سعید، حبیب محمد
ژیانی ئازیزمان ﷺ / نووسینی حبیب محمدسعید.-- تهران: نشر احسان، ۱۳۸۶.
۸۵۸ ص.
ISBN: 964-356-460-6
کردی.
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.
کتابنامه به صورت زیرنویس.
۱. محمد ﷺ، پیامبر اسلام، ۵۳ قبل از هجرت -- ۱۱ ق. -- سرگذشتنامه.
BP ۲۲/۹/ژ۶۶س۹
۲۹۷/۹۳
کتابخانه ملی ایران
۸۵-۵۲۰۷م

## ژیانی ئازیزمان ﷺ

نووسەر: حەبیب محەمەد سەعید
بڵاوکار: نەشری ئیحسان
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم ـ ساڵی ۲۰۰۷
تیراژ: ۳۰۰۰ دانە
چاپخانە: مەهارەت
دیزاین و پیت‌چین: سوز کومپیوتەر
ژمارەی سپاردنی: (۳۳٤)ی ساڵی (۲۰۰٦)ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

فروشگاه شمارهٔ ۱: تهران ـ خیابان انقلاب ـ روبروی دانشگاه ـ مجتمع فروزنده ـ شمارهٔ ٤٠٦ ـ تلفن: ٦٦٩٥٤٤٠٤
فروشگاه شمارهٔ ۲: تهران ـ خیابان ناصر خسرو ـ کوچه حاج نایب ـ شمارهٔ ۳۳ ـ تلفن: ۳۳۹۰۲۷۵۰
صندوق پستی: تهران ۳۸۵ ـ ۱۱٤۹۵


نشر احسان

ISBN: 964-356-460-6
ژمارەی نێو نەتەوایەتی: ٩٦٤-٣٥٦-٤٦٠-٦

# پێشکەش

ئەم بەرهەمە پێشکەش بێت بە :

۞ گیانی پاکی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، هەموو برا پێغەمبەرەکانی تری سەلامیان لێ بێ و ، هەموو هاوەڵان و ، شوێنکەوتووان و ، زانایان و ، ئەولیایان و ، خزمەتگوزارانی دینی خوا .

۞ بەو مامۆستایانەی کە دەستیان گرتین و ، بە کتێب ، یا بە ئامۆژگاریی ئەلف و بێی ئیسلامیان فێر کردین و ، نەیان هێشت سەرگەردانی بیابانی ئیلحاد و بێدینیی ببین .

۞ بە دایك و باوك و ، کەس‌وکاری خەمخۆری دەوروبەر و ، ئەو برایانەی کە برایانە دەستیان گرتین و هەردەم دڵیان خۆش ئەکردین تا لە سەرچەمەی زوڵاڵی قورئان دوور نەکەوینەوە .

۞ بە هەموو چاکویستێك کە خوا هیدایەتی دابێت بۆ سەر رێبازی ئیسلام و ، بڕیاری دابێ تەمەنی بۆ خزمەتی ئیمان ، بۆ بەرفرازیی مردومەکان لە دۆزەخ ، بەخت بکات .

# پێشەکیی

الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين .

دەمێك بوو دۆستان و خۆشەویستان ، لەم لاو لەولا ، پرسیاریان ئەکرد کە چۆن تا ئێستا هەولْم نەداوە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ بنووسم ؟ یان ئاواتیان ئەخواست کە خۆزگە ژیانی ئازیزمانت بنووسیایە . خوا پاداشتی زەننی چاکیان بداتەوە .. ئەوان سەیری دڵ و نیەتی پاکی خۆیانیان ئەکرد کاتێك کە ژیاننامەی هاوەڵانیان ئەخوێندەوە و دڵیان ئەهاتە جۆش و ، بە دیار هەڵوێستە مەردانە و قارەمانانەکانیانەوە فرمێسکیان هەڵ ئەڕشت ، هەر وەك منیش لە کاتی نووسین دا فرمێسکم هەڵ ئەڕشت ..

لە دواجاردا ، دوای نووسینی شتێك لەسەر ژیانی چەند هاوەڵێك و ، پاشانیش نووسینی کورتەیەك لە ژیانی هەر پێنج خەلیفە راشیدەکە ، هاتمە سەر ئەوە کە هەولێك بدەم بۆ نووسینی شتێك ، ئەگەرچی کەمیش بێ ، لەسەر ژیانی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ ، بەو هیوایەی کە هەر تەمەنێك لەو پێناوەدا سەرف بکرێ، بێ پاداشت نەبێ ، چونکە رۆشن کردنەوەی ژیانی پێغەمبەر و هاوەڵانی ، تا موسڵمانان کەڵکی لێ وەربگرن ، قازانج بە دینی موسڵمانان ئەگەیەنێ و ، موسڵمانان کەڵك لەو ژیانە پڕ فەڕ و بەرەکەتەی ئەوان وەرئەگرن .

بە تایبەت کە سەرنج ئەدەین و ، لە ماوەی مەککە و مەدینە ورد ئەبینەوە ، موسڵمانەکان زۆر بەستەزمان بوون و ، بە هەموو شێوەیەك کافران سزا و ئازاریان داون .

لە مەککەدا کەم و کەم دەسەڵات بوون و ، قورەیشی‌یەکان لە هیچ جۆرە سزا و خراپەیەك دەستیان نەئەگرتەوە و ، بێ ڕەحمانە ئازاری موسڵمانەکانیان ئەدا ، هەر لەسەر ئەوەی لەسەر دینی بت‌پەرستیی لاچووبون و ، ئەیان ویست خوای خۆیان بە تاك و تەنیا بپەرستن و ، خەمێکی قەبر و قیامەتی خۆیان بخۆن ، تا ئەوە بوو ناچار بوون مەککە بەجێ بهێڵن و ، کۆچ بۆ مەدینە بکەن .

لە مەدینەش وازیان لیّ نەهێنان ، بگرە دوژمنیان زیادی کرد .. لە مەککەدا تەنها قورەیش ، ئەویش چەند ملهوڕێك زیاتر سزایان ئەدان ، بەلاّم لە مەدینەدا هەموو عەرەبە بتپەرستەکانی دوورگە و ، جوولەکەی مەدینە و خەیبەر ، بوونە دوژمنیان ، کە هێزێکی یەکجار گەورە بوون لە چاو هێزی موسلّمانەکان دا ، سەرەڕای کۆمەڵێك مونافیقی ناو مەدینە کە بووبوونە خۆرە و ، سزا و ئازاری جەستەی کۆمەڵگای ئیسلامی‌یان ئەدا ..

بۆیە ئەتوانین بڵێین :

لەو ڕۆژەوە کە وەحی هات و پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە بانگەواز کرد و ، هەر یەکە لە هاوەڵانیش ئیمانیان هێنا ، هەتا ئەو ڕۆژەی کە هەر یەکەیان بە سەری بەرزەوە گیانی تەسلیم کردەوە ، ساتێك وچانیان نەگرت .. بە دەست کافر و جوولەکە و مونافیقەوە گیریان خواردبوو و شەڕیان پیّ ئەگێڕان .. هەوڵیان ئەدا خۆیان و دینەکەیان بڕووخێنن . ئەمانیش مەردانە چەندیان لە تواناادا بوو هەوڵیان ئەدا و ، پەرچی دەست درێژیی و پیلانی دوژمنانیان ئەدایەوە و ، هەرچیش لە توانایانا نەبوایە ، هاواریان ئەبردە بەر دەرگانەی پەروەردگار تا بە هێز و قودرەتی بیّسنووری خۆی بگاتە فریایان .. ئیتر نە حەسانەوەیەك .. نە ڕابواردنێك .. نە خۆشی‌یەك بۆ ئەوان نەبوو ، چونکە ئەیان زانیی کارێکی گرنگ وا لە ئەستۆیان‌دا و پێویستە بی‌گەیەنن .. دیارە لە کاتی جیّ بە جیّ کردنی بانگەوازدا کۆسپ و تەگەرە دێنە ڕێیان و پێویستە ئارام بگرن ، ئەمەش دوای خۆئامادەکردن و بەکارهێنانی وەسیلەی شەرعیی بۆ پارێزگاریی دین .

بەم شێوەیە سەرتاپای ئەوان جیهاد بوو .. جیهادی گەورە .. جیهادی بچووك .. جیهادی ماددیی .. جیهادی مەعنەویی .. جیهادی کافران .. جیهادی ئەهلی کیتاب .. جیهادی مونافیقان .. جیهادی نەفس .. جیهادی هەوا .. جیهادی شەیتان ..

بۆیە زۆر پێویستە ڕۆڵەکانی ئیسلام بە جوانیی و بە چاکیی شارەزای سیرەت بن . ئەوەتا ئیمام زوهەریی ئەڵێت :

لە زانستی سیرەت‌دا زانستی دنیا و قیامەت هەیە . دوای قورئان موسلّمانان دیراسەی سیرەتیان ئەکرد ، بۆیە ئیمام زەینولعابیدینی کوڕی ئیمام حوسەین خوا

لێیان رازیی بێ ئەیوت : وەك چۆن سوورەتێکی قورئانمان پێ رەوان ئەکرا ، غەزاکانی پێغەمبەری خواشمان ﷺ وەها فێر ئەکرا .

هەروەها ئیسماعیلی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبووەققاص ئەیوت : باوکم غەزا و سەریەکانی بۆمان ئەگێڕایەوە و ئەیوت : رۆڵە گیان ! ئەمە شەرەفی باوباپیرتانە و ، لە یادی نەکەن .

لەم چەرخەدا زۆرێك لە رۆڵەکانی موسڵمانان لە ئیسلام بێئاگا بوون و ، لە مێژووی ئیسلام شتێکی ئەوتۆ نازانن ، زۆر جاری وایش هەیە مێژوویان بە چەواشەیی بیستووە و ، گلەیی و رەخنەیان ئاراستەی ئەوانە ئەکەن کە خزمەتیان کردوون و ، چەپڵە و ئافەرینیشیان بۆ ئەوانەیە کە بڕبڕەی پشتیان شکاندوون و بە دەیان ساڵ نایەنەوە سەر خۆیان !!

هیوادارم گەنجی موسڵمان بە وردیی و ژیریی چاوێك بە دەوروبەری خۆیدا بگێڕێ و ، کەڵك لە مێژووی پرشنگداری ئیسلام وەربگرێ ، بە تایبەت لە ژیانی پێغەمبەر و هاوەڵانی تا توانای هەبێ هەوڵی سەرفرازیی خۆی و مرۆڤایەتیی بدات .

نووسەر
سلێمانیی
٦ / شوال / ١٤٢٣ هـ
١٠ / ١٢ / ٢٠٠٢ م

## بەشی یەکەم
# کورتەیەك لە مێژووی عەرەب
### پێش هاتنی ئیسلام

خوای گەورە ویستی وەها بوو کە دواپەیامی بۆ مرۆڤایەتیی بۆ پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بنێرێت ، تا بیکاتە دواڕابەری مرۆڤ و ، هیدایەت دەری سەرجەمی ئادەمی‌یەکان هەتا دواهەناسەی ژیان .. جا ئەم ئازیزەمان لەبەر ئەوەی لەناو نەتەوەی عەرەب دا و لە نیمچە دوورگەی عەرەب دا هەڵکەوتووە ، شتێکی پێویستە کە لە بارودۆخی ئەو دوورگەیە و ژیان و گوزەرانی عەرەب پێش ئیسلام کەمێك ئاگادار بین ، تا بزانین بانگی ئیسلام لە چ بارودۆخێك دا و لە ناو چ گەل و هۆزێك دا بڵاوبۆتەوە .. پێویستە سەرنجی ژیانی دینیی و ، کۆمەڵایەتیی و ، رەوشتیی و ، سیاسیی ئەو سەردەمەی عەرەبەکانی دوورگەکە بگرین ، تا بزانین ئازیزی خۆشەویستمان ﷺ چ رەنج و تەقەلایەکی بێوچانی داوە بۆ پێگەیاندنی کۆمەڵی هاوەڵان ، کە بوونە بەردی بناغە بۆ بڵاوکردنەوەی دینی پیرۆزی ئیسلام و بەرپاکردنی گەورەترین و پاك‌ترین و بەکەڵك‌ترین شارستانییەت لەسەر گۆی زەویی .

**نیمچە دوورگەی عەرەب :**

نیمچە دوورگەی عەرەب گەورەترین نیمچە دوورگەیە لە هەموو جیهان‌دا و ئەکەوێتە باشووری خۆرئاوای ئاسیاوە . لای خۆرهەڵاتی کەنداوی عەرەب و عیراق و ، لای باشووری زەریای هیندیی و، لای خۆرئاوای دەریای سوورە و ، لای باکووریشی بریتی‌یە لە هێڵێکی وەهمیی کە لە کەنداوی عەقەبەوە بۆ ئەو شوێنە درێژ ئەبێتەوە کە شەتولعەرەب ئەرژێتە کەنداوی عەرەبی‌یەوە .

موسڵمانان دوورگەی عەرەبی‌یان کردۆتە پێنج بەشەوە :

١ ـ **حیجاز** : کە لە ئەیلە ( واتە عەقەبە ) وە تا یەمەن درێژ ئەبێتەوە . لەبەر ئەوەش ناو نراوە حیجاز چونکە بریتی‌یە لەو زنجیرە چیایەی کە دەشتی توهامەی کەناری دەریای سوور لە وڵاتی نەجد جیا ئەکاتەوە ..

٢ ـ **توهامە** : دەشتی کەناری دەریای سوور .

٣ ـ **وڵاتی یەمەن** : لە باشووری خۆرئاوای دوورگە .

٤ ـ **نەجد** : کە بریتی‌یە لەو ناوچە بەرزەی کە ئەکەوێتە نێوان چیاکانی حیجاز و بیابانی بەحرەین ، ئەمەش ناوچەیەکی بەرزی فراوانە کە لە بیابان و چیای بڵند پێك هاتووە .

٥ ـ **عەرووض ، یان یەمامە** : ئەکەوێتە نێوان بەحرەین لە خۆرهەڵات و حیجاز لە خۆرئاوادا، ناویان ناوە عەرووض چونکە بۆتە کۆسپ و جیاکەرەوەی ناوچەی یەمەن و نەجد .

رووبەری نیمچە دوورگەی عەرەب بریتی‌یە لە یەك ملیۆن میل چوارگۆشە ، کە بەشی هەرەزۆری بیابانی وشك و برنگە و ، لە نێوان ئەو بیابانەدا چیایەکی زۆری جیاواز هەن ، کە هەندێ بەرز و هەندێ نزم و هەندێکیش پان و بەرین ، کە گرنگ ترینیان زنجیرە چیاکانی ( سورات ) ە کە هەر لە شامەوە تا یەمەن و ، تەریب لەگەڵ لێوارەکانی دەریای سوور ، درێژ ئەبێتەوە و ، لە نێوان ئەم زنجیرە چیایە و دەریای سووریش‌دا دەشتێکی تەسك هەیە کە پێی ئەوترێ توهامە .

هەروەها لە دوورگەدا ناوچەی بەردەڵانی زۆر هەن کە بە بەردی رەشی کلۆر داپۆشراوە و بە هەر یەکەیان ئەوترێ ( الحَرَّة ) کە بە هۆی گڕکانەکانەوە دروست بوون و ، زۆربەی ئەو ناوچانە زەویی‌یەکەیان بە پیت و ئاویان زۆرە ، بە تایبەت ناوچە بەردەڵانەکانی مەدینە و خەیبەر ، کە بە بەرهەم هێنانی جۆرەها بەروبوومی کشت وکاڵیی لە دێرین زەمانەوە ناوبانگیان دەرکردووە .

شایانی باسە کە لەم دوورگەیەدا رووباری گەورە نیە کە بەردەوام ئاوی لەبەر بڕوا و بەلەم و کەشتیی تیا بەکار بهێنرێت ، بەڵام کانیاوی سازگاری زۆری تیایە کە دەوروبەریان مێرگی صەوزی تیایە و ، چەم و دۆڵەکانیش پڕن لە دار و درەخت و بێستانی رازاوە و هەندێ بەروبووم و صەوزە و میوەیان لێ وەدەست ئەهێنرێ .

ئەم شوێنەی دوورگەی عەرەبیی زۆر گرنگ بوو لەبەر ئەوەی کە لە هەموو لایەکەوە بە لم و بیابان دەورەی گیرابوو و ، نیمچە دوورگەکە وەك قەلایەکی سەختی لێ هاتبوو کە خۆی بۆ هیچ داگیرکەرێکی بێگانە بە دەستەوە نەئەدا . لەبەر ئەمە بوو کە لە دێرین زەمانەوە دانیشتوانی بە سەربەستیی مابوونەوە ، ئەگەرچیی دراوسێی دوو ئیمپراتۆریەتی گەورەی جیهانیی ، وەك بیزەنتیی و ساسانیی ، بوون کە ئەگەر ئەم بەستە سەختەی دەوروبەریان نەبوایە توانای بەرهەڵستیی هێرشەکانی ئەوانیان نەئەبوو .

لەلایەکی تریشەوە دوورگەی عەرەبیی ئەکەوێتە نێوان کیشوەرە ناسراوەکانی جیهانی ئەوساوە ، بۆیە دەرگای بەستنی بە ئیفریقیە و ئەورووپا و عەجەم و هیند و چینەوە لەسەر پشت بوو .

عەرەبەکان کە لە دێرین زەمانەوە نیشتەجێی نیمچە دوورگەی عەرەب بوون لە بنەڕەتدا لقێکی رەگەزی سامیین و ، [1] زمانیشیان زمانی عەرەبییە . عەرەبەکان زیاتر لە هەموو لقەکانی تری سامیی و زمانەکەشیان لە هەموو زمانەکانی تر زیاتر پارێزگاریی لە رەسەنایەتیی خۆیان کردووە ، ئەمەش بە هۆی سروشتی گۆشەگیریی خۆیان و زمانەکەیان لە دوورگەی عەرەبییدا و ، بە هۆی ئەوەشەوە کە بە وردیی پارێزگارییان لە حەسەب و نەسەب ئەکرد و ، نە ژنیان لە بێگانە ئەهێنا و نە ژنیشیان بە بێگانە ئەدا ..

عەرەبەکان بە درێژایی مێژوو چەندین دەوڵەت و شارستانێتییان بەرپا کردووە و رۆڵی گرنگیان لە جیهانی کۆندا بووە .

ئەمەش بەشەکانی عەرەبن لە مێژووی دوور و درێژیاندا :

١ ـ **العرب البائدة** : کە بریتین لە هۆزەکانی عاد و ، ثەموود و ، عەمالیقە و ، طەسم و ، جەدیس و ، ئومەیم و، جورهوم و ، حەضرەمەوت . ئەم هۆزانە پێش هاتنی ئیسلام لەناو چوون .. ئەمانە هەر یەکەیان لە سەردەمی خۆیدا خاوەنی دەسەلات بوون و ، پادشاکانیان دەستیان بەسەر شام و میصریشدا ئەڕۆیشت ..

جا مێژوونووسان ئەو عەرەبە تیاچووانە ئەکەن بە دوو بەشەوە :

---

[1] هەر یەکە لەو نەتەوانەی کە بە عەرەبیی و عیبرانیی و سریانیی و حەبەشیی قسە ئەکەن لقێکی رەگەزی سامیین ، واتە ئەچنەوە سەر سامی کوڕی نووح پێغەمبەر سەلامی لێ بێ .

أ ـ عەمالیقە : کە لە نەوەی لاوزی کوڕی سامی کوڕی نووحن کە پێیان ئەوترێ سامی‌یەکان .

ب ـ لەوانیش بەولاوە ئەو عەرەبانەن کە لە نەوەی ئیرەمی کوڕی سامی کوڕی نووحن و پیێان ئەوترێ ئارامی‌یەکان .

عەمالیق ماوەیەك دەسەڵاتی میصریان گرتە دەست و بنەماڵەیەکی شاهانەیان لەوێدا دامەزراند ، هەروەها لە عیراقیش‌دا دەوڵەتێکیان بە ناوی دەوڵەتی حامۆڕابی‌یەوە دامەزراند کە حامۆڕابیی یەکەم پادشایان بوو و خاوەنی ئەو یاسا بە ناوبانگە بوو کە پێی ئەوترا یاسای حامۆڕابیی ، ئەمەش لە صەدەی بیست و سێهەمی پێش زایین‌دا ..

٢ ـ **العرب العاربة** : ئەمانەش ئەو عەرەبانەن کە نەوەی یەعروبی کوڕی یەشجوبی کوڕی قەحطانن کە پیێان ئەوترێ : عەرەبی قەحطانیی . ئەمانە لە باشووری دوورگەدا واتە لە یەمەن و دەوروبەری‌دا نیشتەجێ بووبوون . پادشاکانی یەمەن لەم عەرەبانە بوون و ، ئەمانە توانی‌یان دەوڵەتی مەعین و سەبەء و حیمیەر دابمەزرێنن .

جا ئەمانە دوو تیرەیان زۆر بەناوبانگ بوون :

أ ـ **حیمیەر** : کە گرنگ‌ترین هۆزیان ( زید الجمهور ) و ، قُضاعة و ، سەکاسیك بوون .

ب ـ **کەهلان** : کە گرنگ‌ترین هۆزی ئەمانیش هەمدان و ، ئەنمار و ، طيء و ، موذحەج و ، کیندە و ، لەخم و ، جوذام و ، ئەزد و ، ئەوس و ، خەزرەج و ، کوڕەکانی جەفنەی پادشایانی شام بوون .

هۆزەکانی کەهلان لە یەمەنەوە کۆچیان کرد و نیشتەجێی شوێنە جۆراو جۆرەکانی دوورگە بوون و ، کۆچ کردنی زۆربەی ئەو هۆزانەش پێش رووخانی بەندی مەئرەب بوو ، ئەمەش بە بۆنەی تیاچوونی بازرگانی‌یەکەیانەوە کە ئەوەبوو رۆمانەکان فشاریان خستە سەریان و ، دەستیان بەسەر رێگاوبانی بازرگانی‌یە دەریایی‌یەکانیان‌دا گرت و ، دوای داگیرکردنی شام و میصریش لەلایەن رۆمانەوە رێی وشکاییشیان لێ گرتن .

لە لایەکی تریشەوە هۆزەکانی کەهلان و حیمیەر زۆر ناکۆك بوون ، ئەمەش لەوەدا دەرئەکەوێ کە هۆزەکانی حیمیەر لە یەمەندا ئەمێننەوە ، کەچیی هۆزەکانی کەهلان کۆچ ئەکەن و یەمەن بەجێ ئەهێڵن .

جا ئەتوانین ئەو هۆزانەی کەهلان کە کۆچیان کرد بکەین بە چوار بەشەوە :[٢]

**یەکەم** : ئەزد : کۆچ کردنی ئەمانە لەسەر رای سەردار و گەورەیان عیمرانی کوڕی عەمر بوو ، ئەوەبوو لە وڵاتی یەمەندا ئەسووڕانەوە و بەدوای شوێنی چاكدا ئەگەڕان تا لە ئەنجامدا بەرەو باکوور کەوتنە رێ :

ثەعلەبەی کوڕی عەمری کوڕی ئەزد بەرەو حیجاز رۆیشت و لە نێوان ثەعلەبیە و ذیقاردا نیشتەجێ بوو ، کاتێکیش کە کوڕەکەی گەورە بوو و دەسەڵاتی پەیدا کرد بەرەو یەثریب رۆیشت و لەوێ نیشتەجێ بوو . هەروەها ئەوس و خەزرەجی جووتە کوڕی حاریثەی کوڕی ثەعلەبەش لە نەوەی ئەو ثەعلەبەیە بوون .

هەر لەوان حاریثەی کوڕی عەمر ـ کە خوزاعەیە ـ لەگەڵ منداڵەکانیا لە حیجازدا ئەگەڕان تا سەرەنجام لە ( مرالظهران ) نیشتەجێ بوون و ، پاشان دەستیان بەسەر حەرەمدا گرت و جورهومەکانیان لە مەککە دەرکردن و خۆیان تیایا نیشتەجێ بوون .

عیمرانی کوڕی عەمریش بە خۆی و کوڕەکانیەوە نیشتەجێی عومان بوون ، ئەمانەش ئەزدی عومانن .

هەروەها هۆزەکانی نەفەری کوڕی ئەزد لە توهامە نیشتەجێ بوون ، ئەمانیش ئەزدی شنۆئەن .

جەفنەی کوڕی عەمریش بەرەو شام کەوتە رێ و ، لەگەڵ کوڕەکانیدا لەوێ نیشتەجێ بوون . ئەم جەفنەیە باوکی پادشاکانی غەسساسینەیە . ئەم ناوەشیان بە بۆنەی ئاوێکەوە لێ نرا کە ئاوی غەسسانیان پێ ئەوت لە حیجاز و بەر لەوەی بۆ شام کۆچ بکەن ، ماوەیەك لەسەر ئەو ئاوە نیشتەجێ بوو بوون .

**دووهەم** : لەخم و جوذام : نەصری کوڕی رەبیعەی باوکی پادشاکانی مەناذیرە لە حیرە یەکێك بوو لە هۆزی لەخم .

---

[٢] الرحيق المختوم : ١٣ ، الطبعة الأولى / دار الخير / ١٩٩٧ .

**سێهەم** : نەوەی طەی : ئەمانیش دوای کۆچی ئەزد بەرەو باکوور کەوتنە رێ و لە ناوچەی طەی لە نێوان جووتە چیای ئەجەء و سولمادا نیشتەجێ بوون و ، دواییش ئەو جووتە چیایە بە چیای طەی ناونران .

**چوارەم** : کیندە : کە لە ناوچەی بەحرەین نیشتەجێ بوون و ، پاشان خۆیان گەیاندە نەجد و لەوێ حوکمەتێکی بەدەسەڵاتیان دامەزراند ، بەڵام ئەم حوکمەتە تەمەنی درێژ نەبوو و زوو تیاچوو .

هەروەها هۆزی قوضاعەش یەمەنی بەجێ هێشت و لە ناوچەی سەماوەی باشووری عیراقدا نیشتەجێ بوون .

٣ ـ **العرب المستعربة** : ئەمانەش ئەو عەرەبانەن کە پێیان ئەوترێ عەدنانیی ، کە نەوەی ئیسماعیل پێغەمبەرن سەلامی خوای لێ بێ کە لە بنەڕەتدا ئیبراهیم خەلیل سەلامی خوای لێ بێ خەڵکی عیراقە و ، لە شاری ئوورەوە ـ کە کەوتۆتە سەر لێواری خۆرئاوای فورات و نزیك شاری کووفە ـ هاتبوو .

لەم دواییەشدا لە شاری ئووردا شوێنەوارناسان توانییان زانیارییەکی زۆر دەربارەی بنەماڵەی ئیبراهیم خەلیل سەلامی لێ بێ و دەربارەی ژیانی دینیی و کۆمەڵایەتیی ئەو شارە دەست بخەن .

بەر لەوەی ئەم باسە تەواو بکەین ، وا چاکە شتێك لە بارەی ژیانی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕیەوە سەلامیان لێ بێ ئاگادار ببین .

ئیبراهیم پێغەمبەری باوکی پێغەمبەران کوڕی ئازەرە ، وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ، ئەویش کوڕی ناحووری ، کوڕی ساروغی ، کوڕی راعووی ، کوڕی فالغی ، کوڕی عابری ، کوڕی شالحی ، کوڕی ئەرفەخشذی ، کوڕی سامی ، کوڕی نووح پێغەمبەرە سەلامی لێ بێ .[٣]

لەو کاتەدا کە ئیبراهیم لەدایك بوو تەمەنی ئازەری باوکی حەفتا و پێنج ساڵ بوو و ، دوو برایشی هەبوون : ( ناحوور ) و ( هاران ) کە یەکێکیان لە ئیبراهیم گەورەتر بوو و یەکێکیشیان بچووکتر . هاران باوکی ( لووط ) پێغەمبەرە سەلامی لێ بێ ، ئیبراهیم خەلیل لە عیراق، لە وڵاتی کلدانیەکان ، واتە ( بابل ) و دەوروبەری ، لەدایك بووە . کە گەورە بوو خاتوو سارەی ئامۆزای خۆی مارە

---

[٣] البداية والنهاية : ١ / ١٣٩ .

کرد . پاشان ئازەر لەگەڵ ئیبراهیم و خاتوو سارە و لووطی کوڕی هاران وڵاتی کلدانیان بەجێ هێشت و روویان لە وڵاتی کەنعانیەکان کرد . ئەوەبوو لە ( حەڕڕان ) نیشتەجێ بوون و لەوێشەوە چوون بۆ فەلەستین و کردیە بنکە بۆ بانگەوازەکەی . جا دانیشتوانی حەڕڕان وەك دانیشتوانی بابل ( کلدانیا ) بت و ئەستێرەیان ئەپەرست .

کاتێك کە ئیبراهیم خەلیل کرایە پێغەمبەر ئامۆژگاریی قەومەکەی کرد تا واز لە بتپەرستیی بهێنن و شوێن ڕێبازی تەوحید بکەون . زۆریش حەزی لە هیدایەت دانی باوکی بوو ، کەچیی ئەو بە گوێی نەئەکرد ، ناچار کەوتە بەڵگە هێنانەوە تا بەڵکو باوکی و قەومەکەی کۆڵ بدەن و ڕێگای خواناسیی بگرنە بەر .[٤]

ئازەر لە حەڕڕان کۆچی دوایی کرد و ، ئیبراهیمیش زۆری پێ ناخۆش بوو کە باوکی بە کافریی مرد و ئیمانی نەهێنا .

ئیبراهیم بەبێ کۆڵدان هەر خەریکی بەرزکردنەوەی بانگی تەوحید بوو و، لەو پێناوەش‌دا تووشی ناڕەحەتی‌یەکی زۆر بوو و، لە ئەنجام‌دا لەسەر شکاندنی بتەکان خستیانە ناو ئاگر و خوای گەورە گەیشتە فریای و فەرمانی دا ئاگرەکە بەندەی خواناس نەسووتێنێ . ئیبراهیمیش مەردانە لەسەر کاری خۆی بەبێ کۆڵدان بەردەوام بوو .

پاشان ئیبراهیم لەگەڵ سارە خاتوونی هاوسەری و لووطی برازای‌دا کۆچیان بۆ وڵاتی پیرۆزی شام کرد .. سارە خاتوونیش لەبەر ئەوەی کە نەزۆك بوو هیچ منداڵێکی نەبوو . پاشان لە پاداشتی ئەوەدا کە ئیبراهیم لەبەر خوا کۆچی کرد و خزم و کەس و کار و نیشتمانی خۆی بەجێ هێشت تا بتوانێ خوای پەروەردگار بپەرستێ و خەڵك بۆ سەر ڕێبازی تەوحید بانگ بکات و ، بە ڕاستییش لە وڵاتی شام‌دا پەیامی خوای گەیاند ، ئەوا خوای گەورە چەند منداڵێکی پیاوچاکی پێ بەخشیی و ، لە ڕۆڵەکانی پێغەمبەرانی ڕەوانە کردن و ، بوونە هەڵگری فەرمایشتی خوا .. لووطی برازاشی ئەوە بوو خوای گەورە کردیە پێغەمبەر و ڕەوانەی لای دانیشتوانی یەکێ لە ناوچەکانی شامی کرد ، کە ئەویش ناوچەی سەدوم بوو .

---

[٤] سوورەتی ( مریم : ٤١ ـ ٤٨ ) و ، سوورەتی ( الأنبیاء :٥١ ـ ٧١ ) ئەم باسە بە جوانیی روون ئەکەنەوە .

پاشان ئیبراهیم خەلیل لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەرەو میصر کەوتنە ڕێ ، ئەو سەردەمەش پادشایەکی ستەمکاری ملهوڕ گەورەی میصر بوو ، کە هەر پیاوێك هاوسەری لەگەڵدا بوایە ژنەکەی لێ داگیر ئەکرد و پیاوەکەشی ئەکوشت . کە سیخوڕانی پادشا ئیبراهیم و سارەیان بینین خێرا هەواڵیان بە پادشا دا کە پیاوێك هاتووە و ژنێکی زۆر جوانی لەگەڵدایە . ناردی بە دوایا و پرسیاری لێ کرد کە ئەم ئافرەتە کێیە لەگەڵتا ؟ فەرمووی : خوشکمە . پاشان ئیبراهیم هاتەوە لای سارە و فەرمووی : سارە ! لەسەر ڕووی زەوییدا جگە لە من و تۆ ئیمانداری تر نیە ، ئەم پادشایشە پرسیاری لێ کردم و ، منیش هەواڵم داوەتێ کە تۆ خوشکمی ( واتە خوشکی دینیی ) ، نەکەی بمخەیتە درۆوە . پادشا ناردی بە دوای سارەدا ، کە چووە ژوورەوە لای پادشا ، پادشا ویستی دەستی بۆ ڕابکێشێ ، دەستی وشك بوو . وتی : لە خوا بپاڕێرەوە بۆم زیانت پێ ناگەیەنم . سارەش لە خوا پاڕایەوە و دەستی بەر بوو . پاشان ویستی دەستی بۆ بەرێ ، ئەم جارەش لە جاری پێشوو خراپتر دەستی وشك بوو . دیسان وتی : لە خوا بپاڕێرەوە بۆم زیانت پێ ناگەیەنم . ئەویش دوعای کرد و دەستی بەر بوو . ئەوەبوو پادشا بانگی کردە هەندێ لە دەست و پێوەندی و وتی : ئێوە مرۆڤتان نەهێناوە بۆ من ، بەڵکو شەیتانتان هێناوە بۆم !! وتی : بیبەنەوە بۆ لای ئیبراهیم . ئەوەبوو هاجەریشی بە شێوەی کەنیزەك پێشکەش کرد ..

کە گەڕایەوە ئەبینێ وا ئیبراهیم بە پێوە وەستاوە و نوێژ ئەکات ، بە دەستی ئاماژەی کرد : ( مَهيَم ) واتە : دەنگ و باس چییە ؟ وتی : (( رَدَّ اللهُ كيدَ الكافِرِ أَو الفاجِرِ في نحرِه ، وأخدَمَ هاجر )) .[٥] بۆی ڕوون کردەوە کە خوای گەورە فریای بەندەی خواناسی خۆی کەوتووە و ئەو کافرە خوانەناسە نەیتوانیوە دەستی بۆ بەرێ ، لەگەڵ ئەوەشدا هاجەری کردۆتە کەنیزەکی .[٦]

جا ئەوەی کە لە بارەی هاجەرەوە زانراوە ئەوەیە کە هاجەر کەنیزەك بووە . بەڵام زانای پایەبەرز قاضي موحەممەد سولەیمان مەنصوورفووریی لە کتێبی ( رحمة

[٥] مختصر صحيح البخاري ـ كتاب الأنبياء ، الحديث رقم ١٣٤٩ .
[٦] السيرة النبوية في ضوء القرآن والسنة للدكتور محمد بن محمد أبـي شهبة : ١ / ١٠٧ ـ ١٠٩ .

للعالمين ) دا ب٢ ل ٣٦ ـ ٣٧ سەلماندوویەتی کە هاجەر ئافرەتێکی ئازاد بووە نەك جاریە و کەنیزەك و ، کچی فیرعەون خۆیشی بووە .[٧]

هەروەها لە موسنەدی ئیمام ئەحمەدیش‌دا هاتووە کە کاتێك سارە خاتوون چووە ژوورەوە لای پادشا ، لە خوا پاڕایەوە و وتی : ( أللهم إن كنتَ تعلم أنّي آمنت بكَ وبرُسُلكَ ، وأحصنتُ فَرجي إلا على زوجي ، فلا تُسَلِّطْ عليَّ هذا الكافِر ) .[٨] لە خوا پاڕایەوە کە ئەگەر ئەو ئیمانی بە خوا و بە پێغەمبەرەکانی هێناوە و شەرەفی خۆی پاراستووە ، ئەوا با یارمەتیی بدات و نەهێڵێ ئەم کافرە دەستی بۆ درێژ بکات .

ئەوەبوو خوای گەورە بۆ پاراستنی شەرەفی پاکی بەندە و پێغەمبەر و خۆشەویست و دۆستی خۆی ، ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی لێ بێ و بۆ گیراکردنی نزا و پاڕانەوەی هەردووکیان سارە خاتوونی پاراست . هەرکە بردیان بۆ لای ئەو ستەم‌کارە ، حەزرەتی ئیبراهیم دەستی دایە نوێژ و پاڕانەوە تا لە داوی ئەو کافرە بیان‌پارێزێ ؟

پاشان ئیبراهیم خەلیل لەگەڵ سارەی هاوسەری‌دا و لەگەڵ هاجەری کەنیزەکی سارەدا و بە زۆرێك ئاژەڵ و بەندە و ماڵ و سامانەوە گەڕانەوە وڵاتی شام . لە شام نزیکەی بیست ساڵ ژیانیان دایە سەر ، پاشان حەزرەتی ئیبراهیم حەزی لە منداڵ بوو ، بۆیە لە خوای گەورە داوای منداڵی کرد و خوای گەورەش مژدەی منداڵێکی ژیر و دانای پێ دا ..

خوای گەورە ئەوەی خستە دڵی سارەوە تا بە ئیبراهیم بگەیەنێ کە خوای گەورە ویستی وەهایە ئەو منداڵی نەبێ . پاشان سارە هاجەری کەنیزەکی پێشکەش بە ئیبراهیم کرد تا بیکاتە هاوسەری بەڵکو خوای گەورە کوڕێکی پێ ببەخشێ .

بە فەرمانی خوا هاجەر سکی پڕ بوو و ئیسماعیلی لێ بوو ، ئەمەش لە کاتێك‌دا کە تەمەنی ئیبراهیم هەشتا و شەش ساڵ بوو .

کاتێك کە تەمەنی ئیبراهیم خەلیل نزیکی سەد ساڵی بوویەوە ئەو مەلائیکەتانەی کە هاتنە ماڵی ئیبراهیم تا بچن کافرانی قەومی لووط لەناو بەرن و کۆمەڵی ئیمان‌دار رزگار بکەن ، ئەو مەلائیکەتانە مژدەیان بە سارە خاتوون دا

---

[٧] الرحيق المختوم : ١٤ .
[٨] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ١٠٩

که خوای گەورە ئیسحاقیان پێ ئەبەخشێ و ئەشیکاتە پێغەمبەرێکی پیاوچاك .
ئەوەبوو لە دوای چەندەها سالی نەزۆکیی و لە تەمەنێکی یەکجار زۆردا ، کە هەتا سارە خۆیشی سەری سوورِ ئەما لەوەی کە منداڵیان ببێ ، خوای گەورە کوری پێ بەخشین . بەمە دەرئەکەوێ کە ئیسحاق دوای ئیسماعیل بە چواردە ساڵ لە دایك بووە .

مێژوونووسان زۆر جار کارێکی گەورە و نەخشەیەکی پرِ دانایەتیی ئەگەرِێننەوە بۆ هۆیەکی سادە و منالانە کە زۆر لە واقیعەوە دوور بێت ..

ئەوەبوو کە ئیسماعیل لەدایك بوو ، خوای گەورە بۆ کارێکی مەزن ، کە بەسترابێ بە ژیانی تێکرِای سەرزەوییەوە تا ئاخرزەمان ، فەرمانی دا ئیبراهیم هاجەری هاوسەری و ئیسماعیلی کورِەی ئازیزی هاودەم و تاقەتی سەردەمی پیریی خۆی لە شامەوە بەرێت بۆ حیجاز ..

ئیبراهیم چەندە دڵی بە ئیسماعیل کرابێتەوە !! داخۆ دوورکەوتنەوەی ئیسماعیل و دایکی چەندە بە لای ئیبراهیمەوە گران بووبێت ؟ بەلام چیی بکا فەرمانی خوایە . ئەبێت بیانبات بۆ ئەوێ .

مێژوونووسان وای دەرئەبرِن کە سارە خاتوون غیرەت گرتوویەتی و ئیبراهیمی ناچار کردووە ژن و منداڵەکەی دوور بخاتەوە . بڵێ فرِێیان بداتە بیابانێکی وشك و برنگی چۆڵ و هۆڵەوە !!

زۆر سەیرە ! سارەخاتوون کە ئەوەندە خواناس بوو خوای گەورە دەست و پەلی فیرعەونی لە ئاستیا وشك ئەکرد ، ئێستە ئەوەندە دڵرِەقە ئیسماعیلی نازداری جگەرگۆشەی خەلیل فرِێ بداتە بیابانی چۆڵەوە ؟

جا چ هەوێیەکی عەوام و بێدینیش شتی وا ئەکات ؟

ئەی غیرەتی ئیبراهیم لە کوێیە ئەگەر ئیسماعیل و دایکی لە ترسی ژنە گەورەکەی هەزار کیلۆمەترێك دوور ئەخاتەوە ؟ ئەوپەرِی بیانووی سارە ئەوەیە ماڵیان بۆ جیا بکاتەوە ؟

دوای ئەوەش لە هەموو سەرزەوییدا بۆچ ئیبراهیم شوێنی مەککەی چۆڵ هەڵ ئەبژێرێ ؟

بۆچ ئیسماعیل لە شوێنێکدا دائەنێت کە ئاوی زەمزەمی لێ هەڵ بقوڵێ ؟

هەرگیز ناگونجێ دایکی چەند پێغەمبەرێکی خوا ئەوەنـدە بێویـژدان و دڵ رەق بێت .

هەندێ روون کردنەوەی مێژوونووسـان لە جێی خۆیدا نیە ، لەبەر ئەوە ئەبێ بە وردیی سەرنج بدەین .

ئیبراهیم سەلامی لێ بێ کە بـاوکی هـەموو پێغەمبەرانـە پێویسـتە هـەڵگری هەموو رەوشتێکی بەرزی ئەو پێغەمبەرانە بێت ، نەك ژنێکی نەزۆك نەخشەی بـۆ بکێشێ و ، ژن و کۆرپەی بێتاوان فڕێ بداتە بیابان !!

بەڵێ ، خوای دانا و زانا فەرمانی دا ئیبراهیم بە دڵێکی مەردانەی بەرگـەگرەوە هاجەر و ئیسماعیل بەرێت بۆ ناوچەی مەککە .. کە شیوێکە لە نێـوان چـیاکانی مەککەدا ، واتە چیاکانی فاران وەك لە تەوراتدا هاتبوو ، ئەو شوێنەی کە زووتر کەعبەی ماڵی خوای تیا بنیات نرابوو و ئێستە رووخاوە و شوێنی دیوارەکانیشـی بە دەرەوە نیە ، ئەمەش لەسەر بانێکی بەرزی سوور ، کە لافـاو ئـەهات و لـەلای راست و لەلای چەپیەوە لێی کەندڕ ئەکرد ، لـەلای درەختێکـی گـەورەدا بەسـەر زەمزەمەوە لە بەشی باکووری مزگەوتەوە دایانان .

خوای گەورە ئیبراهیم و ئیسماعیلی بەو شوێنە ئاشنا کرد کە پێویستە رۆژێـك لە رۆژان هەردووکیان پێکەوە بناغەی دیوارەکانی ماڵی خوا بدۆزنـەوە و کەعبـەی پیرۆز بنیات بنێنەوە ، تا ببێتە قیبلەی هەموو ئیمانداران تا ئاخرزەمان .

خوای گەورە ویستی وەها بوو لەو شوێنە پیرۆزەدا ئیبراهیمی خەلیل جاڕ بـدات و هەموو مرۆڤایەتیی تا ئاخرزەمان بانگ بکات بۆ حەجی ماڵی خوا ..

﴿ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ ( البقرة : ١٢٧ ) .

﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴾ ( الحج : ٢٧ ) .

بەڵێ ، ئیبراهیم هاجەر و ئیسماعیلی لە شوێنی ئێستای کەعبەدا - کە چۆڵ و هۆڵ و بێئاو و ئاوەدانیی بوو - بەجێ هێشتن و ، توورەکەیەك خورما و کوندەیـەك ئاوی لەلا دانان و ، خۆی گەڕایـەوە . کـە هاجـەر بینیـی وا ئیبراهیمـی مێـردی

ئەیەوێ بەرەو فەلەستین بگەڕێتەوە و ئەوان لەو شوێنە چۆڵەدا بەجێ بهێڵێ ، هات بە دوای ئیبراهیمدا و ئەشی وت :

ئەی ئیبراهیم ! بۆ کوێ ئەڕۆی و ئێمە لەم شیوەدا ، کە نە ئادەمی‌یەك و نە هیچی تێدا نیە ، بەجێ ئەهێڵیی ؟ چەند جارێك ئەمەی دووبارە کردەوە ، کەچیی ئیبراهیم هەر ئاوڕی لێ نەئەدایەوە . هاجەرخان ناچار بوو تا ئیبراهیم لە چاو گوم نەبووبوو پرسیاری لێ بکات : ئایا خوای گەورە ئەم فەرمانەی بەسەردا داوی ؟!

فەرمووی : بەڵێ .

وتی : دەی کەواتە خوا نامان‌فەوتێنێ !!

ئەمەش ئیمانی دامەزراوی هاجەرە خاتوونمان بۆ دەرئەخات ، کە بە راستیی بە چاکیی پشتی بە رەحم و سۆزی خوا ئەبەست و ، دڵیشی پڕ لە متمانە بوو کە ئیبراهیم خەلیل کاری نابەجێ ناکات و ، لە فەرمانی پەروەردگاری دەرناچێت .

بە راستیی هاجەرە خاتوون شایان بوو دایکی یەکێك لە پێغەمبەرە مەزنەکان بێت .

کە هاجەرە خاتوون ئەمەی لە ئیبراهیم بیست ، گەڕایەوە دوا .. ئیبراهیمیش رێی گرتە بەر هەتا گەیشتە بەرزایی‌یەکە بە شێوەیەك کە نەیان‌ئەبینیی ، رووی کردەوە ماڵی خوا و دوای بەرزکردنەوەی هەردوو دەستی ، لە خوای گەورە پاڕایەوە و فەرمووی :

﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴾ ( إبراهيم : ٣٧ ) .

دایکی ئیسماعیل شیری بە ئیسماعیل ئەدا و لە ئاوی کوندەکەی ئەخواردەوە ، تا ئەوەبوو دوای ماوەیەك ئاوی کوندەکە تەواو بوو و خۆی و منداڵەکەی تینوویان بوو .. ئیسماعیل لە تینواندا ئەتلایەوە و بەناو خۆڵەکەدا ئەپاوتلی ئەکرد و خۆی ئەکوتا بە زەویی‌دا و زمانی و هەردوو لێوی ئەجووڵاندن وەك لە سەرەمەرگدا بێت . دایکیشی پێی ناخۆش بوو بەو حاڵەوە کوڕەکەی ببینێ .. سەیری دەوروبەری کرد نزیك‌ترین گردۆڵکە لێ‌یەوە گردی صەفا بوو .. خۆی گەیاندە سەری .. لەوێوە سەیرێکی دۆڵەکەی کردەوە تا بزانێ کەسێك ئەبینێ ؟ سەیری کرد و کەسی نەدیی .. کە کەسێکی نەدیی دابەزییە خوارەوە ،

تا کە گەیشتە لای چەمەکە گۆشەیەکی کراسەکەی بەرز کردەوە ، پاشان وەك ئادەمیزادێکی زۆر ماندوو هەوڵی دا و لە چەمەکە کردیە ئەوبەر ، پاشان خۆی گەیاندە سەرگردی دووهەم ، گردی مەڕوە و لەسەری وەستا و سەیری کرد بزانێ کەسێك ئەبینێ ؟ دیسان کەسی نەدیی .. حەوت جار ئەمەی دووبارە کردەوە ..
ئیبن عەبباس خوا لێیان رازیی بێ وتوویە : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( فذلك سعي الناس بينهما )) . فەرمووی : هات و چۆی حاجی‌یان بۆ سەر صەفا و مەڕوە بەو بۆنەوەیە .. بەڵام لەو کاتەدا کە لەسەر مەڕوە بوو دەنگێکی بەرگوێ کەوت .. جووڵەی لە خۆی بڕیی .. هەتا بە خۆی وت : بێ‌دەنگ .. چاك گوێی گرت .. دیسان دەنگەکەی بیستەوە و وتی : ئەگەر یارمەتی‌یەکت بەلاوە هەیە یارمەتییمان بدە . سەیری کرد وا مەلائیکەتێك لە شوێنی زەمزەم‌دا بە پێی یان بە باڵی خەریکی هەڵدانەوەی خۆڵەکەیە هەتا ئاو دەرکەوت ..
هاجەرە خاتوون لە خۆشی‌یانا خەریك بوو باڵی ئەگرتەوە .. هەڵمەتی دا و حەوزی بۆ ئاوەکە بە دەستی دروست ئەکرد و بە مشت ئاوی دەرئەهێنا و ئەی‌کردە ناو کوندەکەیەوە و خێرا ئاوی تر ئەهاتەوە شوێنی .
ئیبن عەبباس ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( يرحم اللهُ أمَّ إسماعيل ، لو تركت زَمزَم ـ أو قال : لو لم تغرفْ من الماء ـ لكانت زمزم عيناً معيناً )) .
فەرمووی : رەحمەتی خوا لە دایکی ئیسماعیل ، ئەگەر وازی لە زەمزەم بهێنایە ، یان بە مشت لێی هەڵ نەگۆزیایە ، ئەوا کانی‌یەك بوو و لە بەری ئەڕۆیشت ..
هاجەرە خاتوون لە زەمزەم تێر ئاوی خواردەوە و شیری دا بە کوڕەکەی . مەلائیکەتەکەش پێی وت : لە تیاچوون مەترسن .. ئا لێرەدا شوێنی ماڵی خوایە و ئەم منداڵە لەگەڵ باوکی‌دا دروستی ئەکەنەوە و ، خوایش کەسانێك کە دۆستی خۆی و دینەکەی بن فەرامۆشیان ناکات و ئەیانپارێزێ ..
هەروا مانەوە و ئاوی زەمزەم لە جیاتیی ئاویش و لە جیاتیی نانیشیان بوو هەتا ئەوەبوو دوای ماوەیەك کۆمەڵێك لە هۆزی جورهومی دووهەم ، کە هۆزێکی یەمەنیی بوون ، هاتن و لە باشووری مەککەدا باریان خست .. کە سەرنجیان دا باڵندەیان دیی کە بە ئاسمانەوە ئەخولایەوە ، وتیان : ئەو باڵندەیە بەسەر ئاودا ئەسووڕێتەوە . ئێمەش ئەو شیوەمان دیی‌بێ ئاومان تیایا نەدیوە . بۆ ئەمە یەك

دوو پیاویان نارد و ئەوانیش سەیریان کرد ئاو هەیە . گەڕانەوە و هەواڵیان دانێ کە ئاو هەیە ، ئەوانیش هاتن و ، دایکی ئیسماعیلیش لەسەر ئاوەکە وەستابوو . وتیان : ماوەمان ئەدەی لێرە لەلاتان بار بخەین ؟ وتی : بەڵێ ، بەلاّم لەم ئاوەدا مافێکتان نیە . وتیان : بەڵێ .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( فألفى ذلك أم إسماعيل وهي تحب الأنسَ )) . فەرمووی : دایکی ئیسماعیل ئەمەی پێ خۆش بوو چونکە پێی خۆش بوو خەڵکیی ببنە هاودەمی . ئیتر لەوێ باریان خست و ناردیان بەدوای کەس وکاریاندا . کە ئەوانیش هاتن و چەند خانوویەکیان دروست کرد و ، منداڵەکە واتە ئیسماعیل گەورە بوو و لێیانەوە فێری زمانی عەرەبیی بوو ، هەروەها فێری تیروکەوان بوو . کە ژیریی و سەلیقەی زیادی کرد دڵی چووە سەر هەڵس‌وکەوتیان و ئەوانیش ئافرەتێکیان لێ مارە بڕیی و ، دوای ماوەیەکیش دایکی ئیسماعیل کۆچی دوایی کرد .

لەم ماوەیەدا بەینا و بەین ئیبراهیم خەلیل سەری لە مەککە ئەدا و ئیسماعیل و دایکی بەسەر ئەکردەوە .. تا ئەوەبوو لە یەکێ لەو سەردانانەیدا لە خەویدا فەرمانی پێ کرا تا ئیسماعیلی نازداری سەر ببڕێ . ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ئیسماعیل پێ‌گەیشتبوو و ئەشی‌توانیی یارمەتیی باوکی بدات . دیارە وەك لە فەرموودەی شەریفیش‌دا هاتووە خەوی پێغەمبەران وەحی خواییە و ، ئیبراهیمیش هیچ گومانێکی لە خەوەکەی نەبوو ، بەلاّم جێ‌بەجێ‌کردنی ئەم فەرمانە بەستراوە بە ئیسماعیل‌یشەوە . بۆیە پەلەی نەکرد و لە دڵی خۆیدا هێشتیەوە .. ئەوەبوو لە شەوی دووهەمیش‌دا هەمان خەوی بینی‌یەوە .

ئەڵێن خەوی یەکەم شەو لە شەوی هەشتەمی مانگی ( ذي الحجة )دا بووە و ناوی نراوە ( يوم التروية ) ، هەندێکی تریش ئەڵێن : ( يوم التروية ) بەو هۆیەوە ناونراوە کە حاجی‌یەکان لەو رۆژەدا بەر لەوەی بۆ بەجێ‌هێنانی کاروباری حەج دەرچن ، ئاو لەگەڵ خۆیان ئەبەن ..

ئەڵێن : خەوی دووهەم جاریش لە شەوی نۆهەمی مانگی حاجی‌یان‌دا بووە بۆیە ناونراوە بە رۆژی عەرەفە .

هەندێکی تریش ئەڵێن : بۆیە ئەو رۆژە ناونراوە بە رۆژی عەرەفە ، لەو رۆژەدا ئادەم و حەوواء ، دوای دابەزینیان لە بەهەشتەوە ، لەسەر زەویی‌دا یەکتریان دۆزیوەتەوە .

ئەوەبوو لە شەوی سێ‌هەم‌دا بۆ سێ‌هەم جار ئیبراهیم خەوەکەی بینی‌یەوە و ، گەیشتە قەناعەتی تەواو کە پێویستە گوێڕایەڵیی فەرمانی پەروەردگار بکات و ئیسماعیلی ئازیزی سەر ببڕێ و ، بەوپەڕی دامەزراوی‌یەوە دان بە خۆی‌دا بگرێ . بەڵام وای بە چاك زانیی ئەم کارە بێ‌پرس ئەنجام نەدات .. پێویستە رای ئیسماعیل‌یش وەربگرێت ، چونکە هەر خۆی بەندەی خوا نیە ، بەڵکو ئیسماعیل یش بەندەی خوایە و، پێویستە گوێڕایەڵیی و مل‌کەچیی ئەویش بۆ فەرمانی خوا دەربکەوێ ..

کە ئیبراهیم باسەکەی بۆ ئیسماعیل روون کردەوە ئیسماعیلی کوڕپە و نازدار ئەوپەڕی رەزامەندیی بۆ فەرمانەکەی خوا نواند و ، ئەشی‌زانیی باوکی لەسەر حەقە و هەر بڕیارێك بدات لە خۆیەوە نیە ، بەڵکو هەموو هەڵس و کەوتێکی بە پێی رەزامەندیی خوایە ، بۆیە رووی کردە باوکی و فەرمووی :

﴿ قَالَ يَـٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ ( الصافات : ١٠٢ ).

خەلیل دەستی کوڕەی تاقانەی گرت و بەرەو شوێنی سەربڕینی قوربانیی لە مینا کەوتنە رێ .. لەوێ ئازیزی خۆشەویستی خست بە دەم‌دا و ، دەستی دایە چەقۆ تا بە راستیی قوربانیی بۆ پەروەردگار بکات .. تا جگەرگۆشەی دڵ خۆشکەری سەردەمی پیریی خۆی سەربڕێ .. تەمەنیشی نزیکی صەد ساڵیی بۆتەوە .. بە تەما نیە جارێکی تر کوڕێکی تری ببێ .. چەقۆی تیژی هێنا بەسەر ملی ئیسماعیل‌دا کەچیی نەی‌بڕیی ..

پەردە لا درا تا دانیشتوانی زۆر و زەبەندەی ئاسمان ، کە ئەوەندە زۆرن کرچە کرچیان بە ئاسمان خستووە و خەریکە بڕووخێ ، سەیر بکەن ..

با مەلائیکەتەکان سەیری دیمەن بکەن ..

با سەیری گوێڕایەڵیی و بەندایەتیی بکەن ..

با سەیری پیاوێکی بەساڵاچووی خواناسی ریش‌سپیی بکەن ، کە بەوپەڕی ئارامیی و بیر و هۆشەوە چەقۆی ناوەتە ملی کوڕەی ئازیزی تا بۆ فەرمان بەرداریی خوا سەری ببڕێ ..

بـــا ســـەیری رۆڵـــەی گـــوێدێر بکـــەن وا گوێڕایـــەڵی فـــەرمانی خـــوا و پێغەمبەرەکەیەتی .. دەستی لەم ژیانە فانی‌یـە هـەڵ گرتـووە بـە هیـوای دەسـت خسـتنی ژیـانی نەبـڕاوەی قیامەت ..

کە چەقۆی خستە سەر ملی ئیسماعیل و نەی‌بڕیی ، لە ئاسمانەوە بـانگ کـرا : ئیبراهیم ! فەرمانی خەوەکەت جێبـەجێ کـرد و گوێڕایـەڵیی خۆتـت نوانـد ، وا بڕیارەمان دا لە جیاتیی سەربڕینی ئیسماعیل بەرانێکی قەڵەو ـ کە بـۆت ئاسـان بێ ـ پەیدا بکە و بی‌کە بە قوربـانیی . خێـرا ئیـبراهیم دەسـت و پـەلی کۆرپـەی شیرینی کردەوە .. گەڕا بۆ بەرانێکی قەڵەو تا سەری بـبڕێ .. سـوپـاسی خـوای گـەورەی کـرد لەسـەر ئـەم میهرەبانی‌یـە .. ئـیتر لـەو رۆژەوە موسـڵمانان ئـەم قوربانی‌یە لەو کاتەدا ئەنجام ئەدەن و بۆتە کارێکی گرنگ لە ژیانی موسڵمانان‌دا ..

بەم شێوەیە ئیبراهیم و ئیسماعیل بوونە نـموونەی بەندایـەتیی مەردایـەتیی و گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانی خوا ، تا هەموو موسڵمانێك تا ئاخرزەمان بیان‌کاتە سەر مەشقی خۆی :

﴿ وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَىٰ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَادَيْنَاهُ أَن يَا إِبْرَاهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴾ ( الصافات : ٩٩ ـ ١١١ ) .

ئیبراهیم و ئیسماعیل لە تاقیی‌کردنـەوە گەورە سـەختەکەدا بـە سـەرکەوتنەوە دەر چوون .. سەلماندیان کە بەنـدەی راسـتەقینەی خـوان .. دوای ئـەوە ئیـبراهیم گەڕایەوە بۆ شام .. دوای ماوەیەك کە تەمەنی ئیـبراهیم لـە صـەد سـاڵیی نزیـك بووبوویەوە کۆمەڵێك لە مەلائیکەتی خوای گەورە لایان دایە لای ئیبراهیم خـەلیل و بوونە میوانی و وایان ئەزانی ئادەمیزادن .. ئەمانە فەرمانیان بەسەردا درا بـوو بچن ناوچەی سەدووم کە قەومی لووطی تیا دەژیان وێرانی بکەن بەسەر کافرەکـان دا و ئیمان‌داران سەرفراز بن .. ئیبراهیم خێرا گوێرەکەیەکی قەڵەوی بـۆ هێنـان و

سەری بڕیی و گۆشتەکەی لەسەر بەردی بە ئاگر سوورەوەکراو برژاند بۆیان ، کەچیی لێیان نەخوارد .. ئیبراهیم ترسی لێ نیشت ، بەڵام مەلائیکەتەکان دڵ خۆشییان دایەوە و ، هەواڵیشیان دایە کە ئەو کارەیان لە ئەستۆدایە و ، مژدەشیان بە سارە خاتوون دا کە لەو تەمەنە زۆرەی خۆی و ئیبراهیمی هاوسەریدا خوای گەورە بڕیاری داوە کە منداڵێکی زانایان پێ ببەخشێ ، کە ئەویش ئیسحاقە و ئەویش کوڕێکی ئەبێ بە ناوی یەعقووب . ئەوەبوو سارە خاتوون سەری سووڕ ئەما و لە خۆشیانا دەستی بە پێکەنین کرد :

﴿ قَالُواْ لَا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴾ ( الذاريات : ٢٨ ) .

﴿ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴾ . ( هود : ٧٠ ـ ٧١ ) .

﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ ( الصافات : ١١٢ ) .

سارە خاتوون سەری سوڕ ئەما ، چونکە نە خۆی و نە مێردەکەی تەمەنیان لەوە تێپەڕیوە کە تازە منداڵیان ببێ ، بەڵام مەلائیکەتەکان دەریان بڕیی کە ئەمە فەرمان و بڕیاری خوایە و سەرسوڕمانی ناوێ :

﴿ قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓاْ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴾ ( هود : ٧٢ ـ ٧٣ ) .

هەروەها ئیبراهیمیش سەری سوڕ ئەما لەم مژدەیە : ﴿ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِى عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِىَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُواْ بَشَّرْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴾ ( الحجر : ٥٤ ـ ٥٦ ) .

ئەوەبوو سارە خاتوون سکی پڕ بوو بە ئیسحاقەوە و ئەویش یەعقووبی کوڕی پێ بەخشرا کە باوکی یووسف و یانزە براکەیەتی و باوکی هەموو پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیلە لە نێوان یووسف و عیسادا سەلامی خوا لە هەموویان بێت .

بەینا و بەین ئیبراهیم سەری لە مەککە ئەدا ، ئەوەبوو دوای ماوەیەك دایکی ئیسماعیل کۆچی دوایی کرد و ئیسماعیلیش لە هۆزی جورهوم ژنی هێنا . دوای ژن هێنانی ئیسماعیل ئیبراهیم سەردانی مەککەی کرد و سەردانی ماڵی

ئیسماعیلی کرد تا لە بارودۆخی ژیان و گوزەرانیان ئاگادار بێ . ئەوەبوو ئیسماعیل لە ماڵ نەبوو .. هەواڵی لە هاوسەرەکەی پرسیی ، ئەویش وتی : چۆتە دەرەوە رزق و رۆزییمان بۆ پەیدا بکات .. لەو ماوەیەدا ئیسماعیل خەریکی راوکردن بوو .. پاشان ئیبراهیم خەلیل هەواڵی ژیان و گوزەرانی لە بووکەکەی پرسیی ، ئەویش وەهای دەربڕیی کە ژیان و گوزەرانیان ناخۆشە و لەوپەڕی دەست کورتیی و نارەحەتییدان . وەك بڵێی ناشوکریی دەر بڕیی ..

فەرمووی : ئەگەر مێردەکەت هاتەوە سەلامی منی پێ بگەیەنە و ، پێی بڵێ با لاشیپانی دەرگاکەی بگۆڕێ .

کاتێك ئیسماعیل هاتەوە هەستی بەوە کرد کە کەسێك هاتۆتەماڵیان . دڵی خەبەری دا ، بۆیە پرسیی : ئایا هیچ کەسێك هاتۆتە ماڵمان ؟ هاوسەرەکەی وتی : بەڵێ ، پیاوێکی پیری وەها و وەها هاتە ماڵمان . پرسیاری تۆی لێمان کرد، منیش هەواڵم دایە و ، پرسیاریشی دەربارەی ژیان و گوزەرانمان کرد . منیش هەواڵم دایە کە لە دەستکورتیی و نارەحەتییداین . فەرمووی : ئایا هیچ ئامۆژگارییەکی کردی ؟ وتی : بەڵێ .. فەرمانی بەسەرمدا دا تا سەلامی ئەوت پێ بگەیەنم و ، ئەی وت : لاشیپانیی دەرگاکەت بگۆڕە .

ئیسماعیل تێگەیشت کە ئەو پیاوە باوکی بەڕێزی بووە و ، بەو ئامۆژگارییەش فەرمانی بەسەردا داوە ئەو ژنەی تەڵاق بدات . بۆیە بە ژنەکەی راگەیاند کە بچێتەوە ماڵی کەس و کاری و تەڵاقی دا .. دوای ئەوە ژنێکی تری لێ خواستن .[9]

چەندێ خوا ویستی لەسەر بوو ئیبراهیم لە شام مایەوە ، پاشان هاتەوە بۆ سەردانی ئیسماعیل و ئەم جارەش لە ماڵەوە نەبوو .. چووە ژوورەوە لای هاوسەرەکەی و پرسیاری ئیسماعیلی لێ کرد .. وتی : لە ماڵ دەرچووە تا رزق و رۆزییمان بۆ پەیدا بکات . فەرمووی : ئەی حاڵتان چۆنە ؟ هەروەها پرسیاری ژیان و گوزەرانیانی لێ کرد . وتی : ژیان و گوزەرانمان باشە و ، سوپاسی خوای گەورەشی کرد . فەرمووی : خۆراکتان چییە ؟ وتی : گۆشت . فەرمووی : ئەی خواردنەوەتان ؟ وتی : ئاو . فەرمووی : خوایە ! فەڕ و بەرەکەت بخەرە گۆشت و ئاویانەوە .

---

[9] ئەم ژنەی کچی ( مضاض ) ی کوڕی عەمر بووە ، کە سەرداری هۆزی جورهوم بووە .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :
(( ولم یکن لهم یومئذ حبٌّ ، ولو کان لهم دعا لهم فیه )) .
فەرمووی : ئەو رۆژە ئەوان دانەوێڵەیان نەبوو ، خۆ ئەگەر بیانبوایە دوعای بەرەکەتی بۆ ئەویش ئەکرد .
ئیبراهیم فەرمووی : ئەگەر مێردەکەت هاتەوە سەلامی منی پێ بگەیەنە و ، فەرمانی منیشی پێ راگەیەنە تا لاشیپانی دەرگاکەی بچەسپێنێ .
کە ئیسماعیل هاتەوە فەرمووی : ئایا کەسێك هاتۆتە ئێرە ؟ وتی : بەڵێ ، پیاوێکی ریش‌سپیی رێك و پێك هاتە ماڵمان .
ژنەکە ستایشی ئیبراهیمی کرد پاشان وتی : دەربارەی تۆش پرسیاری لێ کردم و منیش هەواڵم دایە و ، لە بارەی ژیان و گوزەرانیشمانەوە پرسیاری لێ کردم و منیش هەواڵم دایە کە ئێمە باشین . فەرمووی : ئەی هیچ ئامۆژگاری‌یەکی کردی ؟ وتی : بەڵێ ، ئەو سەلامی لێ ئەکردی و ، فەرمانی بەسەرتدا ئەدا تا لاشیپانی دەرگاکەت بچەسپێنی .
فەرمووی : ئەوە باکم بووە و تۆش لاشیپانەکەی ، فەرمانی بەسەرمدا داوە تا راگیرت بکەم .
ئەوەندەی کە خوا ویستی لەسەر بوو ئیبراهیم لە شام مایەوە ، پاشان هاتەوە بۆ مەککە و دیتی وا ئیسماعیل لەژێر درەختێکی گەورەدا نزیك بە زەمزەم خەریکی نووك‌دادانی تیرە ، کە چاوی بە باوکی کەوت لەبەری هەستایەوە و بەوپەڕی تاسەوە هەڵمەتیان دا و باوەشیان بە یەك‌دا کرد و یەکیان ماچ کرد .. پاشان فەرمووی : ئیسماعیل ! خوای گەورە فەرمانێکی بەسەرمدا داوە . فەرمووی : پەروەردگارت چ فەرمانێکی بەسەرتدا داوە ئەنجامی بدە . فەرمووی: تۆش یارمەتییم ئەدەی ؟ فەرمووی : یارمەتییت ئەدەم .
فەرمووی : خوای گەورە فەرمانی بەسەرمدا داوە تا لێرەدا خانوویەك بۆ خواپەرستیی بینا بکەم ، ئاماژەشی بۆ شوێنێك کرد کە کەمێ بەسەر دەوروبەریدا بەرز بوو .
بە کۆمەکیی خوا دەستیان کرد بە بینا کردن : ئیسماعیل بەردی ئەهێنا و باوکیشی دیواری ئەنا .. تا کە بیناکە بەرز بوویەوە ، بەردە رەشەکەی هێنا و

خستیه سەر دیوارەکە و لەسەری وەستا . ئەو لەسەر دیوارەکەوە دیواری ئەنا و ئیسماعیلیش بەردی بە دەستیەوە ئەدا :

﴿ وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ ﴾ ( البقرة : ١٢٧ ) .

لەو کاتەدا کە خەریکی بیناکردنی کەعبە بوون ، بیریان لەوە ئەکردەوە ئەمان بۆ خوا کار ئەکەن .. هیچ مەبەستێکی دنیایی لە دڵیانا حەشار نەدرا بوو .. زۆریان پێ خۆش بوو خوای پەروەردگار رازیی بکەن .. پێیان خۆش بوو بانگی تەوحید بڵاو بکەنەوە . بۆیە لەگەڵ کارکردن‌دا ئەپاڕانەوە تا خوا ئەم کارەیان لێ وەربگرێ :

﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ ( البقرة : ١٢٧ ).

هەروەها پاڕانەوە خوای گەورە ئیمانیان پێ ببەخشێ و بە دوو موسڵمانی مل کەچیان بگێڕێ و ، لە نەوەکانیشیان ئومەتێکی موسڵمانی بۆ خوا مل‌کەچ پەروەردە بکات و ، لە دین شارەزایان بکات و ، تەوبەیان لێ وەربگرێ :

﴿ رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسۡلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ ( البقرة : ١٢٨ ) .

پاشان دوعایەکی تریان ئەکرد .. لە خوای گەورە ئەپاڕانەوە کە لەو ئومەتە موسڵمانە پێغەمبەرێك هەڵ بخات تا فەرمایشتی خوایان بۆ بخوێنێتەوە و قورئان و حیکمەتیان فێر بکات و پەروەردەیان بکات :

﴿ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولاً مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ ( البقرة : ١٢٩ ) .

خوای گەورە ئەم پاڕانەوەیەی لەو دوو بەندە خواناسە وەرگرت و ، ئومەتی موحەممەدی بە دەستی پێغەمبەری ئاخرزەمان پێ گەیاند و ، مەککەش ئەو پیرۆزی‌یەی دەست کەوت و تا ئاخرزەمانیش جاڕدانەکەی ئیبراهیم هەر دەنگ ئەداتەوە و ، ئیمان‌داران بەرەو مەککەی پیرۆز کەمەندکێش ئەکات .

خوای گەورە فەرمانی بەسەر ئیبراهیم‌دا دا تا بە هیچ شێوەیەك شەریك بۆ خوا بڕیار نەدات .. فەرمانی دا کەعبەی پیرۆز بۆ حاجی‌یان و خواناسان لە هەموو شیرك و بت‌پەرستی‌یەك پاك بکاتەوە :

﴿ وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ ٱلْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴾ ( الحج : ٢٦ ) .

هەروەها فەرمانی بەسەردا دا تا جاڕ بدات و گرۆی ئادەمیی ئاگادار بکات کە خوای گەورە حەجی ماڵی خوای لەسەر ئیمانداران فەرز کردووە و هەرکەسێ توانای هەیە با حەج بکات :

﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴾ ( الحج : ٢٧ ) .

هەروەها ئیبراهیم سەلامی لێ بێ لە خوا پاڕایەوە تا کەعبە و دەوروبەری بە وڵاتێکی هێمن بگێڕێ و رزق و رۆزیی بە ئیمانداران ببەخشێ :

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَاتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ ( البقرة : ١٢٦ ) .

ئەم پاڕانەوەیەی خەلیل پێش دروست کردنی کەعبە بوو ، ئەو کاتەی کە هاجەر و ئیسماعیلی بەجێ هێشتن . بەڵام دوای دروست بوونی شاری مەککە و بنیات نانەوەی کەعبە بەم شێوەیە پاڕایەوە تا ناوچەی مەککە بە وڵاتێکی پڕ لە ئاسایش بگێڕێ و خۆی و وەچە و بەرەکانیشی لە بتپەرستیی بپارێزێ :

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴾ ( إبراهيم : ٣٥ ) .

خوای گەورەش نزا و پاڕانەوەکانی ( خليل الرحمن ) گیرا کردن و ئاواتەکانیشی بۆ هێنایە دیی :

﴿ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَاكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴾ ( البقرة : ١٢٥ ) .

کە ئیبراهیم و ئیسماعیل سەلامیان لێ بێ کەعبەیان بینا کرد جیبریل هات هەموو کاروبارێکی حەج و خواپەرستیی پیشانی ئیبراهیم دا و ، فەرمانیشی بەسەردا دا تا جاڕ بدات تا خەڵکیی بانگ بکات .

ئیبراهیم سەری سوڕ ئەما ، چۆن جاڕ بدات ؟ دەنگی ئەو بە کوێ ئەگات ؟ بۆیە پرسیاری لە پەروەردگاری کرد کە خوایە دەنگی من بە کوێ ئەگات ؟ خوای گەورەش وەڵامی دایەوە : ئەی ئیبراهیم تۆ جاڕ بدە و منیش ئەیگەیەنم ..

ئەمەیە نهێنیی بانگەوازی خوا ..

هەرکەسێ بە دڵێکی پاك و نییەتێکی صافەوە بیەوێ خزمەتی دینی خوا بکا، با بە پێی توانای خۆی هەوڵ بدا و ، چاوەڕوانی بەرەکەتی خوا بێت ..

ئیبراهیم جاڕی دا .. هەتا ئێستاش و هەتا ئاخرزەمانیش دەستە دەستە و پۆل پۆل ساڵانە ئیمانداران ئەچن بە دەم جاڕەکەی ئیبراهیمەوە و حەجی ماڵی خوا ئەکەن .. ئیتر لەو کاتەوە ئیمانداران دەستبەرداری کەعبە نەبوون ..

بەڵێ بە فەرمانی خوا ، ئیبراهیم چووە سەر کێوی ( ئەبوقوبەیس ) و جاڕی دا : خەڵکینە ! خوای گەورە حەجی لەسەرتان فەرز کردووە ، دە بێن حەج بکەن . ئەوەبوو هەرچیی ئادەمیەك خوای گەورە بڕیاری دابوو گیانی بکات بە بەردا ، لە پشتی پیاوان و لە رەحەمی ئافرەتاندا ، هەرچیی ئیماندار بوو تا رۆژی قیامەت و ، لە عیلمی ئەزەلیی خوادا نووسرابوو کە حەج بکات هەر هەموویان وەڵامیان دایەوە : ( لبیك اللهم لبیك ) .

بەڵێ ئیبراهیم و ئیسحاق و خاتوو سارەی دایکی لە ( بیت المقدس )ەوە هاتن بۆ مەککە و حەجیان کرد ..

دوای ئەوەی کە ئیبراهیم کەعبەی پیرۆزی بنیات نا بە فەرمانی خوا گەڕایەوە بۆ شام تا لەوێش ( بیت المقدس ) بینا بکات . هەندێکیش ئەڵێن : ( بیت المقدس ) یەعقووب بینای کردووە . ئەوەندە هەیە کەعبە چل ساڵ پێشتر بینا کراوە .

لە ئەبوذەڕڕەوە خوا لێی رازیی بێ ئەگێڕنەوە کە وتوویە : وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! چ مزگەوتێك یەکەم جار لەسەر زەوییدا بینا کراوە ؟ فەرمووی : ( المسجد الحرام ) . وتم : پاشان کامی تر ؟ فەرمووی : ( المسجد الأقصى ) . وتم : چەند ساڵ بەینیان هەیە ؟ فەرمووی : (( أربعون سنة ، وأينما أدركتك الصلاة فصلِّ فهو مسجد )) .[١٠] فەرمووی : چل ساڵ . لە هەر کوێیەکیش دا بوویت و کاتی نوێژ هاتە بەرەوە نوێژەکەت بکە ، ئەوە مزگەوتە ..

---

[١٠] رواه البخاري ومسلم .

ئیسماعیل لەو ژنە جورهومیە دوانزە کوڕی بوون کە ئەمانەن : نابت ، قیدار ، أدبائیل ، مبشام ، مشماع ، دوما ، میشا ، حدد ، یتما ، یطور ، نفیس ، قیدمان . ئەم دوانزە کوڕە دوانزە هۆزیان لێ کەوتەوە کە تا ماوەیەك هەر هەموویان لە مەککەدا مانەوە و ، زۆربەی ژیان و گوزەرانیان بریتیی بوو لە بازرگانیی لە وڵاتی یەمەنەوە بۆ وڵاتی شام و میصر . پاشان ئەم هۆزانە لە دوورگەی عەرەبیی‌دا بڵاوەیان کرد ، بگرە هەندێکیان لە دوورگەش چوونە دەرەوە .. ئیتر بەرە بەرە ناو و دەنگ و باسیان گوم بوو جگە لە منالەکانی نابت و قەیدار .

قەیداری کوڕی ئیسماعیل بە خۆی و منداڵەکانیەوە لە مەککە مانەوە هەتا لە وەچە و بەرەی ئەو عەدنان و مەعدی کوڕی پێ‌گەیشتن .. ئیتر لەوێوە ئەوانەی لەوان کەوتنەوە ناویان لێ ئەنرا عەرەبی عەدنانیی ..

بەڵێ بەناوبانگ‌ترین نەوەی ئیسماعیل عەدنانە کە باپیری بیست و یەکەمی پێغەمبەری نازدارمانە ﷺ .

زانایانیش بە لێکۆڵینەوەی ورد گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامە کە بە چل پشت عەدنان بە ئیبراهیم پێغەمبەری باپیری ئەگاتەوە .

مەعد کوڕێکی بوو بە ناوی نزار ، کە هەندێك وای ئەگەیەنن ئەو نزارە تاقانە بووە . نزاریش چوار کوڕی بوون ، کە چوار هۆزی گەورەیان لێ کەوتەوە . ئەو چوار کوڕەش ئەمانە بوون : ئیاد ، ئەنمار ، رەبیعە ، موضەر ، کە ئەم دوانەی دواوەیان لق و وەچیان زۆر بوو و نەوەی زۆریان لێ کەوتنەوە . ئەوەبوو لە رەبیعە ئەسەد و ، عەنەزە و ، عبدالقیس و ، بەکر و ، تەغلیب و ، حەنیفە کەوتنەوە و ، موضەریش بەش بوو بە دوو کەرتی گەورەوە : قەیس عەیلانی کوڕی موضەر و ، چەند لقێکی ئیلیاسی کوڕی موضەر ، لە قەیس عەیلان بەنو سولەیم و ، بەنو هەوازین و ، بەنوغەطەفان کەوتنەوە ، کە لە غەطەفانیش عەبس و ذیبیان و ئەشجەع و غونەی کوڕی ئەعصەر کەوتنەوە .

لە ئیلیاسی کوڕی موضەریش تەمیمی کوڕی موڕڕە و ، هوذەیلی کوڕی مودریکە و ، بەنو ئەسەدی کوڕی خوزەیمە و ، چەند لقێکی کینانەی کوڕی خوزەیمە کەوتەوە و ، لە کینانەش قوڕەیش کەوتەوە .

قورەیشیش بەش بوون بە چەند هۆزێکەوە کە گرنگ‌ترینیان جومەح و ، سەهم و ، عەدیی و ، مەخزووم و ، تەیم و ، زوهرە و ، لقەکانی قوصەی کوڕی کیلابن کە بریتین لە عبدالداری کوڕی قوصەی و ، ئەسەدی کوڕی عبدالعزی ی کوڕی قوصەی و ، عەبدمەنافی کوڕی قوصەی .

عەبدمەنافیش چوار پارچەی لێ کەوتەوە : عەبدشەمس و ، نەوفەل و ، موطەللیب و ، هاشم .. پێغەمبەری ئازیزیشمان لە بنەماڵەی هاشم‌دا هەڵبژێررا کە کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموطەللیبی کوڕی هاشم بوو . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە :

(( إن الله اصطفى من ولدِ إبراهيم إسماعيل ، واصطفى من ولد إسماعيل كنانة، واصطفى من بني كنانة قريشاً ، واصطفى من قريش بني هاشم واصطفاني من بني هاشم )) [11] .

فەرموویە : خوای گەورە لەناو ڕۆڵەکانی ئیبراهیم‌دا ئیسماعیلی هەڵبژارد و ، لەناو ڕۆڵەکانی ئیسماعیلیش‌دا کینانەی هەڵبژارد و ، لەناو ڕۆڵەکانی کینانەش‌دا قورەیشی هەڵبژارد و ، لەناو قورەیشیش‌دا بەنی هاشمی هەڵ بژارد و ، لەناو بەنی هاشمیش‌دا منی هەڵبژارد.

هەروەها لە عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیبەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە :

(( إن الله خَلَقَ الخلْقَ فجعلني مِن خيرِ فِرَقِهِم وخيرِ الفريقين، ثم تَخَيَّرَ القبائل ، فجعلني من خير القبيلة ، ثم تخير البيوت فجعلني من خير بيوتهم ، فأنا خَيرُهُم نفساً وخيرهم بيتاً )) [12] .

ئەم فەرموودەیەش دەری ئەبڕێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاکترین مرۆڤە و ، بنەماڵەکەشی چاک‌ترین بنەماڵەیە و ، هۆزەکەشی چاک‌ترین هۆزە .

کە نەوەکانی عەدنان زۆر بوون و لە مەککەدا جێیان نەئەبوویەوە ، بە هەموو لایەکی وڵاتی عەرەب‌دا بڵاوەیان لێ کرد .. بەدوای ئاو و لەوەڕدا ئەگەڕان ..

ئەوەبوو ( عبدالقيس ) و چەند لقێکی بەکری کوڕی وائیل و ، چەند لقێکی تەمیم بەرەو بەحرەین کۆچیان کرد و لەوێ نیشتەجێ بوون .

---

[11] رواه مسلم عن واثلة بن الأسقع ، باب فضل نسب النبي ﷺ : ٢ / ٢٤٥ والترمذي : ٢ / ٢٠١ .

[12] رواه الترمذي ، باب ما جاء في فضل النبي صلى‌الله عليه وسلم : ٢ / ٢٠١ .

ئەوەی حەنیفەش بەرەو یەمامە کەوتنە رێ و لە حیجر ، کە شارۆچکەی یەمامە بووە ، نیشتەجێ بوون و ، پاشماوەی لقەکانی بەکری کوڕی وائیلیش لە سەرانسەری ناوچەی نێوان یەمامە و بەحرەین و کاظمە تا دەریا و کەناری سوادی عیراق تا ئوبوللە ، تا هیت .

تەغلیب یش لە جەزیرەی فوراتدا نیشتەجێ بوون و ، بەنو تەمیمیش لە بیابانی بەصرەدا نیشتەجێ بوون .

بەنو سولەیمیش لە نزیك مەدینەدا ، هەر لە ( وادي القرى ) وە هەتا خەیبەر و خۆرهەلاتی مەدینە نیشتەجێ بوون .

ثەقیفیش لە طائیف و، هەوازین یش لە خۆرهەلاتی مەککەدا نیشتەجێ بوون .

بەنو ئەسەدیش لە خۆرهەلاتی تەیماء و ، خۆرئاوای کووفەدا نیشتەجێ بوون .

ذیبیان یش لە نزیك تەیمائەوە تا حۆران نیشتەجێ بوون .

چەند بنەماڵەیەکی کینانەش لە توهامەدا ئەژیان و ، چەند بنەماڵەیەکی قورەیشیش لە مەککە و دەوروبەریدا ئەژیان ، بەلام یەکجار بێ سەروبەر بوون و بە هیچ شێوەیەك یەکیان نەئەگرت ، تا ئەوەبوو قوصەی لەناویاندا هەلْ کەوت و کوێ کردنەوە و کردنیە هۆزێکی پایەداری خاوەن رێز و، پلە و پایەی بەرز کردنەوە .[13]

---

[13] الرحيق المختوم : ١٦ ـ ١٩ .

# بەشی دووهەم
# حکوومەتەکانی عەرەب
## پێش هاتنی ئیسلام

لە دوورگەی عەرەبیی‌دا دوو جۆر نیشتەجێبوون هەبوو :

١ ـ **بیابان نشینان** : ئەمانە لە بیابان‌دا ئەژیان و بەدوای لەوەڕدا هەردەم لە گەڕان و هاتوچۆدا بوون .. لە هەر کوێ ئاو بوایە لەوێ باریان ئەخست .. ئەمانە لە چادردا ئەژیان ، کە لە موو و خوریی ئەچنران .. زۆربەی دانیشتوان بەم جۆرە ئەژیان بە تایبەت لە باکووردا : حیجاز و نەجد و توهامە .

٢ ـ **شارنشینان** : ئەمانە لە شار و گوندەکان‌دا ئەژیان و خانوویان لە خشت یان بەرد دروست ئەکرد . زۆربەی ئەمانە لە باشووردا لە ناوچەی یەمەن و دەوروبەری و ، لەسەر سنوورەکانی ولاتی رۆم و فارس ئەژیان .

ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە لە دوورگەی عەرەبیی‌دا لە دێرین زەمانەوە چەندەها شارستانیەتی رەسەن دامەزراون کە ئەمانە بەناوبانگەکانیانن :

**یەکەم : شارستانیێتیی سەبەء لە ولاتی یەمەن‌دا :**

لە چەندین شوێن‌دا قورئانی پیرۆز دەری بڕیوە کە لە ولاتی عەرەب‌دا شارستانیێتیی و ئاوەدانیی و پێش‌کەوتن و خۆش‌گوزەرانیی بووە . بۆ نموونە : لە ولاتی یەمەن‌دا کەڵکیان لە ئاوی باران و لافاو وەرگرتووە بەوەی کە بەنداویان بە شێوەیەکی ئەندازەیی رێك و پێك دروست کردووە ، کە گرنگ ترینیان بەندی مەئرەب بووە کە بە ئاوەکەی جۆرەها سەوزە و میوە و باخ و باخاتیان پێ دێراوە و بەروبوومی نایابیان بەدەست هێناوە :

﴿ لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ ۖ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ ۖ كُلُوا۟ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥ ۚ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا۟ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُوا۟ ۖ وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴾ ( سبأ : ١٥ ـ ١٧ ) .

هەروەها قورئانی پیرۆز دەری بڕیوە کە لەو چەرخە دێرینانەدا لە نێوان یەمەن و حیجاز و شام‌دا شاری گەورە گەورە بوون و ، هەر کاروانێك ئەکەوتە رێ ، بە درێژایی ئەو رێیە شوێنی حەسانەوە و نان و ئاویان دەست ئەکەوت و پەکیان نەئەکەوت :

﴿ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ ٱلْقُرَى ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَٰهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ سِيرُوا۟ فِيهَا لَيَالِىَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا۟ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ ( سبأ : ١٨ ـ ١٩ ) .

**دووهەم : شارستانێتیی عاد لە ناوچەی ئەحقاف :**

هەروەها لە باکووری حەضرەمەوت‌دا و لە ناوچەی ئەحقاف‌دا هۆزی عاد ئەژیان .. ئەو هۆزەی کە خوای گەورە هوود پێغەبەری سەلامی لێ بێ بۆ ناردن . ئەمانە لە زانست‌دا پێشکەوتوو بوون و خاوەنی خانوو و باڵاخانە و کارگەی هەمە چەشن و باخ و باخات و کشتوکاڵ و کانیاو بوون :

﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِىٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَٰمٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴾ ( الشعراء : ١٢٣ ـ ١٣٤ ) .

**سێهەم : شارستانێتیی ثەموود لە حیجاز :**

لە وڵاتی حیجریش‌دا کە قەومی ثەموود تیایا نیشتەجێ بوو بوون ، شارستانییەتێك بەرپا بوو بوو . ئەمانیش دارای لێهاتن و توانایەکی بێوێنە بوون ، کە ئەیان‌توانیی لە چیاکان‌دا خانوو هەڵ بکۆڵن و ، بۆ پێگەیاندنی باخ و باخات و سەوزە و میوە کەڵك لە کانیاوەکان وەربگرن :

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ

وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾ ( الشعراء : ١٤١ ـ ١٥٠ ) .

﴿ وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِنْ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِنْ سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا فَاذْكُرُوا آلَاءَ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾ ( الأعراف : ٧٤ ) .

ئەم شارستانیانە ماوەیەکی زۆریان خایاند و دوایی ئەوانیش تیا چوون ، هەروەکو نەبووبن . ئەو خەڵکە هەر هەموو رۆیشتن و دنیایان بەجێ هێشت و ، هەر یەکە کردەوەکانی خۆی ـ چ چاك و چ خراپ ـ بە کۆڵەوە گرت و بەرەو بارەگای خوا کەوتە رێ ..

دیارە ـ وەك پسپۆڕان لێی کۆڵیونەتەوە ـ دوورگەی عەرەب لە دێرین زەماندا ناوچەیەکی بە پیت بووە و ئاو و هەوای وەك ئێستە وشك و بێ باران نەبووە ، بۆیە دوای گۆڕانی ئاو و هەوای و دروست بوونی ئەو بیابانە وشکانە ، خەڵکەکەی ناچار بوون وڵات بەجێ بهێڵن و بەرەو ئەو ناوچانە بکەونە رێ کە ئاو و هەوایان لە بارە بۆ ئاوەدان کردنەوە و بەرپاکردنی شارستانییەت . شایانی باسە کە پسپۆڕان ئەم وشکیی و بێ بارانیی یە ئەگێڕنەوە بۆ هەزاری دووهەمی پێش زایین ..[14]

ئێستاش با بێینە سەر باسی حکومەتەکانی عەرەب :

کاتێك کە خۆری ئیسلام هەڵ هات کاربەدەستانی دوورگەی عەرەب ئەکران بە دوو بەشەوە :

بەشێکیان پادشای خاوەن تەخت و تاج بوون ، هەرچەندە بە تەواوەتیی سەربەخۆ نەبوون و هەمیشە ناچار بوون پاڵ بە یەکێ لە دەوڵەتە گەورەکانەوە بدەن .

بەشەکەی تریشیان ئەو سەرۆك هۆز و عەشرەتانە بوون کە وەك پادشاکان دەسەڵات دار بوون و ، زۆربەشیان سەربەستیی تەواویان هەبوو و ، هەندێکیشیان پاشکۆی پادشایەکی خاوەن تەخت و تاج بوون ، جا تەنها پادشاکانی یەمەن و غەساسینە و مەنازیرە پادشای تاجدار بوون .[15]

---

[14] السيرة النبوية لمحمد بن محمد أبـي شهبة : ١ / ٤٩ ـ ٥٢ .

[15] الرحيق المختوم : ٢٠ .

شایانی باسە کە لە ناوچەکانی وڵاتی عەرەبدا یاسای هۆزایەتیی باو بوو ، هەتا لە حکوومەتی پادشاکانیشدا .. بۆیە هەموو ئەرك و مافێك بەو پێیە دیاریی ئەکرا . هۆزیش سەرۆکێکی هەبوو کە پێیان ئەوت ( سید ) یان ( شیخ ) هەندێ جاریش ( أمیر ) یان ( ملك ) .

هەڵبژاردنی ئەم سەرۆکەش بە پێی لێهاتن و سیفەتی جوانی وەك ئازایەتیی و پیاوەتیی و سەخاوەت بوو .. خۆ ئەگەر کوڕی ئەو سەرۆکە دارای ئەو سیفەتانە بوایە ئەوا دوای باوکی ئەبووە سەرۆکی هۆز ، ئەگینا کەسێکی تری نزیکی لێهاتووی سەرۆك هەڵ ئەبژێررا ..

سەرۆك هۆز مافی ماددیی و مەعنەویی بەسەر هۆزەکەیەوە هەبوو .. مافی مەعنەویی ئەوەبوو رێزی لێ بگیرێ و ، بەدەم فەرمانیەوە بچن و ، هەر بڕیارێکی دەرکرد جێبەجێی بکەن . مافی ماددییشی بریتیی بوو لەوەی کە لە غەنیمەتدا چارەکی پێ بدرێ و ، پێش دابەشکردنی غەنیمەتیش هەر شتێکی بۆ خۆی جیا کردەوە پێی بدرێ کە پێی دەوترێ ( صفایا ) هەروەها ( نشیطە )ش بۆ ئەو بێ کە بریتییە لە دەستکەوتەکانی دوژمن بەر لەوەی بچن بە گژیا ، هەروەها ( فضول ) کە بریتییە لەو شتانە کە بۆ دابەشکردن ناشێن .

بەرامبەر بەم مافە زۆرانە سەرۆکی هۆز ئەرکی زۆریشی لە ئەستۆدا بوون . ئەبوا لە کاتی ئاشتییدا پیاوێکی بەخشندەی سنگ فراوان بێت .. رێز لە میوان و، نوێنەر و ، رێبوار بگرێ و ، فریای دەست کورتانی هۆز بکەوێت و ، پەنای پەناهەندە بدات . لە کاتی جەنگیشدا خۆی پێش سوپا بکەوێت و لە هەموو کەس پاڵەوانتر بێت و خۆی لێپرسراوی جەنگ و ئاشتیی و پەیمانبەستن بێت .

کورتەکەی سەرۆکی هۆز چاوساغی ئەو هۆزەیە و ، دوای راوێژکردن بە پیاوماقووڵانی دەوروبەری لە جیاتیی هۆزەکە بیر ئەکاتەوە و بڕیار ئەدا .. جا لەبەر ئەوەی کە هیچ دەسەڵاتێکی دەرەکیی دەستی بەسەر هۆز و سەرەك هۆزدا نەکێشاوە ، ئەوا هەموو ئەندامێك تامی سەربەستیی و ئازادیی ئەکات و ، پیاوانە رای خۆی دەرئەبڕێت و بە هیچ شێوەیەك ستەم قبووڵ ناکات ..

لە هەمان کاتدا لەبەر ئەوەی تەنها پشت بە هۆزەکەیان ئەبەستن ئەوا ئەوپەڕی کۆمەکیی هۆزەکەی ئەکات و ، شانازیی پێوە ئەکات و ، پشتگیریی لە هەموو

ئەنـدامێکی هۆزەکەی ئەکات ، ئیتر سا لەسەر ڕاستیی بێ یان لەسەر هەڵە ، بـە ڕادەیەك کە دروشمی : ( أنصر أخاك ظالماً أو مظلوماً ) بوو بووە دروشمیان .

لەناو عەرەبەکان دا ئەندامانی هۆز لە سێ چین پێك هاتبوون :

١ ـ **چینی ئازادەکان** : ئەمانە ڕۆڵـەی ڕاستـەقینەی هۆزەکـەن کـە لـە پشـت و ڕەچەڵەك دا یەکیان گرتووە . ئەمانە نـاوکرۆکی هۆزەکـەن و ، خـاوەنی مـافێکی یەکجار زۆرن و ، ئەرکی گرانیش لە ئەستۆیان دایە .

٢ ـ **چینی مەوالیی** : ئەمانە عەرەبن و ئازادیشن یان ئازاد کراون و ، هاتوونەتە پاڵ هۆزەکە ، سا بە هاوپەیمانیی یان بە پەناهەنـدەیی . ئەمانـە هەنـدێ مـاف و هەندێ ئەرکیان لە ئەستۆدایە .

٣ ـ **چینی بەنـدەکان** : ئەمانـە یـەکجار بێمـاف و بێکەسـایەتیی بـوون ، لـە بارودۆخێکی یەکجار خراپ و دژواردا ئەژیان ، بە ڕادەیەك کە ئاغـا بـۆی هـەبوو ئەو بەندەیە بکوژێت . ئەمانە یا بە کڕین هێنرابوون یان دیلی جەنگ بوون .

کە ئیسلام هات گەیشتە فریای ئەم چینە داماوە و ڕێی بۆ ئازادکردنیان خۆش کرد ، تا ببنەوە بە خاوەنی ماف و ڕێز و حورمەتی شایستە بە ئادەمیزاد ..[16]

**پادشایەتیی یەمەن :**

کۆن‌ترینی ئەو گەلانەی کە لە عەرەبی عاریبە لە یەمەن دا ناسرا بـێ قـەومی سەبەء بوون . ئەمانە خاوەنی موڵك و دەسەڵاتێکی گەورە بـوون و ، لـە هونـەری ئەندازەدا ئەوپەڕی وردەکاریی‌یان بەکار ئەهێنا ، بۆیە توانای بنیات نـانی بەنـدی گەورەیان هەبوو بۆ کۆکردنەوەی ئاوی لافاو بۆ کاتی پێویستیی . گەورەترینی ئـەو بەندانە بەندی مەئرەب بوو .

یانزە صەدە پێش زایین شارستانێتیی سەبەء گەیشتە ئەوپـەڕی پێشـکەوتن و ، بوونە خاوەنی دەسەڵات و توانـای زۆر و دەوروبەریشـیان هێنایـە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیانەوە .

لە صەدەکانی پێش ساڵی ٦٥٠ پ . ز پایتەختیان لە شاری ( صرواح ) بـوو کە ئەمڕۆ ناوی ( خريبة ) یە و ئەکەوێتە لای خۆرئاوای شاری مەئرەبەوە و ، لـەو سەردەمەدا بەندی مەئرەب دروست کرا . ئەمەش بە بۆنەی ئەوەوە کـە بـارانێکی زۆر لە وڵاتی یەمەن دا ئەباریی و بە جارێك ئەڕژایە دەریاوە و هیچ کـەڵکێکی لێ

---

[16] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٦٠ ـ ٦٢ .

وەرنەئەگیرا جگە لە کاتی بارینەکەی . سەبەئیش بووبوونە خاوەنی زانست و هونەر و دەسەڵاتێکی زۆر . بۆیە لە نێوان دوو چیادا کە خەریك بوو لە یەك بدەن ، بەندێکی یەکجار گەورەیان دروست کرد و چەند دەرگایەکیان بۆ دروست کرد تا ئاویان لێوە دەرچێت . بەمە رووبەری زەویی و زاری کشتوکاڵیان زۆر کرد و ، لە ساڵێك‌دا لە جارێك زیاتر کشتوکاڵیان ئەکرد . هەروەها بەم بەنداوانە مەترسیی لافاویان لە گوند و شاری سەر رووبارەکان کەم ئەکردەوە و ، کێڵگە کشتوکاڵی‌یەکانیش بی‌ئاوەی نەبوون .. بەمە دەست‌هاتیان زۆربوو و وڵات پڕ لە خێر و بەرەکەت بوو و ، ژیان و گوزەرانی خەڵکەکەش خۆش بوو ..

لە سەردەمی زێڕینی سەبەء دا نازناوی پادشاکانیان ( مکرب سبأ ) بوو ، بەڵام لە نێوان ساڵانی ٦٥٠ پ . ز هەتا ١١٥ پ . ز نازناوی پادشاکانیان گۆڕیی بۆ پادشایانی سەبەء و ، پایتەختیشیان گواستەوە بۆ مەئرەب کە ئێستە شەصت میل وا لە خۆرهەڵاتی شاری ( صنعاء )دا .

گەورەترین و ناودارترین پادشای سەبەء خاتوو بەلقیس بووە کە قورئان باسی لەگەڵ سولەیمان پێغەمبەردا سەلامی لێ بێ کردووە و ، دەریش ئەکەوێ کە خەڵکی یەمەن لەو کاتەدا خەریکی پەرستنی خۆر بوون ، بەڵام زۆر بەهێز و بەدەسەڵات بوون و ، خاوەنی زانستێکی فراوان بوون ، هەتا بەلقیسی پادشا خاوەنی تەختێکی یەکجار مەزن بووە .

دوای لاوازبوونی دەوڵەتی سەبەء هۆزی حیمیەر دەسەڵاتی پەیدا کرد ، ئەمەش لە نێوان ساڵانی ١١٥ پ . ز . هەتا ٣٠٠ ز . لەم سەردەمەدا پایەتەخت لە مەئرەب گوازرایەوە بۆ شاری ( ریدان ) و ناوی ریدان یش گۆڕا بۆ ( ظفار ) و ئەمرۆ کەلاوەکانی ئەو شارە لەسەر چیایەکی خڕن لە نزیك ( یریم ) . لەم سەردەمەدا دەوڵەت بەرەو لاوازبوون رۆیشت و ، تا رادەیەکی زۆر بازرگانی‌یان شکستی هێنا ، ئەویش بە بۆنەی دەست گرتنی نەبطی‌یەکان بەسەر باکووری حیجازدا و ، پاشانیش دەست‌گرتنی رۆمانەکان بەسەر رێگا ئاوی‌یەکانی بازرگانیی‌دا ، ئەمەش دوای ئەوەی کە رۆمەکان میصر و شام و باکووری حیجازیان داگیرکرد و ، لە لایەکی تریشەوە ناکۆکیی نێوان هۆزەکان خۆیان .

بەڵێ کە سەبەئی‌یەکان لاواز بوون هۆزی حیمیەر دەسەڵاتیان پەیدا کرد و دەوڵەتیان دامەزراند .

له دوای ساڵی ٣٠٠ ز ئاژاوه و پشێویی رووی کرده وڵاتی یەمەن و ، جەنگی ناوخۆ دەستی پێ کرد ، تا سەرەنجام بێگانە تەماعیان کردە یەمەن . ئەوەبوو لەو سەردەمەدا رۆمان دابەزییە عەدەن و ، بە کۆمەکیی رۆمان ئەحباش لە ساڵی ٣٤٠ ز توانییان بۆ یەکەم جار وڵاتی یەمەن بگرن ، ئەویش بە هەل وەرگرتن لە بەرابەرکێی نێوان هەمدان و حیمیەر . ئەوەبوو تا ساڵی ٣٧٨ ز یەمەنیان بە دەستەوە بوو ، پاشان یەمەن سەربەخۆیی وەرگرتەوە .

جا تا حکوومەت دەسەڵاتدار بوو بە باشیی خزمەتی بەندی مەئرەب و بەندەکانی تری ئەکرد . هەرلایەکی بڕووخایە خێرا چاك ئەکرایەوە . بەڵام کە دەوڵەت لە رۆژانی دوا دوایی‌دا لاواز بوو نەی‌دەتوانیی وەك جاران خزمەت بکات ، لەبەر ئەوە بەندەکان لاواز بوون و بەرگەی لافاوی توندی زستانی سەختیان نەئەگرت ، ئەوەبوو بە یەك جار بەندی مەئرەب هەرەسی هێنا و لافاوێکی یەکجار گەورە و سامناك دروست بوو و هەموو گوند و شارێکی بەردەمی خۆی رامالیی و، بووە مایەی کاول‌بوونی وڵات .

قورئانی پیرۆزیش باسی ئەوەی کردووە کە لە ئەنجامی لادانی خەڵکەکە لە رێبازی خوا و پشت هەڵکردنیان لە فەرمانی خوا ، خوای گەورە بەڵای بۆ ناردن . لافاوی بۆ ناردن تا ئەوەبوو ئاو بەندەکانی راپێچ کردن و ئەو هەموو ناز و نیعمەتەیان لێ سەندرایەوە و ، رزق و رۆزی‌یان کەم بوویەوە ، ئەویش لە ئەنجامی کوفر و لادان :

﴿ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴾ ( سبأ : ١٦ ـ ١٧ ) .

ئەمەش لە ساڵی ٤٥٠ یان ٤٥١ ز .

بەڵێ بە هۆی لافاو و غەزەبی زۆرەوە ، بە تایبەت رووخانی بەندی مەئرەب هەندێ لە هۆزەکانی یەمەن کۆچیان کرد و لە سەرانسەری دوورگەدا بڵاوەیان کرد ..

یەکێ لە پادشاکانی دەوڵەتی حیمیەریی ناوی ذونواس بوو کە شوێن دینی یەهوود کەوتبوو و هێرشێکی نارەوای کردە سەر نەصرانی‌یەکانی ( نجران ) و هەوڵی دا بە زۆر لە نەصرانییەت وەریان گێڕێ . جا کە کۆڵیان نەدا و لەسەر

دینی خۆیان دامەزراو بوون ، چاڵی بۆ هەڵکەندن و ئەو چاڵانەی پڕ لە ئاگر کردن و ئیمان دارەکانی ئەهاویشتنە ناو ئەو ئاگرەوە ، هەروەك قورئانی پیرۆز لە سوورەتی ( البروج ) دا و فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەیان بۆی کردووە . ئەمەش لە ساڵی ٥٢٣ ز دا بوو .[١٧]

جا لەسەر ئەم کارە نامەردانەیە ئیمپراتۆری رۆمان بە سەرکردایەتیی خۆی هەڵمەتی هێنایە سەر وڵاتی عەرەب و ، ئەحباشیان هەڵ نا و ، کەشتیگەلی دەریاییان بۆیان ئامادە کرد و ، حەفتا هەزار سەرباز لە حەبەشەوە هێرشیان هێنا و ، بە سەرکردایەتیی ئەریاط لە ساڵی ٥٢٥ ز بۆ دووهەم جار یەمەنیان داگیرکردەوە و ذونواس یش کە تێك شکانی خۆی بەلاوە مسۆگەر بوو خۆی لە ئاودا نوقوم کرد و خنکا .

هەروا ئەریاط بە کاربەدەستی یەمەن مایەوە ، تا ئەوەبوو ئەبرەهە ـ کە یەکێ بوو لە فەرماندەکانی سوپاکەی ـ کوشتی و خۆی کردە کاربەدەست تا پادشای حەبەشەی ئاشت کردەوە و لێی رازیی بوو .

دوای ئەوەی کە ئەبرەهە رقی لە کەعبە هەڵسا و بە لەشکرەکەیەوە بەرەو مەککە کەوتە رێ و خوای گەورە لە ناوی برد ، یەمەنییەکان پەنایان بردە بەر فارس تا بگاتە فریایان .

ئەوەبوو یەکێ لە شازادەکانی حیمیەر ، بە ناوی ( سیف بن ذي یزن ) رای کردە لای پادشای فارسەکان و داوای کۆمەکیی کرد دژی ئەحباش ، ئەویش بە سەرکردایەتیی ( وهرز ) سوپایەکی نارد و پێکەوە لەگەڵ سەیف یەکیان گرت بۆ تێك شکاندنی ئەحباش ، کاتێ کە سەرکەوتنیان بە دەست هێنا کیسرا فەرمانی دا تاج لەسەر سەیف بکرێت و ببێتە پادشای یەمەن . بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو سەیف بە دەستی ئەو ئەحباشانەی کە بە شێوەی بەندە بۆ خۆی هێشتبوونیەوە ، کوژرا ، وتووشیانە بە دەست کیسەی فارسەکان کوژراوە . دوای ئەوە کیسرا کاربەدەستێکی فارسیی کردە ئەمیری یەمەن و یەمەن بووە ویلایەتێکی فارسیی . هەر بەو شێوە یەك لە دوای یەك کاربەدەستانی فارسەکان حوکمی یەمەنیان ئەکرد ، هەتا ئەوەبوو دوا حاکمیان پیاوێك بوو بە ناوی باذان .

---

[١٧] ئەو فەرموودەیەی کە لە کتێبی ( لەگەڵ خواناساندا ) هێناومانە لەگەڵ ئەم باسەدا جیاوازە ، بەڵام ئەگونجێ ئەم جۆرە سزادانە بە ئاگر لە چەند کات و شوێنێك دا رووی دابێ .

کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ نامەی نارد بۆ کیسرا تا موسڵمان ببێ ، پادشای ئێران تووڕە بوو و نامەکەی دڕاند و ، فەرمانی دا بە باذان کە پیاو بنێرێ تا پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەست و پەل بەسراویی بەرن بۆی بۆ وڵاتی فارس . کە جووتە پیاوەکە گەیشتنە مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی دانێ کە کیسرا بە دەستی کوڕەکەی کوژراوە کە فەرمووی : (( إن ربي قتل ربكم في ليلة كذا )) . دوو پیاوەکە گەڕانەوە لای باذان و هەواڵەکەیان پێ دا ، دوای ماوەیەك هەواڵی کوژرانی کیسرایان بۆ هات . ئیتر ئەوە بوو لە ساڵی ٦٣٨ ز باذان موسڵمان بوو و حوکم و دەسەڵاتی فارسەکان لە یەمەن کۆتایی پێ هات ..

لە ( الرحيق المختوم ) دا لە جیاتی ( سيف ) ناوی ( معديكرب ) ی کوڕی هاتووە .[١٨]

**مەملەکەتی ئەنباط :**

هەروەها لە باکووری دوورگە دەوڵەتی ئەنباط بەرپا بوو ، کە بریتیی بوون لە چەند هۆزێکی بیابان‌نشین و لە خۆرهەڵاتی ئەردەنەوە بەرەو خوار کشا بوون بۆ باشووری سووریا . بەمە دەوڵەتێکیان بەرپا کرد کە لە باکوورەوە لە غەززەوە دەستی پێ ئەکرد تا عەقەبە لە باشوور . ئەمانە لەسەر رێگای بازرگانیی نێوان باکوور و باشوور بوون و کەڵکیان لێ وەرئەگرت و ، پایتەختی وڵاتەکەشیان شاری ( البتراء ) بوو ، کە تا ئێستاش شارێکی بەناوبانگی وڵاتی عەرەبە و ، لە سەردەمی خۆیاندا لە بیناسازیی‌دا یەکجار پێش کەوتبوون ، کە ئێستا شوێنەواری ئەو دەست رەنگینی‌یەیان هەر ماوە ، بە تایبەت کەلاوەکانی ئەو پەرستگایەی کە بتەکانی تێدا بووە و ، تا ئێستاش کۆڵەکە بەرزەکانی هەر ماون و شاهێدی توانا و دەسەڵات و لێهاتنی ئەو سەردەمەن .[١٩]

**پادشایەتیی حیرە :**

دوای ئەوەی کە ( قوورش ) ی فارسیی ( ٥٥٧ ـ ٥٢٩ پ . ز ) فارسەکانی یەك پێ گرتن و دەوڵەتێکی بەهێزی بەرپا کرد ، کە هیچ کەس نەتوانێ دژایەتی‌یان بکات ، ئەو فارسانە دەسەڵاتیشیان بەسەر عێراق و دەوروبەری‌دا ئەڕۆی . هەر وا مانەوە تا ئەوەبوو ئەسکەندەری مەکدۆنیی هێرشی بەرەو

---

[١٨] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٦٢ ـ ٦٧ ، والرحيق : ٢٠ ـ ٢٢ .
[١٩] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٦٧ .

خۆرهەلاّت هێنا و لە ساڵی ٣٢٦ پ . ز توانیی دارای یەکەمی پادشای فارس تێك بشکێنێ و دەوڵەتی فارس پارچە پارچە بکات و ، هەر ناوچەیەك بکەوێتە دەست پادشایەك کە بە پادشاکانی ( الطوائف ) ئەناسران . هەروا تا ساڵی ٢٣٠ ز حوکمی ولاّتیان ئەکرد . لەو سەردەمەدا هۆزەکانی قەحطان لە یەمەنەوە کۆچیان کرد و بەشێك لە ناوچەی عیراقیان داگیرکرد و ، دوای ئەوانیش هەندێ هۆزی عەدنانییش کۆچیان کرد و لە ناوچەی ( الجزیرة ) ی فوراتدا نیشتەجێ بوون .

لە سەردەمی ئەردەشیری پادشای فارسدا ، کە دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانیی بووە لە ساڵی ٢٢٦ ز ، فارسەکان هێز و دەسەلاّتیان پەیدا کردۆتەوە و فارسەکانی یەك پێگرتوون و ئەو ناوچانەشی داگیر کردووە کە لە سنووری ولاّتەکەیدا عەرەبەکان دەستیان بەسەریانا گرتبوو . بەم بۆنەوە هۆزی قوضاعە کۆچیان بۆ شام کرد ، بەلاّم دانیشتوانی حیرە و ئەنبار ملیان بۆ شای ئێران کەچ کرد ..

لە سەردەمی ئەردەشیردا کاروباری حیرە و هۆزەکانی تری رەبیعە و موضەریش لە بیابانی عیراق و جەزیرەدا بە دەست جوذەیمەی وەضضاح بوو . لێرەدا ئەردەشیر بە ژیریی و سەلیقەی خۆی بیری کردەوە کە دەوڵەتەکەی ئەو توانای ئەوەی نیە راستەوخۆ حوکمی ولاّتی عەرەب بکات و ، توانای ئەوەشی نیە هێرشی ئەو عەرەبانە پەرچ بداتەوە کە هێرش ئەکەنە سەر سنووری ولاّتەکەی ، بەڵکو وا چاکە کەسێك لە خۆیان کە دڵسۆزی فارس بێ بکاتە کاربەدەستیان تا ئەوان مل کەچیی بۆ بکەن و ، لە هەمان کاتدا لە دژی پادشاکانی رۆمان بە کاریان بهێنێ . چونکە ئێران زۆر لە رۆمان ئەترسان و ، رۆمەکانیش غەسسانییەکانیان دژی ئێران بەکار ئەهێنا . واتە فارس عەرەبی عیراقی دژی عەرەبی شام بەکار ئەهێنا و ، هەمیشە کەتیبەیەکی لە سوپای فارس لە حیرە ئەهێشتەوە ، تا هەرکەسێ لە حیرە هەڵ بگەڕێتەوە بیان دات بە گژیانا ، ئەوەبوو لە دەوروبەری ساڵی ٢٦٨ ز جوذەیمە مرد .

دوای جوذەیمە عەمری کوڕی عەدیی کوڕی نەفری لەخمیی ـ کە یەکەم پادشای لەخمییەکان بوو ـ بووە پادشای حیرە ، کە ئەوکاتە کیسرا سابووری کوڕی ئەردەشیر پادشای ئێران بوو .. یەك لە دوای یەك پادشایانی لەخمیی کاروباری حیرەیان بەڕێوە ئەبرد تا ئەوەبوو کیسرا قوبادی کوڕی فەیرووز کاروباری ئێرانی

گرته دەست . لەو کاتەش دا بیروباوەڕی مەزدەك سەری هەڵ دا .. مەزدەك پیاوێکی گومڕای گومڕاکەر بوو .. بانگی دەرپێ تێکەڵیی و بێشەرمیی هەڵ دا .. کۆمەڵێك شەروالْ پیسی بێئەخلاق شوێنی کەوتبوون بۆ ئەوەی دەستدرێژیی بکەنە سەر نامووسی خەڵکیی ، ئەمەش بە ناوی ئازادیی سێکسەوە . قوبادی پادشاش کە لەوپەڕی ڕەوشت نزمیی‌دا بوو شوێن بانگی مەزدەك کەوت و ئەی‌پاراست . پاشان قوباد ئەی‌ویست ئەو بێڕەوشتی‌یە پەرە پێ بدات ، ئەوەبوو ناردی بۆ لای پادشای حیرە کە ئەو کاتە ( منذر بن ماء السماء ) بوو ، تا ئەویش شوێن مەزدەك بکەوێ و جاڕی بێڕەوشتیی بدات و وەك دین شوێنی بکەوێ . بەڵام پادشای حیرە ئەمەی بە لاوە سووك بوو و ، نەی‌توانی بە گوێی قوباد بکات . قوبادیش رقی لێ هەڵگرت و لەسەر کار لای برد و ، حاریثی کوڕی عەمری کوڕی حیجری کیندیی ، کە شوێن بیروباوەڕە سووکەکەی قوباد کەوتبوو ، لە جێی مونذیردا کردە پادشای حیرە .

دوای قوبادی مەزدەکیی کیسرا نەوشیروان بووە پادشای ئێران ، کە زۆر رقی لە مەزدەك و مەزهەبەکەی بوو . پێش هەموو شتێك مەزدەکی گرت و کوشتی ، دوای ئەوەش کۆمەڵێك لەوانەی کە شوێن ئەو بێڕەوشتی‌یەی مەزدەك کەوتبوون گرتنی و کوشتنی .. هەروەها مونذیری کردەوە بە کاربەدەستی حیرە و ، هەوڵیشی دا حاریث دەست گیر بکات ، کەچیی لە دەستی دەرچوو و خۆی گەیاندە لای هۆزی ( کەلب ) و لەوێ مایەوە هەتا مرد ..

دوای مونذیر پادشایەتیی کەوتە دەست وەچە و بەرەکانی هەتا کەوتە دەست نوعمانی کوڕی مونذیر ، کە ئەوەبوو بە هۆی کارێکی دەستهەڵبەستەوە ، کە زەیدی کوڕی عەدیی عوبادیی هەڵی بەستبوو ، کیسرا لە نوعمان تووڕە بوو و ناردی بە دوای‌دا .[20] نوعمان بە نهێنیی خۆی گەیاندە لای هانیءِ کوڕی مەسعوود کە سەرداری شەیبان بوو ، کەس‌وکار و ماڵ و سامانەکەی لای ئەو بە سپاردە دانا و ، خۆی بەرەو پایتەختی ئێران کەوتە رێ . کیسرا فەرمانی دا بەندیان کرد و لە بەندیخانەدا مایەوە هەتا مرد .. لەولاوە ئیاسی کوڕی قەبیصەی

[20] ئەڵێن : کیسرا ویستوویەتی نوعمان یەکێ لە کچەکانی یان خوشکەکانی لە کیسرا یان لە منداڵەکانی مارە بکات ، کەچیی نوعمان بێزی نەهاتووە بیداتێ . ئیتر کیسرا تووڕە ئەبێ و نوعمانیش را ئەکات بەڵام ئەی‌گرێ و لە بەندیخانەدا ئەمرێ . ( السيرة النبوية لأبي شهبة ) .

طائیی لە جێی نوعمان کردە کاربەدەستی حیرە و ، فەرمانیشی بەسەریا دا تا بنێرێ بۆ لای هانیء کوڕی مەسعوود و فەرمانی بەسەردا بکات تا چیی سپاردەی نوعمانی بە لاوەیە تەسلیمی بکات . هانیء خۆی بە پیاو ئەزانیی و بە نامەردیی ئەزانیی کە سپاردەکەی نوعمان بداتە دەست دوژمنانی . بۆیە نەیدان بە دەستەوە . پادشا تووڕە بوو و لەشکرێکی گەورەی نارد بۆ ئیاس تا بچێت بە گژ هۆزی شەیبان‌دا ..

هۆزی شەیبانیش مەردانە پشت‌گیریان لە سەردارەکەیان کرد و ، لەسەر رەوشتێکی جوان خۆیان ئامادەی جەنگێکی سەروماڵیی کرد .. بە غیرەتێکی ناوازەوە شەیبان چوونە مەیدانەوە .. ئەوەبوو جەنگێکی ناهەموار لە ( ذي قـار ) دا رووی دا و سەرەنجام بەنوشەیبان سەرکەوتن و لەشکرە زۆر و زەبەندەکەی فارس تێك شکا ، بەڵام چۆن تێك شکانێك . ئەمەش یەکەم جار بوو کە عەرەب پشتی فارس بدەن بە زەوییدا .. ئەمەش بە ماوەیەکی کەم دوای لەدایك‌بوونی پێغەمبەر ﷺ ، چونکە کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ لەدایك بوو ، ئیاسی کوڕی قەبیصە هەشت مانگ بوو بووبووە کاربەدەستی حیرە .

دوای ئیاس کیسرا حاکمێکی فارسیی کردە کاربەدەستی حیرە و ، لە ساڵی ٦٣٢ ز پادشایی گەڕایەوە بۆ لەخمی‌یەکان و ، مونذیر کە پێی ئەوترا مەعروور بووە پادشا و تەنها هەشت مانگ کاری بە دەست بوو ، ئەوەبوو سوپای موسڵمانان بە سەرکردایەتیی خالیدی کوڕی وەلید گەیشتە ناوچەکەیان و کۆتایی بە حوکمی مەناذیرە هێنا .[21]

**پادشایەتیی شام :**

لەو سەردەمەدا کە هۆزە عەرەبەکانی یەمەن ناچاری کۆچ کردن بوون ، چەند تیرەیەکی قوضاعە خۆیان گەیاندە دەوروبەری شام و لەوێ نیشتەجێ بوون . ئەمانە لە نەوەی سولەیح ی کوڕی حەلوان بوون ، کە بەشێکیان نەوەی ضەجعەمی کوڕی سولەیح بوون . ئەمانە رۆمان بۆ قەدەغەکردنی عەرەب لە لاساریی و ، بۆ دژایەتیی فارسەکان بەکاری ئەهێنان و ، پادشای بۆ دیاریی ئەکردن . بەناوبانگ‌ترین پادشاشیان زیادی کوڕی هەبوولە بووە .. سەردەمی حوکمڕانیی ئەم هۆزە لە سەرەتای صەدەی دووهەمی

[21] الرحيق المختوم : ٢٢ ـ ٢٣ .

زایینەوە تا کۆتایی ئەو صەدەیە بووە . ئەوەبوو غەسسانییەکان هاتن و کاروباریان لە دەستی ضەجاعمەکان سەند و ، بەسەریاندا زاڵ بوون .

غەسسانییەکان لە هۆزی جەفنە بوون و رۆم کردنیە پادشای شام و بنکەیان لە ( دومة الجندل ) بوو . [22] ناودارترین پادشایان حاریثی کوڕی جەبەلە و ، مونذیری کوڕی جەبەلە و ، جەبەلەی کوڕی ئەیهەم بوون . هەروا کاریان لە دەستدا بوو تا ساڵی ١٣ ی کۆچیی هاتە بەرەوە و سوپای موسڵمانان لە یەرمووكدا توانیی شکستیی بکاتە بەشی سوپای مل‌هوڕی رۆم و ، ناچار دوا پادشای غەسسانییەکان ، کە کوڕی ئەیهەم بوو ، ملی بۆ ئیسلام کەچ کرد و موسڵمان بوو، ئەمەش لە سەردەمی خەلیفە عومەردا خوا لێی رازیی بێ .

جەبەلە موسڵمان بوو و خەریکی طەوافی کەعبە بوو پیاوێکی موسڵمان نەیزانیی پێی نا بە ئیزارەکەی جەبەلەدا ، ئەویش کە ئاوڕی لێ دایەوە زللەیەکی توندی لە موسڵمانەکە دا و ، کابرا چوو بۆ لای خەلیفە بۆ شکات . عومەریش ویستی سزای جەبەلە بدات لەسەر ئەم کردەوە نەگونجاوەی . کەچیی جەبەلە هەڵات و خۆی گەیاندە وڵاتی رۆم و چووە سەر ئاییینی گاوران و لەوێ مایەوە هەتا مرد . [23]

**حوکمڕانیی حیجاز :**

ئیسماعیل پێغەمبەر سەلامی لێ بێ بە درێژایی تەمەنی سەرۆکایەتیی مەککە و سەروکاریی ماڵی خوای لە دەستدا بوو . کاتێکیش کە کۆچی دوایی کرد تەمەنی صەد و سیی و حەوت ساڵ بوو و ، دووان لە کوڕەکانی ، نابت ، پاشان قەیدار ، کاروباریان بەڕێوە ئەبرد . پاشان دوای ئەوان باپیریان مەضاضی کوڕی عەمری جورهومیی کاروباری مەککەی گرتە دەست ، بەمە سەرۆکایەتیی مەککە کەوتە دەست باپیریان و هەروا لە دەستیاندا مایەوە و ، منداڵەکانی ئیسماعیل یش خاوەنی پایە و پلەی بەرز بوون ، بە بۆنەی ئەوەوە کە باوکیان کەعبەی بنیات نابوو ، بەڵام کاروباری حوکم هیچیان لە دەستدا نەبوو .

رۆژان رابووردن و رۆڵەکانی ئیسماعیل کارێکی ئەوتۆیان لە دەستدا نەبوو ، هەتا گەیشتە سەردەمی عەدنان . لەبەر لێهاتوویی عەدنان ناوبانگی دەرکرد . شایانی باسە کە بەختەنەصر دووجار هێرشی هێناوەتە سەر وڵاتی عەرەب . لە

[22] هەندێك ئەڵێن : ( جوللەق ) واتە دیمەشق پایتەختیان بووە . ( السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٦٨ ).
[23] الرحيق المختوم : ٢٤ والسيرة النبوية : ١ / ٦٨ .

هێرشی یەکەمدا لە ( ذات عرق ) جەنگ رووی داوە . بەڵام لە هێرشی دووهەمدا، کە لە ساڵی ٥٨٧ پ ز بووە رۆڵەکانی عەدنان پەرژ و بڵاو بوونەتەوە و بەرەو یەمەن رۆیشتوون ، بەڵام ( برمیاه ) پێغەمبەر مەعدی بردووە بۆ شام ، جا کە دەسەڵاتی بەختەنەصر کز ئەبێت مەعد ئەگەڕێتەوە مەککە و ئەبینێ لە جورهوم تەنها جورشومی کوڕی جەلهەمە ماوە ، ئیتر مەعد مەعانەی کچی جورشوم مارە ئەکات و نزاری لێ ئەبێت .

جورهوم بەرە بەرە کەوتنە لاساریی و کاری ناشیرین ، وەك ستەم کردن لەوانەی سەردانی کەعبەیان ئەکرد و ، دەستیان بۆ ماڵ و سامانی کەعبە درێژ ئەکرد . ئەمەش عەدنانی‌یەکانی تووڕە ئەکرد .. جا کاتێك کە خوزاعە لە ( مرالظهران ) ی نزیك مەککە نیشتەجێ بوون و لەوە گەیشتن کە عەدنانی‌یەکان جورهومیان خۆش ناوێن ، ئەمەی بە هەل زانی لەگەڵ چەند تیرەیەکی عەدنانی‌یەکان دا - کە نەوەی بەکری کوڕی عەبدمەنافی کوڕی کینانە بوون - دژی جورهوم وەستان تا لە مەککە دەریان پەڕاندن . ئەمەش لە ناوەڕاستی صەدەی دووهەمی زایین‌دا بوو .

کاتێك کە جورهوم ویستیان مەککە بەجێ بهێڵن بیری زەمزەمیان پڕ کردەوە و جووتە ئاسکە لە زێر دروست‌کراوەکەی کەعبەی لەناو بیری زەمزەمدا شاردەوە و خۆیان بەرەو یەمەن کەوتنە رێ ..

وا دائەنرێ کە سەردەمی ئیسماعیل سەلامی لێ بێ بیست صەدە پێش زایین بووە ، واتە جورهوم بیست و یەك صەدە لە مەککەدا ماونەتەوە و نزیکەی بیست صەدە واتە دوو هەزار ساڵ کاروباری مەککەیان بە دەست بووە .

دوای ئەوەش خوزاعە دەستیان بەسەر کاروباری مەککەدا گرت و حیسابێکی ئەوتۆیان بۆ بەنویەکر نەکرد .

خوزاعەش سێ‌صەد ساڵ کاروباری مەککەیان لە دەست‌دا بوو ، لەم ماوەیەدا عەدنانی‌یەکان بەم لاو بەولادا بڵاو بووبوونەوە و چەند تیرەیەکی کەمی قوڕەیش نەبێ لەگەڵ چەند خانەوادەیەکی نەوەی کەنانە کەس بە دەوری مەککەدا نەما بوو و ، هەتا هاتنی قوصەی کوڕی کیلاب‌یش هیچیان بە دەست نەبوو .

ئەگێڕنەوە کە کاتێ باوکی قوصەی ئەمرێ قوصەی لە کۆشی دایکیا بووە . جا رەبیعەی کوڕی حەرام کە لە بەنوعوذرە بووە دایکی قوصەی مارە ئەکات و ئەیان بات بۆ وڵاتی خۆی لە دەوروبەری شامدا . کە قوصەی گەورە ئەبێت ئەگەڕێتەوە مەککە

ئەبینیٚ کاروباری مەککە وا لە دەستی حەلیلی کوڕی حوبشەی خوزاعییدا . ئەو پیاوە کچێکی ئەبیٚ بە ناوی حوبیا و قوصەی داوای ئەکات و لێی مارە ئەکەن . کاتێك کە حەلیل ئەمرێت ، قوصەی ئەبێتە پیاوێکی دەوڵەمەندی ناودار و ، جەنگ لە نێوان خوزاعە و قورەیش‌دا روو ئەدات و سەرەنجام قوصەی زاڵ ئەبێت و کاروباری مەککە و کەعبەی پیرۆز ئەگرێتە دەست .. ئەمەش لە ناوەڕاستی صەدەی پێنجەمی زایین‌دا ئەبێت واتە ساڵی ٤٤٠ ز .

ئیتر لەو رۆژە بە دواوە هۆزی قورەیش دەسەڵاتی تەواویان بەسەر مەککەدا هەبوو و ، فەرمان فەرمانی ئەوان بوو .[٢٤]

[٢٤] الرحيق المختوم : ٢٤ ـ ٢٧ .

## بەشی سێهەم
# دین داریی عەرەب
## پێش هاتنی ئیسلام

زانایانی دین داریی خەریکە لەسەر ئەوە یەك بگرن کە دین داریی غەریزەیەکە لە مرۆڤدا . ئەم راستی‌یە لە فەرهەنگی ( لاروس ) دا ـ کە لە صەدەی بیستەم دا دانراوە ـ بەم شێوە هاتووە :

« إن الغريزة الدينية مشتركة بين كل الأجناس البشرية حتى أشدها همجية ، وأقربها إلى الحياة الحيوانية ، وإن الإهتمام بالمعنى الإلهي ، وبما فوق الطبيعة ، هو إحدى النزعات العالمية الخالدة للإنسانية ، وإن هذه الغرايز الدينية لا تخفى ، بل لا تضعف ولا تذبل » .

( بارتلمي سانت هلير ) یش داهاتنی دین بەم شێوە روون ئەکاتەوە :

« ما العالم ؟ ما الإنسان ؟ من أين جاء ؟ من صنعهما ؟ ما نهايتهما ؟ وما الموت ؟ وماذا بعد الموت ؟ ... هذه الأسئلة لا توجد أمة ، ولا شعب ، ولا مجتمع إلا وضع لها حلولاً جيدة ، أو رديئة ، مقبولة أو سخيفة ، وهذا هو التدين » .

پێمان خۆش بوو دەقی‌عەرەبیی ئەم دوو بڕگەیە بخرێتە بەر دیدەی ئازیزان . کورتەی مەبەستیشیان ئەوەیە : کە مرۆڤایەتی هەر هەمووی بایەخی بە دین داوە و پرسیار لە هۆی دروست بوونی خۆی و دەوروبەری ئەکات و بیر لە سەرەنجامی مردن و دوای مردنیش ئەکاتەوە ..

جا هەندێك لەو زانایانە رایان وایە کە هەر کاتێك بیر و هەستی مرۆڤ و ، ئاستی رۆشن بیریی بەرز بوویەوە ئەکەوێتە پرسیار کردن : چۆن دروست بووە ؟ کێ دروستی کردووە ؟ سەرەنجامی بەرەو کوێ‌یە ؟

هەندێکش رایان وایە کە دین داریی کاتێك لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا بەهێز ئەبێ کە دیاردە گەردوونی‌یەکان دەربکەون و ، مرۆڤ لە بەردەم ئەو دیاردانەدا خۆی بە لاواز بزانێ .

هەندێکیش وای ئەبینن کە کاتێك مرۆڤ کەوتە خۆشیی و ژیانی هێمنەوە بیر لە بەدییهێنەر و کارهەڵسوورێنی خۆی ئەکاتەوە .
عەرەبەکان سەرەتا شوێن دینی ئیبراهیـم و ئیسماعیل سەلامیان لێ بێ کەوتن .. ئەو دینەش تەوحیدێکی پاڵفتە بوو ، رۆڵەکانی ئیسماعیلیش بە پاکیی خوایان دەپەرست :
﴿ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴾ ( البقرة : ١٢٥ ) .
بەڵام بە تێپەڕبوونی رۆژگار دینی پاڵفتەیان لە بیر چۆوە ، هەرچەندە هەندێ شەعیرەی دینی ئیبراهیم مابوونەوە ، تا ئەوەبوو عەمری کوڕی لوحەی سەرۆکی خوزاعە هەڵ کەوت .. ئەم پیاوە هەندێ رەوشتی جوانی هەبوون وەك چاکەکردن و خێر و خێرات و، پارێزگاریی لە کاروباری دین ، بە رادەیەك کە خەڵك خۆشیان ئەویست و گوێڕایەڵی فەرمانی ئەبوون . وایان ئەزانی لە دینداریی زۆر شارەزایە و ئەو لە راستیی لا نادات .
ئەوەبوو ئەم پیاوە رێی کەوتە وڵاتی شام .. ئەو کاتە عەمالیق لە شامدا بوون ، وایزانیی ئەمانە زۆر شارەزان ، بەو بۆنەوە کە وڵاتی شام جێی وەحی و هاتنی پێغەمبەرانە . ئەوانیش سەرگەردان بوون و خەریکی بتپەرستیی بوون . بۆیە داوای کرد بتێکی پێشکەش بکەن . ئەوانیش ( هوبەل ) یان دایێ و هێنایەوە بۆ مەککە و ، لەناو کەعبەدا دای نا و ، فەرمانی دا دانیشتوانی مەککە بیپەرستن ، ئەوانیش بە گوێیان کرد .. پاشان دانیشتوانی حیجاز هەر هەموویان شوێن دانیشتوانی مەککە کەوتن و دەستیان دایە بتپەرستیی ، بەو بۆنەوە کە ئەمانە سەروکاریی ماڵی خوا ئەکەن و شارەزان .
هوبەل لە عەقیق دروست کرابوو و ، قۆڵێکیشی پەڕیی بوو و ، قورەیش قۆڵێکی زێڕیان بۆ دروست کردبوو ..
لە ( دومة الجندل ) یش هۆزی کەلب بتێکیان بەناوی ( ود ) ەوە هەبوو ، ( لات ) یش بتی ( ثەقیف ) بوو لە ( طائیف ) ، کە تاشە بەردێکی زەبەلاح بوو ، ( عوززا ) ش لە ( وادي النخلة ) و ، مەنات یش لە موشەللەل لە نزیك قودەید لەسەر رۆخی دەریای سوور بوو و ، لەلایەن ئەنصار و غەسسانەوە ئەپەرسترا .. ئەم سیانەی دواوە گەورەترین بتیان بوون .

دوای ئەوە لە هەموو شوێنێکی حیجازدا بت زۆر بوون .
ئەگێڕنەوە کە عەمری کوڕی لوحەی هاوەڵێکی جینیی هەبوو . شەوێکیان هاتە لای و هەواڵی دایە کە کۆمەڵە بتێك وان لە جوددە و کراون بە ژێر گڵەوە ، وا چاکە بچێت بیان‌هێنێت بۆ مەککە ( یان بۆ توهامە ) تا خەڵك بیان‌پەرستێ . کە چوو ئەو بتانەی دۆزی‌یەوە کە لە سەردەمی نووح و ئیدریس‌دا پەرسترابوون کە ( ود ) و ، ( سواع ) و ، ( یغوث ) و ، ( یعوق ) و ، ( نسر ) بوون . لە صەحیحی بوخاریی‌دا هاتووە کە ئەو پێنج بتە ناوی چەند کەسێکی گەورە و پیاوچاکی قەومی نووح بوون . کە مردن بۆ پەند و بیرەوەریی ئەو پەیکەرانەیان بۆ کردن ، تا خەڵکیی چاو لە کردەوەی جوانیان بکات ، کەچیی بەرە بەرە کرانە بت و لە جیاتی خوا ئەپەرستران و عەمری کوڕی لوحەیش هێنانیە ناو عەرەبەکانەوە .
هەروەها لە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا هاتووە : (( أول من سيب السوائب ، وعبد الأصنام عمرو بن لحي الخزاعي )) .
ئەفەرموێ : یەکەم کەسێك کە وشتری هێشتەوە تا نە سواری بن ، نە کەڵك لە تووکی وەربگرن ، نە شیری بخۆن جگە لە میوان و ، بتی پەرست عەمری کوڕی لوحەی بوو ..
ئین کەلبییش دەربارەی داهێنانی بت‌پەرستیی رایەکی تر باس ئەکات کە ئەمەیە : هەرکەسێ سەردانی کەعبەی ئەکرد ، کە ئەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی دەستی ئەدایە بەردێکی حەرەمی مەککیی و لەگەڵ خۆیا ئەی‌بردەوە . لە هەر کوێ باریان بخستایە بەردەکەیان دائەنا و ، بە وێنەی کەعبە تەوافیان بە دەوریا ئەکرد ، ئەوەندە بە پیرۆزیان ئەزانی ، هەر لەبەر ئەوەی کە بەردی حەرەمە . ئەو کاتە عەرەبەکان حەج و عومرەیان ئەکرد . بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو دەستیان کرد بە پەرستنی هەر یەکێ لەو بەردانە کە پێیان خۆش بوایە ، بەمە دەستکاریی دینی ئیبراهیم و ئیسماعیلیان کرد و ، بوونە بت‌پەرست . ئیتر مزگەوتی حەرام پڕ لە بت کرا .
کاتێکیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی کرد لە دەوروبەری کەعبەدا سێ‌صەد و شەصت بت هەبوون . ئەویش بە داردەستەکەی ئاماژەی بۆ هەرکامیان ئەکرد ئەکەوتە زەویی ، پاشان فەرمانی دا لە مزگەوت فڕێ درانە دەرەوە و سووتێنران .

ئیتر ئەوەبوو شەریك بۆ خوا بڕیاردان و بتپەرستیی بوونە شتێکی ئاسایی و خەڵکەکەش هەر وایان ئەزانیی بە پاکیی و ڕاستیی دەستیان بە دینی ئیبراهیمەوە گرتووە .

جا ئەم بتپەرستییەی کە عەمری کوڕی لوحەی بۆ عەرەبەکانی داهێنا، کۆمەڵێك بیدعەشی داهێنان تا ببنە خووڕەوشت و عادەت بۆ ئەو خەڵکە کە یەکجار بە پیرۆزیان ئەزانیی :

عەرەبەکان لووتیان ئەژەند بەسەر ئەو بتانەدا و ، هانایان بۆ ئەبردن و ، لە تەنگانەدا هاواریان لێ ئەکردن و ، داوای پێویستییان لێ ئەکردن ، چونکە بڕوایان وەهابوو کە ئەو بتانە لای خوا تکایان بۆ ئەکەن .

بە نیازی حەج و طەوافەوە بە دەوری ئەو بتانەدا ئەخولانەوە و زەلیلیی خۆیان ئەنوان و سەجدەشیان بۆ ئەبردن .

قوربانییان بۆ بتەکان ئەکرد و ئاژەڵیان بۆ سەر ئەبڕین و ، لە جیاتی ناوی خوا، ناوی ئەو بتانەیان ئەبرد ، کە خوای گەورە قەدەغەی کردوون :

﴿ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ﴾ ( المائدة : ٣ ) .

﴿ وَلَا تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ﴾ ( الأنعام : ١٢١ ) .

عەرەبەکان هەندێ لە خۆراکیان ئەکردە تایبەتمەندی بتەکان ، هەروەها بەشێك لە کشتوکاڵ و بەرهەمی ئاژەڵەکانیان ئەکردە تایبەتمەندیان .. ئەوەندەش گێل بوون بەشێکیان لەوە پێشکەش بە خوا ئەکرد . جا زۆرێك هۆیان هەبوو تا لە بەشەکەی خوا بەشی بتەکان بدەن ، بەڵام بە هیچ شێوەیەك لە بەشی بتەکان بەشی خوایان نەئەدا :

﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا ۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْ ۗ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾ ( الأنعام : ١٣٦ ) .

سادەییان لەوەدا بوو کە نەزریان لە بەرهەمی کشتوکاڵ و ئاژەڵەکانیان بۆ بتەکان بڕیار ئەدا : ﴿ وَقَالُواْ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ﴾ ( الأنعام : ١٣٨ ) .

**ئەم بت پەرستی‌یەی عەرەبەکان بۆ ئەوەبوو بتەکان لە خوا نزیکیان بخەنەوە و تکایان بۆ بکەن ، ئەگینا بڕوایان بە خوا هەبوو کە دروست‌کەر و راگیرکەری گەردوونە :**

﴿ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ﴾ ( الزمر : ٣ ) .

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾ ( يونس : ١٨ ) .

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾ ( الزخرف : ٨٧ ) .

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾ ( العنكبوت : ٦١ ) .

**بەڵام نەیان‌ئەزانیی بە پاك و بێ‌گەردیی و تاك و تەنیایی خوا بناسن ، بەڵکو شەریکیان بۆ بڕیار ئەدا :**

﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴾ ( يوسف : ١٠٦ ) .

**یەکێ تر لە نەزان کاری‌یەکانیان ئەوەبوو مەلائیکەتیان ئەپەرستن و وایان دائەنا کە کچی خوان ، هەندێکیشیان جیننی‌یان ئەپەرست و ، وایان ئەگەیاند کە لەگەڵ خوادا خزمایەتی‌یان هەیە . خوای گەورەش هەڕەشەی ئەو نەزانیی و هەڵەکاری‌یەی لێ ئەکردن :**

﴿ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴾ ( الصافات : ١٥٣ ـ ١٥٨ ) .

﴿ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ﴾ ( الأنبياء : ٢٦ ـ ٢٧ ) .

**لەگەڵ ئەوەش‌دا کە بڕوایان بە خوا هەبوو و شەریکیشیان بۆ بڕیار ئەدا ، بڕوایان بە قیامەت نەبوو :**

﴿ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ۝ إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴾ ( المؤمنون : ٣٦ ـ ٣٧ ) .

﴿ ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ ۝ بَلْ عَجِبُوا أَنْ جَاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِنْهُمْ فَقَالَ الْكَافِرُونَ هَٰذَا شَيْءٌ عَجِيبٌ ۝ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ذَٰلِكَ رَجْعٌ بَعِيدٌ ۝ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنْقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِنْدَنَا كِتَابٌ حَفِيظٌ ﴾ ( ق : ١ ـ ٤ ) .

﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ۝ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴾ ( يس : ٧٨ ـ ٧٩ ) .

﴿ وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ ﴾(الجاثية : ٢٤).

**هەتا ئەوەندە داماو بوون ، ئەوەندە بە تەسکیی بیریان ئەکردەوە ، بڕوایان نەئەکرد کە خوای گەورە لە ناو مرۆڤدا کەسێك هەڵ ببژێرێ و بیکاتە پێغەمبەر :**

﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ رَجُلٍ مِنْهُمْ أَنْ أَنْذِرِ النَّاسَ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِنْدَ رَبِّهِمْ قَالَ الْكَافِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَاحِرٌ مُبِينٌ ﴾ (یونس : ٢) .

**یەکێکی تر لە بیروباوەڕی پووچەڵی عەرەبە نەفامەکان بریتیی بوو لە داواکردنی دیارییکردنی بەش ، ئەویش بە بەکارهێنانی پارچە تەختەیەك کەسێ جۆری هەبوو: جۆرێك لەسەری نووسراوە ( بەڵێ ) ، جۆرێکیش لەسەری نووسراوە ( نەء )، جۆرێکیش هیچی لەسەر نەنووسراوە . لە کاتێکدا ئەو کەسە بیویستایە کارێك ئەنجام بدات وەك سەفەر ، یان بەشداریی جەنگ ، یان بازرگانیی ، یان ژن‌هێنان ، ئەوا ئەچوو بۆ لای خزمەت‌کاری ( هوبەل ) ی گەورە بت . ئەویش دەفرێکی ئەهێنا کە لە چەرم دروست ئەکرا و زەلەمەکانی دەخستە ناوی ، واتە پارچە تەختە نووسراوەکان ، و تێکی ئەدا و خزمەت‌کاری بتە گەورەکە دەفرە لە چەرم دروست‌کراوەکەی ئەهێنایە پێش و دەستی بە راکێشان ئەکرد. جا ئەگەر ( بەڵێ ) بهاتایە ئەوا کارەکەی ئەنجام ئەدا و ، گەر ( نەء ) بهاتایە دەست کۆتا ئەبوو و ، گەر نەنووسراوەکەش بهاتایە جارێکی تر رای ئەکێشا ..**

﴿... وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ﴾ ( المائدة : ٣ ) .

هەروەها بڕوایان بە هەواڵ‌دانی کاهین و فاڵ‌چی‌یەکان هەبوو ، دەربارەی رووداوی دوارۆژ ، یان زانینی نهێنی‌یەکان . هەندێ لە کاهینەکان وایان ئەگەیاند کە جیننی لەبەر دەستیانا کار ئەکات و هەواڵیان بۆ دێنێ .. هەندێکیش وەهایان ئەگەیاند کە غەیب ئەزانن .. هەندێکیش ئەوەیان ئەگەیاند کە کاروباری خەڵك جێ بەجێ ئەکەن ، وەك دۆزینەوەی شتی دزراو و ون بوو .

هەروەها بڕوایان وەها بوو کە ئەگەر باڵندەیەك یان گیان‌دارێك بەلای راست‌دا بفڕیایە یان بڕۆشتایە ئەوا چاك ئەبێت ، گەر بەلای چەپ‌دا بڕوات ئەوا خراپە دێتە رێیان .. هەروەها ئەگەر هەندێ گیان‌دار بهاتایەتە رێیان بە چاکیان ئەزانیی و هەندێ گیان‌داریشیان بە خراپ ئەزانیی . هەندێ رۆژ و مانگ و گیان‌دار و خانوو و ئافرەتیشیان بە نەگبەت و ، چارەڕەش و بێ‌قدووم لە قەڵەم ئەدا .. بڕواشیان وەها بوو کە هەرکەسێ بکوژرێ هەتا خوێنی نەسەنرێ و تۆڵەی بۆ نەکرێتەوە ئەوا رۆحی ناسرەوێ و ، رۆحی ئەبێتە کوندە پەپوویەك و لە چۆڵەوانییدا ئەسووڕێتەوە و هاوار و دادیەتی هەتا خوێنی بسەنرێ ..

لەگەڵ ئەمانەش‌دا هەندێ شتی دینی ئیبراهمیان بەلاوە مابوو ، وەك رێزنان لە کەعبە و ، طەواف کردن و ، حەج و ، عومرە و ، وەستانی کێوی عەرەفات و موزدەلیفە و ، ئاژەڵ سەربڕین . بەڵام تێکەڵ بە بیدعە کرابوون ، بە تایبەت لە کاروباری حەج‌دا .

هەروەك بت‌پەرستیی لە دوورگەدا دەستی باڵای هەبوو ، لە هەمان کات‌دا دینی یەهوود و نەصارا لە دوورگەدا هەبوو ..

دیارە لە سەرەتادا دینی یەهوود لە دوورگەدا نەبوو ، بەڵام لە دوو سەردەم‌دا جوولەکە ناچار بوون شوێن و مەنزڵی خۆیان بەجێ بهێڵن و بەرەو ناوچەی حیجاز بکەونە رێ .

کۆچی یەکەمیان کاتێ دەستی پێ کرد کە بابلی‌یەکان و ئاشووری‌یەکان دەستیان بەسەر فەلەستین‌دا گرت . ئەمەش بووە هۆی جێ پێ لێژبوونی یەهوود و، کاول‌بوونی وڵاتیان و ، رووخاندنی ( هەیکەل ) بە دەستی بوختەنەصەر ، ئەویش ساڵی ٥٨٧ پ . ز و بەدیل گرتنی بەشێکی زۆری جوولەکە و راپێچ کردنیان بۆ بابل ، بەم بۆنەوە هەندێکیان وڵاتیان بەجێ هێشت و کۆچیان بۆ ناوچەکانی باکووری حیجاز کرد .

کۆچی دووهەمیشیان لەو کاتەوە دەستی پێ کرد کە رۆمان بە سەرکردایەتیی ( بتطس ) لە ساڵی حەفتای زایین دا توانی‌یان فەلەستین داگیر بکەن . رۆمانەکانیش کەوتنە سزادانی یەهوود و ئەوانیش ناچاری کۆچ کردن بوون بۆ حیجاز ، ئەوەبوو لە یەثریب و خەیبەر و تەیماء نیشتەجێ بوون و ، لەوێ قەڵا و شاریان بنیات نا و دەستیان دایە کاسپیی و پارە کۆکردنەوە .. شان بە شانی تەماع و رەزیلیی و چاوچنۆکیی و ترسنۆکی‌یان دڵیان زۆر پیس بوو و خۆپەرست بوون ، بۆیە هەوڵیان ئەدا ناکۆکیی و کوشتار بخەنە نێوان هۆزە عەرەبە سادەکانەوە .

لەبەر ئەو رەوشتە نزمانە جوولەکە زۆر سووك و بێبایەخ بوون بەلای عەرەبەکانەوە لەبەر ئەوە بێزیان نەئەهات نزیکی دینێك بکەونەوە کە ئەوانە هەڵ گری بن . لە لایەکی ترەوە یەهوود خۆیان بە ( شعب الله المختار ــ گەلی هەڵبژێرراوی خوا ) لە قەڵەم ئەدا و ، عەرەبەکانیش خۆیان بە چاکتر ئەزانیی بەوەی کە رەفتاری جوولەکە سووك بوون و خۆشیان بە هەڵگری ئایینی ئیبراهیم ئەزانیی ..

لە لایەکی ترەوە بە هۆی ( تبان أسعد أبي كرب )ەوە یەهوودی‌یەت لە یەمەن دا بڵاو بوویەوە . ئەوەبوو سەردانی یەثریبی کرد و لەوێ بووە جوولەکە و دوو زانای جووی لەگەڵ خۆی‌دا برد بۆ یەمەن . لەوێ یەهوودیەت بڵاوەی کرد ..

کاتێك کە یووسف ذونواسی کوڕی تبان بووە کاربەدەستی یەمەن هێرشی کردە سەر مەسیحی‌یەکانی نەجران و فەرمانی بۆ دەرکردن کە مەگەر دینی یەهوود وەربگرن . بەڵام مەسیحی‌یەکان هەرگیز لەو ئاستەدا نەبوون کە بتوانن واز لە دینی خۆیان بهێنن و شوێن دینی جوولەکە بکەون . یووسف چاڵی زۆری بۆ هەڵ کەندن و چاڵەکانی لە ئاگر پڕکردن و بە ژن و پیاو و منداڵ و پیرەوە هەر هەموویانی بە ئاگر سووتاند . ئەڵێن : ژمارەی شەهیدانی ئەم چاڵە ئاگرینانە لە نێوان بیست هەزار هەتا چل هەزار بووە .. ئەمەش لە ساڵی ٥٢٣ ز . [٢٥]

ئەمەش بێ‌متمانەیی‌یە بە دینی جوولەکە کە ئەو خەڵکە زۆرە بە ئاگر سووتاندنی کاربەدەست رازیی بن و نەچنە سەر دینەکەی ..

بەڵام دینی نەصرانیی لە نەجرانی باکووری یەمەن پەرەی سەند بوو و ، دیارە لە رێی حەبەشەوە پێ‌یان گەیشتبوو .

---

[٢٥] سيرة إبن هشام : ١ / ٢٠ ـ ٣٦ .

بۆ یەکەم جار حەبەشە کە لە ساڵی ٣٤٠ ز دا هاتن و یەمەنیان گرت تا ساڵی ٣٧٨ ز تیایا مانەوە ، لەم ماوەیەدا دینی مەسیحیی بڵاوەی کرد . پیاوێکی زاهیدی قیامەتییش کە زۆر خواناس بوو و دوعای گیرا ئەبوو و خاوەنی کەرامات بوو و ناوی ( فیمیون ) بوو لەو ماوەیەدا هاتە نەجران و خەڵکەکەی بۆ سەر دینەکەی خۆی بانگ کردن ، ئەوانیش کە راستگۆیی و خواناسیی کابرایان دیی دینی مەسیحی‌یان وەرگرت .[٢٦]

کە بۆ جاری دووهەم حەبەشە هێرشیان کردەوە سەر یەمەن بە نیازی تۆڵەسەندن لەو کارە نامەردانەیەی یووسف ذونواس و ، ئەبرەهەش توانیی بە یەك‌جار دەست بەسەر یەمەن‌دا بگرێت ، دەستی دایە بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت بەوپەڕی چالاکی‌یەوە ، بە رادەیەك کەوتە تەماعی ئەوەوە ماڵی خوا لە مەککە برووخێنێ و ئەو ماڵەی کە لە صەنعا دروستی کردبوو بکاتە قیبلەی هەموو دوورگە ، بەو نیازەوە عەرەبەکان هەر هەموویان ببنە مەسیحیی و ، حەج کردنیان بریتیی بێ لە سەردانی ماڵەکەی ئەو . بەڵام ئەوەبوو بە سەرشۆڕیی سەری نایەوە و خوای گەورە کەعبەی پیرۆزی پاراست و بە باڵندەیەکی زۆر بچووك لەشکری مل‌هوڕی تەفروتوونا کرد ..

هەروەها لە باکووری دوورگەش‌دا ، لە دەوڵەتی غەسساسینەدا نەصرانییەت پەرەی سەندبوو ، ئەویش لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ رۆمەکان‌دا پەیوەندی‌یان بەهێز بوو ، هۆزەکانی تەغلیب و طەی ئەوانیش بووبوونە مەسیحیی و پادشاکانی حیرەش هەندێکیان نەصرانییەتیان وەرگرت و ، ئەڵێن کۆن‌ترین کەنیسەش لە وڵاتی عەرەب‌دا لە حیرەدا بووە .

بەڵام هەر چۆن بێ وەك پێویست مەسیحییەتیش لەناو عەرەبەکانی دوورگەدا پەرەی نەسەند ، ئەویش لەبەر ئاڵۆزیی بیروباوەڕی نەصرانییەت و شاردنەوەی هەندێ نهێنیی بەلای قەشەکانەوە ..

دینی مەجووسییش ، هەندێ لەو عەرەبانەی کە هاوسنووری وڵاتی فارس بوون وەریان گرت ، وەك باشووری عیراق و کەنارەکانی کەنداوی عەرەبیی ، هەروەها لە سەردەمی دەسەڵات‌داریی فارس‌دا لەسەر یەمەن هەندێ کەس کەوتنە شوێن دینی ئاگرپەرستیی ..

---

[٢٦] سیرة إبن هشام : ١ / ٣١ ـ ٣٤ .

لە وڵاتی عەرەبدا هەندێکیش شوێنکەوتەی دینی صابیئە بوون ، کە هەڵکەندن و پشکنینی وڵاتی عیراق ئەوەی سەلماندووە کە صابیئە دینی کلدانییەکان بووە کە قەومی ئیبراهیم بوون . ئەم دینە زۆربەی دانیشتوانی شام شوێنی کەوتوون ، هەروەها وڵاتی یەمەنیش . بەڵام بە هاتنی دینی تازە وەك یەهوودییەت و مەسیحییەت ئەو دینە تیاچووە و تەنها کەمێك خەڵك لەسەری ماوەتەوە .

لەناو هەموو ئەمانەدا لە وڵاتی عەرەبدا دەستەیەك هەبوون ، ئەگەرچیی کەم بوون ، بەڵام شوێنکەوتەی دینی حەق بوون و ، بانگی تەوحیدی پاڵفتەیان بەرز ئەکردەوە و ، شوێنکەوتەی راستەقینەی ئیبراهیم و ئیسماعیل بوون ، سەلامی خوایان لێ بێ . ئەمانە بڕوایان بە تاك و تەنیایی خوا و ، زیندووبوونەوە و ، قیامەت و ، هاتنی پێغەمبەری ئاخرزەمان هەبووە ، کە خوای گەورە بە هۆی ئەو پێغەمبەرەوە خەڵك لە تاریکیی رزگار ئەکات .. ئەم ئیماندارانە پێیان ئەوترا حەنیفییەکان .[27] کە ئەمانە هەندێکیانن :

( ١ ) **قوسسی کوڕی ساعیدەی ئەیادیی** : ئەم پیاوە وتاردەر و ، حەکیم و ، ژیر و، بەسەلیقە و لێهاتووی ناو کەس‌وکارەکەی بووە . خەڵکیی بۆ سەر ناسینی خوا بە تاك و تەنیا بانگ ئەکرد و داوای ئەکرد واز لە بتپەرستیی بهێنین و ، بڕواشی بە زیندووکردنەوەی دوای مردن هەبوو و ، مژدەی هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ دابوو .

لە ئیبن عەبباسەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : قوسسی کوڕی ساعیدە لە بازاڕی عوکاظ دا وتاری بۆ قەومەکەی ئەدا و ئەیوت : ئا لەم لایەنەوە حەقێك دەر ئەکەوێت ـ بە دەستیشی ئاماژەی بۆ لای مەککەوە کرد ـ . وتیان : ئەو حەقە چییە ؟ وتی : پیاوێك لە نەوەی لوئەی کوڕی غالب بۆ سەر وشەی ئیخلاص و ، ژیانی هەمیشەیی و، ناز و نیعمەتێکی کۆتایی نەهاتوو بانگتان ئەکات . جا ئەگەر بانگی کردن بچن بە دەمیەوە . خۆ ئەگەر بزانم تا کاتی رەوانەکردنی ئەمێنم ئەوا یەکەم کەس من هەوڵ ئەدەم تا بە خزمەتی بگەم .. ئەم پیاوە بەرێزە تا لەدایك بوون و پێگەیشتنی پێغەمبەر ﷺ ما ، بەڵام پێش هاتنی وەحی کۆچی دوایی کرد ..

---

[27] ﴿ مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا ﴾ ( آل عمران : ٦٧ ) .

ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویە :[28] (( رحم الله قساً كأني أنظر إليه على جملٍ أورق تكلم بكلام له حلاوة لا أحفظه )) . ئەفەرموێ : رەحمەتی خوا لە قوس بێت ، لەبەر چاومە کە بەسەر وشترێکی بۆرەوە بوو و بە گوفتارێکی شیرین کە لەبەرم نیە قسەی ئەکرد . هەندێ لە خزمەکانی وتیان : ئێمە لە بەرمانە . فەرمووی : (( هاتُوهُ )) . ئەوانیش وتارە پڕ لە حیکمەت و ئامۆژگارییەکانیان گێڕایەوە .

لەو بارەوە ریوایەتی تریش هەن کە ئەوە ئەگەیەنن ئەم پیاوە ژیر و بەڕێزە ، لەو چەرخە تاریك و دژوارەی بتپەرستییدا بانگی تەوحید و بڕوا بە زیندووبوونەوەی بەرز کردۆتەوە .

( ٢ ) **زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل** : کە ئامۆزای خەلیفە عومەر و باوکی هاوەڵی پایەدار سەعیدی کوڕی زەید بووە ، کە یەکێکە لەو دە کەسەی مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە . زەیدیش یەکێك بووە لەو حەنیفییانەی کە لەسەر دینی ئیبراهیم و ئیسماعیل بووە ـ سەلامیان لێ بێ ـ . گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی نەئەخوارد کە بۆ بتەکان سەر ئەبڕران .

بوخاریی لە صەحیحەکەیدا لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە خوا لێیان رازیی بێ ئەگێڕێتەوە کە : لە خوارووی ( بلدح ) ەوە ـ کە شوێنێکە لە نزیك مەککەدا ـ و پێش هاتنی وەحی پێغەمبەر ﷺ تووشی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل ئەبێت لەو کاتەدا سفرە و خوانێك لە پێغەمبەر نزیك ئەخەنەوە ، کەچیی لێی ناخوا . پاشان زەیدیش ئەڵێت : گۆشتی ئەو ئاژەڵانە ناخۆم کە بۆ بتەکانتان سەرتان بڕیون و تەنها لەوە ئەخۆم کە ناوی خوای لەسەر براوە .

زەید دەربارەی ئاژەڵ سەربڕین رەخنەی لە قورەیش ئەگرت و ئەیوت : مەڕ خوا بەدیی هێناوە و ، لە ئاسمانەوە بارانی بۆ باراندووە و ، لە زەوییشدا گژوگیای بۆ سەوز کردووە ، کەچیی ئێوە لە سەربڕینیدا ناوی غەیری خوای لەسەر ئەبەن ؟!

دیسان بوخاریی لە باسێکی دوور و درێژدا گێڕاویەتەوە کە زەید ئەچێ بۆ شام و بەدوای دینی حەقدا ئەگەڕێ . لەوێ تووشی زانایەکی جوولەکە ئەبێت ، کەچیی دڵی ناچێتە سەر وتەکانی . پاشان تووشی زانایەکی گاور ئەبێت و دڵی ناچێتە سەر وتەکانی ئەویش ، بەڵام هەردووکیان باسی دینی ئیبراهیم ئەکەن کە دینی

---

[28] السيرة النبوية لمحمد بن محمد أبـي شهبة : ١ / ٨٠ ـ ٨١ .

پاك و خاوێنە . كە هاتە دەرەوە هەردوو دەستی بەرزكردنەوە و وتی : (( خوایە ! خۆت بە شاهێد ئەگرم كە من لەسەر دینی ئیبراهیمم )) .

هەروەها بوخاریی لە ئەسمائی كچی ئەبوبەكرەوە خوا لیّیان رازیی بیّ ئەگێڕێتەوە كە وتوویە : چاوم بە زەیدی كوڕی عەمری كوڕی نوفەیل كەوت كە بە پێوە پاڵی بە كەعبەوە دابوو و ئەیوت : ئەی كۆمەڵی قوڕەیش ! بەخوا جگە لە من هیچ كەسێكتان لەسەر دینی ئیبراهیم نیە . زەید ئەبووە هۆی نەمردنی ئەو كچەی كە باوكی ئەیویست زیندەبەچاڵی بكا . بە كابرایەك كە ئەیویست كچەكەی بكوژێت ئەیوت : مەی كوژە ، من بەخێوی ئەكەم . ئیتر كچەكەی ئەبردە لای خۆی . كاتێك كە گەورە ئەبوو ، ئەهاتەوە بۆ لای باوكی و پێی ئەوت: ئەگەر پێت خۆش بیّ ئەیگێڕمەوە بۆت و، گەر پێیشت خۆش بیّ بەخێوی ئەكەم .

ئیبن سەعد و فاكیهییش لە عامیری كوڕی رەبیعەوە ئەگێڕنەوە كە زەید پێی وتووە : من لە رای قەومەكەم دەرچووم و كەوتمە شوێن میللەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ، ئەوەی ئەوان ئەیانپەرست . ئەوان هەردووكیان رووە و ئەم قیبلەیە نوێژیان ئەكرد . منیش چاوەڕوانی پێغەمبەرێكم لە نەوەی ئیسماعیل رەوانە بكریّ ، واش نازانم كە بە خزمەتی بگەم ، بەلاّم من ئیمانم پێی هەیە و تەصدیقیشی ئەكەم و ، شاهێدییش ئەدەم كە پێغەمبەرە و ، گەر تەمەنیشت درێژ بوو لەلایەن منەوە سەلامی لیّ بكە .

عامیر ئەڵێت : كاتێك كە موسڵمان بووم هەواڵەكەیم دا بە پێغەمبەر ﷺ و ، ئەویش وەلاّمی سەلامەكەی دایەوە و ، داوای رەحمەتی خوای بۆ كرد و فەرمووی : (( لقد رأيته في الجنة يسحب ذيولاً )) .

هەروەها گێڕاویەتەوە كە سەعیدی كوڕی زەید و عومەری كوڕی خەططاب خوا لیّیان رازیی بیّ دەربارەی زەید پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد و ، ئەویش فەرمووی : (( غفر الله له ورحمه ، فإنه مات على دين إبراهيم )) . فەرمووی : خوا لیّی خۆش بیّ و رەحمی پیّ بكا ، لەسەر دینی ئیبراهیم مردووە .

كاتێك كە پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ هات ، زەید لە شام بوو هەواڵەكەی بیست . بە پەلە گەڕایەوە بۆ مەككە تا ئیمانی پیّ بهێنیّ ، كەچیی لە رێگادا جەردە هاتنە رێی و كوشتیان .

( ٣ ) **وەرەقـەی کـوڕی نەوفـەلی کـوڕی ئەسـەدی کـوڕی ( عبـدالعزی ) :** ئـامۆزای خاتوو خەدیجە بووە و یەکێ بووە لەوانەی کە بت پەرستیی پـێ نـاخۆش بـووە و حەزی نەکردووە قوڕەیش لە گومڕاییدا بژین .

لەگەڵ زەیدی کوڕی عەمردا پێکەوە بەرەو شام کەوتنە ڕێ تا دینێك کە دڵیـان پێی بکرێتەوە دەسـت بخـەن ، ئـەوەبوو زەیـد کەوتـە شـوێن دینـی ئیـبراهیم و ، وەرەقەش دڵی چووە سەر نەصرانییەت و بووە گاور ، بۆ ئەمەش رەنگـە ڕێـی لـە قەشە و ڕاهیبی ڕاستگۆ کەوتبێ ، کە بـە بێدەسـت کـاریی لەسـەر دینـی پـاکی حەزرەتی عیسا مابێتەوە و ، مژدەی نزیك‌بوونەوەی هاتنی پێغەمبەری ﷺ پێ دابێ .

وەرەقە ئەوەندە پیر بوو بوو کە هەردوو چاوی لە دەسـت دابـوون . کاتێـك کـە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەشکەوتی حیرائی بۆ وەرەقە گێڕایەوە ، وتی : ئەمە ئـەو مەلائیکەتەیە کە خوای گەورە ناردیە خوارەوە سەر مووسا ، خۆزگـە لـەو کاتـەدا کە خزمەکانت دەرت ئەپەڕێنن زیندوو بوومایە . پێغەمبـەری خـواش ﷺ بەسـەر سوڕمانەوە پرسیی : (( أو مخرجيَّ هم ؟ )) فەرمووی : ئایا دەرم ئەپەڕێنن ؟ وتـی : بەڵێ ، هەر پیاوێ وەك ئەم کارەی تۆی خرابێتە ئەسـتۆ دژایـەتیی کـراوە .. خـۆ ئەگەر من بکەومە ئەو ڕۆژەوە کە دەرت ئەکەن بـە چـاکیی کۆمـەکییت ئەکـەم .

ئیتر ئەوەندەی پێ نەچوو وەرەقە کۆچی دوایی کرد و ، ماوەیەکیش وەحی وەستا .

وەرەقە بەر لەوەی پێغەمبەر ﷺ مەردوم بانگ بکات بـۆ ئیمـان‌هێنـان ، ئـەو ئیمانی هێنا . بەیهەقیی و ئەبونوعەیم گێڕاویانەتـەوە کـە کـاتێ وەرەقـە کۆچـی دوایی کرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :

(( لقد رأيت القَسَّ في الجنة عليه ثياب الحرير ، لأنه آمن بي وصدقني )) .

فەرمووی : وەرەقەم لە بەهەشتدا بینی کە جلی لە ئاوریشم چـنراوی لەبـەردا بوو ، چونکە ئیمانی پێم هێنا و تەصدیقی کردم .

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : (( رأيت ورقة في بطنان الجنة عليه السندس )) .

فەرمووی : وەرەقەم لە بەهەشتدا بینیی کە ئاوریشمی ناسکی لەبەردا بوو .

بەم بۆنەوە هەندێ لە زانایان وەرەقە بە یەکەم پیاوێك لە قەڵەم ئەدەن کـە دوای خەدیجە ئیمانی هێنابێ و ، هەندێکیش بە هاوەڵیان ژماردووە ..

( ٤ ) **ئومەییەی کوڕی ئەبوصەلتی کوڕی عەوفی ئەقەفیی :** ئەمیش بەدوای دیندا ئەگەڕا و ، کتێبی ئەخوێندنەوە . ئەش‌ڵێن : بـووە بـە گـاور . لـە شـیعرەکانیدا

باسی تەوحید و ، زیندووبوونەوە و ، دەنگ و باسی قیامـەتی زۆر کـردووە .. لـە کتێبەکان‌دا ئەوەشی وەرگرتبوو کە لەناو عەرەب‌دا کەسێك ئەکرێتـە پێغەمبـەر و بە هیواش بوو خۆی بۆ ئەو کارە هەڵ ببژێرێ . بۆ ئەمە دەستی دایە گۆشـەگیریی و خواپەرستیی بە هیوای ئەوەوە بکرێتە پێغەمبەر ، هـەروەك وای لێـك دابێتـەوە کە پێغەمبەرایەتیی بە وەرزشی رۆحیی دەست ئـەخرێت . ئـیتر نەی‌ئـەزانیی ئـەوە بەخششی خوایی‌یە و هیچی تر .

کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ کاری درا بە سەرشان‌دا ئومەییە حەسادەتی پـێ بـرد و، وتی : دینی حەنیفی‌یەت حـەقە ، بـەڵام بۆ موحەممەد گومـانم هەیـە . پاشـان لێیان پرسیی : ئایا ئیمان بە پێغەمبەرایـەتیی ئـەو نـاهێنی ؟ وتـی : شـەرم لـە پیاوانی ثەقیف ئەکەم کە هەموو جارێ پێم ئەوتن کە من ئەبمە ئـەو پێغەمبـەرەی ئاخرزەمان ، کەچیی ئێستا بکەومە شوێن منالێکی نەوەی عەبدمەناف !!

کاتێکیش کە خوشکەکەی هەندێ لە شیعرەکانی ئومەییەی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ خوێندەوە فەرمووی : ( آمن شعره ، وكفر قلبـه ) . فەرمووی : شیعرەکەی ئیمـانی هێناوە ، بەڵام دڵی بە کافریی ماوەتەوە .

لە صەحیحی بوخارییش‌دا ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویە : (( کـاد أمية بن أبي الصلت أن يؤمن )) . فەرمووی : خەریك بوو ئومەییە ئیمان بهێنێ .

ئومەییـە مـا هـەتا جـەنگی بـەدر رووی دا و بـە شـیعر شـیوەنی بـۆ کـافرە کوژراوەکانی بەدر کرد . دوای ئەوە بە دڵی پڕ لە حەسوودیی و داخ و خەفەتـەوە ، بەبێ ئەوەی ئیمان بهێنێ مرد . هەندێك ئـەڵێن سـاڵی دووهـەمی کۆچـیی دوای جەنگی بەدر و ، هەندێکیش ئەڵێن ساڵی نۆهەم کۆچی دوایی کردووە .

## بەشی چوارەم
# دیمەنی کۆمەڵگای نەفامیی عەرەبیی

دوای باس کردنی کەمێك لە مێژووی عەرەب و حکومەت و دین و خواپەرستی‌یان ، وا چاکە بێینە سەر باسی هەندێك لایەنی ژیان و گوزەرانیان ، تا بزانین ئیسلام چەندە فریاگوزارێکی پێویست بووە بۆ ئەو کۆمەڵە بە تایبەتیی و، کۆمەڵگای گەورەی سەرانسەری زەویی بە گشتیی ..

**یەکەم : ژیانی کۆمەڵایەتیی**

عەرەبەکان بارودۆخ و بەزم و باوی کۆمەڵایەتیی و یاسای دارێژراوی تایبەتیی خۆیان هەبوون و چەندەها صەدە بە پێی ئەوانە رەفتاریان ئەکرد . ئەمەش هەندێ لەو تایبەتمەندی‌یانەیان :

**١ ـ شانازیی‌کردن بە نەسەب و رەچەڵەك :**

عەرەبەکان ، چ شارنشین و چ بیاباننشینیان ، بە چاکیی پارێزگاری‌یان لە نەوە و رەچەڵەکی خۆیان ئەکرد .. بۆ ئەمە لەگەڵ هیچ رەگەزێکی تردا ژن و ژن خوازی‌یان نەبوو ، تا خوێنیان بە پاکیی بمێنێتەوە . لە پێشەوە دیمان چۆن نوعمانی کوڕی موونذیری پادشای حیرە کچی خۆی لە کیسرای پادشای ئێران یان لە یەکێ لە کوڕەکانی مارە نەکرد ، بە مەرجێ نوعمان پاڵی بە فارسەوە دابوو ، تا ئەوەبوو ئەو هەمووە نارەحەتی‌یەی هاتە رێ .

جا ئیسلام کە هات ئەم یاسایەی گۆڕیی و بڕیاری دا کە پێویستە شانازیی بە ئیسلامەوە بکرێت و ، دەست لە دەمارگیریی هەڵ بگیرێت .

هەروەها پارێزگاری‌یان لە رەچەڵەکی ئەسپ و ولاغ و وشترە رەسەنەکانیان ئەکرد.

**٢ ـ شانازیی‌کردن بە وتەی جوان و شیعرەکانیانەوە :**

لە هەموو نەتەوەیەك زیاتر بایەخیان بە شیعر ئەدا و ، بە تۆمارگای پڕ لە شانازیی حەسەب و نەسەبیان لە قەڵەم ئەدا .. هەر هۆزێك شاعیرێکی بلیمەتی لێ‌هاتووی تیا هەڵ کەوتایە ، ئەوپەڕی ئاواتیان بوو . چونکە ئەو شاعیرە ئەبووە

زمان حاڵی ئەو هۆزە و بەرگریی لێ ئەکردن و ، پەرچی هێرشی هۆزەکانی تری ئەدایەوە . ساڵانەش کۆڕی بەرابەرکێیان ئەبەست و شەڕە شیعرەیان ئەکرد ، بەمە زمان پاراویی و رەوان بێژییان گەیشتبووە چلەپۆپە .. کاتێك کە قورئانی پیرۆز هات هەموویانی بێدەنگ کرد و بۆیان سەلما کە هەر هەموویان لە توانایان دا نیە بەرامبەر بە ئایەتێکی قورئان بووەستن . بە رادەیەکیش سەرنجی راکێشا بوون کە پیاوماقووڵە زۆر ناودارەکانیان شەو بە نهێنی‌یەوە ئەچوونە پشت دەرگا و پەنجەرەی ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ تا گوێ لە قورئان بگرن ..

٣ ـ باری ئافرەت :

بە لای زۆربەی هۆزەکانەوە ئافرەت زۆر سووك و بێبایەخ بوو و ، وەکو کەل وپەلێکی کەم‌نرخ ئەویش لە میرات دا ئەبرا .. کوڕە گەورەی مێرد کە لە ژنێکی تر ئەبوو بۆی هەبوو دوای مردنی باوکی ژنەکەی بۆ خۆی مارە بکاتەوە .. یان نەهێڵێ ئیتر شوو بکات . ئیسلام کە هات ئەمەی حەرام کرد .. هەروەها میراتیان بەشی ئافرەت نەئەدا و ، بیانووشیان ئەوەبوو کە ئافرەت لاوازە و توانای نیە جەنگ و کوشتاری دوژمن بکات . میراتیش بەوانە ئەدرێ کە بەرگریی لە هۆز ئەکەن .

هەروەها دوو خوشکیان لە یەك کات دا مار ئەکردن .. ئیسلام ئەویشی قەدەغە کرد ..

هەندێ هۆزیش رێزی چاکی بۆ ئافرەت دائەنا و ، لە کاتی شووکردنی دا رایان وەر ئەگرت .. لە هەمان کات دا خاوەنی غیرەت و شەرەف بوون بۆ بەرگریی لە ئافرەت . بۆ نموونە پیاوی وا هەبوو جەردەیی ئەکرد و خەریکی کوشتن و تاڵان و بڕۆ بوو ، کەچیی غیرەتی قبووڵی نەئەکرد لاوازیی ئافرەت ، یان تەنیایی لە سەفەردا بە هەل بزانێت و ، دەست بۆ شەرەفی بەرێت .

ئافرەتی ئازادیش زۆر بەرێز بوو و زۆر بە پاکیی شەرەفی خۆی ئەپاراست . لە هەمان کات دا ئەوپەڕی ئازایەتیی پێوە ئەبینرا کاتێ کە بێ‌دیایە وا هۆزەکەی پێویستیی بە یارمەتیی ئەو هەیە ..

ئافرەتی بیابان نشینیش بەوپەڕی پاك داوێنی‌یەوە لە کاروباری ژیان و گوزەران دا، وەك ئاژەڵ لەوەڕاندن و ، ئاودان و ، رستن و چنین ، یارمەتیی مێردەکەی ئەدا .

زۆر دڵی بە گوزەرانی شار نەئەکرایەوە ، بەڵکو سەربەستیی و سادەیی ژیانی دەر و دەشتی لەلا خۆشەویست بوو .

ئەوەبوو خەلیفە موعاویە خوا لێی رازیی بێ مەیسوونی کچی بوحدەلی مارە کرد و یەزیدی لێ بوو ، کەچیی ئەم ئافرەتە دڵی بە ژیانی کۆشك و تەلاری شار نەئەکرایەوە و هەر دڵی بەلای ژیانی خێوەت و دەر و دەشتەوە بوو ، بۆیە هۆنراوەیەکی لەسەر ئەوە دانا . کاتێ کە موعاویە ئەمەی بیستەوە ، بەرێزەوە ئافرەتەکەی رەوانەی لای کەس وکاری کردەوە .

٤ ـ نیکاح و تەڵاق :

عەرەبەکان بۆ ژنهێنانی زۆر سنووریان نەبوو . ئەوەبوو کە ئیسلام هات پیاوی وا هەبوو زیاتر لە دە ژنی هەبوو ، ئیسلام ئەمەی رێك کرد تا پیاو لە یەك کاتدا لە چوار ژن زیاتر مارە نەکات ، ئەویش بەو مەرجەی بتوانێ نەفەقەیان بدات و بە چاوی عەدالەتەوە هەڵس وکەوتیان لەگەڵ بکات . لە نەفامییدا ستەمی زۆر لە ئافرەت ئەکرا و مافی پێشێل ئەکرا . ئیسلام هات و هەموو مافێکی بۆ گێڕایەوە و ، ئامۆژگاریی پیاوانیشی کرد تا بە چاکە هەڵس وکەوتیان لەگەڵدا بکەن ..

بەڵام لە سەردەمی نەفامییدا عەرەبەکان چەند جۆرێك نیکاحیان هەبوو ، یەکێکیان کە پاك و دروستە ئەو نیکاحە بوو کە وەك نیکاحی ئێستای ناو موسڵمانان ، کە ئافرەت خوازبێنیی ئەکرێت و وەلیی مارەی ئەبڕێت و مارەیی بۆ ئافرەتەکە دیاریی ئەکرێت .. ئەمە نیکاحی زۆربەی عەرەب بوو بە تایبەتیی بنەماڵە خاوەن رێزەکان .

چەند جۆرێکی فاسیدیش هەبوون کە یەکێ لەوانە نیکاحی ( الإستبضاع ) بووە، کە بریتییە لەوەی ژنەکە ماوەی بێنوێژیی تەواو ئەکرد و پاك ئەبوویەوە ، پیاوەکەی لێی نزیك نەئەکەوتەوە و ئەینارد بۆ لای پیاوێك تا ژن و مێردیی لەگەڵ دا بکات و ، چاوەڕوانیی ئەکرد تا سك پڕبوونی ژنەکە دیاریی بدات ، ئەمەش بەو نیازەوە کە منداڵێکی پێکەوتووی لەو پیاوە ببێ ..

نیکاحێکی تری نەفامیی ئەوە بوو کۆمەڵە پیاوێك کە لە دە کەس تێپەڕیان نەئەکرد ، کۆ ئەبوونەوە و پێکەوە ئەچوونە لای ئافرەتێك . جا کە سکی پڕ ئەبوو و منداڵی ئەبوو ، دوای منداڵ بوون بە چەند شەوێك ئافرەتەکە ئەینارد بە دوای پیاوەکان هەر هەموویاندا و کەسیشیان نەیئەتوانیی دوا بکەوێ ، هەر هەموویان

لەلای کۆ ئەبوونەوە و ، ئافرەتەکە رووی تیَ ئەکردن و پێی رائەگەیانـدن کـە ئـەم منداڵە هی ئەوانە ، جا یەکیَ لە پیاوەکانی بە دڵی خۆی هەڵ ئەبژارد و ئـەیوت : فلانەکەس ئەوە منداڵی تۆیە ، بەمە منداڵەکەی بەسەردا ئـەدا و ، ئـەویش نـەی ئەتوانیی ملەجـەڕیَ بکات .

نیکاحێکی تری عەرەبەکان لە سەردەمی نـەفامییدا بریتیـی بـوو لـەوەی کـە ئافرەتی وا هەبوو ئالای لەسـەر دەرگـای ماڵەکـەی هـەڵ ئـەکرد و هـەر پیاوێـك بیویستایە ئەچووە ژوورەوە لای ئەو ئافرەتە و کەسیَ لە چوونە ژوورەوە قەدەغـەی نەئەکرد . جا کاتیَ ئەو ئافرەتە سکی پڕ ئەبوو و منالّی ئەبوو ، لێی کۆ ئەبوونەوە و ، ئەو پیاوەشیان بانگ ئەکرد کە ئەیتوانیی بزانیَ ئەم منالە لە کـیَ ئەچـیَ و ، منداڵەکەیان ئەدا بەسەر ئەو کەسەدا کە لێی ئەچوو و بە ناوی کوڕی ئەوەوە بانگ ئەکرا و ئەویش ملەجەڕەی نەبوو .

جا کە ئیسلام هات ئەو کارە سووکانەی قەدەغە کـردن و نیکـاحی ئیسـلامیی هێشتەوە .

هەروەها نیکاحێکی تریش هەبوو کە ئیسلام قەدەغەی کرد ، ئـەویش ( شغار ) بوو واتە کابرا کچەکەی بدا بە پیاوێك بەو مەرجەی ئەویش کچەکەی خـۆی بـدات بەم و هیچ مارەیەك بۆ هیچ کچێکیان دیاریی نەکریَ .

ئیسلام نیکاحێکی تری بەتاڵ کردەوە ، کە ئەویش نیکاحی ( متعـة ) بـوو کـە پیاوێك بۆ ماوەیەکی دیارییکراو ئافرەتێك مارە ئـەکات و دوای ماوەکـە تـەڵاقی ئەداتەوە ..

هەروەك لە نیکاحدا سەرلیَشێواو بـوون ، لـە تـەڵاقدانیشدا دیسـان سـەر لیَشێواو بوون ، هەروا بە ناڕەوا ژنیان تەڵاق ئەدا و ، کە پیاوێك رقـی لـە ژنێـك ئەبۆوە نە ئەوەبوو راگیری بکات و پێکەوە ژیان بەسەر بەرن ، نە ئـەوەبوو دەسـتی لیَ بەردا و بچیَ بەلای کاری خۆیەوە .. تەڵاقی ئەدا تا راگیری نـەکا و مەسـرەفی بۆ نەکا ، دوای ماوەیەکیش رجووعی ئەکردەوە تا تەڵاقی نەکەویَ و نـەتوانیَ شـوو بکات و هێلانەیەکی تر پێکەوە بنیَ .

کە ئیسلام هات سنوورێکی بـۆ ئـەم دەسـتدرێژییـە دانـا .. فـەرمان هـات پیاوەکە تا دوو جار بۆی هەیە ژنەکەی تەڵاق بدات و رجووعیشـی بکاتـەوە ، کـە جاری سیَهەم تەڵاقی دا ، مـاوەی نادرێـت رجـووعی بکاتـەوە . جـا یـا ئـەوەتا

ژنەکەی بە چاکیی ڕاگیر ئەکات ، یا ئەوەتا ئەو بەستەزمانە لەژێر چنگی ئەو ڕزگاری ئەبێ .. قورئان ئەفەرموێ :

﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ ﴾ ( البقرة : ٢٢٩ ) .

خۆ ئەگەر ئەم پیاوە بۆ سێهەم جار ژنەکەی تەڵاق دا ، ئەوا هەتا شوویەکی تر نەکات و تەڵاق نەدرێتەوە بۆی حەڵاڵ نیە بچێتەوە لای مێردەکەی . قورئان ئەفەرموێت :

﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ ﴾ ( البقرة : ٢٣٠ ) .

**٥ ـ زیندە بەچاڵی کچان و کوشتنی منداڵان :**

کارێکی تری ناشیرینی عەرەبە نەفامەکان بریتیی بوو لە زیندبەچاڵ کردنی کچان لە ترسی شوورەیی و کوشتنی منداڵان لە ترسی هەژاریی و برسێتیی . قورئانی پیرۆز فەرموویە :

﴿ وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ ۝٨ بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ ﴾ ( التكوير : ٨ ـ ٩ ) .

هەروەها فەرموویە :

﴿ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ ﴾ ( الأنعام : ١٥١ ) .

ئەگێڕنەوە کە زیندەبەچاڵ کردنی کچان لەوەوە داهاتووە کە هۆزێك هێرشی کردۆتە سەر هۆزێکی تر و بەسەریدا زاڵ ئەبێت و ئافرەتەکان بە دیل ئەگرێت و دوایی پیاوەکان ئەیان کەنە هاوسەری خۆیان . کاتێك کە دوو هۆزەکە ئاشت بوونەوە بڕیاریان دا ئافرەتەکان سەر پشك بن ، ئەگەر ئەیانەوێ بگەڕێنەوە ناو کەس وکاریان و گەر ئەشیانەوێ لە ماڵی خۆیان دا بمێننەوە . ئەڵێن ئەوانیش نەگەڕانەوەیان هەڵبژارد . لەسەر ئەمە پیاوانی هۆزە دۆڕاوەکە هەرچی کچیان بوون زیندەبەچاڵیان کردن لە داخی ئەوەی نەکەونە دەست دوژمن . ئیتر ئەم عادەتە ناپەسەندە تەشەنەی کرد بۆ هۆزەکانی تریش .

ئەوەندەش ناحاڵیی بوون کچیان بۆ خوا بڕیار ئەدا و کوڕیش بۆ خۆیان . هەر کامیشیان هەواڵی پێ بدرایە کە ژنەکەی کچێکی بووە بەوپەڕی سووکیی و سەرشۆڕیی لە قەڵەمی ئەدا . قورئان ئەمە ڕوون ئەکاتەوە :

﴿ وَيَجۡعَلُونَ لِمَا لَا يَعۡلَمُونَ نَصِيبٗا مِّمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡۗ تَٱللَّهِ لَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَفۡتَرُونَ ۝٥٦ وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ ٱلۡبَنَٰتِ سُبۡحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشۡتَهُونَ ۝٥٧ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ

مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ۝ يَتَوَارَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾ ( النحل : ٥٧ ـ ٥٩ ) .

هەندێ هۆزیش هەبوون زۆریان لە لا ئەنگ بوو کچیان زیندەبەچاڵ بکەن .

جا کە ئیسلام هات ماف و ڕێزی گێڕایەوە بۆ ئافرەت و پێغەمبەری ئازیزیش ﷺ ئەوپەڕی سۆز و شەفەقەتی بەرامبەر بە ئافرەتان نواند ..

٦ ـ جەنگ و تالان و بڕۆ :

لەسەر شتی هیچ و پووچ جەنگ لە نێوان هۆزەکاندا بەرپا ئەبوو .. لەسەر وشترێك ، لەسەر پێش کەوتنی ئەسپێك .. ئەمەش بە وێنەی جەنگی بەسووس کە لە نێوان بەکر و تەغلیبدا ، بۆ ماوەی چل ساڵ ، لەسەر وشترێك ، بەرپا بوو ، ئەوەبوو گەلێك لە پاڵەوان و سەرۆکانیان ، کە یەکێ لەوانە کولەیبی کوڕی ڕەبیعە بوو ، تیاچوون . هەروەها وەك جەنگی داحس و غەبراء کە بە هۆی پێشکەوتنی دوو ئەسپەوە ، ماوەیەکی زۆریان خایاند .

هۆزەکان کە هێرشیان ئەکردە سەر یەکتریی دەستیان بە تالان و بڕۆ ئەکرد و خەڵکەکەشیان بەدیل ئەگرتن و دوایش ئەفرۆشران و ئەکرانە کۆیلە .. بەڵام لە مانگەکانی حەرامدا دەستیان لە خوێن ڕشتن ئەگرتەوە و کەمێك پشوویان ئەدا ..

بەڵام کە ئیسلام هات و هۆزەکان مل کەچی فەرمانەکانی بوون ، نەك پیاو بێترس سەفەری ئەکرد ، بەڵکو ئافرەتیش بە تەنیا لە صەنعاوە ئەچوو بۆ حەضرەمەوت و مەگەر تەنها لە خوا بترسایە و مەڕ و گورگیش پێکەوە ئاویان ئەخواردەوە !!

٧ ـ زانست و خوێندن و نووسین :

عەرەبەکان بە شێوەیەکی گشتیی لە خوێندن و نووسین بێبەش بوون و ، وەك یەهوود و نەصارا هەڵگری عیلم و زانست نەبوون . بگرە نەزانیی باڵی ڕەشی بەسەر ناوچەکەدا کێشا بوو و ، دانە دانەیان نەبێت شارەزاییان لە نووسین و خوێندندا نەبوو . لەگەڵ ئەوەشدا زیرەك و بلیمەت و هەستیار و خاوەنی ئامادە باشیی چاك بوون و ، توانایان بۆ وەرگرتنی زانست زۆر بوو . بۆیە کە ئیسلام هات بە کەمترین ماوە زانا و حەکیم و فەقیهیان لێ هەڵ کەوتن و بوونە خاوەنی گەورەترین شارستانیی .

لە هەندێ زانستییش‌دا شارەزایی‌یان هەبوو وەك : ئەستێرەناسیی و بەکار هێنانیان بۆ گەشتی دەریا و بیابان و ، وەك هەست‌کردن بە کاتی باران‌بارین و ، هەست‌کردن بە بوونی ئاو لە ژێر چینەکانی زەویی‌دا و ، ناسینی خەڵك ئەویش بە سەیرکردنی شوێن پێی ، ئەگەرچیی بەسەر شتی رەقیش‌دا تێپەڕی کردبایە . هەروەها پزیشکی لیٚ‌هاتوویان تیا هەڵ ئەکەوت کە پشتیان بە تاقیی کاریی ژیانیان ئەبەست وەك حاریثی کوڕی کیلدە .[29]

**دووهەم : خووڕەوشت**

عەرەبەکانی پێش سەردەمی ئیسلام خاوەنی کۆمەڵە رەوشتێك بوون و زۆر بە توندیی دەستیان پیٚ‌یانەوە ئەگرت . جا هەندێ لەو رەوشتانە ناشیرین و قیزەون بوون و ، هەندێکیشیان بەرز و بەڕێز بوون ..

هەندێ لەو رەوشتانەی کە سووك و ناشیرین بوون ئەمانە بوون : فیز و خۆهەڵ کێشان و ، دەمارگیریی و ، زوڵم و ستەم و ، خوێن‌ڕێژان و ، تۆڵەسەندن و ، داگیرکردنی ماڵ و سامانی خەڵك و ، خواردنی ماڵی هەتیو و ، سووخواردن و ، عەرەق خواردنەوە و ، دزیی و ، زیناکردن .

ئەوەی کە شایانی باسە لێرەدا بوترێ ئەوەیە کە زیناکردن زیاتر لەگەڵ کەنیزەکەکان‌دا و لەگەڵ ئەوانەی ئاڵایان هەڵ کردبوو ئەکرا و ، ئافرەتە ئازادەکان لەوە زۆر دوور بوون . بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دوای فەتحی مەککە بەیعەتی لە ئافرەتان وەرگرت ، بەڵێنی لیٚ‌وەرگرتن کە شەریك بۆ خوا بڕیار نەدەن و ، دزیی نەکەن و زینا نەکەن کە فەرمووی : (( علی أن لا یشرکن باللە شیئاً ، ولا یسرقن ، ولا یزنین )) ، لەناو ئافرەتەکان‌دا هیندی کچی عوتبەی هاوسەری ئەبوسوفیان بەسەر سوڕمانەوە پرسیی : ئایا ئافرەتی ئازاد زینا ئەکات ؟!!

هەروەها عەرەبەکان خەریکی هەندێ گەمە و گاڵتە و دڵداریی ئەبوون و قوماریان ئەکرد . بەڵام زۆرێکیش هەبوون کە دەروونیان پاك بوو و هیچێ لەو رەفتارە سووکانەیان بە دڵ نەبوو و خەڵکیش لەسەر ئەو دەروون‌پاکی‌یەیان رێزی تایبەتیان لیٚ ئەگرتن ..

---

[29] السیرة النبویة لأبـي شهبة : ١ / ٨٦ ـ ٩٣ .

جا هەروەك هەندێ لە عەرەبەکان ئەم رەوشتە خراپانەیان لەناودا باو بوو ، لە هەمان کاتدا بە گشتیی خاوەنی چەندین رەفتار و کردار و رەوشتی وەها بەرز بوون کە هیچ میللەتێکی تر بەو ئاستە نەئەگەیشت ، بە رادەیەك کە رەوشتە نزمەکانیان لە چاو سیفەتە بەرزەکانیاندا هەر هیچ نەبوون ، ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی کە خوای گەورە قورئانی بۆ ناو ئەو کۆمەڵە رەوانە کرد ..

جا با هەندێ لەو رەوشتە جوانانەیان بخەینە روو :

١ ـ خۆش ویستنی سەربەستیی و ئازادیی :

عەرەبەکان بە هیچ شێوەیەك ژێر دەستەییان پێ قبووڵ نەئەکرا ، چونکە فێر نەبوو بوون کەس فەرمانیان بەسەردا بدا ، ئەوان تەنها رەچاوی یاسای هۆزەکەیان ئەکرد و ، یەکجار سەربەست بیریان ئەکردەوە ، بۆیە مردنیان پێ باش تر بوو لە زەلیلیی ..

جارێکیان عەمری کوڕی هیندی پادشای حیرە لەگەڵ پیاوانی دەوروبەری دانیشتبوو و لێی پرسیین : ئایا لەناو عەرەبدا کەسێك ئەناسن کە دایکی بێزی نەیەت خزمەتی دایکم بکات ؟ وتیان : بەڵێ ، دایکی عەمری کوڕی کولثوومی شاعیری رووتەڵە .

بۆ ئەم مەبەستە پادشای حیرە داوای لە عەمری کوڕی کولثووم سەرێکی لێ بدات و ، دایکیشی سەرێك لە دایکی بدات . پادشا لەگەڵ دایکیا رێك کەوت کە دوای نان خواردن فەرمان بەسەر دایکی عەمری کوڕی کولثوومدا بدا تا قتپێکی بداتە دەست . کە هات دایکی پادشا فەرمانی بەسەردا دا ، ئەویش وتی : با ئەوەی پێویستیی بە کارێك هەیە خۆی هەستێ ئەنجامی بدات . چەند جارێك دایکی پادشا فەرمانەکەی بەسەردا دا و ، سەرەنجام لەیلای دایکی شاعیر هاواری لێ هەڵسا : ئای زەلیل خۆم ، هەی هاوار بۆ هۆزی تەغلیب . کە عەمری کوڕی گوێی لە دەنگی دایکی بوو یەکجار تووڕە بوو . سەیری کرد وا شمشێرەکەی پادشا لە هەیوانەکەدا هەڵ واسراوە . دەستی گەیاندێ و شمشێرێکی دا بە تەوقەسەری پادشادا و هاواری کردە نەوەی تەغلیب . ئەوانیش هاتن هەیوانەکەیان تاڵان کرد و پارچە شیعرێکیشی بۆ پادشا نووسیی ..

٢ ـ ئازایەتیی :

لە ئازایەتییدا نموونەیان پێ ئەهێنرایەوە ، چونکە لە دەوروبەرێکدا گەورە ئەبوون ، پێویست بوو هەر یەکە بتوانێ بەرگریی لە خۆی بکات و لە تەنگانەدا

خۆی دەرباز بکات . هەتا هی وایان هەبوو لە بیابانێکی چۆڵدا تووشی شێرێك ئەهات ، مەردانە ئەچوو بە گژیا هەتا کەوڵی ئەکرد ، بێ ئەوەی بیر لە هەڵاتن و پاشەکشێ بکاتەوە .. ئەم ئازایەتی‌یە بێوێنەیە ئامادەباشی‌یەکی بێوێنە بوو بۆیان کاتێ کە شوێن قورئان کەوتن و ، بە هیوای گەیشتن بە بەهەشت دەستیان دایە شمشێر و ، پاڵەوانانە دوو ئیمپراتۆریەتی مەزنی جیهانی‌یان کەوڵ کرد و ، لەسەر ناوچەی لە دار و پردوو پاکەوەکراوی هەردووکیان شارستانێتی‌یەکی یەکجار مەزنیان بەرپا کرد و ، بانگی تەوحیدیان بە هەموو لایەکی جیهان‌دا بڵاو کردەوە و ، هەتا ئێستاش ئەو هەڵمەتە چاکەخوازی‌یە هەر بەردەوامە .

٣ ـ سەخاوەت :

سەخاوەت ڕەوشتێك بوو کە ریشکی لە دڵ و دەروونیانا داکوتابوو ، بە تایبەت بیابان‌نشینان . ئەوپەڕی فەخر و شانازی‌یان بەو سیفەتەیانەوە ئەکرد و بەشێکی زۆری شیعرەکانیان باسی سەخاوەت و سنگ‌فراوانیی ئەوان ئەکات .. هەتا پیاوی وەهایان هەبوو لە کاتی گرانیی و سەرما و سۆڵەدا میوانی ئەهات و هیچی شك نەئەبرد دەرخواردی میوانەکەی بدات جگە لەو وشترەی کە مایەی گوزەرانی خۆی و خێزانەکەی بوو ، غیرەت و سەخاوەت پاڵیان پێوە ئەنا و چەقۆی ئەخستە سەر ملی و پێشکەش بە میوانی ئازیزی ئەکرد . هەتا ئەوەندە سەخیی بوون بۆ ئەوەی نەهێڵن خوێن برژێت ئەچوونە ژێر باری قەرزی ( دية )ی یەکجار زۆرەوە ..

سەخاوەتیان هەر ئەوەندە نەبووە نان بە مرۆڤەکان بدەن ، بەڵکو جانەوەر و باڵندەشیان تێر ئەکردن . سەخاوەت و دڵگوشادیی حاتەمی تەیش بە نموونە ئەهێنرێتەوە .

٤ ـ مەردایەتیی :

لەو بیابانەدا ڕەوشتی مەردایەتیی و کۆمەکیی لاواز زۆر بە چاکیی لە دەروونیان‌دا جێی خۆی کردبۆوە . لەبەر ئەوە هەرگیز چاویان لەوە نەبوو لاوازیی ئافرەتێك ، یان پیرێك ، یان نەخۆشێك بە هەل بزانن و ستەمیان لێ بکەن ، بەڵکو هەر کەسێ داوای یارمەتیی بکردایە ، بە سووکیی و چاوشۆڕیی ئەزانی بە دەمیەوە نەچێت .

٥ ـ وەفا و پەیمان پارێزیی :

لەم سیفەتەش‌دا دەستێکی باڵایان هەبوو .. چیرۆکی سومەوئەلی کوڕی عادیاء لە وەفادا بەناوبانگە ، ئەوەبوو کوڕەکەی کردە قوربانیی ، بەڵام نەی‌توانیی

ناپاکیی بکات و بەڵێنەکەی بشکێنێ و ئەو قەڵغانانەی کە بە ئەمانەت لەلای دانرا بوون بە دەستەوە بدات . هەروەها کاتێك کە حاریثی کوڕی عەبباد بکوژی کوڕەکەی کەوتە دەستی کە موهەلهەلی کوڕی ڕەبیعە بوو ، ئەمەش لە جەنگی ( بەسووس )دا ، ئەوەبوو نەیئەزانی ئەم دیلەی دەستی موهەلهەلە .. موهەلهەل پێی وت : ئەگەر من موهەلهەلت پیشان بدەم بەرم ئەدەی ؟ ئەویش بەڵێنی پێ دا کە ئازادی بکات . وتی : دەی من موهەلهەلم . حاریث لە نێوان دوو هێزی ڕاکێشان دا گیری خوارد : هێزی تۆڵەسەندن لەو کەسەی کە جگەری سووتاندووە و کوڕەکەی کوشتووە و ، هێزی بەڵێن بەسەربردن و پەیمان نەشکاندن .. سەرەنجام هێزی وەفا و پەیمان پارێزیی سەرکەوت و ئەوەندەی بۆ هات کەمێ کاکۆڵی پێشەوەی موهەلهەلی ڕاکێشا و ئیتر بەری دا ..

ئیتر با چیرۆکی هانیء ی کوڕی مەسعوودی شەیبانیی و ، حاجب ی کوڕی زورارەی تەمیمیی لەولاوە بووەستن .

٦ ـ چاوپۆشیی لە کاتی دەست ڕۆیشتندا :

هی وایان هەبوو لەگەڵ دوژمنەکەیدا زۆرانبازیی ئەکرد ، کەچیی کە ئەیدا بە زەوییدا ، چاوپۆشیی لێ ئەکرد و دەستی لێ هەڵ ئەگرت .. بگرە کە کەسێك زامدار بووایە هێرشیان نەئەکردە سەری و لێی ئەگەڕان .

٧ ـ مافی دراوسێ و پەنادان :

مافی دراوسێیان زۆر چاك ئەپاراست ، بە تایبەت پاریزگاریی شەرەف و نامووسی ، وەك نامووسی خۆیان تەماشایان ئەکرد .. خۆ ئەگەر کەسێکیش داوای پەنای بکردایە لە یەکێکیان ، ئەوا پەنای ئەدا و ، ئەگەر خۆیشی و کوڕەکانی لەو پێناوەدا دابنایە ، ئەو پەنایەی بە جوانیی ئەپاراست .

٨ ـ قەناعەت :

عەرەبەکان بە بۆنەی دەوروبەرەکەیانەوە و، ژیان و گوزەرانی سەختەوە فێری قەناعەت بووبوون و ، بە کەمیش ڕازیی ئەبوون .. هی وایان هەبوو چەند شەو و ڕۆژ بە بیابانی چۆڵ و وشكدا ڕێی ئەبڕیی ، بە چەند دەنکە خورمایەکی کەم ، کە ئەیخستنە بەر دڵی ، قەناعەتی ئەکرد و ، بە چەند دڵۆپە ئاوێکیش کە جگەری پێیان فێنك بکاتەوە قەناعەتی ئەکرد ..

٩ ـ هێزی رۆح و پاکیی نەفس :

لەبەر ئەوەی کە بە ژیانێکی سادەی کەم ئەرك قەناعەتیان کردبوو ، رۆح و نەفسیان لە چاوشۆڕیی و ژێرمنەتیی پارێزراو بوون . جا لەولاوە لە ئازایەتیی و هێزی ماسوولکەدا لە چڵەپۆپەدا بوون ، لەم لایشەوە لە پاکیی نەفس و ورە بەرزیی‌دا ئەژیان ، بۆیە سووکیی و زەلیلی‌یان پێ قبووڵ نەئەکرا و ، بە بچووك ترین دەست‌درێژیی بۆ سەر رێز و سەربەستی‌یان هەڵ ئەچوون و هەڵمەتیان ئەدایە شمشێر و کوشتار و ، جەنگی ناهەمواریان بەرپا ئەکرد .

کاتێکیش کە موسڵمان بوون زۆر بە ئاسانیی فارس و رۆمیان دان بە زەویی‌دا ..

١٠ ـ ئارام و دان بەخۆدا گرتن :

دیسان بە بۆنەی ئەوەوە کە دوورگەی عەرەبیی بیابانێکی وشك و چۆڵە و ، ئاو و کشت‌وکاڵی کەمە ، دانیشتوانی فێری برسێتیی و تینوێتیی و سەرما و گەرما ئەبوون و ، باکیان لە ماندوێتیی و سەختیی رێگا نەبوو ..

١١ ـ دان بەخۆدا گرتن :

ئەم رەوشتە لە هەندێ کەسایەتیی‌دا بە چاکیی رەنگی ئەدایەوە و ئەو کەسە بە نموونە باس ئەکرا . بەڵام لەبەر ئازایەتیی و زووهەڵچوونیان بۆ کوشتار ئەم سیفەتە دەگمەن بوو ..

١٢ ـ سادەیی و سینەسافیی :

لە بیابان‌دا سادەیی و پاکی‌یەك هەیە کە ئەبێتە مایەی راست‌گۆیی و ئەمانەت‌داریی و دوورکەوتنەوە لە فێڵ و ناپاکیی و خەڵەتاندن ، بە پێچەوانەی ئەو شوێنانەوە کە چڵك و چەپەڵیی دنیا خۆشویستن پیس و پۆخڵی کردووە ..

عەرەبەکان خاوەنی ئەم سیفەتانە بوون کە زۆربەیان لە شوێنی خۆیان‌دا بە کار نەئەهێنران . جا کە ئیسلام هات زاخاوی سیفەتەکانی دا و ، بۆ پاك‌کردنەوەی سەرزەویی خستنیە کار .

## سێهەم : باری ئابووریی

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە عەرەبەکان لە دوو کۆمەڵ پێك هاتبوون : بیابان‌نشینان و شارنشینان .

جا بیابان‌نشینەکان بە پلەی یەکەم بۆ ژیان و گوزەران پشتیان بە بەخێوکردنی مەڕومالآت ئەبەست . بۆیە بە دوای ئاو و باران‌دا و بە دوای لەوەڕدا ئەگەڕان .

ئـەم ئاژەڵانـە پێویسـتیی سـەرەکیی ئـەوانیان رائەپەڕانـد . ئـەوەبوو گۆشـت و شیرەکەیان ئەخواردن و لە خوریی و مووەکەیان جل و بـەرگ پۆشـاك و رەشمـاڵ و پێخـەفیان دروسـت ئـەکرد و ، هەرچیشـیان لێ زیـاد بوایـە ئـەیانفرۆشـت . ژنەکانیشیان هەر هەموو خەریکی رستن ئەبوون و ، ئەمەش دەسـتهاتێکی کـەم نـەبوو ، هەرچەندە دەوڵەمەندیان کەم بوون .

بەڵام شارنشینەکان هەندێکیان پشتیان بە کشتوکاڵ ئەبەست وەك دانەوێڵـە و، میوە و ، خورما و ، سەوزە ، ئەمە لەو ناوچانەدا کە زەویی‌وزاری بەپیتیان هەبوو وەك یەمەن و ، طائیف و ، مەدینە و ، نەجد و ، خەیبەر ..

بەشی یەکجار زۆریشیان خـەریکی بـازرگانیی بوون ، بـە تایبەت دانیشـتوانی مەککە ، کە خاوەنی مەڵبەندێکی بازرگانیی یەکجار گرنگ بـوون ، ئـەویش بـەو بۆنەوە کە خاوەن و خزمەتکاری حەرەم بـوون و ، ڕێـزی تایبـەتی‌یان لـە دڵـی عەرەبەکان‌دا هەبوو . بەم بۆنەوە هیچ کەس ڕێی لە کاروانی ئـەوان نەئـەگرت و ، هیچ تەگەرەیەك نەئەهاتە ڕێی بازرگانی‌یەکەیان .. قورئانی پیرۆزیش ئەم نیعمەتەی خوای وەبیر ئەهێنانەوە کە ئەوان لـە سـایەی کەعبـەی پـیرۆزدا حەسـاوە بـوون ، کەچیی ئەوان نەزان‌کارانە بڕوا بە ( باطل ) ئەکەن و کـوفرانی نیعمەتـەکانی خـوا ئەکەن :

﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنۡ حَوۡلِهِمۡۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَةِ ٱللَّهِ يَكۡفُرُونَ ﴾ ( العنكبوت : ٦٧ ) .

ئیتر ئەوەبوو بازرگانی‌یان بە گەورەترین کاسپیی لە قەڵەم ئەدا ..

منداڵەکانی ( عەبدمەناف ) ی گەورە باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان خۆیان دا وڵاتەکانیان بەش کردبوون . ئەوەبوو هاشم بۆ شام دەچوو و ، عـەبد شەمس بـۆ حەبەشە و ، موطەللیب بۆ یەمەن و ، نەوفەلیش بۆ وڵاتی فارس . دوای خۆیشیان هەندێ لە منداڵەکانیان هەر خەریکی بازرگانیی بوون ..

هەروەها دانیشتوانی یەمەنیش خەریکی بازرگانیی ئـەبوون ، هـەتا لـە دەریـاش‌دا هاتوچۆی کەنارەکانی ئـەفریقیایان ئـەکرد ، وەك حەبەشـە و ، سـوودان و ، صـۆماڵ . هەروەها بۆ هیند و جاوە و سـۆمـەطـرە و ، دوورگەکانی زەریای هینـدیی ئەچـوون و ، دواییش کـە مـوسـڵمان بـوون ، ئیسـلامیان گەیانـدە ئـەو شـوێنانە و خەڵکەکـەیان هیدایەت دا ..

هۆی سەرەکیی گواستنەوەش لە وشکایی‌دا .. لە بیابانی دوور و درێژدا وشتر بوو ، کە بە کەشتیی بیابان لە قەڵەم ئەدرا ، چونکە لە هەموو گیاندارێکی ماڵیی زیاتر ئارامی هەیە و بەرگەی سەفەری دوور ئەگرێت .

هەندێ لە ئەشراف و ماقووڵانی قورەیش وەك هاشم و، ئەبوطالیب و ، ئەبولەهەب و ، عەبباس و ، ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و ، ئەبوبەکر و ، زوبەیر و، طەلحە ، خەریکی بازرگانیی بوون ، جا یا ئەوەتا بە پارەی خۆیان کاسپی‌یان ئەکرد ، یان بە پارەی کەسێکی تر ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ بە پارەی خەدیجە خوا لێی رازیی بێ بازرگانیی ئەکرد ..

شارنشینان هی وایان هەبوو کە وشتر یان مەڕ و بزنی بەخێو ئەکرد ، یا بۆ خۆی یا بۆ کەسانی تر .

کارێکی زۆر خراپ عەرەبەکان لە جوولەکەوە فێر بوون . ئەوەبوو خەریکی سووخواردن بوون ، چونکە جوولەکە ریباسەندنیان لە غەیری جوولەکە حەڵاڵ کردبوو . ئەم کارە پشتی هەژارانی شکاندبوو ، بە تایبەت ریبای ( نەسیئە ) کە ئەگەر قەرزار لە کاتی دیاریی‌کراودا پارەکەی نەدابایەوە ئەوا خاوەن پارە پارەکەی لەسەر زیاد ئەکرد و ماوەکەشی بۆ دوا ئەخست ، بەمە دیرهەمێك قەرز چەند قات ئەبوویەوە و ئەو هەژارە هەر ئەی‌ناڵاند ، تا ئیسلام هات و قەدەغەی کرد و مرۆڤی هەژاری لێ قوتار کرد ..

ئەو قورەیشی‌یانەی کە خەریکی بازرگانیی بوون ساڵانە دوو گەشتی گەورەیان هەبوو : گەشتی زستانە بەرەو یەمەن و ، گەشتی هاوینە بەرەو شام . بەڵام بە بۆنەی رێزی کەعبەوە کەسێك دەست‌درێژیی نەئەکردە سەر کاروانی قورەیش . ئەوەتا لە سوورەتی ( قریش ) دا خوای گەورە ئەو باسەی هێناوە :

﴿ لِإِيلَـٰفِ قُرَيْشٍ ۝١ إِۦلَـٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ۝٢ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَـٰذَا ٱلْبَيْتِ ۝٣ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ۝٤ ﴾ ( قريش ) .

جا بۆ ساغ کردنەوەی ئەو کەل وپەلانە و ، ساغ کردنەوەی بەروبوومی ناوچە جۆراوجۆرەکانی دوورگە و ، دەربڕینی پلەی هەر شاعیرێك و هەر وتاربێژێك و ، دەرخستنی بەرهەمی ئەدەب و ، فەخر و شانازیی‌کردن بە پشت و رەچەڵەکەوە ، عەرەبەکان ساڵانە بازاڕی گەورەیان ئەکردەوە .. کە لە سێ شوێنی لە یەك نزیکەوە ، یەك لە دوای یەك ، لە مانگەکانی حەرام دا هەموو کەسێ کاڵا و تفاقی خۆی ئەهێنایە ئەوێ و ، سەرجەم عەرەبەکان لەوێ کۆ ئەبوونەوە و ، پیشانگایەکی مەزنیان بەرپا ئەکرد ..

بازاڕی یەکەمیان ناوی عوکاظ و ، دووهەم میجەننە یان مەجەننە و ، سێهەمیش ذولمەجاز بوو کە لە بیابانێکی تەختی نێوان نەجد و طائیف دا بوون . بازاڕی گەورەیان عوکاظ بوو کە لە سەرەتای مانگی ( ذولقەعیدە ) وە بۆ ماوەی ( ١٥ ) یان ( ٢٠ ) رۆژ ئەکرایەوە ، پاشان ئەیان گواستەوە بۆ ذولمەجاز تا رۆژی ( تەرویە ) واتە هەشتەمی ذولحەجە ئەمانەوە ، پاشان بەرەو مینا ئەکەوتنە رێ ..

جا خەڵکەکە لە عەرەفە و رۆژانی میناد‌ا دەستیان لە کڕین و فرۆشتن هەڵ ئەگرت ، هەتا ئیسلام هات و ماوەی دان تا لەو رۆژانەش‌دا کڕین و فرۆشتن ئەنجام بدەن ، کە فەرمووی :

﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ ( البقرة : ١٩٨ ) .

کە ئیسلام هات و ناوچەکە موسڵمان بوو ، تا ماوەیەکیش ئەم بازاڕانە مانەوە ، پاشان وازیان لێ هێنرا :

بازاڕی عوکاظ لە صەد و بیست و نۆی کۆچیی‌دا ، ئەو ساڵەی کە موختاری حەروورییی دەستی بەسەر مەککەدا گرتبوو وازی لێ هێنرا ، چونکە لەوە ئەترسان ماڵ و سامانیان تالان بکرێ .. پاشان واز لەو دوانەکەش هێنرا و ، بازاڕ گوازرایەوە بۆ مەککە و مینا و عەرەفات ..

لە بارەی پیشەسازییشەوە شتێکی ئەوتۆیان نەئەزانیی ، بەڵام لە دەوروبەری یەمەن و حیرە و شام‌دا خەریکی چنین و پێستەخۆش‌کردن ئەبوون ..

**چوارەم : بەرپابوونی شارستانیەت**

بە کورتە : شارستانیەت بریتی‌یە لە شێوازی ژیانێکی دامەزراو ، بۆ کۆمەڵە خەڵکێك کە یەك بە یەکی ئەندامانی ، کەم و زۆر ، بەشداریی خزمەت بکەن تا باری ژیان و ، کار و ، کۆمەڵ و ، زانست و ، پیشەسازیی و ، هەڵسووڕاندنی کاروباری حوکم و دەسەڵات بە چاکیی دابمەزرێ و ، ئاسوودەیی و خۆش گوزەرانییش دەست مرۆڤەکان بکەوێ .

بەم پێیە ئەگەر سەرنجی عەرەبەکانی دوورگە بگرین ، ئەبینین بە درێژایی مێژوو چەندین شارستانی‌یان بەرپا کردووە ، وەك وڵاتی یەمەن و ، ناوچەی قەومی عاد و ، ناوچەی ثەموود و ، حیرە و ، غەسسان و ، شام . بگرە لە حیجاز خۆی‌دا .. لە مەککە و مەدینە و طائیف دا ..

ئەوە بوو لە یەمەن‌دا چەند دەوڵەتێکی دەسەڵات دار و خاوەن سەروەریی و ، یاسای رەنگین و رێك و پێك بەرپا بوون ، کە لە هەموو زانست و هونەرێك دا بەشی خۆیان

شارەزا بوون و، توانییان بەنداوەکان دروست بکەن و کەڵك لە ئاوی زستان وەربگرن ، ئەمەش پێویستیی بە هونەری ئەندازیاریی هەیە . بەمە یەمەن بووە وڵاتێکی خۆش گوزەران ، بە رادەیەك کە یۆنانییەکانی ئەو سەردەمە یەمەنیان ناونا بوو : ( وڵاتی بەختەوەری عەرەب ) .

هەروەها قەومی عادیش بوونە خاوەنی شارستانێتییەکی کشت وکاڵیی و ، پیشەسازیی و ، بازرگانیی و، بیناسازیی و، ئەموودیش ئەوەندە لێهاتووبوون بەوپەڕی وردەکارییەوە خانوویان لە چیاکان دا هەڵ ئەکۆڵیی .. خۆ جووتە کۆشکە مەزنەکەی دەوڵەتی حیرە : سەدیر و خەوەرنەق تا ئێستاش کەلاوەکانیان هەر ماون .

هەروەها غەسسانییەکان و ئەنباط و تەدمور دەوڵەتیان بەرپا کرد و ، تا ئێستاش پاشماوەی پەرستگا و کۆشکەکانیان هەر ماون .

ئەگێڕنەوە کە دەوڵەتی حامۆڕابیی لە بابل‌دا بە دەست عەرەبە عەمالیقەکان دامەزراوە ، ئەمەش لە صەدەی بیست و سێهەمی پێش زایین دا .

هەروەها ئەو عەرەبە عەمالیقانە دەسەڵاتی میصر ئەگرنە دەست و دەوڵەتێکی گەورەی تیا بەرپا ئەکەن . لە وڵاتی حیجازیش‌دا شارستانییەك لە مەککە و ، مەدینە و ، طائیف و شارەکانی تردا بەرپا بوو ، کە لە بیناسازیی‌دا دەست ڕۆیشتوو بوون و ، بازرگانی وەهاشیان هەبوون کە لمی بیابانیان ئەکردە زێڕ ..

لە تەگبیر و ڕاوێژدا پیاوی کارامە و بیرتیژ و خەمخۆر و نەخشەکێشی لێهاتوویان هەبوون .. هەتا لە مەککەدا کۆمەڵێك بۆ ڕاوێژکردن دانرابوو و ، لە کاری گرنگ‌دا پرسی پێ ئەکرا و ، خانوویەکی ڕێك و پێکی بۆ دروست کرابوو و پێی ئەوترا : ( دار الندوة ) ، کە تیایا کۆ ئەبوونەوە و ، کۆبوونەوەی گشتیی بەوپەڕی سەربەستیی و جوامێرییەوە ڕای خۆی دەرئەبڕی .. ئەمەش ئەوەی ئەگەیاند کە بیر و هەستیان پێگەیی بوو و ، مافی ڕادەربڕینیان بە یەك ئەبەخشیی .[30]

[30] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٩٤ ـ ١٠٦ ، والرحيق المختوم : ٤٣ ـ ٤٥ ، والسيرة النبوية للصلابي : ٢٢ ـ ٣٧ .

# بەشی پێنجەم
# کاربەدەستانی ماڵی خوا

**یەکەم : دەسەڵاتی جورهوم**

شتێکی ئاشکرایە کە ئیبراهیم و ئیسماعیل سەلامیان لێ بێ پێکەوە کەعبەی پیرۆزیان ، بە فەرمانی پەروەردگار ، بنیات نا .. دوای ئەوە حەزرەتی ئیبراهیم جارە مێژوویی‌یەکەی بۆ تێکڕای مرۆڤایەتیی دا ، تا بێن بۆ حەجی ماڵی خوا ..

دوای ئەو حەزرەتی ئیسماعیل کاروباری کەعبەی بە دەستەوە گرت ، کە ئەویش کۆچی دوایی کرد نابت ی کوڕی ، چەندێ خوا ویستی لەسەر بوو کاروباری کەعبەی هەڵ سووڕاند ، بەڵام دوای ئەو کاروبار کەوتە دەست ( مضاض ) ی کوڕی عەمری جورهومیی کە باوکی دایکی بوو ، واتە خەزووری ئیسماعیل بوو .

جا بە بۆنەی ئەوەوە کە جورهومی‌یەکان خاڵوانی نەوەکانی ئیسماعیل بوون و، بەو بۆنەشەوە کە مەککە ڕێزدارە و نابێ لە پەنایا ستەم بکرێ و خوێن بڕێژرێ ، نەوەکانی ئیسماعیل ناڕەزایی‌یان لە کاربەدەستیی جورهوم دەر نەبڕیی . بەمە جورهوم بوونە حاکمی مەککە و چاودێریی‌کەری کەعبە .

لە هەمان کات‌دا نەوەی ئیسماعیل پەرەیان سەند و بە هەموو لایەك‌دا ـ وەك لە پێشەوە باس کراوە ـ بڵاوەیان لێ کرد .. جا لەبەر ئەوەی کە هەڵگری دینی خوا بوون ، بە گژ هەر کۆمەڵێك‌دا بچوونایە ، بە بۆنەی دین‌داری‌یانەوە زاڵ ئەبوون .

دوای ئەوەی کە ( مضاض ) ی یەکەم حاکمی جورهومیی مرد ، حاریثی کوڕی بووە جێ‌گری و ، دوای ئەویش کار کەوتە دەست عەمری کوڕی حاریث .. جا لە مەککەدا لەگەڵ جورهوم‌دا نەوەی ( قطوراء ) ئەژیان ، کە لەگەڵ نەوەی ( جرهم ) دا ئامۆزا بوون و ، سەرۆکەکەشیان ناوی ( سميدع ) بوو . ئەوەبوو لەسەر دەسەڵاتداریی مەککە کەوتنە بەرابەرکێ و ، سەرەنجام دەستیان دایە شمشێر و ، بە سەرکەوتنی جورهوم کۆتایی پێ هات و ، وڵات بۆ جورهوم یەك‌لایی بوویەوە ..

جورهوم بەرە بەرە دەستیان دایە ستەم و لارییئنواندن و حورمەتشکاندنی کەعبەی پیرۆز .. خوای گەورە بڕیاری داوە کەعبە حەرەمێکی پڕ لە ئەمن و ئاسایش بێت ، کەچیی ئەوان زوڵمیان لەو خەڵکە ئەکرد کە سەردانیان ئەکرد .. هەروەها ئەو سامانەی کە پێشکەش بە کەعبە ئەکرا بە ناڕەوا ئەیانخوارد ، [٣١] تا خوا کەسانێکی بۆ گەیاندن کەعبەیان لێ پاك بکاتەوە .

نەوەی بەکری کوڕی عەبدمەناتی کەنانەیی و غەبشانی خوزاعەیی لە دەست کردەوەی ناڵەباری جورهوم بێزار بوون و ، بڕیاریان دا بچن بە گژیاندا و لە مەککە راوەدوویان بنێن . ئاگاداریان کردن کە کوشتاریان ئەکەن .. بەڵام نەوەی ئیسماعیل لایەنگیریی هیچ لایەکیان نەکرد .. لە ئەنجامدا نەوەی بەکر و غەبشان سەرکەوتن .

ئیبن ئیسحاق دەری بڕیوە کە لە سەردەمی نەفامییدا زوڵم و ستەم و دەست درێژیی لە هیچ کەس قبووڵ نەئەکرا لە مەککەدا ئەنجامی بدات ، بۆیە هەر کەسێ لای دابێت دەرئەپەڕێنرا و، هەر کەسیش نیازی خراپی دەرهەق کەعبە بکردایە یەکسەر تیا ئەچوو .. هەتا ئەوەش وتراوە : بۆیە مەککە ناو نراوە بەککە [٣٢] واتە ملی ئەو پیاوانە ئەشکێنێ کە کاری خراپی تیا ئەنجام بدەن . [٣٣]

جا کە جورهوم ملیان شکا و ، ناچار بوون مەککە بەجێ بهێڵن عەمری کوڕی حاریثی کوڕی ( مضاض ) ی جورهومیی دەستی دایە کەلوپەلە بەنرخەکانی کەعبە کە بریتیی بوون لە دوو ئاسکی زێڕین و ، چەند شمشێرێکی بە ئاڵتوون زاخاو دراو و، چەند قەڵغانێك و خستنیە ناو بیری زەمزەم و پڕی کردەوە . پاشان عەمر بە خۆی و قەومەکەیەوە بەرەو یەمەن کەوتنە رێ و ، زۆریش خەمبار و دڵشکست بوون بەوەی کە لە مەککە دەرپەڕێنرا بوون ..

---

[٣١] ئەگێڕنەوە کە ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی لێ بێ لە تەنیشت دەرگای کەعبەدا بیرێکی هەڵ کەندبوو و ، هەر شتێك پێشکەش بە کەعبە بکرایە فڕێ ئەدرایە ناو ئەو بیرەوە .. جا کە جورهوم دەستیان دایە ستەم ماڵ و سامانی کەعبەیان بۆ خۆیان ئەدزیی .

[٣٢] لە قورئانی پیرۆزدا ناوی مەککە بە بەککە هاتووە کە ئەفەرموێ :

﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ ( آل عمران : ٩٦ ).

[٣٣] سيرة إبن هشام : ١ / ١١٤ .

ئیتر لەو رۆژەوە زەمزەم لەبەر چاوان گوم بوو و، کەس بیری بەلای شوێنەکەیەوە نەمابوو هەتا کاروباری کەعبە کەوتە دەست عەبدولموطەللیبی باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ .

**دووهەم : دەسەڵاتی خوزاعە**

کە جورهوم دەرپەڕێنرا ، غەبشانی خوزاعەیی کاروباری مەککەی بۆ خۆی یەك لایی کردەوە و ، نەوەی بەکر هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو . ئەوەبوو عەمری کوڕی حاریثی غەبشانیی بووە کاربەدەست و ، ئەو رۆژە قورەیش چەند ماڵێکی پڕاو بوون .. هەروا خوزاعە پشتاوپشت کاروباری مەککەیان بە دەست بوو تا سەردەمی دوا کاربەدەستیان کە حولەیلی خوزاعەیی بوو .. ئەو پیاوەی کە کچی خۆی لە قوصەی کوڕی کیلاب مارە بڕیی ..

خوزاعە نزیکەی سێ‌صەد ساڵ ، هەندێکیش ئەڵێن : پێنج صەد ساڵ ، کاروباری مەککەیان لە مشتدا بوو .. ئەمانیش وەك جورهوم کاروباریان بە چاکیی بەڕێوە نەئەبرد .. لە هەمووی خراپتر ئەوەبوو لە سەردەمی ئەواندا و ، بە هۆی عەمری کوڕی لوحەی سەرۆکیانەوە بت‌پەرستیی هاتە ولاتی حیجازەوە ، وەك لە پێشەوە بە درێژە باسمان کرد ..

ئەگێڕنەوە کە کیلابی کوڕی موڕڕە ـ کە پشتی شەشەمینی پێغەمبەری خوایە ﷺ ـ فاطیمەی کچی سەعدی کوڕی سەیل مارە ئەکات و ، دوو کوڕی لێی ئەبێت کە ناویان زوهرە و قوصەی ئەبێت . هێشتا قوصەی لە بێشکەدا ئەبێت باوکی ئەمرێت .. دوای ماوەیەك پیاوێك لە هۆزی عوذرە بە ناوی رەبیعەی کوڕی حەرام دێتە مەککە و فاطیمەی ژنی کیلاب ـ کە بێوەژن کەوتبوو ـ مارە ئەکات و ، ئەی‌باتەوە بۆ ولاتی خۆیان . فاطیمەش بەو بۆنەوە کە قوصەی منداڵە ئەی‌بات لەگەڵ خۆی . بەڵام زوهرە لە مەککە بەجێ دێڵێ ، چونکە گەورە بوو بوو .. جا فاطیمە لە رەبیعەش کوڕێکی بوو بە ناوی ریزاح ..

قوصەی لەوێ مایەوە هەتا گەورە بوو و چووە ناو خەڵکەوە .. رۆژێکیان لەگەڵ پیاوێك‌دا قسەیان بە یەکتر ئەوت ، کابرا قوصەی بەوە عەیب‌دار کرد کە ئەو لە خۆیان نیە ، بەڵکو پێیانەوە لکاوە .. تا ئەو کاتە قوصەی نەی‌ئەزانیی کوڕی کێیە و ، خەڵکی کوێیە .. بە تووڕەیی‌یەوە چووە لای دایکی و ، قسەی کابرای بۆ گێڕایەوە ..

دایکی پێی وت : راست ئەکات رۆڵە ، تۆ لەوان نیت ، بەڵام کەس‌وکاری تۆ لە هی ئەو چاك‌ترن و ، باوباپیرانیشت لە باوباپیرانی ئەو بەرێزترن .. تۆ قورەیشییت و ، براکەت و ئامۆزاکانت لە مەککەدان و ، ئەوان دراوسێی ماڵی پیرۆزی خوان !

قوصەی خۆی گەیاندەوە مەککە ناو خزمەکانی .. ئەوەندە جیددیی و بیروڕا جوان بوو لە دڵی خەڵکەکەدا جێی خۆی کردبۆوە و رێزێکی باشیان لێ ئەگرت .. کاروباری مەککەش لەو رۆژەدا لە دەستی حولەیلی کوڕی حوبشیەی خوزاعییدا بوو .. ئەم پیاوە کچێکی هەبوو بە ناوی ( حوبا ) و ، قوصەی داوای کرد بۆ خۆی و ، باوکیشی کە ئەوەندە قوصەی چوو بوو بە دڵدا لێی مارە کرد . ئەوەبوو لەو ئافرەتە چوار کوڕی بوون : ( عبدالدار ) و (عبدمناف ) و ( عبدالعزی ) و ( عبد ) . بەرە بەرە وەچە و بەرەی قوصەی پەرەیان سەند و ، ماڵ و سامانیشی زۆر بوو و بووە خاوەنی پایە و پلەیەکی بەرزیش ..

**سێهەم : دەسەڵاتی قوصەی**

دوای ماوەیەك حولەیلی کاربەدەستی مەککە مرد و ، قوصەی کە سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد ، دیتی کە خۆی لە خوزاعە شیاوترە تا کاروباری مەککە بەڕێوە بەرێت ، چونکە لەناو نەوەی ئیسماعیلدا قورەیش لە هەمووان پایەدارترن و کوڕی راستەقینەی ئەویشن ..

بۆ ئەمە وت و وێژی لەگەڵ چەند پیاوێکی قورەیشیی و نەوەی کینانەدا کرد و، داوای لێ کردن تا یارمەتیی ئەوەی بدەن خوزاعە و نەوەی بەکر لە مەککەدا دەرکەن . ئەوانیش هاتن بە دەمیەوە . هەروەها داوای لە ریزاحی کوڕی رەبیعە کرد کە برای دایکیی خۆی بوو ، ئەویش لەگەڵ برا باوکییەکانی تریدا هاتن و یارمەتییان دا و ، جەنگێکی ناهەموار لەگەڵ خوزاعە و نەوەی بەکردا رووی دا و، سەرەنجام قوصەی و کۆمەڵەکەی سەرکەوتن و ، ئەوانی تر تێك شکان و لە مەککە دەریان پەڕاندن و ، کاروباری مەککە و سەروکاریی کەعبە کەوتە دەست قوصەی . ئەویش خزمەکانی لە کەعبە نزیك خستنەوە ، کە جاران لە دووری کەعبەوە بوون، کۆی کردنەوە و ، خزمەکانی و دانیشتوانی مەککە کردیانە پادشا و سەرداری خۆیان .. بەمە قوصەی یەکەم کەسێکە لە نەوەی کەعبی کوڕی لوئەیدا کە پادشایەتیی دەست بکەوێت و قەومەکەشی گوێڕایەڵیی بۆ بکەن ..

هەروەها هەموو کارە گرنگەکانی کەعبە کە بە دەست قورەیشەوە بوون درانەوە دەست قوصەی .. ( حجابة ) و ( سقاية ) و ( رفادة ) و ( لـواء ) و ( نـدوة ) [٣٤] هەموویان لە دەستی ئەودا بوون ..

بەمە هەموو پایـە و دەسـەڵاتێکی مەککـە لـە دەسـتیدا بـوو .. ئـیتر هـیچ ئافرەتێـك شـووی نەئـەکرد و ، هـیچ پیـاوێکیش ژنـی نەئـەهێنا و ، لـە بـارەی کاروبارێکیشەوە راوێژ نەئەکرا و ، ئاڵا بۆ هیچ جەنگێك ئامادە نەئەکرا لە مـاڵی ئەودا نەبوایە .

کاتێك کە قورەیش لە دەوروبەری کەعبەدا خانوویان کـردەوە ، ئەوەنـدەی کـە بەشی طـەواف بکـا زەویـیـان بـە دەوری کەعبـەدا بـەجێ هێشـت و ، لـە نێـوان خانووەکانیشیاندا کۆڵانیان بـۆ هـات و چـۆی حاجیـیـان هێشـتەوە و ، قوصـەی خۆیشی ( دار الندوة )ی بۆ دانیشتنی خۆی هەڵ بژارد و رووی دەرگاکەشـی کـردە کەعبە . ئیتر قورەیش هەر ئیش‌وکارێکیان بوایە لەوێ ئەنجامیان ئەدا .

ئەڵێن : حولەیل خۆی وەسیەتی کردووە کە دوای خۆی قوصەی کاروبار بگرێتـە دەست ، ئەمەش دوای ئەوەی کە وەچە و بـەرەی قوصـەی لـە کچـەکەی حولـەیل پەرەیان سەند ، بەڵام خوزاعە ئەمـەیان بـە قوصـەی رەوا نـەبینی ، تـا ئـەوەبوو جەنگ بەرپا بوو و قوصەی سەرکەوت .

هەروەها ئەڵێن : حولەیل کلیلەکان تەسلیمی ئەبوغەبشانی خوزاعەیی ئـەکات ، بەڵام ئەم پیاوە پیاوێکی سـەرخۆش ئـەبێت و ، قوصـەی بـە کووپەیـەك عـەرەق کلیلەکانی لێ ئەکڕێت . بۆیە هەرکەسێ تووشی زەرەر و زیان ببوایە پێیان ئەوت : (( أخسر من صفقة أبي غبشان )) . واتە : لە مامەڵەکەی ئەبوغەبشان دۆڕاوترە .

قوصەی یەکەم کەس بوو کە ( رفادة ) واتـە نـان‌دان بـە حاجیـیـانی داهێنـا و فەرزی کرد لەسەر قـورەیش کـە پێـی وتـن : (( ئـەی کۆمـەڵی قـورەیش ! ئێـوە

[٣٤] حجابة : واتە کلیلی کەعبە لە دەستی ئەو کەسەدا بن و بەرپرسی ئەو کەس نەچێتە ناو کەعبەوە .
سقاية : ئاودانی حاجی‌یانە لە کاتی حەجدا ، ئەویش بەوە ئەبێت کە ئاوی زەمزەم تێکەڵ بە هەنگوین یان ماست یان شەربەتی خورما و مێوژ بکرێت . کاتێکیش کە زەمزەم پڕ کرابوویەوە لە دوورەوە ئاویان ئەهێنا ..
رفادة : قورەیشی‌یەکان هەموو ساڵێك خواردنیان بۆ حاجی‌یان کۆ ئەکردەوە و پێشکەشیان ئەکردن و ، ئەیان‌وت: ئەمانە میوانی خوای گەورەن .
لواء : واتە ئاڵای‌جەنگ و ئەو کەسە هەڵی ئەگرێ .
ندوة : ئەو کەسە سەروکاریی ( دار الندوة ) ی ئەکرد و سەرۆکی کۆبوونەوەکانی قورەیش ئەبوو .

دراوسێی خوان و ، خاوەنی ماڵەکەی ئەو و حەرەمن . حاجی‌یانیش میوانی خوا و، بەسەرکەرەوەی ماڵی ئەون ، لە هەموو میوانێك زیاتر مافی ڕێز لێ‌نانیان هەیە .. جا لە ڕۆژانی حەج‌دا هەتا بەجێ‌تان ئەهێڵن خـواردن و خواردنـەوەیان بـۆ ئامـادە بکەن )) . قوڕەیشیش بەگوێیان کرد .

**چوارەم : دەسەڵاتی عەبدوددار**

قوصەی هێشتا لە ژیان‌دا بوو عەبدمەنافی کوڕی پایە و پلەی لـەناو کۆمـەڵ‌دا وەرگرت و ناوبانگی دەرچوو، هـەروەها ( عبدالعزی ) و ( عبـد ) ی کوڕیشـی ، کەچیی ( عبدالدار ) ی کوڕی کە کوڕە گەورەشی بوو بە هیچ شێوەیەك دیار نەبوو، بۆیە کە باوکی چوو بە ساڵ‌دا و هێزی تیا نەما ، بە ( عبدالدار ) ی کوڕە گەورەی وت : بەخوا کوڕەکەم ! هەر چەندە ئەوان داویانە بە سەرتا ، بەڵام ئەبێ بت‌گەیـەنم پێیان .. ئەبێ هیچ پیاوێکیان نەچێتە ناو کەعبەوە هەتا تۆ دەرگای بۆ نەکەیتەوە و ، قوڕەیشیش نەتوانێ بۆ هیچ جەنگێکی ئاڵا هەڵ بکات بە دەستی تۆ نـەبێ و ، هیچ حاجی‌یەکیش لە هیچ خۆراکێك نەخوا لە خۆراکی تۆ نـەبێت و ، قوڕەیشـیش لە ماڵەکەی تۆدا نەبێ هیچ کارێکی ئەنجام نـەدات . ئەوەبـوو ( دار النـدوة ) و ( حجـابة ) و ( لواء ) و ( سقاية ) و ( رفادة ) ی پێ دا ..

**پێنجەم : دەسەڵاتی هاشم**

دوای قوصەی عەبدوددار هەموو پلەکانی وەرگرت و لەبەر فـەرمانی باوکیـان براکانی بێ‌دەنگ بوون .. هەر چوار براکە چـوون بـە سـاڵ‌دا و منداڵـەکانیان پـێ گەیین .. هەر چۆن عەبدمەناف لێ‌هاتوو و ناودار بوو لـە چـاو عەبـدوددارا ، بـە هـەمان شـێوە کوڕەکانیشـی لێ‌هـاتوو و پایـەداری نـاو کۆمـەڵ بـوون لـە چـاو ئامۆزاکانیان‌دا .. لەبەر ئەمە عەبدشەمس و ، هاشم و ، موطەللیب و ، نەوفـەلی کوڕانی عەبدمەناف بڕیاریان دا کاروباری مەککە لە ژێر چنگی ئامۆزاکانیـان دەر بهێـنن .. بـۆ ئەمـە قـوڕەیش بوونـە دوو بـەش : هەنـدێ لەگـەڵ ئـەمان‌دا و ، هەندێکیش لەگەڵ ئەوان‌دا .. هەردوولا خۆیان بۆ جەنگێکی ناهەموار ئامادە کرد و ، هەر یەکە لەگەڵ هاوپەیمانی خـۆی‌دا بـەڵێنی کـوڵ‌نـەدانی دا . ئـەم جـەنگە ئـەگەر رووی بدایە زۆر ناهەموار ئەبوو و ، قـوڕەیش پیـاوی زۆری لێ ئـەکوژرا . بەڵام خوای گەورە ویستی وابوو رێك بکـەون و جـەنگ روو نـەدات . خـۆ ئەگـەر وابوایە زۆربەی ئەوانەی کە هاوەڵە ناودارەکانیان لێ کەوتەوە ئەکوژران و ئەبوونـە

سووتەمەنیی جەنگ . ئەوەبوو لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کە ( سقاية ) و ( رفـادة ) بدرێ بە نەوەی عەبدمەناف و ( حجابة ) و ( لـواء ) و ( نـدوة ) ش بۆ نـەوەی عەبدوددار و ، ئەم دابەش‌کردنە هەروا مایەوە و پشتاوپشت ئەنجامیان ئەدان هەتا ئیسلام هات .

جا وا دەرئەکەوێ کە موطـەللیب و نەوفەلی کوڕانی عەبدمەناف لەبەر کـەمیی تەمەنیان خۆیان زۆر لە هەڵسووڕاندنی کاروبار نەدابێت ، بۆیە ( رفادة ) و ( سقاية ) مانەوە بۆ ( عبدشمس ) و ( هاشم ) . عەبد شەمس یش پیاوێکی گەڕیدە بـوو و ، کەم لە مەککە ئەبوو و ، لە هەمان کات‌دا منالّی زۆر بـوون و دەستیشـی کـورت بوو . بەڵام هاشم دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتوو بوو ، لەبەر ئەوە هەردوو کارەکـەی گرتنە دەست ، هەرچەندە عەبد شەمس بە تەمەن گەورەتریش بوو .

جا بۆ نان‌دانی حاجی‌یان هاشم کۆمەکیی لـە قـوڕەیش داوا ئـەکرد . ئـەوەبوو هەرچیی حاجیی بهاتنایە ، لەناو قوڕەیش‌دا هەڵ ئەستا و ئەی‌وت :

(( ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! ئێوە دراوسێی خوا و خاوەنی ماڵەکەی ئەون و ، لەم وەرزەش‌دا میوانـانی خـوا و حـاجی‌یانی ماڵەکەی دێنە لاتان و، ئەوانیش میوانی خوان و ، میوانی خواش لە هەموو میوانێك زیاتر مافی ڕێزلێ‌گرتنی هەیـە . جـا بۆ ئەم چەند ڕۆژەی کە پێویستە لێرە بمێننەوە ئەوەندە کۆ بکەنەوە تا خۆراکیان بۆ دروست بکەن . خۆ بەخوا ئەگـەر سـامانی خـۆم بەشـی بکردایـە داوام لـە ئێـوە نەئەکرد )) . ئەوانیش بە گوی‌یان ئەکرد و ، لە ماڵ و سامانیان ، هەر کەسـە بـە پێ‌ی توانای خۆی ، ئەوەندەیان کۆ ئەکردەوە کە تا حاجی‌یان مەککە بەجێ ئەهێڵن خواردنیان بۆ دروست بکەن .

ئەڵێن : هاشم یەکەم کەسێکە کـە گـەشتی زسـتانە و هاوینـەی بـۆ قـوڕەیش داهێناوە و ، یەکەم کەسێکیشە کە نانی گـوشیوەتە ناو گۆشـتاوەوە و پێشـکەش بە حاجی‌یان کراوە ، ئەگینا خۆی ناوی عەمر بووە و ، بە بۆنەی ئەو تێ‌گوشینەوە نازناوی هاشمیان لێ ناوە .

لە سەردەمی هاشم‌دا مەککە گەشەیەکی باشـی کـرد و ، پایـە و پلـەی لـەناو دوورگەدا بەرز بوویەوە و ، بووە پایتەختی وڵاتی عەرەبان و ، پـەیمانی ئاشـتیی و ئاسایشیان لەگەڵ دەوڵەتەکانی دەوروبەریان دا ، وەك ڕۆم و ، فارس و ، حەبەشە و، غەسساسینە بەست .

هاشم بە درێژایی تەمەنی خەریکی خزمەت بوو .. بەرە بەرە ئەچوو بە ساڵدا .. هیچ کەس بیری لەوە نەئەکردەوە کە هەوڵ بدا کاروبـار لـە هاشـم وەربگرێتـەوە ، بەڵام ئەوەبوو ئومەییەی کوڕی عەبـد شەمسـی بـرازای کەوتـە بـیری ئـەوەی کـە مامەی لا بدات و خۆی کاروبار هەڵ بسـوورێنێ .. بـۆ ئەمـە کەوتـە بەرابـەرکێ کەچیی بێ سوود بوو .. هاشم لەسەر کاری خۆی مایەوە و ، بۆ ماوەی دە ساڵیش ئومەییە مەککەی بەجێ هێشت و لە شام نیشتەجێ بوو ..

بەڵێ ، هاشم ی کوڕی عەبدمەناف بازرگانێکی دەوڵەمەنـد بـوو و ، گەشـت و گەڕانیشی زۆر بوو ، بە تایبەت بۆ وڵاتی شام .. لە یـەکێ لـەو گەشـتانەیدا لای دایە شاری یەثریب و، چاوی بە سەلمای کچی عەمری نـەججاریی کـەوت و ، دڵـی چووە سەری و داوای کـرد .. سـەلماش ئەوەنـدە خـاوەنی پایـە و پلـە بـوو لـەناو خزمەکانیا ، بڕیاری ئەوەی دابوو کە بە پیاوێ مێرد ئەکات کە کاروباری نیکاح و تەڵاقی بداتەوە دەست خۆی ، واتە هەر کەی پیاوەکەی نەویسـت یەکسـەر بتـوانێ بەجێی بهێڵێ .. هاشم سەلمای مارەکرد و هەر لـەوێ لای کـەس و کـاری بـەجێی هێشت و خۆی چوو بۆ گەشتی شام .. سەلماش سکی پڕ بوو .. ئەوەبوو هاشـم لـە غەززەی فەلەستین کۆچی دوایی کرد و سەلماش ساڵی ٤٩٧ ز عەبـدولموطـەللیبـی بوو و بە بۆنەی ئەوەوە کە پەڵە قژێکی سپی وەك نیشانە بە سەریەوە بوو ناوی نـا ( شەیبە ) . ئـیتر سـەلما و کوڕەکـەی پێکـەوە لـە مەدینـە مانـەوە و خزمـانی مەککەیان لەمە ئاگادار نەبوون .

شایانی باسە کە هاشم چوار کوڕی هەبوون : ئەسەد و ئەبوصەیفیی و نـەضلە و عەبدولموطەللیب ، هەروەها پێنج کچی هەبوون : شیفاء و ، خالیدە و ، ضەعیفە و ، روقییە و ، جەننە .[٣٥]

دوای مردنی هاشم ، موطەللیبی برای کاری ( رفـادة ) و ( سـقایة ) ی گرتـە دەست . ئەمیش خاوەنی رێـز و پایەیـەکی بـەرز بـوو لـەناو قەومەکـەیدا ، بـە رادەیەکیش لێبوردە و دڵگوشاد و سەخیی تەبیعەت بـوو ، قوڕەیش ناویـان نابوو ( الفیض ) .

---

[٣٥] الرحیق المختوم : ٤٨ .

موطەللیب کە هەواڵی زانیی بیری کردەوە کە شەیبەی کوڕی هاشمی برای وا لە یەثریب لەلای دایکی و ئیتر کاتی ئەوەی هاتووە بێتەوە لای کەس‌وکاری . سواری ولاغ بوو و خۆی گەیاندە یەثریب و چوو بۆ لای سەلما و داوای لێ کرد کە شەیبەی لەگەڵدا بنێرێتەوە ، وا خەریکە بالغ ئەبێت . سەرەتا سەلما هەندێ نەیاریی کرد ، بەڵام دوایی قەناعەتی کرد و شەیبەی رەوانە کردەوە .. موطەللیبیش شەیبەی خستە پاشکۆی خۆی و هێنایەوە . کە بەم شێوەیە خۆیان کرد بەناو شاری مەککەدا قورەیش وایان هەست کرد کە ئەمە بەندەیە و موطەللیب کڕیویەتی، بۆیە هاواریان کرد : ئەمە بەندەی موطەللیبە و کڕیویەتی . موطەللیبیش وتی : ماڵتان ئاوا بێ . ئەمە کوڕی هاشم ی برامە و لە یەثریب هێناومەتەوە . ئیتر لەو کاتەوە نازناوی عەبدولموطەللیب بڕڕا بەسەر شەیبەدا و ناوە راستەقینەکەی بوو بە ژێرەوە و لە بیر چوویەوە ..

**شەشەم : دەسەڵاتی عەبدولموطەللیب**

دوای ماوەیەك موطەللیب کۆچی دوایی کرد و ، عەبدولموطەللیب بووە جێگری و نان دان و ئاودانی حاجی‌یان کەوتە ئەستۆی ئەو . ئەویش شانی دایە بەر و بووە خاوەنی رێز و پایەیەکی ئەوتۆ کە هیچ کەسێ لە باوباپیری بەو پلەیە نەگەیشتبوون .. خەڵکەکە یەکجار خۆشیان ئەویست .. بووە سەرداری هۆزی قورەیش و ماقووڵترین پیاوی ..

کاتێك کە عەبدولموطەللیب ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام ئەدا لە نان‌دان و ئاودانی حاجی‌یان تووشی ناڕەحەتی‌یەکی زۆر بوو ، بە تایبەت لە ئاوداندا .. چونکە ئەو کاتە ئەو تەنها حاریثی کوڕی هەبوو و ، دەمێکیش بوو بیری زەمزەم پڕ کرابوویەوە و شوێنەوارێکی نەبوو .. بۆیە عەبدولموطەللیب ناچار بوو لە چەند بیرێکی جیا جیای دەوروبەری مەککە ئاو بهێنێ و بی‌کاتە چەند حەوزێکەوە لە پەنای کەعبەدا .. کەواتە بۆ ئەنجام‌دانی ئەم کارە پێویستیی بە کوڕی زۆر هەیە ، تا یارمەتیی بدەن . بۆیە عەبدولموطەللیب هەمیشە لە بیری ئەوەدا بوو ..

لە کاتێك‌دا کە عەبدولموطەللیب لە بیری ئەمەدا بوو خەوێکی بینیی کە مایەی سەرفرازیی و ئاسان کاریی بوو .. ئەوەبوو ئاوی زەمزەم وەك جاران دەرکەوتەوە و حاجیان لێ‌یان ئەخواردەوە و ، عەبدولموطەللیبیش مێوژی ئەکڕیی و بە ئاوی زەمزەم شەربەتی دروست ئەکرد و ، جاری وایش ئەبوو تێکەڵ بە شیر ، یان هەنگوینی ئەکرد و ، دەرخواردی میوانەکانی خوای ئەدا ..

**حەوتەم : خەوەکەی عەبدولموطەللیب**

عەبدولموطەللیب خۆی گێڕاویەتەوە کە لە حیجردا خەوی پیا ئەکەوێت و کەسێك دێتە خەوی و فەرمانی بەسەردا ئەکات کە بیری زەمزەم هەڵ بکەنێت ، بەڵام بە ( طيبة ) ناوی زەمزەم ئەبات . کە ئەپرسێ : طیبە چی‌یە ؟ ئەو کەسە ئەڕوا و بەجێی ئەهێڵێ .

بۆ سبەینێ ئەگەڕێتەوە بۆ هەمان شوێن و تیایا ئەخەوێ . دیسان ئەو کەسە دێتەوە لای و فەرمانی بەسەردا ئەدا کە هەڵی بکەنێ ، بەڵام بە ( بَـرَّة ) ناوی ئەبات . کە ئەپرسێ : برة چی‌یە ؟ دیسان بەجێی ئەهێڵێ ..

بۆ جاری سێ‌هەم خەوی پیا ئەکەوێتەوە و ، ئەو کەسە دێتەوە خەوی و فەرمانی بەسەردا ئەدا کە بیری ( مضمونة ) هەڵ بکەنێ . کە ئەپرسێ : مضمونة چی‌یە ؟ دیسان بەجێی ئەهێڵێ .

بۆ رۆژی چوارەم لە هەمان شوێن‌دا ئەخەوێ و ، ئەو کەسە فەرمانی بەسەردا ئەداتەوە تا بیری زەمزەم هەڵ بکەنێ . کە ئەپرسێ : زەمزەم چی‌یە ؟ ئەڵێت : هەرگیز ئاوی لێ نابڕێ و دەست ناگاتە بنی و ، ئاویشی کەم ناکات ، کۆمەڵی حاجی‌یان تێر ئاو ئەکات و ، وەك شیری ئاژەڵ لە نێوان پیسیی و خوێن‌دا دێتە دەرەوە ، ئەمیش وەهایە .. لەو شوێنەدا کە ئەو قەلەڕەشەی کە قاچێکی سپی‌یە دەنووك لە زەویی ئەدات .. لە نزیك شارە مێرووڵەکەدا ..

ئەم خەوە و ناونیشانی شوێنی بیرەکە وەهایان لە عەبدولموطەللیب کرد کە بڕوا بکات و ، بچێت بە دەم فەرمانەوە .. دەستی دایە زەنگنەکەی و حاریثی کوڕیشی لە گەڵیا بوو کە ئەو رۆژە هەر تەنها ئەوی هەبوو .. دەستی بە هەڵ کەندن کرد ، تا گەیشتە سەر ئەو بەردانەی کە بیرەکەیان پێ داپۆشرابوو و دەستی بە ( الله أكبر ) کرد .. قورەیش زانی‌یان عەبدولموطەللیب دەستی لە شتێك گیر بووە ، بۆیە هەڵسان و هاتنە لای و وتیان : عەبدولموطەللیب ! ئەمە بیرەکەی ئیسماعیلی باپیرمانە و ، ئێمەش مافمان پێوەی هەیە و ، لەگەڵ خۆت‌دا بەشدارمان بکە .. وتی : شتی وەها ناکەم !! ئەم کارە تایبەت‌مەندە بە خۆمەوە .. وەك بڵێ : بە تایبەتیی فەرمان بەسەر من‌دا دراوە کە ئەم بیرە هەڵ بکەنم . وتیان : بە ئینصاف بە لەگەڵمان ، چونکە ئێمە دەست بەردارت نابین و ، دێین بە گژتا ..

وتی : دەی کێتان پێ خۆشە بیکەنە حەکەمی نێوانمان تا بتانبەمە لای . وتیان: ئافرەتە کاهینەکەی نەوەی سەعد کە ناوی هوذەیم ە ، وتی : باشە . بەڵام ئەم ئافرەتە لەسەر سنووری شام بوو ..

عەبدولموطەللیب لەگەڵ چەند پیاوێکی نەوەی عەبدمەنافدا سوار بوون و ، لە هەموو هۆزێکی قورەیشیش پیاوێك کەوتە گەلیان .. بە بیابانی چۆڵ و بێئاو و ئاوەدانییدا کەوتنە رێ .. ماوەیەك رێیان بڕیی .. دوای ئەوە دەستەی عەبدولموطەللیب چیی ئاویان پێ بوو تەواو بوو .. ئەوەندە تینوویان بوو خەریك بوو قورگیان وشك بێتەوە .. هاوەڵەکانیان لە هۆزەکانی تر ئاویان لا مابوو و بەشیان نەدان و ، وتیان : ئێمەش لە چۆڵەوانییدایىن و لە خۆمان ئەترسین وەك ئێوە تینوومان بێ ..

عەبدولموطەللیب وای بە چاك زانیی هەر یەکە قەبری خۆی هەڵ بکەنێ .. هەموو هەڵیان کەند و لەسەر قەبرەکان دانیشتن و چاوەڕوانی مردن بوون ..

ئەمە بە کەڵك نەئەهات .. عەبدولموطەللیب بیرێکی تری بۆ هات .. بە هاوەڵانی گەیاند کە نابێ بەو شێوەیە خۆیان تەسلیمی مەرگ بکەن و ، گەر هەروا دانیشن و بە دوای ئاودا نەگەڕێن دەستەپاچەیییە . داوای لێ کردن هەستن بەڵکو خوای گەورە لە شوێنێکدا ئاومان پێ ببەخشێ .. عەبدولموطەللیب و دەستەکەی ویستیان بار بکەن و بە دوای ئاودا بگەڕێن . کە ویستی وشترەکەی هەڵ بستێنێ لە ژێر پێیی ولاغەکەیدا کانیاوێکی سازگار هەڵ قولا .. عەبدولموطەللیب ( الله أكبر ) ی کرد و هاوەڵانیشی بەدوایدا .. دابەزیی و خۆی و هاوەڵانی تێر ئاویان خواردەوە و ، دەفر و کوندەکانیان لە ئاو پڕ کرد .. پاشان بانگی کردە قورەیشییەکانی تر و وتی : وەرن بۆ ئاو خواردنەوە خوای گەورە ئاوی بۆ گەیاندین .. ئەوانیش هاتن و ، تێر ئاویان خواردەوە و ، ئاوی ولاغەکانیان دا و پاشان وتیان : بەخوا ، عەبدولموطەللیب ! بڕیاری دادگات بۆ دەرچوو .. بەخوا هەرگیز لەسەر ئاوی زەمزەم بەربەرەکانێت لەگەڵدا ناکەین .. ئەوەی کە لەم بیابانەدا ئاوی بۆ گەیاندی ، هەر ئەویش ئاوی زەمزەمی پێ بەخشیوی .. بەسەری بەرزەوە بگەڕێرەوە سەر ئاودانەکەی خۆت .. هەموو پێکەوە گەڕانەوە و وازیان لە کاهینەکە هێنا و نەچوونە لای ..

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە کاتێ عەبدولموطەللیب خەوەکەی دیی لەگەڵ حاریثی کوڕیدا چوونە سەر ئەو شوێنەی کە بۆی وەسف کرابوو .. شارە مێرووولەکەی دۆزییەوە و ، دیتی وا ئەو قەلەڕەشەی کە قاچێکی سپییە لە نزیك شارە مێرووولەکەدا و ، لە نێوان هەردوو بتی ( إساف ) و ( نائلة ) دا دەنووك لە زەویی ئەدا ..

زەنگەنی هێنا و لەو شوێنەدا کە فەرمانی پێ درابوو دەستی بە بیرهەڵکەندن کرد .. قورەیش لێی راست بوونەوە و وتیان : بەخوا دەستبەردارت نابین لەنێوان ئەو دوو بتەماندا ، کە لەبەر دەمیاندا ئاژەڵ ئەکەینە قوربانیی ، بیر هەڵ بکەنیت .

عەبدولموطەللیب بە کوڕەکەی خۆی وت : تۆ پارێزگارییم لێ بکە تا خۆم خەریکی هەڵکەندن بم . بەخوا لەسەر ئەوەی کە فەرمانم پێ دراوە بەردەوام ئەبم ، جا کە قورەیش زانییان لەسەر کاری خۆی سوورە ، وازیان لێ هێنا .. ئەوەبوو زۆری هەڵ نەکەند گەیشتە ئەو بەردانەی کە بیرەکەیان پێ داپۆشرا بوو و دەستی بە ( الله أكبر ) کرد و بۆی دەرکەوت کە خەوەکەی راستە و فەرمانی تایبەتییە .

کە چووە خوارەوە جووتە ئاسکە زێڕەکەی دۆزینەوە .. پاشان شمشێر و قەڵغانەکانی دۆزینەوە . ئیتر ئەوەبوو قورەیش هاتن و وتیان : ئێمە لەمەدا هاوبەشتین .. وتی : نەخێر . دوایی بە شێوەی ( قداح ) تیروپشکی کرد و هەردوو ئاسکەکە بۆ کەعبە دەرچوون و ، شمشێر و قەڵغانەکانیش بۆ عەبدولموطەللیب ، بەڵام قورەیش هیچیان بۆ دەرنەچوو .

دوای ئەوەی کە بیری زەمزەم پڕ کرابوویەوە و مەککە کەم ئاو بوو ، قورەیشییەکان ناچار بوون لە مەککەدا چەند بیرێك هەڵ بکەنن .. هاشم ی کوڕی عەبدمەناف لە دەمی شیوی ئەبوطالیبدا بیرێکی هەڵ کەند و ، لە ژوورووی مەککەیشەوە عەبد شەمسی کوڕی عەبد مەناف بیرێکی هەڵ کەند و ، ئومەییەی کوڕی عەبد شەمسیش بیرێکی بۆ خۆی هەڵ کەند و ، نەوەکانی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززاش بیرێك و ، نەوەکانی عەبدوددااریش بیرێك و ، نەوەکانی جومەح و ، نەوەکانی سەهمیش هەریەك بیرێکیان هەڵ کەند ..

جا کە عبدولموطەللیب بیری زەمزەمی هەڵ کەندەوە خەڵکەکە پشتیان لە ئاوی بیرەکانی تر هەڵ کرد و روویان کردە بیری زەمزەم ، بە بۆنەی ئاوی سازگاریەوە و ،

لەبەر پایە و پلەی مزگەوتی حەرام و ، لەبەر ئەوەش بیری ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە سەلامیان لێ بێ ..

جا لە بارەی فەضل و گرنگیی ئاوی زەمزەمەوە فەرموودەی زۆر هاتوون ، یەکێ لەوانە ئەو فەرموودەیە کە ئیمام موسلیم ریوایەتی کردووە کاتێك کە چیرۆکی موسڵمانبوونی ئەبوذەر خوا لێی رازیی بێ ئەگێڕێتەوە : (( إنَّها طَعامُ طعم )) . ئەبوداوودی طەیالیسییش بەم شێوەیە ریوایەتی کردووە : (( طعامُ طعمٍ ، وشفاء سُقمٍ )) . واتە هەم خۆراکە و هەم شیفای نەخۆشییشە .

هەروەها ئیمام ئەحمەد لە جابیرەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( ماء زمزم لما شُرب له )) واتە : ئاوی زەمزەم بۆ هەر نیازێك بخورێتەوە بە کەڵك دێت . بۆ خۆراك ، بۆ خواردنەوە ، بۆ دەرمان ، بۆ دوعا .

هەروەها دارقطني و حاکم بە صەحیحیی لە ئیبن عەبباس ەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەتیان کردووە کە فەرموویە :

(( ماء زمزم لِما شُربَ له : إنْ شَربتَهُ لِتَستَشْفِيَ شفاكَ الله ، وإن شربته لِشَبَعِكَ أشبَعَكَ الله ، وإن شربته لِقَطعِ ظمئِكَ قطعَهُ الله ، وهي هزمة جبريل ، وسقيا الله إسماعيل )) .

فەرموویە : ئاوی زەمزم بۆ هەر مەبەستێ بخورێتەوە بە کەڵکە : ئەگەر بۆ شیفای نەخۆشیی خواردتەوە ، خوا شیفات بۆ ئەنێرێ .. گەر بۆ تێربوونیش خواردتەوە، خوا تێرت ئەکات .. گەر بۆ نەمانی تینوێتییش خواردتەوە ، خوا تینوێتییت لا ئەبا.. ئەمە کاری لێدانی جیبریلە بە پێی یان بە باڵی و ، خوای گەورە ئیسماعیلی پێ تێراو کردووە . ئەم فەرموودە ( حافظ الدمياطي ) بە صەحیحی داناوە و ( حافظ العراقي ) ش دانی پیا ناوە .

ئیبن ماجە و حاکم لە ئیبن عەبباس ەوە ئەگێڕنەوە کە بە پیاوێکی وتووە : ئەگەر ئاوی زەمزەمت خواردەوە روو بە قیبلە بووەستە و ، ناوی خوا بێنە و ، بە سێ جار ئاوەکە بخۆرەوە و ، هەموو جارێکیش هەناسە بدە و ئەوەندەشی لێ بخۆرەوە کە بندەستت بئاوسن .. کە لێیش بوویتەوە سوپاسی خوا بکە ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( إن آية ما بيننا وبين المنافقين أنهم لا يتضلعون من زمزم )) . ( البداية والنهاية : ٢ / ٢٤٧ ) . فەرموویە : نیشانەی جیاکەرەوەی ئێمە و مونافیقان ئەوەیە کە ئەوان ناتوانن لە زەمزەم زۆر بخۆنەوە کە بندەستیان بئاوسێ .

ئاوی زەمزەم کاتێ کە لە بیرەکە دێتە دەرەوە یەکجار شیرین و سازگارە .. هەر ئەڵێی شیرە و تازە لە گوان دۆشراوە و ، ساردکردنەوەی یان کردنی بە هەڵم لە سروشتی خۆی دەری ئەکات .

ئاوی زەمزەم بە چەندین تاقیی‌کاریی کەڵك و سوودی لە بواری تەندروستیی و خۆراکیی‌دا زانراوە . بەڵام سوود و کەڵکی بۆ ئەو کەسەیە کە بڕوای پێی هەبێ کە ئاوێکی تایبەتی‌یە و خوای گەورە خۆی بەهرەی پێ داوە . ئەوانەش کە وەهای بۆ ئەچن کە هیچی تیا بەسەر نیە ئەوانە ناتوانن بی‌خۆنەوە و کەڵکیش لە خواردنەوەی نابینن ..[٣٦]

**هەشتەم : نەزری سەربڕینی کوڕێک**

عبدولموطەللیب بەو بۆنەوە کە کوڕی کەم بوون تا بەرگریی لێ بکەن ، تووشی ناڕەحەتیی و چەرمەسەریی زۆر هات ، بە تایبەت لەو کاتەدا کە ویستی بیری زەمزەم هەڵ بکەنێت .. هەتا هی وایان هەبوو ئەی‌دا بە گوێی عبدولموطەللیب‌دا کە چۆن ئەوەندە قاچ رائەکێشێ ، کە ئەو تاقە و کوڕی زۆری بە دەوردا نیە !!

ئەمە کاری کردە سەر دڵی عبدولموطەللیب و نەزری بۆ خوا کرد کە ئەگەر خوا دە کوڕی بداتێ و ، ئەوەندە گەورە بن کە بتوانن بەرگریی لە باوکیان بکەن ، لە پەنای کەعبەدا یەکێکیان سەر ببڕێ !!

خوای گەورە ویستی وەها بوو کە دە کوڕی بە عبدولموطەللیب بەخشیی و ئەوەندەش گەورە بوون کە بەرگریی لێ بکەن .[٣٧]

دوای ئەمە عبدولموطەللیب کوڕەکانی کۆکردنەوە و ، هەواڵی دانێ کە ئەو نەزرەی بۆ خوا بڕیار داوە .. ئەڵێن : لە خەوی‌دا نەزرەکەی بیر خراوەتەوە و ، ئەویش داوا لە کوڕەکانی ئەکات کە ئەم بەڵێنەی بۆ ئەنجام بدەن ، ئەوانیش گوێڕایەڵیی بۆ ئەکەن و ، ئەڵێن : چیی بکەین ؟ ئەڵێت : هەر یەکەتان تیریك هەڵ

---

[٣٦] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ١٤٥ ـ ١٥٩ ، والسيرة النبوية للصلابـي : ٣٧ ـ ٣٩ .

[٣٧] ئەڵێن دوای سیی ساڵ لە هەڵکەندنی زەمزەم ئەم ئاواتەی عبدولموطەللیب هاتۆتە دیی . کوڕەکانیشی ئەمانەن : ١ ـ حاریث : گەورەترین کوڕی بووە کە دایکی صەفیەی کچی جوندوبە . ٢ ، ٣ ، ٤ ـ زوبەیر و ئەبوطالیب و عەبدوڵلاّ کە دایکیان فاطیمەی کچی عەمری کوڕی عائیذی مەخزوومی‌یە . ٥ ، ٦ ، ٧ ـ حیجل و موقەووەم و حەمزە کە دایکیان هالەی کچی وهەیبە . ٨ ، ٩ ـ ضرار و عەبباس کە دایکیان نەتلە یان نوتەیلەیە . ١٠ ـ ئەبولەهەب ، عبدالعزى کە دایکی ئامینەی کچی هاجەرە . هەروەها شەش کچیشی بوون کە پووری پێغەمبەر بوون ﷺ کە ئەمانەن : صەفیە ، ئوم حکیم البیضاء ، عاتیکە ، ئومەیمە ، ئەڕوا ، بەڕڕە .

بگرێت و ناوی خۆی لەسەری بنوسێت ، پاشان بۆم بێنن . ئەوانیش فەرمانەکەیان ئەنجام دا . ئەویش چووە ژوورەوە ناو کەعبە بۆ لای هوبەل کە لەناو کەعبەدا بوو و فەرمانی بەو کەسە دا کە قورعەکە ئەکات و باسەکەی بۆ گێڕایەوە کە ئەیەوێ کوڕێکی هەڵ ببژێرێ و سەری ببڕێ .

یەکەم کوڕێك کە عبدولموطەللیب زۆری خۆش ئەویست عەبدوڵڵای کوڕی بوو و، ئاواتی ئەوەبوو ناوی ئەو دەر نەچێ و ئەو رزگاری بێ ، ئیتر کوڕەکانی تری هەر کامیان بەر بکەوێ قەیدی نیە . هەر کە کابرای قورعەچیی خزمەتکاری هوبەل هەستا تا کاری خۆی ئەنجام بدا ، عبدولموطەللیب دەستی بە نزا و پاڕانەوە کرد . کەچیی لەناو هەموویاندا ناوی عەبدوڵڵا دەرچوو . عبدولموطەللیب ویستی سەری ببڕێ . خێرا خاڵوانی کوڕەکە لە نەوەی مەخزووم هەڵسان و وتیان : بەخوا سەری نابڕیت هەتا چارەیەکی بۆ بدۆزیتەوە . جا ئەگەر لە سامانمان کرا فیدیەی بۆ بدەین ئەوا ئامادەین . قوڕەیشیش وتیان : شتی وا نەکەیت ، نەوەکو ببێتە سوننەت و یاسا . داوایان لێ کرد بچێ بۆ یەثریب ، چونکە لەوێ ئافرەتێکی کاهین هەیە کە هەواڵدەرێکی جیننیی لەلایە و پرسیاری لێ بکات . ئەو کاتە ئەم کاری خۆی لە دەستی خۆیدایە : ئەگەر فەرمانی پێ کرد کوڕەکە سەر ببڕێ ، ئەوا سەری ئەبڕێ . خۆ ئەگەر بە کارێکیش کە سەرفرازیی تۆیش و ئەویشی تیایە فەرمانی دا ئەوا بە گوێی ئەکەی .

چەند کەسێك لەگەڵ عبدولموطەللیبدا بەرەو شاری یەثریب کەوتنە رێ ، ئەبینن ئافرەتەکە لەوێ نیە ، وا لە خەیبەر . بۆیە کەوتنە رێ بۆ خەیبەر . کە عبدولموطەللیب چیرۆکەکەی بۆ ئافرەتەکە گێڕایەوە ، خێرا وەڵامی نەدانەوە .. داوای لێ کردن تا بەیانیی مۆڵەتی بدەن .. کە بۆ سبەینێ هاتنەوە لای پێی وتن : هەواڵم بۆ هاتووە .. لەلای ئێوە خوێنی پیاو چەندە ؟ وتیان : دە وشتر . وتی : دەی بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان و کوڕەکەتان بێننە پێشەوە و دە وشتریش بێننە پێشەوە ، پاشان قورعەیان بۆ بکێشن . جا ئەگەر کوڕەکەتان دەرچوو ، دە وشتری تری بۆ زیاد بکەن هەتا پەروەردگارتان رازیی ئەبێ . خۆ ئەگەر وشترەکان دەرچوون ئەوا لە بریی کوڕەکە سەریان ببڕن ، ئەوە پەروەردگارتان رازیی بووە و ، کوڕەکەشتان رزگاری بووە .

کە هاتنە مەککە عەبدولموطەللیب ویستی کارەکە ئەنجام بدات .. ئەوەبوو عەبدوڵڵایان هێنایە پێشەوە لەگەڵ دە وشتردا .. عەبدوڵڵا دەرچوو .. دە وشتریان زیاد کرد ، دیسان هەر عەبدوڵڵا دەرچوو .. کردیان بە سیی وشتر و .. چل و .. پەنجا .. هەتا گەیشتە صەد وشتر ، ئەوسا کە قورعەیان کرد وشترەکان دەرچوون . قورەیش وتیان : عبدولموطەللیب ! بە راستیی پەروەردگارت رازیی بوو .. وتی : نەخێر ، دەبێ سێ جار قورعە بکێشم .. ئەوەبوو سێ جار وشترەکان دەرچوون .. بە جارێكدا صەد وشتر سەربڕڕان و وازیان لێ هێنرا تا هەموو کەسێ بە پێی پێویستیی خۆی گۆشت بەرێت و کەس دەست بە روویەوە نەنێت .. هەتا باڵندە و درِندەکانیش لە گۆشتیان قەدەغە نەئەکران ..

بەم شێوەیە خوای گەورە ویستی وەها بوو کە عەبدوڵڵا لەو بەڵایە رزگاری ببێت ، تا سەرداری مرۆڤایەتیی لێ ببێت .. [٣٨]

دوای عبدولموطەللیب ( سقاية ) کەوتە دەست ئەبوطالیبی کوڕی ، بەڵام وا هاتە پێش چەند ساڵێك ئەبوطالیب دەست کورت بوو ، بۆیە لە عەبباسی برای دە هەزاری تا ساڵی داهاتوو قەرز کرد و لە ئاودانی حاجییاندا خەرجی کرد . کە ساڵی ئایندەش هاتە بەرەوە ئەبوطالیب هیچی لە دەستدا نەبوو ، دیسان چواردە هەزاری تری لە عەبباس قەرز کردەوە و ، عەبباسیش پێی وت : بەو مەرجەی ئەگەر قەرزەکەت نەدایەوە واز لە ( سقاية ) بێنی بۆم تا من لە جیاتیی تۆ ئەنجامی بدەم . وتی : باشە . ساڵی ئایندە هاتە بەرەوە دیسان هیچی لە دەستدا نەبوو ، ئیتر ئاودانی حاجییان کەوتە دەست عەبباس و ، دوای ئەویش کەوتە دەست عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و ، پاشانیش عەلیی کوڕی عەبدوڵڵا و پاشان داوودی کوڕی عەلیی ، پاشان سولەیمانی کوڕی عەلیی ، پاشان عیسای کوڕی عەلیی ، پاشان خەلیفە مەنصوور گرتیە دەست و ئەبو رەزینی خزمەتگوزاری کردە سەروکارییکەری .. پاشان زەمانە هات و چوو و ئەم کارە مەردانە پڕ شانازییە لە دەست چوو .. [٣٩]

---

[٣٨] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ١٦٠ ـ ١٦٢ .
[٣٩] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ١٥٣ ـ ١٥٤ .

# بەشی شەشەم
# لـەدایـك بـوون

**یەکەم : ژن‌هێنانی عەبدوڵڵا**

خەڵکی مەککە و دەوروبەری بە چاوی خۆیان دی‌یان چۆن خوای گەورە گەیشـتە فریای عەبدوڵڵا .. عبدولموطـەللیب بە دڵ و بە گیان ئامادە بوو نـەزرەکەی بـەجێ بهێنێ ، کەچیی خوای گەورە ویستی وەهابوو عەبدوڵڵا بمێنێ ..

عـەبدوڵڵا گەنجێکی نەونەمامی جوان خـاس بـوو .. خـاوەنی لـەش و لارێکـی بەهێز بوو ، بۆیە لە چەند لاوە ئافرەتی قەشەنگ و پێ‌کەوتووی قورەیش بە ئاوات بوون ببنە هاوسەری گەنجی لاوچاکی پێ‌کەوتوو .. بە تایبـەتیی دوای ئـەو رووداوە گرنگە کە بریتیی بوو لە سەربڕینی صەد وشتر لە جیاتی سەربڕینی عەبدوڵڵا ئەوە بوو لەوەوپێش خوێنی پیاوێك دە وشتر بوو کەچیی بۆ عـەبدوڵڵا بووە صەد وشتر و، ئیسلامیش دوایی کە هات بڕیاری لەسەر ئەوە دا کە خوێنی مرۆڤ صەد وشتر بێت.

ریوایەتیش کراوە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـە : ( أنـا ابـن الـذبيحين ) . فەرموویە : من کوڕی دوو کەسە سەربڕاوەکەم ، واتە ئیسماعیل و عەبدوڵڵا .

لە عـەبباس‌ەوە خوا لێی رازیی بێ ئەگێڕنەوە کە وتوویە : کاتێك کە عەبـدوڵڵا ئامینەی گواستەوە لە نەوەی مەخزووم و نەوەی عەبدمـەناف دوو ئـافرەت ژمـارە کراوون کە لە خەفەتی ئەوەدا کە شوویان بە عەبـدوڵڵا نـەکردووە و لـە دەسـتیان دەرچـووە خـەریك بـووە بـمرن و ، هەرچـیی ئـافرەتی قورەیشـیش بـووە شـەوی گواستنەوەی ئامینە نەخۆش کەوتووە .[٤٠]

عـبدولموطەللیب ـ کە سـەردار و نـاوداری مەککـە بـوو ـ ویسـتی ئـافرەتێکی خانەدانی قورەیشیی بۆ ئەم کوڕەی داوا بکات .. ماوەیەکی زۆر بـیری کـردەوە .. سەرەنجام بە وێنەی پیاوێکی دنیا دیدەی خاوەن تاقییکاریی کچێکی هەڵ بژارد .. ئامینەی کچی وەهبی کوڕی عەبد مەنافی کوڕی کوڕی زوهرەی دۆزیـیەوە ، کـە زوهرە برای قوصەی بووە ..

---

[٤٠] شرح المواهب : ١ / ١٣٤ .

ئامینە کچی سەرداری نەوەی زوهرە بوو ، کە خاوەنی ناو و شەرەف بوون . ئەوەبوو عەبدولموطەللیب دەستی عەبدوڵڵای کوڕی گرت و بردی بۆ ناو نەوەی زوهرە و ، پێکەوە چوونە ماڵی وەهب ی کوڕی عەبدمەناف و ، داوای ئامینەی بۆ کرد ، کە ئەو رۆژە لە هەموو روویەکەوە کچی تاقانەی قورەیش بوو .. عەبدوڵڵا ئامینە ئەگوازێتەوە و وەك عادەتی ئەو رۆژەی عەرەب سێ رۆژ لە ماڵی خەزوورانی ئەمێننەوە و ، رۆژی چوارەم دێنەوە بۆ ماڵی خۆیان .. ئەم ژن و مێردە گەنجە ـ وەك زۆربەی مێژوونووسان باسیان کردووە ـ لە دە رۆژ زیاتر پێکەوە نابن ..

ئەگێڕنەوە لەو کاتەدا کە عەبدولموطەللیب و عەبدوڵڵا پێکەوە بەرەو ماڵی وەهب ئەڕۆیشتن ، ئافرەتێك لە نەوەی ئەسەدی کوڕی عەبدلعوززا لە نزیك کەعبەدا بە لایان دا تێ ئەپەڕێ .. هەندێ ئەڵێن قوتەیلەی خوشکی وەرقەی کوڕی نەوفەل بووە .[41] کە سەیری دەم و چاوی عەبدوڵڵا ئەکات نوورێکی گەشاوەی تیا بەدیی ئەکات ، بۆیە لە خۆشیی ئەو نوورەی ناوچاویەوە ، خۆی پێ ناگیرێ و ، هەموو شەرمێك ئەخاتە ئەولاوە و ، دەری ئەبڕێ کە ئامادەیە صەد وشتری بداتێ ، ئەگەر بێت و ژن و مێردیی لەگەڵ دا بکات ، بەو مەرجەی ئەو نوورەی دەست کەوێ ..

هەندێکیش ئەڵێن کە ئەو ئافرەتە فاطیمەی کچی موڕڕی خەثعەمیی بووە کە ئافرەتێکی یەکجار جوان و یەکجار پاك داوێن بووە . ئەم ئافرەتە خوێندەواریی هەبوو و کتێبە پێشینەکانی خوێندبوونەوە و ، ئەو رۆژەش ئەو نوورەی ناوچاوانی عەبدوڵڵای بەدیی کرد .. هەستی کرد ئەمە ئەوەیە کە کتێبەکان باسی ئەکەن . بۆیە خۆی پێ ناگیرێ و داوای ژن و مێردیی لێ ئەکات و بەڵێنی صەد وشتری ئەداتێ ..

لە هەردوو ریوایەتەکەدا عەبدوڵڵا رازیی نابێ و دەری ئەبڕێ کە وا لە خزمەت باوکیا و ناتوانێ لێی جیا بێتەوە .

جا ئەم وەڵامەی عەبدوڵڵا و ، هەروەها ئەم دوو دێرە شیعرەی خوارەوەش ئەوە ئەگەیەنن کە ئەو ئافرەتە هەرکامیان بووبێ ، هەر ئەو کاتە عەبدوڵڵای ویستبێ و، هەر لەبەر ئەو نوورەی ناچاوانیش بووبێ :

أما الحرامُ فالحمام دونــه　　　والحل لاحل فأســتبينــه
فكيف بالأمر الذي تبغينه　　　يحمي الكريم عرضه ودينه

---

[41] هەندێك ئەڵێن : ناوی روقیە بووە .

به هەر حاڵ ویستی خوا وەها بوو ئەو نووره بەشی ئامینه بێت .. لەو ماوه کورتەی ژیانی هاوسەریی عەبدوڵلا و ئامینەدا ، به فەرمانی خوا خانی گەورەی سەرزەویی سکی به بەڕێزترین ئادەمیزادەوه پڕ بوو . قەدەری خوا ویستی وەها ئەو ڕێز و پایەیه به ئامینه ببەخشێ .. ئەوەش ویستی ( رب العالمین ) ە که خۆی چاك ئەزانێ هەرکەسێ چەند شانی هەڵ ئەگرێ تا ناز و نیعمەتی خۆی بەسەریدا بڕژێنێ .. دوای ئەوه ئیتر خەوی ئەبینی و مژدەی پێ ئەدرا که ئەم منداڵەی سکی پایەداره ..

ئەوەبوو جارێکیان له خەویدا ئەوەی بینیسی کە نوورێکی لێ هاتە دەرەوه و هەموو سەرزەویی رووناك کردەوه و کۆشکەکانی بوصراش لە وڵاتی شام پێی دەرکەوتن .

ئەبونوعەیم له ( الدلائل )دا و ، ئیبن سەعدیش له ( الطبقات )دا ئەگێڕنەوه که ئامینە وتوویە : لە خەومدا دیتم ئەستێرەیەکم لێ‌هاتە دەرەوه کە هەموو سەرزەویی رۆشن کردەوه ، هەتا کۆشکەکانی شامیشم دیتن .. جا خاتوو ئامینەش زۆر لەوه ژیرتر و زیرەك تر بوو کە لەو خەوانەی تێ بگات ، بۆیە بەلایەوه ئاشکرا بوو کە ئەم منداڵەی مرۆڤێکی گەورەی لێ دەرئەچێ ..

بەڵێ ، عەبدوڵلا و ئامینە پێکەوه زۆر نەژیان ، ئەوه بوو عەبدوڵلا بۆ بازرگانیی رووی لە شام نا و ژنە خۆشەویستەکەی بەجێ هێشت . لەوێ کاروباری بازرگانیی خۆی تەواو کرد و ، زۆر بە پەلە بوو کە بگەڕێتەوه مەککە . لە کاتی گەڕانەوەیدا سەرێکی لە خاڵوانی عبدولموطەللیبی باوکی لە یەثریب دا ، بە فەرمانی خوا لەوێ نەخۆش کەوت .. هاوەڵەکانی گەڕانەوه مەککە و ئەو لەوێ بە نەخۆشیی مایەوه .. عبدولموطەللیب هەواڵی نەخۆشیی عەبدوڵلای کوڕی زانیی ، بۆیە بە پەلە حاریثی کوڕە گەورەی خۆی نارد تا کە عەبدوڵلای برای چاك بوویەوه بیهێنێتەوه بۆ مەککە .. کە حاریث گەیشتە یەثریب هەواڵی زانیی کە عەبدوڵلا لەوێ کۆچی دوایی کردووه و ، لە ماڵی نابیغەی جەعدیی لە نەوەی نەججاری خاڵوانی نێژراوه .

حاریث بە دڵی شکست و بە دەستی خاڵیی گەڕایەوه مەککە و باوکی و خزمانی لە هەواڵی دڵ تەزێن ئاگادار کرد ، کە تازە ئازیزیان ئیتر ناگەڕێتەوه ناویان و ، بۆ هەتا هەتایی بەجێی هێشتوون و ، دیدار و قیامەت کەوتوون ..

عەبدولموطەللیبی ریش سپیی قرچە لە جەرگی هەڵسا .. خۆشەویستترین کەسی ، لە ناسكترین کاتی ژیاندا ، لە کاتی دروستکردنی هێلانەی نوێدا ، لە دەست دا.. لە هەمان کاتدا بە هەواڵی کۆچی عەبدوڵڵا کۆستی ئامینە کەوت .. دڵیان زۆر بە یەك خۆش بوو .. بەڵام بڵێی چیی ؟ فەرمانی خوایە و دەستکاریی ناکرێ :.

بەڵێ ، خوای گەورە لە کارەکانیدا حەکیمە .. هەموو کەسێ لەم ژیانەدا دەورێکی پێ ئەسپێررێ و پێویستە ئەنجامی بدا .. کە ئەو ئەرکەی ئەنجام دا ئەبێ بڕوا و ئەم ژیانە چۆڵ بکات ..

ئەرکی سەرشانی عەبدوڵڵاش تەواو بوو .. هەر ئەوەندە موحەممەدی ئازیزمان ﷺ لە پشتی ئەو بکەنرێ و ، بێتە ناو کۆڕی ژیانەوە تا بە شێوەی ( رحمة للعالمین ) مرۆڤایەتیی بحەسێنێتەوە ئیتر لەم ژیانەدا کارێکی نەماوە .. مان و نەمانی جیاوازییان نیە ..

کۆرپەی ناو سکی ئامینە لە کاتی کۆچی دوایی باوکیدا تەمەنی دوو مانگ بوو .. جا هەندێ ئەڵێن کە تەمەنی عەبدوڵڵا بیست و پێنج ساڵ بووە ، بەڵام ( حافظ العلائي ) و ( حافظ ابن حجر ) ئەوەیان بە صەحیح لە قەڵەم داوە و ئیمام سیووطییش لە ( شرح المواهب : ١ / ١٣١ ) دا ئەو رایەی هەڵ بژاردووە کە تەمەنی هەژدە ساڵان بووە .

عەبدوڵڵا ئەو کارەی کە لە ژیاندا خرا بوویە ئەستۆی ئەنجامی دا و ، کۆرپەی ئازیزی هێشتا نەهاتبووە دنیاوە بەجێی هێشت و ، لە ماڵ و سامانی دنیا پێنج وشتر و رانە مەڕێك و کەنیزەکێك کە ناوی ئوم ئەیمەن ، بەرەکەی حەبەشیی بوو لە دوا بەجێ مان . ئەم ئافرەتە بەخێوکەری پێغەمبەری خوا بووە . جا ئەم میراتەی عەبدوڵڵا ، بەڵێ سامانی پیاوێکی یەکجار دەوڵەمەند نەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەو کۆمەڵە و ئەو رۆژە شتێکی کەم نەبوو .

ئەگێڕنەوە کە خاتوو ئامینە بەم چەند دێرە شیعرە شیوەنی بۆ عەبدوڵڵای جوانەمەرگی ئازیزی کردەوە :

عفا جانب البطحاء من ابن هاشم — وجاور لحداً خارجاً في الغمائم
دعته المنايا دعوة فأجابها — وما تركت في الناس مثل ابن هاشم
عشية راحوا يحملون سريره — تعاوره أصحابه في التزاحم

فإن تــك غالتــه المنون وريبــها فقد كــان معطاءً كثير التراحم .[٤٢]

**دووهەم : خەوێکی تری عەبدولموطەللیب**

لە کاتێك‌دا کە عەبدولموطەللیب لە حیجـردا خـەوی پیـا ئەکـەوێت ، خـەوێك ئەبینێ کە زۆر سەرسامی ئەکات و ترس و لەرزێکی زۆری لێ ئەنیشـێ و ئەچـێتە لای ئافرەتە کاهینەکەی قورەیش و خەوەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە کە ئەم شەو لە خەودا دیویەتی درەختێکی وەها گەورە سەوز بوو بوو کە سەری لە ئاسمان گیرکردبـوو و ، لقەکانیشـی بـە خۆرهـەلات و خۆرئـاوادا بلاوەیـان کردبـوو و ، نـوورێکیش لـە درەختەکە بەرز ئەبوویەوە کە نووری لـەو گەشـاوەتر نـەبوو و ، حـەفتا ئەوەنـدەی رووناکیی خۆر بوو . عەبدولموطەللیب چاوی لێ ئەبێ کە عـەرەب و عـەجـەم سـەجدە بۆ ئەو درەختە گەورە نوورانی‌یە ئەبەن ، کە سات لە دوای سات گەورەتر و بلنـدتر و نوورانیی‌تر ئەبوو .. ساتێك لە چاو ون ئەبوو و ساتێکیش دەرئەکەوتەوە ..

هەروەها چاوی لە کۆمەلێك لە قورەیش ئەبێ کە ئەوانیش خۆیان بـە لقـەکانیا هەلّ ئەواسن و ، کۆمەلێکی تری قورەیشییش ئەیانەوێ ئـەو درەختـە بـبڕن ، کـە هەرچیی بەو نیازەوە لێی ئەهاتنە پێش ، گەنجێك کە عەبدولموطەللیـب لـەو گەنجـە جوان‌تر و بۆن خۆش‌تری نـەدیی بـوو ، پشـتی ئـەو خەلکـەی ئەشـکاند و چـاوی دەرئەهێنان .. عەبدولموطەللیـب کە ئەمە ئەبینێ پێی خۆش ئەبێ ئـەمیش بەشـی خۆی دەستی بۆ بەرێ و شتێکی دەست کەوێ ، کەچیی دەستی نای‌گاتێ و هیچـی بەرناکەوێ . ئەمیش بەسەر سوڕمانەوە ئەپرسێ : ئەی بۆ کێ ئەبێ ؟ ئـەلێن : بـۆ ئەوانە ئەبێ کە پێشت کەوتوون و خۆیان پیایا هەلّ واسیوە .. ئیتر عەبدولموطەللیب بە ترس و لەرزەوە لە خەوەکەی بێدار ئەبێتەوە ..

لە کاتی گێڕانەوەی خەوەکەدا بـۆ کاهینەکـە سـەرنجی ئـەدا کـە دەم و چـاوی ئەگۆڕێ .. پاشان وتی : ئەگەر ئەم خەوەت بێتە دیی لە پشـتی تـۆ پیاوێـك هـەلّ ئەکەوێ کە دەسـەلاتی بـەسـەر خـۆرهەلات و خۆرئاوادا ئەبێت و هەموو خەلکیی بۆی مل کەچ ئەبن ..

عەبدولموطەللیب سەری سوڕ ئەمێنێ کە ئەم پیاوە کێ بێ ؟ دوای بیرکردنەوە بە ئەبوطالیبی کوڕی ئەلێت : لەوانەیە ئەم منالّە بێت . مەبەستی لە منالّەکەی نـاو سکی ئامینەیە . هەموو جارێ ئەبوطالیب ، دوای ئەوەی کە وەحی بـۆ پێغەمبـەر

---

[٤٢] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ١٦٣ ـ ١٦٦ ، الرحيق المختوم : ٥١ ـ ٥٢ .

ﷺ هاتبوو ، ئەم باسەی ئەگێڕایەوە و ، ئەیوت : بەخوا درەختەکە ( أبو القاسم الأمين ) ە . لێیان ئەپرسیی : ئەی ئیمان ناهێنی ؟ ئەیوت : لە ترسی عار و شوورەیی ئیمان ناهێنم .. [٤٣]

**سێهەم : سوپای ئەبرەهە**

ئەبرەهەی حەبەشیی گەورە جێگری نەجاشیی پادشای حەبەشە بوو لە سەر وڵاتی یەمەن ، کە دەسەڵاتی بەسەر یەمەن‌دا بە تەواویی پەیدا کرد ، سەرنجی دا خەڵکەکە بە تاك و بە کۆمەڵ و ، بە سواریی و بە پیادە سەر لە کەعبەی پیرۆز ئەدەن ، پرسیی : ئەمانە بۆ کوێ ئەچن ؟ وتیان : بۆ کەعبە لە مەککە و بۆ ئەنجام دانی حەج . پرسیی : کەعبە چی‌یە ؟ وتیان : ماڵێکە لە بەرد دروست کراوە . پرسیی : ئەی بە چیی پۆشتە کراوەتەوە ؟ وتیان : بەو پارچە قووماشە خەت خەتە یەمەنی‌یانەی کە لێرە دروست ئەکرێن . وتی : من ماڵی لەوە چاك تر بنیات ئەنێم .

ئەوەبوو لە شاری صەنعائی پایتەختی یەمەن‌دا دەستی دایە بیناکردنی کەنیسەیەکی گەورە و ئەوپەڕی کەل و پەلی بەنرخی بۆ رازاندنەوەی بەکار هێنا و ناوی نا ( قوللەیس ) بەو هیوایەوە کە عەرەبەکان دەست‌بەداری کەعبە بن و روو لەو کەنیسەیەی ئەو بکەن . [٤٤] جا پیاوێکی عەرەب لە نەوەی کینانە ئەم نیازە پیسەی ئەبرەهەی بەرگوێ ئەکەوێ و، شەو ئەچێتە ژوورەوە و ، قیبلەی کلیساکە پڕ لە پیسیی ئەکات . ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هیچ کەس رووی تێ ناکات .

کە ئەبرەهە ئەمەی بیست رقی جوبی و ، هاتە سەر ئەو رایە کە ئەبێ کەعبە بڕووخێنێ تا خەڵکەکە ناچار بن روو لە کلیساکەی ئەو بکەن . بۆ ئەم بڕیارەی سوپایەکی زۆر و زەبەندەی وەهای خستە رێ کە نە بە دانیشتوانی مەککە و نە بە هەموو عەرەبی دوورگە چار نەکرێت .. شەصت هەزار سەربازی بەرەو کەعبەی پیرۆز خستە رێ تا بی‌ڕووخێنێ .. ئەڵێن ئەو سوپایە نۆ یان سیانزە فیلی لەگەڵ‌دا بووە ، کە ئەبرەهە بۆ خۆی گەورەترینی ئەو فیلانەی هەڵ بژاردبوو .. لە رێگادا چەند هۆزێکی کەم هێزی عەرەب هاتنە رێی تا نەهێڵن هێرش بکاتە سەر کەعبە، کەچیی بە ئاسانیی بەسەریان‌دا زاڵ بوو . هەروا لەسەر رەوتی خۆی بەردەوام بوو

---

[٤٣] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ١٦٦ - ١٦٧ .

[٤٤] هەمان مێشکی پووچی گاوریتیی جیهانیی ئەمڕۆش وەها بیر ئەکاتەوە کە لەم لاو لەولا نۆکەر بە کرێ بگرێ و کەنیسە رەواج پێ بدات . بەڵام بێ‌گومان ئەو دینەی کە خوا پێی رازی‌یە هەر ئەوە سەرکەوتوو ئەبێت .. دواییش ئەبورغاڵەکان هەر سەرشۆڕی‌یان بۆ ئەمێنێتەوە ..

هەتا گەیشتە ( مغمَّس ) و لەوێ سوپاکەی کۆك کردەوە و ، خۆی ئامادە کرد کە بچێتە ناو مەککەوە .. کە نزیکی شاری مەککە بوونەوە رانە وشترێکی عەبدولموطەللیبی کوڕی هاشمیان دەست کەوت و دایانە بەر .
عەبدولموطەللیب کە ئەمەی بیست چوو بۆ لای ئەبرەهە تا داوای وشترەکانی لێ بکاتەوە .. عەبدولموطەللیب پیاوێکی پێگەوتووی خاوەن ویقار و سام و هەیبەت بوو . کە ئەبرەهە چاوی پێی کەوت ، بە گەورەی لە قەڵەم دا و رێزی لێ گرت و لەسەر تەختەکەی خۆی دایتیشاند .. کاتێ کە عەبدولموطەللیب باسی ئەوەی کرد کە بە دوای رانە وشترەکەیدا هاتووە ئەبرەهە دەمی داچەقیی و بە سەرسوڕمانەوە وتی : ئایا باسی وشترم لەگەڵدا ئەکەی و ، باسی ئەو ماڵەم لەگەڵدا ناکەی کە مایەی سەربەرزیی و پایەداریی خۆت و باوباپیرانتە ؟!
عەبدولموطەللیب زۆر ژیرانە و دامەزراوانە هاتە وەڵام و وتەیەکی وەها بەنرخی لە دەم دەرچوو کە لەوەو دوا بوویە قسەی نەستەق و ، دەریشی ئەخا کە چەند بە جوانیی ـ وەك بەندەیەکی ئیماندار ـ لە کاری سەرشانی خۆی و کاری پەروەردگاری تێ گەیشتووە :
(( من خاوەنی وشترم و ، ماڵی خوایش خاوەنێکی هەیە ئەیپارێزێ )) ..
وەك بڵێ : تۆ خراپ تێگەیشتووی .. ئەم ماڵە ماڵی من نیە تا پارێزگاریی لێ بکەم .. تۆ خراپ تێ گەیشتووی ، کە ئەتەوێ ئەم ماڵە بڕووخێنی ، چونکە وا ئەزانی ئەم ماڵە هێزی مرۆڤی وەك من ئەیپارێزێ .. تۆ خراپ تێ گەیشتووی ، کە وا ئەزانی ئەم سوپایەت ئەتوانێ لەگەڵ خوادا بجەنگێ .. ئەوەندەی تۆ خراپ تێ گەیشتووی ، من چاك تێگەیشتووم و ، خۆم ئەناسم و ئەشزانم کاری سەرشانم چیە و ، هەر کارێکیش کاری خوا بێ من دەستی تێ وەر نادەم ..
بە یەك رستە عەبدولموطەللیب دەرسێکی دوور و درێژی عەقیدەی خواناسانی وتەوە .. با ئەبرەهە و غەیری ئەبرەهەش بزانن کە کاتێ دژایەتیی دینی خوا ئەکەن ، هەرگیز لە دەستی خوا رزگاریان نابێت .. ئەوانەش لە جیهانی ئیسلامییدا ـ بە هەر ناوێکەوە بێت ـ کاروباری وڵاتانی ئیسلامییان پێ سپێرراوە ، ئەگەر دڵسۆزی ئەو دینە نەبن کە گەلەکانیان ـ هەر زمان و رەگەزێك بن ـ وان لەسەری ، ئەوا نۆکەریی کافران فریایان ناکەوێ و ، خوای گەورە بە دەسەڵاتی خۆی رسوایان ئەکات .. ئەمە با بۆ مێژوو لە نێوانماندا بێت ، چونکە

بەرەكانی دوای ئێمە كە دێن و پەڕەكانی مێژوو هەڵ ئەدەنەوە ، هەموو ڕاستیەكیان بۆ دەرئەكەوێ .. ئەو كاتە ئابڕووچوون بەشی نۆكەران ئەبێ و ، سەربەرزییش ئەبێتە بەشی خەمخۆران و خواناسانێك كە بە ئیخلاصەوە لە ژێر ئاڵاكەی ئازیزدا ﷺ وەستابن ..

عەبدولموطەللیب گەڕایەوە كەعبە و لەگەڵ چەند پیاوێكی قوڕەیشییدا بیریان كردەوە كە ئەمان بە هێزی بازووی خۆیان بەرگرییان لە كەعبە بۆ ناكرێ و سوپای دڕندە بەوان چار ناكرێ ، بۆیە هاتنە سەر ئەوە كە دەست بە ئەڵقەی دەرگاكەی كەعبەوە بگرن و لە خوای گەورە بپاڕێنەوە تا سەركەوتن بە ماڵە پیرۆزەكەی خۆی ببەخشێ و ئەبرەهە و سوپاكەی تەفر و توونا بكات و ئەم شیعرەشی وت :

لاهُمَّ إنَّ المرءَ يمنعُ رحلَه فامنَع رحالَكَ
وانصر على آلِ الصليب وعابديه اليومَ آلَكَ
لا يغلبنَّ صَليبُهُمَ ومحالُهُم أبداً محالَكَ
إن كنتَ تاركهُم وقبلتَنا فَأمرٌ ما بَدا لَكَ

پاشان ئەڵقەی دەرگاكەی بەردا و بە چاوی پڕ لە فرمێسكەوە لەگەڵ دانیشتوانی شاردا بەرەو چیاكانی دەوروبەری مەككە كەوتنە ڕێ تا خۆیان لە شاڵاوی سوپای دڕندە دەرباز كەن .. كەعبەی پیرۆزیان دایە دەست خوا ..

كەعبەی ئازیزمان ! دەسەڵاتێكمان نیە .. بەڵام ئەزانین تۆ ماڵی خوایت .. داواكارین خوای پەروەردگار هێزی خۆی بخاتە كار و سوپایەكی قودرەتی خۆی ڕەوانەی ستەمكاران بكات ، تا تەفر و توونایان بكات ..

ئەبرەهە هات ، هات ، هەتا گەیشتە دۆڵی ( محسر ) ی نێوان موزدەلیفە و مینا ، لەوێ فیلەكەی چۆكی دا .. بە هیچ شێوەیەك هەڵ نەسایەوە تا بەرەو كەعبە بڕوات .. كەچیی كە ڕوویان ئەكردە هەر لایەكی تری غەیری مەككە بە پەلە ئەكەوتە ڕێ .. دیسان كە ڕوویان ئەكردەوە مەككە چۆكی ئەدا ..

ئەمە نیشانەیەكی گەورە بوو بۆ ئەبرەهەی صەلیبیی كەچیی خۆی كەڕ و كوێر ئەكرد و ، هەر ئەیویست كەعبە بڕووخێنێ ..

قوڕەیشیەكانیش تەپەی دڵیان ئەهات و ، ئەترسان كەمێكی تر ئەبرەهە بگاتە ناو شار و كەعبە بڕووخێنێ .. كەعبەش لە ناوەڕاستی شاردا .. لە

مەیدانێکی فراواندا ، وەك پاڵەوانی بێباك ، قنج وەستا بوو .. چاوەڕوان بوو بەرامبەرەکەی لێی بێتە پێش و ، وەهای تەمێ بکات و بیکاتە پەند کە تا ئاخرزەمان هەر بوترێتەوە ..

قوڕەیشییەکان بێئاگا بوون .. هەر ئەوەندەیان زانیی تینی خۆر کەم بوویەوە .. وەك هەور بەری خۆر بگرێ .. سەریان بەرز کردەوە هەور نەبوو .. کۆمەکیی خوا بوو .. سوپای ئاسمان گەیشتە فریای ماڵی پیرۆز .. کێ ئەتوانێ دەستی بۆ بەرێ ؟ ئەوە بە ئیخلاص و تەقوای ئیبراهیم و ئیسماعیل سەلامیان لێ بێ بنیات نراوە ، کێ دەستی ئەگاتە ئاستێك کە دەستکاریی کاری پڕ لە ئیخلاصی ئەو جووتە شێرە بکات ؟..

قوڕەیش سەیریان کرد ئاسمان لە باڵندەی ورد پڕ بووە .. هێزی خوا گەیشتە فریای کەعبە .. ئەوەندەی تر یەقینیان بە پیرۆزیی کەعبە زیاد بوو ..

بەڵێ کۆمەڵە باڵندەیەکی زۆر و زەبەندە کەوتنە ئاسمان .. لە سەرکردایەتیی ئاسمانەوە فەرمانیان بۆ دەرچوو .. هەر باڵندەیەك سێ بەردی بچکۆلە بە وێنەی دەنکە نۆك هەڵ بگرێت .. دانەیەك بە دەنووك و دوانیش بە هەردوو پێی .. هێرش بکەنە سەر دوژمن .. دوژمنی خوا .. سەر ستەمکار .. ئەو ستەمکارەی کە ئەیەوێ لانەی حەسانەوەی دڵەکان تێك بدات ..

هەر سەربازێکی خوانەناسی صەلیبیی یەکێ لەو بەردانەی بەر بکەوتایە بە فەرمانی خوا لاشەی پارچە پارچە ئەبوو و ، ئەندامەکانی لێك جوێ ئەبوونەوە و یەکسەر ئەمرد .. کە سوپا ئەمەی دیی ، هەموو کەسێ کەوتە بیری هەڵاتن و خۆڕزگارکردن . تەیرەن ئەبابیلەش بەسەر سەریانەوە و ، بەبێ بەزەیی دایان ئەگرتنەوە .. چەند ساتێك لەمەوبەر شەیتان بزەی لێوی ئەهات و سوپا دڵ ڕەشەکەی بە گرم و هوڕ ئەو ناوەی هەراسان کردبوو .. بەلام وا ئێستا خواناسان خۆشیی کەوتە سەر روویان و ستەمکاران نازانن چۆن خۆیان دەرباز بکەن ..

سەرکەوتنی خوا هەر وا بووە .. هەتا پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێ بێ نەیان ئەزانیی خوا چۆن و کەی سەرکەوتن ئەنێرێ .. بەڵکو جاری وا ئەبوو دەستیان لە خۆیان ئەشۆریی و بە تەمای سەرکەوتن نەئەمان و پرسیاریان لە سەرکەوتن ئەکرد کەی دێت :

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا﴾ (یوسف : ١١٠).

﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ﴾( البقرة : ٢١٤ ) .

لەمەوە دڵمان پڕ لە یەقین ئەبێ کە سەرەنجامی هەموو مل‌هوڕێك مل‌شکانە ، وەك ئەبرەهە و فیرعەون و هیتلەر و ناپلیۆن و .. .. هتد .

سوپای ئەبرەهە ئەو دەرودەشتەی پڕ کرد ، بەڵام بە مردوویی .. چەند ساتێك لەمەوبەر ئەو دەرودەشتەی هێنابووە لەرزە ، کەچیی ئێستا هاوار و ناڵە و کڕووزانەوەی ئەچێ بە حەوادا .. ئەبرەهە خۆیشی لەم غەزەبە خواییە دەرباز نەبوو ، بەڵکو خوای گەورە دەردێکی بۆ نارد کە بە هۆیەوە سەرپەنجەکانی رزین و، کە گەیشتەوە صەنعاء ئەوەندەی جووجکێکی مابوویەوە ، ئیتر سنگی لەت بوو و دڵیشی پچڕا و ، پاشان مرد ..

چەند رۆژێ لەمەوبەر کەس نەی‌ئەوێرا سەیری ناوچاوی پاڵەوان بکات .. کەچیی ئێستە وا بە زەلیلیی گەڕایەوە دوا .. چووە لەگەڵ خوادا بجەنگێ ، کەواتە ئەنجامی لەوە چاکتری دەست ناکەوێ !!

کە قوڕەیش ئەمەیان دیی ، تێ گەیشتن کە کەعبەی ئازیزیان بەلای خواوە زۆر سەنگینە ، وا ئەم سوپا بێ‌شوومارەی بۆ ناردن تا سوپای صەلیب تێك بشکێنێ .. طەوافێکی کەعبەیان کرد و ، بە دڵی پڕ لە ئارامیی‌یەوە رۆیشتەوە ماڵەوە ..

دواییش وەحی هاتە خوارەوە سەر پێغەمبەری ئازیز ﷺ و بۆی گێڕانەوە کە هێزی خوای گەورە کۆمەکە بۆ دینەکەی و هەڵ گرانی و ، دڵ خۆشییشی دانەوە کە خوای گەورە لەسەر ئەوانە و ستەم‌کارانیان بۆ لەناو ئەبات ، وەك ئەبرەهەی لەناو برد و کردیە پەندی زەمانە :

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ۝١ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ۝٢ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ۝٣ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ۝٤ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ ﴾ (سورة الفيل )

پێغەمبەری خواش ﷺ لە فەرموودەیەکی‌دا ئەوەی روون کردۆتەوە کە خوای گەورە رێ نادا کەسێك بە دژایەتیی هێرش بکاتە سەر کەعبە ، وەك سوپای فیلی تەفر و توونا کرد و ، هەر کەسیش رێزی لێ بگرێ پشتیوانیی لێ ئەکا وەك رێی بە پێغەمبەر و سوپای فەتح‌دا تا بێن و کەعبە لە بتەکان پاك بکەنەوە ، کە ئەی‌فەرموو :

(( إن الله حبس عن مكة الفيل ، وسلّط عليها رسوله والمؤمنون )) .رواه الشيخان .

ئەم هێرشە تێكشكاوەی حەبەشەی گاور بۆ سەر قیبلەی موسڵمانان تا ئاخرزەمان پەنجا یان پەنجا و پێنج رۆژ پێش لە دایك بوونی پێغەمبەری خوا بووە ، بەرامبەر بە كۆتایی شوباتی ، یان سەرەتای مارتی ساڵی ٥٧١ ز . جا تێك شكانی ئەبرەهە بەڵگەیەكی بەهێزە كە خوای گەورە كەعبەی بۆ دەوری گرنگی خۆی ئامادە ئەكرد ، كە ئەوەبوو لە دایك بوونی دوا پێغەمبەر نزیك بووبوویەوە .. ئەم رووداوە ئەوەی سەلماند كە خوای گەورە نایەوێ هیچ لایەنێك دەستی بەسەر كەعبەدا بڕوا كە لەمەولا ئەبێتە مەڵبەندی خواناسیی تا ئاخرزەمان .. كە ئەمەش تایبەت مەندییەكی كەعبەی پیرۆز بوو .. هەتا ( بيت المقدس ) ئەمەی پێ نەبەخشرا ..

ئەوەبوو ساڵی ( ٥٨٧ ) پ . ز بەختەنەصر هێرشی كردە سەر ( بيت المقدس ) و هەرچەندە ئەو موشریك بوو و ئەهلی وڵاتەكە موسڵمان بوون داگیری كرد .. هەروەها رۆمەكانیش لە ساڵی ( ٧٠ ) ز توانییان ( بيت المقدس ) بگرن ، كەچی نەصرانییەكان ـ كە موسڵمانی ئەو سەردەمە بوون ـ نەیان توانیی كەعبە بگرن ئەگەرچیی دانیشتوانی مەككەش بت پەرست بوون ..

تیاچوونی سوپای ئەبرەهە بەوەوە نەوەستا ، بەڵكو بە یەكجاریی لە یەمەن دەرپەڕێنران و سەرانسەری دوورگەیان لێ پاك كرایەوە . ئەوەبوو لەناو دەوڵەتی حیمیەردا پیاوێك بە ناوی ( سيف بن ذي يزن ) هەڵكەوت ، كۆمەكیی لە كیسرای فارسی داوا كرد و ، ئەویش لە ساڵی ٥٧٥ ز دا بە سەركردایەتیی ( وهرز) سوپایەكی نارد و حەبەشەكانیان تێك شكاندن ..[45]

**چوارەم : لە دایك بوون**

رۆژان تێپەڕین و ، كاتی لە دایك بوونی ئازیزیش ﷺ هاتە بەرەوە . ئەو ماوەیەش كە لە سكی دایكیدا بوو ، نە ناڕەحەتییەك و نە ئێش و ئازارێك هیچی بۆ دایكی نەبوو .. ئەوە بوو دەنگێكیش بەر گوێی دایكی كەوت ، كە پێی ئەوت : سەرداری ئەم ئوممەتە وا لە سكتا ، كاتێك كە كەوتە زەویی بڵێ :

---

[45] الرحيق المختوم : ٤٩ ـ ٥٠ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ١٦٧ ـ ١٦٩ ، السيرة النبوية للندوي : ٧٧ ـ ٨٠ ، السيرة النبوية للصلابي : ٣٩ ـ ٤٤ .

(( أعيذه بالواحد ، من شر كل حاسد )) . بلێ : ئەیخەمە پەنای خوای تاك و تەنیا ، تا لە شەڕ و خراپەی هەموو حەسوودێك بیپارێزێ . ناویشی بنێ (( محمد )) .

کاتی منداڵبوون هاتە بەرەوە .. دوای نۆ مانگ خوای گەورە فەرمانی دا نوورەکەی بە گەشاوەیی بێتە سەرزەویی .. با بێتە کۆڕی ژیانەوە .. با ئەو تۆوە پیرۆزە ، تەنە مویارەکە بوونی پێشکەش بکرێت و، ئەو ئەرك و کارە بەرز و پیرۆزە ـ کە بریتییە لە گەورەترین خزمەتێك کە مرۆڤایەتیی بتوانێ پێشکەشی بوونەوەری بکات ـ کە پێی سپێرراوە ئەنجامی بدات .. مرۆڤایەتیی یەکجار گیرخواردەیە و پێویستی بە رزگارکەر هەیە ..

ئەوەبوو لە شیوی نەوەی هاشم ، لە مەککە ، لە بەرەبەیانی رۆژی دووشەممەی نۆهەمین رۆژی ، یان دوانزەهەمین رۆژی مانگی رەبیعی یەکەمدا ، کە بەرامبەرە لەگەڵ رۆژی بیستەم یان بیست و دووهەمی مانگی نیسانی ساڵی پێنج صەد و حەفتا و یەکی زاینیی ، وەك ( محمود باشا الفلكي ) و ( محمد سليمان المنصورفوري ) تەحقیقیان کردووە ، سەرداری هەموو جیهان هاتە دنیاوە .. موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای قوڕەیشیی سەرزەویی رووناك کردەوە .

کاتێك کە لە دایك بوو لەگەڵیا نوورێك هاتە دەرەوە کە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوای پێ رووناك بوویەوە .. هەتا کۆشکەکانی بوصرا لە شام دەرکەوتن .. کە لە دایك بوو لەسەر هەردوو ئەژنۆی چۆکی دادا و ، خۆی دا بەسەر هەردوو دەستیدا و ، سەریشی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە ، پاشان پڕی مشتی خۆڵیشی هەڵ گرت ، ئەمەش بە پێی ئەو ریوایەتەی موحەممەدی کوڕی سەعد کە فەرموودەی کۆمەڵێك ئەگێڕێتەوە کە عەطائی کوڕی ئەبوڕەباح و ، ئیبن عەبباسیان لەگەڵدایە کە ئامینەی کچی وەهب وتوویە :

(( لَمَّا فَصَلَ مِنِّي ـ تَعني النَّبيَّ ـ خَرَجَ مَعَهُ نُورٌ أَضاءَ لَه ما بَينَ الْمَشرق وَالمغرب ، ثُمَّ وَقَعَ عَلَى الأَرض جَاثِياً عَلى رُكبَتَيه ، مُعتَمِداً على يَدَيهِ ، ثُمَّ أَخَذَ قَبضَةً مِنَ التُّراب ، فَقَبَضَهَا ، وَرَفَعَ رَأسَهُ إِلى السَّماءِ )) .

جا ئەو نوورە نووری پێغەمبەرایەتیی بووە و ، چۆك دانیشی لەسەر هەردوو ئەژنۆی ئەوە ئەگەیەنێ کە لەبەر دەم پەروەردگاریدا خۆی زۆر بە بچووك ئەزانێ و، خۆیشی لە دروست کراوانی خوا بە زیاتر نازانێت .. خۆدانیشی بەسەر هەردوو

دەستیدا ئەوە ئەگەیەنێ کە بە ناسك و تەمەڵ گەورە نابێت ، بە وێنەی منالی پادشا و پیاوماقوولان ، بەڵکو هەر بە مندالیی پشت بەخوا ئەبەستێ و ، پاشانیش بە خۆی . هەڵ گرتنی مشتێك خۆڵیش ئەوە دەگەیەنێ کە لە خۆڵی ئەم زەوییە دروست بووە و ، بۆ ناویشی ئەگەڕێتەوە و ، بۆ زیندوو بوونەوەش هەر لەم خۆڵە دەرئەچێتەوە و ، بەسەر دانیشتوانی زەوییش‌دا زاڵ ئەبێ .. سەربەرز کردنەوەشی بۆ ئاسمان ئەوە ئەگەیەنێ کە یەکجار بە چاکیی پشتی بە خوای پەروەردگاری بەستووە و ، پایە و پلەشی بەلای خواوە بەرزە و ، مەبەستیشی یەکجار بەرز و پیرۆزە و ئەبێتە سەرداری هەر هەموو دروستکراوانیش ..

ئیمامی پایەداریش ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ، بەززار و ، طەبەرانیی و ، حاکم و، بەیهەقیی لە عیرباضی کوڕی ساریەی سوللەمی‌یەوە خوا لێی رازیی بێ ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە :

(( إنِّي عندَ اللهِ لَخاتَمُ النَّبِيِّينَ ، وإنَّ آدَمَ لَمُنجَدلٌ في طِينَته ، وَسأُخبرُكُم عَن ذَلكَ : أَنا دَعوَةُ أَبي إبراهِيمَ ، وَبَشارَةُ عِيسى ، وَرُؤيا أُمِّي الَّتي رَأَتْ ، وَكَذلكَ أُمَّهاتُ النَّبِيِّينَ يَرين )) . قال الحافظ إبن حجر : وصححه إبن حبان والحاكم .

فەرموویە : من لە عیلم و تەقدیری هەتا هەتایی خوادا بە دوا پێغەمبەر دانرام کە هێشتا ئادەم قوڕ بوو و دروست نەکرابوو .. ئەفەرموێ : من دوعا و پاڕانەوەی ئیبراهیمی باوکم و ، مژدەی عیسا و ، خەوبینینی دایکمم و ، دایکانی پێغەمبەرانیش هەروا خەو ئەبینن ..

پێغەمبەری خوا ﷺ لە مالی ئەبوطالیب و لە شیوی نەوەی هاشم دا لەدایك بوو و ، شیفای دایکی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ، مامانی بوو . زۆرێك لە زانایانیش دەریان بڕیوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خەتەنەکراویی و ناوك بڕاویی لە دایك بووە ، بەڵگەشیان ئەم فەرموودانەن ، کە فەرموویە :

(( مِن كَرامَتي على رَبي أنِّي وُلِدتُ مَختوناً ، وَلَم يَرَ أَحَدٌ سَوأَتي )) . [٤٦] فەرموویە: یەکێ لەو رێزانەی کە خوا لێمی گرتووە ئەوەیە کە بە خەتەنەکراویی لە دایك بووم و ، کەسیش عەورەتمی نەدیوە .

---

[٤٦] رواه الطبراني في الأوسط ، وأبونعيم ، وإبن عساكر من طرق متعددة ، وقد صححه الحافظ ضياء الدين المقدسي في كتابه (( الأحاديث المختارة )) ، مما ليس في الصحيحين ، وتصحيحه أعلاه من تصحيح الحاكم ، وحسنه الحافظ مغلطاي .

هەروەها لە ئیبن عومەرەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : پێغەمبەر ﷺ بە ناوك بڕاویی و خەتەنەکرایی لە دایك بووە .[٤٧]

ئەو ماڵەی کە پێغەمبەری خوای ﷺ تیا لە دایك بوو مایەوە بۆ عەقیلی کوڕی ئەبوطالیب و ئەویش فرۆشتی بە موحەممەدی کوڕی یوسف برای حەججاج و ، خستیە سەر ئەو خانووەی خۆی کە پێی ئەوترا : البیضاء . تا ئەوەبوو خەیزەرانی دایکی رەشیدی خەلیفەی عەبباسیی هات بۆ حەج و ئەو ماڵەی جیا کردەوە و کردیە مزگەوت . هەندێکیش ئەڵێت : خاتوو زوبەیدەی هاوسەری رەشید ئەو مزگەوتەی لە کاتی حەج کردنی‌دا بنیات ناوە و ، تا ئەم دواییی‌یانەش هەر ما بوو، بەڵام رووخێنرا و ئێستە نیاز وایە لەو شوێنەدا قوتابخانەی لەبەرکردنی قورئان بنیات بنرێ .

کە ئازیزمان ﷺ هاتە دنیاوە دایکی زۆر دڵی پێی کرایەوە .. چونکە خەم و خەفەتێکی زۆری دایکی و کەس‌وکاری رەواندەوە ، کە دوای مردنی باوکی لە دڵ و دەروونیان‌دا بەجێی هێشتبوو . لە هەمان کات‌دا فرمێسکێکی گەرمی زۆری هەڵ رێژا بۆ ئەوەی کە باوکی ئەم کۆرپە نازدارەی بەچاو نەبینی ..

کە منداڵەکە هاتە دنیاوە ، یەکەم کارێك کە خاتوو ئامینە ئەنجامی‌دا ئەوەبوو هەواڵی دا بە خەزووری کە مژدە بێت وا خوا کوڕێکی لاوچاکی پێمان بەخشیی .

باپیری خەمباری بەساڵ‌دا چوو بە پەلە هات .. زۆر شادمان بوو .. لە جیاتیی خۆی و لە جیاتیی عەبدوڵڵاش کۆرپەی ئازیزی ، کە ئێستە مەلۆتکەیە هەڵ گرت و چەند جارێك نووساندی بە سنگیەوە .. دوو هەست تێکەڵ بوون : هەستێك بۆ بێ‌تاقەتیی عەبدوڵڵا و ، هەستێکیش بۆ هاتنە دنیای کۆرپەی ئازیز .. بەرەو کەعبە کەوتە رێ ، تا تەوافی کەعبەی پێ بکات .. دەستی کرد بە پاڕانەوە و شوکر و سوپاسی خوا و ، ناویشی نا موحەممەد ، هەر چەندە ئەو رۆژە ئەو ناوە ئەوەندە باو نەبوو و ، تەنها خەڵکێکی زۆر کەم ناوی موحەممەدی لێ نرابوو . بەڵام خوای گەورە ئەم ناوەی خستە دڵی باپیریەوە ، تا فەرمانی خوا بەجێ بهێنێ و ئەو ناوەشی لێ بنرێ کە لە کتێبەکانی تری پێشەوەدا ناوی هاتبوو و مژدەی هاتنیان دابوو .

---

[٤٧] رواه إبن عساكر .

کاتێکیش پرسیار لە باپیری کرا کە بۆچ ناوی ناوە ( محمد ) ، وتی : ویستم لـە ئاسمان‌دا خوا سوپاسی بکات و ، لە زەوییش‌دا خەڵك . ئـەش‌گـونجێ کـە خـاتوو ئامینە ئەو خەوەی بۆ خەزووری گێڕابێتەوە و رای هەردووکیان یەکی گرتبێ ..

دوای سەردانی کـەعبەی پیـرۆز سەرداری قوڕەیش ، کە منداڵەکەی لە بـاوەش گرتبوو ، گەڕایەوە ماڵەوە ، بەڵام لـە خۆشـیانا خـەریك بـوو بـاڵی ئەگرتـەوە .. منداڵەکەی دایەوە دەست دایکی ..

بۆ رۆژی حەوتەم ـ بە شێوەی دەسـتوور و بـاوی عەرەبـەکان ـ بـاپیری دەسـتی بـە سەربڕینی چەند حەیوانێك کرد و ، بۆ سوپاس گوزاریی پەروەردگار دەستی بە دەعـوەت کـردن کـرد .. چـونکە ئـەم منداڵـە جێـی عەبـدوڵڵای بـاوکی پـڕ کردبـۆوە و ، وەك ئاوێنەیەکی بێ‌گەردی بریسکاوە شێوەی عەبدوڵڵای جوانەمـەرگی تیـا ئەدرەوشـایەوە . نەوەی هاشم هەر هەموو بەشداریی ئەم ئاهەنگەی عبدولموطەللیب یان کرد ..

ثوەیبەی ئەسلەمییش کە کەنیزەکی ئەبولەهەبی کـوڕی عـبدولموطـەلليـب بـوو کاتێ کە مژدەی لەدایك‌بوونی موحەممەدی برازای پێ دا ، ئـەو کەنیزەکـەی ئـازاد کرد ..

ئەوەتا عـەبباسی سەرداریشمان خوا لێی رازیی بێ لە ستایشی پێغەمبـەردا ﷺ ئەم شیعرانەی وتووە :

وأنت لما ولدت أشرقت الأر ضُ وضاءت بنورك الأفق
فنحن في ذلك الضياء وفي النـ ـورِ وسبل الرشاد نخترق

حەزرەتی عـەبباس بەم شیعرەی ئەوە دەرئەبڕێ کە بە لەدایك بـوونی پێغەمبـەر ﷺ سەرزەویی و ئاسۆکان بە نووری ئەو رۆشن بوونەوە و ، ئیمـان‌دارانـیش لـەناو ئەو نوورەدا نوقوم بوون و ، بە هۆی ئەو نوورەشەوە رێی راستیان بـەدیی کـرد و ، گرتیانە بەر ..

ئەش‌گێڕنەوە کە عەبباسی کوڕی عبدولموطەللیب خـوا لێـی رازیـی بـێ ئـەبو لەهەبی برای ، دوای ساڵێك لە مردنی ، لە خەودا ئەبینێ ، ئەمەش دوای جەنگی بەدر .. کە پرسیاری حاڵ و گوزەرانی لێ ئەکات ، ئەبولەهەب لە وەڵامدا ئەڵێت : وام لەناو ئاگردا ، بەڵام هەموو شەوێکی دووشەممە بە هۆی ئاوێکەوە کە لە نێـوان ئەم دوو پەنجەیەمدا : سەببابە و ئیبهام ( واتە پەنجەی شـایەتمان و پەنجـە گـەورە )

ئەیمژم سزام لەسەر کەم بۆتەوە ، ئەمەش لەسەر ئەوەی کە کاتێ ثوەیبە مژدەی لە دایك بوونی موحەممەدی پێ دام ، ئازادم کرد ..

جا ئەوەمان لە یاد نەچێ کە لە کاتی لەدایك‌بوون دا چەندین نیشانە دەرکەوتن، کە ئەوەیان ئەگەیاند رووداوێکی مەزن لە جیهان‌دا رووی داوە : یەکێ لەوانە :

داکەوتنی هەیوانی کیسرا و رووخانی چواردە پەنجەرەی کە ئەمەش نیشانەی ئەوەبوو کە حوکمی ساسانیی تەنها چواردە پادشایان ماون حوکم بکەن ئیتر ئەڕووخێن . هەرواش دەرچوو .. ئەوەبوو دە پادشایان لە ماوەی چوار ساڵ‌دا حوکمڕانی‌یان تەواو بوو و ، ئەوانی تریشیان هەتا رووخانی دەوڵەتەکەیان حوکمیان کرد و ، دوای ئەوە ملیان بۆ موسڵمانان کەچ کرد ..

یەکێ تر لەو رووداوانە رۆچوون و نوقوم‌بوونی دەریاچەی ( ساوە ) بوو لە وڵاتی فارس ، کە دەریاچەیەکی گەورە بوو لە نێوان هەمەدان و قوم‌دا و درێژیی و پانیی شەش فەرسەخ بووە و کەشتیی تیایا کاریان کردووە و خەڵکیی لە نێوان شارەکانی دەوروبەری‌دا هات و چۆیان ئەکرد .

یەکێ تر لەو رووداوانە کوژانەوەی ئاگری مەجووس بوو کە لە ئێران ئەیان پەرست و هەزار ساڵ ئەبوو ، نەیان هێشتبوو بکوژێتەوە .

**پێنجەم : ناو و نەسەب**

پێغەمبەری نازدارمان ﷺ گەلێك ناو و سیفاتی جوانی هەبوون ، دیارە ناوی زۆریش بەڵگەیە لەسەر پایەداریی ئەو کەسە . بەڵام لە هەموویان بەناوبانگ تر پێنج ناویان بوون : لە هەردوو صەحیحی بوخاریی و موسلیم‌دا هاتووە کە لە جوبەیری کوڕی موطعیم ەوە ئەگێڕنەوە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە :

(( لي خَمسَة أسماء : أنا محمد ، وأنا أحمد ، وأنا الماحي الذي يمحو الله بي الكفر ، وأنا الحاشر الذي يحشر الناس على قدمي ، وأنا العاقب )) .

فەرموویە : من پێنج ناوم هەن : من موحەممەدم ، من ئەحمەدم ، من ماحییم کە خوا کوفرم پێ مەحو ئەکاتەوە ، من حاشیرم کە خەڵکیی بەدوای من‌دا حەشر ئەکرێن ، هەروەها من عاقیبم کە من دوا پێغەمبەرم و پێغەمبەری تر بەدوام‌دا نایەت ..

بەڵام لە هەموویان بەناوبانگ‌تر موحەممەد و ئەحمەدن . ئەوەتا لە قورئانی پیرۆزدا ، بۆ نموونە ، هاتوون :

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ﴾ ( الفتح : ٢٩ ) .

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ﴾ ( آل عمران : ١٤٤ )

﴿ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ﴾ ( الصف : ٦ ) .

هەروەها هەندێ ناویشی لە قورئان‌دا هاتوون :

الشاهد ، المبشر ، النذير ، المبين ، الداعي إلى الله ، السراج المنير :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴾ ( الأحزاب : ٤٥ - ٤٦ ) .

هەروەها ناوی تریشی لە قورئان‌دا هاتووە :

المذكر ، الرحمة ، النعمة ، الهادي ، الشهيد ، الأمين ، المزمل ، المدثر ، الرؤوف ، الرحيم .

ناوی تریشی هەن وەك ( المتوكل ) .

لە فەرموودەی صەحیح‌دا هاتووە :

(( سميتك المتوكل ، ليس بفظ ، ولا غليظ ، ولا جاف ، ولا سخاب بالأسواق ، ولا يقابل السيئة بالسيئة ولكن يعفو ويصفح )) رواه البخاري .

هەروەها ناوی تریشی هەن ، وەك :

المختار ، المصطفى ، الشفيع المشفّع ، الصادق المصدوق . ئەوە بوو کە هەندێ لە هاوەڵان لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەیەکی ئەگێڕایەوە ئەیوت :

(( حدثني الصادق المصدوق ﷺ )) .

هەندێکیش ئەوەیان دەربڕیوە کە ناوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە وێنەی ناوەکانی خوای گەورە نەوەد و نۆ ناون .. خۆ ئەگەر بە وردییش سەرنج بدرێن ئەگەنە سێ‌صەد ناو .

ناوی ( محمد ) یش ( إسم المفعول ) ی ( تحميد ) ە بۆ موبالەغە . خۆ دیارە ئازیزمان لە هەموو چرکەیەك‌دا هەزاران خواناس ، لەو رۆژەوە کە کاری پێغەمبەرایەتی خراوەتە ئەستۆی هەتا رۆژی قیامەت و ، لە مەحشەریش‌دا کە

شەفاعەت بۆ خەڵك ئەكات و لە ترس و بیمی ئەو رۆژە سەختە رزگاریان ئەكات ، خەریكن ستایشی ئەكەن و داوای رەحمەت بارانی بۆ ئەكەن . قورئان ئەفەرموێ :
﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴾ ( الإسراء : ٧٩ ) .
بەڵێ ئەو مەقامە تاقانەیە بۆ ئازیزمان دیاریی كراوە . مەقامێك كە تیایا سوپاسی بكرێت .
داخۆ لە ئینس و جینن و مەلائیكەت چەند كەس لەو مەقامەدا سوپاسی بكەن ؟ مەگەر خوا خۆی بزانێت .
ئەمەش ناوی باو باپیری ئازیزمان ﷺ بەو پێیەی كە ئیمام بوخاریی لە صەحیحەكەیدا تۆماری كردوون :
موحەممەدی ، كوڕی عەبدوڵلای ، كوڕی عەبدولموطەللیبی ، [٤٨] كوڕی هاشمی [٤٩] كوڕی عەبد مەنافی، [٥٠] كوڕی قوصەی، [٥١] كوڕی كیلابی، [٥٢] كوڕی موررەی ، كوڕی كەعبی، [٥٣] كوڕی لوئەی، كوڕی غالبی، كوڕی فیهری، [٥٤] كوڕی مالیكی، كوڕی نەضری، [٥٥] كوڕی كینانەی، كوڕی خوزەیمەی ، كوڕی مودریكەی، كوڕی ئیلیاسی، [٥٦] كوڕی موضەری ، [٥٧] كوڕی نزاری ، [٥٨] كوڕی مەعدی ، كوڕی عەدنان . [٥٩]

---

[٤٨] ناوی شەیبە بووە ، ئەڵێن لەبەر ئەوە ناویان ناوە شەیبە هەندێ لە قژی سەری سپیی بوون و ، ئەش ڵێن : پێی وتراوە ( شيبة الحمد ) چونكە زۆر سەخیی بووە .

[٤٩] ناوی عەمر بووە و نازناوی هاشمی لەبەر ئەوە لێ نراوە كە نانی زۆری گوشیوەتە ناو گۆشتاوەوە بۆ نان دانی خەڵكیی .

[٥٠] ناوی ( المغيرة ) بووە .

[٥١] ناوی زەید بووە .

[٥٢] ناوی حەكیم بووە .

[٥٣] یەكەم كەسێك بووە كە رۆژی جومعە خەڵكی كۆكردۆتەوە و ، وتاری بۆ داون و ، باسی رەوانەكردنی پێغەمبەری ﷺ بۆ كردوون و ، پێشی راگەیاندوون كە لەنەوەی خۆی ئەبێت .

[٥٤] ناوی قورەیش بووە و ، بە بۆنەی ئەمەوە هۆزی قورەیش ناونراوە . كەواتە هەرچیی لە ژووری فیهرەوە بێت قورەیشیی نیە ، بەڵكو كینانیی‌یە .

[٥٥] بە بۆنەی گەشاوەیی دەم و چاویەوە ناویان ناوە ( النضر ) . ئیبن هیشام وتوویە : ئەم قورەیشە ، شافیعیی و نەوەوییش ئەمەیان بە راست زانیوە . ئەڵێن : قورەیشیش بچووك كراوەی ( قرش ) ە ، كە گەورەترین گیانداری دەریایە . بە بۆنەی ئەوەوە قرش هەموو شتێ ئەخوا و هیچ شتێ ناتوانێ ئەو بخوات . هەروەها قورەیشیش هۆزێكی بەهێز بووە .

[٥٦] یەكەم كەسێك بووە كە وشتری كردووە بە ( هدي ) بۆ حەج . عەرەب یەكجار رێزێكی زۆریان لە ئیلیاس گرتووە و ، وەك لوقمانی حەكیم سەیریان كردووە و ، ناوی سەرگەورەی قەوم و سەرداری عەشرەتی لێ نرا بوو و ، هیچ كارێك بێ پرسی ئەو ئەنجام نەئەدرا ..

تا ئێرە زانایان یەك دەنگن لەسەر نەسەبی پێغەمبەر ﷺ ، بەڵام لە عەدنانەوە زۆور جیاوازیی تێدا هەیە ، هەرچەندە نەسەبزانان لەسەر ئەوەش یەك دەنگن کە ئیبراهیم و ئیسماعیل سەلامیان لێ بێ باپیرە گەورەی پێغەمبەرن ﷺ.

هەتا هەندێ سیفاتی لاشەی ئیبراهیم سەلامی لێ بێ لە پێغەمبەری خوادا بوون . لە فەرموودەی صەحیحیش‌دا هاتووە کە کاتێ باسی ئیبراهیم کراوە فەرموویە : (( وَإِنَّهُ لأَشبَهُ الناسِ بِصاحِبِكُم )) . دەری بڕیوە کە ئیبراهیم سەلامی لێ بێ لە هەموو کەسێ زیاتر لە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە .

پێغەمبەری خوا ﷺ ــ وەك زانایان دەریان بڕیوە ــ لە پشتی پاکەوە بۆ رەحەمی پاك گوازراوەتەوە و هیچ پیسیی و چەپەڵی‌یەکی نەفامیی تێکەڵ بە نەسەبی بێگەردی نەبووە ، هەتا لە نێوان دایك و باوکی‌دا هاتۆتە دنیاوە ..

لە صەحیحیی موسلیم‌دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویە :

(( إن الله اصطفى كنانة من وَلَد إسماعيلَ ، وَاصطَفَى من كنانةَ قُرَيشاً ، واصطفى من قريشٍ بَني هاشمَ ، واصطفاني من بَني هَاشمَ )) . ورواه الترمذي في سننه بزيادة في أولـه : (( إن الله اصطفى من ولد إبراهيم إسماعيل )) . فەرموویە : خوای گەورە لە ناو رۆڵەکانی ئیبراهیم‌دا بۆ رەوشت بەرزیی و فیطرە پاکیی ئیسماعیلی هەڵ بژاردووە و، لەناو رۆڵەکانی ئیسماعیلیش‌دا کینانەی هەڵ بژاردووە و ، لەناو کینانەش‌دا قورەیشی هەڵ بژاردووە و ، لەناو قورەیشیش‌دا نەوەی هاشمی هەڵ بژاردووە و ، لەناو نەوەی هاشمیش‌دا منی هەڵ بژاردووە .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەری بڕیوە کە لەناو صەدەکان‌دا هەر لە ئادەمەوە تا سەردەمی خۆی هەمیشە خوای گەورە ئەوی لە چاکترین نەسەب دەرهێناوە ، کە فەرموویە :

(( بُعِثتُ مِن خَيرِ قُرونِ بَني آدَمَ قَرناً فَقَرناً ، حَتى بُعِثتُ مِنَ القَرنِ الَّذي كُنتُ فيهِ )). رواه البخاري .

---

[٥٧] ناوی عەمر بووە و کونیەکەشی ئەبوئیلیاس . حەزی لە ماستی ترش بووە بۆیە ناویان ناوە موضر . پیاوێکی عاقڵ و دانا بووە .

[٥٨] ئەڵێن کاتێك کە لە دایك ئەبێت باوکی زۆری پێ خۆش ئەبێت ، بۆیە دەست بە سەربڕینی ناژەڵ ئەکات و نانی خەڵك ئەدات ، لەگەڵ ئەوەش دا ئەڵێت : هێشتا ئەمە کەمە بۆ ئەم منداڵە .

[٥٩] ئەڵێن : یەکەم کەسێکە کە کەعبەی داپۆشیوە ، یان لە سەردەمی ئەودا داپۆشراوە .

هەروەها جارێکیان پێغەمبەر ﷺ وتاری دا و فەرمووی : (( أنا محمد بن عبدالله .. )) هەتا کۆتایی نەسەبی شەریفی ، پاشان فەرمووی :

(( وَما افترقَ الناسُ فرقَتين إلاَّ جَعلَني اللهُ في خَيرِهما ، فَأُخرجتُ من بَينِ أَبوَيَّ ، فَلم يُصبني شَيءٌ من عهرِ الجَاهليَّة ، وَخَرجتُ من نكاحٍ ، وَلَم أُخرَج مِن سفاحٍ ، من لَدُن آدمَ حتى انتهَيتُ إِلى أَبي ، وَأُمِّي ، فَانا خَيرُكُم نَفساً ، وَخَيرُكُم أَباً )) . رواه البيهقي .

ئەفەرموێ : هەرچیی خەڵك ئەبن بە دوو تیپەوە ، خوای گەورە منی لە تیپە چاکەکە داناوە ، ئیتر هیچ شەرواڵ پیسی‌یەکی نەفامییم بەرنەکەوتووە ، هەر لە ئادەمەوە تا ئەگاتە لای دایك و باوکم ، بە نیکاحی شەرعیی حەڵاڵ لە دایك بووین . لەبەر ئەمە من لە هەمووتان چاكترم و باوکیشم لە باوکی هەمووتان چاکترە ..

هەروەها ئیمام ئەحمەد لە موسنەددا لە موطەللیبی کوڕی ئەبو وەداعەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : عەبباس خوا لێی رازیی بێ وتوویە : پێغەمبەر ﷺ هەندێ قسەی خەڵکی بەرگوێ کەوتبوون ، بۆیە سەرکەوتە سەر مینبەر و فەرمووی : (( مَن أنا ؟ )) وتیان : تۆ پێغەمبەری خوایت . فەرمووی : (( أنا محمد بن عبدالله ، بن عبدالمطلب ، إن اللهَ خَلَقَ الخلقَ فَجعَلَني في خَيرِ خَلقه ، وَجَعَلَهُم فرقَتين فَجَعَلني في خير فرقَة ، وخلق القَبائلَ ، فجعلني في خير قَبِيلَةٍ ، وَجعلهَم بُيوتاً فَجعلني في خيرِهِم بَيتاً ، فَأَنَا خَيرُكُم بَيتاً ، وخَيرُكُم نَفساً )) .

فەرمووی : من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموطەللیبم . کە خوای گەورە بوونەوەری بەدیی هێنا ، منی بە یەکێ لە گرۆی ئادەمیی گێڕا.. کە خەڵکیشی کردە دوو دەستەوە منی بە یەکێ لە چاکترین دەستە گێڕا .. کە هۆزەکانیشی بەدیی هێنان ، منی بە یەکێ لە چاکترین هۆز گێڕا .. کە بنەماڵەکانیشی بەدیی هێنان ، منی بە یەکێ لە چاکترین بنەماڵە گێڕا .. کەواتە بنەماڵەکەی من لە هی هەمووتان چاکترە و ، خۆیشم لە هەمووتان چاك ترم ..

جا خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی هەڵ بژاردووە لە بەرێزترین خێزان و بنەماڵەی ئەو کۆمەڵە ، کە دوور بێ لە هەموو ناتەواوی‌یەك ، هەڵی بژاردووە و ، لەناو کۆمەڵدا سەنگین و بەرێز بووە ، تا ئەو کۆمەڵە بە شانازی‌یەوە شوێن خۆی و دینەکەی بکەوێ ..

ئەمە بۆ هەموو پێغەمبەرێك یاسا بووە .. دیارە بۆ پێغەمبەری ئاخرزەمان و هەڵگری گەورەترین بەرنامەی خوایی ڕێز و پایەداریی و ڕەوشتی بەرز زیاتر پێویستن .. چونکە تا ژیان ئەبڕێتەوە پێغەمبەری تر نایەت و ، پێویستە محمد المصطفی ﷺ سەرمەشقی هەموو مرۆڤ بێت و ، بەڕێزترین و پایەدارترین ئادەمیزاد شانازیی پێوە بکات لە ژێر بەیداخی ئەودا بووەستێ .. کەواتە پێویستە لە هەموو بوارێكدا تاقانە بێت و کەسێ نەتوانێ شان لە شانی بدات .. ئەمەش ، سەرەڕای حەسەب و نەسەبێکی یەکجار پاك پەروەردەیەکی زۆر نایابی پێویستە .

جا با لە هەموو سەرێکەوە سەرنجی پشت و ڕەچەڵەکی بدەین :

لە پێشەوە بە درێژە باسی جوامێریی و مەردایەتیی باوباپیرانی ئازیزمان خستە بەر دیدەی خوێنەری خۆشەویست . دیمان کە باپیرانی یەکجار پایەدار بوون و تاقە کەسێکیان لەسەر ڕەوشتێکی نەگونجاو ڕەخنەی لێ نەگیراوە .. هی وایان هەبووە جوان لاو و پێکەوتوو و ، هی واشیان هەبووە پاڵەوانی لێهاتوو و ، هی واشیان هەبووە سنگ گوشادی سەخیی تەبیعەت و ، هی واشیان هەبووە دانا و ژیر و زرنگ و وتە شیرین و ، هی واشیان هەبووە بە سۆز و چاکەخواز و ، هی واشیان هەبووە دین‌دار و خواناس و عیبادەت‌کار بووە .

ئەم پیاوانە پشتاوپشت بە مەردایەتیی تەمەنیان بەسەر ئەبرد ، تا لە ئەنجامدا بنەماڵەی هاشمیان لێ کەوتەوە ، کە سەرداری هەموو عەرەب بوون و ڕێزی تایبەتی‌یان لێ ئەگیرا و ، کەسێ نەبوو شان لە شانیان بدات . هەتا ئەوەبوو ـ وەك لە پێشەوە باس کرا ـ نان‌دان و ئاودانی حاجیانیان پێ سپێررا بوو ، هەرچەندە ئەوەندەش دەوڵەمەند نەبوون .

سەبارەت بە دایکانی ئازیزیشمان ﷺ ، دایکی خۆی ئامینەی کچی وەهبی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی زوهرەی کوڕی کیلاب بوو کە لەگەڵ عەبدوڵڵای مێردیدا لە کیلابی باپیریاندا یەکیان ئەگرت .

لە پێشەوە باسی ئەوەشمان کرد کە زوهرە برا گەورەی قوصەی بوو و ، نەوەی زوهرەش هەمیشە دڵسۆز و دۆستی ڕاستەقینەی نەوەی عەبدمەنافی کوڕی قوصەی بوون و ، لە جەنگ و لە ئاشتییدا پشتیان ئەگرتن .

جا عەبدمەنافی باپیری ئامینە لە شەرەف و پایەدارییدا هاوتای عەبدمەنافی کوڕی قوصەی ئامۆزای بوو و ، بۆ ڕێزلێنان پێیان ئەوتن : جووتە مەنافەکە .

وەهبی باوکیشی سەرداری نەوەی زوهرە بوو .
دایکی باوکی ئامینەش ، واتە دایکی وەهبیش ، کە هاوسەری عەبدمەنافی کوڕی زوهرە بووە ناوی عاتیکەی کچی ئەوقەصی کوڕی موڕڕەی کوڕی هیلال بووە ، یەکێ بووە لەو ئافرەتە بەڕێزانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ شانازیی پێوە کردوون کە فەرمووییە :
(( أنا ابن العواتك من سُلَيم )) .
ئەو ئافرەتانە کە ناویان عاتیکە بووە و لە هۆزی سولەیم یش بوون سیانن :
یەکەمیان : عاتیکەی کچی هیلالی کوڕی فالج ی کوڕی ذەکوان بووە . ئەم ئافرەتە هاوسەری قوصەی و دایکی عەبدمەنافی کوڕی قوصەی و خوشکی موڕڕەی کوڕی هیلال بووە .
دووهەمیان : عاتیکەی کچی موڕڕەی کوڕی هیلالی کوڕی فالج بوّوە . ئەمیش هاوسەری عەبدمەنافی کوڕی قوصەی و دایکی هاشم و خوشکی ئەوقەصی کوڕی موڕڕە بووە .
سێهەمیشیان : عاتیکەی کچی ئەوقەصی کوڕی موڕڕەی کوڕی هیلال بووە ، ئەمیش هاوسەری عەبدمەنافی کوڕی زوهرە و دایکی وەهب بووە .
وە نەبێ ئامینە لەسەری دایکیشیەوە لەوان کەمتر بووبێ . دایکی ناوی بەڕڕەی کچی عەبدولعوززای کوڕی عوثمانی کوڕی عەبدوداری کوڕی قوصەی بووە .
دایکی عەبدوڵلاش ناوی فاطیمەی کچی عەمری کوڕی عائیذی مەخزوومیی بووە ، کە نەوەی مەخزوومیش لەناو قورەیش دا لە چلەپۆپەدا بوون .
دایکی عبدولموطەللیب یش - وەك لە پێشەوە باس کرا - سەلمای کچی عەمری نەججاریی بووە ، کە ئەوە بوو لەبەر ڕێز و پایەداریی لەناو قەومەکەیدا بڕیاری دابوو شوو بە پیاوێك ئەکات کە کاری لە دەستی خۆیدا بێت ، واتە هەرکەی ئەو پیاوەی لەبەر چاوکەوت سەلما بتوانێ دەستی لێ هەڵ بگرێ . جا کاتێك کە هاشم خوازبێنیی سەلمای کرد لە باوکی مەرجی ئەوەی گرت کە کچەکەی لەلای خۆیان بمێنێتەوە . ئەشلێن : ئەوەی لێ داوا کردووە کە لە یەثریب لای خۆیان منداڵی ببێ . ئەوەبوو هاشم سەلمای برد بۆ مەککە و کاتێ ویستی بچێ بۆ سەفەری شام سەلماش حامیلە بوو بردیەوە بۆ یەثریب تا لەوی عبدولموطەللیبی لێ ببێ .. ئەوی لەوێ دانا و خۆیشی چوو بۆ شام و لە غەززە کۆچی دوایی کرد . کە شەیبە لە

دایك بوو حەوت ساڵ لەلای خاڵوانی مایەوە ، تا ئەوە بوو موطەللیبی مامی چوو بە دوایدا و هێنایەوە ..

دایکی هاشمیش عاتیکەی کچی موڕڕە بووە لە نەوەی سولەیمی کوڕی مەنصوور ، وەك لە پێشەوە باسمان کرد .

دایکی عەبدمەنافیش ـ وەك لە پێشەوە باس کرا ـ عاتیکەی کچی هیلالی کوڕی فالج بووە .[٦٠] بەڵام ئیبن ئیسحاق ئەوەی دەربڕیوە کە دایکی عەبدمەناف حوببای کچی حولەیلی خوزاعیی‌یە ، کە کاروباری مەککە بە دەست حولەیلەوە بوو و دوای ئەو کەوتە دەست قوصەی .

دایکی قوصەیش فاطیمەی کچی سەعد کە یەمەنیی‌یە و لە هۆزی ئەزدی شنۆئەیە .

دایکی کیلابیش هیندی کچی سەریرە لە نەوەی فیهری کوڕی مالیك .

دایکی موڕڕەش وەحشیەی کچی شەیبانە ئەویش لە نەوەی فیهرە .

دایکی کەعب یش ماویەی کچی کەعبە لە هۆزی قوضاعە .

دایکی لوئەیش سەلمای کچی عەمری خوزاعیی‌یە .

دایکی غالب یش لەیلای کچی سەعدە لە هوذەیل .

دایکی فیهریش جەندەلەی کچی حەرثە لە هۆزی جورهوم .

دایکی مالیکیش عاتیکەی کچی سەعدی کوڕی ظەربە لە هۆزی قەیس عەیلان .

دایکی نەضریش بەڕڕەی کچی میراری کوڕی ئەددە .

دایکی کینانەش عەوانەی کچی سەعدە لە قەیس عەیلان .

دایکی خوزەیمەش سەلمای کچی ئەسلەمی قوضاعیی‌یە .

دایکی مودریکەش خەندەفە کە نموونەی شەرەف و پایەداریی بووە .

دایکی ئیلیاسیش رەبابی کچی جوندەی کوڕی مەعد بووە .

دایکی موضەریش سەودەی کچی عەککە .

دایکی نزاریش مەعانەی کچی جەوشەمە لە هۆزی جورهوم .[٦١]

---

[٦٠] الروض الأنف : ١ / ٧٦ .

[٦١] البداية والنهاية ونور اليقين ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ١٧٣ ـ ١٩٠ ، الرحيق المختوم : ٥٣ ـ ٥٤ ، السيرة النبوية للصلابي : ٤٤ ـ ٤٨ .

## بەشی حەوتەم

# شیر پیّدان و پیّگەیشتنی

**یەکەم : شیرپیّدان**

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەدایك بوو ، پێش هەموو کەسێك دایکی شیری پێ دا . ئەڵێن : سێ رۆژ و ، هەندێك ئەڵێن : حەوت و ، هەنـدێکیش ئـەڵێن نـۆ رۆژ شیری پێ داوە .

پاشان ثوەیبەی کەنیزەکی ئەبولەهەبی کوڕی عەبدولموطەللیب شیری مەسرووحی کوڕی ، بۆ ماوەی چەند رۆژێك ، تا ئەو کاتەی کە حەلیمە هات بۆ مەککە ، پـێ داوە .. هەروەها شیری بە حەمزەی کوڕی عەبدولموطەللیبی مـامی پێغەمبـەر ﷺ و، ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومیی پوورزای پێغەمبەر ﷺ داوە . بەمە پێغەمبـەر و حـەمزە و ئەبوسـەلەمە هەرسـێکیان بـرای شـیریی یـەکترن . هەروەها حەمزە شیری حەلیمەشی خواردووە ، کەواتە لە دوو سەرەوە برای شـیریی پێغەمبەری خوایە ﷺ .

ئەوەبوو دوای ( عمرة القضاء ) بـە پێغەمبـەریان وت : ئایـا فـاطیمـەی کچـی حەمزە مارە ناکەیت ؟

فەرمووی : (( إنها إبنة أخي من الرضاع )) فەرمووی : کچی برای شیریمە .

کاتێکیش کە ئوم حەبیبە پێـی وت : قسـەمان بـۆ کـراوە کـە ئەتـەوێ کچـی ئەبوسەلەمە مارە بکەیت ، لە ریوایەتێکی تـردا : دورڕەی کچـی ئـەبو سـەلەمە مارە بکەیت ، فەرمووی : (( بنت أبي سلمة ؟ )) وتی : بەڵێ .

فـەرمووی : (( إنها لو لم تكن ربيبتي في حجري ما حَلَّتْ لي ، إنها لإبنة أخـي مـن الرضاعة ، أرضعتني وأباسلمة ثويبة ، فلا تعرضنَّ عليَّ بناتكن ، ولا أخواتكن )) . رواه البخاري .

فەرمووی : ئەگەر کۆڵەبەستیشم نەبوایە ، ئەوا هەر بۆم نەئەشیا ، کچـی بـرای شیرییمە . ثوەیبە شیری بە منیش و بە ئەبوسەلەمەش داوە . ئـیتر هـەوڵ مـەدەن کچەکانتان و خوشکەکانتان بـخوازم .

جا پیاوماقوولانی عەرەب عادەتیان وەها بوو کە لە دەشت دایەن بۆ منداڵەکانیان بە کرێ بگرن ، تا منداڵەکە رەسەن و ، لاشە دروست و ، مێشک پاك بێت و ، لە تەمەڵیی و خاویی و شل و شۆڵیی بەدوور بێت . چونکە بڕوایان وەها بوو کە ئەو منداڵەی لەناو شاردا بەخێو بکرێ مێشك داخراو و ، بێهیممەت و ، لەش‌ولار لاواز ئەبێت و ، بە پێچەوانەشەوە هەر منداڵێك لە بادیەدا و لەناو ئەعراب‌دا بەخێو بکرێ زمان‌پاراو و ، رەسەن‌گۆ دەرئەچێت . ئەوەبوو جارێکیان ئەبوبەکری صددیق خوا لێی رازیی بێ بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو : ئەی پێغەمبەری خوا ! کەسم نەدیوە لە تۆ زمان پاراوتر بێ . فەرمووی :

(( وَما يَمنَعُني ، وَأَنا مِن قُرَيشٍ ، وَأُرضِعتُ في بَني سَعد )) .

زمان پاراوی‌یەکەی گەڕاندەوە بۆ دوو هۆ : یەکەمیان قورەیشی‌یە و ، دووهەمیشیان لەناو نەوەی سەعددا شیری پێ دراوە ..

دەوڵەمەندەکانی شار منالەکانیان ئەنارده بیابان تا تەمەنیان ئەگەیشتە هەشت یان دە ساڵان . جا هەندێ هۆز لە شیردان‌دا ناوبانگیان دەرکردبوو و ، هەندێکیش لە زمان پاراویی‌دا ، کە یەکێ لەو هۆزانە هۆزی نەوەی سەعد بوو ، کە حەلیمەی دایەنی پێغەمبەر ﷺ لەوان بوو .

لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەدایك ئەبێت چەند ئافرەتێك لە هۆزی نەوەی سەعد لە بیابانەوە ئەکەونە رێ تا سەرێك لە مەککە بدەن ، بەو هیوایەوە کە منداڵی شیرەخۆریان بدەنە دەست و بیان‌بەوە بۆ ناوچەی خۆیان و لەوێ بەخێویان بکەن .. ساڵەکەش ساڵی گرانیی و قات و قڕیی بوو .. یەکێ لەو ئافرەتانەش ناوی حەلیمەی کچی ئەبو ذوئەیبی سەعدیی بوو ، خۆی و مێردەکەی کە ناوی حاریثی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی ریفاعەی سەعدیی بوو [٦٢] ، لەگەڵ منداڵە شیرەخۆرەکەی خۆی کە ناوی عەبدوڵلا بوو کەوتنە رێ . گوێدرێژێك و وشترێکی پیریان پێ بوون .. کە وشترەکە دڵۆپێك شیری تێدا نەبوو و ، سەرانسەری شەو ئەو ژن‌و مێردە خەویان نەئەچووە چاوان ، چونکە منداڵەکەیان لە برسان‌دا هەتا بەیانیی هەر ئەگریا ، نە دایکی دڵۆپێك شیری تیا بوو و ، نە

---

[٦٢] حاریث ما هەتا ئیسلام هات و موسڵمان بوو ، هەتا خاوەنی ( الإصابة ) بە هاوەڵی لە قەڵەم داوە . پێیان ئەوت : ئەبوکەبشە . هەر بەو بۆنەوە کاتێك کە قورەیش دژایەتیی پێغەمبەریان ﷺ ئەکرد ئەیان وت : کوڕی ئەبوکەبشە وای دەرئەبڕێ کە لە ئاسمانەوە قسەی لەگەڵ دا ئەکرێ !!

وشترەکەش . بەڵام بە دڵ و بە گیان چاوەڕوانیی کۆمەکیی و دەرووی خێری خوا بوون .. سواری وشتر و گوێدرێژەکە بوون و لەگەڵ هاوەڵانیاندا بە هەر حاڵێك بوو خۆیان گەیاندە مەککە ..

حەلیمە سوێند بەخوا ئەخوا کە پێی بزانێ هەموو ئافرەتەکان پێغەمبەری خوایان ﷺ نیشان دراوە ، بەڵام کە پێیان ئەوترا هەتیوە و باوکی نەماوە ، ئەیان دایە دواوە ، چونکە ئەوان بۆیە ئەو منداڵەیان ئەبردە لادێ و بەخێویان ئەکرد ، چاوەڕوانی ئەوەبوون باوکی منداڵەکە دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکات ، بۆیە ژنەکان ئەیان وت : هەتیوە ، ئەبێ دایکی و باپیریی چییان لە دەست بێت ؟ لەبەر ئەوە هیچ ژنێك نەیئەویست .

ژنەکان هەموو منداڵەکانی مەککەیان هەڵ گرت و جگە لە حەلیمە ژنێك نەما منداڵی دەست نەکەوێت و ، جگە لە موحەممەدی هەتیویش لە مەککەدا منداڵێك نەما تا حەلیمە هەڵی بگرێ و بیباتەوە بۆ بیابان و بەخێوی بکات ..

داخۆ حەلیمە چەندە دڵی لە خۆی دامابێ ؟

چەندە گلەیی لە بەختیی خۆی کردبێ ؟ ساڵی وشك و گرانیی .. مەڕومالاتی برسیی و بێدەرامەت .. گوانی وشتر وشك و برنگ .. ولاغی لاواز کە توانای ڕێ بڕینی نەبوو .. مەمکەکانیشی دڵۆپێك شیریان تیا نەبوو . مناڵەکەشی شەو تا بەیانیی لە برسانا ئەکرووزایەوە .. لە هەمان کاتدا ئافرەتەکان هەر هەموویان بە دڵی خۆیان منداڵی دەوڵەمەندیان دەست کەوتووە و ، ئەمیش دەستی خاڵییە و ، جگە لە موحەممەدی بێباوکیش منداڵ نەماوە .

ئیتر نەیئەزانی پەروەردگار خێری بۆ ئەو گل داوەتەوە .. نەیئەزانی پەروەردگار بەرەکەتی ئاسمان و زەویی بۆ ئەو هەڵ گرتووە ..

لەبەر ئەوەش هەر دەستی خاڵی نەبێ ، کاتێك کە ویستیان بگەڕێنەوە بە مێردەکەی وت : بەخوا پێم ناخۆشە لەناو دەستە خوشکانما تەنها من بە دەستی خاڵیی بگەڕێمەوە .. ئەچم بۆ لای ئەو هەتیوە و هەڵی ئەگرم . مێردەکەشی دڵی دایەوە و وتی : سێ و دووی لێ مەکە ، بڕۆ بیهێنە بەڵکو خوا بیکاتە مایەی بەرەکەت بۆمان .

حەلیمە کەمەندکێش بوو .. هێزێك رای ئەکێشا .. هێزی تەماعیش نەبوو .. چونکە هیچ دنیایەك لەو منداڵە هەتیوە چاوەڕوان نەئەکرا .. ڕۆیشت بۆ ماڵی

خاتوو ئامینه .. خاتوو ئامینەش رەنگە ئەو رۆژە شیوەنێکی چاکی کردبێ .. شیوەنێك بۆ مێردی جوانەمەرگی کە لە ناکاودا بەجێی هێشتن و ، شیوەنێکیش بۆ کۆرپەی ئازیز کە هەرچی ژنی بیابان بوو هەموویان هاتنە سەری و ، لەبەر ئەوەی کە هەتیو بوو هەڵیان نەگرت ..

ئەو بێبەختانە موحەممەدی ئازیزیان ﷺ نەئەناسیی .. بەڵێ ئەو داماوانە خوا پێداو نەبوون تا بتوانن پڕی پیا کەن و خێری دنیا و قیامەت بگرنە باوەش ..

حەلیمە گەیشتە ماڵی ئامینە خانم و تەقەی لە دەرگا دا و چووە ژوورەوە .. چووە ژوورەوە بۆ خزمەتی ئازیز و نەشیئەزانیی کە گەورەترین ئازیزی سەر رووی زەوییە .. نەیئەزانی شیفاعەتی قیامەت بە دەست ئەو ساوا بێباوکەیە .. ئەبینێ وا منداڵەکە بە قوماشێکی لە خوریی چنراوی لە شیر سپییتر داپۆشراوە و، بۆنی میسکی لێ بەرز ئەبێتەوە و ، ئاوریشمێکی سەوزیش وا لە ژێریا و ، کەوتووە بە پشتا و پرخەی لێ داوە .. ئەوەندە جوان و نازدار بوو ناوچاوی ئەدرەوشایەوە .. دڵی نەهات بەخەبەری بهێنێ ، لەسەر خۆ و بە هێمنیی ، بەوپەڕی شەفەقەتەوە لێی چووە پێش .. دایکیشی تەماشای ئەکات ، خەڵکی گەڕەك هاتنە دیاری دیمەن .. دیمەنی شەفەقەت و خۆشەویستیی .. دیمەنی دڵڕفێن .. مەلائیکەتەکانیش بە خۆشیی و شادمانییەوە سەیریان ئەکرد .. ئافەرینیان لە ئافرەتی خاوەن بەخت ئەکرد ، کە لە ئازیز ئەچووە پێش .. دەستی خستە سەر سنگی پیرۆزی ئازیز ، ئەویش زەردەخەنەیەکی ناسکی کرد و ، هەردوو چاوی کردنەوە تا سەیری حەلیمە بکات .. ئەوەبوو نوورێك لە هەردوو چاویەوە هاتە دەرەوە و حەلیمە چاوی لێ بوو کە هەتا ئاسمان ئەو نوورە بەرز بوویەوە و ئەویش هەر سەیری ئەکرد ..

حەلیمە خۆی شۆڕ کردەوە و ماچێکی ناوچاوانی ئازیزی کرد و ، مەمکی راستی خستە دەمی و ، خێرا مەمکی لە شیر پڕ بوون و ، ئازیزیش تێری خواردەوە .. مەمکی چەپیشی بۆ گرت ، کەچیی دەمی بۆ نەبرد ، هەر هەمیشە هەروا بوو ، خوای گەورە بە رەوشتبەرز دروستی کردبوو .. خوای گەورە ئەوەی خستبووە دڵیەوە کە لەو شیرەدا هاوبەشی هەیە و ، نابێ بەشەکەی ئەو بخوا .. بەڵێ هەر بە منداڵیی خوای گەورە قەناعەت و عەدالەت و چاکەخوازیی پێ بەخشیی بوو ، پاشان موحەممەدی ﷺ هەڵ گرت و هێنایەوە بۆ شوێنی

بارخستنیان . لەوێش هەردوو مەمکی جوولآن .. تێر شیری خواردەوە ، براکەشی تێر شیری خواردەوە و خەوت . لەوەو پێش ئەوەبوو خەوی لەوانیش و لە خۆیشی حەرام کردبوو ..

پیاوەکەی حەلیمە هەستا و چوو بۆ لای وشترەکە کە گوانەکانی لەوەو پێش وشك و برنگ بوون ، ئەبینێ وا گوانی ئەوەندە شیریان تیایە خەریکە لەناو گەلیا جێیان نەبێتەوە .. خێرا شیرێکی زۆری دۆشیی و لەگەڵ حەلیمەدا تێریان لێ خواردەوە .. ئەو شەوە خۆشیان و منداڵەکەشیان تێر لێی خەوتن .. کە رۆژیان لێ بوویەوە پیاوەکەی وتی : حەلیمە چاك بزانە ، بەخوا وا ئەبینم منداڵێکی موبارەکت وەرگرتووە .. ئەویش وەڵامی ئەداتەوە کە هیواداره وەها بێت ..

هەستان باریان کرد و بەرەو ناوچەکەی خۆیان گەڕانەوە .. حەلیمە موحەممەدی خستە باوەشی و پێکەوە سواری گوێدرێژەکەیان بوون .. ئەو گوێدرێژەی کە لەو سەرەوە گیانی تیا نەبوو رێ ببڕێ ، بە پەلە رێی ئەبڕیی و هەموو ژنەکانی بەجێ ئەهێشتن و وڵاغی هیچ کامیان بە وڵاغەکەی حەلیمەدا نەئەگەیشتەوە .. ئافرەتەکان هاواریان لێ هەڵسا : کچی ئەبوذوئەیب !ماڵت ئاوا بێ ، بەزەییت پیامانا بێتەوە ، پەلە مەکە .. ئەمە ئەو گوێدرێژە نیە کە لەو سەرەوە پێی هاتی ؟! ئەویش وەڵامی ئەدانەوە : بەڵێ ، بەخوا ، هەر ئەوە .. ئەیان وت : بەخوا شتێ رووی داوە !!

موحەممەدی ئازیز ﷺ گەیشتە هەوارگەی نەوەی سەعد .. فەڕ و بەرەکەت لەگەڵیا هات .. چاوێکی بە دەوروبەریا هەڵ هێنا .. تا ئەو رۆژە ناوچەیەکی تر نەبوو ئەوەندەی ئەو ناوچەیە وشك و بێبەرهەم بێت .. بەڵام بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ فەڕ و بەرەکەت رووی کردە ماڵی حەلیمە .. مەڕەکانی کە ئەگەڕانەوە ، گوانیان پڕ لە شیر بوون .. هەرچەندە ساڵە گرانیی بوو .. حەلیمە بە ئارەزووی دڵی شیری ئەدۆشیی و ئەیان خواردەوە ، کەچیی دەر و دراوسێکان و ماڵەکانی تری هۆزەکە دڵۆپێك شیر لە گوانی ئاژەڵەکانیاندا نەبوو .. ئەوانەی کە چاویان لە ئاژەڵەکانی حەلیمە بوو گلەییان لە شوانەکانی خۆیان ئەکرد کە بۆچ ئەوانیش وەك شوانەکانی حەلیمە ئاژەڵەکانیان لە شوێنی چاكدا ناڵەوەڕێنن ؟ داوایان لێ ئەکردن کە لەو شوێنەدا بیان لەوەڕێنن کە ئاژەڵەکانی حەلیمەی تیا ئەلەوەڕێن ..

کەچیی بێهوودە بوو ، هەموو ڕۆژێ ئاژەڵەکانی حەلیمە بە گوانی پڕ لە شیرەوە ئەگەڕانەوە و ، ئاژەڵەکانی تر دڵۆپێك شیریان تیا نەبوو ..

هەروا خێر و بەرەکەت بەسەر ماڵ و منداڵی حەلیمەدا ئەڕژا ، هەتا ئازیز دوو ساڵی تەواو کرد و حەلیمە لە شیری بڕی‌یەوە . بەڵام لەو دوو ساڵەدا وەها گەورە ئەبوو کە لە منداڵەکانی تری نەئەکرد .. بەو دوو ساڵە کوڕێکی بەهێزی لێهاتووی لێ دەرچوو ..

دوای دوو ساڵ تەمەن حەلیمە موحەممەدی هەڵ گرت و هێنایەوە بۆ مەککە بۆ لای دایکی تا چاوی پێ بکەوێ .. حەلیمە حەزی نەئەکرد موحەممەدی خۆشەویستی ﷺ لێ بسێننەوە .. یەکەم لەبەر ئەوەی موحەممەد گیان وەك منالانی تر ناڕەحەتیی لەسەرشانیان نەبوو .. منداڵێکی ڕێك و پێکی پاك و تەمیز بوو .. بێ گریە و بێ بیانوو بوو .. دووهەمیش لەبەر ئەو خێر و بەرەکەتەی کە بەسەر ماڵ وحاڵی حەلیمەدا ڕژا بوو .. بەڵام چار نەبوو ئەبوا بی‌باتەوە .. کە هێنایەوە مەککە و دایکی چاوی پێ کەوت ، تێر تێر سەیری کرد پاشان باوەشی پێدا کرد و ماچیشی کرد .. زۆری پێ خۆش بوو کە دیی وا موحەممەد گیان لەش‌ساغ و تەن دروستە و ، بە چاکییش گەورە بووە ..

حەلیمە دڵی نەئەهات موحەممەد لە مەککە بەجێ بهێڵێ ، بۆیە لە دایکی پاڕایەوە تا موحەممەدی پێ بداتەوە تا لەگەڵ خۆیا بی‌باتەوە بۆ ناوچەی نەوەی سەعد ، تا لەوێ گەورە ببێ .. چونکە دەرد و دای مەککە زۆرە .. ئەوەندەی لێ پاڕانەوە تا دایکی قەناعەتی کرد و دوای پشوودان و حەسانەوە موحەممەدیان هەڵ گرت و گەڕانەوە هەواری خۆیان ..

حەلیمە و شەیمای کچی موحەممەدیان زۆر خۆش ئەویست بۆیە هەمیشە یاری‌یان لەگەڵدا ئەکرد و هەڵیان ئەپەڕاند و بە ئاوازەوە شیعریان بۆ ئەوت و دوعای سەلامەتی‌یان بۆ ئەکرد . بۆ نموونە حەلیمە ئەی‌وت :

يا رب إذا أعطَيته فأبقه   وأعله إلى العُلا وَرَقِّه

وادحضْ أباطيل العدا بحَقِّه

شەیماش ئەی‌وت :

يارب أبق أخي محمداً   حتى أراه يافعاً وأمردا

ثم أراه سيداً مُسَوَّداً   واكبت أعاديَهُ معاً والحسدا

وأعـــطه عـــزاً يدوم أبـــدا

پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کەس زیاتر چاکەی لەبەر چاو بوو و ، هەمیشە بە چاکتر پاداشتی ئەدایەوە .. بە تایبەت چاکەی مالّی حاریث و حەلیمە . ئەوەبوو دوای سەرکەوتنی ئیسلام باوك و دایکی شیریی هاتنە لای و . ئەویش عەباکەی خۆی بۆیان راخست و ، سیلەی رەحمی لەگەلّیاندا بەکار هێنا و رێزی چاکی لیّ گرتن . لە دوای فەتحی مەککەش کە جەنگی هەوازین رووی دا و زۆرێك لە ژن و منداڵیان کەوتنە دەست موسڵمانان ، شەیماش یەکیّ بوو لەو ئافرەتە دیلانە .. کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەیمای ناسی‌یەوە ، پێی فەرموو :

(( إن أحببت فعندي مُحَبَّبَة مكرَّمَة ، وإن أَحببتِ أن أمتعك ، وترجعي إلى قومك فعلت )) . فەرمووی : ئەگەر پێت خۆش بیّ لێرە لای خۆم بمێنیتەوە ، ئەوە خۆشەویست و بەڕێزی لەلامان و ، گەر پێشت خۆش بیّ پێویستییت بۆ جیّ بەجیّ بکەم و بگەڕێیتەوە ناو خزمەکانت ، وا ئەکەم .

وتی : پێویستییم بۆ جیّ‌بەجیّ بکەیت و بم‌نێریتەوە بۆ ناو خزمەکانم .

ئەوەبوو بە جوانیی سیلەی رەحمی لەگەلّدا نواند و ، رێزی لیّ گرت و ناردیەوە بۆ ناو خزمەکانی . ئەلّێن : بەندەیەك و کەنیزەکێکی پێشکەش کردووە ، ئەویش لە یەکی مارە کردوون و منداڵیان بووە . شایانی باسە کە ئەو رۆژە تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەصت ساڵ زیاتر بووە و ، تەمەنی شەیماش بەرەو حەفتا ساڵیی رۆیشتووە .

**دووهەم : سنگ لەت کردن**

رۆژێکیان موحەممەد ﷺ و برا شیری‌یەکەی کە لە تەمەنی چوار ساڵیی‌دا بوون، لە پشتی ماڵەکانەوە بە لای مەڕەوە بوون ، لە ناکاو براکەی رای کردەوە بۆ ماڵەوە و هاواری کرد : دوو پیاو کە جل‌وبەرگی سپی‌یان لەبەردا بوو هاتن برا قوڕەیشی‌یەکەمیان گرت و پاڵیان خست و سکیان دڕیی !!

حەلیمەش لەگەڵ مێردەکەی بە پەلە بەرەو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەڕۆن ئەبینن وا هەستاوەتەوە سەر پیّ و رەنگیشی هەلّ بزرکاوە . حەلیمە و مێردەکەی ئەی‌گرن و ماچی ئەکەن و حاریث لێی ئەپرسیّ : رۆڵە گیان ! چیت بەسەر هاتووە ؟!

فەرمووی : (( جَاءَنِي رَجُلان عَلَيهما ثِيابٌ بِيضٌ ، فَأَضْجَعانِي ، وَشَقَّا بَطْنِي ، ثم استَخرَجَا مِنهُ شَيئاً لا أَدرِي مَا هو ؟ فَطَرَحَاهُ ، ثم رَدَّاهُ كَما كَان )) !!

فەرمووی : دوو پیاوی جل‌وبەرگ سپیی هاتن و، پاڵیان خستم و ، سکیان دڕیم و، پاشان شتێکیان تیا دەرهێنا کە نازانم چیی بوو ، فڕێیان دا و ، پاشان وەکو خۆیان لێ کردەوە ..

ئیتر ئەی‌هێننەوە ماڵەوە .. حاریث لەم ڕووداوە تێ ناگات و ترسی لێ ئەنیشێ کە موحەممەدی ئازیزیان تووشی شتێکی خراپ هاتبێ ، بۆیە داوا لە حەلیمە ئەکات کە هەتا زووە و ، مەترسی‌یەکی لێ دەرنەکەوتووە بی‌بەنەوە بۆ لای کەس وکاری و ، با لە جیاتیی چاکە و پیاوەتیی بەخێوکردنی ، خەجاڵەت نەبن ..

کوڕە بە ناچاریی هەڵ ئەگرن و ئەی‌بەنەوە مەککە لای دایکی . کە دایکی ئەمە ئەبینێ سەری سوڕ ئەمێنێ ، بۆیە پرسیار ئەکات : ئەی دایەنی دڵسۆز ! چۆن هێناوتەتەوە ، لە کاتێکدا کە تۆ زۆر لەسەر ئەوە سوور بوویت لەلات بمێنێتەوە ؟

حەلیمە وەڵامی ئەداتەوە : لە خوا بە زیاد بێ کوڕەکەم گەورە بووە و ، ئەوەی لەسەر شانم بووە جێ‌بەجێم کردووە و ، خوا نەخواستە ئەترسام شتێکی لێ ڕوو بدات ، بۆیە منیش بەو شێوەیەی کە تۆ پێت خۆش بێت هێناومەتەوە بۆت .

خاتوو ئامینە بڕوای بە قسەکانی حەلیمە نەکرد ، بۆیە وتی : ئەمە کاری تۆ نیە ، ڕاستی‌یەکەیم پێ بڵێ .. وازی نەهێنا هەتا حەلیمە ڕاستیی باسەکەی بۆ دایکی گێڕایەوە . ئەویش وتی : ترسایت شەیتان دەستی لێ بووەشێنێ ؟! وتی : بەڵێ . وتی : نە بەخوا ، شەیتان دەستی بەسەریا ناڕوا و ، ئەم کوڕەشم پایەدار ئەبێت ، هەواڵێت بۆ بگێڕمەوە ؟

حەلیمە ئەڵێت : بەڵێ .

ئەڵێت : کاتێك کە سکم پێوەی پڕ بوو چاوم لێ بوو نوورێکم لێوە دەرچوو کە کۆشکەکانی بوصرای لە وڵاتی شام ڕووناك کردنەوە بۆم . پاشانیش بەخوا نەم‌دیوە هیچ سکێك ئەوەندە سووك و ئاسان بێت ، کاتێکیش کە لەدایك بوو و کەوتە زەویی هەردوو دەستی لەسەر زەویی دانان و ، سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە .. گوێی مەدەرێ و وازی لێ بێنە .

بەم شێوەیە دایکی دڵی حەلیمەی دایەوە و ، بەوپەڕی ڕێز و ئیحتیرامەوە خوا حافیزیی لێ کرد و ، ڕەوانەی وڵاتی خۆیانی کردەوە .

کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوایش ﷺ پێی ئەڵێن : ئەی پێغەمبەری خوا ! هەواڵی خۆتمان بۆ باس بکە . فەرمووی : (( نَعم ، أنا دَعوَةُ أَبي إبراهيمَ ، وَبُشرَى أَخي عيسَى ، وَرَأت أُمِّي حينَ حَمَلَت بي أَنَّهُ خَرَجَ منها نُورٌ أَضَاءَت لَها قُصورُ الشامِ ، وَاستُرضعتُ في بَني سَعد بن بكرٍ ، فَبينا أنا مَعَ أَخٍ لي خَلفَ بُيوتنا نَرعَى بَهْماً لَنا إذ أَتاني رَجُلان عَلَيهما ثَيابٌ بيضٌ بطَست من ذَهَب مَملوءَة ثَلجاً ، ثم أَخَذاني فَشَقَّا بَطني ، وَاستَخرَجا قَلبي فَشَقَّاهُ ، فَاستَخرَجاً مِنهُ عَلَقَةً سَوداءَ فَطَرَحاها ، ثُمَّ غَسَلا قَلبي وَبَطني بذَلكَ الثَّلجِ حَتَّى أَنقياهُ ، ثم قالَ أَحَدُهُما لصاحبه : زِنهُ بعَشَرَة مِّن أُمَّته ، فَوَزَنَني بِهم ، فَوَزَنتُهُم ، ثم قال : زِنهُ بمائَة مِّن أُمَّته ، فَوَزَنَني بِهم ، فوزنتهم ، ثم قال : زنه بألف من أمته ، فوزنني بهم ، فوزنتهم ، ثم قال : دَعهُ عَنكَ ، فَوَاللهِ لَو وَزَنتَهُ بأمته لَوَزَنَها )) . ( سيرة ابن هشام : ١ / ١٦٦ ) . قال ابن كثير : وهذا إسناد جيد قوي .

فەرمووی : بەڵێ من ئەنجامی نزا و پاڕانەوەی ئیبراهیمی باوکە گەورەمم و ، مژدەکەی عیسای برامم و ، کاتێکیش کە لە سکی دایکما بووم ، دایکم نوورێکی وەهای بینیی کە لێوەی دەرچوو کۆشکەکانی شامی بۆ رووناك کردەوە و ، لەناو نەوەی سەعدی کوڕی بیکریش‌دا شیرم پێدراوە .. کاتێك کە لەگەڵ برایەکم‌دا لە پشتی ماڵەکانمانەوە خەریکی مەڕ لەوەڕاندن بووین دوو پیاوی جل‌وبەرگ سپیی ( کە جیبریل و میکائیل بوون ) هاتن و تەشتێکی لە ئاڵتوون دروست‌کراویان پێ بوو کە پڕ لە بەفر بوو . منیان گرت و سکیان لەت کردم و ، دڵیان دەرهێنام و ، لەتیان کرد و ، ئەڵقەیەکی ڕەشیان تیایا دەرهێنا و ، فڕێیان دا . پاشان دڵ و سکمیان بەو بەفرە وەها شۆردن هەتا پاك پاکیان کردنەوە و ، پاشان یەکێکیان بە هاوڕێکەی وت : بە دە کەسی ئوممەتەکەی‌دا کێشانەی بکە . ئەویش کێشانەی کردم و ، من لە هەموویان قورس‌تر بووم . پاشان وتی : بە صەد کەسی ئوممەتەکەی‌دا کێشانەی بکە . ئەویش کێشانەی کردم و ، من لە هەموویان قورس تر بووم . پاشان وتی : بە هەزار کەسی ئوممەتەکەی‌دا کێشانەی بکە . ئەویش کێشانەی کردم و ، لە هەموویان قورس‌تر بووم . پاشان وتی : وازی لێ بهێنە ، دە بەخوا ئەگەر بە هەموو ئوممەتەکەی‌دا کێشانەی بکەی ئەم لە هەموویان قورس‌تر ئەبێت ..

ئیمام موسلیم یش ئەم چیرۆکەی بەم شێوە گێڕاوەتەوە :

عَن أَنس بن مالك : أنَّ رسولَ الله ﷺ أتاهُ جبريلُ ـ عليه السلام ـ وَهُوَ يلعبُ مـعَ الغلـمان فَأَخَذَهُ فَصَرَعَهُ ، فَشَقَّ عَن قَلبه فَاستَخرَجَ القَلبَ ، وَاستخرجَ منـهُ عَلَقَـةً سَوداءَ ، فَقـالَ : هذا حَظُّ الشَّيطان ، ثُمَ غَسَلَهُ في طَست مِّن ذَهَب بماءِ زَمـزَمَ ، ثم لأَمَهُ ، ثم أَعادَهُ في مَكانه ، وَجاء الغلمانُ يَسعَونَ إلى أُمِّه ـ يَعني ظئرهُ ـ فقالوا إن محمدا قد قُتل ، فاستقبلوه وهوَ مُنتَقِعُ اللونِ . قال أنسٌ : وقد كُنتُ أَرَى أَثرَ ذلكَ المخيطِ في صدرِه . [٦٣]

ئەگێڕێتەوە کە جیبریل سەلامی لێ بێ دێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەگەڵ منداڵان دا یاریی ئەکرد ، گرتی و دای بە زەوییدا و ، سـنگی لـەت کـرد و دڵـی دەرهێنا و لەتی کرد و ئەڵقەیەکی رەشـی لـەناویا دەرهێنـا و فـەرمووی : ئەمـە بەشی شەیتانە ، پاشان لە تەشتێکی زێڕیندا بە ئـاوی زەمـزەم شـۆردی ، پاشـان لکاندییەوە و خستیەوە شوێنی خۆی و ، منداڵانیش بە پەلە خۆیـان گەیانـدە لای حەلیمە و وتیان : موحەممەدیان کوشت . کە چوون بە پیریەوە ئەبینن وا بـە رەنـگ هەڵبزرکاویی هاتەوە .

ئەنەس ئەڵێ : شوێنی ئەو دوورینەوەیەم لەسەر سنگی بەدیی ئەکرد ..

وەنەبێ لەت کردنی سنگی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ هەر ئەم جارە بووبێ ، بـەڵکو دوو جاری تریش سنگی لەت کراوە .. جارێك لـە کـاتی بـوون بـە پێغەمبـەر و ، جارێکیش لە کاتی گەشتی ئیسرا و میعراج دا .. شایانی باسـە کـە لـەت کردنـی سێهەم بە فەرموودەی صەحیح ، کە بوخـاریی و موسـلیم ریوایـەتیان کـردوون ، چەسپاوە . [٦٤]

لەت کردنی یەکەم بۆ لابردنی ئەو ئەڵقەیە بوو کە بەشـی شـەیتان بـوو ، واتـە بەشی نەفس و ئارەزووەکانی ، کە دیارە هەموو کەسێ نەفسـی ئـەمارەی هـەوڵی لەگەڵ ئەدا تا گومڕای بکات . جا خوای گەورە ئەیەوێ یەکەم خۆشەویسـتی لـەوە رزگاری بێ و بە هیچ شێوەیەك شەیتان نەتوانێ لە خشتەی بەرێ .

---

[٦٣] صحيح مسلم بشرح النووي : ٢ / ٢١٦ ط حجازي .

[٦٤] سەیری کتێبی ( الإسراء والمعراج ) ی دکتۆر محمد بن محمد أبو شهبة بکە : ١ / ٥٥ ـ ٦٦ .

لەت‌کردنی دووهەم جاریش بۆ ئەوە بوو بەوپەڕی وریایی و هۆشیارییەوە فەرمانی ئاسمان وەربگرێ و ، دڵی بتوانێ قورئانی پیرۆز لە بەر بکات و پیتێکی لێ تێکەڵ نەبێت ، تا بە تەواوترین شێوە دینی خوا بگەیەنێ ..

لەت‌کردنی سێهەمیش ئامادەکردنی بوو بۆ ئەو خێر و بەرەکەت و فیوضاتە خواییانە کە لە شەوی میعراج‌دا پێشکەشی ئەکرێن و ، بۆ ئەو بەڵگە و نیشانە ئاشکرایانەش کە پەروەردگاری پێشکەشی ئەکات و ، بۆ ئەوەش تا لە نهێنیی ئیسرا و میعراج بە جوانیی تێ بگات . دیارە ئەمەش هەمووی پێویستی بە فراوانیی سنگ و دامەزراویی دڵ هەیە .

**سێهەم : مۆری پێغەمبەرایەتیی**

چەندین ریوایەت دەربارەی ئەوە هاتوون کە پارچە گۆشتێکی بەرزەوە بوو و ، بە موو داپۆشراو ، لەسەر شانی چەپی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبووە ، بە وێنەی هێلکەی پۆڕ یان کۆتر ، وەك لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم‌دا هاتووە . ئەمەش بە مۆری پێغەمبەرایەتیی ناسراوە .. جا ریوایەتەکان ئەوە ئەگەیەنن کە ئەم مۆرە لە کتێبە پێشووەکان‌دا بە یەکێ لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتیی لە قەڵەم دراوە ، وەك لە چیرۆکی بەحیرای راهیب‌دا هاتووە . ئەوەبوو بە هەر حاڵ هەوڵی دا تا چاوی بە مۆرەکەی سەرشانی کەوت و ، کە لەلای یەقین بوو خۆیەتی ئەبوطالیبی مامەی تێ‌گەیاند .

ئەوەی راستیی بێ ئەم مۆرە دوای لەدایك‌بوونی لەسەر شانی پەیدا بووە و ، راست‌تریش دوای لەت‌کردنی سنگی . ئەوەش کە ئەڵێ پێوەی لەدایك بووە رایەکی لاوازە . ( شرح المواهب : ١ / ١٩٢ ) .

هەردوو ئیمام ، بوخاریی و موسلیم بە سەنەدی خۆیان لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە ، لە صحیحەکەیان‌دا ریوایەتیان کردووە کە وتوویە : پوورم - مەبەستی لە خوشکی دایکیەتی - بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەم خوشکەزایەم ئازاری هەیە . ئەویش دەستی موبارەکی هێنا بە سەرم‌دا و ، دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کردم . پاشان دەست نوێژی گرت و ، لە

ئاوی دەست نوێژەکەیم خواردەوە و ، لە پشتیەوە وەستام و ، لە نێوان هەردوو شانیدا سەیری مۆری پێغەمبەرایەتیم کرد کە وەك هێلکەی پۆڕ وەها بوو .[٦٥]
ئیمام موسلیم یش بە سەنەدی خۆی لە جابیری کوڕی سەمورەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : لەسەر پشتی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆرێکم دیی کە وەك هێلکەی کۆتر وەها بوو .[٦٦]

**چوارەم : بۆ لای دایکی**

ئازیزمان لە ماڵی حەلیمە چوار ساڵی تەواو کرد .. بە رەوشتی جوان و ژیریی کەم وێنە و هەڵس‌وکەوتی رێك و پێکەوە ئەو ماوەیەی لە ناو نەوەی سەعددا بەسەر برد .. بوو بووە نموونەی مرۆڤی بەڕێز .. هەر بەو منداڵیە هەموو کەسێ پێی سەرسام بوو .. وێنەیەکی تاقانەی پەروەردە بوو .. ئەوە بوو لە ساڵی چوارەم دا ، یان لە سەرەتای ساڵی پێنجەمدا حەلیمە هێنایەوە بۆ لای دایکی ، ئەمەش دوای سنگ لەت کردن ..
جا هەروەك لە رەوشت و هەڵس‌وکەوت‌دا هەڵکەوتوو بوو ، وەهاش لە باڵا و لەش و لاردا هەڵکەوتوو بوو ، کە هیچ منداڵێك لەو تەمەنەدا وەها گەش و پێکەوتوو نەبوو ..
هاتەوە لای دایکی تا ماوەیەکیش لەگەڵ ئەودا بژیی ، نەوەکو ئەویش زۆری بە دنیاوە نەمابێ و ، وەك باوکی بە جێی بهێڵێ ..
خاتوو ئامینە بە چاوێکی پڕ لە رێزەوە سەیری موحەممەدی ئازیزی ئەکرد ، چونکە ئاگاداری ئەوە بوو کە ئازیزی منداڵێکی ئاسایی نیە ، وەك منداڵان .. بەڵکو پیاوێکە لە سەرووی هەموو پیاوانەوە .. هەر بەو منداڵیە دیار بوو کە پاشەڕۆژێکی روونی هەیە و ، بۆ کارێکی تایبەتیی و مەزن بەدیی هێنراوە ..
پێکەوە ژیان هەتا تەمەنی ئازیز گەیشتە شەش ساڵان .. دایکی وای بە چاك زانیی لەگەڵ موحەممەدی خۆشەویستیدا ﷺ سەردانی خاڵوانی عەبدولموطەللیبی باپیری بکەن لە شاری یەثریب ، کە لە نەوەی نەججار بوون ، تا ئەم کوڕە لاوچاکە بزانێ کە ئەم خاڵوانەی چۆن خزمێکی دڵسۆزن بۆی ، کە ئەوەبوو لە دوای بوونی بە

---

[٦٥] صحيح البخاري ـ كتاب المناقب ـ باب خاتم النبوة .
[٦٦] صحيح مسلم ـ كتاب الفضائل ـ باب صفة خاتم النبوة .

پێغەمبەر و ، دوای کۆچ کردنی بۆ مەدینە نەوەی نەججار ڕێزێکی تایبەتی‌یان لە خۆی و لە هاوەڵانی و لە دینەکەی گرت و ، خزمێکی یەکجار چاك دەرچوون . ئەمە لە لایەکەوە . لە لایەکی تریشەوە ئەم سەردانەیان بۆ ئەوەبوو کە سەرێك لە قەبرەکەی عەبدوڵڵای جوانەمەرگی خۆشەویستیان بدەن ، کە وا لە شاری یەثریب دا بە گڵ سپێرراوە .. دیارە ئەم چەند ماوەیە ئامینە ئەبێ چۆنیەتیی کۆچی دوایی عەبدوڵڵای مێردی بۆ موحەممەدی کوڕی باس کردبێ ، بەو بۆنەوە ئازیزیش حەزی کردبێ سەرێك لەو شارە بدەن کە باوکی تیا نێژراوە .

خاتوو ئامینە لەگەڵ کوڕی خۆشەویستی‌دا و بە یاوەریی عەبدولموطەللیبی خەزووری و ، لەگەڵ ئوم ئەیمەن ، بەرەکەی حەبەشیی ، کە کەنیزەکی عەبدوڵڵا بووە ، لە مەککە دەرچوون و لەگەڵ کاروان‌دا گەیشتنە یەثریب .. لەوێ چوونە ماڵی نابیغەی نەججاریی خزمیان کە عەبدوڵڵا لای ئەوان نێژرا بوو و ، بۆ ماوەی مانگێك لەوێ مانەوە و ، بە کوڵ فرمێسکیان بۆ ئازیزیان هەڵ رشت و ، موحەممەدیش ﷺ ئەو کاتە واتای هەتیویی لە خۆی‌دا بەدیی کرد .

دوای ئەوە خواحافیزی‌یان لە خزمان کرد و لەگەڵ کاروان‌دا گەڕانەوە بۆ مەککە .. لە ڕێگادا خاتوو ئامینە نەخۆش کەوت و ویستی خوا وەها بوو کۆچی دوایی بکات و ، هەر لەوێ لە گوندی ( ئەبواء ) نێژرا و ، ئازیزیش لەسەر قەبرەکەی چۆکی دا و بە خوڕ فرمێسکی گەرمی بۆ مەرگی ناخلۆفی دایکی هەڵ رشت .. وەك چاوی بە باوکی نەکەوت ، لە دایکیشی زۆر زوو جیا بوویەوە و تاسەیان لە یەك نەشکا .. ئیتر فەرمانی خوایە .. ئەبێ خۆشەویستەکەی وەها گەورە ببێ .. تا سۆزی تەواوی بەرامبەر بە هەموو مرۆڤێك هەبێ ..

دوایی پێغەمبەر ﷺ ، دوای کۆچ کردنی بۆ مەدینە ، هەندێ بیرەوەریی ئەو گەشتەی ئەگێڕایەوە .. ئەی‌فەرموو : لەگەڵ دایکم‌دا هاتینە ئێرە .. قەبری عەبدوڵڵای باوکم لەم خانووەدایە .. لە بیری نەوەی عەدیی کوڕی نەججار فێری مەلەکردن بووم ..

**پێنجەم : لە لای باپیری**

عەبدولموطەللیب موحەممەدی کوڕەزای دڵشکستی هێنایەوە مەککە و ، لەلای خۆی هێشتیەوە .. زۆر بەزەیی پیا هاتەوە .. ئەوان ویستیان بە سەردانی یەثریب

کەمێ دڵی موحەممەد گیان خۆش بکەن ، کەچیی بە مردنی دایکی کۆستێکی تریشی کەوت و ، ئەوەندەی تر خەمبار بوو .. بۆ ئەمە لە هەموو منداڵەکانی زیاتر بەزەیی پیا ئەهاتەوە و ، لە خۆی نزیکی ئەخستەوە و ، نەی ئەهێشت تەنیا بکەوێت . هەرکەی نانیشیان بۆ عەبدولموطەللیب دابنایە نەی ئەخوارد هەتا موحەممەدیان بانگ بکردایە و بهاتایە لەگەڵیا نانی بخواردایە . جا ئەم دڵدانەوەیەی عەبدولموطەللیب بوو بووە هۆی سارێژ کردنی زامی بێباوك و دایکیی موحەممەد .

لەولاوە ئوم ئەیمەن [٦٧] وەکو دایکێکی دڵسۆز سەروکاریی ئەکرد ، هەتا کە گەورە بوو چاکەی ئوم‌ئەیمەنی لەبەر چاو بوو و ئەی‌فەرموو : (( هي أمي بعد أمي )).

عەبدولموطەللیب یش زۆر جار ئوم ئەیمەنی ئاگادار ئەکردەوە هەتا چاو لە موحەممەد کلا نەکات ، چونکە ئەم منداڵە پیاوێکی ناوداری لێ دەرئەچێ و ، ئەهلی کیتاب وەهای دەرئەبڕن کە ئەبێتە پێغەمبەری ئەم ئوممەتە ..

باپیری هەر چەندە سەرنجی هەڵس و کەوت و سیفەت و سروشتی ئازیزی ئەدا ، دڵی ئەگەشایەوە ..

عەبدولموطەللیب فەرشێکی تایبەتیی خۆی هەبوو کە لە سێبەری کەعبەدا بۆیان رائەخست و هیچ کوڕێکی لەسەری دانەئەنیشت ، بەڵکو هەموویان بە دەوری فەرشەکەدا دائەنیشتن و چاوەڕوان بوون باوکیان لە ماڵ دەرچێت و بێت لەسەری دابنیشێ .. کەچیی موحەممەدی ئازیز ﷺ کە تەمەنی حەوت و هەشت ساڵان بوو، ئەهات و ئەچووە سەر فەرشەکەی باپیری و لەسەری دائەنیشت .. مامەکانی ئەیان ویست هەڵی بسێنن و دەری کەن . جا ئەگەر باپیری چاوی لەو کارەیان بوایە ئەی وت : واز لەم کوڕەم بهێنن ، دە بەخوا خاوەنی پایە و پلە ئەبێت .. دوای ئەوە لەگەڵ خۆیدا لەسەر فەرشەکەی دای ئەنا و ، دەستی راستی بە پشتیا ئەهێنا و ئەشی گوشیی بە خۆیەوە و ، بە هەڵس‌وکەوت و کردەوەکانی یەکجار دڵخۆش ئەبوو .

کە تەمەنی ئازیز گەیشتە هەشت ساڵ و دوو مانگ و دە رۆژ عەبدولموطەللیبی باپیری لە مەککەدا کۆچی دوایی کرد و ، پێش مردنیشی وای بە چاك زانیی

---

[٦٧] ئوم ئەیمەن : ناوی بەرەکەی حەبەشی‌یە و کچی ( ثعلبة ) ی کوڕی حیصن ە . کەنیزەکی عەبدوڵلاّ بوو ، پاشان بووە کەنیزەکی پێغەمبەر . زوو بە زوو موسڵمان بوو و هەردوو کۆچی حەبەشە و مەدینەی کرد . ئەوەی صەحیح بێ ئەوەیە کە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر بە پێنج مانگ کۆچی دوایی کردووە .

موحەممەد بداتە دەست ئەبوطالیبی کوڕی ، چونکە ئەو برای دایك و باوکیی عەبدوڵڵا بوو .

**شەشەم : لەلای مامەی**

وەنەبێ ئەبوطالیب گەورەترین یان دەوڵەمەندترین کوڕی عەبدولموطەللیب بووبێ، بەڵکو ماقووڵترین و پایەدارترین و نەفس پاك ترین کەسی قورەیش بوو و ، موحەممەدی برازایشی یەکجار خۆش ئەویست ، بە رادەیەك کە هیچ کام لە کوڕەکانی خۆی ئەوەندە خۆش نەئەویستن ، بەڵکو ئەمی پێش هەموویان ئەخست .. ئەبوا لەگەڵ خۆیدا نانی بخواردایە و ، بخەوتایە . کە لە ماڵیش دەرئەچوو لەگەڵ خۆیدا ئەی بردە دەرەوە ..

بۆ نان خواردن بە تایبەتیی حیسابی بۆ موحەممەدی برازای ئەکرد .. ئەوەبوو ئەگەر ماڵ و منداڵی ئەبوطالیب بە تاك و بە کۆ نانیان بخواردایە تێر نەئەبوون ، بەڵام ئەگەر پێغەمبەری خوایان ﷺ لەگەڵدا بوایە تێریان ئەخوارد . بۆیە کە ئەبوطالیب بیویستایە نانیان دەرخوارد بدات . ئەی وت : بوەستن تا کوڕەکەم دێت .. ئیتر کە پێغەمبەر ئەهات و لەگەڵی ئەخواردن ، خواردنەکەیان لێی ئەمایەوە . ئەبوطالیب یش لەمە سەری سوڕ ئەما و ئەیوت : بە راستیی تۆ موبارەکی .

منداڵان کە بەیانیان لە خەو هەڵئەستان چاویان ریپۆقەی ئەکرد و قژیان ئەدژرا، کەچیی موحەممەدی نازیزپاك و خاوێن و رێك وپێك لە خەو هەڵئەستا ..

هەتا ئەبوطالیب زیاتر سەرنجی رەفتاری شیرین و هەڵس و کەوت و نان خواردن و قسەکردنی پێغەمبەری خوای ئەکرد ، کە لەو تەمەنەدا هیچ منداڵێك عەقڵی پێیان نەئەشکا ، ئەوا زیاتر خۆشی ئەویست و رێزی لێ ئەگرت ..

ماوەی منداڵیی بە چاودێریی و ، ماوەی گەورەییشی بە بەرگریی لێ کردن ، زیاتر لە چل ساڵ ئەبوطالیب بە دڵسۆزییەوە سەروکاریی موحەممەدی برازای کرد .

ئیبن عەساکیر لە جەلهەمەی کوڕی عەرفەطەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : هاتمە مەککە ، ئەبینم خەڵکەکە گرانییانە ..

قوڕەیشییەکان وتیان :ئەبوطالیب ! گرانیی کەوتە شیوەکەوە و ، ماڵ و منداڵ هیچیان نیە بیخۆن ، ئادەی داوای باران بارین بکە . ئەبوطالیبیش هاتە دەرەوە و،

منداڵێکیشی لەگەڵدا بوو بە وێنەی خۆری بە هەور بەرگیراو ، کە هەورێکی رەش رەش لێی رەوی‌بێتەوە و ، چەند منداڵێکیش بە دەوریا بوون . ئەبوطالیب منداڵەکەی برد و ، پشتی نووساند بە کەعبەوە و ، پەناشی بۆ پەنجەی منداڵەکە برد و ، پەڵە هەورێکی بچووکیش بە ئاسمانەوە نەبوو .. لە هەموو لایەکەوە هەور پەیدا بوو و ، بە خوڕەم باران هاتە خوارەوە و ، لافاوی شیوەکە هەڵسا و ، دەر و دەشت صەوز بوو .

**حەوتەم : مەڕ لەوەڕاندن**

پێغەمبەری خوا ﷺ بە منداڵیی خەریکی مەڕ بەخێوکردن بووە .. جاری وابووە بۆ خزمەکانی و ، جاری واش بووە بۆ خەڵکی مەککە . بەمە هەر بە منداڵیی سەلماندی کە دارای رەوشتێکی یەکجار بەرزە ، بەوەی کە نان و بژێویی خۆی بە رەنجی شان و عەرەقی ناوچەوانی پەیدا کردووە .. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی گەورەیی‌دا باسی شوانیی خۆی ئەکرد و زۆریش پێی شادمان بوو ..

ئیمام ئەحمەد لە ئەبو سەعیدی خودری‌یەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : شوانی وشتر و مەڕەکان لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دەستیان دایە خۆهەڵکێشان و شانازیی‌کردن . پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : (( الفَخرُ والخُيَلاءُ في أهلِ الإبِلِ ، والسَّكِينَةُ والوِقارُ في أهل الغَنَمِ )) . فەرمووی : فەخر و شانازیی بەلای شوانی وشترەوەیە و ، هێمنیی و ویقاریش بە لای شوانی مەڕەوەیە . هەروەها فەرموویە : (( بُعِثَ مُوسَى وَهُوَ يَرعَى غَنَماً لأهله ، وَبُعثتُ أنا وَأَنا أَرعَى غَنَماً لأَهلِي بِجِيادٍ )) .

فەرموویە : مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێ کە کرا بە پێغەمبەر مەڕی بۆ خزمەکانی ئەلەوەڕاند و ، منیش کە کرام بە پێغەمبەر مەڕم لە ( جیاد ) دا بۆ خزمەکانم ئەلەوەڕاند .. هەروەها فەرموویە : (( ما بعث الله نبياً إلا وقد رَعَى الغَنَمَ )) . فەرموویە : هەموو پێغەمبەرێك مەڕی بەخێو کردووە . هاوەڵانی وتیان : تۆیش ؟ فەرمووی : (( نعم ، كُنتُ أرعاها على قراريطَ لأهلِ مَكَّةَ )) .[68]

فەرمووی : بەڵێ ، بە چەند قیراطێك مەڕم بۆ دانیشتوانی مەککە ئەلەوەڕاند ..

حیکمەتی ئەوەش کە پێغەمبەران سەلامیان لێ بێ پێش هاتنی وەحیی بۆیان مەڕیان لەوەڕاندبێ ئەوەیە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری نەتەوەکانیان رابێن ، ئەویش بە راهاتن لەسەر شەفەقەت و بەزەیی و ، هەر بە منداڵیی لەسەر ئارام و

---

[68] رواه البخاري .

بەرگەگرتن رابێن و ، بیر لە بەرژەوەندیی دەوروبەریان بکەنەوە و دژی ستەم و ناڕەوایی بوەستن و ، پشتگیریی لە لاواز و کەمدەست بکەن .

لە بیرمان نەچێ کە خوای گەورە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانی ئازیزدا چاودێریی تایبەتیی کردووە تا تووشی هەڵە نەبێت و ، بە رەوشتە نزمەکانی کۆمەڵی نەفامیی چەپەڵ نەبێت ..

( إبن الأثير ) ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە :

(( ما هَمَمْتُ بشيءٍ مما كانَ أهلُ الجاهليَّة يعملون غير مرَّتين ، كلُّ ذلك يحول الله بيني وبينَهُ ، ثمَّ ما هممتُ به حتى أكرمَني برسالَته . قلت ليلةً للغلام الذي يرعى معي بأعلى مكة : لو أبصرت لِي غنمي حتى أدخل مكَة ، وأسمر بها كما يسمر الشباب ! فقال : أفعل ، فخَرجت حتى إذا كنت عند أول دار بمكة ، سمعت عزفاً ، فقلت : ما هذا ؟ فقالوا : عرس فلان بفلانة ، فجلست أسمع ، فضَرَبَ الله على أذني ، فنمتُ ، فما أيقظني إلا حَرُّ الشمس ، فعدتُ إلى صاحبي ، فَسَألَني ، فأخبرته ، ثم قلت ليلةً أخرى مثل ذلك ، ودخلت مكة ، فأصابني مثلَ أول ليلةٍ ، ثم ما هَمَمْتُ بِسوءٍ )) .

( صححه الحاكم والذهبي وضعفه إبن كثير ).

لەم فەرموودەیەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش هاتنی وەحی بۆی تەنها دوو جار هەوڵی داوە چاو لە نەفامان بکات ، کەچیی خوای گەورە بۆی نەرەخساندووە و لەو کارە ناشیرینانەی نەفامیی بەدووری گرتووە هەتا خوای گەورە ئەیکاتە هەڵبژاردەی خۆی ..

ئەفەرموێ : شەوێکیان بەو منداڵەم وت کە لەگەڵمدا مەڕی ئەلەوەڕاند لە ژووری مەککەوە : خۆزگە چاوێکت لە مەڕەکانی منیش بوایە هەتا بچوومایە بۆ مەککە و وەك گەنجان شەوێکی خۆشم بەسەر ببردایە . وتی : باشە .

ئەفەرموێ : رۆیشتم تا گەیشتمە یەکەم ماڵی مەککە ، لەوێ گوێم لە دەنگی شایی بوو ، پرسییم : ئەمە چی‌یە ؟ وتیان : شایی فلان و فیسارە . منیش دانیشتم و گوێم گرت ، کەچیی خوای گەورە وەك بدا لە بناگوێم خەوی پیا خستم و ، بە تینی خۆر لەخەو هەڵسام . ئیتر گەڕامەوە بۆ لای هاوەڵەکەم و ، کە پرسیاری لێ کردم ، باسەکەم بۆی گێڕایەوە .

شەوێکی تریش وەهام وت و ، چوومەوە بۆ مەککە و ، ئەو شەوەش وەك یەکەم جارم لێ هاتەوە .. ئیتر دوای ئەوە شتی خراپ بە دڵمدا نەهات ..

**هەشتەم : گەشتی شام :**

کە تەمەنی ئازیزمان ﷺ گەیشتە دوانزە سالأن [69] لەگەڵ ئەبوطالیبی مامەیدا بە نیازی بازرگانیی بەرەو شام کەوتنە ڕێ .. مامەی نیازی نەبوو بیبات لەبەر مەینەت و ماندوو بوونی ڕێگا . کەچیی کە سەیری کرد برازاکەی ئەم گەشتەی زۆر پێ خۆشە و ، حەزی لەوەیە کە لە مامەی جیا نەبێتەوە . ئەویش بەزەیی پیا هاتەوە و ، لەگەڵ خۆیدا بردی .. بەردەوام ڕۆیشتن هەتا کاروانەکە گەیشتە شاری بوصرا لە وڵاتی شام . لەوێ ڕاهیبێکی لێ بوو کە ناوی جەرجیس بوو و بە ( بەحیرا ) ئەناسرا ، کە هەندێ ئەڵێن زانایەکی مەسیحیی بووە و ، هەندێکیش ئەڵێن : حیبرێکی یەهوودی تەیماء بووە . ئەم ڕاهیبە لە کتێبە ئاسمانییە پێشینەکان شارەزا بوو و ، ئەوەشی بۆ دەرکەوتبوو کە کاتی ڕەوانەکردنی پێغەمبەری ئاخرزەمان ﷺ نزیك بۆتەوە و ، لەناو عەرەبیشدا هەڵ ئەکەوێ .

کە کاروانی قوڕەیشییەکان نزیك کەوتەوە ، بەحیرا چاوی لە پەڵە هەورێك بوو کە سێبەری بۆ یەکێ لە کاروانەکە ئەکرد ، بەم بۆنەوە ، بۆ یەکەم جار نانی بۆ کاروانەکە دروست کرد و داوای لە قوڕەیشییەکان کرد کە میوانی ئەو بن . کاتێك کە دێن بۆ سەر دەعوەتەکە ڕیوایەتی وا هەیە کە وای ئەگەیەنێ پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵیانا هاتووە و ، ڕیوایەتی وایش هەیە کە وای ئەگەیەنێ هەموویان هاتوون جگە لە پێغەمبەر ﷺ و لە ژێر درەختێکی نزیکدا بەجێی ئەهێڵن .. کە دێن بەحیرا سەرنجی یەك بە یەکیان ئەگرێت ، ئەبینێ ئەو کەسەی کە ناونیشانی لای ئەوە تیایانا نیە .. بۆیە گلەیی ئەوە ئەکات کە ئەو دەعوەتی هەموویانی کردووە ، کەچیی وا هەندێکیان ئامادە نەبوون .. ئیتر ئەنێرن بە دوای پێغەمبەریشدا ﷺ .

کاتێ کە ئامادە بوو بە وردیی سەرنجی گرت و ئاگاداری هەندێ سیفەتی بوو ، پاشان بە هەر فێڵێك بوو چاوی بە مۆری پێغەمبەرایەتیی نێو هەردوو شانی کەوت و بەو شێوە بوو کە لە کتێبەکانی خۆیاندا نووسرا بوو . ئەوەبوو رووی لە ئەبوطالیب کرد و پرسیی : ئەم کوڕە چیتە ؟ وتی : کوڕمە . بەحیرا وتی : کوڕت نیە و ، باوکی ئەم کوڕەش نەماوە !! ئەبوطالیب وتی : برازامە . پرسیی : ئەی کوا

---

[69] مامۆستا ئەبولحەسەنی نەدەویی ڕەحمەتی خوای لێ بێ ڕای وەهایە کە بە ڕیوایەتی صەحیح نۆ سالأن بووە. ( السيرة النبوية للندوي : ١٠٤ ) .

باوکی ؟ وتی : ئەم لە سکی دایکیا بووە باوکی مردووە . وتی : ڕاست ئەکەی . برازاکەت بەرەوە بۆ وڵاتی خۆی و ، بیپارێزە لە جوولەکە ، بەخوا ئەگەر بیبینن و، ئەوەی من لێی ئاگادار بووم ئەوانیش لێی ئاگادار بن ، تووشی شەڕ و خراپەی ئەکەن . ئەم برازاتە پایە و پلەیەکی بەرزی ئەبێ .

لە ڕیوایەتێکی تردا دەری ئەبڕێ کە ئەم برازایەی ئەبێتە سەرداری هەموو جیهان و خوای گەورە بە شێوەی ( رحمة للعالمين ) ڕەوانەی ئەکات .

ئەبوطالیبیش ئەڵێ : ئەمەت لە کوێ زانیی ؟

وتی : کاتێ کە ئێوە لە بارستایەکە هاتن بەم دیوا ، هەرچیی دار و بەرد بوو هەر هەمووی چوو بە دەما و سەجدەی برد ، دیارە ئەمانەش تەنها بۆ پێغەمبەر سەجدە ئەبەن و ، بە هۆی مۆری پێغەمبەرایەتییشەوە ئەیناسم ، کەوا بە وێنەی سێوێك لە بەشی خوارەوەی دەفەی شانیدایە و ، ئێمەش ئەوە لە کتێبەکانماندا ئەبینین . هەروەها داوای لە ئەبوطالیب کرد ئەم برازایەی بگێڕێتەوە و نەی با بۆ شام ، نەوەکو یەهوود دەستێکی لێ بوەشێنن .. ئەوە بوو مامەشی لەگەڵ چەند بەندەیەکیدا ناردیەوە بۆ مەککە .

**نۆهەم : جەنگی فیجار :**

کاتێ کە تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە چواردە یان پانزە ساڵ جەنگی فیجار لە دوورگەدا ڕووی دا .. ئەم جەنگە لە نێوان قوڕەیش و هۆزەکانی کینانەدا لە لایەکەوە و ، قەیس عیلان و کۆمەکانیدا لە لایەکی ترەوە ، ڕووی دا .. فەرماندەی قوڕەیش و کینانە هەر هەموویان لەم جەنگەدا حەربی کوڕی ئومەییە بوو ، واتە باوکی ئەبوسوفیان ، ئەویش بە بۆنەی تەمەن و پیاوماقووڵییەوە .

هۆی بەرپابوونی ئەم جەنگە ئەوەبوو کە نوعمانی کوڕی مونذیری پادشای عەرەب لە حیرە کاروانێکی خۆی نارد بۆ بازاڕی عوکاظ ، جا پێویستیی بە کەسێکی وەها لێهاتوو هەبوو کە کاروانەکە بخاتە پەنای خۆیەوە و کەسێك نەتوانێ ڕێی پێ بگرێ .

ڕۆژێکیان بەرڕاضی کوڕی قەیسی کەنانیی و ، عوروەی کوڕی عوتبەی ڕەححال لە کۆڕی پادشادا دانیشتبوون و ، پادشا ڕووی لە دانیشتوان کرد و وتی : کێ ئەم بازرگانییەم ئەخاتە پەنای خۆیەوە تا بگاتە عوکاظ ؟

بەڕڕاض ـ کە پیاوێکی جەردە و خوێڕیی بوو و خزمەکانی ، بە بۆنەی خراپ کاری‌یەوە ، هیچ متمانەیەکیان پێ نەئەکرد ـ وتی : من ئەیگرمە پەنام کە نەوەی کینانە دەستی بۆ نەبەن .

پادشا وتی : من ئەمەوێ بۆ هەموو خەڵکیی بیگریتە پەنای خۆت .

عوروە وتی : کارێکی سووك ئەکەیت .. سەگێکی خوێڕیی پەنایان بدات بۆت ؟ مەبەستی لە بەڕڕاض بوو . من بۆ هەموو دانیشتوانی بیابان ، دانیشتوانی نەجد و توهامە ، ئەیگرمە پەنام .

بەڕڕاض وتی : عوروە ! بۆ کینانەش ئەیگریتە پەنات ؟ وتی : بەڵێ ، بۆ هەموو خەڵکییش !

بەڕڕاض ئەمەی گرتە دڵ و ، خۆی لە عوروە داگرت هەتا ئەوەبوو بە بازرگانی‌یەکەوە بەرەو عوکاظ کەوتە رێ و ، لە رێگا هەلی بە دەست هێنا و عوروەی کوشت و کاروانەکەی نوعمانی فڕاند و قورەیشیش لە بازاڕی عوکاظ دا بوون و ، هەواڵیان بۆ هات کە بەڕڕاض چ نامەردی‌یەکی ئەنجام داوە .. قورەیش بە پەلە خۆیان پێچایەوە و گەڕانەوە بەرەو مەککە و ، نەیان‌هێشت هەوازین هەستیان پێ بکەن .

دوای ماوەیەك هەوازینیش هەواڵی کوژرانی عوروەیان بیست و کەوتنە شوێن قورەیش و بەر لەوەی بگەنە حەرەمی مەککە فریایان کەوتن و دەستیان دایە جەنگ و کوشتار، هەتا ئەوەبوو قورەیش خۆی دایە پەنای حەرەم و جەنگ وەستا . بەڵام بەڵێنیان دا ساڵی ئایندە لە عوکاظدا بەرامبەر بە یەك بوەستن .. ئەم جەنگە چوار ساڵی خایاند ، هەتا ئەوەبوو خوای گەورە بە ئیلهام دڵی ژیرێکی لایەکیانی ئاگادار کرد و ، داوای رێك کەوتنی کرد . ئەوانیش گوێیان بۆ گرت ، بەڵام دوای ئەوەی کە جەنگ هەردوو لای بە چۆك‌دا هێنا بوو . لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە هەرلایەکیان کەمتری لێ کوژرا بوو ، خوێنی زیادە کوژراوانی ئەو لایەنەکە بدات .. کە سەرژمێری‌یان کرد ئەبینن قورەیش کەمتری لێ کوژراوە ، بۆیە خوێنی بیست پیاوی بۆ هەوازین بژارد .

ئەم جەنگە لە مانگەکانی حەرام‌دا رووی دا کە خوای گەورە جەنگ و کوشتاری تیا قەدەغە کردبوون و ، هەر لەبەر ئەمەیەش ناونرا جەنگی فیجار .

جا پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لەگەڵ مامەکانیدا بەشداریی ئەم جەنگەی کردووە، کە هەندێ ئەڵێن : وەکو ئەوان تیری ئەهاویشتن و ، هەندێکیش ئەڵێن : ئەو تیرانەی کە هەوازین ئەیهاویشتن کۆی ئەکردنەوە و ئەیدان بە دەست مامەکانیەوە .

کاتێکیش کە بۆتە پێغەمبەر و پرسیاری لێ ئەکەن ئەوە دەرئەبڕێ کە لەو بەشدارییەش پەشیمان نیە ، کە فەرموویە : (( قَد حَضرته مع عُمومَتي ، ورَمَيتُ فيه بأَسهُم ، وَما أُحِبُّ أَنِّي لَم أَكُن فَعَلتُ )) .[٧٠]

**دەهەم : پەیمانی (( فەضول )) :**

بە چوار مانگ دوای کۆتایی هاتنی جەنگی فیجار ، چەند هۆزێکی قورەیشیی لە مەککەدا کۆبوونەوە و پەیمانێکیان بەست بە ناوی پەیمانی فەضول ، کە بە راستیی هەنگاوێکی مەردانە بوو و ، بەرێزترین و چاکترین پەیمان بوو کە عەرەب لە سەردەمی نەفامییدا ئەنجامی بدەن ..

مەبەستی بەستنی ئەم پەیمانە بۆ ئەوە بوو کە ئەو هۆزانەی بەشداریی تیا ئەکەن بە هەموو هێزێکیانەوە یەك بگرن لەسەر ئەوەی کە لە مەککەدا هەرکەسێ ستەمی لێ بکرێ ، ئیتر سا دانیشتووی مەککە بێ ، یان خەڵکی شوێنی تر بێ و سەری لە مەککە دابێ ، دەستبەرداری نەبن هەتا مافی بۆ وەر بگرنەوە و ، لەوەش نەگەڕێن کە ستەمی لێ کردووە هەتا هەموو مافێکی بۆ بگێڕێتەوە .

هۆی بەستنی ئەم پەیمانەش ئەوەبوو کە پیاوێك لە هۆزی زوبەید لە یەمەنەوە هەندێ کەلوپەل بۆ فرۆشتن دێنێ بۆ مەککە و ، یەکێ لە پیاوە دەسەڵاتدار و ناودارەکانی قورەیش ، کە ناوی عاص ی کوڕی وائیلی سەهمیی بوو ، کەل ویەلەکەی لە کابرای زوبەیدیی کڕیی ، بەڵام پارەکەی نەئەدایە ، دوای داواکردنی ناچار بوو پەنای بردە بەر چەند هۆزێك کە لە عاص ەوە نزیك بوون ، تا مافەکەی بۆ وەر بگرنەوە .. هۆزەکانیش ئەمانە بوون : عبدالدار ، مخزوم ، جُمَّح ، سهم ، عدي کوڕی کەعب . کەچیی هیچێ لەم هۆزانە نەهاتنە هاواری ئەو پیاوە بێکەسە و ، زیاد لەوەش پیایا هەڵ شاخان ..

زوبەیدیی کە ئەمەی دیی هەستی کرد نرخی مرۆڤ نەماوە ، ناچار بوو لە کاتی هەڵهاتنیخۆردا چووە سەر چیای ئەبوقوبەیس و ، قورەیشیش لە دەوری کەعبە

[٧٠] الطبقات الکبری : ١ / ١٢٨ .

کوڕیان بەستبوو . جا بۆ ئەوەی مافی خۆی دەست بکەویتەوە ، بە دەنگی بەرز چەند دێرە شیعرێکی وت ، تا تیٚ بگەن کە ستەمی لیٚ کراوە و کەلوپەلی لیٚ زەوت کراوە .

کە زوبەیری کوڕی عەبدولموطەللیب ئەمەی بیست وتی : (( ما هذا مترك )) . دیارە ئەمە زۆر کاری تیٚ ئەکات ، نەك بە تەنیا ئەو بەڵکو کار ئەکاتە سەر چەند هۆزێك . ئەوەبوو نەوەی هاشم و ، موطەللیب و ، ئەسەد و ، زوهرە و ، تەیم لە ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی جەدعانی تەیمیی ، بە بۆنەی تەمەن و ماقووڵیەوە ، کۆبوونەوە و ، ئەویش دەعوەتێکی بۆ کردن و پەیمانیان دا و لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە ستەم قبووڵ نەکەن و ، بە یەك دەست لە دژی ستەمکار بووەستن و لەسەر ستەملیٚکراویش بکەنەوە . ئەوەبوو هەستانەوە بۆ عاص ی کوڕی وائیل و حەقی کابرای زوبەیدیەیان لە ژێر چنگی دەرهێنا و بە سەری بەرزەوە رەوانەیان کردەوە ..

بە بۆنەی ئەوەوە کە ئەم پەیمانە سەری گرت زوبەیری کوڕی عەبدولموطەللیب ئەم شیعرەی هۆنیەوە :

إنَّ الفضولَ تعاقدوا ، وتحالفوا ألاّ يقيمَ ببطنِ مَكَّةَ ظالمُ
أَمرٌ عَليه تعاقدوا وتواثقوا فالجار والمعترُّ فيهم سالِم

ئەڵێت : کۆمەڵی فەضول پەیمانیان بەست و سوێندیان خوارد کە نەهێڵن لە شیوی مەککەدا زاڵمێك جێی ببێتەوە . ئەمە کارێکە ئەوان بەڵێنیان داوە و لەسەری رێك کەوتوون کە چ خەڵکی مەککە و چ میوانانی ماڵی خوا هەر هەموو تیایا سەلامەت و بیٚوەی بن ..

ئەمە بڕیاری مرۆڤی بەڕێزە ، بۆ قەڵاچۆکردنی ستەم .. ئەمە داوای مافی مرۆڤە بەڵام بە راستیی و بە کردەوە ، نەك بە فڕوفێڵ و چاوبەستن ..

پێغەمبەری ئازیزیشمان ﷺ هەرچەندە هێشتا منداڵ بوو و وەحیی بۆ نەهاتبوو ، بەشداریی ئەم پەیمانە بەڕێزەی کردووە و ، دوای ئەوەی کە خوای گەورە کردیە پێغەمبەری ئاخرزەمان ئەی فەرموو : (( لَقَد شَهِدتُ في دارِ عَبدِاللهِ بنِ جَدعانَ حِلفاً ما أُحِبُّ أَنَّ لي بِهِ حُمُرَ النعم ، وَلَو أُدعَى بِهِ في الإِسلامِ لأَجَبتُ )) .[71]

---

[71] الرحيق المختوم : ٥٤ ـ ٥٩ ، السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ١٩١ ـ ٢١٤ ، السيرة النبوية للصلابـي : ٤٨ ـ ٦١ .

## بەشی هەشتەم
# سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتیی

**یەکەم : رەنج و تەقالا**

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لە سەرەتای ژیانیەوە کارێکی ئەوتۆی نەبووە ، بەڵام ریوایەتی زۆر هەن لەسەر ئەوەی کە کاتێ لە ماڵی حەلیمەی دایەنی بووە خەریکی مەڕ لەوەڕاندن بووە و ، کاتێکیش گەڕاوەتەوە مەککە و بە چەند قیراطێك مەڕی بۆ خەڵك لەوەڕاندووە .

خەدیجەی کچی خوەیلید ئافرەتێکی پایەدار و دەوڵەمەند بوو . پیاوی بەکرێ ئەگرتن تا سەروکاریی بازرگانیی‌یەکەی بۆ بکەن . قورەیشیش لە بازرگانیی‌دا سەرقاڵ بوو بوون .. کاتێ کە خەدیجە هەواڵی راستگۆیی و ، ئەمانەت‌داریی و ، رەوشت‌بەرزیی پێغەمبەری خوای ﷺ بیست ، ناردی بە دوای‌دا و ، کە تەشریفی هێنا خەدیجە پێی راگەیاند کە بە بۆنەی ئەوەوە هەواڵی راستگۆیی و ، ئەمانەت داریی و ، رەوشت‌بەرزیی ئەوی بیستووە ناردوویە بە دوای‌دا و ، دووقاتی خەڵکیی تر کرێی بۆ دائەنێ .

پێغەمبەریش ﷺ ئەمەی بۆ ئەبوطالیبی مامەی گێڕایەوە و ، ئەویش وتی : ئەمە رزقێکە خوا بۆی گەیاندووی .

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە ئەبوطالیب ئەوە ئەخاتە پێش چاوی پێغەمبەر ﷺ تا سەروکاریی بازرگانیی خەدیجە بکات ، چونکە بێ‌گومان خەدیجە فەزڵی ئەو بەسەر کەسانی تردا ئەدات . هەروەها ئەبوطالیب خۆی چووە بۆ لای خەدیجە و پێی وتووە : ئایا خەدیجە ئامادەی موحەممەد بەکرێ بگری ؟ پێمان گەیشتووە کە فلانە کەست بە دوو وشتر بە کرێ گرتووە ، بەڵام بۆ موحەممەد بە چوار وشتر نەبێ رازیی نابین .

خەدیجە بە وتەیەك وەڵامی دایەوە کە ئەوپەڕی رێز و حورمەت و هەست و خۆشەویستیی تیا بەدیی ئەکرا : ئەگەر ئەمەت بۆ نەویستراوێکی دوورینە داوا

بکردایه ، ئەوا بە گوێم ئەکردی ، چ جای ئەوەی کە بۆ خۆشەویستێکی نزیك داوای ئەکەی !!

ئەبوطالیبی ریش سپیی بەوپەڕی دڵ خۆشی‌یەوە گەڕایەوە دوا و ، باسەکەی بۆ موحەممەدی برازای گێڕایەوە .. ئای کە ئەو وشە پاك و راستانە چەندە موحەممەدی لاویان دڵخۆش کردبێ !

ئەو کاتە تەمەنی ئازیز گەیشتبووە بیست و پێنج سالیی .. لە چواردەی ذولحەججەدا و ، لەگەڵ مەیسەرەی خزمەتگوزاری خەدیجەدا ، بە ماڵ و سامانی بازرگانیی خەدیجەوە بەرەو شام کەوتنە رێ .. رۆیشتن هەتا گەیشتنە بازاڕی بوصرا ، لە ریوایەتێك‌دا ، یان بازاڕی حوباشە ، لە ریوایەتێکی تردا . لەوێ پێغەمبەر ﷺ لە بازاڕی بوصرادا لە نزیك پەرستگای راهیبێك‌دا کە ناوی ( نسطورا ) بوو ، دابەزی‌یە ژێر سێبەری درەختێك ..

نەسطورا وتی : مەیسەرە ! ئەم پیاوەی کە دابەزی‌یە ژێر ئەم درەختە کێ‌یە ؟ وتی : پیاوێکی قورەیشیی خەڵکی حەرەمە . راهیبەکە وتی : تەنها پێغەمبەر دائەبەزێتە ژێر ئەم درەختە ! لە ریوایەتێکی تردا : دوای عیسا تەنها پێغەمبەر دابەزیوەتە ژێر ئەم درەختە !

لەم گەشتەدا مەیسەرە خەریك بوو باڵی ئەگرتەوە .. لە ژیانی‌دا پیاوی وەهای نەدی بوو .. دڵی پڕ بوو لە رێز و خۆشەویستیی بۆ موحەممەدی سەرداری .. بە جوانیی رەوشتی بەرزیی ، چاکەی ، نەرم و نیانیی ، دڵسۆزیی ، موعامەلە چاکیی ، ئەمانەت‌داریی ، دەست‌پاکیی ئازیزی بە چاوی خۆی بینیی.. بە چاوی خۆی ئەوەشی دیی کە پەڵە هەورێك سێبەری بۆ ئەکرد ، ئیتر وتەکەی نەسطوراش با لەولاوە بوەستێ ..

پێغەمبەر ﷺ کەل‌وپەلی فرۆشت و ئەوەش کە پێویست بوو کڕیی و بە قازانجێکی یەکجار زۆرەوە ، لەگەڵ مەیسەرەدا گەڕایەوە دوا ..

کاروانی خێر و بەرەکەت لە کاتی نیوەڕۆدا گەیشتەوە مەککە .. لەو کاتەدا خەدیجە لە باڵاخانەکەی‌دا دانیشتبوو .. لەگەڵ گەیشتنی کاروان‌دا چاویشی لە موحەممەدی بەڕێز بوو کە هەیبەت و مەزنیی دای‌پۆشیبوو .. چووە ماڵەوە و دەنگ و باسی کڕین و فرۆشتنی بۆ خەدیجە گێڕایەوە و ، خەدیجەش بەم بازرگانی‌یە پڕ خێر و بەرەکەتە یەکجار شادمان بوو ..

دوای ئەوە مەیسەرە بە وردیی هەواڵی موحەممەدی لەم گەشتەدا بۆ خەدیجە گێڕایەوە .. دەری خست کە پیاوی وەهای هێشتا بە چاو نەبینیوە .. موعامەلە و هەڵس و کەوتی سەرنجی هەموانی راکێشا بوو ..

دووهەم : مارەکردنی خەدیجە

کە خەدیجە دەستپاکیی و فەڕ و بەرەکەتی موحەممەدی بینیی و ، مەیسەرەش هەواڵەکەی نەسطورای بۆ گێڕایەوە ، بۆی دەرکەوت کە ( الصادق الأمین ) پیاوێکی ئاسایی نیە و ، دەنگ‌وباسێکی ئەبێ .. شایانی باسە کە وەرقەی کوڕی نەوفەل و خەدیجە ئامۆزا بوون و ، وەرقەش شارەزایی لە کتێبە پێشووەکان‌دا هەبوو . بۆ ئەمە خەدیجە چووە لای وەرقە و پرسیاری ئەم دەنگ‌وباسەی مەیسەرەی لێ کرد . ئەویش وەڵامی دایەوە : خەدیجە ! ئەگەر ئەمە راست بێ ، موحەممەد ئەبێتە پێغەمبەری ئەم ئوممەتە !

خەدیجە کە ئەمەشی بیست ، رووداوێکی پێشتری هاتەوە یاد کە تا رادەیەك کاریگەریی لەسەر دڵ و دەروونی هەبوو ..

ئەوەبوو لە رۆژێکی جەژن‌دا خەدیجە لەگەڵ چەند دەستە خوشکێکی‌دا بوون و ، جوولەکەیەك هاتە لایان و وتی : ئەی کۆمەڵی ئافرەتانی قورەیش ! هاکا لەناوتان دا پێغەمبەرێك هەڵکەوت کە کاتی هاتنی نزیك بۆتەوە ، جا کامتان بۆی کرا با خۆی بکاتە هاوسەری .. ئافرەتەکان هەموویان دەستیان دایە بەرد و چەو وەشاندن بۆ جوولەکەکە و قسەشیان پێ وت ، جگە لە خەدیجە کە بە چاکیی گوێی بۆ قسەکەی هەڵۆڵ کرد و کاری تێ کرد .

خەدیجە ئەم دوو رووداوەی بەستن بە یەکەوە ، ئەبینێ کە ئەگونجێ ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوە موحەممەدی لاوچاکی ئەمین و دەست پاك بێت .. دڵی پاك و بێ‌گەردی خەدیجە ئەمەی ئەخوێندەوە .. بەڵام دەی چیی بکات ؟

بەڵێ خەدیجە تەمەنی هەیە و بێوەژنە و موحەممەدیش وا لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیی‌دا ، بەڵام خۆ ماقووڵترین پیاوی دوورگە داوای بکا ئەو شووی پێ ناکات .. بەڵام وا ئێستا دڵی بۆ رەوشت و ئەمانەت و فەڕ و بەرەکەتی موحەممەد کەمەندکێش بووە . ئایا خۆی بی‌دا بە گوێی‌دا کە نیازی وایە شووی پێ بکات ؟

یان کەسێك بنێرێتە لای تا بزانێ نیازی چی‌یە و ، ئەم باسەی بە لاوە چۆنە ؟ بۆ ئەمە ریوایەتی جیاواز هەن .

هی وایان هەیە ئەڵێت : خەدیجە خۆی ئەنێرێتە لای پێغەمبەر و پێی ئەڵێت : ئامۆزام ! بە بۆنەی خزمایەتیی و پایەدارییت لەناو قەومەکەت‌دا و ، بە بۆنەی دەست‌پاکیی و رەوشت‌بەرزییتەوە حەز ئەکەم شووت پێ بکەم .[72]

هی واشیان هەیە ئەڵێت : نوفەیسەی کچی مونیەی[73] ناردۆتە لای . کە ئەمەیان زیاتر گونجاوە ..

نوفەیسە بۆمان ئەگێڕێتەوە کە خەدیجە ئافرەتێکی لێ‌هاتوو و ماقووڵ و لەسەرخۆ بوو و ، لە هەمان کاتیش‌دا خوای گەورە خێر و بێری بەسەری‌دا رژاند بوو .. ئەو رۆژە خەدیجە خاوەنی نەسەب و پایە و پلەی ناو کۆمەڵ و خاوەنی سامانێکی فراوان بوو ، بۆیە هەموو ناودار و ماقووڵێك حەزی ئەکرد بی‌خوازێت ..

دوای ئەوەی کە کاروانەکەی لە شامەوە ئەگەڕێتەوە نوفەیسە ئەنێرێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ تا بزانێ رای چی‌یە .

نوفەیسە ئەپرسێ : ئەی موحەممەد ! بۆچ ژن ناهێنی ؟

ئەفەرموێ : (( ما بيدي ما أتزوج به )) . ئەفەرموێ : دەستم ناڕوا ژن بهێنم .

ئەڵێ : ئەی ئەگەر ئەوەت بۆ چارسەر کرا و ، سامان و ، جوانیی و ، ماقووڵیی و ، هاوشانییشت پێشکەش کرا ، ئایا رازیی ئەبیت ؟

فەرمووی : (( فمن هي ؟ )) . فەرمووی : ئەوە کێ‌یە ؟

ئەڵێت : خەدیجە .

فەرمووی : (( وكيف لي بذلك ؟ )) . فەرمووی : جا چۆن ئەوەم بۆ رێك ئەکەوێ؟

وتی : لەسەر من .

فەرمووی : (( فأنا أفعل )) . فەرمووی : رازیی ئەبم .

خەدیجە هەواڵی بە کەس‌وکاری دا ، ئەبینن هەموویان زۆریان پێ خۆشە . ئەوەبوو کاتێکی بۆ پێغەمبەر و کەس‌وکاری دیاریی کرد تا ئامادە بن ..

---

[72] ئەمە ریوایەتی ئیبن ئیسحاقە .

[73] مونیە دایکیەتی و لە هەندێ کتێبیش دا أمية هاتووە کە باوکیەتی و خوشکی ( یەعلا ) ی هاوەڵی بەناوبانگە .

پێغەمبەریش ﷺ ئەمەی بۆ مامەکانی باس کرد .. بۆ ئەمە هەردوو مامی ئەبوطالیب وحەمزە هەستان و چوون بۆ ماڵی خەدیجە ، ئەبینن وا عەمری کوڕی ئەسەدی مامەی خەدیجە وا لەوێ ئامادەیە و ، ئەبوطالیب خەدیجەی لێ خواست بۆ موحەممەدی برازای و ، عەمریش ڕەزامەندیی نواند و خەدیجەی برازای پێشکەش کردن و دەری بڕیی کە پیاوی وەك موحەممەد پێویستە پێشوازیی لێ بکرێ . دوای ئەوە ئەبوطالیب هەستا و وتارێکی جوانی پڕ بەلاغەتی دا ، کە تیایا بە وردیی باسی موحەممەدی برازای و تایبەتمەندییەکانی و ، پایەداریی خۆی و ، پایەداریی باوباپیرانی کرد .

زۆربەی سەرچاوەکان ئەوەیان باس کردووە کە خەدیجە مامەی بە شووی داوە و ، ئەوەش کە ڕاست بێ ئەمەیە چونکە لەو کاتەدا باوکی مرد بوو ، وەك سوهەیلیی دەری بڕیوە .

واقیدییش دەری بڕیوە کە ڕاستەقینەی چەسپاو لای ئەهلی عیلم ئەوەیە کە باوکی خەدیجە پێش جەنگی فیجار مردووە و ، عەمری کوڕی ئەسەدی مامەی بە شووی داوە .. هەروەها طەبەرییش هەمان ڕای هەبووە .. بەڵام ئیبن ئیسحاق وای ئەبینێ کە باوکی بە شووی دابێ ، ئەویش ڕایەکی لاوازە ..

ئەمەش وتارەکەی ئەبوطالیب :

(( الحمد لله الذي جَعَلَنا من ذُرِّيَّة إبراهيمَ ، وزَرعَ إسماعيلَ ، وضِئْضِيءَ معدّ ، وعُنصُرَ مُضَر ، وَجَعَلَنا حَضَنَةَ بيته ، وسُوّاسَ حَرمه ، وجعل لنا بيتاً مَحجوجاً ، وحَرَماً آمناً ، وجعلنا الحكامَ عَلى الناسِ ، ثمَّ إنَّ إبنَ أخي هذا مُحمدُ بنُ عبدالله لا يُوزَنُ بهِ رجلٌ من قريش شَرفاً ونُبلاً وفَضلاً إلا رجحَ به ، وَهوَ وإن كانَ في المَال قَلٌّ ، فَإنَّ المَالَ ظلٌّ زائلٌ ، وَأَمرٌ حَائلٌ ، وَعاريَةٌ مُسترجَعَةٌ ، وَمُحمَّدٌ مَنْ عَرَفتُم قَرابَتَهُ ، وهو ـ والله ـ بعد هذَا لهُ نَبأٌ عظيمٌ ، وخطرٌ جليلٌ جسيمٌ ، ولهُ في خديجة بنت خُوَيلد رَغبَةٌ ، ولها فيه مثل ذلك ، وما أَحبَبتُم مِنَ الصَّداق فَعليَّ )) .

سوپاس و ستایشی خوای گەورە ئەکات کە ئەوانی بە نەوەی ئیبراهیم و ئیسماعیل و موعەد و موضەر گێڕاوە و ، کردوونیە پاسەوان و بەڕێوەبەری ماڵەکەی و حەرەمی پیرۆز و ، ماڵێکی پێ بەخشیون کە خەڵکیی بۆ حەج زیارەتی ئەکەن و ، بە حەرەمێکی پڕ لە ئاسایشی گێڕاوە و ، ئەوانی کردووە بە کاربەدەستی خەڵکیی .

پاشان دەری ئەبڕێ کە ئەگەر موحەممەدی برازای ، سەبارەت بە پایەداریی و ماقووڵیی و پیاوچاکیی ، لەگەڵ هەر پیاوێکی قورەیش‌دا کێشانە بکرێ ، ئەوا ئەم قورس‌ترە . جا ئەگەر ئەم لە ماڵ و سامان‌دا دەست کورت بێ ، ئەوا ماڵ و سامان زوو تیا ئەچێ و ، نامێنێتەوە و ، سپاردەیەکە وەرئەگیرێتەوە . بەڵام موحەممەد کە ئەزانن چۆن خزمێکە ، بەخوا دەنگ‌وباسێکی گرنگی ئەبێت و پاشەڕۆژێکی رووناك چاوەڕوانی ئەکات .

پاشان دەری ئەبڕێ کە موحەممەد حەزی لە خزمایەتیی ئەوانە و داوای خەدیجە ئەکات و چەندیش مارەیی داوا بکەن مامەی ئامادەیە .

ئەوەبوو ئەبوطالیب دوانزە ئۆقیە و نیو ، واتە پێنج صەد دیرهەمی کردە مارەیی و پێغەمبەری خواش ﷺ بیست وشتری بۆ زیاد کرد .

پێغەمبەری خوا ﷺ خەدیجەی گواستەوە .. ئەوەبوو یەك دوو وشتری سەربڕیی و نانی خەڵکێکی زۆری دا و ، خەدیجەش فەرمانی دا بە کەنیزەکەکانی تا گۆرانیی بڵێن و ، دەف لێ بدەن ، چونکە بە راستیی بە ئاوات گەیشتبوو . پیاوی تاقانەی سەرزەویی بۆ خۆی هەڵ بژاردووە ..

ئەو رۆژە تەمەنی پێغەمبەر ﷺ بیست و پێنج ساڵ بوو ، بەڵام تەمەنی خەدیجە چل ساڵ و کەمێکیش زیاتر بوو .. هەردووکیان هەستیان بەوپەڕی دڵ ئارامیی ئەکرد ..

بە راستیی خەدیجە ئافرەتێکی دامەزراو و بەسەلیقە بوو ، بە خۆی و سامانیەوە لە خزمەتی پێغەمبەردا بوو .. خوای گەورەش ویستی وەهابوو کە لەم ژن و مێردە رێك و پێکە کوڕ و کچ بکەونەوە .. ئەوەبوو لە کوڕان قاسم و عەبدوڵڵا لەدایك بوون ، هەندێکیش ئەڵێن : سێ کوڕ بوون و ( طیب ) یان بۆ زیاد ئەکەن و ، هەندێکیش ئەڵێن : چوار کوڕ بوون و ( طاهر ) یشی بۆ زیاد ئەکەن .. خوای گەورە چوار کچیشی پێ بەخشین : زەینەب و روقیە و ، ئوم‌کولثووم و ، فاطیمە خوا لێیان رازیی بێ . کوڕەکانیان هەر بە منداڵیی و پێش هاتنی وەحیی مردن . بەڵام کچەکانیان ژیان تا هەر چواریان موسڵمان بوون و شوویان کرد و جگە لە فاطیمە هەمووشیان لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ کۆچی دوایی‌یان کرد . فاطیمەش تەنها شەش مانگ دوای کۆچی دوایی باوکی ژیا ، ئەویش کۆچی دوایی کرد .

بەمە ئازیزمان لە سەرەتای تەمەنیەوە تاڵیی لەدەستدانی دایك و باوكی چەشت ، لە پیرییش‌دا تاڵیی لەدەست‌دانی منداڵەكانی چەشت ، بە هیوای ئەوەی خوای گەورە بیكاتە پاداشت بۆی ..

ئیتر ئەوەبوو حیكمەتی خوای گەورە وەها بوو كە كوڕەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ نەكەونە دوای خۆی ، تا نەبنە مایەی سەر لێشێوانی خەڵكیی ، بەوەی كە بیان‌گەیەننە پلەی پێغەمبەرایەتیی .. لە هەمان كات‌دا حیكمەتی خوای گەورە وەها بوو چەند كوڕێكی پێ ببەخشێ ، تەوەكو كەسێك تانە لە پیاوەتیی بدات و، هەر بە منداڵییش بردنیەوە بۆ لای خۆی تا ئەوانەی كە منداڵیان پێ نەبەخشراوە ، یان پێیان بەخشراوە و مردوون ، دڵیان لە خۆیان دانەمێنێ .. هەروەها مردنی باوك و دایكی پێغەمبەریش ﷺ كە ئەو هێشتا لە تەمەنێكی كەم‌دا بووە ، هەمان حیكمەتی تیا بووە تا هیچ منداڵێكی هەتیو دڵی لە خۆی دانەمێنێ و ، هەست بە كەمیی نەكات ، ئەوەتا یەكەم خۆشەویستی خوای گەورە بێ‌باوك و دایك گەورە بووە .

شایانی باسە كە خەدیجە یەكەم هاوسەری پێغەمبەری خوا بووە ﷺ و هەتا ئەویش مابوو هیچ ژنێكی تری مارە نەكردووە ..

### سێهەم : نوێكردنەوەی بینای كەعبە

لە سەردەمی ئیسماعیل پێغەمبەرەوە سەلامی لێ بێ كەعبە بە بەرزیی نۆ باڵ بنیات نرابوو و هەروا مابوویەوە و كەس نەی‌ئەوێرا بیڕووخێنێ و سەر لە نوێ بینای بكاتەوە .. ئەو كاتەش سەری نەگیرابوو و ، دز هەلیان بە دەست هێنا بوو و چیی گەنجینەی بەنرخ لەناویا بوو دزیی‌بوویان . ئیتر بە درێژایی رۆژگار دیوارەكانی كۆن بوو بوون و خەریك بوو بكەون .

كاتێك كە تەمەنی پێغەمبەری ئازیز ﷺ گەیشتە سیی و پێنج ساڵیی ، واتە پێنج ساڵ پێش هاتنی وەحیی لافاوێكی زۆر گەورە دای بەسەر مەككەدا و دیوارەكانی كەعبەی درز پێ دا و بناغەكانی رامالیی .. هەروەها پێش تریش بە دەستی ئافرەتێك ، كە ویستبووی بوخوردی تیا دابگیرسێنێ ، ئاگری تێ بەر بوو بوو . بەم بۆنەوە قورەیش پێیان خۆش بوو بینای كەعبە نوێ بكەنەوە ، بەڵام زۆر لەوە ئەترسان كە خوای گەورە بەم كارە برەنجێ و تووشی خراپەیەك بن ..

وەلیدی کوڕی موغیرەی مەخزوومیی رووی کردە قورەیش و وتی : ئایا ئێوە بەم رووخاندنە ئەتانەوێ چاکە بکەن یا خراپە ؟ وتیان : چاکەمان ئەوێ . وتی : دەی خوا پیاوچاکان لەناو نابات .

وەلید خۆی دەستی دایە زەنگن و خەریکی رووخاندن بوو هەتا ئێوارە .. خەڵکەکە زۆر ئەترسان .. چاوەڕوان بوون ئەو شەوە وەلید تووشی بەڵایەك ببێ و وتیان : چاوەڕوان ئەبین ، ئەگەر ئەو شتێکی تووش هات ئێمە نایڕووخێنین و وەك خۆی چاکی ئەکەینەوە . خۆ ئەگەر هیچی تووش نەهات ئەوا دەست بە رووخاندنی ئەکەین و ، دیارە خوا بەم کارەمان رازییە .

بۆ بەیانیی وەلید هاتەوە سەر کار و هیچی لێ نەهاتبوو و ، دەستی بە کاری خۆی کردەوە .. ئیتر خەڵکەکەش سامیان شکا و هاتنە یارمەتیی وەلید و رووخاندیان هەتا گەیاندیانەوە سەر ئەو بناغەیەی کە ئیبراهیم سەلامی لێ بێ بنیاتی نابوو .. وازیان لەو بناغەیە هێنا و بەسەریەوە دیواریان دروست کردەوە ..

قورەیش ئەم کارەیان یەکجار بە پیرۆز ئەزانیی ، بۆیە بە راوێژی یەکێ لە پیاوماقوولانیان لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە سامانی حەرام بۆ کەعبە سەرف نەکرێ .. لە هەر کاسپیی‌یەکیان کە پاك و حەڵاڵە بۆی سەرف بکەن .. پارەی ئافرەتی داوێن پیس و، پارەی ریبا و ، پارەی ستەم و بە ناڕەوا لە خەڵك سەندراوی بۆ سەرف نەکرێ .

ئەمەش دەری ئەخا کە پاشماوەیەکی دینی ئیبراهیم لەناویاندا هەرمابوو و ، ئەو سێ رەوشتەیان بە لاوە یەکجار ناپەسەند بوون ..

قورەیش لە نێوان خۆیاندا بیناکردنەوەی دیوارەکانی کەعبەیان دابەش کرد .. لای دەرگاکە بۆ نەوەی عەبد مەناف و زوهرە و ، نێوان روکنی ئەسوەد و یەمانیی بۆ نەوەی مەخزووم و ، سەرەکەشی بۆ نەوەی جومەح و سەهم و ، لای حیجریش بۆ نەوەی عەبدوددار و ، ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا و ، عەدیی . هەر هۆزێك ئەبوا بەشی دیواری خۆی بەرد کۆ بکاتەوە ..

جا پێغەمبەری خواش ﷺ لەگەڵ مامەکانی‌دا بەشداریی ئەم کارە پیرۆزەیان کرد و خەریکی بیناکردن و بەرد گواستنەوە ئەبوو ..

ئیمام بوخاریی و ئیمام موسلیم ، لە صەحیحەکەیان‌دا ، لە جابیرەوە ریوایەتیان کردووە کە وتوویە : کاتێ کە بینای کەعبە نوێکرایەوە ، پێغەمبەر ﷺ

و عەبباسی مامەی پێکەوە بەردیان ئەگواستەوە . ئەوەبوو عەبباس بە پێغەمبەری وت : ئیزارەکەت بخە سەر شانت تا بەردەکان ئازارت نەدەن . ئەویش وای کرد ، کەچیی کەوتە زەویی و هەردوو چاوی بڕییە ئاسمان ، پاشان هاتەوە هۆش خۆی و فەرمووی : (( إزاري ، إزاري )) بە پەلە ئیزارەکەی دا بە خۆی‌دا و ئیتر دوای ئەوە بە رووتیی نەبینرا ، ( مەبەست لە دەرکەوتنی رانە ) .

ئەو کەسەی کە وەستای دیوار درووست‌کردن بوو پیاوێکی رۆمیی بوو بە ناوی ( باقووم ) . ئەڵێن : ئەم پیاوە سواری کەشتی‌یەك ئەبێ کە لە تەختە بارکرابوو و بەرەو یەمەن ئەچوو تا قوللەیسی کەنیسەکەی ئەبرەهەی پێ تەعمیر بکرێتەوە . کە کەشتی‌یەکە لە دەریای سووردا گەیشتە ئاستی مەککە رەشەبایەك هەڵی کرد و کەشتی‌یەکەی تێك شکاند . قورەیش کە ئەمەیان بیست بەرەو کەناری دەریای سوور کەوتنە رێ و ، پاشماوەی کەشتی‌یەکە و تەختەکانیان کڕین و وەستا باقوومیشیان لەگەڵ خۆیان هێنا . بەم شێوەیە خوای گەورە بڕیاری وەها بوو ئەو دار و تەختانەی نێررابوون بۆ کەنیسەکە بۆ کەعبەی ماڵی پیرۆزی خوا بەکار هێنران و ئەویان پێ نوێ کرایەوە ..

دەستیان بە دیوار کرد هەتا گەیشتنە شوێنی دانانی بەردە رەشەکە .. لێرەدا هەر کەسە ئەی‌ویست خۆی بەردە رەشەکە لە شوێنی خۆی دابنێتەوە .. هەموو هۆزێك ئەویست ئەو شەرەفە دەست خۆی بکەوێ .. ئەوەندە لە یەك سوور بوونەوە خەریك بوو جەنگ روو بدات .. ئەوەبوو نەوەی عەبدوددار تەشتێکی پڕ لە خوێنیان هێنایە پێشەوە و ، پاشان ئەوانیش و نەوەی عەدیی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی پەیمانی مەرگیان بە یەکتر دا و ، دەستیشیان بەناو خوێنی تەشتەکەدا کرد . ئەمانە ناونران ( لعقة الدم ـ خوێن لێسەکان ) . چوار یان پێنج شەو بەم حاڵەوە مانەوە .

پاشان خوای گەورە بە سۆزی بەلێشاوی ئیلهامی خستە دڵی یەکێ لە پیاوە ژیرەکانیان ، کە ئەبوئومەییەی کوڕی موغیرەی مەخزوومیی ، باوکی خاتوو ئوم سەلەمەی دایکی ئیمان‌داران بوو ، کە لەو ساڵەدا ئەم پیاوە بە تەمەن‌ترین پیاوی قورەیش بوو ..

ئەبوئومەييە وتى : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! یەکەم کەسێك کە لە دەرگای ئەم مزگەوتەوە [٧٤] دێتە ژوورەوە بیکەنە حەکەمی نێوانتان . هەموو بە جارێ رازیی بوون و ، چاویان بڕییە دەرگای مزگەوت و ، ملەقوتەیان بوو تا بزانن داخۆ یەکەم کەس کێ دێتە ژوورەوە ..

لەو کاتەدا خوای گەورە ڕەزامەندیی وەها بوو کە ( محمد الأمین ) بنێرێ تا یەکەم کەس بچێتە ژوورەوە و لەو بەڵایە ڕزگاریان بکات .. ئەمەش یاسایەکی خواییە کە هەر بەندەیەك مەبەستی خوا بێت خوا ئەگاتە فریای ..

هەر کە ئازیزیان بینیی هەر هەموو بە یەك دەنگ وتیان : ( هذا الأمین ، رضیناه هذا محمد !! ) . دەریان بڕیی کە زۆریان پێ خۆشە موحەممەدی ئەمین حەکەمی نێوانیان بێت ..

کە خۆشەویستمان گەیشتە لایان و هەواڵەکەیان دایە ، کەوتە بیرکردنەوە .. ئەوەندەی پێ نەچوو نەخشەی چارەسەریی هاتە بیر و ، خێرا کەوتە جێبەجێکردنی ئەو نەخشە جوانەی .. داوای قوماشێکی کرد ، کە بۆیان هێنا ، بە دەستی پیرۆزی بەردە ڕەشەکەی هەڵ گرت و ، خستیە سەر قوماشەکە و فەرمانی دا لە هەر هۆزێك پیاوێك بێتە پێشەوە و دەست بداتە گۆشەیەکی قوماشەکە و بەرزی بکەنەوە .. هەموو بە جارێ بەرزیان کردەوە ، تا گەیشتە ئاستی جێی دانانی .. بە هەردوو دەستی پیرۆزی بەردەکەی هەڵ گرت و خستیەوە شوێنی خۆی و دیواریشی لەسەر کرد .

قورەیش لە ئاژاوەیەکی خوێناویی ڕزگاری بوو و ، بەم هەڵوێستەش پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر پایەی لەناو خەڵکەکەدا بەرز بوویەوە و ، باسەکەش بووە باسی هەموو کۆڕ و کۆمەڵێك ..

ئەوەبوو قورەیش بڕیاریان دا کەماڵی خوا بە ماڵ و سامانی حەڵاڵ نوێ بکەنەوە ، کەچیی ماڵ و سامانی حەڵاڵ کورتی هێنا ، لەبەر ئەوە ناچار بوون لەلای باکووری بەیتەوە پارچەیەکیان لێ دابڕیی و دیوارێکی نزمیان بۆ ئەو بەشە بنیات نا تا بزانرێ ئەویش لەسەر بەیتە ، ئەمە ئەو ناوچەیە کە پێی ئەوترێ ( حیجر ) . لە صەحیحی بوخارییش‌دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بە عائیشەی فەرموو : (( لولا أنَّ قومكِ حدیثو عهد بالكفر لبنیت الكعبة علی قواعد إبراهیم )) .

---

[٧٤] کە دەرگای نەوەی شەیبە بووە و ئەمڕۆ ناوی ( باب السلام ) ە .

فەرمووی : ئەگـەر قەومەکـەت تـازە موسـڵمان نەبوونایـە کـە مەترسیی هـەڵ گەڕانـەوەیـان لێ بکـرێ ، ئـەوا کەعبـەم لەسـەر بناغـەکانی ئیـبراهیم بنیـات ئەنایەوە ..

بەرزیی کەعبەش لە سەردەمی ئیبراهیم و ئیسماعیل‌دا سـەلامیان لێ بـێ نـۆ باڵ بوو و ، دوو دەرگاشی هەبوون : دەرگایەکی خۆرهەڵات و یەکێکی خۆرئاوا تا ئـەو کەسـەی ئەچـێتە ژوورەوە ، لـە دەرگایەکیانـەوە بچـێتە ژوورەوە و ، لـەوی تریشیانەوە بێتە دەرەوە .

بەڵام کاتێ کە قورەیش نوێیان کردەوە نۆ باڵی تر بـەرزیان کـردەوە و ، تـەنها یەك دەرگایان هێشتەوە و ، دەرگاکەشیان لە زەویی بەرز کردەوە ، کە مەگـەر بـە پەیژە یان پلیکانە کەسێك سەر بکەوتایە ، ئەمەش تا ئەوانـە بچـنە ژوورەوە کـە خۆیان بیانەوێ و ، لەسەر شەش کۆڵەکەش سەریان گرت .

سەرەنجام کەعبە لە شێوەی شەش پاڵوودا نوێ کرایەوە ، کە بەرزی‌یەکەی پـانزە مەترە و درێژیی ئەو لایەی کە بەردە رەشەکەی تیایە و بەرامبەرەکەشـی دە مـەتر و، ئەو لایەش کە دەرگاکەی تیایە و بەرامبەرەکەشـی دوانـزە مـەتر و ، بـەرزیی بەردەکەش مەتر و نیوێك و ، بەرزیی دەرگاکەش لە زەوی‌یەوە دوو مەترە .

کەعبە هەر بەو شێوەیە مایەوە تا سەردەمی عەبـدوڵڵای کـوڕی زوبـەیر ، کـە ئەوەبوو عەبدوڵڵا لەلایەن یەزیـدی کـوڕی موعاویـەوە گـەمارۆ درا و ، بـە هـۆی جەنگەوە گوللەی مەنجەنیق بەر کەعبە کەوت . ئەوەبوو عەبدوڵڵای کـوڕی زوبـەیر لە سەردەمی خەلافەتی خۆی‌دا کەعبەی رووخانـد و لەسـەر بناغـەکانی ئیـبراهیم دروستی کردەوە ، کە بەرزی‌یەکەی کردە بیست و حەوت باڵ ، وەك بەرزیی ئێسـتا و ، ئەوەی قورەیش لێی کەم کردبوویەوە خستیەوە سـەری و ، لای خۆرئاواشـەوە دەرگایەکی تری داکرد .

بەڵام دوای ئەوەی کە عەبدوڵڵا شەهید کرا و ، کاروبـار کەوتـە دەست نـەوەی ئومەییە، لە خەلافەتی عەبدولمەلیکی کـوڕی مـەڕوان‌دا ، حـەججاج راوێـژی بـە عەبدولمەلیك کرد تا ئەوەی کە کـوڕی زوبـەیر کردوویـەتی هـەڵی بوەشـێنێتەوە . ئەویش بۆی نووسیی کە دەست لە بەرزی‌یەکەی نـەدات ، بـەڵام زیادەکـەی حیجـر لابەرێت و وەك خۆی لێ بکاتەوە و ، ئەو دەرگایـەش کـە دای کـردووە بیگرێـت ، ئەویش وەهای کرد . ئیمام موسلیم ئەمەی ریوایەت کردووە .

فاکیهییش باسی ئەوەی کردووە کە عەبدولمەلیك پەشیمان بووە کە ماوەی داوە حەججاج دەست کاریی کەعبە بکات و لەعنەتیشی لە حەججاج کردووە . بەم شێوەیە حەججاج کەعبەی وەك سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لێ کردەوە .

خەلیفە هاروونوڕڕەشیدیش ، یان باوکی ، هەوڵی دا تا کەعبە وەك سەردەمی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر لێ بکاتەوە ، بەڵام ئیمام مالیك لێی پاڕایەوە تا شتی وا نەکات و وازی لێ بهێنێ ، تا کەعبە نەبێتە یاریی دەستی پادشاکان . ئیتر هەر وا بەو حاڵەی خۆی ماوەتەوە تا ئێستا .. خوای گەورە بیپارێزێ ..

**چوارەم : یارمەتیی‌دانی ئەبوطالیب**

یەکێك لەو نیعمەتانەی کە خوای گەورە رژاندی بەسەر عەلیی کوڕی ئەبوطالیب دا کە بووە مایەی خێری دنیا و قیامەتی ، ئەوەبوو کە قوڕەیش کەوتنە گرانیی و گوزەران تاڵی‌یەوە ، ئەبوطالیبیش خاوەنی کووژەڵێك خێزان بوو و ، هەرچەندە لەناو قوڕەیش‌دا خاوەنی پایە و پلەی مەعنەویی و رێز و حورمەت بوو ، بەڵام خاوەنی ماڵ و سامانی زۆر نەبوو . کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرنجی ئەم وەزعەی دا و ، بیری لە کاتی منداڵیی خۆی کردەوە کە چۆن مامەی ئەوی بەخێو ئەکرد و ، نازی ئەکێشا و ، پێشی منداڵەکانی خۆی ئەخست ، هاتە سەر ئەو بڕیارە کە تەگبیرێك بۆ مامەی بکات . ئەوەبوو چووە لای عەبباسی مامەی ، کە دەوڵەمەندترینی نەوەی هاشم بوو و ، دای بە گوێی‌دا کە ئەبوطالیبی برای خێزانی زۆرە و ، خەڵکییش ئەمەی بەسەر هاتووە ، وا چاکە یەکی کوڕێکی لێ وەربگرن تا باری سەرشانی سووك ببێ ، کە فەرمووی :

(( یـا عَمِّ! إنَّ أخاكَ أباطالبَ كثيرُ العيال ، وقد أصابَ الناسَ ما تَرى من هذه الأَزمَة ، فَانطَلِقَ بنا إلَيه ، فَلنُخَفِّف عَنهُ مِن عَياله ، أَنا آخُذُ مِن بَنيهِ واحِداً ، وتَأخُذُ أَنتَ واحِداً )) . عەبباس وتی : بەڵێ ..

پێکەوە رۆیشتن بۆ ماڵی ئەبوطالیب پێیان وت : ئەمانەوێ باری خێزانەکەت لەسەر شانت سووك بکەین ، هەتا ئەمەی کە بەسەر خەڵکیی‌دا هاتووە بڕەوێتەوە ..

ئەبوطالیب پێی وتن : تەنها عەقیلم بۆ بهێڵنەوە ، ئیتر چیی ئەکەن بیکەن .

ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ عەلیی و ، عەبباسیش جەعفەری بردە لای خۆی . ئیتر عەلیی لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ مایەوە هەتا وەحی هاتە خوارەوە و ، عەلییش بووە

یەکێك لەوانەی کە زوو بە زوو موسڵمان بوو و ، کەوتە شوێن ڕێبازی قورئان ، بگرە ئەڵێن : یەکەم کەسە کە موسڵمان بووە . جەعفەریش لای عەبباس مایەوە هەتا موسڵمان بوو و ، کارێکی پێ هات کە پێویستیی بە مامەی نەمێنێ ..

ئەم مانەوەیەی ئیمام لە ماڵی ئازیزدا بۆ ماوەی چەند ساڵێك ، بووە هۆی ئەوە کە پەروەردەیەکی زۆر نایاب لە موحەممەدی ئامۆزای وەربگرێ .. ئەوەبوو سەرەنجام ئەو پیاوەی لێ دەرچوو کە نازناوی شێری خوای وەرگرت و ، لە هەموو بوارێك دا ، چ زانستیی و ، چ ڕەوشتیی و ، چ ئازایەتیی بووە پیاوی مەیدان و بووە ئەستێرەیەکی گەشی مێژووی دوور و درێژی ئیسلام ..

**پێنجەم : سەرەنجامی منداڵەکانیان**

لە ماوەی پێش هاتنی وەحی‌دا ، پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لە ژیان و گوزەرانێکی ئاسوودەدا ئەژیا ، ئەوەش بە هۆی ژیریی و سەلیقەی خاتوو خەدیجەوە خوا لێی ڕازیی بێ . ئەوەبوو خوای گەورە لەو ماوەیەدا کوڕ و کچی پێ بەخشین ، هەرچەندە هەندێ ڕووداو ئەبوونە مایەی خەم و خەفەت بۆیان ..

لەو ماوەیەدا قاسم و عەبدوڵڵای کوڕیان کە هێشتا لە بێشکەدا بوون وەفاتیان کرد و خەم و خەفەتێکی زۆریان بۆ دایك و باوکیان بەجێ هێشت ..

لە لایەکی ترەوە کچەکانیان بەرە بەرە گەورە بوون و کاتی شووکردنیان هاتە بەرەوە . ئەوەبوو زەینەبی کچە گەورەیان شووی بە ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع کرد ، کە لە ئەشراف و گەورە بازرگانانی قورەیش و پوورزای خۆی بوو ..

ئەبولعاص پیاوێکی وەها ڕەوشتبەرزی نەجیب بوو ، بە لای خەدیجەی پووریەوە یەکجار خۆشەویست بوو ، بۆیە ئامادەیی دەربڕیی تا پێغەمبەر ﷺ زەینەبی کچی لێ مارە بکا .

ڕوقیە و ئوم‌کەلثوومیش دەست‌گیرانی عوتبە و عوتەیبەی کوڕانی ئەبولەهەبی مامەی پێغەمبەر بوون ، کاتێ کە وەحی هاتە خوارەوە و ، ئەبولەهەب کەوتە دژایەتیی ئیسلام ، فەرمانی بەسەر کوڕەکانی‌دا دا تا لە دەست‌گیرانەکانیان جیا ببنەوە ، تا بار بن بەسەر باوکیانەوە و نەتوانێ بانگەوازەکەی بگەیەنێ . ئەوانیش بە گوێیان کرد .

هەروەها قورەیش هاتنە لای ئەبولعاص و هەوڵیان لەگەڵ دا کە ئەگەر زەینەبی خێزانی تەڵاق بدات ، دەست ئەخاتە سەر هەر کچێکی قورەیش لێی مارە ئەکەن . ئەویش مەردانە ئەوەی نەبیست و ، وتی : بەخوا بە هیچ ئافرەتێکی قورەیشی ناگۆڕمەوە !! ئەوەبوو لە ئەنجامدا روقیە و ئوم‌کەلثوومیش یەك لە دوای یەك شوویان بە عوثمانی کوڕی عەففان کرد و ، بەو بۆنەشەوە کە هیچ کەسێك دوو کچی پێغەمبەرێکی مارە نەکردوون جگە لەو ، نازناوی ( ذوالنورين )ی لێ نرا ..

فاطیمەش منداڵ بوو و لە ماڵی باوکیا مایەوە و ، هەموو ئەو ئازار و ناڕەحەتی‌یانەی دیتن کە قورەیش بە پێغەمبەر و موسڵمانانی ئەچەشتن .. ئەوەبوو دوای کۆچی مەدینە و تەواوبوونی جەنگی بەدر شووی بە ئیمام عەلیی ئامۆزای باوکی کرد و ، خوای گەورە کوڕ و کچی پێ بەخشیی و ، ئال و بەیتی پاك و خاوێنیش لەوان کەوتۆتەوە ..

**شەشەم : بە کوڕکردنی زەید**

زەیدی کوڕی حاریثەی ، کوڕی شورەحبیلی ، کوڕی کەعبی ، کوڕی عەبدولعوززای کەلبیی ، کە منداڵێکی بچووك بوو لەگەڵ دایکی‌دا لە سەفەردا بوون و ، کۆمەڵێ لە ئەعراب هێرشیان کردە سەریان و زەیدیان بە دیل گرت و فرۆشتیان . ئەوەبوو حەکیمی کوڕی حەزامی خەڵکی مەککە کڕیی و کە هاتەوە پێشکەشی خاتوو خەدیجەی پووری کرد ، ئەمەش کەمێك دوای شووکردنی بە پێغەمبەر ﷺ . ئەو کاتە زەید تەمەنی گەیشتبووە بیست ساڵان و پێغەمبەر ﷺ داوای لە خەدیجە کرد تا زەیدی پێشکەش بکات . زەید لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ پەروەردەیەکی باشی وەرگرت و ، ئەوپەڕی نازی هەبوو ..

کاتێ کە باوکی زەید هەواڵی زانی کە زەیدی کوڕی وا لە مەککە ، لەگەڵ هەندێ خزمیا هاتن بۆ مەککە و هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا لە بریی زەیدی کوڕیان چیی داوا ئەکات بیدەنێ .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أو خير من ذلك ؟ )) . فەرمووی : ئەی لەوە چاکترتان ناوێ ؟

واتە : ئێوە ئامادەن پارە بدەن تا کوڕەکەتان بدەینەوە ، چاکتر لەوەتان ناوێ ؟

وتیان : ئەو چاکەیە چی‌یە ؟

فەرمووی : (( خَيِّروه ، فإن اختاركم فهو لكم دون فداء ،وإن اختارني فدعوه )) .
فەرمووی : خۆی بکەنە سەرپشك ، ئەگەر ئێوەی هەڵ بژارد ، ئەوا بەبێ فیدیە پێشکەشتان بێت و ، گەر منیشی هەڵبژارد ، ئەوا وازی لێ بهێنن ..
که هاتن و پرسیان بە زەید کرد ، پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵ بژارد !!
مامەی زەید دەستی دایە جل و بەرگی زەید و رای کێشا و وتی : زەید ! واز لە باوکت و مامەت ئەهێنیی و کۆیلایەتیی هەڵ ئەبژێری ؟!
وتی : ئەرێ ، بەخوا کۆیلایەتیی لای موحەممەدم لە لا خۆشترە لەوەی کە لە لای ئێوە بم !!
بە مەرجێ هێشتا موحەممەدی ئازیزمان وەحی بۆ نەهاتووە ، بگرە وا لە تەمەنی لاویی‌دا !!
کە زەید ئەم بڕیارەی دا ، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرمووی : (( يا معشر قريش ! إشهدوا أن زيداً إبني يرثني وأرثه )) . فەرمووی : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! بە شاهید بن کە زەید کوڕمە و ، میراتم ئەبا و میراتیشی ئەبەم . گەڕا بەسەر کۆڕ و ئەلْقەکانی قورەیش‌دا و ئەی‌کردنە شاهێدی ئەم بڕیارە .. کە باوکی و کەس‌وکاری رەوشت و هەڵس و کەوتی پێغەمبەر و ، دڵئارامیی و بێ‌خەمیی زەیدیان بینیی ، دڵیان بێ‌خەم بوو و گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان و ، دەست‌بەرداری زەید بوون ..
ئیتر لەو رۆژەوە ناوی زەیدی کوڕی حاریثە گۆڕرا بۆ زەیدی کوڕی موحەممەد ، هەتا ئەو کاتەی کە فەرمانی قورئان هاتە خوارەوە و یاسای بەکوڕکردنی بەتاڵ کردەوە و ، فەرمانی دا هەر کەسە بە ناوی باوکی خۆیەوە بانگ بکرێ .
ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئوم ئەیمەنی دایەن و کەنیزەکی خۆی لە زەید مارە بڕیی ، کە تەمەنی لە زەید زیاتر بوو و ، خوای گەورە ئوسامەی کوڕی زەیدی پێ‌یان بەخشیی ، کە لەبەر خۆشەویستیی هەردووکیان بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ ناوی ( الحِبُّ بن الحِبِّ ) واتە : خۆشەویستی کوڕی خۆشەویستی لە ئوسامە نا و ، لەگەڵ حەسەنی کوڕی فاطیمەدا بە یەك چاو سەیری ئەکردن .. حەسەنی لەسەر رانێکی خۆی دائەنا و ، ئوسامەش لەسەر رانەکەی تری .

**حەوتەم : ژیانێکی پاك و بێ‌گەرد**

ئەگەر بە وردیی لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ پێش هاتنی وەحی بکۆڵینەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە ژیانێکی پاك و بێ‌گەرد و بەڕێزی بەسەر بردووە و ، هەرچیی پێی

بلێی ناتەواویی لە ژیانیا نەبووە ، چونکە خوای گەورە خۆی چاودێریی ئەکرد و ، لە هەموو پیسیی و چەپەڵی‌یەکی نەفامیی ئەی‌پاراست ، تا سەرەنجام بووە پیاوی تاقانەی قەومەکەی لە ڕەوشت‌جوانیی و ، نەرم و نیانیی و ، چاکەخوازیی و ، ڕاستگۆیی و ، ئەمانەت‌داریی‌دا و ، کەسیش نەبوو ئەوەندەی ئەو لە ڕەوشتە سووکەکانی نەفامیی بەدوور بێت . ئیتر ئەوەبوو ناویان نا ( الأمين ) .

بەڵێ ئەو کۆمەڵەی کە ئەو ڕۆژە لە دوورگەدا ئەژیا ، کۆمەڵێکی نەفام و نەزان کار و بت‌پەرست بوون ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش‌دا هەندێ بەڕێزی پایەبەرزی تێدا بوون کە بە سووکایەتیی نەفامیی ڕازیی نەبوون ، وەك حەنیفی‌یەکان کە هەڵگری بانگی تەوحید بوون .. هەروەها مرۆڤی بەڕێز و بەخشندە و ، خاوەن وەفا و ، داوێن‌پاك و ، دوور لە هەموو گوناه و تاوانێك ، لەو کۆمەڵەدا هەبوون ، بەڵام جگە لە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ کەسێکی تر نەبوو کە هەر هەموو ڕەوشتە بەرزەکانی تێدا هەبن و لە هەموو ڕەوشتە سووکەکانیش بەدوور بێت .

هەر بە منداڵیی هەڵ گری عەقیدەی بێ‌گەرد و ، ئیمانی پاك و ، بیرکردنەوەی قووڵ بوو ، کە بە هیچ جۆرێ ملی بە لاری‌یەکانی ئەو کۆمەڵە نەئەدا ..

لە هەموو ژیانی‌دا یەك جار نەبینراوە سەجدە بۆ بتێك بەرێت ، یان بۆ پیرۆزیی دەستی پیا بهێنێ . هەتا بە منداڵیی کە تووشی بەحیرای ڕاهیب بوو ، پێی وت : داوات لێ ئەکەم لەبەر خاتری لات و عوززا ، هەرچیییت لێ ئەپرسم وەڵامم بدەرەوە. دیارە بەحیرا خۆی بڕوای بەو بتانە نیە ، بەڵام گوێی لە قوڕەیش ئەبوو کە سوێندیان پێ ئەخواردن ئەش‌گونجێ پێغەمبەری پێ تاقیی کردبێتەوە ، تا بزانێ چۆن سەیری ئەو بتانە ئەکات .

فەرمووی : (( لا تسألني بحق اللات والعزى شيئاً ، فوالله ما أبغضت شيئاً قط بغضهما )) . فەرمووی : لەبەر خاتری لات و عوززا هیچم لێ مەپرسە ، بەخوا ئەوەندەی ڕقم لەوانە ڕقم لە هیچ شتێکی تر نیە .

هەروەها بەیهەقیی لە زەیدی کوڕی حاریثەوە خوا لێی ڕازیی بێ ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : جووتە بتێك هەبوون کە لە مس دروست کرابوون و پێیان ئەوترا : ئیساف و نائیلە کاتێ کە موشریکەکان طەوافیان بکردایە دەستیان بەو دوو بتەش دا ئەهێنا . ئەوەبوو پێغەمبەری خواش ﷺ طەوافی کرد و منیش لەگەڵیا طەوافم کرد . کاتێك کە بەلای بتەکەدا تێ‌پەڕیم دەستم پیا هێنا ، پێغەمبەری خوا ﷺ

فەرمووی : (( لا تَمُسَّهُ )) . زەید ئەڵێت : دیسان طەوافمان کردەوە و لە دڵی خۆم‌دا وتم : هەر دەست بە بتەکەدا ئەهێنم ، تا بزانم چی ئەبێت . ئەوەبوو دەستم لێ دایەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أَلَم تُنْهَ ؟ )) فەرمووی : ئەی تۆ لەوە قەدەغە نەکراوی ؟

زەید ئەڵێت : دەی بەو خوایەی کە ڕێزی لەو نا و ، قورئانی نارده خوارەوە سەری ، هەتا وەحی بۆ هات دەستی لە هیچ بتێك نەدا .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لە شیعردانان نەبووە ، چونکە ئەوە لەگەڵ پایە و پلەی پێغەمبەرایەتیی‌دا شتێکی نەگونجاوە و ، خوای گەورەش دەری ئەبڕێ کە شیعری پیشانی موحەممەدی پێغەمبەری نەداوە ، ئەمەش لە وەڵامی ئەو نەفامانەدا کە قورئانیان بە شیعر ئەزانی کە ئەفەرموێ : ﴿وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ﴾ . لەگەڵ ئەوەش‌دا لەزەتی لە جوانیی و حیکمەتی شیعر ئەبینیی و ، جاری وەهاش ئەبوو کە لە هاوەڵانی داوای ئەکرد کە شیعری بۆ بخوێننەوە .

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ نزیکی عەرەق و فاحیشە نەکەوتۆتەوە و ، هیچ جۆرە قومارێکی نەکردووە و ، هاوەڵیی پیاوخراپان و بەرەڵایانی نەکردووە .

هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە جێی متمانەی هەمووان بووە ، بۆیە هەرکەسێ ئەمانەتێکی ببوایە لای ئەو دایئەنا و ، هەر وتەیەکی نهێنیی ببوایە لای ئەو باسی ئەکرد ، چونکە لە ئەمینیی و دەست‌پاکیی‌دا تاقانەی قەومەکەی بوو . هەتا دوای هاتنی وەحی و دژایەتیی قەومەکەی بەرامبەری ، ئامانەتەکانیان لای ئەو دائەنا و ، ئەوەبوو ئەویش لە شەوی هیجرەت‌دا عەلیی لە مەککە هێشتەوە تا ئەمانەتەکان بداتەوە بە خاوەنەکانیان . هەروەها هەر پەیمانێکی لەگەڵ کەسێك دا بەستبێ بە جوان‌ترین شێوە ئەو پەیمانەی بردۆتە سەر و ، هەر بەڵێنێکیشی دابێت بە ڕاستیی و پاکیی بەڵێنەکەی جێبەجێ کردووە .. ئەگێڕنەوە کە جارێکیان ئازیزمان ﷺ بەڵێن بە پیاوێك ئەدات کە لە فلان شوێن‌دا چاویان بە یەك بکەوێت . سێ ڕۆژ لەو شوێنەدا ئامادە ئەبێت و چاوەڕوانیی پیاوەکە ئەکات و ، پیاوەکە ئامادە نابێت. دوایی کە چاوی پێ کەوت گلەیی ئەوەی لێ کرد کە لە بەڵێنەکەی دوا کەوت و ئەمیشی ئازار داوە کە فەرمووی : (( لقد شققتَ عليَّ )) .

سیفەتێکی زۆر دیاریشی ڕاستگۆیی بووە ، بە پێی شاهێدیی دۆست و دوژمن. هەتا لەو کاتەدا کە ئەیویست خزمەکانی بۆ سەر ئیسلام بانگ بکات ، ئەویش بە پێی فەرمانی قورئان : ﴿ وأنذر عشيرتك الأقربين ﴾ ، ئەوەبوو دەستی دایە بانگ کردنی لقەکانی قورەیش و ، کە ئامادە بوون پێی فەرموون : (( أرأيتكم لو أخبرتكم أن خيلاً وراء هذا الجبل تريد أن تغير عليكم ، أكنتم مصدِّقيَّ ؟ )) .

فەرمووی : ئەگەر هەواڵتان بدەمێ کە دوژمن لەو دیوی ئەو شاخەوەیە ئەیەوێ هێرشتان بکاتە سەر ، ئایا بڕوام پێ ئەکەن ؟ وتیان : بەڵێ ، هەرگیز درۆمان لە دەم نەبیستووی .

کاتێکیش کە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب ، پێش موسڵمانبوونی ، بۆ بازرگانیی ڕێی کەوتە وڵاتی شام و ، لەو کاتەش‌دا هیرەقلی پادشای ڕۆم لەوێ بوو و ، داوای کەسانێکی خەڵکی حیجازی کرد تا هەواڵی پێغەمبەری تازە بزانێ ، ئەوەبوو ئەبوسوفیانیان بردە کۆشکی پادشا و ، پادشا پرسیارێکی زۆری دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەبوسوفیان کرد ، کە یەکێ لەو پرسیارانەی ئەوەبوو : ئایا درۆتان لە دەمی بیستووە ؟ ئەبوسوفیان وتی : نەخێر . هیرەقل وتی : ناگونجێ کەسێك لەگەڵ خەڵك‌دا دەستبەرداری درۆ ببێ ، کەچیی بە ناوی خواوە درۆ بکات !!

لە پاڵ ئەم سیفەتە جوانانەی‌دا سیلەی ڕەحمیشی بەجێ ئەهێنا و ، بەزەیی بە هەژاران و موحتاجان‌دا ئەهاتەوە و ، ڕێزی لە میوان ئەگرت و ، کۆمەکیی لاواز و نەدارانی ئەکرد و ، دەستی موبارەکی ئەهێنا بەسەر کەساس و خەمباران‌دا و ، دەستی لێقەوماوانی ئەگرت ، وەك لە سەرەتای هاتنی وەحی‌دا خاتوو خەدیجەی ژیر و بلیمەت دڵخۆشیی ئەدایەوە تا خەمی نەبێ لەوەی کە تووشی شتی خراپ ببێ ، چونکە ئەو چاکەویستە و خواش چاکەویستان هەرگیز سەرشۆڕ ناکات ، کە ئەیوت : (( ما كان الله ليخزيك أبداً ، إنك لتصل الرحم ، وتقري الضيف ، وتحمل الكلَّ ، وتَكسب المعدوم ، وتعين على نوائب الحق )) . ( صحيح البخاري ـ باب كيف كان بدء الوحي ) .

ئەمەی پێشەوە کورتەیەك بوو لە ژیانی ئازیز پێش هاتنی وەحی بۆی ، کە بە ڕاستیی هەر کەسێ بە ئینصافەوە سەرنجی بگرێ ، ئەزانێ لە ناو مرۆڤایەتیی‌دا ، بە درێژایی مێژوو ، تاقە کەسێکی تر نەبووە ئەوەندە بێ کەم و کوڕیی و ،

ئەوەندەش رەوشتبەرز بێت ، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا شاهێدییە لەسەر ئەوە کە تا ئەم پیاوە وەستابێ هیچ کەسێکی تر شایانی ئەوە نیە ببێتە ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوەی کە حەزرەتی عیسا سەلامی لێ بێ مژدەی هاتنی داوە ..

**هەشتەم : جیهان چاوەڕوانی رزگارکەرە**

ئەمەی پێشەوە هەر هەمووی بۆمانی دەرخست کە جیهان بە گشتیی و وڵاتی عەرەب بە تایبەتیی نوقمی تاوان و خراپە و ستەم بوو بوو ، بە رادەیەك کە مرۆڤایەتیی حەسانەوەی نەما بوو ..

ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤایەتیی ژیانێکی هیچ و پووچ بوو .. مرۆڤەکان کە یەك بەرەباب بوون ، بووبوونە دوو دەستە : ئاغاکان بەبێ ماندووبوون و زەحمەت کێشان خێر و بێری زەوییان داگیر کردبوو و ، بەندەکانیش بەشیان رەنج و تەقالا و عەرەقڕێژان بوو ، بێ ئەوەی تامی رەنجی شانیان بکەن .. وەك ئاژەڵ تەماشا ئەکران و ، مەگەر لە پاشماوەی ئاغاکان نانێکیان دەست بکەوتایە .. لەولاوە ستەمێکی زۆر لە ئافرەت ئەکرا و مافەکانی ژێر پێ ئەخران .. هی وایان هەبوو کە هاوسەری باوکی مارە ئەکردەوە .. هی وایان هەبوو لە یەك کاتدا دوو خوشك هاوسەری بوون .. جوولەکە ئەوەندە لە سەفاهەتدا رۆچوو بوون کە ئافرەتی مەحرەمیان مارە ئەکردەوە .. عەرەبەکانیش کچی بەستەزمانیان زیندەبەچاڵ ئەکرد ..

لە بارەی دینیشەوە ، لە دوورگەدا بتپەرستیی و ، لە وڵاتی کلدانیا و سەبەء و بابلیشدا پەرستنی خۆر و ئەستێرە و ، لە وڵاتی فارس و دەوروبەریشیدا ئاگرپەرستیی و ، هەندێکیش پەرستنی دوو خوا : خوای رووناکیی و خوای تاریکیی و ، هەندێکیش صابینەی بێدین و ، لە وڵاتی هیند و دەوروبەریشیدا بورهومیی و ئاژەڵپەرستیی بە تایبەت مانگا و ، لە وڵاتی چین و دەوروبەریشیدا بە خوا زانین و پەرستنی بووذا و، یەهوودییەتیش وەها دەستکاریی کرا بوو کە عوزەیریان بە کوڕی خوا ئەزانیی و ، نەصرانییەتیش وەها سەرگەردان بوو بوون کە سێ خوایان ئەپەرست و عیسا و مەریەمیشیان بە خوا ئەزانیی ، هەتا یۆنان و میصری فیرعەونەکانیش ، ئەگەرچیی لانکەی شارستانییەت بوون ، خەریکی بت پەرستیی و ، پەرستنی چەندین خوا و ، پەرستنی ئاژەڵ پیشەیان بوو ..

لە بارەی ئەخلاق و ڕەوشتیشەوە ، سەرزەویی نوقمی ڕەوشتە نزمەکان بوو بـوو، بـە تایبـەت لـە کۆشـکی کیسـرا و قەیصـەر و پادشـا و میرەکـان‌دا بـەرەڵایی گەیشتبووە چڵەپۆپە ، بـە ڕادەیـەك کـە ئـەو بەدڕەوشـتی‌یانە گـەورەترین هـۆی لاوازبوونی ئەو دوو دەوڵەتە گەورە جیهانی‌یە : ڕۆم و فارس بوو ، تا ئەوەبوو پیریی و کلۆریی سەریان هەڵ دا و ، پاشانیش ڕووخان و تیاچوون !

لە بارەی حوکم و سیاسەتیشەوە ، ستەم و ماف‌خواردن لە هەموو سـەرزەویی‌دا شتێکی زۆر ئاسایی بوون .. جـەنگ و کوشـتار لەسـەر شـتێکی بچـکۆلە بـەرپا ئـەبوون و ، خـەڵکێکی زۆر بـەبێ هـوودە تیـا ئەچـوون .. ئـیتر بـا جەنگـە خوێناوی‌یەکانی نێوان جووتە دەوڵەتە گەورەکە ، ڕۆم و فارس ، لەولاوە بووەستن ..

ئەمە بارودۆخی سەرزەویی بوو .. لەو بارەوە قورئانی پـیرۆزیش بـڕیاری خـۆی دا بوو :

﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُواْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ ( الروم : ٤١ ) .

ئا لەم بارودۆخەدا سەرزەویی هاواری بوو تا ڕزگارکەرێك بگاتە فریای و بێت بە هانایەوە ..

خوای گەورەش ، کـە خاوەنی بـەزەیی و شـەفەقەتی بێ‌سـنوورە بەرامبـەر بـە بەندەکانی ، هات بە هانای ئادەمی‌یەکانەوە .. فریای دڵـە تینووەکـان کـەوت .. زامی زامدارانی سارێژ کرد .. دەرمانی بۆ دەردەکان ڕەوانە کرد .. پێغـەمـبەری ئاخـرزەمـانی هەڵ بژارد .. ڕزگارکەری مرۆڤی نارد .. تا بانگ بەرز بکاتەوە و ، خەڵکیی خوای خۆیان بناسن و ، بە تاك و تەنیا بێ‌شەریك و هاوەڵ بی‌پەرستن ..

ئـەمرۆش سـەرزەویی هـەر هـەمووی بـە دەسـت سـتەم و فرِوفێـڵەوە گـیری خـواردووە .. دەستە و تاقمەیەکی کەمی فێڵباز لە هەموو ناوچەیەك‌دا کاروباریان بە دەست گرتووە و خوێنی هـەژاران ئەمـژن و ، بـە نـاوی زرق و برقـەوە دەسـت خەڕۆیان ئەکەن و ، هەرکە فێڵێك ئاشکرا بـوو ، فێڵـی لـەوە خـراپ‌تـر بـە کـار ئەهێنرێت ، تا مرۆڤەکان هەر چەوساوە و داماو بن ..

ئەمرۆش سەرزەویی پێویستی بەو بەرنامە ڕزگارکەرە هەیە ، تا سـەر لـە نـوێ مرۆڤە ئیمـان‌دارەکـان خزمـەتی ژیـان بکـەن و ، بەوپـەڕی ئیخلاصـەوە هـەوڵی حەسـانەوەی مـرۆڤ بـدەن .. کـاتی ئـەوە هـاتووە بـە ڕێبـازی قورئـان مـرۆڤی

خۆنەویست .. تێرخواردوو لە دنیا .. چاوەڕوان‌کەری قیامەت .. خزمەت‌گوزاری خوا رازیی‌کەر ، پێ بگەنەوە .. ئەوانەی کە ئەزانن دنیا دوو رۆژە و ، پێویستە سەربەرزیی قیامەتی پێ بکڕێ ..

**نۆهەم : مژدەی هاتنی پێغەمبەر ﷺ**

لە صەحیحی بوخاریی‌دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( نحن معاشرَ الأنبياء إخوة لعلاَّت ، ديننا واحد )) . فەرموویە : ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران برای یەکترین ، یەك دینمان هەیە ..

بەڵێ ، هەموو پێغەمبەران یەك دینیان هەیە و ، هەر هەموشیان پشتگیریی لە یەکتریی ئەکەن ، چونکە خوای گەورە هەموویانی بۆ یەك مەبەست رەوانە کردووە ، کە بریتی‌یە لە هیدایەت‌دانی ئادەمی‌یەکان تا خوای خۆیان بناسن و بە جوانیی بی‌پەرستن ، تا لە قیامەت‌دا سەرفراز بن و بە هەمیشەیی بەختەوەر بن . ئەوەتا قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە دینی پێغەمبەران یەکێکە و لە بنەڕەت‌دا جیاوازی‌یان نیە :

﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ۚ ﴾ ( الشورى : ١٣ ) .

بەڵام دینی هەر پێغەمبەرێك بە پێی ئاڵ و گۆڕی زەمانە و ، پێویستیی کۆمەڵ روون کراوەتەوە ، وەك قورئان ئەفەرموێ : ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ ﴾ ( المائدة : ٤٨ ) .

لە لایەکی ترەوە خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی رەوانە کردبێ بەڵێن و پەیمانی لێ وەرگرتووە کە ئەگەر لە سەردەمی ئەودا هەر پێغەمبەرێکی خوا دەستی بە بانگەواز کرد بەبێ دواکەوتن ئیمانی پێ بهێنێ و کۆمەکیی و پشتیوانیی بکات ، وەك قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّۦنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾ ( آل عمران : ٨١ ) .

جا كە پێغەمبەران سەلامیان لێ بێ ئەمە ئەركی سەر شانیان بێت ، ئەوا پێویستە خەڵكیی چاكتر ملكەچیی حەق بن و بە پاكیی شوێنی بكەون ، ئەویش بە ئیمان‌هێنان بە هەر پێغەمبەرێك كە بە بەڵگەی رێك و پێك پێغەمبەرایەتیی خۆی بسەلمێنێ ..

جا پێغەمبەری ئاخر زەمانیش ﷺ ئەوەندە بەڵگە و نیشانەی زۆری هەن لەسەر راستیی و پاكیی پەیامەكەی ، كە هیچ پێغەمبەرێكی تر نەی‌بوون ، چونكە دینەكەی ئەم دینی كامڵ و ، دینی هەتا هەتایی و ، دینی ئاخرزەمانە كە هیچ شەریعەت و دینێكی تر نەسخی ناكاتەوە ..

ئەوەبوو پێغەمبەرانی پێش ئەم ، سەلامیان لێ بێ ، بە تایبەت مووسا و عیسا ، مژدەیان بە هاتنی دابوو . ئەو مژدانەش هەر هەموویان لە تەورات و ئینجیل‌دا تۆمار كراون و زاناكان لێیان ئاگادارن و ، چاك ئەزانن كە ئەم پێغەمبەری ئاخرزەمانە ﷺ فەرمان بە چاكە ئەكات و ، دوورەپەرێزیی لە خراپە ئەكات و ، هەرچیی شتی پاكە بۆیان حەڵاڵ ئەكا و ، هەرچییش پیسە لەسەریان حەرام ئەكا و ، ئەو بارە قورسانەش كە لە سەرشانیان بوو لەسەریان لا ئەبا . جا هەركەسێ شوێنی ئەو ئازیزە بكەوێ و ، كۆمەكیی و پشتیوانیی لێ بكا و ، شوێن ئەو نوورە بكەوێ كە بۆی هاتووە ، ئەوا سەركەوتوو ئەبێ ، وەك قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ ۙ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ ( الأعراف : ١٥٦ ــ ١٥٧ ) .

دیسان قورئانی پیرۆز رێ لە نەصارا ئەگرێ كە لەبەر دەم پەیامی پێغەمبەری ئاخرزەمان‌دا ملەجەڕێ ئەكەن و ، ئەی‌دا بە گوێ‌یان‌دا كە حەزرەتی عیسا خۆی مژدەی ئەوەی داوە ، كەچیی وا ئەوان بەڵگە روون و ئاشكراكانی ئەبینن و لەگەڵ ئەوەش‌دا ئیمان ناهێنن و بە سیحری لە قەڵەم ئەدەن ، كە ئەوپەڕی نەفامیی و نامەردیی‌یە ، قورئان لەو بارەوە ئەفەرموێ :

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ ( الصف : ٦ ) .

جا هەرچەندە گاور و جوولەکە دەستکارییەکی زۆری تەورات و ئینجیلیان کردووە ، بە تایبەت لەو شوێنانەدا کە ناونیشانی پێغەمبەری ئاخرزەمان هاتووە، کەچیی هێشتا بەڵگە و مژدەی زۆر ماون کە بێسەلمێنن موحەممەد ﷺ ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوەیە کە مژدەی هاتنیان داوە ..

لە تەوراتدا مژدەیەك لەسەر زمانی حەزرەتی مووسا سەلامی خوای لێ بێ هاتووە ئەڵێت : (( أقيم لهم نبياً من وسط إخوتهم مثلك ، وأجعل كلامي في فمه ، فيكلمهم بكل ما أوصيه به )) . ( سفر تثنية الإشتراع الإصحاح ١٨ الفقرة ١٨ ) .

ئەمە بە جوانیی دەری ئەخات کە مەبەست لەو پێغەمبەرە موحەممەدی ئازیزمانە ﷺ و ، مەبەست بە ( إخوتهم ) نەوەکانی ئیسماعیلە سەلامی لێ بێ . ئیتر لە نێوان مووسا و عیسادا چەند پێغەمبەرێك یەك لە دوای یەك هاتوون یەکێکیان دەری نەبڕیوە کە ئەو پێغەمبەرەیە کە لە مژدەکەی سەرەوەدا ناونیشانی هاتوون و ، هەرچیی پێغەمبەریش بەدوای مووسادا هاتوون و هەوڵیان داوە شەریعەتەکەی ئەو جێبەجێ بکەن ، هیچ کامیان لەو پێغەمبەرە ناچن .

لە کۆتایی ( سفر التثنية )ش دا دەقێکی تر دەری بڕیوە کە لەناو بەنی ئیسرائیل دا پێغەمبەری وەك ئەو پێغەمبەرە هەڵ نەکەوتووە .

باسی پێغەمبەری ئاخرزەمان لەناو جوولەکەدا یەکجار باسێکی بڵاو و زانراو بوو ، کە خوێندەوار و نەخوێندەواریان ئەیزانیی و ، جوولەکەکان بەرە لەدوای بەرە چاوەڕوانی هاتنی بوون و ، هەموو نیشانەیەکیشی لەناو کتێبەکانیاندا نووسرابوون ..

بۆ پشت گیریی ئەم باسە با سەرنجی ئەم وت و وێژەی نێوان ( يوحنا المعمدان ) واتە یەحیای کوڕی زەکەریا سەلامیان لێ بێ و ئەوانەی کە هاتبوون بۆ لای تا پرسیاری لێ بکەن : تۆ چییت ؟ ئەویش دانی بە راستییدا نا و ، دەری بڕیی کە

مەسیح نیە . لێیان پرسیی : ئەی چییت ؟ ئیلیایت ؟ [٧٥] فەرمووی : من ئەو نیم. وتیان : ئەی ئەو پێغەمبەرەیت ؟ واتە پێغەمبەری ئاخرزەمان . وەڵامــی دایــەوە : نەخێر .. ( سفر يوحنا ـ الإصحاح الأول ، الفقرة ١٩ ـ ٢١ ) .

ئەمەی پێشەوە ئەوە دەرئەخات کە جوولەکە بە یەقینیی چاوەڕوانی دەرکەوتنی سێ پێغەمبەر بوون : یەکەمیان : ئیلیا ، کە چاوەڕوان بوون جارێکی تر لە سەر ئەم زەوییەدا دەربکەوێتــەوە و ، دووهەمیشــیان : مەســیح و ، سێهەمیشــیان : پێغەمبەری ئاخرزەمان ، کە ئەوەندە بە لایانەوە بــەناوبانگ بــوو بــە پێویســتیان نەئەزانی هیچ سیفەتێکی هەڵ بدەن ، بەڵکو تەنها ( ذلك الــنبي ) بــەس بــوو بــۆ ناساندنی .

جا لەو کاتەوە هەتا ئێستا لە هــیچ شــوێنێكدا کەســێك هــەڵ نەکــەوت ئــەوە دەربڕێ کە ئــەو پێغەمبەرەیــە کــە حــەزرەتی موسا ســەلامی لێ بــێ مــژدەی سەرهەڵدانی داوە ، جگە لە پێغەمبەری خۆمان ﷺ. کە ئــەوەبوو ئــەو ئاگــای لــە هیچ شتێك نەبوو قەشە و راهیبەکانی شام و دوورگــەی عــەرەبیی ، بگــرە وڵاتــی یەمەنیش ، چاوەڕوانی ئەوە بوون پێغەمبەری ئاخرزەمان سەر هەڵ بدات و ، لەناو خەڵكدا سیفەتەکانیان هەڵ ئەدا و ، دەریشیان ئــەبڕیی کــە کــاتی هــاتنی نزیــك بۆتەوە ..

دەی مادام کەسێکی تر نەهات ئەم کارە رابگەیەنێ .. هەروەها کەسێك نەهات کتێبێکی بۆ بێت و بانگی سەرزەویی بکا بۆ موسڵمان بوون جگە لــە ئازیزمــان ، کە ئەوەبوو کۆمەڵی موسڵمانی بە چاكترین و پاكترین شێوە بەرپا کــرد و ، پــاك ترین و عــەدالەتترین دەوڵەتیشی دامەزراند و ، لەو کاتەشەوە هەتا ئێستا مرۆڤە پاکەکان را ئەکێشێ و ، بە ئامۆژگاریی دینە پاکەکــەی پــەروەردەیان ئــەکات و ، پاكترین مرۆڤی سەرزەوییش هەمیشە هەڵگرانی ئایینەکەی ئــەم بــوون ، کەواتــە ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوە موحەممەدی خۆشەویستمانە .

لە لایەکی ترەوە لە دوای حەزرەتی موسا هیچ پێغەمبەرێکی تــر وەك مووســا خاوەنی شەریعەتی سەربەخۆ نەبووە جگە لە پێغەمبەری خۆمــان . کەواتــە تــەنها ئەم لە موسا نەچێت .

---

[٧٥] ئیلیا یەکێکە لە پێغەمبــەرەکانی بەنی ئیســرائیل کە لە دەوروبەری ( ٨٨٠ ـ ٨٥٠ پ . ز ) دا ژیاوە . ( المنجد في الأعلام ) .

هەروەها مژدەیەکی تر لە تەوراتدا هاتووە کە ئەڵێت : (( جاء الرب من سيناء، وأشرق لهم من ساعير ، وتلألأ من جبل فاران )) . ( تثنية الإشتراع الإصحاح ٢٣ الفقرة ١ ) .

جا لە سیناوە هاتن ئاماژەیە بۆ هاتنی مووسا و ، هەڵهاتنیش لە ساعیرەوە ئاماژەیە بۆ هاتنی عیسا و ، درەوشانەوەش لە کێوی فاران ەوە ئاماژەیە بۆ هاتنی موحەممەدی پێغەمبەرمان ﷺ ، چونکە تەورات خاکی حیجاز ( مەککە ) ی بە فاران ناو بردووە .

هەروەها مژدەیەکی تریش دەری ئەبڕێ کە وڵاتی عەرەب ئەو خاکەیە کە پێغەمبەری ئاخرزەمانی تیا هەڵ ئەکەوێ و ، باسی کۆچ کردنیشی تێدا هاتووە ، کە لە مێژوودا هیچ کۆچێکی تر وەك کۆچی ئازیزمان لە مەککەوە بۆ مەدینە ناوبانگ و گرنگیی بۆ خۆی نەپچڕیوە ، کە باس لە کۆچی ئەوانە ئەکات کە لە دەست شمشێری زاڵمان هەڵاتوون و ، دانیشتوانی خاکی تەیماش هەڵ ئەنێ تا غیرەت بیان گرێ و ئاو و نان پێشکەش بە لێقەوماو و هەڵاتووان بکەن ، بە تایبەت موحەممەد پێغەمبەر کە شەوی کۆچ کردنی کۆمەڵێ شمشێر بەدەستی دڵ ڕەق لە پشت دەرگای ماڵەکەیەوە وەستا بوون و بە تەما بوون هێرش بەرنە سەری و بێ ڕەحمانە بی کوژن :

(( وحي من جهة بلاد العرب ، في الوعر من بلاد العرب ، تبيتين يا قوافل الدادانيين ، هاتوا ماء لملاقاة العطشان ، يا سكان أرض تيماء وافوا الهارب بخبزة ، فإنهم من أمام السيوف قد هربوا ، من أمام السيف المسلول ، ومن أمام القوس المشدودة ، ومن أمام شدة الحرب )) . ( أشعيا الإصحاح ٢ الفقرة ١٣ ـ ١٥ ) .

جا پێش هاتنی وەحی و پێش کۆچ کردنی پێغەمبەری خواش ﷺ بۆ مەدینە ، جوولەکەکان هەر کە لەگەڵ عەرەبەکانی مەدینەدا بجەنگانایە ، هەواڵیان ئەدانێ کەوا کاتی هاتنی پێغەمبەرێك نزیك بۆتەوە ، کە پشت گیریی جوولەکە ئەکا و ، ئەمانیش شوێنی ئەکەون و ، ئەبنە سوپای ئەو پێغەمبەرە و ، بە وێنەی عاد و ئیرەم کوشتاریان ئەکەن .

کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی خوای بڵاو کردەوە ، جوولەکە بە دڵیان نەبوو ، چونکە بە تەما بوون ئەو پێغەمبەرە لە خۆیان هەڵ بکەوێ و پێیان ناخۆش بوو پێغەمبەرایەتیی لەوان بسەنرێتەوە ، بۆیە کەوتنە دژایەتیی و بەگژداچوونی . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ ( البقرة : ٨٩ )

هەروەها ئینجیلیش مژدەی بە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ داوە . هەتا ئەو ئینجیلانەی کە ئەمڕۆ هەن ، ئەگەرچیی ـ بە شاهێدیی زانا نەصرانییە راستگۆکان ـ دەستکاریی کراون ، هێشتا بەڵگە و مژدەی زۆریان تێدا ماون .

بۆ نموونە لە ئینجیل ( یوحنا )دا هاتووە ، کە یەسووع فەرموویە : (( إن كنتم تحبوني فاحفظوا وصاياي ، وأنا أطلب من الآب فيعطيكم معزياً آخر ليمكث معكم إلى الأبد ، روح الحق ، الذي لا يستطيع العالم أن يقبله ، لأنه لا يراه ، ولا يعرفه ، وأما أنتم فتعرفونه لأنه ماكث معكم فيكون فيكم )) . ( يوحنا الإصحاح ١٤ الفقرة ١٥ ـ ١٧ ) .

هەروەها ئەفەرموێ : (( وأما المعزي الروح القدس الذي سيرسله الآب باسمي ، فهو يعلمكم كل شيء ، ويذكركم بكل ما قلته لكم )) . ( يوحنا ١٤ : ٢٦ ) .

هەروەها ئەفەرموێ : (( ومتى جاء المعزي الذي سأرسله أنا إليكم من الآب ، روح الحق الذي من عند الله الآب ينبثق فهو يشهد لي )) . ( يوحنا ١٥ : ٢٦ ) .

هەروەها فەرموویە : (( لكني أقول لكم الحق إنه خير لكم أن أنطلق ، لأنه إن لم أنطلق لا يأتيكم المعزي ، ولكن إن ذهبت أرسله إليكم )) . ( يوحنا ١٦ : ٧ ) .

دیسان فەرموویە : (( إن لي أموراً كثيرة أيضاً لأقول لكم ، ولكنكم لا تستطيعون أن تحتملوا الآن ، وأما متى جاء ذاك روح الحق فهو يرشدكم إلى جميع الحق )) . ( يوحنا ١٦ : ١٢ ، ١٣ ) .

ئەم مژدانە هەر هەموویان دەقن و هەواڵی هاتنی پێغەمبەری ئاخرزەمان ئەگەیەنن .. بەڵام زاناکانی نەصارا هەمیشە هەوڵیان داوە لە مەبەستی خۆیان لایان پێ بدەن .. هەوڵیان داوە حەزرەتی عیسا خۆی بگرنەوە . بەڵام کە ئەو فەرموویە : (( إن لم أنطلق لا يأتيكم المعزي )) . ئەفەرموێ : هەتا من نەڕۆم پێغەمبەری ئاخرزەمان نایەتە ناوتان .

لە سەرەتاوە ناوی پێغەمبەری ئاخرزەمان لە ئینجیلدا بە ( البارقليط ) هاتووە، بەڵام کە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبیی هی وا هەیە بە ( المخلص ـ رزگارکەر ) و هی واش هەیە بە ( المعزي ـ دڵ دەرەوە ) تەفسیری کردووە ..

مامۆستای بەڕێز عبدالوهاب النجار دەربارەی مانای ( البارقليط ) پرسیار لە خۆرهەڵات ناسی ئیطالیی ( نلینۆ ) ئەکات ، کە لە ئادابی زمانی یۆنانییدا دکتۆرای هێناوە و لە زانکۆی میصردا وانەی ئەوتەوە . ئەویش ئەڵێت : قەشەکان ئەڵێن : ئەم وشەیە مانای ( المعزي ) ئەگرێتەوە . مامۆستا پێی ئەڵێ : من پرسیار لە دکتۆر نلینۆ ئەکەم ، کە لە ئادابی یۆنانیی کۆندا دکتۆرای هێناوە ، نەك لە قەشەیەك ! نلینۆ ئەڵێت : مانای ئەم وشەیە ئەو کەسە ئەگرێتەوە کە سوپاسی زۆری کرا بێ .

مامۆستا ئەڵێ : ئایا ئەمە لەگەڵ مانای ( أفعلَ ) ی تفضیلی فیعلی ( حَمِدَ ) دا رێکە ؟ ( واتە (( أحـمد )) ) . ئەڵێ : بەڵێ . ( قصص الأنبياء ــ مبحث بشارة عيسى بالنبي : ٤٧٣ ) .

لە لایەکی ترەوە وشەی ( فارقليط ) لە ( بيركلـي طـوس )ی لـەفزە یۆنانیـیە بنەڕەتییەکەیەوە هاتووە کە لە مانای موحەممەد یان ئەحمەدەوە نزیکە .

زیاد لە ئینجیلەکانی تر ئینجیل بەرناباش ، کە لەم دواییەدا کەوتەوە روو و، دەمێك بوو شاررابوویەوە ، پڕیەتی لە مژدە بە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

بەڵێ ، پێش هاتنی وەحی لـە هـەموو لایەکـەوە حیـبر و راهیبـەکان بڵاویـان کردبوویـەوە کـە لـەناو عـەرەبەکـان دا پێغەمبـەرێك بـەم زوانـە دەسـت بـە بڵاوکردنەوەی دینی خوا ئەکات . یەکێ لەوانە ئەو قەشەیە بوو کە هاوەڵی سەلمانی فارسیی بوو خوا لێی رازیی بێ و ، پێی وتبوو :

سەلمان ! خوای گەورە لە نێوان چیاکانی توهامەدا ، واتە حیجاز ، پێغەمبەرێك ئەنێرێت کە ناوی ئەحمەدە و ، نـاونیـشـانی ئەوەیە کە ( هـەدیـە ) ئەخـوات ، بـەڵام ( صەدەقە ) ناخوات ..

ئەمـەش یـەکێ بـوو لـەو هۆیانـەی کـە پاڵیـان بـە سـەلمانەوە نـا ، دوای تاقییکردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، موسڵمان ببێ ..

هـەروەها هـەواڵ دانـی جوولەکـەکان بـە هـاتنی پێغەمبـەری ئاخرزەمـان و هەڕەشەکردنیان لە ئەوس و خەزرەج ، پاڵی بە ئەوس و خەزرەجەوە نـا تـا دەسـت پێشیی بکەن و خێرا موسڵمان بن ، بەر لەوەی جوولەکە پێی بـزانن و موسـڵمان بن .

سەلەمەی کوڕی سەللامەی کوڕی وەقش خوا لێی رازیی بێ ، کە یەکێ بووە لە هاوەڵانی بەدر ئەڵێت : لە گەڕەکی نەوەی عەبدولئەشهەلدا دراوسێیەکی جوولەکەمان هەبوو ، رۆژێکیان ـ کەمێك پێش بە پێغەمبەربوونی پێغەمبەر ﷺ ـ لە ماڵەکەی خۆی هاتە دەرەوە و لەسەر کۆڕەکەی نەوەی عەبدولئەشهەل وەستا . سەلەمە ئەڵێت : ئەو رۆژە من بچوکترین کەسی کۆڕەکە بووم و ، عەبایەکم لەسەر شان بوو و لە پەنای ماڵی خۆمان دا راکشابووم . باسی زیندووبوونەوە و قیامەت و حیساب و میزان و بەهەشت و ئاگری کرد . ئەمەی بە کۆمەڵێك ئەهلی شیرك و بت پەرست ئەوت ، کە بڕوایان نەبوو دوای مردن زیندووبوونەوەیەك هەبێت .

وتیان : ماڵت کاول بێ ، فلانە کەس ! تۆ وای ئەبینیی کە ئەو خەڵکە دوای مردنیان زیندوو بکرێنەوە بۆ دنیایەك کە بەهەشت و ئاگری تێدا بێت و ، لەسەر کردەوەکانیان پاداشت وەر بگرنەوە ؟ وتی : بەڵێ ، بەو کەسەی کە سوێندی پێ ئەخورێ ، هەر یەکە ئاوات ئەخوازێ کە لەم دنیادا لە بری ئەو ئاگرە ، گەورەترین تەنووری بۆ گەرم بکەن و ، بیخەنە ناوی و ، دەرگای لەسەر دابخەن ، بەو مەرجەی لە سبەی رۆژدا لەو ئاگرە رزگاری ببێ ..

پێیان وت : ماڵت کاول بێ ، نیشانەی ئەمە چییە ؟

وتی : نیشانەی ئەمە رەوانەکردنی پێغەمبەرێکە لە دەوروبەری ئەم وڵاتەدا .. دەستیشی بەرەو مەککە و یەمەن درێژ کرد ..

وتیان : دەی کەی ئەیبینین ؟

سەلەمە ئەڵێت : سەیری منی کرد ، کە لە هەموویان منداڵتر بووم و وتی : تەمەنی ئەم منداڵە بەسەر ناچێ فریای ئەکەوێ .

سەلەمە ئەڵێت : دە بەخوا زۆری پێ نەچوو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ﷺ رەوانە کرد و ، کابرای جوولەکەیش لەناومان دا زیندوو بوو و ، ئێمە ئیمانمان هێنا ، کەچیی ئەو بە زوڵم و حەسوودیی رێگای کوفری گرتە بەر . وتمان : ماڵت کاول بێ فلانە کەس ! ئەی تۆ نەبوویت باسیت بۆ کردین ؟ وتی : بەڵێ . بەڵام ئەو نییە . [76] ( صحيح السيرة النبوية ، إبراهيم العلي : ٣١ ) .

[76] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٢١٤ ـ ٢٥٤ ، الرحيق المختوم : ٥٩ ـ ٦٢ ، السيرة النبوية للندوي : ١١٠ ـ ١١٢ ، سيرة إبن هشام : ١ / ٢٣١ ، السيرة النبوية للصلابي : ٦٢ ـ ٧٠ .

جا وا زیاتر لە هەزار ساڵ بەسەر ئەو مژدانەدا تێپەڕیی و جگە لە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ کەسێکی تر نەهات و پێغەمبەرایەتیی رابگەیەنێ و خەڵك بڕوای پێ بکەن و ، دینەکەی ببێتە دینی مرۆڤ و ، مرۆڤایەتیی رزگار بکات . هەروەها جگە لە قورئانیش لە ئاسمانەوە کتێبێکی تر نەهاتە خوارەوە تا مرۆڤەکان بڕوای پێ بکەن و وەك قورئان پیرۆز بێ و شوێن فەرمانەکانی بکەون ..

دەی ئەگەر بڕوانەکردنی گاور و جوولەکەکانی ئەو سەردەمە بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەدی پێشەوامان ﷺ ، کە نەوەکو ئەو پێغەمبەرە نەبێت کە مووسا و عیسا سەلامیان لێ بێ مژدەی هاتنیان داوە ، ئەگەر بڕوانەکردنیان تا رادەیەك چاوی لێ بپۆشرێ لەو رۆژەدا ، ئەی ئەو گاور و جوولەکانەی ئەمڕۆ ئەبێ وەڵامیان چیی بێ ؟

ئایا ئەگەر مووسا و عیسا بەڵێنەکەیان نەهاتۆتە دیی ، دەی چۆن بڕوایان پێیان ئەمێنێ ؟

خۆ ئەگەر ئەو بەڵێنە لە غەیری موحەممەددا ﷺ هاتۆتە دیی ، دەی کوا ؟

خۆ ئەگەر هاتۆتە دیی و موحەممەد راستی فەرمووە ، ئەی چۆن ئیمانی پێ ناهێنن ؟ خۆ دیارە هەرکەسێ ئیمان بەو بەڕێزە نەهێنێ ئەوا ئیمانیشی بە مووسا و عیسا نامێنێ ، چونکە وەسیەت و مژدەکەی ئەوانی پشت‌گوێ خستووە ..

**دەهەم : چاوەڕوان نەبوون**

لەمەو بەر بە درێژە باسی سەردەمی پێش هاتنی وەحیمان بۆتان کرد .. خەڵکێکی زۆر چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەری ئاخرزەمان بوون و ، هەندێکیش لەوانە ـ وەك بەحیرای راهیب ـ هەندێ ناونیشانیان بۆ دەرکەوتبوو ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کات بە تەمای وەحیی و پەیام و کتێب نەبوو کە خوای گەورە بە سۆز و بەزەیی خۆی پێشکەشی بکات .. بەڵام هەستی بە شڵەژاویی ئەکرد و نەیشی ئەزانیی سەرچاوەکەی لە کوێوەیە .

ئەوەتا قورئانی پیرۆز ئەو شاهێدیە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدات .. ئەوەتا قورئان دەری ئەبڕێ کە موحەممەد ﷺ ئاگای لە کتێب و لە ئیمان نەبووە :

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ ( الشورى : ٥٢ ) .

﴿ وَمَا كُنتَ تَرۡجُوٓاْ أَن يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبُ إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرٗا لِّلۡكَٰفِرِينَ ﴾ ( القصص : ٨٦ ) .

حیکمەتی خوای گەورەش وەها بوو کە هەڵ بژاردەکەی نەخوێندەوار بێ ، تا لە هەموو گومانێك بەدوور بێت :

﴿ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴾ ( العنكبوت : ٤٨ ) .

﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ ﴾ ( الأعراف : ١٥٧ ) .

# بەشی نۆهەم
# هاتنـــی وەحـــی

**یەکەم : ماوەی گۆشەگیریی**

تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ نزیکی چل ساڵیی بوویەوە و ، سەرزەوییش لە ژیان و گوزەرانێکی تاڵدا بوو .. مرۆڤایەتیی بە دەست زوڵم و ستەمەوە بەرەو هەڵدێر ئەچوو .. بە وردیی سەرنجی حاڵ و هەڵس و کەوتی خزمەکانی ئەدا .. ئەو بیر و هەستەیانی بە دڵ نەبوو .. لە نەفامییدا نوقوم بوو بوون .. بتپەرستیی ژیانی تاڵ کردبوون .. تاریکایی و بەدبەختیی مرۆڤیان چارەڕەش کردبوو .. وەك دەستێکی ئەمین پاڵی پێوە بنێ حەزی لە تەنیایی و گۆشەگیریی ئەبوو .. حەزی لەوە بوو لە کەس وکاری کەنار بگرێ ، تا دەروونی بحەسێتەوە و ، دڵی بگەشێتەوە و ، کەمێك سەرنجی گەردوون بدات ، تا دەست ڕەنگینیی خوای بەدییهێنەری بۆ دەربکەوێ .. تا دەسەڵات و هێز و حیکمەت و توانای پەروەردگاری بۆ دەربکەوێ ..

ئەوەبوو لە مەککە دەرئەچوو و دوور ئەکەوتەوە ، هەتا خانووەکان تەواو ئەبوون و ئەگەیشتە چەم و شیوەکانی مەککە .. لەو کاتەدا بەلای هەر بەردێك و درەختێکدا تێپەڕی بکردایە پێی ئەوت : (( السلام علیك یا رسول الله ! )) . کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ڕاست و چەپدا و بۆ دواوە ئاوڕی ئەدایەوە جگە لە دارودرەخت و بەردەکان هیچی تری نەئەدیی ..[77]

هەروەها لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( إني لأعرف حجراً بمكة ، كان يُسلِّم عَلَيَّ قبل أن أبعثَ ، إني لأعرفـــه الآن )) .[78] فەرموویە : لە مەککەدا بەردێك ئەناسمەوە کە پێش ئەوەی بکرێمە پێغەمبەر سەلامی لێ ئەکردم . ئێستە ئەیناسمەوە .

---

[77] سيرة إبن هشام : ١ / ٢٣٤ _ ٢٣٥ .

[78] صحيح مسلم برقم ( ٢٢٧٧ ) ، عن جابر بن سمرة رضي الله عنه .

سەرەتای هاتنی وەحی بە خەوی ڕاست دەستی پێ ئـەکرد کـە هەرچـی خـەوی ئەبینی بـە جـوانـیی ئەهـاتـە دیی ، وەك لە فەرموودەکەی عائیشەدا خـوا لێـی ڕازیی بێ هاتووە .[٧٩]

ئەوەبوو سەویق و ئاوی لەگەڵ خۆیدا ئەبرد و ، ئەچوو بۆ ئەشـکەوتی ( حراء ) لە چـیای ( نـــور ) ، کـە نزیکـەی دوو تـا ســێ میـل لـە مەککـەوە دوورە و ، ئەشکەوتێکی ڕێك و پێکە و ، درێژیی‌یەکەی چـوار بـاڵ و ، پانیەکەشـی باڵێـك و سێ‌چـارەکی باڵێك ئەبێ و ئەکەوێتە لای چـەپی ئـەو کەسـەوە کـە بـەرەو مینـا ئەڕوات .. دەرگای ئەشکەوتەکە ئەوەندە ئەبێ کە پیاوێکی قەڵەو بتـوانێ لێـیـەوە بچێتە ژوورەوە .. لە ناوەوەش ئەوەندە بەرزە کە پیاوی باڵابـەرزی تێـدا بـە پێـوە بوەستێ و ناوەکەشی جێی دانیشتن و نوێژکردنی چەند پیاوێکی تێدا ئەبێتەوە .

ئەشکەوتەکە لە شوێنێکی وەهادایە کە مرۆڤ بیر بکاتەوە و سەرنج بدات و ، تا چاویش کار بکـات چـیاکان دیـارن و ، هـەر ئـەڵێی سـەجدەیان بـۆ گـەورەیی و دەسەڵات‌داریی خوا بردووە ..

کاتێ کە پێغـەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بۆ ئـەوێ ئـەبرد مـاڵ و منداڵەکەشـی لەگەڵ خۆیدا ئەبرد و لە نزیك خۆیدا ئەبوون و ، مانگی ڕەمەزان لەوێ ئەمایـەوە و ، هەر هەژارێك لەوێوە گوزەری بکردایە نان و خواردنی پێشکەش ئەکرد .. ئیتر لەوێ کاتی بە خواپەرستیی و بیرکردنەوە لە دیـاردە گەردوونی‌یـەکانی دەوروبـەری بەسەر ئەبرد و ، بیری لەو دەسەڵاتە ڕەهایەی پەروەردگار ئـەکردەوە کـە ئاسمـان و زەویی بەدیی هێناوە .. لەولاشەوە خزمـەکانی سـەرگەردان بـوو بـوون و بتێکـی بێ‌کەڵك و بێ‌زیانیان ئەپەرست و، ئەمیش نەخشـەیەکی بـە دەسـتەوە نـەبوو تـا چارەسەری بارەکەیان بۆ بکات ..

کە ماوەی تەنیایی و گۆشەگیریی تەواو ئەکرد ئەگەڕایـەوە مەککـە و ، یەکـەم جاریش بەر لەوەی بچێتەوە ماڵەوە ، سەرێکی لە کەعبەی پیرۆز ئـەدا و ، حـەوت جار ، یان چەندێ خوای گەورە ویستی لەسەر بوایە ، طـەوافـی ئـەکرد و ، پاشـان ئەگەڕایەوە ماڵەوە . بۆ ئەم گەشتە ڕۆحی‌یەی خاتوو خەدیجەی هاوسەری کۆمەکیی ئەکرد و ، خواردن و پێویستیی بۆ ئامادە ئەکرد . ئیتر ئەوەبوو لەسەر ئەم کـارەی بەردەوام بوو هەتا خوای گەورە وەحی بۆ نارد .

---

[٧٩] البخاري رقم ( ٣ ) ، ومسلم رقم ( ١٦٠ ) ، وأحمد : ٦ / ٣٣٣ .

ئەم تەنیایی و گۆشەگیرییەی ئازیزمان ﷺ ـ کە سێ ساڵ پێش هاتنی وەحی بوو و ، خواپەرستییەکەشی بە پێی دینی پاك و خاوێنی ئیبراهیم خەلیل و، بە پێی فیطرەی بێگەردی بۆ خوای گەورە ملکەچ بوو ـ نەخشەی خوای گەورە بوو تا خۆشەویستەکەی ئامادەی هەڵ گرتنی سپاردە گەورەکە بکات .. تا مرۆڤایەتیی رزگار بکات .. تا رەورەوەی مێژوو بگۆڕێ .. تا فرمێسکە بە ناڕەوا رژاوەکانی سەرزەویی وشك بکاتەوە ..

**دووەم : هاتنی وەحی**

کاتێك کە تەمەنی پێغەمبەری خواﷺ گەیشتە چل ساڵیی ، کە تەمەنی کامڵی پیاوانە و ، وتراویشە کە پێغەمبەران لەو تەمەنەدا وەحییان بۆ هاتووە ، خوای گەورە وەحی بۆ نارد ، ئەمەش لە مانگی ( ربیع الأول ) دا ، کە ئەوەبوو سەرەتای وەحی بە خەوی راست دەستی پێکرد . ئەوەبوو هەر خەوێکی ئەدیی ئەهاتە دیی ، دیارە خەوی پێغەمبەرانیش وەحییە .. ئەمە شەش مانگی خایاند، هەتا ئەوەبوو جیبریلی ئەمین وەحی قورئانیی لە حەڤدەی رەمەزانی ساڵی چل و یەکەمی لەدایك بوونی ئازیزدا بۆ هێنا ، [٨٠] کە بەرامبەر بە شەشەم رۆژی ئابی ساڵی ٦١٠ ز بوو ، بۆ ئەمە قورئانی پیرۆز ئەفەرموێ :

﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴾ ( الأنفال : ٤١ ) .

---

[٨٠] لە ( الرحیق المختوم ) دا هاتووە کە لە رۆژی دووشەممەی بیست و یەکەم رۆژی مانگی رەمەزان دا بووە ، کە بەرامبەرە بە ١٠ ی ئابی ساڵی ٦١٠ ی ز ، ئەو کاتەش تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ چل ساڵی قەمەریی و شەش مانگ و دوانزە رۆژ بووە کە دەکاتە نزیکەی سیی و نۆ ساڵی شەمسیی و سێ مانگ و دوانزە رۆژ . بەڵام ئەو ئایەتەی سوورەتی ( الأنفال ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە حەڤدەی رەمەزان دا بووە و شەوی قەدری ئەو ساڵەش لە حەڤدەدا بووە .

لە لایەکی ترەوە دانەری بەڕێزی ( الرحیق المختوم ) بە شێوەیەکی زانستیانە بۆی دەرکەوتووە کە دووشەممەی رەمەزانی ئەو ساڵە ئەکەوێتە بیست و یەکی رەمەزانەوە و ، بە بۆنەی ئەو فەرموودەشەوە کە دەری ئەبڕێ هاتنی وەحی لە دووشەممەدا بووە، کەواتە لە بیست و یەكدا وەحی بۆ هاتووە . فەرموودەکەش لە ئەبوقەتادەوە ریوایەت کراوە کە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کراوە دەربارەی رۆژووی دووشەممە ، ئەویش فەرموویە :(( فیه ولدتُ ، وفیه أنزل علي )) . ( صحیح مسلم :١ / ٣٦٨ ، أحمد : ٥ / ٢٩٧ ، ٢٩٩ ، البیهقي : ٤ / ٢٨٦ ، ٣٠٠ ، الحاکم : ٢ / ٦٠٢ .

(( وما أنزلنا على عبدنا يوم الفرقان يوم التقى الجمعان )) ئەوە ئەگەیەنیٚ لە حەڤدەی رەمەزان‌دا وەحی بۆ هاتووە ، چونکە بە یەك‌دەنگیی موسڵمانان جەنگی بەدر لە حەڤدەی رەمەزانی ساڵی دووهەمی کۆچیی‌دا بووە ..

سەرەتا پێنج ئایەتی پیرۆزی سوورەتی ( إقرأ ) هاتنە خوارەوە :

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۝٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۝٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴾ ( العلق : ١ ـ ٥ ) .

ئەوەشمان لە یاد بیٚ کە عیلم و زانست دوو جۆرە : زانستیٚکی ( کسبي ) کە ( علم بالقلم ) ئاماژەی بۆ ئەکات و ، زانستیٚکی ( وهبي )ش کە ( علم الإنسان مالم يعلم ) ئاماژەی بۆ ئەکات کە زانستی پیٚغەمبەرانیش یەکیٚکە لەو جۆرە زانستە .

جا هاتنە خوارەوەی ئەم پیٚنج ئایەتە پیرۆزە بە یەکەم رۆژی پیٚغەمبەرایەتیی و هاتنی وەحی ئەژمیٚرریٚت ..

بە سەرنج‌دانی ئەم ئایەتانە کە سەرەتای هاتنی وەحین و ، وا یەکسەر باسی خویٚندن و قەڵەم و زانست ئەکەن ، فەیلەسووف و زانا و میٚژوونووسان یەکجار سەرسامن .. چونکە پیٚغەمبەری خوا ﷺ خۆی نەخویٚندەوار بووە و ، کۆمەڵەکەشی کۆمەڵیٚکی نەخویٚندەوار بووە ، کە قەڵەم تیایا زۆر دەگمەن بووە و ، ژمارەی خویٚندەوارانیش لە ژمارەی پەنجەکانی دەست زیاتر نەبوون . ئەمەش بە راستیی ئەوە ئەگەیەنیٚ کە ئەم قورئانە پیرۆزە شویٚن‌کەوتووانی بۆ خویٚندەواریی هەڵ ئەنیٚ و ، ئاواتی پیٚشکەوتن و حەسانەوەی مرۆڤە .. کە ئەوەبوو سەرەنجامیش هەروا ئەرچوو ، کە بە ماوەیەکی کەم شارستانییەتیٚکی زانستیانەی بەرفراوان لەسەر زەویی‌دا بەرپا بوو کە هیچ گەل و نەتەوەیەکی تر هەڵمەتی وا پڕ خیٚر و بەرەکەتی بە خۆیەوە نەدیوە و ، ئەو هەڵمەتە موبارەکەش تا ئیٚستا هەر بەردەوامە و ، میٚشکە خویٚندەوارە پاکەکانی ئەورووپا رووناك ئەکاتەوە و ، مرۆڤە ماف خوراوە بیٚ‌کەسەکانی سەرزەوییش بەسەر ئەکاتەوە ..

وتمان ئەم رووداوە پیرۆزە لە مانگی رەمەزان‌دا بووە ، کە پیٚغەمبەری خوا ﷺ لە ئەشکەوتی ( حراء ) خەریکی خواپەرستیی بووە ، قورئانیش پشت‌گیریی ئەمە ئەکات کە ئەفەرمویٚ :

﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِیٓ أُنزِلَ فِیهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَیِّنَـٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ ﴾ ( البقرة : ١٨٥ ) .

هەروەها لە شەوی قەدریش‌دا بووە :

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَـٰهُ فِی لَیۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴾ ( القدر : ١ ) .

جا زانایان دەربارەی ( إنا أنزلناه ) دوو رایان هەیە : یەکەم : مەبەست لە هاتنە خوارەوەی قورئان هەموویەتی بۆ ئاسمانی دنیا ، پاشان لە ماوەی بیست و ئەوەندە ساڵ‌دا بە بەش بەش دابەزیوەتە خوارەوە سەر زەویی . دووهەم : مەبەست لە سەرەتای هاتنی قورئان بێت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ئەشکەوتی ( حراء ) دا خەریکی خواپەرستیی بوو ، بەمە شەوی قەدری ئەو ساڵە شەوی حەڤدەی رەمەزان بووە ..

ئەو شەوە شەوێکی موبارەك بووە :

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَـٰهُ فِی لَیۡلَةٖ مُّبَـٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِینَ ﴾ ( الدخان : ٣ ) .

جا وا خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران خوا لێی رازیی بێ ئەو رووداوە گرنگەمان بۆ ئەگێڕێتەوە .. رووداوێك کە رەورەوەی مێژووی گۆڕیی .. مرۆڤی ئازاد و رزگار کرد .. تەخت و تاراجی ستەمی لەناو برد .. سەر لە نوێ ژیانی پڕ رێزی مرۆڤانەی بینا کردەوە .. رەوشت‌بەرزیی بووە ترازووی هەڵسەنگاندن .. دەست‌پاکیی و دەم‌پاکیی و چاکەویستیی دەست‌مایەی مرۆڤی بەرێز بوون :

سەرەتا کە وەحی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات خەوی چاك یان راست بوو .. هەر خەوێکی ئەبینیی وەك سپێدەی بەرەبەیان ئەهاتە دیی .. پاشان ژیانی گۆشەگیریی بەلاوە خۆشەویست بوو .. ئەوەبوو لە ئەشکەوتی ( حراء ) دا بە تەنیا ئەمایەوە و، چەند شەوێك خەریکی خواپەرستیی ئەبوو ، بەر لەوەی بگەڕێتەوە ناو ماڵ و منداڵی و ، توێشوو لەگەڵ خۆی‌دا بەرێت ، پاشان ئەگەڕایەوە لای خەدیجە و توێشووی بۆ چەند شەوێکی تر هەڵ ئەگرتەوە ، تا ئەوەبوو لە ئەشکەوتی ( حراء ) دا بوو و ( حەق ) ی بۆ هات .. ئەوەبوو مەلائیکەتەکە هاتە لای و فەرمووی : بخوێنە .. ئەویش فەرمووی : (( ما أنا بقارىء )) . فەرمووی : من خوێندەوار نیم .. ئەفەرموێ : گرتمی و ، توند گوشیمی ، هەتا خەریك بوو هەناسەم لێ ببڕێ ،

پاشان بەری دام و ، فـەرمـووی : بـخوێنە ، منیش وتم : (( ما أنـا بقـاريء )) .
دیسان گرتمی و ، بۆ سێهەم جار گوشیمی ، پاشان بەری دام و فەرمووی :
﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۝٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۝٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴾ ( العلق : ١ - ٥ ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ بەو ئایەتانەوە گەڕایەوە و دڵیشی لە ترسانا ئەلەرزیی و ، چووە ژوورەوە لای خەدیجەی کچی خوەیلیـد خـوا لێـی رازیـی بێ و فـەرمووی : (( زَمِّلُونـي ، زملونـي )) . فەرمـووی : دام پۆشـن ، دام پۆشـن . دایان پۆشیی هەتا ترسەکەی لاچوو و ، بە خەدیجەی فەرموو ـ و رووداوەکەشی بۆ گێڕایـەوە ـ : لە خۆم ئەترسم ( واتە تووشی نەخۆشی‌یەك ببێت ) . خەدیجە وتی : نەخێر ، بەخوا هەرگیز خوا سەرشۆڕت ناکات .. تۆ سیلەی رەحم بە جێ دێنی و ، یارمەتیی لاواز ئەدەی و ، دەست‌گرۆیی بێ‌دەست ئەکەیت و ، نانی میوان ئەدەیت و ، یارمەتیی لێقەوماوان ئەدەیت . لـە هەنـدێ ریوایـەت‌دا هـاتووە : راسـتیی ئـەڵێیت . لـە هەندێکی تریش‌دا : ئەمانەت ئەپارێزی .[81]

[ دوای ئـەم دڵخۆشیی‌دانەوەیـەش مـژدەی دایە و پێی وت : ئامۆزا ! مـژدەت لێ بێ . بەو خوایەی کە گیانی خەدیـجەی بە دەستە هیوادارم ببیتە پێغەمبـەری ئەم ئوممەتە ! ][82]

خەدیجە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبات بۆ لای وەرەقـەی کـوڕی نەوفـەلی کـوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا کە ئامۆزای بووە و ، هەر لـە سـەردەمی نـەفامیی‌دا بوو بووە نەصرانیی و ، نووسینی عیبرانیی فێر بوو بوو و ، بە عیبرانیی چەندێ کە خوا ویستی لەسەر بوو ئینجیلی نووسی‌بوویەوە و ، پیاوێکی بە ساڵاچووی پیر بوو و کوێریش بوو بوو .. خەدیجە پێـی وت : ئـامۆزا ! گـوێ لـەم برازایـەت بگـرە . وەرەقەش پرسیی : کوڕی برام ! چییت دیوە ؟ پێغەمبـەری خـواش ﷺ چیی دیـی بـوو بۆی گێڕایەوە . وەرەقە وتی : ئەمە ئەو نێرراوەیە ( واتە : جیبریل ) کە خـوا

---

[81] ئەمە ئەوپەڕی رەوشت بەرزیی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرئەخات کە لە نەفامیی‌دا و پێش هاتنی وەحی ئەمە رەفتاری بووە . لەولاوە ژیریی خەدیجە دەرئەخات کە خاوەنی ئیمانێکی دامەزراو بووە بە خوا کە هەر کەس چاکەکار بێ خوا لە کارەساتی ناهەموار ئەیپارێزێ .

[82] سيرة إبن هشام : ١ / ٢٣٨ .

بۆ لای مووسای ناردووە .[٨٣] خۆزگە ئەو رۆژە گەنج بوومایە ، خۆزگە ئەو کاتەی کە قەومەکەت دەرت ئەکەن زیندوو بوومایە . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أو مخرجي هم ؟ )) فەرمووی : گوایە ئەوان دەرم ئەکەن ؟ وتی : بەڵێ ، هەر پیاوێ ئەمەی کە تۆ هێناوتە هێنابێتی ئەوا دژایەتیی کراوە و ، گەر ئەو رۆژەش بمێنم پشتیوانی‌یەکی چاکت لێ ئەکەم . ئیتر ئەوەندەی پێ نەچوو وەرەقە کۆچی دوایی کرد و ، وەحیش وەستا ..[٨٤]

**سێهەم : وەستانی وەحی**

دوای هاتنی سەرەتای سوورەتی ( العلق ) بۆ ماوەیەك وەحی وەستا .. جا هەندێك وتوویانە کە ماوەی چل رۆژ وەستاوە . وتراویشە : شەش مانگ ، یان دوو ساڵ و نیو ، یان سێ ساڵ وەستاوە .

ئەوەی کە زیاتر لە راستی‌یەوە نزیکە دوو رایەکەی پێشەوەن ، بە تایبەت چل رۆژەکە .. حیکمەتی ئەم وەستانەش بۆ ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دوای گەیشتنی بە جیبریل و گوشین و ئازاردان و ترس و لەرز هێور ببێتەوە و ، ئەمجا ئەم تاسەی هەبێ تا بە جیبریل بگات .

بەڵام دابڕانی وەحی ماوەی دوو ساڵ و نیو یان سێ ساڵ هیچ مانایەکی نیە و، ریوایەتێکی صەحیحیش پشتی ئەوە ناگرێ .. جا لەو ماوەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەردەوامیی هات و چۆی ( حراء ) و دەوروبەری ئەکرد ، بەو هیوایەوە کە بەشکو ئەو مەلائیکەتەی کە هاتە خوارەوە لای جارێکی تر بێتەوە .. ئەوەبوو جیبریل هاتەوە و وەحی دەستی پێ کردووە ..

بەڵام لە هەندێ ریوایەتی ( صەحیحی بوخاریی ) دا باسی ئەوە هاتووە کە دوای وەستانی وەحی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند جارێك چۆتە سەر لووتکەی چیاکان و ویستوویەتی خۆی بخاتە خوارەوە و جیبریل فریای کەوتووە ..

ئەم ریوایەتە مەرجی صەحیحیی وەرنەگرتووە ، چونکە لە ( البلاغات ) ە و ئەو ( فیما بلغنا ) وتەی زوهەری‌یە و ( موصول ) نیە ، بگرە وەك ( منقطع )

---

[٨٣] چونکە ئەو شەریعەتەی کە بۆ مووسا هاتبوو لەو شەریعەتەی کە بۆ عیسا هاتبوو تەواوتر و فراوان تر بوو .

[٨٤] بوخاریی و موسلیم ریوایەتیان کردووە . هەر ئەو رۆژە وەرەقە ئیمانی هێنا و تەصدیقی پێغەمبەری کرد و ، بە گوێی عیساشی کرد .

وەهایە و جۆرێکە لە فەرموودەی ( ضعیف ) . دیارە بوخارییش فەرموودەی سەنەددار تەخریج ئەکات کە بەسترا بێ بە ریوایەتی ریوایەتکەرە ( عدل ) و ( ضابط ) ەکانەوە . سەیری ( فتح الباري : ١٦/ ١٢ ط الحلبي ) بکە .[85]

**چوارەم : بەشەکانی وەحیی شەرعیی**

وەحی بە مانا شەرعی‌یەکەی بریتی‌یە لەوەی کە خوای گەورە پێغەمبەرانی لەو شەرعە ، یان لەو کتێبە ئاگادار ئەکات ، کە ئەیەوێ بی‌گەیەنێ پێیان ، ئیتر سا بە هۆی یەکێکەوە بێ ، یان راستەوخۆ ..

زانایانیش پێناسەی وەحی‌یان بەم شێوە کردووە :

أ ) بە پێی ئەو کەسەی کە وەحی بۆ دێت : (( عرفانٌ يجده الشخص من نفسه مع اليقين أنه من عند الله )) . ئەو کەسە کە وەحی بۆ دێت هەست ئەکات بەو بەرەکەتە و ، بە یەقین‌یش لای روونە کە ئەمە لەلایەن خواوەیە .

ب ) بە پێی سەرچاوەی هاتنیەوە : (( ما أنزله الله على أنبيائه ، وعرفهم به من أنباء الغيب ، والشرائع )) . بەم مانایە بریتی‌یە لەوەی کە خوا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرانی و ، بریتییشە لەو هەواڵە غەیبیی و لەو حوکمە شەرعی‌یانەی کە بە هۆی وەحی‌یەوە ئاگاداری کردوون ..

بۆ ئیمکان‌بوونی وەحیش دوو کار پێویستن :

**یەکەم** : سەرچاوەی ناردنی وەحی ، کە ئەویش خوای گەورەیە و ، بوونی مەلائیکەتێکی ئەمین و دەست‌پاك تا ئەو وەحی‌یە لەلایەن خوای گەورەوە بە پێغەمبەران بگەیەنێ .. ئەو مەلائیکەتەش بریتی‌یە لە لاشەیەکی نوورانیی کە نابینرێ ، بەڵام توانای هەیە خۆی بە چەندین شێوەی جیاجیای چاك بگۆڕێ و ، بە گورجی‌یەکی یەکجار زۆریش هات و چۆ بکات . جاری واش ئەبێ کە پێغەمبەران بە راستەقینەکەی ئەی‌بینن .

**دووهەم** : بوونی دەروونێکی مرۆڤانەی پاك و بێ‌گەرد کە خاوەنی توانایەکی تایبەتیی بێ بۆ وەرگرتنی وەحی لە خواوە بە راستەوخۆ ، یان لەو مەلائیکەتەوە کە خوا رەوانەی ئەکات .

---

[85] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٢٥٩ ـ ٢٦٦ .

جا بۆ کاری یەکەم ، کە بوونی خوای گەورەیە بە قودرەت و دەسەڵاتی تەواوەوە، ئەوا هەموو جۆرە دەلیلێك لەسەر بوونی و لەسەر تاك و تەنیایی و ، توانا و دەسەڵاتی کۆ کراوەتەوە مرۆڤە ژیرەکان ئەوەیان سەلماندووە ..

بۆ بوونی مەلائیکەتیش ئەوا هەموو خاوەن دینەکان بە یەكدەنگیی بەڵگەی تەواویان بە دەستەوەیە لەسەر بوونیان .

بۆ کاری دووهەمیش کە بریتی‌یە لە بوونی دەروونێکی پاك و پاڵفتە لە نێو مرۆڤدا ، تا بتوانێ وەحی لە خواوە ، یان لە مەلائیکەتەوە وەربگرێ ، ئەویش کارێکی مومکینە و هەزاران پێغەمبەری راستگۆ و پیاوچاك ، کە خۆری پڕنووری مێژووی مرۆڤایەتیین ، هاتوون و ئەم راستی‌یەیان گەیاندووە .

بەمە دەرئەکەوێ کە هاتنی وەحی بۆ مرۆڤ ، مایەی بەرزبوونەوەی پلە و ئاستی مرۆڤە . رێز و شکۆمەندیی بە مرۆڤ بەخشراوە و ، منەتێکی خواییشە بۆ بەرەی ئادەمیزاد کە خوای بەسۆزیان دەستبەرداریان نەبووە سەرگەردانی بیابانی نەفامیی بن ، بەڵکو پێغەمبەرانی بە ئامۆژگاریی پڕ نرخەوە بۆ ناردوون ، تا رێبازی چاك و خاوێن بگرنە بەر و ، سەرفرازی دنیا و قیامەت بن .

ئێستەش با بێینە سەر بەشەکانی وەحیی شەرعیی :

١ ـ فەرمایشت‌کردنی خوای گەورە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا لە دوای پەردەوە ، کە ئەمە دوو جۆرە :

أ ) لە کاتی ئاگاداریی و بەخەبەر بووندا : وەك ئەوەی کە خوای گەورە لەسەر کێوی طوور فەرمایشتی لەگەڵ مووسا پێغەمبەردا کرد ، سەلامی لێ بێ . هەروەها وەك ئەوەش کە خوای گەورە لە شەوی ئیسرا و میعراجدا فەرمایشتی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کرد و ، نوێژی لەسەر موسڵمانان فەرز کرد .. جا فەرمایشت‌کردن لەگەڵ مووسادا بە ئایەت سەلماوە و ، فەرمایشتی ئیسرا و میعراجیش لە فەرموودەی ئیسراءدا سەلماوە .

ب ) لە خەودا : وەك ئەو فەرموودەیەی کە ئیبن عەبباس و موعاذ لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەتیان کردووە ، کە فەرموویە : (( أتاني ربي ، فقال : فيم يختصم الملأ الأعلى ؟ .. .. )) رواه أحمد في مسنده ، والترمذي في سننه ، وقال : حسن صحيح ، وعبدالرزاق ، والطبراني عن ابن عباس ، والترمذي ، وابن مردويه ، والطبراني من حديث معاذ .

(( أتاني ربي )) واته : پەروەردگارم هاتە خەوم . (( الملأ الأعلى )) واته : مەلائیكەتەكان .

جا پیاوچاكانی پێشینە لە ئەهلی سوننە و جەماعە لەسەر ئەو رایەن كە حەزرەتی مووسا و حەزرەتی موحەممەد ، سەلامیان لێ بێ ، فەرمایشتی ئەزەلیی و قەدیمی خوای گەورەیان بیستووە كە یەكێكە لە سیفاتەكانی خوا ..

٢ ـ خوای گەورە بە هۆی جیبریلی ئەمینەوە پێغەمبەرەكانی ئاگادار كردوون ، كە ئەمە پێی ئەوترێ : ( الوحي الجلي ) ، كە ئەمیش بە چەند شێوەیەك ئەبێت :

أ ) بەو شێوەیەوە كە خوای گەورە جیبریلی دروست كردووە ، كە ئەمە بە دەگمەن دەرئەكەوێت و ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها دووجار بەم حاڵەتەوە جیبریلی دیوە : جارێكیان دوای وەستانی وەحی بوو كە پێغەمبەر ﷺ لە ئەشكەوتی ( حراء ) بوو و جیبریلیش ئەهاتە خوارەوە و ، جارێكیش لە شەوی ئیسرا و میعراجدا كە بە ئاسمانەوە بوو و ، خوای گەورەش ئەمەی لە سوورەتی ( النجم ) دا ئایەتی ( ١ ـ ١٨ ) باس كردووە .

ب ) جیبریل لە شێوەی پیاوێكدا ئەهات ، كە زۆر جار لە شێوەی ( دحیة الكلبي ) دا ئەهات ، كە هاوەڵێكی دیمەن جوان و رێك و پێك بوو و ، ئامادەبوانی كۆڕەكەش ئەیانبینی و ، وتەكانیان ئەبیست ، بەڵام نەیانئەزانی ئەوە جیبریلە .

یان لە شێوەی پیاوێكی نەناسراودا ئەهات ، وەك لە فەرموودە بەناوبانگەكەدا هاتووە كە جیبریل دێت دەربارەی ئیمان و ئیسلام و ئیحسان پرسیار ئەكات و ، هەردوو ئیمامی فەرموودە بوخاریی و موسلیم ریوایەتیان كردووە .

ج ) جیبریل لە شێوەی مەلائیكەتیی خۆیدا دێت و ، لەم حاڵەتەدا نابینرێ ، بەڵام دەنگێك وەك دەنگی زەنگ ، یان دەنگی هەنگ دێت . جا لەم حاڵەتەدا پێغەمبەر ﷺ لە حاڵەتی مرۆڤانەی خۆیەوە ئەگۆڕا بۆ حاڵەتێك كە توانای هەبێ لە مەلائیكەتەكەوە وەحی وەربگرێ . بەڵام ئەمە نارەحەتترین حاڵەت بوو بەلای پێغەمبەرەوە و ، تووشی جۆرە تایەك ئەبوو و ، ناوچاویشی لە رۆژی یەكجار سارددا چین چین عەرەقی دەرئەدا و، وەك كەسێكی خەوتوو پرخەی لێ دێت و ، لاشەی قورس ئەبێت .. هەتا ئەگەر بەسەر وشترەكەیەوە بوایە وشترەكەی چۆكی ئەدا و ، گەر رانی بەسەر رانی كەسێكەوە بوایە خەریك بوو بیهاڕێت ..

٣ ـ خستنە ناو دڵەوە : بەوەی کە جیبریل هەر وەحی‌یەکی بوێت بی‌خاتە دڵی پێغەمبەرەوە و ، ئەوەش بزانێ کە ئەوەی خراوەتە دڵیەوە لەلایەن خوای گەورەوەیە ، ئەمەش وەك ئەو فەرموودەیەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەی‌گێڕنەوە کە فەرموویە : (( إنَّ روحَ القُدُسِ نَفَثَ في رُوعي : أَنَّهُ لَن تَموتَ نَفسٌ حَتى تَستَكمِلَ رِزقَها ، فَاتَّقُوا اللهَ ، وَأَجمِلُوا الطَّلَبَ ، وَلا يَحمِلَنَّ أَحَدَكُم استِبطاءُ الرِّزقِ عَلى أَن يَطلُبَهُ بِمَعصِيَةِ الله ، فَإِنَّ اللهَ تعالى لا يُنال ما عندَهُ إلاَّ بطاعَتِه )) . رواه إبن أبي الدنيا في كتاب ( القَناعة ) ، وإبنَ ماجه ، والحاكم في المستدرك وصححَه ، والطبراني ، وأبو نُعيم في الحلية .

ئەفەرموێ : جیبریل خستیە دڵمەوە کە : هیچ نەفسێك نامرێت هەتا رزقی خۆی بە تەواویی وەر نەگرێت . دەی کەوایە شەرمی خوا بکەن و ، بە جوانیی داوای رزق بکەن و ، کاتێکیش کە رزق دوا ئەکەوێت بۆ یەکێکتان ، با بە شێوەی لە خوا یاخیی‌بوون هەوڵی رزق نەدات ، چونکە ئەوەی کە لەلای خوای گەورەیە بە گوێڕایەڵیی و پەرستنی دەست‌گیر ئەبێ .

٤ ـ ئیلهام : ئەمیش ئەو زانستەیە کە خوای گەورە ئەی‌خاتە دڵی پێغەمبەرەکەیەوە ، یان لە کاتی دۆزینەوەی ئەحکام‌دا ئەی‌خاتە سەر زمانی ، بەڵگەی ئەم جۆرە وەحی‌یانە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە :

﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴾ ( الشورى : ٥١ ) .

لەم ئایەتە پیرۆزەدا چوار جۆرە وەحی تێدا باس کراوە : ( وحياً ) مەبەست لە ئیلهام و وەحی خەوە و ، ( أو من وراء حجاب ) لە پشتی پەردەوە و ، ( أو يرسل رسولاً ) مەبەست لە ناردنی جیبریلە .

٥ ـ بینینی خەوی راستەقینە ، کە لە سەرەتای وەحی‌یەوە ئەو خەوانەی ئەدین و بە چاکییش ئەهاتنە دیی . دیارە خەوی پێغەمبەران وەحی‌یە ، وەك خەوەکەی ئیبراهیم خەلیل بۆ سەربڕینی ئیسماعیلی تاقە جگەرگۆشەی و ، وەك ئەو خەوەش کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش فەتحی مەککە دیتی کە مژدەی ئەوەی پێ درا کە بە سەرکەوتوویی ئەچنە کەعبەوە و فەتحی مەککەش ئەکەن . شایانی باسە کە قورئانی پیرۆز باسی ئەم دوو خەوەی کردووە .

هەموو ئەم جۆرە وەحی‌یانە ئەوەشی لەگەڵدایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە یەقینیی و پێویستیی ئەوە ئەزانێت کە ئەوەی پێی دراوە حەقە و لەلایەن خوای

پەروەردگارەوە نێرراوە و ، لە ختوورەی نەفس و ، وەسوەسەی شەیتانەوە بەدوورە ..[٨٦]

**پێنجەم : هاتنەوەی وەحی**

لەو ماوەیەدا کە وەحی وەستا ، ترس‌ولەرز لە پێغەمبەری خوا ﷺ دوور کەوتەوە ، بگرە بە تاسەوە بوو بۆ هاتنەوەی جیبریل و ، بۆیشی دەرکەوت کە بۆتە پێغەمبەری خوای بەدەسەلات .

جا لەو کاتەدا کە وەحی وەستابوو و ، ئەویش هاتوچۆی ئەشکەوتی حەرِای ئەکرد ، تا لەوێ بە تاقی تەنیا بێنێتەوە و ، خواپەرستیی بکات ، ئەوەبوو رۆژێکیان دائەبەزییە خوارەوە لە ئاسمانەوە دەنگێك هات ، کە سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە ، ئەبینێ وا جیبریلە و لەسەر کورسی‌یەك لە نێوان ئاسمان و زەوی‌دا دانیشتووە و ئاسۆی داپۆشیوە . ترسی لێ نیشت و خۆی دا بە زەوی‌دا ، پاشان گەڕایەوە ماڵەوە و ، فەرمووی : دام پۆشن ، دام پۆشن ، کە دایان پۆشیی خوای گەورە سوورەتی ( المدثر ) ی لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی ئایەتی پێنجەمی ناردە خوارەوە .

بوخاریی [٨٧] لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ئەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ کە باسی ماوەی وەستانی وەحی کردووە و فەرموویە :

(( فَبينا أنا أمشي ، سَمعتُ صَوتاً مِّنَ السماء ، فَرَفَعتُ بَصَري قِبَلَ السماء ، فَإذا المَلَكُ الذي جاءَني بحَرَّاءَ قَاعدٌ علىكُرسيٌّ بَينَ السماءِ والأَرضِ ، فَجَئثتُ منهُ حَتَّى هَوَيتُ إلى الأَرضِ ، فَجَئتُ أَهلِي ، فقلتُ : زَمِّلوني ، زَملوني ، فَزَمَّلُوني ، فَأَنزَلَ اللَّهُ تَعالى : يَاأيها المدثر ، إلى قوله : فاهجُر ، ثم حَمِيَ الوَحيُ وَتَتابَعَ )) .[٨٨]

**شەشەم : ئەرکی بانگ کردن**

کە سەرەتای سوورەتی ( المدثر ) هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرنجی دا ئەم ئایەتانە چەند فەرمانێکیان تێدایە کە پێویستە ئەنجامیان بدات :

---

[٨٦] الرحيق المختوم : ٦٨ ـ ٦٩ ، والسيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٢٦٧ ـ ٢٧١ .
[٨٧] صحيح البخاري ، كتاب التفسير باب والرجز فاهجر ٢ / ٧٢٣ .
[٨٨] الرحيق المختوم : ٦٧ ـ ٦٨ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٢٧٩ ـ ٢٨٠ .

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ۝٤ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ۝٥ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ۝٦ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ﴾ ( المدثر : ١ - ٧ ) .

یەکەم جار فەرمانی بەسەردا ئەدات کە ئەی ئەو کەسەی خۆی داپۆشیوە ، هەستە ، هەستە مەردومەکان ئاگادار بکەرەوە و تێیان بگەیەنە کە چارەنووسێکی پڕمەترسیی چاوەڕوانییان ئەکات ئەگەر ئیمان نەهێنن و گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانەکانی پەروەردگار نەکەن .

پاشان فەرمانی بۆ دێت : با پەروەردگاری بە گەورە و مەزن بزانێت ، تا لەسەر زەوییدا کەس خۆی بە گەورە نەگرێ و ، گەورەیی و دەسەڵات هەر شایانی خوایە.

پاشان فەرمانی بۆ دێت تا جل و بەرگی بە پاك و خاوێن رابگرێ و ، دەست بەرداری هەموو پیسیی و چەپەڵییەك ببێ ، واتە خۆی بە پاك و خاوێن رابگرێ ، چ ظاهیر و چ باطین ، تا دڵ و دەروون و لاشە و هەموو ئەندامێکی پاك و خاوێن ، لە ژێر چاودێریی و پارێزگاری و هیدایەت و نووری پەروەردگاردا ، پێ بگەیەنێ ، بۆ ئەوەی ببێتە سەرمەشقی ئادەمییەکان و دوور و نزیك چاوی لێ بکەن .

پاشان فەرمانی بۆ دەرئەچێ ئەو کە بەندەی ملکەچی خوایە و فەرمان جێبەجێ ئەکات و بانگەوازی خوا بڵاو ئەکاتەوە ، با وریا بێت ، نەکا خۆی بە شت بزانێ ، یان منەتێ بکات کە گوایا کاری کردووە و خزمەتی پێشکەش کردووە . وای لێك نەداتەوە کە کارێکی ئەنجام داوە .. تا ئەتوانێ خزمەت بکا و ماندوو ببێ و خۆی لەو پێناوەدا بەخت بکا ، بەڵام ئەوە هەمووی بە تەوفیقی خوا بزانێ و ، سوپاسی بکا کە توانیویەتی گوێڕایەڵیی فەرمان بکات .

لە ئایەتی حەوتەمیشدا فەرمانی بۆ دێت کە لە ئەنجامی کارکردنتدا بۆ دینی خوا کەسانێك دێنە رێت و هەوڵی ساردکردنەوەت ئەدەن ، ئەگەر کۆڵت نەدا دژایەتییت ئەکەن .. پاگاندەت بۆ ئەکەن .. خەڵکت لێ سارد ئەکەنەوە .. هەوڵی کوشتنت ئەدەن .. لەسەرت پێویستە دان بە خۆدا بگری .. ئارام لەسەر هەموو نارەحەتییەك بگری .. بۆ رەزامەندیی خوا کۆڵ نەدەیت و لەسەر خزمەتی خۆت بەردەوام بیت .

بەڵێ ، هەڵ گرانی دینی خوا ئەبێ بە تەمای دژایەتیی نەفامان بن .. نەفامان لە کوشت و بڕیان درێغیی ناکەن .. ئەمانیش ئەبێ خۆیان بدەنە دەست خوا و ،

دەست لە هەموو بەرژەوەندیەکیان بشۆن و ، بە تەمـای خـوا بـن لەسـەر مـل کەچیی و گوێڕایەڵیی ، بەسۆز و بەزەیی خۆی سەرکەوتنیان بۆ بنێرێ ..

ئەمانە چەند فەرمانێکی سـووك و ئاسـانن ، بـەڵام لـە راستـییدا یـەکجار کاریگـەرن و ، بـۆ ئەنـجامدانـی ئـەرکی بانگـەوازی ئیسـلام پیـاوی خۆیـان پێئەگەیەنن .. چونکە پێش هەموو شتێك تەوحید ئەبەنە نـاو کرۆکـی دڵـەوە و ، موسڵمانان فێری ناسینی خوا بـە تـاك و تـەنیا ئەکـەن .. هـەروەها ئیمـان بـە قیامەت لە دڵدا جێ ئەکەنەوە ، چونکە ئـەم دنیایـە هـەموو پاداشـتێکی تێـدا نادرێتەوە ، سەرەڕای ئەوەش کە نـەفس پاگـژ ئەکـەن و ، لـە هـەموو پیسـیی و چەپەڵییەك مرۆڤ دوور ئەخەنەوە و ، بۆ کـارە مـەزن و پـاك و پیرۆزەکـان هـەڵی ئەنێن .. پاشان موسڵمان فێر ئەبێ کە هـەموو کـارێکی بـە خـوا بسـپێرێ و بـە تەمای هێزی ئەو بێ بگاتە هانای سوپای خواناسیی کە هەمیشە لە چاو کافراندا هەر کەم بووە ، کەچیی هەمیشە هەر سەرکەوتوو بووە .

بەڵێ ، ئەم سوورەتە پایەدارە ، بگرە سەرەتاکەی هەڵمەتێکی رزگـاریی‌خوازیی بوو ، تا بانگی رزگاریی مرۆڤ دەست پێ بکات :

ئەی موحەممەدی ئازیزمان ! کاتی خەو و حەسانەوە نەما .. ئەوە نـەما تـۆ بـۆ خۆت بژیت .. ئەوە نەما هەوڵ بدەیت ژیـان و گـوزەرانی مـاڵ و منـداڵت خـۆش بکەیت .. هەستە مرۆڤایەتیی سەرگەردان بووە .. نرخ و بەهای مرۆڤ دابـەزیوە .. مرۆڤەکان خوای خۆیان بە چاکیی ناناسن .. رێـی چـاکیان ون کـردووە .. زوڵـم و ستەم باڵی کێشاوە بەسەر زەوییدا ..

هەستە ، دەست بەکاری خۆت بکـە .. تـۆ بـۆ کـارێکی یـەکجار مـەزن هـەڵ بژێرراوی .. ئەو کارە پیرۆزە فەرامۆش مەکە .. هەموو سەرزەویی چاوەڕوانتە .. مرۆڤایەتیی تا ئاخرزەمان بە تەمایە تۆ رزگاری بکەی .. ئەوەتا نەخشە و دەست بە کار بە ..

هەستە ، کاری پیرۆز چاوەڕوانتە .. دڵە شەیداکانی حەق و راستیی چـاوئەگێڕن بزانن کێ ئاڵای راستیی بە راستیی بەرز ئەکاتەوە ، تـا بچـنە ژێریـەوە و کۆشـش بکەن .. خزمـەتی حەق بکەن .. چاکە لەسەر زەوییدا بڵاو بکەنەوە ..

بەڵێ ، ئازیزمان ! هەستە .. سوپایەکی مەزن لە پیاوچاکانی سـەرزەویی ، تـا ئاخرزەمان چاوەڕوانن تۆی بەرێز ئاڵا بەرز بکەیتەوە ..

سوپایەکی بەڕێز ئامادەیە تا فەرمان بدەیت و ، ئەویش تەخت و تاجی زوڵم لە بن بهێنێ ..

سوپایەکی مەزن چاوەڕوانە تۆی بەڕێز نەخشەی پاك‌کردنەوەی دڵ و دەروونیان پیشان بدەیت ، تا ئەوانیش یەك لە دوای یەك و ، دەستە لە دوای دەستە ، بە درێژایی مێژوو خەریکی پەروەردەی خۆیان و نەوەکان بن و ، خەریکی تەزکیەی نەفس بن ، تا مرۆڤایەتیی لە ( أسفل سافلين ) رزگاری بێ و ، هەوڵ بۆ گەیشتن بە کەمالات و پایە و پلە بەرزەکان بدات ..

هەستە ، کاتی خەو نەما .. کاتی حەسانەوە نەما .. غیرەت بدە بەر خۆت و بە تاقی تەنیا ژیان و گوزەرانی سەرزەویی بگۆڕە .. رەورەوەی مێژوو بگۆڕە .. دەستی ستەم‌کاران لە بنا ببڕە ..

کاتێ کە ئەم کارە پیرۆزە خرایە ئەستۆی ئازیز ئێمەش سەردەمی خۆمانمان بیر کەوتەوە .. دیسان نەفامیی پەڕەی سەندۆتەوە . ئیمان کز کز بووە .. مل هوڕان یاریی بە ژیان و مافی مرۆڤ ئەکەن .. ئەمڕۆش هەمان هەڵمەتی چاکەخوازیی پێویستە بۆ رزگارکردنی مرۆڤ . بۆ ئازادکردنی مرۆڤ .. ئەمڕۆ موسڵمانان ئەگەرچی ژمارەیان یەکجار زۆرە ، بوونەتە پاروویەکی چەور و ستەم کاران تەماعیان تێ کردوون .. لەبەر ئەوەی ئامۆژگارییەکانی قورئان پشت‌گوێ خراون .. ئەمڕۆش پێویستە موسڵمانان خۆیان پەروەردە بکەنەوە و ، هێزی پێویست ئامادە بکەنەوە تا بچنەوە مەیدانی شەیتان پەرستان و لە زوڵم و ستەم دەست‌کۆتایان بکەن . بە کۆمەکیی خوا ئەو رۆژەش نزیکە .. چونکە ستەم و جەور لە سنوور دەرچوون و ، هاکا سۆزی پەروەردگار فریای بەستەزمانەکان کەوتەوە ..

بەڵێ ئازیزمان هەستا و فەرمانەکانی ئەنجام دان و ، بێ پشوو زیاتر لە بیست ساڵ جیهادی کرد تا قەڵاکانی زاڵمانی رماندن و ، دڵە نەخۆشەکانی دەرمان کردن و ، مرۆڤی دڵسۆزی بەغیرەتی خەم‌خۆری خۆنەویستی چاکەویستی لەسەر زەوییدا پەروەردە کردن .. ئەو کۆمەڵێکی پەروەردە کردن ، کەچیی هەر دانەیەکی ئەو کۆمەڵە کەوتە وڵاتێك و بووە هەوێنی پەروەردە و بەشی زۆری سەرزەویی پەروەردە کرا و ، زۆرێك لە مەردمەکان لە داوی نەفس و شەیتان خۆیان دەرباز کرد و ،

بوونە سەرمەشق بۆ تەوبەکردن و خۆ چاك‌کردنی خەڵکێکی زۆر . بەمە سەرزەویی ڕۆشن بوویەوە ..

ئەمڕۆش بە کۆمەکیی خوا ئەو هەڵمەتە مەردانەیە بەڕێوەیە و هاکا هێزی تاریکیی هێنا بە چۆك‌دا و بەڵێنەکەی قورئان :

﴿ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ ﴾ هاتە دیی ..

**حەوتەم : هاتنە خوارەوەی ( الضحى ) :**

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی سوورەتی ( الضحى ) ئیمام بوخاریی لە صەحیحەکەی‌دا بە سەنەدی خۆی لە جوندوبی کوڕی سوفیانی بوجەلی‌یەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت ، ئەوەبوو شەوێك ، یان دوو شەو ، یان سێ شەو هەڵ نەستا . ژنێك [89] هات و وتی : ئەی موحەممەد ! هیوادارم شەیتانەکەت دەست بەردارت بووبێ ، ئەوە دوو سێ شەوە نای‌بینم لێت نزیك بکەوێتەوە .. خوای گەورەش ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴾ ی ناردە خوارەوە .

لەم سوورەتەدا خوای پەروەردگار سوێند بۆ پێغەمبەرەکەی ئەخوات کە پەیوەندیی لەگەڵیا نەپچڕاندووە و هەردەم خۆشی ئەوێت ، کە ئەی‌فەرموو :

﴿ وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴾ .

ئەوەشی بۆ روون ئەکاتەوە کە چەندە لەم دنیایەدا رێزی لێ گرتووە ، ئەوا لە قیامەت‌دا رێزی زیاتری لێ ئەگرێ :

﴿ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴾ .

مژدەشی ئەداتێ کە لەم دنیایەدا سەری ئەخا و ، لە قیامەتیش‌دا پاداشتی ئەداتەوە :

﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴾ .

پاشان وەبیری دێنێتەوە کە ئەوی خۆشەویستی هەتیو بوو دەرووی لێ کردەوە و، نەی‌ئەزانی چۆن هیدایەتی قەومەکەی بدا پیشانی دا و ، هەژار و دەست‌کورتیش بوو دەوڵەمەندی کرد :

---

[89] ئوم جەمیلی کچی حەربی هاوسەری ئەبولەهەب بووە .

﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ۝٦ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ۝٧ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ﴾.

کەواتە ئەی خۆشەویستم ! تۆش دڵی هەتیوان مەشکێنە و ، قسەی تاڵ و سوێریش بەرامبەر بە هەژاران مەکە .

﴿فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ۝٩ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ﴾ .

لە کۆتاییدا فەرمانی بەسەردا ئەکات تا باسی ئەو ناز و نیعمەتانە بکات کە خوای گەورە بەوی بەخشیوە ، بە تایبەتیی هەڵ بژاردنی بۆ پێغەمبەرایەتیی . ئەوەبوو ئەویش متمانەی بە هەر کەس بکردایە لە کەس وکاری ئەو نیعمەتە گەورەیەی باس ئەکرد کە خوای گەورە بەویش و بە بەندەکانیشی پێشکەش کردووە .

﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ .

بەمە دەرئەکەوێ کە بۆ ماوەیەکی کەم وەحی وەستاوە و ، پێغەمبەریش ﷺ کە بێتاقەتیی کردووە ، خوای گەورە بە سوورەتی ( الضحى ) دڵی داوەتەوە . ئەم وەستانەی وەحی جیایە لەگەڵ وەستانەکەی دوای هاتنی سەرەتای سوورەتی ( العلق ) .

## بەشی دەهەم
# قۆنـــاغـــەكـــانی بانگـــەوازی ئیســـلام

ئەتوانین سەردەمی بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺ بكەین بە دوو قۆناغەوە كە بە تەواویی لە یەك جیاوازن :

١ ـ قۆناغی مەككە ، كە نزیكەی سیانزە ساڵی خایاند .

٢ ـ قۆناغی مەدینە ، كە دە ساڵی تەواوی خایاند .

جا هەر یەكە لەم دوو قۆناغە ئەكرێ بە چەند بەشێكەوە كە ئەوانیش هەر یەكە تایبەتمەندیی خۆیان هەیە .

با سەرەتا قۆناغی مەككە باس بكەین ، كە دوو بەشە :

أ ) قۆناغی بانگ بە نهێنیی : سێ ساڵ .

ب ) قۆناغی بـانگ بـە ئاشـكرا ، كـە لـە سـەرەتای چـوارەم سـاڵی هـاتنی وەحی‌یەوە دەست پێ ئەكات هەتا كۆچ كردن بۆ مەدینە .[٩٠]

## قۆناغی بانگ بە نهێنیی :

**یەكەم : دەستەی یەكەمی ئیمان داران**

لەبـەر ئـەوەی كـە مەككـە بنكـەی سـەرەكیی دینیـی عەرەبـەكان بـوو ، سەدەنەكانیش كە سەروكاریی دین‌داری‌یان ئەكرد لـەوێ بـوون و ، پاگانـدەیان بـۆ بتەكانی كەعبە ئەكرد و بەلای عەرەبەكانەوە بە پیرۆز لـە قەڵـەم درابـوون ، گـەر كەسێك هەوڵی راست‌كردنەوەی بیروباوەڕی ئەو خەڵكـەی بدایـە ، ئـەوا ئەوپـەڕی تووشی ناڕەحـەتیی ئـەهات و ، ئەوەنـدە كۆسـپ و تەگـەرە ئەهاتنـە رێـی كـە پێویستیی بە دامەزراویی و كۆڵ نەدانێكی بێ‌وێنە بوو ، لەبەر ئەمە وا چـاك بـوو بانگی ئیسلامیی لە سەرەتادا بە نهێنیی بێت تا خەڵكی مەككە نەشڵەژێن و لـەم بانگە پیرۆزە بە خراپ تێ نەگەن ..

---

[٩٠] مەگەر باسی قۆناغی بانگ بە ئاشكرا لە بەشی یانزەهەم دا پێشكەش بكرێت .

بۆ ئەمە دوای هاتنــە خـوارەوەی ئایەتـەکانی سـەرەتای سـوورەتی ( المـدثر ) پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بـە بانگ‌کردن بۆ سەر ئیسلام بە نهێنیی . دیارە لە پێشەوە پێویستە بانگی ماڵ و منداڵەکەی ، پاشان دۆستانی و ئەوانەی کە زۆر لێیەوە نزیکن بکات .

ئـەوەبوو یەکـەم کەسـێك کـە لـە تافرەتـان‌دا ئیمـانی هێنـا ، بگـرە یەکـەم ئادەمی‌یەك کە ئیمانی هێنا خەدیجەی هاوسـەری بـوو ، خـوا لێـی رازیـی بـێ . خەدیجە کۆمەك و پاڵپشتێکی زۆر بەغیرەت بوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ. ئـەوەبوو یەکەم رۆژ کە قورئـان هاتـە خـوارەوە دڵـی پێغەمبـەری دایـەوە و هەواڵەکەشـی گەیاندە وەرەقەی ئامۆزای تا ئازیز تێ‌بگەیەنێ و هیچ خـەمێکی نـەبێت .. چـیی نارەحەتیی ئەهاتە بەردەمی و ، خزمەکانی چەندە ئـازاری دڵیـان ئـەدا ، خەدیجـە دڵی ئەدایەوە و باری سەرشانی سوك ئەکرد و ، هێز و وزەی ئەدایێ هەتا دان بـە خۆی‌دا بگرێ و کاری پیرۆز بە ئەنجام بگەیەنێ .[91]

دوای خەدیجە یەکەم پیاوێکی ئازاد کە ئیمانی هێنا ئەبوبەکری صـدیق بـوو ، خوا لێی رازیی بێ . کە لە ئەنجام‌دا بووە یەکەم وەزیر و یەکەم خەلیفەی ئیسلام ، کە بە سەروماڵ بەخشیین دڵنەوایی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد .

حافیظ ئەبولحەسەنی ئەطـرابولوسیی لە عائیشەوە خوا لێی رازیی بێ تـەخریجی کردووە کە وتوویە : ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ بە نیـازی بەخزمـەت گەیشـتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ دەرچوو ـ ئەوەبوو لە سەردەمی نـەفامیی‌دا دۆسـتی بوو ـ ، کە تووشی بوو فەرمووی : ئەبولقاسم ! لە کۆڕی خزمەکانت‌دا دیـار نیـت و، بە عەیب‌دارکردنی باوك و دایکیان تاوانباریان کردوویت . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

(( إنـــي رسول الله أدعوكَ إلى الله )) .

فەرمووی : من پێغەمبەری خوام و بانگت ئەکەم بۆ ئیمان‌هێنان بە خـوا . کـە لە فەرمایشتەکەی بوویەوە ، ئەبوبەکر موسڵمان بوو و ، پێغەمبەری خوا ﷺ کـە لێی جوێ بوویەوە لە نێوان هەردوو چیای ئەبوقوبـەیس و ئەحمـەردا ، کـە دەورەی

---

[91] بۆ زێدە شارەزابوون لە ژیانی پڕ فەڕ و بەرەکەتی خەدیجە خوێنەری بەڕێز ئەتوانێ ژیانەکەی لە زنجیرەی هاوەڵان دا بخوێنێتەوە .

مەککەیان داوە ، کەسێکی تر نەبوو ئەوەنـدەی ئـەو شـادمان بـێ ، ئـەویش بـە موسڵمانبوونی ئەبوبەکر ... كذا في البداية ( ٣ / ٢٩ ) .[٩٢]

ئیبن ئیسحاقیش ئەوەی باس کردووە که ئەبوبەکری صددیق خوا لێی رازیی بێ بە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگات و ئەفەرموێ : ئایا قورەیش راست ئەڵێ ، ئـەی موحەممـەد ، کـە وازت لـە خواکانمـان هێنـاوە و ، ژیرەکانمانـت بـە نـەزان دەرکردووە و ، باوباپیرانمانت بە کـافر لـە قەڵـەم داون ؟ پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمووی :

(( بَلى ، إني رسولُ اللهِ وَنَبيُّهُ ، بعثني لأُبَلِّغَ رسالَتَهُ وَ أدعوكَ إلى اللهِ بالحقِّ . فوَاللهِ إنه لَلْحَقُّ ، أَدعوكَ يا أبابكرٍ إلى اللهِ وحدَهُ لا شريكَ لَهُ ولا تعبُدُ غـيرَهُ والمـوالاةِ علـى طاعَـــته )) .

فەرمووی : بەڵێ ، من پێغەمبەری خوام ، ناردوومی هەتا پەیامەکەی بگەیەنم و ، تۆش بە حـەق و راسـتیی بـۆ لای خـوا بـانگ ئەکـەم .. دە بـەخوا دینێکـی حەقە، ئەبوبەکر ! بانگت ئەکەم بۆ پەرسـتنی خـوای تـاك و تـەنیای بێشـەریك و غەیری ئەو کەس نەپەرستی و گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی بکەیت .. قورئانیشی بـۆ خوێند . ئیتر هیچ ئینکارییەکی نەکرد و ، موسڵمان بوو و ، پشـتی لـە بتـەکان کرد و وازی لە شەریك بۆ خوادانان هێنا و ، دانی بە راستیی ئیسلامدا نـا . ئـیتر ئەبوبەکر بە ئیمان و تەصدیقەوە گەڕایەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکیدا ستایشی ئەبوبەکر وەها ئەکا کە هیچ کەسی نەگاتێ ، بە بۆنەی ئەوەوە کە هەر کەسی بانگ کردبێ بۆ موسـڵمان بـوون هەڵوێستەیەکی بووە ، جگە لە ئەبوبەکر کە راستەوخۆ بەبێ دوودڵیی خێرا ئیمانی هێناوە ، کە ئەفەرموێ :

(( ما دَعَـوْتُ أَحداً إلى الإسلامِ إلاَّ كانَتْ عندهُ كبـوَةٌ ، وَتَـرَدُّدٌ ، ونَظـرٌ ، إلا أَبـابكرٍ ، ما عَكَمَ عنه حينَ ذَكَرْتُهُ ، ولا تَرَدَّدَ فيه )) .[٩٣]

لەناو منداڵانیشدا یەکەم منداڵ عەلیی کوڕی ئەبوطالیب خوا لێی رازیـی بـێ موسڵمان بوو . ئەو کاتە تەمەنی دە ساڵان بـوو و ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەبـەر گرانیی بۆ یارمەتییدانی مامەی ، ئەوی هێنابووە لای خۆی .

---

[٩٢] شرح حياة الصحابة : ١ / ١٣٧ - ١٣٨ .
[٩٣] شرح حياة الصحابة : ١ / ١٣٨ - ١٣٩ .

ئیبن ئیسحاق باسی ئەوەی کردووە کە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب خوا لێی رازیی بێ دوای رۆژێك دێت و ئەبینێ کە هەردووکیان ( واتە پێغەمبەر و ﷺ خەدیجە خوا لێی رازیی بێ ) خەریکن نوێژ ئەکەن . عەلیی فەرمووی : ئەی موحەممەد ! ئەمە چی‌یە ؟ فەرمووی :

(( دينُ اللهِ الذي اصطفى لنفسه وبعث به رسله ، فأدعوكَ إلى الله وحده لا شريك له ، وإلى عبادَته ، وأن تكفر باللاَتَ والعزى )) .

فەرمووی : ئەمە ئەو دینەیە کە خوای گەورە بۆ خۆی هەڵ بژاردووە و ، پێغەمبەرانیشی پێ رەوانە کردووە . جا منیش بانگت ئەکەم بۆ ئیمان‌هێنان بە خوا بە تاك و تەنیایی و بێ‌شەریکیی و ، بۆ پەرستنی و ، پشت‌هەڵ‌کردن لە لات و عوززا . عەلیی فەرمووی : ئەمە کارێکە لەوەو پێش نەم بیستووە و ، منیش هیچ کارێك ئەنجام نادەم هەتا پرس بە ئەبوطالیب نەکەم . پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لەوەی کارەکەی ئاشکرا ببێ پێی ناخۆش بوو ئەم نهێنی‌یەی بڵاو بێتەوە ، بۆیە پێی فەرموو :

(( يا عليُّ ! إذْ لَمْ تُسلِم فاكتُم )) .

فەرمووی : عەلیی ! ئەگەر موسڵمان نابی ئەم کارە بشارەوە .

ئەو شەوە عەلیی مایەوە ، پاشان خوای گەورە موسڵمان‌بوونی خستە دڵی عەلی‌یەوە و کە رۆژی لێ بوویەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی : ئەی موحەممەد ! چیت بۆ باس کردم ؟ پێغەمبەری خوا پێی فەرموو :

(( تشهدُ أن لا إله إلا الله وحدهُ لا شَريكَ له ، وتكفر باللات والعزى ، وتبرأ من الأنداد )) .

فەرمووی : شاهێدیی ئەوە بدەی کە خوای گەورە تاك و تەنیایە و شەریکی نیە و ، پشت لە پەرستنی لات و عوززا هەڵ بکەی و ، خۆت لەو بتانە دامالّی کە کراونەتە شەریکی خوا . عەلیی وای کرد و موسڵمان بوو و ، هەروا ئەهاتە خزمەتی و لە ئەبوطالیب یش ئەترسا و ، موسڵمان بوونەکەشی شاردەوە و دەری نەخست . كذا في البداية ( ٣ / ٢٤ ) . [٩٤]

لەناو بەندە ئازادکراوەکانیش‌دا زەیدی کوڕی حاریثەی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم کەس موسڵمان بوو ، کە ئەوەبوو لە پێشەوە باسمان

[٩٤] شرح حياة الصحابة : ١ / ١٤١ - ١٤٢ .

کرد چۆن لەگەڵ باوکی و کەس وکاریدا نەچووەوە و ، لە مەککەدا لە خزمەتی ئازیزدا مایەوە .

لەناو بەندە ئازادنەکراوەکانیش دا یەکەم کەس بیلالی کوڕی رەباحی حەبەشیی موسڵمان بوو ، کە بەندەی ئومەییەی کوڕی خەلەفی ستەمکار بوو و ، لە دوایی دا لەبەر دەنگی خۆشی بووە بانگ‌وێژی پێغەمبەری ئیسلام .

هەروەها کچەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەواڵی هاتنی وەحی یان بیست ، خێرا موسڵمان بوون ، چونکە ئەوان پێش پێغەمبەرایەتییش هەموو رەوشتێکی ئازیزیان بە دڵ بوو و ، گوێڕایەڵی هەموو فەرمانێکیشی بوون .. لەولاشەوە بە تەواویی لە هەموو هەڵس‌وکەوتێکی نەفامیی بەدووریان گرتبوو .

ئیبن ئیسحاق لە عائیشەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : کاتێك کە خوای گەورە رێزی لە پێغەمبەرەکەی نا و کردیە پێغەمبەر خەدیجە و کچەکانی موسڵمان بوون ..

ئەبوبەکری صددیق خوا لێی رازیی بێ پیاوێکی هۆگر و خۆشەویست بوو . خاوەنی پایەوپلە و رێز بوو .. خاوەنی زانستێکی زۆر بوو بە تایبەت لە زانستی نەسەب و رەچەڵەك دا .. لە پاڵ رەوشتی جوانیدا پیاوێکی دەستڕۆیشتوو و ، بازرگانێکی چاکەکار بوو ، بۆیە بەلای قورەیشەوە پایەدار و مەزن بوو ..

ئەبوبەکر بە ئیمان‌هێنانی خۆی وازی نەهێنا .. بەڵکو کەوتە بڵاوکردنەوەی ئیسلام .. پێی خۆش بوو ئەو فەڕوبەرەکەت و نوور و رووناکی‌یەی کە دەست خۆی کەوتووە ، خوای گەورە بەشی دۆست و هاوەڵە بەڕێزەکانیشی لێ بندات .. بۆیە وەك خۆی بە نهێنیی ئیمانی هێنا ، هەر بە نهێنییش دەستی دایە بانگ‌کردن ، تا ئەوەبوو کۆمەڵێکی بەڕێزی قورەیشیی خاوەن ویقار و ژیر و بلیمەت ئیمانیان هێنا و بە هەموویانەوە بوونە بەردی بناغە و دەستەی یەکەمی ئیمان‌داران لە مەککەدا، کە ئەمانە بوون :

عوثمانی کوڕی عەففانی کوڕی ئەبولعاصی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبد شەمسی کوڕی عەبد مەنافی کوڕی قوصەی .[٩٥]

---

[٩٥] دایکی عوثمان ئەڕوای کچی کورەیزی کوڕی رەبیعە بووە و دایکی دایکیشی بیضاء ئوم حەکیم کچی عەبدولموطەللیب بووە کە پووری پێغەمبەر بووە .

زوبەیری کوڕی عەووامی کوڕی خوەیلیدی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی قوصەی ، کە دایکی صەفیەی کچی عەبدولموطەللیب ی پووری پێغەمبەر بووە .

عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوفی کوڕی عەبدولحاریثی کوڕی زوهرەی کوڕی کیلاب.

سەعدی کوڕی ئەبووەققاص کە ناوی مالیك بووە ، کوڕی ئوهەیبی [٩٦] کوڕی عەبد مەنافی کوڕی زوهرەی کوڕی کیلاب .

هەروەها طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی عوثمانی کوڕی عەمری کوڕی کەعبی کوڕی سەعدی کوڕی تەیمی کوڕی مورڕە ..

ئەبوبەکریش و طەلحەش لە ( مُرَّة ) دا لەگەڵ پێغەمبەردا بە یەك ئەگەنەوە .

ئەمانە دەستەی یەکەم بوون لە ئیمانداران کە مەردانە ئیمانیان هێنا و ، بوونە بەردی بناغە بۆ بنیاتنانی قەڵای ئیسلام .

**دووهەم : دەستەی دووهەمی ئیمان داران**

دوای ئەمانە ئەبوعوبەیدە عامیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەڕڕاح موسڵمان بوو ..

پاشان ئەبوسەلەمە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولئەسەد ، کە دایکی ناوی بەڕڕەی کچی عەبدولموطەللیب و برای شیریی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە و ، ئەرقەمی کوڕی ئەبوئەرقەم کە ناوی عەبد مەنافی کوڕی ئەسەد بووە و ، عوثمانی کوڕی مەظعوون و هەردوو براکەشی قودامە و عەبدوڵڵا و ، عوبەیدەی کوڕی حاریثی کوڕی موطەللیبی کوڕی عەبد مەناف و ، سەعیدی کوڕی زەید و فاطیمەی کچی خەططابی هاوسەری کە ئامۆزای باوکی بووە و ، ئەسمائی کچی ئەبوبەکر و ، خەببابی کوڕی ئەرەتت یش موسڵمان بوون ..

**سێهەم : دەستەی سێهەم**

پاشان عومەیری کوڕی ئەبووەققاصی برای سەعد و ، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود و ، مەسعوودی کوڕی قاریی ، کە مەسعوودی کوڕی رەبیعەی کوڕی

---

[٩٦] ئوهەیب مامەی ئامینەی کچی وەهبی کوڕی عەبد مەناف بووە ، کەواتە ئەبووەققاص ئامۆزای ئامینە بووە . ئامۆزاش وەك برا وەهایە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ سەعدی بە خاڵۆی خۆی دەژمارد .

عەمر بووە و ، سولەیطی کوڕی عــەمر و ، حــاطـبـی بـرای و ، عەییاشـی کـوڕی ئەبوڕەبیعە و ، ئەسمائی کچی سەلامەی هاوسەری و ، خونەیسی کـوڕی حوذافـەی سەهمیی و ، عامیری کوڕی رەبیعــە و ، عەبـدوڵڵای کـوڕی جـەحش و ، عەبـدی کوڕی جەحشی برای و ، جەعفەری کوڕی ئەبوطالیـب و ، ئەسمائی کچی عومەیسی هاوسەری و ، حاطبی کوڕی حاریث و ، فاطیمەی کچی موجەلللی هاوسەری و ، خەططابی کوڕی حاریثی برای حـاطـەب و ، فەکیهــەی کچـی یەسـاری هاوسـەری خەططاب و ، موعـەممەری کوڕی حاریثی بـرای حـاطـەب و خـەططاب و ، سـائیبی کوڕی عوثـمانی کوڕی مـەظعوون و ، موطەللیبی کوڕی ئەزهەر و ، رەملەی کچـی ئەبوعەوفی هاوسەری و ، نەححامی کوڕی عەبدوڵڵای کـوڕی ئوسـەید موسـڵمان بوون . هەروەها عـامیری کوڕی فوهەیرە کە بەندەی ئازادکراوی ئەبوبەکر بـووە و ، خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عـاص و ، ئەمینە یـان هەمینـەی کچـی خەلـەفی هاوسەری و ، ئەبوحوذەیفەی کـوڕی عوتبـەی کـوڕی رەبیعـە و ، واقیـدی کـوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبد مەناف و ، خالیـد و عــامیر و عـاقیـل و ئیاسـی کـوڕانی بەکیری کوڕی عەبد یالەیل و ، عەمماری کوڕی یاسیر و ، صوهەیبی کـوڕی سـینان و، ئەبوزەڕڕی غیفاریی و ، ئونەیسی برای و ، دایکی موسڵمان بوون ..

ئەمانەش دەستەی سێهەم بوون کە موسـڵمان بـوون و ، بـە موسـڵمان بـوونی ئەمانەش ئیسلامەتیی لە مەککەدا بە تەواوەتیی بڵاوەی کرد و ، لە هەموو کـۆڕ و کۆمەڵێك دا باس هەر باسی ئیسلام بوو ..

بەیهەقیی لە جەعفەری کـوڕی موحەممـەدی کـوڕی خالیـدی کـوڕی زوبـەیرەوە تەخریجی کردووە ، کە ئەویش لە باوکیەوە ، یان لە موحەممەدی کوڕی عەبـدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عوثمانەوە کە وتوویە : خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص هەر زوو موسڵمان بوو ، پـێش موسـڵمان بـوونی براکـانی . سـەرەتای موسـڵمان بوونیشی ئەمە بوو کە لە خەویدا بینیی وا لەسەر رۆخی ئاگر وەستێنراوە ـ باسی فراوانیی ئاگرەکەشی کرد کە مەگەر هەر خوا بیزانێ ـ . لە خەویدا ئـەوەی دیـی کە کـەسـێك ( لە ریوایەتی حاکم دا باوکی هاتووە ) هات و بە پاڵ ئەیخستە نـاو ئاگرەکـەوە و ، پێغەمبـەری خـواش ﷺ دەسـتی بـە هـەردوو شـوێنی گرێدانـی ئیزارەکەیەوە گرتووە تا نەکەوێتە ئاگرەکەوە .. لە خەوەکـەی راچـڵەکیی و وتـی : سوێند بە خوا ئەخۆم کە ئەم خەوە خەوێکی راستە . ئـەوەبوو تووشـی ئەبوبـەکری

کوڕی ئەبوقوحافە بوو و ئەوەی بۆ باس کرد و ، ئەویش فەرمووی : چاکت بۆ کراوە .. ئەوەش پێغەمبەری خوایە ﷺ و شوێنی بکەوە ، چونکە هەر رۆژێك دێت کە شوێنی بکەوی و بچیتە سەر ئیسلام و ، ئیسلامیش ناهێڵێت بکەویتە ناو ئەو ئاگرەوە ، بەڵام باوکت ئەکەوێتە ناوی .. خالد لە ئەجیاد تووشی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو و وتی : ئەی موحەممەد ! [97] خەڵك بۆ چیی بانگ ئەکەیت ؟ فەرمووی :

(( أدعوك إلى الله وحده لا شريكَ له وأنَّ محمداً عبده ورسوله ، وتَخلَعَ ما أنت عليه مِن عبادةِ حجرٍ لا يسمَعُ ولا يضُرُّ ولا يُبصِرُ ولا ينفعُ ولا يدري مَن عَبَدَهُ مِمَّن لا يَعْبُدُهُ )) .

فەرمووی : بانگت ئەکەم بۆ ناسینی خوای گەورە بە تاك و تەنیا و بێ‌شەریك و، موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری خوایە و ، وازیش لە پەرستنی ئەو بەردە بهێنی کە نە ئەبیستێ و ، نە ئەبینێ و ، نە زیانی هەیە و ، نە کەڵك و ، ناش زانێ کێ ئەی‌پەرستێ و کێش نای‌پەرستێ . خالید وتی : دەی من شاهێدیی ئەدەم کە جگە لە زاتی الله خوایەکی تر نیە و ، شاهێدییش ئەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت . پێغەمبەری خوا ﷺ بە موسڵمان‌بوونی ئەو زۆر شادمان بوو و ، خالیدیش ماوەیەك نادیار بوو و ، باوکیشی بە موسڵمان‌بوونی ئەوی زانیی ، ئیتر ناردی بە دوای‌دا و هێنایان و ، باوکی سەرزەنشتی کرد و ، بە دارێك کە بە دەستیەوە بوو ئەوەندەی کێشا بە سەری‌دا هەتا دارەکە شکا و ، وتی : بەخوا خۆراکت لێ قەدەغە ئەکەم . خالید وتی : ئەگەر تۆ خۆراکم لێ قەدەغە بکەیت ئەوا خوا ئەوەندە رزقم بۆ ئەنێرێ کە پێی بژیم ، ئیتر چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و دەستی لێ بەر نەئەدا و لەگەڵیا ئەبوو . ( كذا في البداية ٣٢/٣ ) .

لە ریوایەتێکی تردا دوای ئەوەی کە باوکی دارەکەی بە سەردا ئەشکێنێ ، پێی ئەڵێ : لە کاتێك‌دا شوێنی موحەممەد کەوتووی کە ئەبینیی خزمەکانی بە بۆنەی ئەو دینەوە هێناویەتی ، کە خواکانیان و باوباپیری رابوردوویان بە عەیب‌دار ناو ئەبات ، لە دژی وەستاون ؟ خالید وتی : بەخوا راست ئەکات و منیش شوێنی کەوتووم . ئەبوئوحەیحەی باوکی تووڕە بوو و قسەی سووك و جنێوی پێ دا و پاشان وتی : بڕۆ ، نامەرد ! بۆ کوێ ئەڕۆی بڕۆ ، بەخوا خۆراکت لێ قەدەغە ئەکەم . خالید وتی : ئەگەر تۆ خۆراکم لێ قەدەغە بکەیت ئەوا خوا ئەوەندە رزقم بۆ

[97] لە ریوایەتی تردا وا هاتووە : (( يا رسول الله ، يا محمد ! )) .

ئەنێرێ کە پێی بژیم .. ئەری کرد و بە کوڕەکانیشی وت : هەر کامتان قسەی لەگەڵ بکات وەك ئەوی لێ ئەکەم .

لە ( الإستيعاب ) دا ئەمەشی بۆ زیاد کراوە : خالید لە دەوروبەری مەککەدا خۆی لە باوکی گوم ئەکات ، هەتا هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆچی دووهەمیان دا بەرەو وڵاتی حەبەشە ئەکەونە رێ ، ئەوەبوو خالیدیش پێش هەمووان کەوتە رێ ..

هەروەها لە خالیدی کوڕی سەعیدەوە حاکمیش تەخریجی کردووە کە سەعیدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییە نەخۆش ئەکەوێت و ، ئەڵێت : ئەگەر خوا لەم نەخۆشی‌یەم هەڵی ساندمەوە ئەوا هەرگیز خوای موحەممەد ( إبن أبي كبشة ) لە دۆڵی مەککەدا ناپەرسترێت .. بۆ ئەمە خالیدی کوڕی وتی : خوایە ! هەڵی نەسێنیتەوە . ئەوەبوو بەو نەخۆشی‌یەی مرد . ( وهكذا أخرجه إبن سعد ٤ / ٩٥ ) .[98]

هەروەها ئیبن سەعد لە ( ٣ / ٢٤٧ ) دا لە ئەبوعوبەیدەی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەممارەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : عەمماری کوڕی یاسیر خوا لێیان رازیی بێ ئەی وت : لەبەر دەرگای ماڵی ئەرقەم‌دا ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژوورەوە بوو ، تووشی صوهەیبی کوڕی سینان بووم خوا لێی رازیی بێ ، پێم وت : چیت ئەوێت ؟ ئەویش پێمی وت : تۆ چیت ئەوێ ؟ وتم : ویستم بچمە ژوورەوە لای موحەممەد و وتەکانی ببیستم . وتی : منیش هەر ئەوەم ئەوێت . چووینە ژوورەوە لای و ، ئەویش ئیسلامی پیشان داین و موسڵمان بووین . ئیتر ئەو رۆژە هەتا ئێوارەمان بەسەر هات لەوێ ماینەوە ، پاشان بە نهێنیی لەوێ دەرچووین .

ئەوەبوو موسڵمان‌بوونی عەممار و صوهەیب دوای موسڵمان‌بوونی سیی و ئەوەندە پیاو بوو خوا لێیان رازیی بێت .[99]

ئەمانەی پێشەوە هەر هەموو بە نهێنیی موسڵمان بوون و پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵیان کۆ ئەبوویەوە و ، بەبێ دەنگ ئامۆژگاریی و رێنمایی ئەکردن ، چونکە هێشتا بانگەوازی ئیسلام نهێنیی و فەردیی بوو .

---

[98] شرح حياة الصحابة : ١ / ١٤٥ - ١٤٧ .

[99] شرح حياة الصحابة : ١ / ١٧٠ .

ئەمانەی کە موسڵمان بوون لە مەککەدا مانەوە ، بەڵام لە سەرەتاوە پیاوێك دێتە مەککە و موسڵمان ئەبێت و ئەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی و دوای کۆچی مەدینە دێتەوە خزمەتی ئازیز .

ئیمام ئەحمەد ( ١١٢/٤ ) و ئیمام موسلیم ( ١ / ٢٧٥ ) تەخریجیان کردووە کە شەددادی کوڕی عەبدوڵلا وتوویە : ئەبوئومامە وتی : ئەی عەمری کوڕی عەبەسە! چۆن ئیددیعای ئەوە ئەکەی کە تۆ چواریەکی ئیسلام بیت ؟ وتی : لە سەردەمی نەفامییدا خەڵکم بە گومڕا ئەزانیی و ، بتەکانیشم بە هیچ دانەئەنان .. پاشان دەربارەی پیاوێك دەنگ و باسم بیست کە لە مەککەدا هەندێ هەواڵ بڵاو ئەکاتەوە و باسی هەندێ شتیش ئەکات . سواری وشترەکەم بووم و هاتم هەتا گەیشتمە مەککە ، ئەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ بەبێ دەنگ کار ئەکات و ، قەومەکەشی دەستیان بە سەریدا ئەڕوا ، منیش خۆم دەر نەخست و چوومە خزمەتی و وتم : تۆ چیت ؟ فەرمووی :

(( أنا نبيٌّ الله )) .

وتم : پێغەمبەری خوا چییە ؟ فەرمووی : (( رسولُ الله )) .

ئەڵێ : وتم : خوا ناردووتی ؟ فەرمووی : (( نعم )) . وتم : بە چیی ناردووتی؟ فەرمووی :

(( بِأَن يُوَحَّدَ اللهُ ولا يُشرَكَ بهِ شيءٌ ، وكسرِ الأوثان ، وصلةِ الرحمِ )) .

فەرمووی: بەوەی کە خوا بە تاك و تەنیا بپەرسترێ و هیچ شتێك نەکرێتە شەریکی و ، بتەکان بشکێن و ، سیلەی رەحمیش بەجێ بهێنرێ .

وتم : لەمەدا کێت لەگەڵدایە ؟ فەرمووی : (( حُرٌّ وعبدٌ )) ـ أو عبد وحر ـ .

فەرمووی : ئازادێك و بەندەیەك . ئەبینم ئەبوبەکری کوڕی ئەبوقوحافە و بیلالی بەندەی ئازادکراوی ئەبوبەکری لەگەڵدایە .. وتم : دەی من شوێنت ئەکەوم ( مەبەستی ئەوەیە بە ئاشکرا شوێن ئیسلام بکەوێ و لە مەککەدا لەگەڵیا بمێنێتەوە ) . فەرمووی :

(( إنَّكَ لا تستطيعُ ذلك يومك هذا ، ولكنِ ارجعْ إلى أهلِكَ فإذا سمعتَ بي قد ظهرتُ فالحَقْ بِي )) .

فەرمووی : ئەمڕۆ تۆ توانای ئەوەت نیە ، بەڵام بە موسڵمانێتیی بگەڕێرەوە بۆ ناو کەس وکارت و خەریکی دینداریی خۆت بە ، هەتا کە بیستت من

سەرکەوتووم ئەوا خۆت بگەیەنە لام .[١٠٠] ئەڵێ : بە موسڵمانێتیی گەڕامەوە بۆ ناو کەس وکارم . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد و منیش هەر هەواڵم ئەپرسی ، تا ئەوەبوو لە یەثریبەوە کاروانێك هات و وتم : ئەم مەککەیی یە چی یە هاتۆتە ناوتان ؟ وتیان : قەومەکەی ویستوویانە بی کوژن کەچیی نەیان توانیوە و دەستیان پێی نەگەیشتووە و ، کە ئێمەش هاتین خەڵکیی بە پەلە دەچوون بۆ لای . عەمری کوڕی عەبەسە ئەڵێت : منیش سواری وشترەکەم بووم هەتا گەیشتمە مەدینە و بە خزمەتی گەیشتم و وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا ئەم ناسیتەوە ؟ فەرمووی :

(( نعم ، أَلَسْتَ أنت الذي أَتَيتَنِي بِمَكَّةَ ؟ )) .

فەرمووی : بەڵێ ، ئەو پیاوە نیت کە لە مەککە هاتیتە لام ؟ ئەڵێ : وتم : بەڵێ . وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوەی کە خوای گەورە فێری کردوویت و من نایزانم فێرم بکە ... فەرموودەکەی بە درێژە هێناوە .

### چوارەم : ماڵی ئەرقەم

دوای ماوەیەك وا پێویست بوو شوێنێکی ئەمین دیاریی بکەن بۆ کۆبوونەوە و خواپەرستیی .. ئەوەبوو ماڵی ئەرقەم دیاریی کرا ، ئەویش لەبەر ئەوەی لە نزیك گردی صەفادا و ، لە کەناری شاردا بوو .. موسڵمانەکان لەو ماڵەدا بە نهێنیی کۆ ئەبوونەوە و ، خەریکی نوێژ و خواپەرستیی ئەبوون و ، پێغەمبەری خواش ﷺ ئیمان و بناغەکانی ئیسلامی تێ ئەگەیاندن و ، بە دڵی خۆی پەروەردەی ئەکردن، تا ئەوەبوو کۆمەڵە ئادەمی یەکی وەهای لێ پێ گەیاندن کە بە دڵ و بە گیان خوا و پێغەمبەریان خۆش بوێن و ، ببنە خاوەنی ورە و دامەزراوی یەك کە ملیان بۆ هیچ رەشەبایەك نەچەمێتەوە و ، هەموو سزا و ئازارێکیان بە لاوە ئاسان بێت .. ئیتر هەر کەس دڵی ئەچووە سەر ئەوە کە شوێنی دینی تازە بکەوێت بە نهێنیی خۆی ئەگەیاندە ماڵی ئەرقەم و نەی ئەهێشت قورەیش پێی بزانن .

پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی لەو ماڵەدا مانەوە و بەردەوام بە نهێنیی خەریکی خۆ شارەزاکردن بوون لە قورئان و فەرمانەکانی ، تا ئەوەبوو خوای گەورە هیدایەتی عومەری کوڕی خەططابی دا و ، بانگی ئیسلام ئاشکرا کرا .

---

[١٠٠] ئیمام نەوەویی وتوویە : ئەوە موعجیزەی پێغەمبەرایەتیی تێدایە ، بەوەی کە رای گەیاندووە سەر ئەکەوێ .

ئەم ماڵەی ئەرقەم یەکەم قوتابخانەیەك بوو کە لەسەر زەویی‌دا دامەزرا تا قورئانی پیرۆزی تێدا بخوێنرێ و ، موسڵمانە کەمەکانی مەککەی تێدا پەروەردە بکرێن .. ئەوەبوو دوای کۆچ کردن پێغەمبەری خوا ﷺ خانوویەکی لە مەدینەدا بە ئەرقەم بەخشی ، لە بریی ئەو خانووەی مەککەی کە دەوری قوتابخانەیەکی مەزنی بینیی ، ئیتر با پاداشتی قیامەتی بووەستێ ..

لەم قۆناغەدا بەرە بەرە قورئانی پیرۆز ئەهاتە خوارەوە .. ئایەتەکانی ئەم قۆناغە کورت و ، هێمن و ، دڵرفێن بوون .. ئەوانەی کە ئەیان‌بیستن شەیدایان ئەبوون .. بە تاسەوە گوێیان لێ ئەگرتن .. ئەوانەی خواپێ‌داو بوون و بە پاکیی گوێیان ئەگرت تەزکیەی نەفسی خۆیانیان ئەکرد و ، بە جارێ باوەشیان بە ئیمان‌دا ئەکرد و ، دنیایان بەلاوە یەکجار بێ‌بایەخ ئەبوو ، بە تایبەتیی ئەو ئایەتانەی کە باسی بەهەشت و دۆزەخیان ئەکرد ، ئەوەندە کاریگەر بوون ، ئەو کەسە وای ئەزانیی بە چاوی سەر بەهەشت و دۆزەخ ئەبینێ ..

**پێنجەم : نوێژ و خواپەرستیی**

پێش هاتنی وەحی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەچووە ئەشکەوتی ( حراء ) نوێژی ئەکرد ، دیارە بە پێی دینی ئیبراهیم پێغەمبەر . کە وەحیش هات هەر لە سەرەتاوە نوێژیش فەرمانی پێ کرا . موقاتیلی کوڕی سولەیمان وتوویە : هەر لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە خوای گەورە نوێژی فەرز کرد : دوو رەکعەت بەیانیان و دوو رەکعەتیش ئێواران ، ئەمەش بە بۆنەی فەرمایشتی خوای گەورەوە :

﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِبْكَـٰرِ ﴾ ( غافر : ٥٥ ) .

ئیبن حەجەریش وتوویە : بێ‌گومان پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها هاوەڵانیشی ، پێش شەوی ئیسرا نوێژی کردووە ، بەڵام ئیختیلاف لەوەدایە کە ئایا پێش پێنج فەرزەی نوێژ هیچ نوێژێکی تر فەرز بووە یان نا ؟ وتراوە کە نوێژێك پێش خۆرکەوتن و ، نوێژێکیش پێش خۆرئاوابوون فەرز بوون .

ئیبن هیشامیش ئەوەی باس کردووە کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی کە کاتی نوێژ ئەهات ئەچوون بۆ شیوەکان و ، لەوێ نوێژیان بەجێ ئەهێنا و ، نەیان‌ئەویست خزمەکانیان چاویان لێ بێت . ئەوەبوو جارێکیان ئەبوطالیبیش چاوی لە پێغەمبەر

ﷺ و عەلیی کوڕی بوو کە نوێژیان ئەکرد ، کە لە باسەکەیان تێگەیشت ڕەزامەندیی بۆ نواند و داوای کرد لە سەری بەردەوام بن .[١٠١]

لەم قۆناغەدا کە بانگەواز بە نهێنیی بوو و ، لە هەمان کاتیش‌دا فەردیی بوو ، وا دەرئەکەوێ کە هەندێ دەنگ‌وباسی دینی تازە بەرگوێی قوڕەیش کەوتبێ ، بەڵام شتێکی ئەوتۆ نەبوو کە بایەخی پێ بدرێ ، چونکە قوڕەیش لە سەرەتاوە وای‌ئەزانیی ئەم دین‌داری‌یەی موحەممەدیش وەك دین‌داریی هەندێ پیاوی ترە کە لە مەککە و دەوروبەری‌دا ئەژیان ، وەك ئومەییەی کوڕی صەڵت و قوسسی کوڕی ساعیدە و ، عەمری کوڕی نوفەیل . بەڵام بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار هەستیان کرد کە دینی تازە ڕووخاندنی بتەکانی ئەوانی مەبەستە و ، هەموو بیروباوەڕێك لەناو ئەبات ..

ماوەی سێ ساڵ بانگەواز بەم شێوەیە بوو ، کە لەم ماوەیەدا دەستەیەك ئیمان دار پێ‌گەیشتن کە بە ڕاستیی و پاکیی شوێن ئیمان کەوتبوون و ئەوپەڕی برایەتیی و کۆمەکیی و یارمەتیی‌دانیان بەرچاو ئەگرت ، تا فەرمانی خوا بگەیەنن و ، مەردمەکان لە خواناسیی شارەزا بکەن ..

**شەشەم : پاڵەوانی بێ باك**

لەم قۆناغەدا کە موسڵمانەکان هێشتا لەبەر کەمیی و کەم دەستی‌یان خۆیان ئاشکرا نەکردبوو ، ئەبوبەکری ئیمان‌دۆست داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا خۆیان و بانگەوازەکەیان ئاشکرا بکەن .. ئەمەش لە کاتێك‌دا کە ژمارەی ئیمان داران گەیشتبووە سیی و هەشت کەس . پێغەمبەری خواش ﷺ وەڵامی ئەدایەوە کە هێشتا موسڵمانەکان کەمن کە ئەی‌فەرموو :

(( یا أبابکر ! إنا قلیل )) .

ئەبوبەکری صددیق بەردەوام ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا دووبارە ئەکردەوە هەتا ماوەی دان دەرچن و بچنە ( المسجد الحرام ) . ئەوە بوو موسڵمانەکان ، هەر پیاوێك لەگەڵ عەشیرەتی خۆی‌دا ، لە کەعبەدا بڵاوەیان لێ کرد و ، ئەبوبەکر لەناو خەڵکەکەدا هەستایەوە و دەستی بە وتاردان کرد و پێغەمبەری خوایش ﷺ دانیشتبوو . ئەبوبەکر یەکەم وتاردەرێك بوو کە بانگ بۆ لای خوا و بۆ لای

[١٠١] سیرة إبن هشام : ١ / ٢٤٧ .

پێغەمبەرەکەی بکات . موشریکەکانیش بەگژی ئەبوبەکر و موسڵمانەکان دا هەڵ چوون . ئەوەبوو لە هەموو لایەوە موسڵمانەکان لێدانێکی توندیان لێ درا و کافران نیشتنە مل ئەبوبەکر و ، زۆریان لێ دا .. عوتبەی کوڕی رەبیعەش بە جووتێ نەعلی ئەستوورەوە دەستی بە لێدانی کرد و ، ئەیشی کێشان بە دەم و چاوی‌دا هەتا لە هۆش خۆی چوو و ، چەند پیاوێکی نەوەی تەیم هەڵیان گرت و بردیانەوە ماڵەوە و وتیان : ئەگەر ئەبوبەکر بمرێت ئێمە عوتبەی کوڕی رەبیعە ئەکوژین . ئەبوقوحافەی باوکی و خزمەکانی خەریکی بانگ لێ کردنی بوون ، تا ئەوەبوو لە کۆتایی ئەو رۆژەدا هۆشی بە خۆی‌دا هاتەوە ..

داخۆ کە ئەبوبەکر هۆشی بە خۆی‌دا هاتبێتەوە چیی کردبێ ؟ یەکەم وتەیەك کە بە دەمیا هات ئەوەبوو کە فەرمووی : پێغەمبەری خوا چیی کرد ؟ چ باوکی و چ خزمەکانی لەم هەواڵ پرسینەی بێزار بوون .. کاتێ کە تەنیا دایکی لەلای‌دا مابوویەوە لێی پرسیی : پێغەمبەری خوا چیی کرد ؟ وتی : بەخوا ئاگام لە هاوەڵەکەت نیە . فەرمووی : بچۆ بۆ لای ئوم جەمیل ـ واتە فاطیمە ــ ی کچی خەططاب و پرسیاری لێ بکە .. ئەویش هێشتا موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا نەکردبوو .. دایکی ئەبوبەکر چوو بۆی لای و وتی : ئەبوبەکر هەواڵی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای هاوەڵیت لێ ئەپرسێ . وتی : نە ئەبوبەکر ئەناسم و ، نە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵاش !! جا ئەگەر پێت خۆشە بێم لەگەڵتدا بۆ لای کوڕەکەت ئەوا دێم . وتی : بەڵێ . لەگەڵیا رۆیشت و ئەبینێ وا ئەبوبەکر لە جێگا کەوتووە و هیلاکە . ئوم جەمیل لێی نزیك کەوتەوە و بە دەنگی بەرز هاواری کرد: بەخوا ئەوانەی ئاوەها لێیان داوی کۆمەڵێکی فاسق و کافرن و ، هیواداریشم خوا تۆڵەت لێیان بسێنێ . فەرمووی : پێغەمبەری خوا چیی کرد ؟ وتی : ئەوە دایکتە و گوێی لێیە . فەرمووی : خەمی ئەوت نەبێ . وتی : ساغ و سەلامەتە ! فەرمووی : لە کوێیە ؟ وتی : وا لە ماڵی ئەرقەم . فەرمووی : مەرج بێت تا نەگەمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ نە نان و نە ئاو تام نەکەم .

وازیان لێ هێنا تا هاتوچۆ کەم بوویەوە و کۆڵانەکان چۆڵ بوون ، دوای ئەوە هەردوو ئافرەتەکە چوونە ژێر هەردوو باڵی ئەبوبەکر و ، گەیاندیانە خزمەتی پێغەمبەری خوا .. پێغەمبەری خواش ﷺ خۆی دا بەسەری‌دا و ماچی کرد و ، موسڵمانەکانیش ماچیان کرد .. پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرێك بەزەیی پیادا هاتەوە. ئەبوبەکر فەرمووی : دایك و

باوکم به قوربانت بن ، جگه لەوەی کە ئەو فاسقە دای لە دەم و چاوم هیچم نیە ، ئەمەش دایکمە و لەگەڵما چاکە ، تۆیش مویارەکی ، بۆ لای خوا بانگی بکە و دوعاشی بۆ بکە بەشکو خوای گەورە بە هۆی تۆوە لە ئاگر رزگاری بکا .

پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ کرد و ، بۆ ئیمانهێنان بە خواش بانگی کرد و، موسڵمان بوو .[١٠٢]

---

[١٠٢] البداية والنهاية : ٣ / ٣٠ .

## بەشی یانزەهەم
# قۆناغی بانگ بە ئاشکرا

**یەکەم : ئاشکراکردن**

دوای بەسەربردنی ماوەی نهێنیی ، خوای گەورە فەرمانی بەسەر پێغەمبەرەکەیدا ﷺ دا تا بانگ کردنی مەردمەکان بۆ لای خوا ئاشکرا بکات ، ئەمەش دوای بەسەرچوونی سێ ساڵ لە دوای هاتنی وەحی . ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە تا بانگ ئاشکرا بکات و پشتیش بکاتە کافران و موشریکان و بایەخێکیان پێ نەدات ، کە فەرمووی :

﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ ( الحجر : ٩٤ ) .

ئیتر ئەوەبوو پێغەمبەر و یارانی بانگی خواناسی‌یان ئاشکرا کرد .. بەڵام خزمەکانی بەم بانگەوازەی دوور نەکەوتنەوە و ، پەرچیان نەدایەوە و دژایەتی‌یان نەکرد ، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ باسی سووك و بێ‌کەڵکیی بتەکانی کرد و ، بیر و بۆچوونی پیاوماقووڵانی دایە دواوە و ، بۆشی دەرخستن ئەو رێباز و بۆچوونەی کە ئەوان لەسەرینی هەڵەیە و هەر هەمووی نەفامیی و پڕوپووچە ..

قورەیش کە زانی‌یان ئەم دینە تازەی موحەممەد ﷺ ئەیەوێ دین و بیروباوەڕەکەی ئەوان لەناو بەرێت ، کەوتنە دژایەتیی و ، بەرهەڵستی خۆی و هاوەڵانی وەستان ، بێ ئەوەی بەراوردی ئەم دوو بۆچوونە بکەن و بزانن کامیان راستە و چاکە و ، کامیان ژیریی پەسەندی ئەکات ..

ماوەیەك ویستیان بە بەڵگە و سەلماندن دینی تازە بدەنە دواوە ، کەچیی چاریان پێ نەکرا ، چونکە دینەکەی خۆیان هیچی لەگەڵ فیترەت‌دا نەئەگونجا و ، ئامۆژگاری‌یەکانی قورئانیش دڵانی کەمەندکێش ئەکرد . جا کە بەزێنران ، پەنایان بردە بەر جنێو و قسەی سووك و بوختان و پاگاندە و ، سزاو ئازاردان .. بەمە پێغەمبەر و هاوەڵانی کەوتنە بەر پلاری دوژمنانەی قورەیش و ، بەوپەڕی بێ‌ویژدانی‌یەوە ، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ ئازاری خواناسانیان دا و ، هەرچەندە ئەبوطالیب بەرگریشی لە موحەممەدی برازای ئەکرد ، بەڵام سزا و

چەرمەسەرییەکی سەختی چەشت و موسڵمانەکانیش بە یەکجاریی تەنگیان پێ هەڵ چنرا بوو ، بە تایبەتیی بەندەکان و موسڵمانە لاواز و بێکەسەکان ..

ئیمام ئەحمەد لە ئیبن عەباسەوە خوا لێیان رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : کاتێك کە خوای گەورە ئایەتی : ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾[١٠٣] ( الشعراء : ٢١٤ ) ی ناردە خوارەوە ، پێغەمبەر ﷺ هاتە لای صەفا و سەر کەوتە سەری ، پاشان هاواری کرد : ( يا صباحاه ! ) ئەوەبوو خەڵکەکە لێی کۆبوونەوە . پیاوی وا هەبوو خۆی ئەهات و هی وایش هەبوو لە بریی خۆی کەسێکی ئەنارد . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

(( يا بني عبدالمطلب ! يابني فهر ! يا بني كعب ! أرَأيتم لو أخبرتكم أنَّ خَيلاً بِسَفحِ هذا الجبلِ تريدُ أن تُغيرَ عليكم صَدَّقتُموني ؟ )) .

بانگی لێ کردن و پرسیاری لێ کردن کە ئەگەر هەواڵیان بداتێ کۆمەڵێك ئەسپ سوار وان لە بنی ئەو چیایەدا و ئەیانەوێ هێرشیان بکەنە سەر ، ئایا بڕوای پێ ئەکەن ؟ وتیان : بەڵێ .[١٠٤] فەرمووی :

(( فإني نذيرٌ لكم بين يدي عذاب شديد )) .

پێی راگەیاندن کە پێغەمبەری خوایە و پێی خۆشە ئیمان بهێنن تا لە سزایەکی سەختی چاوەڕوانکراو سەرفراز بن . ئەبولەهەب وتی : سەرانسەری رۆژ داوەشێیت، بۆ ئەمەت بانگ کردین ؟ ئەوەبوو خوای گەورەش سوورەتی :

﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ۝٣ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ۝٤ فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ﴾ ی ناردە خوارەوە . هەروەها بوخاریی و موسلیمیش لە شێوەی ئەمە تەخریجیان کردووە ، وەك لە ( البداية ٣ / ٣٨ ) دا هاتووە .[١٠٥]

هەروەها ئیمام ئەحمەد لە خاتوو عائیشەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : کاتێك ئایەتی ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ( تەشریفی بردە سەر صەفا ) و فەرمووی :

---

[١٠٣] ئەفەرموێ : خزمە نزیکەکانت بە سزای خوا بترسێنە ئەگەر ئیمان نەهێنن .
[١٠٤] لە ریوایەتەکەی بوخارییدا ئەڵێن : بەڵێ ، جگە لە راستگۆیی هیچمان لێ نەبیستووی !!
[١٠٥] شرح حياة الصحابة : ١ / ١٧٧ - ١٧٨ .

(( يا فاطمةَ ابنةَ محمد ﷺ ! يا صفيةَ ابنةَ عبدالمطلب ! يابني عبدالمطلب ! لا أملك لكم من الله شيئاً ، سلوني من مالي ما شئتم )) إنفرد بإخراجه مُسلمٌ ( ١ / ١١٤ ) .[١٠٦]

بانگ ئەکاتە فاطیمەی کچی و ، صەفییەی پووری و ، تێکڕای نەوەکانی عەبدولموطەللیب و پێیان ڕائەگەیەنێ کە بە تەما نەبن بە بۆنەی خزمایەتیی ئەمەوە خوا لێیان خۆش ببێ ، بەڵکو ئەگەر ئیمان نەهێنن پێغەمبەری خوا هیچیان بۆ ناکات و ، لە ماڵ و سامانی هەرچییان پێ خۆشە با داوای بکەن ..

هەروەها ئیمام ئەحمەد [ لە ( المسند ) دا ( ١١١/١ ) ] لە ئیمام عەلییەوە خوا لێی ڕازیی بێ تەخریجی کردووە کە فەرموویە : کاتێك کە ئەم ئایەتە :

﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ هاتە خوارەوە پێغەمبەر ﷺ ئەهل و کەس وکارەکەی خۆی کۆ کردنەوە ، کە ئەوەبوو سیی کەسیان لێ کۆبوویەوە، نانیان خوارد و ، ئاویان خواردەوە و ، پێی فەرموون :

(( مَن يَضمَنُ عَنّي دَيني وَمَواعيدي ويكونُ مَعِي في الجنة ويكونُ خليفتي في أهلي؟ )) .

پرسیاری لە مامەکانی و ئامۆزاکانی کرد کە کامیان ئامادەیە کەسی نزیکی بێت ، قەرزەکەی بۆ بداتەوە و سەروکاریی‌کەری ماڵ و منداڵیشی بێ ، کە ئەگەر لە پێناوی خوادا و لە کاتی ڕاگەیاندنی دینەکەیدا بکوژرێت ؟ پیاوێکیان وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لە سەخاوەت و سنگ فراوانییدا وەك دەریا وا بوویت ، کێ ئەتوانێ ئەو کارە ئەنجام بدات ؟ ئەفەرموێ : ئەمەی سێ جار فەرموو . ئەفەرموێ : ئەمەی خستە بەردەم ئەهل و کەس‌وکارەکەی . ئیمام عەلیی خوا لێی ڕازیی بێ فەرمووی : من .

دیسان ئیمام ئەحمەد [ لە ( المسند ) دا ( ١ / ١٥٩ ) ] لە ئیمام عەلییەوە خوا لێی ڕازیی بێ تەخریجی کردووە کە فەرموویە : پێغەمبەری خوا ﷺ نەوەی عبدولموطەللیبی کۆکردنەوە ، یان بانگ کردن ، کە کۆمەڵێکی زۆر بوون و ، هەریەکەیان ( جذعە ) یەکی ئەخوارد و یەك فەرەق یشی[١٠٧] ئەخواردەوە .

---

[١٠٦] شرح حياة الصحابة : ١ / ٢٠٢ - ٢٠٣ .

[١٠٧] جەذعە : بەو ئاژەڵە ئەوترێ کە لاو و بەهێز بێ . جا ئەو وشترەی کە پێی نابێتە ساڵی پێنجەم و ، ئەو مانگا و بزنەی پێیان نابێتە ساڵی دووهەم و ، ئەو مەڕەی کە ساڵێکی تەواو کردبێ پێی ئەڵێن جەذعە . فەرەقیش پێوانەیەکە کە شانزە ڕەتڵ ئەبێت و یەك ڕەتڵیش دوانزە مشتە .

ئەوەبوو یەك مشت خواردەمەنیی بۆ لیّ نان ، هەر هەموویان دەستیان بە خواردن کرد و تێریان خوارد و خواردەمەنیەکەش وەك خۆی مایەوە ، هەروەك دەستی لیّ نەدرابیّ . پاشان داوای دۆلکەیەکی بچووکی کرد ، هەموویان تێریان خواردەوە و خواردنەوەکەش وەك خۆی مایەوە ، هەروەك دەستی لیّ نەدرابیّ ، یان لیّی نەخورابێتەوە . فەرمووی :

(( يا بني عبدالمطلب ! إني بعثتُ إليكم خاصة وإلى الناس عامةً ، فقد رأيتم من هذه الآية ما رأيتُم ، فأيكم يبايعُني على أن يكونَ أخي وصاحبي ؟ )) .

فەرمووی : ئەی نەوەی عەبدولموطەللیب ! من بە پێغەمبەریی رەوانەکراوم بە تایبەتیی بۆ لای ئێوە و بە گشتییش بۆ لای هەموو خەڵکیی . موعجیزەی ئەو نان و ئاوەشتان بە چاوی خۆتان دیی . جا کێتان بەیعەتم ئەداتیّ هەتا برا و هاوەڵم بیّ ؟ ئەفەرمویّ : تاقەکەسێك هەڵ نەستایەوە . ئیمام ئەفەرمویّ : من کە بچووك ترینی خەڵکەکە بووم هەستامەوە بۆ لای و ، فەرمووی : دابنیشە . پاشان ئەمەی سیّجار فەرموو ، هەموو جاریّ هەڵ ئەستام و پیّمی ئەفەرموو : دابنیشە . هەتا جاری سیّهەم ئەوەبوو دەستی دا بەسەر دەستمدا. ( كذا في التفسير لإبن كثير: ٣ / ٣٥٠ ) .[١٠٨]

ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی ئازیزمان ﷺ .

**دووهەم : دژایەتیی ئەبولەهەب و هاوسەرەکەی**

ئەوەی کە زۆر سەیرە ئەبولەهەبی مامەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە ناوی عەبدولعوززا بووە ، کاتیّ کە ( ثويبة ) ی کەنیزەکی هەواڵی دایە کە ئامینەی هاوسەری عەبدوڵلای برای کوڕی بووە ، ئەبولەهەب لە مژدەیدا ئەو کەنیزەکەی ئازاد کرد ، کەچیی کاتێك کە وەحی بۆ ئازیز هات ، ئەبولەهەبی مامەی لە هەموو کەس خراپتر دژایەتیی ئەکرد .. ئەوەبوو لەسەر صەفا چۆن قسەی پیّ وت و پەرچی فەرمایشتەکانی دایەوە ، کە هیچ نەبیّ ئەبوایە لەبەر ئەوەی کە برازایەتی دەنگی نەکردایە ، با خەڵکی تر رەخنەی لیّ بگرتایە .

هەروەك ئەبولەهەب خۆی دژایەتیی دینی تازەی ئەکرد ، ئوم جەمیلی هاوسەریشی ، کە ناوی ئەڕوای کچی حەربی کوڕی ئومەییە و خوشکی ئەبوسوفیان بووە ، بە هەمان شێوە دژایەتیی ئەکرد ..

---

[١٠٨] شرح حياة الصحابة : ١ / ٢٠٣ ـ ٢٠٤ . هيثمي لە ٨ / ٣٠٢ دا وتوويە : رواه أحمد ورجاله ثقات ..

لە لایەکەوە خزمایەتیی و ، لە لایەکی ترەوە دراوسێیەتیی و ، لە لایەکی تریشەوە موحەممەدی رەوشت جوان و نەرم و نیان ، شیاوی دژایەتیی نیە .. چل و سێ ساڵ تەمەنی بە راستگۆیی و دەستپاکیی بەسەر بردووە .. تا ئێستە کارێکی نەکردووە کە دڵی هیچ کەسێك گەرد بگرێت ..

ئوم جەمیل هەوڵی ئەدا بە دووزمانیی و قسەهێنان و بردن نێوان پێغەمبەر و خەڵکیی تێك بدات .. دڕك و داڵی کۆ ئەکردەوە و ئەیخستە رێگاکەیەوە و ، پیسیی فڕێ ئەدایە بەر دەرگاکەی و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ دووری ئەخستەوە و دەیفەرموو :

(( أي جوار هذا يا بني عبدمناف ؟ )) .

ئەیفەرموو : ئەمە چۆن دراوسێیەتی‌یەکە ئەی نەوەی عەبدمەناف ؟

ئەمە رەفتاری ئەو ژن و مێردە نامەردە بوو .. تا ئەوەبوو خوای گەورە سوورەتی ( تبت يدا ) ی نارده خوارەوە و مژدەی بە هەردووکیان دا کە هەردووکیان ئەبنە سووتەمەنیی دۆزەخ ..

ئەمە یەکێکە لە موعجیزەکان ، لە سەرەتای بانگەوازەوە قورئان بڕیاری دا ئەبولەهەب و ئەڕوای هاوسەری دۆزەخیین ، واتە ئیمان ناهێنن !!

کاتێك کە ئوم جەمیل بیستی وا دەربارەی خۆی و مێردەکەی قورئان هاتۆتە خوارەوە ، هەستا و بەرەو مزگەوت کەوتە رێ تا تۆڵە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بسێنێ .. لەوکاتەدا ئەویش لە مزگەوتدا ، لە پەنای کەعبەدا لەگەڵ ئەبوبەکردا دانیشتبوو و ، ئوم جەمیلیش بەردێکی پڕ بە مشتی هەڵ گرتبوو و ، کە نزیکیان کەوتەوە خوای گەورە چاوی لە ئاستی پێغەمبەردا ﷺ لە بینین خست و تەنها ئەبوبەکری ئەبینی !! ئەمەش یەکێکی تر لە موعجیزەکانی ئازیزە ﷺ . وتی : ئەبوبەکر ! ئەوە هاوەڵەکەت کوا ؟ پێم گەیشتووە کە هەجووی کردووم . بەخوا ئەگەر بیبینم ئەم بەردە ئەکێشم بە دەمیا .. بەخوا منیش شاعیرم ، پاشان وتی :

مُـذَمَّـماً عَـصَـيْنا وَأَمْـرُهُ أَبَـيْـنا

ودينُـه قَـلَـيْـنا

ئیتر رۆیشت .

ئەبوبەکر فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا نەتی بینی ؟ فەرمووی :

(( ما رأتني ، لقد أخذ اللهُ بِبَصَرِها عَني )) .

فەرمووی : نەیبینیم ، خوای گەورە لە ئاستی بینینی مندا چاوی لە بینین خست .

لەو کاتەدا قورەیش ئەوەندە رقیان لە پێغەمبەری خوا بوو و ، ئەوەندەش ناوەکەی لەسەر زمانیان قورس بوو لە جیاتیی موحەممەد موذەممەم یان پێ ئەوت و ، لە جیاتی ( محمد ) جنێویان بە ( مُذَمَّم ) ئەدا . چونکە موحەممەد واتە سوپاسی زۆری کرابێ ئەوان ئەیان گۆڕیی بۆ ئەوە کە زەمی زۆری کرابێ ..

جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بە منەتێکی خوایی ئەزانی ، کە قورەیشی لەوە لا داوە کە جنێوی پێ بدەن ، چونکە جنێو و قسەیان بە مذمم ئەدا نەك بە محمد ، کە ئەیفەرموو :

(( ألا تعجبون لما يصرفُ الله عني من أذى قريش ، يسبون ويهجون مذمماً ، وأنا محمد )) !![109]

ئەمەش نیعمەتیکی خوایی بوو ، پاك و بێگەردیی بۆ خوای بەرز و بەتوانا ..

لە ریوایەتێکی تردا کە طبرانیی لە ( الأوسط ) دا لە رەبیعەی کوڕی عەبباد یان عوبەیدی دەیلییەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : چیتان لێ ئەبیستم کە ئەڵێن قورەیش بە خراپە ناوی پێغەمبەری خوایان ﷺ ئەبرد و جنێویان پێ ئەدا ، من لە هەمووتان زیاتر چاوم لێ بووە ، چونکە ماڵەکەی لە نێوان ماڵی ئەبولەهەب و عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیطدا بوو . کە ئەگەڕایەوە ماڵەوە ئەیبینیی وا رەحەمی ئاژەڵ و خوێن و شتی پیس و چەپەڵ فرێ دراوەتە بەر دەرگاکەی ، ئەویش بەسەری کەوانەکەی فرێی ئەدان و ئەی فەرموو :

(( بِئسَ الجِوارُ هذا يا معشر قريش ))!

ئەیفەرموو : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! ئای کە دراوسێیەتییتان خراپە ![110]

ئەبولەهەبی مامی بەمەوە نەوەستا ، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەر بازار و کۆڕ و کۆمەڵێك بچوایە دوای ئەکەوت و هەوڵی ئەدا بە درۆی بخاتەوە ، بە تایبەت لە وەرزی حەجدا .

---

[109] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٢٩٢ ـ ٢٩٣ .

[110] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٥٥ ـ ٤٥٦ .

ئیمام ئەحمەد لە ( المسند ) دا لە پیاوێکەوە ( کە ناوی رەبیعەی کوڕی عەبباد بووە ) ریوایەتی کردووە کە وتوویە : لە سەردەمی نەفامییدا و لە بازاڕی ( ذي المجاز ) دا پێغەمبەری خوام ﷺ دیوە کە ئەیفەرموو :
(( يا أيها الناس ! قولوا : لا إله إلاّ الله تفلحوا )) .
ئەیفەرموو: خەڵکینە ! بڵێن : ( لا إله إلاّ الله ) سەرکەوتوو و سەرفراز ئەبن . جا خەڵکیی لە دەوری کۆ ئەبوونەوە و ، پیاوێکی دەم و چاو گەشاوەی خێلیش کە دوو پەلکەی بە سەرەوە بوون بە دوایەوە بوو و ، ئەیوت : ئەمە لە دین وەرگەڕاوە و درۆزنە !! بۆ هەر کوێ بچوایە شوێنی ئەکەوت . منیش دەربارەی پرسیارم کرد ، وتیان : ئەبولەهەبی مامەیەتی .[111]
هەروەها طبەرانیی بە شێوەی ( مرسل ) لە قەتادەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : عوتەیبەی کوڕی ئەبولەهەب ئوم کولثوومی کچی پێغەمبەری خوای ﷺ مارە کردبوو و ، روقیەش دەستگیرانی عوتبەی کوڕی ئەبولەهەبی برای بوو و ، هێشتا نەیگواستبووەوە ، تا ئەوەبوو وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ هات . جا کاتێ کە فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ﴾ هاتە خوارەوە ، ئەبولەهەب بە عوتبە و عوتەیبەی وت : سەرم لە سەرتان حەرام بێت ( واتە پەیوەندییم پێتانەوە نەمێنێ ) ، ئەگەر هەردوو کچەکەی موحەممەد تەڵاق نەدەن . دایکیشیان[112] کچی حەربی کوڕی ئومەییە ـ کە ( حمالة الحطب ) ە ـ وتی : کوڕەکانم ! هەردووکیان تەڵاق بدەن ، چونکە هەردووکیان لە دین وەرگەڕاون . ئەوانیش تەڵاقیان دان . کاتێ کە عوتەیبە ئومکولثوومی تەڵاق دا هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و وتی : بە دینەت کافرم و کچەکەشتم تەڵاق دا .. نە بێیتە لام و نە بێمە لات ، پاشان هەڵمەتی دایە پێغەمبەر ﷺ و کراسەکەی دڕیی ، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە عوتەیبە نیازی هەبوو بۆ بازرگانیی بەرەو شام بکەوێتە رێ .. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :
(( أما إني أسأل الله أن يسلط عليك كلبه )) .

---

[111] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٢٩٣ ـ ٢٩٤ .
[112] کە ئوم جەمیلە و یەکێکە لە ئافرەتە ناودارەکانی قورەیش و بۆ دژایەتیی ئیسلام و موسڵمانان یارمەتی دەری مێردەکەی بوو ، بۆیە لە قیامەتیشدا پێکەوە سزا دەچێژن ..

فەرمووی : داواکارم خوای گەورە شێرەکەیت بۆ بنێرێ .. ئەوەبوو لەگەڵ کۆمەڵێك بازرگانی قورەیشییدا کەوتنە ڕێ هەتا گەیشتنە شوێنێك کە پێی ئەوترێ ( الزرقاء ) [١١٣] و شەو لەوێ باریان خست .. ئەو شەوە شێرێك هات و بە دەوریان دا سووڕایەوە و عوتەیبەش ئەیوت : دایکە ڕۆ ! بەخوا ئەمە ، وەك موحەممەد وتوویە ئەم خوات .. موحەممەد وا لە مەککە و منیش لە شام کەچیی ئەم کوژێ .. شێرەکە هات و لەناو ئەو خەڵکەدا هەڵمەتی دایە عوتەیبە و گازێکی پڕ بە پڕی دەمی لێ گرت و کوشتی ..

زوهەیری کوڕی عەلاء وتوویە : هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە بۆمانی باس کردووە کە ئەو شەوە شێرەکە بە دەوریان دا سووڕاوەتەوە دوای ئەوە ڕۆیشتووە و ، ئەوانیش خەوتوون و ، عوتەیبە ئەخەنە ناوەڕاستی بازرگانەکانەوە . کەچیی شێرەکە دێتەوە و هەنگاویان بەسەردا ئەنێ و ، قەپێك بە سەری عوتەیبەدا ئەکات و تێکی ئەشکێنێ .. ئەوەبوو دوای کۆچی دوایی روقیە ، عوثمانی کوڕی عەففان ئوم کولثوومیش مارە ئەکات ، خوا لە هەموویان ڕازیی بێ . [١١٤]

**سێهەم : بەرگریی و خۆشەویستیی ئەبوطالیب**

بە پێچەوانەی ئەبولەهەبەوە ، ئەبوطالیبی ڕیش سپیی و ، سەردار و ، پیاوماقوولی قورەیش ، موحەممەدی برازای یەکجار خۆش ئەویست و ، دڵی پێ ئەسووتا . ئەوەبوو بە منداڵیی بە چاکیی چاودێریی ئەکرد و ، کاتێکیش کە بووە پیاوی ناو پیاوان و ، کاری بانگەواز خرایە ئەستۆی ، بەرگریی لێ ئەکرد و ، بە هەموو شێوەیەك ئەیپاراست و ، دژی هەڵوێستی قورەیشییەکان ئەوەستا ، هەرچەندە لەسەر دینی قورەیش مابوویەوە و ، موسڵمان نەبوو بوو .

جا موسڵمان نەبوونی ئەبوطالیب لەو بارودۆخە ناسکەدا حیکمەتێکی زۆر گەورەی تێدا بوو و ، بەو بۆنەشەوە بوو ئەیتوانیی بەرگریی لە پێغەمبەری خوا بکات . چونکە ئەگەر ئەبوطالیب موسڵمان ببوایە ئەوا قورەیش ڕقیان لێ هەڵ ئەگرت و ، لەبەر چاویان ئەکەوت و ، هیچ قسەیەکیشی لێ وەرنەئەگیرا ، بگرە هیچ ڕێزێکی بۆ دانەئەنرا و ، بە دەست و بە زمان ئازاریان ئەدا .. ئەمە ئەخشەی

---

[١١٣] شوێنێکە لە شام و نزیك ( معان ) کە بە دڕندەی زۆر و دڕ بەناوبانگە .

[١١٤] شرح حياة الصحابة : ١/ ٤٥٤ _ ٤٥٥ . بە لای ( هيثمي ) يەوە زوهەير ( ضعيف )ە ، بەلام ئيبن حيببان بە ( ثقة ) ی داناوە .

ڕەنگینــی پــەروەردگارە و ئەوپــەڕی دانایــەتیی بــوو و ، بەرژەوەنــدیی بــانگی ئیسلامیش لەوەدا بوو ..

بەڵێ ئازیزانم ! ئەمە دوو مامەی پێغەمبەری خوان ﷺ کە لە جێی بـاوکن بـۆ ئەو .. یـەکێکیان ئەوپـەڕی دژایـەتیی ئـەکات و، بێشـەرمانە بـە خـۆی و ژن و منالێیەوە ئازاری دڵی خۆی و خانەوادەکەی ئەدەن . ئەوی تریشیان ئامادەیە سەری لە پێناوی ئازیزدا دابنێ ، کەچیی هیچ کامیـان موسـڵمان نـابێ و واز لـە دینـی قورەیش ناهێنێ .

خۆ ئەگەر ئەم دووانە موسـڵمان ببوونایـە ، ئـەوا خـەڵکیی هـەلیان بـۆ هـەڵ ئەکەوت تا بڵێن : کە ئەم دوو پیاوە ماقووڵەی نەوەی هاشم لەبەر ئەوە موسـڵمان بوون تا پشتی موحەممەدی برازایان بگرن و ، بەو بۆنەوە هێزێـك پێـك بهێـنن بـۆ بەدەست هێنانی کاروباری دنیایی و ، سەرەنجام خۆیان وەك گەورە و سـەرۆك و دەم ڕاستی ئەو خەڵکە لە قەڵـەم بـدەن . کەواتـە موسـڵمان بـوونی ئـەو دووانـە لـە بەرژەوەندیی ئیسلامدا نەبوو ..

بەڵێ ئازیزانم ! کارەکانی خوا هەر هەموویان جوان و ڕەنگینن .. با هەرگیز بـۆ هیچ بڕیارێکی خوا ناڕەزایی و پێ ناخـۆش بـوون دەرنـەبڕین .. خوای گەورە خۆی چاك ئەزانێ ..

لەولاوە خوای گەورە ویستی وەها بوو ، لە کـاتێکی زۆر ناسـكدا ، یـەکێ لـە مامەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت و موسڵمان ببێ .. حەمزەی پاڵەوان خوا لێی ڕازیی بێ لە ڕۆژێكدا کە لە بەرژەوەندیی ئیسلامدا بێت ، دێت و ئیمان بە خـوا و بە ڕۆژی دوایی ئەهێنێ .. لە هەمان کاتدا مامەیەکی تـری کـە عـەبباسـە خـوا لێی ڕازیی بێ موسڵمان نەبێ ، بەڵام وا زوو نا ، بەڵکو موسڵمان بوونی خـۆی لـە شەوی فـەتحی مـەککـەدا ئاشـکرا کـرد .. ئەمـەش دیسـان بەرژەوەنـدیی بـانگی ئیسلامی تێدا بـوو .. ئەگـەر وا نەبوایـە عـەبباس نەیئـەتوانیی لـە مـەککـەدا بمێنێتەوە و، ببێتە چاودێر بەسەر قورەیشەوە و، بە وردیی پێغەمبەری خوا ﷺ لـە هەموو هەڵس وکەوتێکی قورەیش ئاگادار بکات ..

لەگەڵ ئـەوەدا کـە ئـەبوطالیـب خـاوەنی ڕێـز بـوو و ، بـەرگریی تـەواوی لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەکرد ، هـێشتا پێغـەمبەر و مـوسـڵمانەکان لـە سـزای

درندانەی قوڕەیش دەرباز نەبوون .. هەموو جۆرە ئازارێکیان ئەدان .. جنێویان ئەدا و ، گاڵتەیان ئەکرد ، هەتا هەوڵی کوشتنیان ئەدا ..
بەڵێ ئازیزان ! ئازیزمان تووشی ناڕەحەتیی و چەرمەسەریی زۆر هات ، بەڵام بێ ئەوەی هیچێ لەو سزا و ئازارانە بتوانن ورەی پێ بەر بدەن ، یان دەستی لە کارکردن و هەوڵ دان سارد بکەنەوە .. بەڵکو مەردانە و شێرانە بڕیاری دا تا دوا هەناسەی ژیانی و ، تا ڕژانی دوا دڵۆپی خوێنی گەشی خەریکی بانگ‌کردن بێ بۆ لای خوا .. خەریکی ڕزگارکردنی ئادەمی‌یەکان بێ لە سزای سەختی ئاگری دۆزەخ .. خەریکی پاك‌کردنەوەی دڵەکان بێت ، تا دژایەتیی و خراپ‌کاری‌یان تێ‌دا ریشەکەن ببێ و ، لە جێ‌یان‌دا خۆشەویستیی و بەزەیی جێ‌گیر ببێ ..
ئەم هەڵوێستە بەرزەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێویست بوو ، چونکە :
یەکەم : خوای گەورە فەرمانی پێ داوە و لەسەری بە پێویست گێڕاوە کە ببێتە ڕزگارکەری مرۆڤایەتیی .
دووهەم : هەموو پێغەمبەرێکی پێش خۆی مژدەی هاتنی ڕزگارکەری ئاخرزەمانی داوە .
سێ‌هەم : مرۆڤەکان پێویستی‌یان بە ڕزگارکەر هەیە و ، سەرزەویی تینووی دوا بەرنامەی ئاسمانە و ، گوزەرانی سەرزەویی بەبێ ڕزگارکەر مەحاڵە ..
لەم ڕوانگەوە ئەو موسڵمانانەی سەردەمی ئازیز و ئەوانەش کە دوای ئەوان هاتوون و تا ڕۆژی قیامەت دێن هەر هەموویان شاگردیی ئازیز ئەکەن تا کاری ڕزگاریی‌خوازیی بە چاك ترین شێوە ئەنجام بدرێت و ، خۆشیان وەك هەموو ئادەمی‌یەك ڕزگار و سەرفراز بن .
**چوارەم : دژایەتیی ئەبوجەهل**
نازناوی ئەبوجەهل پێغەمبەری خوا ﷺ لێی ناوە ، ئەگینا نازناوی ئەبولحەکەم بووە و ، ناویشی عەمری کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی مەخزوومی‌یە .
پێغەمبەری خوا ﷺ بە فیرعەونی ئەم ئوممەتەی لە قەڵەم داوە .
ئەبوجەهل لە هەموو کەس زیاتر دژایەتیی دینی نوێی ئەکرد .. جگە لەوەی کە نەگبەتیی یەخەی پێ‌گرتبوو و حەزی لە کوفر و ستەم بوو ، لەولاشەوە ڕقێکی لە نەوەی هاشم بوو و ، وەك مەخزوومی‌یەك پێی خۆش بوو لە شەرەف و

پایەدارییدا پێشیان بداتەوە .. بۆیە کە هەواڵی دینی تازەی بیست بە رق و قینێکەوە وتی :

ئەی کۆمەڵی قورەیش ! موحەممەد هیچی ناوێ جگە لەوەی کە ئەیبینن کە بریتییە لە عەیبدارکردنی دینەکەمان و ، جنێودان بە باوباپیرمان و ، بە شێت و لێوە دەرکردنی پیاوە ژیرەکانمان و ، سووکایەتیی کردن بە خواکانمان .. دەی من بەڵێن بە خوا ئەدەم کە سبەینێ بە بەردێکەوە بۆی دائەنیشم ، جا کە لە نوێژەکەیدا سەجدەی برد ، سەری پێ لەت ئەکەم ، جا با نەوەی عەبدمەناف چییان پێ خۆشە بیکەن ..

بۆ سبەینێ ئەبوجەهل بەردێکی بە دەستەوە گرت و ، بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت هەتا بێت .. ئەوەبوو تەشریفی هێنا و لە نێوان هەردوو روکنی کەعبەدا ، روکنی ئەسوەد و روکنی یەمانییدا دەستی بە نوێژ کرد و ، قورەیشییەکانیش هەر کۆمەڵە و لە شوێنی کۆڕ و کۆمەڵی خۆیاندا دانیشتن و چاوەڕوان بوون .. کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەجدەی برد ، ئەبوجەهل دەستی دایە بەردەکە و، بە دزە دزە بەرەو رووی هات ، تا کە لێی نزیك کەوتەوە ، رەنگی زەرد بوو و ، ترسی لێ نیشت و ، هەردوو دەستی بە بەردەکەوە وشك بوون و هۆشی لە خۆی نەما و ، بەردەکەشی لە دەست کەوتە خوارەوە و ، بە چاوی زاقەوە گەڕایەوە دوا ..

قورەیش ئاگادار بوون .. بگرە بە تایبەت زۆرێکیان بە بۆنەی بەڵێنەکەی ئەبوجەهلەوە لەوێ جەم بوو بوون ، هەموو چاویان لە پاڵەوان بوو کە لە ئازیزی پارێزراو چووە پێشەوە .. بە تەما بوون بەردی پیا بکێشێ .. کەچیی ئەبینن ئەبوجەهلێکی وشکی وەك شۆڕە بیی لەرزیو بەردەکەی فڕێ دا و گەڕایەوە دواوە .. چەند پیاوێك هەڵسان و هاتن بە دەمیەوە و ، پرسییان : چیتە ، ئەبولحەکەم ؟! وتی : هەستام بۆی تا نەخشەکەی دوێنێ ئەنجام بدەم ، کەچیی کە لێی نزیك کەوتمەوە ، نێرە وشترێك هاتە رێم .. بەخوا هەرگیز نێرە وشترم لە شێوەی کەللەسەر و مل و کەڵبەی ئەو وشترەدا نەدیوە . ویستی بمخوات .

ئیبن ئیسحاق وتوویە : بۆم باس کراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە :

(( ذلك جبريل ، ولو دنا منه لأخذه )) .

فەرموویە : ئەوە جیبریل بووە ، ئەگەر نزیك بکەوتایەتەوە لەناوی ئەبرد ..

جارێکی تریش ئەبوجەهل ئەڵێت : بەڵێن بەخوا ئەدەم کە ئەگەر موحەممەد لە سەجدەدا ببینم ئەچمە سەر ملی و ، دەم و چاویشی لە خۆڵ هەڵ ئەسووم . ئەوەبوو بەرەو رووی پێغەمبەری خوا ﷺ هات بچێتە سەر ملی ، کەچیی لە ناکاو بەرەو دواوە پاشەکشەی ئەکرد و ، بە هەردوو دەستی خۆی ئەپاراست .. پێیان وت : ئەوە چیتە ؟ وتی : لە نێوان من و ئەودا چاڵێك ئاگر و ، ترس و لەرز و ، باڵ هەن . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :

(( لو دنا مني لاختطفته الملائكة )) .

فەرمووی : ئەگەر لێم نزیك بکەوتایەتەوە مەلائیکەت ئەیان فڕاند .. [115]

هەروەها بەیهەقییش لە عەبباس ەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : رۆژێکیان لە مزگەوتدا بووم ، ئەبینم وا ئەبوجەهل ـ بەر لەعنەتی خوا بکەوێ ـ هات و وتی : بەڵێن بە خوا ئەدەم کە ئەگەر موحەممەد لە سەجدەدا ببینم بچمە سەر ملی . منیش خێرا دەرچووم و خۆم گەیاندە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و چوومە ژوورەوە لای و هەواڵی وتەکەی ئەبوجەهلم دا پێی . ئەویش بە تووڕەیی لە ماڵ دەرچوو و هات بۆ مزگەوت . ئەوەندە پەلەی بوو لە دەرگاوە نەهاتە ژوورەوە، بەڵکو بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوت . منیش وتم : ئەمڕۆ رۆژێکی ناهەموارە . ئیزارەکەم کۆکردەوە و ، کەوتمە شوێنی . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە خوێندنی : ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ﴾ ( العلق : ١ - ٢ ) کرد و ، کاتێ کە گەیشتە لای ئەو ئایەتانەی کە باسی ئەبوجەهل ئەکەن : ﴿ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ۝٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ﴾ ( العلق : ٦ - ٧ ) ، پیاوێك بە ئەبوجەهلی وت : ئەبولحەکەم ! ئەوە موحەممەدە . ئەبوجەهلیش وتی : ئەوەی من ئەیبینم ئێوەش نایبینن ؟ بەخوا ! ئاسۆی ئاسمانم لێ داخراوە . ( لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : نێوان من و ئەو بە سوپای مەلائیکەت داپۆشراوە .. ) کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە کۆتایی سوورەتەکە سەجدەی برد . ( کذا في البداية: ٣ / ٤٣ ) . [116]

لە ریوایەتێکی تردا هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانی ( ٦ ـ ١٩ ) ی کۆتایی سوورەتی ( العلق ) وەها باس کراوە کە ئەبوجەهل بەلای پێغەمبەردا ﷺ کە

---

[115] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٢٩٥ .

[116] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٥٢ - ٤٥٣ .

نوێژ ئەکات تێ ئەپەڕێ ، ئەمەش دوای ئەوەی چەند جارێك ویستبووی دەست درێژیی بکاتە سەر پێغەمبەر و خوای گەورە پارێزگاریی لێ کرد بوو و ، ئەبوجەهلی خەجاڵەت کردبوو ، ئەڵێت : پێمان نەوتووی نوێژ نەکەی ، ئەی موحەممەد ؟ خۆ ئەزانیی لە مەککەدا هیچ کەس لە من زیاتر پشتیوانی نیە . پێغەمبەر ﷺ گوێی پێ نەدا و لێیشی تووڕە بوو . ئەوەبوو ئەبوجەهل بە سەرشۆڕیی گەڕایە دواوە و ، خوای گەورەش دەربارەی ئەبوجەهل و نەزان کاریی و خراپەکانی ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارەوە :

﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ۝٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ۝٧ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ۝٨ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ ۝٩ عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ۝١٠ أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ۝١١ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ۝١٢ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١٣ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ۝١٤ كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ۝١٥ نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ ۝١٦ فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ ۝١٧ سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ۝١٨ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب ۩ ﴾ ( العلق : ٦ - ١٩ ) .[١١٧]

**پێنجەم : عوقبەی بەدبەخت**

لەناو ملهوڕانی قوڕەیشدا عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیط زیاتر خۆی بەدبەخت و خەجاڵەت کرد .. ئەوەتا بوخاریی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەتی کردووە کە : جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە نزیك ماڵی خوادا نوێژی ئەکرد و ، ئەبوجەهل و چەند هاوەڵێکیشی دانیشتبوون . بە یەکتریيان وت: کێتان ئەچێ مندالدانی وشتری ئەوەی فلان دێنێ و ، ئەیخاتە سەرپشتی موحەممەد کاتێ کە بە سەجدەدا ئەچێ ؟ بەدبەختی هەموو خەڵکەکە ، ( عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیط )[١١٨] هەڵمەتی دا و چوو هێنای و ، دانی بە خۆدا گرت هەتا پێغەمبەری خوا سەجدەی برد و ، ئەویش خستیە سەر پشتی لە نێوان هەردوو شانیدا . منیش ( واتە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ) سەیرم ئەکرد و هیچم لێ نەئەهات ، خۆزگە دەسەڵاتم ببوایە . ئەوانیش پێ ئەکەنین و ، خۆیان ئەدا بەسەر یەکتریدا ( بۆ خۆشیی و رابواردن ) و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ وا لە سەجدەدا و ، سەر بەرز ناکاتەوە ، هەتا فاطیمە هات و ، لەسەر پشتی فڕێی دا و ، سەری بەرز کردەوە ، پاشان فەرمووی : (( أللهم عليك بقريش )) . سێ جار . فەرمووی :

---

[١١٧] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٢٩٦ .
[١١٨] صحيح البخاري : ١ / ٥٤٣ .

خوایه ! تۆڵە لە قورەیش بسێنی . کە دوعـای لیٚ کـردن قورەیشـیـیەکان زۆریـان بەلاوە ناڕەحەت بوو و ، بە لایانەوە وەها بوو کە دوعاکردن لەو شارەدا گیرا ئەبێت . پاشان پێغەمبەر ﷺ ناوی هێنان و فەرمووی :

(( أللهم عليكَ بأبي جَهلٍ ، وعليك بعتبة بن ربيعة ، وشيبة بن ربيعة ، والوليد بن عتبة ، وأمية بن خلف ، وعقبة بن أبي معيط )) .

فەرمووی : خوایە ! تۆڵە لە ئەبوجەهل و ، عوتبە و ، شەیبە و ، ولید و ، ئومەییە و ، عوقبە بسێنی ، حەوتەمیشی ناو هێنا ، بەڵام لەبەری نەکردبوو . دە بەو کەسەی کە گیانمی بە دەستە ، هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی بردن بە چاوی خۆم دینم بە کوژراویی خرانە بیرەکەوە ، بیرەکەی بەدر .[119]

طبەرانییش لە حاریثی کوڕی حاریث ەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : بە باوکمم وت : ئەم کۆمەڵە خەڵکە چین ؟ وتـی : ئەمانـە لـە دەوری پیـاوێکی لـە دیـن وەرگەڕاوی خۆیان کۆبوونەتەوە . ئەڵێت : ئێمەش دابەزین و ، ئەبینین پێغەمبـەری خوا ﷺ خەڵکەکە بۆ ناسینی خوای گەورە بە تاك و تـەنیا و ئیمـان‌هێنـان بـانگ ئەکات و ، ئەوانیش پەرچی قسەکانی ئەدەنەوە و ، ئازاری پـیٚ ئەگەیـەنن هـەتا ڕۆژ نیوە بوو و ، خەڵکەکەی دەوری بڵاوەیان لیٚ کرد و ، ئافرەتێـك کـە سـەرووی سنگی دەرکەوتبوو هات و دۆلکەیەك و دەستەسرێکی پیٚ بوون و پێغەمبەری خـوا ﷺ لێی وەرگرت و ئاوی خواردەوە و دەست نوێژیشی گرت و ، پاشان سەری بـەرز کردەوە بۆ لای و فەرمووی :

(( يا بنيَّة ! خَمِّري عليك نحرِك ولا تخافي على أبيكِ )) .

فەرمووی : کچەکەم ! سنگت داپۆشە و بۆ باوکت ترست بە دڵدا نەیەت . وتمان : ئەمە کیٚیە ؟ وتیان : ئەمە زەینەبی کچیەتی خوا لێی ڕازیی بیٚ .

قال الهيثمي ( ٦ / ٢١ ) رجاله ثقات .[120]

هەروەها طبەرانیـی لە مونیب ی ئەزدیـیەوە تەخریجی کردووە کە وتوویـە : لـە سەردەمی نەفامییدا چاوم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کە ئەیفەرموو :

(( يا أيها الناس ! قولوا لا إله إلا الله تفلحوا )) .

---

[119] صحيح البخاري : ١ / ٣٧ .

[120] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٤٣ .

ئەیفەرموو : خەڵكینە ! بڵێن : ( لا إله إلا الله ) ئیتر سەرفراز و سەرکەوتوو ئەبن . جا هی وایان هەبوو کە تفی لە دەم و چاوی ئەکرد و ، هی واشیان هەبوو کە خۆڵی بە سەریدا ئەکرد و ، هی واشیان هەبوو جنێوی پێ ئەدا هەتا ڕۆژ نیوە بوو ، ئەوەبوو کچۆڵەیەك بە دۆلکەیەك ئاوەوە هات و دەست و دەم و چاوی بۆ شۆرد و ، ئەویش فەرمووی :

(( یا بنیة ! لا تَخشَي عَلى أبيكِ غيلَةً ولا ذِلَّةً )) .

فەرمووی : کچەکەم ! نەترسی باوکت لەناو ببرێت ، یان زەلیل ببێ . وتم : ئەمە کێیە ؟ وتیان : زەینەبی کچی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە کچۆڵەیەکی جوانکیلە بوو.. قال الهيثمي ( ٦ / ٢١ ) وفيه مُنبت بنُ مُدرِك ، ولم أَعرِفْهُ، وبقية رجاله ثِقات .[١٢١]

قورەیش سزا و ئازاری ئەو پیاوە موبارەکەیان زۆر دا .. پیاوێك تەمەنی لە چل ساڵیی تێپەڕیبێ و هێشتا درۆیەکی لێ نەبیسترا بێ .. هیچ خراپەیەکی لێ نەوەشابێتەوە ، کەچیی لە پەنای کەعبەی پیرۆزدا ئەو هەمووە ئازارەی پێ بچێژرێ .. ڕۆژێك نەبێ و دوان نەبێ .. چەند بێویژدان بوون دەرهەق بە ( رحمة للعالمین ) ؟ .

بوخاریی لە عورووەوە خوا لێی ڕازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : پرسیارم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص خوا لێیان ڕازیی بێ کرد و وتم : هەواڵی ناڕەحەتترین کارێکم بدەرێ کە موشریکەکان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامیان دابێ . وتی : لە کاتێك‌دا کە پێغەمبەر ﷺ لە حیجری کەعبەدا[١٢٢] نوێژی بەجێ ئەهێنا ، عوقبەی کوڕی ئەبومعەیط هات و کراسەکەی خستە ملی پێغەمبەر ﷺ و لە ملی‌دا توندی کردەوە و خەریك بوو بیخنکێنێ . ئیتر ئەوەبوو ئەبوبەکر خوا لێی ڕازیی بێ هات و شانی عوقبەی گرت و لە پێغەمبەر ﷺ دووری خستەوە و فەرمووی :

﴿ أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡ ﴾ ( غافر : ٢٨ ) .

( كذا في البداية : ٣ / ٤٦ ) .[١٢٣]

---

[١٢١] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٤٣ - ٤٤٤ .

[١٢٢] وای ئەگەیەنن کە قەبری ئیسماعیل پێغەمبەر سەلامی لێ بێ و قەبری هاجەری دایکی تیایدایە .

[١٢٣] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٤٤ ، والسيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٢٩٦ - ٢٩٧ .

جارێکی تریش ئەم عوقبەیە هات و پێغەمبەریش ﷺ لە پەنای کەعبەدا نوێژی ئەکرد . عوقبە پێی خستە سەر ملی پێغەمبەری خوا ﷺ و خەریك بوو هەردوو چاوی دەرپەڕن .

لە ریوایەتێکی تریش‌دا کە ئیبن ئەبوشەیبە لە عەمری کوڕی عاص‌ەوە خوا لێی رازیی بێ ئەی‌گێڕێتەوە هاتووە کە وتوویە : تەنها رۆژێك بە چاوەوە بووم کە قورەیش ئەیان‌ویست پێغەمبەر ﷺ بکوژن . ئەوەبوو لە پەنای کەعبەدا دانیشتبوون و کەوتنە تەگبیری ئەوەی کە ئازاری بدەن و پێغەمبەری خوایش ﷺ لە نزیك ( مقام ) دا نوێژی بەجێ ئەهێنا . عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیط هەستایەوە بۆی و عەباکەی خستە ملی و رای‌کێشا هەتا بەسەر ئەژنۆی‌دا کەوت و خەڵکەکە هاواریان لێ بەرز بوویەوە و وایان زانی گیانی دەرچوو .. لەولاوە ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ بە پەلە هات و هەردوو قۆڵی پێغەمبەری خوای ﷺ لە دواوە گرتن و ئەی‌فەرموو : ﴿ أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ ؟ ﴾ .

پاشان کافرەکان وازیان لە پێغەمبەر ﷺ هێنا و ، پێغەمبەری خواش ﷺ هەستایەوە و دەستی بە نوێژ کرد . کە نوێژەکەی تەواو کرد دای بە لایان‌دا و ئەوانیش لە سێبەری کەعبەدا دانیشتبوون و فەرمووی :

(( يا معشر قريش ! أما والذي نفس محمد بيده ! ما أُرسلتُ إليكم إلا بالذَّبح )) .

فەرمووی : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! بەو خوایەی کە گیانی موحەممەدی بە دەستە ! سەربڕین بەشتانە گەر ئیمان نەهێنن . بە دەستیشی ئاماژەی بۆ قورگی کرد .. ئەبوجەهل پێی وت : تۆ هەرگیز نەفام نەبوویت . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أنت منهم )) .[١٢٤]

یەکێکی تر لەو مل‌هوڕانەی قورەیش کە دژایەتیی ئازیزیان ئەکرد نەضری کوڕی حاریث بوو .. یەکێ بوو لە شەیتانە سەفیهەکانی قورەیش .. ئەم پیاوە بەوەی کە سەردانی حیرەی کردبوو لە خۆی بایی بوو بوو ، بەوەی کە هەندێ چیرۆکی پادشاکانی فارس و ، سەرگوزەشتەی رۆستەم و ئەسفەندیاری بیست بوو .. ئەوەبوو هەرچیی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوڕێك‌دا دائەنیشت و خوای گەورەی بیری خەڵکەکە ئەخستەوە و ، خەڵکەکەی لەوە ئاگادار ئەکرد تا خۆیان لە غەزەبی خوا

[١٢٤] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٤٤ - ٤٤٥ .

بپارێزن ، با وەك ئوممەته پێشینەكانیان لیٚنەیەت و سزا نەدرێن ، ئەو پیاوە هەر كە ئەیدیی وا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو كۆڕەدا هەستا ، ئەو لە جێی دائەنیشت و، ئەیوت : ئەی كۆمەڵی قورەیش ! بەخوا من باسی چاكترتان بۆ ئەگێڕمەوە لەو . وەرن بۆ لای من . من باسێكتان بۆ ئەكەم كە لە باسەكەی ئەو چاكتر بێ .. ئیتر دەستی بە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەی پادشاكانی وڵاتی فارس ئەكرد و ، پاشانیش ئەیوت : ئیتر موحەممەد لە كوێ لە باسەكانی من چاكترتان بۆ باس ئەكات ؟ [١٢٥]

**شەشەم : بانگ كردنی ناوداران**

هەرچەندە خوانەناسان بەبێ بەزەیی و دوور لە ویژدانەوە بەرامبەر بە ئازیز ئەجووڵانەوە و ، هەموو هەوڵێكیان ئەدا بۆ دەست كۆتابوونی لە بانگەواز ، پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لە بانگ‌كردنی پیاوە ناودارەكانیان كۆڵی نەئەدا و ، بەزەیی بە حاڵیانا ئەهاتەوە . پێی خۆش بوو لە ئاگری دۆزەخ دەرباز بن .

بەیهەقیی لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە ئەخریجی كردووە كە وتوویە : یەكەم جار كە پێغەمبەری خوام ﷺ ناسیی رۆژێك بوو كە من و ئەبوجەهلی كوڕی هیشام لە یەكێ لە كۆڵانەكانی مەككەدا پێكەوە بەرێوە ئەچووین ، تووشی پێغەمبەری خوا ﷺ بووین . پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوجەهلی فەرموو :

(( يا أبا الحكم ! هَلُمَّ إلى الله وإلى رسوله أدعوك إلى الله )) .

فەرمووی : ئەبولحەكەم ! خێرا كە بۆ لای خوا و بۆ لای پێغەمبەرەكەی .. بانگت ئەكەم بۆ لای خوا .. ئەبوجەهل وتی : ئەی موحەممەد ! ئایا لە جنێودان بە خواكانمان واز ناهێنی ؟ ئایا جگە لەوەی كە ئێمە شاهێدیی بدەین تۆ تەبلیغت كردووین هیچی ترت ئەوێ ؟! دەی وا ئێمە شاهێدیی ئەدەین كە تۆ تەبلیغت كردووین .. بەخوا ئەگەر بزانم ئەوەی كە تۆ ئەیڵێیت راستە ئەوا شوێنت ئەكەوتم . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ رۆیشت و ، ئەبوجەهل رووی تێ كردم و وتی : بەخوا ئەزانم ئەوەی كە ئەو ئەیڵێت راستە ، بەڵام شتێك قەدەغەم ئەكات : نەوەی قوصەی وتیان : ( حجابة ) لە دەستی ئێمەدایە . وتمان : بەڵێ . پاشان وتیان : ( سقاية ) ش لە دەستماندایە . وتمان : بەڵێ . پاشان وتیان : ( ندوة ) ش لە دەستماندایە . وتمان : بەڵێ . پاشان وتیان : ( لواء ) یش لە دەستمان دایە . وتمان : بەڵێ . پاشان ئەوان نانیان دا و ، ئێمەش نانمان دا ، هەتا كە لە

---

[١٢٥] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٢٩٧ .

پایەداریی‌دا یەکسان وەستاین ، وتیان : پێغەمبەرمان تیا هەڵ کەوتووە . بەخوا شتی وا ناکەم ( واتە دانی پیا نانێم و ئیمانی پێ ناهێنم ) . كذا في البداية ( ٣ / ٦٤ ) .

هەروەها ئیسحاقی کوڕی راهەوەی لە ئیبن عەبباس‌ەوە خوا لێیان رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وەلیدی کوڕی موغیرە دێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش قورئانی بۆ ئەخوێنێ ، بە شێوەیەك وەك دڵی نەرم ببێ . ئەمە بە ئەبوجەهل گەیشتەوە ، کە برازای وەلید بوو و ، بە پەلە خۆی گەیاندە لای و وتی : مامە ! خزمەکانت ئەیانەوێ ماڵ و سامانت بۆ کۆ بکەنەوە . وتی : بۆچ ؟ وتی : تا بت دەنێ ، چونکە تۆ چوویتە لای موحەممەد تا شتێکی لێ داوا بکەیت . وەلید وتی : خۆ قورەیش ئەزانێ من سامانم لە هەموویان زیاترە . وتی : دەی شتێك دەربارەی موحەممەد بڵێ ، تا بە خزمەکانت بگاتەوە کە تۆ ئەوت ناوێ . وتی : جا چیی بڵێم؟ دە بەخوا پیاوێکتان لە ناودا نیە کە لە شیعردا لە من زاناتر بێ و ، لە من زیاتر لە رەجەز و لە قەصیدەی شیعر و لە شیعرەکانی جینن شارەزاتر بێ .. دە بەخوا ئەوەی ئەو ئەیڵێ لە هیچێ لەمانە ناچێ . دە بەخوا ئەم قسانەی شیرینی‌یەکیان تێدایە و ، گەشاوەیی و جوانی‌یەکیان بەسەرەوەیە .. سەرەتا و کۆتایی‌یەکەشی پڕ لە خێر و کەڵکی زۆرە و ، ئەو بەسەر هەموو شتێك‌دا بەرزترە و هیچ شتێك لەو بەرزتر نیە و ، هەرچییش لە ژێریا بێت تێکی ئەشکێنێ . ئەبوجەهل وتی : هەتا شتێکی پێ نەڵێی خزمەکانت لێت رازیی نابن . وتی : ئەڵێم بووەستە هەتا بیرێکی لێ بکەمەوە . کە بیری کردەوە وتی : ئەمە سیحرێکە کە لە غەیری خۆیەوە وەری ئەگرێ و فێری ئەبێ . ئەوەبوو کۆمەڵە ئایەتی : ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ۝١١ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ۝١٢ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴾ ( المدثر : ١١ / ١٣ ) هاتنە خوارەوە . بەم شێوەیە بەیهەقیی لە حاکم ەوە ، لە عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی صەنعانی‌یەوە لە مەککە ، لە ئیسحاقەوە ریوایەتی کردووە .

هەروەها ئیبن عەساکیر لە موعاویەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : رۆژێکیان ئەبوسوفیان بەرەو بیابان لە ماڵ دەرچوو و ، هیندیشی لە پاشکۆی‌دا سوار کردبوو و ، منیش منداڵێك بووم و بە سواریی گوێدرێژێکم لە پێشیانەوە ئەڕۆیشتم . لە ناکاو دەنگی پێغەمبەری خوامان ﷺ بیست . ئەبوسوفیان وتی : موعاویە ! دابەزە ، تا موحەممەد سەرکەوێ .. منیش لەسەر

گوێدرێژەكە دابەزیم و پێغەمبەری خوا ﷺ سەركەوت و كەمێك لە پێشمانەوە ڕۆیشت . پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لامان و فەرمووی : (( یا أبا سفیانَ بن حَرب ! ویا هند بنتَ عُتبة ! واللهِ لَتمُوتُنَّ ثم لَتُبعثُنَّ ثم لَیَدخُلَنَّ المُحسنُ الجنَّة والمُسيءُ النارَ وأنا أقولُ لكم بحَقٍّ وإنَّكم لأوَّلُ مَن أُنذرتُم )) .

فەرمووی : ئەی ئەبوسوفیانی كوڕی حەرب و ، ئەی هیندی كچی عوتبە ! بەخوا ئەمرن و پاشان زیندوو ئەكرێنەوە و ، پاشان چاكەكار ئەچێتە بەهەشت و خراپەكاریش ئەچێتە ئاگرەوە . منیش ئەمەتان بە ڕاستیی پێ ئەڵێم و ، ئێوەش یەكەم دەستەن كە ئاگادار كراون ..

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە خوێندنی :

﴿ حمٓ ۝١ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٢ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ ۝٣ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ۝٤ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٌ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٌ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ۝٥ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُۗ وَوَيۡلٌ لِّلۡمُشۡرِكِينَ ۝٦ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ۝٧ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٍ ۝٨ ۞ قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٩ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ۝١٠ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴾ ( فصلت : ١ ـ ١١ ) كرد .

ئەبوسوفیان پێی وت : ئەی موحەممەد! لێ بوویتەوە ؟ فەرمووی : بەڵێ . ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر پشتی گوێدرێژەكە دابەزیی و من سواری بوومەوە . هیندیش ڕووی لە ئەبوسوفیان كرد و وتی : ئایا بۆ ئەم سیحربازە كوڕەكەمت دابەزاند ؟ وتی : نابەخوا سیحرباز نیە و ، درۆزنییش نیە . كذا في الكنز ( ٧ / ٩٤ ) . وأخرجه الطبراني ( في الأوسط ) أيضاً مثله . قال الهيثمي ( ٦ / ٢٠ ) : حُمَيد بنُ مُنهِبٍ لم أعرفه ، وبقية رجاله ثقاتٌ .[١٢٦]

---

[١٢٦] شرح حياة الصحابة : ١ / ١٦٥ - ١٦٩ .

**حەوتەم : مەزنیی ئازیز**

لـه پێشـەوە شـتێکمان دەربـارەی ئـەو سـزا و ئـازارەوە خسـتە بـەر دیـدەی خۆشەویستان کە مل هـوڕانی نـەفامیی بـە پێغەمبـەری ئازداریـان چەشـت ، بـە تایبەتیی ئەو ئازارەی کە لە لایەن ئەبوجەهلەوە ئەهاتە ڕێی . بەڵام خـوای گـەورە سۆز و بەزەیی خۆی بە لێشاو بەسەر پێغەمبەردا ﷺ ڕژاندبوو ، بـە تایبـەت ئـەو کاتەی کە ئەبوجەهل ویستی بە بەردەکە مێشـکی پێغەمبـەر بپـژێنێ ، ئـەوەبوو ترس و لەرزێکی زۆر لە پێغەمبەر ﷺ چوو بووە دڵیەوە ، ئەویش بە بۆنەی ڕێك و پێکیی لاشەی و مەزنیی و پایەداریی کەسایەتیی ئەو ، بە ڕادەیەك کە لە دڵیاندا سام و هەیبەتێك پەیدا بوو بوو کە زۆر لە خۆیان ئەترسان .

نموونەیەك لەسەر ئەمە :

ئیبن ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە و وتوویە : پیاوێکی هۆزی ئیراش بە چەند سـەر وشترێکیەوە هاتە مەککە و ، ئەبوجەهل لێی کڕیی ، بـەڵام دەسـتی دەسـتیی بـە کابرا ئەکرد و پارەکەی نەئەدایە . کابرای ئیراشیی هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ هاتـە لای کـۆڕ و کۆمـەڵی قـوڕەیش و ، پێغەمبـەری خـواش ﷺ لـە لایـەکی مزگەوتەوە دانیشتبوو . وتی : ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! چ پیاوێکتان ئامادەیە ئەو حەقەم لەلای ئەبولحەکەمی کوڕی هیشام بۆ وەربگرێتەوە ؟ من غـەریب و ڕێبـوارم و، حەقەکەم ناداتێ .. پیاوانی کۆڕەکە وتیان : ئا ئەوە ئەبینیی ؟ ـ ئاماژەیان بـۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ، چونکە ئەیانزانیـی لـە نێـوان ئـەو و ئەبوجـەهلدا چ دوژمنایەتییەك هەیە ـ بڕۆ بۆ لای ، ئـەو حەقەکـەت بـۆ وەرئەگرێتـەوە . ئـەیان ویست گاڵتەی پێ بکەن ..

کابـرای ئیراشیی هاتە سـەر سـەری پێغەمبـەری خـوا ﷺ و باسـەکەی دا بـە گوێیدا . ئەویش پیاوانە هەستایەوە و پێکـەوە ڕۆیشـتن .. کـە پیـاوانی کۆڕەکـە چاویان لێ بوو هەستایەوە و لەگەڵیا ڕۆیشت ، بە پیاوێکیان ، کە لە گەڵیانا بوو ، وت : شوێنی بکەوە و بزانە چیی ئەکات ؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت هەتا گەیشتە لای ماڵی ئەبوجـەهل و تەقـەی لـە دەرگا دا ، وتی : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی :

(( محمدٌ ، فاخرُج )) .

فەرمووی : موحەممەدم ، وەرە دەرەوە . کە هاتە دەرەوە ، رەنگی زەرد هەڵ گەڕا بوو ، فەرمووی :

(( أعط هذا الرجل حقه )) .

فەرمووی : حەقی ئەم کابرا بدە . وتی : مەڕۆ هەتا چیی لە لامە بی‌دەمێ ، چووە ژوورەوە و ، هاتەوە و پارەکەی بۆ هێنا و دایە دەستی . دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە و ، بە کابرای ئێراشییشی فەرموو :

(( إلحق لشأنك )) .

فەرمووی : بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە . ئێراشیی هاتەوە بۆ لای کۆڕەکە و وتی : خوا پاداشتی بە چاکە بداتەوە . حەقەکەمم وەرگرتەوە !!

کاتێ ئەو پیاوەی کە ناردیان تا بزانێ ئەبوجەهل چیی ئەکات گەڕایەوە ، پێیان وت :ماڵت کاول بێ ، چییت دیی ؟ وتی : شتێکی یەکجار سەیرم دیی ! بەخوا هەر ئەوەندە بوو کە تەقەی لە دەرگاکەی دا ، هاتە دەرەوە و گیانی تیا نەمابوو . وتی : حەقی ئەم کابرایە بدە ، ئەویش پێی دا !!

ئەوەندەی پێ نەچوو ئەبوجەهل هات و ئەوانیش لۆمەیان کرد و بە گاڵتەوە پێیان وت : دە بەخوا ئەوەی تۆ کردووتە تا ئێستە نەمان دیوە !! وتی : ماڵتان کاول بێ ، هەر ئەوەندە بوو کە تەقەی لە دەرگاکەم دا ، دەنگێکم بیست و ترس و لەرز دای‌گرتمەوە ! نێرە وشترێکیش بەسەر سەریەوە بوو کە هەرگیز نێرە وشترم لە شێوەی کەللەسەر و مل و کەڵبەی ئەو وشترەدا نەدیوە !! دە بەخوا ئەگەر بە گوێم نەکردایە ئەی‌خوارم !! ئیتر شێوەی ئەو نێرە وشترە هەرگیز لە مێشکی ئەبوجەهل دەر نەئەچوو !!

نموونەیەکی تریش :

جارێکی تر پیاوماقووڵانی قوڕەیش لەلای حیجردا کۆبوونەوە و هاتنە سەر باسی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان : ئەوەندەی بۆ ئەم پیاوە دانمان بە خۆمان‌دا گرتووە هەرگیز وا نەبووین : ژیرەکانمانی بە شێت لە قەڵەم دا و ، جنێوی بە باوباپیرمان دا و ، دینەکەمانی عەیب‌دار کرد و ، کۆمەڵمانی پەرتەوازە کرد و ، سووکایەتیی بە خواکانمان کرد و ، وا کارێکی گەورەمان لێ قەوماوە .. کاتێك کە ئەوان لەم باسەدا بوون پێغەمبەری خوا ﷺ دەرکەوت . لەسەر خۆ هات هەتا گەیشتە لای بەردە رەشەکە و دەستی لێ دا ، پاشان بە طەواف کردنی بەیتەوە دای

بە لایاندا و، ئەوانیش بە قسە چەند توانجێکیان تێ گرت و ، لە دەم و چاویدا ئەزانرا و ، تێپەڕی کرد .. کە بۆ سووڕی دووهەم بە لایاندا تێپەڕیی وەك جاری پێشوو توانجیان تێ گرتەوە . بۆ سێهەم جاریش کە بە لایاندا تێپەڕی بە هەمان شێوە دووبارەیان کردەوە . ئەوەبوو رووی تێ کردن و فەرمووی :

(( أتسمعون يا معشر قريش ؟ أما والذي نفسي بيده لقد جئتكم بالذبح )) .

فەرمووی : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! ئایا گوێتان لێمە ؟ بەو خوایەی کە گیانمی بە دەستە ، گەر ئیمان نەهێنن سەربڕین بەشتانە .

ئەم فەرمایشتەی کاری کردە سەر خەڵکەکە و ترسێکی زۆریان لێ نیشت ، هەتا ئەو کەسەیان کە زیاتر خەڵکی بۆ ئازاردانی هەڵ ئەنا ، دڵی ئەدایەوە و هێوری ئەکردەوە و ئەیوت : ئەبولقاسم بە ژیریی و سەلیقەوە تەشریف بەرە ، تۆ هەرگیز نەفامییت نەکردووە !!

یەکە بە یەکەی پیاوانی قورەیش شەرمێکی زۆریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکرد .. سام و هەیبەتی لە دڵیاندا هەبوو .. کامەیان زۆر دژایەتیی ئەکرد ، یان جنێوی پێ ئەدا ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ رووی تێ ئەکرد ئەشڵەژا و ، دەمی گۆی نەئەگرت و ، لاشەی هێزی لێ ئەبڕا .[١٢٧]

بەززاریش و طەبەرانییش لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجیان کردووە کە وتوویە : لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا بوو و ، ئەبوجەهلی کوڕی هیشام و ، شەیبە و عوتبەی کوڕانی رەبیعە و ، عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیط و ، ئومەییەی کوڕی خەلەف و ، دوو پیاوی تر ( وەلیدی کوڕی عوتبە و ، عومارەی کوڕی وەلید بوون ) کە حەوت پیاو بوون لە حیجردا و ، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی ئەکرد ، کە سەجدەی برد ، درێژەی بە سەجدەکەی دا ، ئەبوجەهل وتی : کێتان ئەچێ پاشەڕۆکی وشترەکانی نەوەی فلان بێنێ تا هەڵی رێژن بەسەر شان و ملی موحەممەددا ؟ لە هەموویان بەدبەخت تر ، عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیط هەستا چوو هێنای و خستیە سەر هەردوو شانی و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ لە سەجدەدا بوو .. ئیبن مەسعوود ئەڵێت : منیش وەستابووم و نەمئەتوانی قسە بکەم ، چونکە کەسێکم نەبوو بەرگرییم لێ بکا تا بچم بە دەمیەوە .. ئەوەبوو فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ بیست بووی و ،

---

[١٢٧] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٢٩٧ - ٢٩٩ .

هات بە دەمیەوە و ، ئـەوەی خرابوویـە سەرشـانی دای گـرت ، پاشـان رووی لـە قورەیش کرد و قسەی پێ وتن . کەچیی ئەوان وەلاٌمیان نەدایـەوە .. پێغەمبـەری خواش ﷺ ، وەك هەموو جارێك کە لە سەجدە ئەبوویەوە ، سەری بـەرز کـردەوە . کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بۆوە ، فەرمووی :

(( أللهم ! عليك بقريش ـ ثلاثاً ـ عليك بعتبة وعقبة وأبي جهل وشيبة )) .

فەرمووی : خوایە ! تۆڵە لە قورەیش بسێنی . ( سێ جار ) . خوایـە تۆڵـە لـە عوتبە و عوقبە و ئەبوجەهل و شەیبە بسێنی . پاشان لـە مزگـەوت دەرچـوو و ، ئەبولبوختەریی ، کە قامچی‌یەکی بە دەستەوە بوو ، تووشی بوو . کە پێغەمبەری ﷺ دیی لە دەم و چاوی‌دا هەستی بـە شـتێك کـرد ، بۆیـە وتـی : ئـەوە چیتە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( خَلِّ عَنِّي )) . فەرمووی : وازم لێ بهێنە . وتی : خـوا بزانێ بەرت نادەم هەتا هەواڵم بدەیتێ چیتە ؟ شتێکت تـووش بـووە . کـاتێ کـە پێغەمبەر ﷺ زانیی بەری نادات ، هەواڵی دایە و فەرمووی :

(( إِنَّ أَبا جهلٍ أَمَرَ فَطُرِحَ عَلَيَّ فَـرثٌ )) . فـەرمووی : ئەبوجـەهل فـەرمانی دا پاشەڕۆکیان خستە سەر شان و ملم .

ئەبولبوختـەریی وتـی : بـا بـڕۆین بـۆ مزگـەوت . ئـەوەبوو پێغەمبـەر و ئەبولبوختەریی پێکـەوە چـوون بـۆ مزگـەوت ، پاشـان ئەبولبوختـەریی رووی لـە ئەبوجەهل کرد و وتی : ئەبولحـەکەم ! تۆ فەرمانت داوە پاشەڕۆك بخرێتە سەر شـان و ملی موحەممەد ؟ وتی : بەڵێ . ئەڵێ : قامچـی‌یەکەی بـەرز کـردەوە و دای بـە تەوقە سەری‌دا . پیاوەکان دەسـتیان بـە هەڵمـەت‌دان بـۆ یـەکتریی کـرد . خێـرا ئەبوجەهل قیڕاندی : ماڵتـان کـاول بـێ ! ئـەوەش بـۆ ئـەو ، موحەممـەد ویسـتی دوژمنایەتیی بـخاتە نێوانـمانەوە و خۆی و هاوەڵانیشی دەرباز بن !

لە ریوایەتەکەی ئیمام ئەحمەددا وەها هاتووە کە عەبدوڵلا وتوویە : هـەموویانم بینیی کە لە رۆژی بەدردا کوژرا بوون . كذا في البداية ( ٣ / ٤٤ ) .[١٢٨]

**هەشتەم : موسڵمان بوونی حەمزە**

هۆی موسڵمانبوونی حەمزە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە جارێکیان لە نزیك ( صەفا ) ئەبوجەهل دای بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ و دەستی کـرد بـە ئـازاردان و جنێـو پێ‌دانی و ، هەندێ شتی پێ وت کە زۆری پێ ناخۆش بوو ، بەڵام پێغەمبەری خوا

---

[١٢٨] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٤٩ - ٤٥٠ .

ﷺ هیچ وەڵامێکی نەدایەوە . بەڵام ئافرەتێك ، کە کەنیزەکێکی ئازادکراوی عەبدوڵڵای کوڕی جەدعان بوو ، [١٢٩] لە ماڵەکەی خۆیەوە بە گوێوە بوو . پاشان ئەبوجەهل ڕۆیشت و بە جێی هێشت و بەرەو کۆڕێکی قورەیشی‌یەکان کەوتە ڕێ و، لەگەڵیان دانیشت و ، زۆری پێ نەچوو حەمزە هات و ، تیر و کەوانەکەی کردبووە شانی و ، لە ڕاو گەڕابوویەوە . جا هەرکەی لە ڕاو و شکار ئەگەڕایەوە نەئەچووە ماڵەوە لای کەس‌وکاری هەتا طەوافی کەعبەی بکردایە . جا کە ئەوەی ئەنجام ئەدا، بەلای هەر کۆڕێکی قورەیش‌دا تێپەڕی بکردایە ، ئەوەستا و سەلامی لێ ئەکردن و وت‌وویژی لەگەڵدا ئەکردن .. حەمزە بەدەستەڵات‌ترین گەنجی قورەیش و ئازاترینیان بوو . کاتێك کە بە لای کەنیزەکەکەدا تێپەڕی کرد پێی وت : باوکی عوماره ! خۆزگە بە چاوەوە بوویتایە ماوەیەك لەمەوبەر موحەممەدی برازات لەلایەن ئەبولحەکەمی کوڕی هیشامەوە چیی پێ کرا !! ئا لێرەدا چاوی پێ کەوت و دەستی بە ئازاردانی کرد و جنێویشی پێ دا و هەرچیی پێی ناخۆش بوو پێی کرد، پاشان ڕۆیشت و موحەممەدیش ورتەی لە دەم دەر نەهات .

حەمزە کە ئەمەی بیست زۆری پێ ناخۆش بوو .. یەکجار ڕقی هەڵسا . خوای گەورە چاوی بەزەیی و خۆشەویستیی بۆ خست .. بۆیە بە پەلە کەوتە ڕێ تا خۆی بگەیەنێتە لای ئەبوجەهل .. بڕیاری دابوو دەستێکی چاك لە ئەبوجەهل بووەشێنێ . کە چووە مزگەوتەوە سەیری کرد وا لەناو خەڵکەکەدا دانیشتووە .. بەرەو ڕووی ڕۆیشت تا کە گەیشتە سەر سەری ، کەوانەکەی بەرز کردەوە و ، دەستی بە لێدانی کرد و ، زۆر بە سەختیی سەری زامدار کرد ، پاشان پێی وت : گوایە تۆ جنێوی پێ ئەدەی ، بە مەرجێ من وام لەسەر دینەکەی و ، ئەوە ئەڵێم کە ئەو ئەی‌ڵێت ؟! ئەگەر ئەتوانی وەڵامم بدەرەوە . چەند پیاوێك لە ئەوەی مەخزووم هەستان بۆ حەمزە تا لە سەر ئەبوجەهل بکەنەوە .. پێی وتن : واز لە ئەبوعوماره بێنن ، دە بەخوا منیش سووکایەتی‌یەکی خراپم بە برازاکەی ئەو کردووە ..

حەمزە گەڕایەوە ماڵەوە .. وەسوەسەی شەیتانیی و ، خورپەی دەروونیی زۆر ئەهاتن بە دڵی‌دا ، کە چۆن وازی لە دینی خزمەکانی هێنا و ، کەوتە شوێن دینی

[١٢٩] لە ریوایەتەکەی طەبەرانیی‌دا هاوسەرەکەی حەمزە خۆی بووە . ( شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٥١ ).

برازاکەی .. پاشان داوای لە خوای گەورە کرد تا ڕێی ڕاستی سەرفرازیی پیشان بدا و بێخاتە سەری و ، گەر ئەم دینە تازەشی بێکەڵکە لێی لای بدا کە وتی :
(( أللهم إن كان هذا رشداً فاجعل تصديقه في قلبي ، وإلا فاجعل لـي مما وقعت فيه مخرجاً )) .

ئەو شەوەی زۆر بە ناڕەحتیی بەسەر برد .. هەموو جۆرە وەسوەسەیەك بە دڵیدا ئەهات ، تا ئەوەبوو ڕۆژی لێ بوویەوە و بە پەلە خۆی گەیاندە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : کوڕی برام ! بەزمێکم تووش بووە نازانم چۆن لێی دەرچم و ، ناشزانم ئایا کەسێکی وەکو من ڕێی ژیریيم گرتووە یان سەرگەردانیی ؟ باسێکم بۆ بکە ، بە ڕاستیی کوڕی برام حەزم لەوەیە قسەم بۆ بکەی . پێغەمبەر ﷺ ڕووی تێ کرد و ، فەرمایشتێکی دا بە گوێیدا کە دڵەکان ڕووناك ئەکاتەوە و ، دەروون ئەحەسێنێتەوە و ، تاریکایی گومان و وەسوەسە ئەڕەوێنێتەوە .. دەستی کرد بە یادخستنەوە و ، مژدەدان و ، ترساندن ، تا ئەوەبوو خوای گەورە ئیمانی لە دڵیدا چەسپادن . ئیتر وتی : شاهێدیی ئەدەم کە تۆ ڕاستگۆیت .. دەی دینەکەت ئاشکرا بکە .. دە بەخوا پێم خۆش نیە لەسەر دینەکەی یەکەم جارم بم ، ئەگەرچیی هەرچیی وا لە ژێر ئاسماندا موڵکی من بێت .

بە موسڵمانبوونی حەمزە خوا لێی ڕازیی بێ موسڵمانەکان یەکجار دڵ خۆش بوون و ، بوونە خاوەنی هێز و دەسەڵات و ، پێغەمبەری خواش ﷺ زیاتر پشت ئەستوور بوو .[١٣٠]

یەکێکی تر لەوانەی کە کەوتنە شوێن پێغەمبەری ئازیز ﷺ و بەرگرییان لە خۆی و لە بانگەوازەکەی کرد گەنجێك بوو بەناوی طولەیب ی کوڕی عومەیر ..[١٣١]

---

[١٣٠] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٢٩٩ - ٣٠٠ .

[١٣١] طُلَيب کوڕی عومەیری کوڕی وەهبی کوڕی ئەبوکەثیری کوڕی عەبدی کوڕی قوصەی بووە ، بەڵام دایکی ناوی ئەرواى کچی ( عبدالمطلب ) بووە ، واتە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ خاڵۆزا و پوورزا بوون .. هێشتا موسڵمانەکان لە ( دار الأرقم ) دا بوون ئەو موسڵمان بووە و کۆچیشی بۆ حەبەشە کردووە . طولەیب یەکەم موسڵمان بووە کە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ موشریکێکی خوێناویی کردبێ . ئەوەبوو بەرگوێی کەوتبوو کە عەوفی کوڕی صەبرەی سەهمیی جنێوی بە پێغەمبەر ﷺ داوە ، بۆیە ئێسقانی چەناگەی وشترێکی هەڵ گرت بۆی و سەری خوێناویی کرد . بۆ ئەمە بە ئەرواى دایکییان وت : نابینی کوڕەکەت چیی کردووە ؟ ئەرواش وەڵام ئەداتەوە کە طولەیب کۆمەکیی خاڵۆزاکەی کردووە و دڵی داوەتەوە . طولەیب لە ئەجنادین شەهید بووە . ( الإصابة : ٢ / ٢٣١ - ٢٣٢ ) .

کاتێك کە طولەیب موسڵمان ئەبێت ، ئەگەڕێتەوە لای دایکی و پێی ئەڵێ : موسڵمان بووم و شوێن موحەممەد ﷺ کەوتووم . پاشان ئەکەوێتە بانگ کردنی دایکی بۆ سەر ئیسلام و ئەڵێت : بۆچیی موسڵمان نابیت و شوێنی ناکەوی ، خۆ حەمزەی برات خوا لێی رازیی بێ موسڵمان بووە ؟ ئەڵێت : چاوەڕوان ئەکەم تا بزانم خوشکەکانم چیی ئەکەن ؟ دوایی منیش وەك ئەوان ئەکەم .

طولیب ئەڵێت : لەبەر خاتری خوا داوات لێ ئەکەم کە بچیتە خزمەتی و ، سەلامی لێ بکەیت و ، تەصدیقی بکەیت و ، شاهێدیی بدەی کە جگە لە زاتی ( الله ) خوایەکی تر نیە . دایکی وتی : فإني أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله .

ئیتر لەو رۆژە بە دواوە ئەڕوا بەرگریی لە پێغەمبەری برازای ئەکرد و ، طولەیبیشی هەڵ ئەنا تا کۆمەکیی دینی تازە بکات و فەرمانەکانی بە جوانیی جێبەجێ بکا .. ( کذا في الإستيعاب : ٤/٢٢٥ ) .

لە ریوایەتەکەی تردا لە ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : طولەیبی کوڕی عومەیر خوا لێی رازیی بێ لە دار الأرقم موسڵمان بوو و کە هاتە دەرەوە چووە ماڵەوە لای دایکی کە ئەڕوای کچی عەبدولموطەللیب بوو و وتی : موسڵمان بووم و چوومە سەر دینی ( رب العالمين ) جل ذکره . دایکیشی وتی: شایان‌ترین کەس کە تۆ یارمەتیی بدەیت و کۆمەکیی بکەیت خاڵۆزاکەتە . بەخوا ! ئەوەی کە لە پیاوان دێت لە ئێمەش بهاتایە شوێنی ئەکەوتین و ، بەرگرییشمان لێ ئەکرد . ئەڵێ : وتم : دایە گیان ! بۆچیی موسڵمان نابیت و .. .. تا کۆتایی .[١٣٢]

طولەیب کە موسڵمان بوو ، بووە ئەندامێکی لێهاتووی شوێنکەوتەی قورئان و ، بە سەر و بە ماڵ بەرگریی لە ئازیز ﷺ ئەکرد ..

ئەوەبوو جارێکیان ئەبوجەهل و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی رێیان بە پێغەمبەر ﷺ گرت و ئازاریان دا . کە طولەیب ئەمەی بیست خۆی گەیاندە لای ئەبوجەهل و دەستی بە لێدانی کرد تا سەری شکاند و گرتیان . ئەبولەهەبی خاڵۆی هەستایەوە تا بەرگریی لێ بکا . ئەم دەنگ و باسە گەیشتەوە لای ئەڕوای دایکی و ئەویش وتی : چاك‌ترین رۆژانی تەمەنی ئەو رۆژەیە کە پشت‌گیریی لە خاڵۆزاکەی کردووە.

---

[١٣٢] شرح حياة الصحابة : ١ / ٣٣٨ - ٣٣٩ .

به ئەبولەهەبیان وت : ئەڕوای خوشكت لە دین وەرگەڕاوە ، ئەویش چوو بۆ لای و لۆمە و گلەیی لیّ کرد . ئەڕواش وەڵامی دایەوە : لە پشت سەری برازاکەتەوە بووەستە ، جا ئەگەر سەرکەوت ئەوا بۆ تۆش چاکە ، ئەگەر نا لە لایەن برازاکەتەوە گلەییت نایەتە سەر . ئەبولەهەب وتی : جا ئێمە دوژمنایەتیی هەموو عەرەبمان پیّ ئەکریّ ؟ ئەو دینێکی تازە بابەتی داهێناوە ! ( كذا في الإصابة : ٤ / ٢٢٧ ) . [١٣٣]

**نۆهەم : موسڵمان بوونی طوفەیل**

پێغەمبەری خوا ﷺ بەبیّ وچان خەریکی ئاگادارکردنی خزمەکانی بوو تا بەڵکو دڵیان نەرم ببیّ و شوێن دینەکەی بکەون و ، لە ئاگری دۆزەخ خۆیان دەرباز کەن . ئەوانیش ئەوەندە نەفام بوون کەوتنە دژایەتیی و ئازاردانی و ، سزادانی ئەوانەش کە ئیمان ئەهێنن .. ئەوەبوو بە تەما بوون بە چەند شێوەیەك لە ناوی بەرن ، کەچیی خوای گەورە ئەیپاراست و پیلانی ناحەزانی پووچەڵ ئەکردەوە .. دوای ئەمەش کەوتنە پاگاندەکردن بۆ خۆی و دینەکەی و ، هەرکەسیّ سەردانی مەککەی بکردایە وەهایان ئەترساند کە نەوێریّ لێی نزیك ببێتەوە و قسەیەکی لیّ ببیستیّ .. پێغەمبەری خوایش ﷺ دانی بە خۆیدا ئەگرت و بە تەمای کۆمەکیی خوا بوو ..

یەکیّ لەو پیاوە ناودارانەش کە سەردانی مەککەیان ئەکرد ، پیاوێك بوو بە ناوی طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسیی ، کە پیاوێکی بەڕێزی ماقووڵی ژیری خاوەن سەلیقە بوو و ، دەستی شیعریشی هەبوو ..

طوفەیل خۆی باس ئەکات کە جارێکیان دێتە شاری مەککە و ئەبینیّ وا پێغەمبەری خوا ﷺ وا لەویّ . کە قورەیشییەکان چاویان بە طوفەیل ئەکەویّ ، خێرا چەند پیاوێکیان دەورەی لیّ ئەدەن تا بەر لەوەی ڕێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێت و گویّ لە دەنگ و باسی دینی تازە بگریّ ، ئەمان مێشکی پڕ بکەن و ، لە زەرەر و زیانی چاوکەوتن پێی و گویّگرتن لێی ئاگاداری بکەن .

چوونە لای و پیّیان وت : طوفەیل ! تۆ هاتوویتە وڵاتی ئێمە و ، ئەم پیاوەش کەوا لە ناوماندا گیرمان بە دەستیەوە خواردووە : کۆڕ و کۆمەڵمانی پەرتەوازە کردووە .. قسەکانی ئەڵێی سیحرن ، نێوانی کوڕ و باوك ، برا و برا ، ژن و مێرد ،

[١٣٣] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٥٣ .

تێك ئەدا .. ئێمە ئەترسین ئەوەی بەسەر ئێمەدا هاتووە بەسەر تۆ و خزمەکانیشت دا بێت . بە هیچ شێوەیەك قسەی لەگەڵ نەکەیت و ، گوێیشی لێ نەگریت .

طوفەیل ئەڵێت : دە بەخوا ئەوەندەیان باس کرد بۆم تا ئەوەبوو هاتمە سەر ئەوەی کە گوێ بۆ قسەیەکی نەگرم و قسەیەکیشی لەگەڵدا نەکەم ، هەتا کە بەیانیی چووم بۆ مزگەوت ، لە ترسی ئەوەی نەوەکو قسەیەکی بەرگوێم بکەوێ و کارم تێ بکا و منیش نەمەوێ بیبیستم و حەزی پێ نەکەم .. لە ترسی ئەوە هەردوو گوێم بە لۆکە ئاخنین .

ئەڵێت : بۆ بەیانیی چووم بۆ مزگەوت و ، ئەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ وا لە مزگەوتدا و ، لە پەنای کەعبەدا نوێژ ئەکات . منیش لە نزیکیدا راوەستام .. خوای گەورە ویستی وەها بوو هەندێ لە فەرمایشتەکانی بدات بە گوێمدا .. فەرمایشتێکی جوانم بیست .. لە دڵی خۆمدا وتم : دایکم رۆڵەڕۆم بۆ بکات . خۆ من پیاوێکی ژیری شیعر زانم و ، چاك و خراپم لێ تێك ناچێ .. باشە چیی تیایە ئەگەر گوێ لەم پیاوە بگرم بزانم چیی ئەڵێ ؟! ئەگەر شتی چاکی بۆ باس کردم ئەوا وەری ئەگرم و ، گەر خراپیش بوو وازی لێ دێنم .. دانم بە خۆمدا گرت هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە .. دوای کەوتم هەتا کە چووە ماڵەوە ، منیش چوومە ژوورەوە لای و وتم : ئەی موحەممەد ! خزمەکانت وەها و وەهایان پێ وتم ( بەوەی کە پێمیان وتبوو ) ، دە بەخوا ئەوەندەیان ترساندم لەم کارەی تۆ هەتا گوێم بە لۆکە ئاخنین تا قسەکانت نەبیستم ، بەڵام خوای گەورە ویستی وەها بوو شتێکی لێ ببیستم .. بە راستیی فەرمایشتێکی جوانم بیست .. دە تۆش دینەکەتم بۆ باس بکە .. ئەویش ئیسلامی بۆ باس کردم و قورئانی بۆ خوێندم ، ئەڵێت : دە بەخوا هەرگیز فەرمایشتی لەوە جوانتر و ، فەرمانی لەوە راستتر و بەدادترم نەبیست بوو .. ئەڵێت : ئیتر موسڵمان بووم و شەهادەتی حەقم دا و وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! من پیاوێکم لەناو خزمەکانمدا گوێڕایەڵییم بۆ ئەکرێ و ، ئەشمەوێ بگەڕێمەوە ناویان و بۆ موسڵمان بوون بانگیان بکەم .. جا لەخوای گەورە داوا بکە نیشانەیەکم پێ ببەخشێ تا لە بانگکردنیاندا بۆ سەر ئیسلام یارمەتییم بدات . پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : (( أللهم اجعل له آية )) .

طوفەیل ئەڵێ : بەرەو لای قەومەکەم کەوتمە رێ ، هەتا کە گەیشتمە دەربەندێك کە خەڵکەکەم لێوە دەرئەکەوت ، نوورێك بە وێنەی چرا لە نێوان هەردوو چاوم

دا پەیدا بوو . ئەڵێ : وتم : خوایە ! با بە دەم و چاومەوە نەبێت ، چونکە ئەترسم وا تێ بگەن کە ئەمە تۆڵە و پێتواندنە لە دەم و چاومدا ، لەسەر وازهێنان لە دینەکەیان ، پەیدا بووە .. ئەڵێ : نوورەکە لەوێ گوازرایەوە بۆ سەر نووکی قامچی‌یەکەم ، بە شێوەیەك کە کاتێ لە دەربەندەکەوە دائەبەزیمە خوارەوە خەڵکەکە بە قامچی‌یەکەمەوە ئەو نوورەیان وەك چرای هەڵواسراو ئەبینی ، هەتا گەیشتمە لایان . کاتێ کە دابەزیم باوکم - کە ریش سپی‌یەکی بەتەمەن بوو - هات بۆ لام . ئەڵێ : وتم : بابەگیان ! لێم دوور بکەوەرەوە ! نە تۆ پەیوەندییت بە منەوە هەیە و ، نە منیش پەیوەندییم بە تۆوە هەیە . وتی : بۆچ ئەی کوڕەکەم ؟ ئەڵێ : وتم : من موسڵمان بووم و شوێن دینی موحەممەد ﷺ کەوتووم . باوکم وتی: دینی من دینی تۆیە . چوو خۆی شۆرد و جل و بەرگەکەی خاوێن کردەوە و پاشان هات و ئیسلامم بۆ باس کرد و ئەویش موسڵمان بوو . ئەڵێت : دوای ئەوە هاوسەرەکەم هات بۆ لام و پێم وت : لێم دوور بکەوەرەوە ، نە من پەیوەندییم بە تۆوە هەیە و نە تۆش پەیوەندییت بە منەوە هەیە . وتی : بۆچ ، دایك و باوکم بە قوربانت بن ؟ ئەڵێ : وتم : ئیسلام من و تۆی جیا کردۆتەوە . ئیتر ئەویش موسڵمان بوو . داوام لە دەوسیش کرد تا موسڵمان بن ، کەچیی خێرا بە دەممەوە نەهاتن ..

طوفەیل وەك خەم خۆر و دڵسۆزی خۆی و کەس وکاری بوو ، وەهاش دڵسۆزی هۆزەکەی بوو .. پێی خۆش بوو موسڵمان بن و لە سزای دۆزەخ سەرفراز بن .. جا کە دیتی وا هۆزی دەوس بۆ موسڵمان بوون سستیی ئەکەن ، دێتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە و ، ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! دەوس بە گوێم ناکەن ، لەبەر ئەوە دوعایان لێ بکە ..

پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی نەهات دوعایان لێ بکات ، بەڵکو دوعای هیدایەتی بۆ کردن کە فەرمووی :

(( أللهم اهْدِ دَوساً )) .

پاشان بە طوفەیلی فەرموو :

(( إرجع إلى قومك فادعُهُم وارفق بهم )) .

فەرمووی : بگەڕێرەوە بۆ ناو قەومەکەت ، بانگیان بکە و بە نەرمیی لەگەڵیان بجووڵێرەوە .

طوفەیل ئەڵێ : گەڕامەوە و بەردەوام لە ناوچەی دەوس‌دا خەریکی بانگ‌کردنیان بووم بۆ سەر ئیسلام ، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد و لە جەنگی بەدر و ئوحود و خەندەق بوویەوە . دوای ئەوە بە خۆم و ئەو خزمانەمەوە کە موسڵمان بوو بوون هاتینە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەبینین تەشریفی لە خەیبەرە و ، منیش لەگەڵ حەفتا یان هەشتا ماڵی دەوس هاتینە مەدینە . ( ذكره في البداية ٣ / ١٠٠ ) عن ابن إسحاق مع زيادة يسيرة . [١٣٤]

**دەهەم : هانابردن بۆ لای ئەبوطالیب**

قورەیشی‌یەکان هەرچی‌یان لە توانادا هەبوو بەرامبەر بە پێغەمبەر و ﷺ هاوەڵانی کردیان ، بۆ ئەوەی لە بڵاوکردنەوەی دینی تازە دەست کۆتابن ، کەچی هەرهەمووی بێهوودە بوو ، چونکە ئەوانەی شوێن قورئان کەوتبوون بە پاکیی چێژی ئیمانیان کردبوو و ، ئیمان بە پەڕەکانی دڵیان گەیشتبوو .. لەبەر ئەمە بۆ هیچ هێزێك کۆڵیان نەئەدا .. لەولاشەوە قورەیش هەستیان کرد کە ئەبوطالیبی مامەی ، بە بۆنەی خزمایەتی‌یەوە بەرگریی لێ ئەکا ، بۆیە وایان بە چاك زانیی بچنە لای بەڵکو چارەیەکی ئەم کێشەیە بدۆزنەوە .

چەند پیاوێکیان عوتبە و شەیبەی کوڕانی رەبیعەی کوڕی عەبد شەمس و ، ئەبوسوفیانی کوڕی حەربی کوڕی ئومەییە و ، ئەبولبوختەریی عاصی کوڕی هیشام و ، ئەسوەدی کوڕی موطەللیبی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا و ، ئەبوجەهلی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی مەخزوومیی و ، نەبیه و مونەببیهی کوڕانی حەججاج لە نەوەی سەهم و ، عاصی کوڕی وائیلی سەهمیی چوون بۆ لای ئەبوطالیب و وتیان : ئەبوطالیب ! برازاکەت سووکایەتیی بە خواکانمانی کردووە و، دینەکەمانی عەیب دار کردووە و ، پیاوە ژیرەکانمانی بە سەفیهـ دەر کردووە و، باوباپیرانمانی بە گومڕا داناوە ، جا یا دەست کۆتای بکە لێمان ، یان دەست بەرداری ببە بۆمان . تۆ خۆیشت وەك ئێمە لەگەڵیا ناکۆکی و ، لە کۆڵتی ئەکەینەوە ..

ئەبوطالیب بە ژیریی و سەلیقە و ، بە نەرم و نیانیی و لەسەرخۆ وەڵامی دانەوە و، ئەوانیش هەڵسان و بەجێیان هێشت .. پێغەمبەری خوایش ﷺ هەروا بە نەرم و نیانیی و سەلیقە و ژیری‌یەوە دینی خوای ئەگەیاند و ، ئەوانیش بە شێوازەکەی

---

[١٣٤] شرح حياة الصحابة : ١ / ٣٥٤ - ٣٥٦ .

خۆیان دژایەتی‌یان ئەكرد و سزای هاوەڵەكانیان ئەدا و ، یەكتریشیان ئامۆژگاریی ئەكرد تا گوێی بۆ نەگرن .

دوای ماوەیەك ئارامیان لێ بڕا و ، هاتنەوە بۆ لای ئەبوطالیب و وتیان : ئەبوطالیب ! تۆ تەمەنێكت هەیە و ، لەناوماندا خاوەنی ڕێز و پایەدارییت . داوامان لێ كردی كە برازاكەت دەست كۆتا بكەیت لێمان ، كەچیی دەست كۆتات نەكرد .. بەخوا ئێمە لەسەر جنێودان بە باوباپیرمان و ، بە سەفیهـ دەركردنی ژیرەكانمان و ، عەیب داركردنی خواكانمان ئارامان نەماوە ، یان ئەوەتا دەست كۆتای بكە لێمان ، یان لەگەڵ تۆیش و ئەویش‌دا لەسەر ئەوە ئەكەوینە زۆران بازیی ، هەتا لایەكمان تیا ئەچێت . ئیتر هەستان و ڕۆیشتن .. ئەبوطالیب دابڕان و دژایەتیی خزمەكانی بە لایەوە زۆر گران بوو ، لە هەمان كات‌دا تەسلیم كردنی برازاكەی و پشت بەردانیشی یەكجار پێ ناخۆش بوو .[١٣٥]

طعبەرانییش لە عەقیلی كوڕی ئەبوطالیب ەوە خوا لێی ڕازیی بێ تەخریجی كردووە كە وتوویە : قوڕەیش هاتنە لای ئەبوطالیب و وتیان : ئەبوطالیب ! برازاكەت دێتە شوێنی كۆڕ و كۆمەڵمانەوە و شتانێ بە گوێ‌ماندا ئەدا كە ئازارمان پێ ئەگەنێ ، جا ئەگەر ڕات لەسەری بوایە دەست‌كۆتای بكەی لێمان ئەوا چاكە . پێمی وت : عەقیل ! بڕۆ ئامۆزاكەتم بۆ بدۆزەرەوە . منیش چووم لە ژوورێكی بچووكی ئەبوطالیب دا دۆزیمەوە .. لەگەڵم دا هات و هەوڵی ئەدا خۆی بخاتە ژێر سێبەرەوە كەچیی دەستی نەئەكەوت ، هەتا گەیشتە لای ئەبوطالیب . ئەبوطالیب پێی وت : كوڕی برام ! بەخوا ئەزانم بە گوێیشم ناكەی ، بەڵام ئەوەتا خزمەكانت هاتوون و وای ئەگەیەنن كە تۆ دێیتە لای كەعبەكەیان و ناو كۆڕ و كۆمەڵیان و شتانێ بە گوێیان‌دا ئەدەی كە ئازاریان پێ ئەگات .. جا ئەگەر بە چاكت زانیی ئەوا وازیان لێ بهێنە .

پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بۆ ئاسمان بەرزكردنەوە و فەرمووی : (( والله ! ما أنا بأقدر أن أدَعَ ما بُعثتُ به مِن أن يُشعلَ أحدُكم من هذه الشمس شُعلةً من نارٍ )) . فەرمووی : بەخوا ! چۆن یەكێ لە ئێوە ناتوانێ شۆڵەیەك ئاگر لەو خۆرە لێ بكاتەوە ، ئاوەها منیش ناتوانم واز لەو كارە بهێنم كە پێی ڕەوانە كراوم .

[١٣٥] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١/ ٣٠١ .

ئـەبوطاليب رووی تـێ كـردن و وتـی : بـەخوا ! ئـەم برازايـەم هـەرگيز درۆی نەكردووە ، بە ڕێك و پێكيی بگەڕێنەوە دوا ..

قال الهيثمي ( ٦ / ١٤ ) : رواه الطبراني وأبو يعلى باختصار يسير في أوله ، ورجال أبي يعلى رجال الصحيح . وأخرجه البخاري في التأريخ ( الكبير ٤ / ٥١ ) بنحوه كما في البداية ( ٣ / ٤٢ ) .

لەلای بەيهەقييش وەها هاتووە كە ئەبوطاليب بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەڵێت : كوڕی برام ! خزمەكانت هاتبوون بۆ لام و وەها و وەهايان وت : جا بـەزەييت بـە منيش و بە خۆشتدا بێتەوە و ، كارێكيش مەخەرە ئەستۆمەوە كە نە منيش و نە خۆيشت بەرگەی نەگرين ، واز لە هەر قسەيەك بێنە كە خزمەكانت پێيان ناخۆشە. پێغەمبەری خوا ﷺ وا تێگەيشت كە مامەی دەربارەی ئەو رايەكی بۆ دەركەوتووە و ، پشتی بەرئەدا و ، ئەیدا بە دەستەوە و ، تواناى نەماوە لەگەڵيا خۆی بگرێ و بەرگريی لێ بكا ..

ئەبێ هەڵگری بەرنامەی خوا هەڵوێستی چۆن بێ ؟ تەنها ئەبوطاليب بـەرگريی لێ ئەكرد ، لەوە ئەچێ ئەويش توانـای بـەرگريی نـەماوە و ، بەرگـەی دژايـەتيی هەموو هۆزەكان ناگرێ ..

خوای گەورە فەرمانی كردووە قورئان بگەيەنێت ، كەچيی وا خزمەكانی خۆيـان ئامادە كردووە بۆ جەنگێكی سەرومالّيی تا دينی تازە بـڵاو نەبێتـەوە !! ئايـا واز بهێنێ ، يان بێ باك بەردەوام بێ .. ئەگەرچيی بـە تـاق و تـەنيا بێـت و هـەموو سەرزەوييش دژی وەستابێ ..

جا مادام كەسێكی لە پشت نەماوە ، ئەبێ بڕيارێك بدا بەرامبـەر بـە هـەموو سەرزەويی بتوانێ بوەستێ .. بۆيە هاتە وەڵام و فـەرمووی : (( يا عـم ! واللهِ لَـو وَضَعُوا الشمسَ في يَمِيني وَالقمَرَ في يَسارِي عَلى أَن أَترُكَ هذا الأَمرَ حَتَّى يُظهِرَهُ اللهُ أَو أَهلِكَ دونَهُ ما تَرَكتُهُ )) !!

فەرمووی : مامەگيان ! بەخوا ، ئەگەر خۆر بخەنـە لای راسـتمەوە و مـانگيش لای چەپـمەوە بۆ ئەوەی واز لەم كارە بهێنم ، ئەوا وازی لێ ناهێنم هـەتا يـا خـوا سەری دەخات ، يان من لە پێناویدا تيا ئەچم ..

بڕياری پياوانە .. بۆ مێژوو .. بۆ گۆڕينی ڕەوڕەوەی مێژوو ..

ئەم فەرمايشتە تا ئاخرزەمان كاريگەريی تەواو نابێ ..

پياوی پياوانە بڕيار ئەدات ..

ئەی کوا بڕیارەکەی ئەبرەهە ، یان فیرعەون ، یان نەمروود ، یان هەر ستەم کارێکی تریان ؟

کوا بڕیار و نەخشەکانی ناپلیۆن و هیتلەر و ستالین و کرۆمەر و .. صەدەهای تر کە لە مێژووی نوێدا هەرچیی کاری نامەردانە هەبوو ئەیان‌کرد و ، هەرچیی ڕێگای سووك هەبوو ئەیان‌گرتە بەر بەو هیوایەوە بە ئامانج بگەن ، کەچیی هەر هەموویان بە سەرشۆڕیی سەریان ئەنایەوە ؟ ئەوانە ماوەیەك ئادەمی‌یەکانیان بە زمانی لووس ئەخەڵەتاندن و لە ئەنجام‌دا تووشی مەینەتیی و بەدبەختی‌یان ئەکردن .

ئازیزمان بە غیرەتی ئیمانەوە دای بە گوێی ئەبوطالیب‌دا کە تا مردن کۆڵ نادات .. دیارە ئەوانەش کە ئیمانیان ئەهێنا ئاگایان لەم بڕیارە بوو .. ئەبوا ئەوانیش بەو بڕیارەوە ئیمانیان بهێنایە .. واتە ئیمان‌هێنان هەروا ئاسان نەبوو .. ئیمان‌هێنان واتە عارەق‌ڕێژان و خوێن‌ڕێژان لە پێناوی ئیمان‌دا .. واتە دەست‌شتن لە خۆشیی و رابواردن .. لەبیرچوونەوەی بەرژەوەندیی .. پشت‌گوێ‌خستنی ماڵ و منداڵ .. ئەمانە با خوا چاودێری‌یان بکات .. بیان ژیەنێ .. ئیمان‌دار بۆتە سەرباز و وا لە پێشی پێشەوەی بەرەکانی جەنگ‌دا .. بە تەمای خۆی نیە ..

هەر لەبەر ئەمە بوو لە مەککەدا بانگەواز زۆر بڵاوەی نەئەکرد و ، شوێن کەوتوانی کەم بوون .. بەڵام وەك کەم بوون ، یەکجار بەهێز بوون .. کۆڵنەدەر بوون .. ئامادەی هەموو سزا و ئازارێك بوون ..

کورتەکەی : یەکجار ئیمان‌دار بوون ..

بە چاکیی خۆیان بە خوا فرۆشتبوو ..

کە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ فەرمایشتەکەی بە گوێی ئەبوطالیب‌دا دا ، دڵی پڕ بوو و دەستی بە گریان کرد .. پاشان هەستا و رۆیشت ..

دڵی لە خۆی دائەما .. دەرمانی دەردەکانی بۆ مرۆڤ هێناوە ، کەچیی لە جیاتیی پێشوازیی ، سووکایەتیی پێ ئەکرێ .. دژایەتیی ئەکرێ .. ئازاری ئەدرێ .. هەروەك تاوانێکی یەکجار گەورەی کردبێ !!

هەرکەس ئەیەوێ شوێن ئازیز و دینەکەی بکەوێ ، با خۆی ئامادەی هەموو نارەحەتی‌یەك بکات .. با بە تەمای بێ‌کەسیی و بێ‌ئازیی و بێ‌مافی بێ .. با خزمەت بکا و بە تەمای دژایەتیی بێ .. با خەمی مرۆڤەکان بخوا و بە تەمای گاڵتە پێ‌کردن و سووکایەتیی بێ ..

ئەبوطالیب هەڵوێستی نامەردانەی قورەیشی هەڵسەنگاند و ، سەرنجی غیرەتی برازای بێپشتیوانیشی دا چۆن بۆ گەیاندنی راستیی بە تەمای هەموو سزا و ئازارێکە و ، گیانیشی خستۆتە سەر لەپی دەستی تا لەو پێناوەدا خۆی بکاتە قوربانی ئەو بیروباوەڕە بێگەردەی کە بەدیی‌هێنەری مەزنی پێشکەشی کردووە . بۆیە بە چاوێکی رێزەوە هەڵوێستی مەردی خۆنەویستی نرخاند و ، لە هەمان کات دا دڵی پێ سووتا و بریاری دا بە هیچ شێوەیەك پشتی بەر نەدات ، بۆ ئەمە بەر لەوەی لە چاو ون بێ بانگی لێ کرد تا بگەڕێتە دواوە .. کە گەڕایەوە ، وتی : برۆ ، کوڕی برام ! چییت پێ خۆشە بیڵێ ، دە بەخوا هەرگیز بۆ هیچ شتێك پشتت بەر نادەم !!

**یانزەهەم : کارێکی گێلانە**

قورەیش کە دی‌یان وا ئەبوطالیب چارێکی بۆ موحەممەدی برازای نەدۆزی‌یەوە و ، لە بلاوکردنەوەی دینی تازە دەست کۆتای نەکرد و ، بێباك ماوەی‌دا کاری خۆی ئەنجام بدا ، کەوتنە تەگبیری ئەوەی کە چۆن چارەیەك بۆ ئەم کارەی موحەممەد بدۆزنەوە . سەرەنجام هاتنە سەر ئەو رایە کە کوڕێکی گەنجی پێکەوتوو دیاریی بکەن تا لەگەڵ موحەممەددا بی‌گۆڕنەوە ، ئەم ببێتە کوڕی ئەبوطالیب و ، ئەبوطالیبیش موحەممەدی برازای تەسلیمی ئەوان بکا تا لەسەر ئەوەی لە دین وەرگەڕاوە بی‌کوژن و کۆتایی بە ئاژاوەکەی بهێنن .

بۆ ئەمە عیمارەی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرەیان هەڵ بژارد .. عیمارەی برای خالید . لەگەڵ خۆیان‌دا بردیان بۆ لای ئەبوطالیب و پێیان وت : ئەبوطالیب ! ئەمە عیمارەی کوڕی وەلیدە ، کە بەهێزترین و جوان‌ترین گەنجی قورەیشە ، وەری بگرە و ژیریی و ئازایەتی‌یەکەی پێشکەشت بێت و ، بی‌کە بە کوڕی خۆت و ، ئەم برازایەشت ، کە لە دینی باو باپیرت پاشگەزبۆتەوە و ، قەومەکەتی پەرتەوازە کردوون و ، پیاوە ژیرەکانی بە سەفیهـ لە قەڵەم داون ، تەسلیممان بکە تا بی‌کوژین !!

ئەبوطالیب سەرنجی دا قورەیش کارێکی منداڵانەی گەلاڵە کردووە و ، بیرکردنەوەکەی زۆر هەڵەیە ، بۆیە پێی وتن : بەخوا رێك کەوتنێکی خراپە !! کوڕەکەتانم ئەدەنێ تا بەخێوی بکەم بۆتان و ، منیش کوڕەکەمتان بدەمێ تا بی‌کوژن ؟! بەخوا هەرگیز ئەمە رێك ناکەوێ .

موطعیمی کوڕی عەدیی کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی قوصەی ـ کە ئامۆزازای ئەبوطالیب بوو ، واتە نەوفەل و هاشم برا بوون ـ وتی : بەخوا ئەبوطالیب ! خزمەکانت ئەوپەڕی ویژدانیان لەگەڵتدا بەکار هێنا و ، هەوڵی تەواویشیان دا تا لەوەی کە پێت ناخۆشە رزگارت بکەن ، بەڵام وا نابینم کە تۆ هیچیان لێ وەر بگریت !!

ئەبوطالیب بە موطعیمی وت : بەخوا ویژدانیان لەگەڵمدا بەکار نەهێنا ، بەڵام تۆ بڕیارت داوە کە پشتی من بەر بدەیت و خەڵکم لە دژ هەڵ بنێیت ، جا چییت پێخۆشە درێغیی مەکە . پاشان ئەبوطالیب دژی موطعیم و ئەو خزمانەشی لە نەوەی عەبدمەناف کە پشتیان بەردا و ، هەروەها دژی ئەو هۆزە قوڕەیشیانەش کە دژایەتییان کرد قەصیدەیەکی هۆنییەوە کە بەم دێڕە دەست پێ ئەکات :

ألا قل لعمرو ، والولید ، ومطعم ألا لیت حظي من حیاطتکم بکر[١٣٦]

واتە : بلێ بە ئەبوجەهل و ، وەلید و ، موطعیم ، خۆزگە لە جیاتیی ئێوە وشترێکم ببوایە ، چونکە ئەو لە ئێوە بەکەڵکتره بۆم .

کە ئەبوطالیب بۆ ئەوەش لەگەڵیان رێك نەکەوت نێوانیان زیاتر تێك چوو و ، دژایەتیی قوڕەیش بۆ پێغەمبەر و موسڵمانەکان زیاتر بوو و ، بەوپەڕی بێویژدانییەوە ئازاریان ئەدان .

ئەبوطالیب سەرنجی دا قوڕەیش بڕیاری تەواویان بۆ دژایەتیی موحەممەدی برازای و موسڵمانەکان داوە و ، بە هیچ شێوەیەکیش دەستیان لێ ناپارێزن ، بۆ ئەمە بانگی کردە نەوەی هاشم و نەوەی موطەللیب تا ئەوانیش کۆمەکیی بکەن و بە هەموویانەوە موحەممەدی خزمیان بپارێزن .[١٣٧] ئەوانیش پیاوانە هاتن بە دەمیەوە و هەموویان بڕیاری بەرگرییان دا جگە لە ئەبولەهەب . ئەبوطالیب ی لە ستایشی خزماندا قەصیدەیەکی دانا تیایا دەست خۆشیی لێ ئەکردن ، کە ئەڵێت :

إذا اجتمعت یوماً قریش لمفخرٍ فعبد مناف سرها ، وصمیمها

[١٣٦] سیرة إبن هشام : ١ / ٢٦٧ .

[١٣٧] وەك لە پێشەوە باس کرا عەبدمەنافی کوڕی قوصەی چوار کوڕی هەبوون : عەبدشەمس و هاشم و موطەللیب و نەوفەل . جا منداڵەکانی هاشم و موطەللیب پێکەوە جۆر بوون ، بەڵام نەوەکانی عەبدشەمس و نەوفەل هەر لەو سەردەمەوە و هەتا سەردەمی پێغەمبەریش ﷺ هەر دژایەتیی نەوەی هاشمیان ئەکرد .. ئەوەبوو ئومەییەی کوڕی عەبدشەمس دژایەتیی لەگەڵ هاشمی مامەیدا ئەکرد .. کەمێك لەمەو پێشیش لە دژایەتیی موطعیمی کوڕی عەدیی کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدمەناف ئاگادار بووین .

وإن حُصِّلت أشراف عبد منافها ففي هاشم أشرافها ، وقديمها
وإن فخرت يوماً فإن محمداً هو المصطفى من سرها وكريمها
تداعت قريش غثها وسمينها علينا فلم تظفر، وطاشت حلومها

هەروەها ئەبوطاليب کە سەرنجی دژایەتیی قورەیشی دا ، ترسی ئەوە بە دڵیا هات کە عەرەبەکان هەر هەموویان هەڵوێستی قورەیش بگرنە بەر و دژایەتی‌یان بکەن ، بۆیە قەصیدە بەناوبانگەکەی وت کە تیایا پەنا بە حەرەمی مەککە ئەبات و ، رێز و خۆشەویستیی بۆ پیاوماقووڵانی قەومەکەی دەرئەخات و ، باسی ئەوەش ئەکات کە هەرگیز دەستبەرداری پێغەمبەری خوا ﷺ نابن و ، ئامادەیە بە خۆی و بە نەوەی هاشمەوە هەر هەموو لە بەرگریی ئازیزدا تیا بچن . جا ئەم قەصیدەیە زۆر درێژە و لە پێناسەیدا ئەوەندە بەسە کە خوا لێ‌خۆش بوو ئیبن کەثیری کەڵەزانای ئیسلام وەصفی بکات کە قەصیدەیەکی پڕ لە بەلاغەتە و ، تەنها مەگەر هەر ئەبوطاليب توانای وتنی هەبێ ، چونکە لە ( المعلقات السبع ) بەهێزتر و بەلیغترە .. [١٣٨]

**دوانزەهەم : بانگەوازی راستیی**

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ هەڵگری دینی حەق بوو ، بۆیە حەزی ئەکرد ئەو حەقە بە هەموو کەسێك بگەیەنێ .. پێی خۆش بوو هەلی دەست بکەوێ و ئەو راستی‌یە پاکە بدا بەگوێی پیاوی شیاودا ..

ئەوەبوو جارێکیان قورەیشی‌یەکان هاتنە لای حوصەین کە باوکی عیمرانی کوڕی حوصەین بوو .. لەبەر ئەوەی زۆر بە گەورە و بەرێزیان ئەزانیی هاتنە لای و پێ‌یان وت : ئەم پیاوە بدوێنە ، چونکە ناوی خواکانمان بە خراپە ئەبات و جنێویان پێ ئەدات . قورەیشی‌یەکان لەگەڵ حوصەین‌دا هاتن لە نزیك دەرگای ماڵی پێغەمبەرەوە ﷺ دانیشتن . فەرمووی : (( أوسعوا للشيخ )) . فەرمانی دا جێگا بۆ حوصەین فراوان بکەن ، چونکە عیمران و هاوەڵانی زۆربوون کە لەوێ ئامادە بوون. حوصەین وتی : ئەمە چی‌یە لێتەوە پێمان گەیشتووە کە : جنێو بە خواکانمان ئەدەیت و ناویان ئەبەیت ، خۆ باوکی تۆ بۆ پارێزگاریی دینی باوباپیری قەڵایەکی

[١٣٨] سيرة إبن هشام : ١ / ٢٧٢ ـ ٢٨٠ ، البداية والنهاية : ٣ / ٥٣ ـ ٥٧ .

چاك بوو ؟ فەرمووی : (( يا حصين ! إنَّ أبي وأباكَ في النار ، [١٣٩] يا حصينُ كم تعبُدُ مِن إله ؟ )) . فەرمووی : حوصەین ! باوکی منیش و باوکی تۆیش لە ئاگردان . ئەی حوصەین ! تۆ چەند خوا ئەپەرستی ؟ وتی : لە زەوییدا حەوت و لە ئاسمانیش دا یەك . فەرمووی : (( فإذا أصابك الضُّرُّ مَن تدعو ؟ )) . فەرمووی : ئەگەر زەرەر و نارەحەتییەکت تووش بوو هاوار لە کێ ئەکەی ؟ وتی : لەو خوایەی کە لە ئاسماندایە . فەرمووی : (( فإذا هلك المالُ مَن تدعو ؟ )) . فەرمووی : ئەی ئەگەر ماڵ و سامانت تیا چوو هاوار لە کێ ئەکەی ؟ وتی : لەو خوایەی کە لە ئاسمان دایە . فەرمووی : (( فيستجيبُ لكَ وَحْدَهُ وَتُشرِكهم مَعَه ، أَرْضَيْتَه في الشكر أَم تَخافُ أن يَغلبَ عَلَيكَ ؟ )) . فەرمووی : تەنها ئەو دێت بە هاناتەوە ، کەچیی خواکانی زەوییش ئەکەیتە شەریکی .. ئایا بۆ سوپاسگوزاریی هاواری لێ ئەکەیت ، یان ئەترسیی زیانت پێ بگەیەنێ و ، زیانت لێ دوور نەخاتەوە ؟ وتی : هیچ کامیان ! پاشان وتی : ئەشزانم هیچ شتێکی وەهام پێ ناوترێ . فەرمووی : (( يا حُصين ! أَسلم تسلم )) . فەرمووی : موسڵمان ببە ، سەلامەت ئەبی . وتی : من خزم و عەشرەتێکم هەن ، دەی چیی بڵێم ؟ فەرمووی : (( قل : أللهم إني أستهديكَ لأرشَدِ أَمري وزدني علماً يَنفَعُني )) . فەرمووی : بڵێ : خوایە داوای هیدایەتت لێ ئەکەم بۆ سەر چاکترین ڕێگا و ، زانستیشم زیاد بکە تا کەڵکم پێ بگەیەنێ . حوصەین فەرمایشتەکەی دووبارە کردەوە و ، هەڵ نەسا هەتا موسڵمان

---

[١٣٩] پێغەمبەر ﷺ نایەوێ دڵی حوصەین بشکێ ، بۆیە باوکی خۆیشی ئەخاتە گەل باوکی ئەو . جا هەندێ ئەم فەرموودەیە و هی تریش ئەکەنە بەڵگەی ئەوە کە دایك و باوکی لە دۆزەخ دان . بەڵام زانای پایەبەرز ئیبن حەجەر لە ( الزواجر ) دا وتوویە : خوای گەورە ڕێزی لە پێغەمبەرمان ﷺ بەوە گرتووە کە دایك و باوکی زیندوو کردوونەتەوە هەتا ئیمانیان هێناوە ، هەروەك لە فەرموودەیەكدا هاتووە کە ئیمام قورطوبیی و ئیبن ناصیرووددینی حافیظی شام و غیری ئەوانیش بە صەحیحیان داناوە ، بەمە بە پێچەوانەی یاسای ئاساییەوە ، لەبەر ڕێزنان لە پێغەمبەر ﷺ ، دوای مردن دایك و باوکی کەڵکیان لە ئیمان وەرگرتووە . ئیبن عابیدین ڕەحمەتی خوای لێ بێ وتوویە : ئەمە پێچەوانەی ئەوە نیە کە ئیمام لە ( الفقه الأكبر ) دا وتوویە کە دایك و باوکی پێغەمبەر ﷺ لەسەر کوفر مردوون . هەروەها پێچەوانەی ئەو فەرموودەیەش نیە کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە : (( إستأذنت ربي أن أستغفر لأمي فلم يأذن لي )) . فەرموویە : لە پەروەردگارم داوای ماوەم کرد تا داوای لێخۆش بوونی بۆ بکەم ، کەچیی ماوەی نەدام .. هەروەها پێچەوانەی ئەو فەرموودەیەش نیە کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە کە پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! باوکم لە کوێیە ؟ فەرمووی : (( في النار )) . کە پیاوەکە پشتی هەڵ کرد بانگی کردەوە و فەرمووی : (( إن أبي وأباك في النار )) . فەرمووی : باوکی هەردووکمان لە ئاگردان . ئەو ڕایەی سەرەوە پێچەوانەی ئەمانە نیە لەبەر ئەوەی کە ئەگونجێ زیندووکردنەوەی دایك و باوکی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوە بووبێ .

بوو . عیمران ( ی کوڕی ) هەستا سەر و هەردوو دەست و هەردوو پێی (باوکی) ماچ کرد .. کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بینیی دەستی بە گریان کرد و فەرمووی : (( بكيتُ من صَنيعِ عمرانَ ، دخل حُصَينٌ وهو كافرٌ فلَم يَقُم إليه عمرانُ ولَم يَلتَفتْ ناحيَتَهُ ، فلما أَسلَمَ قضى حَقَّه فَدَخَلَني من ذلك الرِّقَّةُ )) . فەرمووی : بەم کارەی عیمران گریام . حوصەین کە کافر بوو و هاتە ژوورەوە عیمران لەبەری هەڵنەستا و ئاوڕیشی نەدایەوە بۆ لای ، بەڵام کە موسڵمان بوو ڕێزی لێ گرت و ، منیش بەوە دڵم پڕ بوو .

کاتێك کە حوصەین ویستی هەستێ و بڕواتەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرمو : (( قوموا فَشَيِّعوهُ إلى منزله )) . فەرمووی : هەستن تا ماڵەوە ڕەوانەی بکەن .. کاتێ کە لە دەرگاکە چووە دەرەوە قوڕەیش چاویان پێ کەوت وتیان : لە دین وەرگەڕا . ئیتر بڵاوەیان لێ کرد . كذا في الإصابة : ١ / ٣٣٧ .[١٤٠]

ئیبن ( عبدالبر ) یش لە موعاویەی کوڕی حیدەی قوشەیرییەوە ، لە ( الإستيعاب ) دا تەخریجی کردووە و بە صەحیحیشی داناوە کەوتوویە : هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەر لەوەی بێمە خزمەتت زیاتر لە ژمارەی پەنجەکانم ـ هەردوو لەپی دەستیشی ئەدا بە یەکدا ـ سوێندم خواردووە کە نەیەمە لات و لە دینەکەشت نزیك نەکەومەوە ، کەچیی وا لە شێوەی کەسێك‌دا کە جگە لەوەی خوا پیشانی دابم هیچ نەزانم ، هاتوومەتە خزمەتت و ، وا لەبەر خاتری خوای مەزن پرسیارت لێ ئەکەم کە پەروەردگارمان تۆی بە چیی ڕەوانە کردووە بۆ لامان ؟ فەرمووی : (( بدين الإسلام )) . پرسیی : ئەی دینی ئیسلام چیە ؟ فەرمووی : (( أنْ تقولَ : أَسلَمتُ وجهِيَ لله وتَخَلَّيْتُ ، وتقيمَ الصلاةَ ، وتؤتِيَ الزكاةَ ، وكلُّ مسلم على كلِّ مسلم مُحَرَّمٌ ، أخوان نصيران ، لا يقبلُ الله ممَّن أشركَ بعدَ ما أَسلَمَ عَمَلاً حتى يفارقَ المشركينَ ، مالي أُمسكُ بحُجَزِكم عَنِ النار ؟ ألا! وإنَّ رَبي داعيَّ وإنه سائلي : هَلْ بَلَّغتَ عبادي ؟ فأَقولُ : ياربِّ ! قد بَلَّغتُ . ألا ! فليُبلِّغْ شاهدُكُم غائبَكُم ، ألا ! ثم إنَّكم تُدعَونَ مُفَدَّمَةً أَفواهُكم بالفِدام ، ثمَّ إنَّ أَوَّل شيءٍ يُنبِيءُ عَنَ أحدكم لفخذُه وَكَفُّهُ )) .

فەرمووی : ئیسلام ئەوەیە بڵێیت : وا مل کەچی هەموو فەرمانێکی خوا بووم و، خۆشم لە شیرك داماڵیی و ، نوێژ ئەنجام بدەیت و ، زەکات بدەیت و ، هەموو

---

[١٤٠] شرح حياة الصحابة : ١ / ١٥٠ ـ ١٥٢ .

موسڵمانێك بە بۆنەی موسڵمان بوونیەوە قەدەغەیە موسڵمانێکی تر ئازاری بدات، چونکە هەر دوو موسڵمان بۆ یەکتریی دوو برای هاوکۆمەك و هاوپشتیوانن .. هەرکەسێ دوای موسڵمانبوون شەریك بۆ خوا قەرار بدات ئەوا هیچ کارێکی چاکەی لێ وەرناگرێ هەتا لە موشریکان دابڕێت و جیا بێتەوە .. منیش هەوڵ ئەدەم تا گوناهـ نەکەن و سەرەنجام نەکەونە ئاگرەوە . بە راستیی پەروەردگارم بانگم ئەکات و پرسیاریشم لێ ئەکات : ئایا تەبلیغی بەندەکانمت کرد ؟ منیش ئەڵێم : پەروەردگارا ! تەبلیغم کرد . دەبا ئێوەش ئەوەتان ئامادەیە تەبلیغی ئەوەتان بکات کە ئامادە نیە . بە راستیی ئێوە بە دەمی بەستراوەوە بانگ ئەکرێن ( تا بە دەمی خۆیان قسە نەکەن ، بەڵکو ئەندامەکانیان بێنە گۆ و راستییەکان بڵێن ) . پاشان ئەوەش بزانن کە یەکەم شتێك هەواڵتان رابگەیەنێ دەست و پێتانە .[١٤١]

ئەڵێ : وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمە دینەکەمانە ؟ فەرمووی : (( هـذا دينك وأينما تحسن يكفكَ )) . فەرمووی : ئەمە دینی تۆیە و ، لە هەر شوێنێکیش دا چاکەیەك بکەیت خوای گەورە لێت رازیی ئەبێ ..

**سیانزەهەم : دڵخۆشکردن بە ماڵ و پایە و دەسەڵات**

قورەیش ـ بە بۆنەی هاتنی دینی تازەوە ـ ئارامی لا هەڵ گیرا بوو .. پێی خۆش بوو بە هەر نرخێك بووە پێغەمبەر و ﷺ هاوەڵانی کۆڵ پێ بدات .. ئەوەبوو هەموو رێیەکی سزادانیان بەکار هێنا کەڵکی نەخوارد .. بگرە ژمارەی موسڵمانەکان زیادی ئەکرد و ، هەتا ئازاردان سەختتر بوایە ، دامەزراویی ئیمان دارانیش لە زیادکردنا بوو .. بۆیە گەڕان بۆ چارەسەرییەکی سەرتاسەریی و مسۆگەر .. پیاوانی ژیر و بەسەلیقەیان کەوتنە بیرکردنەوە .. وایان بە چاك زانیی سیاسەتی نەرمیی و گونجاندن بەکار بهێنن .. یان رازییکردن بە سامان و پایە و پلە ، بەڵکو موحەممەد و شوێنکەوتوانی کۆڵ بدەن .

---

[١٤١] لە فەرموودەیەکی ئیمام موسلیمیشدا ( ٢ / ٤٠٩ ) هاتووە کە : (( فيختم على فيه ، ويقال لفخذه ولحمه وعظامه : أنطقي . فتنطق فخذه ولحمه وعظامه بعمله )) ئەفەرموێ : دەمی دائەخرێت و ، بە ران و گۆشت و ئێسقانی ئەوترێ : قسە بکەن ، ئەوانیش کردەوەکانی باس ئەکەن . لە سوورەتی ( يس )یشدا هاتووە:
﴿ ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ .

ئیبن ئیسحاق لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەظی‌یەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : بۆم باس کراوە ڕۆژێکیان عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ـ کە سەردارێکی خاوەن حیلم بووە ـ لە کۆڕی قورەیش‌دا دانیشتبوو و ، پێغەمبەری خواش ﷺ بە تەنیا لە مزگەوتی حەرام‌دا دانیشتبوو ، وتی : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! هەڵ ئەسم بۆ لای ئەمە و چەند شتێکی ئەخەمە بەردەم بەڵکو یەکێکیان وەربگرێ و ، لە کۆڵمان بێتەوە ؟ وتیان : بەڵێ ، ئەی باوکی وەلید . عوتبە هەستا و چوو لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشت و وتی :

کوڕی برام ! تۆ خۆت ئەزانیی کە لە عەشیرەت‌دا تۆ چاك و لە نەسەبیش‌دا پایەداریت و ، کارێکی گەورەشت ڕووبەڕووی خزمەکانت کردۆتەوە : کۆمەڵیانت پەرتەوازە کردووە و ، پیاوە ژیرەکانیانت بە سەفیهـ دەرکردووە و ، دین و خواکانیانت عەیب‌دار کردووە و ، باوباپیرانی لەمەو پێشیانت بە کافر دەرکردووە .. جا وا من چەند کارێکت ئەخەمە پێش چاو تا سەرنجیان بدەیت ، بەڵکو یەکێکیان وەربگریت ..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( قُل يا أَبَا الوَلِيدِ أَسْمَعُ )) . فەرمووی : ئەبولوەلید ! بڵێ ، گوێم لێ‌یە .

وتی : کوڕی برام ! ئەگەر بەم کارەی کە هێناوتە ماڵ و سامانت ئەوێ ، ئەوا لە ماڵ و سامانی خۆمان ئەوەندەت بۆ کۆ ئەکەینەوە هەتا لە هەموومان سامانت زیاتر بێت و ، گەر پایە و ماقووڵییشت ئەوێ ، ئەوا ئەت‌کەینە سەرداری خۆمان و بەبێ تۆ پەنجە بە خۆڵ‌دا ناکەین و ، گەر پادشایەتییشت ئەوێ ، ئەوا ئەت‌کەینە پادشای خۆمان و ، گەر ئەمەش کە تووشت ئەبێ جیننی‌یە و ئەی‌بینیی و توانات نیە لە خۆتی دوور بخەیتەوە ، ئەوا پزیشکت بۆ بانگ ئەکەین و ، لە ماڵ و سامانمان ئەوەندەت بۆ خەرج ئەکەین تا چاکت ئەکەینەوە ، چونکە جاری وا ئەبێ جیننی‌یەك بەسەر کابرادا زاڵ ئەبێ مەگەر دەرمانی خۆی بکات .

هەتا عوتبە لە قسەکانی بوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر گوێی بۆ گرتبوو ، پاشان فەرمووی : (( أَقَد فَرغتَ يا أَبا الوَلِيد ؟ )) . فەرمووی : ئەی عوتبە ئایا لێ بوویتەوە ؟ وتی : بەڵێ . فەرمووی : (( فَاسْمَع مِنِّي )) . فەرمووی : دە گوێم بۆ بگرە . وتی : باشە . فەرمووی : ﴿ حمٓ ۝ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ ۝ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ

لَا يَسْمَعُونَ ۝ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَـٰمِلُونَ ﴾ ( فصلت : ١ ـ ٥ ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر خوێندنی سوورەتەکە بەردەوام بوو .. کە عوتبە قورئانەکەی بیست بە جوانیی گوێی لێ ڕاگرت و ، هەردوو دەستی لە پشتیەوە دانا و خۆی دا بەسەریانا . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ئایەتی سەجدە و سەجدەی برد ، پاشان فەرمووی : (( قَد سَمِعتَ يا أبا الوَليد ما سَمِعتَ ، فَأَنتَ وَذَاكَ )) !! فەرمووی : ئەوەی کە بیستت وەڵامی تۆیە !

لە ریوایەتەکەی ئیمام بەیهەقییدا وا هاتووە : کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە فەرمایشتی :

﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَـٰعِقَةً مِّثْلَ صَـٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴾ ( فصلت : ١٣ ) ،
خێرا عوتبە دەستی گرت بەسەر دەمی پێغەمبەردا و ، تکای لێ کرد کە لەبەرخوا و ، لەبەر خزمایەتیی بووەستێ !!

عوتبە بە باشیی لە بەلاغەتی ئایەتەکان تێ ئەگەیشت ، بۆیە ئەترسا ئەو هەڕەشەیە بە خێرایی جێبەجێ ببێ ، وا پاڕایەوە ڕەحمبڕیی نەکات بەرامبەر بە خزمەکانی !

کە عوتبە وەڵامی وەرگرت هەستا و گەڕایەوە بۆ ناو هاوەڵەکانی .. کە ناوچاوی عوتبەیان لە دوورەوە بینیی ، بە یەکتریان وت : سوێند بە خوا ئەخوێن کە عوتبە بەو دەم و چاوەوە نەگەڕاوەتەوە کە لێرەوە ڕۆیشت .. ئەمەش وریایی ئەو کۆمەڵە دەرئەخات کە چۆن لە دەم و چاوی عوتبەدا شتێکیان خوێندەوە و زانییان عوتبە دۆڕاوە و ورەی لە دەست داوە . کە گەیشتە لایان و دانیشت وتیان : ها باوکی وەلید چییت پێیە ؟ وتی : ئەوەم پێیە کە وتەیەکم بیستووە ، بەخوا هەرگیز وتەی وەهام نەبیستووە ، بەخوا نە شیعرە ، نە سیحرە ، نە کاری کاهینانە .. ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! وەرن بە گوێم بکەن و ، بیخەنە ئەستۆی منەوە و ، واز لەم پیاوە بهێنن و دەستبەرداری خۆی و دینەکەی بن . بەخوا ئەم وتەیەی کە من لێوەم بیست ، دەنگ و باسێکی ئەبێ . جا ئەگەر عەرەب لە ناوی برد ، ئەوا کەسانی تر لە کۆڵتان ئەکەنەوە ، خۆ ئەگەر بەسەر عەرەبیشدا زاڵ

ببێ، ئەوا موڵك و دەسەڵاتی ئەو موڵك دەسەڵاتە بۆتان و ، بلندییشی بلندی‌یە بۆتان و ، لە هەموو کەسێ زیاتر ئێوە پێی بەختەوەر ئەبن .

وتیان : بەخوا ، ئەی باوکی وەلید ! بە زمانی سیحری لێ کردوویت !! وتی : ئەوە رای منە و ، ئێوەش چیتان بەلاوە چاکە وەها بکەن .[١٤٢]

دیارە ئەم بۆچوونەی قورەیش لەبەر ئەوەیە لە کاری پێغەمبەرایەتیی بێ‌ئاگان ، ئەگینا کۆمەڵێکی لێ‌هاتوو بوون ، چونکە خەمی کۆمەڵگەیان ئەخوارد و ، تەگبیر و راوێژی پێویستیان ئەکرد و ، لە کۆتاییش‌دا بۆ پاراستنی قەوارەی کۆمەڵەکەیان ئەو هەمووە جەنگە سەروماڵی‌یە خوێناویانەیان بەرپا کرد . بەڵام بە راستیی نەیان‌پێکا کاتێك کە موحەممەدی دەست‌پاك و راستگۆیان بە داواکاری ماڵ و پادشایی و بەرژەوەندیی تایبەتیی ، یان بە نەخۆشیی و شێتیی تاوانبار ئەکرد .. ئەگەر ئەوان دانیشتوانی سەرانسەری زەوی‌یان بەو باسانەوە تاوانبار بکردایە ، ئەبوا ( محمد الأمين ) یان بە شیاوی ئەو تاوان‌بارکردنە نەزانی‌بایە . چونکە بەسەربردنی زیاتر لە چل ساڵی تەمەنی لەناویان‌دا شاهێدە کە ئەم بەڕێزە دوورە لە هەڵوێستی نزم و سووك و ، هیچ کات بۆ دنیاگەریی و بەرژەوەندیی‌بازیی کەسی نەخەڵەتاندووە . بۆیە ئەبوا بە پێی تەمەنی پیرۆزی بیان‌زانیایە کە شایانە خوای مەزن وەحی بۆ بنێرێ و ، بی‌کاتە هەڵگری پەیامی ئاسمان و پەروەردەکەری ئوممەتی ئیسلام و ، رزگارکەری مرۆڤایەتیی و ، مێژوو بۆ مرۆڤ دروست بکات و، لەسەر بناغەی ئیمان شارستانیەتێکی وەها مەزن بەرپا بکات کە تا ئاخرزەمان هەر بەردەوام بێت .

بەڵێ ، عوتبە بە بیستنی چەن ئایەتێك بۆی دەرکەوت کە خزمەکانی لە کاری ئازیز ئاگادار نین .. بە راستیی شاهێدیی دا کە موحەممەد بەرز و بەڕێزە و ، کاری سووك ئەنجام نادات ..

سەرم لەو کەسانە سووڕ ئەمێنێ کە دوای زیاتر لە هەزار و چوارصەد ساڵ هێشتا ئازیز ناناسن و ، بڕوای پێ ناکەن ، دوای ئەوەی کە بە پەروەردە ناوازەکەی چەندین ملیار مرۆڤی پاکی پەروەردە کردن .. ئای کە داماو و دواکەوتوو و گەمژەن ئەوانەی شوێنی ناکەون !!

[١٤٢] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٠٦ ـ ٣٠٨ .

قورەیشی‌یەکان بە هاتنی قورئان زۆر سەرسام بوون ، بە تایبەتیی پیاوە ناودارەکانیان ، چونکە بە سەلیقە هەستیان بە بەرزیی و پایەداریی شێوازی قورئان ئەکرد .. بە راستیی کاری کردبووە سەر هەر هەموویان ..

ئیبن ئیسحاق لە ( السیرة )دا لە زوهەری‌یەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : بۆم باس کراوە کە : شەوێکیان ئەبوجەهل و ، ئەبوسوفیان و ، ئەخنەسی کوڕی شەریق ، هەر یەکە بە جیا و بۆ خۆی لە ماڵ دەرئەچن و ، تا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەوە شەونوێژ ئەکات گوێ لە قورئان خوێندنەکەی بگرن ، هەر یەکەیان شوێنێکی بۆ خۆی گرت تا گوێ بگرێ و ، هیچ کامیشیان بە شوێنی دوانەکەی تر نازانێ . ئەو شەوە گوێیان گرت ، تا کە رۆژیان لێ بوویەوە و فەجر دەر هات هەر یەکەیان لە شوێنی خۆی هەستا و لە رێگا یەکیان گرتەوە .. کە بە یەکتری‌یان زانیی ، لۆمەیان لە خۆیان کرد و بە یەکتری‌یان وت : نەگەڕێنەوە ، ئەگەر سەفیهێکتان بتان‌بینێ ئەوا ئەبنە هۆی ئەوەی کە شتێك بکەوێتە دڵیەوە . پاشان رۆیشتن .

بۆ شەوی دووهەم هەر پیاوێکیان - بەبێ ئاگاداریی لە هاتنی دووانەکەی تر - لە شوێنەکەی خۆی دانیشتەوە و ، شەو هەتا بەیانیی گوێی گرت ، تا کە فەجر دەرکەوت هەر یەکە لە شوێنی خۆی هەستا و لە رێگا یەکیان گرتەوە .. ئەمجارەش وەك جاری پێشوو ئامۆژگاریی یەکتریان کردەوە و ، پاشان رۆیشتن !!

بۆ شەوی سێهەم دیسان هەر پیاوێکیان چووەوە شوێنەکەی خۆی و دانیشت و هەتا بەیانیی گوێیان لە پێغەمبەر ﷺ گرت و ، تا کە فەجر دەرکەوت هەر یەکە لە شوێنی خۆی هەستا و لە رێگا یەکیان گرتەوە .. وتیان : هەتا پەیمان نەدەین کە جارێکی تر نەگەڕێینەوە ، ئەم شوێنە بەجێ ناهێڵین . ئەوەبوو پەیمانیان لەسەر نەگەڕانەوە دا و ، پاشان لێك جوێ بوونەوە !!

کە رۆژ بوویەوە ئەخنەسی کوڕی شەریق داردەستەکەی هەڵ گرت و ، خۆی گەیاندە ماڵی ئەبوسوفیان و وتی : ئەبوحەنظەلە ! دەربارەی ئەوەی کە لە موحەممەدت بیست رات چی‌یە ؟

وتی : ئەبوثەعلەبە ! بەخوا هەندێ شتم بیست کە ئەمزانی چین و ، مەبەستەکەشیانم ئەزانی و ، هەندێ شتیشم بیست کە نە مانام ئەزانین ، نە مەبەستیشیانم ئەزانی .

ئەخنەس وتی : بەو خوایەی کە سوێندت پێ خوارد منیش هەروا بووم !

لای ئەو دەرچوو و خۆی گەیاندە لای ئەبوجەهل و چووە ژوورەوە لای و وتی : ئەبولحەکەم ! دەربارەی ئەوەی کە لە موحەممەدت بیست رات چی‌یە ؟

وتی : جا چیم بیستووە ؟ ئێمە و نەوەی عەبدمەناف لەسەر شەرەف و پایەداریی ناکۆکیی کەوتە نێوانمان : نانیان دا ، ئێمەش نانمان دا .. کۆڵیان هەڵ گرت ، ئێمەش کۆڵمان هەڵ گرت .. شتیان بەخشیی ، ئێمەش شتمان بەخشیی .. تا کە بەرامبەر یەك بە یەکسانیی وەستاین ، وتیان : ئێمە پێغەمبەرێکمان تیا هەڵکەوتووە کە لە ئاسمانەوە وەحی بۆ دێت ، جا ئێمە کەی بەوە ئەگەینەوە ؟ دە بەخوا هەرگیز ئیمانی پێ ناهێنین و، تەصدیقیشی ناکەین !![143]

لەم رووداوەوە دوو شتمان بۆ دەرئەکەوێ :

١ ـ عەرەبەکان بە فیطرەت لەزەتیان لە بیستنی قورئان بردووە ، بە رادەیەك کە پیاوانێکی ناودار وەك ئەو سیانەی پێشەوە گوێ نەدەنە ئەوە لەسەر خۆڵ لە پشت دەرگا و پەنجەرەوە دانیشن و هەتا بەرەبەیان خەو لە خۆیان حەرام بکەن و گوێ لە قورئان خوێندن بگرن ..

٢ ـ دوای دەرکەوتنی راستیی ، کە ئەوانە ئیمان ناهێنن بەڵگەیە لەسەر دەمارگیریی سەردەمی نەفامیی .

جا یەکێ وەکو ئەبوجەهل ئەمە قەناعەتی دەربارەی قورئان ، کەچیی بۆ هەڵ خەڵەتاندنی خۆیشی و خەڵکییش دەست بە رەخنەگرتن ئەکات لە قورئان :

ئەوەبوو کاتێك کە ئایەتی ﴿عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ﴾ لە سوورەتی ( المدثر ) هاتە خوارەوە ، ئەبوجەهل بۆ گاڵتە و رەخنە ئەیوت : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! موحەممەد وەهای رائەگەیەنێ کە ئەو سەربازانەی کە لە دۆزەخ دا سزاتان ئەدەن و لەوێ بەندتان ئەکەن نۆزدە سەربازن ، دەی خۆ ئێوە یەکجار زۆرن ، گوایا هەر صەد پیاوتان چاری پیاوێکیان ناکەن ؟ ئەوەبوو لە پەرچ دانەوەی ئەم بۆچوونە منالانەدا ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە : ﴿ وَمَا جَعَلۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةٗۙ وَمَا جَعَلۡنَا عِدَّتَهُمۡ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيَسۡتَيۡقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗاۙ وَلَا يَرۡتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم

[143] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣١٢ .

مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾ ( المدثر : ٣١ ) .[١٤٤]

لەگەڵ ئەو هەمووە دژایەتی‌یەدا پێغەمبەری نازدارمان ﷺ زۆر حەزی ئەکرد ئەو خزمانەی گوێ لە قورئان بگرن ، چونکە قورئان زۆر کاریگەر بوو لەسەریان ، لە هەمان کاتدا موشریکەکان پێیان خۆش نەبوو خەڵك گوێی لێ بگرێ ، نەوەکو دڵیان نەرم ببێ و ویژدانیان ببزوێ و ئیمان بهێنن .. هەتا ئامۆژگاریی یەکتریان ئەکرد تا لە کاتی قورئانخوێندنی پێغەمبەردا ﷺ قرە قرِ بکەن و ، گومان و دوو دڵیی بۆ خەڵك دروست بکەن و نەهێڵن بە چاکیی ببیسترێ .. قورئانی پیرۆزیش باسی ئەو هەڵوێستەیان ئەکات و ئەفەرموێ :

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ ( فصلت : ٢٦ ).

هەتا ئەوەندە خوار و خێچ بوون کە دەنگی قورئانخوێندنیان ئەبیست بڵاوەیان لێ ئەکرد ، هەندێکیش ئاژاوەیان دروست ئەکرد و ، هەندێکیشیان کراسەکەیان ئەدا بەسەر خۆیانا هەتا نەبیستن . قورئانیش ئەو حاڵەتەیان باس ئەکات کە ئەفەرموێ :

﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ ( هود : ٥ ) .

هەندێکی تر لەو خەڵکە شەیدای قورئان بوو بوون و ، هەمیشە حەزیان لە گوێگرتن بوو .. جا هەرچەندە بۆیان بکرایە بە نهێنیی گوێیان ئەگرت و ، کە بترسانایە ئەوانی تر پێیان بزانن ئەوا ئەڕۆیشتن و دوور ئەکەوتنەوە نەوەکو ئازاریان بدەن . بۆ ئەمەش خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دا تا لە کاتی نوێژکردندا دەنگی یەکجار بەرز نەکاتەوە و نەشی شارێتەوە ، بەڵکو مامناوەندیی بیخوێنێ ، ئەویش لەبەر خاتری ئەوانە .

ئیبن عەبباس ئەڵێت : ئایەتی :

﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴾ ( الإسراء : ١١٠ ) بە بۆنەی ئەوانەوە هاتە خوارەوە ، ئەفەرموێ : ئەوەندە دەنگت لە نوێژدا بەرز

[١٤٤] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٣١١ .

مەکەرەوە کە خەڵکەکە بێزار بن و بڵاوەی لێ بکەن ، ئەوەندەش نزمی مەکەرەوە کە ئەوانەی پێیان خۆشە گوێت لێ بگرن ، نەیبیستن و لێی بێبەش بن . [١٤٥]

**چواردەهەم : بە ئاشکرا خوێندنی قورئان**

هەرکەسێ قورئانی بە دەنگی بەرز بخوێندایە ، موشریکەکان لە ترسی ئەوەی نەوەك کار بکاتە سەر دڵ و دەروونی خەڵکەکە ، ئازاری ئەو کەسەیان ئەدا .. بۆ ئەمە یەکێ لە هاوەڵان ، کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود بوو ، ئەم کارەی خستە ئەستۆی خۆی ..

ئەوەبوو رۆژێکیان هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەوە و وتیان : بەخوا هێشتا قورەیش ئەم قورئانەیان بە ئاشکرا و بە دەنگی بەرز نەبیستووە . ئەوە چ پیاوێك ئامادەیە بیدات بە گوێیاندا ؟

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی رازیی بێ ، کە لەو رۆژەدا گەنجێکی لاوازی بێکەس بوو ، وتی : من ! وتیان : ئێمە لە تۆ ئەترسین ، پیاوێکمان ئەوێ کەس وکاری هەبن و ئەگەر خەڵکەکە ویستیان لێی بدەن ، ئەوان بەرگریی لێ بکەن . وتی : وازم لێ بێنن ، خوا بەرگرییم لێ ئەکات ..

بۆ سبەینێ لە کاتی چێشتەنگاودا ئیبن مەسعوود هاتە لای مەقام و ، قورەیشیش کۆڕیان بەستبوو و ، عەبدوڵڵاش لە لای مەقامدا وەستا و ، دەستی بە قورئان خوێندن کرد :

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ دەنگی بەرزکردەوە : ﴿ ٱلرَّحْمَٰنُ ۝١ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾ لەسەر خوێندنی خۆی بەردەوام بوو .. قورەیش ئاوڕیان لێ دایەوە .. سەرنجیان دا .. لە یەکتریان ئەپرسیی : ( إبن أم عبد ) چیی ئەڵێ ؟ بەرە بەرە تێگەیشتن قورئان ئەخوێنێ .. وتیان : لەوە ئەخوێنێ کە بۆ موحەممەد هاتووە .. هەستانەوە بۆی .. بەبێ بەزەیی دایان گرتەوە .. لە دەم و چاوی .. ئەویش هەر بەردەوام بوو .. چەندێ خوا ویستی لەسەر بوو خوێندی .. پاشان گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵانی ، بەڵام دەم و چاوی ئازاری زۆری پێگەیشتبوو . وتیان : ترسی ئەمەمان لە دڵدا بوو بۆت . وتی : دوژمنانی خوا ئێستە لە هەموو کاتێك بە لامەوە سووکترن ..

---

[١٤٥] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٣١٣ .

ئەگەر بتانەوێ سبەینێش بە هەمان شێوە ئەچمەوە بەردەمیان . وتیان : نەء ، بەستە ، ئەوەی کە ئەوان پێیان ناخۆش بوو دات بە گوێیان‌دا ..[١٤٦]

**پانزەهەم : هەوڵی دووهەمی عوتبە**

لە پێشەوە هەوڵی یەکەمی عوتبە باس کرا کە ئەی‌ویست بە هەر شێوەیەك بووە پێغەمبەری خوا ﷺ رازیی بکات ، تا بەڵکو واز لە خۆیان و دین و خواکانیان بێنێ . پیاوماقووڵانی قورەیش وایان بە چاك زانیی جارێکی تر ئەو هەوڵە بدرێتەوە . بۆ ئەمە عوتبەی کوڕی رەبیعە و شەیبەی برای و ، ئەبوسوفیان و ، نەضری کوڕی حاریث و ، ئەبولبوختەریی کوڕی هیشام و ، ئەسوەدی کوڕی موطەللیبی کوڕی ئەسەد و ، زەمعەی کوڕی ئەسوەد و ، وەلیدی کوڕی موغیرە و، ئەبوجەهلی کوڕی هیشام و ، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئومەییە دوای مەغریب ، لە نزیك کەعبەدا دانیشتن و ، ناردیشیان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە پیاو ماقووڵانی قەومەکەت کۆ بوونەتەوە ، تا وت و وێژت لەگەڵ‌دا بکەن . ئەویش بە پەلە تەشریفی هێنا بۆ لایان و، وای‌ئەزانیی دەربارەی ئەم کارەی شتێکیان بۆ دەرکەوتووە . لە راستییش‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئیمان هێنانیان زۆر سوور بوو و، حەزیشی لەوە بوو رێی راست بدۆزنەوە و ، ناڕەحەتیی و تیاچوونیانی یەکجار بە لاوە قورس بوو . کە لەلایان دانیشت ئەوەی کە جاری پێشوو عوتبە پێی وتبوو ئەمانیش خستیانەوە بەردەمی . کە ئەوان لە پێشنیارەکەیان بوونەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون : (( ما بي ما تَقُولُونَ ، ما جئتُكُم بما جئتكم بِهِ أَطلُبُ أَموالَكُم ، وَلا الشَّرَفَ فيكُم ، وَلا المُلكَ عَلَيكُم ، وَلكِنَّ اللهَ بَعَثَني إِلَيكُم رَسولاً، وأَنزَلَ عَلَيَّ كتاباً ، وأَمَرَني أَن أكونَ لَكُم بَشيراً وَنذيراً ، فَبَلَّغتُكُم رِسالات رَبِّي ، وَنَصَحتُ لَكُم ، فإِن تَقبَلوا مِنِّي ما جِئتُكُم بِه فَهُو حَظُّكُم في الدنيا والآخِرَة ، وإِن تَرُدُّوهُ عليّ أَصبِرُ لأَمرِ اللهِ حتى يَحكُمَ اللهُ بَيني وَبَينَكُم )) !!.

فەرمووی : هیچیێ لەوانەم نیە کە ئێوە ئەی‌ڵێن ، ئەوەش کە هێناومە بۆ ئەوە نیە داوای سامانتانی پێ بکەم ، یان خۆم پایەدار بکەم لە ناوتان‌دا ، یان خۆم بکەمە پادشا بەسەرتانەوە ، بەڵکو خوای گەورە بە پێغەمبەریی رەوانەی لای ئێوەی کردووم و ، کتێبێکی بۆ ناردووم و ، فەرمانی بەسەرم‌دا داوە کە مژدەدەر و ترسێنەرتان بم . منیش فەرمایشتی خوام پێتان راگەیاند و ، ئامۆژگارییتانم

[١٤٦] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣١٤ .

كرد . جا ئەگەر ئەوەى كە هێناومە بۆتان لێم وەرگرن ئەوە بەختى دنيا و قيامەتتان بە دەست هێناوە و ، گەر بيشىدەنەوە بەسەرمدا ، ئەوا بۆ كارى خوا ئارام ئەگرم هەتا حوكم و فەرمانى خۆى لە نێوانماندا جىبەجىٚ بكات !!

وتيان : ئەى موحەممەد ! جا ئەگەر ئەوەى كە پێشنيارمان كرد بۆت لێمان وەرناگرى ، خۆ ئەزانيى كە هيچ كەسێك ئەوەندەى ئێمە ولاتى بەرتەسك و ، سامانى كەم و ، ژيان و گوزەرانى تالٚ نيە . دەى داوا بكە لەو پەروەردگارەت كە ئەم دينەى پيادا رەوانە كردووى ، با ئەم چيايانەمان لىٚ دوور بخاتەوە كە تەنگيان پێمان هەلٚ چنيوە و ، با ولاتەكەمان بەرفراوان بكا و ، وەك رووبارەكانى شام و عێراق رووبارى پيا بڕوا و ، ئەو باوباپيرانەشمان كە لەمەو پێش مردوون بۆمان زيندوو بكاتەوە .. جا با يەكىٚ لەوانەى كە بۆمان زيندوو ئەكاتەوە قوصەى كوڕى كيلاب بێت ، چونكە بە راستيى ريش سپىيەكى راستگۆ بووە . با دەربارەى ئەمەى كە تۆ ئەىلێى پرسيارى لىٚ بكەين بزانين رەوايە يان نارەوا . جا ئەگەر ئەوەى داوامان لىٚ كردوويت ئەنجامت دا و تەصديقيان كردى ، ئێمەش تەصديقت ئەكەين و ، بۆمان دەرئەكەوىٚ كە بە لاى خواوە چ پايە و پلەيەكت هەيە و ، بەو شێوەش كە خۆت ئەىلێى ، راستە ئەو بە پێغەمبەر رەوانەى كردووى .

پێغەمبەرى خوا ﷺ پێيانى فەرموو : (( ما بهذا بُعثتُ ، إنَّما جئتُكُم من عند الله بما بَعَثَني به ، فقد بَلَّغتُكُم ما أُرسلتُ به إلَيكُم ، فإن تَقبَلُوهُ فَهُوَ حظُّكُم في الدنيا والآخرةِ ، وإن تَرُدُّوهُ عليَّ أصبرُ لأمرِ اللهِ حتى يَحكُمَ اللهُ بيني وبَينَكم )) !!

فەرمووى : من ئەمەم پىٚدا رەوانە نەكراوە ، بەلٚكو لەلايەن خواوە ئەوەم بۆ هێناون كە خوا پێمدا رەوانەى كردووە . وا منيش ئەوەى پێم رەوانە كرابوو بە ئێوەم راگەياند . جا ئەگەر لێم وەرگرن ئەوە بەختى دنيا و قيامەتتان بە دەست هێناوە و ، گەر بىشىدەنەوە بە سەرمدا ، ئەوا بۆ كارى خوا ئارام ئەگرم هەتا حوكم و فەرمانى خۆى لە نێوانماندا جىبەجىٚ بكات !!

وتيان : دەى ئەگەر ئەمە بۆ ئێمە ناكەى ، دەى بۆ خۆت شتىٚ بكە : داوا بكە لە پەروەردگارت تا مەلائيكەتێك بنێرىٚ بۆ لامان و ، تەصديقى ئەوە بكات كە تۆ ئەىلێى و ، لەسەرت بكاتەوە .. هەروەها داواى لىٚ بكەى كە باخ و باخات و گەنجينە و كۆشك و تەلارى لە زێڕ و زيو دروستكراوت پىٚ ببەخشىٚ و ، پێويستييت بەو هەولٚ و كۆششە نەمێنىٚ كە ئێمە ئەتبينين ، لە بازاڕەكاندا كار

ئەكەیت و ، وەك ئێمە هەوڵی ژیان و گوزەران ئەدەیت ، تا كە ئەگەر وەك خۆت ڕایئەگەیەنی پێغەمبەری خوا بیت ، ئێمەش بزانین بەلای پەروەردگارتەوە چ پایە و پلەیەكت هەیە .

پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو : (( ما أنا بفاعلٍ ، ما أنا بالذي يَسأَلُ رَبَّهُ هذا ، وما بُعثتُ إلَيكم بهذا ، ولكنّ اللهَ بَعَثني بَشيراً ونَذيراً ، فَإن تَقبَلُوا ما جئتُكم به فَهُو حَظُّكُم في الدنيا والآخرة ، وإن تَرُدُّوهُ عليَّ أصبرُ لأمرِاللهِ حتى يَحكُمَ اللهُ بيني وبينكم )) .

فەرمووی : شتی وەها ناكەم .. من ئەوە نیم كە شتی وەها لە پەروەردگارم داوا بكەم و ، بۆ ئەوەش بۆ لاتان ڕەوانە نەكراوم . بەڵكو خوای گەورە منی بە مژدەدەر و ترسێنەر ڕەوانە كردووە . جا ئەگەر ئەوەی كە هێناومە بۆتان لێم وەربگرن ، ئەوە بەختی دنیا و قیامەتتان بە دەست هێناوە و ، گەر بیشی دەنەوە بەسەرمدا ، ئەوا بۆ كاری خوا ئارام ئەگرم هەتا حوكم و فەرمانی خۆی لە نێوانماندا جێبەجێ بكات !!

وتیان : دەی ، وەك خۆت ڕای ئەگەیەنی كە پەروەردگارت ئەگەر ویستی لەسەربێ ئاسمان ئەخاتە خوارەوە ، بیخەرە خوارەوە ، چونكە هەتا ئەوە نەكەیت ئێمە ئیمانت پێ ناهێنین .

پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو :

(( ذلك إلى اللهِ إن شاءَ فَعَلَ بكُم ذلك )) . فەرمووی : ئەوە بە دەستی خوایە و ، گەر بیەوێ پێتان ئەكات .[١٤٧]

وتیان : ئەی موحەممەد ! ئایا پەروەردگارت نازانێ كە ئێمە لەگەڵتا دائەنیشین و، پرسیاری ئەوەت لێ ئەكەین كە لێتمان پرسیی و ، داوای ئەوەشت لێ ئەكەین كە لێتمان داوا كرد ، تا بێ بە هاناتەوە و ئەوەی كە پێویستە وەڵاممان بدەیتەوە فێرت بكات و ، هەواڵیشت بداتێ كە ئەگەر ئێمە ئەوەی كە هێناوتە لێتمان وەرنەگرت ، ئەو چیمان پێ ئەكات ؟ چونكە پێمان گەیشتووە كە ئەمە پیاوێك

---

[١٤٧] ئەمە ئاماژەیە بۆ فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴾ ( سبأ : ٩ ) .

فێرت ئەکات وا لە یەمامە [١٤٨] و ناویشی (( الرحمن )) ە [١٤٩] ، بەڵام ئێمە ـ بەخوا ـ هەرگیز ئیمان بە رەحمان ناهێنین . ئێمەش ـ ئەی موحەممەد ـ بیانوومان بڕییت و ماوەیەکی زۆر لەسەرت وەستاین ! بەخوا لەسەر ئەمەی کە پێمانت کرد وازت لێ ناهێنین تا لە ناوت ئەبەین ، یان لە ناومان ئەبەیت !! یەکێکیان وتی : ئێمە مەلائیکەت ئەپەرستین ، کە کچی خوان . یەکێکی تریان وتی : ئیمانت پێ ناهێنین هەتا خوا و مەلائیکەت بهێنی بۆ شاهێدیی ، کە تۆ راست ئەکەیت .

کاتێك کە ئەمەیان وت پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایان هەستا و ، عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئومەییەی کوڕی موغیرەی مەخزوومییش لەگەڵیا هەستا . عەبدوڵڵا کوڕی عاتیکەی کچی عەبدولموطەللیب بوو ، واتە پوورزای پێغەمبەر بوو .. عەبدوڵڵا کە لەگەڵیا هەستا وتی : ئەی موحەممەد ! خزمەکانت پێشنیارەکەی خۆیانیان خستە بەردەمت ، کەچیی تۆ وەرت نەگرت .. پاشان چەند کارێکیان بۆ خۆیان داوا کرد لێت ، تا بزانن پایە و پلەت بە لای خواوە چەندە ، ئەوەشت نەکرد .. پاشان داوایان لێ کردی ئەو سزایەی کە ئەوانی پێ ئەترسێنی بە زوویی پێیان بچێژری . دە بەخوا هەرگیز ئیمانت پێ ناهێنم هەتا پەیژەیەك بەرەو ئاسمان بنێیت و ، پاشانیش پیایا سەر بکەویت و ، منیش چاوم لێت بێ هەتا بگەیتە ئاسمان و ، نووسراوێکیش بە شێوەی بەڵگەنامە لەگەڵ خۆتدا بهێنیێ و ، چوار مەلائیکەیش لەگەڵتدا بێن و شاهێدیی ئەوە بدەن کە تۆ راست ئەکەیت . سوێندیش بەخوا ئەخۆم کە ئەگەر ئەوەش ئەنجام بدەیت هێشتا وا ئەزانم تەصدیقت ناکەم !! پاشان رۆیشت و پێغەمبەری خوای ﷺ بەجێ هێشت و ، پێغەمبەری خواش ﷺ بە خەفەت و داخەوە گەڕایەوە لای ماڵ و منداڵی بە بۆنەی لە دەست چوونی ئەوەی کە ئەو بە تەما بوو خزمەکانی ئەنجامی بدەن کاتێ کە بانگیان کرد و ، بە بۆنەی دوورکەوتنەوەشیان لێی . [١٥٠]

جا قورئانی پیرۆز باسی ئەم بڕوبیانوو و ملبادانەی موشریکانی کردووە و دڵی پێغەمبەری ئازیزیشی داوەتەوە کە ئەفەرموێ : ﴿ وَقَالُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ

---

[١٤٨] یەمامە : وڵاتێکی فراوانە کە کانیاو و دارخورمای زۆری لێ بووە و نەوەی حەنیفەی تیا ژیاوە و بنکەی موسەیلەمەی درۆزن بووە لە نەجددا .

[١٤٩] مەبەست لە موسەیلەمەی درۆزنە . هەندێکیش وتوویانە : کاهینێکی جوولەکە بووە لە یەمامە .

[١٥٠] شرح حياة الصحابة : ١ / ١٧٠ ـ ١٧٤ .

تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴾ (الإسراء : ٩٠ ـ ٩٦) .

**هەروەها قسەکانیان ئەگێڕێتەوە :**

﴿ وَقَالُوا۟ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۙ لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا ۚ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٨﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَٰلَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴾ (الفرقان : ٧ ـ ٩) .

**ئەوەش ئەخاتە پێش چاو کە ئەوان ڕەخنە لە پێغەمبەری خوا ئەگرن کە خواردن ئەخوات و ئەچێتە بازاڕ و هەوڵی کار و کاسپی ئەدات ، وە نەبێ کارێکی نەگونجاوی کردبێ ، چونکە ئەوە سوننەتی هەموو پێغەمبەرانە ، کە ئەفەرموێ :**

﴿ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾ ﴾ (الفرقان : ٢٠)

**هەروەها ئەوەشیان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە یاسای خوا وەها بووە کە پێغەمبەرانی مرۆڤ بن و ، هەرگیز مەلائیکەتی بۆ ئەو کارە پیرۆزە هەڵ نەبژاردووە ، کە ئەفەرموێ :**

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ ۖ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾ وَمَا جَعَلْنَٰهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُوا۟ خَٰلِدِينَ ﴾ (الأنبياء : ٧ ـ ٨) .

**چونکە ئەگەر مەلائیکەت بکرێتە پێغەمبەر مەگەر لە شێوەی پیاوێکدا بێتە سەرزەویی ، ئەو کاتە ئەیانوت ئەمە مرۆڤە نەك مەلائیکەت ، کەواتە زیاتر سەریان لێ ئەشێوێ ، کە ئەفەرموێ :**

﴿ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴾ ( الأنعام : ٩ ) .

ئەو بیانووانە را و بۆچوونی مرۆڤی تێ نەگەیشتوون ، چونکە کاری پێغەمبەرایەتیی زۆر لەوە بەرزتر و پیرۆزترە تا تێکەڵ بەو شتە ماددییانە ببێ و ، هاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ رزگاری‌یە لە ئاگری دۆزەخ ، نەك دەست کەوتنی زێڕ و زیو ، یان باخ و باخات . پێغەمبەری خواش ﷺ دنیای ئەوەندە بە لاوە گرنگ نەبوو و ، پشتی لە زرق و برقیشی هەڵ کردبوو ، تا ببێتە نموونەیەکی رێك و پێك لە پێش چاوی هەموو کاربەدەستێك دا کە دنیا مەبەستی گەورەی مرۆڤ نیە و ، مرۆڤی بەرێز و تێ‌گەیشتوو ئەم دنیایە بە کێڵگەی ئاخیرەت دائەنێ .

ئەبو ئومامە خوا لێی رازیی بێ لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویە:

(( عَرَضَ عليّ ربي ـ عزوجل ـ أن يَجعَل لي بَطحاء مكة ذهباً ، فَقُلتُ : يا رَبِّ أَشبَعُ يوماً ، وأَجوعُ يوماً ، فإذا جُعتُ تَضَرَّعتُ إلَيكَ وذَكرتُكَ ، وإذا شَبِعتُ حَمِدتُّكَ وشكرتُكَ )) . رواه أحمد وهذا لفظه ، والترمذي وقال : هذا حديث حسن .

ئەفەرموێ : خوای پەروەردگارم پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم کە دەر و دەشتی مەککەم بۆ بکا بە زێڕ ، منیش وتم : پەروەردگارا ! پێم خۆشە رۆژێ تێر و ، رۆژێ برسیی بم . جا کە برسیی بووم لێت ئەپاڕێمەوە و یادت ئەکەم و ، کە تێریش ئەبم سوپاس و شوکرانەت ئەکەم .

ئەمە وەڵامێکە خوای گەورە خۆی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ﷺ لێ ئاگادار کردووە .. ئەبێ دەروونی ئیماندار ئەوەندە وا بەستەی دنیا نەبێت .. ئەم بۆچوونە زۆر جیاوازە لەگەڵ بۆچوونی ئەوانەدا کە ئیسلام ئەکەنە هۆیەکی دەست‌خستنی دنیا .. ئەوانە لە ئیسلام‌دا وەرنەگیراون و ، قورئانی پیرۆزیش وەهایان تێ هەڵ ئەدا ئەیان‌کاتە پەندی زەمانە !!

کە قوڕەیش ئەو بیانووانەیان ئەگرت و ، داوای رووبار و زێڕ و زیویان ئەکرد ، یان پێغەمبەر ﷺ سەربکەوێ بۆ ئاسمان و مەلائیکەت بهێنێ بۆ شاهێدیی ئەوەی کە خوا رەوانەی کردووە .. ئەم بیانووانە بۆ ئەوە نەبوون کە ئەگەر بۆیان دەرکەوت راست ئەکا ئیمان ئەهێنن ، چونکە بە هاتنی قورئان بەو هەموو ئیعجاز و بەلاغەتەوە ، ئەوان هێشتا قەناعەتیان نەئەکرد .. هەتا ئەوەبوو کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئومەییەی پوورزای سوێندی خوارد و دەری بڕیی کە ئەگەر ئەو کارانەش ئەنجام بدا هێشتا ئیمان ناهێنێ ..

قورئانی پیرۆز هەڵوێستی هەندێکی تریشیان ئەخاتە روو کە سوێندیان ئەخوارد ئەگەر نیشانەیەکیان بۆ بێت لەسەر راستیی ئەم دینە ئیمانی پێ ئەهێنن ، بەڵام قورئان پەرچیان ئەداتەوە کە ئیمان هێنان تەنها بە دەستی خوایە و ، ئەوانە ئەگەر مەلائیکەتیش بێنە خوارەوە سەریان و ، مردووەکانیش وت و وێژیان لەگەڵدا بکەن ، مەگەر بە ویستی خوا ، ئەگینا ئیمان ناهێنن :

﴿ وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِن جَاءَتْهُمْ آيَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ۚ قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِندَ اللَّهِ ۖ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَا إِذَا جَاءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾ ۞ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ ﴾ ( الأنعام : ١٠٩ ـ ١١١ ) .

هەتا خوای گەورە دڵ خۆشیی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەداتەوە کە موشریکان عینادیی ئەکەن و بە دوای حەق و راستییدا ناگەڕێن ، بۆیە ئەگەر قورئان لە شێوەی کتێبێکیشدا بنێرێتە خوارەوە و دەستی لێ بدەن ، ئەو کاتە کافران ئەڵێن ئەمە سیحرە و چاوبەست کراون :

﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَابًا فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾ ( الأنعام : ٧ ) .

قوڕەیشییەکان دژایەتییەکی بێ ڕەحمانەی ئازیزیان ئەکرد ، بەڵام خوای گەورە سۆز و بەزەیی خۆی بەسەر ئەواندا ئەڕژاند :

پێش هەموو شتێك قورئانیان بۆ هات بە زمانێکی پاراو کە هەموویان شەیدای بووبوون ..

دوای ئەو هەموو دژایەتیی و ، بیانووگرتن و داواکارییە سەیر و سەمەرانە ، هێشتا خوای گەورە سۆز و بەزەیی خۆی بەسەریاندا ئەڕژاند ، هەتا کە ئەو داواکاریانەی بۆ جێبەجێ نەئەکردن ، ئەوەش هەر سۆز و بەزەیی بوو . چونکە ئەگەر ئەو داواکاریانەشیان بەجێ بهێنرانایە ئەوا ، مەگەر کەمێکیان ، ئەگینا ئیمانیان نەئەهێنا ، ئەو کاتەش ئەکەوتنە بەر سزای خوا ، کە بریتییە لە دەرهێنانی رەگ و ریشەیان و لەناوبردنیان بە یەکجاریی ، وەك لەناوبردنی عاد و

ئەمـوود و قەومی فیرعەون . بەڵام خوای گەورە بە هـۆی ڕێـزی پێغەمبـەرەوە ﷺ سزای ریشەکەن کردنی لەسەر ئوممەتی ئیسلام هەڵ گرت ، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە رەحمەت نێرراوە نەك بە سزا و عەزاب :

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ .

بەڵێ ، بەڕێزان ! موحەممەدی خۆشەویستمان رەحمەتـە بـۆ هـەموو جیهـان .. رەحمەتە بۆ چاکەکاریش و بۆ خراپەکاریش .. بۆ چـاکەکاران رەحمەتـە بـۆ دنیـا و قیامەتیان و ، بۆ خراپـەکارانیش رەحمەتـە بـۆ دنیایـان ، چـونکە لـە بـەزەویی‌دا رۆچـوون و خنکـان و بـەردەبارانی ئاسمـان بێ‌خـەم بـوون .. هـەروەها تێکـڕای مرۆڤایەتیی لە دینی ئیسلام بەهرەمەنـد بـوون : دەروونـەکان لـە کۆیلایـەتیی و زەلیلیی و شیرك و ، بیروڕای پڕوپووچ و .. مێشکەکانیش لە نەفامیی و گـومڕایی و .. کۆمەڵگاکانیش لە ستەم و جەور و فەسادی ئەخلاقیی ئازاد بوون و ، دەروازە فراوانەکانی زانست و زانیارییش بـۆ مرۆڤایـەتیی خرانـە سـەر پشت و ، خێـر و بێرێکی یەکجار زۆریش بەسەر ئادەمی‌یەکان‌دا پەخشان بوو .

بەڵگەمان بۆ ئەم رەحمەتە فراوانەی ئازیزیش ئەم دوو فەرمـوودە شەریفەن :

ئیمام ئەحمەد لە ئیبن عـەبباسەوە ریوایەتی کـردووە کـە وتوویـە : دانیشـتوانی مەککە داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە کێوی صەفایان بۆ بکات بە زێڕ و، چیاکانیشان بۆ بەرێتە دواوە تا کشتوکاڵ بکەن . بۆ ئەمە پێی وتـرا کـە : ئەگـەر بتەوێ ئەوا لەسەریان بوەستە و ، گەر بشت دەوێ با هەرچی‌یان داواکردووە پێیـان بدرێ ، ئیتر ئەگەر ئیمانیان نـەهێنا ئـەوا چـۆن ئوممەتـە پێشـینەکان تیاچـوون ، ئەوانیش تیا ئەچن . فەرمووی : (( بَل أَستَأْنِي بِهِـم )) . فـەرمووی : لەسـەریان ئەوەستم . هەروەها نەسسـائییش لـە فـەرمـوودەی ئـیبن جـەریرەوە ریوایـەتی کردووە ..

هەروەها لە ریوایەتێکی تردا ئیمام ئەحمەد لـە ئـیبن عـەبباس‌ەوە خـوا لێیـان رازیی بێ ریوایەتی کردووە کە وتوویە : قـوڕەیش بـە پێغەمبـەریان ﷺ وت : لـە پەروەردگـارت بپارێڕەوە تا صەفامان بۆ بکـا بـە زێـڕ و ، ئێمـەش ئیمانـت پـێ ئەهێنین . فەرمووی : (( وتفعلوا ؟ )) فەرمووی : جا وا ئەکـەن ؟ وتیـان : بـەڵێ . ئەڵێ : پێغەمبەریش ﷺ دوعای کرد و جیبریل هاتـە خـوارەوە لای و فـەرمووی : پەروەردگارت سەلامت لێ ئەکات و پێت ئەفەرموێ : ئەگەر بتـەوێ صـەفایان بـۆ

ئەبێت بە زێڕ ، ئیتر هەرکەس ئیمان نەهێنێ ئەوا سزایەکی وەهای ئەدەم کە سزای هیچ کەسم نەدابێ و ، گەر پشت دەوێ دەرگای تەوبە و رەحمەتیان بۆ ئەخەمە سەر پشت .. فەرمووی : (( بل التوبة والرحمة )) .[151]

**شانزەهەم : سووک تەماشاکردنی موسڵمانە لاوازەکان**

کاتێـك کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ تەشـریفی ئەهاتـە مزگـەوت و دائەنیشـت موسڵمانە هەژارە بێدەسەڵاتەکانیش ، بە وێنەی خەبباب و ، عەممار و ، صوهەیب و ، بیلال و ، ئەبوفوکەیهە یەساری بەندەی ئازادکراوی صەفوانی کوڕی ئومەییە ، بە دەوریا دائەنیشتن . جا لەبەر ئەوەی ئەوانـە هـەژار و دەسـت‌کـورت بـوون بـت پەرستەکان گاڵتەیان پێ ئەکردن و پێیان پێ‌ئەکـەنین و ، بـە یـەکتری‌یان ئـەوت : ئەوانە هاوەڵەکانی موحەممەدن !! ئایـا خـوا لـەناو هـەموومان‌دا ئەمانـەی هـەڵ بژاردوون و رێگای راستی پیشان داون .؟! ئەگەر دینەکەی موحەممەد چاك بوایـە ، ئەوانە پێشی ئێمەیان نەئەدایەوە و ، خوا بەوانـەی نەئـەدا و ئێمـەی لێ بێ‌بـەش بکات !! کە کافرەکان ئەم تەشەرانەیان ئەدا لە بیری ئەوەدا نەبوون کە خوای گەورە وەڵامیان بداتەوە ، ئەوەبوو قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و ، پایـە و پلـەی بـەرزی موسڵمانە هەژارەکانی دەرخست و پەرچی وتەی نەفامەکانیشی ئەدایەوە :

﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ ( الأنعام : ٥٣ ) .

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ ۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴾ ( الأحقاف : ١١ ) .

لە هەموو سەردەمێك‌دا مل‌هوڕان دینی خوایان بەوە لەبەر چاو بچووك بۆتـەوە کە هەژار و بێ‌نەوایان شوێنی کەوتوون :

﴿ وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ ﴾ ( هود : ٢٧).

قەومەکەی نووح بە نووحیان ئەوت : تەنها ئەوانە شوێنت کـەوتوون کـە لـەناو ئێمەدا خاوەنی پلە و پایە نین و بێ‌دەسەڵاتن ..

پاشان مل‌هوڕانی مەککە کەوتنە بیانووگرتن تا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بەندە و هەژار و دەست‌کورتانەی دەوروبـەری لـە خـۆی دوور بخاتـەوە ، تـا مـاقووڵانی

[151] البداية والنهاية : ٣ / ٥٢ .

قورەیش لەلای دانیشن . ئەوەبوو ئەیانوت : خۆزگە ئەم بەندە و کۆیلانەت لێمان دوور ئەخستنەوە ، چونکە بۆنی عەرەقی جبەکانیان ئازارمان ئەدات ، ئەو کاتە ئێمە لەلات دائەنیشتین و وت و وێژمان لەگەڵتدا ئەکرد . فەرمووی : (( ما أنا بطارد المؤمنين )) . فەرمووی : هەرگیز ئیمانداران دەر ناکەم .

وتیان : دەی کاتێ ئێمە هاتین بۆ لات ، ئەوان هەڵ بستێنە و ، هەرکەی ویستت با لە لات دابنیشن . فەرمووی : (( نعم )) ، بەو هیوایەوە بەشکوم ئیمان بهێنن و، ئەوەندەش لەسەر ئیمان هێنانیان سوور بوو خەریك بوو لەو بارەوە نووسراوێکیان بۆ بنووسێ .

بەڵام خوای پەروەردگار ، کە خۆی چاك مل‌هوڕانی قورەیشی ئەناسی ، بەم کارەی پێغەمبەری خوا ﷺ نارازیی بوو و ، لەوە قەدەغەی کرد کە ئەو هەژارە ئیمان‌دارە خواپەرستانە دەر بکات .. ئەوانە دوورخستنەوەیان ئەوپەڕی ستەمە ، چونکە ئەوانە بە لای خواوە زۆر پایەدارن :

﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ( الأنعام : ٥٢ ) .

کە ئەم ئایەتە پیرۆزانە هاتنە خوارەوە ، پێغەمبەری ئازیز ﷺ زیاتر لە جاران لە خۆی نزیکی خستنەوە و ، هەرچیی تووشیان ببوایە باوەشی پێدا ئەکرد و ئەیفەرموو : (( أهلاً بِمَن عاتَبَني الله فيهم )) . ئەیفەرموو : مەرحەبا لەو کەسانەی کە خوا لەسەر ئەوان عیتابی لێ گرتم . لە کاتی دانیشتنیشیدا ئەوەندە لێیان نزیك ئەکەوتەوە تا ئەژنۆی بەر ئەژنۆیان ئەکەوت .. بەڵام کە بیویستایە هەستێ ، هەڵ ئەستا و بەجێی ئەهێشتن . بۆ ئەمەش خوای گەورە ئایەتی بۆ نارد تا لەگەڵ هەژارە ئیمان‌دارەکان‌دا دان بە خۆیدا بگرێ و بەجێیان نەهێڵێ ، تا ئەوان لە پێشەوە هەستن و برۆن :

﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴾ ( الكهف : ٢٨ ) .

ئیتر ئەوەبوو پێغەمبەری نازدار ﷺ لەسەر فەرمانی قورئان دائەنیشت و هەڵ نەئەستا ، هەتا ئیمانداره هەژارەکان بە ویستی خۆیان هەڵئەستان و ، ئەشیفەرموو : (( الحمدُ لله الذي لَم يُمتني حتى أَمَرَني أَن أَصبرَ نَفسي مَعَ أَقوامٍ مِّن أُمَّتي ، مَعَكُمُ الْمَحيَا ، وَمَعَكُمُ الْمَماتُ )) . ئەیفەرموو : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە منی نەمراند هەتا فەرمانی ئەوەی بەسەرمدا دا کە لەگەڵ هەژارانی ئوممەتەکەمدا دان بە خۆمدا بگرم . ژیان و مردن هەر لەگەڵ ئێوەدا خۆشە ..

هەر لەو بارەوە رۆژێکی تر ئیبن ئوم مەکتووم [١٥٢] هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، پیاوە گەورەکانی قورەیشیش وەك : عوتبە و ، شەیبەی کوڕانی رەبیعە و ، ئەبوجەهلی کوڕی هیشام و ، عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب و ، ئومەییەی کوڕی خەلەف و ، وەلیدی کوڕی موغیرە لە دەوری بوون و ، هەوڵی ئەدا بەڵکو ئەوانە موسڵمان بن و ، بە موسڵمان بوونیان خەڵکێکی زۆر موسڵمان ببێ ..

عەبدوڵڵا ، کە نابینا بوو ، هات و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! قورئانم بۆ بخوێنە .. لەوەی کە خوا فێری کردووی منیش فێر بکە . چەند جارێ ئەمەی دووبارە کردەوە و، نەیئەزانیی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو پیاوانەوە پەشۆکاوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆش بوو عەبدوڵڵا باسەکەی پێ ئەبڕیی و ، نەیویست وەڵامی خۆی بداتەوە . کە ئەمەی زۆر دووبارە کردەوە ، دەم و چاوی لێ گرژ کرد و رووی کرد بەو لاوە و وازی لێ هێنا ..

عەبدوڵڵا بە چاوەوە نەبوو .. ئەگەر بە چاویشەوە بوایە ، هەقی بە پێغەمبەری خوا نەدا ، کە ئەو دەستی بە ماقووڵانی قورەیشەوە گیرا بوو .. ماقووڵانی قورەیشیش لەو رووگرژکردن و رووهەڵکردنە گلەیی‌یەکیان نەبوو .. بە لایانەوە ئاسایی بوو سەرکردەیەك لەوە گەورەتریش بەرامبەر بە سەربازێکی یان شوێن کەوتوویەکی بکات .. بە لای پێغەمبەری خوایشەوە ﷺ کارێکی وەها گرنگ نەبوو .. بەڵام لە ترازووی خوادا ئەمە زۆر گەورە بوو .. بەڵێ عەبدوڵڵا هەژار و نابینا و بێدەسەڵات بوو ، بەڵام ئیماندار بوو . پیاوماقووڵانی قورەیشیش

---

[١٥٢] ئیبن هیشام وتوویە : ئیبن ئوم مەکتووم یەکێکە لە پیاوانی نەوەی عامیری کوڕی لوئەی و ، ناوی عەبدوڵڵا بووە و ، هەندێکیش ئەڵێن : عەمر . ئوم مەکتوومیش دایکی بووە و ، ناوی عاتیکەی کچی عامیری کوڕی مەخزووم و ، باوکیشی قەیسی کوڕی زائیدە بووە .

هەرچەندە ناودار و دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارن ، بە لای خواوە ئەو سەنگەیان نیە کە ئیمانداریکیان بۆ فەرامۆش بکرێ . بۆیە گلەیی هاتە سەر پێغەمبەر ﷺ .

لە حەوت طبەقەی ئاسمانەوە رەخنە هاتە خوارەوە : چۆن ئەبێ روو لەو ئیمان دارە نابینایە بە گرژییەوە هەڵ بکرێ ؟ ترازووی ئاسمان بەوە رازیی نیە .. ترازووی ئاسمان ئیمانی بە لاوە سەنگینە .. دڵێکی پڕ لە ئیمانی بە لاوە مەبەستە .. سەردارانی قورەیش ئەگەر ئیمان نەهێنن لە ترازووی ئاسماندا زۆر سووك و بێبایەخن : قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە :

﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ۝٢ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ۝٣ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ۝٤ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ۝٥ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ۝٦ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ۝٧ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ۝٨ وَهُوَ يَخْشَىٰ ۝٩ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ۝١٠ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ۝١١ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ۝١٢ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ۝١٣ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ۝١٤ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ۝١٥ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴾ ( عبس : ١ ـ ١٦ ) .

ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە تا مرۆڤە ژیرەکان لە دینی خوا تێ بگەن .. تا لە ترازووی ئیمان شارەزا بن .. ئیماندار بە لای خواوە زۆر سەنگینە .. پایە و پلە و، دەوڵەمەندیی و ، کەس و کار و ، جوانیی لەش و لار هیچیان تیا بەسەر نیە .. خوای گەورە تەنیا ئیمان و ئیخلاص و تەقوای ناو کرۆکی دڵی مەبەستە ..

لە ترازووی شەریعەتدا تەنها ئیمان سەنگی هەیە ..

ئا لێرەدا نرخی مرۆڤ .. رێزی مرۆڤ .. مافی مرۆڤ دیاریی ئەکرێت ..

با هەموو یاسا و بیروباوەڕێك بکشێتە دواوە و ، بە خەجاڵەتەوە واز لە هاش و لووش بهێنێ ..

تەنها لە دینی خوادا مرۆڤ .. بگرە ژیان سەنگی هەیە ..

با ئادەمییەکانیش چاوێ بە دەور و بەریانا بگێڕن و بە سەلیقەی ئادەمیزادەوە دۆست و دوژمن بناسن . ئیتر با کەم خۆیان بکەنە قوربانیی لە پێناوی ستەمکاران و ملهوڕان و خوێنمژە زمانلووسەکاندا .. با پێشەوا و سەرداری راستەقینەی خۆیان بدۆزنەوە و بە سەری بەرزەوە بچنە ژێر بەیداخە شەکاوەکەیەوە و ، بە پێی توانای خۆیان ، ئەمانیش لە خزمەتی ئازادکردنی مرۆڤدا بەشداریی

بکەن .. تا شەرەف .. ڕێـز .. مـاف .. نـرخ .. ئـارامیی دڵ .. سـەری بـەرز .. ڕەوشت بەرزیی .. پاکیی و پاڵفتەیی دەروون .. هتد بۆ ئادەمیزاد بگێڕنەوە ..

بەڵێ ، لە سایەی دینی خوادا هەموو بەهایەکی بەرز دەست ئادەمیزاد ئەکەوێ و ، هەرکەی ئادەمیزادیش لە خواناسیی ترازا هەموو سووکیی و ڕیسوایی‌یەك لـە ژیانی‌دا سەرهەڵ ئەدەن ..

پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتەکانی خوێندنەوە .. خستیە بەرچاوی ئیمان‌دارانـیش و کافرانیش کە پەروەردگار لەسەر ئەو ڕووگرژکردن و ڕوو وەرچـەرخانەی لـە ئیبن ئوم مەکتووم گلەیی بۆ ناردووە .. گلەیی لە قورئان‌دا .. هاتە خـوارەوە .. خـوای گەورە موحاسەبەی موحەممەدی خۆشەویسـتی ئـەکات ، لەسـەر ئیمـان‌دارێکـی هەژار .. بە مەرجێ ئەو گلەیی‌یە تا قیامەت ئەمێنێ .. هەموو موسـڵمانێ ئـەو کۆمەڵە ئایەتە ئەخوێنێتەوە و ، لەوە ئاگادار ئەبێ کە هەموو مرۆڤێك لە سـایەی ئیسلام‌دا مافی مرۆڤانەی تەواوی دەست ئەکەوێت ..

دوای هاتنی ئەم ئایەتانە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزی زۆری لە ئیبن ئوم مەکتووم ئەگرت و هەرچیی چاوی پێ ئەکەوت پێی ئەفەرموو : (( أهلاً ومرحباً بِمَن عـاتَبَني فيه رَبِّي )) . ئەی‌فەرموو : مەرحەبا لەو کەسەی کە پەروەردگارم لەسەر ئەو عیتابی لێ گرتم . ئەشی‌فەرموو : (( هَل لَكَ مِـن حاجَـةٍ ؟ )) . ئەی‌فـەرموو : ئایـا هـیچ پێویستی‌یەکت نیە ؟ ئەوەبوو دوای کۆچ‌کردن بۆ مەدینە و ، بەرپابوونی دەوڵـەتی ساوای قورئان لە مەدینەدا ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بۆ جیهاد ئـەبرد و مەدینەی بەجێ ئەهێشت ، دوو جاریان کاروباری مەدینەی بە ئیبن ئـوم مـەکتووم سپارد . ئەڵێن : لە جەنگی قادسیەدا شەهید بـووە و ، هەنـدێکیش ئـەڵێن : لـە جەنگی قادسیە گەڕاوەتەوە و لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە ..[١٥٣]

ئەم دوو ڕووداوەی پێشەوە ، ڕووداوی دوورخسـتنەوەی هـەژارەکان و ، ڕووداوی ڕووگرژکردن لە ئیبن ئـوم مـەکتووم ، هەریەکـەیان بەڵگەیـەکی بـەهێزە کـە ئـەم قورئانە دانراوی پێغەمبەری خوا نیە ، بەڵکو فەرمایشتی خـوای پـەروەردگارە .. چونکە هیچ کەسێك بە دەستی خۆی ناتەواویی خۆی تۆمـار ناکـات ، جـا ئەگـەر قورئان لەلایەن خواوە نەبوایە لەسەر ئیبن ئوم مەکتووم ڕەخنە لە پێغەمبەری خـوا ﷺ نەئەگیرا . چونکە سروشتی مرۆڤ وەهایە کەم و کوڕی ناداتە پاڵ خۆی ، بگرە

[١٥٣] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٢٣ ـ ٣٢٦ .

هەموو هەوڵێك ئەدا تا هەر ناتەواوی‌یەك هەبێ بی‌شارێتەوە و پینەی بكات . خۆ ئەگەر موحەممەدی ئەمین و دەست پاكیش تاقە بڕگەیەكی لەم قورئانە بشاردایەتەوە ، ئەوا ئەم باسەی سوورەتی ( عبس ) ی ئەشاردەوە كە خوای پەروەردگار عیتابی بۆ ناردووە .. وەك یەكێ لە پێشینە پایەدارەكان باسی كردووە .[١٥٤]

**حەڤدەهەم : پرسیاری بت پەرستان**

قوڕەیش نەیان‌ئەزانی چ بەرەكەتێكی خوای گەورەیان بۆ هاتووە ، بۆیە بە شەو و بە ڕۆژ لە بیری لەناوبردنی پێغەمبەر و دینەكەی‌دا بوون .. كە چاریان نەما هاتنە سەر ئەوەی پیاو بنێرنە لای جوولەكەی مەدینە و پرسیاری ئەم دینە تازەیان لێ بكەن .

ئەوەبوو بۆ ئەم كارە دوو پیاویان هەڵ بژارد كە یەكجار داخ لە دڵ و دوژمن بە پێغەمبەری خوا بوون .. یەكەم نەضری كوڕی حاریث ی كوڕی كیلدەی كوڕی عەلقەمەی كوڕی عەبدمەنافی كوڕی قوصەی و ، دووهەمیش عوقبەی كوڕی ئەبوموعەیط.. مەككەیان بەجێ‌هێشت و بەرەو مەدینە كەوتنە ڕێ ، تا بچنە لای زاناكانی جوولەكە .. پێیان وتن : لە بارەی موحەممەدەوە پرسیاریان لێ بكەن و ، وەصفی بكەن بۆیان و ، هەواڵی وتەكانیشی بەوان بگەیەنن ، چونكە خاوەنی یەكەم كتێبن و ، لە زانستی پێغەمبەران‌دا شتانێ ئەزانن كە ئێمە نای‌زانین .

كە گەیشتنە مەدینە ، چوونە لای حیبرەكانی یەهوود و دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریان لێ كردن و ، وەصفی هەڵس و كەوت و كارو باری ئەویان بۆ كردن و وتیان : ئێوە ئەهلی تەوراتن ، هاتووین دەربارەی ئەم خزمەمان هەواڵمان بدەنێ ..

جوولەكەی نیازپیسیش ئەمەیان بە هەل زانی .. وتیان : باشە ، سێ شتتان پێ ئەڵێین ، ئێوە دەربارەی ئەوانە پرسیاری لێ بكەن .. جا ئەگەر هەواڵی دانێ ، ئەوە ڕاست ئەكات ، پێغەمبەرە و ڕەوانە كراوە .. خۆ ئەگەر واشی نەكرد ئەوا لە خۆیەوە قسە ئەكات و ئێوەش ڕای خۆتان دەربارەی ئەو یەك لا بكەنەوە ..

دەربارەی چەند گەنجێك كە لەسەر دەمەكانی پێشوودا ژیاون پرسیاری لێ بكەن كە دەنگ و باسیان چۆن بووە ؟ ئەوانە دەنگ و باسێكی سەیریان بووە . هەروەها

---

[١٥٤] تفسير إبن جرير : سورة عبس .

دەربارەی پیاوێك کە خۆرهەڵات و خۆرئاوای زەویی گەڕاوە پرسیاری لێ بکەن کە هەواڵی چۆن بووە ؟ هەروەها دەربارەی ڕۆح پرسیاری لیێ بکەن کە ڕۆح چی‌یە ؟

هەردوو نێرراوەکەی قوڕەیش ، نەضر و عوقبە مەدینەیان بەجێ هێشت و بەرەو مەککە گەڕانەوە و ، وتیان : ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! جیاکەرەوەی نێوان ئێوە و موحەممەدمان بۆتان هێناوە .. حیبرە جوولەکەکان فەرمانیان بە سەرمان دا داوە کە دەربارەی چەند شتێك پرسیاری لێ بکەین . ئەوەبوو پرسیارەکانیان بە قوڕەیش وت ..

هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، وتیان : ئەی موحەممەد! هەواڵی ئەم پرسیارانەمان بدەرێ . ئەوەبوو پرسیارەکانی جوولەکەیان لێ پرسیی . ئەویش پێی فەرموون : (( أُخبِرُكُم غداً بِما سَأَلتُم عَنهُ )) . فەرمووی : سبەینێ هەواڵتان ئەدەمێ . ئیتر نەی‌فەرموو : (( إن شاء الله )) . قوڕەیشی‌یەکان هەستان و ڕۆیشتن و ، پێغەمبەری خوا ﷺ پانزە شەو چاوەڕوانیی کرد ، کەچیی خوای گەورە وەحی بۆ نەئەنارد و ، جیبریلیش نەئەهاتە لای ، تا ئەوەبوو دانیشتوانی مەککە کەوتنە گومان و دەستیان کرد بە سرکە سرك و وتیان : موحەممەد بەڵێنی سبەینێی پێمان دا ، کەچیی ئەوە پانزە شەومان بەسەردا تێپەڕیی و وەڵامی هیچ پرسیارێکمانی نەدایەوە .. نەهاتنی وەحی پێغەمبەری خوای ﷺ خەم‌بار و ماتەمین کرد و ، دەم بەرەڵابوونی دانیشتوانی مەککەشی یەکجار بەلاوە گران بوو .

دوای ئەو ماوەیە جیبریل سەلامی لێ بێ لەلایەن خوای گەورەوە سوورەتی ( أصحاب الكهف ) ی بۆ ئازیز هێنا .. پێغەمبەری خوا ﷺ بە جیبریلی فەرموو : (( لقد احتبست عني يا جبريل حتى سؤت ظناً )) فەرمووی : ئەی جیبریل ! ئەوەندە دیار نەبوویت هەتا ترسام کە نەیەیتەوە . جیبریل فەرمووی : ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴾( مريم : ١٩ ).

خوای گەورە سوورەتەکەی بە سوپاس و ستایشی خۆی و ، پێغەمبەرایەتیی ئازیزەکەی ﷺ دەست پێ کردووە و ، باسی قورئانی تێدا کردووە کە ئەو ڕاستە شەقامەیە پێچ و پەنا و ، کەم و کوڕیی و ، نا تەواویی تێدا نیە .

خوای گەورە ئەم قورئانە پیرۆزەی بۆ ئاگادارکردنەوەی کافران و یاخی‌یان ڕەوانە کردووە و ، مژدەش بە ئیمان‌دارە چاکەکارەکان ئەدات ..

لە ئایەتی شەشەمدا ، خوای گەورە بەزەیی بە ئازیزدا دێتەوە کە ئەوەندە خەم و خەفەتی ئیماننەهێنانی قەومەکەی لەسەر دڵی کۆبۆتەوە ، کە خەریکە خەفەت بی‌کوژێ .. بۆ ئەمە دڵی ئەداتەوە کە با ئەوەندەش خەفەت نەخوا :

﴿ فَلَعَلَّكَ بَـٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُواْ بِهَـٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴾ ( الکهف : ٦ ).

دوای ئەوە لە ئایەتی ( ٩ ـ ٢٧ ) ی سوورەتەکەدا وەڵامی پرسیاری یەکەمیان ئەداتەوە کە بریتی‌یە لە چیرۆك و بەسەرهاتی ( أصحاب الکهف ) و ، لە دوو توێی چیرۆکەکەش‌دا ئەوەی وەبیر دێنێتەوە کە با بە هیچ کارێك نەڵێت سبەینێ ئەنجامی ئەدەم هەتا کارەکە بە وتنی (( إن شاء الله )) بە دەستی خوا بسپێرێت ، کە ئەفەرموێ :

﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ۝٢٣ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَـٰذَا رَشَدًا ﴾ ( الکهف : ٢٣ ـ ٢٤ ) .

پاشان هەر لە هەمان سوورەت‌دا و لە ئایەتی ( ٨٣ ـ ٩٨ ) باسی پیاوە گەشتیارەکەی کرد کە خۆرهەڵات و خۆرئاوای سەرزەویی گەڕابوو .

هەروەها دەربارەی ئەو پرسیارەیان کە ئایا رۆح چی‌یە ، لە سوورەتی ( الإسراء ) دا ، ئایەتی ( ٨٥ ) وەڵامی دانەوە :

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ ( الإسراء : ٨٥ ) .

قورئان فەرمان ئەدا کە رۆح بەدیی‌هێنراوێکی عەجیبی خوای پەروەردگارە کە جگە لە خۆی هیچ کەس حەقیقەتی نازانێ و ، ئادەمی‌یەکانیش بە چ پلەیەکی زانست گەیشتبن ، ئەوا لە چاو زانستی خوای مەزن‌دا یەکجار کەمە ..

ئەمە بە پێی ریوایەتی ئیبن ئیسحاق و ئیمام ئەحمەد و تیرمیذی‌یە و ، ئایەتەکە ئەبێتە مەککیی . بەڵام بە ریوایەتی ئیمام بوخاریی لە ئیبن مەسعوودەوە ، بە ئایەتێکی مەدەنیی لە قەڵەم ئەدرێ .

جارێکیان ئیبن مەسعوود لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ئەبێ و بەلای کۆمەڵێ جوولەکەدا تێپەڕ ئەکەن .. جوولەکەکان هەندێکیان بە هەندێکیان ئەڵێن : دەربارەی رۆح پرسیاری لێ بکەن . پێغەمبەر ﷺ بێ‌دەنگ ئەبێ و وەڵامیان ناداتەوە .. پاشان سەعاتێك ئەوەستێ . ئیبن مەسعوود ئەڵێ : وام زانی

کە وەحیی بۆ دێت . کاتێك لە سەری لاچوو ، فەرمووی : ﴿ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلاً ﴾ . بۆ ئەمە هەندێ لە زانایان تەرجیحیان بەم ریوایەتەی بوخاریی داوە و ، ئایەتەکەیان بە مەدەنیی ژماردووە و وتوویانە کە هەندێ سوورەتی مەککیی ئایەتی مەدەنی‌یان تێدایە و هەندێ مەدەنییش ئایەتی مەککی‌یان تێدایە .

هەندێ لە زانایانیش ، وەك ئیبن کەثیر بۆ ئەو رایە ئەچن کە ئەم ئایەتە لە مەککەدا بە بۆنەی پرسیاری موشریکانەوە دابەزیی بێ و ، لە مەدینەش‌دا بە بۆنەی پرسیاری جوولەکەوە دابەزیی بێتەوە ..[155]

قورەیش بەمەش کۆڵیان نەدا و موسڵمانیش نەبوون ، بەڵکو رێی جۆراو جۆریان ئەگرتە بەر تا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبەرداریان ببێ ..

رێیەکی تریان ئەوەبوو کەوتنە هەوڵی ئەوەی ئیسلام و نەفامیی نیوانیو بە یەك بگەیەنن و رێك بکەون . بتپەرستەکان لە هەندێ دروشمی دینەکەیان دابەزن و پێغەمبەریش ﷺ لە هەندێ دروشمی دینەکەی دابەزێ هەتا بە یەك بگەن . قورئانیش باسی ئەم بۆچوونە هەڵەیانی کرد و فەرمووی :

﴿ وَدُّواْ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴾ ( القلم : ٩ ) .

لە ریوایەتی ئیبن جەریر و طەبەرانیی‌دا هاتووە کە بتپەرستەکان ئەو پێشنیارەشیان خستۆتە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەم بۆ ماوەی ساڵێك خواکانی ئەوان بپەرستێت و ، ئەوانیش بۆ ماوەی ساڵێك خواکەی ئەم بپەرستن . لە ریوایەتێکی تریش‌دا هاتووە کە وتوویانە : ئەگەر خواکانی ئێمە وەربگریت ئێمەش خواکەی تۆ ئەپەرستین ..[156]

ئیبن ئیسحاق‌یش ریوایەتی کردووە و وتوویە : لە کاتێك‌دا کە پێغەمبەری خوا ﷺ طەوافی کەعبەی ئەکرد ، ئەسوەدی کوڕی موطەللیبی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا و ، وەلیدی کوڕی موغیرە و ، ئومەییەی کوڕی خەلەف و ، عاصی کوڕی وائیلی سەهمیی ـ کە ئەمانە ناودار و ماقووڵی قەومەکەیان بوون ـ هاتنە رێی و وتیان : ئەی موحەممەد ! خێرا کە با ئێمە ئەو خوایە بپەرستین کە تۆ

[155] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٣٢٦ ـ ٣٢٩ .
[156] الرحيق المختوم : ٨٤ .

ئەیپەرستی و ، تۆش ئەوانە بپەرستە کە ئێمە ئەیانپەرستین ، بەمە هەردوو لامان لە کارەکەدا هاوبەش ئەبین . جا ئەگەر ئەو خوایەی کە تۆ ئەیپەرستیی لەو خوایانەی کە ئێمە ئەیانپەرستین چاکتر بوو ، ئەوا ئێمەش بەشی خۆمانمان لێی دەست کەوتووە و ، گەر ئەوانەی کە ئێمە ئەیانپەرستین لەوەی تۆ چاکتر بوون ، ئەوا تۆش بەشی خۆتت لێیان دەست کەوتووە .. ئەوەبوو خوای گەورە سووورەتی ( الكافرون ) ی ناردە خوارەوە :

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴾ .[١٥٧]

ڕۆژێکی تر پێغەمبەری خوا ﷺ لە کەعبەدا لەگەڵ وەلیدی کوڕی موغیرە دانیشتبوون ، نەضری کوڕی حاریث هات و ئەویش لەلایان دانیشت و چەند پیاوێکی تری قورەیشیش لەوێ دانیشتبوون . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتی کرد و ، نەضریش ویستی وەڵامی بداتەوە ، کەچیی پێغەمبەری خوا نەضری بەزاند و قسەی بڕیی ، پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزانەی بەسەریاندا خوێندنەوە :

﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ۝٩٨ لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ ۝٩٩ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴾ ( الأنبياء : ٩٨ ـ ١٠٠ ) .

ئایەتەکە ئەوە دەر ئەخات کە ئەو بتپەرستانە خۆیان و ئەو شتانەش کە ئەیان پەرستن بە جارێکدا ئەخرێنە دۆزەخ .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و، عەبدوڵڵای کوڕی زوعبەرای سەهمیی هات و دانیشت . وەلیدی کوڕی موغیرە بە کوڕی زوعبەرای وت : بەخوا نەضری کوڕی حاریث بەرامبەر بە کوڕەکەی عەبدولموطەللیب هیچی پێ نەکرا . موحەممەد وای ئەگەیەنێ کە ئێمە و ئەو خوایانەشمان کە ئەیانپەرستین ئەبینە سووتەمەنیی دۆزەخ ..

عەبدوڵڵای کوڕی زوعبەرا وتی : بەخوا من فریای بکەوتمایە ئەم بەزاند .. ئادەی پرسیار لە موحەممەد بکەن : ئایا هەموو ئەوانەی کە لە غەیری خوا پەرستراون لەگەڵ ئەوانەدا کە پەرستوویانن ئەچنە دۆزەخەوە ؟ دەی ئێمە

---

[١٥٧] إبن هشام : ١ / ٣٦٢ .

مەلائیکەت ئەپەرستین و ، یەهوودیش عوزەیر ئەپەرستن و ، نەصاراش عیسای کوڕی مەریەم ئەپەرستن .. وەلید و ئەوانەش کە لەگەڵیا بوون لە کۆڕەکەدا سەریان لە وتەکەی کوڕی زوعبەرا سوڕ ئەما !

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إنَّ كُلَّ مَن أَحَبَّ أن يُعبَدَ مِن دُونِ اللهِ فَهُوَ مَعَ مَن عَبَدَهُ ، إنَّهُم إنَّما يَعبُدونَ الشَّياطِينَ ، وَمَن أَمَرَتْهُم بِعِبادَتِه )) .

فەرمووی : هەرکام لەو پەرستراوانەی کە ئەو پەرستنەیان پێ خۆش بێ لەگەڵ ئەوانەدان کە پەرستوویانن .. واتە هەر خواناسانێك کە پێی خۆش نەبێ بکرێتە خوا ناکەوێتە بەر ئەو هەڕەشەیە .

ئەوەبوو خوای گەورە بۆ تەصدیقی ئازیزەکەی ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارەوە :

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُوْلَـٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِي مَا ٱشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَـٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ هَـٰذَا يَوْمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ ( الأنبياء : ١٠١ ـ ١٠٣ ) .

مەبەستی لە عیسای کوڕی مەریەم و ، عوزەیر و ، هەر خواناسێك کە بە پاکیی خزمەتی دینی کرد بێ و خەڵکانێك بە بێ ڕەزامەندیی ئەو پەرستشیان بۆ ئەنجام دابێ ، ئەوانە لە ئاگری دۆزەخ بەدوورن و ، هەرچییان پێخۆش بێ بە هەتا هەتایی پێشکەشیان ئەکرێ و ، ترس و بیمی قیامەت خەمباریان ناکات .

هەروەها دەربارەی حەزرەتی عیسا سەلامی لێ بێ ، کە کوڕی زوعبەرا باسی کرد و ، وەلید و ئامادەبووان لەو بەڵگە و بەرابەرکێیەی سەریان سووڕما ، قورئان هاتە خوارەوە :

﴿ ۞ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ ۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴾ ( الزخرف : ٥٧ ـ ٥٨ ) .

پاشان باسی حەزرەتی عیسا ئەکات :

﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَـٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَـٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ ۚ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾ ( الزخرف : ٥٩ ـ ٦١ ) .

**هەژدەهەم : گاڵتەو سووکایەتیی**

یەکێ لەوانەی کە دژایەتیی پێغەمبەری خوای ﷺ ئەکرد ئەخنەسی کوڕی شەریقی ثەقەفیی بوو ، کە هاوپەیمانی نەوەی زوهرە بوو و ، گوێ لە قسەی ئەگیرا. جا لەسەر ئەو دژایەتی‌یەی قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و نۆ سیفەتی سووك و ناشیرینی ئەوی هەڵ دا :

﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ۝ هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٍ ۝ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ۝ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴾ ( القلم : ١٠ ـ ١٣ ) .

ئەفەرموێ : ئەی موحەممەدی خۆشەویستمان ! گوێڕایەڵیی بۆ ئەو مرۆڤە سووکە مەکە کە یەکەم : بەحەق و ناحەق سوێندی زۆر ئەخوات و ، دووهەم : سووك و بێ نرخ و ، سێهەم : عەیبی زۆر لە خەڵك ئەنێ و ، چوارەم : قسەی زۆر لە نێوان خەڵکدا دێنێ و ئەبا و بەینی خەڵك تێك ئەدا و ، پێنجەم : چرووك و ماڵ و سامان بەلاوە خۆشەویست و ، شەشەم : دەستدرێژیی‌کەر و ، حەوتەم : ئەنجامدەری گوناهـ و تاوانی زۆر و ، هەشتەم : وشك و زبر و، نۆهەم : خۆهەڵواس بە کۆمەڵێك کە لەوان نەبێت ..[١٥٨]

وتراویشە ئەم کۆمەڵە ئایەتانەی پێشەوە دەربارەی وەلیدی کوڕی موغیرە ، یان ئەبوجەهل ، یان ئەسوەدی کوڕی عەبدیەغوث هاتوونەتە خوارەوە ..

وەلیدی کوڕی موغیرەش دوژمنێکی داخ لە دڵ و سەرسەختی ئیسلام بوو .. ئەوەبوو ئەیوت : ئایا وەحی بۆ موحەممەد دێت و ، من کە گەورە و سەرداری قورەیشم و ، ئەبومەسعوود عەمری کوڕی عومەیری ثەقەفیی سەرداری ثەقیف ، کە هەردووکمان جووتە گەورەی ئەم دوو شارە : مەککە و طائیف‌ین ، وەحیمان بۆ نایەت ؟ ئەوەبوو خوای گەورە وەڵامی ئەم نەزانگۆیی‌یەی وەلیدی نارده خوارەوە :

﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ۝ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ۝ ﴾ ( الزخرف : ٣١ ـ ٣٢ ) .

---

[١٥٨] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٣٣ ـ ٣٣٢ ، والرحيق المختوم : ٨٨ .

ئەبوجەهلیش جارێکیان تووشی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو پێی وت : بەخوا ، ئەی موحەممەد ! یان ئەوەتا واز لە قسەوتن بە خواکانمان دێنی ، یان ئەوەتا ئێمەش قسە بەو خوایە ئەڵێین کە ئەیپەرستی . ئەوەبوو خوای گەورە فەرمانی نارد تا ئیمانداران قسە بە بتی موشریکان نەڵێن تا ئەوانیش بە نەزانیی و دڵ پیسیی قسە بە خوای پەروەردگار نەڵێنەوە ، کە ئەیفەرموو :

﴿ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ ( الأنعام : ١٠٨ ) .

بەم بۆنەوە پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لە قسەوتن بە بتەکانیان هێنا و ، تەنها بانگی بۆ پەرستنی خوا ئەکردن .

یەکێکی تر لەوانەی کە بە سووکیی سەیری پێغەمبەری خوای ﷺ ئەکرد عاصی کوڕی وائیلی سەهمیی بوو .

ئەوەبوو خەبابی کوڕی ئەرەتتی هاوەڵی پایەبەرز لە مەککەدا ئاسنگەر بوو و شمشێری دروست ئەکرد و ، چەند شمشێرێکی بۆ عاصی کوڕی وائیل دروست کردبوو و پێی فرۆشتبوو و ، هێشتا پارەکەی وەرنەگرتبوو .. خەبباب چوو بۆ لای تا پارەکەی پێ بدات ، کەچیی پێی ئەوت : خەبباب ! موحەممەدی هاوەڵتان ، کە تۆ وای لەسەر دینەکەی نالێت : ئەهلی بەهەشت چەندیان زێڕ و زیو و جل و بەرگ و خزمەتگوزار بوێت پێشکەشیان ئەکرێت ؟ خەبباب وتی : بەڵێ . وتی : ئەی خەبباب ! دەی تا ڕۆژی قیامەت لەسەرم بووەستە هەتا بگەمە ئەو شوێنە و پارەکەت لەوێ ئەدەمەوە . دە بەخوا ، خەبباب ! تۆ و گەورەکەت لای خوا لە من لە پێشتر نین و ، زیاتر خاوەن ماف نین . جا بۆ پەرچ دانەوەی ئەو نەفامە قورئان هاتە خوارەوە :

﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴾ ( مريم : ٧٧ ـ ٨٠ ) .

یەکێکی تر لە سەرزلەکانی قورەیش ئوبەی کوڕی خەلەف بوو ، کە ئێسقانێکی رزیوی بە دەستەوە گرتبوو و ، بەرەو رووی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت و ئەیوت : ئەی موحەممەد ! تۆ ئەڵێیت کە خوا ئەم ئیسقانە دوای ورد و

خاش بوونی زیندوو ئەکاتەوە ؟ پاشان ئێسقانەکەی بە دەستی ورد و خاش کرد و بەرەو رووی پێغەمبەری خوا ﷺ فووی پیا کرد . ئەویش فەرمووی : (( نعم أنا أقولُ ذلك ، يبعثه الله وإياك بعد ما تكونان هكذا ، ثم يُدخلك الله النار )) .. فەرمووی : بەڵێ من وا ئەڵێم .. خوای گەورە ئەو ئێسقانە و تۆش ، دوای رزینتان بەم شێوەیە ، زیندوو ئەکاتەوە و ، پاشان تۆ ئەخاتە ناو ئاگرەوە .. ئەوە بوو خوای گەورەش ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارەوە :

﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَـٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَـٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّـٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ ( يس : ٧٨ ـ ٨٣ ) .

لەگەڵ ئەم هەموو دژایەتی‌یەدا قورەیش بەینا و بەین داوای رێککەوتنیان ئەکردەوە ..

رۆژێکی تر پێغەمبەری خوا ﷺ طەوافی کەعبەی پیرۆزی ئەکرد ، چەند قورەیشی‌یەك ، کە بریتیی بوون لە ئەسوەدی کوڕی موطەللیب و ، وەلیدی کوڕی موغیرە و ، ئومەییەی کوڕی خەلەف و ، عاصی کوڕی وائیل ، هاتنە رێی و وتیان :

ئەی موحەممەد ! وەرە با ئێمە ئەوەی تۆ ئەی‌پەرستی ئێمەش بی پەرستین و ، ئەوەش کە ئێمە ئەی‌پەرستین تۆش بی‌پەرستە . بەمە ئێمەش و تۆش لە کارەکەدا هاوبەش ئەبین . ئەو کاتە ئەگەر ئەوەی کە تۆ ئەی‌پەرستی لەوەی کە ئێمە ئەی‌پەرستین چاکتر بوو ، ئەوا ئێمە بەشی خۆمان دەست کەوتووە لێی و ، گەر ئەوەش کە ئێمە ئەی‌پەرستین لەوەی کە تۆ ئەی‌پەرستی چاکتر بوو ، ئەوا تۆش بەشی خۆتت دەست کەوتووە لێی . وەنەبێ پێغەمبەری ئازیز ﷺ بەم فێڵە بخەڵەتێ ، خێرا دایە دواوە و پشتی لێ هەڵ کرد و ، ئەوەبوو خوای گەورەش سوورەتی ( الكافرون ) ی نارد تا کاری پیرۆزی تێکەڵ بە بتپەرستان نەکات :

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمۡ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ۝٤ وَلَآ أَنتُمۡ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ۝٥ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ۝٦ ﴾ ( الكافرون : ١ ـ ٦ ) .[١٥٩]

**نۆزدەهەم : سزاو ئازاردان**

**بتپەرستەکانی مەککە دوای ئەوەی هەوڵێکی زۆریان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دا تا بەڵکو بە نەرم و نیانی رازیی بکەن و وازیان لێ بهێنێ ، کەچیی کەڵکی نەبوو و ، بۆیان فریو نەدرا ، گەڕانەوە سەر بەزمی یەکەمجاریان .. کەوتنە دژایەتیی و سووکایەتیی بە پێغەمبەر و هاوەڵان ..**

**لە پێشەوە باسمان کرد کە یەکێ لە شەیتانەکانی قورەیش کە دژایەتیی ئازیزیان ئەکرد نەضری کوڕی حاریث بوو . ئەوەبوو هەرچیی پێغەمبەری خوا ﷺ چیرۆکی پێغەمبەران و ئوممەتە پێشینەکانی ئەگێڕایەوە ، ئەویش چیرۆکی درۆ و دەلەسەی مێژووی ئەگێڕایەوە ، کە لە ولاتی فارس دەربارەی پادشاکانی فارس و رۆستەم و ئەسفەندیار بیستبوونی . هەرچیی پێغەمبەر ﷺ دائەنیشت و قورئانی بۆ خەڵکەکە ئەخوێند ، ئەویش بەدوایدا دائەنیشت و ئەو چیرۆکانەی ئەگێڕانەوە و ئەشیوت : باسەکانی موحەممەد لە باسەکانی من چاکتر نین ، بەخوا ، ئەی کۆمەڵی قورەیش ! باسەکانی من چاکترن و ، چیرۆکەکانی ئەو دەستهەڵبەستراوی پێشینەکانن و لەبەری کردوون . لە پەرچی ئەو نەفامەشدا قورئانی پیرۆز هات و ئەیفەرموو :**

﴿ وَقَالُوٓاْ أَسَـٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ۝٥ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ۝٦ ﴾ ( الفرقان : ٥ ـ ٦ ).

**هەروەها ئەیفەرموو :**

﴿ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَـٰتُنَا قَالَ أَسَـٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ ( القلم : ١٥ ) .

**لەولاوە ئومەییەی کوڕی خەلەفیش هەرچیی چاوی بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکەوت عەیبە و ناتەواویی بۆ دروست ئەکرد و بە دەست و بە زمان ئازاری ئەدا ، بۆیە سوورەتی ( همزة ) هاتە خوارەوە تا هەڕەشە لەو بێدینە رەزیلە پووڵ خۆشەویستە بکات و ، ئاگاداریشی بکا کە جێی ئەو دۆزەخە :**

---

[١٥٩] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٣٣٢ ـ ٣٣٥ ، والرحيق المختوم : ٨٨ .

﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ۝١ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُۥ ۝٢ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ۝٣ كَلَّا ۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِى ٱلْحُطَمَةِ ۝٤ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ۝٥ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ۝٦ ٱلَّتِى تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ۝٧ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ۝٨ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍۭ ۝٩ ﴾ ( الهمزة : ١ ـ ٩ ) .

ئوبەی کوڕی خەلەفیش دۆستی عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیط بوو و بەینیان زۆر خۆش بوو . جارێکیان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبوو و گوێی لێ گرتبوو . کە ئەم دەنگ و باسە گەیشتەوە لای ئوبەی هات بۆ لای عوقبە و پێی وت : بۆچ پێم نەگەیشتووە تۆ چووی لای موحەممەددا دانیشتووی و گوێت لێی گرتووە ؟! سوێندی زۆری خوارد کە قسەی لەگەڵدا نەکا هەتا لەسەر ئەو دانیشتن و گوێگرتنەی تف لە دەم و چاوی پێغەمبەر نەکات . ئەو عوقبە بەدبەختە بۆ ئەوەی دڵی ئوبەی لێ زیز نەبێ چوو ئەو نامەردییەی کرد ، ئەوەبوو قورئانی پیرۆز دەربارەی هەردووکیان دابەزیی کە باسی سەرگەردانیی و پەشیمانیی قیامەتیان ئەکات :

﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلاً ۝٢٧ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلاً ۝٢٨ لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولاً ۝٢٩ ﴾ ( الفرقان : ٢٧ – ٢٩ ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ ساڵ لەدوای ساڵ خەریکی بانگەواز بوو و ، قورەیشیش ئازاری زۆریان ئەدا .. ویستی خوا ڕەها بوو کوڕەکانی هەر بە منداڵیی کۆچی دوایییان ئەکرد و ، هەندێ لە بتپەرستانیش دەستیان بەسەر دڵیاندا ئەهێنا و پێیان خۆش بوو کە گوایا موحەممەد ئەمرێ و کوڕی لە دوا بەجێ نامێنێ و باسەکەی ئەبڕێتەوە ، یەکێ لەوانە عاصی کوڕی وائیل بوو ، کە هەرچیی ناوی پێغەمبەری خوا ﷺ ببرایە ، ئەیوت : وازی لێ بێنن ، وەجاخکوێر و دوابڕاوە ، هەر کە مرد باسی ئەبڕێتەوە .. ئەوەبوو سوورەتی ( الكوثر ) هاتە خوارەوە تا دڵی ئازیز بداتەوە کە خوای گەورە ناز و نیعمەتی زۆری پێ بەخشیوە و ناحەز و دوژمنانی وەجاخکوێر و دوابڕاون ، ئەویش بە تیاچوونی خۆیان و دینەکەیان و، بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی ئیسلام و سەرکەوتنی شوێنکەوتوانی و ، بەردەوامیی ئیسلام تا ئاخرزەمان .

جارێكی تریش وەلیدی كوڕی موغیرە و ، ئومەییەی كوڕی خەلەف و ، ئەبوجەهلی كوڕی هیشام بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕیان كرد و دەستیان كرد بە گاڵتەكردن و دڵشكاندنی ، ئەویش زۆری پێ ناخۆش بوو ، ئەوەبوو خوای گەورە بۆ دڵ خۆشیدانەوەی ئەم و ، هەڕەشە و ترساندنی ئەو ستەمكارانە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە :

﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ ( الأنعام : ١٠ ) .

لەگەڵ هەموو ئەمانەش‌دا پێغەمبەر ﷺ لەسەر كاری پیرۆزی خۆی بەردەوام بوو .. بە زمانی شیرین و بە حیكمەت و ژیریی و سەلیقەوە مەردمەكانی بانگ ئەكردن و ، تا كافران دژایەتی‌یان ئەكرد ، ئەم زیاتر لەسەر كاری پیرۆزی سوور و دامەزراو بوو ..[١٦٠]

ئەمانە هەموویان خزم و كەسی پێغەمبەری خوا بوون .. چاكیان ئەناسی .. خۆی و باوباپیرانی .. كەچی شیاوی ئیمان نەبوون .. كەوتنە دژایەتیی ، لەولاوە خوای گەورە خەڵكی تری ئەنارد و لە پەنای كەعبەی پیرۆزدا ئیمانی بە پەیامەكەی ئازیز ئەهێنا ..

یەكێ لەو خواپێداوانە ناوی ضیماد بوو .. جا با سەرنجی چیرۆكی موسڵمان بوونەكەی بدەین :

موسلیم و بەیهەقیی لە ئیبن عەبباس‌ەوە خوا لێیان رازیی بێ تەخریجیان كردووە كە وتوویە : ضیماد[١٦١] ـ كە پیاوێكی هۆزی ئەزد شەنوئە بوو[١٦٢] ـ هاتە مەككە و ، نووشتەی بۆ كەسانێك ئەكرد كە بە هۆی جنۆكەوە تێك چووبن . ئەوەبوو بەرگوێی كەوت كە سەفیهەكانی مەككە ئەیانوت : موحەممەد شێت بووە . ئەویش پرسیی : كوا ئەو پیاوە بەڵكو خوای گەورە بە دەستی من شیفای بۆ بنێرێ .

---

[١٦٠] السيرة البنوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٣٥ ـ ٣٣٩ .

[١٦١] ضیماد : لە سەردەمی نەفامیی‌دا دۆستی پێغەمبەری خوا بووە ﷺ و ، دەستی دوكتۆرییشی هەبووە ، بە تایبەتیی بۆ كەسێك كە جینییی دەستیان لێ وەشاندبێ .

[١٦٢] ئەزد شەنوئە : هۆزێكی ولاتی یەمەن بووە .

ئەڵێ : تووشی موحەممەد بووم و وتم : من نووشتە بۆ دەستوەشاندنی جنۆکە ئەکەم و ، هەرکەسیش خوا ویستی لەسەر بێ بە دەستی من شیفای ئەدات ، تۆش فەرموو ( با نووشتەت بۆ بکەم ) .

موحەممەد فەرمووی : (( إنَّ الحَمدَ للهِ نَحمُده ونَستَعينُه ، مَن يَهده اللهُ فَلا مُضلَّ لهُ، ومَن يُضلل فَلا هَادِيَ لَه ، أَشهدُ أَن لا إِلَه إلا اللهُ وحدَهُ لا شَرِيكَ لَه )) . سێجار دووبارەی کردەوە . وتی : بەخوا من وتەی کاهین و ، سیحرباز و ، شاعیرانم بیستوون ، بەڵام وەك ئەم وتانەم نەبیستوون .. دەستت بێنە با بۆ موسڵمانبوون بەیعەتت پێ بدەم . ئەوەبوو پێغەمبەری خواش ﷺ بەیعەتی لێ وەرگرت و پێی فەرموو: (( وعلى قومِكَ )) . وتی: بۆ قەومەکەشم . ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ ( دوای هیجرەت ) سوپایەکی رەوانە کرد و بەلای قەومەکەی ضیماددا تێپەڕیان کرد . ئەمیری سوپاکە بە سریەکەی وت : ئایا لەم خەڵکە هیچتان دەست کەوتووە ؟ پیاوێکیان وتی : من مەسینەیەکم دەست کەوتووە . وتی : بۆیان بگێڕەرەوە ، ئەمانە قەومەکەی ضیمادن .

لە ریوایەتێك دا هاتووە : ضیماد بە پێغەمبەری ﷺ وت : ئەو فەرمایشتانەتم بۆ دووبارە بکەرەوە ، بە راستیی ئەوانە گەیشتوونەتە بەرزترین پلەی بەلاغەت . (كذا في البداية : ٣ / ٣٦ ) .

هەروەها نەسسائیی و بەغەویی و موسەددەد لە موسنەدەکەیدا ـ وەك لە ( إصابة : ٢ /٢١٠ ) دا هاتووە ـ تەخریجیان کردووە و ، ئەبونوعەیمیش لە ( دلائل النبوة ص ٧ ) دا لە رێی واقیدییەوە تەخریجی کردووە ، کە وتوویە : موحەممەدی کوڕی سولەیط ، لە باوکیەوە ، لە عەبدورڕەحمانی عەدەوییەوە بۆی باس کردووم کە وتوویە : ضیماد وتوویە : بۆ بەجێهێنانی عومرە هاتم بۆ مەککە و، لە کۆڕێکدا کە ئەبوجەهل و عوتبەی کوڕی رەبیعە و ، ئومەییەی کوڕی خەلەفی لێ بوون دانیشتم . ئەبوجەهل وتی : ئەم کابرایە کۆمەڵمانی پەرتەوازە کردووە و ، پیاوە ژیرەکانمانی بە سەفیهـ دەرکردوون و ، هەرچیمان لێ مردوون بە گومڕای دەرکردوون و ، خواکانمانی عەیبدار کردوون . ئومەییە وتی : بێگومان ئەو کابرایە شێتە . ضیماد ئەڵێ : قسەکەی دڵمی گرت و وتم : من پیاوێکم چارەسەریی نەخۆشیی جنۆکە ئەکەم .. لەو کۆڕە هەستام و بەدوای پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەگەڕام . ئەوەبوو ئەو رۆژە نەمدۆزییەوە .. بۆ سبەینێ بەدوایدا گەڕام

و ئەبینم وا لە پشتی ( مقام )ەوە دانیشتووە و نوێژ ئەکات .. دانیشتم هەتا لێ بوویەوە ، پاشان هاتمە لای و دانیشتم و ، وتم : ئەی کوڕی عەبدولموطەللیب ! خێرا رووی تێ کردم و فەرمووی : ( ما تشاء ؟ ) . فەرمووی : چیت ئەوێ ؟ وتم : من نەخۆشیی جنۆکە چارەسەر ئەکەم ، جا ئەگەر پێت خۆش بێ چارەسەریی تۆیش ئەکەم و ، بە نەخۆشی‌یەکی وەها گرانیشی مەزانە ، چونکە هی وەهام چارەسەر کردووە کە نەخۆشی‌یەکەی لە هی تۆ گرانتر بووە و چاکیش بۆتەوە .. لە خزمەکانیشت هەندێ سیفەتی خراپی تۆم بیست وەك بە سەفیهـ دەرکردنی ژیرەکانیان و ، پەرتەوازەکردنی کۆمەڵیان و ، بە گومڕا دەرکردنی مردوانیان و ، عەیب دارکردنی خواکانیان .

وتم : ئەمەش کاری کەسێکە کە شێت بێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( الحمدُ للهِ أحْمَدُه وأستعينُهُ وأُؤمنُ به وأتوكَّلُ عليه ، من يهده اللهُ فلا مضلَّ له ومَن يُضللْهُ فلا هَادي له ، وأشهدُ أن لا إلـه إلا اللهُ وحدَهُ لا شريكَ لهُ ، وأشهدُ أنَّ محمداً عبدُه ورسولهُ )) .

ضیماد ئەڵێت : فەرمایشتێکم بیست کە هەرگیز هیچ فەرمایشتێکی لەوە چاکترم نەبیستبوو ، بۆیە داوام لێ کرد تا بۆم دووبارە بکاتەوە ، ئەویش بۆمی دووبارە کردەوە . وتم : تۆ بۆچیی بانگ ئەکەیت ؟

فەرمووی : (( إلى أنْ تُؤمِنَ باللهِ وحدَهُ لا شريكَ له وتخلَعَ الأوثانَ مِن رَقَبَتِكَ ، وَتَشهَدَ أَنِي رَسُولُ اللهِ )) . فەرمووی : بانگت ئەکەم تا ئیمان بە خوای تاك و تەنیا و بێ‌شەریك بهێنی و ، گەردنت لە پەرستنی بتەکان ئازاد بکەیت و ، شاهێدیش بدەی کە من پێغەمبەری خوام .

وتم : جا ئەگەر من ئەو کارەم کرد چیم بۆ ئەبێ ؟

فەرمووی : (( لَكَ الجَنَّةَ )) . فەرمووی : پاداشتت بەهەشت ئەبێ . وتم : دەی من شاهێدیی ئەدەم کە جگە لە زاتی ( الله ) هیچ پەرستراوێکی تر نیە و تاك و تەنیا و بێ‌شەریکە و ، گەردنم لە پەرستنی بتەکان ئازاد ئەکەم و خۆم لێیان دائەماڵم و ، شاهێدییش ئەدەم کە تۆش بەندە و پێغەمبەری خوایت .. ئیتر ئەوەبوو لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ مامەوە هەتا کۆمەڵە سوورەتێکی زۆر لە قورئان فێر بووم ، پاشان گەڕامەوە بۆ ناو قەومەکەم .

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی عەدەویی وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ عەلیی کوڕی ئەبوطالیبی خوا لێی ڕازیی بێ کردە ئەمیری سریەیەك و ڕەوانەی کردن و، لە شوێنێكدا بیست وشتریان دەست کەوتن و دایاننە بەر و، هەواڵ بە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب گەیشت کە ئەوانە قەومی ضیمادن خوا لێی ڕازیی بێ ، فەرمووی : بیان گێڕنەوە ، ئەوانیش گێڕانیانەوە ..[١٦٣]

**بیستەم : موسڵمانە لاوازەکان و سزای قوڕەیش**

هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ خاوەنی ویقار و هەیبەتێکی زۆر بوو کە هەروا بەو ئاسانی‌یە هەموو کەسێ نەوێرێ و شەرم بکا دەستی بۆ بەرێ ، سەرەڕای ئەوەی کە ئەبوطالیبی گەورەترین پیاوی خاوەن ڕێزی قوڕەیش پشتیوانی بوو و ئەیپاراست . کەچیی قوڕەیش ئازاریان ئەدا و دژایەتی‌یان ئەکرد .. ئیتر ئەبێ حاڵی موسڵمانە هەژارە بێدەست و کەسەکان چۆن بووبێ ؟ ئەوان لە حاڵێکی زۆر ناڵەباردا ئەژیان .. بتپەرستان هیچ شێوەیەکی سزادان نەما بە کاری نەهێنن ، کەچیی موسڵمانەکان بەوپەڕی غیرەتەوە شانیان دابووە ژێر سزا و ئازار و گاڵتە پێکردن ..

بەڵێ ، بەڕێزان ! لە مێژوودا هیچ کۆمەڵێك نەبووە بە وێنەی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ تووشی سزا و ئازار و ئەشکەنجە بووبێ .. بە ڕاستیی سزایەکی وەها دران کە چیاکان بەرگەیان نەئەگرت ، ئەمەش لە پێناوی ئیماندا .. بە تایبەت بەندە و کۆیلە و هەژارەکان . ئەمەش سەیر نیە ، چونکە ئیمان چوو بووە کرۆکی دڵیانەوە و ، ڕۆژانە چاوەڕوانی ئاسمان بوون تا وەحی بێتە سەر ئازیز و ئەوانیشی لێ ئاگادار بکات . لە هەمان کاتدا لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ چاکترین پەروەردەیان وەرئەگرت و ، خۆی پێشەنگی دامەزراویی و ، ئارامگرتن و ، بەرگەگرتن و ، پشتگوێ خستنی دنیا و ، گوێنەدان بە سزا و ئازاری ناحەزان بوو بۆیان .

ڕێك و پێکیی کارەکەیان لەوەدا بوو گوێیان لە هیچ حەز و ئارەزوویەکی دەروونیان نەبوو .. نە پارە و ، نە دەسەڵات و ، نە ناوبانگ و ، نە ڕابواردنی دنیایان بە مەبەست نەگرتبوو .. خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ و شوێن کەوتنی دینە پاکەکەیان تاقە ئاواتیان بوو .. هەر ئەوەندە خوا ڕازیی بێ و ، دینە پاکەکەی گەشە بکات و ، ئادەمی‌یەکان خوای خۆیان بناسن و ، لەسەر ناز و

[١٦٣] شرح حياة الصحابة : ١ / ١٤٨ ـ ١٥٠ .

نیعمەتەکانی سوپاسی بکەن و ، خۆیـان لـە تـاوان و خراپـەکان بپـارێزن ، هـەتا سەرفرازی قیامەت بن .

خۆ ئەگەر لەناو میللەت و ئوممەتە پێشینەکان‌دا کەسانێك ـ چ ژن و چ پیـاو ـ هەڵ کەوتبن کە سەروماڵیان کردبێتە قوربانیی بۆ گەیاندنی دینی خـوا و ، لەسـەر هەموو سزا و ئازارێك ئارامیان گرتبێ ، وەك هاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ زۆر و زەبەندە نەبوون ، بەڵکو چەند کەسانێکی کەم بوون و ، جـاری وایـش بـووە کـە ناتەواوی‌یان لێ دەرکەوتووە .

بەڵگەمان بۆ ئەمە چاکترین و رێك و پێكترینی شـوێن‌کـەوتوانی سـەردارمان عیسا پێغەمبەر ـ سەلامی لێ بـێ ـ حەواری‌یـەکان بـوون کـە هەرچـەندە چـەند کەسێکی کەم بوون ، یەکێکیان ـ کە یەهووذای ئەسخەریووطیـی بـوو ـ ناپـاکیی دەرهەق بە پێغەمبەرەکەی کرد و ، چوو هەواڵی شوێنی عیسـای بـەو جوولەکانـە گەیاند کە بە دوای‌دا ئەگەڕان تا دەستیان بکەوێ و بی‌کوژن . ئەوەبوو خوای گەورە لە دەستیان رزگاری کرد و ، بۆ ئاسمانی بەرز کـردەوە ، ئـەگینا ئـەیان کوشـت .. کەچیی لەناو هاوەڵان‌دا کە چەندە زۆر بوون نموونەی وەها نیە ، بەڵکو بە دڵ و بـە گیان خۆشیان ئەویست و ، هەموو خۆشەویستێکیشیان بە قوربان ئەکرد ..

هەتا ئەبوجەهلی خوانەناس کە ئەی‌بیست کەسێك موسڵمان بووە و ، پایەدار و کەس‌وکاردارە ، دەستی بە بۆڵەی ئەکرد و دڵی ئەشکاند و ، پێی ئەوت : وازت لە دینی باوباپیرت هێنا کە لە تۆ چاکترە ؟ ژیرییت بە سەفیهـ و ، رات بـە هەڵـە و لاواز دەرئەکەین و ، پایەشت ناهێڵین . ئەگەر بازرگانیش بوایە ، ئەبوجەهل پێـی ئەوت : بازرگانی‌یەکەت تووشی زەرەر ئەکەین و ، ماڵ و سامانت لەناو ئەبەین .. گەر لاوازیش بوایە دەستی بە لێ‌دانی ئەکرد و خەڵکیشی هەڵ ئـەنا تـا ئـازاری بـدا ..

ئەم ریوایەتەی ئیبن ئیسحاقیش کە سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبن عەبباس‌ەوە ئەی‌گێڕێتەوە دەری ئەخا کە تا چ رادەیەك هاوەڵان سزا و ئازاریان چەشتووە ..

سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێت : پرسـیارم لـە ئـیبن عـەبباس کـرد : ئایـا بـت پەرستەکان ئەوەندە سزا و ئازاری هاوەڵانی پێغەمبەری خوایان ﷺ ئەدا کە ئەگـەر وازیشیان لە دین بهێنایە گلەیی‌یان لێ نەکرایە ؟ وتی : بەڵێ . بەخوا بە شێوەیەك لە یەکێکیان ئەدا و ، برسی‌یان ئەکرد و ، تینوویان ئەکرد ، لە تاو لێ‌دانـی زۆر و

سەخت نەیئەتوانیی بە ڕێکیی دابنیشێ ، بە ڕادەیەك كە هەرچییان بویستایە بیلێ ، ئەیوت . هەتا پێیان ئەوت : ئایا لات و عوززا بە خوای خۆت ئەزانی ؟ ئەویش لە تاوا ئەیوت : بەڵێ .[١٦٤]

هاوەڵان ڕۆژ و مانگ و ساڵیان لە ژێر ئەشكەنجە و ئازاردا بەسەر ئەبرد و ، بەبێ كۆڵدان لەسەر خواپەرستیی بەردەوام بوون ..بەڵام بەینا و بەین لاوازیی سروشتی مرۆڤ سەری لێ ئەدان و هانایان ئەبردە خزمەتی ئازیزی نەبێزراویان ﷺ و شكاتی حاڵی خۆیان ئەكرد ، ئەویش نموونەی بۆ ئەهێنانەوە و سزا و ئازاری ئومەتە پێشینەكانی بۆ باس ئەكردن تا دڵیان فێنك ببێتەوە و تێ بگەن كە دینی خوا پیاوی پیاوانەی ئەوێ كە لە چیای سەخت خۆگرتر بن و ، بۆ هیچ ڕەشەبایەك ملیان نەچەمێتەوە ..

لە خەببابی كوڕی ئەرەتتەوە خوا لێی ڕازیی بێ ئەگێڕنەوە كە وتوویە : هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ كە لە سێبەری كەعبەدا بوردەیەكی كردبووە پاڵ پشت و ، ئێمەش بە دەست بتپەرستەكانەوە گیرمان خوارد بوو و وتم : ئایا لە خوا ناپاڕێیتەوە بۆمان ؟ دانیشت و ، دەم و چاوی سوور بوو بوویەوە و فەرمووی :
(( قد كانَ مَن كانَ قَبلَكُم لَيُمشَطُ بأمشاط الحَديد ، ما دونَ عظامه من لحمٍ أو عَصب، ما يَصرفُهُ ذلكَ عَن دينه !! وَلَيُتمَّنَّ اللهُ هذاَ الأمرَ حَتى يَسيرَ الرَاكبُ مـن صَـنعاءَ إلَى حضرموتَ ما يَخافُ إلاّ اللهَ ـ عَزوجل ـ والذئب على غَنَمه )) . وفي رواية : (( ولكنكم تستعجلون )) . رواه البخاري و مسلم .

فەرمووی : ئەوانەی لە پێش ئێوەوە ئیماندار بوون ، هی وایان هەبوو كە زاڵمان ئەیان گرت و بۆ ئەوەی لە دین پەشیمان ببێتەوە بە شانەی ئاسنین گۆشت و دەماری لاشەی لە ئێسقانەكانیان جیا ئەكردنەوە ، بێئەوەی ئەمە لە دین وازی پێبهێنێ . جا ئەم دینەش بە جۆرێك خوا بە ئاكامی ئەگەیەنێ كە سوار بە تەنیا لە صەنعاوە هەتا حەضرەمەوت بڕوا و لە هیچ نەترسێ جگە لە خوای گەورە و ، لە گورگیش كە هەڵمەت بۆ مەڕەكانی بەرێت . بەڵام ئێوە پەلە ئەكەن ..[١٦٥]

ئێستەش با چەند دیمەنێكی ئەو سزا و ئازارە زۆرەی كە ساڵەها هاوەڵە كۆڵ نەدەرەكان بە دەست قوڕەیشەوە چەشتیان بخەینە ڕوو .

---
[١٦٤] السيـرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٤٠ ـ ٣٤١ .
[١٦٥] السيـرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٤١ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ٤٨٠ .

سەرەتا با باسی کەمێ لەو سزا و ئازارە بکەین کە بیلال چەشتی :
بیلالی کوڕی ڕەباح حەبەشی‌یە و دایکیشی ناوی حەمامە بووە و ، بەندەی ئومەییەی کوڕی خەلەف بووە . ئومەییە پیاوێکی زبری دڵڕەق بووە و ، هەرچیی پێی بڵێی ڕەحم و سۆزی مرۆڤانە لە دڵی ئەودا نەبووە ..
ئیمام ئەحمەد و ئیبن ماجە لە ئیبن مەسعوودەوە خوا لێی ڕازیی بێ تەخریجیان کردووە کە وتوویە : حەوت کەس یەکەم جار ئیسلامیان ئاشکرا کرد : پێغەمبەری خوا ﷺ و ، ئەبوبەکر و ، عەممار و ، سومەییەی دایکی و ، صوهەیب و ، بیلال و، میقداد خوا لێیان ڕازیی بێ . جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی مامەیەوە خوا ئەی‌پاراست و ، ئەبوبەکریش بە هۆی قەومەکەیەوە خوا ئەی‌پاراست . ئیتر ئەوانی تریان بت‌پەرستەکان ئەیان‌گرتن و زرێی ئاسنینیان ئەکردە بەریان و لەبەر خۆردا ئەیان‌سووتاندن و ئەیان‌توانەوە ، بە ڕادەیەك هەر یەکەیان ئەوەی بە دەمدا هات کە ئەوان ئەیان‌ویست ، جگە لە بیلال کە لە پێناوی خوادا خۆی لەبەر چاو کەوتبوو و ، خەڵکەکەشی بەلاوە هیچ بوو . ئەوە بوو ئەویان گرت و دایانە دەست منالان ( دیارە بە دەست و پێی بەستراوەوە ) و ، ئەوانیش بە کۆڵانەکانی مەککەدا ئەیان‌سووڕاندەوە و ، ئەویش ئەی‌وت : (( أَحَدٌ ، أَحَدٌ )) .[١٦٦]
لە ڕیوایەتەکەی ئەبونوعەیم لە ( الحلية )دا بەم شێوەیە هاتووە : بەڵام ئەوانی تر ، زرێی ئاسنینیان لەبەر ئەکردن و لەبەردەم خۆردا ئەیان‌تاوانەوە ، تا ئەوەبوو ئەوەندەی کە خوا ویستی لەسەر بوو تەنگیان پێ هەڵ چنرا ، ئەویش بە گەرمای ئاسن و خۆر و ، کاتی عیشایش ئەبوجەهل لەعنەتی خوای لێ بێ بە حەربەکەیەوە ئەهاتە لایان و دەستی بە جنێو پێ‌دان و سەرزەنشت‌کردنیان ئەکرد .
دەربارەی بیلالیش هەواڵەکەی ئەمەی زیاتر بوو : پەتێکیان ئەخستە ملی و لە نێوان دوو چیاکەی مەککەدا ( چیای ئەبوقوبەیس و چیای سوور ) ئەیان سووڕاندەوە .[١٦٧]
زوبەیری کوڕی بەککاریش لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : بیلال بەندەی کچێکی نەوەی جومەح بوو و لەسەر لمە سوورەوە بووەکەی مەککەدا سزایان ئەدا و پشتیان ئەنووساند بە لمە

---

[١٦٦] مسند الإمام أحمد : ١ / ٤٠٤ وسنن إبن ماجه : ١ / ١٤ .
[١٦٧] الحلية : ١ / ١٤٠ وأخرجه إبن سعد : ٢ / ١٦٦ عن مجاهد بنحوه .

گەرمەکەدا تا شەریك بۆ خوا بڕیار بدا ، ئەویش ئەیوت : أَحَدٌ ، أَحَدٌ . کە وەرەقەش [١٦٨] بەلای‌دا تێ ئەپەڕیی و بیلال لەو حاڵەتەدا بوو ، ئەیوت : بەڵێ ، بیلال أحد أحد ! بەخوا ئەگەر بی‌کوژن قەبرەکەی ئەکەمە جێی سۆز و بەزەیی خوا.
وهذا مرسل جيد كذا في الإصابة ( ٣/ ٦٣٤ ) .

ئومەییەی تاوانبار بەوپەڕی بێویژدانی‌یەوە بیلالی لەسەر ئەو لمە سوورەوە بووە پاڵ ئەخست ، کە ئەو لمە ئەوەندە گەرم بوو گۆشتی ئەبرژاند . پاشان فەرمانی ئەدا بەردە زلەکەیان ئەخستە سەر سنگی و پاشان پێی ئەوت : بەخوا ، ئەبێ هەروا بمێنیتەوە تا یا ئەمری ، یان بە موحەممەد کافر ببیتەوە و ، لات و عوززا بپەرستی .

بیلال باکی لەم سزا و ئازار و هەڕەشانە نەبوو ، بەڵکو بەوپەڕی یەقینەوە پشتی بە خوا بەستبوو و ، بەوپەڕی قەناعەتەوە بە راستیی ڕێبازەکەی هەردەم خەریکی دووبارە کردنەوەی (( أحد .. أحد )) بوو . بەمە تاڵیی سزا و ئازار تێکەڵ بە شیرینیی ئیمان ئەبوو و ، سەرەنجام شیرینیی ئیمان بەسەر تاڵیی سزا و ئازاردا زاڵ ئەبێ . بیلال ئەیوت : ئەگەر وشەیەکی ترم بزانیایە کە لە (( أحد أحد )) زیاتر پێیان ناخۆشە ئەم وت .

بۆ ماوەیەکی زۆر ئومەییە هەموو جۆرە سزایەکی بیلالی ئەدا ، تا ئەوەبوو رۆژێکیان ئەبوبەکری صدیق خوا لێی رازیی بێ بەلای بیلال‌دا تێپەڕی کرد و بە ئومەییەی فەرموو : ئەوە دەربارەی ئەو هەژارە لە خوا ناترسیت ؟ هەتا کەی ؟! وتی : تۆ خەسارت گێڕاوە ، دەی لەوەی کە ئەی‌بینیی رزگاری بکە . فەرمووی : وا ئەکەم . بەندەیەکی رەش‌پێستم هەیە کە لەو ئازاتر و بەهێزتریشە و ، لەسەر دینەکەی خۆتە و ئەت‌دەمێ لە بری بیلال . وتی : وا قبووڵم کرد . فەرمووی : با بۆ تۆ بێ . ئەوەبوو ئەبوبەکری سەردارمان خوا لێی رازیی بێ بەندەکەی خۆی دایە و ، لە جیاتیی‌دا بیلالی وەرگرت و ، لە ڕێی خوادا ئازادی کرد ..

لە ریوایەتی تریش‌دا هاتووە کە بە حەوت یان پێنج ئۆقیە زیو کڕیویەتی و ئازادی کردووە .

---

[١٦٨] بە پێی ئەم ریوایەتە وا دەرئەکەوێ کە تا ماوەیەك وەرەقە لە ژیان‌دا مابێ ..

ئەوەبوو پێش‌تر ئەبوبەکر شەش بەندەی موسڵمانی تری کڕیی بوون و ئازادی کردبوون و بیلال حەوتەمیان بوو ..[١٦٩]

هەروەها حەمامەی دایکی بیلال و ، عامیری کوڕی فەهیرە و ، دایکی ، یان خوشکی و ، ئەبوفەکیهە و ، ئوم‌عونەیس و ، لەطیفەی کچی و ، لوبەینەی کەنیزەکی مەوئیلی کوڕی حەبیب و ، زەنیرەی ئازاد کردوون خوا لە هەموویان رازیی بێ .

لەو رۆژەدا ئەو هەژارانە لە خوایان ئەویست پارووەك نانی بەندایەتی‌یان دەست بکەوێ ، کەچیی کە خۆری ئیمان هەڵ هات ، خێرا دڵە پاکەکانیان ، کە وەك دڵی زاڵمان بە زوڵم رەش نەبوو بوونەوە ، تەسلیمی سوپای ئیمان بوون و ، بوونە سەربازی خۆنەویستی فیداکاری ئیمان ، تا ببنە پێشەنگی هیدایەت تا مرۆڤایەتیی خوای خۆی بناسێ و ، لە سەرشۆڕیی هەردوو دنیا سەرفراز بێت ..

عەمماری کوڕی یاسر و ، یاسری باوکی و ، سومەییەی کچی خوبباطیش کەوتنە بەر پلاری قوڕەیش ..

یاسر هاوپەیمانی ئەبوحوذەیفەی کوڕی موغیرە و ، سومەییەش کەنیزەکی بوو، لە یەکی مارە بڕین و عەمماریان بوو و ، دواییش یاسری ئازاد کرد .. کە ئیسلام هات هەرسێکیان موسڵمان بوون و ، کافرانی قوڕەیشیش ـ لە سەروو هەموویانەوە ئەبوجەهل ـ کە پێیان زانین هەموو رۆژێ لە ماڵ دەریان ئەکردنە دەشت هەتا سزایان بدەن و ، لەسەر ئەو لمە سوورەوە بووەی مەککە لاشەیان داخ بکرێ و ، ئەوانیش زرێی ئاسنیان لەبەر ئەکردن ، کەچیی کۆڵیان نەئەدا ..

طەبەرانیی و حاکم و بەیهەقیی و ئیبن عەساکر لە جابیرەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجیان کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای عەممار و کەس و کارەکەیدا تێ‌ئەپەڕێ و ئەوانیش سزا ئەدران ، ئەی‌فەرموو : (( أبشروا آل ياسر فإن موعدكم الجنة )) . ئەی‌فەرموو : خاوخێزانی یاسر مژدەتان لێ بێ ، بەڵێنی بەهەشتتان دراوەتێ .

لە عوثمانیشەوە خوا لێی رازیی بێ ئەگێڕنەوە کە فەرموویە : لە کاتێك‌دا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە بەطحاء بەڕێوە ئەچووین ، ئەبینین وا عەممار و

---

[١٦٩] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٤١ ـ ٣٤٢ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ٤٧٤ ـ ٤٧٧ ، والرحيق المختوم : ٩٠ .

باوکی و دایکی لەبەر خۆردا سزا ئەدرێن بۆ ئەوەی لە ئیسلام هەڵ بگەڕێنەوە . باوکی عەممار وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! هەمیشە هەر واین ! فەرمووی : (( صبراً یا آل یاسر ! اللهم اغفر لآل یاسر ، وقد فعلت )) . فەرمووی : ئەی خاوخێزانی یاسر ! ئارام بگرن .. خوایە ! لە خاوخێزانی یاسر خۆش ببە و ، لێیشیان خۆش بوویت .

هەروەها حاکم لە عەبدوڵلای کوڕی جەعفەرەوە خوا لێیان رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای یاسر و عەممار و دایکی عەمماردا تێپەڕیی و ئەوانیش لەسەر خوای گەورە سزا ئەدران . پێی فەرموون : (( صبراً یا آل یاسر ! صبراً یا آل یاسر ! فإن موعدکم الجنة )) . فەرمووی: ئەی خاوخێزانی یاسر! ئارام بگرن ، بەڵێنی بەهەشتتان پێ دراوە . کاتێکیش کە عەممار دادی کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! سزا و ئازار بە یەکجاریی کاری کردۆتە سەرمان ، ئەویش فەرمووی : (( إصبر أبا الیقظان ! أللهم لا تعذب من آل یاسر أحداً بالنار )) . فەرمووی : ئەی عەممار ! ئارام بگرە . خوایە لە خاوخێزانی یاسر هیچ کەس بە ئاگر سزا نەدەیت .. ئەبوجەهلی لەعنەتییش بەلای سومەییەدا تێپەڕی کرد کە لەسەر خوا سزا ئەدرا ، حەربەیەکی دا لە عەورەتی و بەوە شەهید بوو . سومەییە یەکەم کەس بوو لەسەر ئیسلام شەهید کرا . ئەوەندەشی پێ نەچوو یاسریش لە ژێر ئێشی سزا و ئازاردا گیانی لە دەست دا .

خێزانێکی بێکەس و بێپشتیوان رۆژانە ئەبرانە دەرەوە و لەسەر لمی سوورەوە بوو پاڵ ئەخران و هەتا ئێوارە سزا ئەدران .. ئێوارە ئەهێنرانەوە ماڵەوە ، بێ ئەوەی کەسێك هەبێ یارمەتییان بدات ، یان دڵیان بداتەوە .. ئەمەش هەمووی لە پێناوی خوادا ..

ماوەیەکی زۆر ئەمە بەردەوام ئەبێ ، تا رۆژێکیان دایکی بەساڵاچووی بێخزمەت و بێناز بە حەربەی ئەبوجەهلی بێدین شەهید ئەکرێ .. خوێنە پیرۆزەکەی ئەڕژێتە سەر لمە سوورەوە بووەکە .. گیانی پیرۆزی دەرئەچێ .. دوای ماوەیەکیش یاسری پیری بێهێز و لاواز لە ژێر ئەشکەنجە و سزا و ئازاردا گیانی دەرئەچێ ..

عەممار بە تەنیا مایەوە .. دایکی و باوکی هەموو کەسێکی بوون ، ئەوانیش بەجێیان هێشت .. ئارمایی کوشتن و مردنی دایك و باوکی کارێکی زۆری کردە سەر دەروونی .

دوای ئەوە سزای عەممار ئەوەندە زۆر كرا كە ناچار بوو قسە بە پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێت .. وتەی كافربوون بە زمانیا دێت ، بەڵام دڵی پڕ لە ئیمان بوو ..

ئەبونوعەیم لە ( الحلية : ١/١٤٠ ) دا لە ئەبوعوبەیدەی كوڕی موحەممەدی كوڕی عەممارەوە تەخریجی كردووە كە وتوویە : بتپەرستەكان عەممار خوا لێی رازیی بێ گرت و دەستبەرداری نەبوون هەتا قسەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ وت و ناوی خواكانیانی بە چاكە برد .. كاتێ كە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ما وراءَكَ ؟ )) . فەرمووی : دەنگ و باست چی‌یە ؟ ئەڵێ : خراپە ، ئەی پێغەمبەری خوا ! دەستبەردارم نەبوون هەتا بە خراپە ناوی تۆم برد و ناوی خواكانیانیشم بە چاكە برد . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( فكيف تجدُ قَلبَكَ ؟ )) . فەرمووی : دڵت چۆنە ؟ وتی : دڵم پڕ لە ئیمان و دامەزراوە . فەرمووی : (( فإن عادوا فعُد )) . فەرمووی : ئەگەر داوایان لێ كردیتەوە ئەوە دووبارە بكەرەوە ..

ئیبن سەعدیش ( ٣ / ١٧٨ ) لە موحەممەدەوە تەخریجی كردووە كە : پێغەمبەر ﷺ تووشی عەممار بوو كە ئەگریا . پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو چاوی عەمماری سڕین و ئەیفەرموو : (( أخذك الكفارُ فَغَطَّوْكَ في الماءِ ، فقلت كذا وكذا ، فإن عادوا فقل ذاك لهم )) .

فەرمووی : كافرەكان گرتیتیان و نوقمی ژێر ئاویان كردیت ، تۆش وەها و وەهات وت ، ئەگەر داوایان لێ كردیتەوە ئەوەیان بۆ بڵێرەوە .

هەروەها ئیبن سەعد ( ٣ / ١٧٧ ) لە عەمری كوڕی مەیموونەوە تەخریجی كردووە كە وتوویە : بتپەرستەكان عەمماری كوڕی یاسریان بە ئاگر سووتاند . ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایا تێپەڕی ئەكرد و دەستی بەسەر سەریا ئەهێنا و ئەیفەرموو : (( يا نارُ ! كوني برداً وسلاماً على عمار كما كنتِ على إبراهيم عليه السلام ، تقتلك الفئة الباغية )) . [170] فەرمووی : ئەی ئاگر ! وەك سارد و سەلامەتیی بووی بۆ ئیبراهیم سەلامی لێ بێ وەهاش بە بۆ عەممار .. دەستە لە سنوور دەرچووەكە ئەت كوژێ .

لە كاتێكدا كە عەممار ناچاری وتنی هەندێ قسە بوو ، خەڵك كەوتنە باسی ئەوەی كە عەممار كافر بوویەوە ، بەڵام كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەكەی بیست

---

[170] (( تقتلك الفئة الباغية )) . بوخاریی و ، موسلیم و ، تیرمیذیی و ، ئەحمەدیش تەخریجیان كردووە .

به ورەیەکی بەرزەوە باسی عەمماری کرد و فەرمووی : (( كلا ، إنَّ عَمَّاراً مُلِيءَ إيماناً مِن مَفرَقِ رَأْسِه إلى أَخْمَص قَدَمِه ، واختَلَطَ الإيمانُ بلَحمِه ودَمِه )) !!

فەرمووی : نەخێر ، عەممار هەر لە تەوقە سەریەوە تا پەنجەی پێی پڕە لە ئیمان و ، ئیمان تێکەڵی گۆشت و خوێنی بووە .

پاشان قورئانی پیرۆزیش هاتە خوارەوە تا دەری بخا کە عەممار و هاوچەشنانی ، ئەگەرچیی ناچاریش بکرێن ، دڵیان پڕ لە ئیمانە و خوا لەوانە نارەنجێ :

﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١٠٦﴾ ( النحل : ١٠٦ ) .

ئایەتەکە هەڕەشە لەوانە ئەکات کە لە دوای ئیمانهێنان بە خوای گەورە کافر ئەبنەوە و ، خۆشەویستیی بۆ کوفر دەرئەبڕن ، ئەوانە خوا غەزەبیان لێ ئەگرێ و عەزاب و سزایەکی سەختیشیان بۆ ئامادە کراوە ، جگە لەوانەی کە بە زۆر کوفریان پێ ئەوترێ و ، ناوکرۆکی دڵیان پڕیەتی لە ئیمان .

ئەمە روخسەتێکی خوایی بوو بۆ هەر ئیمانداریك کە بە دەست خوانەناسانەوە گیری خواردبێ و ، ناچاری بکەن وتەی نەشیاو دەربڕێ ..

هەروەها یەکێکی تر لەو موسڵمانە بێدەسەڵاتانەی کە لەسەر خواناسیی سزای سەختیان لەلایەن قوڕەیشەوە پێ ئەچێژرا و ، یەکێ بوو لەوانەش کە هەر زوو بە زوو ئیمانی هێنا بوو ، عامیری کوڕی فەهیرە بوو ..

عامیر شوانی مەڕەکانی ئەبوبەکر بوو و ، لە رۆژی کۆچ کردنی پێغەمبەری خوادا ﷺ یارمەتیی دان و هاوەڵی رێگەشیان بوو تا مەدینە بۆ ئەوەی خزمەتیان بکات . بەشداریی بەدر و ئوحودی کرد و ، لە بیری مەعوونەدا شەهید کرا .

یەکێکی تر لەوانەی کە سزایان چەشت ئەبوفەکیهە بوو ، کە ناوی ئەفلەح بووە . ئەمیش ئەو رۆژە موسڵمان بوو کە بیلالی تێدا موسڵمان بوو . ئەفلەح بەندەی ئازادکراوی نەوەی عەبدوددار بوو ، ئومەییەی کوڕی خەلەف سزای ئەدا .. پەتیان ئەخستە هەر دوو پێی و رایان ئەکێشا . سەرەنجام ئەبوبەکر لە پێناوی خوادا کڕیی و ئازادی کرد .[١٧١]

[١٧١] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٣٤٢ ـ ٣٤٤ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ٤٧٧ ـ ٤٧٩ ، والرحيق المختوم : ٩٠ .

ئیبن سەعدیش (٣ / ٣٧) لە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی تەیمی‌یەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : کاتێك کە عوثمانی کوڕی عەففان خوا لێی رازی بێ موسڵمان بوو ، حەکەمی کوڕی ئەبولعاصی کوڕی ئومەییە ، [١٧٢] کە مامەی عوثمان بووە ، ئەی‌گرێ و بە پەتێك توند ئەی‌بەستێتەوە و پێی ئەڵێ : ئایا ئەتەوێ پشت لە دینی باوباپیرت هەڵ بکەیت و شوێن دینێکی داهێنراو بکەویت ، بەخوا هەتا واز لەو دینە نەهێنی دەست و پێت ناکەمەوە . عوثمان فەرمووی : بەخوا ! هەرگیز وازی لێ ناهێنم و دەست‌بەرداری نابم . کە حەکەم دیتی وا لەسەر دینی خۆی دامەزراوە وازی لێ هێنا .

هەروەها بوخارییش لە ( التأريخ ) دا لە مەسعوودی کوڕی حیراشەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : لە کاتێکدا کە لە نێوان صەفا و مەڕوەدا خەریکی طەواف بووین سەیرمان کرد وا خەڵکێکی زۆر شوێن گەنجێکی لاوچاك کەوتوون کە دەستی بە ملیەوە بەسترابوو . وتم : ئەمە چی‌یەتی ؟ وتیان : ئەمە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلایە ، لە دین وەرگەڕاوە . ژنێکیش بە دوایەوە بۆڵە بۆڵی بوو و جنێوی پێ ئەدا . وتم : ئەی ئەمە کێیە ؟ وتیان : صەعبەی کچی حەضرەمی‌یە و دایکیەتی . (كذا في الإصابة : ٣ / ٤١٠) .

هەروەها حاکم‌یش لە ( المستدرك ) دا (٣ / ٣٦٩) لە ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی طەلحەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا خوا لێی رازیی بێ پێمی وت : گەیشتمە بازاڕی بوصرا ، ئەبینم وا راهیبێك لە پەرستگاکەی‌دایە و ئەڵێ : لە خەڵکی هاتووی ئەم وەرزە پرسیار بکەن ، بزانن ئایا کەسێکی خەڵکی حەرەمی مەککی‌یان تیایە ؟ طەلحە خوا لێی رازیی بێ فەرمووی : بەڵێ ، من . وتی : ئایا ئەحمەد دەرکەتووە ؟ ئەڵێ : وتم : ئەحمەد کێیە ؟ وتی : کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموطەللیب . ئەمە ئەو مانگەیە کە تیایا دەرئەکەوێ و دوا پێغەمبەریشە . لە حەرەمدا دەرئەکەوێ و بۆ شوێنی دارخورما و بەردی رەشی کوناویی و خۆڵی ئاودار و خوێوایی کۆچ ئەکات . نەکەی بهێڵی کەس پێشت بکەوێ بۆ لای . طەلحە ئەڵێ : ئەو قسەیەی چووە دڵمەوە ، بۆیە بە پەلە کەوتمە رێ هەتا گەیشتمەوە مەککە و وتم : هیچ شتێکی تازە رووی

---

[١٧٢] ئەم حەکەمە باوکی مەروانی باوکی عەبدولمەلیکە و نەوەی ئومەییەش بەرەو وەچەی ئومەییەی باپیری حەکەمن .

داوه ؟ وتیان : بەڵێ ، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای ئەمین داوای پێغەمبەرایەتیی ئەکات و کوڕی ئەبوقوحافەش شوێنی کەوتووە . ئەڵێ : لە ماڵ دەرچووم و خۆم گەیاندە لای ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ و وتم : شوێنی ئەم پیاوە کەوتووی ؟ فەرمووی : بەڵێ ، تۆش بچۆ بۆ لای و شوێنی بکەوە ، چونکە بۆ سەر حەق بانگ ئەکات . لەوێ طەلحە هەواڵی راهیبەکەی بۆ ئەبوبەکر گێڕایەوە . ئەبوبەکر هەستا و طەلحەی بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و طەلحە موسڵمان بوو و ، وتەی راهیبەکەشی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە و پێغەمبەری خواش ﷺ بەوە دڵ خۆش بوو . جا کە ئەبوبەکر و طەلحە موسڵمان بوون نەوفەلی کوڕی خوەیلیدی عەدەویی گرتنی و بە پەتێك هەردووکیانی بەست بە یەکەوە و نەوەی تەیمیش بەرگریی لێیان نەکرد .. نەوفەلی کوڕی خوەیلید نازناوی (( شێری قوڕەیش )) ی لێ نرابوو و ، قوڕەیشیش ئەبوبەکر و طەلحەی ناونان ( القرينين ) واتە جووتە بە یەکەوە بەستراوەکە .. لە ریوایەتەکەی بەیهەقییدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویە : (( أللهم ! أكفِنا شَرَّ ابنِ العَدَوِيَّة )) . فەرمووی : خوایە ! شەڕی نەوفەل مان لێ لا بدەی .

هەروەها ئەبونوعەیم لە ( الحلية : ١ / ٨٩ ) دا لە ئەبوئەسوەدەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : زوبەیری کوڕی عەووام خوا لێی رازیی بێ کە هەشت ساڵان بوو موسڵمان بوو و ، لە تەمەنی هەژدە ساڵییشدا کۆچی بۆ مەدینە کرد . ئەوەبوو مامەی زوبەیر زوبەیری لەناو حەسیرێکی پێچراوەدا هەڵ واسیی و لە ژێرەوە دووکەڵی ئەدا و پێی ئەوت : بگەڕێرەوە بۆ سەر کوفر و ، زوبەیریش ئەیوت : هەرگیز کافر نابمەوە .[١٧٣]

خەبابیی کوڕی ئەرەتتیش بەندەی ئوم ئەنماری کچی سیباعی خوزاعیی بوو و، بتپەرستەکان هەموو جۆرە سزایەکیان ئەدا و ، قژی سەریان رائەکێشا و ، بە توندییش ملیان ئەچەماندەوە .. چەندین جار بەسەر سکڵەوە بە پشتا پاڵیان ئەخست و بەردێکیشان ئەخستە سەر سنگی تا نەتوانێ هەڵسێتەوە .[١٧٤]

ئەبونوعەیمیش لە ( الحلية : ١ / ١٤٤ ) دا لە شەعبییەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : عومەر خوا لێی رازیی بێ پرسیاری لە بیلال کرد کە لەلایەن بت

---

[١٧٣] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٧١ ـ ٤٧٣ .

[١٧٤] الرحيق المختوم : ٩١ .

پەرستانەوە چ ناڕەحەتی‌یەکی تووش بووە ، خەبابیش وتی : ئەی ئـەمیری ئیمـان داران ! سەیری پشتم بکە . عومەر فەرمووی : تا ئـەمڕۆ شـتی وەهـام نـەدیوە . وتی: ئاگرێکیان بۆ کردمەوە کە بە چەورایی پشتم کوژایەوە .[١٧٥]

با دەربارەی موسڵمان‌بوونی ئەبوذەڕی غیفاریی و سزادانیشی شتێ بـخەینە بەر چاو :

بوخاریی ( ١ / ٥٤٤ ) لە ئیبن عەبباس‌ەوە خوا لێیان رازیی بێ تەخریجی کـردووە کە وتوویە : کە هەواڵی رەوانەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوذەڕ گەیشـت بـە براکەی ( کە ناوی ئەنیس بووە ) وت : سوار بە بۆ مەککە و هەواڵی ئەو پیاوەم بۆ بزانە کە وەهای راگەیاندووە پێغەمبەرە و لە ئاسمانەوە وەحیی بۆ دێت و ، گوێ لە قسەکانی بگرە و پاشان وەرەوە بۆ لام . براکەی کەوتە رێ هەتا هاتـە خزمـەتی و فەرمایشتی لێ بیست و ، پاشان گەڕایەوە بۆ لای ئەبوذەڕ و پێـی وت : فـەرمانی بە رەوشتە جوانەکان ئەدا و فەرمایشتێکیشم لێی بیست کە لە شـیعر نەئەچوو . وتی : دڵـم ئاوی نەخـواردەوە و ئەوەی ویسـتم دەستم نەکەوت .

بۆ ئەمە ئەبوذەڕ توێشووی پێچایەوە و جەوەندەیەکی پڕ لـە ئـاو کـرد و خـۆی گەیاندە مەککە و هاتە مزگەوت و بە دوای پێغەمبەردا ﷺ گەڕا و نەشی ئەناسـی و پێیشی ناخۆش بوو هەواڵی بپرسێ ، هـەتا ئێـوارەی لێ هـات و بـۆ خـۆی پـاڵ کەوت . ئیمام عەلیی خوالێی رازیی بێ چاوی پێ کەوت و زانیی کە غەریبە . کە چاوی پێ‌کەوت کەوتە شوێنی و ، بردیە ماڵەوە و ، هـەتا بـەیانیی هـیچ کامیـان پرسیاریان لە یەك نەکرد . پاشان جەوەندە و توێشووەکەی هەڵ گرت و گەڕایەوە بۆ مزگەوت و ، ئەو رۆژەش هەروا مایەوە و هەتا ئێوارە پێغەمبـەر ﷺ نـەی دیـی . دیسان چـووەوە شـوێنی پـاڵ کەوتنەکـەی و ، ئیمـام عـەلیی بـەلایا تێ‌پـەڕیی و فەرمووی : ئەی نابێ کابرا مەنزڵی خۆی بزانـێ ؟ هـەڵی سـاند و بردیـەوە ، بـێ ئەوەی هیچ کامیان پرسیار لـە هـاوەڵەکـەی بکـات ، تـا رۆژی سـێ‌هەم هاتـە بەرەوە .. دیسان ئیمام عەلیی بردیەوە و لەوێ مایەوە و ، پاشان فەرمووی : بـۆم باس ناکەی بۆ چیی هاتووی ؟ وتی : ئەگەر بـەڵێن و پـەیمانم بـدەیتێ کـە پیشـانم بدەی پێت ئەڵێم . بەڵێنی دایە و ئەویش هـەواڵی پـێ دا .. فـەرمووی : بـەڵێ ، ئەوە راستە و پێغەمبەری خوایە . کە رۆژمـان لێ بوویـەوە شـوێنم بکـەوە ، جا

---

[١٧٥] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٧٩ ـ ٤٨٠ .

ئەگەر شتێکم بینی کە بۆ تۆ مەترسیی تێدا بێت ، ئەوا وەك ئاو بڕێژم هەڵوێستە دەکەم و ، گەر ڕۆیشتم شوێنم بکەوە هەتا من لە کوێ چوومە ژوورەوە تۆیش بێیتە ژوورەوە . ئەویش بە گوێی کرد و ، بە دوایا کەوتە ڕێ هەتا ئیمام چووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەویش لەگەڵی چووە ژوورەوە . فەرمایشتەکانی لێ بیست و هەر لە شوێنی خۆیدا موسڵمان بوو . پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (( إرجِع إلى قومِك فَأَخبِرهُم حتى يَأتِيَكَ أمري )) . فەرمووی : بڕۆرەوە بۆ ناو قەومەکەت و هەواڵیان بدەرێ و چاوەڕوان بە هەتا فەرمانت بۆ ئەنێرم .. وتی : بەو خوایەی گیانمی بە دەستە ! لە ناو کۆڕ و کۆمەڵی قوڕەیش‌دا تەوحید بە دەنگی بەرز ئاشکرا ئەکەم . هاتە دەرەوە و خۆی گەیاندە مزگەوت تا توانیی بە دەنگی بەرز قیڕاندی : أَشهَدُ أَن لاَّ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وأَنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله . ئیتر خەڵکەکە هەستان و دەستیان بە لێدانی کرد هەتا دایان بە زەوییدا .. لەولاوە عەبباس هات و خۆی دا بەسەریدا و باوەشی پیا کرد و وتی : تیاچن !نازانن ئەمە لە هۆزی غیفارە و ، وا لە سەرەڕێی بازرگانەکانی شامتاندا ؟ لە دەستیان رزگاری کرد . بۆ سبەینێ بە هەمان شێوەی کردەوە و ، دەستیان بە لێدانی کردەوە و هەڵ چوون بە گژیدا و ، دیسان عەبباس فریای کەوتەوە .

هەروەها بوخاریی ( ١ / ٥٠٠ ) بەم شێوە ریوایەتی کردووە : وتی : ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! من شاهێدیی ئەدەم کە جگە لە زاتی ( الله ) هیچ خوایەکی تر نیە و شاهێدییش ئەدەم کە موحەممەد بەندە و پێغەمبەری ئەوە .. وتیان : هەستن بۆ ئەو لەدین وەرگەڕاوە . ئەوەبوو هەستان و وەها لێیان ئەدام کە بمرم ، جا عەبباس فریام کەوت و خۆی دا بەسەرمدا ، پاشان رووی تێ کردن و وتی : تیاچن ! پیاوێك لە هۆزی غیفار ئەکوژن و بازرگانیی و هاتوچۆشتان لەسەر خاکی غیفارە ؟ ئیتر وازیان لێم هێنا . کە رۆژم لێ بوویەوە ، دیسان گەڕامەوە و ئەوەی کە دوێنێ وتم دووبارەم کردەوە . وتیان : هەستن بۆ ئەو لەدین وەرگەڕاوە . ئەوەبوو وەك دوێنێیان لێ کردمەوە و ، عەبباس فریام کەوتەوە و ، خۆی دا بە سەرمدا و ، قسەکەی دوێنێی پێ وتنەوە .

هەروەها موسلیم ( ٢ / ٢٥٩ ) لە رێی عەبدوڵلای کوڕی صامیتەوە ، لە ئەبوذەڕەوە خوا لێیان رازیی بێ تەخریجی کردووە کە تیایا هاتووە : براکەم کەوتە رێ و خۆی گەیاندە مەککە و کە گەڕایەوە پێمی وت : چوومە مەککە و چاوم بە

پیاوێك کەوت کە خەڵکیی پێیان ئەوت لەدین وەرگەڕاو ، کە لە هەموو کەسێك زیاتر لە تۆ ئەچوو . ئەڵێ : هاتمە مەککە و ئەبینم پیاوێك ناوی ئەبا . وتم : ئەو لە دین وەرگەڕاوە لە کوێیە ؟ کابرا دەنگی بەسەرمدا بەرز کردەوە و وتی : لەدین وەرگەڕاو ! لە دین وەرگەڕاو ! خەڵکەکە هێرشیان کردە سەرم هەتا وەك بتی بە خوێنی قوربانیی سوورکراویان لێ کردم . ئیتر لە نێوان کەعبە و پەردەکانیدا خۆم حەشار دا و ماوەی پانزە شەو و رۆژ ( لە ریوایەتێکی تری موسلیمدا سیی شەو و رۆژ هاتووە ) لەوێ مامەوە ، بەبێ نان و بەبێ ئاو جگە لە ئاوی زەمزەم . ئەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ تووشمان بوون و چوونە کەعبەوە دە بەخوا ! من یەکەم کەس بووم کە بە سەلامی ئیسلام سەلامم کرد ، وتم : السلام عليك يا رسول الله ! فەرمووی : (( وعليك السلام ورحمة الله ! مَن أنت ؟ )) فەرمووی : تۆ کێیت ؟ منیش وتم : پیاوێکم لە نەوەی غیفار . هاوەڵەکەی ( کە ئەبوبەکر بوو ) فەرمووی : ئیزنم بدە ئەی پێغەمبەری خوا ! با ئەمشەو میوانم بێت . ئەوەبوو لەگەڵ خۆیدا بردمیەوە بۆماڵەوە لە باشووری مەککەدا و ، چەند مشتێك مێوژی دامێ . ئەڵێ : گەڕامەوە بۆ لای براکەم و هەواڵی ئەوەشم دایە کە من موسڵمان بووم . وتی : منیش لەسەر دینی تۆم . هەردووکمان چووین بۆ لای دایکمان ، ئەویش وتی: منیش لەسەر دینی ئێوەم . ئەڵێ : هاتم بۆ لای خزمەکانم و بانگم کردن ، ئەوانیش هەندێکیان شوێنم کەوتن .

هەروەها ئەبونوعەیم لە ( الحلية : ١ / ١٥٨ ) دا لە رێی ئیبن عەبباسەوە خوا لێیان رازیی بێ ، لە ئەبوذەڕڕەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : لە مەککەدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ مامەوە و ئیسلامی فێرکردم و شتێك لە قورئانم خوێند و ، دوای ئەوە وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمەوێ دینەکەم دەر بخەم . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( إِنِّي أَخافُ عَلَيكَ أَنْ تُقتَلَ )) . فەرمووی : ئەترسم بکوژرێیت . وتم : هەر ئەبێ وا بکەم ئەگەرچیی بش کوژرێم . ئەڵێ : لێم بێدەنگ بوو و ، منیش هاتم و قورەیشیش لە مزگەوتدا ئەڵقە ئەڵقە باس و خواستیان ئەکرد و ، وتم : أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله . ئەڵقەکان راچڵەکین و هەستان و بە شێوەیەك دەستیان بە لێدانم کرد کە بە جێیان هێشتم وەك بتی بە خوێن سوورکراو وەها بووم و ، وەهایان ئەبینی کە کوشتوومیان . کە هۆشم بە خۆما هاتەوە هاتمەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و، کە حاڵمی بینی

پێمی فەرموو : ( أَلَسم أَهْلك ؟ ) . فەرمووی : ئەی دوورەپەرێزییم لەوە نەکردی ؟ وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! خواستێکی دڵم بوو و بە جێم هێنا . ئەوەبوو لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ مامەوە ، تا فەرمووی : (( إلحَقْ بِقومكَ فإذا بَلَغَكَ ظهوري فأْتني )) . فەرمووی : بڕۆرەوە بۆ ناو خزمەکانت و کە پێت گەیشت سەرکەوتووم وەرە بۆ لام .[١٧٦]

هەروەها سەعیدی کوڕی زەیدیش - کە یەکێکە لە دە کەسە مژدە پێدراوەکە - بە خۆی و هاوسەرەکەیەوە کەوتنە بەر پلاۆی سزا و ئازار :

بوخاریی ( ١ / ٥٤٥ ) لە قەیس ەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : لە سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلم بیست کە لە مزگەوتی کووفەدا ئەیوت : بەخوا ! لەسەر موسڵمانبوون عومەر خوا لێی رازیی بێ توند بەستوومیەتەوە . لە ریوایەتێکی تردا ( ١ / ٦٥٤٦ ) فاطیمەی هاوسەریشی ، کە خوشکی عومەر بووە و ، هێشتا عومەر موسڵمان نەبووە ، هەمان سزای داوە .

ئیبن سەعدیش ( ٣ / ١٩١ ) لە ئەنەس ەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : عومەر خوا لێی رازیی بێ لە ماڵ دەرچوو و شمشێرەکەشی لە شان کردبوو و تووشی پیاوێکی نەوەی زوهرە بوو [١٧٧] کە لێی پرسیی : نیازی کوێت هەیە ، عومەر ؟ فەرمووی : ئەمەوێ موحەممەد بکوژم . وتی : جا چۆن لە دەستی نەوەی هاشم و نەوەی زوهرە دەرئەچیت ، ئەگەر موحەممەد بکوژی ؟ ئەڵێ : عومەر پێی فەرموو : وا ئەبینم تۆش لە دین وەرگەڕاوی و وازت لە دینەکەی خۆت هێناوە . وتی : ئایا لەوە سەیر ترت پیشان نەدەم ؟ فەرمووی : چی‌یە ؟ وتی : خوشکەکەت و زاواکەت لە دین وەرگەڕان و وازیان لەو دینە هێنا کە تۆی لەسەری . ئەڵێ : عومەر بە هەڕەشە و بێزاری‌یەوە کەوتە رێ هەتا خۆی گەیاندە لایان و پیاوێك لە موهاجیرەکانیان بەلاوە بوو کە ناوی خەبباب بوو خوا لێی رازیی بێ . ئەڵێ : کاتێك کە خەبباب دەنگی عومەری بیست لە ماڵەکەدا خۆی شاردەوە و ، عومەریش هاتە ژوورەوە لای خۆشکەکەی و زاواکەی . فەرمووی : ئەو دەنگە دەنگەتان چیی بوو ؟ ئەڵێ : ئەوانیش خەریکی خوێندنی سوورەتی ( طه ) بوون ، وتیان : قسەی نێوان خۆمان بوو . فەرمووی : لەوە ئەچێ

---

[١٧٦] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٨١ - ٤٨٤ .

[١٧٧] سەعدی کوڕی ئەبووەققاص بووە خوا لێی رازیی بێ .

ئێوەش لە دین وەرگەڕابن . ئەڵێ : زاواکەی وتی : ئەی عومەر ! ئەی ئەگەر حەق لە غەیری دینەکەی تۆدا بوو ؟ عومەر هەڵمەتی دایە زاواکەی و بە توندیی دای بە زەوییدا . خوشکەکەی هات تا لە مێردەکەی دووری بخاتەوە ، کەچیی عومەر دای بە دەم و چاویا و خوێناویی کرد .. خوشکەکەی بە تووڕەییەوە وتی : ئەی عومەر ! ئەی ئەگەر حەق لە غەیری دینەکەی تۆدا بوو ؟! أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله . کە عومەر بێهیوا بوو فەرمووی : ئەو کتێبەم بدەنێ کە لەلاتانە تا بیخوێنمەوە . ئەڵێ : عومەر خوێندەواریی هەبوو ، خوشکەکەی پێی وت : تۆ پیسیت و ئەمەش ئەبێ پاکەکان دەستی لێ بدەن . هەستە خۆت بشۆ ، یان دەستنوێژ بگرە . عومەر هەستا و دەستنوێژی گرت ، پاشان پەڕە قورئانەکەی وەرگرت و دەستی بە خوێندنی سوورەتی ( طه ) کرد ، هەتا گەیشتە : ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ ﴾ ( طه : ١ / ١٤ ) . ئەڵێ : عومەر فەرمووی : موحەممەدم پیشان بدەن . کە خەبباب فەرمایشتەکەی عومەری بیست ، لە ماڵەکە هاتە دەرەوە و وتی : عومەر ! مژدە بێت ! هیوادارم دوعاکەی شەوی پێنج شەممەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ بگرێتەوە کە فەرمووی : (( أللهم أعز الإسلام بعمر بن الخطاب أو بعمرو بن هشام )) . فەرمووی : خوایە ! ئیسلام بە عومەری کوڕی خەططاب یان بە عەمری کوڕی هیشام ( واتە : ئەبوجەهل ) پایەدار بکە . وتی : پێغەمبەری خوایش ﷺ وا لەو ماڵەی لای گردی صەفادا ، ( مەبەستی لە ماڵی ئەرقەمە ) . ئیتر عومەر کەوتە ڕێ هەتا گەیشتە ماڵەکە . ئەڵێ : دەرگای ماڵەکە حەمزە و طەلحە و خوا لێیان ڕازیی بێ چەند هاوەڵێکی پێغەمبەری خوای ﷺ لێ وەستابوون . کە حەمزە چاوی بە عومەر کەوت ، هاوەڵەکانی لە عومەر ترسان . حەمزە فەرمووی : بەڵێ ، ئەوە عومەرە .. ئەگەر خوا چاکەی بۆ عومەر بوێ ئەوا موسڵمان ئەبێ و شوێن پێغەمبەر ﷺ ئەکەوێ و ، گەر غەیری ئەوەشی بوێ ئەوا کوشتنی بە دەستمان ئاسان ئەبێ . ئەڵێ : پێغەمبەری خوایش ﷺ لە ژوورەوە بوو وەحی بۆ ئەهات . ئەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە ، هەتا گەیشتە لای عومەر و یەخەی و قایشی شمشێرەکەی گرت و فەرمووی : (( أَمَا أنت بمُنتَهٍ يا عمر ! حتى يُنزِلَ اللهُ بكَ منَ الخزي والنَّكالِ ما أنزلَ بالوليد بن المغيرة ؟ أَللهمَّ هذا عمر بن الخطاب ، أللهم أَعِزَّ الدينَ بِعُمَرَ بنِ الخطاب )) . فەرمووی : ئەی عومەر ! ئیتر دەست کۆتا

نابی ، هەتا خوا وەك وەلیدی كوڕی موغیرە زەلیلیی و سزات بۆ بنێرێ ؟ خوایە ! ئەمە عومەری كوڕی خەططابە . خوایە ! دین بە عومەری كوڕی خەططاب پایەدار بكە . ئەڵێ : عومەر فەرمووی : شاهێدیی ئەدەم كە تۆ پێغەمبەری خوایت ، ئیتر موسڵمان بوو و ، فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! دین ئاشكرا بكە .[١٧٨]

یەكێكی تر لەو پاڵەوانانەی كە لە رۆژانی رەش و تاریكدا موسڵمان بوون ، هاوەڵی پایەدار عوثمانی كوڕی مەظعوون بوو خوا لێی رازیی بێ ، ئەوەبوو لەوەو پێش وەلیدی كوڕی موغیرەی باوكی خالید پەنای دابوو و قورەیشی لەو پەنادانە ئاگادار كرد بوو كە هیچ كەسێ دەست بۆ عوثمانیكوڕی مەظعوون نەبات . عوثمان سەرنجی ئەدا موسڵمانە بێكەس و بێدەرەتانەكان هەر لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە لەسەر لمە سوورەوە بووەكەی مەككەدا سزا ئەدرێن .. رۆژێك و دوان نیە .. مانگ و ساڵ تێ ئەپەڕن و ئەو بەستەزمانانە لە ژێر ئازاردا ئەتلێنەوە . موسڵمانەكانی بەو حاڵەوە ئەدیی و ، خۆیشی بێخەم و بێترس ئەهات و ئەچوو ، بە بۆنەی پەنای سەر زلێكی قورەیشەوە ، كە هەتا لە سزادان و ئازاردانی دڵی پێغەمبەری خوایش ﷺ درێغیی نەئەكرد.. بۆ ئەمە بە خۆی وت : بەخوا ! ئەم هات و چۆیەم بەیانیان و ئێواران لە پەنای پیاوێكی موشریكدا و ، لەولاوە هاوەڵانم و هاودینانم سزا و ئازار و بەڵایان بەسەردا ئەبارێ و من هیچم تووش نابێ، ئەوپەڕی ناتەواوییە بۆ من . بۆ ئەمە چوو بۆ لای وەلیدی كوڕی موغیرە و پێی وت : ئەی ئەبوعەبدشەمس ! ماوەی پەناكەت تەواو بوو و ، وا منیش پەناكەتم گێڕایەوە بۆت . ئەڵێ : جا بۆچ ئەی كوڕی برام ؟ بۆچ هیچ خزمێكم ئازاری داوی ؟ وتی : نەء ، بەڵام من پێم خۆشە لە پەنای خوای گەورە و بەدەسەڵاتدا بم و ، نامەوێ بچمە پەنای غەیری ئەوەوە .. وەلید وتی : دەی با بچین بۆ مزگەوت و لەوێ وەك بە ئاشكرا پەنام دای ، بە ئاشكراش پەناكەم بۆ بگێڕەرەوە . ئەڵێ : پێكەوە رۆیشتن هەتا گەیشتنە مزگەوت و ، وەلید بە خەڵكەكەی وت : ئەمە عوثمانە و هاتووە پەناكەم بۆ ئەگێڕێتەوە . ئەویش پێی وتن : راست ئەكا و ، وەفای نواند و ، بە رێزەوە پەنای دام ، بەڵام من وام پێ

---

[١٧٨] شرح حیاة الصحابة : ١ / ٤٨٥ ـ ٤٨٦ . موسڵمان بوونی عومەر لە دواوە بە درێژتر باس ئەكرێت ـ إن شاء الله ـ .

خۆشە کە جگە لە خوا لە پەنای هیچ کەس‌دا نەبم ، بۆیە پەناکەیم بۆ گێڕایەوە .
دوای ئەوە عوثمان رۆیشت و ، لەبیدی کوڕی رەبیعەی کوڕی مالیکی کوڕی کیلابی قەیسیی [١٧٩] لە کۆڕی قورەیش‌دا بوو و شیعری بۆ ئەخوێندنەوە ، عوثمانیش چوو لەگەڵیانا دانیشت . لەبید بە شێوەی شیعر وتی :

أَلا كُلُّ شَيْءٍ ما خَلا اللهَ باطِلُ

عوثمان وتی : راست ئەکەیت . لەبید وتی :

وَكُلُّ نَعيمٍ لاَ مَحَالَةَ زَائِلُ

عوثمان وتی : راستت نەکرد ، ناز و نیعمەتی ئەهلی بەهەشت تیا ناچێت .
لەبیدی کوڕی رەبیعە وتی : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! بەخوا ! هەرکەس لە کۆڕی ئێوەدا دابنیشتایە ئازاری نەئەدرا ، ئەمە کەی واتان لێ هاتووە ؟ پیاوێکی کۆڕەکە وتی : ئەمە یەکێکە لەو سەفیهانەی کە وازیان لە دینەکەمان هێناوە ، بە قسەی ئەو خەمبار و ناڕەحەت مەبە . عوثمانیش وەڵامی دایەوە و ، دەنگیان بەرز بوویەوە . ئەو پیاوە هەستایەوە و زللەیەکی لە چاوی عوثمان دا و شینی کردەوە و، وەلیدی کوڕی موغیرەش لە نزیکەوە چاوی لێ بوو کە عوثمان چیی بەسەر هات . وتی : دە بەخوا ! ئەی کوڕی برام ! پێویستی نەئەکرد ئەو چاوەت وەهای بەسەر بێ ، چونکە تۆ لە پەنایەکی پارێزراودا بووی . عوثمان وتی : بەڵێ ، بەخوا ! چاوە ساغەکەم بەستەزمانە کە وەك هاوەڵەکەی لە رێی خوادا وەهای بەسەر نەهاتووە و، من ئێستا وام لە پەنای یەکێك‌دا کە لە تۆ پایەدارتر و بەتواناترە ، ئەی ئەبوعەبدشەمس ! ئیتر ئەوە بوو عوثمان خوا لێی رازیی بێ دەربارەی لێ درانی ئەو چاوەی شیعرێکی وت .. [١٨٠]

---

[١٧٩] لە ( السيرة النبوية ) ی ( أبو شهبة ) دا ناوی بەم جۆرە هاتووە : لەبیدی کوڕی رەبیعەی ، کوڕی عامیری ، کوڕی مالیکی ، کوڕی جەعفەری ، کوڕی کیلابە و کونیەکەی ئەبوعەقیلە . موسڵمان بووە و ، بوخاریی و ئیبن ئەبوخەیثەمە و غەیری ئەوانیش بە یەکێ لە هاوەڵانیان ژماردووە . کاتێك کە عومەری سەردارمان خوا لێی رازیی بێ دەربارەی ئەو شیعرەی کە لە سەردەمی نەفامیی‌دا وتبووی پرسیاری لێ کرد ، وەڵامی دایەوە : خوای گەورە شیعری بۆ گۆڕیوم بە سوورەتی ( البقرة ) . لە کووفە نیشتەجێ بووە و ، لە سەردەمی حەزرەتی عوثمان‌دا هەر لە کووفە کۆچی دوایی کردووە . صەد و بیست ساڵ ژیاوە و ، ئەڵێن زیاتریش . ئەم شیعرەش هی ئەوە :
ولقد سئمت من الحياة وطولها وسؤال هذا الناس : كيف لبيد ؟
( السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٣٦٢ )

[١٨٠] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٨٨ _ ٤٩٠ . لە ( السيرة النبوية ) ی أبوشهبەدا وا هاتووە کە عوثمان دوای گەڕانەوەی لە کۆچی یەکەمی حەبەشە چۆتە پەنای وەلیدەوە و ، کە ئەبینێ ئیمان‌داران سزا ئەدرێن پەناکەی بۆ ئەگێڕێتەوە . ج ١ / ٣٦١ _ ٣٦٢ .

موصعەب یش سزا و ئازارێکی زۆری چەشت :

ئیبن سەعد ( ٣ / ٨٢ ) لە موحەممەدی عەبدەرییەوە ، لە باوکیەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : موصعەبی کوڕی عومەیر خوا لێی رازیی بێ لە گەنجیی و جوانیی و قژی سەریدا لاوچاکی مەککە بوو .. باوك و دایکی زۆریان خۆش ئەویست .. دایکی زۆر دەوڵەمەند بوو و خاوەنی سامانێکی زۆر بوو و بە جوان ترین و ناسكترین جل و بەرگ پۆشتەی ئەکردەوە و ، لە هەموو دانیشتوانی مەککە بۆن خۆش‌تر بوو و ، پێڵاوی حەضرەمیی ( دروست کراوی یەمەنی ) لە پێ ئەکرد .. پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەکرد و ئەیفەرموو : (( ما رَأيتُ بِمَكَّةَ أحَداً أَحسنَ لِمَّةً ، ولا أَرَقَّ حُلَّةً ، ولا أنعَمَ نِعمةً مِن مُصعَبِ بن عُميرٍ )) .

ئەیفەرموو : لە مەککەدا کەسم نەدیوە لە موصعەبی کوڕی عومەیر کاکۆڵ جوانتر و ، جل و بەرگ ناسك تر و ، ناز و نیعمەت دارتر بێ . ئەوە کەوتە گوێی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبوئەرقەمدایە و ، خەڵك بۆ سەر ئیسلام بانگ ئەکات . چووە خزمەتی و موسڵمان بوو و ، ئیمانی پێ هێنا . ئەوە بوو کە چووە دەرەوە موسڵمان بوونی خۆی لە ترسی دایکی و خزمەکانی ئاشکرا نەکرد .. بە نهێنیی جاروبار ئەچووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، جارێکیان عوشمانی کوڕی طەلحە چاوی لێ بوو نوێژی ئەکرد هەواڵی بە دایکی و خزمەکانی دا . ئەوانیش گرتیان و بەندیان کرد و ، هەروا بە بەندیی مایەوە تا لە کۆچی یەکەمی حەبەشەدا ئەویش کۆچی کرد ، پاشان موسڵمانەکان کە گەڕانەوە ئەویش لەگەڵیان گەڕایەوە ، بەڵام بە رەنگی گۆڕاو و زبرییەوە . دایکیشی لە رقانا وازی لێ هێنا .[181]

هاوەڵە ئافرەتەکانیش کەوتنە بەر پلاری سزا و ئازاری قورەیش و ، ئەوانیش مەردانە شانیان دایە بەر سزا و ئازار و ، خۆیان یەكلایی کردەوە بۆ خوا ..

لە پێشەوە شتێك لە سزا و ئازاری سومەییەمان لەگەڵ یاسری مێردی و عەمماری کوڕیدا باس کرد .

یەکێکی تر لەو خوشکانەی کە سزا دران زننیرەی رۆمیی بووە کە کەنیزەکی عومەری کوڕی خەططاب بووە .. پێش موسڵمان بوونی عومەر موسڵمان ئەبێت و، کە عومەر پێی ئەزانێ هەموو جارێ ئەوەندەی لێ ئەدا هەتا ماندوو ئەبێت و ،

---

[181] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٩١ .

ئەبوجەهل‌یش لە لێدانی‌دا یارمەتیی ئەدا ، کەچیی زننیرە هەتا ئەهات لەسەر ئیسلام دامەزراوتر ئەبوو . دوای ئەوەی کە موسڵمان بوو بوو چاوی کوێر بوون ، بۆ ئەمە قورەیش ئەیان‌وت : لات و عوززا چاویان کوێر کردووە . ئەویش ئەی‌وت: بە ماڵی خوا ، درۆیان کردووە ، لات و عوززا نە قازانج و نە زیانیان لێ نایەت ، بەڵکو ئەمە فەرمانی ئاسمانە و ، پەروەردگاریشم توانای هەیە چاوەکانم بۆ بگێڕێتەوە !! ئەوەبوو خوای گەورە رۆشنایی چاوەکانی پێ بەخشی‌یەوە . ئەمجار قورەیش ئەیان‌وت : ئەمە سیحری موحەممەدە ..

جا ئەبوجەهل ئەی‌وت : ئایا سەرتان لەمانە و لە شوێن‌کەوتوانیان سوورِ نامێنێ ؟ ئەگەر ئەوەی موحەممەد هێناویەتی چاك و حەق بوایە ئەوانە پێشمان نەئەکەوتن .. ئایا زننیرە بۆ سەر رێگای راست پێشمان ئەکەوێ ؟

ئەبوجەهل داماو بوو وا ئەوەندە خۆی بە ژیر و لێ‌هاتوو ئەزانیی .. نەی‌ئەزانیی تا ئاخرزەمان و تا موسڵمانێك لەسەر زەویی‌دا بمێنێ داوای رەزامەندیی لە خوا ئەکرێ بۆ زننیرە و ، ئەویش بە سووکیی و رسوایی سەر ئەنێتەوە و ، دینەکەی موحەممەدیش ﷺ هەتا ئاخرزەمان بە ملیارەها ئیمان‌دار پەروەردە ئەکات .

یەکێکی تر لەو خوشکە بەرِێزانە ناوی ئوم عونەیس بوو ، کە کەنیزەکێکی نەوەی زوهرە بوو و ، ئەسوەدی کوڕی عەبدیەغووث سزا و ئازاری ئەدا ، کەچیی کۆڵی نەئەدا و ، لەسەر ئیمان‌داریی خۆی بەردەوام بوو .

هەروەها حەمامەی دایکی بیلالیش لە پێناوی خوادا سزا و ئازار ئەدرا .. کەنیزەکێکی نەوەی موئەممەلیش ، کە بەشێکی نەوەی عەدیی کوڕی کەعبن ، موسڵمان بوو بوو و عومەری کوڕی خەططاب سزای ئەویشی ئەدا .. خەریکی لێدانی ئەبوو هەتا ماندوو ئەبوو ، پاشان ئەی‌وت : داوای لێبووردنت لێ ئەکەم ، لەبەر ماندووبوونم دەست‌بەردارت ئەبم !! ئەویش ئەی‌وت : خوایش وەها بە تۆ بکات .

هەروەها نەهدییە و کچەکەشی کەنیزەکی ئافرەتێکی نەوەی عەبدوددار بوون و بەبێ رەحمانە ئەوانیش ئازار ئەدران .

کافرەکانی قورەیش هەندێ لە هاوەڵانیان بە پێستەی وشتر و مانگاوە ئەپێچایەوە و ، پاشان لەبەر گەرمای خۆردا فرێیان ئەدان و ، هەندێکی تریان زرێی ئاسنیان لەبەر ئەکردن و ، پاشان ئەیان‌خستنە ژێر بەردێکی زلە .

ئەو بەستەزمانانەی کە بەندە و کەنیزەك بوون کەسێك نەبوو بەرگرییان لێ بکات ، بەڵام خوای گەورە ئەبوبەکری صدیقی خوا لێی رازیی بێ فریایان خست .. ئەبوبەکری خاوەن ڕێز کە دەستگرۆیی نەداری ئەکرد و ، سیلەی رەحمی بەجێ ئەهێنا و ، باری لێقەوماوی سووك ئەکرد و ، میوانداریی ئەکرد و ، بۆ حەق کۆمەکیی ئەکرد و ، لە سەردەمی نەفامییدا هیچ تاوان و گوناهێکی ئەنجام نەدابوو و ، مرۆڤێکی هێمن و هۆگر بوو و ، دڵی بە لاواز و بەندە کۆیلەکان ئەسووتا ، بەشێکی زۆری پووڵ و سامانەکەی تەرخان کرد بۆ کڕینی بەندە و کەنیزەکەکان و ئازادکردنیان لە پێناوی خوادا ، ئەمەش بەر لەوەی شەریعەتی پاك و بێگەرد هانی موسڵمانان بدا بۆ ئازادکردنی بەندەکان و ، پاداشتی زۆریان بخاتە بەر چاو . ئەوانەی کە ئازادی کردن ئەمانە بوون ، وەك لە پێشەوەش ئاماژەیان بۆ کراوە :

بیلالی کوڕی رەباح و ، ئەبوفوکەیهە و ، عامیری کوڕی فوهەیرە و ، حەمامەی دایکی بیلال و ، ئوم عونەیس و ، زننیرە و ، کەنیزەکەکەی ئەوەی موئەممەل و ، نەهدییە و کچەکەی ئازاد کردن .

ئەوەبوو ئەبوبەکر بەلای ئەو دوو ئافرەتەدا تێئەپەڕی و ، خانمەکەیان گەنمی پێ دابوون بیبەن بیکەن بە ئارد و ئەشیوت : بەخوا هەرگیز ئازادتان ناکەم و ، هەڕەشەی لێ ئەکردن . صدیقیش فەرمووی : ئوم فلان لە سوێنەکەت پەشیمان بەرەوە . وتی : وا پەشیمان بوومەوە ، تۆ خەسارت کردوون ، دە ئازادیان بکە . فەرمووی : هەردووکیان بە چەند ؟ وتی : بەوەندە و بەوەندە . فەرمووی : وا وەرم گرتن ، با ئازاد بن . گەنمەکەی بۆ بگێڕنەوە . وتیان : ئەی ئەبوبەکر ! ئەی گەنمەکە نەکەین بە ئارد و ئەوسا بۆی بگێڕینەوە ؟ فەرمووی : ئەگەر ویستتان وەها بکەن .

ئەم کارەی ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ بۆ ئەوە نەبوو دنیا و بەرژەوەندیەکانی دەست بکەوێ .. بۆ سوپاس و پێزانین و دەستخستنی پایە و پلە نەبوو ، بەڵکو رەزامەندیی خوای پەروەردگاری مەبەست بوو .. رۆژێکیان باوکی پێی وت : کوڕەکەم ! ئەبینم تۆ بەندەگەلێکی لاواز ئازاد ئەکەیت ، خۆزگە پیاوانێکی بەهێزت ئازاد بکردنایە ، هەتا بیانپاراستیتایە و ، لە پشتت بوونایە . ئەبوبەکریش خوا لێی رازیی بێ فەرمووی : بابەگیان ! من ئەمەم بۆ رەزامەندیی

خوا ئەویّت . ئەوەبوو خوای گەورەش دەربارەی کردەوەی جوان و نییەتی پاکی ناوکرۆکی دڵی صدیق قورئانی ناردە خوارەوە ، تا مژدە بەویش و بە هەموو چاکەکاریّکیش بدات و ، چارەنووسی خراپ کارانیش دۆزەخە کە ئەفەرمویّ :

﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ۝٧ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ۝٨ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٩ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ۝١٠ وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ ۝١١ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ۝١٢ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ۝١٣ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ۝١٤ لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ۝١٥ الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ۝١٦ وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى ۝١٧ الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّىٰ ۝١٨ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ ۝١٩ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ۝٢٠ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ۝٢١ ﴾ ( الليل : ٥ ـ ٢١ ) .[١٨٢]

خوای گەورە لە ئەبوبەکریش و لە هاوەڵەکانی تریش رازیی بیّ .

---

[١٨٢] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٤٤ ـ ٣٤٧ .

## بەشی دوانزەهەم
# چەند رووداوێكی گرنگ

**یەكەم : كۆچ كردن بۆ حەبەشە**

سزا و ئازاردانی قورەیش لە ناوەڕاست یان كۆتایی ساڵی چوارەمی هاتنی وەحی‌دا دەستی پێ كرد . سەرەتا ئازاردانەكەی سووك بوو ، بەڵام بەرە بەرە و رۆژ لە دوای رۆژ سەخت‌تر ئەبوو تا كە گەیشتنە ناوەڕاستی ساڵی پێنجەمی هاتنی وەحی ، لە مەككەدا تەنگیان پێ هەڵ چنرا و ، نەیان‌ئەتوانیی لەوە زیاتر دان بە خۆیانا بگرن و ، كەوتنە بیری ئەوەی كە خۆیان لەو سزا سەختە دەرباز بكەن . پێغەمبەری خواش ﷺ توانای نەبوو هاوەڵە بەڕێزە ئازیزەكانی لەو سزا و ئازارە لا بدات ، بۆیە پێیانی فەرموو :

(( لو خَرَجتُم إلى أرض الحبشة ، فإن بها مَلكاً لا يظلم عنده أحدٌ ، وهي أرض صِدقٍ حتى يجعلَ اللهُ لكُم فَرَجاً ممّا أنتُم فيه )) . فەرمووی : خۆزگە كۆچتان بۆ حەبەشە بكردایە ، چونكە پادشایەكی لێ‌یە كە لەلای ئەودا هیچ كەس ستەمی لێ ناكرێ و ، خاكی راستگۆیی‌یە ، تا بەشكوم خوا دەروویەكتان لێ بكاتەوە .

هاوەڵانی ئازیز هەندێكیان بەرەو وڵاتی حەبەشە كەوتنە رێ ، تا لە دەست قورەیشی ستەم‌كار دەرباز بن و ، بە سەربەرزیی خوای خۆیان بپەرستن . ئەمەش یەكەم كۆچ‌كردن بوو لە ئیسلام‌دا ، كە لە مانگی رەجەبی ساڵی پێنجەمی هاتنی وەحی‌دا بوو ، بە پێی ریوایەتی ( الواقدي ) .

یەكەم كەسێ كە كۆچی دەست پێ كرد عوثمانی كوڕی عەففان و روقیەی هاوسەری بوو .. كە هەواڵیان ئەگاتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( صحبهما الله ، إن عثمان أول من هاجر بأهله بعد لوط عليه السلام )) . فەرمووی : خوا یاوەریان بێت . دوای لووط پێغەمبەر سەلامی لێ بێ ، عوثمان یەكەم كەسێكە كە بە خۆی و هاوسەریەوە كۆچی كردووە .

پاشان ئەبوحوذەیفەی كوڕی عوتبەی كوڕی رەبیعە و سەهلەی كچی سوهەیلی كوڕی عەمری هاوسەری ، كە ئەوەبوو لە حەبەشە خوای گەورە كوڕێكی پێ

بەخشین و ناویان نا موحەممەد و ، زوبەیری کوڕی عەووام و ، موصعەبی کوڕی عومەیر و ، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و ، ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومیی و ، ئوم‌سەلەمەی کچی ئەبوئومەییەی کوڕی موغیرەی مەخزوومیی هاوسەری ، کە ئەوەبوو لە حەبەشە خوای گەورە کچێکی پی‌بەخشین و ناویان نا زەینەب و ، عوثمانی کوڕی مەظعوون و ، عامیری کوڕی ڕەبیعەی هاوپەیمانی ئالی خەططاب و ، لەیلای کچی ئەبوحەثمەی هاوسەری و ، ئەبوسەبرەی کوڕی ئەبوڕەهم ، یان ئەبوحاطبی کوڕی عەمر و ، سوهەیلی کوڕی بەیضاء ، کەوتنە ڕێ . بەمە کۆچ‌کەران دە پیاو و چوار ئافرەت بوون . وتووشیانە : پێنج ئافرەت بوون ، ئەویش بە کۆچ‌کردنی ئوم‌کەلثوومی کچی سوهەیلی کوڕی عەمر کە هاوسەری ئەبوسەبرە بوو .

کۆچ‌کەران ، هەندێ بە سواریی و ، هەندێ بە پێ کەوتنە ڕێ ، هەتا گەیشتنە سەر دەریای سوور و ، لەوێ بە نیو دینار کەشتی‌یەکیان بە کرێ گرت تا هەموویان بگەیەنێتە حەبەشە . کە قوڕەیش بەو دەرچوونەیان زانیی کەوتنە شوێنیان ، بەلاّم فریای هیچ کەسیان نەکەوتن .[183]

لەم کاتە زۆر ناسکەدا سوورەتی ( الكهف ) هاتە خوارەوە ، تا وەلاّمی پرسیارەکانی بت‌پەرستان بداتەوە کە خستبوویاننە بەردەم پێغەبەری خوا ﷺ . سوورەتەکە سێ چیرۆکی تێدا بوو تا مۆچیاریی بن بۆ ئەو هەلۆێستە ناهەموارە و ئیمان‌داران دامەزراو بن . یەکەمیان چیرۆکی ( أصحاب الكهف ) بوو تا کۆچ کردن و دەست‌بەردار بوون لە ولاّتێك‌دا کە زالّمان تیایا بەدەسەلاّت بن ، فێری ئیمان‌داران بکات ، تا ئیمانیان سەلامەت بێت .

چیرۆکی دووهەمیش چیرۆکی سەردارمان خضر و سەردارمان موسا پێغەمبەرە سەلامیان لێ بێ ، کە موسلّمان فێر ئەکات کە مەرج نیە هەمیشە کاروبارەکان بە پێی ڕوالّەت بەڕێوە بچن . جا ئەمە ئەوەی ئەبردە دلّی ئیمان‌دارانەوە کە ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کە ئەوان تیای‌دا ئەژین ، پڕیەتی لە حیکمەت و ، ڕۆژێکیش دیت زالّمان دەسەلاّتیان نامێنێ و ، ئیمان‌دارە لاوازەکان ئەبنە خاوەنی دەسەلاّت و ، گەر ئەو زالّمانە نەیەنە ژێر بەیداخی دینی خواوە ڕۆژی ڕەشی خۆیان

---

[183] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٣٤٩ ـ ٣٥٠ . لە ( الرحيق المختوم ) دا باسی دوو کەشتیی بازرگانیی هاتووە . هەروەها ژمارەی پیاوانی بە دوانزە و ئافرەتانی بە چوار باس کردووە . بڕوانە ل ٩٣ .

بە چاو ئـەبینن و ، رۆژێ دێـت ئیمـانداران چـیرۆکی سـومەییەی بەسالاَچـوو و ، بیٚدایك و خوشك و باوك و بـرا ، کـە خـوێنی گەشـی چـوو بـە نـاخی لـمەکەی مەککەدا ، بەوپەڕی سەربەرزییەوە ئەگێڕنەوە .. رۆژێك دێـت عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسعوودی لاواز ئەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی شەرعیی وەها گـەورە کـە لـە مێژوودا دەنگ بداتەوە .

چیرۆکی سێهەمیش چیرۆکی ( ذوالقرنين ) ە ، کە ئەوە ئەباتە دڵی ئیمانداره‌وه ئەم زەوییە پان و پۆڕە ، بەم هەموو ناز و نیعمەتەیـەوە مـوڵکی خوایـە و، هـەر کات ئیمانداران شیاوی هەڵگرتنی دینی خوا بوون کاروباری دنیایان پێ ئەسپێرێ و ، سەرکەوتنیش هەمیشە بۆ حەقـە و ، بـە ئیمـان مـرۆڤ سـەربەرز و بـە کـوفر سەرشۆڕ ئەبێت . هەروەها ئەوە فێری ئیماندار ئـەکات کـە هـاتنی پێغەمبـەران سەلامیان لێ بێ لە هەموو شوێن و کاتێکدا بۆ سەرفرازکردنی بێدەسـەلاَتانە لـە یەئجووج و مەئجووجی سەردەمی خـۆیـان .

هـەروەهـا دوای ئـەوەش سـوورەتی ( الزمر ) هاتە خوارەوە و ، ئامـاژەی بـۆ کۆچ کردن ئەکرد و ، ئەوەشی ئەخستە بەر چاوان کە موڵکی خـوا فراوانـە و ، بـا ئیمانداران ئارام بگرن چونکە پاداشتەکەیان لە ژمارە نایەت :

﴿ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ۝١٠ ﴾ ( الزمر : ١٠ ) .[١٨٤]

بە کۆمەکیی خوا موسڵمانەکان گەیشتنە حەبەشە و لەوێ لـە پـەنای پادشـای ئیمانداردا حەسانەوە .

**دووهەم : موسڵمان بوونی عومەر**

عومەر کوڕی خەططابی ، کـوڕی نوفـەیلی ، کـوڕی عەبـدولعوززای ، کـوڕی ریاحی ، کوڕی عەبدوڵڵای ، کوڕی قەرطـی ، کـوڕی رەزاحـی ، کـوڕی عـەدیی ، کوڕی کەعب ە ، کە کەعب باپیری پێغەمبەری خوایشە ﷺ . دایکی عومەر ناوی حەنتەمەی کچی هاشم ی کوڕی مرغیرەیە .

عومەر خوا لێی رازیی بێ لە سەردەمی نەفامییدا لە هەموو کەسێك خراپتر سزا و ئازاری موسڵمانەکانی ئەدا ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ وای بـۆ ئەچـوو کـە

---

[١٨٤] الرحيق المختوم : ٩٢ ـ ٩٣ .

ئەگەر عومەر یان ئەبوجەهل یەکێکیان موسڵمان بن ، ئەوا تای ترازووی موسڵمانەکان سەنگین ئەبێت و ، ئیسلام زۆر پایەدار ئەبێت ، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە عومەر و ئەبوجەهل لە دژایەتیی ئیسلامدا هاوتای یەك بوون و ، بە موسڵمانبوونی یەکێکیان ئیسلام و موسڵمانان یەکجار باریان سووك ئەبێ . ئەوەبوو عومەر موسڵمان بوو ، بەڵام ئەبوجەهل هەتا دووهەمساڵی کۆچیی ، ڕۆژی جەنگی بەدر هەر دژایەتیی موسڵمانانی کرد ، تا لەوێ بە خەجاڵەتیی و سەرشۆڕیی‌یەوە سەری نایەوە و کۆتایی بە خراپکاریەکانی بەرامبەر بە دینی خوا هات .

جا بە سەرنج‌دانی ئەو ریوایەتانەی کە باسی موسڵمانبوونی عومەر ئەکەن ، ئەوە دەرئەکەوێ کە عومەر ڕاستەوخۆ و خێرا موسڵمان نەبووە ، بەڵکو لە قووڵایی دڵ و دەروونی‌دا بەراوردکردن و زۆرانبازی‌یەك هەبووە ، کە ماوەیەك پێوەی خەریکی سەرنج‌دان و بیرکردنەوە بووە .

عومەر پیاوێکی ژیر و بەسەلیقە بووە ، لە هەمان کات‌دا بەهێز و توورە بووە .. موسڵمانەکان بە دەستیەوە گیریان خواردبوو ، لە هەمان کات‌دا دوو هەستی دژ بە یەك لە ویژدانی‌دا زۆرانیان ئەگرت :

**یەکەم** : پێی خۆش بوو ڕێز لە بەزم و باو و عادەتی باوباپیری بگرێ ، کە لەناو عەرەب‌دا هۆزی قورەیش یەکەم هەڵکەوتوو بوو و ، لەو کۆمەڵەش‌دا عومەر پیاوی پیاوانە بوو ، ئەگەرچیی هێشتا نەچوو بوو بە ساڵ‌دا .. لە پاڵ ئەمەش‌دا خەریکی بەزم و ڕەزمی ڕابواردن و خواردنەوە بوو ..

**دووهەم** : بە چاوی ڕێزەوە تەماشای موسڵمانەکانی ئەکرد ، کە زۆربەیان بەندە و کۆیلە و ئافرەتی بەستەزمان بوون ، چۆن بەو ڕادەیە دان بە خۆیان‌دا ئەگرن و ، لەسەر دین ئەو هەموو سزا و ئازارە قبووڵ ئەکەن .. ئەو خۆی بە پیاوێکی بەهێز و خاوەن توانا دائەنێ ، کەی ئامادەیە لەسەر دینی قورەیش وەها سزا بدرێ ، لە هەمان کات‌دا لە دینی خۆی کەوتبووە شك و گومان : کێ ئەڵێ دینی ئیسلام ڕاست و پاك و بێ‌گەرد نیە ؟ ! کێ ئەڵێ خوا بەو دینە ڕازیی نیە ؟!

بۆ نموونەی ئەوەی کە سەری لە موسڵمانەکان سوڕ ئەما وا ئەوەندە دامەزراون و لەسەر دین کۆڵ نادەن ، ئیبن ئیسحاق لە ئوم عەبدوڵڵای کچی ئەبوحەثمەوە ،

که هاوسەری هاوەڵی ناودار و پایەبەرز عامیری کوڕی رەبیعە بووە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە :

ئێمە خەریك بووین کۆچمان بۆ حەبەشە ئەکرد و ، عامیریش چوو بوو بەدوای پێویستی‌یەکماندا ، ئەوەبوو عومەری کوڕی خەططاب هات و لە نزیکمدا وەستا و، هێشتا هەر موشریکیش بوو . ئەڵێت : عومەر هەمیشە خەریکی سزا و ئازاردانمان بوو ، هات و وتی : ئەڵێی دەر ئەچن ، ئوم عەبدوڵلا ؟ ئەڵێت : وتم : بەڵێ ، بەخوا ئەمانەوێ بە مولکی خوادا بڕۆین و لێرە دەرچین . سزاتان داین و ، تەنگتان پێمان هەڵ چنی ، تا بەڵکو خوا دەروویەکمان لێ بکاتەوە و سەرفراز بین . وتی : خوا یاوەرتان بێت ! ئەڵێت : هەستم بە نەرمیی و سۆزێك کرد پێیەوە کە لەوەو پێش نەمدیی بوو . پاشان رۆیشت و ، وا ئەزانم کۆچ کردنی ئێمە خەمباری کرد ..

ئەڵێت : عامیر هاتەوە و وتم : ئەبوعەبدوڵلا ! ئەگەر کەمێك لەمەو پێش عومەرت بدیایە چۆن بەزەیی پیامانە ئەهاتەوە و بۆمان خەمبار بوو . وتی : ئایا بە تەما هەیت موسڵمان ببێ ؟ وتی : بەڵی . وتی : ئەوەی تۆ دیوتە ، هەتا کەرەکەی خەططاب موسڵمان نەبێ ، ئەو موسڵمان نابێ !! ئەوەندە عومەری بەلاوە دڵڕەق و کەللە شەق بوو ..[١٨٥]

عومەر لە ناکاودا موسڵمان نەبوو ، بەڵکو ماوەیەك خەریکی بیرکردنەوە بوو .. قورئانیش بە رێك و پێکیی و ئیعجاز و شێوازە ناوازەکەیەوە و بە قوڵیی مانا و مەبەستەکانیەوە یەکجار کاریگەریی لەسەر موسڵمان بوونی عومەر بوو ، چونکە عومەریش خاوەنی چێژێکی ئەدەبیی و شارەزایەکی چاکی زمانی عەرەبیی بوو ، تا ئەوەبوو بەلاغەتی قورئان کەمەندکێشی کرد .

ئیمام ئەحمەد لە ( المسند ) دا لە عومەرەوە ریوایەتی کردووە کە فەرموویە : بەر لەوەی موسڵمان ببم لە ماڵ هاتمە دەرەوە تا رێ بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگرم ، ئەبینم پێشم کەوتووە و تەشریفی بردۆتە مزگەوت ( کەعبە ) و ، لە دوایەوە وەستام و ، ئەویش دەستی بە خوێندنی سوورەتی ( الحاقة ) کرد و ، منیش سەرم لە دانانی قورئان سوڕ ئەما !! ( لە دڵی خۆمدا ) وتم : شاعیرە ، وەك قوڕەیش ئەیوت . کەچیی پێغەمبەر ﷺ ئەمەی خوێند :

---

[١٨٥] الرحيق المختوم : ١٠٢ ، السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٥١ ـ ٣٥٢ .

﴿ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ .
وتم : کاهینە ، ئەوەی لە دڵمدا بوو زانیی .. کەچیی فەرمووی :
﴿ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾ هەتا گەیشتە کۆتایی سوورەتەکە .
عومەر ئەفەرموێ : بە تەواویی ئیسلام کەوتە دڵمەوە .[١٨٦]

هەروەها هەندێ ریوایەت باس لەوە ئەکەن کە رۆژێکیان عومەر دێت بۆ لای هاوەڵانی تا پێکەوە دانیشن ، کەچیی کەسیانی دەست ناکەوێ ، ئەفەرموێ : با بچم بۆ لای فلانە عەرەق فرۆش بەشکو عەرەقی بەلاوە هەبێ و بیخۆمەوە ، کەچیی بەلایەوە نابێ . پاشان ئەفەرموێ : با بچم بۆ کەعبە و حەوت جار طەوافی کەعبە بکەم . کە رۆیشت بۆ طەواف کردن ، ئەبینێ وا پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ وەستاوە و نوێژ ئەکات . ئەفەرموێ : با ئەمشەو گوێ لە موحەممەد بگرم بزانم چیی ئەڵێت . چوو لە پشتی پەردەی کەعبەوە خۆی حەشار دا و ، لە پشت پەردەکەوە ئەهات بەرێوە تا لەلای قیبلەوە نزیکی پێغەمبەر ﷺ کەوتەوە و ، تەنها پەردەکەی کەعبە داپۆشیی بوو .

ئەفەرموێ : کاتێك کە قورئانم بیست دڵم نەرم بوو و ، دەستم بە گریان کرد و موسڵمان بووم . هەروا لە شوێنی خۆمدا وەستام هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد و ، تەشریفی برد .[١٨٧]

هەروەها شێوەیەکی تری موسڵمانبوونی عومەر لە پێشەوەی ئەم کتێبەدا باس کراوە ..

دەربارەی ساڵی موسڵمانبوونی عومەر ، ریوایەتەکان جیاوازییان هەیە ، ئیبن ئیسحاق ئەڵێ : دوای کۆچی یەکەم بۆ حەبەشە موسڵمان بووە ، بەم پێیە ساڵی پێنجەمی وەحییە .. وتراویشە لە مانگی ذولحەججەی ساڵی شەشەمدا بووە .[١٨٨]

کاتێك کە عومەر موسڵمان بوو ، فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا ئێمە ئەگەر بمرین و ، گەر بمێنین لەسەر حەق نین ؟ فەرمووی : (( بلى ، والذي نفسي بيده إنكم على الحق إن متم ، وإن حييتم )) . فەرمووی : بەڵێ ، بەو خوایەی

---

[١٨٦] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٥٢ ، نقلاً عن تفسير إبن كثير والبغوي .
[١٨٧] السيرة النبوية لإبن هشام : ١ / ٣٤٧ .
[١٨٨] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٥١ . شایانی باسە کە عومەر بە سێ رۆژ دوای موسڵمان بوونی حەمزە موسڵمان بووە . ( الرحيق : ١٠٦ ) .

گیانـمی بە دەستە ئێوە ئەگەر بـمرن و ، گەر بـمێنن ، لەسەر حەقن . منیش وتم: دەی ئیتر شاردنەوەی بۆ چی‌یە ، ئەی پێغەمبەری خوا ، بۆچ دینەکەمان بشارینەوە کە ئێمە لەسەر حەقین و ، ئەوان لەسەر ناحەقن ؟! فـەرمووی : (( یا عمر إنا قلیل ، قد رأیت ما لقینا )) . فـەرمووی : عومەر ئێمە کەمین ، خـۆ دیـت چـیمان بەسـەر هات .

عومەر فەرمووی : بەو خوایەی حەقی پێتا رەوانە کردووە هەر کۆڕێك بۆ کـوفر تیایا دانیشتبم ، ئەبێ بۆ ئیمانیش تیایا دابنیشم .

پاشان پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانەکان بە دوو ریز هاتنە دەرەوە کـە عومـەر لـە ریزێکیان‌دا و ، حەمزەش لە ریزەکەی تردا بوون ، هەتا گەیشتنە مزگەوتی حـەرام و قورەیشیش سەیری ئەکردن و ، بە جارێ پشتی شکا بوو . ئەو رۆژە پێغەمبـەری خوا ﷺ عومەری ناو نا ( الفاروق ) چونکە حەق و ناحەقی لێك جوێ کردنەوە ..

ئەگێڕنەوە کە کاتێ عومەر موسڵمان ئەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ ( الله أکبر ) بـە دەنگێکی وەها بەرز ئەفەرموێت کە ئەو هاوەڵانەی کە لە دەوربەری کەعبەدا بوون زانی‌یان کە عومەر موسـڵمان بـووە ، دوای ئـەویش موسـڵمانەکان یـەکجار ( الله أکبر ) یان دووبارە کردەوە و هـەمرو دانیشـتوانی مەککـە زانی‌یـان کـە عومـەر موسڵمان بووە .

بە موسڵمانبوونی عومەر خـوا لێـی رازیـی بـێ موسـڵمانەکان و دینەکـەیان پایەدار بوون ، بە رادەیـەك کـە ئـیتر هـاوەڵان نەئەترسـان و ئـەیان‌تـوانیی بێنـە کەعبەوە و بە دەوری‌دا طەواف بکەن و ، نوێژی تیا بکەن .

ئیمام بوخاریی لە صەحیحەکەی‌دا لە ئیبن مەسعوودەوە ریوایـەتی کـردووە کـە وتوویە : لەو رۆژەوە کە عومەری کوڕی خەططاب موسڵمان بوو ئێمەش سـەربەرز و بە عیززەت بووین .

هەروەها زیادی بەککائییش لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : موسڵمانبوونی عومەر فەتح و ، کۆچ کردنی سەرکەوتن و ، بوونی بە ئەمیر رەحمەت بوو ، ئێمە (ی موسڵمانە لاوازەکان ) نـەمان ئـەوێرا لـە کەعبـەدا نوێژ بکەین هەتا عومەر موسڵمان بوو ، جا کە ئەو موسڵمان بوو چوو بـە گـژیانا هەتا ماوەیان دا ئەویش و ئێمەش لە کەعبەدا نوێژ بکەین .[١٨٩]

[١٨٩] السیرة النبویة لأبـي شهبة : ١ / ٣٥٦ .

کەعومەر موسڵمانبوو ، بیری کردەوە کێ لە هەموان زیاتر لەناو دانیشتوانی مەککەدا دژایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکات ، سەرنجی دا ئەبوجەهل یەکەم کەسێکی داخ لە دڵە .. ئەفەرموێ : کە ڕۆژم لێ بوویەوە هاتم تەقەم لە دەرگاکەی دا ، ئەفەرموێ : ئەبوجەهل هاتە دەرەوە لام و وتی : یاخوا بەخێر بێیت خوشکەزام [١٩٠] ، بۆچی هاتوویت ؟ فەرمووی : هاتووم تا هەواڵت بدەمێ کە من ئیمانم بە خوا و بە موحەممەدی پێغەمبەری هێناوە و ، تەصدیقی ئەوەشم کردووە کە هێناویەتی . ئەفەرموێ : دەرگاکەی لە ڕووم دا داخست و وتی : خوا خۆیشت و ئەوەش کە هێناوتە بەخێر نەهێنێ . [١٩١]

هەروەها ئیبن جەوزیی ئەوەی باس کردووە کە عومەر خوا لێی رازیی بێ فەرموویە : هەر پیاوێك کە موسڵمان ئەبوو چەند پیاوێك دوای ئەکەوتن و ، دەستیان بە لێدانی ئەکرد و ئەویش لەوانی ئەدا .. منیش کە موسڵمان بووم هاتم بۆ لای خاڵم ، کە عاص ی کوڕی هاشم بووە ، ئاگادارم کرد کە موسڵمان بووم ، ئەویش یەکسەر چووە ژوورەوە .. [١٩٢]

ئیبن ئیسحاقیش لە ئیبن عومەرەوە خوا لێیان رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : کاتێ کە عومەر خوا لێی رازیی بێ موسڵمان بوو فەرمووی : چ قوڕەیشییەك لە هەموو کەس زیاتر قسە ئەگەیەنێت ؟ پێیان وت : جەمیلی کوڕی مەعمەری جومەحیی . چوو بۆ لای . عەبدوڵلا ئەڵێت : من کە منداڵێکی وەها بووم کە هەرچیم بدیایە لێی تێ ئەگەیشتم ، شوێن باوکم کەوتم تا بزانم چیی ئەکات ، هات تا گەیشتە لای و پێی فەرموو : ئەی جەمیل ! ئایا زانیوتە من موسڵمان بووم و چوومەتە سەر دینی موحەممەد ﷺ ؟ ئەڵێ : دە بەخوا ! لێی دووبارە نەکردەوە ، خێرا هەستا و عەباکەی بەدوای خۆیدا ڕائەکێشا و عومەریش بەدوایدا و ، منیش بەدوای عومەردا ، هەتا گەیشتە دەرگای مزگەوت و بە هەموو هێزێکیەوە هاواری کرد : ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! ـ قوڕەیشیش بە دەوری کەعبەدا کۆڕیان بەستبوو ـ کوڕی خەططاب لە دین وەرگەڕاوە . ئەڵێ :

---

[١٩٠] دایکی عومەر ، کە حەنتەمەی کچی هاشمی کوڕی موغیرە بووە ، ئامۆزای ئەبوجەهلی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرە بووە ، نەك خوشکی بێت ، وەك ئیبن ئیسحاق لە ( السيرة النبوية : ١ / ٣٥٠ ) دا دەری بڕیوە . بەڵام لەناو عەرەبدا ئامۆزاش بە خوشك و کوڕیشی بە خوشکەزا ناو ئەبەن .

[١٩١] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٥٧ والرحيق المختوم : ١٠٥ .

[١٩٢] الرحيق المختوم : ١٠٥ .

عومەریش لە دوایەوە ئەیفەرموو : درۆ ئەکات ، من موسڵمان بووم و شاهێدییم داوە کە جگە لە زاتی ( الله ) هیچ خوایەکی تر نیە و ، موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە . بە جارێ بۆی هەڵسانەوە و دەستیان بە لێدانی یەکتریی کرد هەتا خۆر گەیشتە سەر سەریان . ئەڵێ : عومەر ماندوو بوو و دانیشت و ، ئەوانیش هاتنە سەر سەری و ، ئەویش ئەیفەرموو : چیتان پێخۆشە بیکەن ، سوێند بە خوا ئەخۆم ! ئەگەر سێصەد پیاو ببوینایە ئەوا یا مەککەمان بۆتان چۆڵ ئەکرد ، یان ئێوە بۆ ئێمەتان چۆڵ ئەکرد . ( هەر وایش بوو ، سوپای بەدر کە لە سێصەد و ئەوەندە پیاو پێك هاتبوو سوپای قورەیشی دا بە زەوییدا ) .

ئەڵێ : کاتێك کە لەم هەڵوێستەدا بوون ریش سپییەکی قورەیشیی ، کە دەستە بەرگێکی یەمەنیی و کراسێکی خەت خەتی لەبەردا بوو هات و ، لە سەریان وەستا و وتی : ئەوە چیتانە ؟ وتیان : عومەر لە دین وەرگەڕاوە . وتی : بەسیە ! پیاوێك کارێکی بۆ خۆی هەڵ بژاردووە ، چیتان ئەوێ لێی ؟ ئایا نەوەی عەدیی لەم خزمەیان دەست بەردار ئەبن و بەرگریی لێ ناکەن ؟ واز لە پیاوەکە بهێنن . ئەڵێ : دە بەخوا ! ئەت وت کراسن و لەبەری داماڵران . عەبدوڵلا ئەڵێ : دوای ئەوەی کە باوکم کۆچی بۆ مەدینە کرد پێم وت : بابەگیان ! ئەو پیاوە کێ بوو کە ئەو رۆژەی موسڵمان بووبووی لە مەککە ئەو خەڵکەی لێ دوور خستیتەوە، کە خەریك بوون لێیان ئەدایت ؟ فەرمووی : کوڕم ! ئەوە عاص ی کوڕی وائیلی سەهمیی بوو ..

وهذا إسناد جيد قوي ، كذا في البداية ( ٣ / ٨٢ ) .

بوخارییش ( ١ / ٥٤٥ ) لە ئیبن عومەرەوە خوا لێیان رازیی بێ ریوایەت ئەکات کە وتوویە : لە کاتێکدا کە عومەر لە ماڵەوە بوو و ئەترسا ، عاص ی کوڕی وائیلی سەهمیی ، باوکی عەمر ، کە دەستە بەرگێکی یەمەنیی و کراسێکی بە ئاوریشم دەورەگیراوی لەبەردا بوون ، کە لە نەوەی سەهمی هاوپەیمانی سەردەمی نەفامییمان بوو ، پێی وت : ئەوە چیتە ؟ عومەر فەرمووی : قەومەکەت وایان گەیاندووە کە لەسەر ئەوەی موسڵمان بووم ئەمکوژن . وتی : کەس بۆی نیە دەستت بۆ بەرێ . دوای ئەوەی کە وای وت ترسم نەما . عاص لە ماڵ دەرچوو و تووشی خەڵکەکە هات کە پڕ بە پڕی چەمەکە ئەبوون ، وتی : نیازی کوێتان هەیە ؟

وتیان : ئەو کوڕی خەططابەمان ئەوێ کە لە دین وەرگەڕاوە . وتی : کەس بۆی نیە دەستی بۆ بەرێ . ئیتر خەڵکەکە گەڕانەوە .[١٩٣]

**سێهەم : نووسراوە ستەم کارانەکە**

ئەبوطالیب لە فڕوفێڵی قوڕەیش ئەترسا .. موحەممەدی برازای کۆڵ نادات و، قوڕەیشیش لەسەر بەرگریی لە دینی خۆیان سوورن . بەڵێ حەمزە و عومەر و هی تریش موسڵمان بوون ، ئەی ئەگەر بتپەرستێك هەلی بە دەست هێنا و دەستێکی لە موحەممەدی برازای وەشاند ، ئەو کاتە چیی ئەکرێت ؟ بە تایبەت دوای ئەوەی کە قوڕەیش ئامادە بوون عیمارەی کوڕی وەلیدی بدەنێ و ئەویش موحەممەدیان بداتێ و بیکوژن .. کەواتە کوشتنیان بە لاوە ئاساییە ..

ئەبوطالیب پێکابووی .. لە ڕاستییشدا لەسەر کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاشکرا خۆیان یەکلایی کردبوویەوە . هەتا قورئانی پیرۆزیش ئاماژە بەو بڕیارەیان ئەدا کە نیازی کوشتنی خۆشەویستیان ﷺ کردبوو ، کە ئەفەرموێ :

﴿ أَمْ أَبْرَمُوٓاْ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴾ ( الزخرف : ٧٩ ) .

ئەبوطالیب وای بە چاك زانیی تەگبیرێك بۆ موحەممەدی برازای بکات ، تا کار لە کار نەترازاوە و قوڕەیش دەستێکیان لێ نەوەشاندووە . بۆ ئەمە خزمەکانی لە نەوەی هاشم و نەوەی موطەللیبی جووتە کوڕی عەبدمەنافی کۆکردنەوە و[١٩٤] ، داوای لێ کردن کە موحەممەدی خزمیان بپارێزن . پیاوانی هەردوو نەوەکە ، بە موسڵمان و بە کافریانەوە بە گوێیان کرد و بەڵێنیان دا کە بیپارێزن جگە لە ئەبولەهەب ، لێیان جوێ بوویەوە و ، پاڵی دا بە قوڕەیشەوە ..[١٩٥]

قوڕەیش سەرنجیان دا کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبوون دان و ، دوای موسڵمانبوونی حەمزە و عومەریش خوا لێیان ڕازیی بێ ، موسڵمانەکان یەکجار ورەیان بەرز بۆتەوە و ، ئەوانەشیان کە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە ڕێیان لە وڵاتێکی پڕ لە ئەمن و ئەمان و پادشایەکی دادپەروەر کەوت ،

---

[١٩٣] شرح حياة الصحابة : ١ / ٤٧٠ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ١/ ٣٥٧ ـ ٣٥٨ ، الرحيق المختوم : ١٠٥ .

[١٩٤] لە پێشەوە باسمان کرد کە عەبدمەناف چوار کوڕی هەبوون کە دوانەکەی تریان عەبدشەمس و نەوفەل بوون . بەڵام نەوەی موطەللیب زیاتر دۆستی نەوەی هاشم بوون .

[١٩٥] السيرة النبوية لإبن هشام : ١ / ٢٦٩

که به جوانیی بەخێرهاتنیان لێ کرا و ڕێزیان لێ گیرا و ، وا ئیسلام لەناو هۆزەکان دا پەرە ئەسێنێ .

بۆ ئەمە بە یەك دەنگیی بڕیاریان هاتە سەر ئەوە کە موحەممەدی ئازیز ﷺ بکوژن ، بەڵام کە دییان وا ئەبوطالیب نەوەی هاشم و نەوەی موطەللیبی یەك پێ گرتن تا بە دڵ و بە گیان بەرگریی لێ بکەن ، دەستیان لە کوشتنی سارد بوویەوە ، چونکە ئەگەر ئەوان موحەممەد بکوژن ئەوا خزمەکانی کە بەڵێنیان بە ئەبوطالیب داوە ئەوەندەیان لێ ئەکوژنەوە کە شیوی مەککە بە خوێن پڕ ببێتەوە ، هەر لەوانەیە ریشەیان دەربهێنین .. بۆیە کەوتنە بیرکردنەوە تا کارێکی تر ئەنجام بدەن کە وەك کوشتن تاوانبار نەبن ، بەڵام پشتی موسڵمانەکان و دینەکەیان بشکێنێ .

بۆ ئەمە لە شیوی موحەصصەب کۆبوونەوە و بڕیاریان دا و سوێندیان خوارد کە دژی نەوەی هاشم و نەوەی موطەللیب بووەستن ، بەوەی کە نە ژن و ژنخوازییان لەگەڵدا بکەن ، نە کڕیین و فرۆشتن ، نە هەڵس و کەوت ، نە تێکەڵاوییان نەکەن و ، نەچنەماڵیان و ، قسەیان لەگەڵدا نەکەن هەتا پێغەمبەری خوایان ﷺ بدەن بە دەستەوە تا بیکوژن . ئەمەیان لە شێوەی بەڵگەنامەیەكدا نووسیی کە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ نەوەی هاشمدا ڕێك نەکەون و ، بەزەییان پیایانا نەیەتەوە ، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ تەسلیم نەکەن . ئەم نووسراوە بە دەستی بەغیضی کوڕی عامیری کوڕی هاشم نووسرا و ، پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای لێ کرد و دەستی وشك بوو . قوڕەیش بۆ ئەوەی ئەم بڕیارەیان سەر بگرێ و کەس نەوێرێ لە دژی بوەستێ لەناو کەعبەدا هەڵیان واسیی ، ئەمەش لە سەرەتای مانگی موحەڕڕەمی ساڵی حەوتەمی پێغەمبەرایەتییدا ، کە هەر لەو شەوەدا نەوەی هاشم و نەوەی موطەللیب ، بە ئیماندار و بە کافریانەوە ـ جگە لە ئەبولەهەب ـ جیا بوونەوە و لە شیوی ئەبوطالیبدا بەند کران و لە دانیشترانی مەککە دابڕان .[١٩٦]

دابڕان و گەمارووی قوڕەیش بۆ موسڵمانەکان درێژەی کێشا ، بە ڕادەیەك کە خۆراك و کەل و پەلیان لێ بڕا ، چونکە هەر خۆراکێك ئەهاتە ناو شاری مەککەوە، خێرا بتپەرستە دەوڵەمەندەکان تەکانیان ئەدا و ئەیانکڕیی .. موسڵمانەکان بە یەکجاریی تەنگیان پێ هەڵ چنرا ، بە ڕادەیەك کە ناچار بوون پەنا بەرنە بەر

---

[١٩٦] الرحيق المختوم : ١١٠ والسيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٥٩ .

خواردنی گەڵاّ و پێستە و ، لەو دیوی شیوەکەوە دەنگی ژنان و منداڵانیان ئەهات کە لە برسانا ئەکرووزانەوە .. ئیتر مەگەر سا شتێکیان بە نهێنیی پێ بگەیشتایە و ، تەنها لە مانگەکانی حەرامدا مەگەر لە شیوەکە دەرچوونایە بۆ شت کڕین .. جاری وایش ئەبوو کە کاروانێك لە دوورەوە ئەهات ، هەوڵیان ئەدا بەر لەوەی بگاتە ناو شاری مەککە دەستیان بیگاتێ و شتێکی لێ بکڕن ، بەڵاّم هەرکام لە خاوەنانی کاروانەکە ئەگەر خەڵکی مەککە بوایە ، کەل و پەلەکەی لەسەر موسڵمانەکان ئەوەندە گران ئەکرد تا توانایان نەبێت بیکڕن ..[197]

ماوەی دوو سێ ساڵ بەم شێوەیە مانەوە ، هەتا بە تەواویی تەنگیان پێ هەڵ چنرا ، چونکە مەگەر لە خزمێکەوە شتێکیان پێ بگەیشتایە ..

یەکێك لەوانەی کە دەستی یارمەتیی بۆیان درێژ ئەکرد حەکیمی کوڕی حەزام بوو کە برازای خاتوو خەدیجە بوو خوا لێی ڕازیی بێ ، هەروەها هیشامی کوڕی عەمری عامرییش یارمەتیی ئەدان کە لە هەمووان زیاتر دەستگرۆیی نەوەی هاشمی ئەکرد ، چونکە لە دایکیەوە برازای نەضلەی کوڕی هاشمی کوڕی عەبد مەناف بوو . بەم بۆنەوە هیشام سیلەی ڕەحمی لەگەڵ نەوەی هاشمدا بە جێ ئەهێنا و یارمەتیی ئەدان . ئەمیش خۆی خاوەنی پایە و پلە بوو لەناو خزمەکانیدا .. هەموو جارێك بە شەودا وشترێکی لە خۆراك بار ئەکرد و ئەی هێنایە دەمی ئەو شیوەی کە نەوەی هاشم و نەوەی موطەللیبی تێدا گەماروو درابوون ، کە ئەگەیشتە دەمی شیوەکە ڕەشووی وشترەکەی دائەماڵی و ، ئەیدا بە لاتەنیشتی وشترەکەدا ، تا بە خۆراکەکەوە بەرەو شیوەکە دەرچێ و گەنم و دانەوێڵەکە بگاتە دەست خزمەکانی .

ئەوەبوو جارێکیشیان حەکیمی کوڕی حەزام لەگەڵ غولامێکیدا کە گەنمی دابوو بە کۆڵیا هات و ئەیویست بیبا بۆ خەدیجەی پووری ، خوا لێیان ڕازیی بێ ، کە ئەویش لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە شیوەکەدا بوو . لەو کاتەدا حەکیم تووشی ئەبوجەهل هات و کەوتە دوایان و ، ئەیوت : ئەوە ئەتەوێ خۆراك بەری بۆ نەوەی هاشم ؟! بەخوا ناهێڵم بە خۆت و خۆراکەکەتەوە لە شوێنی خۆتا بجووڵێی هەتا لە مەککەدا ئابڕووت ئەبەم . خوای گەورە وای ڕێك خست لەو کاتەدا ئەبولبوختەریی کوڕی هیشامی کوڕی حاریثی کوڕی ئەسەد هات و لە ئەبوجەهلی پرسیی : ئەوە

---

[197] الرحيق المختوم : ١١١ .

چیتانه ؟! وتی : خواردەمەنیی ئەبا بۆ نەوەی هاشم !! ئەبولبوختەریی پێی وت : ئەوە خواردەمەنی‌یەکی پووری بووە بەلایەوە داوای کردووە کە بۆی بنێرێت ، ئایا قەدەغەی ئەکەی خواردەمەنیی خۆیشی بۆ بنێرێت ؟ ڕێی کابرا بەر دە . ئەبوجەهل کۆڵی نەدا هەتا دەستیان دایە یەخەی یەکتریی .. ئەوەبوو ئەبولبوختەریی دەستی دایە ئێسقانی چەناگەی وشترێك و دای بە سەری ئەبوجەهل دا و شکاندی و ، بە توندییش دای بە زەوییدا و ، حەمزەی کوڕی عەبدلموطەللیب یش لەو نزیکانەدا وەستا بوو و چاویشی لێ بوو و ، ئەوانیش پێیان ناخۆش بوو ئەم هەواڵەیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بگات و ، دەست بەسەر دڵیانا بهێنن . لەگەڵ ئەم بارودۆخەش‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ وچانی بۆ نەبوو ، بە شەو و بە ڕۆژ ، خزمەکانی و قەومەکەی ، بە نهێنیی و بە ئاشکرا ، بێ‌ئەوەی لە کەس بترسێ ، بانگ ئەکردن بۆ لای خوا .[198]

لەم بارودۆخە نالەبارەدا موسڵمانەکان ئەژیان .. نەك تەنها موسڵمانەکان ، بەڵکو ئەوانەی نەوەی هاشم و موطەللیب‌یش کە موسڵمان نەبووبوون و لەسەر کوفر مابوونەوە ، لەگەڵ خزمە موسڵمانەکانیان ئەو برسێتیی و نارەحەتی‌یەیان چەشت . جا نەك هەر موسڵمانەکان کۆڵیان نەدا و پەشیمان نەبوونەوە ، بەڵکو ئەوانەش کە موسڵمان نەبووبوون و ، لەبەر خزمایەتیی پشت‌گیریی پێغەمبەریان ئەکرد ، ئەوانەش مەردانە شانیان دایە ژێر مەینەت و ، نە کۆڵیان دا و ، نە تەسلیمی قوڕەیش بوونەوە .. ئەمە ئەوپەڕی جوامێری‌یە کە کابرا موسڵمانیش نەبووبێ و ، ئەوە هەڵوێستی پیاوانەی بێت ..

ئەمڕۆ ئێمەی موسڵمان ژمارەمان زۆرە ، بەڵام پیاوی وەك کافرانی نەوەی هاشم و موطەللیب‌مان یەکجار کەمە ، چ جای وەك موسڵمانان .

ئەبوطالیبی ریش سپیی ، نەك هەر دامەزراو و کۆڵنەدەر بوو ، بەڵکو هەمیشە لە خەمی پێغەمبەری خوادا بوو ﷺ . ئەترسا شەو بێنە سەری و بی‌کوژن .. بۆیە کە خەڵکیی بیان‌ویستایە بخەون ، فەرمانی ئەدا کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر نوێنی خۆی بخەوێ ، تا ئەوەی نیازی خراپی ببوایە چاوی لێ بوایە ، پاشان کە خەڵك ئەخەوت ، فەرمانی ئەدا یەکێك لە کوڕەکانی ، یان براکانی ، یان ئامۆزاکانی

---

[198] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٦٠ .

بچن لەسەر نوێنەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بخەوێ و ، ئەویش بچێت لەسەر نوێنەکەی ئەو کەسەیان بخەوێ .[١٩٩]

**چوارەم : گەڕانەوەی کۆچ کەرانی حەبەشە**

ئەوەبوو دوای دەرچوونی کۆچ‌کەران بەرەو حەبەشە ، حەمزە و عومەر خوا لێیان ڕازیی بێ موسڵمان بوون .. تای ترازووی موسڵمانەکان سەنگین بوو .. دینی ئیسلام چووە قۆناغێکی بەهێزترەوە .. ئەوەبوو موسڵمانەکان ـ وەك لە پێشەوە باس کرا ـ بەبێ ترس ئەچوونە کەعبەوە و نوێژیان بەجێ ئەهێنا .. تۆ بڵێ جۆرە کرانەوەیەك لە نێوان موسڵمانەکان و قوڕەیش‌دا پەیدا بوو ، کەچیی زۆری نەخایاند .. قوڕەیش سەرنجی دا ئەم هێور بوونەوەیە ئەبێتە مایەی زۆربوونی ئیمان داران و پەرەسەندنی دینەکەیان ، بۆیە قوڕەیش چاوی پەڕینە تەوقەسەری و ، وەك جاران دەستی دایەوە سزادان و ناڕەحەت‌کردنی ئیمان‌داران .

جا ئەو ڕێك کەوتن و ئاشتی‌یە کاتی‌یە بووە دەنگ و باسێکی گەورە و گەیشتە لای کۆچ‌کەرانی حەبەشە .. ئەوانیش خۆیان بە بۆنەی غەریبیی و دووری‌یان لە نیشتمانەوە لە خوایەکیان ئەویست هەلیان بۆ هەڵ کەوێ و بگەڕێنەوە . لە لایەکی تریشەوە ئاژاوەیەك دژی نەجاشیی پادشای حەبەشە بەرپا بوو کە خەریك بوو لە ناوی بەرن . جا موسڵمانەکان لەوە ئەترسان ئەم پادشایە ، کە دۆستی ئەوانە و ڕێزیان لێ ئەگرێ ، بە دەستی نەیارانی لەناو بچێ و ، پادشایەك بێتە جێی کە بەو چاوەوە تەماشای ئەمان نەکات و شوێنیان پێ لێژ ببێ ، یان دەریان بکات .

بە بۆنەی ئەم خاڵانەی سەرەوە ئەو غەریبانەی وڵاتی حەبەشە وایان بە چاك زانیی کە بگەڕێنەوە بۆ مەککە . بەڵام کە گەیشتن بۆیان دەرکەوت کە ئەوەی لەوێ بیستبوویان وا نەبوو و ، قوڕەیش لە جاران زیاتر ئازاری ئیمان‌داران ئەدات . ئەوەبوو هەندێکیان بە نهێنیی چوونە مەککەوە و ، هەندێکیشیان لە پەنای هەندێ خزمیان‌دا چوونە ناو شارەوە و ، هەندێکی تریشیان چۆن هاتبۆوە وەهاش بە دوای خۆی‌دا گەڕایەوە بۆ حەبەشە . ئەم گەڕانەوەیە ، یان لە مانگی شەووالی ساڵی پێنجەم ، یان لە ساڵی شەشەمی هاتنی وەحی‌دا بوو .

---

[١٩٩] الرحيق المختوم : ١١١ .

جا یەکێ لەوانەی کە قوڕەیشی‌یەکان پەنایان دا عوثمانی کوڕی مەظعوون بوو خوا لێی رازیی بێ ، بەڵام کە دیتی وا ئیمان‌داران لەبەر بێ‌کەسی‌یان سزا ئەدرێن ، ئەویش پەناکەی گێڕایەوە بۆ وەلید ، وەك لە پێشەوە بە درێژە باس کراوە .

یەکێکی تر لەوانەی کە پەنای درا ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەد بوو خوا لێی رازیی بێ . ئەوەبوو چووە پەنای ئەبوطالیبی خاڵیەوە . کۆمەڵێ لە خزمانی باوکی لە نەوەی مەخزووم ئەم پەنادانەی ئەبوطالیبیان پێ ناخۆش بوو ، بۆیە چوونە سەری و وتیان : ئەبوطالیب ! تۆ موحەممەدی برازاتت خستۆتە پەنای خۆتەوە و ئەی‌پارێزی ، ئەی چیت داوە لەم خزمەی ئێمە لێمانی ئەپارێزی؟ وتی: ئەو خوشکەزامە و داوای پەنای لێ کردووم ، جا ئەگەر خوشکەزاکەم نەپارێزم ئەوا برازاکەشم ناپارێزم . لەو کاتەدا ئەبولەهەب ئامادە بوو ، کە قسەی پیاوانی نەوەی مەخزوومی بیست ـ ئەگەرچیی دۆستی ئەوان و دوژمنی موسڵمانان بوو ـ زۆر تووڕە بوو و وتی : ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ! بەخوا دەست‌درێژیی زۆر ئەکەنە سەر ریش سپی‌یەکە ، واتە ئەبوطالیب ، هەروا خەریکن لە نێوان خزمەکانیا تەپ ئەکوتنە سەری !! بەخوا یان دەست کۆتا ئەبن لێی ، یان ئەبینە پاڵپشتی هەتا بە ئاواتی خۆی بگات !! وتیان : باوکی عوتبە ! هەر شتێك تۆ پێت ناخۆش بێ وازی لێ دێنین . لەبەر ئەوەی کە ئەبولەهەب دۆست و کۆمەکی ئەوان بوو دژی پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان خۆش نەبوو دڵی بشکێنن . کە ئەبوطالیب ئەمەی لە ئەبولەهەبی برای بیست کەوتە تەماعی ئەوەوە کە بەشکو دڵی نەرم بووبێت و ، ئەویش ببێتە کۆمەك و پارێزگاریی پێغەمبەری خوا ﷺ . بۆ ئەمە قەصیدەیەکی بۆ ئەبولەهەب هۆنی‌یەوە کە تیایا هەڵی ئەنا تا کۆمەکیی لێ بکا و ، ببێتە پارێزگار بۆ پێغەمبەر ، کە ئەمە سەرەتاکەیەتی :

إنَّ امرءاً أبوعتيبة عمه    لفي روضة ما إن يسام الْمَظالما

بەڵام لەگەڵ ئەمەش‌دا دڵی ئەبولەهەب نەرم نەبوو و ، بە داوای برا گەورە ریش سپی‌یەکەیەوە نەهات و ، بە دوای سەرگەردانیی قوڕەیش‌دا رۆیشت .[٢٠٠]

**پێنجەم : کۆچی دووهەمی حەبەشە**

لە پێشەوە باسی ئەوە کرا کە دەنگ و باسێکی هەڵە بە موسڵمانە کۆچ کردووەکان بۆ حەبەشە گەیشت و وایان زانیی قوڕەیش کۆڵیان داوە لە دژایەتی

---

[٢٠٠] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٣٦٠ ـ ٣٦٣ .

ئیسلام ، بۆیە گەڕانەوە مەککە و هەندێکیان چوونەوە ناو شار . کە سەیریان کرد موسڵمانان لە جاران زیاتر چەوساوە و بەستەزمانن و ، قورەیش بە هیچ شێوەیەك بەزەیی پیایانا نایەتەوە ، بڕیاریان دا جارێکی تر کۆچ بکەنەوە بۆ حەبەشە . ئەم جارە ژمارەیەکی زیاتر لە جاری یەکەم خۆیان ئامادەی کۆچ کردن کرد . جا ئەگەر عەمماریان لەگەڵ چووبێت ئەوا ژمارەی پیاوە کۆچ کەرەکان هەشتا و سێ پیاو بووە و ، ئەگەر عەممار کۆچی نەکردبێ هەشتا و دوو پیاو بوون و ، ژمارەی ئافرەتانیش هەژدە ئافرەت بوون کە یانزەیان قورەیشیی و ، حەوتیشیان غەیرە قورەیشیی بوون ، ئەمە جگە لەو منداڵانەی کە لە گەڵیان چوو بوون و ، پاشان ئەوانەش کە لەوێ لە دایك بوون ..

ئەمانەش ناوی هەندێك لەو هاوەڵانەی کە بۆ جاری دووهەم کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە :

جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب و ، ئەسمائی کچی عومەیسی هاوسەری و ، عەبدوڵڵای کوڕیان کە لەوێ لە دایك بوو ..[٢٠١]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود و ، میقدادی کوڕی عەمر کە بە ( إبن الأسود ) ناسراوە و ، عامیری کوڕی ئەبووەققاص و، خونەیسی کوڕی حوذافەی سەهمیی و ، هیشامی کوڕی عاصی کوڕی واثیلی سەهمیی و ، سەکرانی کوڕی عەمر و ، سەودەی کچی زەمعەی هاوسەری و ، ئەبوعوبەیدە عامیری کوڕی عەبدوڵڵای جەڕڕاح و ، عوبەیدوڵڵای کوڕی جەحش و ، ئوم حەبیبە ڕەملەی کچی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب کە هاوسەری عوبەیدوڵڵا بوو . لەوێ عوبەیدوڵڵا سەرگەردان بوو ، لە دین وەرگەڕا و بوو بە گاور و دەستی بە عەرەق خواردنەوە کرد هەتا مرد و ، هاوسەرەکەی خوا لێی ڕازیی بێ بێوەژن کەوت ، دوور لە کەس و کار و دوور لە نیشتمان . لەبەر ڕەزامەندیی خوا دانی بە خۆیدا گرت . کە عیددەی تەواو بوو پێغەمبەری خوا ﷺ نەجاشیی ئاگادار کرد تا مارەی بکات بۆی . ئەویش لە پێغەمبەری مارە بڕیی و چوارصەد دیناری کردە مارەیی ، بەمە بووە یەکێ لە دایکانی ئیماندااران و ، موسڵمانەکان بە وێنەی دایکی خۆیان

---

[٢٠١] لەوە ئەچێ منداڵەکانی جەعفەر لە حەبەشە لە دایك بوو بن ، چونکە لە ساڵی حەوتەمی کۆچییدا دوای خەیبەر ئەگەڕێتەوە و ، جەعفەر خوا لێی ڕازیی بێ لە جەنگی موئتەدا ، لە ساڵی هەشتەمدا شەهید ئەبێ !

ڕێزیان لێ ئەگرت . بە ڕاستیی کارێکی زۆر پیاوانە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی ئەو ئافرەتە لێقەوماوەی دایەوە .[٢٠٢]

ئیبن ئیسحاق ناوی کۆچ کەرانی هەموو نووسیوە ، خوێنەری ئازیز ئەتوانێ سەرنجی ( السيرة النبوية : ١/٣٢٢ ـ ٣٣٠ ) بدات .

بەڵام لە هەندێ سەرچاوەدا ، وەك ئیبن ئیسحاق و ئەبونوعەیم و بەیهەقیی ، وا هاتووە کە ئەبوموساش کۆچی بۆ حەبەشە کردووە ، بەڵام وا نیە ، بەڵکو ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە ئەبوموسا لەگەڵ کەسانی تردا سواری کەشتیی بووە بەو نیازەی بگاتە مەککە ، کەچیی کەشتی‌یەکە گەیاندوویەتیە حەبەشە .

بوخاریی لە صەحیحەکەی‌دا لە ئەبوموسای ئەشعەری‌یەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : ئاشکرابوونی پێغەمبەرمان ﷺ بەرگوێ کەوت ، بۆیە سواری کەشتی‌یەك بووین و ، ئێمەی گەیاندە لای نەجاشیی لە حەبەشە . لەوێ تووشی جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب هاتین و ، لای ئەو ماینەوە تا ئەو کاتەی کە گەڕاینەوە . ئەوەبوو بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ گەیشتین ، ئەمەش لە کاتێك دا بوو کە خەیبەری فەتح کردبوو . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( لكم أهل السفينة هجرتان )) . فەرمووی : ئەی سواربووانی کەشتی‌یەکە ئێوە دوو کۆچتان بۆ ئەنووسرێن .[٢٠٣] هەر بەم شێوە موسلیمیش ریوایەتی کردووە .

کاتێك کە قوڕەیش لەم کۆچە ئاگادار بوون بڕیاریان دا نەهێڵن سەر بگرێ ، بەڵام موسڵمانەکان گورج و گۆڵتر بوون و ، خوای گەورە سەفەرەکەی بۆ ئاسان کردن و ، بەر لەوەی قوڕەیش بیانگەنێ ، خۆیان گەیاندەوە حەبەشە لای نەجاشیی .[٢٠٤]

کە موسڵمانەکان بە سەلامەتیی گەیشتنە حەبەشە و ، نەجاشیی ڕێزی لێ گرتن ، تا بۆ خۆیان بەبێ ترس خواپەرستیی ئەنجام بدەن ، قوڕەیش کەوتنە تەگبیری ئەوەی کە دوو پیاوی بەهێز و لێهاتوو ، بە چەندین دیاریی ناوچەی مەککەوە ڕەوانەی لای نەجاشیی بکەن ، بەڵکو پادشا ڕازیی بکەن و موسڵمانەکان

---

[٢٠٢] لە زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەردا ژیان نامەی ئوم حەبیبە بە درێژە باس کراوە .

[٢٠٣] مەبەست لەوەیە کە لە یەمەنەوە بۆ حەبەشە کۆچێك و ، لە حەبەشەشەوە بۆ مەدینە کۆچێکیان کردووە . السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٣٧٥ ـ ٣٧٦ .

[٢٠٤] الرحيق المختوم : ٩٤ .

دەر بکات . لە هەموو شتێ زیاتر پێستەی مەککە بۆ دیاریی چاك بوو ، بۆیە چەند پێستەیەکیان بۆ پادشا کۆکردەوە و ، یەك بە یەکی فەرماندە گەورەکانیشی دیاری‌یان بۆ دانان ..

بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە بە جوانیی رایان هاتە سەر ئەوەی کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوڕەبیعە و ، عەمری کوڕی عاص بنێرن بە دوایانا . جا ئامۆژگاری‌یان کردن کە لە پێشەوە دیاریی فەرماندەکان بگەیەنن و داوایان لێ بکەن کە لەلای پادشادا پشتیان بگرن ، دوای ئەوە دیاری‌یەکانی پادشا بگەیەنن و دەربارەی هەڵاتووان بی‌دوێنن ، خۆ ئەگەر پێ‌یان کرا با داوا لە پادشا بکەن یەکسەر بیان گێڕێتەوە ، نەك بانگیان بکا و گوێیان لێ رابگرێ .

هەردووکیان بەرەو حەبەشە کەوتنە رێ .. کە گەیشتن پێش هەموو شتێك دڵی فەرماندەکانیان خۆش کرد و دیاری‌یەکانیان پێشکەش کردن و ، یەك بە یەکیشیان تێ گەیاند کە : چەند سەفیهـ و تێ‌نەگەیشتوویەکمان هاتوونەتە حەبەشە و ، وازیان لە دینی کەس و کاریان هێناوە و ، نەش‌هاتوونەتە سەر دینەکەی ئێوە . جا خزمەکانمان ئێمەیان ناردووە تا پادشا ئەوانەیان بۆ رەوانە بکاتەوە . جا ئەگەر ئێمە دەربارەی ئەوان پادشامان دواند ، ئێوە ئاماژەی بۆ بکەن تا قسەیان لەگەڵ نەکات و یەکسەر بیان‌داتەوە دەستمان .

پاشان دیاری‌یەکانیان پێشکەش بە نەجاشیی کرد و خۆشەویستترین دیاریی بە لای پادشاوە پێستە بوو ، بەڵام مووسای کوڕی عوقبە لە کتێبی ( المغازي ) دا باسی ئەوەی کردووە کە ئەسپێك و جبەیەکی ئاوریشمیان بە دیاریی بۆ هێناوە .

وتیان : ئەی پادشا ! چەند گەنجێکی سەرلێ‌شێواومان وازیان لە دینی خزمەکانیان هێناوە و ، نەش‌هاتوونەتە سەر دینەکەی تۆ ، بەڵکو دینێکی تازەیان داهێناوە کە ئێمە شارەزاییمان لێی نیە و ، ئێستە هاتوونەتە وڵاتی ئێوە . جا کەس وکاریان : باوك و ، مامە و ، خزمەکانیان ئێمەیان ناردۆتە خزمەتتان تا بیان‌گێڕیتەوە لایان ، چونکە ئەوان چاکتر شارەزان لەو دینەی کە بە شوورەیی‌یان لە قەڵەم داوە و لەسەری عیتابیان لێ گرتوون . فەرماندەکان ( بەتریکەکان ) وتیان : ئەی پادشامان ! راست ئەکەن ، خزمەکانیان چاکتر ئەیان‌ناسن ، کەواتە بیان دەرەوە دەستیان .

نەجاشیی تووڕە بوو و ، پاشان وتی : نا ، بەخوا ! نایانگێڕمەوە هەتا بانگیان بکەم و بیاندوێنم ، تا بزانم دەنگ و باسیان چی‌یە ؟ کۆمەڵە خەڵکێك پەنایان هێناوەتە وڵاتەکەی من و ، پەنای منیان لە هەموو پەنایەك بە چاکتر زانیوە ، ئەگەر وا بوون کە ئێوە ئەی‌ڵێن تەسلیمیان ئەکەمەوە و ، ئەیان گێڕمەوە بۆ ناو خزمەکانیان . گەر واش نەبوون لە دەستی ئەوان ئەیانپارێزم و تا دراوسێ‌یەتیی منیان بوێت ، منیش بە چاکیی لەگەڵیان ئەجوولێمەوە !!

پاشان نەجاشیی ناردی بە دوای هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا ﷺ . کە نێرراوی پادشا هاتە لایان ، بە یەکتریان وت : کە چووینە لای پادشا چیی وەڵام ئەدەنەوە ؟ وتیان : بەخوا پادشا هەر کەس بێ ، ئەوەی پێ ئەڵێین کە ئەی‌زانین و ، پێغەمبەرەکەمان ﷺ فەرمانی پێ داوین ..

کاتێك کە هاتن بۆ دیوانی پادشا ، ئەبینن وا پادشا ئوسقوفەکانی خۆی ( زاناکان ) کۆکردوونەتەوە دەوری خۆی و ئینجیلەکانیان کردوونەتەوە .

پادشا پرسیاری لە موسڵمانەکان کرد : ئەم دینەتان چی‌یە وا وازتان لە دینی خزمەکانتان هێناوە ، کە نە هاتوونەتە سەر دینەکەی من و ، نە هاتووشنەتە سەر دینی هیچ کام لەم میللەتانە ؟!

لە جیاتیی هەموویان سەردارمان جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب خوا لێی رازیی بێ هاتە قسە و وتی : ئەی پادشا ! ئێمە قەومێکی نەفام بووین ، کە بتمان ئەپەرست و ، مردارەوەبوومان ئەخوارد و ، داوێنپیسییمان ئەکرد و ، رەحم بڕییمان ئەکرد و ، لەگەڵ دراوسێ‌دا خراپ بووین و ، بەهێزمان لاوازمانی ئەخوارد ..

ئەمە حاڵی ئێمە بوو هەتا خوای گەورە لەناو خۆماندا پێغەمبەرێکی بۆ ناردین کە پشت و نەسەبی ئەناسین و ، ئاگاداری راستگۆیی و ، دەستپاکیی و ، پاكداوێنیی ئەوین . ئەویش ئێمەی بۆ لای خوا بانگ کرد تا بە تاك و تەنیای بزانین و ، بی‌پەرستین و ، واز لە پەرستنی ئەو بتانە بهێنین کە بە خۆمان و باوباپیرانمانەوە ئەمانپەرستن .. فەرمانی بە سەرماندا دا کە راستگۆ بین و ، ئەمانەت بپارێزین و ، سیلەی رەحم بەجێ بهێنین و ، بۆ دراوسێ چاك بین و ، لە شتی حەرام و خوێنڕشتن دەست کۆتا بین . لە داوێنپیسیی و ، وتنی ناهەق و ، خواردنی ماڵ و سامانی هەتیو و ، بۆختانکردن بۆ ئافرەتی پاكداوێن دوورە

پەرێزیی لێ کردین .. فەرمانی بە سەرمان دا کە خوا بە تاك و تەنیا بپەرستین و ، هیچ شتێك نەکەینە هاوەڵی و ، نوێژ جێبەجێ بکەین و زەکات بدەین ... ( هەموو فەرمانەکانی ئیسلامی بۆ هەڵ دا ) ئێمەش تەصدیقمان کرد و ، ئیمانمان پێ هێنا و ، بۆ گوێڕایەڵیی ئەوەی کە لە لایەن خواوە هێنابووی شوێنی کەوتین .. خوامان بە تاك و تەنیا و بێشەریك پەرست و ، هەرچیی کە لە سەرمانی حەرام کردبوو حەرامان کرد و ، هەرچیشی حەلاڵ کرد بوو حەلاڵمان کرد. بۆ ئەمە خزمەکانمان هەڵمەتیان دایە سەرمان .. سزا و ئازاریان داین .. هەوڵیان دا لە دینەکەمان وەرمان گێڕنەوە بۆ سەر بتپەرستیی ، تا ئەو شتە پیسانەی کە لەوەوبەر بە لامانەوە حەلاڵ بوون بە حەلاڵیان بزانین . جا کە زۆریان بۆمان هێنا و، ستەمیان لێمان کرد و ، تەنگیان پێمان هەڵ چنی و ، بوونە کۆسپ بۆ جێبەجێ کردنی دینەکەمان ، هاتووین بۆ وڵاتی بەڕێزتان و ، لەناو هەموانا تۆمان هەڵ بژاردووە و ، حەزمان لە پەنای تۆ بووە و ، هیوامان وەها بووە کە لە پەنای ئێوەدا ستەممان لێ نەکرێ ، پادشا !!

نەجاشیی وتی : ئایا لەوەی کە پێغەمبەرەکەتان لەلایەن خواوە هێناویەتی هیچت لەبەرە ؟

جەعفەر وتی : بەڵێ .

نەجاشیی وتی : دەی بۆم بخوێنە .

جەعفەر دەستی بە خوێندنی سەرەتای سوورەتی ( مریم ) کرد .. نەجاشیی ئەوەندە گریا هەتا ریشی بە فرمێسك خووسا .. قەشەکانیش بە بۆنەی بیستنی ئەو قورئانەوە کە بەسەریاندا خوێنرا ، ئەوەندە گریان هەتا ریشیان بە فرمێسك خووسا .. دوای ئەوە نەجاشیی وتی : ئەمە و ئەوەی کە عیسا هێناویەتی لە یەك سەرچاوەوە هاتوون .. بڕۆنەوە ( بە عەمر و عەبدوڵلا ) ، بەخوا نایان دەمەوە دەستتان و ، ناشمەوێ هیچ کەس دژایەتییان بکات .

کاتێك نەجاشیی دەستی بە رووی عەمر و عەبدوڵلاوە نا و ، بە نائومێدیی چوونە دەرەوە ، عەمری کوڕی عاص وتی : بەخوا سبەینێ دێمەوە و شتی وەهای بەلاوە ئەلێم رەگ و ریشەیان لە بنا دەربێنێت . عەبدوڵلای کوڕی ئەبوڕەبیعە وتی: شتی وا نەکەی ، ئەوانە هەر خزمن ، ئەگەرچیی لە ئێمەش لایان دابێ . وتی : بەخوا هەواڵی ئەدەمێ کە وەهای ئەگەیەنن عیسای کوڕی مەریەم بەندەیە .

بۆ بەیانیی چوویەوە لای پاشا و وتی : پادشا ! ئەوانە دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم قسەیەکی گەورە ئەکەن . پادشا ناردی بە دوایانا تا پرسیاریان لێ بکا بزانێ چیی ئەڵێن . کاتێك کە نێرراوی پادشا هاتە لایان ، بە یەکتریان وت : ئەگەر دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم پرسیاری لێتان کرد ، چیی وەڵام ئەدەنەوە ؟ وتیان : بەخوا ! ئەوەی لە بارەوە ئەڵێین کە خوای گەورە فەرموویە و پێغەمبەرەکەمان بۆی هێناوین ، چیی ئەبێ با ببێ !!

راستوتن .. دامەزراویی ئیمان .. پشتبەستن بە خوا .. نەترسان لە هەڵوێستی ناسكدا .. کۆڵنەدان .. یەكڕیزیی .. داوای کۆمەکیی و یارمەتیی تەنها لە خوا .. ئەمانە و هەموو سیفەتێکی تری جوان رەوشتی پەروەردەکراوانی قورئانە !!

ئەمەیە دەرمانی چاككردنی مرۆڤ ..

هاتنەوە کۆشکی پادشا و چوونە ژوورەوە لای .. پادشا پرسیاری لێ کردن : دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم چیی ئەڵێن ؟

جەعفەر وەڵامی دایەوە : ئەوە ئەڵێین کە پێغەمبەرەکەمان ﷺ بۆمانی هێناوە . ئەڵێین : بەندە و ، پێغەمبەر و ، روح و ، فەرمایشتی خوایە کە پێشکەشی مەریەمی پاكداوێنی کرد ..

نەجاشیی دەستی دا بە زەوییدا و ، چیلکەیەکی لە زەوییەکەدا هەڵ گرت و، وتی : بەخوا دینی عیسای کوڕی مەریەمیش ئەوەندەی ئەم چیلکەیە لەوەی کە تۆ وتت نەترازاوە !!

فەرماندەکان ، کە لە دەوری پادشادا بوون کە ئەمەیان لە پادشا بیست ، لەبەر نارەزایی پرخەیەکیان کرد .. پادشاش رووی لە فەرماندەکان کرد و ، وتی : بەخوا وایە ، ئەگەرچیی ئێوەش بپرخێنن ..

روویشی کردە موسڵمانەکان و وتی : برۆن لە خاکی مندا ئەمین بن . هەر کەس قسەتان پێ بڵێ باجی ئەخەم ، ( سێجار ) پێم خۆش نیە ئەوەندەی چیایەك زێڕم هەبێ و ئازاری پیاوێکتان بدەم .

روویشی کردە ئەوانەی دەوروبەری : دیارییەکانیان بۆ بگێڕنەوە ، پێویستییم پێیان نییە . بەم شێوەیە بە سەرشۆڕیی لای پاشا دەرچوون و ، موسڵمانەکانیش لەلای نەجاشیی بەوپەڕی رێزەوە مانەوە ، تا ئەوەبوو هەندێکیان پێش کۆچ کردن

بۆ مەدینە گەڕانەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە و ، هەندێکیشیان مانەوە تا دوای فەتحی خەیبەر و لە ساڵی حەوتەمی کۆچیی‌دا گەڕانەوە مەدینە .

لەم چیرۆکەی کۆچ کردن دا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە هەر کەس بە ئیخلاصەوە شوێن دینی خوا بکەوێ و ، لەگەڵ خوادا ڕاست بکات ، خوای گەورەش ڕاستی بۆ دێنێتە پێش و ، هەر سەری ئەخا و ، چاودێریی ئەکات و ، لە تەنگانەش‌دا دەرووی لێ ئەکاتەوە و ، ئەشی‌کاتە پێشەنگ بۆ موسڵمانانی دوای خۆی تا بە چاوی خۆیان دەستی پڕ قودرەتی خوا ببینن و ، ئەوانیش لە ڕۆژانی سەخت‌دا دان بە خۆیان‌دا بگرن و ، لەسەر ڕاستیی کوڵ نەدەن و ، نەش‌هێڵن دینی پاك دەستکاریی بکرێ و ، هەوا و ئارەزووی ڕۆزگاری تێکەڵ بکرێت .. کورتەکەی بە پاکیی لەسەر دینی خوا دامەزراو بن و باکیان نەبێ هەرچیی دێتە پێشیان !

کۆچ‌کردنی ئیمان‌داران بۆ حەبەشە مایەی فەڕ و بەرەکەت بوو بۆ نەجاشیی پادشایش ، چونکە بە بۆنەی ئەوانەوە ئەویش هیدایەتی وەرگرت و شایەتمانی حەقی هێنا و ، بڕوای بە پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا کە پێغەمبەری ئاخرزەمانە ، ئەگەرچیی موسڵمان‌بوونەکەی لە دەستە و تاقمەی دەوری شاردەوە ، چونکە هەستی کرد کە ئەوان سەرگەردانن و ، مێشکیان لەسەر بیروباوەڕی پڕوپووچ بەستوویەتی و ، بەو ئاسانی‌یە حەق نابینن .

لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم‌دا لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازیی بێ ڕیوایەت کراوە کە وتوویە : لەو ڕۆژەدا کە نەجاشیی کۆچی دوایی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی دا کە مردووە و ، موسڵمانەکانی لە شار دەرکرد و چوون بۆ ( مُصَلَّى ) و ، ( بۆ بەجێ هێنانی نوێژی مردوو ) چوار ( الله اکبر ) ی فەرموو . واتە نوێژی غائیبی لەسەر نەجاشیی کرد ..

هەروەها ڕیوایەت کراوە کە ناوی ئەصحەمە بووە . بوخاریی لە جابیرەوە خوا لێی ڕازیی بێ ڕیوایەتی کردووە کە وتوویە : کاتێ کە نەجاشیی کۆچی دوایی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : « ماتَ اليومُ رجلٌ صالِحٌ ، فَقُومُوا فَصَلُّوا عَلَى أَخيكُم أَصحَمَةَ » .

فەرمووی : ئەمڕۆ پیاوچاکێك کۆچی دوایی کردووە ، دە هەستن نوێژ لەسەر ئەصحەمەی براتان بکەن .

ئەمە لە چەند هاوەڵێکەوە گێڕراوەتەوە .[٢٠٥]

بە بۆنەی ئەم نوێژەوە جومهووری فەقیهەکانی ئیسلام رایان هاتۆتە سەر ئەوە کە نوێژی مردووی غائب دروستە و ، بۆتە کارێکی شەرعیی و تا قیامەت کاری پێ ئەکرێ ..[٢٠٦]

**شەشەم : کۆچ کردنی ئەبوبەکر**

ئەبوبەکریش خوا لێی رازیی بێ لەسەر ئیمانهێنانی و ، لەسەر ئەوەی کە لە سەری پێغەمبەری خوای ﷺ ئەکردەوە ، تووشیی ئازار و نارەحەتیی هات ، بە رادەیەك کە ناچار بوو بەدوای موسڵمانە کۆچکەرەکاندا ئەویش کۆچ بکا بۆ حەبەشە ..

کە گەیشتە شوێنێك پێی ئەوترا ( برك الغماد ) تووشی ( ئیبنوددوغوننە ) ی سەرداری هۆزی ( قارە ) بوو و ئەویش لێی پرسیی : نیازی کوێت هەیە ، ئەبوبەکر ؟

فەرمووی : خزمەکانم دەریان پەڕاندم و ئەمەوێ بڕۆم بە وڵاتدا تا بتوانم پەروەردگارم بپەرستم .

وتی : پیاوی وەك تۆ ـ ئەبوبەکر! ـ نابێ دەرچێت و نابێ دەریش بکرێت !! پیاوی وەك تۆ کە دەست گرۆیی بێنەوا ئەکەیت و ، سیلەی رەحم بەجێ ئەهێنی و ، یارمەتیی بارگران و دەستکورت ئەدەیت و ، میوانداریی ئەکەیت و ، فریای لێقەوماو ئەکەویت .. من پەنات ئەدەم .. وەرە بگەڕێرەوە لە وڵاتی خۆتدا خواپەرستیی خۆت بکە .

ئەبوبەکر لەگەڵیا گەڕایەوە و دانیشتەوە ..

( إبن الدغنة ) بەسەر پیاوماقووڵانی قورەیشدا گەڕا و پێی وتن : پیاوی وەك ئەبوبەکر نابێ دەرچێت و نابێ دەریش بکرێت ، ئایا ئێوە پیاوێکی وەها دەرئەکەن کە : دەست گرۆیی بێنەوا ئەکات و ، سیلەی رەحم بەجێ ئەهێنێ و ، یارمەتیی بارگران و دەستکورت ئەدات و ، میوانداریی ئەکات و ، فریای لێقەوماو ئەکەوێت ؟

---

[٢٠٥] البداية والنهاية : ٣ / ٧٧ وانظر صحيح البخاري ومسلم ـ كتاب الجنائز .

[٢٠٦] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٧٥ ـ ٣٨٠ .

قوڕەیشی‌یەکان بۆ ئـەوەی پەناکـەی ( إبـن الدغنـة ) وەربگـرن ، وتیـان : بـە ئەبوبەکر بڵێ با لە ماڵی خۆیدا بۆ خۆی خواپەرستیی بکـا و چـەندی پـێ خۆشـە نوێژ بکا و قورئان بخوێنێ . نەك بە ئاشکرا بەجێیان بهێنێ و ئێمـەیان پـێ ئـازار بدات ، چونکە ئێمە لەوە ئەترسین مـاڵ و منالـمـان لـە دیـن وەربگێـڕێ . ( إبـن الدغنة ) ئـەوەی بـە ئەبوبـەکر گەیانـد و ئـەویش ماوەیـەك لـە ماڵـەوە نوێـژ و خواپەرستیی بەجێ ئەهێنا و لە هیچ شوێنێکی تر نە نوێژی ئەکرد و نـە قورئـانی ئەخوێند .

دوای ماوەیەك وای بە چاك زانیی لـە پـەنای دیـواری ماڵەکـەیدا مزگـەوتێك دروست بکات و بۆ خۆی خواپەرستیی تـێدا بکـات . جـا چـونکە خـاوەنی دڵ و دەروونێکی پاك و ناسك بوو ، هەر کە قورئانی بخوێندایە خۆی پێ نەئـەگیرا ، بـە خوڕ فرمێسك لە چاوی جۆگەلەیان ئەبەست و ، ژن و منالی بتپەرستەکانیش لـە دەوری جـەمیان ئەخـــوارد و ، بـەوپـــەڕی سـەرســامی‌یەوە سـەرنجی خواناسـی ڕاستەقینەی ڕەوشت بەرزیان ئەدا و ، ئەم واتایانە ئەکەوتنە مێشکیانەوە :

ناسینی خوا بە تاك و تەنیا و دەست بەرداربوونی بتەکان ..

شەرم و تەقوا و گریان لەبەردەم خوای گەورەدا ..

پاك کردنەوەی دڵ و دەروون بە خواپەرستیی ..

زاخاودانی مێشك بە نهێنی‌یەکانی ئیمان و قورئان . دیارە ئەمانەش لەو بـار و دۆخەدا و لەو غەریبیی و نامۆیەدا پیاوی تەواو بەهێزیان ئەویست ..

بتپەرستەکان هاواریان بردەوە بەر ( إبن الدغنة ) تا سەرێکی مەککە بدات . کە هات پێیان وت : ئێمە بە پەنادانی تۆ ئەبوبـەکرمان پـەنا دا . بـەو مەرجـەی بچێ لە ماڵەکەی خـۆیدا خواپەرسـتیی بکـات . کەچـیی وا لـە پـەنای دیـواری ماڵەکەیدا مزگەوتێکی دروسـت کـردووە و بـە ئاشـکرا نوێـژی تـێدا ئـەکات و قورئانی تێدا ئەخوێنێ و ، ئێمەش ئەترسین ژن و منالـەکانمان بخەڵـەتێنێ . بۆیـە ئەمانەوێ ئەوەی لێ قەدەغە بکەیت .. ئەگەر پێی خۆشە بـا لـە مـاڵی خـۆیدا خواپەرستیی بکات و ، ئەگەر وا ناکات و بە ئاشکرا بە جێی ئـەهێنێ ، داوای لێ بکە با پەناکەت بۆ بگێڕێتەوە ، چـونکە ئێمـە لامـان جـوان نـەبوو پـەیمانی تـۆ بشکێنین و لە هەمان کاتیشدا ئێمە ماوەی ئـەوە نـادەین ئەبوبـەکر بـە ئاشـکرا خواپەرستیی بکات . ( إبن الدغنـة ) هـات بـۆ لای ئەبوبـەکر و پێـی وت : خـۆ

ئەزانیت و لە یادتە من چ بەڵێن و پەیمانێکم پێ دایت ، جا یا بەو شێوە بکە ، یان پەناکەم بۆ بگێڕەرەوە ، چونکە من پێم ناخۆشە عەرەبەکان دەنگ و باسی ئەوەم ببیستن کە من پەنایەکم داوە ، کەچیی شکێنراوە .

مێشکی نەفامیی و خۆپەرستیی و لە خۆبایی بوون هەر وایە ، لەبەر ئەوەی خۆیان بە خاوەن دەسەڵات ئەزانن ئەیانەوێ ئیماندارەکە بە پرس و رای ئەوان خواپەرستیی بکات .. ئەبێ ئەوان نەخشەی بۆ بکێشن ..

هەمیشە هەروا ئەبێ ، هەتا ئیماندار پابەندی هەل و مەرجی خوانەناسان بێت ، ئەوا ناتوانێ بە گوێرەی ئایەتی ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝ ﴾ رەفتار بکات ..

چونکە ئەبێ لەگەڵیان رێك بکەوێ لەسەر ئەوەی کە رۆژێ خواکانی ئەوان بپەرسترێن و ، رۆژێکیش خواکەی ئەم شەریکی بۆ بڕیار بدرێت .

ئەبێ پیرۆزبایی لە بیدعە و بت پەرستییان بکرێت ..

ئەبوبەکر خێرا سەرنجی دا پەنای ( إبن الدغنة ) واتە زەوت کردنی سەربەستیی بیروباوەڕەکەی .. واتە : بێئیمان نەخشەی خواپەرستیی بۆ بکێشێ .. بێئیمان ماوەی بدا و رەزامەندیی بنوێنێ خوا بپەرستێ !! دیارە هەر کاتێکیش ویستی لەسەر نەبوو ئەو مافەی لێ وەرئەگرێتەوە .

بۆیە بڕیاری دا پەناکەی ( إبن الدغنة ) بگێڕێتەوە و بچێتە پەنای خوای گەورەوە .

بڕیاری دا خەریکی خزمەتی ئیسان و قورئان بێت و بە هیچ شێوەیەك بۆ هیچ بێئیمانێك مل کەچ نەکات .. ئەو ئەیەوێ خواپەرستیی بکات ، بە پلەی یەکەمیش مەبەست پێی سەرفرازیی قیامەتە ، دەی کێ بەمە نارازییە ، با چیی لە دەست دێ درێغیی نەکات ، چونکە کاری ئیماندار لە دەستی بەهێزی قەدەری خوادایە .

جارێکی تر ( إبن الدغنة ) رووی کردەوە کۆمەڵی قورەیش و پێی راگەیاندن وا ئەبوبەکر پەناکەی بۆ گێڕاوەتەوە ، ئەوە خۆیان و ئەوە ئەبوبەکری هاوماڵیان ..

دوای ئەوە نەفامێکی قورەیشیی تووشی ئەبوبەکر بوو کە بەرەو کەعبە ئەچوو، مشتێك خۆڵی هەڵگرت و بە تەوقەسەری ئەبوبەکریدا کرد ..

لەسەر چیی ؟

لەسەر ئەوەی خواپەرستیی ئەکات .

تاوانی چیـیە ؟
چونکە وازی لە بتپەرستیی هێناوە .
ئەمڕۆش لە سەرانسەری زەوییدا موسڵمانان بەو شێوەیە ئەچەوسێنرێنەوە .
لەو کاتەدا پیاوماقووڵێکی قورەیشیی ـ کە وەلیدی کوڕی موغیرە ، یان عاصی کوڕی وائیل بووە ـ دای بەلای ئەبوبەکردا کە پێی فەرموو : نابینی ئەو نەفامە چیی ئەکات ؟ وتی : خۆت وات بە خۆت کردووە .
کە خوانەناسیی باڵی بەسەر هەر شوێنێکدا کێشا ، ئەوا هەرگیز بە تەما نەبی داد و یەکسانیی تیدا دەست بکەوێ .. بۆیە ئەبوبەکر لە داخی ئەو بێنازییەی لە وڵاتی خۆیدا و لەناو کەس وکاری خۆیدا ، پەنای بردە بەر مناجاتێك لەگەڵ پەروەردگاریدا کە چەندە خاوەنی حیلمە ، کە ئەیفەرموو : ( أي ربِّ ما أحلَمَكَ ) . سێ جار .
لێرەدا ئەوەشمان بۆ دەرئەکەوێ کە ئەبوبەکر قورئانی ئەوەندە بە تام و بە چێژەوە خوێندووە خەڵکی گەڕەکەکە بە گەورە و بچووکەوە سەرسام بوون و ، ئەوانیش ئەوەندە قورئان لەسەر دڵ و دەروونیان کاریگەر بووە ، پیاوەکان ترساون لە موسڵمانبوونی ژن و منداڵ و کەس و کاریان .
ئیمام ئەحمەد لە ( المسند ) دا لە صەعصەعەی کوڕی موعاویەی مامەی فرزدەقەوە ریوایەتی کردووە کە دێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ، ئەویش ئەم ئایەتانەی بۆ ئەخوێنێتەوە : ﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾ . صەعصەعە وتی : بەسمە ، ئەگەر هیچی تریش نەبیستم باکم نیە .. واتە ئەمەم بەسە تا لە حیکمەتی هاتنی قورئان تێ بگەم .. چاکە و خراپە تەنها یەك زەڕڕەشیان نافەوتێ ..
هەروەها ریوایەت کراوە کە کاتێك ئەعرابییەك ئەم دوو ئایەتەی سەرەوە لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ ئەبیستێ ، ئەڕوا و ئەڵێت : زەڕڕە ، زەڕڕە . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( لقد فقه الرجل )) . فەرمووی : کابرا لە ئیسلام تێ گەیشت .[٢٠٧]

---

[٢٠٧] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٨١ ـ ٣٨٣ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ٤٦٧ ـ ٤٦٩ .

لەم هەڵوێستەی ئەبوبەکردا خوا لێی رازیی بێ ، کە واز لە روخصە دێنێ و ، دەست بە عەزیمەوە ئەگرێ ، دەرسێکی گرنگمان بۆ روون ئەبێتەوە ، کە هەر کاتێ موسڵمانەکان پشت بە روخصە ببەستن و واز لە عەزیمە بهێنن ، ئەوا ئیمانداره بەغیرەتەکان دەر ناکەون و ، خۆ هەڵواسە چڵکاوخۆرەکان زمان درێژ ئەکەن و سنگ دەرئەپەڕێنن و ، خۆیان ئەبەنە پێشەوە و ، خۆیان ئەکەنە خاوەنی بانگەواز .. بەڵام بە هەڵبژاردنی عەزیمە ، پیاوم ئەوێ خۆی بخاتە بەر هێرشی زاڵمان و ، دەست لە بەرژەوەندیی دنیایی خۆی و ماڵ و منداڵی بشوات .

کاتێ کە روخصە کرایە دەستوور ، قەڵەباغ دروست ئەبێ ، بەڵام قەڵەباڵغێك کە دین لاواز ئەکات .. تا بوو ئەیخۆن و ، کە نەما پاشگەز ئەبنەوە بۆ ناو کۆڕ و کۆمەڵی نەفامیی .. شایانی باسە کە هەندێك ئەم روخصە دین ڕووخێنە بە پێشکەوتن لە قەڵەم ئەدەن !!

**حەوتەم : هەڵوەشاندنەوەی نووسراوە ستەمکارانەکە**

نەوەی هاشم و نەوەی موطەللیب لە شیوی ئەبوطالیبدا سێ ساڵ مانەوە ، بەڵام بە تەواویی تەنگیان پێ هەڵ چنرا .. گەورە و بچووکیان برسیی بوون ، تا ئەوەبوو خوای گەورە چەند کەسانێکی لە پیاوماقووڵانی قورەیش رەخساند هەتا نووسراوەکەی قورەیش هەڵ بوەشێننەوە ، یەکەم هەنگاوی مەردانەش بۆ ئەم کاره هیشامی کوڕی عەمر [٢٠٨] نای . هیشام رۆیشت بۆ لای زوهەیری کوڕی ئەبوئومەییەی مەخزوومیی ، کە کوڕی عاتیکەی کچی عەبدولموطەللیب بوو و ، پێی وت : زوهەیر ! ئایا رازییت بەوەی کە خۆت خواردن بخۆیت و ، جل و بەرگ بپۆشیت و ، ژنومێردیی بکەی ، کەچیی خاڵوانت بەو جۆرە بن کە ئەیزانیی ؟! نە شتیان پێ بفرۆشرێ و ، نە شتیان لێ بکڕرێت و ، نە ژنیان لێ بخوازرێت و نە ژنیان پێ بدرێت . وتی : ماڵت کاول بێ هیشام ! چیی بکەم ؟ من تاقە پیاوێکم ، بەخوا ئەگەر پیاوێکی ترم لەگەڵدا بوایە ، هەڵم ئەوەشاندەوە . هیشام وتی : ئەو پیاوەم دۆزیوەتەوە . وتی : کێیە ؟ وتی : خۆمم . زوهەیر وتی : دەی سێهەممان بۆ پەیدا بکە .

---

[٢٠٨] هیشام کوڕی عەمری ، کوڕی حاریثی ، کوڕی حەبیبی ، کوڕی نەصری ، کوڕی مالیکی ، کوڕی حسسەلی، کوڕی عامیری ، کوڕی لوئەی ە ، کە لە دایکیەوە برازای نەضلەی کوڕی هاشم بووە . ئەم مەردە ، وەك لە پێشەوە باسمان کرد لە ماوەی سێ ساڵی دابڕانەکەدا دەستی یارمەتیی بۆ نەوەی هاشم درێژ ئەکرد .

هیشام چوو بۆ لای موطعیم ی کوڕی عەدیی و پێی وت : موطعیم ! ئایا تۆ ڕازییت دوو تیرەی نەوەی عەبدمەناف تیا بچن و ، تۆیش بە چاوەوە بیت و ، پشت گیری قوڕەیش بیت ؟ ئیتر خزمایەتیی ئەوی لەگەڵ نەوەی هاشمدا هێنایەوە بیری و هەڵی نا کۆمەکی‌یان بکات . ئەویش وتی : ماڵ کاول ، من چیی بکەم ؟ من تاقە پیاوێکم . وتی : دووهەمم بۆت دۆزیوەتەوە . وتی : کێیە ؟ وتی : خۆمم . وتی : دەی سێ‌هەممان بۆ پەیدا بکە . وتی : دۆزیومەتەوە . وتی : کێیە ؟ وتی : زوهەیری کوڕی ئەبوئومەییەیە . وتی : دەی چوارەممان بۆ پەیدا بکە . چوو بۆ لای ئەبولبوختەریی کوڕی هیشام و ، ئەوەی کە بە موطعیمی کوڕی عەدیی وت ، بەویشی وت . وتی : ماڵت کاول بێ ، جا کەسێ شك ئەبەی کە لەسەر ئەمە کۆمەکیی بکا ؟ وتی : بەڵێ ، زوهەیری کوڕی ئەبو ئومەییە و ، موطعیمی کوڕی عەدیی و ، خۆیشم . وتی : دەی پێنجەممان بۆ پەیدا بکە .

ئەوەبوو ڕۆیشت بۆ لای زەمعەی کوڕی ئەسوەدی کوڕی موطەللیبی کوڕی ئەسەد و ، باسەکەی لەگەڵ کردەوە و ، باسی خزمایەتیی و مافی نەوەی هاشیمیشی بۆ کرد . ئەویش پرسیی : ئەم کارەی کە تۆ بانگم ئەکەی بۆی کەسی تر رای لەسەریەتی ؟ وتی : بەڵێ . پاشان ناوی پیاوەکانی بۆ هەڵ دا ..

پێم خۆشە ئەوەش وەبیری ئازیزان بهێنمەوە کە ئەمانە هێشتا لە ژیانی نەفامیی‌دا ئەژین و ، ئیمانیان نەهێناوە ، ئاوەها خزمدۆست و ، خاوەن بەڵێن و ، خاوەن جوامێر بوون ، داخۆ لە دوای بە خزمەت گەیشتنی قورئان چ مەردێکیان لێ دەرچووبێ ؟!!

شوێنێك هەبوو لە ژووری مەککەوە ناوی حەجوون بوو ، بڕیاریان دا شەو لەوێ یەك بگرن . کە هەموویان گەیشتنە ئەوێ ، بە یەك دەنگیی بڕیاری کاریان دا و بەڵێنیان بە یەکتر دا کە هەتا ئەو نووسراوە ستەمکارانەیە هەڵ نەوەشێننەوە کۆڵ نەدەن .

زوهەیر وتی : من یەکەمتانم و یەکەم کەسیش قسە ئەکەم . کە ڕۆژیان لێ بوویەوە و چوون بۆ ناو کۆڕ و کۆمەڵیان ، زوهەیری کوڕی ئەبوئومەییە کە دەستە جلێکی نایابی لەبەردا بوو ، هات و حەوت جار طەوافی کەعبەی کرد ، پاشان ڕووی کردە خەڵکەکە و وتی : ئایا ئێمە خۆمان نان بخۆین و ، جل بەرگ بپۆشین و ،

ئەوەی هاشم‌یش تیا بچن نە شتیان پێ بفرۆشرێ و، نە شتیشیان لێ بکڕێت ؟ بەخوا دانانیشم هەتا ئەو نووسراوە ڕەحم‌بڕە ستەم‌کارانەیە نەدڕێت .

ئەبوجەهل ، لە سووچێکی مزگەوت‌دا بوو وتی : درۆت کرد ، بەخوا نادڕێت. زەمعەی کوڕی ئەسوەد وتی : بەخوا تۆ خۆت درۆزنی ، کاتێ کە نووسرا ڕەزامەندییمان لەسەر نووسینی نەبوو !! ئەبولبوختەریی وتی : زەمعە ڕاست ئەکا، ئەوەی تیایا نووسراوە ڕەزامەندییمان لەسەری نیە و ، دانی پیا نانێین . موطعیمی کوڕی عەدیی وتی : ئێوە هەردووکتان ڕاست ئەکەن و ، هەر کەسیش غەیری ئەوە بڵێ درۆ ئەکات . لای خوا خۆمان لە تاوانی ئەو نووسراوە و هەرچیی وا تیایا دائەماڵێین . هیشامی کوڕی عەمریش شتێکی وەهای وت .

ئەبوجەهل وتی : ئەمە کارێکە شەو بڕیاری لەسەر دراوە و ، لە شوێنێکی تر ڕاوێژی لەسەر کراوە ، ئەبوطالیبیش لەلایەکی مزگەوتەوە دانیشتبوو و دەنگی نەئەکرد ..

موطعیمی کوڕی عەدیی هەستا بۆ نووسراوەکە هەتا بیدڕێنێ ، سەیری کرد جگە لە نووسراوی (( باسمك اللهم )) هەر هەموو نووسینەکە مۆرانە خواردوویەتی .

ئیبن هیشام باسی ئەوەی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوطالیبی فەرمووە : (( يا عَمِّ ! إنَّ اللهَ قد سَلَّطَ الأَرَضَةَ على صَحيفَةِ قُرَيشٍ ، فَلَم تَدَعْ فيها إسماً هُو للهِ إلا أَثبَتَتهُ فيها ، وَنَفَت منها الظُّلمَ ، والقطيعَةَ وَالبُهتانَ )) . فەرمووی : مامەگیان ! خوای گەورە مۆرانەی ناردووە و ، جگە لە ناوی خوا هەرچیی نووسینی سەر ئەو نووسراوە هەیە لە زوڵم و ڕەحم‌بڕیی و بوهتان ، هەر هەمووی سڕیوەتەوە .

ئەبوطالیب پرسیی : ئایا پەروەردگارت ئەم هەواڵەی پێ داوی ؟! فەرمووی : (( نعم )) . وتی : دە بەخوا ناهێڵم کەس بچێتە کەعبەوە ، خێرا هەستا و هات بۆ لای قورەیش و وتی : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! موحەممەدی برازام هەواڵێکی ئاوەها و ئاوەهای پێ داوم ، ئادەی وەرن بەلای نووسراوەکەتانەوە ، جا ئەگەر وابوو کە ئەو فەرموویە ، ئەوا واز لە دابڕانمان بهێنن و ، لەسەر ئەو بڕیارە دابەزن ، خۆ ئەگەر درۆزنیش بوو ئەوا برازاکەم ئەدەم بە دەستتانەوە .

خەڵکەکە وتیان : ڕازییمانە و ، لەسەر ئەوە پەیمانیان بەست .

ئەوەبوو سەیری نووسراوەکەیان کرد ، بەو شێوەیە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبووی ، کەچیی لە جاران خراپ‌تر بوون و ، پەیمان و بەڵێنەکەشیان لە بیرچۆوە . ئیتر هەر ئەو ڕۆژە بوو کە ئەو چەند پیاوەی قوڕەیش ئەو کارەیان کرد و نووسراوەکەیان دڕاند ..

کاتێك کە نووسراوەکە دڕێنرا ، دەربارەی ئەوانەی کە بوونە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەو نووسراوە ، ئەبوطالیب قەصیدەیەکی لە مەدحی ئەو پیاوانەدا دانا ، کە ئەمە سەرەتاکەیەتی :

ألا هَل أتى بَحرِيينا صنع ربنا ‏ ‏ على نَأيهم والله بالناس أرودُ
فيخبرهم أن الصَحيفة مُزِّقت ‏ ‏ وأن كل مالم يرضه الله مفسدُ

ئەڵێ : ئایا کاری جوانی پەروەردگارمان لەسەر پشت هەڵ کردنی قوڕەیش ، گەیشتووە بە کۆچ کردووەکانمان بۆ حەبەشە ، کە خوای گەورە لە هەموو کەس زیاتر لەگەڵ خەڵکیدا نەرم و نیانە و ، هەواڵیان بداتێ کە نووسراوەکە دڕێنرا و ، هەر کارێکیش کە خوا ڕەزامەندیی لەسەر نەبێ فاسید و بێ‌کەڵکە .

نەك هەر ئەم موعجیزەیە ، بەڵکو قوڕەیش بە چاوی خۆیان موعجیزەی زۆریان بە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەدیی ، کەچیی هەر ملیان با ئەدا .. [٢٠٩]

**هەشتەم : چەند موعجیزەیەك**

موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەنە هەزار موعجیزە وەك لای زانایان چەسپاوە ، [٢١٠] جا لێرەدا پێمان خۆشە چەند دانەیەکیان بخەینە بەرچاوی ئازیزان .. بۆ زیاتر شارەزابوونیش خوێنەری بەڕێز ئەتوانێ سەرنجی موعجیزەکان بە درێژە بدات ، بۆ نموونە لە کتێبی ( موعجیزاتی ئەحمەدیی ) دا ، واتە مەکتووبی نۆزدەهەمی کتێبی ( المكتوبات : ١١١ـ ٢٥٦ ) ، کە زیاتر لە سێ‌صەد موعجیزەی لە خۆ گرتووە . [٢١١]

**أ ـ موسڵمان بوونی تەمیم ی داریی :**

ئەبونوعەیم لە تەمیمی داریی‌یەوە خوا لێی ڕازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ هات من لە شام بووم . ئەوەبوو بۆ

---

[٢٠٩] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٨٤ ـ ٣٨٦ .
[٢١٠] كليات رسائل النور : ٢ / المكتوبات : ١١٤ لبديع الزمان سعيد النورسي .
[٢١١] المكتوبات : ١١١ ، موعجیزاتی ئەحمەدیی : ٥ .

ئیش و کارێکی خۆم دەرچووم و شەوم بەسەردا هات . وتم : ئەمشەو خۆم ئەخەمە پەنای گەورەی ئەم شیوەوە . ئەڵێت : کاتێك کە راکشام بۆ خەوتن ، گوێم لە دەنگێك بوو بانگی ئەکرد ، بەڵام نەمئەبینیی : پەنا بە خوا بگرە ، چونکە جیننیی لە حزووری خوادا ئەو بێشەرمی‌یە ناکەن و پەنای هیچ کەسێك نادەن . وتم : سوێند بە خوا ! ئەڵێیت ... وتی : پێغەمبەری ئوممی‌یەکان ( عەرەب ) پێغەمبەری خوا ﷺ دەرکەوتووە و ، لە حەجوون لە دوایەوە نوێژمان بە جێ هێنا و، موسڵمانبووین و شوێنی کەوتین و ، فڕوفێڵی جینن تیا چوو و ، ئەستێرەی کشاویان تێ گیرا .. بڕۆ بۆ لای موحەممەدی پێغەمبەری ( رب العالمین ) و موسڵمان ببە .

تەمیم ئەڵێت : کە رۆژم لێ بوویەوە چووم بۆ گوندی ( دَیر أَیوب ) [٢١٢] و ، لەوێ پرسیارم لە راهیبێك کرد و ، هەواڵەکەم پێ دا . راهیبەکە وتی : راستیان پێ وتوویت . ئەو پێغەمبەرە لە حەرەمدا دەرئەکەوێت و ، لە حەرەمیشەوە کۆچ ئەکات و ، چاكترینی پێغەمبەرانە . نەکەی هیچ کەس پێشت بکەوێ بۆ لای .

تەمیم ئەڵێت : هەوڵم ئەدا بەسەر شاخ و گرددا سەربکەوم ، تا ئەوەبوو گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بووم .كذا في البداية ( ٢/٣٥٠ ) . [٢١٣]

**ب ـ شیری مەڕە نەزاوەکە :**

ئیمام ئەحمەد لە ئیبن مەسعوودەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : مەڕم بۆ عوقبەی کوڕی ئەبومعەیط ئەلەوەڕاند و ، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ بەلامدا تێپەڕیان کرد و ، فەرمووی : (( یا غُلام ! هل من لبن ؟ )) . فەرمووی : رۆڵە ! شیرت بەلاوە هەیە ؟ منیش وتم : بەڵێ ، بەڵام پێم سپێرراوە . فەرمووی : (( فهل من شاة لم ینزُ علیها الفحلُ ؟ )) . فەرمووی : ئەی مەڕێکت بەلاوە نیە کە بەرانی نەگرتبێ ؟ منیش مەڕێکم بۆ هێنا و ، دەستی بە گوانیا هێنا و ، شیر هاتە خوارەوە و ، دۆشی‌یە ناو دەفرێك ، خۆی لێی خواردەوە و دەرخواردی ئەبوبەکریشی دا و ، پاشان بە گوانەکەی فەرموو :

---

[٢١٢] دەیرئەییووب : گوندێکە لە حەوران ، لە دەوروبەری دیمەشق ، ئەییووب پێغەمبەر سەلامی لێ بێ لەم گوندەدا ژیاوە و ، هەر لێرەشدا خوای گەورە تاقیی کردۆتەوە و ، ئەو کانیەشی تێدایە کە پێی دا لە زەویی و بە فەرمانی خوا هەڵ قوڵیی و بووە مایەی چاكبوونەوەی و ، قەبرەکەشی هەر لەوێیە . ( معجم البلدان : ٢ / ٤٩٩ ) .

[٢١٣] شرح حیاة الصحابة : ٤ / ٣٩١ ـ ٣٩٢ .

(( اقلص )) ، فەرمووی : وەرەوە یەك ، ئەویش هاتەوە یەك . عەبدوڵڵا ئەڵێت : پاشان هاتمە خزمەتی و وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! لەم فەرمایشتەم فێر بکە ( کە شیری پێ دێتە ناو گوانەوە ) . ئەڵێ : دەستی بە سەرمدا هێنا و ، فەرمووی: (( یا غلام ! یرحَمُكَ الله ، فإنكَ عَليمٌ مُعَلَّمٌ )) . فەرمووی : ڕۆڵەگیان ! خوای گەورە ڕەحم و سۆزی بڕژێنێ بەسەرت دا ، دوایی فێر ئەبیت . هەر بەم مانایە بەیهەقییش تەخریجی کردووە و ، تیایا ئەڵێت : منیش گیسکێکی مێچکەم بۆ هێنا و ، گرتی و ، پاشان دەستی بە گوانیا هێنا و دوعای کرد و ، ئەبوبەکریش قاپێکی بۆ هێنا و شیری دۆشی‌یە ناوی و ، دەرخواردی ئەبوبەکری دا و ، پاشان خۆیشی خواردیەوە .( کذا في البداية : ٦ / ١٠٢ ) .[٢١٤]

ج ـ دوعای گرانیی :

قوڕەیش زۆر نالەبار بوون ، چونکە بە چاوی خۆیان هەڵوێستی جوانی پێغەمبەر و هاوەڵانیان ئەدیی و ، ڕێكوپێکیی قورئانی پیرۆز سەرنجی هەموویانی ڕاکێشا بوو و ، لەم لاو لەو لاوە کەسانی ژیر و بەسەلیقە ئەهاتن و بە چەند ساتێکی کەم لە ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوا ﷺ و پاکیی دینەکەی ئەگەیشتن و ئیمانیان ئەهێنا ، کەچیی قوڕەیش هەر ملەجەڕەیان ئەکرد و ، ئازاری ئیمانداران ئەدا ، تا ئەوەبوو جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لێ کردن و ، فەرمووی : (( أللهم أعِنّي عليهم بِسَبعٍ كسبعِ يوسفَ )) . فەرمووی : خوایە یارمەتییم بدەی تا بە سەریاندا زاڵ ببم ، بەوەی کە حەوت ساڵ گرانی‌یان ، بە وێنەی حەوت ساڵە گرانی‌یەکەی یووسف پێغەمبەر سەلامی لێ بێ ، تووش بکەی. ئەوەبوو بەم دوعایە خوای گەورە یەك ساڵ گرانیی هێنا بە سەریانا کە ئەوەبوو شتی پیس و مردارەوەبوو و ئێسقانیان ئەخوارد ، هەتا هی وایان هەبوو لە برسان دا شتێکی وەك دووکەڵی لە نێوان خۆی و ئاسماندا ئەبینیی . پاشان ئەبوسوفیان لەگەڵ چەند پیاوێکی خزمی‌دا هاتنە خزمەتی و ، وتیان : ئەی موحەممەد ! تۆ وای ئەگەیەنی کە بە شێوەی ڕەحمەت ڕەوانە کراوی ، کەچیی وا خزمەکانت تیاچوون . لە خوا بپاڕێرەوە بۆیان . ئەوەبوو پێغەمبەری دڵ پڕ لە ڕەحم و شەفەقەت بۆیان پاڕایەوە و ، خوای گەورەش گرانی‌یەکەی لەسەر لابردن و ، بارانیان بۆ باریی و ، حەوت ڕۆژ لەسەر یەك بارانی زۆریان بۆ باریی ، بە ڕادەیەك

---

[٢١٤] شرح حياة الصحابة : ٤ / ٤٩٣ ـ ٤٩٤ .

که خەڵکەکە بە دەست بارانی زۆرەوە هاواریان لێ هەڵسا ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : (( أللهم ! حوالينا ولا علينا )) . فەرمووی : خوایە ! لە دەور و بەرمانا بیبارێنە ، نەك لەسەرمان .. ئەوەبوو هەورەکە لەسەریان رەوییەوە و ، باران بە دەوریانا بۆ خەڵکەکە باریی . خوای گەورەش لە قورئاندا ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە :

﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ۝١٠ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ۝١١ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ۝١٢ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ۝١٣ ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ ۝١٤ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ ۝١٥ ﴾ ( الدخان : ١٠ ـ ١٥ ) .

کەچیی بت پەرستەکان گەڕانەوە سەر گومڕایی و کوفری خۆیان و ئیمانیان نەهێنا ، خوای گەورەش هەڕەشەی گەورەتری لێ کردن :

﴿ يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ۝١٦ ﴾ ( الدخان : ١٦ ) .

ئەمەش یان هەڕەشە بوو بۆ تێك شکانیان لە جەنگی بەدردا ، یان هەڕەشەی سزای قیامەت بوو .[215]

**نۆهەم : جەنگی رۆم و فارس**

پێش کۆچ کردن بۆ مەدینە جەنگێك لە نێوان فارس و رۆمدا رووی دا ، کە ئەوەبوو فارسەکان بەسەر رۆمەکاندا زاڵ بوون و ، بت پەرستەکانی مەککەش بەم سەرکەوتنە دڵ خۆش بوون ، بە بۆنەی ئەوەوە کە ئێرانیی یەکان وەك خۆیان بت پەرست بوون .. لە هەمان کاتدا موسڵمانەکانیش ئەو ژێرکەوتنەی رۆمەکانیان پێ ناخۆش بوو و ، ئەوەیان پێ خۆش بوو کە رۆمەکان سەرکەون ، بە بۆنەی ئەوەوە کە ئەوانیش وەك خۆیان هەڵگری دینی ئاسمانن و ، هەردووکیان کتێبی ئاسمانیی یان بۆ هاتووە .

بەم بۆنەوە بت پەرستەکان کە ئەکەوتنە گفت و گۆ لەگەڵ موسڵمانەکاندا ، خۆشیی یان دەرئەبڕیی و ئەیان وت : ئێوە خاوەنی کتێبن و ، نەصاراش خاوەنی کتێبن ، ئێمەش ئومیین و ، برا هاودینەکانی وڵاتی فارسمان بەسەر برا هاودینەکانی ئەهلی کیتابی ئێوەدا سەرکەوتوون . جا ئەگەر ئێوەش بێن بە

[215] تفسير إبن كثير والبغوي: ٧ / ٤٢٠ ـ ٤٢١، نقلاً من السيرة النبوية لأبي شهبة :١ / ٣٨٧ ـ ٣٨٨ .

گۆمانا ئەوا بەسەرتاندا سەر ئەکەوین .. بەم بۆنەوە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارەوە :

﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥ وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ۝٦ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ۝٧﴾ ( الروم : ١ـ ٧ ) .

که ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە و ئەبوبەکری صددیق خوا لێی ڕازیی بێ لە واتاکەیان تێ گەیشت ، بۆی ڕوون بووەوە کە خوا بەڵێنی سەرکەوتنی ڕۆمەکانی داوە بۆیە کە هاتە دەرەوە ناو کافران پێی فەرموون : ئایا بە سەرکەوتنی براکانتان بەسەر براکانماندا دڵتان خۆش بووە ؟! با دڵتان خۆش نەبێ و ، خوای گەورە چاوتان ڕوون نەکاتەوە .. دە بەخوا خوا ڕۆمەکان بەسەر فارسەکاندا زاڵ ئەکات . ئەمەش هەواڵێکە پێغەمبەرمان ﷺ پێی ڕاگەیاندووین .

ئومەییەی کوڕی خەلەف بۆی هەستایەوە و ، وتی : ئەبوفەصیل ! درۆت کرد . ئەبوبەکر فەرمووی : تۆ خۆت درۆت کرد ، ئەی دوژمنی خوا ! وتی : گرەوت لەگەڵدا ئەکەم لەسەر دە وشتری بەهێزی کەم تەمەن ، ئەگەر تا ماوەی سێ ساڵ ڕۆم بەسەر فارسدا سەرکەوت ، ئەوا من ئەدۆڕێم و ، گەر فارسیش بەسەر ڕۆمدا سەرکەوت تۆ ئەدۆڕێیت . ئەمە هێشتا گرەو لە ئیسلامدا حەرام نەکرابوو .

ئەبوبەکر گەڕایەوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی دایە و ، ئەویش فەرمووی : (( ما هكذا ذكرت ، إنما البضع ما بين الثلاث إلى التسع ، فزايده في الخطر ومادّه في الأجل )) . فەرمووی : وام باس نەکردووە ، بەڵکو وشەی ( بضع ) سێ هەتا نۆ ئەگرێتەوە . بڕۆ گرەوەکەی بۆ زیاد بکە و ، ماوەکەیش درێژ بکەرەوە .

ئەبوبەکر چووە دەرەوە و تووشی ئوبەی هات و پێی وت : لەوە ئەچێ پەشیمان بیت ؟ ئەبوبەکر فەرمووی : نەخێر ، وەرە با گرەوەکەت بۆ زیاد بکەم و ،

ماوەکەشت بۆ درێژ بکەمەوە ، گرەوەکە بکە بە صەد وشتر و ماوەکەش تا نۆ ساڵ . وتی باشە .

بەر لەوەی نۆ ساڵەکە تەواو بێ رۆمەکان بەسەر فارسەکاندا زاڵ بوون و ، بەمەش موسڵمانەکان زۆر دڵخۆش بوون ، وا ئەوەی کە قورئان بەڵێنی دابوو هاتە دیی و ، هەواڵدانەکەی پێغەمبەریش ﷺ بە راست دەر چوو ، بەوەی کە رۆمە خاوەن کتێبەکان بەسەر فارسە ئاگرپەرستەکان دا سەرکەوتن .

ئەم سەرکەوتنەی رۆم نەزانراوە لە چ ساڵێکدا بووە ئەوەندە هەیە کە ئەبوبەکر ئەم گرەوەی لە مەککەدا و پێش کۆچ کردن کردووە و ، دوای کۆچ کردنیش رۆمەکان سەرکەوتنیان بە دەست هێناوە . جا هەندێك ئەڵێن دوای بەدر سەرکەوتوون و ، هەندێکیش ئەڵێن لە ساڵی حودەیبییەدا بووە ، بەڵام یەکەمیان راست ترە .[٢١٦]

**دەهەم : ساڵی مانەمینیی**

بە دڕاندنی نووسراوە ستەمکارانەکە خەم و مەینەتیی و برسێتیی لە کۆڵ نەوەی هاشم و نەوەی موطەللیب کەوتن و ، پێغەمبەری خواش ﷺ باری سەر شانی سووك بوو و ، کاروباری مەککە وەك جاران ئاسایی بوویەوە ، بەڵام ئەوە بوو دوو رووداوی گرنگ روویان دا و ، هەردووکیشیان بوونە مایەی خەم و پەژارەیەکی زۆر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەمانەن :

**أ ـ کۆچی دوایی ئەبوطالیب :**

رووداوی یەکەمیان بریتیی بوو لە کۆچی دوایی مامە و پشتیوان و کۆمەکیی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە ئەوە بوو ئەبوطالیب تەمەنی لە هەشتا ساڵیی تێ پەڕیی بوو و ، چەند ساڵێکیش بوو لە مەینەت و ئازاردا ئەژیا ، بە تایبەت سێ ساڵی دابڕانەکە و نووسراوە ستەمکارانەکە ، هەموو ئەمانە هێزیان لێ بڕیی بوو ، ئیتر ئەوەبوو دوای بەسەرچوونی ئابڵووقە ئابووری‌یەکەی قورەیش چەند مانگێکی کەم ژیا ، نەخۆشیی زۆری بۆ هێنا و کەوتە جێگاوە .

کە بتپەرستەکان ئەمەیان دیی ، بیریان کردەوە وا چاکە تا ئەبوطالیب نەمردووە تەگبیرێکی موحەممەدی برازای بکات ، ئەگینا گەر قورەیش ئێستە واز بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهێنێت و ، ئەبوطالیب ناچار نەکەن تا ماوە کۆڵ بە

---

[٢١٦] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٨٩ ـ ٣٩٠ .

برازاکەی بدات ، ئەوا دوای مردنی ئەبوطالیب دەست بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەرن لەناو عەرەبەکاندا ئابڕوویان ئەچێت .. بۆیە هاتنە سەر ئەوەی کە جارێکی تر بە ئاگاداربوونی ئەبوطالیب هەوڵ بدەن ڕێك بکەون ..

ئیبن ئیسحاق و غەیری ئەویش ئەگێڕنەوە کە : کاتێك ئەبوطالیب نەخۆش کەوت و ، قوڕەیشیش قورسیی نەخۆشی‌یەکەیان بەرگوێ کەوت ، هەندێ بە هەندێکیان وت : حەمزە و عومەر موسڵمان بوون و ، دینی موحەممەدیش لەناو هەر هەموو هۆزەکانی قوڕەیش‌دا پەرەی سەندووە . وەرن با بچین بۆ لای ئەبوطالیب تا برازاکەی دەستکۆتا بکات و ، شتێکیش لە ئێمەوە وەربگرێ و بیداتێ . چونکە ئێمە ئەترسین ئەم ریش سپی‌یە بمرێت و ، شتێکیش تووشی ئەو ببێت . ئەو کاتە لەبەر چاوی عەرەب‌دا سووك و رسوا ببین ، بەوەی کە بڵێن : وازیان لێ هێنا ، بەڵام کە مامەی مرد دەستیان بۆ برد .

پیاوماقووڵانی قوڕەیش ، بە وێنەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و ، شەیبەی برای و، ئەبوجەهلی کوڕی هیشام و ، ئومەییەی کوڕی خەلەف و ، ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب لەگەڵ چەند پیاوماقووڵێکی تردا کە ژمارەیان ئەگەیشتە بیست و پێنج کەسێك ، خۆیان گەیاندە لای ئەبوطالیب و قسەیان لەگەڵ کرد . وتیان : ئەبوطالیب ! تۆ خۆت ئەزانیی چۆن پیاوێکی بەلامانەوە ، ئەبینی وا ئەمەشت بەسەردا هاتووە و ، ئەترسین شتێکت بەسەر بێت . ئەشزانیی شتێك لە نێوان ئێمە و برازاکەت‌دا هەیە . جا بانگی بکە و ، شتێك لە ئێمە بپچڕە بۆ ئەو و ، شتێکیش لەو بپچڕە بۆ ئێمە ، تا وازمان لێ بهێنێ و ، ئێمەش واز لەو و لە دینەکەی بهێنین .

ئەبوطالیب وتی : کوڕی برام ! ئەمانە پیاوماقووڵانی قەومەکەتن ، وا هاتوون و کۆبوونەتەوە ، تا شتێکت پێ بدەن و تۆش شتێکیان بەوان بدەی . پاشان ئەوەی کە ئەوان وتبوویان بۆی گێڕایەوە ، کە هیچ کامیان دەست بۆ هیچ لایەك نەبەن .

پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو : (( أرأيتم إن أعطيتُكم كلمةً تكلمتم بها، ملكتم بها العربَ ودانت لكم بها العجمُ )) .

ئەفەرموێ : تەنها یەك وشەم لەوان ئەوێ کە بیڵێن ، ئیتر بەوە ئەبنە پادشای عەرەب و ، عەجەمیش ملیان بۆ کەچ ئەکات .

وەك بفەرموێ : ئەوان لەوە ئەترسن کە بەم دینەی من تووشی زیان بن . نەخێر من چاکەم بۆیان هێناوە . تەنها وشەیەك بڵێن با قازانج بکەن .
لە ریوایەتی ئیبن ئیسحاقدا وەها هاتووە : (( كلمة واحدة تعطونها ، تملكون بها العرب ، وتدين بها العجم )) .
کاتێك کە ئەمەی فەرموو ، هەموو سەرسام بوون .. وەستان .. حەپەسان .. نەیانئەزانی ئەو تاقە وشە ، کە تا ئەو رادەیە بەکەڵك و سوودبەخشە ، چۆن بیدەنە دواوە ..
هەر هەموو بێدەنگ وەستابوون .. تۆ بڵێی راست بکا ؟ دەی خۆ (( الصادق الأمين )) هەرگیز درۆ ناکات .. تەنها وشەیەکیش زۆر ئاسانە ..
ئەبوجەهل بێدەنگیی و حەپەسانی کۆتایی پێ هێنا و ، پرسیی : ئەو وشەیە کامەیە ؟ بەسەری باوکت دە ئەوەندەشت بۆ ئەڵێین !
فەرمووی : (( تقولون : لا إله إلا الله ، وتخلعون ما تعبدون من دونه )) .
فەرمووی : بڵێن ( لا إله إلاّ الله ) و ، واز لە پەرستنی غەیری خوا بهێنن .
دەستیان دا بە یەكدا و ، پاشان وتیان : ئایا ، ئەی موحەممەد ! ئەتەوێ خواکان بکەی بە یەك خوا ؟ کاری تۆ سەیرە !
پاشان هەندێ بە هەندێکیان وت : بەخوا ئەم پیاوە هیچێ لەوەتان ناداتێ کە ئێوە ئەتانەوێ ، هەستن برۆن شوێن دینی باوباپیرانتان بکەون ، هەتا خوا حوکمی نێوانتان ئەکات . پاشان بڵاوەیان لێ کرد .
جا دەربارەی ئەوانە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە :
﴿ صٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ۝١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ۝٢ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ۝٣ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ۝٤ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ۝٥ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ۝٦ مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ۝٧ ﴾ ( ص : ١ ـ ٧ ) .[٢١٧]
پێغەمبەری خوا لەسەر ئیمانهێنانی مامەی زۆر سوور بوو و ، بە ئاواتەوە بوو کۆتایی تەمەنی ئیمانداریی بێ و ، بەختەوەریی دنیا و قیامەتی دەست گیر

[٢١٧] الرحيق المختوم : ١١٤ ـ ١١٥ .

ببێ . ئەمەش نەك هەر لەبەر ئەوەی کە مامەیەتی ، بەڵکو لەسەر ئەوەی کە مرۆڤێکە و ، بەڵکو لە ئاگر سەرفراز ببێ ، لەلایەکی تریشەوە یەکجار دڵسۆز بوو بۆ پاراستنی پێغەمبەری خوا ﷺ . بەڵام چەندە پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی ئەدا ، لەولاوە شەیتانەکانی ئینس بە پێچەوانەوە لە ئیمان‌هێنان ساردیان ئەکردەوە .

بوخاریی لە صەحیحەکەی‌دا ڕیوایەتی کردووە کە کاتێ ئەبوطالیب کەوتە گیان کەنشت پێغەمبەر ﷺ تەشریفی بردە ژوورەوە لای و ئەبوجەهلیش بە لایەوە بوو . فەرمووی : (( أي عم ! قل : لا إله إلا الله ، كلمة أحاجُّ لك بها عندالله )) . وفي رواية : (( أشهد لك بـها عند الله )) . فەرمووی : مامەگیان ! بڵێ : لا إله إلا الله ، یەك وشەیە شاهێدییت بۆ ئەدەم لای خوا . ئەبوجەهل و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئومەییە وتیان : ئەبوطالیب ! پشت لە میللەتی عەبدولموطەللیب هەڵ ئەکەی ؟ هەروا خەریك بوون ئەیان‌دواند ، تا ئەوەبوو دوا شتێك کە بەوانی وت : ئەو[218]وا لەسەر میللەتی عەبدولموطەللیب . دوای ئەوەش پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( لأستغفرن لك ما لم أُنْهَ عنك )) . فەرمووی : هەتا قەدەغە نەکرێم ، داوای لێ‌خۆش‌بوونت بۆ ئەکەم . ئەوەبوو ئایەتی :

﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓاْ أُوْلِى قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾ ( التوبة : ١١٣ ) .

هەروەها ئایەتی :

﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾ ( القصص : ٥٦ ) هاتنە خوارەوە .

بەڵام حافیظ ئیبن حەجەر لە ( فتح الباري ) دا بە دووری ئەزانێ کە ئایەتەکەی ( التوبة ) بەو بۆنەوە هاتبێتە خوارەوە ، چونکە چیرۆکی ئەبوطالیب لە مەککەدا بووە و سوورەتی ( التوبة ) ش لە کۆتایی قۆناغی مەدینەدا هاتۆتە خوارەوە ..[219]

هەر چۆنێ بێ دەربارەی موسڵمان‌بوون و نەبوونی ئەبوطالیب شت نووسراوە .. هەندێ ئەڵێن ئیمانی هێناوە و هەندێکیش دانی پێ‌دا نانێن . بۆیە پێم خۆش بوو بە ڕای خواناسێکی بەرچاو ڕۆشن ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەمەوە .

---

[218] . ڕاویی بۆ ئەوەی شیرك بۆ خۆی بڕیار نەدا ، ئەگەرچیی بە دەمیش بێت ، لە جیاتیی ( من ) ( ئەو ) ی بەکار هێناوە ، بەڵام ئەبوطالیب وشەی ( من ) ی بەکار هێناوە .

[219] . السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٩٢ _ ٣٩٣ .

مامۆستا بدیع الزمان سەعیدی نوورسیی لە ( كلیات رسائل النور / المكتوبات : ٤٩٩ ) دا ئەمەی نووسیوە :

ئەپرسن : راستترین وتە دەربارەی ئەبوطالیبی مامەی چییە ؟

وەلاّم : شیعە ئەلێن : ئیمانی هێناوە ، کەچیی زۆربەی ئەهلی سوننە ئالێن ئیمانی هێناوە .

بەلاّم ئەوەی کە بە دلّمدا هات ئەمەی خوارەوەیە :

ئەبوطالیب بە شێوەیەکی یەکجار پاك و بێگەرد کەسێتیی پێغەمبەری ﷺ خۆش ئەویست . خۆی خۆش ئەویست نەك پەیامەکەی . جا بێگومان ئەو خۆش ویستنە یەکجار پاك و بێگەردەی و ، ئەو شەفەقەتە بەهێزەی بۆ کەسێتیی پێغەمبەر ﷺ هەروا بە هەدەر ناڕوا و ، لای خوا نافەوتێت .

بەلێ ، ئەو ئەبوطالیبەی کە خۆشەویستی ( رب العالمین ) ی بەو پلە پاك و بێگەردە خۆش ویستبێ و ، لە دوژمنان پاراستبێتی و ، پشتگیریی خۆی بۆ نواندبێ ، هەتا ئەگەر بچێتە دۆزەخیشەوە ، بە بۆنەی ئەوەوە کە ـ لە شەرمانا و لەبەر دەمارگیریی نەتەوایەتیی و هەستی تری لەو شێوە ، نەك بە عینادیی و مل بادان ـ ئیمانێکی وەرگیراوی دەرنەخستبێ ، ئەوا خوای پاكوبێگەرد توانای ئەوەی هەیە کە لە ناو دۆزەخدا ، لە پاداشتی چاکەکانیدا ، بەهەشتێکی تایبەت بەو بەدیی بهێنێ و ، دۆزەخە تایبەتیەکەی ئەو بۆ بەهەشتێکی تایبەت بگۆڕێ ، بە وێنەی ئەوەی کە جار جار لە زستانێکی سارد و سەختدا بەهارێکی رازاوە بەدیی ئەهێنێ و ، بە وێنەی ئەوەش کە بەندیخانەیەکی تەنگ ـ بە هۆی خەوبینینی کەسێکەوە ـ ئەگۆڕێ بۆ کۆشکێکی بلند .

زانستیش هەر لای خوایە و .. جگە لە خوای گەورەش هیچ کەس غەیب نازانێ ..

﴿ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ .

کە ئەبوطالیب کۆچی دوایی کرد قوڕەیش بەو پەڕی بێڕەحمیەوە دەستیان دایە ئازاردانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەلاّم چۆن ئازاردانێك . هەتا ئەوەبوو یەکێ لە سەفیهەکانی قوڕەیش رێی پێ گرت و ، خۆلّی بە سەریدا کرد ، ئەویش هەر بە خۆلّەکەوە تەشریفی بردە مالّەوە و ، یەکێ لە کچەکانی هەستا بە دەمیەوە و ، خۆلّەکەی بە سەریەوە تەکاند و دەستیشی بە گریان کرد و ، پێغەمبەری خوایش

ﷺ پێی ئەفەرموو : (( لا تبكي يا بنية ، فإن الله مانع أباك )) . ئەی فەرموو : کچەکەم ! مەگریی ، خوا خۆی باوکت ئەپارێزێ .

ئەشیفەرموو : (( ما نالت مني قريش شيئاً أكرهه حتى مات أبوطالب )) . ئەی فەرموو : تا ئەبوطالیب نەمرد بوو قوڕەیش شتێکی وەهای لەگەڵدا نەکردم کە پێم ناخۆش بێ .

لە ئەبوهورەیرەشەوە خوا لێی ڕازیی بێ ئەگێڕنەوە کە وتوویە : کە ئەبوطالیب کۆچی دوایی کرد قوڕەیشی‌یەکان بە زبریی و ڕووی تاڵەوە بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ وەستان ، ئەویش ئەیفەرموو : (( يا عم ! ما أسرع ما وجدت فقدك )) . ئەیفەرموو : ئای مامەگیان ! چەند بە خێرایی نەمانی تۆم پێوە دەرکەوت .[٢٢٠]

شایانی باسە کە کۆچی دوایی ئەبوطالیب لە مانگی ڕەجەبی ساڵی دەهەمی پێغەمبەرایەتیی بووە ، دوای ڕزگاربوونیان لە نووسراوە ستەمکارانەکە بە شەش مانگ . وتراویشە لە مانگی ڕەمەزان دا بووە و پێش کۆچی خەدیجە بە سێ ڕۆژ .[٢٢١]

**ب ـ کۆچی دوایی خەدیجە :**

خەدیجەی دایکی ئیمانداران خوا لێی ڕازیی بێ لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی دەهەمی پێغەمبەرایەتیی‌دا ، لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵیی‌دا کۆچی دوایی کردووە ، کە ئەو کاتە تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجا ساڵ بووە .

کۆچ‌کردنی خەدیجە ڕووداوی دووهەمی پڕ لە خەم و پەژارە بوو لە ژیانی ئازیزدا .. چونکە خەدیجە خاوەنی پلە و پایەیەکی یەکجار بەرز بوو لەناو قەومەکەی‌دا و ، وەزیرێکی ڕاستگۆ و ، هاوسەرێکی دڵسۆز و ژیر و خواناس بوو .. پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆح و دڵ و دەروونی لەگەڵیا ئەحەسانەوە .. هەرچی قوڕەیش ئازاریان بدایە ، ئەو دڵی ئەدایەوە و خەمی ئەڕەواندەوە ..

کاتێك کە خەولەی کچی حەکیم پێی وت : ئەی پێغەمبەری خوا ! وات ئەبینم کە بە بۆنەی لەدەست چوونی خەدیجەوە خەم و خەفەتت لەلا جەم بووە ، فەرمووی: (( أجل ، كانت أم عيال ، وربة بيت )) . فەرمووی : بەڵێ ، خەدیجە دایکی منداڵ و، کەیبانووی ماڵ بوو .

---

[٢٢٠] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٣٩٦ وشرح حياة الصحابة : ١ / ٤٤٢ .

[٢٢١] الرحيق المختوم : ١١٦ .

خەدیجە بە پێی فەرموودەی صەحیح ، بیست و پێنج ساڵ هاوسەری بووە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنی گەنجێتیی و کاملیی خۆی لەگەڵیا بەسەر بردووە ، بێ ئەوەی دڵی بێت ژنی تری بەسەردا بێنێ ، ئەمەش لەبەر خاتری ئەو خزمەتە زۆر و پڕبەرەکەتە کە خەدیجە پێشکەشی دینی خوای ئەکرد ، تا دڵی گەرد نەگرێ ، چونکە ئەو هەموو هۆیەکی حەسانەوەی دەروون و لاشەی بۆ ئەم رەخساندبوو و ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە هیچی کەم نەبوو . بۆیە پێغەمبەری خوایش ﷺ زۆر بە جوانیی و چاکتر پاداشتی ئەو چاکانەی خەدیجەی دایەوە .

زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە ، دوای فاطیمەی کچی پێغەمبەر، چاکترین ئافرەتی ئوممەتی ئیسلام هاوسەرە بەرێزەکانی پێغەمبەرن . ئەوەتا قورئان ئەفەرموێ :

﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴾ ( الأحزاب : ٣٢ ) .

جا لەناو دایکانی ئیمانداران‌یش‌دا چاکترینیان خەدیجە و عائیشەن . بەڵام هەندێ لایان وایە کە خەدیجە پایەدارترە و ، هەندێکیش لایان وایە عائیشە و ، هەندێکیش لەسەر ئەوە وەستاون و بڕیاری پایەداریی هیچ کامیان نەداوە . بەڵام ئیمام ( السبكي ) وای داناوە کە خەدیجە ، پاشان عائیشە ، پاشان حەفصە ، پاشان ئەوانی تر پایەدارترن ، لە راستیی‌دا خەدیجە شیاوی ئەوەیە کە یەکەم بێت چونکە یەکەم کەس بوو کە ئیمان بهێنێ و ، سەروماڵیشی خستبووە خزمەتی ئیسلامەوە و لە رۆژانی سەخت و دژواردا دانی بە خۆی‌دا گرت و لەسەر دینی خوا کۆڵی نەدا ..

بوخاریی و موسلیم لە صەحیحەکەیان‌دا لە ئیمام عەلی‌یەوە ـ خوا لێی رازیی بێ ـ ریوایەتیان کردووە کە فەرموویە : گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە فەرموویە : (( خير نسائها مريم بنت عمران ، وخير نسائها خديجة بنت خويلد )) . ئەفەرموێ : چاك ترین ئافرەت مەریەمی کچی عیمرانە و ، چاك ترین ئافرەتیش خەدیجەی کچی خوەیلیدە ، هەر یەکەیان لەسەردەمی خۆی‌دا ..

هەروەها بوخاریی و موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەت ئەکەن کە وتوویە : جیبریل هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوە خەدیجەیە وا بە دەفرێکەوە کە پێخۆر ، یان خواردن ، یان

خواردنەوەی تێدایە هات ، جا کە هاتە خزمەتت لە پەروەردگاریەوە سەلامی پێ بگەیەنە ، هەروەها لە منیشەوە و ، مژدەی کۆشکێکی لە لوئلوئی کلۆر دروست کراوی لە بەهەشتدا بدەرێ ، کە نە دەنگە دەنگ و ، نەماندوو بوونی تێدا نیە .

خەدیجە پایە و پلەی ئەوەندە بەرز بوویەوە کە پەروەردگاری سەلامی لێ بکات ، دیارە ئەم پایە و پلەیە دەست هیچ کام لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ نەکەوتووە و ، ئەوەش دەربارەی پایە و پلەی عائیشە چەسپابێ ئەوەیە کە جیبریل سەلامی لێ بێ سەلامی لێ کردووە . جا ئەو پلە بەرزە بۆ خەدیجە لە پاداشتی ئەو هەمووە خزمەتەدا بوو کە لە سەرەتاوە ئەو ـ لە کاتی بێکەسیی و بێدەریی‌دا ـ پێشکەش بە بانگی خواناسیی کرد .

لە ڕیوایەتەکەی ( الطبراني )دا ئەوەشی بۆ زیاد کراوە کە کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە جیبریلەوە سەلامەکەی پەروەردگاری پێ ئەگەیەنێ ، وەڵامی سەلامەکە بەم شێوەیە ئەداتەوە : (( هو السلام ، ومنه السلام ، وعلى جبريل السلام )) . لە ڕیوایەتەکەی ( النسائي ) یش‌دا ئەمەی لەگەڵدایە : (( وعليك يا رسول الله السلام ، ورحمة الله وبركاته )) . ئەمەش ژیریی و سەلیقە و ئەدەببەرزیی خەدیجە دەرئەخات ، خوا لێی ڕازیی بێت ..

بەڵگەیەکی تر لەسەر پایەبەرزیی خەدیجە لە پایەی عائیشە خوا لە هەردووکیان ڕازیی بێ ، ئەم فەرموودەیە کە ئیبن مەردەوەی لە تەفسیرەکەی‌دا ، بە سەنەدێکی صەحیح ، ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( كَمُلَ مِنَ الرِّجالِ كثيرٌ ، ولم يَكمُلْ مِنَ النساء إلا ثلاثٌ : مريم بنت عمران ، وآسية امرأة فرعونَ ، وخديجة بنت خويلد ، وفَضل عائشة على النساء كفضل الثريد على سائر الطعام )) .

فەرمووی : لە پیاوان‌دا زۆرێك کامڵ بوون و ئیمانی تەواویان دەستگیر بووە، بەڵام لە ئافرەتان‌دا سێ ئافرەت کامڵ و ئیمان تەواو بوون : مەریەمی کچی عیمران و ، ئاسیەی هاوسەری فیرعەون و ، خەدیجەی کچی خوەیلید . پایە بەرزیی عائیشەش بەسەر ئافرەتانی تردا وەك پایەی گۆشتاوە بەسەر خواردنی تردا . ئەو خواردنە لەناو عەرەبەکان‌دا لە هەموو خواردنێك بە لەزەتتر بووە .

کە لێرەدا سەرنجێك لەو سێ ئافرەتە کامڵە ئەدەین ، بۆمان دەرئەکەوێ هەر یەکەیان کۆمەك و پشتیوانی پێغەمبەرێك بووە ..

ئاسیە بووە هۆی سەرنەبڕینی مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێ لەلایەن فیرعەونەوە و ، وەك کوڕی خۆی پەروەردەی کرد و ، کاتێکیش کە بووە پێغەمبەر تەصدیقی کرد و ، لە پێناوی دینەکەیدا بە شەهیدیی سەری نایەوە ..

مەریەمیش بەخێوکردن و پەروەردەکردنی عیسا پێغەمبەری سەلامی لێ بێ خرایە ئەستۆ و ، کاتێکیش کرایە پێغەمبەر تەصدیقی کرد و ئیمانی بە دینەکەی هێنا ..

خەدیجەش یەکەم کەس لە سەرزەوییدا ئیمانی بە پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا و، بە دڵ و بە گیان بووە کۆمەك و پشتیوانی و ، بە سەروماڵ یارمەتیی بانگی ئیسلامی ئەدا و ، بە چاكترین شێوەش لە نارەحەتیی و ڕۆژانی سەختدا دڵی پێغەمبەری ﷺ ئەدایەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ رەنج و خزمەتی خەدیجەی لەبەر چاو بوو ، بۆیە هەر وەك لە ژیانیدا بە چاكترین شێوە لەگەڵیا ئەژیا و ، نەیئەهێشت بە هیچ شێوەیەك دڵی گەرد بگرێ ، بەوەی کە ژنی بەسەریدا نەئەهێنا ، ئەوا لەدوای مردنیشی بە هەمان شێوە ڕێزی لێ ئەگرت و ، هەردەم ناوی ئەبرد و ، باسی چاکەکانی ئەکرد و ، رەحمەتی بۆ ئەنارد و ، چاکەی لەگەڵ دەستە خۆشکانیدا ئەکرد و ، هەر کەسێکیش پەیوەندیی خزمایەتیی بەوەوە ببوایە ڕێزی لێ ئەگرت . دیارە ئەگەر لای خەڵکی تر چاکە بفەوتێ ، یان لە بیر بچوێتەوە ، ئەوا لای مامۆستای تاقانەی مرۆڤایەتیی هەرگیز لە بیر ناچڕێتەوە .. ئەوەتا ئازیزمان ﷺ ئامۆژگارییمان ئەکات کە هەر کەس چاکەی لەگەڵدا کردین با بە چاکە پاداشتی بدەینەوە ، ئەگەر نا با دوعای خێری بۆ بکەین ، کە ئەفەرموێ : (( مَن أَسدى إليكم معروفاً فكافئوهُ ، وإلا فادْعُوا له )) [٢٢٢] .

ئەوەبوو لە غەزای بەدری گەورەدا ئەبولعاصی کوڕی رەبیع کە زاوای پێغەمبەر بوو و ، مێردی زەینەبی کچە گەورەی بوو خوا لێیان رازیی بێ ، بە دیل کەوتە دەست موسڵمانەکان و ، ناچار ژنە دڵسۆزەکەی فیدیەی نارد بۆ مەدینە هەتا مێردەکەی ئازاد بکرێت . ئەوەبوو ئەو فیدیەیە ملوانکەیەکی زێڕی تێدا بوو کە خەدیجە شەوی شووکردنی زەینەبی کچی پێشکەش بە زەینەبی کردبوو .. کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بە ملوانکەکە کەوت ، دڵی یەکجار پەرێشان بوو ،

---

[٢٢٢] رواه أبوداود والنسائي بسند صحيح بلفظ (( مَن صَنعَ )) .

خەدیجە و ڕۆژانی سەختی بانگەوازی مەککە و ، مەینەت و سزاچەشتنی خەدیجە و، ئازاردانی کچەکانی کە ئەوەبوو دەستگیرانی کوڕانی ئەبولەهەب بوون و ، تەڵاقیان دان ، ئەمانەی هەموو هاتەوە یاد .. ئەوەبوو هاوەڵان هەستیان بەم دڵ گرانییە و ، وەبیرهاتنەوەی ڕۆژانی رابردووی کرد . جا پێغەمبەری خوا ﷺ نەیویست خۆی یەکسەر بڕیار بدا ، بەڵکو داوای لە هاوەڵان کرد کە ئەم ملوانکەیە هی خەدیجە بووە و بە دیاریی پێشکەشی زەینەبی کردووە ، ئەگەر بە چاکی ئەزانن با ملوانکەکە بنێرنەوە بۆ زەینەب و دیلەکەشی بۆ بەر بدەن ، کە فەرمووی : (( إن رأيتم أن تطلقوا لها أسيرها ، وتردُّوا عليها قِلادَتَها فافعلوا )) . هاوەڵانیش بە چاوان فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد و ، بە دڵە پاکەکانیان هەستیان بە تاسەمەندیی دڵی ئازیزیان کرد ..

پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە یادی خەدیجەی ئەکرد و ، بە چاکە ناوی ئەبرد و، ستایشی ئەکرد .

نەك تەنها خۆش‌ویستن و ڕێزگرتن لە خەدیجە خۆی ، بەڵکو خۆشەویستان و دەستەخوشکانیشی خاوەنی ڕێزی تایبەتیی بوون . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ سیلەی رەحمی لەگەڵ ئەوانیش‌دا بەجێ ئەهێنا ، هەتا دوای مردنی خەدیجە ، خۆ ئەگەر مەڕێکی سەر ببڕیایە پارچە پارچەی ئەکرد و فەرمانی ئەدا کە گۆشت بۆ دەستە خوشکانی خەدیجە بنێرن کە ئەیفەرموو : (( أرسلوا إلى صديقات خديجة )) .[223]

هەرچیی هالەی کچی خوەیلیدی خوشکی خەدیجە بۆ ماوەخواستن دەنگی ئەهات ، دەنگی خەدیجەی وەبیر ئەهێنایەوە و ، پێی ئەگەشایەوە ..

ئەوەبوو ڕۆژێکیان پیرەژنێکی دەستە خوشکی خەدیجە هات بۆ ماڵیان ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەخێرهاتنی چاکی لێ کرد و بە وردیی حاڵ و ئەحواڵی ئەپرسین . کاتێك کە چووە دەرەوە عائیشە نارەزایی دەربڕیی و وتی : ئەوەندەش روو بەو پیرەژنە ئەدەی ؟ ئەویش تێی گەیاند کە ئەمە لە سەردەمی خەدیجەدا

---

[223] رواه البخاري .

سەردانی ئەکردن و ، وەفادارییش لە ئیمانەوەیە کە فەرموویی : (( إنها كانت تأتينا زمان خديجة ، وإن حسن العهد من الإيمان )) . رواه الحاكم ، والبيهقي في الشعب .[٢٢٤]

دوای کۆچی دوایی خاتوو خەدیجە پێغەمبەری خوا لە مانگی شەووالی سالّی دەهەمی هاتنی وەحی‌دا ئافرەتێکی ئیمان داری مارە کرد کە ناوی سەودەی کچی زەمعە بوو .. ئەم ئافرەتە یەکێ بوو لە موسڵمانە دێرینەکان .. ئەوەبوو بەشداریی کۆچی دووهەمی حەبەشەی کردبوو . سەکرانی کوڕی عەمری مێردیشی لەگەڵیا موسڵمان بوو بوو و کۆچیشی بۆ حەبەشە کردبوو و ، لەوێ لە خاکی حەبەشە ، یان دوای گەڕانەوەی بۆ مەککە ، کۆچی دوایی کردبوو . کە سەودەی هاوسەری عیددەی تەواو کرد پێغەمبەری خوا ﷺ خوازبێنیی کرد و مارەی کرد و ، ئەمە یەکەم ژن بوو کە دوای خەدیجە هێنای . ئەمەش بۆ دڵدانەوەی ئەو ئافرەتە بەڕێزە کە مێردەکەی مردبوو ، ئەگینا ئافرەتێك بوو چوو بوو بە ساڵ‌دا و ، کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ عائیشەی گواستەوە ، سەودە نۆبەی ژن و مێردیی خۆی دا بە عائیشە .[٢٢٥]

**یانزەهەم : سەردانی طائیف**

کە ئەبوطالیب و خەدیجە کۆچی دوایی‌یان کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ یەکجار بێ‌ناز بوو و ، قوڕەیش یەك پارچە بوونە کۆسپی بەردەمی بانگی ئیسلامیی و ، نەفامەکانیش لە رادە بەدەر سزا و ئازاری ئازیزیان ئەدا .. موسڵمانەکان زۆر نارەحەت بوون ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ رووی لە شاری طائیف نا بەڵکو هۆزی ثەقیف پیاوی وەهایان تی‌دا بێ کە ئیمان وەربگرن و ، ببنە پارێزەری بانگەواز ..

ئەوەبوو لە مانگی شەووالی ساڵی دەهەم‌دا بەرامبەر بە هاوینی ( ٦١٩ ) ز ، لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریثەی خزمەتگوزاریا بەرەو طائیف کەوتنە رێ ، کە شەصت میل لە مەککەوە دوور بوو .. رۆیشتن و گەڕانەوەشیان هەر بە پێ بوو . لەوێ لە نێو دانیشتوانی طائیف‌دا دە رۆژ مانەوە و ، خەریك ئەبوون بانگی یەك بە یەکی ناودارانی ثەقیفیان کرد بۆ موسڵمان بوون ، کەچیی تاقە کەسێکیان بە دەمیەوە نەهات و ، ئیمانیان نەهێنا .

---

[٢٢٤] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٣٩٦ ـ ٤٠٠ . ژیان‌نامەی خاتوو خەدیجە لە زنجیرەی هاوەڵان‌دا بە درێژە باس کراوە .

[٢٢٥] الرحيق المختوم : ١١٨ ـ ١١٩ .

هەندێ لەوانەی کە سەری لێ دان سێ کەسی ناودار و ماقوولّیان بوون بە ناوی: عەبدیالەیل و ، مەسعوود و ، حەبیبی کوڕانی عەمری کوڕی عومەیر ، کە سەردار و قسە ڕۆیشتووی هۆزی ثەقیف بوون و ، ئافرەتێکی قوڕەیشییش لە نەوەی جومەح ، بە ناوی صەفیەی کچی موعەممەر هاوسەری یەکێکیان بوو . تەشریفی برد لە لایان دانیشت و ، باسی بۆ کردن کە بۆ کۆمەکیی دینەکەی هاتووە ، تا پشتیوانیی بکەن و ، بەرامبەر بە ناحەزانی کۆمەکی بن .

یەکێکیان وتی : بەرگی کەعبەی دڕیی بێ ئەگەر خوا ئەوی بە پێغەمبەر ڕەوانە کردبێ . دووهەمیشیان وتی : ئایا خوا کەسی دەست نەکەوت لە غەیری تۆ تا بیکاتە پێغەمبەر ؟ سێهەمیشیان کە لەوان ژیرتر بوو وتی : بەخوا من هەرگیز قسەت لەگەڵدا ناکەم . ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوا بیت ، لەوە گەورەتریت کە من وەڵامت بدەمەوە و ، گەر بە دەم خواشەوە درۆت هەڵ بەستبێ ، پێویست ناکات قسەت لەگەڵدا بکەم .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە دڵی شکستەوە لەلایان هەستا و ، دەستی لەوە شۆرد کە ئەوان یارمەتیی بدەن ، بەڵام پێیانی فەرموو: (( إذ فعلتم ما فعلتم فاكتموا عني )) . فەرمووی : ئەوەی کردتان کردتان بەڵام ئەم باسەم بڵاو مەکەنەوە .. پێی ناخۆش بوو دەنگ و باسی بگاتەود مەککە کە سەری لە طائیف داوە و ، ئەو کاتە قوڕەیش زیاتر ئازاری خۆی و هاوەڵانی بدەن . بەڵام ئەو سێ برایە یەکجار نامەرد بوون ، بە گوێیان نەکرد ، بەڵکو چەتوون و بەندە و خزمەتکارەکانیان لە دژی هەڵ نا تا جنێوی بدەنێ و ، بەردە بارانی بکەن ، هەتا هەردوو قولە پێی خوێناویی بوون و ، نەعلەکانی بە خوێن خووساون و ، خوێن سەری کرد و ڕژایە سەر خۆڵەکە و ، زەیدی کوڕی حاریثەی خزمەت گوزاریشی خۆی ئەدایە بەر بەردەکانیان تا پێغەمبەری خوا ﷺ بپارێزێت ، تا ئەوەبوو سەری ئەویشیان شکاند و خوێناوییان کرد . هەروا خەریکی ڕاونان و بەرد تێگرتنیان بوون تا ناچاریان کردن پەنا بەرنە باخچەیەك کە هی عوتبە و شەیبەی کوڕانی ڕەبیعەی خەڵکی مەککە بوو و ، خۆیشیان لەناو باخەکەدا بوون .. شایانی باسە لە پێشەوە باسی عوتبە و شەیبە زۆر هاتووە و هەمیشە خەریکی ئازاردانی پێغەمبەری خوا بوون ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆش بوو بچێتە باخی دوو پیاوی دوژمنی خوا و پێغەمبەرەکەیەوە ، ئەوەبوو لە باخچەکە گەڕایەوە دوا و ، منداڵ و بەندە

چەتوونەکانیش دەستیان لێ هەڵ گرتن و گەڕانە دواوە . ئیتر پێغەمبەری خـوا ﷺ لەگەڵ زەیددا خوا لێی رازیی بێ خۆیان گەیاندە ژێر دارمێوێك و لەوێ دانیشـتن ، تا بەشکوم کەمێ بحەسێنەوە و ماندوێتیی و ئێش و ئازاریان نەمێنێ و ، هــەردوو پیاوەکەش عوتبە و شەیبە تەماشـایان ئـەکرد و ، چـاویان لێ بـوو سـەقیفهەکانی ثەقیف چ ئازارێکیان پێیان گەیاند . بەڵام جووڵـەیان نـەکرد ، بگـرە زۆریـان پـێ خۆش بوو ئەو دیمەنەیان بەو جووتە خواناسەوە ئـەبینی . دوای ئـەوە پێغەمبـەری خوا ﷺ چاوی کەوت بە ئافرەتە قورەیشی‌یەکەی نەوەی جومـەح و گلـەیی ئـەوەی لەلا کرد کە چ سزا و ئازارێکی بە دەست مێـرد و هێوەرەکانیـەوە چەشـت ، کـە فەرمووی : (( ماذا لقينا من أحمائك ؟! )) .

پێغەمبەری خوا ﷺ غەریب و میوان و بێ‌کەس بـوو .. لـە جیـاتی خزمـەت و حەسانەوە و میوان داریی ، دڵی بێ‌گەردی بەو شێوە شکێنرا و کەسێك نەبوو ئـەو منداڵ و بەندە لاسارانەی لێ دوور بخاتەوە . سەرنجی دا ئەو کار بۆ خوا ئـەکات .. لەسەر خوا ئەمەی پێ ئەکرێت .. بەڵێ ئەمرۆ دینەکـەی کـەم پشـتیوانە ، بـەڵام خوای گەورە خۆی کۆمەکیەتی . جا وا چاکە هانا بۆ لای خوا بەرێت تـا دڵەکـەی بحەسێتەوە و ، ماندوێتیی و برسێتیی و خەم و خەفەتی بڕەوێتەوە .. وا چاکە مـل کەچیی و ڕەزامەندیی خۆی بـۆ کـار و بڕیـاری خـوا دەربڕێـت ، تـا بی‌سەلمێنێ بەندەیەکی گوێڕایەڵی دڵسۆزی مل‌کەچە ، تا لە بەرزترین شێوەدا خـوای گـەورە پاداشـتی بـۆ بنووسـێ .. بـۆ ئەمـە دەسـتی دایـە نـزا و پاڕانـەوە ، تـا بـەڵکو پەروەردگاری لێی رازیی بێ و ، فەرمووی :

(( أللهم إليك أشكو ضعف قوتـي ، وقلة حيلتي ، وهوانـي على النـاس ، يـا أرحم الراحمين ، أنت رب المستضعفين ، وأنت ربـي ، إلى مـن تكلـني ؟ إلى بعيـد يتجهمني ؟! أم إلى عدو ملكته أمري ؟! إن لم يكن بك عَلَيَّ غضب فلا أبالي ، ولكـن عافيتك أوسع لي .

أعوذ بنور وجهك الذي أشرقت له الظلمات وصلح عليه أمر الدنيا والآخرة مـن أن تُنـزل بـي غضبك ، أو يحل عليَّ سخطك . لك العتبى حتى ترضى ، ولا حـول ولا قوة إلا بالله )) . رواه إبن إسحاق .

لەم نزایەدا لاوازیی و ، بێ‌دەسەڵاتیی و ، بێ‌بایەخیی بەلای خەڵکەوە بـۆ خـوا دەر ئـەخات و ، دەریشـی ئـەبڕێ کـە خـوای گـەورە پـەروەردگاری لاواز و بـێ

دەسەڵاتانە و ، ئەمیش بە پەروەردگاری خۆی ئەزانێ .. ئەپرسێ : خوایە ! کارم ئەدەیتە دەست کێ ؟ بە دوورینەیەك کە ڕووم لێ گرژ بکات ، یان بە دوژمنێك کە دەسەڵاتی بەسەریدا بڕوا ؟ دواییش دەری ئەبڕێ کە ئەگەر خوا خەشمی لێ نەگرێ، ئیتر باکی بۆ هیچی تر نیە ..

پاشان پەنا بەو نوورەی پەروەردگار ئەگرێت کە لە هەموو تاریکییەکدا تیشکی داوەتەوە و هەموو کاروبارێکی دنیا و قیامەتی پێ چاك ئەبێت ، تا خەشم و قینی خۆی نەبارێنێتە سەری و ، هەموو کارێك ئەداتەوە دەست خوا و، دەریشی ئەبڕێ کە هیچ هەوڵ و کۆششێك هیچی تیا بەستە نیە ئەگەر خوای لە پشت نەبێ .

کاتێك کە عوتبە و شەیبە ئەمەیان بە چاوی خۆیان دیی ، کە لەوانەیە گوێیشیان لە پاڕانەوەکەی بووبێ ، سۆزیان بۆی جوولا .. یەکەم لەبەر ڕەوشت جوانیی خۆی و، دووهەمیش لەبەر غەریبی و بێنازیی . هەستیان بە ماندوێتیی و برسێتیی ئازیز کرد ، بۆیە بەندەیەکی نەصرانییان هەبوو بە ناوی عەدداس ، بانگیان کرد و پێیان وت : هێشوویەك لەم ترێیە لێ بکەرەوە و ، بیخە ئەو قاپەوە و ، بیبە بۆ ئەو پیاوە و بڵێ : بیخۆ . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بۆ ترێکە برد فەرمووی : (( بسم الله )) لە ڕیوایەتێکی تردا : (( بسم الله الرحمن الرحيم )) و ، دەستی بە خواردنی کرد .

عەدداس بە سەرسوڕمانەوە سەیری دەم و چاوی کرد و ، پاشان وتی : بەخوا خەڵکی ئەم وڵاتە ئەم قسەیە ناکەن !! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ومن أي البلاد أنت يا عداس ، وما دينك ؟ )) . فەرمووی : ئەی تۆ خەڵکی چ وڵاتێکی ، عەدداس ؟ لەسەر چ دینێکی ؟ وتی : نەصرانییم و ، خەڵکی شاری نەینەوام . فەرمووی : (( من قرية الرجل الصالح يونس ابن متَّى ؟ )) . فەرمووی : خەڵکی شارەکەی یوونسی کوڕی مەتتای پیاوچاکیت ؟ عەدداس پێی وت : تۆ یوونسی کوڕی مەتتا چۆن ئەناسیت ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ذاك أخي ، كان نبياً ، وأنا نبي )) . فەرمووی : برامە ، ئەو پێغەمبەر بووە و منیش پێغەمبەرم ..

عەدداس خۆی خست بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ و سەری و هەردوو دەست و هەردوو پێی ماچ کرد !! عوتبە و شەیبە یەکێکیان بەوی تریانی وت : خزمەت گوزارەکەی هەڵ گێڕایەوە لێت .

که عەدداس هاتەوە لایان وتیان : عەدداس ، تیاچیت ، ئەوە چیت بوو سەر و هەردوو دەست و هەردوو پێی ئەو پیاوەت ماچ ئەکرد ؟! وتی : گەورەم ! لەسەر زەوییدا کەسێکی تر نیە ئەوەندەی ئەمە پیاوچاك بێت !! هەواڵێکی پێداوم جگە لە پێغەمبەر هیچ کەس نایزانێت . وتیان :ماڵت کاول بێ ، عەدداس ! لە دینەکەی خۆت وەرت نەگێڕێ ، دینەکەی خۆت لە دینی ئەو چاکترە .

دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ، بە دڵێکی پڕ لە خەم و شکستەوە طائیفی بەجێ هێشت . ئەوەندە خەمبار بوو نەیزانیی چۆن ئەو ڕێگا دوور و درێژەی بڕیی .. هەر ئەوەندەی زانیی گەیشتۆتە ( قرن الثعالب ) . کە سەری بەرز کردەوە ئەبینێ وا هەورێك سێبەری بۆ کردووە .. کە سەیری کرد ئەبینێ وا جیبریلی لەناودایە ، ئەفەرموێ : (( فَنادانـي ، فَقالَ : إنَّ اللهَ قَد سَمِعَ قَولَ قَومِكَ لَكَ ، وَما رَدُّوا عَلَيكَ ، وَقَد بَعَثَ إلَيكَ مَلَكَ الجبالِ لِتَأمُرَهُ بما شِئتَ فيهم ، قال : فناداني مَلَكُ الجبالِ ، وَسَلَّمَ عَلَيَّ ، ثُمَّ قالَ : يا مُحَمَّد ! إنَّ اللهَ قَد بَعَثَني إلَيكَ ، وَأنا مَلَكُ الجبالِ لِتَأمُرَني بِأمرِكَ ، فَما شِئتَ ؟ إن شِئتَ أن أُطبِقَ عليهِمُ الأخشَبَين )) .

فەرمووی : جیبریل بانگی لێ کردم و فەرمووی : خوای گەورە وتە و وەڵامی قەومەکەتی بیست و ، وا مەلائیکەتی سەرپەرشتیاری کێوەکانی ناردووە تا بە ویستی خۆت فەرمانی بەسەردا بدەیت ، ئەفەرموێ : مەلائیکەتی کێوەکان بانگی لێ کردم و ، سەلامی لێ کردم ، پاشان فەرمووی : ئەی موحەممەد ! خوای گەورە ناردوومی بۆ لات و ، من مەلائیکەتی کێوەکانم ، تا فەرمانم بە سەردا بدەیت .. جا ویستت بە چییە ؟ ئەگەر بتەوێ ئەو دوو چیایەی ئەم بەر و ئەوبەری مەککە دێنمەوە یەك بەسەریاندا .. [٢٢٦]

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( بَل أَرجُو أَن يُخرِجَ اللهُ مِن أَصلابِهِم مَن يَعبُدُ اللهَ وَحدَهُ ، وَلا يُشرِكَ بهِ شَيئاً )) . [٢٢٧] فەرمووی : هیوادارم خوای گەورە لە پشتی ئەوانە وەچەیەك بخاتەوە کە بە تاك و تەنیا خوا بپەرستێ و ، شەریکی بۆ بڕیار نەدا . لە هەندێ ریوایەتدا مەلائیکەتی سەرپەرشتیاری کێوەکان ئەڵێت : تۆ هەر بەو شێوەیت کە پەروەردگارت ناوی ناوی ، (( رؤوف رحيم )) يت .

---

[٢٢٦] چیای ئەبوقوبەیس و قوعەیقەعانی بەرامبەری .

[٢٢٧] رواه الشيخان واللفظ لمسلم .

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە طائیفەوە بەرەو مەککە ئەگەڕایەوە ، ئەوەبوو گەیشتە ( نەخلە ) ، کە شەوێك ڕێگا لە مەککە دوورە و ، بریتی‌یە لە دوو شیو : یەکێکیان نەخلەی شامی‌یە و ئەوی تریشیان نەخلەی یەمانی‌یە ، لەوێ لە نیوەشەودا هەستا بۆ شەو نوێژ . کاتێك کە نوێژی ئەکرد ، کۆمەڵێك جیننیی ، کە حەوت جیننیی نەصیبین بوون ، بەلای‌دا تێپەڕیان کرد و ، گوێیان بۆ قورئان خوێندنەکەی گرت . کە لە نوێژ بوویەوە ، بۆ ئاگادارکردنەوە گەڕانەوە لای قەومەکەیان و خۆیان موسڵمان بوون و ئیمانیان بەو قورئانە هێنا کە بیستیان . خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەم هەواڵە بۆ پێغەمبەرەکەی ئەگێڕێتەوە :

﴿ وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُواْ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِيٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ ( الأحقاف : ٢٩ ـ ٣٢ ) .

هەواڵی ئەم سەردانەی طائیف لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ گەیشتە لای قوڕەیش ، ئەوانیش زۆریان پێ ناخۆش بوو و ، خۆیان ئەخواردەوە بۆی کە چووە داوای کۆمەکیی لە ثەقیف بکات لە دژیان . ئەوەبوو بڕیاریان دا کە نەهێڵن بێتە مەککەوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی کرد کە ئەگەر لە خۆیەوە بچێتە ناو مەککەوە خراپەیەك بەرامبەری بکەن ، بۆیە وای بە چاك زانیی یەکێك لە پیاو ماقووڵان پەنای بدات . بۆ ئەمە عەبدوڵڵای کوڕی ئورەیقیطی نارد بۆ لای ئەخنەسی کوڕی شەریق تا پەنای بدات ، لە وەڵامدا ئەخنەس وتبووی : من هاوپەیمانی قوڕەیشم ، هاوپەیمانیش ناتوانێ بەسەر خەڵکی شوێنەکەدا پەنای کەسێك بدات .

پاشان ناردی بۆ لای سوهەیلی کوڕی عەمر تا ئەو پەنای بدا ، ئەویش وتبووی: نەوەی عامر ناتوانن بەسەر نەوەی کەعبی کوڕی لوئەی‌دا پەنای کەسێك بدەن .

پاشان ناردی بۆ لای موطعیمی کوڕی عەدیی تا پەنای بدات . وتبووی : باشە . بڵێ با بێت . بەم وەڵامە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی برد و ئەو شەوە لە

لای موطعیم مایەوە . کە ڕۆژ بوویەوە موطعیم لەگەڵ هەر شەش یان هەر حەوت کوڕەکەیدا لە ماڵ هاتنەدەر و شمشێرەکانیان لە شان کردبوو و ، پێکەوە چوونە کەعبە و بە پێغەمبەری خوای وت : بڕۆ طەواف بکە . خۆشیان بە قایشی شمشێرەکانیان دەستە ئەژنۆ دانیشتن .

ئەوەبوو ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب هات بەلای موطعیمەوە و ، پێی وت : پەنادەری ، یان شوێن کەوتوو ؟ وتی : پەنادەرم . وتی : دەی کەواتە دەست بۆ پەنا و پەیمانی تۆ نابەین . پێکەوە دانیشتن هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە طەواف کردن بوویەوە . کاتێك کە تەشریفی برد ئەوانیش لەگەڵیا ڕۆیشتن .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پیاوەتی‌یەی موطعیمی لەبەر چاو بوو و ، کاتێکیش کە جوبەیری کوڕی هاتە مەدینە تا دەربارەی دیلەکانی بەدر قسە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکات ، پێی فەرموو : (( لَو كانَ الْمُطعَمُ بنُ عَدِيٍّ حَيًّا ثُمَّ كَلَّمَنِي في هؤلاءِ النَّتنَى لَتَركْتُهُم لَهُ )) ئەفەرموێ : ئەگەر موطعیمی باوکت زیندوو بوایە و دەربارەی ئەم پیسکانە قسەی لەگەڵما بکردایە ، دەم بەخشین پێی .

دوای کۆچ کردنی موسڵمانەکان بۆ مەدینە ، موطعیم لە مەککە کۆچی دوایی کرد ، بێ‌ئەوەی موسڵمان ببێ . بەڵام ئەوەبوو حەسسانی کوڕی ثابیت ، لە پاداشتی ئەو چاکەیەی مەککەی بە شیعرێکی جوان شیوەنی بۆ کرد .

لە ڕیوایەتی تردا هاتووە کە دانیشتوانی طائیف لەسەر ڕێگای پێغەمبەر ﷺ بە دوو ڕیز ئەمبەر و ئەوبەر بژی دائەنیشتن و ، کاتێ کە تێپەڕ ئەکات لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا بەردێك ئەگرنە قاچی پیرۆزی هەتا هەردوو پێی خوێناویی ئەبن و کە لێیان تێپەڕ ئەکات خوێن سەری کردبوو .

لە ڕیوایەتێکیشدا عەدداس بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەڵێت : شاهێدیی ئەدەم کە تۆ بەندە و پێغەمبەری خوایت . بەمە عەدداس ئیمانی هێنا و کەوتە شوێن دینی ئیسلام .

کاتێکیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیەوێ بگەڕێتەوە مەککە ، زەیدی کوڕی حاریثەی هاوەڵی خوا لێی ڕازیی بێ سەری سوڕ ئەمێنێ و ئاگاداری ئەکات کە قوڕەیش دەست دێننە ڕێی . ئەوەبوو پێی وت : دوای ئەوەی کە ئەوان دەریان کردوویت چۆن ئەچیتەوە ناویان ؟ فەرمووی : (( يا زَيدُ ! إنَّ اللهَ جاعِلٌ لِما تَرى فَرَجاً وَمَخرَجاً ، وَإِنَّ اللهَ ناصِرُ دِينِهِ ومُظهِرُ نَبِيِّهِ )) . فەرمووی : ئەی زەید ! ئەوەی تۆ

ئەیبینیی لە تەنگانە خوای گەورە دەرووی بۆ ئەکاتەوە و، خوای گەورە دینەکەی و پێغەمبەرەکەی سەر ئەخات .. ئیتر ئەکەوێتە ڕێ هەتا نزیك ئەکەوێتەوە ، ئەوسا لە حەڕڕاءدا ئەمێنێتەوە تا نێرراوەکەی ئەنێرێت بۆ لای پیاوە قورەیشی‌یەکان تا پەنای بدەن .

ئەوەبوو موطعیمی کوڕی عەدیی ڕەزامەندیی نواند تا پەنای بدات و ، فەرمانی دا بە کوڕەکانی و خزمەکانی تا چەکەکانیان هەڵ بگرن و چوار دەوری کەعبە بگرن ، چونکە پێغەمبەری خوای ﷺ پەنا داوە . خۆیشی لەسەر ولاغەکەی وەستا و کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە کەعبە ، موطعیم جاڕی دا : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! من موحەممەدم پەنا داوە ، هیچ کەستان قسەی پێ نەڵێ .

پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە لای بەردە ڕەشەکە و ئیستیلامی کرد و ، دوو ڕەکعەت نوێژی بەجێ هێنا و ، گەڕایەوەماڵەوە و موطعیم و کوڕەکانیشی بە شمشێرەوە بە دوایەوە بوون هەتا گەیاندیانە ماڵەوە ..[٢٢٨]

**دوانزەهەم : گەشتی ئیسرا و میعراج**

لە چەند لاپەڕەی پێشوودا باسی ئەو ناڕەحەتی‌یەمان کرد کە لە لایەن ثەقیفەوە تووشی پێغەمبەری خوا ﷺ هات ، کاتێك کە وەکو میوانێك تەشریفی بردە ناویان تا بانگیان بکات بۆ لای خوا ، کە ئەوەبوو بە هەموویانەوە بەردیان تێ ئەگرت و هەردوو پێی موبارەکی خوێناویی کران و ، ئەویش بە خەم باریی و ، دڵ شکاویی و ، ناڕەحەتی‌یەوە گەڕایەوە مەککە ، بەڵام خەمی گەورەی ئەوەبوو کە بانگەوازەکەی شوێنی چاکی دەست نەکەوێ بۆ بڵاوبوونەوە . چونکە ئەو گەشتە پڕ مەینەتی‌یەی طائیفی بۆ ئەوە کرد کۆمەکیی و پشتیوانیی بۆ بانگەکەی دەست بخات ، کەچیی ئەبینێ وا دانیشتوانی طائیف گەلێك لە دانیشتوانی مەککە خراپ تر و ، کەللە ڕەقتر و ، نەزان و سەفیهـ ترن . کاتێکیش گەڕایەوە مەککە ، ئەگەر لە پەنای موطعیمدا نەبوایە نەیان ئەهێشت بچێتەوە ناویان .

لەناو ئەم هەموو خەم و خەفەتەدا و ، لەناو کۆمەڵێکی ئاوەها دوژمن بە ئیمان دا ، کە هەموو ڕێیەکیان بۆ دژایەتیی دینی خوا ئەگرتە بەر و ، دوای ئەم هەموو تەنگانە و ناڕەحەتی‌یانە ، خوای گەورە سۆزی بۆ پێغەمبەر و ئازیز و

---

[٢٢٨] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٤٠١ ـ ٤٠٥ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ٢٠٨ و : ١ / ٤٥٦ ـ ٤٦١ ، والرحيق المختوم : ١٢٨ ـ ١٣٢ .

خۆشەویستەکەی جوولاّ و ، بۆ ئەوەی دڵە زامدارەکەی ساڕێژ بکات و ، خەم و خەفەتی لە کۆڵ بکاتەوە گەشتی ئیسرا و میعراجی پێ کرد ..

ئەوەبوو لەو گەشتە پیرۆزەدا چەندین بەڵگە و نیشانەی گەورە گەورەی پەروەردگار و ، چەندین نیشانەی چاودێریی و بایەخ‌پێدانی خوایی بە خۆی و بە بانگەوازەکەی بینیی ، کە جار لە دوای جار متمانەی زیاتری بە خۆی و ، بە سەرکەوتنی بانگەوازەکەی ئەکرد و ، بۆی روون ئەبۆوە کە هێزی لەبن‌نەهاتووی پەروەردگار لەگەڵ بانگەوازەکەی ئەودایە و ، دوژمنەکانی چەندە زۆر و بەدەسەلاّتیش بن لە ناویان ئەبات .

هەر لەم گەشتەدا خوای گەورە بەشێك لە موڵکی فراوانی خۆی پیشانی موحەممەدی خۆشەویستی ﷺ دا ، تا دڵ و دەروونی پڕ بێ لە متمانە و ، رەزامەندیی و ، نوور و ، هێمنیی و ، ئاسوودەیی و ، زامەکانیشی ساڕێژ بن .

لە پێشەوە با بزانین ئیسرا و میعراج چین ؟

ئیسرا : بردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن خوای بەدەسەلاّتەوە لە مزگەوتی حەرامەوە لە مەککە بۆ مزگەوتی ئەقصا لە ئیلیاء واتە قودس ، ئەویش لە بەشێکی شەودا و ، گەڕانەوەی بۆ شوێنی خۆی هەر لەو شەوەدا ..

میعراجیش : بەرزکردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەیتولمەقدیس‌ەوە بۆ حەوت ئاسمانەکە و ژوورتریش ، کە ئەوەبوو پێنج فەرزەی نوێژ فەرز کران و ، گەڕانەوەشی لە بەشێکی شەودا بۆ بەیتولمەقدیس ..

دوای ئەمەش وا چاکە بەڵگەی سەلماندنی رووداني ئیسرا و میعراج لە قورئان و سوننەت دا بخەینە روو .

رووداوی ئیسرا بە پێی قورئان و فەرموودەی صەحیح چەسپاوە . ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ سُبۡحَـٰنَ ٱلَّذِیٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَیۡلࣰا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِی بَـٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِیَهُۥ مِنۡ ءَایَـٰتِنَاۤۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِیعُ ٱلۡبَصِیرُ ۝١ ﴾ ( الإسراء : ١ ) .

ئەم ئایەتە پیرۆزەی سەرەتای سوورەتی ( الإسراء ) بە وشەی ( سبحان ) دەست پێ ئەکات کە پاك و بێ‌گەردیی بۆ ئەو خوایە دەرئەبڕێ کە توانای ئەوەی هەیە لە بەشێکی شەودا شەوڕەویی ( إسراء ) بە خۆشەویستەکەی بکات و ، لە هەمان کاتیش‌دا سەرسوڕمانی تێدایە . لە جیاتی ناوی پێغەمبەریش ﷺ وشەی ( عبد )

ی بەکارهێناوە تا موسڵمانان کە ئەم پایە بەرزە بە خۆشەویستی خواوە ئەبینن ، سەریان لێ نەشێوێ و لە پلەی بەندایەتیی نەیترازێنن و لە رادەی خوایەتیی نزیکی نەکەنەوە .. هەروەها وشەی ( لیلاً ) هاتووە تا ئاماژە بێت کە ئەم رووداوە لە بەشێکی شەودا ئەنجام ئەدرێ . (( المسجد الحرام )) یش لە مەککەیە و بە بۆنەی رێز و حورمەتیەوە ناونراوە ( الحرام ) . ( المسجد الأقصى ) ش لە قودسە و ، بە بۆنەی دووریی‌یەوە لە کەعبەی پیرۆز ناونراوە ( الأقصى ) . هەروەها ( بارکنا حوله ) ئەوە ئەگەیەنێ کە مزگەوتی ئەقصا لە بەیتولمەقدیس لە فەڕ و بەرەکەتی دینیی و دنیایی بەشی دراوە . بەرەکەتی دینیی وەك ئەوەی کە مزگەوتی ئەقصا بۆتە بنکەی پێغەمبەران و ، شوێن کۆچی زۆربەیان و ، قیبلەیان و ، شوێن دابەزینی مەلائیکە و ، یەکێکیشە لەو سێ مزگەوتەی کە رێ بە ئیمانداران دراوە زیارەتیان بکەن ، کە کەعبە و مزگەوتی مەدینە و ، مزگەوتی ئەقصان . بەرەکەتە دنیایی‌یەکانیش ئەوەیە کە بە رووبار و کشت و کاڵ و باخ و باخات دەوری دراوە .

فەرموودەش زۆرن لەو بارەوە ، کە بە کۆمەکیی خوا لە دواوە هەندێکیان باس ئەکەین .

میعراجیش بە فەرموودەی صەحیح چەسپاوە ، بەڵام هەندێ لە زانایان وای ئەبینن کە ، ئەگەرچیی گەشتی میعراج راستەوخۆ بە قورئان نەچەسپاوە ، بەڵام لە سوورەتی ( النجم ) دا ئاماژەی بۆ کراوە کە خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾ ( النجم : ١٣ ـ ١٨ ) .

جا ئیبن‌مەسعوود و خاتوو عائیشە خوا لێیان رازیی بێ ئەوەیان لێ ریوایەت کراوە کە ئەوەی لە ئایەتی سیانزەهەم‌دا بینراوە جیبریل بووە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیەی خوا خەلقی کردووە بینیویەتی و ، تەنها دوو جاریش بەو شێوەیەی بینیویەتی : یەکەمیان ئەو کاتەی کە لە ئەشکەوتی حەڕاء ئەهاتە خوارەوە و ، دووهەمیش شەوی میعراج .

کەچیی لە ئیبن عەبباس‌یشەوە ریوایەت کراوە کە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بینیویەتی خوای گەورەیە ، بەڵام ریوایەتی یەکەم صەحیح و پشت پێ بەستراوە .

ئیمام ئیبن کەثیر لە تەفسیرەکەیدا ئەمەمان بۆ روون ئەکاتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو جار جیبریلی ، سەلامی لێ بێ ، بەو شێوە دیوە کە خوای گەورە خەلقی کردووە : یەکەم : دوای وەستانی وەحیی ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەشکەوتی حەرِاء ئەهاتە خوارەوە ، بە شێوەی خۆی ، کە شەش صەد باڵی هەبوون و لەبەر گەورەیی ئاسۆی داپۆشیی بوو ، چاوی پێ کەوت ، ئەوەبوو لێی نزیك کەوتەوە و ، ئەو وەحیەشی پێ گەیاند کە خوای گەورە بۆی ناردبوو . خوای گەورە لەو بارەوە ئەفەرموێ :

﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ۝٥ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ۝٦ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ۝٧ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝٨ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ﴾ ( النجم : ٥ ـ ١٠ ) .

دووهەمیش : لە شەوی ئیسرا و میعراجدا لەلای ( سدرة المنتهى ) وەك لە سوورەتی ( النجم ) دا ئاماژەی بۆ کراوە :

﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ۝١٣ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ۝١٤﴾ ( النجم : ١٣ ـ ١٤ ).

شایانی باسە ، وەك لە پێشەوە باس کرا ، بە هیچ شێوەیەك نەچەسپاوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ خوای پەروەردگاری بە چاو دیبێ و ، هیچ هاوەڵێکیش ئەوەی بە دەمدا نەهاتووە و ، کە ئیبن عەبباسیش رای وەهایە بینیبێتی ، مەبەستی بینینی دڵە .

دەربارەی ئایەتی : ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝٨﴾ ( النجم : ٨ ) یش مەبەستی لە نزیك بوونەوەی جیبریلە ، وەك عائیشە و ئیبن مەسعوود خوا لێیان رازیی بێ دەریان بریوە . بەڵام نزیك‌کەوتنەوە لە چیرۆکی ئیسرادا نزیك‌بوونەوەی خوای گەورەیە .

جومهووری زانایان رایان لەسەر ئەوەیە کە گەشتی ئیسرا و میعراج لە یەك شەودا بووە و، لە کاتی بێداریی پێغەمبەردا ﷺ بووە و ، بە لاشە و بە رۆحیش بووە و ، فەرموودەی صەحیحی زۆر لەو بارەوە هاتوون . هەروەها فەرموودەی صەحیحیش هەن کە سنگی پیرۆزی لەت کراوە و ، سواری بوراق بووە و ، بەرەو ئاسمان پێیەوە بەرز بۆتەوە و ، تووشی پێغەمبەران بووە و ، پێنج فەرزەی نوێژ فەرز کران و ، فەرمایشتی لەگەڵ خوادا کردووە و ، هات و چۆی نێوان خوای

پەروەردگار و مووسا پێغەمبەری کردووە بۆ کـەمکردنـەوەی ژمـارەی نوێـژەکان .
ئەمانە هەر هەموویان ئەیسـەلمێنن کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گەشـتی ئیسـرا و میعراجی بە لاشە و بە ڕۆحی پیرۆزی ئەنجام داوە .

ئەو فەرموودانەش کە لە بارەی ئیسرا و میعراجەوە ریوایەت کـراون ، کۆمەڵـە فەرموودەیەکن کە لە زۆرێك لە هاوەڵانەوە خوا لێیان رازیی بێ ریوایەت کـراون و راویـیە راستگۆکان لێیان وەرگرتـوون و ، ئیمامـانی فـەرموودە و تەفسـیر ، وەك بوخاریی و ، موسلیم و ، ئەحمەد و ، تیرمیذیی و ، نەسسـائیی و ، بەیهـەقیی و، ئیبن جەریری طەبەریی تەخریجیان کردوون . هـەروەها هـەردوو ئیمـام موحەمـەدی کوڕی ئیسحاق و ، عەبدولمەلیکی کـوڕی هیشـام لـە ژیـان‌نامەکـەیان‌دا باسـیان کردوون .

ریوایەتـەکانی فـەرموودەی ئیسـرا و میعـراج یـەکجار زۆرن و ئەگەنـە پلـەی تەواتور، کە لە عومەری کـوڕی خـەططاب و ، عـەلیی و ، ئـیبن مەسـعوود و ، ئـەبوذەڕڕ و ، مـالیکی کـوڕی صەعصـەعە و ، ئـەبوهورەیرە و ، ئەبوسـەعیدی خودریی و ، ئیبن عەبباس و ، شەددادی کوڕی ئەوس و ، ئوبەی کـوڕی کـەعب و، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قەرظ و ، ئەبوحەببەی ئەنصاریی و ، ئەبولەیلای ئەنصـاریی و ، عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص و ، جابر و ، حوذەیفە و ، بورەیـدە و ، ئەبوئـەییووبی ئەنصـاریی و ، ئەبوئومامـە و ، سـەمورەی کـوڕی جونـدوب و ، ئەبولحەمرا و ، صوهەیبی رۆمیی و ، ئوم هانیی کچی ئەبوطـالیب و ، عائیشـە و ئەسمای خوشکیەوە ریوایەت کراون ، کە هەندێکیان بە درێژە و ، هەندێکیشیان بە کورتە باسەکەیان هێناوە .

ئێستەش با متمانە پێ‌کراوتـرین و صـەحیح‌تـرین ریوایـەت وەربگـرین ، کـە هەردوو ئیمامی مەزن ، بوخاریی و موسلیم و لە هەردوو کتێبە صەحیحەکەیان‌دا لەسەر صەحیحیی رێك کەوتوون .

هەردوو ئیمامی فەرمووده لە صەحیحەکەیان‌دا ، بە سەنەدی خۆیـان ، [٢٢٩] لـە قەتادەوە ، لە ئەنەسی کوڕی مالیـك ەوە ، لـە مـالیکی کـوڕی صەعصـەعەوە ـ لەفزەکەش هی بوخاریی‌یە ـ ریوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسـی ئـەو شەوەی بۆ کردوون کە شەوڕەویی پێ کراوە و ، فەرموویـە : (( بَينَما أنا في الحَطِيمِ ،

[٢٢٩] صحيح البخاري ـ باب المعراج : ٥ / ٦٦ ، صحيح مسلم بشرح النووي : ٢ / ٢٢٣ ـ ٢٢٥ .

وَرُبَّما قالَ : في الحجْرِ مُضطَجعاً إذ أتاني آت ، فَقَدَّ قال ـ أي قتادة ـ : وَسَمِعتُهُ يَقُولُ : فشقَّ ما بينَ هذه إلَى هذه ، فَقُلتُ للجارود : ما يَعني به ؟ قال : من ثغرَةِ نَحرِه إلى ثُنَّته ، فاستَخرَجَ قلبي ، ثم أتيتُ بطَست من ذَهَب مَملوءَةً إيماناً وَرَحمَةً ، فغُسل قلبي ، ثم حُشي ثم أُعيدَ ، ثم أُتيتُ بدابَّةٍ دونَ البغلِ وفوقَ الحمارِ أبيض . فقال له الجارود : هو البُراقُ يا أبا حمزة ـ كنية أنَس ـ ؟ قال أنسٌ : نعم ، يضع خطوهُ عندَ أقصى طَرفه ، فحُملتُ عَليه ، فانطَلَقَ بي جَبريل حتى أتَى السماءَ الدنيا ، فاستَفتَحَ ، فقيلَ : مَن هذا ؟ قَال : جبريلُ ، ومَن مَعَكَ ؟ قال : مُحمدٌ ، قيلَ : وقد أُرسلَ إلَيه ؟ قالَ : نَعَم ، قال : مرحَباً به فَنعمَ المجيء جاء ، ففتح )) . فلما خلصت فإذا فيها آدم عليه الصلاة والسلام ، فقَالَ : هذا أبوك آدم ، فسلِّم عليه ، فسلَّمتُ عليه ، فرد السلام ثم قال : مرحباً بالإبن الصالح والنبي الصالح .

ثم صعد بي حتى أتى السماء الثانية ، فاستفتح ، قيل : من هذا ؟ قال : جبريل ، قيل : ومن معك ؟ قال : محمد ، قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم ، قيل : مرحباً به فنعم المجيء جاء ، ففتح . فلما خلصت إذا يحيى وعيسى عليهما الصلاة والسلام وهما إبنا الخالة . قال : هذا يحيى وعيسى فسلِّم عليهما ، فسلمت ، فردا ، ثم قالا : مرحباً بالأخ الصالح والنبي الصالح .

ثم صعد بي إلى السماء الثالثة ، فاستفتح ، قيل : من هذا ؟ قال : جبريل ، قيل : ومن معك ؟ قال : محمد ، قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم ، قيل : مرحباً به فنعم المجيء جاء ، ففتح . فلما خلصت إذا يوسف . قال : هذا أخوك يوسف فسلم عليه ، فسلمت عليه فرد ، ثم قال : مرحباً بالأخ الصالح ، والنبي الصالح .

ثم صعد بي إلى السماء الرابعة ، فاستفتح ، قيل : من هذا ؟ قال : جبريل ، قيل : ومن معك ؟ قال : محمد ، قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم ، قيل : مرحباً به فنعم المجيء جاء ، ففتح . فلما خلصت فإذا إدريس ، قال : هذا إدريس فسلم عليه ، فسلمت عليه فرد ، ثم قال : مرحباً بالأخ الصالح والنبي الصالح .

ثم صعد بي حتى أتى السماء الخامسة ، فاستفتح ، قيل : من هذا ؟ قال : جبريل ، قيل : ومن معك ؟ قال : محمد ، قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم ، قيل : مرحباً به فنعم المجيء جاء . فلما خلصت فإذا هارون ، قال : هذا هارون فسلم عليه ، فسلمت عليه فرد ، ثم قال : مرحباً بالأخ الصالح والنبي الصالح .

ثم صعد بي حتى أتى السماء السادسة ، فاستفتح ، قيل : من هذا ؟ قال : جبريل ، قيل : ومن معك ؟ قال : محمد ، قيل : وقد بعث إليه ؟ قال : نعم ، قيل :

مرحباً به فنعم المجيء جاء . فلما خلصت فإذا موسى قال : هذا موسى فسلم عليه ، فسلمت عليه ، فرد ، ثم قال : مرحباً بالأخ الصالح والنبي الصالح . فلما تجاوزت بكى ، قيل له : ما يبكيك ؟ قال : أبكي لأن غلاماً بعث بعدي يدخل الجنة من أمته أكثر ممن يدخلون من أمتي .

ثم صعد بي إلى السماء السابعة فاستفتح جبريل ، قيل : من هذا ؟ قال : جبريل ، قيل : ومن معك ؟ قال : محمد ، قيل : وقد بعث إليه ؟ قال : نعم ، قيل : مرحباً به فنعم المجيء جاء . فلما خلصت فإذا إبراهيم ، قال : هذا أبوك فسلم عليه ، فسلمت عليه ، فرد السلام ثم قال : مرحباً بالإبن الصالح والنبي الصالح .

ثم رفعت إلى سدرة المنتهى ، فإذا نبقها مثل قلال هجر ، وإذا ورقها كآذان الفيلة ، قال : هذه سدرة المنتهى ، وإذا أربعة أنهار : نهران باطنان ، ونهران ظاهران ، فقلت : ما هذان يا جبريل ؟ قال : أما الباطنان فنهران في الجنة ، وأما الظاهران فالنيل والفرات .

ثم رفع لي البيت المعمور ، ثم أُتيتُ بإناء من خمر ، وإناء من لبن ، وإناء من عسل، فأخذت اللبن ، فقال : هي الفطرة التي أنت عليها وأمتك .

ثم فرضت عليَّ الصلوات خمسين صلاة كل يوم ، فرجعت ، فمررت على موسى ، فقال : بم أمرت ؟ قلت : أمرت بخمسين صلاة كل يوم . قال : إن أمتك لا تستطيع خمسين صلاة كل يوم ، وإني قد جربت الناس قبلك ، وعالجت بني إسرائيل أشد المعالجة ، فارجع إلى ربك فاسأله التخفيف لأمتك . فرجعت فوضع عني عشراً. فرجعت إلى موسى فقال مثله ، فرجعت فوضع عني عشراً ، فرجعت إلى موسى ، فقال مثله ، فرجعت فوضع عني عشراً ، فرجعت إلى موسى فقال مثله ، فرجعت فأمرت بخمس صلوات كل يوم ، فرجعت إلى موسى ، فقال : بم أمرت ؟ قال : بخمس صلوات كل يوم ، قال : إن أمتك لا تستطيع خمس صلوات كل يوم ، وإني قد جربت الناس قبلك وعالجت بني إسرائيل أشد المعالجة ، فارجع إلى ربك فاسأله التخفيف لأمتك . قال : سألت ربي حتى استحييت ، ولكن أرضى وأسلم ، قال : فلما جاوزت ناداني مناد : أمضيت فريضتي وخففت عن عبادي )) ..

ئەفەرموێ : لە كاتێك‌دا كە لە حیجردا بووم و ڕاكشابووم ، یەكێك هات بۆ لام . قەتادە باسەكەی بڕیی و وتی : گوێم لێی بوو ئەیفەرموو : هەر لێرەوە تا ئەوێی هەڵ دڕیی . وتم بە جاردوود : مەبەستی چی‌یە پێی ؟ وتی : لە قوڕگیەوە هەتا خوار ناوكی . ئەوەبوو دڵمی دەرهێنا ، پاشان تەشتێكی زێڕینیان بۆ هێنام

که پڕ بوو له شتێك که شۆڕین پێی ئیمان زیاد و حیکمەت کامڵ ئەکات . دڵمی شۆڕیی .. پاشان پڕ کرایەوە و ، خرایەوە شوێنی خۆی . پاشان وڵاغێکی سپییم بۆ هێنرا که له ئێستر بچووکتر و له گوێدرێژیش گەورەتر بوو . جاروود لێی پرسیی: بوراقه ، [٢٣٠] ئەی ئەنەس ؟ ئەنەس وتی : بەڵێ ، تا کوێ چاوی بڕ بکات بە هەنگاوێك ئەیگاتێ . پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : سواری کرام و ، جیبریل کەوتە گەڵم تا گەیشتە ئاسمانی دنیا و ، داوای کرد دەرگای بۆ بکەنەوە . مەلائیکە وتیان : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی : جیبریلم . وتیان : ئەی کێت لەگەڵە ؟ فەرمووی : موحەممەد . وتیان : نێردراوە بە دوایدا ؟ فەرمووی : بەڵێ . وتیان : بەخێر بێت، هاتنێکی چاکه . ئیتر دەرگا کرایەوە .

که چوومە ژوورەوە ئەبینم وا ئادەم ، صەلات و سەلامی لێ بێ ، لەوێیە . فەرمووی : ئەمە ئادەمی باوکتە ، سەلامی لێ بکە . سەلامم لێ کرد و ، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و ، پاشان فەرمووی : کوڕی صاڵح و پێغەمبەری صاڵح [٢٣١] بەخێر بێیت .

پاشان جیبریل بەرزی کردمەوە هەتا گەیشتە ئاسمانی دووهەم و ، داوای کرد دەرگای بۆ بکەنەوە . مەلائیکە وتیان : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی : جیبریلم . وتیان : ئەی کێت لەگەڵە ؟ فەرمووی : موحەممەد . وتیان : نێردراوە بە دوایدا ؟ فەرمووی : بەڵێ . وتیان : بەخێر بێت ، هاتنێکی چاکه . ئیتر دەرگا کرایەوە . که چوومە ژوورەوە ئەبینم وا یەحیا و عیسا ، صەلات و سەلامیان لێ بێ ، که پوورزای یەك بوون ، [٢٣٢] لەوێن . فەرمووی : ئەمە یەحیا و عیسان ، سەلامیان لێ بکە . سەلامم لێ کردن و ، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە . پاشان فەرموویان : برای صاڵح و پێغەمبەری صاڵح بەخێر بێیت .

پاشان بەرزی کردمەوە بۆ ئاسمانی سێهەم و ، داوای کرد دەرگای بۆ بکەنەوە. مەلائیکە وتیان : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی : جیبریلم . وتیان : ئەی کێت لەگەڵە ؟

[٢٣٠] بوراق له ( برق ) ەوە وەرگیراوە ، چونکە له ڕۆیشتن دا خێرایی وەك خێرایی بروسکە وەهایە .

[٢٣١] هەموو ئەو پێغەمبەرانەی که چاویان پێی کەوت سیفەتی ( صاڵح ) یان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەکار هێناوە ، چونکە وشەی ( صلاح ) هەموو چاکەیەك ئەگرێتەوە و ، ( صاڵح ) یش بریتییە له پاك و بێگەردیی و بەجێهێنانی هەموو فەرمانێکی خوایی و پاراستنی مافی بەندانی خوا .

[٢٣٢] واتە مەریەم و ئیشاعی دایکی یەحیای کوڕی زەکەریا خوشکن . وتراویشە که ئیشاع و دایکی مەریەم خوشکن . واتە مەریەم و یەحیا پوورزا بن دیارە ئەمەش گونجاوە ، چونکە پووری دایك بە پوور ئەژمێررێ .

فەرمووی : موحەممەد . وتیان : نێردراوە بە دوایدا ؟ فەرمووی : بەڵێ . وتیان : بەخێر بێت ، هاتنێکی چاکە . ئیتر دەرگا کرایەوە . کە چوومە ژوورەوە ئەبینم وا یووسف لەوێیە . فەرمووی : ئەمە یووسفی براتە ، سەلامی لێ بکە . سەلامم لێ کرد و ، ئەویش وەڵامی دایەوە . پاشان فەرمووی : برای صالح و پێغەمبەری صالح بەخێر بێیت .

پاشان بەرزی کردمەوە بۆ ئاسمانی چوارەم و ، داوای کرد دەرگای بۆ بکەنەوە. مەلائیکە وتیان : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی : جیبریلم . وتیان : ئەی کێت لەگەڵە ؟ فەرمووی : موحەممەد . وتیان : نێردراوە بەدوایدا ؟ فەرمووی : بەڵێ . وتیان : بەخێر بێت ، هاتنێکی چاکە . ئیتر دەرگا کرایەوە . کە چوومە ژوورەوە ئەبینم وا ئیدریس لەوێیە . فەرمووی : ئەمە ئیدریسە ، سەلامی لێ بکە . سەلامم لێ کرد و ، ئەویش وەڵامی دایەوە . پاشان فەرمووی : برای صالح و پێغەمبەری صالح بەخێر بێیت .

پاشان بەرزی کردمەوە هەتا گەیشتە ئاسمانی پێنجەم و ، داوای کرد دەرگای بۆ بکەنەوە . وتیان : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی : جیبریلم . وتیان : ئەی کێت لەگەڵە ؟ فەرمووی : موحەممەد . وتیان : نێردراوە بەدوایدا ؟ فەرمووی : بەڵێ . وتیان : بەخێر بێت ، هاتنێکی چاکە . کە چوومە ژوورەوە ئەبینم وا هاروون لەوێیە . فەرمووی : ئەمە هاروونە ، سەلامی لێ بکە . سەلامم لێ کرد و ، ئەویش وەڵامی دایەوە . پاشان : فەرمووی : برای صالح و پێغەمبەری صالح بەخێر بێیت .

پاشان بەرزی کردمەوە هەتا گەیشتە ئاسمانی شەشەم و ، داوای کرد دەرگای بۆ بکەنەوە . وتیان : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی : جیبریلم . وتیان : ئەی کێت لەگەڵە ؟ فەرمووی : موحەممەد . وتیان : نێردراوە بە دوایدا ؟ فەرمووی : بەڵێ . وتیان : بەخێر بێت هاتنێکی چاکە . کە چوومە ژوورەوە ئەبینم وا مووسا لەوێیە . فەرمووی : ئەمە مووسایە ، سەلامی لێ بکە . سەلامم لێ کرد و ، ئەویش وەڵامی دایەوە . پاشان فەرمووی : برای صالح و پێغەمبەری صالح بەخێر بێیت . کە تێپەڕییم دەستی بە گریان کرد . پێی وترا : چیی ئەتگریێنێ ؟ فەرمووی : بۆ

ئەوە ئەگریم دوای من منالێك [٢٣٣] کراوە بە پێغەمبەر کە لە ئوممەتەکەی ئەو زیاتر لە ئوممەتەکەی من ئەچنە بەهەشت .

پاشان بەرزیی کردمەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم و جیبریل داوای کرد دەرگای بۆ بکەنەوە . مەلائیکە وتیان : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی : جیبریلم . وتیان : ئەی کێت لەگەڵە ؟ فەرمووی : موحەممەد . وتیان : نێردراوە بە دوای‌دا ؟ فەرمووی : بەڵێ . وتیان : بەخێر بێت ، هاتنێکی چاکە . کە چوومە ژوورەوە ئەبینم وا ئیبراهیم لەوێیە ، فەرمووی : ئەمە باوکتە ، سەلامی لێ بکە . ئەفەرموێ : سەلامم لێ کرد و ، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە . پاشان فەرمووی : کوڕی صالح و پێغەمبەری صالح بەخێر بێیت .

پاشان بەرز کرامەوە بۆ ( سدرة المنتهى ) ، [٢٣٤] ئەبینم بەرهەمی درەختەکانیان وێنەی کووپەی هەجەرە ، [٢٣٥] و گەڵاشیان بە وێنەی گوێچکەی فیلە . جیبریل فەرمووی : ئەمە ( سدرة المنتهى ) یە . ئەبینم چوار رووباری لێیە : دووانیان باطنیی و دوانیشیان ظاهریی . وتم : ئەم دووانە چین ، جیبریل ؟ فەرمووی : دوو رووبارە باطنیەکە دوو رووبارن لە بەهەشت‌دا و ، [٢٣٦] دوو رووبارە ظاهرەکەش نیل و فوراتن . [٢٣٧]

پاشان ( البيت المعمور ) م لێوە دەرکەوت . ئەوەبوو قاپێك لە عەرەق و ، قاپێك لە شیر و ، قاپێك لە هەنگوێنیان بۆم هێنا ، منیش شیرەکەم وەرگرت ..

---

[٢٣٣] وەنەبێ مووسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێ بە کەم سەیری پێغەمبەری خوای ﷺ کردبێ ، چونکە نەك هەر ئەو ، کە پێغەمبەرێکی ( أولو العزم ) ە ، بەڵکو هەموو پێغەمبەرانی خوا ئەدەبی ئەوەیان هەیە کە بزانن پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ سەرداری پێغەمبەرانە و ، یەکەم خۆشەویستی خوایە ، بەڵام مەبەستی ئەوە بووە کە لە چاو تەمەنی پێغەمبەران‌دا ، وەك نووح و ئیبراهیم و مووسا ، سەلامیان لێ بێ ، ئەو تەمەنی کەم بووە . کەچیی لەگەڵ ئەوەدا کە تەمەنی کەم بووە و ، ماوەی بانگەوازی پێغەمبەرایەتییشی کورت بووە ، خوای گەورە پلەی بەرزتری پێ‌بەخشیوە و ، شوێن‌کەوتوانی دینەکەی بە پاکیی و بەبێ دەست‌کاریی لە شوێن‌کەوتوانی هەموو دینێکی تر زیاترن و ، دینی هیچ پێغەمبەرێك ئەوەندە شوێن‌کەوتەی نەبوون .

[٢٣٤] بۆیە ناو نراوە ( سدرة المنتهى ) لەبەر ئەوەی کە زانستی هەموو پێغەمبەرێکی خاوەن پەیام و ، هەموو مەلائیکەتێکی ( مقرب ) تا ئەوێیە و ، جگە لە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ کەسێکی تر لەوە تێپەڕی نەکردووە .

[٢٣٥] کووپەی هەجەر بەلای گوێ‌گرانەوە زانراو بوون ، چونکە هەجەر ناوچەیەك بووە لە نزیکی مەدینە .

[٢٣٦] کە بریتیین لە رووباری کەوثەر و ، رووباری سەلسەبیل .

[٢٣٧] بەو مانایە کە دینەکەی لە دۆڵە پڕ پیت و بەرەکەتەکانی نیل و فورات دا نیشتەجێ ئەبێ و ، دانیشتوانیان ئەبنە هەڵ‌گری ئەم ئیسلامە و دەستە بە دەستە و بەرە بەرە خزمەتی ئیسلام ئەکەن . نەك بە مانای ئەوەی کە نیل و فورات سەرچاوەکەیان لە بەهەشت بێت .

جیبریل فەرمووی : ئەوەی وەرت گرت ئەو فیترەتەیە کە خۆت و ئوممەتەکەت وان لەسەری .[٢٣٨]

پاشان بۆ هەموو ڕۆژێك پەنجا نوێژم لەسەر فەرز کرا و ، بەدوای خۆمدا گەڕامەوە و ، بەلای مووسادا تێپەڕییم و فەرمووی : فەرمانی چیت بەسەردا درا؟ وتم : فەرمانم بەسەردا دراوە کە هەموو ڕۆژێك پەنجا نوێژ بکەم . فەرمووی : ئوممەتەکەت توانای نابێ هەموو ڕۆژێك پەنجا نوێژ بکات ، چونکە من پێش تۆ خەڵکم تاقیی کردۆتەوە و ، بەوپەڕی ناڕەحەتی‌یەوە کاروباری بەنی ئیسرائیلم هەڵ سووڕاندووە . بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت و داوای لێ بکە با باری سەرشانی ئوممەتەکەت سووك بکات . منیش گەڕامەوە و دە نوێژم لەسەر لابرا . کە گەڕامەوە لای مووسا هەمان فەرمایشتی فەرمووەوە . دیسان گەڕامەوە و ، دە نوێژی ترم لەسەر لابرا ، جارێکی تر گەڕامەوە لای مووسا و هەمان فەرمایشتی فەرمووەوە . دیسان گەڕامەوە و ، دە نوێژی ترم لەسەر لابرا . ئەم جارەش گەڕامەوە لای مووسا و هەمان فەرمایشتی فەرمووەوە .

کە گەڕامەوە فەرمانم بەسەردا درا ڕۆژی پێنج نوێژ بەجێ بهێنم . فەرمووی : ئوممەتەکەت توانای نابێ هەموو ڕۆژێك پێنج نوێژ بکات ، چونکە من پێش تۆ خەڵکم تاقیی کردۆتەوە و ، بەوپەڕی ناڕەحەتی‌یەوە کاروباری بەنی ئیسرائیلم هەڵ سووڕاندووە . بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت و داوای لێ بکە با باری سەرشانی ئوممەتەکەت سووك بکات . فەرمووی : ئەوەندەم لە پەروەردگارم داوا کرد شەرمەزار بووم ، کەواتە ڕازییم و تەسلیم بووم ، فەرمووی : کە تێپەڕم کرد ، بانگم لێ کرا :[٢٣٩] بڕیارم لە سەر فەرزەکەم داوە و ، باری بەندەکانیشمم سووك کردووە .

هەندێ ڕیوایەتی ئیمام موسلیم‌یش باسی هاتنی پێغەمبەر بۆ ( بيت المقدس ) و ، چوونە ناوی و ، بەجێ‌هێنانی دوو ڕەکعەت نوێژ و ، هەڵبژاردنی قاپە شیرەکە و نەویستنی قاپە عەرەقەکە کە جیبریل هەردووکی بۆ هێنا ئەکات ، ئەمەش

---

[٢٣٨]. شیری بە فیترەت داناوە ، چونکە شیر یەکەم خواردنێکە کە ئەچێتە ناو سکی منداڵی تازە لە دایك بووەوە و ، تەنها خوای گەورە دروستی ئەکات و ، خۆراکێکی تەواوە . جارێکی تریش دوای نوێژ کردن لە بيت المقدس ئەم هەڵ بژاردنە ڕووی دا .

[٢٣٩]. خوای گەورە خۆی بانگی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە ، ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە ڕاستەوخۆ ، لەشەوی میعراجدا فەرمایشتی لەگەڵ ئازیزدا کردووە .

دوای هاتنە دەرەوەی لە ( بيت المقدس ) . هەروەها ئەوەشی باس کردووە کە خوای گەورە فەرموویە : (( يا محمد إنـهن خمس صلوات كل يوم وليلة ، لكـل صـلاة عشر، يعني حسنات _ فذلك خمسون صلاة ، ومن همَّ بحسنة فلم يعملها كتبـت لـه حسنة ، فإن عملها كتبت له عشراً ، ومن هم بسيئة ولم يعملها لم تكتب شيئاً ، فـإن عملها كتبت سيئة واحدة )) .

ئەفـەرموێ : ئـەی موحەمـەد ! لـە شـەو و ڕۆژێـكدا پێـنج نوێـژن و ، هـەر نوێژێکیش بە دە چاکەیە ، ئەمە پەنجا نوێژ . هەرکەسیش نیازی چاکەیەکی کرد و ئەنجامی نەدا بە چاکەیەك بۆی ئەنووسرێ و ، گەر ئەنجامی دا بـە دە چـاکە بـۆی ئەنووسرێ . هەرکەسیش نیازی خراپەیەکی کـرد و ئـەنجامی نـەدا هیچـی لەسـەر نانووسرێ و ، گەر ئەنجامی دا تەنها یەك خراپەی لەسەر ئەنووسرێ ..

هەروەها هەندێ کتێبی تری فەرموودەش باسی ئەو شتانە ئەکەن کە پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە بۆ ( بيت المقدس ) چاوی پێ‌کەوتوون و ، دوو ڕەکعـەت نوێـژیش کە لە ( طور سيناء ) و لە ( بيت لحم ) و لە مەدینـە ئـەنجامی داون ، هـەروەها باس لەوە ئەکەن کە لە ( بيت المقدس ) پێشنوێژیی بـۆ پێغەمبـەران کـردووە و ، پێغەمبەران و ، پێغەمبەریش ستایشی پەروەردگاریان کردووە .

لەو گەشتەی‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بە مـالیکی سەرپەرشـتیاری دۆزەخ ئەکەوێت ، کە بە هیچ شـێوەیەك پێ‌ناکـەنێ و ، خۆشـیی ناکەوێتـە ناوچـاوانی . هەروەها چاوی بە بەهەشت و دۆزەخ ئەکەوێت .

چاوی کەوت بەوانەی کە بە ستەم ماڵ و سـامانی هـەتیوان ئـەخۆن ، کـە وەك وشتر لمۆزیان هەبوو و ، پارچە ئاگری وەك تاشە بەردیان ئەخستە دەمیانـەوە و لـە دوایانەوە دەرئەچوو .

چاویشیان بە سووخۆرەکان کەوت ، کە ورگێکی وەها زلەیان پێـوە بـوو نـەیان ئەتوانی لە جێی خۆیان بجووڵێن و ، کە ئالی فیرعەون بە لایانا تێپەڕیان ئەکرد تـا ئاگری دۆزەخیان پیشان بدرێت ، ئەنیشتنە ملیان و ئەیان پلیشاندن .

چاویشی بە زیناکەران کەوت کە گۆشتێکی قەڵەوی چاك و ، گۆشـتێکی لـەڕی گەنیویان لەبەردەم‌دا بوو و ، لە گۆشتە گەنیوەکەیان ئەخوارد و ، وازیان لە قەڵەوە چاکەکە ئەهێنا .

چاویشی کەوت بە هەندێ ئافرەت کە بە مەمکیان هەڵواسرا بوون ، بە بۆنەی ئەوەوە کە منداڵی پیاوێکیان بە هی پیاوێکی تر لە قەڵەم دابوو .

هەروەها لەمسەر و لەوسەرەوە چاوی کەوت بە کاروانێکی قورەیش ، کە ئەوەبوو وشترێکیان لێ ون بوو بوو پیشانی دان و ، ئاوەکەشیان لە دەفرێکی سەرگیراودا بوو و ، کاتێ کە ئەوان خەوتبوون ئاوەکەی خواردەوە و ، دەفرەکەشی وەك خۆی بە سەرگیراویی بەجێ هێشت . ئەمەش بووە بەڵگەیەك لەسەر راستیی فەرمایشتەکانی کاتێ کە لە مەککە بۆ قورەیشی باس کرد .

هەر ئەو شەوە ئەم گەشتە پیرۆزە تەواو بوو .. کە رۆژ بوویەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەم گەشتە و ئەو شتانەی کە بینیبوونی کرد بۆ قورەیش و ، ئەوانیش زیاتر لە جاران ملیان با ئەدا و ، دژایەتییان ئەکرد .. داوایان لێ کرد باسی ( بیت المقدس ) یان بۆ بکات . خوای گەورە وێنەی مزگەوتەکەی بۆ دەرخست هەتا بە وردیی بۆیان باس بکات . ئەویش هەموو ناونیشانێکی مزگەوتی بۆ هەڵ ئەدان و نەیانئەتوانیی ئینکاریی لە راستیی بکەن . هەروەها هەواڵی کاروانەکەی پێدان کە لەمسەر و لەوسەرەوە چاوی پێ کەوتبوو و ، هەواڵی ئەو کاتەشی دانێ کە ئەگاتە بەرەوە و ، هەواڵی ئەو وشترەش کە ئەکەوێتە پێش کاروانەکە . ئەوەبوو هەموو هەواڵەکانی بە راست دەرچوون ، کەچیی ئەو ستەمکارانە زیاتر ئەسڵەمینەوە و ، هەتا ئەهات کافرتر ئەبوون .

بەڵام ئەبوبەکر بە جوانیی تەصدیقی ئازیزی کرد ، بۆیە نازناوی ( صدديق ) ی لێ نرا .

دەربارەی کاتی ئیسرا و میعراج رای زۆر هەیە :

١ ـ وتراوە کە ئیسراء لە یەکەم ساڵی هاتنی وەحیدا بووە ، طەبەریی رای لەسەر ئەمە بووە .

٢ ـ وتراویشە پێنج ساڵ دوای هاتنی وەحی بووە ، ئەمەش رای نەوەویی و قورطوبیی بووە .

٣ ـ وتراویشە شەوی بیست و حەوتەمی مانگی رەجەبی ساڵی دەهەمی هاتنی وەحی بووە ، ئەمەش رای مامۆستا مەنصورفووریە .

٤ ـ وتراویشە شانزە مانگ پێش کۆچکردن بۆ مەدینە بووە ، واتە لە رەمەزانی ساڵی دوانزەهەمی هاتنی وەحیدا بووە .

٥ ـ وتراویشه ساڵێك و دوو مانگ پێش كۆچ كردن بووه ، واته له موحه‌ڕڕه‌می ساڵی سیانزه‌هه‌می هاتنی وه‌حی‌دا بووه .
٦ ـ وتراویشه ساڵێك پێش كۆچ كردن بووه ، واته له ره‌بیعی یه‌كه‌می ساڵی سیانزه‌هه‌می هاتنی وه‌حی‌دا بووه .[٢٤٠]

**سیانزه‌هه‌م : بانگ كردنی هۆزه‌كان**

دوای ئه‌وه‌ی كه دوژمنایه‌تیی نێوان موسڵمانه‌كان و قوڕه‌یش گه‌یشته چڵه‌پۆپه و ، بت‌په‌رستان به هه‌موو هێزێكیانه‌وه دژایه‌تیی ئیسلامیان ئه‌كرد و ، ئه‌وه‌بوو دانیشتوانی طائیف‌یش نه موسڵمان بوون و ، نه بوونه كۆمه‌كی ئیسلام ، بگره نامه‌ردانه ئازاری پێغه‌مبه‌ریشیان دا ، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له مانگی ذوالقعدة ) ی ساڵی ده‌هه‌می هاتنی وه‌حی‌دا ، كه به‌رامبه‌ر به مانگی حوزه‌یران ، یان ته‌مووزی ٦١٩ ی زایینی بوو ، گه‌ڕایه‌وه مه‌ككه تا هۆزه عه‌ره‌به‌كان بانگ بكات بۆ سه‌ر ئیسلام ، چونكه كاتی ئه‌وه بوو كه عه‌ره‌به‌كان له هه‌موو لایه‌كه‌وه روو بكه‌نه مه‌ككه بۆ ئه‌نجام‌دانی فه‌رزی حه‌ج ، ئه‌وه‌بوو یه‌ك به یه‌ك سه‌ری له‌و هۆزانه ئه‌دا و باسی ئیسلامی بۆ ئه‌كردن :

ئه‌بونوعه‌یم له عه‌بباس‌ه‌وه خوا لێی رازیی بێ ریوایه‌تی كردووه كه وتوویه : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پێمی فه‌رموو : (( لا أرى عندك ، ولا عند أخيك ـ يريد أبا لهب ـ مَنَعَة ، فهل أنتم مخرجيَّ إلى السوق غداً حتى نقر في منازل قبائل الناس ؟ )) .
فه‌رمووی : وا نابینم نه تۆ و نه ئه‌بوله‌هه‌بی براشت توانای به‌رگرییتان لێم هه‌بێ، ئایا سبه‌ینێ دێن له‌گه‌ڵما تا بچین بۆ بازاڕ و سه‌ر له‌و هۆزانه بده‌ین ؟

بۆ به‌یانیی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌گه‌ڵ ئه‌بوبه‌كری صدديق‌دا خوا لێی رازیی بێ كه‌وتنه رێ و چوونه لای هۆزه عه‌ره‌به‌كان و ئه‌ی‌فه‌رموو :
(( يا بني فلان ! إني رسول الله إليكم ، آمركم أن تعبدوا الله ، ولا تشركوا به شيئاً ، وأن تخلعوا ما تعبدون من دون الله من هذه الأنداد وأن تؤمنوا بي ، وتمنعوني حتى أبلِّغَ رسالة ربي ؟ )) .
ئه‌ی‌فه‌رموو: ئه‌ی نه‌وه‌ی فلان ! من پێغه‌مبه‌رم و بۆ لای ئێوه ره‌وانه كراوم ، فه‌رمانتان به‌سه‌ردا ئه‌ده‌م كه خوا بپه‌رستن و ، هیچ شتێك مه‌كه‌نه شه‌ریكی و ،

---
[٢٤٠] الرحيق المختوم : ١٤٠ ـ ١٤٥ ، والسيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٤٠٧ ـ ٤٢٧ .

ئەم بتانە واز لێ بهێنن و مەیانکەنە شەریکی خوا و ، ئیمان بە دینەکەی من بهێنن و ، پارێزگارییم بکەن هەتا پەیامەکەی پەروەردگارم بگەیەنم ..

هەروەها ئەیفەرموو : (( مَن يحملني حتى أبلغ رسالة ربي ؟ )) ئەیفەرموو : کێ لە وڵاتی خۆیدا جێم ئەکاتەوە هەتا پەیامەکەی پەروەردگارم بگەیەنم ؟

ئەشیفەرموو : (( يا أيها الناس ! قولوا : لا إله إلا الله تفلحوا )) . ئەیفەرموو : خەڵکینە ! بڵێن : ( لا إله إلا الله ) سەر ئەکەون ، کاتێ ئەمانەی ئەفەرموو ، ئەبولەهەب ، عبدولعوززای کوڕی عەبدولموطەللیبی مامەی بە دوایەوە بوو و ، ئەی وت : ئەمە لە دینی خۆتان و باوباپیرانتان وەرتان نەگێڕێ ، ئەمە ئەیەوێ لە پەرستنی لات و عوززا و جیننییە هاوپەیمانەکانتان داتان بماڵێ و ، بتان خاتە سەر ئەو دینە داهێنراو و گومڕایەی خۆی ، بە گوێی مەکەن و هیچی لێ مەبیستن !!

هی وا هەبوو ئەبولەهەبی نەئەناسیی و سەری سوڕ ئەما و ئەیوت : ئەم پیاوە کێیە وا بە دوایەوە و هەرچیی ئەو ئەیلێ ئەم پەرچی ئەداتەوە ؟! ئەیان وت : ئەوە ئەبولەهەبی مامەیەتی !!

هەر لە ساڵی چوارەمەوە هەتا ساڵی دەهەمی هاتنی وەحی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو وەرزێکدا داوای ئیمانهێنانی هۆزەکانی کردووە .

ئەمەش هەندێ لەو هۆزانەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بردە ناویان و باسی ئیسلامی بۆ کردن .

لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حوصەینەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریف دێنێتە ناو مەنزڵگای تیرەیەکی هۆزی کەلب کە پێیان ئەوترا نەوەی عەبدوڵڵا . ئەوەبوو بانگی کردن بۆ لای خوا و ، خۆی پێیان ناساند ، هەتا ئەیفەرموو : (( يا بني عبدالله ! إن الله قد أحسن إسم أبيكم )) . ئەیفەرموو : ئەی نەوەی عەبدوڵڵا ! خوای گەورە ناوێکی جوانی وەك ناوی عەبدوڵڵای لە باپیرە گەورەتان ناوە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئیمانیان وەر نەگرت .

لە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە خوا لێیان ڕازیی بێ ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاتە مەنزڵگای نەوەی حەنیفەوە . ئەوەبوو بانگی کردن بۆ لای خوا و ، خۆی پێیان ناساند ، کەچیی هیچ عەرەبێك وەك ئەوان بە ناشیرینیی وەڵامی نەدایەوە .

(كذا في البداية : ٣ / ١٣٩ وكذا في الطبري : ٢ / ٨٤ ) .

له ( دلائل النبوة : ١٠٠ ) دا ئەبونوعەیم له عەبدورڕەحمانی عامیرییەوە لە چەند پیاوێکی پیری قەومەکەیەوە تەخریجی کردووە کە وتوویانە :

له بازاڕی عوکاظ دا بووین پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە لامان و فەرمووی : (( مِمَّن القوم )) . فەرمووی : ئێوە له چ هۆزێکن ؟ وتمان : لە نەوەی عامیری کوڕی صەعصەعەین . فەرمووی : (( مِن أيِّ بني عامرٍ ؟ )) . فەرمووی : له چ تیرەیەکی نەوەی عامیر ؟ وتمان : نەوەی کەعبی کوڕی ڕەبیعە . فەرمووی : (( كيف المنعةُ فيكم ؟ )) . فەرمووی : توانای خەڵك پارستنتان چۆنە ؟ وتمان : کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێ و ، کەسیش خۆی تووش ناکات و لەگەڵمان هەڵچێ . ئەویش پێی فەرموون : (( إنِّي رسولُ الله ، فإن أتيتُكم تمنعوني حتَّى أُبلِّغَ رِسالةَ ربّي ؟ ولَم أُكره أحداً منكم على شيءٍ )) . فەرمووی : من پێغەمبەری خوام . ئەگەر بێمە ناوتان پارێزگاریم ئەکەن هەتا پەیامەکەی پەروەردگارم بگەیەنم ؟ بە مەرجێ هیچ کەسێکیشتان بۆ هیچ کارێك ناچار ناکەم . وتیان : ئەی تۆ لە چ تیرەیەکی قوڕەیشییت ؟ فەرمووی : (( من بني عبدالمطلب )) . وتیان : ئەی لەگەڵ نەوەی عەبدمەنافدا چۆنیت ؟ فەرمووی : (( هم أول من كذبني وطردني )) . فەرمووی : ئەوان یەکەم کەس بە درۆزنیان دەرکردم و دەریشیان پەڕاندم .. وتیان : بەڵام ئێمە نە دەرت ئەپەڕێنین و نە ئیمانیشت پێ ئەهێنین . پارێزگارییت ئەکەین هەتا پەیامەکەی پەروەردگارت بگەیەنی .

ئەڵێ : پێغەمبەر ﷺ لەلایان دابەزیی و ، خەڵکەکەش خەریکی کڕین و فرۆشتن بوون ، لە ناکاو بەیحەرەی [٢٤١] کوڕی فیراسی قوشەیریی هاتەوە لایان و وتی: ئەم پیاوە کێیە لە لاتان ؟ نایناسم .. وتیان : موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای قوڕەیشییە . وتی : چیتانە بەسەریەوە ؟ وتیان : وای ئەگەیەنێ کە پێغەمبەری خوایە و ، داوامان لێ ئەکات بیپارێزین هەتا پەیامەکەی پەروەردگاری بگەیەنێت . وتی : ئەی ئێوە چیتان وەڵام دایەوە ؟ وتیان : وتوومانە : بەسەر چاوان ، ئەتبەین بۆ وڵاتی خۆمان و تۆش وەك خۆمان ئەپارێزین ، بەیحەرە وتی : پێ‌نازانم کەسێك لە خەڵکانی ئەم بازاڕە شتێك لەگەڵ خۆیان بەرنەوە ئەوەندەی ئەمەی کە ئێوە ئەیبەنەوە خراپ بێت . سەرەتا ئەیبەنەوە تا لەگەڵ خەڵکیدا ببنە دوژمن و ، عەرەب بە جارێکدا هەر هەموویان بێن بە گژتانا ، خزمەکانی

[٢٤١] لە هەندێ سەرچاوەدا ( بُجرة ) هاتووە و لە هەندێکی تریشدا ( بحيرة ) .

چاکی ئەناسن . خۆ ئەگەر بیانزانیایە خێری تیایە ئەوا بە هۆیەوە ئەبوونە بەختەوەرترین کەس . ئەچن سەفیهێکی ئەو خەڵکە ، کە خزمەکانی دەریان کردووە و ، بە درۆزنیان لە قەڵەم داوە ، جێ ئەکەنەوە و پشت گیریی لێ ئەکەن . ئای کە رایەکی خراپتان هەیە . پاشان رووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : هەستە بڕۆرەوە ناو خزمەکانت . بەخوا لەبەر ئەوە نەبوایە کە میوانی خزمەکانی ئەمدا لە ملت .

ئەڵێ: پێغەمبەری‌خوا ﷺ هەستا و چوو بەلای وشترەکەیەوە و سواری بوو .. بەیحەرەی پیسیش نەقیزەی لاتەنیشتی وشترەکەی دا و ، ئەویش هەڵی ئەخستەوە تا پێغەمبەری خوای ﷺ خستە خوارەوە . لەو کاتەدا ئافرەتێك بە ناوی ضوباعەی کچی عامیری کوڕی قورط ـ کە یەکێ بوو لەو ئافرەتانەی لە مەککەدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ موسڵمان بوو بوو ـ هاتبوو بۆ سەردانی ئامۆزایانی و وتی : ئەی ئالی عامیر ! ـ هەرچەند هیچ عامیرێکم نیە ـ ئایا لە نێو ئێوەدا ئاوەها ئەکرێ بە پێغەمبەری خوا و کەسێکتان بەرگریی لێ ناکات ؟ سێ پیاو لە ئامۆزاکانی هەستان بۆ بەیحەرە و ، ئەویش دوو کەس هاتن بۆ یارمەتیی . هەر یەکە لە سێ ئامۆزاکەی ضوباعە پیاوێکیان گرت و دای بە زەویی‌دا و ، پاشان لەسەر سنگی دانیشت و ، بە بۆکز و مشتەکۆڵە دەم و چاوی دارگرتەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أَللَّهُمَّ ! بارِكْ على هـؤلاءِ وَالعَـنْ هـؤلاءِ )) . فەرمووی : خوایە ! فەڕ و بەرەکەت بڕژێنە بەسەر ئەمانەدا ـ بە خزمەکانی ضوباعە ـ و نەفرەتیش بکە لەوانە ـ بە بەیحەرە و یارمەتی‌دەرەکانی ـ .

ئەڵێ : ئەو سیانەی کۆمەکیی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد موسڵمان بوون و بە شەهیدییش سەریان نایەوە و ، ئەوانی تریش بەو لەعنەتەوە سەریان نایەوە . ئەو دوانەی کە یارمەتیی بەیحەرەیان دا ناویان : حەزەنی کوڕی عەبدوڵڵا و موعاویەی کوڕی عویادە بوو . ئەو سیانەش کە بوونە کۆمەکی ناویان : غیطریف و غەطەفانی کوڕانی سەهل و ، عوروەی کوڕی عەبدوڵڵا بوون .

وأخرجه الحافظ سعيد بن يحيى بن سعيد الأموي في مغازيه عن أبيه ، كما في البداية ( ٣ / ١٤١ ) .

بەڵام لای ئیبن ئیسحاق بەم جۆرە هاتووە : پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بردە مەنزڵگای نەوەی عامیری کوڕی صەعصەعە و ، بانگی کردن بۆ لای خوا و ، خۆی پێیان ناساند ، کەچیی پیاوێکیان بە ناوی بەیحەرە ، یان بەحیرەی کوڕی فیراس

وتی : بەخوا ئەگەر من ئەم گەنجەی قورەیش لەگەڵ خۆم ببەمەوە وڵاتی خۆمان هەموو عەرەبی پێ ئەخۆم ، پاشان بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت : باشە ئەگەر ئێمە بۆ ئەم کارەت شوێنت کەوتین پاشان خوا بەسەر نەیارانتدا سەری خستیت ، ئایا دوای خۆت کارەکەت ئەدرێتە دەست ئێمە ؟ فەرمووی: (( الأمر لله يضعه حيث يشاء )) . فەرمووی : ئەمە کاری خوایە و بە ویستی خۆیەتی بە هەر کەسێکی بسپێرێ . کابرا وتی : گوایە سنگمان بکەینە قەڵغان بۆت لەبەردەم عەرەبدا و ، کاتێکیش کە خوا سەری خستیت کارەکەت بدرێتە دەست کەسانی تر ؟ ئێمە پێویستمان بە کاری تۆ نیە ..[٢٤٢] بەمە ئیمانیان نەهێنا .

کە خەڵکەکە کاریان تەواو بوو و گەڕانەوە دوا ، نەوەی عامیریش گەڕانەوە دوا و ، چوونە لای ریش سپی‌یەکی بەساڵدا چوویان ، کە ئەوەندە پیر بوو بوو نەی‌ئەتوانی لەگەڵیانا بچێت بۆ حەج . ئەوەبوو هەموو جارێ کە ئەگەڕانەوە ئەچوون بۆ لای و رووداوی وەزری حەجیان بۆی ئەگێڕایەوە . کە ئەو ساڵە گەڕانەوە لای پرسیاری لێ کردن کە لەم وەرزەدا چیی رووی داوە ، وتیان : گەنجێکی قورەیشیی کە لە نەوەی عەبدولموطەللیب بوو هات بۆ لامان و ، وەهای دەرئەبڕیی کە پێغەمبەرە و ، داوای لێ ئەکردین کە بی‌پارێزین و لەگەڵیا بین و بی‌هێنین بۆ وڵاتی خۆمان .

ئەڵێ : ریش سپی‌یەکە بە داخەوە دەستی کێشا بەسەری خۆیدا ، پاشان وتی : ئەی نەوەی عامیر ! ئایا ئەتوانن فریای ئەم کارە بکەون ؟ ئایا دەستگیر ئەکرێتەوە ؟ بەو خوایەی گیانی فڵانەکەسی بە دەستە هەرگیز هیچ ئیسماعیلی‌یەك ئەمەی نەوتووە و ، ئەم داوایەشی راستە ، ئەی ئێوە ژیرییتان لە کوێ بوو ؟

(كذا في البداية : ٣ / ١٣٩ والطبري في تأريخه : ٢ / ٨٤ ) .

ئەم چیرۆکە ، ئیسلامی پاڵفتە لە سیاسەتی چەواشەکار جیا ئەکاتەوە .. پێغەمبەری نازدار ﷺ ، دینی حەقی هێناوە بۆ پاك کردنەوەی نیاز و مەبەستی مرۆڤ ، بۆیە سەرەتا بە بەڵێنی ساختە دەست پێ ناکات تا کۆمەك و پشتیوان

---

[٢٤٢] کابرا ناحەقی نیە ، چونکە لە روانگەی هەوا و ئارەزووی دەروونەوە و ، بە پێی بەرژەوەندیی دنیایی ، کەس بە هەوانتە کار بۆ کەسی تر ناکات .. ئیتر نازانێ ئەمە رێبازی ئیمانە و ، بەرژەوەندی‌یەکانی پاداشتی قیامەتە و ، دەست کەوتەکانیشی رەزامەندیی خوای پەروەردگارە .. سەیر لەوەدایە بڕواشی هەیە کە سەرکەوتنی ئەم کارە بە دەستی خوایە ، بەڵام بەبێ بەرژەوەندیی بۆچیی خۆی ماندوو بکات ؟

جەم بکات و ، دواییش کەس نەوێرێ هەناسە بدات .. بەڵکو لە هەموو کاتێـکدا هەر راستیی ئەوێ و ، راستییش بە شوێن‌کەوتوانی ئەگەیـەنێت ، هەرچـەندە ئـەم رێگایە دوور و درێژە و گەیشتن بە مەنزڵ زۆری ئەوێ ، بـەڵام سـەربەرزیی دنیـا و قیامەتی لەگەڵدایە و ، ئەوانەش کە شوێنی ئەکـەون هـەڵبـژاردەی پـاك خـاوێنی گرۆی ئادەمیین ..

ئەبونوعەیم لە ( الدلائل : ١٠٢ ) دا لە عەبدوڵڵای کوڕی وابیصەی عەبسی‌یەوە، لە باوکیەوە لە باپیریەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ تەشـریفی هێنا بۆ شوێنی بارخستنمان لە مینا و ، ئێمەش لە ( جمرە ) ی یەکەم کە لە دوای مزگەوتی ( خیف ) ەوە دێت بارمان خستبوو .. بە سواریی وشترەکەی تەشـریفی هێنا و زەیدی کوڕی حاریثەشی لە پاشکۆیدا سـوار کردبـوو . ئـەوە بـوو بـانگی کردین ، دە بەخوا نەهاتین بە دەمیەوە و ، ئەو چاکەیەمان دەست‌گیر نەبوو .

ئەڵێت : باسی خۆی و بانگەوازەکەیان لە وەرزی حەجدا بیستبوو . تا ئـەوەبوو هاتـە لای ئێمـەش و بـانگی کـردین و کـەس نەچـوو بـە دەمیـەوە . ئـەو کاتـە مەیسەرەی کوڕی مەسرووقی عەبەسییشمان لەگەڵدا بوو و وتی : سـوێند بـەخوا ئەخۆم ئەگەر لەگەڵ ئەو پیاوەدا راست بکەین و ، بی‌بەینەوە لەگـەڵ خۆمـاندا و، لە نێوماندا بیێنێتەوە ، ئەوە رای راستە ..دیسـان سـوێندیش بـەخوا ئـەخۆم کـە کاری ئەم پیاوە سەر ئەکەوێ و ئەگاتە هەموو شوێنێك . خەڵکەکە وتیان : وازمان لێ بێنە ، تووشی بەزمێکمان مەکە کە توانامان بەسەریدا ناشکێ .. پێغەمبەری خوا ﷺ تەمای کردە مەیسەرە ( بۆ ئیمان هێنان ) و فەرمایشتی لەگەڵدا کـرد ، مەیسەرەش وتی : ئای کە قسەکانت جوان و نوورانیین ! بەڵام خزمەکانم بە گـوێم ناکەن و ، پیاویش بە خزمەکانیەوە بەندە ، ئەگەر ئەوان پشتیوانیی لێ نەکـەن ، غەریب و دوورینە لە کۆمەکی‌یەوە دوورترن . پێغەمبەری خوا ﷺ تەشـریفی بـرد و، خەڵکەکەش گەڕانەوە بۆ ناو کەس‌وکاریان ، ( لە رێدا ) مەیسەرە پێی وتـن : بـا لا بدەینـە ئـاوایی فـەدەك [٢٤٣] ، جوولەکـەی وا تیـا و دەربـارەی ئـەم پیـاوە پرسیاریان لێ ئەکەین . خەڵکەکە لایان دایە لای جوولەکەکان و ئەوانیش بەشێك لە بەشەکانی تەوراتیان دەرهێنـا و کردیانـەوە و، دەسـتیان بـە دیراسـەی باسـی

---

[٢٤٣] فەدەك گوندێك بووە لە خۆرهەڵاتی خەیبەرەوە و لە ساڵی حەوتەمی کۆچییدا بە رێك کەوتن بۆتە ( فيء ) بۆ پێغەمبەر ﷺ . ئێستا شارێکی ئاوەدانی پڕ لە خورما و کشت‌وکاڵە و پێی ئەوترێ : ( الحائط ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ کرد : پێغەمبەری نەخوێندەواری عەرەبیی ، کە سواری وشتر ئەبێت و ، بە پارچەیەك نان قەناعەت ئەکات و ، نە درێژە و نە کورت و ، نە قژی لوولە و نە خاو .. لە چاوانی‌دا سووری‌یەك تێکەڵ بە سپیی بووە . جا ئەگەر ئەمەیە ئێوەی بانگ کردووە ، ئەوا بچن بە دەمیەوە و شوێن دینەکەی بکەون و ، ئێمەش حەسوودیی پێ ئەبەین و شوێنیشی ناکەوین و ، لە چەندین شوێنیش‌دا بە دەستیەوە تووشی بەڵای گەورە گەورە ئەبین .. عەرەبیش هەر هەموویان یان شوێنی ئەکەون ، یان لەگەڵیا ئەجەنگن ، جا ئێوە لەوانە بن کە شوێنی ئەکەون .
مەیسەرە وتی : خزمینە ! ئەم کارە روون و ئاشکرایە . خەڵکەکە وتیان : ئەتەوێ بگەڕێینەوە بەدوای خۆمانا و بچینە لای ؟ هەموو بە جارێك‌دا بەرەو وڵاتی خۆیان گەڕانەوە و ، پیاوە ناودارەکانیان نەیان‌هێشت بچنە خزمەتی و تاقە کەسێکیان موسڵمان نەبوو .. کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد و ، حەجی ماڵ ئاوایی ئەنجام‌دا مەیسەرە تووشی بوو و ناسی‌یەوە . وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەخوا لەو کاتەوە کە تەشریفت هێنایە ناومان هەتا ئێستە سوور بووم لەسەر شوێن کەوتنت ، تا ئەوەی کە رووی دا ، رووی دا .. خوای گەورە ویستی وەها بوو موسڵمان‌بوونم ، وەك دەی‌بینیی ، ئاوەها دوا بکەوێ و ، زۆربەی ئەوانەش کە ئەو کاتە لەگەڵم‌دا بوون مردن .. ئەبێ شوێنی ئەوانە کوێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( كُلُّ مَنْ ماتَ على غَيرِ دينِ الإسلامِ فَهُوَ في النَّار )) . فەرمووی : هەرکەسێ لەسەر غەیری دینی ئیسلام بمرێ لە ئاگردایە .
مەیسەرە وتی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە رزگاری کردم . ئەوەبوو موسڵمان بوو، بەڵام موسڵمان‌بوونێکی چاك ، بە رادەیەك کە خاوەنی پایە و سەنگی تایبەتیی بوو لەلای ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ . ( وذكره في البداية : ٣ / ١٤٥ ) .

دیسان ئەبونوعەیم لە ( الدلائل : ١٠٣ ) دا تەخریجی کردووە و وتوویە : موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی کەثیری کوڕی صەڵت لە ئیبن روومان و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر و غەیری ئەوانیشەوە خوا لێیان رازیی بێ بۆی گێڕاومەتەوە کە وتوویانە :

پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ هەوارگەی کیندە لە بازاڕی عوکاظ دا ، بەڵام تەشریفی نەبردبووە لای هیچ هۆزێکی عەرەب کە ئەوەندەی ئەوان نەرم و

نیان بێ ، کاتێك کە نەرم و نیانیی و زمان پاراویی و ڕووخۆشیی ئەوانی دیی ، دەستی دایە فەرمایشت لەگەڵیان‌دا و ئەی‌فەرموو : (( أدعوكم إلى الله وحده لا شريك له وأن تمنعوني مما تمنعون منه أنفسكم فإن أظهر فأنتم بالخيار )) . فەرمووی : بانگتان ئەکەم بۆ ئیمان‌هێنان بە خوای تاك و تەنیا و بێ‌شەریك و ، خۆتان لە هەرچیی ئەپارێزن منیشی لێ بپارێزن . جا کە سەر کەوتم ئیتر بە ویستی خۆتانە . زۆربەیان وتیان : ئەم وتەیە چەند جوانە ! بەڵام ئێمە خەریکی پەرستنی ئەو خوایانەین کە باوباپیرمان ئەیان پەرستن .. بچووکی هەموویان هاتە زمان و وتی : خزمینە ! پێش هەموو کەسێك ئیمان بەم پیاوە بهێنن ، بەر لەوەی خەڵك پێشتان بکەوێ . دە بەخوا ئەهلی کیتاب باسی ئەوە ئەکەن کە کاتی نزیك بۆتەوە لە حەرەم‌دا پێغەمبەرێك ڕەوانە بکرێ . لە ناو خەڵکەکەدا پیاوێکی یەك‌چاو هەبوو وتی : تکایە بێ‌دەنگ بن ! کابرا عەشرەتەکەی دەری کردووە و ، ئێوە جێی ئەکەنەوە ، ئێوە ئەتوانن جەنگی هەر هەموو عەرەب بگرنە ئەستۆ ؟! نا ، نا . ئیتر ئەوەبوو بە خەمباری‌یەوە بەجێی هێشتن و ، خەڵکەکەش گەڕانەوە بۆ ناو خزمەکانیان و هەواڵیان دانێ . پیاوێکی جوولەکە وتی : بەخوا ئێوە بەختتان لە دەست داوە . یان لە ( المجمع : ٨ / ٢٣٢ ) دا ئەڵێت : پەلە بکەن و هەوڵ بدەن بەختی خۆتان دەست بکەوێ تا ڕێی ڕاست بگرنە بەر ، دوایین پێغەمبەرە ) . ئەگەر پێش هەموو کەس ئیمان بەم پیاوە بهێنن ، ئەوا ئەبنە سەرداری عەرەب . ئێمە لە کتێبەکانمان‌دا ناو و نیشانەکانی ئەبینین . هەرچیی جوولەکەکە صیفەتەکانی هەڵ ئەدات ، ئەوانەی کە چاویان بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبوو تەصدیقی صیفەتەکانیان ئەکرد . پاشان جوولەکەکە وتی : ئەبینین کە لە مەککە ئەبێتە پێغەمبەر و ، شوێنی کۆچ‌کردنیشی یەثریبە . خەڵکەکە بە یەك‌دەنگیی هاتنە سەر ئەوە کە ساڵی داهاتوو لە حەج‌دا بێنەوە خزمەتی . بەڵام ئەوەبوو سەردارێکیان لە حەجی ئەو ساڵە دوای خستن و یەك کەسیان حەجیان نەکرد . ئەوەبوو کابرای جوولەکەش مرد و ، لە سەرەمەرگی‌دا ئەوەی لێ بیسترا کە تەصدیقی موحەممەدی ﷺ ئەکرد و ئیمانی پێ ئەهێنا .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لە هۆزی بەکری کوڕی وائیل دا و فەرمووی : (( مِمَّن القوم ؟ )) فەرمووی : لە چ هۆزێکن ؟ وتیان : لە بەکری کوڕی وائیلین . فەرمووی : (( مِن أيِّ بَكرِ بن وائِلٍ ؟ )) فەرمووی : لە چ تیرەیەکی بەکری

کوڕی وائیلن ؟ وتیان : لە نەوەی قەیسی کوڕی ثەعلەبە . فەرمووی : (( کیفَ العَدَدُ ؟ )) فەرمووی : ژمارەتان چۆنە ؟ وتیان : زۆرین وەك خۆڵ . فەرمووی : (( فکیف المنعة ؟ )) . فەرمووی : ئەی پارێزگارییتان چۆنە ؟ دانیان بەوەدا نەنا کە بتوانن پەنای بدەن ، ئەمەش لە ترسی حکوومەتی فارس . کە پشتی هەڵ کرد و ویستی بڕوا ئەبولەهەب لەوێوە تێپەڕیی و وتیان : ئەم پیاوە ئەناسیی ؟ وتی : بەڵێ ، لە بەرزترین پلەی نەسەبدایە ، بەڵام لە چ بارەیەکیەوە پرسیار ئەکەن ؟ ئەوانیش هەواڵیان دایە کە بۆ چیی بانگی کردوون و وتیان : وای ئەگەیەنێ کە پێغەمبەری خوایە . وتی : نەکەن بە گوێی بکەن ، ئەوە شێتە و وڕێنە ئەکات . وتیان : کاتێ کە باسی فارسی کرد هەستمان بەوە کرد . (کذا في البدایة : ٣ / ١٤٠ )

هەروەها ئەبونوعەیم لە ( الدلائل : ٩٦ ) دا لە ئیبن عەبباس ەوە ، لە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب ەوە خوا لێیان رازیی بێ ، تەخریجی کردووە کە فەرموویە : .. .. .. .. پاشان گەیشتینە کۆڕێك کە هێمنیی و ویقار باڵی کێشا بوو بە سەریا و، ئەبینین پیاوی ریش سپیی خاوەن رێز و خاوەن هەیئەت تیایا دانیشتوون . ئەبوبەکر پێش کەوت و سەلامی کرد .. ئیمام عەلیی فەرمووی : ئەبوبەکر لە هەموو کاتێكدا پێش ئەکەوت . ئەبوبەکر پرسیاری لێیان کرد : ئەم هۆزە کێن؟ وتیان : ئێمە نەوەی شەیبانی کوڕی ثەعلەبەین . ئاوڕی دایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی : دایك و باوکم بە قوربانت بن ، کەس ئەوەندەی ئەمانە لەناو قەومەکەیاندا دەسەڵاتدار نیە . ئەوەبوو مەفرووقی کوڕی عەمر و ، هانیءی کوڕی قەبیصە و ، موثەننای کوڕی حاریثە و ، نوعمانی کوڕی شەریکیان لەناودا بوون و ، نزیکترین کەسیشیان لە ئەبوبەکرەوە مەفرووقی کوڕی عەمر بوو . مەفرووق بە رەوانبێژیی و زمانپاراویی پێشی هەموویانی دابوویەوە و ، دوو پەلکەشی هەبوون کە ئەگەیشتنە سەر سنگی و لە دانیشتنی کۆڕەکەشدا لە هەموویان نزیكتر بوو لە ئەبوبەکرەوە . ئەبوبەکر پێی فەرموو : ژمارەتان زۆرە ؟ وتی : لە هەزار کەس زیاترین و ، هەزاریش لەبەر کەمییان ناشکێن . فەرمووی : ئەی پارێزگاریی لەناوتاندا چۆنە ؟ وتی : لەسەرمان پێویستە توانای خۆمان بەخت بکەین و ، هەموو کۆمەڵێکیش خۆیان و بەختیان . ئەبوبەکر فەرمووی : ئەی جەنگتان لەگەڵ دوژمنتاندا چۆنە ؟ مەفرووق وتی : کاتێك کە بە دوژمن ئەگەین لە هەموو کەس تووڕەترین و ، کاتێکیش کە تووڕە ئەبین لە هەموو کەس

ئازاترین و ، ئێمە ئەسپی تیژمان لە منالأنمان و ، چەکیشمان لە وشتری گوان پڕ لە شیر خۆشتر ئەوێن و ، سەرکەوتنیش لای خوایە .. جارێك سەرمان ئەخات و جارێکیش ژێرمان ئەخات . لەوە ئەچێ تۆش کاکەی قورەیشیی بیت ؟ ئەبوبەکر فەرمووی : رەنگە دەنگ و باسی پێغەمبەری خواتان ﷺ پێ گەیشتبێت ، ئەمە ئەوە . مەفرووق وتی : پێمان گەیشتووە کە ئەو شتانە باس ئەکات . پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا و وتی : کاکی قورەیشیی ! بانگەواز بۆ چیی ئەکەی ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە پێشەوە و دانیشت و ، ئەبوبەکریش هەستایە سەر پێ و بە کراسەکەی سێبەری بۆ ئەکرد .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أدعوكم إلى شهادة أن لا إلا الله ( وحده لا شريك له ) [٢٤٤] وأني رسول الله ، وأن تؤوني ، وتمنعوني ، وتنصروني حتى أؤدّي عَن الله تعالى ما أمرني به ، فإن قريشاً قد تظاهرت على أمر الله ، وكذبت رسوله ، واستغنت بالباطل عن الحق ، والله هو الغني الحميد )) .

فەرمووی : بانگتان بۆ ئەوە ئەکەم کە شاهێدیی بدەن جگە لە زاتی ( الله ) هیچ خوایەکی تر نیە و تاك و تەنیا و بێ‌شەریکە و ، منیش پێغەمبەری خوام و، جێم بکەنەوە و ، بم پارێزن و ، کۆمەکییم بکەن هەتا ئەو فەرمانە جێ‌بەجێ بکەم کە خوا خستوویەتیە ئەستۆم . چونکە قورەیش لە دژی فەرمانی خوا یەکیان گرت و ، پێغەمبەرەکەی ئەویان بە درۆ خستەوە و ، بە شوێن‌کەوتنی ناڕەوا وەهایان دانا کە پێویستیان بە حەق و راستیی نیە ، خوای گەورە خۆی دەوڵەمەند و سوپاس کراوە . مەفرووق وتی : بۆ چیی تر بانگەواز ئەکەی ، ئەی کاکی قورەیشیی ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتانەی خوێند :

﴿ قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُم مِّنْ إِمْلَاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ وَبِعَهْدِ اللَّهِ أَوْفُوا ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ

---

[٢٤٤] لە ( البداية : ٢ / ١٤٤ ) دا هاتووە .

تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ( الأنعام : ١٥١ ـ ١٥٣ ) .

لەم ئايەتە پيرۆزانەدا خواى گەورە فەرمان بەسەر پێغەمبەرى خوادا ﷺ ئەدات تا بانگى ئادەمى‌يەكان بكات و بۆيان باس بكات كە خواى گەورە چيى لەسەريان قەدەغە كردووە :

**يەكەم** : شەريك بۆ خوا بڕيار نەدەن .

**دووهەم** : نەك هەر لەگەڵ دايك و باوك دا خراپ نەبن ، بەڵكو فەرمان ئەدات : لەگەڵيشيان چاك بن و خزمەتيان بكەن .

**سێهەم** : لەبەر هەژاريى و دەست‌كورتيى منالەكانيان نەكوژن ، چونكە خوا رزقى خۆشيان و مندالەكانيشيان ئەدات .

**چوارەم** : نزيكى هيچ رەوشتێكى نزم و سووك نەكەونەوە .

**پێنجەم** : هەر نەفسێك كە خوا كوشتنى حەرام كردبێ ئەوان نەى‌كوژن ، مەگەر بە حەقى شەرعيى خۆى .

ئەم پێنجەى پێشەوە ئامۆژگاريى پەروەردگارن تا مرۆڤەكان عەقڵ و ژيرى‌يان بۆ بەرژەوەنديى خۆيان بەكار بهێنن .

**شەشەم** : بە چاكە نەبێ لە ماڵ و سامانى هەتيوان نزيك نەكەون و مافيان پێ‌شێل نەكەن .

**حەوتەم** : بە دەستى پاكەوە كێشانە و پێوانە بكەن و ، غەش و ناپاكى‌يان تێدا نەكەن .. ديارە ئەمەش بە پێى تواناى بەندەكان .

**هەشتەم** : ئەگەر هاتنە گۆ شتى راست و پڕداد و يەكسانيى بڵێن . ناهەقيى مەڵێن ئەگەرچيى حەق وتن پێچەوانەى بەرژەوەنديى خزم و كەس بێت ..

**نۆهەم** : هەر پەيمان و بەڵێنێكتان بە خوا دا بى‌بەنە سەر ..

ئەم چوارەش ئامۆژگاريى خوان تا مرۆڤەكان هۆشيار و وريا بن .

لە ئايەتى سێهەم‌دا خواى گەورە دەرى ئەبڕێ كە ئەم ئامۆژگارى‌يانە و سەرجەم دينەكەى رێبازى راست و پاكى ئەون و با مرۆڤە خواناسەكان شوێنى بكەون و ، شوێن توولە رێ‌كان نەكەون ، كە سەريان لێ ئەشێوێنن و پارچە پارچەيان ئەكەن .

ئەمەش ئامۆژگاريى خوايە تا بەڵكو بەندەكانى فێرى تەقوا و خواناسيى پاك و بێ‌گەرد ببن .

مەفرووق وتی : بۆ چیی تر بانگەواز ئەکەیت ، ئەی کاکی قورەیشیی ؟ دە بەخوا ئەمە وتەی دانیشتوانی زەویی نیە ، چونکە ئەگەر قسەی ئەوان بوایە ، ئێمە ئەمانزانیی .

دیسان پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە قورئان خوێندن کردەوە :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ ( النحل : ٩٠ ) .

ئەفەرموێ : خوای گەورە فەرمان بە دادپەروەریی و چاکەکردن و ، دەست گرۆیی خزمان ئەکات و ، مرۆڤەکان لە رەوشت سووکیی و خراپ کاریی و دەست درێژیی قەدەغە ئەکات . جا خوای گەورە ئەم ئامۆژگاریيانە ، بە مەبەستی هۆشیاریی و بێداریيەوە پێشکەش بە بەندەکانی ئەکات .

مەفرووق وتی : کاکی قورەیشیی ! بەخوا بانگەوازت بۆ رەوشتبەرزیی و کردەوەی چاك کردووە و ، هەر کۆمەڵێکیش هەوڵیان دابێ بە درۆت بخەنەوە و، دژت یەکیان گرتبێ ناهەقیيان کردووە . جا پێی خۆش بوو کە هانیئی کوڕی قەبیصەش لە باسەکەدا بەشداریی بکات ، بۆیە وتی : ئەمەش هانیئی کوڕی قەبیصەی ریش سپیی و سەرداری دینمانە .

هانیئ وتی : کاکی قورەیشیی ! وتەکانتم بیستن و ، تەصدیقیشم کردن ، بەڵام من وەهای ئەبینم کە ئەگەر ئێمە واز لە دینی خۆمان بهێنین و شوێن دینەکەی تۆ بکەوین ، هەر تەنها بە دانیشتنێکت لەگەڵمانا ، کە نە بیرێك لە کارەکەت بکەینەوە و ، نە سەرنجی سەرەنجامی ئەوەش بدەین کە بانگمان ئەکەی بۆی ، ئەوپەڕی بێسەلیقەیی و ، کەم عەقڵیی و ، کورت بینیی سەرەنجامە . دیارە پێهەڵکەوتنیش لە پەلەکردندایە . کۆمەڵە خەڵکانێکیشمان بە جێ هێشتوون پێمان ناخۆشە بێ ئەوان هیچ پەیمانێك ببەستین ، بەڵام وا چاکە تۆ بگەڕێیتەوە و ورد ببیتەوە و ، ئێمەش بگەڕێینەوە و ورد ببینەوە . جا پێی خۆش بوو کە موثەننای کوڕی حاریثەش لە باسەکەدا بەشداریی بکات ، بۆیە وتی : ئەمەش موثەننایە کە ریش سپیی و فەرماندەی جەنگمانە . موثەنناش وتی : وتەکانتم بیستن و ، بە چاکیشم لە قەڵەم دان ، کاکی قورەیشیی ! ئەوەی کە باست کرد پێی موعجیب بووم و ، وەڵامیش هەر ئەوەیە کە هانیئی کوڕی قەبیصە دایەوە ، ئێمە

( له وڵاتی خۆماندا ) له نێوان دوو ئاودا بارمان خستووه كه یه‌كێكیان یه‌مامه‌یه و ، ئه‌وی تریشیان سه‌مامه‌یه . پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : (( وما هذان الصيران ؟ )) . فه‌رمووی : ئه‌و دوو ئاوه چین ؟ وتی : یه‌كێكیان به‌رزاییه‌ وشكه‌كان و زه‌ویی‌وزاری عه‌ره‌به و ، ئه‌وی تریشیان زه‌ویی‌وزاری فارس و رووباری كیسرایه . ئێمه‌ش له‌لایه‌ن كیسراوه په‌یمانمان لێ وه‌رگیراوه كه هیچ شتێكی تازه دانه‌هێنین و ، كۆمه‌كیی هیچ داهێنراویكیش نه‌كه‌ین و ، له‌وه‌ش ئه‌چێ ئه‌م كاره‌ی كه تۆ بانگه‌وازی بۆ ئه‌كه‌ی پادشایان رقیان لێی بێ . جا هه‌رچیی كارێك له وڵاتی عه‌ره‌بدا روو بدات ئه‌وا چاوپۆشیی له تاوانی خاوه‌نه‌كه‌ی ئه‌كرێت و ، بیانووشی لێ وه‌رئه‌گیرێت . به‌ڵام هه‌رچیی كارێك له وڵاتی فارسدا روو بدات ئه‌وا چاوپۆشیی له تاوانی خاوه‌نه‌كه‌ی ناكرێت و ، بیانووشی لێ وه‌رناگیرێت . جا ئه‌گه‌ر بته‌وێ له هه‌ر كارێكدا كه په‌یوه‌ندیی به وڵاتی عه‌ره‌به‌وه كۆمه‌كییت بكه‌ین ، ئه‌وا به‌سه‌ر چاو . پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : (( ما أسأتُمُ الرَّدَّ إذ أفصحتم بالصدق إنه لا يقوم بدين الله إلا مَن حاطه من جميع جوانبه )) . فه‌رمووی : به خراپ وه‌ڵامتان نه‌دایه‌وه ، به‌وه‌ی كه راستییتان ده‌ر بڕیی ، به‌ڵام مه‌گه‌ر كه‌سێك بتوانێ ده‌ست به دینی خواوه بگرێ كه له هه‌موو لایه‌نه‌كانیه‌وه ده‌ستی پێوه بگرێ .

پاشان پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هه‌ستا و ده‌ستی ئه‌بوبه‌كری خوا لێی رازیی بێ گرت و گه‌ڕانه‌وه ..

له هه‌ندێ ریوایه‌تدا ئه‌مه‌شی بۆ زیاد كراوه : پاشان پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : (( أرأيتم ؟ إن لم تلبثوا إلا يسيراً حتى يمنحكم الله بلادهم وأموالهم ويفرشكم بناهم ، أتسبحونه وتقدسونه ؟ )) . فه‌رمووی : زۆری پێ ناچێ خوا وڵات و سامانه‌كه‌ی ئه‌وانتان پێشكه‌ش ئه‌كات و ، كچه‌كانیان یا ئه‌كاته هاوسه‌رتان یان كه‌نیزه‌كتان . ئایا پاك و بێگه‌ردیی و ته‌قدیسی خوا ده‌ر ئه‌بڕن ؟

نوعمانی كوڕی شه‌ریك ئه‌ڵێت : خوا بكات ! تۆ بڵێی ئه‌وه بێته دیی ، ئه‌ی كاكی قوره‌یشیی ؟!

پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئایه‌تی : ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴿٤٦﴾ ﴾ ( الأحزاب : ٤٥ ـ ٤٦ ) ی خوێند ، پاشان هه‌ستا و، هه‌ردوو ده‌ستی ئه‌بوبه‌كری خوا لێی رازیی بێ گرتن .

عەلیی خوا لێی ڕازیی بێ فەرمووی : پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی دایەوە بۆ لامان و فەرمووی : (( يا عليّ ! أَيَّةُ أخلاقٍ للعرب كانت في الجاهلية ، ما أشرفها ؟! بها يتحاجزون في الحياة الدنيا )) .

فەرمووی : ئەی عەلیی ! عەرەب چ ڕەوشتێکی بەرزیان هەبوو لە سەردەمی نەفامیی‌دا ؟ بەو ڕەوشتە جوانانەیان لە ژیانی دنیادا دەست بە خەڵکی‌یەوە ئەگرن تا نەکەونە ناو زوڵم و ستەمەوە .

ئەفەرموێ : پاشان گەیشتینە کۆڕی ئەوس و خەزرەج ، ئەوەبوو هەڵنەساین هەتا بەیعەتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا .

عەلیی ئەفەرموێ : ئەنصارەکان ڕاستگۆ و ئارامگر بوون و ، پێغەمبەری خواش ﷺ کە زانیی ئەبوبەکر خوا لێی ڕازیی بێ لە نەسەبیان شارەزایە شادمان بوو .

ئەڵێ : کەمێك بەسەر ئەوەدا تێپەڕی کرد و پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە ناو هاوەڵانی و پێی فەرموون : (( أَحْمَدُوا الله كثيراً فقد ظفِرَت اليوم أبناءُ ربيعة بأهل فارسَ ، قتلوا ملوكهم واستباحوا عسكرهم وبي نُصِرُوا )) .

فەرمووی : سوپاسێکی زۆری خوای گەورە بکەن ، چونکە ئەمڕۆ کوڕانی ڕەبیعە ( واتە هۆزی ئەسەد ) بەسەر فارسەکان‌دا زاڵ بوون : پادشاکانیان کوشتوون و ، سەرباز و سوپایان ڕیشەکەن کران و ، بە هۆی منەوە سەرکەوتن .

ئەمە لە ڕێیەکی تریشەوە هاتووە کە : ئەوا ( نەوەی شەیبان ) کاتێ لەگەڵ فارسەکان‌دا جەنگیان کرد و ، لە ( قوڕاقیر )[٢٤٥] ـ کە شوێنێکی نزیکی فوڕاتە ـ بە یەك گەیشتن ناوی موحەممەدیان ﷺ کردە دروشمی خۆیان و ، بەوەش بەسەر فارسەکان‌دا زاڵ بوون و ، دوای ئەوەش موسڵمان بوون .

پێغەمبەری خوا ﷺ کۆڵی نەدا و ، بەردەوام خەریکی سەردان و چاو پێ‌کەوتنی هۆزەکان بوو و ، لە هەموو بۆنەیەك‌دا داوای ئیمانهێنانی لێ ئەکردن و ، لەگەڵ ماقووڵانیان‌دا وت‌ووێژیی ئەکرد و ، تەنها ئەوەندەی ئەویست جێی بکەنەوە و بی‌پارێزن ، کەچیی هیچ هۆزێك بە دەمیەوە نەهات .. بەڵکو سەری لە هەر هۆزێك ئەدا ئەیان‌وت : کابرا خزمەکانی چاکی ئەناسن . پیاوێك قەوم و کەسەکەی خراپ کردبێ و ، پشتیان لێ هەڵ کردبێ ، ئایا بە کەڵکی ئێمە دێت ؟!

[٢٤٥] مەبەست لە جەنگی ذی‌قارە کە لە نزیك کووفەدا ڕووی داوە .

داخۆ ئازیزمان ﷺ چەند خەفەتی خواردبێ ؟ بەڵێ خەفەتی زۆری ئەخوارد ، بە رادەیەك كە قورئان ئامۆژگاریی ئەكرد : ﴿ فَلَعَلَّكَ بَـٰخِعٌ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَـٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴾ ( الكهف : ٦ ) .

بەڵام وا سوپاس بۆ خوا ، دوای پانزە صەدە ، ئێستا دینە پاكەكەی خوا چاكتر بڵاو ئەبێتەوە و ، ئادەمیزادە چاوكراوە چاكویستە بەرێزەكان دێن و شوێنی ئەكەون .. مەگەر خوای گەورە خۆی بزانێ لە هەموو دەقیقەیەكدا چەند جار گیانی پاكی پێغەمبەری خوا ﷺ رەحمەتباران ئەكرێت و ، صەڵاواتی لە دیدار ئەدرێت ؟

ئەو رۆژە هیچ هۆزێك باوەشی خزمەتكردنی بۆ ئیسلام نەكردەوە ، تا ئەوەبوو ـ وەك لە دواوە باسی دێت ـ ئەو فەڕ و بەرەكەتە بووە بەشی ئەنصار و ، دانیشتوانی یەثریب بوونە كۆمەكی بەوەفای بەئەمەكی دینی خوا ، تا سەربەرزیی دنیا و قیامەتیان دەست بكەوێ ..

لە بەشەكانی پێشەوەشدا باسی موسڵمانبوونی چەند پیاوێكمان كرد كە خەڵكی مەككە نەبوون ، بەڵام كە سەردانی مەككەیان كرد و سەرنجی ئیسلامیان گرت ، ئیمانیان هێنا ، وا ئێستەش بە پشتیوانی خوا باسی دووانی تریان ئەكەین :

**یەكەم** : **سوەیدی كوڕی صامیت** : ئەم پیاوە یەكێ بووە لە شاعیرە ژیرەكانی یەثریب و ، لەبەر ئازایەتیی و ، شیعر وتن و ، پیاوەتیی و ، رەچەڵەكیەوە خەڵككە ناویان نابوو ( الكامل ) . واتە مرۆڤی تەواو . ساڵێكیان بۆ حەج یان عەمرە سەردانی مەككەی كرد و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ هاتنی ئەم پیاوە ژیرەی بە هەل زانیی و بانگی كرد بۆ ئیسلام .. سوەید وتی : لەوانەیە ئەوەی لەلای تۆش هەبێ هەر ئەوە بێ كە لەلای من هەبێ . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( وما الذي معك ؟ )) . فەرمووی : چیت لایە ؟ وتی : حیكمەتی لوقمان ، فەرمووی : (( أعرضها علّي )) . فەرمووی : بۆم بڵێ . ئەویش بۆی وت . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إن هذا الكلامَ حَسنٌ ، والذي معي أفضلُ من هذا، قرآن أنزله الله تعالى عليّ ، هو هدى ونور )) . فەرمووی : ئەمە وتەیەكی چاكە ، بەڵام ئەوەی كە لەلای منە لەمەش چاكترە . قورئانە و خوای باڵادەست ناردوویەتیە خوارەوە سەرم ، ئەمە هیدایەت و نوورە .. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بۆ خوێند

و ، بانگی بۆ سەر ئیسلام کرد و موسڵمان بوو و ، وتیشی : ئەمە فەرمایشتێکی چاکە .

پاشان لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ هەستا و گەڕایەوە مەدینە و ئەوەندەی پێ نەچوو رۆژی جەنگی ( بوعاث ) بە دەستی خەزرەج کوژرا و ، خزمەکانی وەهای بۆ ئەچوون کە بە موسڵمانیی کوژرا بێ . ئەمەش لە سەرەتای ساڵی یانزەی هاتنی وەحیدا بوو .

**دووهەم** : **ئیاسی کوڕی موعاذ** : ئەبولحەیسەر ، ئەنەسی کوڕی رافیع لەگەڵ چەند گەنجێکی نەوەی عەبدولئەشهەلدا ، کە ئیاسی کوڕی موعاذیشیان لەگەڵدا بوو ، هاتن بۆ مەککە ، بەو هیوایەی پەیمانێك لەگەڵ قورەیشدا ببەستن لە دژی خەزرەج ، ئەمەش پێش رووداني جەنگی بوعاث ، کە لە سەرەتای ساڵی یانزەهەمینی هاتنی وەحیدا رووی دا ، چونکە دوژمنایەتیی نێوان ئەوس و خەزرەجی جووتە هۆزی عەرەبی شاری یەثریب گەیشتبووە چڵەپۆپە و ، ئەوسییەکانیش لەبەر کەمیی ژمارەیان پێیان خۆش بوو قورەیش پەیمانیان لەگەڵ دا ببەستن .. کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی هاتنی ئەو کۆمەڵە گەنجەی ئەوسی بیست ، تەشریفی بۆ لایان هێنا و ، لەگەڵیان دانیشت و ، فەرمووی : (( هل لکم في خير مما جئتم له ؟ )) . فەرمووی : ئایا لەوە چاکترتان ناوێ کە بۆی هاتوون ؟ وتیان : ئەو شتە چییە ؟ فەرمووی : (( أنا رسول الله إلى العباد أدعوهم أن يعبدوا الله ، ولا يشركوا به شيئاً ، وأنزل عليّ الكتاب )) . فەرمووی : من پێغەمبەری خوام بۆ سەر بەندەکانی و ، بانگیان ئەکەم تا خوا بپەرستن و ، هیچ شتێ نەکەنە شەریکی و ، کتێبێکیشی ناردۆتە خوارەوە بۆم . پاشان باسی ئیسلامی بۆ کردن و، قورئانی بۆ خوێندن . ئیاسی کوڕی موعاذ ـ کە تازە پێ ئەگەیشت ـ وتی : بەخوا ئەمە چاکترە لەوەی کە بۆی هاتوون . ئەبولحەیسەر پڕی مشتی خۆڵی هەڵ گرت و ، دای بە دەم و چاوی منداڵەکەدا و وتی : وازمان لێ بێنە ، بەخوا ئێمە بۆ شتێکی تر هاتووین و ، ئیاسیش بێ دەنگ بوو .

ئیتر پێغەمبەری خواش ﷺ تەشریفی هەستا و ، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ مەدینە و ، ئەوەندەی پێ نەچوو جەنگی بوعاث رووی دا و ، ئەوس و خەزرەج ، بە پیلانی جوولەکە ، خوێنی یەکتریان رێژا و ، زۆریشی پێ نەچوو ئیاس کۆچی دوایی کرد . خزمەکانی باسی ئەوەیان ئەکرد کە لەو کاتەوە ئیاس بانگی ئیسلامی بیست بوو،

هەر خەریکی وتنی: ( لا إله إلا الله ) و ( الله أكبر ) و ( الحمد لله ) و ( سبحان الله ) بوو هەتا کۆچی دوایی کردووە ، بۆیە هیچ گومانیان نەبوو کە ئیاس بە موسڵمانیی مردووە ..

شایانی باسە کە لە جەنگی بوعاثدا خەڵکێکی زۆر لە ئەوسیش و لە خەزرەجیش کوژراوە ، بە تایبەت لە پیاوماقووڵ و ناودارەکانیان و ، سەرەنجامیش سەرکەوتن بۆ ئەوس بووە هەرچەندە ژمارەیان کەم بوو .

جا خوای گەورە ویستی وەها بوو کە ئەو رووداوە گەورەیە کەمێك پێش کۆچ کردنی پێغەمبەری خوا بێ ﷺ بۆ مەدینە ، تا دڵەکان زۆر وریا و هۆشیار بن و ، ئامادەی ئیمانهێنان بن بەو دینە پاکەی کە ناکۆکیی و دوژمنایەتیی نێوان ئەوانی نەهێشت و ، یەکی پێ گرتنەوە و ، نەمامی خۆشەویستیی و برایەتیی و بە یەکەوە گونجانی لە دڵیانا بۆ هەتا هەتایی ناشت .

بوخاریی بە سەنەدی خۆی لە صەحیحەکەیدا لە عائیشەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەتی کردووە کە وتوویە : جەنگی بوعاث رۆژێك بوو کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی هێنابوویە پێشەوە ، ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە مەدینە پیاوماقووڵ و پێشەنگەکانیان ناکۆکیيان تێکەوتبوو و ، سەردار و پێشەواکانیشیان کوژرابوون .. [٢٤٦]

**چواردەهەم : موسڵمان بوونی ئەنصار**

خوای گەورە ، بۆ سەرخستنی دینەکەی خۆی و ، رزگاربوونی ئیمانداره بێدەسەڵاتەکانی مەککە ، ئەوەی خستە دڵی پێغەمبەری ئازیزەوە ﷺ تا سەردانی هۆزە عەرەبەکان بکات ، کە بۆ زیارەتی ماڵی خوا لە هەموو لایەکی دوورگەوە هاتبوون و ، بانگیان بکات بۆ موسڵمانبوون . ئەوەبوو لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە لە ساڵی یانزەهەمینی هاتنی وەحیدا ، کە بەرامبەر بە ساڵی ٦٢٠ زایینییە ، لە کاتیدا حەجدا سەردانی هۆزە عەرەبەکانی کرد ، هەتا هەوڵی ئەدا کە لە تاریکیی شەودا سەردانیان بکات ، تا بتپەرستەکانی مەککە چاویان لێ نەبێ ، چونکە بە بەر چاوی ئەوانەوە سەردانی هەر هۆزێکی بکردایە ، بت پەرستەکان خێرا ئەچوون و خەڵکەکەیان لە ئیمانهێنان سارد ئەکردەوە ..

---

[٢٤٦] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٤٢٩ ـ ٤٣٣ ، والرحيق المختوم : ١٣٣ ـ ١٣٧ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ١٧٩ ـ ١٩٥ .

ئەوەبوو شەوێکیان لەگەڵ ئەبوبەکر و عەلیی‌دا خوا لێیان ڕازیی بێ کەوتنە ڕێ و ، گەیشتنە لای مەنزڵگای ذەهەل و شەیبان و باسی ئیسلامی بۆ کردن .. ئەوەبوو لە نێوان ئەبوبەکر و پیاوێکی نەوەی ذەهەل‌دا پرسیار و وەڵامێکی خۆش ڕووی دا و ، نەوەی شەیبانیش ، وەك لە پێشەوە بە درێژە باسمان کردووە ، وەڵامێکی جوانیان دایەوە ، بەڵام بۆ وەرگرتنی ئیسلام لە خۆیانەوە بڕیاریان لەسەر نەدا ..

کە لەوان جیا بوونەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای عەقەبەی مینادا تێپەڕی کرد و ، گوێی لە دەنگی چەند پیاوێك بوو کە قسەیان ئەکرد .. پێی هەڵ گرت و فریایان کەوت .. ئەبینێ شەش گەنجی یەثریبن و ، هەمووشیان لە هۆزی خەزرەجن کە ئەمانە بوون :

١ ـ ئەسعەدی کوڕی زورارە ، لە نەوەی نەججار . ئەبونوعەیم وتوویە : یەکەم کەس بووە کە لە ئەنصار و ، لە تیرەی خەزرەج موسڵمان بووە .

٢ ـ عەوفی کوڕی حاریثی کوڕی ڕیفاعە ، لە نەوەی نەججار ، واتە کوڕی عەفرائی کچی عوبەیدی نەججاری‌یە ، کە عەفراء دایکی موعاذ و موعەووەذە و، موعەووەذی کوڕیشی بەشداریی کوشتنی ئەبوجەهلی کردووە لە بەدردا ..

٣ ـ ڕافیع ی کوڕی مالیك ی کوڕی عیجلان ، لە نەوەی زورەیق .

٤ ـ قوطبەی کوڕی عامیری کوڕی حەدیدە ، لە نەوەی سەلیمە .

٥ ـ عوقبەی کوڕی عامیری کوڕی نابیی ، لە نەوەی حەرامی کوڕی کەعل .

٦ ـ جابیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ڕیئاب ، لە نەوەی عوبەیدی کوڕی غونم .[٢٤٧]

---

[٢٤٧]. ئەم ناوانە ئیبن ئیسحاق باسی کردوون . شایانی باسە کە لەناو هاوەڵان‌دا پێنج هاوەڵ ناویان جابیری کوڕی عەبدوڵڵا بووە :

١ ـ جابیری کوڕی عەبدوڵڵای عەمری کوڕی حەرام ، کە هاوەڵێکی ناودارە و ، خۆیشی و باوکیشی هەر هاوەڵ بوون و ڕۆژی ئوحود هەر یەکەیان هەوڵی ئەدا خۆی بەشداریی جەنگ بکات ، وەك لە باسی جەنگی ئوحوددا باسی هاتووە .

٢ ـ جابیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ڕیئاب کە زوو بە زوو موسڵمان بووە .

٣ ـ جابیری کوڕی عەبدوڵڵای عەبدیی .

٤ ـ جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ڕاسبیی .

٥ ـ جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاریی ، کە ڕۆژی ئوحود لەبەر کەمیی تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە دوا .

لە بەختەوەریی دانیشتوانی یەثریبدا ، ئەوەبوو چەند تیرەیەکی جوولەکەی بێڕەوشت دراوسێ و هاوپەیمانیان بوون . هەر جارە بیانویستایە عەرەبەکانی یەثریب بترسێنن ئەیان دا بە گوێیاندا کە لەم زەمانەدا کاتی هاتنی یەکێ لە پێغەمبەرەکانی خوایە و ، کە بانگی ئاشکرا کرد ، جوولەکە شوێنی ئەکەون و بە وێنەی عاد و ئیرەم قەتڵ و عامیان ئەکەن ..

جا خوای گەورە بە سۆزی خۆی خێر و بەرەکەتی تووشی ئەو شەش لاوە دڵ پاکە کرد و بوونە پێشەنگ بۆ ئیمانهێنانی دانیشتوانی یەثریب .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە لایان لێی پرسین : (( مَن أنتم ؟ )) فەرمووی : ئێوە کێن ؟ وتیان : چەند کەسێکی هۆزی خەزرەجن . فەرمووی : (( مِن موالي اليهود ؟ )) . فەرمووی : لە هاوپەیمانانی جوولەکە ؟ وتیان : بەڵێ . فەرمووی : (( أفلا تجلسون إليّ أكلّمكم ؟ )) . فەرمووی : دانانیشن تا قسەتان بۆ بکەم ؟ وتیان : بەڵێ . لە خزمەتیدا دانیشتن و ، ئەویش بانگی کردن بۆ لای خوا و ئیسلامی نیشان دان و ، قورئانی بۆ خوێندن .

کە گەنجەکان ئەم باسەیان بیست ، ئەوەیان هاتەوە یاد کە هەموو جارێ جەنگ لە نێوان جوولەکە لە لایەك و ئەوس و خەزرەجیش لە لایەك رووی ئەدا و ، کە سەرکەوتن بۆ عەرەبەکان ئەبوو ، جوولەکە بۆ دڵدانەوەی خۆیان و ترساندنی عەرەبەکان ئەوەیان دەرئەبڕیی کە ئەوان شوێنی پێغەمبەری چاوەڕوانکراو ئەکەون و ئەیانکوژن ، بۆیە کە ئەمەیان لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ بیست ، یەکسەر هەندێکیان بە هەندێکیان وت : بەخوا ، ئەی خزمینە ! ئەزانن ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جوولەکە هەڕەشەیان لێتان ئەکرد .. جا با ئەوان پێشتان نەکەون بۆ لای و ، خێرا بانگەوازەکەی قبووڵ بکەن و ، موسڵمان بن ..[٢٤٨]

---

[٢٤٨]. ئیبن سەعدیش ( ٣ / ٦٠٨ ) لە خوبەیبی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : ئەسعەدی کوڕی زورارە و ذەکوانی کوڕی عەبدولقەیس هاتن بۆ مەککە بۆ لای عوتبەی کوڕی رەبیعە ، تا ناکۆکییان بۆ چارەسەر بکات . لە مەککە دەنگ و باسی پێغەمبەری خوایان ﷺ بیست و چوونە خزمەتی . ئەویش ئیسلامی بۆ باس کردن و ، قورئانی بۆ خوێندن . ئەوانیش موسڵمان بوون و ، نزیکی عوتبەی کوڕی رەبیعە نەکەوتنەوە و، گەڕانەوە بۆ مەدینە .. ئەم دوو پیاوە یەکەم کەسێك بوون کە ئیسلامیان هێنا بۆ مەدینە .. ( شرح حياة الصحابة : ١ / ١٧٠ ) .

ئەشڵێن : ذەکوان کۆچی کردووە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە و لەوێ نیشتەجێ بووە ، پاشان لەگەڵ کۆچی موسڵمانان‌دا ئەویش کۆچی بۆ مەدینە کردووە . بەمە ئەبێتە موهاجیرییش و ئەنصارییش ، وەك ئیبن هیشام وتوویە . لە جەنگی ئوحوددا شەهید بووە . ( السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٤٣٦ ) .

ئەم کۆمەڵە گەنجە لە ژێر و سەلیقەدارەکانی یەثریب بوون ، سەرنجیان دا کە ئەو جەنگەی ماوەیەکی کەم لەمەوبەر ڕووی دا و هێشتا گڕەکەشی نەکوژاوەتەوە ، زیانێکی زۆری پێ گەیاندوون و ، خەڵکێکی زۆری هەردوولا ـ ئەوس و خەزرەج ـ کوژراون ، بۆیە دڵیان بەوە خۆش بوو کە بەڵکو ئەم بانگەوازە ببێتە هۆی کوژانەوەی ئاگری جەنگ . بۆیە ڕوویان کردە پێغەمبەری خوا ﷺ و پێیان وت : ئێمە کە خزمەکانمان بەجێ هێشتووە ئەوپەڕی دوژمنایەتیی لە نێوانیاندا هەیە و، بەڵکو خوای گەورە بە هۆی تۆوە یەکیان پێ بگرێ . جا ئێمە ئەگەڕێینەوە ناویان و بانگیان ئەکەین بۆ سەر ئەم کارەی تۆ و ، ئەم دینەش کە لێتمان وەرگرتووە باسی ئەکەین بۆیان ، جا ئەگەر خوای گەورە لە دەورت کۆیان بکاتەوە و یەک بگرن ، ئەوا هیچ پیاوێك وەك تۆ پایەدار نابێت .

بەمە ئەم دەستە بەختەوەرە ئیمانیان هێنا و ، گەڕانەوە یەثریب و ، خزمەکانیان ئاگادار کردن کە ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان‌کراوەی کە هەموو جارێ جوولەکە باسیان ئەکرد ، بانگی دەست پێ کردووە و ، ئەمانیش ئیمانیان هێناوە، جا ئەوانیشیان بانگ کرد بۆ ئیمان‌هێنان و شوێن‌کەوتنی ئیسلام ، تا ئەوەبوو لە شاری یەثریبدا ماڵێك نەما باسی ئیسلام و پێغەمبەری نازداری ﷺ تێدا نەکرێت .

ئیمام ئەحمەد لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە خوا لێیان ڕازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : لە وەرزی حەجدا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بە خەڵکەکە ئەناساند و ئەیفەرموو : (( هل مِن رَجُلٍ يَحمِلُني إلى قومه ، فإنّ قريشاً قد منعوني أن أبلغ كلام ربي عز وجل ؟ )) . ئەیفەرموو : ئایا کەسێك هەیە بم با بۆ ناو کەس و کارەکەی ؟ چونکە قوڕەیش ئەوەیان لێ قەدەغە کردووم کە فەرمایشتی پەروەردگارم بگەیەنم ..

ئەوەبوو پیاوێکی هۆزی هەمدان [٢٤٩] هاتە خزمەتی و فەرمووی : لە چ هۆزێکیت ؟ پیاوەکە وتی : لە هۆزی هەمدانم ، فەرمووی : (( هَل عِند قومك مِن مَنَعَة ؟ )) . فەرمووی : ئایا قەومەکەت توانای بەرگرییان هەیە ؟ وتی : بەڵێ . پاشان کابرا ترسا قەومەکەی ئەو پەیمانەی ئەو نەبەنە سەر ، بۆیە هاتەوە خزمەتی

[٢٤٩] هەمدان : هۆزێکی قەحطانیی بووە و ، لە یەمەندا ژیاون ، ئەوانیش لە ساڵی نۆهەمی کۆچییدا ، بۆ موسڵمان بوون ، نوێنەریان دێتە مەدینە .

پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەچمەوە لای خزمەکانم و هەواڵیان ئەدەمێ و ، ساڵێکی تر دێمەوە لات . فەرمووی : بەڵێ . ئەوەبوو کابرا ڕۆیشت و ، لە مانگی ڕەجەبدا نوێنەری ئەنصار هاتن . قال الهيثمي ( ٦ / ٣٥ ) رجاله ثقات ، وعزاه الحافظ في الفتح ( ٧ / ١٥٦ ) إلى أصحاب السنن ، والإمام أحمد وقال : صححه الحاكم .[٢٥٠]

شایانی باسە کە لە مانگی شەووالی ساڵی یانزەهەمی هاتنی وەحیدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ عائیشەی صددیقەی خوا لێی ڕازیی بێ خوازبێنیی کرد ، کە ئەو کاتە تەمەنی ٦ ساڵان بوو ، بەڵام دوای کۆچ کردن بۆ مەدینە و ، لە مانگی شەووالی ساڵی یەکەمی کۆچ کردن دا ، کە تەمەنی ئەو کاتەی نۆ ساڵان بوو ، گواستیەوە .[٢٥١]

جا تەمەنی شووکردنی عائیشە خوا لێی ڕازیی بێ بۆتە باسی سەر زمانی هەندێ تێ نەگەیشتووی ئەم سەردەمە ، کە لەبەر دوورییان لە ئیمانەوە بۆ ئەوە ئەگەڕێن کە ڕەخنە لە ئیسلامی پاك و پاڵفتە و بێگەرد بگرن .. ئەوانە ئەیانەوێ ڕەخنە لەو دینە پاکە بگرن ، کە تاقانە دینی سەر زەوییە و ، ئەوەندە خواناسی ڕەوشت بەرزی پەروەردە کردووە ، مەگەر هەر خوا بزانی چەند ملیۆن مرۆڤی لە تاوان و خراپکاریی گێڕاوەتەوە و ، کردوونیەتیە مرۆڤی بێزیانی ، بە کەڵکی ، چاكویستی ، پیاوەتییکەری ، خۆبەختکەر ، تا بە دەست و کردەوەیان مرۆڤایەتیی بحەسێنەوە ..

بەوانە ئەڵێین : شووکردنی عائیشە لەو تەمەنەدا جێی ڕەخنەی هیچ ئەندامێکی ئەو کۆمەڵگایە نەبووە ، سەرەڕای ئەوەی کە دۆست و دوژمن ، لە سەرانسەری مێژوودا ، دانیان بەوەدا ناوە کە موحەممەدی ئازیزمان ﷺ هیچ ڕەفتارێکی نەبووە کە لە فیطرەی پاك و خاوێنەوە دووربێ . لەبەر ئەوە با نۆکەریی کافران ئیتر بەسیی بێ ، چونکە دەستیان لە بنی هەمانەی خاڵییەوە دەر ئەچێت .

جارێکیان بەڕێزێك حەزی ئەکرد هەندێ ڕەخنە و تەشەر بگرێتە ئیسلام و بیشی دا بە گوێی مندا ، کە ئەو تاقەتی لە دینی ئیسلام نیە و ، دین بۆ چیی باشە ؟

---

[٢٥٠] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٤٣٤ ـ ٤٣٦ ، والرحيق المختوم : ١٣٨ ـ ١٣٩ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ٥٩٤ ـ ٥٩٦ .

[٢٥١] الرحيق المختوم : ١٣٩ .

منیش ـ بە یارمەتیی خوا ـ وام بە چاك زانیی وەلامێکی کورتی بدەمەوە ، چونکە خۆی لە خانەوادەیەکی موسڵمان و خاوەن ڕەوشتدا گەورە بوو بوو ..

وتم : فلانە کەس ! دەستێکیشم دا بەسەر شانیدا ، خۆ تۆ ئەزانی دایکت ، وەك هەموو ئافرەتە دین دارە پاك داوێنەکانی کوردستان ، تۆی تەنها لە باوکت وەرگرتووە و ، کوڕی باوکی خۆتی . جا توخوا ئەگەر گومانت لە پاك داوێنیی دایکت ببوایە ، ئەوا وەك ئێستە سەربەرز ئەبووی؟ ئیسلام ئەوەندەی بەس نیە .

وتی : مامۆستا ! بەسمە ، بە زاتی خوا دین هەر تەنها بۆ ئەوە هاتبێ منالان سەریان بەرز بێ کە نەوەی باوکی خۆیانن ئیتر بەسیانە . ئیتر هیچ نالێم ..

بەلێ ، ئازیزان ! هەزار سال زیاترە ئەم دینە پاکە داوێن پاکیی بە میللەتی کوردی بەغیرەت پێشکەش ئەکات ، کە مەگەر تەنها ئەوانە قەدری بزانن کە ئاگایان لە داوێن پیسی و سووکیی ئەورووپایە . توخوا حەیف نیە ئەوەندە بەدنمەك بین ؟ دینێك زیاتر لە هەزار سالە شەرەفمان پێشکەش ئەکات .. خوا ئەوانە ڕسوا بکات کە بێ شەرەفیی بۆ کورد داوا ئەکەن !!

**پانزەهەم : پەیمانی یەکەمی عەقەبە**

کە شەش گەنجە خەزرەجی‌یەکە گەڕانەوە مەدینە و پەیامی ئیسلامیان بە خزمەکانیان گەیاند ، ئەوەبوو لە وەرزی داهاتووی حەجدا ، واتە سالی دوانزەهەمی هاتنی وەحی ، بەرامبەر بە سالی ٦٢١ زایینیی ، دوانزە موسڵمان هاتن بۆ حەجی مالی خوا کە لەو دوانزەیە پێنجیان لە شەش گەنجە ئەنصاری‌یەکە بوون کە سالی پار موسڵمان بوون و ، ئەوەی کە لە شەش کەسەکە ئامادە نەبوو جابیری کوڕی عەبدوللای کوڕی ڕیئاب بوو و ، ئەو حەوتەش کە تازە موسڵمان بوو بوون ئەمانە بوون :

١ ـ موعاذی کوڕی حاریث ، لە نەوەی نەججار ، واتە کوڕی عەفراء و برای عەوف بووە ، کە پار موسڵمان بوو بوو .

٢ ـ ذەکوانی کوڕی عەبدولقەیس ، لە نەوەی زورەیق .

٣ ـ عوبادەی کوڕی صامیت ، لە نەوەی غونم .

٤ ـ یەزیدی کوڕی ثەعلەبە ، لە هاوپەیمانانی نەوەی غونم .

٥ ـ عەبباسی کوڕی عوبادەی کوڕی نەضلە ، لە نەوەی سالم .[٢٥٢]

---

[٢٥٢] وتوویانە : ئەمیش هەم ئەنصارییە و هەم موهاجیریی .

٦ ـ ئەبولهەیثەم مالیکی کوڕی تەییهان ، لە نەوەی عەبدولئەشهەل .
٧ ـ عوەیمی کوڕی ساعیدە ، لە نەوەی عەمری کوڕی عەوف .
شایانی باسە کە پێنجەکەی پێشەوە خەزرەجیین و دوانەکەی دواوەش ئەوسیین.
ئەمانە کە گەیشتنە مەککە لە عەقەبەی مینـا پەیوەندییان بە پێغەمبەری خواوە ﷺ کرد و ، بەیعەتیان پێ دا ، کە وەك ئەو بەیعەتە وەها بوو کە ئافرەتان لە کاتی فەتحی مەککەدا ئەیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ .
بوخاریی لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( تَعالوْا بايعوني على أنْ لا تشركوا بالله شيئاً ، ولا تَسرِقوا ، ولا تزنوا ، ولا تقتلوا أولادَكم ، ولا تأتوا ببهتان تفترونه بينَ أيديكم وأرجلكم ، ولا تعصوني في معروف ، فمن وفَّى منكم فأجرُهُ على الله ، وَمَن أصابَ من ذلك شيئاً فعوقبَ به في الدنيا ، فهو له كفَّارةٌ ، وَمَن أصابَ من ذلك شيئاً ، فستره الله ، فأمره إلى الله ، إن شاءَ عاقبه ، وإن شاءَ عفا عنه )) .
فەرمووی : وەرن ، بەیعەتم بدەنێ کە هیچ شتێك نەکەنە شەریکی خوا و ، دزیی نەکەن و ، زینا نەکەن و ، منداڵەکانتان نەکوژن و ، بوهتان و ناحەقیی ئەنجام نەدەن و ، لە کاری چاکەدا لێم یاخیی نەبن ، جا هەرکەس لە ئێوە ئەمەی بردە سەر ئەوا پاداشتی لای خوایە .. هەر کەسیش لەوانە تاوانێکی ئەنجام دا و لە دنیادا لەسەری سزا درا ، ئەوە ئەبێتە کەففارەت بۆ تاوانەکەی .. هەر کەسیش لەوانە تاوانێکی ئەنجام دا و ، خوای گەورە بۆی شاردەوە ، ئەوا ئەدرێتە دەست خوا : ئەگەر ویستی سزای ئەدا و ، گەر ویستیشی لێی خۆش ئەبێ .
بەڵام ریوایەتەکەی ئیبن ئیسحاق ، کە ئەویش لە عوبادەی کوڕی صامیتەوەیە ، بەم جۆرەیە : عوبادە خوا لێی رازیی بێ ئەڵێت : یەکێك بووم لەوانەی کە ئامادەی عەقەبەی یەکەم بووین .. ئێمە دوانزە پیاو بووین و ، بەیعەتی ژنانمان بەم شێوەیە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا ، ئەمەش بەر لەوەی کە جەنگ ماوەی بدرێ : هیچ شتێك نەکەینە شەریکی خوا و ، دزیی نەکەین و ، زینا نەکەین و، منداڵەکانمان نەکوژین و ، بوهتان و ناحەقیی ئەنجام نەدەین و ، لە چاکەدا لە فەرمانی خوا یاخیی نەبین .. جا ئەگەر ئەوەتان بە جوانیی بەجێ هێنا ئەوا بەهەشتتان بۆ ئەبێ و ، گەر لە شتێکیشدا ناپاکیی بکەن ، ئەوا ئەدرێنە دەست خوا ، گەر ویستی سزاتان ئەدات و ، گەر ویستیشی چاوپۆشییتان لێ ئەکات ..

ئیمام ئەحمەدیش و طەبەرانییش لە روویەکی ترەوە لە عوبادەی کوڕی صامیت ەوە تەخریجیان کردووە کە عوبادە و ئەبوهورەیرە لەلای موعاویەدا لە شام وت و وێژیان کردووە . عوبادە وتوویە : ئەبوهورەیرە ! تۆ لەگەڵماندا نەبوویت کاتێك کە ئێمە لەسەر گوێڕایەڵیی و مل کەچیی ، لە چالاکیی و تەمەڵییدا و ، لەسەر فەرماندان بە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لە خراپە و ، لەسەر ئەوەی کە حەق بڵێین و ، لەسەر خوا لە لۆمەی لۆمەکەران نەترسین و ، لەسەر ئەوەش کە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ ناومان بۆ یەثریب کرد کۆمەکیی بکەین ، بەوەی کە وەك چۆن خۆمان و هاوسەر و منالآنمان ئەپارێزین، ئەویش وەها بپارێزین ، بەیعەتمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا ، تا بەهەشتمان پێ بدرێت . ئا ئەمە بەیعەتی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کە پێمان دا ..

لە وەصفی ئیماندارانی مەدینەدا ئەبونوعەیم لە ( الدلائل : ١٠٥ ) دا ، لە ڕێی واقیدییەوە ، لە ئیسحاقی کوڕی حوبابەوە ، لە یەحیای کوڕی یەعلاوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : رۆژێکیان عەلیی کوڕی ئەبوطالیب خوا لێی رازیی بێ باسی فەضل و دەستپێشخەریی ئەنصاریی ئەکرد بۆ موسڵمان بوون ، پاشان فەرمووی: هەرکەسێ ئەنصاری خۆش نەوێن و ، مافیان نەپارێزێت ئیماندار نیە . بەخوا چۆن جوانوو پەروەردە ئەکرێت ، ئەوان بە شمشێرەکانیان و ، زمانی پاراویان و ، سەخاوەتی دڵ و دەروونیان بە لێهاتنیانەوە ئیسلامیان پەروەردە کرد . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەرزی حەجدا دەرئەچوو و هۆزەکانی بانگ ئەکردن ، کەچیی هیچ کەس نەئەهات بە دەمیەوە و قسەی لێ وەر نەئەگرت . تەشریفی ئەبردە ناو هۆزەکان لە مەجەننە و عوکاظ و مینا تا رێ بە هۆزەکان بگرێت و ساڵ لە دوای ساڵ ئەگەڕایەوە ناویان ، هەتا هۆزی وەهایان هەبوو کە دەیوت : ئیتر کاتی ئەوەت نەهاتووە کە دەستمان لێ بشۆیت ؟ ئەوەندە خۆی پێیان ئەناساند ، هەتا ئەوەبوو خوای گەورە ئەم چاکەیەی بەم تیرەی ئەنصارە ویست . ئیسلامی خستە بەر چاویان و ، ئەوانیش هاتن بە دەمیەوە و ، بە خێرایی باوەشیان بۆ کردەوە و ، کۆمەکییان کرد و ، دڵیان دایەوە . جا خوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە ، هاتینە ناویان و لەگەڵیانا لە ماڵەکانیاندا نیشتەجێ بووین ، بە شێوەیەك ئەوەندە حەزیان ئەکرد دەستیان بکەوین و ، نەچین لەگەڵ کەسی تردا قورعەیان بۆمان ئەکرد . هەتا لە ماڵ و سامانیاندا ، ئەوەندە دڵفراوان بوون ،

ئێمە لە خۆیان زیاتر مافمان پێیەوە هەبوو ، پاشان خوێنی خۆیان بۆ پاراستنی پێغەمبەرەکەیان ﷺ ( وعليهم أجمعين ) بەخشیی .

شایانی باسە کە یەکێ لە کردەوە جوانەکانی هاوەڵی پایەداری نەوەی نەجاری خەزرەجیی ئەسعەدی کوڕی زوراره ، ئەوەبوو کە ئەو یەکەم کەس بوو، بەر لە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بۆ مەدینە ، نوێژی جومعەی بۆ موسڵمانان کرد . ئیبن ئیسحاق لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە :

من دەستی کەعبی کوڕی مالیکی باوکمم ئەگرت ، کاتێ کە نابینا بووبوو . هەرچیی لەگەڵیا ئەرۆیشتم بۆ نوێژی جومعە و گوێی لە بانگ ئەبوو دوعای خێری بۆ ئەبوئومامە ئەسعەدی کوڕی زوراره ئەکرد . ئەڵێت : ماوەیەکی زۆر خەریکی ئەمە ئەبوو ، هەرچیی بانگی جومعەی ببیستایە دوعای خێر و ، داوای چاوپۆشیی بۆ ئەکرد. ئەڵێت : لە دڵی خۆمدا وتم : بەخوا بێدەسەڵاتییە بۆ من پرسیاری لێ نەکەم کە : بۆچیی هەرچیی گوێی لە بانگی جومعە ئەبێت دوعای خێر بۆ ئەبوئومامە ئەسعەدی کوڕی زوراره ئەکات ؟

ئەڵێت : رۆژێکیان ، وەك جاران لەگەڵیا چووم بۆ نوێژی جومعە ، کاتێك کە گوێی لە بانگی جومعە بوو دوعای خێر و ، داوای چاوپۆشیی بۆ کرد ، منیش وتم پێی : بابەگیان ! ئەوە بۆچ هەرچیی گوێت لە بانگی جومعە ئەبێت دوعای خێر بۆ ئەبوئومامە ئەکەیت ؟

وتی : ئێی رۆڵەگیان ! ئەو یەکەم کەس بوو لە مەدینەدا ، لە ( هَزم النبيت ) لە حەڕڕەی ( بني بياضة ) ، کە پێی ئەوترێ : ( نقيع الخضمات ) نوێژی جومعەی بۆ کردین ، وتم : ئەو رۆژە ئێوە چەند کەس ئەبوون ؟ وتی : چل پیاو . هەروەها ئەبوداوود و ئیبن ماجەش لە رێی ئیبن ئیسحاقەوە ریوایەتیان کردووە .[٢٥٣]

**شانزەهەم : یەکەم نێرراو لە ئیسلامدا**

کاتێك کە نەوموسڵمانەکانی ئەوس و خەزرەج گەڕانەوە بۆ مەدینە ، نامەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیی کە پیاوێکی شارەزای قورئانمان بۆ بنێرە ، تا قورئانمان فێر بکات ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم داوایەی زۆر بە دڵ بوو ، کە

---

[٢٥٣] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١/ ٤٣٦ ـ ٤٤٠ ، والرحيق المختوم : ١٤٦ ـ ١٤٧ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ١٩٥ ـ ١٩٦ .

ئەوەبوو هاوەڵی پایەدار موصعەبی کوڕی عومەیری کوڕی هاشم ی کوڕی عەبد مەنافی کوڕی عەبدوداری کوڕی قوصەی[٢٥٤] بۆ هەڵ بژاردن و ، فەرمانی دا قورئانیان فێر بکات و ، لە ئیسلام شارەزیان بکات و ، لە فیقهی ئیسلامیان ئاگادار بکات و ، پێشنوێژیان بۆ بکات ، چونکە ئەوس و خەزرەج هەر یەکەیان پێی ناخۆش بوو ئەوی تریان پێشنوێژیی بۆ بکات ، بە بۆنەی ئەو ناکۆکییەوە کە لە نێواندا هەبوو .. لە مەدینەدا موصعەب ناونرا ( المقرىء ) یان ( القارىء ) بە بۆنەی ئەوەوە کە شارەزای قورئان بوو .. ئەوەبوو کە لە ڕێوە هات بووە میوانی هاوەڵی پایەداری پێشەنگی موسڵمانان بوون و سەرداری خەزرەج و ، نەقیبی نەوەی نەججار ئەسعەدی کوڕی زورارەی کوڕی عەدەسی کوڕی ئەبوئومامە و ، هەردووکیان پێکەوە بەوپەڕی چالاکییەوە دەستیان دایە بڵاوکردنەوەی ئیسلام .

موصعەب لەم کارەیدا ئەوپەڕی سەرکەوتنی بە دەست هێنا و خەڵکێکی زۆری مەدینەی ڕاکێشا بۆ سەر ئیسلام ، کە ناودارەکانیان سەعدی کوڕی موعاذ و ، ئوسەیدی کوڕی حوضەیر بوون و ، بە موسڵمانبوونی ئەوانیش خەڵکێکی زۆر لە نەوەی عەبدولئەشهەل ئیمانیان هێنا .

دوای ئەوەی کە موصعەب بووە میوانی ئەسعەدی کوڕی زورارە ، ڕۆژێکیان بەرەو گەڕەکی نەوەی عەبدولئەشهەل و نەوەی ظەفەر پێکەوە کەوتنە ڕێ و ، چوونە ناو باخێکی نەوەی ظەفەر و لەسەر بیرەکەی کە پێیان ئەوت بیری ( مرق )

---

[٢٥٤] یەکێ بووە لە هاوەڵە ناودار و پایەدارەکان کە بە ڕاستیی نموونەی ئیمانداری دامەزراو بوو و هەمیشە پێشەنگی چاکەکاریی بوو .. یەکەم جار کۆچی کرد بۆ حەبەشە ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ مەدینە بۆ ئەوەی خەڵکەکەی بانگ بکات بۆ سەر ئیسلام و قورئانیان فێر بکات ، کە ئەوەبوو ئەوپەڕی لێهاتوویی نواند و ، دەورێکی بێوێنەی هەبوو لە موسڵمانکردنی ئەوس و خەزرەجدا .. موصعەب پێش موسڵمانبوونی لە ناز و نیعمەتێکی کەموێنەدا ئەژیا ، کە بە گەنج و لاوچاکی تاقانەی قوڕەیش ئەژمێررا ، بە ڕادەیەك کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەوەی ئەکرد کە لە مەککەدا هیچ گەنجێکی نەدیوە وەك موصعەب جوان و پێکەوتوو و خاوەن ناز و نیعمەت بووبێ کە ئەیفەرموو : (( ما رأيت بمكة أحسن لمة ، ولا أنعم نعمة من مصعب بن عمير )) . لەگەڵ ئەمەشدا بانگەوازی ئیسلامی هەڵ بژارد و ، تووشی سزا و ئازار و تەنگ پێ هەڵ چنین و هەژاریی و بێبەرگیی بوو ، بە ڕادەیەك کە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەو حاڵەوە بینیی دەستی بە گریان کرد بۆ ئەو گوزەرانەی کە ئەوی ئیمانداری تێ کەوتووە . بەشداریی جەنگی بەدری کردووە و لە جەنگی ئوحودیشدا شەهید بووە ، ئەمەش لە کاتێکدا کە خۆی بۆ پارێزگاریی پێغەمبەری خوا ﷺ کردبووە قەڵغان . کە شەهید بوو کراسێکی لەبەردا بوو ئەگەر سەریان پێ دائەپۆشیی هەردوو قاچی دەرئەکەوتن و گەر قاچیان پێ دائەپۆشیی سەری دەر ئەکەوت . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا تا سەری پێ داپۆشن و بە گەڵای ( ئیذخیر ) یش قاچی داپۆشن کە فەرمووی : (( غطوا رأسه وضعوا على رجليه الإذخر )) .

دانیشتن و ، هەندێ لە موسڵمانەکان لە دەوریان جەم بوون ، بەڵام سەعدی کوڕی موعاذ و ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ، کە سەرداری نەوەی عەبدولئەشهەل بوون ، هێشتا لەسەر دینە کۆنەکەیان مابوونەوە و موسڵمان نەبووبوون ، کاتێک کە بیستیان وا موصعەب هاتۆتە مەدینە و بەوپەڕی چالاکی‌یەوە دینی نوێ بڵاو ئەکاتەوە و ، وا ئێستەش هاتۆتە ناو باخەکەیانەوە ، سەعد بە ئوسەیدی وت : ماڵت ئاوابێ ! بڕۆ بۆ لای ئەو دوو پیاوەی کە هاتوونەتە گەڕەکەمانەوە ، تا لاوازەکانمان لە خشتە بەرن ، پیایانا هەڵ شاخێ و ، لەوە قەدەغەیان بکە کە جارێکی تر بێنەوە بەم ناوەدا . خۆت ئەزانی ئەگەر ئەسعەدی کوڕی زورارە نزیکم نەبوایە ، ئەو کارەم لە کۆڵت ئەکردەوە ، بەڵام پوورزامە و ناتوانم هیچی پێ بڵێم .

ئوسەیدی کوڕی حوضەیر حەربەکەی هەڵ گرت و بەرەو روویان رۆیشت . کاتێك کە ئەسعەدی کوڕی زورارە ئوسەیدی بینیی بە موصعەبی وت : ئەمە سەرداری قەومەکەیەتی ، وا هات بۆ لات و تۆش نییەتت بۆ خوا یەکلایی بکەرەوە . موصعەب وتی : ئەگەر دابنیشێت قسەی بۆ ئەکەم . ئوسەید بە قسە پێوتنەوە هاتە سەر سەریان و وەستا و وتی : چیی پاڵی پێوە ناون تا بێن لاوازەکانمان لە خشتە بەرن ؟! ئەگەر خۆتانتان خۆش ئەوێ کەنارمان لێ بگرن .

موصعەب کە خاوەنی دەم و چاوێکی گەشاوەی وەها بوو کە هەر دەت‌وت دەم و چاوی پیرۆزی پێغەمبەری خوایە ﷺ بە زمانی پاراوی ئیمان‌داری هێمنی دڵ پڕ لە متمانە بە خۆی و دینە پاکەکەی هاتە وەڵام : ئەی ناکرێ دابنیشی و گوێ بگری ، جا ئەگەر کارێکت بە دڵ بوو ئەوا وەری ئەگریت و ، گەر پێیشت ناخۆش بوو ئەوا لە کۆڵت ئەکرێتەوە ؟!

ئوسەید وتی : ئینصافت بەکار هێنا . پاشان حەرەبەکەی چەقاند بە زەوییدا ، لەلایان دانیشت و ، موصعەبیش باسی ئیسلامی بۆ کرد و ، قورئانی بۆ خوێند و، پاشان هەردووکیان ( ئەسعەد و موصعەب ) ئەیان وت : بەخوا بەر لەوەی قسە بکات ، لە گەشاوەیی و کرانەوەی دەم و چاویدا ئیسلامان ئەخوێندەوە ، پاشان وتی : ئای کە فەرمایشتێکی چاك و جوانە ! ئەگەر بتانەوێ بێنە سەر ئەم دینە چیی ئەکەن ؟ وتیان : خۆت ئەشۆیت و خۆت و جلەکانت پاك و خاوێن ئەکەیت و ، پاشان شاهێدیی حەق ئەدەی و ، پاشان نوێژ بەجێ ئەهێنی .

هەستا و خۆی شۆرد و ، جلی پاکی لەبەر کرد و ، شاهێدیی حەقی دا و ، پاشان هەستا و دوو ڕەکعەت نوێژی بەجێ هێنا ، پاشان بە هەردووکیانی وت : پیاوێکم بە لاوەیە ئەگەر ئەو شوێن کە دینەتان بکەوێ ، ئەوا یەك خزمی لە ئێمان هێنان دوا ناکەوێ . ئەویش سەعدی کوڕی موعاذە و ، ئێستە ئەی‌نێرم .

ئوسەید هەستا و حەربەکەی هەڵ گرت و ، بەرەو سەعد و خزمەکانی ، کە لە کۆڕ و کۆمەڵی خۆیاندا دانیشتبوون ، گەڕایەوە .. کاتێ کە بەرەو ڕوویان ئەڕۆیشت ، سەعد سەیری کرد و وتی : سوێند بەخوا ئەخۆم کە ئوسەیدی کوڕی حوضەیر بەو دەم و چاوەوە نەگەڕاوەتەوە ، کە لەلای ئێوەوە پێوەی ڕۆیشت !!

کاتێك کە ئوسەید گەیشتە لایان ، سەعد لێی پرسیی : چیت کرد ؟ وتی : هەر دوو پیاوەکەم دواند ، دە بەخوا هیچ خراپەیەکیان نەبوو و ، منیش داوام کرد لەو کارەیان واز بهێنن . وتیان : چیت پێ خۆش بێ ، وەها ئەکەین ، ئەوەشم بۆ باس کراوە کە نەوەی حاریثە هاتوون بۆ ئەسعەدی کوڕی زوراره هەتا بی‌کوژن ، ئەمەش هەر بۆ شکاندنی تۆ ، چونکە ئەزانن کە پوورزای تۆیە .

بۆ ئەم باسە دەربارەی نەوەی حاریثە ، سەعد بە تووڕەیی‌یەوە هەستا و ، حەربەکەی بە دەستەوە گرت و پاشان وتی : بەخوا وا بزانم هیچت نەکرد .

خۆی چوو بۆ لای موصعەب و ئەسعەد و ، ئەبینێ وا بێ‌خەم دانیشتوون ، ئیتر تێ گەیشت کە ئوسەید ویستوویەتی سەعد خۆی بێت و قسەیان لێ ببیستێ . بۆیە لە سەریان وەستا و دەستی بە قسە پێوتنیان کرد . پاشان بە ئەسعەدی وت : بەخوا ، ئەبوئومامە! ئەگەر لەبەر خزمایەتیی نێوانمان نەبوایە ، تۆ ئاوەهات پێ نەئەکردم .. ئەو شتەی کە ئێمە پێمان ناخۆش بێ ئەی‌هێنیتە ماڵەکەمانەوە ؟ ئەوەبوو پێشتر ئەسعەد بە موصعەبی وتبوو : بەخوا ، وا ئەو کەسەی کە سەرداری هەموو قەومەکەیەتی هات بۆ لات ، ئەگەر ئەو شوێن دینەکەت بکەوێ ، ئەوا دوو کەسیان لە موسڵمان‌بوون دوا ناکەون .

موصعەب کە سەعدی بە تووڕەیی بینیی ، بە نەرم و نیانیی پێی وت : دانانیشی تا گوێ بگری؟ جا ئەگەر بە کارێك ڕازایی بوویت و پێت خۆش بوو ، ئەوا وەری ئەگریی و ، گەر پێیشت ناخۆش بوو، ئەوا ئەو ناخۆشی‌یەت لێ دوور ئەخەینەوە .

سەعد وتی : ئینصافت بە کار هێنا . پاشان حەربەکەی بە زەویـیدا چـەقاند و دانیشت و ، ئەویش باسی ئیسلامی بۆ کرد و ، قورئـانی بـۆ خوێنـد . مووسـای کوڕی عـەقەبە باسی ئەوەی کردووە کـە سـەرەتای سـوورەتی ( الزخـرف ) ی بـۆ خوێندووە .

هەردووکیان موصعەب و ئەسعەد وتیان : بەخوا ، بەر لەوەی قسە بکات ، لـە گەشاوەیی و کرانەوەی دەم و چاویدا ئیسلامان ئەخوێندەوە .

دوای ئەوە سەعد بە هەردووکیانی وت : ئەگەر ئێوە موسڵمان بن و ، بێنە سەر ئەم دینە ، چیی ئەکەن ؟ وتیـان : خـۆت ئەشـۆیت ، خـۆت و جلـەکانت پـاك را ئەگریت ، پاشان شاهێدیی حەق ئەدەی و، پاشـان دوو رەکعـەت نوێـژ ئەکـەیت . ئەویش هەستا و خۆی شۆرد و جل و بەرگەکەی گۆڕیی و ، شاهێدیی حـەقی دا و، پاشان دوو رەکعەت نوێژی بە جێ هێنا و ، دوای ئەوە دەستی دایـە حەربەکـەی و لەگەڵ ئوسەیدی کوڕی حوضەیردا گەڕانەوە شـوێنی کـۆڕ و کۆمـەڵی خزمـەکانی. کاتێك کە خزمەکانی چاویان پێ کـەوت وا گەڕایـەوە ، وتیـان : سـوێند بـە خـوا ئـەخۆین کە سەعد بەو دەم و چـاوەوە نەگەڕاوەتـەوە ، کـە لـە لای ئێـوەوە پێـی ڕۆیشت !

کاتێك کە گەیشتە لایان وتی : ئەی نەوەی عەبدولئەشهەل ! لە ناوتانا مـن بـە چیی ئەژمێرن ؟ وتیان : سەردارمان و ، خاوەنی چاكترین رامـان و بـە بەرەکـەت ترین سەرۆکمانی .. وتی : دەی قسەکردن لەگەڵ هیچ پیاوێك و هیچ ژنێکتاندا لە من حەرام بێت هەتا ئیمان بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی نەهێنن .

ئەڵێ : دە بەخوا هەرچیی پیاو و ژنی نەوەی عەبدولئەشهەل بوو کـە ئێوارەیـان لێ هات ئیمانیان هێنا بوو .

ئەسعەد و موصعەب بە دڵی پڕ لە ئاسـوودە و ، بـە سـوپاس گـوزاریی خـوای گەورەوە گەڕانەوە بۆ ماڵی ئەسعەد و ، موصعەب لە ماڵی ئـەواندا مایـەوە و ، بەردەوام خەریکی بانگکردن بوو بۆ لای خوا ، هەتا ئەوەبوو هیچ ماڵێکی ئەنصار نەما کە ئیسلامی تێ نەچووبێ ، جگـە لـە چـەند پیاوێـك کـە یـەکێکیان نـاوی عـەمری کوڕی ثابیتی کوڕی وەقش بوو و ، نازناویشی ئوصەیریم بوو و ، جگە لـە چەند پیاوێکی ئەوسی کوڕی حاریثەش ، لـە نـەوەی ئومەییـەی کـوڕی زەیـد و ، خەطمە و ، وائیل و ، واقیف کـە ئـەوەبوو خزمێکیـان هـەبوو ، پێیـان ئـەوت

ئەبوقەیسی کوڕی ئەسەلت و ناویشی صەیفیی و ، پیاوێکی شاعیر بوو و، وەك فەرماندەیەکیش خزمەکانی بە گوێیان ئەکرد . جا ئەم خزمەیان بووە هۆی ئەوەی کە لە ئیسلام دوور بگرن هەتا دوای جەنگی خەندەق ( چاڵ ) . رای مێژوونووسان لەسەر ئەوەیە کە صەیفیی ، بە هۆی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوولی سەرۆکی نیفاقەوە ، موسڵمان نەبووە .

بەڵام ئوصەیریم موسڵمانبوونی دواکەوت هەتا ڕۆژی ئوحود . ئەوسا موسڵمان بوو و ، لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوو و ، هێشتا نوێژێکی بۆ خوا بەجێ نەهێنابوو و ، پێغەمبەری خواش ﷺ هەواڵی دا کە ئەهلی بەهەشتە .

بە ئیسنادێکی (حەسەن ) ئیبن ئیسحاق لە ئەبوهورەیرەوە ریوایەتی کردووە کە ئەی وت : باسی پیاوێکم بۆ بکەن کە چۆتە بەهەشت و تاقە نوێژێکیشی بۆ خوا بەجێ نەهێناوە . جا کە هیچ کەس نەیئەناسیی ، ئەبوهورەیرە ئەیوت : ئوصەیریمی نەوەی عەبدولئەشهەلە .

بەر لە هاتنی وەرزی حەجی داهاتوو ، واتە حەجی ساڵی سیانزەهەمی هاتنی وەحی ، موصعەب گەڕایەوە مەککە ، تا خۆی بگەیەنێتە خزمەتی پێغەمبەر و ، مژدەی گەشەکردنی بانگی پیرۆزی لە مەدینەدا بداتێ ، کە چۆن هۆزە ڕەوشت بەرزەکانی یەثریب باوەشیان بۆ بانگی خواناسیی کردۆتەوە ، کە بە ڕاستیی خاوەنی غیرەت و سەخاوەت و جوامێریین .[٢٥٥]

**حەڤدەهەم : پەیمانی دووهەمی عەقەبە**

دوای ئەوەی کە موصعەب کاری سەرشانی خۆی بە چاکیی ئەنجام دا و ، دینی ئیسلامی لە مەدینەدا بڵاو کردەوە ، گەڕایەوە مەککە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەوەبوو لە وەرزی حەجی سیانزەهەمینی ساڵی هاتنی وەحیدا کە بەرامبەر بە مانگی حوزەیرانی ساڵی ٦٢٢ز بوو حەفتا و ئەوەندە موسڵمانی شاری یەثریب ، بەرەو مەککە ، لەگەڵ حاجیانی تری شاردا ، کەوتنە ڕێ ، تا لەگەڵیانا فەرزی حەج بە جێ بهێنن .

---

[٢٥٥] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٤٤٠ ـ ٤٤٤ ، والرحيق المختوم : ١٤٧ ـ ١٤٩ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ٢١٦ ـ ٢١٧.

موسڵمانەکان لە ڕێی نێوان مەککە و مەدینەدا ، یان هێشتا لە یەثریب دەرنەچووبوون ، لە نێوان خۆیاندا پرسیاریان ئەکرد : هەتا کەی دەست بەرداری پێغەمبەری خوا ﷺ ببین و ، لە چیاکانی مەککەدا بیترسێنن و دەری بکەن ؟

کە گەیشتنە مەککە بە نهێنیی چەند پەیوەندییەکیان بە پێغەمبەری خواوە ﷺ کرد ، کە ئەوەبوو بڕیاریان دا لە ڕۆژێکی ( أيام التشريق ) دا ، لە نزیك عەقەبەدا ، لە مینا ، لە شوێنی ڕەجمی یەکەمدا کۆببنەوە ، بەڵام ئەوپەڕی نهێنیی تێدا بە کار بێت و ، بە شەویشدا بێت . بەم شێوەیە خوای گەورە پیاوی دڵسۆز و مەرد و قارەمانی بۆ دینەکەی ئامادە کرد و بوونە قەڵا بۆ پاراستنی بیری خواناسیی .

ئەوانەی کە لە مەدینەوە هاتبوون کەعبی کوڕی مالیك و ، بەڕائی کوڕی مەعروریان تێدا بوون ، کە بەڕاء یەکێ بوو لە گەورە و سەردارەکانیان .

بەڕاء ڕووی کردە خزمەکانی وتی : شتێکم بە دڵدا هاتووە ، ئیتر بەخوا نازانم لەگەڵمدا ئەبن یان نەء ؟ وتیان : ئەو شتە چیە ؟ وتی : ئەمەم بە دڵدا هاتووە کە پشت نەکەمە ئەم بینایە ، واتە کەعبە و ، لە نوێژکردندا ڕووی تێ بکەم .

وتیان : بەخوا ئەوەی کە بە ئێمە گەیشتووە ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ڕوو بە شام ـ بيت المقدس ـ نوێژی کردووە و ، ئێمەش نامانەوێ پێچەوانەی ئەو بجووڵێینەوە . ئەوەبوو کە کاتی نوێژ ئەهات ڕوو بە ( بيت المقدس ) نوێژیان ئەکرد، هەتا گەیشتنە مەککە و ، بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتن کە لە مزگەوتی حەرام دا لەگەڵ عەبباسی مامەیدا پێکەوە دانیشتبوون .

پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە عەبباس کرد و فەرمووی : (( هل تعرف هذين الرجلين ، يا أبا الفضل ؟ )) . فەرمووی : ئەو دوو پیاوە ئەناسی ؟ وتی : بەڵێ . ئەوەیان بەرائی کوڕی مەعرورە کە سەرداری خزمەکانیەتی و ، ئەوەش کەعبی کوڕی مالیکە . پێغەمبەری ﷺ فەرمووی : (( الشاعر ؟ )) . وتی : بەڵێ . بەرائیش باسی نوێژکردنەکەی ڕوو بە کەعبەی بۆ گێڕایەوە و ، وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! چۆنی ئەبینی ؟ فەرمووی : (( قد كنت على قبلة لو صبرت

عليها )) . فەرمووی : تۆ قیبلەیەکت هەبوو خۆزگە ئارامت لەسەری بگرتایە .[٢٥٦]
کەعب ئەڵێت :

ئیتر بەراء گەڕایەوە سەر قیبلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، لەگەڵمانا ڕوو بە شام نوێژی کرد و ، کاتێکیش کە لە سەرەمەرگدا بوو ، فەرمانی دا بە کەس وکارەکەی تا ڕووی بکەنە کەعبە و ، لە مانگی صەفەردا و یەك مانگ پێش کۆچی ئازیز ﷺ کۆچی دوایی کرد و ، وەسیەتیشی کرد کە سێیەکی سامانەکەی بدرێ بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش وەری گرت و ، گێڕاشیەوە بۆ منداڵەکانی.. بەراء یەکەم کەس بوو کە وەسیەت بکات بە بەخشینی سێیەکی سامانەکەی .

کەعب ، کە باسەکەمان بۆ ئەگێڕێتەوە ، ئەڵێت : کاتێك کە لە حەج بووینەوە، ئەو شەوەش هاتە بەرەوە کە بەڵێنمان دابوو بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بگەین ، ئەوەبوو عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرامان لەگەڵدا بوو ، واتە باوکی جابیر ، کە یەکێ لە سەردار و پیاوماقووڵەکانمان بوو ، ئەویشمان لەگەڵ خۆماندا برد ، بەڵام ئەم کارەمان لە هەموو ئەو موشریکانە ئەشاردەوە کە لەگەڵمانا بوون ، قسەمان لەگەڵ ئەودا کرد و وتمان : ئەی باوکی جابیر ! تۆ سەردارێك و پیاوماقووڵێکی ئێمەیت و ، ئێمەیش ئەوەمان پێ ناخۆشە کە تۆی وا تیا و ، سبەینێ ببیتە سووتەمەنیی ئاگر . پاشان بانگمان کرد بۆ ئیسلام و ، هەواڵی کاتی دیاریی‌کراویشمان دایە کە ئێمە و پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەقەبەدا کۆ ئەبینەوە . ئەوەبوو موسڵمان بوو و ، لەگەڵمانا بەشداریی پەیمانی عەقەبە ( ی دووهەمی ) شی کرد و ، بووە یەکێکیش لە سەرۆك ( نقيب ) ەکانی ئەنصار .

کەعب ئەڵێت : ئەو شەوە لەگەڵ هاوەڵەکانم‌دا لەناو کەل و پەلەکانمان‌دا خەوتین ، هەتا سێیەکی شەو ڕۆیشت ، ئەوسا لەناو کەل و پەلەکانمان‌دا ، بەبێ

[٢٥٦] لێرەدا فەرمانی نەداوە ئەو نوێژانە دووبارە بکاتەوە ، چونکە ئیجتیهادی کردووە . لە فەرموودەش دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەدا ڕوو بە ( بيت المقدس ) نوێژی کردووە . ئەمەش ڕای ئیبن عەبباسە . هەندێکیش وتوویانە تەنها ئەو شانزە حەڤدە مانگەی مەدینە ڕوو بە ( بيت المقدس ) نوێژی کردووە . جا ئیبن عەبباس ئەم جیاوازی‌یەی ڕوون کردۆتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کە لە مەککەدا نوێژی ئەکرد ڕوو بە ( بيت المقدس ) ئەوەستا و کەعبەشی ئەخستە نێوان خۆی و ( بيت المقدس ) . واتە ڕووی لە هەردووکیان ئەکرد. بەڵام خەڵکیی ئەمەیان نەئەزانیی هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد ، ئەوسا لەوێ ڕووی کردە قودس و بێ‌تاقەتی کەعبەش بوو ، هەتا خوای گەورە ئیزنی دا ڕوو بکاتەوە کەعبە .

دەرکەوتن بە وێنەی قەتێ خۆمان دزییەوە تا بە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بگەین ، هەتا ئەوەبوو لە شیوەکەدا لەلای عەقەبە کۆ بووینەوە ، کە حەفتا و سێ پیاو بووین و، دوو ئافرەتیشمان لەگەڵدا بوون : نوسەیبەی کچی کەعب ، ئوم عومارە ، کە یەکێ لە ئافرەتانی نەوەی مازنی کوڕی نەججار و ، ئەسمائی کچی عەمری کوڕی عەدیی کوڕی نابیی ، ئوم مەنیع ، کە یەکێ لە ئافرەتانی نەوەی سەلیمە بوو .

ئەمەش ناوی موسڵمانانی مەدینەیە کە لە پەیمانی دووهەمی عەقەبەدا ئامادە بوون :

ئەوس یانزە پیاویان هاتبوون :

١ ـ ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ، کە یەکێکە لە نەقیبەکان .

٢ ـ ئەبولهەیثەم مالیکی کوڕی تەییهان ، بەدرییە .

٣ ـ سەلەمەی کوڕی سەللامەی کوڕی وەقش ، بەدرییە .

٤ ـ ظەهیری کوڕی رافیع .

٥ ـ ئەبوبوردەی کوڕی نیار ، بەدرییە .

٦ ـ نوهەیری کوڕی هەیثەم لە نەوەی نابیی کوڕی مەجدەعەی کوڕی حاریثە .

٧ ـ سەعدی کوری خەیثەمە ، یەکێکە لە نەقیبەکان و ، لە بەدریش‌دا شەهید بووە .

٨ ـ ریفاعەی کوڕی عەبدولمونذیری کوڕی زەنبر ، نەقیبە و بەدرییشە .

٩ ـ عەبدوڵلای کوڕی جوبەیری کوڕی نوعمانی کوڕی ئومەییەی کوڕی بەرك، بەدرییە و ، لە جەنگی ئوحوددا ئەمیری تیرهاوێژەکانی سەر گردەکە بوو و بە پلەی شەهیدیی گەیشت .

١٠ ـ مەعنی کوڕی عەدیی کوڕی جەددی کوڕی عیجلانی کوڕیحاریثی کوڕی ضەبیعەی بەلەویی کە هاوپەیمانی ئەوس بووە . بەدر و بە دواوە ئامادەی جەنگەکان بووە . لە یەمامەدا شەهید بووە .

١١ ـ عوەییمی کوڕی ساعیدە ، بەشداریی بەدر و بە دواوەی کردووە .

خەزرەجیش شەست و دوو پیاویان هاتبوون :

١ ـ ئەبوئەییووبی ئەنصاریی ، خالیدی کوڕی زەید کە بەدر و بە دواوە ئامادە بووە و ، لە سەردەمی موعاویەدا ، لەگەڵ سوپای ئیسلامدا گەمارۆی ئەستەنبوولیان دا و ، لەوێ کۆچی دوایی کردووە .

٢ ، ٣ ، ٤ ـ موعاذ و ، عەوف و ، موعەووەذی کوڕانی حاریث کە دایکیان ناوی عەفراء ە و ، بەدریین .

٥ ـ عیمارەی کوڕی حەزم کە بەدر و بە دواوە ئامادە بووە و ، لە یەمامە لە جەنگی موسەیلەمەی درۆزندا شەهید بووە .

٦ ـ ئەسعەدی کوڕی زورارە ، ئەبوئومامە کە یەکێکە لە نەقیبەکان و ، پێش جەنگی بەدر کۆچی دوایی کردووە .

٧ ـ سەهلی کوڕی عەتیك ، بەدرییە .

٨ ـ ئەوسی کوڕی ثابیتی کوڕی مونذیر ، بەدرییە .

٩ ـ ئەبوطەلحەی ئەنصاریی ، زەیدی کوڕی سەهل ، بەدرییە .

١٠ـ قەیسی کوڕی ئەبوصەعصەعە ، عەمری کوڕی زەیدی کوڕی عەوفی کوڕی مەبذوولی کوڕی عەمری کوڕی غونمی کوڕی مازین ، کە لە بەدردا ئەمیری پاشکۆی سوپا بوو .

١١ ـ عەمری کوڕی غوزەییە .

١٢ ـ سەعدی کوڕی ڕەبیع کە یەکێکە لە نەقیبەکان ، بەشداریی بەدری کردووە و ، لە ئوحوددا بە شەهیدیی سەری ناوەتەوە .

١٣ ـ خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ئەبوزوهەیری کوڕی مالیك ، بەشداریی بەدری کردووە و ، لە ئوحوددا شەهید بووە .

١٤ ـ عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ، کە یەکێکە لە نەقیبەکان و ، بەشداریی بەدر و ئوحود و خەندەقی کردووە و لە جەنگی موئتەدا کە ئەمیری سوپا بوو ، بە پلەی شەهیدیی گەیشت ..

١٥ ـ بەشیری کوڕی سەعد ، بەدرییە .

١٦ ـ عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی عەبدڕەببە ، کە بانگی فێرکرا و ، بەدرییشە .

١٧ ـ خەللادی کوڕی سووەید کە بەشداریی بەدر و ئوحود و خەندەقی کردووە و، رۆژی قورەیظە بەرداشێکی بەسەردا بەر درایەوە و سەری زامدار کرد و شەهید بوو. وتراویشە کە پێغەمبەی خوا ﷺ بەڵێنی داوە کە ئەجری دوو شەهیدی هەیە .

١٨ ـ ئەبومەسعوود ، عوقبەی کوڕی عەمری بەدریی ، ئیبن ئیسحاق وتوویە: گەنجترینی ئەوانە بووە کە بەشداریی عەقەبەیان کردووە ، بەلاّم ئامادەی بەدر نەبووە .

١٩ ـ زیادی کوڕی لەبید ، بەدری‌یە .

٢٠ ـ فەڕوەی کوڕی عەمری کوڕی وەدەقە .

٢١ ـ خالیدی کوڕی قەیسی کوڕی مالیك ، بەدری‌یە .

٢٢ ـ رافیعی کوڕی مالیك ، کە یەکێکە لە نەقیبەکان .

٢٣ ـ ذەکوانی کوڕی عەبدقەیسی کوڕی خەلدەی کوڕی موخەللەدی کوڕی عامیری کوڕی زورەیق ، کە پێی ئەوترێت : موهاجیریی و ئەنصاریی ، چونکە کە موسڵمان ئەبێت لە مەککەدا ، لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەمێنێتەوە تا کاتی کۆچ‌کردن و ئەویش کۆچ ئەکات . لە هەمان کات‌دا بەشداریی بەدری کردووە و ، لە ئوحودیش‌دا شەهید بووە .

٢٤ ، ٢٥ ـ عەبباد و حاریثی برای کوڕانی قەیسی کوڕی عامیری کوڕی خالیدی کوڕی عامیری کوڕی زورەیق ، هەردووکیان بەدریین .

٢٦ ـ بەڕائی کوڕی مەعروور ، کە یەکێکە لە نەقیبەکان و ، وەك نەوەی سەلیمە دەری ئەبڕن یەکەم کەسێکە کە بەیعەتی داوە . پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگاتە مەدینە کۆچی دوایی کردووە .

٢٧ ـ بیشری کوڕی بەڕائی کوڕی مەعروور ، بەشداریی بەدر و ئوحود و خەندەقی کردووە و ، لە جەنگی خەیبەردا ، بە هۆی خواردنی گۆشتی ئەو مەڕە ژەهراوی‌یەوە شەهید بووە ، کە زەینەبی ژنی سەللامی کوڕی میشکەمی یەهوودیی دەرخواردی ئەو و پێغەمبەری خوای ﷺ دابوو .

٢٨ ـ سینانی کوڕی صەیفیی کوڕی صەخەر بەدری‌یە .

٢٩ ـ طوفەیلی کوڕی نوعمان کوڕی خەنساء ، بەدری‌یە و ، رۆژی خەندەق شەهید بووە .

٣٠ ، ٣١ ـ مەعقەل و یەزیدی برای کوڕانی مونذیری کوڕی سەرح ، هەر دووکیان بەدریین .

٣٢ ـ مەسعوودی کوڕی یەزیدی کوڕی سوبەیع .

٣٣ ـ ضەححاکی کوڕی حاریثەی کوڕی زەیدی کوڕی ثەعلەبە ، بەدرییە .

٣٤ ـ یەزیدی کوڕی خوذامی کوڕی سوبەیع .

٣٥ ـ جەبباری کوڕی صەخەری کوڕی ئومەییەی کوڕی خەنسائی کوڕی سینانی کوڕی عوبەید ، بەدرییە .

٣٦ـ طوفەیلی کوڕی مالیکی کوڕی خەنساء ، بەدرییە .

٣٧ ـ کەعبی کوڕی مالیك .

٣٨ ـ سەلیمی کوڕی عەمری کوڕی حەدیدە ، بەدرییە .

٣٩ ـ قوطبەی کوڕی عامیری حەدیدە ، بەدرییە .

٤٠ ـ ئەبولـمونذیر ، یەزیدی برای قوطبە ، ئەویش بەدرییە .

٤١ ـ ئەبولیەسەر ، کەعبی کوڕی عەمر ، بەدرییە .

٤٢ ـ صەیفی کوڕی ئەسوەدی کوڕی عەبباد .

٤٣ ـ ثەعلەبەی کوڕی غونـمەی کوڕی عەدیی کوڕی نابیی ، بەدرییە و ، لە خەندەق‌دا شەهید بووە .

٤٤ ـ عەمری کوڕی غونـمەی برای ثەعلەبە .

٤٥ ـ عەبسی کوڕی عامیری کوڕی عەدیی ، بەدرییە .

٤٦ ـ خالیدی کوڕی عەمری کوڕی عەدیی کوڕی نابیی .

٤٧ ـ عەبدوللای کوڕی ئونەیسی هاوپەیـمانیان کە لە هۆزی قوضاعە بوو .

٤٨ ، ٤٩ ـ عەبدوللای کوڕی عەمری کوڕی حەرام کە یەکێکە لە نەقیبەکان و بەدرییە و ڕۆژی ئوحود شەهید بووە و ، جابیری کوڕی عەبدوللای کوڕی .

٥٠ ـ موعاذی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح ، بەدرییە .

٥١ ـ ثابیتی کوڕی جەذەع ، بەدرییە و ، لە طائیف شەهید بووە .

٥٢ ـ عومەیری کوڕی حاریثی کوڕی ثەعلەبە.بەدرییە .

٥٣ ـ خودەیجی کوڕی سەللامەی هاوپەیـمانیان کە لە هۆزی بەلیی بووە .

٥٤ ـ موعاذی کوڕی جەبەل ، کە ئامادەی بەدر و بە دواوە بووە و ، لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەططابدا خوا لێی رازیی بێ بە طاعوونی عەمەواس لە شام کۆچی دوایی کردووە .

٥٥ ـ عوبادەی کوڕی صامیت کە یەکێکە لە نەقیبەکان و ، ئامادەی بەدر و بە دواوە بووە .

٥٦ ـ عەبباسی کوڕی عوبادەی کوڕی نەضلە ، کە دوای موسڵمان بوونی لە مەککەدا ئەمێنێتەوە هەتا کۆچ‌کردن بۆ مەدینە و ئەویش کۆچ ئەکات ، بۆیە پێی ئەوترا : موهاجیریی و ئەنصاریی و ، رۆژی ئوحود شەهید بووە .

٥٧ ـ ئەبوعەبدوررەحمان ، یەزیدی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی خەزمەی کوڕی ئەصرەمی هاوپەیمانیان کە لە هۆزی بەلیی بووە .

٥٨ ـ عەمری کوڕی حاریثی کوڕی لەبدە .

٥٩ ـ ریفاعەی کوڕی عەمری کوڕی زەید ، بەدرییە .

٦٠ ـ عوقبەی کوڕی وەهبی کوڕی کیلدەی هاوپەیمانیان ، بەدرییە . ئەمیش یەکێ بوو لەوانەی کە رۆیشتنە مەککە و لەوێ مایەوە هەتا کۆچ کرا بۆ مەدینە ، بۆیە پێی ئەوترا موهاجیریی و ئەنصاریی .

٦١ ـ سەعدی کوڕی عوبادەی کوڕی دلێم ، کە یەکێکە لە نەقیبەکان .

٦٢ ـ مونذیری کوڕی عەمر کە یەکێکە لە نەقیبەکان و ، بەدریی و ئوحودیی‌یە و ، بە ئەمیریی لە رۆژی بیری مەعوونەدا شەهید کرا .

دوو ئافرەتەکەش وەك لە پێشەوە ناویان برا ، ئوم‌عەمارە و ئوم‌مەنیع بوون .

کەعبی کوڕی مالیك ئەڵێت : لە شیوەکەدا کۆبوویـنەوە و چاوەڕوانی پێغەمبەری خوا بووین ﷺ تا ئەوەبوو تەشریفی هات و ، عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیبیشی لەگەڵدا بوو ، کە هێشتا لەسەر دینی خزمەکانی مابوویەوە ، بەڵام پێی خۆش بوو لە کاری برازاکەی‌دا ئامادە بێت و، دڵی لێی بێ‌خەم بێت . کە دانیشت یەکەم قسەکەر عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب بوو ، وتی : ئەی کۆمەڵی خەزرەج ! ـ ئەوەبوو عەرەبەکان ئەنصاریان ، چ ئەوس چ خەزرەج ، هەر بە خەزرەج ناو ئەبرد ـ خۆتان ئەزانن موحەممەد چیی ئێمەیە و ، لەو خزمانەشمان کە رایان دەربارەی ئەو وەك ئێمە وەهایە پاراستوومانە . ئەو لەناو خزمەکانی‌دا پایەدار و ، لە وڵاتەکەی‌دا پارێزراوە . ئەویش بڕیاری داوە پاڵ بە ئێوەوە بدات و

بێتە ناوتان . جا ئەگەر ئێوەش ئەزانن کە ئەو بەڵێنەی پێتان داوە بۆی ئەبەنە سەر و ، لە ناحەزانی ئەیپارێزن ، ئەوا ئێوە و ئەو . خۆ ئەگەر ئەشزانن دوای دەرچوونی بۆ ناوتان دەستبەرداری ئەبن و پشتی بەرئەدەن ، ئەوا هەر لە ئێستەوە لێی گەڕێن ، چونکە لەناو خزم و وڵاتی خۆیدا عەزیز و پارێزراوە .

ئەڵێ : پێمان وت : هەرچیت وت بیستمان . جا ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمایشت بکە .. بۆ خۆت و بۆ پەروەردگارت هەرچییت پێخۆشە دیاریی بکە . ئەنصار هەر لە یەکەم رۆژدا دەریان خست کە چەندە بە پاکیی لە دینی خوا دێنە پێشەوە .. چونکە بە راستیی پیاو بوون .. پاڵەوان و چاونەترس بوون .. سنگ فراوان و سەخیی تەبیعەت بوون .. ئیمانداری خاوەن ئیخلاص بوون .. بە سەر وماڵەوە هاتنە پێشەوە تا خزمەتی ئیمان بکەن .. بە تەمای هیچیێ لەم دنیایە نەبوون .. لەگەڵ ئەوەشدا بە تەمای هەموو ناڕەحەتییەك بوون بێتە رێیان .

لەم کاتەدا کە هەموو ئامادە بوون بەیعەت بە پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن ، عەبباسی کوڕی عوبادەی کوڕی نەضلەی ئەنصاریی ، کە یەکێ بوو لەوانەی بەیعەی یەکەمی عەقەبەی دابوو ، هەستایە سەر پێ و وتی : ئەی کۆمەڵی خەزرەج ! ئایا ئەزانن بەیعەت لەسەر چیی بەم پیاوە ئەدەن ؟ وتیان: بەڵێ . وتی : ئێوە پەیمانی ئەوەی ئەدەنێ کە لەگەڵ سوور و رەشی ئەو خەڵکەدا بجەنگن . جا ئەگەر ئەزانن بەوەی کە سامانەکەتان تووشی موسیبەت بوو و، پیاوماقوولاٌنتان کوژران ، ئەیدەن بە دەستەوە ، ئەوا هەر ئێستە وەها بکەن ، چونکە بەخوا ئەگەر وەها بکەن ئەوە سەرشۆڕیی دنیا و قیامەتە . خۆ ئەگەر ئەزانن لەگەڵ تیاچوونی ماڵ و سامانتان و ، کوژرانی پیاوماقوولاٌنتان ئەو بەڵێنەی پێتان داوە بۆی ئەبەنە سەر ، ئەوا بیبەن ، بەخوا ئەوە خێری دنیا و قیامەتە .

وتیان : بە مەرجی تیاچوونی ماڵ و سامان و ، کوژرانی پیاوماقوولاٌنمان ئەیبەین لەگەڵ خۆمان . جا ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر ئەوەمان بردە سەر چیمان بۆ ئەبێ ؟ فەرمووی : ( الجنة ) ، بەهەشت . وتیان : دەستت بێنە . دەستی کردەوە و ئەوانیش بەیعەتیان پێ دا . جا عەبباسی کوڕی عوبادە خوا لێی رازیی بێ بەو قسانەی ویستی موسڵمانەکان لە کاری سەرشانیان ئاگادار بکات ، تا خۆیان بۆ کارەکە یەکلایی بکەنەوە و ، هەروا بە سووکیی سەیری نەکەن دوایش بۆیان نەچێتە سەر . دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ کارەکەی بۆیان روون کردەوە :

جا لە ریوایەتەکەی ئیمام ئەحمەددا کە جابیر خـوا لێـی رازیـی بـێ ریوایـەتی کردووە ئەو بەندانە باس کراون کە پێغەمبەری خوا ﷺ داوایان ئەکات :
جابیر ئەڵێ : وتمان : ئەی پێغەمبەری خوا ! لەسـەر چیی بەیعـەتت بـدەینێ ؟ فەرمووی :

(١) « على السمع والطاعة في النشاط والكسل .. لەسـەر گوێڕایـەڵیی و مـل کەچیی لە کاتی چالاکیی و تەمەڵییدا..

(٢) وعلى النفقة في العسر واليسر .. هەروەها لەسەر خەرج کردن لە خۆشـیی و ناخۆشییدا ..

(٣) وعلى الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر .. هەروەها لەسـەر فـەرمان دان بـە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لە خراپە ..

(٤) وعلى أن تقولوا في الله لا تأخذكم في الله لومة لائم .. هـەروەها لـە پێنـاوی خوادا راستیی بڵێن و بۆ رەزامەندیی خوا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسن .

(٥) وعلى أن تنصرونـــي إذا قدمت إليكم ، وتمنعوني مما تمنعون منـــه أنفســكم وأزواجكم وأبناءكم ، ولكم الجنة » . هەروەها کە هاتمە ناوتان لە هـەر شـتێ کـە خۆتان و ژنەکانتان و منداڵەکانتان ئەپارێزن ، منیشی لێ بپـارێزن و ، بەهەشـتتان پێ ئەدرێ .

بەڵام لە ریوایەتی کەعبدا ، کـە ئـیبن ئیسـحاق ریوایـەتیکردووە بـەم شـێوە هاتووە :

کەعب ئەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتی کـرد و ، قورئـانی خوێنـد و ، بانـگی کـرد بۆ لای خوا و ، ئیسـلامی خستە پێش چاویان ، پاشـان فـەرمووی : « أبايعكم على أن تمنعونـــي مما تمنعون منه نساءكم وأبناءكم » . فەرمووی : لەسـەر ئەوە بەیعەتتان لێ وەرئـەگرم کـە هـەر شـتێ ژن و منداڵـەکانتانی لێ ئـەپارێزن منیشی لێ بپارێزن .

بەرائی کوڕی مەعروور دەستی گرت و وتی : بەڵێ ، بەو خوایەی تۆی بە حـەق بە پێغەمبەرایەتیی رەوانـە کـردووە ، هـەر شـتێ خۆمـان و ژن و منـداڵمانی لێ ئەپارێزین تۆیشی لێ ئەپارێزین . بەیعەتمان لێ وەربگرە ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! بەخوا ئێمە رۆڵەی جەنگ و شەڕ و شۆڕ و ، خاوەنی چەکین ، پشتا و پشت بۆمـان ماوەتەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش بوو کە ئەنصار بە کورتە قسە بکەن ، نەوەکو بتپەرستەکان بە کارەکەیان بزانن .

بەیهەقیی ریوایەتی کردووە کە فەرموویە: (( لیتکلم متکلمکم ولا یطل الخطبة فإن علیکم من المشرکین عیناً ، وإن یعلموا بکم یفضحوکم )) . فەرمانی دا با قسەکەریان قسە بکات ، بەلاّم بە کورتە نەوەکا بت پەرستەکان پێیان بزانن و ، کارەکەیان ئاشکرا بکەن ، چونکە کۆبوونەوەیەکی مێژوویی گرنگە و ، پێویستە بپارێزرێ .

کە بەڕاء لێ بوویەوە ، ئەبولهەیثەم مالیکی کوڕی تەییهان کە پەیمانی یەکەمی عەقەبەیشی دابوو ، هەستایە سەر پێ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە لەگەلّ ئەو پیاوانەدا پەیوەندییەکمان بەستووە و ، ئەیپچڕێنین ـ مەبەستی لە پەیوەندیی جوولەکەیە ـ ، جا ئایا ئەگەر ئێمە وەهامان کرد و ، خوای گەورەش تۆی سەر خست ، ئەشێ بگەڕێیتەوە ناو خزمەکانت و ، واز لە ئێمە بهێنی ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد و ، پاشان فەرمووی : (( بل الدم الدم والهدم الهدم ، أنا منکم وأنتم مني ، أحارب من حاربتم ، وأسالم من سالمتم )) .

بەم فەرموودەیە بۆی دەرخستن کە ئەو و ئەنصار سەروماڵ لە یەکن و جیابوونەیان نیە ، ئەو لەوانە و ، ئەوانیش لەون .. ئەنصار بچن بە گژی هەر کەسێکا ئەویش ئەچێت بە گژیا و ، ئاشتییش لەگەڵ هەر کەسێکا بکەن ئەویش ئاشتیی لەگەلا ئەکات .

ئەوەبوو دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ بە جوانترین شێوە ئەو بەلێنەی بەسەر برد و ، چاکەی ئەنصاری هەر لەبەر چاو بوو و ، دوای سەرکەوتن و فەتحی مەککەش هەر لە مەدینە مایەوە و وەسیەتیشی کرد کە موسلمانان بە چاوی رێزەوە سەیری ئەنصار بکەن و ، کە کۆچی دواییشی کرد هەر لە مەدینە نێژرا ..

هەروەها طبەرانییش لە عورووەوە بە شێوەی مورسەل ، تەخریجی کردووە کە وتوویە : یەکەم کەسێك کە بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبولهەیثەمی کوڕی تەییهان بوو خوا لێی رازیی بێ کە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لە نێوان ئێمە و خەلکییدا چەندین پەیمان و بەلێن هەیە ، کە لەوانەیە ئێمە دەستیان لێ هەلّ بگرین . جا دوای ئەوەی کە دەستمان لەو پەیمان و بەلێنانە هەلّ گرت و چووین بو گژی خەلکییدا ، ئەترسین تۆش بگەڕێیتەوە بۆ ناو خزمەکانت .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە قسەکانی دەستی بە پێکەنین کرد و فەرمووی : (( الـدمُ ، الدم .. الهدمُ ، الهدم )) . ( بەمە بۆی روون کردنەوە کە مان و مردنیان پێکەوەیە ) .

کاتێ کە ئەبولهەیثەم بە وەڵامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی ئاوی خواردەوە ، رووی لە خزمەکانی کرد و ، وتی : خزمینـە ! ئەمـە پێغەمبەری خوایـە ﷺ و ، شاهێدیی ئەدەم کە راستگۆیە و ، ئەمڕۆ ئەویش وا لە پەنای ماڵی خـوادا و ، لـە نێو خزم و عەشرەتەکەیدا . ئەوەش بزانن کە ئەگەر بیبەن لەگـەڵ خۆتـاندا ئـەوا هەموو عەرەب بە یەك دەنگیی دژایەتییتان ئەکەن . جا ئەگـەر دڵتـان خۆشـە بـە کوشتار لە پێناوی خوادا و ، تیاچوونی سامان و ماڵ و منداڵتـان ، ئـەوا خـوڵکی بکەن با بێت لەگەڵتانا ، چونکە بە راستیی پێغەمبەری خوایە . ئەگەر ئەشترسن پشتی بەردەن ، ئەوا ئێستە وازی لێ بهێنن ...

لێرەدا ئەنصار وتیان : وا ئەوەی کە خوا و پێغەمبەرەکەی پێیان داوین وەرمـان گـرت و ، ئێمـەش هەرچیی تـۆ داوات لێمـان کـردووە ، وا بەخشـییمان ، ئـەی پێغەمبەری خوا ! جا تۆش ئەی ئەبولهەیثـەم نێـوان ئێمـە و پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەردە با بەیعەتی بدەینێ . ئەبولهەیثەم وتـی : مـن خـۆم یەکـەم کـەس بەیعـەتی ئەدەمێ ، پاشان هەموویان یەك لە دوای یەك بەیعەتیان پێ دا ..

یەکێکی تر لەوانەی کە لەو کۆڕە مەزنە مێژووییەدا قسەی کـرد ، سـەرداری پایەدار ئەسعەدی کوڕی زوراره بوو ، کە دەوری کاریگەری بینیی لە بـەر دەسـتی موصعەبدا تا لە ناو مەدینەدا ئیسلام بڵاو بکاتەوە .. ئەوەبوو دوای ئـەوەی کـە پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی پرسیارەکەی ئەنصاری دایەوە ، کـە پرسییان لەسـەر چیی بەیعەتی بدەنێ و ، ئەویش بەندەکانی باس کرد ، وەك لە پێشەوە نووسـران ، دوای ئەوە ئەسعەدی کوڕی زوراره خوا لێی رازیی بێ ـ کە لـە هـەموو خەڵکەکـە بچووكتر بوو ، بەڵام لە ریوایەتی بەیهەقییدا وا هاتووە کە جگە لە راویی لە هەر حەفتا پیاوەکە منداڵتر بووە ـ دەستی ئەگرێت و ئەڵێت : ئەی دانیشتوانی یەثریب ! لەسەر خۆ بن ! ئێمە بۆیە بە سواریی وشتر هاتووینەتە خزمەتی ئـەزانین کـە ئـەو پێغەمبەری خوایە و ، ئەمڕۆش راکێشانی بۆ یەثریب دژایەتیی هـەموو عەرەبـە و کـوژرانی پیـاوە چـاکەکانتانە و ، شمشـێرتان ئاراسـتە ئـەکرێت . جـا یـا ئێـوە کەسانێکن کە لەسەر ئەوە ئارام ئەگرن ، ئەوا بیبەن و پاداشتتان لای خوایە ، یان کەسانێکن لە خۆتان ئەترسن ، ئەوا وازی لێ بهێنن . جـا ئـەوە روون بکەنـەوە ،

چونکە ئەوە لە گلەیی خوایی ڕزگارتـان ئـەکات . وتیـان : ئـەی ئەسـعـەد ! وەرە دواوە . دە بەخوا ! هەرگیز دەستبەرداری ئـەم بەیعەتـە نـابین و کەسـیش لێمـان داناماڵێ .

ئەڵێ : هەسـتاین بـۆ خزمـەتی و بەیعـەتمان پـێ دا و ، مـەرج و پـەیمانی لێ وەرگرتین ، تا لەسەر ئەوە بەهەشتمان پێ بدرێ .

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەسعەدی کوڕی زوراره ئەڵێت : ئەی موحەممەد چـیت پـێ خۆشە بۆ پەروەردگارت داوای بکە ، پاشان چییت بۆ خۆت پێ خۆشە داوای بکـە، پاشان هەواڵمان بدەرێ بزانین ئەگەر ئەوانە جێ بەجێ بکـەین چ پاداشـتێکمان بـۆ ئەبێت ؟ فـەرمووی : (( أَسأَلُكم لِربِّي أن تعبدوهُ ، ولا تُشرِكوا بِهِ شيئاً ، وأسـألكم لِنَفسي وأصحابِي أن تُؤوونا وتَنصرونا ، وتمنعونا مِمّـا تمنعـون منـه أنفسـكم )) .

فەرمووی : بۆ پەروەردگارم ئەوەتان لێ داوا ئەکەم کە بیپەرستن و ، هـیچ شـتێك نەکەنە شەریك بۆی . بۆ خۆیشم و هاوەڵانیشم ئەوەتان داوا لێ ئەکەم کـە جێمـان بکەنەوە و ، کۆمەکییمان بکەن و ، لـە هـەر شـتێ کـە خۆتـانی لێ ئـەپارێزن ، ئێمەشی لێ بپارێزن .

وتیان : ئەگەر ئەوەمان کرد چیمان بۆ ئەبێ ؟ فەرمووی : ( الجنـة ) . وتیـان : بەسەر چاو .

ئیتر ئەوەبوو بەوپەڕی ئیخلاص و ورە بەرزییەوە ئەنصار هەستان و بەیعـەتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا .. جا ڕاوییەکان لە دیارییکردنی یەکـەم کـەس دا کـە بەیعەتی کردبێ جیاوازییان هەیە .

ئیبن ئیسحاق بە پێی ئەوەی کە لە کـەعبی کـوڕی مالیکـەوە ئەیگێڕێتـەوە ، ئەڵێت : یەکەم کەس بەرائی کوڕی مەعروورە .

نەوەی نەججاریش ئەڵێن : ئەبوئومامە ، ئەسعەدی کوڕی زورارەیە .

ئیبن سەعد لە عەبباسەوە ڕیوایەتی کردووە کە وتوویە : یەکەم کەسێك کە لەو شەوەدا دەستی دا بە دەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەسعەدی کـوڕی زوراره بـوو ، پاشان بەڕائی کوڕی مەعروور ، پاشان ئوسەیدی کوڕی حوضەیر .

نەوەی عـەبدولئەشهەلیش ئەڵێن : ئەبولهەیثەمی کوڕی تەییهانە .

نەوەی سەلیمەش ئەڵێن : یەکەم کەسێك کە لەو شەوەدا بەیعەتی داوە کـەعبی کوڕی مالیکە .

ئەمە بە پێی ئاگاداربوونی راوی‌یەکان دەرئەکەوێت . هەرچەندە ئەمە وەها گرنگ نیە ، بەڵکو گرنگ ئەوە بوو کە ئەنصار توانی‌یان ئەو بەیعەتە بەسەر بەرن .

ئەو دوو ئافرەتەش کە ئامادەی ئەم کۆبوونەوە مێژوویی‌یە بوون ، هەر دووکیان بەیعەتیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڵام تەنها بە قسە ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز تەوقەی لەگەڵ هیچ ئافرەتێك دا نەکردووە .

دوای تەواوبوونی بەیعەت لەسەر ئەو مەرجانەی کە باسیان کردن ، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە خەڵکەکە کرد تا لە نێوان خۆیان دا دوانزە سەرۆك هەڵ ببژێرن ، تا ببنە نەقیبی خزمەکانیان و ، کەفیلی جێبەجێ‌کردنی بەندەکانی ئەو بەیعەتە بن ، بۆیە پێ‌یانی فەرموو : « أخرجوا إلي منكم إثني عشر نقيباً ، ليكونوا على قومهم بما فيهم » .

ئەم کارەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە ئەفەرموێ :

﴿ وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ ٱثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا ۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ ۖ لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ ﴾ ( المائدة : ١٢ ) .

خێرا ئەنصار لە نێو خۆیاندا دوانزە نەقیبیان هەڵ بژارد : نۆیان لە خەزرەج و سیانیشیان لە ئەوس ، کە ئەمە ناوەکانیانە :

**نەقیبەکانی خەزرەج :**

١ ـ ئەسعەدی کوڕی زورارەی کوڕی عەبس .
٢ ـ سەعدی کوڕی رەبیعی کوڕی عەمر .
٣ـ عەبدوڵلای کوڕی رەواحەی کوڕی ثعلبە .
٤ـ رافیعی کوڕی مالیکی کوڕی عیجلان .
٥ ـ بەرائی کوڕی مەعروری کوڕی صەخەر .
٦ ـ عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی حەرام .
٧ ـ عوبادەی کوڕی صامیتی کوڕی قەیس .
٨ ـ سەعدی کوڕی عوبادەی کوڕی دلێم .
٩ ـ مونذیری کوڕی عەمری کوڕی خونەیس .

نەقیبەکانی ئەوس :

١ـ ئوسەیدی کوڕی حوضەیری کوڕی سەماك .

٢ ـ سەعدی کوڕی خەیثەمەی کوڕی حاریث .

٣ ـ ریفاعەی کوڕی مونذیری کوڕی زوبەیر .

هەندێکیش وتوویانە لە جێی ریفاعە ئەبولهەیثەمی کوڕی تەییهان بووە .

کە نەقیبەکان هەڵ بـژێرران جـارێکی تـر پێغەمبـەری خـوا ﷺ پەیـمانی لێ وەرگرتن ، بە ناوی ئەوەوە کە ئەمانە سەرۆکن و لێپرسراوی خەڵکەکەن . ئەوە بوو پێی فەرموون : (( أنتم علي قومكم بما فيهم كفلاء ككفالة الحواريين لعيسى بن مريم ، وأنا كفيل علي قومي )) . فەرمووی : ئێوە کەفیلی خزمەکانتانن بـەو شـێوەی کـە حەواریەکان بوونە کەفیلی خزمەکانیان بۆ عیسـای کـوڕی مەریـەم و ، منـیش کەفیلی خزمەکانم ، واتە موهاجیرەکان . وتیان : بەڵێ .

پاشان پێغەمبەری خـوا ﷺ مـاوەی دان تـا بگەڕێنـەوە شـوێنەکـانیان کـە فـەرمووی : (( ارفضُّوا إلى رحالكم )) ، تا ئەم کۆبوونەوە گرنگە هـەر بـە نهێنیـی بمێنێتەوە .

لە ( زاد المعاد) یش‌دا هاتووە :

کە پەیمانەکە بەسترا و ، خەریك بوو خەڵکەکـە بـڵاوەی لێ بکـەن ، شـەیتانێك پێی زانی ، بەڵام کارەکە لە دوا ساتەکانی‌دا پێی زانـرا و ، ئـەو شـەیتانە فریـای ئەوە نەکەوت سەردارانی قورەیش لەم هەواڵە ئاگادار بکات و ، لـە کاتێـك‌دا کـە هەموویان لەوێ ئامادە بوون ، بدەن بە سەریان‌دا ، بۆیە ئەو شـەیتانە ناچـار بـوو بچێتە سەر شوێنێکی بەرز و ، بە دەنگێکی یەکجار بەرز هاوار بکات :

ئەی دانیشتوانی ئـەم مەنزڵانـە ! ئاگـادارن لـە موحەمـمەد و لـەو لـە دیـن وەرگەڕاوانەی کە وان لەگەڵی‌دا ؟ کۆبوونەتەوە تا بێن بە گژتان‌دا .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هذا أزبُ العقبة ، أما والله يا عدو الله لأتفرغن لك )) . فەرمووی : ئەوە شەیتانی عەقەبەیە . بەخوا ، ئەی دوژمنی خـوا ! خـۆم یەك لایی ئەکەمەوە بۆت . پاشان فەرمانی بەسـەر هـاوەڵانی‌دا دا تـا بـڵاوەی لێ بکەن و بگەڕێنەوە بۆ مەنزڵەکانیان .

کاتێ کە دەنگی ئەو شەیتانە بیسترا ، عەبباسی کوڕی عوبادەی کوڕی نـەضلە وتی : بەو خوایەی کە بە دینی حەق رەوانەی کـردووی ، ئەگـەر پێـت خـۆش بـێ

سبەینێ بە شمشێرەکانمانەوە هێرش ئەکەینە سەر دانیشتوانی مینا . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لم نؤمَر بذلك ، ولكن ارجعوا إلى رحالكم )) فەرمووی : فەرمانی ئەوەمان پێ نەدراوە ، بگەڕێنەوە لای کەلوپەلەکانتان . ئەوانیش گەڕانەوە .

کە ڕۆژ بوویەوە و قورەیش هەواڵەکەیان بیست کە شەو بەیعەتیان داوە ، زۆربەیان هاتنە مەنزڵگای ئەنصار و پێیان وتن : ئەی کۆمەڵی خەزرەج : پێمان گەیشتووە کە ئێوە هاتوون ئەم پیاوەی لای ئێمە لەناومان دەرکەن و ، بەیعەتی بدەنێ تا بێت بە گژماندا . دە بەخوا هیچ هۆزێکی عەرەب ئەوەندەی ئێوە پێمان ناخۆش نیە جەنگ لە نێوانماندا بەرپا ببێ .

لەولاوە حاجییەکانی یەثریب ، کە لەسەر بتپەرستیی مابوونەوە و ، موسڵمان نەبووبوون و ، ئاگایان لە کۆبوونەوە و پەیمانی عەقەبە نەبوو ، کە شەو ئیمانداران لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەستبوویان ، دەستیان بە سوێند خواردن کرد کە شتی وەها رووی نەداوە و ، ئاگایان لێ نیە . ئەوانیش راستیان ئەکرد ، چونکە ئاگاداری هیچ شتێك نەبوون . تا ئەوەبوو بتپەرستەکان هەستان و ، رۆیشتن بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول و ، ئەوەی بە خەزرەجیان وت بەویشیان وت . ئەویش وتی : بەخوا ئەوە کارێکی گەورەیە و ، تا ئێستە خزمەکانم هیچ کارێکی وەهایان بەبێ ئاگاداریی من ئەنجام نەداوە و ، منیش پێ نازانم شتی وەها کرا بێ . ئیتر لای ئەویش هەستان .

ئەم هەواڵە زۆر قورەیشی ناڕەحەت کرد و ، خەم وخەفەت رووی تێ کردن و ، کۆڵیان نەدا و ، کەوتنە دوای هەواڵەکە و ، بە وردیی پرسیاریان دەربارەی ئەکرد ، هەتا ئەوەبوو بۆیان دەرکەوت کە راستە و ، بەیعەتیان داوە ، بەلاّم دوای ئەوەی کە حاجی‌یەکان گەڕابوونەوە بۆ ولاتی خۆیان .. ئەوەبوو کۆمەڵێکیان کەوتنە دوای ئەنصار بەڵکو فریایان بکەون و دەستگیریان بکەن ، بەلاّم لە دەستیان دەر چووبوون و ، تەنها دوو پیاویان بەرچاو کەوتن : سەعدی کوڕی عوبادە و ، مونذیری کوڕی عەمر ، کە هەردووکیشیان لە دوانزە نەقیبەکە بوون . خەڵکەکە بە هیچ شێوەیەك نەیان توانیی مونذیر بگرن ، بەلاّم توانی‌یان سەعد بگرن و، بە لغاوی وشترەکەی خۆی قۆڵ بەستیان کرد و ، بەرەو مەککە گێڕایانەوە و ، لە رێگا دەستیان بە لێدانی کرد و قژیان رائەکێشا ، هەتا گەیاندیانەوە مەککە . لەوێ

هاواری بردە بەر دوو پیاوماقوولی قورەیشیی ، کە پێشتر پەنای کاروانی بازرگانیی هەردووکیانی دابوو ، کە بە مەدینەدا تێپەڕیان ئەکرد ، کە موطعیم ی کوڕی عەدیی ( ئەو پیاوەی کە پەنای پێغەمبەری خوای ﷺ دا کاتێ کە لە طائیف گەڕایەوە ، تا بچێتە ناو مەککەوە ) و حاریثی کوڕی حەربی کوڕی ئومەییە ( واتە برای ئەبوسوفیان ) بوون .. هاواری بردە بەر هەردووکیان و ، ئەوانیش هەردووکیان هاتن و لە ژێر چنگی قورەیش دەریان هێنا و ، بەرەو مەدینە گەڕایەوە ..

بەم شێوەیە ئیمان دارانی مەدینە بەیعەتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا و ، بەڵێنیان پێ دا کە کۆچ بکا بۆ ناویان و وەك چاویان ، خۆی و هاوەڵانی ئەپارێزن .. ئەوپەڕی ئازایەتیی و پاڵەوانێتیی بوو لەو ڕۆژەدا ئەو مەرد و قارەمانانە ئەو بڕیارە ترسناکەیان دا .. چونکە ئەیانزانیی هەموو عەرەب ئەبێتە دوژمنیان ، بەڵام ئەوەندە بە پاکیی ئیمانیان هێنا بوو ، هەموو مەترسییەکیان خستبووە ئەولاوە و ، ئەوەندەش خوا و پێغەمبەریان ﷺ بە دڵ و بە گیان خۆش ئەویستن باکیان لە هیچ هەڕەشەیەك نەبوو .

دوای ئەوەی کە بەڵێنیان دا گەڕانەوە وڵاتی خۆیان تا ئەو ئیمانەیان بە بسەلمێنن .. هەریەکەیان دەستی کرد بە پەروەردەکردنی خۆی و کەس وکاری و، بانگ‌کردنی ئەوانەی کە لێیەوە نزیکن .. بانگی خواناسیی شوێنی شیاوی خۆی دەست کەوتبوو ..

ئەوەبوو چەند گەنجێکی نەوەی سەلیمەش موسڵمان بوو بوون و ، هێشتا عەمری کوڕی جەمووحی سەرداریان موسڵمان نەبووبوو . عەمر بتێکی بە ناوی ( مەنات ) لە تەختەیەکی چاك بۆ دروست کرابوو و ، لە ماڵەکەی خۆیدا دانابوو و ئەیپەرست و ، بە هیچ شێوەیەك دەستبەرداری نەئەبوو . گەنجەکانیش پێیان خۆش بوو ئەم خزمە ناودارەیان هیدایەت وەربگرێ و لە بتپەرستیی ڕزگاری ببێ ، بە تایبەت موعاذی کوڕی و موعاذی کوڕی جەبەل . کە عەمر هەر کۆڵی نەدا ناچار بوون شەو بتەکە هەڵ بگرن و بە دەما بیخەنە چاڵە پیسییەکی نەوەی سەلیمەوە . کە عەمر ڕۆژی لێ بوویەوە و بتەکەی نەدیی ، وتی : ماڵتان کاول بێ ، ئەوە ئەمشەو کێ دەست درێژیی

کردۆتە سەر خواکەمان ؟ چوو گەڕا هەتا دۆزی‌یەوە و ، هێنایەوە ماڵەوە و ، پاك شۆردی و بۆنی خۆشی پێوە کرد و پاشان وتی : بەخوا ئەگەر بزانم کێ وەهای پێ کردووی شەرمەزاری ئەکەم ..

هەرکە ئێوارەی لێ ئەهات و خەوی پیا ئەکەوت ، گەنجەکان تەپیان ئەکوتایەوە سەر مەناتی دەستەپاچە و فڕێیان ئەدایەوە ناو پیسیی و زبڵی گەڕەك و بە جێیان ئەهێشت .. ئەویش بۆ بەیانیی ئەچوو ئەی‌دۆزی‌یەوە و پاکی ئەکردەوە و بۆن خۆشیی لێ ئەدایەوە .

چەندین جار فڕێیان ئەدا و ئەویش ئەی‌هێنایەوە ، تا ڕۆژێکیان لە دەستی بێزار بوو ، بۆیە شمشێرەکەی هێنا و کردیە ملی مەنات و پێی وت : بە خوا من نازانم کێ ئەمەت پێ ئەکا ، ئەگەر خێر و چاکەت تیایە ئەوا بەرگریی لە خۆت بکە و ، با ئەم شمشێرەت بەلاوە بێ ..

کە شەو هات و عەمر خەوی پیاکەوت ، گەنجەکان هەڵمەتیان دایە سەر بتەکە و شمشێرەکەیان لە ملی داکەند و بردیان بە گوریسێك لەگەڵ سەگێکی تۆپیودا پەتیان کرد و خستیانە ناو بیرێکی پیسایی نەوەی سەلیمەوە . کە عەمر لە خەو هەستا دیسان بتەکەی دیار نەبوو و ، کەوتە گەڕان بە دوای‌دا ، هەتا ئەوەبوو لە بیرەکەدا دۆزی‌یەوە و ئەبینێ وا لەگەڵ سەگێکی تۆپیودا پێکەوە خراونەتە ناو بیرەکەوە . کە ئەمەی دیی هۆشی کردەوە ، کە ئەمە بتێکە و هیچ زیان و کەڵکێکی بە دەست نیە و کە هەندێ لە خزمەکانیشی قسەیان بۆ کرد ، موسڵمان بوو بەلاّم چۆن موسڵمانێك و ، سوپاسی ئەوانەشی کرد کە ئەم هەوڵەیان لەگەڵ‌دا دا تا لە بت‌پەرستیی ڕزگاری ببێ . [٢٥٧]

---

[٢٥٧] السيرة النبوية لأبي شهبة : ١ / ٤٤٤ ـ ٤٥٤ ، والرحيق المختوم : ١٥٠ ـ ١٥٧ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ٤١٦ ـ ٤٢٥

## بەشی سیانزەهەم
# کۆڵنەدان و ئارامگرتن

ئەمەی لە پێشەوە باس کرا مێژوو بوو .. مێژووی مرۆڤ ، بە راستەقینە .. لە پێناوی دین‌دا .. مرۆڤەکان شوێنی دین نەکەوتن تا بەرز ببنەوە .. تێر بن .. دەوڵەمەند بن .. ببنە کاربەدەست .. نەخێر .. مرۆڤەکان دی‌یان دین بریتی‌یە لە رێگای راست تا مرۆڤ لە خوا نزیك بکاتەوە .. تا خوای پێ بناسێنێ .. تا لە تاریکیی و گومڕایی رزگاری بکات .. بەڵام ئەمەی بە هەوانتە دەست نەئەکەوت ..

هەر مرۆڤێ بیری لەوە ئەکردەوە کە شوێنی ئیسلام بکەوێ تا خوای گەورەی پێ بناسێنێ و ، فێری بکا چۆن خوا لە خۆی رازیی بکا ، ئەی‌دیی گەیشتن بەم ئاواتە زۆر سەختە .. ئەم رێگایە قوربانیی ئەوێ .. ئەبێ لەناو کۆمەڵ‌دا سووك و رسوا ببێ .. ئەبێ لەلای خزم و کەس وکاری بێ‌نرخ و بەها دەرچێ .. دواجار ئەبێ ژیانی خۆی و ماڵ و منداڵی بخاتە ئەولاوە ..

هاوەڵانی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ و خوا لەوانیش رازیی بێ ، ئەمەیان چاك ئەزانیی ، بۆیە تەنها ئەوانە شوێنی ئیسلام ئەکەوتن کە دەستیان لە خۆیان شۆرد بوو .. هەروەها لە مێژووی دوور و درێژی ئیسلامیش‌دا کەسانێکی زۆر بە راستیی و پاکیی خەریکی رازیی‌کردنی خوای گەورە ئەبوون و ، باکیان لە هیچ کەس نەبوو و ، لە هیچ هێزێکیش سڵیان نەئەکردەوە و ، لە سەر خزمەتی خۆیان بەردەوام ئەبوون و تا دوا دڵۆپی خوێن دامەزراو ئەبوون ..

کاتێك کە مرۆڤ بە ویژدانەوە و ، دوور لە لایەنگیریی سەرنجی ئەم قوربانیی دانە ئەگرێت و ، بەراوردیشی لەگەڵ سیاسەتی فشەڵی خوانەناسان ئەکات سەری سوڕ ئەمێنێ :

بۆچیی هەڵگرانی ئیمان وەها دامەزراون و ، بۆچیی هەڵگرانی سیاسەت و بەرژەوەندیی و چەواشەش ئەوەندە دەستەپاچە و بێ‌هەڵوێستن ؟

بە سەرنج‌دانی ئەو نموونە بەرزانە کە ئیمان‌داران تۆماریان کردوون چەند خاڵێك دێنە بەرچاو ، کە غیرەت بخاتە بەر ئیمان‌داران تا بەرگەی ئەو سزا سەختە بگرن کە بە بیستنی مووچڕکە بە لەش‌دا دێت و دڵ دێنێتە لەرزین :

**یەکەم : ئیمان بە خوا :**

هۆی بنەڕەتیی و سەرەکیی دامەزراویی موسڵمانان ئەگەڕێتەوە بۆ ئیمان بوونیان بە بوون و بە تاك و تەنیایی خوای گەورە و ، ناسینی بە هەموو ناو و سیفەتێکیەوە ، بە رادەیەك کە ئیمان‌دار بۆی دەربکەوێ هێز و توانا و زانستی خوای گەورە بێ‌سنوورە ، بەم بۆنەوە زۆری خۆش بوێ و ، زۆریش لێی بترسێ ..

بەڵێ ، کە ئیمان لەناو کرۆکی دڵ‌دا جێی بۆوە لە چیاکان سەنگین تر ئەبێ و، غیرەتێکی وەهاش ئەخاتە بەر خاوەنەکەیەوە کە هەرچیی مەینەت و ناڕەحەتیی دنیا هەیە هەمووی بەلاوە ئاسان بێت .. بەمە هێزی ئیمان هێزێکی ناوازەیە و ، بێ‌ئیمانان هەرگیز شتی وەها بە خۆیانەوە نابینن ..

هەر لەم هۆیەوە ، کە بە سەرەکیی ئەژمێررێت ، هۆیەکانی تریش ئەکەونە پێش چاو و ، ئەوانیش دامەزراویی و ئارامی ئیمان‌دار زیاتر ئەکەن ..

**دووهەم : پایەداریی پێغەمبەری خوا :**

پێغەمبەری خوا ﷺ کە وەحیی بۆ هاتبوو و ، دینی خوای بە مەردومەکان ئەگەیاند ، فەرماندە و پێشەنگێك بوو کە دڵەکان شەیدای ئەبوون .. پێشەوایەك بوو کە خۆشەویستی‌یەکەی بێ‌وێنە بوو ..

بەڵێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرماندەی گشتیی ئوممەتی ئیسلام ، بگرە گرۆی ئادەمی‌یە ، خاوەنی رەوشتێکی بەرز و جوان و ، دەروونێکی پاك و بێ‌گەرد و ، هەڵگری هەرچیی سیفەتی جوانی مرۆڤانە بوو ، کە دڵەکانی کەمەندکێش ئەکرد و ، مرۆڤە بەڕێزەکانیش خۆیان بە قوربانی ئەکرد .. ئەوەندە بەرز و بەڕێز بوو .. ئەوەندە چاکەکار و پاك‌داوێن و ، دەست‌پاك و ، راستگۆ بوو ، هەرکەسێ ساتێك لەگەڵی‌دا بژیایە شەیدای ئەبوو و ، ئەو کەسەش کە بەقەد هەموو دنیا رقی لێی ئەبوویەوە ، هەر بەوەی دەستی پیرۆزی ئەخستە سەرسنگی ئەو کەسە ، یەکسەر ئازیزی بەلاوە ئەبووە خۆشەویست‌ترین کەس .. نەك هەر دۆستانی ، بەڵکو دوژمنانیشی ناچار بوون دان بە سیفەتە بەرزەکانی‌دا بنێن و ، ستایشی بکەن ، بگرە بۆ دوعا و پاڕانەوەیەکی هەموو حیسابێکیان بۆ ئەکرد ..

لە باسەکانی پێشەوە بۆمان روون بوویەوە کە پیاوماقوڵانی قورەیش بڕوایان بە راستگۆیی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبوو ، بەڵام هەوای نەفس رێی پێ نەئەدان ئیمان بهێنن . بە تایبەت ئەو سیانەی کە بە شەودا بە نهێنیی خۆیان لە پشت دەرگا و پەنجەرەی ماڵی پێغەمبەرەوە دائەشارد و گوێیان لەو قورئانە بەلەزەتە ئەگرت کە ئازیز لە شەونوێژییدا ئەیخوێند . بە شەودا شەیدای بوو بوون و بە رۆژیش گاڵتەیان پێ ئەکرد .

هەتا ئەبوجەهل ئەیوت : ئەی موحەممەد! ئێمە تۆ بە درۆزن نازانین ، بەڵام بڕوا بەوە ناکەین کە هێناوتە . ئەوەبوو قورئانی پیرۆز لە وەڵامی ئەو وتەیەدا هاتە خوارەوە :

﴿ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ ( الأنعام : ٣٣ ) .

جارێکیان کافرەکان سێجار تانە و تەشەریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دا ، ئەویش لە سێهەم جاردا فەرمووی :

(( يا معشر قريش ! جئتكم بالذبح )) . ئاگاداری کردن کە ئەم کارێکی هێناوە ئەگەر شوێنی نەکەون ئەوا تیاچوون بەشیانە . کە ئەوەی فەرموو ، هەموو تێ گەیشتن کە ئەو لە خۆیەوە قسە ناکات و ، ئەو فەرموودەیەی جێبەجێ ئەبێت .

کاتێکیش کە ورگ و ریخۆڵەی وشتریان خستە سەر شان و ملی و ئەویش لە سەجدەدا بوو ، ئەوەبوو دوعای لێ کردن ، ئەوانیش یەکسەر پێکەنینیان نەما و ، خەم و دڵەتەپێ سەری لێدان و ، بە یەقینیی ئەیانزانیی کە بەو دوعایەی تیا ئەچن .

ئەوەبوو دوعاشی لە عوتبەی کوڕی ئەبولەهەب کرد ، لەسەر ئەو بێئەدەبیەی کە کردی ، لەو رۆژە بەدواوە عوتبە ئەترسا ئەو دوعایەی گیرا ببێ ، کاتێک چاویشی بە شێرەکە کەوت وتی : بەخوا موحەممەد لە مەککەیە و منی لێرە کوشت !!

ئوبەی کوڕی خەلەفیش کە ملهوڕێکی قورەیش بوو ، هەموو جارێك هەڕەشەی کوشتنی لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکرد ، کەچیی ئازیز فەرمووی : (( بل أنا أقتلك إن شاء الله )) . فەرمووی : إن شاء الله من تۆ ئەکوژم . کاتێك کە لە جەنگی ئوحوددا پێغەمبەری خوا ﷺ دای لە ملی ئوبەی ـ کە رووشانێکی گەورە نەبوو ـ

ئوبەی ئەیوت : هەر خۆی لە مەککە پێمی وت : من تۆ ئەکوژم . دە بەخوا ، ئەگەر تفێکم تیٚ بکات ئەوا ئەمکوژێ ..

سەعدی کوڕی موعاذیش ـ کاتێك کە لە مەککە بوو ـ بە ئومەییەی کوڕی خەلەفی وت : لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە کە ئەیفەرموو ئەوان ـ واتە موسڵمانەکان ـ ئەتکوژن . ئومەییە زۆر ترسا و بڕوای کرد ، بۆیە بڕیاری دا کە هەرگیز لە مەککە دەرنەچێت . بەڵام کە لە ڕۆژی بەدردا ئەبوجەهل ناچاری کرد لە مەککە دەرچێ و بکەوێتە گەل لەشکری قوڕەیش ، چوو چاکترین وشتری کڕیی ، تا لە کاتی لێقەوماندا بتوانێ لە مەیدانی جەنگ هەڵ بێت . هەتا ژنەکەشی پێی وت : ئەبوصەفوان ! ئەوە تۆ لەبیرت چوویەوە کاکەی یەثریبییت چیی پێ وتی ؟ وتی : نا بەخوا ، تەنها ئەمەوێ بە دوایانا بڕۆم .

ئەمە دوژمنەکانی بوون ئاوەها حیسابیان بۆ ئەکرد ، بەڵام هاوەڵان و دۆستانی ، هەر هەموو گیان و چاو و دڵیان ئەکردە قوربانی .. دایك و باوکیان ئەکردە قوربانی .. ئەوەندەیان خۆش ئەویست ، لە مێژوودا شتی وەها دووبارە نەبۆتەوە .. لە ئەنجامدا ئەو کارە مەزنەیان لە مێژوودا ئەنجام دا ، چونکە بە ڕاستیی پێیان خۆش بوو لە گەردنی خۆیان بدرێ ، بەڵام دڕکێك بەودا نەچەقێ و ، نینۆکێکی زامدار نەبێت .. ئەمەش بە کردەوە سەلماندیان .. خۆیان ئەکردە قەڵغان بۆ پاراستنی ..

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە ئەو ڕۆژەی بتپەرستەکان ئەوەندەیان لە ئەبوبەکر دا هەتا بە بێهۆشیی بردیانەوەماڵەوە ، کە چاوی کردەوە هەواڵی پێغەمبەری خوای ﷺ پرسیی . تامی هیچی نەکرد تا بەو هیلاکییە چووە خزمەتی و بە چاوی خۆی دیی وا ئازیزەکەی ساغ و سەلامەتە .

خوا کۆمەك بێت لە ژیانی مەدینەدا غیرەتی هاوەڵان و خۆشویستنی پێغەمبەریان ﷺ بە درێژە باس ئەکەین . بەڵام ئێستا تەنها یەك نموونە باس ئەکەین :

ئیبن عەساکیر لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە تەخریجی کردووە کە وتویە: یەکەم کەسێك کە لە ڕێی خوادا شمشێری لە کێلان دەرهێنابێ زوبەیری کوڕی عەووام بووە ، خوای لێ ڕازیی بێ . ئەوەبوو ڕۆژێکیان لە ماڵەوە بۆ خەوی قەیلوولە ڕاکشابوو ، لە ناکاو ئەم دەنگەی بەرگوێ کەوت : پێغەمبەری خوا ﷺ

کوژراوە . بە پەلە دەرپەڕیی و شمشێرەکەشی لە کێلان دەر کێشا بوو ، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ تووشی بوو کە شمشێرەکەی بەرز کردبۆوە و ، فەرمووی : (( ما لَكَ يا زبير ؟ )) . فەرمووی : زوبەیر ئەوە چیتە ؟ وتی : ئەوە کەوتە بەرگوێم کە تۆ کوژراویت . فەرمووی (( فما أَردت أن تصنع ؟ )) . فەرمووی : جا ویستت چیی بکەی ؟ وتی : بەخوا ویستم دەست بە کوشتاری دانیشتوانی مەککە بکەم و لە کەس نەپرسمەوە . پێغەمبەر ﷺ دوعای خێری بۆ کرد .. شایانی باسە کە زوبەیر کوڕی صەفیەی کچی عەبدولموطەللیب بووە ، واتە پوورزای پێغەمبەری خوا بووە.

**سێهەم : هەست کردنی هاوەڵان بە لێپرسراویی :**

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە سەرنجی پەیامی ئیسلامیان دا ، لەوە گەیشتن کە ئەم کارە سپاردەیەکی یەکجار مەزنە و ، بەختەوەریی مرۆڤایەتیی لە هەردوو ژیاندا بەستراوە بە دینە پاك و بێگەردەکەی خواوە . بۆیە زۆر بە پێویستیان ئەزانی شان بدەنە بەر زەحمەت و مەینەت و ، باکیان لە هیچ نەبێت ، هەتا ئیسلام بە مرۆڤایەتیی بگەیەنن و ، بە چاکترین شێوە ، بۆ رەزامەندیی پەروەردگار ، ئەرکی سەرشانیان ئەنجام بدەن . چونکە هەر کەسێ لەو لێ پرسراوییەی قیامەت تێ گەیشت ، ئیتر ناتوانێ خۆی لە کارکردن و خزمەت کردن لا بدات ، هەر لەبەر ئەوەی کە سەرنجامی خۆلادان زۆر ترسناکە و ، ئەو زیانە زۆرەی کە لە مرۆڤایەتیی ئەکەوێ ، چ لە موسڵمانان و چ لە ناموسڵمانانیش ، زۆر لەوە زیاترە کە یەکێك یان کۆمەڵێك خۆیان لە مەینەت و سزا لا بدەن .. بەبۆنەی ئەم تێگەیشتنەوە هاوەڵان بوو بوونە خاوەنی ورەیەکی یەکجار بەرز و ، قەناعەتیان کردبوو کە مردن لەو پێناوەدا زۆر زۆر ئاسانترە لە کۆڵدان و خۆلادان لە خزمەت ..

**چوارەم : ئیمان هێنان بە قیامەت :**

ئەمیش کارێکی یەکجار گەورەی کردبووە سەر دڵ و دەروونی ئیمانداران ، چونکە یەقینیان هەبوو کە دوای مردن زیندوو ئەکرێنەوە و ، لەبەر دەمی خوای پەروەردگاردا ئەوەستێنرێن و ، موحاسەبە ئەکرێن و ، ئەو رۆژە دڵسۆزان و نییەت پاکان پاداشتی خزمەتەکەیان وەرئەگرنەوە و ، سەربەرزیی بۆ سەرفرازانی ئەو رۆژەیە . هاوەڵان لەلایەکەوە بە تەمای رەحمی خوا بوون و ، لە لایەکیشەوە لە سزای سەختی زۆر ئەترسان ، وەك قورئان وەصفیان ئەکات :

﴿ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَٰجِعُونَ ﴾ ( المؤمنون : ٦٠ ) ، چونکه ئەیانزانیی کە دنیا بە خۆشیی و ناخۆشی‌یەوە و ، بە ئازار و ناز و نیعمەتیەوە ، لە چاو قیامەتدا ، باڵە مێشوولەیەك ناژێ ، بۆیە هەموو سزا و ئازارێکیان بە لاوە ئاسان بوو و ، باکیان لێی نەبوو .

پێنجەم : **بەرەکەتی قورئانی پیرۆز :**

لەو بارودۆخە ناهەموارەی مەککەدا کە هاوەڵان لەژێر سزا و ئازاردا ئەتلانەوە، سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز ئەهاتنە خوارەوە و بەڵگەی رێك و پێکیی ئیسلامیان ئەسەلماند و ، ئامۆژگاریی موسڵمانانیان ئەکرد ، هەتا دان بە خۆیانا بگرن و ، لەسەر رێبازی خۆیان دامەزراو بن ، چاو لە ئیمانداره پێشینەکان بکەن کە بە هیچ شێوەیەك کۆڵیان نەئەدا و ، بەرگەی سەختترین سزایان ئەگرت .. بۆ نموونە :

قورئانی پیرۆز ئەیدا بە گوێی ئیمانداراندا : ئەی کۆمەڵی ئیماندار ! ئەگەر بە تەمان بچنە بەهەشت ، سەرنجی موسڵمانەکانی لەمەو بەر بگرن ، کە چۆن نارەحەتیی و سزا و ئازار بەشیان بوو .. سەرکەوتنی خوا ئەوەندە دوا ئەکەوت ، خەریك بوو ئارام و وزەی ئیمانداران تەواو ببێ ، هەتا پێغەمبەری مژدەدەریان بە سەرسوڕمانەوە لەگەڵ ئیمانداراندا پرسیاریان ئەکرد کە سەرکەوتنی خوا کەی دێت ؟ خوای گەورەش بەڵێنی ئەدا کە سەرکەوتنی خوا نزیکە :

﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴾ ( البقرة : ٢١٤ ).

هەروەها قورئانی پیرۆز بەسەر سوڕمانەوە پرسیاری ئەکرد : ئایا خەڵکیی ئەیانەوێ تاقی نەکرێنەوە و ، لەسەر دینی خوا سزا و ئازار نەچێژن ، بەڵکو هەر ئەوەندە بڵێن : ئیمانمان هێنا ، ئیتر کاری سەرشانیان تەواو بێت ؟ نەخێر ، ئەوانەی پێشی ئەوان هەر هەموو تاقیی کراونەتەوە تا ئیمانداران و راستگۆیان بناسرێن و ، درۆزن و بەرژەوەندیی‌بازانیش هەر بناسرێن :

﴿ الٓمٓ ۝١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ۝٢ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾ ( العنكبوت : ١ ـ ٣ ) .

لە هەمان کات‌دا قورئانی پیرۆز ئەهات و پەرچی هەڵە و نەزانیی کافران و مل هوڕانی ئەدایەوە و ، قسەی ئەبڕین . لە هەمان کات‌دا هەڕەشەی لە ئەنجامی هەڵوێستی خوار و خێچیان ئەکرد و سەرەنجامی کافرانی ئوممەتە پێشینەکانی ئەخستە بەر چاویان و تێی ئەگەیاندن با ئەوانیش بە تەمای هەمان چارەنووس بن، ئەگەر لە کەلی شەیتان دانەبەزن و ئیمان نەهێنن . هەروەها سەربەرزیی دنیا و قیامەتی ئیمان‌دارانیشی ئەخستە پێش چاویان . ئیتر با باسی خۆشیی و رابواردنی بەهەشت بۆ ئیمان‌داران و خواناسان و ، سەختیی و نالەباریی سزا و ئازاری دۆزەخ بۆ کافران و سەرپێچیی‌کەران لەولاشەوە بووەستن ..

**شەشەم : مژدەکانی سەرکەوتن :**

هەرچەندە موسڵمانەکان لەوپەڕی بێ‌دەستیی و کەم‌هێزیی‌دا بوون ، بەلاّم هەر لە یەکەم رۆژەوە ئەوەیان لا روون بوو کە موسڵمان‌بوون بریتیی نیە لە گەیاندنی سزا و ئازار بۆ موسڵمانەکان ، چونکە ئەو سزا و ئازارە تەنها بۆ تاقیی‌کردنەوەیە و هیچی تر .. بەڵکو هاتنی ئیسلام بۆ رزگارکردنی مرۆڤە .. بۆ لەناوبردنی هەموو بەزم و باوێکی نەفامی‌یە .. بۆ وەرگرتنی دەسەلاّتە لە مل‌هوڕان ، تا چاك‌ویستان کاروبار بە دەست بگرن و ، تێکڕای مرۆڤایەتیی بحەسێتەوە و ، پەروەردگار رازیی بکرێت و ، بەندەکانی خوا فێری ئەوە بکرێن کە پێویستە مل‌کەچی‌یان تەنها بۆ خوا بێت ..

قورئانی پیرۆز کە ئەهاتە خوارەوە مژدەی سەرکەوتنی ئەدا .. ئەبێ چاك ویستان سەر بکەون .. خێر و چاکە ئاواتی مرۆڤی بەرێزە .. مرۆڤی چاك ویست چارەی زوڵمی ناوێ .. مێژووی مرۆڤایەتیی بریتی‌یە لە زۆران‌بازیی حەق و ناحەق و ، سەرەنجامیش هەمیشە بۆ پیاوچاکانە .

بەڵێ ، لە رۆژانی سەختی مەککەدا کە موسڵمانەکان گیریان خواردبوو ، ئەو ئایەتانە ئەهاتنە خوارەوە کە باس لە زۆران‌بازیی نێوان پێغەمبەران و گەلەکانیان ئەکەن کە چۆن ئەو بەرێزانەیان ئازار ئەدان و ، بە درۆیان ئەخستنەوە ، کەچیی لە ئەنجام‌دا سەرکەوتنی خوا پێشکەش بە خواناسان ئەکرا و ، کافران و زاڵمانیش سەرشۆڕ و خەجالەت ئەبوون و ، بە سوکیی سەریان ئەنایەوە و ، سەرزەویی ئەبووە موڵکی خواناسان ..

ئەم چیرۆکانە هەردوو لای تێ ئەگەیاند کە ئەی خواناسان مژدە بێت و ، ئەی کافرانیش تیاچوون و سەرشۆڕیی بەشتانە .

بۆ نموونە : لەم چەند ئایەتەدا خوای گەورە باسی ئەو بەڵێنەی خۆی ئەکات کە بە ئیمان دارانی داوە ، کە سەربازانی خوا سەرفراز ئەبن و ، خوانەناسانیش دەربازبوونیان بۆ نیە :

﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾ ( الصافات : ١٧١ ـ ١٧٧) .

﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴾ ( القمر : ٤٥ ) .

﴿ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴾ ( ص : ١١ ) .

دەربارەی کۆچ کەرانیش بۆ حەبەشە ئەفەرموێ :

﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾ ( النحل : ٤١ ) .

کافرەکانی مەککە داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد هەتا چیرۆکی یووسف پێغەمبەریان سەلامی لێ بێ بۆ باس بکات ، ئەوەبوو سوورەتی یووسف هات و ، دای بە گوێی هەموان‌دا کە چۆن براکانی یووسف خەجاڵەت بوون و بەبێ دەسەلاتیی گەڕانەوە بەر دەست یووسف ، ئەوا هەموو ستەم کارێکیش وەها خەجاڵەت ئەبێ ، بە تایبەت دانیشتوانی مەککە کە بە ناڕەوا سزای ئیمان‌دارانیان ئەدا و ، ژیانیان لێ تاڵ کردبوون .

هەروەها وەك چەرخەکان و شوێنەکان بێن بە یەك ، وت و وێژێکی نێوان کافران و پێغەمبەرەکانیان بە گشتیی ، باس ئەکات .. کافرەکان روو لە پێغەمبەرەکانیان ئەکەن و ، دوو رێگایان بۆ دائەنێن : یان ئەوەتا واز لەو دینە بهێنن کە بانگەوازی بۆ ئەکەن و ، بگەڕێنەوە سەر دینی ئەوسایان ، یان ئەوەتا لە وڵات دەرئەکرێن و ، پێویستە ئەو شوێنە بەجێ بهێڵن ..

دیارە پێغەمبەران سەلامیان لێ بێ ناتوانن لە بەر دوو رۆژ ژیانی ئەم دنیایە دەست لە دین هەڵ بگرن و ، خوای پەروەردگار برەنجێنن و ، خۆیان خەجاڵەتی قیامەت بکەن ، لە هەمان کاتیش‌دا کە مل‌هوڕان دەستیان لێ ئەوەشێنن و شاربەدەریان ئەکەن ، ئەوان دەسەلاتێکیان نیە ، لەبەر ئەوە خۆیان ئەدەنە دەست ئەو خوایەی کە ئەوانی بۆ ئەو کارە هەڵ بژاردووە . لێرەدا سۆزی پەروەردگار

ئەبزوێ و ، فریای بەندە گوێڕایەڵەکانی ئەکەوێ و ، وەحی بۆ پێغەمبەران دێت و بڕیاری ئاسمان ئاشکرا ئەکات کە ستەمکاران تیا ئەچن و ، لە جێی ئەوان دا خوای گەورە ئیمانداران نیشتەجێ ئەکات ، بەو مەرجەی ئیمانداران ترسی خوا و هەڕەشەی قیامەتیان بە چاکی لە دڵدا بێت :

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴾( ابراهيم: ١٣ ـ ١٤).

هەتا پێغەمبەری خواش ﷺ مژدەی سەرکەوتنی موسڵمانانی ئەدا ، بە تایبەت لە وەرزی حەج دا ، وەك مژدەی بەهەشتی ئەدانێ ، ڕاستەوخۆ مژدەی دەسەڵاتی دنیاشی پێ ئەدان ، کە ئەیفەرموو :

(( يا أيها الناس! قولوا : لا إله إلا الله تفلحوا ، وتملكوا بها العرب ، وتدين لكم بها العجم ، فإذا متم كنتم ملوكاً في الجنة )) . رواه الترمذي .

خەبابی کوڕی ئەرەتتیش مژدەیەکمان بۆ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کە لە سێبەری کەعبەدا شانی بەسەر عەباکەیدا دادابوو و ، ئێمەش بە دەست موشریکەکانەوە زۆر ناڕەحەت بووبووین .. وتم : ئایا لە خوا ناپاڕێیتەوە ؟ ئەویش دانیشت و ، دەم و چاویشی سوور بووبوویەوە و ، فەرمووی : (( لقد كان من قبلكم ليمشط بأمشاط الحديد ما دون عظامه من لحم وعصب ، ما يصرفه ذلك عن دينه ، وليتمنَّ الله هذا الأمر ، حتى يسير الراكب من صنعاء إلى حضرموت ما يخاف إلا الله . زاد بيان الراوي : والذئب على غنمه . وفي رواية : ولكنكم تستعجلون )) . رواه البخاري : ١ / ٥١٠ .

مژدەی سەرکەوتن و ئاسایش و ئاشتیی و خۆشگوزەرانیی .. کەواتە سزا و ئازار کاتیین و ، ئەوەندە ناخایەنن ..

ئەمانە هەندێك بوون لەو هۆیانەی کە بووبوونە مایەی هێز و وزە و ورە و دامەزراویی بۆ کۆمەڵی ئیماندار ، خوای گەورە دڵ و دەروونی ئێمەش وەها دامەزراو بکات ، تا کاری پیرۆزی سەرشانمان ئەنجام بدەین و ، خوای گەورە لە سەربەرزیی دنیا و قیامەت بێبەشمان نەکات ...[258]

---

[258] الرحيق المختوم : ١٢٠ ـ ١٢٦ .

## بەشی چواردەهەم
# کۆچ کردن بۆ مەدینە

کۆچ کردن ، لە راستییدا کارێکی گران و ناڕەحەتە و ، مرۆڤ ئاواتی بۆ ناخوازێ ،.بەڵکو پێی خۆشە لە ولات و مەڵبەندی خۆیدا سەربەست بێ و بحەوێتەوە .. خەریکی کار و کاسپیی خۆی و بەرژەوەندییەکانی بێت . چونکە کۆچ کردن بریتییە لە دەست هەڵگرتن لە هەموو بەرژەوەندییەك و ، تووشبوونی زەرەر و ، لە دەستچوونی ماڵ و سامان ، بە هیوای خۆ دەرباز کردن بە رووت و قووتیی ، تا ناحەزان دەست بەسەر خانووبەرە و کەل وپەل و زەوییوزاردا بگرن و، دەستیش بەسەر دڵیانا بهێنن بۆ دەرپەڕاندنی کۆچ کەر .. جاری واش ئەبێ کۆچ کەر لە رێگا تیا بچێ ، یان تووشی دەست کورتیی و نەبوونیی ببێ ، چونکە بەرەو دوا رۆژ و چارەنووسێکی نادیار ئەڕوات و ، نازانێ چ مەینەت و خەم وخەفەتێکی دێتە رێ .

هۆی کۆچ کردنیش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو سزا و ئازارەی کە زاڵمان بە ئیمان دارە لاوازەکانی ئەچێژن و ، ناچار لەبەر بەرگەنەگرتن ، ناچار ئەبن ولات بەجێ بهێڵن و، چاوەڕوان بن خوا دەروویان لێ بکاتەوە و ، لە شوێنێکی ئەمین و ئەمان دا خۆیان ببیننەوە .

ئەوەبوو ئیمان دارانی مەککەش لەلایەن قورەیشەوە تەنگیان پێ هەڵ چنرابوو و، سزا و ئازاریشیان لە رادە دەرچوو بوو ، بۆیە هەندێکیان کۆچی یەکەمی حەبەشەیان کرد و ، پاشانیش کۆچی دووهەم هەندێکی تریان کردیان .

دوای ئەوە خوای گەورە کۆمەکیی و پشتیوانیی تازەی نارد . لە مەدینەوە ، لە هۆزی ئەوس و خەزرەج ، دەیان پیاوی مەرد و قارەمان هاتن و ، بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتن و ، ئیمانیان هێنا و ، بەیعەتیان دا و ، بەڵێنی پاراستنی دینی ئیسلامیان دا .. بەڵێنیان دا پێغەمبەر و هاوەڵانی وەك چاویان بپارێزن .. با هەموو دنیا ببێتە دوژمنیان ، رێگای راستیان دۆزیوەتەوە و ، دەستبەرداری نابن ..

بە بیری کەس‌دا نەئەهات وەها بەو شێوەیە و بە کۆمەڵ دانیشتوانی مەدینە ئیمان بهێنن و ، لەو ئیمان‌هێنانەشیان‌دا ئەوەندە راستگۆ دەرچن و ، بەو شێوە بێ‌وێنەیە قارەمان و چاونەترس دەرچن ..

ئەمڕۆش لەسەر زەویی‌دا موسڵمانان بێ‌نازن .. هەموویشی ئەگەڕێتەوە بۆ گێلیی خۆیان .. زۆر و زەبەندە ، بەڵام گێژ و خەڵەتاو .. هەر مونافیقێك دوو قسەی لووسی بۆ کردن خێرا شوێنی ئەکەون و ، پێشەوای خەم خۆر و نەخشەکێش ناناسن .. ئیمامی رەببانیی نادۆزنەوە .. بەڵام هاکا رەحمی خوایان فریا کەوت و، دەرووی لێ کردنەوە و ، گەڕانەوە سەر راستە شەقام و ، کەوتنەوە گەل قافڵەی ئیمان و ، وازیان لە دروشمە ساختە دەستبڕەکان هێنا .. هاکا خوای بەسۆز هۆی رزگاریی بۆ ناردن ، دیارە دوای خۆچاك‌کردن ، کە شیاوی یارمەتیی خوا بن ..

بەڵێ ئیمان‌دارانی مەککە خوا دەرووی لێ کردنەوە .. چونکە قۆناغی پەروەردەی مەککەیان تەواو کردبوو و بووبوونە خاوەنی ئیمان و تەقوایەك کە شیاو بن ببنە هەڵگری قورئان و ، پێشەوای موسڵمانان .. ئەم ئیمان‌دارانە خوای گەورە برای دڵسۆزی بەوەفای بۆ گەیاندن تا لە مەدینەدا بناغەی دەوڵەتێکی ئیسلامیی دابمەزرێنن ..

بۆ ئەم کارە ئێش و ئازارێکی زۆر بە بت‌پەرستەکانی مەککە گەیشت و ، زۆریان بەلاوە گران بوو دینی ئیسلام لە مەدینەدا بنکەی هەبێت ، بۆیە زیاتر لە جاران سزا و ئازاری موسڵمانەکانیان ئەدا و ، بە تەواوەتیی تەنگیان پێ هەڵ چنین ، بۆیە جگە لە کۆچ‌کردن هیچ چارەیەکی تریان بۆ نەمابوویەوە ..

لە لایەکەوە مەککە ، بە بۆنەی دژایەتیی قورەیشەوە ، کەڵکی ئەوەی پێوە نەمابوو ئیسلامی تێدا بلاو بکرێتەوە و ، ئەوەی تێدا مابوویەوە بە هیچ شێوەیەك بیری لە موسڵمان‌بوون نەئەکردەوە .. لەولاشەوە ئیمان‌داران ، لە مەدینەدا خوشك و برای چاکیان دەست کەوتبوو و ، بە کۆمەڵ ئیمانیان ئەهێنا و ، چاوەڕێ ئەکرا کە مەڵبەندێکی بێ‌وێنەی لێ دروست ببێ بۆ گەشەکردن و بلاوبوونەوەی ئیسلام .. بۆیە ، سەرەڕای ئازار و سزاش ، پێویست بوو مەدینە لە بریی مەککە بکرێتە مەڵبەندی پەخشی بانگەوازی قورئان ..

هەموو جارێ کە قورەیش سزای موسڵمانەکانیان ئەدا ، موسڵمانەکان هاواریان ئەبردە بەر پێغەمبەری خوا ﷺ تا چارەیەکیان بکات . ئەویش بە سنگی فراوانەوە

ئامۆژگاریی ئەکردن ، تا دان بە خۆیان‌دا بگرن و پەلە نەکەن ، تا خوا دەروویان لێ بکاتەوە ..

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەوی‌دا ئەوەی دیت کە لە مەککەوە کۆچی بۆ ولاتێك کردبوو کە دارخورمای تێدا بوو . ظەننیشی بۆ ئەوە رۆیشت کە ئەو ولاتە یەمامە یان هەجەر [٢٥٩] بێت ، پاشان بۆی دەرکەوت کە ئەو شوێنە مەدینەیە . لە صەحیحی بوخاریی‌دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویە : (( أُريتُ دار هجرَتِكُم ذات نخل بين لابتين )) . وهما الحرتان . فەرموویە : ئەو شوێنەم پیشان دراوە کە کۆچی بۆ ئەکەن ، ولاتێکە دارخورمای هەیە و کەوتۆتە نێوان دوو ( لابە ) یان ( حەڕڕە ) وە ، کە بریتیین لە زەوی‌یەك بە بەردی رەشی کلۆر داپۆشرابێت .

دوای بینینی ئەم خەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە شادمانی‌یەوە هاتە دەرەوە ناو هاوەڵەکانی و فەرمووی : (( قد أُريتُ دارَ هجرتكم وهِي يثرب ، فمَن أَرادَ أَن يَخرُجَ فَلَيَخرُج إليها )) . فەرمووی : ئەو شوێنەم پیشان دراوە کە کۆچی بۆ ئەکەن ، یەثریبە . جا کێ پێی خۆشە با کۆچ بکا بۆی . هەروەها فەرمووی : (( إن الله عز وجل قد جعل لكم إخواناً وداراً تأمنون بها )) . فەرمووی : خوای گەورە برا و مەنزڵی باشی بۆ گەیاندوون تا تیایا بە ئەمینیی بحەسێنەوە .

ئەم ماوەدانەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە دڵی هاوەڵان بوو ، چونکە ساڵەهای ساڵ بوو بە دەست قورەیشەوە گیریان خوارد بوو ، بۆیە خێرا دەستیان دایە کۆچ کردن .. هەندێ بە ئاشکرا وەك عومەر و هاوەڵانی و ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومیی و ، هەندێکیش بە نهێنیی کە ئەوانە بێ‌کەس و بێ‌دەستەکان بوون ، لە لاواز و بەندەکان وەك صوهەیب و ، زۆرێکیش لەوانەی کە کۆچیان بۆ حەبەشە کردبوو ، گەڕانەوە مەککە و ، پاشان لەوێوە بۆ مەدینە کۆچیان کرد .

جا ئەگەر لە کاتی ئەم کۆچ کردنە ورد ببینەوە ، ئەوا بۆمان دەرئەکەوێ کە دوای بەیعەتی یەکەمی عەقەبە و ، ساڵێك پێش بەیعەتی دووهەمی عەقەبە

---

[٢٥٩] یەمامە : ناوچەیەکە لە نەجدی دوورگەی عەرەبیی و ، هەجەریش : ناوچەیەکە لە بەحرەین و ، ولاتی هۆزی عەبدولقەیس ە ، کە بۆ موسڵمان بوون پێش هەموو ناوچەکانی تر کەوتن .

بووە، ئەویش بە پێی چیرۆکی کۆچ کردنی ئەبوسەلەمە و ئوم‌سەلەمەی هاوسەری کە لەمەو دوا باسی لێوە ئەکەین .

ئەم کۆچ کردنە گەورەترین سەرکەوتن و دەستکەوت بوو بۆ موسڵمانە چەوساوەکان ، تا نیشتمانێکیان هەبێ و بێ‌خەم خواپەرستیی تیا ئەنجام بدەن و ، لەوێشەوە بانگەوازەکەیان بڵاو بکەنەوە .

موسڵمانەکان بەوپەڕی چوست و چالاکی‌یەوە دەستیان بە کۆچ کرد ، کەچیی موشریکەکانی مەککە هەوڵیان ئەدا بیان‌گێڕنە دواوە ، چونکە هەستیان بە مەترسیی ئەکرد .. ئەگەر موسڵمانەکان لە شوێنێکدا بنکەیەکیان بۆ دابمەزرێ ، هێز پەیدا ئەکەن و مەککەیان لە دەست وەرئەگرنەوە .

یەکەم کەسێك کە کۆچی بۆ مەدینە کرد ، ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەد بوو ، [٢٦٠] ئەمەش ساڵێك پێش بەیعەتی دووهەمی عەقەبە ، کە ئەوەبوو لە حەبەشەوە گەڕابوویەوە مەککە و ، دانیشتوانی مەککە ئازاریان ئەدا . جا کە بیستی وا ئەنصار موسڵمان بوون و ، پێغەمبەریش ﷺ ڕێگەی داوە هاوەڵانی کۆچ بکەن بۆ مەدینە ، ئەو یەکەم کەس خۆی ئامادە کرد ، تا لەگەڵ ئوم‌سەلەمەی هاوسەری و سەلەمەی کوڕیان دەرچن . ژن و کوڕەکەی سواری وشترێك کردن و ، جڵەوی وشترەکەی گرت بە دەستەوە . کاتێك چەند پیاوێکی نەوەی موغیرەی کوڕی عەبدوڵلا - کە کەس وکاری ئوم سەلەمەی هاوسەری و ئامۆزای بوون - بەم شێوەیە چاویان پێ کەوت ، هەستانەوە بۆی و وتیان : وا خۆتت بۆمان چار ناکرێت ، ئەی ئەم هاوسەرەت ، لە پێناوی چی‌دا لێت بگەڕێین بیبەی بە وڵاتدا ؟ جڵەوی وشترەکەیان لێ سەند و ، ئافرەتەیان لە دەست دارنی . ئەبوسەلەمە بە تەنیا خۆی ڕۆیشت و هاوسەرەکەی و منداڵەکەیان لێ سەندەوە .

نەوەی عەبدولئەسەدیش - خزمەکانی ئەبوسەلەمە - لەولاوە تووڕە بوون و وتیان : بەخوا ، مادام ئێوە ژنەکەتان لە کوڕەکەمان سەندۆتەوە ، ئێمەش ناهێڵین منداڵەکەمان لەلای ئەو بمێنێتەوە . ئەوەبوو هەردوو لا سەلەمەیان ڕائەکێشا ،

---

[٢٦٠] ئەبوسەلەمە برای شیریی پێغەمبەری خوا بووە ﷺ ، کە ثوەیبەی کەنیزەکی ئەبولەهەب شیری بە هەردووکیان دابوو . هەروەها پوورزایشی بوو ، واتە کوڕی بەڕڕەی کچی عەبدولموطەللیب بوو و ، یەکێکیش بووە لەوانەی کە زوو بە زوو موسڵمان بوون و ، لە موسڵمانە دامەزراوەکان بووە .. لە سەرەتای ساڵی چوارەمی کۆچییدا دوای جەنگی ئوحود شەهید بووە .

هەتا دەستی لە جێ چوو و ، سەرەنجام نەوەی عەبدولئەسەد منالەکەیان بردەوە لای خۆیان و ، نەوەی موغیرەش ئوم سەلەمەیان لای خۆیان بەند کرد . هەم لە مێردەکەی و هەم لە کوڕەکەیان کرد .. ئەبوسەلەمەش لەبەر خاتری دینەکەی ژن و منالّی بەجێ هیشتن و بەرەو مەدینە کەوتە رێ ، گەیشتە قەباء و لەوێ نیشتەجێ بوو تا ئەوەبوو دوای سالێك ژنەکەی گەیشتە لای .

ئومسەلەمەش هەموو رۆژێك ، هەتا نزیکەی سالێك ، لە مال دەرئەچووە دەشت و ، هەتا ئێوارە ئەگریا بۆ دارنینی مێردەکەی و منالەکەی لێی .. تا ئەوەبوو پیاوێ لە ئامۆزاکانی بە لایا تێپەڕی و ، سەرنجی دا ئەو بەستەزمانە چەندە خەمباری وێرانبوونی هێلانەکەیەتی ، ئەوەبوو سۆزی بۆی جوولا و بەزەیی پیایا هاتەوە و چوو بۆ لای کەس وکاری و ، پێی وتن : ئەوە بۆچ واز لەو هەژارە ناهێنن تا بچێت بۆ لای مێردەکەی ؟ هەم لە مێردەکەی و هەم لە مندالەکەی دابڕتان کردووە .

کەس وکاری نەرم بوون و ، بە ئوم سەلەمەیان راگەیاند کە ئەگەر بیەوێ بڕوات بۆ لای مێردەکەی رێی لێ ناگرن . لە هەمان کاتدا نەوەی عەبدولئەسەدیش سەلەمەیان گێڕایەوە بۆی و ، ئوم سەلەمە کۆچی کرد بۆ مەدینە ..

ئومسەلەمە ئەلێت : سواری وشترەکەم بووم و ، سەلەمەی کوڕیشم خستە کۆشم و ، بەرەو لای مێردەکەم لە مەدینە کەوتمە رێ و ، هیچ کەسیشم لەگەلدا نەبوو . وتم : هەر کەسم تووش بوو لەگەلیان ئەڕۆم هەتا ئەگەمە لای مێردەکەم . کە گەیشتمە ( تەنعیم ) [٢٦١] تووشی عوسمانی کوڕی طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحە لە نەوەی عەبدوددار بووم و ، وتی : ئەی کچی ئەبوئومەییە بۆ کوێ ئەڕۆیت ؟ [٢٦٢] وتم : ئەچم بۆ مەدینە بۆ لای مێردەکەم . وتی : ئەی کەست لەگەلدا نیە ؟! وتم : نە بەخوا ، جگە لە خوا و لەم کوڕەشم ، کەسم لەگەلدا نیە . وتی : بەخوا بە جێت ناهێلم . جلەوی وشترەکەی گرت و بە پەلە کەوتە رێ .

دە بەخوا هەرگیز لەناو عەرەبدا نەکەوتوومەتە گەل هیچ کەسێك کە لەو بەڕێزتر بێت . کاتێك کە ئەگەیشتینە مەنزلێ بۆ پشوودان ، وشترەکەی پێ چۆك

---

[٢٦١] شوێنێکە ئەکەوێتە نێوان مەککە و سەرەف کە دوو فەرسەخ لە مەککەوە دوورە .

[٢٦٢] ئوم سەلەمە ناوی هیندی کچی ئەبوئومەییەی کوڕی موغیرەی مەخزوومیيە ، کە ئامۆزای خالیدی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرەیە ، هەروەها ئامۆزای ئەبوسەلەمەی مێردیشی بوو .

ئەدا ، پاشان خۆی دوور ئەکەوتەوە ، تا کە من دائەبەزیم و وشترەکەی دوور ئەخستەوە و کەل وپەلەکەی دائەگرت و وشترەکەی بە درەختێکەوە ئەبەستەوە و خۆیشی ئەچوو بۆ ژێر دارێکی تر و لە ژێریا پاڵ ئەکەوت . کە کاتی رۆیشتنیش ئەهات ، هەڵ ئەستا وشترەکەی گورج ئەکردەوە .. پاشان لێم دوور ئەکەوتەوە و ئەی‌وت : سواری وشترەکە ببە . کە سوار ئەبووم ئەهات و جڵەوی وشترەکەی ئەگرت و رای ئەکێشا هەتا مەنزڵێکی تر ..

بەم شێوەیە هەتا گەیاندمیە مەدینە کە چاوی بە گوندی نەوەی عەمری کوڕی عەوف کەوت لە قەباء ، وتی : مێردەکەت وا لەم گوندەدا و ، بە پشتوانیی خوا بچۆرە ناویەوە .. ئیتر خۆی گەڕایەوە بۆ مەککە ..

هەموو جارێ ئوم‌سەلەمە ئەی‌وت : بەخوا پێ نازانم هیچ بنەماڵەیەکی ئیسلام ئەوەیان تووش بووبێ کە تووشی ئالی ئەبوسەلەمە بووە و ، هەرگیز هیچ هاوەڵێکیشم نەدیوە لە عوثمانی کوڕی طەلحە[263] بەڕێزتر بووبێت .

لێرەدا وا چاکە سەرنجێکی ئەم رەوشتە بەرزە بدەین کە عوثمانی کوڕی طەلحە ئەی‌نوێنێ .. بە مەرجێ ئەمە هێشتا موسڵمان نەبووە ، کەچیی غیرەتی قبووڵ ناکات ئافرەتێکی بەڕێز و خانەدان ئەو بیابانە چۆڵە لەگەڵ کۆرپەکەیدا بگرێتە بەر .. ئەو بۆ کاری خۆی رێی لەو شوێنە ئەکەوێ ، کەچیی بڕیار ئەدا پێنج صەد کیلۆمەتر رێگا ببڕیت تا ئەو ئافرەتە بگەیەنێتە شوێنی خۆی و ، ئەوسا بە دوای خۆی‌دا ئەگەڕێتەوە .. ئەمە هێشتا موسڵمان نەبووە و ، بە خزمەتی قورئان نەگەیشتووە ، وا ئەوەندە بەڕێزە ، خەم خۆرە و ، بەزەیی بە مرۆڤی لاوازدا دێتەوە، ئەی داخۆ دوای موسڵمان‌بوونی چ پیاوێکی لێ دەرچووبێ ؟

بە داخەوە ئەمرۆ رەوشتی مرۆڤایەتیی زۆر دابەزیوە .. لە هەموو سەرزەوییدا ، ئەوانەی فێڵ‌باز و دەست‌بڕن بوونەتە هەڵسووڕێنەری سیاسەتی گەلان و ، درۆکردن و چاوبەست کردن و ، بەرزکردنەوەی دروشمی ساختە و گزیی‌کاریی ، ئەوپەڕی ئازایەتی‌یە بە لایانەوە . ئیتر لە دزیی و جەردەیی و تالان و برۆ و ، خوێن مژینی گەلە چەوساوەکان و ، قڕکردنیان بە شێوازی جۆراوجۆر هەر مەپرسە ..

---

[263] عوثمانی کوڕی طەلحە دوای پەیمانی حودەیبیە موسڵمان بووە و ، لە مانگی صەفەری ساڵی هەشتەم‌دا کۆچی بۆ مەدینە کردووە . ئەوەبوو طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحەی باوکی و ، عوثمانی کوڕی ئەبوطەلحەی مامەی و ، هەرسێ براکەشی : حاریث و کیلاب وموسافیع لە جەنگی ئوحوددا بە دەستی موسڵمانەکان کوژرا بوون .

دوای ئەبوسەلەمە ، عامیری کوڕی ڕەبیعە کە هاوپەیمانی نەوەی کوڕی کەعب بوو ، لەگەڵ لەیلای کچی ئەبوحەثمەی هاوسەریدا کۆچیان کرد بۆ مەدینە ..

ئیمام ( إبن عبد البر ) وتوویە : لەیلا یەکەم ئافرەتێکە کە گەیشتبێتە مەدینە ، واتە کۆچی کردبێ بۆ ئەوێ . بەڵام مووسای کوڕی عەقبە وتوویە : یەکەم ئافرەتێك کە کۆچی کردبێ ئوم سەلەمەیە و ، هەر یەکە بە بارێكدا .. ئوم سەلەمە یەکەم ئافرەتێکە کە بە نیازی کۆچ کردنەوە بۆ مەدینە دەرچووبێ و ، گەر خزمەکانی لەو کۆچەی قەدەغەیان نەکردایە ، یەکەم ئافرەت ئەو ئەگەیشتە مەدینە . لەیلاش یەکەم ئافرەتە کە گەیشتۆتە مەدینە ..

دوای ئەوە موسڵمانان یەك لە دوای یەك دەستیان دایە کۆچ .. ئەوەبوو موصعەبی کوڕی عومەیر و عەبدوڵلای کوڕی ئوم مەکتووم هەردووکیان کۆچیان کرد و ، قورئانیشیان فێری ئەنصار ئەکرد . هەروەها بیلالی کوڕی ڕەباح و ، سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص خوا لە هەموویان ڕازیی بێ کۆچیان کرد ..

بوخاریی لە صەحیحەکەیدا بە سەنەدی خۆی لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : یەکەم کەسێك لە کۆچ کەران کە گەیشتنە لامان - لە ریوایەتەکەی حاکمدا ئەمەی بۆ زیادکراوە ( لە ئیکلیلدا ) - موصعەبی کوڕی عومەیر و کوڕی ئوم مەکتووم بوون .

پاشان نەوەی جەحشیش کۆچیان کرد : عەبدوڵلای کوڕی جەحشی کوڕی ڕەییابی ئەسەدیی ، کە ئەچێتەوە سەر ئەسەدی کوڕی خوزەیمەی هاوپەیمانی نەوەی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمس ، ماڵ ومنداڵی هەڵ گرت ، لەگەڵ ئەبوئەحمەد ، عەبدی کوڕی جەحش ی برای ، [٢٦٤] کە پیاوێکی نابینا بوو ، بەڵام بەبێ ئەوەی کەسێك دەستی بگرێ سەرانسەری مەککە ئەگەڕا و ، شاعیریش بوو و ، فاریعەی کچی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب هاوسەری بوو .

هەروەها لە ئافرەتانیشیان زەینەبی کچی جەحش و ، حەمنەی کچی جەحش ، هاوسەری موصعەبی کوڕی عومەیر و ، ئوم حەبیبی کچی جەحش هاوسەری

---

[٢٦٤] کوڕانی جەحش سیان بوون : عەبدوڵلا و ، عوبەیدوڵلا و عەبد . لە پێشەوە باسمان کرد کە عوبەیدوڵلا لەگەڵ ئوم حەبیبە ڕەملەی کچی ئەبوسوفیانی هاوسەریدا کۆچی بۆ حەبەشە کرد و لەوێ وازی لە ئیسلام هێنا و چووە سەر دینی گاوران و لەوێ مرد . عەبدوڵلاش لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوو . عەبدیش ماوەیەکی زۆر، تەمەنی بەسەر برد . ئەمانە هەرسێکیان کوڕی ئومەیمەی کچی عەبدولموطەللیبن ، واتە پوورزای پێغەمبەری خوان ﷺ .

عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف ، کۆچیان کرد . بەمە ماڵی نەوەی جەحش بە هۆی کۆچ‌کردنەوە داخرا ، کە ئەوەبوو عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و ، عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب و ئەبوجەهلی کوڕی هیشام لەوێوە تێپەڕین کە نیازیان بوو سەرکەون بۆ لای ژووررووی مەککە ، عوتبە سەیری ماڵەکەی کرد ، چۆڵ و هۆڵ بوو و کەسی تێدا نیە . کە بەو شێوە بینیی هەناسەیەکی هەڵ کێشا و پاشان وتی :

کل دارٍ وإن طالت سلامتها    يوماً ستدركها النكباء والحوب

ئەڵێت : هەموو خانوویەك ئەگەرچیی ماوەیەکی زۆر سەلامەت و بێوەی بێت هەر ڕۆژێك ئەبێت وێران ببێت .

پاشان وتی : خانووەکەی نەوەی جەحش چۆڵ و هۆڵ بووە .. ئەبوجەهلیش بە عەبباسی وت : ئەمە کاری برازاکەتە .. کۆمەڵمانی پەرتەوازە کرد و ، کارمانی پەرت و بلاّو کرد و لە یەکی پچڕاندین .

ئەوەبوو ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب هەڵمەتی دابوو و خانووەکەی نەوەی جەحشی داگیر کردبوو .. وتراویشە کە فرۆشتبووی بە عەمری کوڕی عەلقەمەی عامیریی . کاتێ کە ئەم هەواڵە بە عەبدوڵڵای کوڕی جەحش گەیشت و ، ئەویش بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ باس کرد ، فەرمووی : (( ألا ترضى يا عبدالله أن يعطيك الله بها داراً في الجنة خيراً منها ؟ )) فەرمووی : عەبدوڵڵا ! ئایا ڕازیی نابی خوای گەورە لە جیاتی ئەو خانووەت لە بەهەشتدا خانوویەکی لەوە چاکترت پێ ببەخشێ ؟ وتی : بەڵێ . فەرمووی : (( فذلك لك )) .

کاتێکیش کە فەتحی مەککە کرا ئەبوئەحمەد ، عەبدی کوڕی جەحش چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا و باسی خانووەکەی خۆیانی بۆ کرد ، تا بیگێڕێتەوە بۆیان . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ پەلەی بۆ نەئەکرد . خەڵکیی وتیان : ئەبوئەحمەد ! پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆشە باسی شتێك بکەن کە لە پێناوی خوادا لێتان سەندراوە . ئیتر ئەبوئەحمەد باسی خانووەکەی نەکرد ، بەڵام دەربارەی کۆچ‌کردنی نەوەی جەحش قەسیدەیەکی جوانی هۆنیوەتەوە .

پاشان موسڵمانان دەستە دەستە کۆچیان کرد .. ئەوەبوو نەوەی غەنمی کوڕی دوودان کە بە چاکیی دەستیان بە ئیسلامەوە گرتبوو ، هەر هەموویان ، بە ژن و بە پیاوەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە . کە ئەمانە پیاوەکانیان بوون : عوکاشەی کوڕی موحصەن و شوجاع و عوقبەی کوڕانی وەهب و ، ئەربەدی کوڕی حومەیرە

و ، مونقیذی کوڕی نەباتە و ، سەعیدی کوڕی ڕەقیش و ، موحەرریزی کوڕی نەضلە و ، یەزیدی کوڕی ڕەقیش و هی تریش .

لە ئافرەتانیشیان : جوذامەی کچی جەندەل و ، ئوم قەیسی کچی حیصن و، ئوم حەبیبی کچی ثومامە و، ئامینەی کچی ڕەقیش و، سەخبرەی کچی تەمیم کۆچیان کرد .

پاشان عومەری فارووقیش خوای لێی ڕازیی بێ کۆچی بۆ مەدینە کرد .. ئەوەبوو لەگەڵ عەییاشی کوڕی ئەبوڕەبیعە و، هیشامی کوڕی عاصی کوڕی وائیلی سەهمیی ، ڕێك کەوتن لە شوێنێك کە دە میل لە مەککەوە دوور بوو یەکتریی ببینن و ، بە یەکترییان وت : هەر کاممان سبەینێ نەهات ئەوە بەند کراوە، با ئەو دوو هاوەڵەکەی نەوەستن و بڕۆن .

عومەر ئەفەرموێ : ئەوەبوو من و عەییاشی کوڕی ئەبوڕەبیعە بۆ سبەینێ گەیشتینە ئەو شوێنە و ، هیشام بەند کرا و ، هەوڵیان لەگەڵیا دا تا لە دین وەریان گێڕا ..

ئیبن عەساکیر و غەیری ئەویش لە ئیمام عەلییەوە خوا لێی ڕازیی بێ تەخریجیان کردووە کە فەرموویە : پێ نازانم هیچ موهاجیرێك بە ئاشکرا کۆچی کردبێ جگە لە عومەری کوڕی خەططاب ، ئەوەبوو کە ویستی کۆچ بکات شمشێرەکەی کرد بە لا تەنیشتیا و ، تیر و کەوانەکەی کردە شانی و ، چەند تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێنا و گرتنی بە دەستیەوە و ، داردەستەکەشی بە قەدیەوە هەڵواسیی و ، بەرەو کەعبە کەوتە ڕێ و ، پیاوماقوڵانی قورەیشیش لە پەنایدا بوون ..

حەوت جار تەوافی کەعبەی کرد و ، پاشان هاتە مەقام و دوو ڕەکعەت نوێژی بەجێ هێنا ، پاشان یەك بە یەك هاتە سەرسەری ئەڵقەکان و بە خەڵکەکەی فەرموو : ئەم دەم و چاوانە ناشیرین بن .. جگە لەم لووتانەش خوا هیچ لووتێك نەچەقێنێ بە خۆڵدا.. کێ ئەیەوێ دایکی ڕۆڵەڕۆی بۆ بکات ، یان منداڵەکانی هەتیو بخات ، یان هاوسەرەکەی بێوەژن بخات ، با لەودیوی ئەم شیوەوە چاوم پێی بکەوێ . جگە لە کۆمەڵێك موسڵمانی لاواز ، کە خۆی ڕێی نیشان دابوون ، هیچ کەس نەیوێرا شوێنی بکەوێ .. ئیتر کەوتە ڕێ و ، هەندێ لە کەس و کار و

خزمانی و ، هه‌ندێ له موسڵمانه بێ‌ده‌سه‌ڵاته‌کانیش له‌گه‌ڵیا کۆچیان کرد ، تا ئه‌و بیان‌پارێزێت ..

ئه‌م گه‌شته‌ی عومه‌ری فارووق نزیکه‌ی بیست پیاوی له‌گه‌ڵدا بوو ، که له‌وانه: زه‌یدی کوڕی خه‌ططاب و ،[٢٦٥] عه‌ییاشی‌کوڕی ئه‌بوڕه‌بیعه و ، عه‌مر و عه‌بدوڵلای کوڕانی سوراقه‌ی کوڕی موعته‌میری عه‌ده‌ویی و، خونه‌ییسی کوڕی حوذافه‌ی سه‌همیی و ،[٢٦٦] سه‌عیدی کوڕی زه‌یدی کوڕی عه‌مری کوڕی نوفه‌یلی ئامۆزای عومه‌ر و ، مێردی فاطیمه‌ی خوشکی و ، واقیدی کوڕی عه‌بدوڵلای ته‌میمیی ، که هاوپه‌یمانیان بوو و ، خوولیی کوڕی ئه‌بوخوولیی و ، مالیکی کوڕی ئه‌بوخوولیی ، که هه‌ردووکیان هاوپه‌یمانیان بوون و ، هه‌ر چوار کوڕه‌که‌ی به‌کیریش : ئیاس و ، عاقیل و ، عامیر و ، خالید .

ئیبن ئیسحاق ته‌نها ئه‌م سیانزه که‌سه‌ی ناو بردوون . حافیظ ئیبن حه‌جه‌ریش له (( الفتح )) دا وتوویه : له‌وانه‌یه ئه‌وانی تر شوێنکه‌وته‌یان بوو بن . ئه‌وه‌بوو عومه‌ری سه‌ردارمان و ئه‌وانه‌ی که له‌گه‌ڵیا بوون و ، هاوپه‌یمانه‌کانیان له نه‌وه‌ی سه‌عدی کوڕی له‌یث لای ریفاعه‌ی کوڕی عه‌بدولمونذیری نه‌وه‌ی عه‌مری کوڕی عه‌وف له قه‌باء دابه‌زین .

که گه‌یشتنه مه‌دینه ئه‌بوجه‌هلی کوڕی هیشام و حاریثی برای هاتن بۆ مه‌دینه بۆ لای عه‌ییاشی کوڕی ئه‌بوڕه‌بیعه‌ی ئامۆزایان و برای دایکی‌یان .[٢٦٧] ئه‌مه‌ش له کاتێک‌دا بوو که پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هێشتا له مه‌ککه‌دا بوو .

---

[٢٦٥] زه‌ید برای عومه‌ره و ، له‌ویش به‌ته‌مه‌ن تره و ، پێش ئه‌ویش موسڵمان بووه . به‌شداریی به‌در و غه‌زاکانی کردووه و ، له جه‌نگی یه‌مامه‌دا ، له ساڵی دوانزه‌هه‌می کۆچیی‌دا ، که ئالای موسڵمانه‌کانی هه‌ڵ گرتبوو ، شه‌هید بووه و ، عومه‌ر یه‌کجار بۆی خه‌مبار بوو و ، ئه‌شی‌فه‌رموو : ئه‌و بۆ هه‌ر دوو کاره چاکه‌که پێشم که‌وت : پێش من موسڵمان بوو و پێش منیش شه‌هید بوو .. کاتێکیش که موته‌ممیمی کوڕی نووه‌یره له شیعره‌کانی‌دا شیوه‌نی بۆ مالیکی برای کرد ، که له جه‌نگی موسڵمانه‌کان‌دا به هه‌ڵگه‌ڕاوه‌یی کوژرابوو ، عومه‌ر پێی فه‌رموو: ئه‌گه‌ر منیش شیعرم بزانیبایه ئه‌وا ، به‌و شێوه‌ی که تۆ شیوه‌نی براکه‌تت کرد ، منیش شیوه‌نی براکه‌مم ئه‌کرد . موته‌ممیم له وه‌ڵام‌دا وتی : ئه‌گه‌ر براکه‌ی منیش له‌سه‌ر ئه‌و رێبازه بمردایه که براکه‌ی تۆ له‌سه‌ری مردووه ، شیوه‌نم بۆ نه‌ئه‌کرد . عومه‌ر فه‌رمووی : هیچ که‌س به وێنه‌ی ئه‌م دڵ دانه‌وه‌یه‌ی تۆ دڵی نه‌داوه‌مه‌ته‌وه .

[٢٦٦] زاوای عومه‌ر بووه ، واته مێردی حه‌فصه‌ی کچی عومه‌ر و ، له جه‌نگی به‌دردا شه‌هید بووه ..

[٢٦٧] ئه‌بوڕه‌بیعه ناوی عه‌مره و نازناویشی ( ذوالرمحين) بووه ، واته خاوه‌نی جووته رمه‌که ، کوڕی موغیره‌ی ، کوڕی عه‌بدوڵلای ، کوڕی عومه‌ری ، کوڕی مه‌خزوومی قوره‌یشی‌یه . واته عه‌ییاشیش ئامۆزای خالیدی کوڕی وه‌لیده .

ئەبوجەهل رووی کردە عەییاش و پێی وت : دایکت نەزری کردووە کە سەری شانە نەکات و ، نەچێتە بەر سێبەر هەتا تۆ نەبینێت . ئەویش بەزەیی بە دایکیدا هاتەوە . عومەر پێی فەرموو: بەخوا ، ئەمانە ئەیانەوێ لە دین وەرت بگێرن ، ئاگات لە خۆت بێ . بەخوا ئەگەر ئەسپێ ئازاری دایکت بدەن ناچار ئەبێ سەری شانە بکات و ، گەر گەرمای مەککەش زۆری بۆ هێنا ناچار ئەبێ بچێتە بەر سێبەر . عەییاش وتی : ناهێڵم سوێنەکەی دایکم بکەوێت و ، لەوێش هەندێ سامانم هەیە وەری ئەگرم . عومەر پێی فەرموو : بەخوا خۆیشت ئەزانیی کە من لە هەموو قورەیش سامانم زیاترە ، جا نیوەی سامانەکەم بۆ تۆ ، بەلاّم مەچۆ لەگەڵیانا . عەییاش بە گوێی عومەری نەکرد و بڕیاری دا لەگەڵیان بگەڕێتەوە مەککە . عومەر فەرمووی : کە هەر وات کرد ، دەی وشترەکەی من ببە لەگەڵ خۆتدا ، وشترێکی رەسەنی گوێڕایەڵە ، سواری ببە و ، گەر گومانت لێیان کرد بە وشترەکە خۆت رزگار بکە .

عەییاش سواری وشترەکەی عومەر بوو و لەگەڵیان کەوتە رێ . لە نیوەی رێدا ئەبوجەهل وتی : کوڕی برام ، بەخوا ، ئەم وشترەم رێ نابڕێ ، ناکرێ ئەو وشترەی خۆتم بدەیتێ سواری بم ؟ وتی : بەڵێ . عەییاش وشترەکەی چۆك پێ دا و، ئەوانیش هەردووکیان وشترەکانی خۆیان چۆك پێ دان ، تا بیان گۆڕنەوە . کە عەییاش دابەزییە زەویی ، هەردووکیان هەڵمەتیان دایێ و ، قۆڵ بەستیان کرد و، هێنایانەوە مەککە و ، هەوڵیان لەگەڵیا دا ، تا لە دین هەڵ بگەڕێتەوە و ، ئەویش هەڵگەڕایەوە . ئەوەبوو بە رۆژی رووناك و بە قۆڵ بەستراویی کردیان بە مەککەدا و ، ئەشیان وت : ئەی دانیشتوانی مەککە ! ئەوەی کە ئێمە کردمان بەم سەفیهەمان ، ئێوەش هەر ئەوە بکەن بە سەفیهەکانتان .

ئیبن ئیسحاق بە سەنەدی خۆی لە عومەرەوە ریوایەتی کردووە کە فەرموویە : ئێمە ئەمان وت : هەرکەس لە دین هەڵگەڕابێتەوە خوای گەورە نە کار و نە چاکە و نە تەوبەی لێ وەرناگرێ .. ئەوانە کۆمەڵێك بوون خوایان ناسیی بوو ، کەچیی بە بۆنەی ناڕەحەتییەکەوە کە تووشیان بوو گەڕانەوە بۆ ناو کوفر . هەروەها خۆشیان ئەوەیان بە خۆیان ئەوت . بەلاّم کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد ، خوای گەورە دەربارەی ئەوان و ، قسەکەی ئێمە و قسەکەی خۆیشیان ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارەوە :

﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ ( الزمر : ٥٣ ـ ٥٥ ) .

ئایەتەکان ئامۆژگاریی بەندەکانی خوا ئەکەن کە دەست لە سۆزی خوا نەشۆن بە بۆنەی گوناه و تاوانەوە ، چونکە خوای گەورە بەسۆز و بەخشندەیە و چاوپۆشیی لە هەموو گوناهەکان ئەکات . کەواتە با بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و ، خۆیان تەسلیمی ئەو بکەن و ، بکەونە شوێن ڕێبازی خوا ، بەر لەوەی کە سزای خوایان بۆ بێت .

عومەر بە دەستی خۆی ئەم ئایەتەی نووسییەوە و ، ناردی بۆ لای هیشامی کوڕی عاص . هیشام ئەڵێ : کە ئایەتە نووسراوەکانم بۆ هاتن لە ( ذوطوی ) خەریکی خوێندنەوەیان ئەبووم و لێیان ورد ئەبوومەوە ، کەچیی لێیان تێ نەئەگەیشتم ، هەتا وتم : خوایە ! تێم بگەیەنی لێیان . ئەڵێ : خوای گەورە ئەوەی خستە دڵمەوە کە ئەم ئایەتانە دەربارەی ئێمە و ، ئەوەی خۆمان بە خۆمان ئەوت و، ئەوەی کە پێمان ئەوترا هاتوونەتە خوارەوە . ئەڵێت : گەڕامەوە لای وشترەکەم و ، سواری بووم و ، خۆم گەیاندە مەدینە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .

ئیبن هیشامیش وتوویە : کەسێك کە متمانەم پێی هەبوو بۆمی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە فەرمووبووی :

(( من لي بعيّاش بن أبي ربيعة ، وهشام بن العاص ؟ )) .

فەرمووبووی : کێ ئەتوانێ عەییاش و هیشامم دەست بخات ؟ وەلیدی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرە [٢٦٨] ئەڵێت : من دەستتیان ئەخەم ، ئەی پێغەمبەری خوا ! بەرەو مەککە کەوتە ڕێ و ، بە نهێنیی خۆی کرد بە شاردا ، تووشی ئافرەتێك بوو کە هەندێ خواردەمەنیی پێ بوو . وتی : خوشکەگیان ! نیازی کوێت هەیە ؟ وتی: ئەو دوو بەندکراوەم ئەوێن ، ( مەبەستی لە عەییاش و هیشام بوو ) . وەلیدیش کەوتە شوێن ئافرەتەکە هەتا لە شوێنەکەی هەردووکیان ئاگادار بوو .. ئەوەبوو لە ژوورێکدا بەند بوون کە سەری نەگیرابوو . کە ئێوارەی لێ هات خۆی گەیاندە

[٢٦٨] برای خالیدی کوڕی وەلیدە ، کە پێش خالید موسڵمان بووە و ، هەردوو کۆچەکەی کردوون . لە موسڵمان بوونی خالیددا ڕۆڵی باشی هەبووە .

لایان . پاشان بەردێکی هێنا و خستیە ژێر کۆتەکانیان و بە شمشێرەکەی دای لە کۆتەکان و هەردووکی پچڕاندن . بەو بۆنەشەوە بە شمشێرەکەیان ئەوت : ( ذوالمروة ) . هەردووکیانی سواری وشترەکەی کردن و ، هێنانی . ئەوەبوو پێی هەڵ کەوت و پەنجەیەکی خوێناویی بوو . ئەویش وتی :

هل أنت إلا أصبع دَميت          وفي سبيل الله ما لقيت

پاشان هەردووکیانی هێنایە مەدینە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .

کاتێك کە صوهەیبیش خوای لێی رازی بێ ویستی کۆچ بکات ، کافرەکانی قورەیش پیێان وت : تۆ رووتەڵەیەکی هیچ و پووچ بوویت هاتیتە ناومان و ،ماڵ و سامانت پێکەوە نا و ، گەیشتی بەم حاڵەت ، ئێستاش ئەتەوێ بە خۆت و بە پارەکەتەوە بڕۆیت . بەخوا شتی وەها نابێت . ئەویش پێی وتن : ئایا ئەگەر سامانەکەمتان بدەمێ ، وازم لێ دێنن ؟ وتیان : بەڵێ . وتی : دەی وا سامانەکەم دا پێتان . ئەم هەواڵە گەیشتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، ئەویش فەرمووی : (( ربح صهيب ، ربح صهيب )) . فەرمووی : صوهەیب قازانجی کرد . ئەمە لە سیرەی ئیبن هیشامدایە .

ئیمام بەیهەقییش چیرۆکی کۆچ کردنی صوهەیب بە جۆرێکی تر ئەگێڕێتەوە ، ئەڵێت : صوهەیب وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد و ئەبوبەکریش لەگەڵیا کۆچی کرد ، منیش ویستم لەگەڵیدا کۆچ بکەم ، کەچیی چەند گەنجێکی قورەیشیی گێڕامیانەوە . منیش ئەو شەوە دانەنیشتم ، هەر هات و چۆم بوو و، ئەوانیش وتیان : بە هۆی سکیەوە خوا پەشۆکاندوویەتی ، منیش رەوان نەبووم ، تا ئەوەبوو خەوتن و منیش لە نێوانیاندا بە دزەوە دەرچووم . دوای ئەوەی کە ماوەیەك رۆیشتم کۆمەڵێکیان گەیشتن پیاما و ، ئەیان ویست بمگێڕنەوە . پێم وتن : ئەگەر چەند ئۆقیەیەك زێڕتان بدەمێ رێگام بەر ئەدەن و بەڵێنم بۆ ئەبەنە سەر؟ ئامادەییان نواند . منیش بە دوایانا گەڕامەوە مەککە و ، وتم : ژێر ئەو دەرگایە هەڵ بکەنن ، چەند ئۆقیەیەکی تێدایە و بشچن بۆ لای فلانە ئافرەت و هەردوو ملوانکەکەی لێ وەربگرن . ئیتر من کۆچم کرد و هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قوباء ، بەر لەوەی بە جێی بهێڵێ . کە چاوی پێم کەوت فەرمووی : (( يا أبا يحيى ! ربح البيع )) . فەرمووی : صوهەیب ! فرۆشتنەکەت

قازانجی‌کرد . وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! کەس پێشم نەکەوتووە بۆ خزمەتت و ، جیبریلیش سەلامی لێ بێ هەواڵی پێ داوی .

هەروەها ئیبن سەعد (٣ / ١٦٢) و ، حاریث و ، ئیبنولمونذیر و ، ئیبن عەساکیر و، ئیبن ئەبوحاتەم لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە رەحمەتی خوای لێ بێ تەخریجیان کردووە کە : صوهەیب خوا لێی رازیی بێ بەرەو لای پێغەمبەر ﷺ کۆچی‌کرد و چەند کەسێکی قورەیشیی موشریکیش شوێنی کەوتن . ئەویش دابەزیی و چیی تیر لە تیردانەکەی‌دا هەبوون دەری هێنان و وتی : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! چاك ئەزانن من لە هەمووتان چاکتر نیشانە بە تیروکەوان ئەپێکم . جا سوێند بەخوا ! بەر لەوەی بگەنە لام چەند تیر وا لە تیردانەکەم‌دا هەر هەمووتان تێ ئەگرم ، پاشان هەتا شتێك لە شمشێرەکەم بە دەستمەوە بمێنێ لێتان ئەدەم ، دواییش خۆتان چاك ئەزانن .. ئەگەر بش تانەوێ ئەو سامانەمتان پیشان ئەدەم کە لە مەککەیە و دەست مەهێننە رێم .. وتیان : باشە . پەیمانیان بە یەك دا شوێنی سامانەکەی پیشانیان دا . ئەوەبوو لەو بارەوە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە :

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾ .

( البقرة : ٢٠٧ ) .

کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ صوهەیبی بینیی فەرمووی :

(( ربح البيع يا أبا يحيى ! ربح البيع يا أبا يحيى ! )) . دوای ئەوە ئەو ئایەتەشی بۆ خوێندەوە .

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە دانیشتوانی مەککە شوێنی ئەکەون و ، ئەویش لە تیردانەکەی‌دا چل تیر دەرئەهێنێ و ، ئەڵێت : بەر لەوەی بگەنە لام هەر یەکە تیرێکتان لێ ئەدەم ، ئەوسا دەست ئەدەمە شمشێر و ، بۆتان دەرئەکەوێ کە پیاوم . لە مەککەش‌دا دوو کەنیزەکم بەجێ هێشتوون ، بۆ ئێوە .

ئەوەبوو صوهەیب بووە میوانی خوبەیبی کوڕی ئیساف لە سونح .

بەم شێوەیە ، دوای دوو مانگ و چەند رۆژێك لە بەستنی پەیمانی دووهەمی عەقەبە ، هەموو موسڵمانەکان کۆچیان کرد و ، لە مەککەدا تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر و عەلیی خوا لێیان رازیی بێ مانەوە و ، ئەوانەش مانەوە کە کافرەکان بەندیان کردبوون تا کۆچ نەکەن ..[٢٦٩]

---

[٢٦٩] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ١ / ٤٥٧ ـ ٤٦٨ ، والرحيق المختوم : ١٥٨ـ١٦٠ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ٥٥٥ ـ ٥٥٨ ، ١ / ٥٧٥ ـ ٥٨٠ ، ١ /٨ .

## بەشی پانزەهەم
# کۆچ کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ

وەك لە پێشەوە باس کرا ، موسڵمانەکان بە کۆمەڵ و دانە دانە کۆچیان بۆ مەدینە کرد ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە مایەوە ، بەو هیوایەی کە ماوەی خۆیشی بدرێ تا کۆچ بکات و ، تەنها ئەبوبەکر و عەلیی و ئەوانەی کە بەند کرابوون لەوێ مانەوە .

ئەوەبوو ئەبوبەکریش نیازی کردبوو وەك هاوەڵان کۆچ بکات بۆ مەدینە ، کەچیی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووبوو: (( لا تعجل لعل الله يجعل لك صاحباً )) . فەرمووی : پەلە مەکە ، بەڵکو خوا هاوەڵت بۆ بگەیەنێ . ئەبوبەکریش لەوە تێ گەیشت کە مەبەستی خۆیەتی .

لە باسی دوور و درێژی کۆچ کردن دا لە صەحیحی بوخارییدا هاتووە : ئەبوبەکر خۆی ئامادە کرد کە بەرەو مەدینە بڕوا ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: (( على رسلك ، فإني أرجو أن يؤذن لي )) . فەرمووی : پەلە مەکە ، هیوادارم ماوەی کۆچ کردنی منیش بدرێ . ئەبوبەکر فەرمووی : باوکم بە قوربانت بێ ، ئایا بە هیوای ئەوە هەیت ؟ فەرمووی : (( نعم )) . ئیتر ئەبوبەکرخۆی بە دیار پێغەمبەری خواوە ﷺ هێشتەوە تا ببێتە هاوەڵی و ، بۆ ماوەی چوار مانگیش گەڵای درەختی سەموری دا بەو دوو وشترەی کە بۆ کۆچ کردن بۆ مەدینە ئامادەی کردبوون .

کە قورەیش دیتی وا شوێنکەوتوانی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بوون و ، دانیشتوانی مەدینە بە غیرەتێکی بێوێنەوە سەروماڵ و منداڵیان ئەکەنە قوربانی خۆی و دینەکەی و ، هاوەڵانیش وا دەروویان لێ کراوەتەوە و ، خوای گەورە برای دینیی زۆر دڵسۆز و خۆنەویستی بۆ گەیاندوون و، وا بەرە بەرە کۆچیان کرد بۆ ئەوێ و ، لەوێ دڵیان لە خۆیان و دینەکەشیان بێخەمە ، ترسی ئەوەیان لێ نیشت پێغەمبەری خواش ﷺ کۆچ بکات بۆ مەدینە و لەوێ هێز پەیدا بکات و، دوای ماوەیەك بێتەوە سەریان و ، مەککەشیان لە دەست بسێنێ .

بۆ ئەمە یەکجار خەمبار و نارەحەت بوون ، چونکە لایان روون بوو کە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ مەککە بەجێ بهێڵێ ، هەم دین و هەم ئابووریی و بازرگانییان ئەکەوێتە مەترسییەوە . چونکە ئەیانزانیی کەسێتیی پێغەمبەری خوا ﷺ چەندە کاریگەرە و ، چەندەش حەکیم و وردبینە . لە هەمان کاتدا هاوەڵانی چەندە بەغیرەت و راستگۆ و کۆڵنەدەرن و ، بە ئیخلاص و نییەتی پاکەوە کار بۆ دینەکەیان ئەکەن ، لەلایەکی تریشەوە هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج چەندە بەهێز و بەغیرەتن و ، پیاوە ژیرەکانیشیان خاوەنی چ نەخشەیەکی جوان و رێك و پێکن ، دیسان مەدینەش خاوەنی چ شوێنێکی وەها گرنگە بۆ ئەو بازرگانییەی کە لە نێوان شام و یەمەندا ئەکرا و ، بە لێواری دەریای سووردا تێ ئەپەڕیی ، کە پێویستیی بە ئاسایش و هێمنییە ، هەتا دانیشتوانی مەککە ساڵانە بایی چارەکە ملیۆنێك مثقاڵ ( دینار ) ئاڵتوون بازرگانییان ئەکرد .

بە بۆنەی هەموو ئەمانەوە قورەیش لەبەردەم مەترسییەکی گەورەدا بوو ، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەستیان دەربچێت و ، مەدینە ببێتە بنکەی دژایەتیی بەرژەوەندییەکانی قورەیش . بۆیە بەوپەڕی خەمخۆرییەوە بۆ رێگا چارەیەکی زۆر سەرکەوتوو ئەگەڕان تا ئەم گیروگرفتە چارەسەر بکەن .

ئەوەبوو لە رۆژی پێنجشەممەی بیست و شەشەم رۆژی مانگی صەفەری ساڵی چواردەهەمی هاتنی وەحیدا ، کە رێکەوتی دوانزەی مانگی ئەیلوولی ساڵی ( ٦٢٢ ) ی زایینیی بوو ، [٢٧٠] واتە دوای نزیکەی دوو مانگ و نیو لە دوای بەیعەتی دووهەمی عەقەبە ، پەرلەمانی مەککە لە ( دارالندوة ) [٢٧١] لە

---

[٢٧٠] خاوەنی ( الرحيق المختوم ) ئەم مێژووەی لە ( رحمة للعالمين ) ی زانای پایەبەرز ( محمد سليمان المنصورفوري ) وەرگرتووە . ( الرحيق : ١٦٢ ) .

[٢٧١] دارالندوة : ماڵەکەی قوصەی کوڕی کیلابی باپیرە گەورەی پێغەمبەری خوا بووە ﷺ . کە قورەیش لەوێ بڕیاری هەموو کارێکی گرنگیان ئەدا ، کە ئەوەبوو قوصەی ئەم ماڵەی دا بە ( عبد الدار ) ی کوڕی و هەروا بە دەستیانەوە مایەوە ، هەتا سەردەمی موعاویە خوا لێی رازیی بێ و لە عیکریمەی کوڕی عامیری کوڕی هاشم ی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی عەبدودداری کڕیی و کردییە ( دار الإمارة ) . وتراویشە : کە کاتێ موعاویە حەجی کردووە ، لە زوبەیری عەبدەریی ( واتە لە نەوەی عەبدودداره ) کڕیوە بە صەد هەزار دیرهەم و ، پاشان خراوەتە سەر مزگەوتی کەعبە . سوهەیلییش وتوویە : دوای نەوەی عەبدوددار کەوتۆتە دەست حەکیمی کوڕی حەزام و لە سەردەمی ئیسلامدا و لە کاتی خەلافەتی موعاویەدا فرۆشتوویە بە صەد هەزار . ئەویش لۆمەی ئەکات و ئەڵێت : ئایا رێز و شەرەفی باوباپیرانت فرۆشت ؟! حەکیم ئەڵێت : بەخوا جگە لە تەقوا هیچ رێزێك باوی نەماوە، بەخوا لە سەردەمی نەفامییدا بە کووپەیەك عەرەق کڕیومە ، ئێستاش بە صەد هەزارم فرۆشتووە و ، دەشتان گرم بە شاهێد کەوا نرخەکەیم بەخشیی لە رێی خوادا .. جا کێمان دۆڕاوین ؟!

سەرەتای رۆژەوە [٢٧٢] گرنگ‌ترین کۆبوونەوەی مێژوویی ئەنجام دا .. ئەوەبوو نوێنەری هەموو هۆزە قورەیشی‌یەکان ئامادەی بوون تا ئەم کێشە سەختە چارەسەر بکەن و ، لە ریشکەوە دەری بهێنن .

جا دیارترین پیاوانی ئەم کۆبوونەوەیە ئەمانە بوون :

١ ـ لە نەوەی عەبدشەمس : عوتبەی کوڕی رەبیعە و ، شەیبەی برای و ، ئەبوسوفیانی کوڕی حەربی زاوای .

٢ ـ لە نەوەی مەخزووم : ئەبوجەهلی کوڕی هیشام .

٣ ـ لە نەوەی نەوفەلی کوڕی عەبدمەناف : جوبەیری کوڕی موطعیم و ، طوعەیمەی کوڕی عەدیی و، حاریثی‌کوڕی عامیر .

٤ ـ لە نەوەی عەبدوددار : نەضری کوڕی حاریثی کوڕی کیلدە ، ئەوەی کە ناوسکی وشترەکەی خستە سەر شان و ملی پێغەمبەری خوا ﷺ .

٥ ـ لە نەوەی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا : ئەبولبوختەریی کوڕی هیشام و ، زەمعەی کوڕی ئەسوەدی کوڕی موطەللیب و ، حەکیمی کوڕی حەزام .

٦ ـ لە نەوەی جومەح : ئومەییەی کوڕی خەلەف .

٧ ـ لە نەوەی سەهم : نەبیهـ و مونەببیهی کوڕانی حەججاج .

کاتێك کە هاتن بۆ ( دارالندوة ) شەیتان لە شێوەی ریش سپی‌یەکی نەجدیی‌دا هاتە رێیان و دەستیێ بەرگی ئەستووری لەبەردا بوو .کە دیيان وا لە دەرگادا وەستاوە ، وتیان : مامەی ریش سپیی کێیە ؟ وتی : ریش سپی‌یەکی ئەهلی نەجدە و ، ئەوەی بیستووە کە بۆی کۆبوونەتەوە ، بۆیە ئەویش لەگەڵتان‌دا ئامادە بووە تا بزانیێ ئێوە چیی ئەڵێن و ، بەڵکو لە را و ئامۆژگاریی خۆی بێ‌بەشتان نەکات . وتیان : چاکە ، فەرموو ژوورەوە .. بەمە لەگەڵیان چووە ژوورەوە .

دوای ئەوەی پیاوانی کۆبوونەوەکە ئامادە بوون ، دەست کرا بە دەربڕینی را و، گەڵاڵەکردنی چارەسەری‌یەکان ، تا بە هەموویانەوە رێیەکی سەرکەوتوو هەڵ ببژێرن ، بۆ رزگاربوون لەم بەڵایە کە یەخەی پیێ گرتوون .

---

[٢٧٢] بەڵگە بۆ ئەوەی کە ئەم کۆبوونەوەیە لە سەرەتای رۆژەوە بووە ، ئەوەیە لە دوای کۆبوونەوەکە جیبریل سەلامی لیێ بیێ هەواڵ بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدات و ماوەی ئەدات کە کۆچ بکات و ، ئەویش لە قوڵەی گەرمای نیوەڕۆدا تەشریف بۆ ماڵی ئەبوبەکر ئەبات تا هەواڵی کۆچ‌کردنی بداتیێ .

ئەوەبوو هەندێکیان بە هەندێکیانی وت : دیتان کاری ئەم پیاوە چیی لیّ هات، دە بەخوا ئێمە لێی بیّخەم نین لەوەی کە بە خۆی و ئەوانەشەوە کە شوێنی کەوتوون لە غەیری خۆمان هەڵمەت بداتە سەرمان . جا رایەك دەربارەی دەر ببڕن . ئەوانیش راوێژیان کرد ..

یەکێکیان ـ کە ئەبولبوختەریی کوڕی هیشام بوو ـ وتی : کۆت و زنجیر بکەنە دەست و پێی و ، دەرگای لەسەر داخەن و ، چاوەڕوانیی بکەن تا ئەو مەرگەی کە تووشی هاوشێوانی بوو ، لەو شاعیرانەی کە لە پێشی ئەوەوە بوون : زوهەیر و ، نابیغە و ، پێشینانی تریش ، تووشی ئەویش ببیّ ..

ریش‌سپی‌یە نەجدی‌یەکە وتی : نا ، بەخوا ، ئەو رایە بە کەڵکی ئێوە نایەت .. بەخوا ئەگەر بەندی بکەن ، وەك خۆتان ئەڵێن ، ئەوا فەرمانی لە پشت دەرگاوە بە هاوەڵانی ئەگات و ، لەوانەشە هەڵمەت بدەنە سەرتان و لە ژێر چنگتان دەری بکەن ، پاشان بە هۆی ئەوەوە وەها زۆر بن کە کارتان لە دەست بستێنن .. ئەم رایە بە کەڵکتان نایەت ، رای تر ببیننەوە .

جارێکی تر راوێژیان کردەوە .. پاشان یەکێکیان ـ کە ئەبولئەسوەد بوو ـ وتی : لەناو خۆمان‌دا دەری ئەکەین و ، لە ولاتمان دووری ئەخەینەوە . جا کە لە ناومان‌دا دەرچوو ، ئیتر بەخوا باکمان نابێت بۆ هەر کویّ بڕوا ، یان بکەوێتە هەر شوێنێکەوە ، ئەو کاتە یەکێتیی و پێکەوە گونجانمان وەك جاران بۆ ئەگەڕێتەوە ..

ریش سپیی نەجدیی وتی : ئەم رایەش بە کەڵکتان نایەت . نابینن چەند قسە جوان و گوفتار شیرینە و ، دڵی پیاوان کەمەندکێش ئەکات ؟ دە بەخوا ئەگەر ئەوە بکەن ، ئەگونجیّ بچێتە لای هۆزێکی عەرەب و شوێنی بکەون و ، پاشان پێشیان بکەویّ و بیان‌هێنێتە سەرتان و ، دەستتان بەسەردا بگریّ و ، کارتان لە دەست بستێنیّ ، پاشان چیی بویّ پێتان ئەکات .. رایەکی تری بۆ بدۆزنەوە .

ئەبوجەهلی کوڕی هیشام وتی : بەخوا من لە بارەیەوە رایەکم هەیە ، بڕوا ناکەم هێشتا پەیتان پێی بردبیّ . وتیان : ئەو رایە چی‌یە ، ئەبولحەکەم ؟ وتی : وای بۆ ئەچم کە ئێمە لە هەموو هۆزێك گەنجێکی شیکەی بەهێز و ، خاوەن نەسەب هەڵ ببژێرین و ، هەر گەنجێکیش لەوانە شمشێرێکی تیژی بدەینە دەست ، پاشان بچنە سەری و ، هەر هەموو بە جاریّ بە شمشێر دای‌بگرنەوە و ، بی‌کوژن و، لە دەستی بحەسێینەوە .. چونکە ئەگەر ئەو گەنجانە وەها بکەن ، ئەوا خوێنی

لەناو هەر هەموو هۆزەکاندا بلاوە ئەکات و ، ئەو کاتەش نەوەی عەبدمەناف ناتوانن لەگەڵ ئەو هەمووە خەڵکەدا بجەنگن و ، ناچار ئەبن بە خوێن دان رازیی ببن . ئەو کاتە ئێمەش خوێنەکەی بۆیان کۆ ئەکەینەوە ..

ریش سپیی نەجدی ( واتە ئیبلیس ) وتی : قسە ئەمەیە کە ئەم پیاوە کردی ، ئەم رایە باشە و هیچ رایەکی تر بە کەڵك نایەت . بەم شێوەیە خەڵکەکە لەسەر ئەم رایە رێك کەوتن و ، پاشان بلاوەیان لێ کرد ..

کافرەکان بڕیارێکیان دا ، بەو هیوایەوە کە رووناکیی خوا لەسەر زەویی‌دا بکوژێننەوە ، خوای گەورەش بڕیاری داوە کە بە هۆی قورئانی پیرۆزەوە رێبازی خواناسان بە ئادەمی‌یەکان بگەیەنێ .. مرۆڤەکان هیدایەت بدات .. دوو هێز کەوتنە کار ، بەڵام دژ بە یەکتریی .. هێزێکی یەکجار بالادەست و ، هێزێکی یەکجارلاواز ، کەوتنە زۆرانبازیی ..

کە بڕیارەکەیان دا خوای گەورە جیبریلی ناردە خوارەوە بۆ لای پێغەمبەری ئازیز ﷺ و هەواڵی دایە کە کافران چ نیازێکی پیسیان کردووە و ، خوای گەورە فەرمانی وەهایە ئەمشەوی داهاتوو لەسەر جێگاکەی خۆی نەخەوێ ، بەڵکو هەر شەو کۆچ بکات ..

لەو بارەیەوە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و ، لە فێڵ و تەڵەکەی کافران ئاگاداری کرد ، کە ویستوویانە بەندی بکەن هەتا بمرێ ، یان دەری بکەن و لە مەککە دووری بخەنەوە ، یان بی‌کوژن وکۆتایی بە باسەکەی بێت .. جا دڵ خۆشیی ئەدایەوە کە ئەوانە لەبەردەم هێز و دەسەڵات و تەگبیری خوای گەورەدا یەکجار دەستە پاچەن و هیچیان پێ ناکرێ ، کە ئەی‌فەرموو :

﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ ﴾ ( الأنفال : ٣٠ ) .[٢٧٣]

کە جیبریل سەلامی لێ بێ ئەم هەواڵەی هێنا ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە قوڵەی گەرمای نیوەڕۆدا تەشریفی بۆ ماڵی ئەبوبەکر برد ، تا هەواڵی کۆچ‌کردنی هەردووکیانی پێ بدات . رۆژانی تر پێغەمبەری خوا ﷺ دوو جار ، بەیانیان و ئێواران ، سەری لە ماڵی ئەبوبەکر ئەدا .. عائیشە ئەڵێت :

---

[٢٧٣] هەندێ وتوویانە لە مەککە و ، هەندێ وتوویانە لە کاتی کۆچ کردندا و ، هەندێکیش وتوویانە لە مەدینە هاتۆتە خوارەوە .

ڕۆژێکیان لە ماڵی خۆمان دانیشتبووین و، لە قوڵەی نیوەڕۆدا یەکێ بە ئەبوبەکری وت : [٢٧٤] ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ سەروچاوی بەستووە و لەم ساتەدا تەشریفی هێناوە کە لەم کاتەدا تەشریفی نەهێناوە . ئەبوبەکر فەرمووی : دایك و باوکم بە قوربانی بن ، بەخوا لەم کاتەدا کارێك هێناویەتی . پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت و ، ئیزنی هاتنە ژوورەوەی خواست و ، ئەوانیش ئیزنیان دا و ، تەشریفی هاتە ژوورەوە . ئەبوبەکر لەسەر قەڵەوێرەکە کشایەوە هەتا ئەو لەسەری دانیشت . پاشان بە ئەبوبەکری فەرموو : (( أخرج مَن عندك )) . فەرمووی : کێت لەلایە با بچێتە دەرەوە . ئەبوبەکریش فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! باوکم بە قوربانت بێ ، خێزانەکەی خۆتە . [٢٧٥]

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( فإني قد أذن لي في الخروج )) . فەرمووی : ماوەی منیش دراوە کۆچ بکەم . ئەبوبەکر لە خۆشیانا دەستی بە گریان کرد و فەرمووی : ئەمەوێ هاوەڵت بم ، ئەی پێغەمبەری خوا . ئەویش فەرمووی : (( نعم )) .

عائیشە ئەڵێت : دە بەخوا بەر لەو ڕۆژە هیچ کات نەمزانیوە کەسێك لە خۆشیانا گریا بێ ، هەتا ئەو ڕۆژە چاوم لێ بوو کە ئەبوبەکر ئەگریا !!

پاشان ئەبوبەکر فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەم دوو وشترەم بۆ ئەمە ئامادە کردووە ، جا ، باوکم بە قوربانت بێ ، یەکێ لەم دوو وشترەم بۆ تۆ . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( بالثمن )) . فەرمووی : بەو مەرجەی پارەکەیت بۆ بگێڕمەوە . [٢٧٦]

دوای ئەم تەگبیرە عەبدوڵڵای کوڕی ئورەیقیطیان بە کرێ گرت ، کە پیاوێك بوو لە نەوەی دەئلی کوڕی بیکر و ، دایکیشی لە نەوەی سەهمی کوڕی عەمر بوو و ، هێشتا موسڵمان نەبووبوو .. بە کرێیان گرت ، تا ڕێیان پیشان بدات و ، ئەو دوو

---

[٢٧٤] لەوە ئەچێ ئەسمای کچی ئەبوبەکر بێت .

[٢٧٥] لە صەحیحی بوخارییدا ئەفەرموێ : (( إنما هم أهلك )) . چونکە عائیشە دەستگیرانی بووە و ئەسمائیش بۆتە ژن خوشکی . بەڵام لە سیرەدا ئەفەرموێ : دوو کچەکەمن .

[٢٧٦] خۆ ئاگادارین کە لە سەردەمی مەککەدا ئەبوبەکر چیی سامانی هەبوو لە پێناوی خوا و پێغەمبەرەکەیدا خەرجی کرد و ، ئەوەش کە مابوویەوە ڕۆژی کۆچ کردن لەگەڵ خۆیدا بردی و هیچی بۆ مناڵەکانی بەجێ نەهێشتبوو . بەڵام لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆشە مەسرەفی هیجرەت ، بە بۆنەی ئەجر و پاداشتیەوە لەسەر خۆی بێت و بایی چوارصەد دیرهەمیش بووە .

وشترەش كە ئەبوبەكر ئامادەى كردبوون دايە دەستى عەبدوڵلاّ ، تا بەخێويان بكات بۆ كاتى ديارييى كراو ..

دواى ئەوەى كە نەخشەى كۆچ‌كردنيان كێشا ، پێغەمبەرى خوا ﷺ گەڕايەوە ماڵى خۆيان و چاوەڕوان بوو كە شەو بێت .

لە لايەكى ترەوە ئەسماء و عائيشەش بەشداريى بەڕێ‌خستنى هەردوو كۆچ كەريان كرد ، ئەويش بە پێچانەوەى خۆراكى پێويست . خواردنەكەيان خستە ناو دەفرێكەوە كە لە پێست دروست كرا بوو و ، كە ويستيان دەمى دەفرەكە ببەستن هيچيان دەست نەكەوت ، ناچار خاتوو ئەسماء پشتوێنەكەى پشتى خۆى كردەوە و كردى بە دوو كەرتەوە و ، بە كەرتێكى دەمى دەفرەكەى بەست و ، كەرتەكەى تريشى بەستەوە لە پشتى خۆى .

لاى ئيبن سەعديش وەها هاتووە كە پشتوێنەكەى كردووە بە دوو كەرتەوە و ، هەردوو كەرتەكەشى بۆ بەستنى دەمى دەفرەكە و دەمى كوندەكەى تر بەكار هێناوە ، بۆيە ناونرا ( ذات النطاقين ـ خاوەن دوو پشتوێنەكە) .

لە سيرەى ئيبن هيشام‌دا وەها هاتووە كە چيرۆكى ئەم پشتوێنە دواى دەرچوون لە ئەشكەوتەكە رووى داوە ، كاتێك كە ئەو پياوەى بە كرێيان گرتبوو هەردوو وشترەكەى هێناوە ، بەلاّم لە صەحيحى بوخارييدا ـ كە ديارە راسترە ـ وەها هاتووە كە ئەمە لە ماڵى ئەبوبەكردا رووى داوە پێش دەرچوونيان .

ئەو تاوان‌بارانەى كە زياترحەزيان لە دژايەتيى ئيسلام بوو ، ئەو رۆژە هەر خەريكى خۆئامادەكردن بوون بۆ جێبەجێ كردنى ئەو نەخشەيەى كە سەر لە بەيانيى پەرلەمانى مەككە ( دار الندوة ) بڕيارى لەسەر دابوو و ، لەناو ئەو تاوان بارانەش‌دا يانزە كەسيان بۆ سەرۆكى ئەو كارە هەڵ بژارد كە ئەمانە بوون :

ئەبوجەهلى‌كوڕى هيشام و ، حەكەمى‌كوڕى ئەبولعاص و ، عوقبەى كوڕى ئەبوموعيط و ، نەضرى كوڕى حاريث و ، ئومەييەى كوڕى خەلەف و ، زومعەى كوڕى ئەسوەد و ، طوعەيمەى كوڕى عەديى و ، ئەبولەهەب و ، ئوبەى كوڕى خەلەف و ، نەبيهى‌كوڕى حەججاج و ، مونەببيهى كوڕى حەججاج .

دواى ئەوەى كە پێغەمبەرى خواش ﷺ هەواڵى بە ئەبوبەكر دا و ، نەخشەى كۆچ كردنيان كێشا ، گەڕايەوە بۆ ماڵەوە . ئەوەبوو جيبريل سەلامى لێ بێ فەرمانى پيا دابوو كە شەو لەسەر جێگەكەى خۆى نەخەوێت .

کە دنیا تاریك داهات ، گەنجە قورەیشی‌یەکان ، کە فەرمانی کوشتنی ئازیزیان وەرگرتبوو ، هەموو پێکەوە هاتنە بەر دەرگاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و گەمارۆی ماڵەکەیان دا ، تا بزانن کەی ئەخەوێت و هێرش بکەنە سەری .. هەر یەکە بۆ خۆی شمشێری بە دەستەوە گرتبوو و چاوەڕوانی ئەوەبوو بە یەکجار هەڵمەتی بەرنە سەر .

ئەو ستەم‌کارانە متمانەی تەواویان بە سەرکەوتنی نەخشەکەیان هەبوو ، هەتا ئەوەبوو ئەبوجەهل بە فیز و دەمارێکەوە وەستا و ، بە گاڵتە و سووکایەتی‌یەوە رووی لە گەنجە شمشێر بە دەستەکان کرد و وتی : وەهای دەر ئەبڕێ کە ئەگەر ئێوە لەم کارەی‌دا دوای بکەون ، ئەبنە پادشای عەرەب و عەجەم و ، پاشانیش دوای مردنتان زیندوو ئەکرێنەوە و ، بە وێنەی باخ و باخاتەکانی ئوردن بەهەشتتان پێشکەش ئەکرێت ، خۆ ئەگەر وا نەکەن ئەوا سەربڕین بەشتانە و ، پاشانیش کە دوای مردنتان زیندوو کرانەوە ، ئەخرێنە ناو ئاگرەوە و ئەسووتێنرێن .

کاتی دیاریی‌کراو بۆ جێبەجێ‌کردنی ئەم پیلانە نامەردانەیە دوای نیوەشەو بوو .. بۆیە هەموویان بە وریایی‌یەوە چاوەڕوانی سەعاتی سفریان ئەکرد .. ئەوان نەخشەیەکیان ئەویست و ، خوای بەدەسەلاتیش نەخشەیەکی تر ..

هەرچەند قورەیش هەرهەموویان خەریك بوون تا ئەم کارەیان بە جوانیی جێبەجێ بکەن ، خوای گەورە دۆڕان و شەرمەزاریی دنیا و قیامەتی کردە بەشیان ..

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەورگیرانی ماڵەکەی ئاگادار بوو و ، شوێنی مەلاس‌دانی گەنجە شمشێر بە دەستەکانی زانیی ، هەستی کرد کە پێویستە بە وردیی نەخشە بکێشن ، چونکە هەڵوێستەکە پڕ مەترسی‌یە و ، وریایی ئەوێ .. بۆ ئەمە فەرمانی بە ئیمام عەلیی دا ، کە ئەو کاتە گەنجێك بوو و ، پێی فەرموو : (( نَم على فِراشي ، وتَسَجَّ ببردي هذا الحضرمي الأخضر، فإنه لن يخلص إليك منهم شيء تكرهه )) . فەرمانی بەسەردا دا کە لە نوێنەکەی خۆی‌دا بخەوێ و ، ئەو بوردە سەوزە حەضرەمی‌یەشی بدا بە خۆی‌دا و ، بەڵێنیشی پێ دا کە هیچ خراپەیەك لەلایەن ئەو گەنجانەوە نایەتە رێی .

ئیمام عەلیی بەوپەڕی سنگ فراوانی‌یەوە گوێڕایەڵی فەرمان بوو و ، لەسەر نوێنەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت و بوردەکەشی دا بە خۆی‌دا .. بەمە ئیمام بووە یەکەم گەنجێك لە ئیسلام‌دا کە ئامادە بێت خۆی بکاتە قوربانیی ، بەوەی کە

خۆی بکاتە قەڵغان بۆ پارێزگاریی پێغەمبەر ﷺ ، بە مەرجێ ئەیزانیی کە چەند مەترێك لە شمشێر و رمی ژەهراوییکراوی کافرانەوە دوورە ..

ئەم نەخشە جوانە جیبریل سەلامی لێ بێ ئاماژەی پێ کرد ، کە ئەوەبوو سەری لە بتپەرستەکان شێواند ، کە خێرا خێرا لە درزی دەرگاکەوە سەیریان ئەکرد وا کەسێك خەوتووە و ، واشیان ئەزانی کە پێغەمبەری خوایە ﷺ ، کەچیی عەلیی گەنج و پاڵەوان و فیداکار بوو خوا لێی رازیی بێ ..

کاتی ئەوە هات کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ دەر بچێ .. بتپەرستانیش وان لە پشت دەرگاوە ..

بتپەرستان هاتوون بە دەم نەخشەی شەیتانەوە .. لە هەمان کاتدا پێغەمبەری خواش ﷺ ئەیەوێت بچێت بە دەم نەخشەی پەروەردگاریەوە ..

جا چۆن بڕوا ، وا کافران دەوری ماڵەکەیان گرتووە و شمشێریان لە مشتدایە ؟

موسڵمان تا کوێ ئەتوانێ کار ئەنجام بدا پێویستە هەوڵ بدا و ، لە هەر کوێش توانای تەواو بوو ، ئەوا پشت بە خوا ئەبەستێ .. چونکە کار کاری خوایە و ، خۆی تەگبیری بۆ ئەکات .. بەم یەقینەوە ئازیزمان ﷺ خۆی ئامادەی دەرچوون کرد ..

بەشێك لە شەو رۆیشتبوو .. خوای گەورە فەرمانی دەرکرد بۆ چاوەکانیان تا لە بینینی ئازیز بکەون .. چاوەکانیش سەربازی خوا بوون و ، فەرمانبەردار بوون .. هاتە دەرەوە و ، مشتێك خۆڵیشی هەڵ گرت و بۆ زیاتر گاڵتەپێکردنیان خۆڵی وەشاند بە سەریاندا و دەستیشی بە خوێندنی قورئانی پیرۆز کرد :

﴿يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ۝٢ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝٣ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ۝٤ تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ۝٥ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ ۝٦ لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٧ إِنَّا جَعَلۡنَا فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ أَغۡلَٰلٗا فَهِيَ إِلَى ٱلۡأَذۡقَانِ فَهُم مُّقۡمَحُونَ ۝٨ وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ۝٩﴾ ( يس : ١ ـ ٩ ) .

پیاوێکیان نەما خۆڵ بە سەریدا نەکرێت .. بە سوپاسێکی زۆری خواوە ئازیزمان بەرەو کاری خۆی ، بۆ ماڵی ئەبوبەکر رۆیشت و ، بتپەرستانیش

چاوەڕوان بوون کە نووستووی ژێر بوردە صەوزە حەضرەمی‌یەکە بێتە دەرەوە و دەستی لێ بووەشێنن ..

پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەلە خۆی گەیاندە مالّی ئەبوبەکر و ، ئەبوبەکریش چاوەڕوانی هاتنی ئەو بوو ، تا گەشتەکەیان دەست پێ بکەن ..

شمشێر بە دەستەکان هەر چاوەڕوان بوون سەعاتی سفر بێتە بەرەوە ، کەچیی لە ناکاو پیاوێك لەولاوە هات و چاوی بەو گەنجانە کەوت کە لە دەرگادا وەستابوون ، پرسیی : چاوەڕوانی چیین ؟

وتیان : موحەممەد. وتی : خوا زەرەرۆمەندی کردوون . بەخوا موحەممەد لە ناوتان‌دا دەرچووە و ، خۆلّیشی کردووە بە سەری هەمووتان‌دا و ، چووە بە لای کاری خۆیەوە . نابینن چیتان بەسەر هاتووە ؟! هەر یەکەیان دەستی دا لە سەری خۆی ئەبینیێ خۆلّی لەسەر وەستاوە . لەگەلّ ئەوەش‌دا هێشتا بڕوایان نەئەکرد ، لە درزی دەرگاکەوە سەیری ئەو نووستووەی ناو ژوورەکەیان ئەکرد کە بوردەکەی بە خۆی‌دا دابوو و ، ئەیان وت : بەخوا ئەوە موحەممەدە خەوتووە و بوردەکەی بە خۆی‌دا داوە .

هەر وا مانەوە هەتا رۆژ بوویەوە و دنیا رووناك بوو و ، چوونە ژوورەوە ئەبینن ئیمام عەلی‌یە ! وتیان : کوا موحەممەد ؟ فەرمووی : نازانم . ئیتر زانی‌یان کە لە دەستیان دەرچووە . بەمە تووشی خەم و خەفەتێکی زۆر هاتن بۆ لە دەست چوونی ئەو هەلە و ، سەرنەگرتنی نەخشە پیسەکەیان .

ئەم کۆچەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی ( ٢٧ ) ی مانگی صەفەری سالّی چواردەهەمی هاتنی وەحیی‌دا و ، بەرامبەر بە شەوی ١٣/١٢ ی مانگی ئەیلوولی سالّی ( ٦٢٢ ) ی زاینیی بوو . بەلاّم ئیبن ئیسحاق وتوویە لە هیلالی رەبیعی یەکەم‌دا بووە .

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەلّ ئەبوبەکردا ئاو و خواردنیان لەگەلّ خۆیان برد و ، لە دەرگایەکی بچووکی دواوەی مالّەکەیانەوە دەرچوون تا هیچ کەس نەیان‌بینیێ و ، بەر لەوەی رۆژ ببێتەوە مەککە بەجێ بهێلّن .

جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی‌زانیی کە قورەیش ئەوپەڕی هەولّ ئەدەن بۆ دۆزینەوە و دەست‌خستنی و ، ئەو رێیەش کە ئەوان ئەی‌گرنە بەر ئەو رێیەیە کە

بەرەو مەدینە ، بەرەو باکوور ئەڕوات ، بۆیە ڕێیەکی تری پێچەوانەی ئەو ڕێیەی گرتە بەر ، کە ئەویش ڕێی بەرەو باشووری مەککە بوو ، کە بەرەو یەمەن ئەڕوات.

بۆ ماوەی پێنج میل بەم ڕێیەدا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە چیای ثەور ، کە چیایەکی بڵند و سەرکەشە و ، ڕێگاکەی سەختە و ، سەرکەوتن بۆی یەکجار گرانە و ، بەردی زۆری تێدایە و ، تا ئەوەبوو هەردوو پێی پێغەمبەری خوا ﷺ زامدار بوون . بۆیە ئەبوبەکر ناچار بوو کە گەیشتنە شاخ پێغەمبەری خوا بگرێت بە کۆڵەوە ، تا بە هەر حاڵێك بوو گەیاندییە ئەشکەوتێك لەسەر لوتکەی چیاکە ، کە بە ئەشکەوتی ثەور ناسراوە .

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی مەککە بەجێ بهێڵێ ڕووی کردە کەعبەی پیرۆز و فەرمووی : (( واللە إنك لأحب أرض اللە إلي ، وإنك لأحب أرض اللە إلى اللە، ولولا أن أهلك أخرجوني منك ما خرجت )) . رواه أحمد والترمذي وصححه .

فەرمووی : بەخوا تۆ خۆشەویستترین زەویی خوای بە لامەوە و ، خۆشەویست ترین زەویی خوایشی بەلای خواوە . خۆ ئەگەر خەڵکەکەت دەریان نەپەڕاندمایە بە جێم نەئەهێشتی .

لە ڕێگادا کە بەرەو ئەشکەوتەکە ئەڕۆیشتن پێغەمبەریخوا ﷺ کارێکی سەیری بە ئەبوبەکرەوە دیی .. سەیری کرد جارێك پێشی ئەکەوێ و ، جارێکیش دوای ئەکەوێ .. جارێك لەلای ڕاستەوە و جارێکیش لەلای چەپەوە ئەڕوا !! پێغەمبەری خوا ﷺبۆ ئەمە پرسیاری لێ کرد . ئەویش فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوەم بیر ئەکەوێتەوە کە کافران بە دواتا بێن منیش لە دواتەوە ئەڕۆم و ، ئەوەشم بیر ئەکەوێتەوە کە ڕێت لێ بگرن منیش لە پێشتەوە ئەڕۆم . جارێکیش لای ڕاست و جارێکیش لای چەپت لێ ئەگرم ، چونکە دڵم لێت بێخەم نیە !

فەرمووی : (( یا أبابكر! لو كان شيء لأحببت أن يكون بك دوني ؟ )) .

فەرمووی : ئەبوبەکر ! ئەگەر شتێ ڕوو بدات پێت خۆشە تووشی خۆت ببێ نەك من ؟! فەرمووی : بەڵێ ، بەو خوایەی کە حەقی پێدا ڕەوانە کردووی !!

بەردەوام لە تاریکیی شەودا و ، لە نێو بەرد و چەم و دۆڵدا ڕێیان بڕیی هەتا گەیشتنە ئەشکەوتەکە .

کاتێکیش گەیشتنە لای ئەشکەوتەکە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی بچێتە ژوورەوە ، کەچیی ئەبوبەکر نەیهێشت پێشی بکەوێ و پێی فەرموو : لە شوێنی

خۆت بوەستە هەتا بزانم کە هیچی تێدا نیە ، خۆ ئەگەر شتێکی تێدابوو با تووشی من بێ نەك تۆ . کە چووە ژوورەوە باش پیایا گەڕا ، چەند کونێکی تێدا بوو ئیزارەکەی لەت کرد و ئەو کونانەی پێ گرت و تەنها دوو کونیان مان ، بە هەردوو پاژنەی پێی ئەوانیشی گرت ، پاشان بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: وەرە ژوورەوە . کە چووە ژوورەوە ئەوەندە ماندوو بوو[٢٧٧] سەری خستە کۆشی ئەبوبەکر و پێی ئەوی کردە سەرین و خەوت .

بە فەرمانی خوا یەکێ لەو دوو کونەی کە ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ بە پاژنەی پێی گرتنی مارێکی تێدا بوو و ئەبوبەکری گەست .. لەبەر خاتری پێغەمبەری خواش ﷺ تا خەوەکەی لێ تێك نەچێ و بەخەبەر نەبێتەوە ، ئەبوبەکر نەیتوانیی بجوولێتەوە . بەڵام ئەوەندە ئازاری گەستنەکە زۆر بوو ، فرمێسك لە چاوەکانی هاتنە خوارەوە .. چاری ئەوانی پێ نەکرا .. کەوتنە سەر دەم و چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش بەخەبەر هات .. فەرمووی : (( ما لك يا أبابكر ؟ )). فەرمووی : ئەبوبەکر! ئەوە چیتە؟ فەرمووی : گەزرام ، دایك و باوکم بە قوربانت بن . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ تفی لە شوێنی گەستنەکە دا و بە فەرمانی خوا چاك بوویەوە ..[٢٧٨]

ئەوەش ریوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك لەگەڵ ئەبوبەکری هاوەڵیدا خوا لێی رازیی بێ چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە خوای گەورە فەرمانی دا درەختێك لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا سەوز بوو و لقەکانی دەرگاکەیان داپۆشیی و، خوای گەورە بە ئیلهام فەرمانیشی بە جاڵجاڵۆکەدا دا تا لقەکانی ئەو درەختە بە دەزووەکەی بتەنێ و ، بە ئیلهامیش فەرمانی دا دوو کۆترە کێویلە لە نێو لقەکانی ئەو درەختەدا هێلانەیان بەست و هێلکەیان تیا کرد .[٢٧٩] ئەم سێ نیشانەیە

---

[٢٧٧] مامۆستا ( محمد بن محمد أبو شهبة ) لە ( السيرة النبوية في ضوء القرآن والسنة ) ، بەرگی یەکەم لاپەرە ( ٤٧٨ ) دا باسی ئەوە ئەکات کە ئەو رێیە بۆ ئەشکەوت یەکجار سەختە و ، ئەوان لە سەردەمی گەنجییدا کە سەرکەوتوون سەعاتێك زیاتریان پێ چووە و ، ئەوەندە بەردیشی زۆر بووە پێڵاوەکانیان لە پێیانا دراون . ئەی داخۆ کەسێك لە شەوی تاریك دا و دوژمن راوی بنێ ئەو رێیە چەند بۆی نارەحەت بوو بێت ؟

[٢٧٨] ئەم چیرۆکە رەزینی عەبدەریی لە عومەری کوڕی خەططابەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەتی کردووە و ، ئەوەشی تێدا هاتووە کە دوایێ ئەو ژەهرە لە کاتی مردنیدا کاریگەریی هەبووە .

[٢٧٩] ئیمام ئەحمەد و بەززار هەر یەکە لە موسنەدەکەی خۆیدا و ، قاسمی کوڕی ثابیتیش لە ( الدلائل ) دا ( شرح المواهب : ١ / ٢٩٩ ) حافیظ ئیبن عەساکیریش ( البداية والنهاية : ٣ / ١٨١ ، ١٨٢) ئەم

کاریگەریی چاکیان هەبوو لە چەواشەکردنی موشریکەکان تا بگەڕێنەوە و نەچنە ناو ئەشکەوتەکەوە .

ئەم دەرچوونەی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکجار نهێنیی بوو ، بۆیە تەنها ئەبوبەکری صددیق و ئیمام عەلیی بەو دەرچوونەیان ئەزانیی ، کە ئەوەبوو فەرمانی بە ئیمام‌دا دا لە نوێنەکەی‌دا بخەوێ ، تا کافران چەواشە بکات و ، کە رۆژیشی لێ بوویەوە چیی سپاردە و شتی بەنرخی لە لا دانرا بوو ، بیداتەوە دەست خاوەنەکانیان . چونکە هەر کەسێ لە مەککەدا چشتێکی نەختینەی ببوایە ، لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ دای ئەنا ، چونکە جێی متمانەی هەموان بوو . دیارە ئەو کەل و پەل و زێڕ و زیوانە هی موسڵمانەکان نەبوون ، بەڵکو هی کافرەکان بوو. چونکە موسڵمانەکان مەککەیان بەجێ هێشتبوو و ، مەککە تەنها بت پەرستانی تێدا مابوونەوە . ئەمەش ئەوپەڕی متمانە بوو کە کافران بە پێغەمبەری خوایان ﷺ هەبوو ، کە سیانزە ساڵی رەبەق بوو لە دژایەتیی و زۆرانبازیی‌دا بوون و ، هەوڵی تەواویان ئەدا کە موسڵمانەکان ریشەکێش بکەن ، بە تایبەتیی برسیی‌کردنی گەورە و بچووکیان بۆ ماوەی سێ ساڵ بە پێی یاسا و بڕیارێکی ستەم کارانە .. هەر ئەو متمانەیە بوو کە سەری ئەکێشا تا کابرای کافر ویژدانی ببزوێ و خۆی بە تاوانبار بزانێ کاتێ کە ئەچوو بە گژ سوپای ئیمان‌دا .. جا مامۆستای پایەبەرز ئەبولئەعلای مەودوودیی رەحمەتی خوای لێ بێ هۆیەکی شکستی قوڕەیش لە بەدردا بۆ ئەوە ئەگێڕێتەوە کە قوڕەیشیی‌یەکان بەوە ورەیان بەردا بوو لە دڵەوە لە خۆیان ئەپرسیی : من بە گژی کێ‌دا ئەچم ؟ بە گژی موحەممەددا ، کە ئەو شەوەی رای کرد سپاردەکەی ناردەوە بۆم ؟ ئەو بیویستایە نەی ئەگێڕایەوە .. ئەمە هۆیەکی نەفسیی بوو بۆ شکانی قوڕەیش لە بەدردا .

ئێستا با سەرێك لە گەنجە شمشێر بەدەستەکان بدەینەوە ، کە لە دەرگادا وەستا بوون و ، وایان ئەزانیی ئەوەی کە نووستووە پێغەمبەرە ﷺ . هەتا لە نێوان خۆیان دا وت و وێژی ئەوەیان بوو کە کامیان لە پێشەوە شێرشی بکاتە سەر و دەست و پەلی ببەستێ . ئەوەبوو پیاوێك هات هەواڵی دانێ کە پێغەمبەری خوا لە دەستیان دەرچووە .

---

چیرۆکەیان ریوایەت کردووە .. هەروەها سەیری تەخریجی ئەمە لە ( کلیات رسائل النور : ٢ / المکتوبات / ٢١٥ ) بکە .

که قورەیش لە دەست دەرچوونی پێغەمبەریان ﷺ کەوتە گوێ چاویان پەڕی‌یە تەوقە سەریان ، بۆیە کەوتنە گەڕان بە دوایا و ، بەڵێنیان دا کە هەر کەسێ دەستی بخات ، چ بە زیندوویی و چ بە مردوویی ، صەد وشتر بکەنە خەڵاتی و ، ئەوانەش کە لە شوێن پێ هەڵ گرتن‌دا شارەزایی‌یان هەبوو هەموویان ناردن ، تا هەموو ڕێگاکان بگەڕێن و شوێن پێی هەڵ بگرن و ، بی‌دۆزنەوە ، کە لەوانە : کەرزی کوڕی عەلقەمە و ، سوراقەی کوڕی جەعشەم بوون - کەوتنە شوێنیان هەتا گەیشتنە کێوی ( ثەور ) و ، سەرکەوتنە سەر چیاکە و گەیشتنە دەمی ئەشکەوتەکە .

لێرەدا قورەیشی‌یەکان سەرسام مان : ئەگەر چووبنە ناو ئەشکەوتەکەوە ، ئەی چۆن داوی جاڵجاڵۆکەکە نەدڕاوە و ، هێلکەی کۆترەکەش نەشکاون؟

ئایا پێویست ئەکات بچنە ناو ئەشکەوتەکەوە؟ یەکێکیان ویستی بچێتە ژوورەوە ، ئەوەبوو یەکێکی تریان وتی : ئەم داوی جاڵجاڵۆکەیە هی پێش لە دایك بوونی موحەممەدە!!

بەم شێوەیە خوا کوێری کردن و وازیان لە ئازیز و هاوەڵەکەی هێنا..

بەڵام ئەوەبوو ماوەیەك لە بەردەم ئەشکەوتەکەدا وەستان و قسە و باسیان ئەکرد ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکری هاوەڵی گوێیان لێیان بوو .. هەتا ئەبوبەکر زۆر ئەترسا پێیان بزانن و پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی ناڕەحەتیی ببێ ، بۆیە ئەی‌فەرموو : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر کەسێکیان سەیری ژێر پێی بکات ئەمان بینێ .. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : (( ما ظنك ، يا أبابكر! بإثنين الله ثالثهما ؟ )) فەرمووی : ئەبوبەکر! ئەگەر خوای گەورە چاودێری دوو کەس بێ و ، لە پشتیان بێت ، ئەبێ کێ بتوانێ زیانیان پێ بگەیەنێ ؟ لە ڕیوایەتێکی تردا ئەوەش هاتووە کە کافرەکان هەموو شاخەکانی مەککە ئەگەڕێن ، تا ئەگەنە ئەو شاخەی کە ئەوانی لێ بوو .. ئەبوبەکر چاوی لە پیاوێك بوو کە بەرامبەر بە دەرگای ئەشکەوتەکە وەستا بوو ، بۆیە فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمان بینێ . فەرمووی : (( كلا إن ملائكة تسترنا بأجنحتها )) . فەرمووی : نەخێر مەلائیکەتێك بە باڵەکانی ئێمەی داپۆشیوە . ئەو پیاوە دانیشت و ڕوو بە ڕووی ئەشکەوتەکە میزی کرد . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لوكان يرانا ما

فعل هذا )) . فەرمووی : گەر ئێمەی بدیایە وەهای نەئەکرد . خوای گەورەش قورئانی ناردە خوارەوە کە ئەیفەرموو :

﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَـٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾ ( التوبة : ٤٠ ) .

لە هەمان کاتدا گەنجەکان کە چوونە ژوورەوە و دییان وا عەلیی لەوێیە ، رقیان هەستا و ، رایان کێشا هەتا گەیاندیانە کەعبە و ، بۆ ماوەی سەعاتێکیش بەندیان کرد ، بەو هیوایەی هەواڵێکیان لێوەی دەستگیر ببێ .

جا کە لە عەلییەوە هیچیان دەست نەکەوت ، خۆیان گەیاندە ماڵی ئەبوبەکر .. ئەسمای کچی ئەبوبەکر ، خوا لێیان رازیی بێ ، ئەڵێت : کە پێغەمبەری خوا ﷺ و باوکم کۆچیان کرد ، چەند پیاوێکی قورەیشیی ، کە ئەبوجەهلیشیان لەگەڵدا بوو، هاتنە بەر دەرگاکەمان و وەستان . منیش هاتمە دەرەوە بە دەمیانەوە . وتیان : ئەی کچی ئەبوبەکر ! باوکت لە کوێیە ؟ وتم : بەخوا نازانم باوکم لە کوێیە . ئەبوجەهل ، کە پیاوێکی بەدڕەفتاری پیس بوو ، دەستی بەرز کردەوە و زللەیەکی لێ دام و گوارەکەی گوێمی پەڕاند !!

نامەردی بێئیمان ، لە هەموو چەرخێكدا ئەمە رەفتاریەتی .. سزا و ئازاردانی ئافرەت و منداڵ بە ئازایەتیی ئەزانێ ..

هەروەها خاتو ئەسماء ئەڵێت : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر کۆچیان کرد ، ئەبوبەکر هەموو سامانەکەی لەگەڵ خۆیدا برد ، کە پێنج یان شەش هەزار دیرهەم بوو . کە بردی و رۆیشت ئەبوقوحافەی باپیرم کە چاوەکانی لە دەست دابوون هات بۆ لامان و ، وتی : بەخوا من وەهای ئەبینم وەك خۆی رۆیشتووە سامانەکەشی بردووە و جەرگی ئێوەی بریوە . منیش وتم : نەخێر بابەگیان ! خێر و بەرەکەتێکی زۆری بۆمان بەجێ هێشتووە . ئەڵێت : کۆمەڵە بەردێکم کۆکردنەوە و لە گۆشەیەکی ماڵەکەدا ، کە هەموو جارێ باوکم پارەی تیا دائەنا ، دام نان و ، بە کراسێك دام پۆشین و ، دەستیم گرت و بردم و پێم وت : بابەگیان ! دەست بخەرە سەر ئەمە ، ئەویش دەستی خستە سەری و وتی : خراپ

نیە ، ئەگەر ئەمەی بۆتان بەجێ هێشتبێ چاکی کردووە و ، ئەمەش بەشتان ئەکات .. نا بەخوا هیچی بۆمان بەجێ نەهێشتبوو ، بەلاّم من ویستم بەوە دلّی ریش سپی‌یەکە دابمرکێنمەوە .

بەلّێ ، مالّ و مندالّی ئەبوبەکر ، هەتا شوانەکەشی ، هەر هەموویان بە دلّ و بە گیان خزمەتی ئیسلامیان ئەکرد و ، باکیان لە قوربانیی‌دان و خۆفیداکردن نەبوو ، بە تایبەت لە کاتی کۆچ‌کردن‌دا .. ئەوەبوو خاتو ئەسماء پشتوێنەکەی لەت کرد و کەلوپەلی سەفەری پێچایەوە بۆیان . هەروەها عەبدوللاّی کوڕی ئەبوبەکر کە لە تافی لاویی دابوو و ، عامیری کوڕی فوهەیرەش ، کە بەندەی ئازادکراوی ئەبوبەکر بوو و ، شوانی مەڕەکانی بوو ، هەر یەکەیان دەوری گرنگیان بینیی .

بوخاریی لە خاتو عائیشەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە :

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر خۆیان گەیاندە ئەشکەوتێکی چیای ثەور و ، لەوێ سێ شەو مانەوە . عەبدوللاّی کوڕی ئەبوبەکریش ، کە تازە لاوێکی ژیکەلّە و عاقلّ بوو ، شەو لە ئەشکەوتەکەدا لەلایان ئەمایەوە و ، بەیانیی زوو کە هێشتا تاریك بوو ئەوانی بەجێ ئەهێشت و خۆی ئەگەیاندەوە لای قوڕەیش هەروەك شەو لە مەککەدا خەوتبێ . هەر کە نەخشە و پیلانێکی قوڕەیشی ببیستایە جوان لێی ئەگەیشت و ، کە ئێوارە تاریکی ئەکرد هەوالّەکەی ئەهێنایەوە بۆیان و ، عامیری کوڕی فوهەیرەی مەولای ئەبوبەکریش ، کە بڕکە مەڕێکی لە نزیکیانا ئەلەوەڕاند ، کە سەعاتێك لە شەو تێ ئەپەڕیی مەڕەکانی ئەهێنایەوە لای ئەوان ، تا ئەوانیش ئەو شەوە شیر و ماستی بڕکە مەڕەکە بخۆن و، لەگەلّ بەرەبەیانیش‌دا عامیری کوڕی فوهەیرە لە مەڕەکان ئەخوڕیی .. هەموو شەوێ ئەمەی دووبارە ئەکردەوە .

عامیر بەم کارەی شوێن پێ‌کانی عەبدوللاّی بە بڕکە مەڕەکە ئەسڕیەوە ، تا بە بۆنەی شوێن پێی ئەوەوە ، کافران نەیان دۆزنەوە ..

بەیهەقیی لە ( دلائل النبوة ) دا ، وەك لە ( الكنـز الجديـد : ١٣٥/١٤ ) دا هاتووە لە ئیبن سیرینەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە:

لە سەردەمی عومەردا خوا لێی رازیی بێ ناوی چەند پیاوێك برا ، هەر وەك فەزلّی عومەر بەسەر ئەبوبەکردا بدەن ، خوا لە هەردووکیان رازیی بێ ، ئەمە گەیشتەوە بە عومەر ، ئەویش فەرمووی : بەخوا ! تاقە شەوێکی ئەبوبەکر لە ئالی

عومەر چاکترە و ، تاقە رۆژێکیشی لە ئالی عومەر چاکترە . ئەوەبوو ئەو شەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو ئەشکەوتەکە ، لەگەڵ ئەبوبەکردا کەوتە رێ ، ئەبوبەکر ساتێك لە پێشیەوە و ، ساتێکیش لە دوایەوە ئەڕۆی ، تا کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی پێ کرد فەرمووی : (( یا أبابکر! ما لك تمشي ساعة خلفي وساعة بين يَدَيَّ ؟ )) فەرمووی: ئەبوبەکر! ئەوە چیتە ساتێك لە دوامەوە ساتێکیش لە پێشمەوە ئەڕۆی ؟ فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! کە ئەوەم بیر ئەکەوێتەوە لە دواتەوە بێن بۆت لە دواتەوە ئەڕۆم و ، کە ئەوەشم بیر ئەکەوێتەوە کە رێت لێ بگرن ، لە پێشتەوە ئەڕۆم . فەرمووی: (( یا أبابکر! لوکان شيء لأحببتَ أن یکون بك دوني ؟ )).... هتد

سێ شەو لە ئەشکەوتەکە خۆیان حەشار دا : شەوی جومعە و ، شەممە و ، یەك شەممە . پاشان کە کافرەکان وازیان لە گەڕان هێنا ، لە ئەشکەوتەکە دەرچوون .. وەك لە پێشەوەش باس کرا پیاوێکیان لە نەوەی ( دیل ) ، کە ناوی عەبدوڵڵای کوڕی ئورەیقیط بوو ، بە کرێ گرت ئەم پیاوە زۆر شارەزای رێگا بوو و ، هاوپەیمانی ئالی عاصی کوڕی وائیلی سەهمیی بوو و ، بە وێنەی قورەیشییەکان بتپەرست بوو ، کەچیی ئەمان متمانەیان بە مەردایەتیی و دەست پاکیی ئەم پیاوە ئەکرد ، بۆیە هەردوو وشترەکەیان دایە دەستی و ، کاتیان بۆ دیاریی کرد کە دوای سێ شەو و لە بەرەبەیانی سێهەمدا بێتە بەر دەرگای ئەشکەوتی ثەور هەردوو وشترەکەش ئامادە بکات . عامیری کوڕی فوهەیرەش بۆ خزمەتکردن و یارمەتییدانیان لەگەڵیان کەوتە رێ ، کە بە نۆبە سواری وشترەکەی ئەبوبەکر ئەبوون .. بەمە بوون بە چوارکەس .

کە عەبدوڵڵای کوڕی ئورەیقیط لەگەڵیان کەوتە رێ بەرەو باشووری مەککە بردنی ، پاشان بەرەو رۆخی دەریا و لە خوارووی عوسفانەوە [٢٨٠] بردنی ، پاشان لە خوارووی ( ئەمج )ەوە بردنی ، پاشان تێ پەڕی پێکردن و ، دوای تێپەڕبوون لە قودەید لە رێگاکە کردنیە ئەوبەر و ، لەوێشەوە تێپەڕی پێ کردن و ، بەرەو ( خەڕرار ) کەوتە رێ کە نزیکی جوحفەیە .. ئەم رێگایە کە ئەوان گرتیانە بەر رێیەکی چۆڵ بوو و کەم کەس پیایا هات و چۆی ئەکرد .. دەستپێکردنی کۆچ ، لە ئەشکەوتی ثەورەوە ، لە شەوی دووشەممەی یەکەم شەوی مانگی رەبیعی

---

[٢٨٠] عوسفان : ئەکەوێتە نێوان مەککە و مەدینە کە سێ قۆناغ لە مەککەوە دوورە .

یەکەمی ساڵی یەکەمی کۆچیی بەرامبەر بە شانزەی ئەیلوولی ٦٢٢ ز بووە . هەروا لەسەر رەوتی خۆیان بەردەوام بوون هەتا ئەوەبوو لە رۆژی دووشەممەی هەشتەمی رەبیعی یەکەمی ساڵی یەکەمی کۆچیی بەرامبەر بە ٢٣ی ئەیلوولی٦٢٢ ز پێغەمبەری خوا ﷺ لە قەباء دابەزیی .

لە هەندێ ریوایەتیش‌دا لە رۆژی دووشەممەدا گەیشتوون ، کە دوانزەی رەبیعی یەکەم بووە و ، لە قوڵەی چێشتەنگاودا ، کە خەریك بووە خۆر بگاتە ناوەڕاستی ئاسمان ، لە قەباء بوونەتە میوانی نەوەی عەمری کوڕی عەوف .

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکەوێتە رێ ئەم دۆعایە ئەخوێنێ :

ئەبونوعەیم لە رێی ئیبراهیمی کوڕی سەعدەوە ، لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : پێم گەیشتووە کە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ رەزامەندیی خوا لە مەککەوە بەرەو مەدینە کۆچی کرد ، فەرمووی : (( الحمدُ لله الذي خَلَقَني ولم أكُ شيئاً ، أَللّهمَّ ! أعِني على هولِ الدنيا وبوائق الدهر، ومصائب اللَيالي والأيام . أللهم ! اصحَبني في سفري ، واخلفني في أهلي وبارِكْ لي فيما رَزَقتَني ، ولك فَذَلّلني وعلى صالحِ خُلُقي فَقَوِّمْني ، وإليكَ ربِّ فَحَبِّبْني وإلى الناسِ فلا تكلْني ، ربَّ المُستَضعفين وَأنتَ رَبِّي، أعُوذُ بوَجهكَ الكريم الذي أشرقَتْ لَه السَماوات والأرضُ وكُشفَت به الظلماتُ ، وَصَلُحَ عليه أَمرُ الأَوّلين ( والآخرين ) أن تُحلَّ عَلَيَّ غَضَبكَ ، وتُنزِلَ بِيَ سَخَطك ، أعوذُ بكَ من زَوالِ نعمَتكَ وَفُجاءَةَ نقمَتكَ ، وَتَحوُّلِ عافِيَتكَ ، وَجَميعِ سَخَطكَ ، لك (العُتبى) عِندي خَيرُ ما اَستطعْتُ وَلاَ حَولَ ولا قُوَّةَ إلا بكَ )) .كذا في البداية ( ٣ / ١٧٨) .

ئەفەرموێ : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە منی لە هیچەوە بەدیی هێنا .. خوایە! لە ترس و لەرزی دنیا و ، کارەساتی زەمانە و ، بەلا و موسیبەتی رۆژگاردا یارمەتییم بدەی .. خوایە ! خۆت هاوەڵی ئەم سەفەرم و ، سەروکارییکەری ماڵ و منالّم بە و ، فەڕ و بەرەکەتیش بخەرە ئەو رزقەمەوە کە پێمت بەخشیوە و ، لەبەر دەستی خۆتت‌دا زەلیلم بکەی و ، لەسەر چاك‌ترین رەوشتم دامەزراوم بکەی و ، پەروەردگارم ! بەلای خۆتەوە خۆشەویستم بکەیت و، نەم‌کەیتە کارێك پشت بە خەڵکیی ببەستم . ئەی پەروەردگاری منیش و ، مرۆڤە لاوازەکانیش ! پەنا بە رووی پیرۆزت ئەگرم کە ئاسمانەکان و زەویی پێی رۆشن بوونەتەوە و ، تاریکییەکان پێی رەویونەتەوە و ، کاروباری پێشینە و دواییینەی پێ چاك بووە ،

تا خەشم وقین و رەنجانت بەسەرمدا نەبارێت . پەنات پێ ئەگرم ، تا نیعمەتـەکانت لێم نەسەنرێنەوە و ، لە ناکاودا پـێم نـەنوێنیت و ، لـەش‌سـاغیی و بـێوەییم لێ نەسەنیتەوە و ، بە یەکجاریی لێم نەرەنجێیت . گەڕانەوەش لە هـەر شتێ کـە تـۆ پێت ناخۆش بێ بۆ سەر هەر شتێ کە تۆ پێت خۆش بێ چاکترین کارێکە کـە مـن بتوانم ئەنجامی بدەم و ، هەموو هەوڵ و هێزێکیش هەر بە دەستی خۆتە .

ئەوەبوو لە ڕێی کۆچ‌کردن‌دا هەندێ ڕووداو روویان دا :

**یەکەم** : بوخاریی لە ئەبوبەکری صددیق‌ەوە خوا لێـی رازیـی بـێ ریوایـەتی کردووە کە فەرموویە : شەو رێمان بڕیی و بەیانییش هەر رۆیشـتین هـەتا نزیکـەی نیوەڕۆ و ، ڕێ چۆڵ بوو و ، کەس هاتوچۆی نەئەکرد . ئەوەبوو بەردێکی بەرز هاتە ڕێمان کە سێبەری هەبوو و خۆری لێ نەکەوتبوو . لـەوێ دابـەزین و ، بـە دەسـت شوێنێکم بۆ پێغەمبەر ﷺ چاك کرد هەتا تیایا بخەوێ و فەڕوویەکم بـۆ راخسـت و وتم : بخەوە ، ئەی پێغەمبەری خوا ! خۆم چاودێرییت ئەکـەم . خـەوت و، منـیش چوومە دەرەوە تا چاوم لە دەور و بەرمان بێت ، ئەبینم وا شوانێك بە مەڕەکانیەوە بەرەو بەردەکە دێ ، تا وەك ئێمە بچێتە ژێر سێبەرەکەیەوە . وتم پێی : تۆ شـوانی کێیت ، رۆڵە؟ وتی : شوانی پیاوێکی مەدینە یان مەککەم . وتم : ئایا مەڕەکانت شیریان تێدایە ؟ وتی : بەڵێ . وتم : بۆمان ئەدۆشـیت ؟ وتـی: بـەڵێ . مـەڕێکی گرت و وتم : گوانی لە خۆڵ و موو و شتی تر پاك بکەرەوە .. شیری دۆشـی‌یە نـاو دەفرێکەوە و ، منیش دەفرێکم پێ بوو ، بۆ پێغەمبەرم هەڵ گرتبوو تا ئاوی تێـدا بخواتەوە و دەستنوێژی پێ بگرێ . هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و پێیشم نـاخۆش بوو کە لە خەو هەڵی بستێنم . کاتێ کە هەستا ئاوم کرد بەسەر شـیرەکەدا هـەتا بنی سارد بوویـەوە ، وتم : فـەرموو بخـۆرەوە ئـەی پێغەمبـەری خـوا . ئەوەنـەی خواردەوە تا من رازیی بووم ، پاشان فـەرمووی : (( ألـــم يـأن الرحيـــل ؟ )) . فەرموو: کاتی رۆیشتنمان نەهاتووە ؟ وتم : بەڵێ . فەرمووی : ئیتر کەوتینە ڕێ .

**دووهەم** : هەروەها بەیهەقیی و ، ئیبن عەساکیر لـە ئەبوبـەکرەوە خـوا لێـی رازیی بێ تەخریجیان کردووە کـە فەرموویـە : لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ لـە مەککەوە کەوتینە ڕێ ، ( لە گەشتی کۆچ‌کردن‌دا ) تا گەیشـتینە ئاوەدانی‌یـەکی عەرەب . پێغەمبەری خوا ﷺ سـەیری ماڵێکی کرد لە کەنارەوە و ، رووی لێ نا. کە دابەزین ، تەنها ئافرەتێکی لێ بوو ، ئەویش وتی : ئـەی بەنـدەی خـوا ! مـن

ئافرەتم و کەسیشم بەلاوە نیە ، ئەگەر میوان‌دارییتان ئەوێ بچن بۆ لای سەرداری هۆز .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوێی نەکرد ـ ئەمەش لای ئێوارەوە بوو ـ کوڕێکی ئافرەتەکە چەند بزنێکی خۆی دابووە بەر و هاتەوە .. دایکی پێی وت : رۆڵە ! ئەم بزن و چەقۆیە بەرە بۆ ئەو دوو پیاوە و پێیان بڵێ : دایکم ئەڵێت : ئەم بزنە سەر ببڕن و خۆتان تێر گۆشتی لێ بخۆن و بەشی ئێمەش بدەن . کاتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( إنطلق بالشفرة وجئني بالقدح )) . فەرمووی : چەقۆکە بەرەوە و قاپێکم بۆ بهێنە . وتی : نەلەوەڕاوە و ، شیری تێدا نیە . فەرمووی : (( إنطلق )) . کوڕەکە رۆیشت و قاپێکی هێنا .. پێغەمبەر ﷺ دەستی بە گوانی بزنەکەدا هێنا . پاشان شیری دۆشیی ، هەتا قاپەکەی پڕ کرد . پاشان فەرمووی : (( إنطلق به إلى أمك )) . فەرمووی : بیبە بۆ دایکت . ئافرەتەکە تێر شیری خواردەوە . پاشان کوڕەکە قاپەکەی هێنایەوە و فەرمووی: (( إنطلق بهذه وجئني بأخرى )) . فەرمووی : ئەم بزنە بەرەوە و یەکێکی ترم بۆ بهێنە . وەهاشی بەمیش کرد و ، ئەبوبەکری لە شیر تێر کرد و ، بزنێکی تری هێنا و ، وەهاشی بەمیش کرد و ، پێغەمبەریش ﷺ لە شیر تێر بوو ، ئەو شەوە لەوێماینەوە و ، پاشان کەوتینە رێ .. ئەو ئافرەتە پێغەمبەری ﷺ ناو نابوو موبارەك . ئەوەبوو مەڕەکانی ئەوەندە زۆر بوون جەڵەبێکی لێیان هێنا بۆ مەدینە . لەو کاتەدا ئەبوبەکری صددیق تێپەڕی و کوڕی ئافرەتەکەش چاوی پێ کەوت و ناسییەوە . وتی: دایکەگیان ! ئەمە ئەو پیاوەیە کە لەگەڵ موبارەكدا بوو . دایکیشی هەستا بۆ لای و وتی : ئەی بەندەی خوا ! ئەو پیاوەی کە لەگەڵتدا بوو کامەیە ؟ فەرمووی : نازانی کێیە؟ وتی : نەخێر . فەرمووی : پێغەمبەرە ﷺ . وتی: دە بم بە بۆ لای . ئەبوبەکر بردییە خزمەتی و پێغەمبەریش ﷺ دەعوەتی کرد و ، دیاریی و پێشکەشیی پێ دا . ئافرەتەکەش هەندێ کەل و پەلی ئەعرابی پێشکەش کرد و ، پێغەمبەریش ﷺ جل و بەرگی بۆ کرد و دیاریی تری دایە ، ئەویش موسڵمان بوو .

قال إبن كثير : سنده حسن .كذا في الكنـز ( ٨ / ٣٣٠ ) .

**سێهەم** : ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ پیاوێکی بەساڵدا چوو بوو ، هەرچەندە بە تەمەن لە پێغەمبەری خوا ﷺ گەنج‌تر بوو ، بەڵام بە پیرتر پێش چاو ئەکەوت .

جا لەبەر ئەوەی ئەبوبەکر خەریکی بازرگانیی و گەشت و گەڕان بوو ، لە نێوان ڕێی مەککە و مەدینەدا زۆر بینرا بوو و خەڵکێکی زۆر ئەیان ناسیی . جا کە تووشی کەسێك ئەهاتن و پێغەمبەری خوای ﷺ نەئەناسیی ، ئەیپرسیی : ئەبوبەکر ! ئەم پیاوەی لەگەڵتایە کێیە ؟ ئەویش ئەیفەرموو : پیاوێکە ڕێم پیشان ئەدا . ئەو کەسە وای ئەزانیی دەلیلی ڕێگایە ، کەچیی مەبەستی ئەبوبەکر ئەوەبوو کە ڕێی خێر و چاکەی پیشان ئەدا ..

ئەم کارەی ئەبوبەکر بە ئامۆژگاریی پێغەمبەری خوا بوو ، ئیبن سەعد لە ( الطبقات ) دا باسی ئەوەی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ بە ئەبوبەکری فەرمووە : (( أَلْهِ الناسَ عني )) . فەرموویە : دەربارەی ناسینم خەڵك چەواشە بکە . چونکە کاتەکە زۆر ناسك بوو و کافران بە کوڵ بە دوایا ئەگەڕان . لە ڕێگادا گەر کەسێك ئەبوبەکری نەناسیبا ئەیپرسیی : تۆ کێیت ؟ ئەویش ئەیفەرموو: بە دوای پێویستیی خۆما ئەگەڕێم . خۆ ئەگەر بوترایە ئەمە کێیە لەگەڵتا ؟ ئەیفەرموو: ڕێنیشاندەرە و ڕێم نیشان ئەدا ..

**چوارەم** : هەر لە ڕێی مەدینەدا پێغەمبەر و هاوەڵانی دایان بە لای چادرەکەی ئوم مەعبەددا ، کە لەوێش موعجیزەیەکی تری پێغەمبەری خوا ﷺ دەر کەوت و، لە هەمان کاتدا لێهاتن و ، مەردایەتیی و ، سەخاوەت و ، زمان پاراویی و، ڕەوانبێژیی و پاك داوێنیی خەڵکانی ئەو کاتە ، بە تایبەت ئافرەتان ، دەر ئەکەوێت ، چونکە ئوم مەعبەد وەصفێکی پێغەمبەری خوای ﷺ کردووە گەورەترین شارەزا سەری لەو دارشتنەی سوڕ ئەمێنێ .

زۆرێك لە ئیمامانی فەرموودە ، بە تایبەت ئیمام بەیهەقیی لە حوبەیشی برای ئوم مەعبەد و ، هاوەڵی پێغەمبەری خواوە ﷺ ریوایەتی کردووە کە وتوویە: کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکر و ، عامیری کوڕی فوهەیرە کۆچیان کرد و ، کوڕی ئورەیقیطیش ڕێگای پیشان ئەدان ، گەیشتنە قودەید و دایان بەلای ئوم مەعبەد : عاتیکەی کچی خالیدی کوڕی خولەیدی خوزاعییدا ، کە ئافرەتێکی پاك داوێنی بەساڵاچووی بەهێز بوو و ، بە بۆنەی زۆریی تەمەنیەوە نەئەچووە پەنای پەردەوە و ، لە بەردەم چادرەکەیدا دائەنیشت و ، هەر کەس لەوێوە تێپەڕی بکردایە لە نان و ئاو تێری ئەکرد . جا پێغەمبەر و هاوەڵانی لەبەر گرانیی ساڵەکە و کەمخۆراکیی خواردنەکەیان تەواو بوو بوو ، لەبەر ئەوە

پرسیاریان لێ کرد کە ئایا شیر یان گۆشتی بە لاوە هەیە بیکڕن ؟ کەچیی هیچی بە لاوە نەبوو و ، وتی : بەخوا ئەگەر شتێکمان بە لاوە ببوایە ئەمانکردە میوان داریی بۆتان .

پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری مەڕێکی کرد کە لەلایەکی چادرەکەدا بوو و ، بە بۆنەی لاوازیی و بیٚهێزییەوە لە ران بەجیٚ ما بوو ، پرسیاری لیٚ کرد : (( هل بها من لبن ؟ )) . فەرمووی : ئەوە شیری تێدایە ؟ وتی : زۆر لاوازترە . فەرمووی : (( أتأذنين لي أن أحلبها ؟ )) . فەرمووی : ماوەم ئەدەی بیدۆشم ؟ وتی : بەلیٚ ، دایك و باوکم بە قوربانت بن ، ئەگەر شیری تێدا شك ئەبەی بیدۆشە .

فەرمانی دا مەڕەکەیان هێنا و گرتی و دەستی بە گوانی مەڕەکەدا هێنا . لە ریوایەتێکی تردا دەستی بە پشتیدا هێنا و ، ناوی خوای هێنا . لە ریوایەتێکی تردا دوعای بەسەردا خوێند ، ئیتر پێی بلاوکردنەوە و ، شیری تیٚ هات و ، داوای قاپێکی وەهای کرد کە کۆمەڵێك لە شیر تێر بکات . شیرێکی زۆری دۆشییە ناو قاپەکە و ، هاوەلانی لە شیر تێرکرد و ، ئوممەعبەدیشی لە شیر تێر کرد ، پاشان لە دوای هەموویان خۆیشی شیری خواردەوە و فەرموویشی : (( ساقي القوم آخرهم شُرباً )) . فەرمووی : ئەو کەسەی شیر دەرخواردی خەلك ئەدات خۆی لە دوای هەموویان ئەخواتەوە . پاشان جارێکی تر قاپەکەی پڕکردەوە و ، هەر هەموویان دووبارە خواردیانەوە ، پاشان بۆ سیٚهەم جار پڕی کردەوە و ، لەلای ئوممەعبەد بەجێی هێشت . لە ریوایەتێکی تردا پێی ئەفەرمویٚ : (( إرفعي هذا لأبي معبد إذا جاءك )) . فەرمووی : ئەمەش هەڵگرە تا ئەبومەعبەد بێتەوە . پاشان سواری ولاغەکانیان بوون و ، ڕۆیشتن .

زۆری پیٚ نەچوو ئەبومەعبەدی مێردی هاتەوە و چەن بزنێکی لاوازیش لەبەر دەمیەوە لەبەر لاوازیی لارەلار بەڕێوە ئەچوون و، ئێسقانیشیان مۆخی تێدا نەمابوو . کە ئەبومەعبەد چاوی بە شیرەکە کەوت سەری سوڕما و وتی : ئوممەعبەد ! ئەمە چییە ؟ ئەمەت لە کویٚ بوو ؟! خۆ مەڕەکە نەلەوەڕاوە و ، سکیشی پڕ نیە و ، مەڕی شیردەریش لە ماڵدا نیە . وتی: نا بەخوا ، بەلام پیاوێکی موبارەك کە ئاوەها و ئاوەها بوو لێرەوە تێپەڕی کرد . وتی : ئوممەعبەد ! وەصفی بکە بۆم .

ئوم‌مەعبەد بە سەلیقەیەکی یەکجار وردەوە وەصفی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد و وتی :

(( رأيتُ رجُلاً ظاهرَ الوَضاءَة ، مُبلجَ الوَجه ، حَسنَ الخُلق ، لم تعبه ثجلة ، ولم تزر به صعلة ، وسيم قسيم ، في عَينَيه دعج ، وفي أشفاره وَطَف ، وفي صوته صَحَل ، أحور ، أكحل ، أزج ، أقرن ، شديد سواد الشعر ، في عنقه سطح ، وفي لحيته كثاثة ، إذا صمت فعليه الوقار ، وإذا تكلم سما وعلاه البهاء ، وكأن منطقه خرزات نظم يتحدرن ، حلو المنطق ، فصل ، لا نَزْر ، ولا هذر ، أجهر الناس ، وأجمله من بعيد ، وأحلاه وأحسنه من قريب ، رَبعة لاتشنؤه من طول ، ولا تقتحمه عين من قصَر، غصن بين غصنين ، فهو أنضر الثلاثة منظراً ، وأحسنهم قدراً ، له رفقاء يحفّون بَه ، إذا قال استمَعوا لقوله ، وإذا أمر تبادَروا لأمره ، محفود محشود ، لا عابس، ولا مفند )) .[٢٨١]

وتی: پیاوێکم دیی کە دیمەنی جوان و رێك وپێك و ، دەم وچاوی گەشاوە و ، ڕەوشت جوان بوو .. ئەوەندە ورگی نەبوو ناشیرینی بکا و ، ئەوەندەش سەری بچووك نەبوو کە بۆی عەیبە بێ .. جوان و پێ‌کەوتوو بوو .. چاوەکانی زۆر ڕەش و .. برژانگی چاوەکانیشی درێژ بوون .. دەنگی کەمێك گڕ بوو ، بەلاّم بە ناسکیی .. سپیایی چاویشی زۆر سپیی و .. پێڵووەکانی ڕەش و .. بڕۆی درێژ و باریك و .. هەردوو برۆی بە یەکەوە نووسا بوون .. قژی سەری یەکجار ڕەش و ، ملی بەرز و درێژ و ، ریشی پان و پڕ بوو .. گەر بێ‌دەنگ بوایە ویقاری پێوە دیار بوو و ، گەر فەرمایشتیشی بکردایە گەوهەری لە دەم ئەبارێی ، وەك دوڕ و یاقووت بە شێوەیەکی جوان بهۆنێتەوە .. پیاوێکی زمان شیرین بوو .. لەسەرخۆ فەرمایشتی ئەکرد .. نە کەم‌گۆ و نە فرەگۆ بوو .. بەبێ زیادەڕەویی دەنگی لە هەموان بەرزتر بوو .. لە دوورەوە لە هەموو کەس جوان‌تر و ، لە نزیکیشەوە لە هەموو کەس شیرین‌تر و چاك‌تر بوو .. چوارشانەیەك بوو کە لەبەر بالاّبەرزیی ، یان کورتەبالاّیی لەبەر چاو نەئەکەوت . لقی گوڵێکە لە نێوان دوو لق‌دا ، کە ئەو لە سێ کەسەکەدا گەشاوەترین دیمەن و چاك‌ترین ڕێزی هەیە . کۆمەڵە هاوڕێیەکی هەن کە دەورەی لێ ئەدەن .. گەر فەرمایشت بکات ئەوانە گوێی بۆ ئەگرن و ،

---

[٢٨١] ئەمە ئافرەتێکی دەوارنشینی ئەو سەردەمەیە .. هێشتا خەڵکی شاریش و ، لادێش نیە .. دەوارنشینێکە بە تەنیا .. ئافرەتە خاوەن شەهادەکانی ئەمڕۆ زۆربەیان ساڵ تەواو ئەکەن و بڕوانامە وەرئەگرن ، بۆیە بە ئاسانیی شەیدای بەزم و باوی کافران ئەبن .. ئافرەتانی ئەو سەردەمەش ئەمە سەرنج و تێ بینیی و داڕشتن و وەصف کردنیانە !!

گەر فەرمانیش بکات بە پەلە ئەنجامی ئەدەن .. پیاوێکە کە هاوەڵانی خزمەتی ئەکەن و ، قەڵەبالغیی بە دەوردایە .. نە رووگرژ و نە گلەیی‌کەرە .

ئەبومەعبەد وتی : بەخوا ئەوە کاکەی قورەیشی‌یە و ، گەر بە خزمەتی بگەیشتمایە شوێنی ئەکەوتم و ، تا بۆشم بکرێ هەوڵی ئەوە ئەدەم .

( شرح المواهب : ١ / ٤١٠ ـ ٤١٦ ، البداية والنهاية : ٣ / ١٩٢ ـ ١٩٣ ) .

لەو کاتەدا کە کافرەکانی قورەیش نەیان‌ئەزانیی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو کوێ تەشریفی بردووە تا بی‌گرن ، لە مەککەدا دەنگی جیننی‌یەك ئەهات کە بێ ئەوەی ببینرێ بە دەنگی بەرز شیعری ئەوت :

جزى اللهُ ربُّ العرشِ خيرَ جَزائه ... رفيقَين حَلاَّ خَيمَتَي أُمِّ معبَد

هما نَزَلا بالبَرِّ وارتحلا به ... وأفلح مَن أمسى رفيقَ محمد

فيا لقُصَيٍّ ما زوى اللهُ عنكم ... به من فعال لا يُحاذى وسؤْدَد

ليهنَ بني كعب مكانُ فتاتِهم ... ومقعدُها للمؤمنين بمرصَد

سلوا أختكم عنْ شاتِها وإنائِها ... فإنكم إن تسألوا الشاةَ تَشهَد

لە خوای گەورە داوای ئەکرد تا پاداشتی ئەو جووتە هاوەڵە بداتەوە کە گەیشتنە چادرەکەی ئوم مەعبەد و دوای رێزگرتن لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە سەری قوصەی و نەوەی کەعبی بەرز کردۆتەوە ، ئەڵێ : لە خوشکەکەتان و مەڕەکەی و قاپەکەی پرسیار بکەن ، خۆ ئەگەر لە مەڕەکە بپرسن شاهێدییتان بۆ ئەدات .

ئەسماء ئەڵێت : نەمان‌زانیی پێغەمبەری خوا ﷺ رووی لە کوێ ناوە ، تا ئەوەبوو پیاوێکی جیننیی لە باشووری مەککەوە هات و ئەم چەند دێڕە شیعرەی سەرەوەی ئەوتن و ، خەڵکیش بەدوای‌دا ئەچوون و ، دەنگیان ئەبیست ، بەڵام بە چاو نەیان‌ئەبینی ، هەتا لە باکووری مەککەوە دەرچوو . ئەڵێت : کاتێك دەنگی ئەومان بیست ئیتر زانییمان کە پێغەمبەری خوا ﷺ رووی لە کوێ ناوە و ، رووی لە مەدینە کردووە .

**پێنجەم** : هەر لە کاتی هیجرەتدا رووداوێکی تریش رووی دا .. ئیبن ئەبوددونیا لە بانگهێشتی جیننی‌یەوە و ، ئیبن عەساکیر لە واثیلەی کوڕی ئەسقەعەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجیان کردووە کە وتوویە : موسڵمان‌بوونی حەججاجی کوڕی عیلاطی بەهزیی ، پاشان سوللەمیی خوا لێی رازیی بێ بەم جۆرە بوو :

جارێکیان لەگەڵ کاروانێکی قەومەکەیدا بەرەو مەککە ئەکەوێتە رێ . کە شەویان بەسەردا هات و ، ئەوانیش لە شیوێکی چۆڵی سامناکدا بوون ، ترس و لەرزیان لێ نیشت . ئەوەبوو هاوەڵانی پێیان وت : حەجاج ! هەستە تۆش بۆ خۆت و هاوەڵانت ئەمانێك وەر بگرە ، حەجاجیش ئەم شیعرانەی وت :

أُعيذُ نَفسي وأُعيذُ صَحبي     من كُلِّ جنِّيٍّ بهذا النَّقْب
حتَّى أَؤُوبَ سالماً ورَكْبي

دوای ئەوە گوێی لە دەنگێك بوو ئەیفەرموو : ﴿ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ ﴾ . ( الرحمن : ٣٣ ) .

کاتێك کە گەیشتنەوە مەککە لە ناو کۆڕ و کۆمەڵی قورەیشدا ئەم دەنگ و باسەیان گێڕایەوە . وتیان : راست ئەکەیت ، بەخوا حەجاج ! ئەمە لەوەیە کە موحەممەد رای ئەگەیەنێ کە دابەزیوەتە سەری . وتی : بەخوا خۆیشم و ئەمانەیش کە لەگەڵمدا بوون بیستیان . لەم باسەدا بوون لەولاوە عاصیی کوڕی وائیل هات و، وتیان : ئەبوهیشام ! نابیستی ئەبوکیلاب چیی ئەڵێت ؟ وتی : چیی ئەڵێت ؟ ئەوانیش هەواڵەکەیان بۆ گێڕایەوە . وتی : جا بۆچ سەرتان سوڕ ئەمێنێ ؟ ئەوەی لەوەی ئەوی داوە بە گوێتاندا ، هەر ئەوەش خستۆیەتیە سەر زمانی موحەممەد . ئیتر خەڵکەکە لێم کشانە دواوە ، بەڵام من خۆم لەسەر کارەکە سوورتر ئەبووم . ئەوەبوو هەواڵی پێغەمبەرم ﷺ پرسیی و ، ئاگاداریان کردم کە لە مەککە بەرەو مەدینە دەرچووە . منیش سواری وشترەکەم بووم و کەوتمە رێ هەتا گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە و ، چیم بیستبوو بۆم گێڕایەوە . ئەویش فەرمووی : (( سَمعتَ واللهِ الحقَّ ، هو واللهِ من كلامِ ربِّي الذي أُنزِل عَلَيَّ ، ولقد سَمِعتَ حقاً ، يا أباكِلاب )) . فەرمووی : بەخوا ، ئەی حەجاج ! حەقت بیستووە و ، ئەمەش لەو فەرمایشتەی خوای پەروەردگارمە کە ناردوویەتیە خوارەوە بۆم . وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئیسلامم فێر بکە . ئەویش شایەتمانی فێر کردم و فەرمووی : (( سِرْ إلى قومِكَ فادعُهُم إلى مثلِ ما أدعوك إليه فإنه الحق )) . فەرمووی : بڕۆرەوە بۆ ناو قەومەکەت و بۆ سەر ئەمەی کە من پیشانم دای بانگیان بکە .. ئەمە رێی راستە .

لـە ( حياة الصـــحابة ) دا ئامـاژە بـۆ لاوازیـی ئـەییووبی کـوڕی سـووەید و موحەممەدی کوڕی عـەبدوڵلاً کراوە ، بەلاّم لە ( شرح حياة الصــحابة ) دا ، روون کراوەتەوە کە لاواز نین . ( شرح حياة الصحابة : ٤ / ٣٩٣ ) .

**شەشەم** : لە سەفەری کۆچدا پێغەمبەری ئازیز ﷺ بانگی چەند کەسێکی بـۆ سەر ئیسلام کردووە و ، سوپاس بۆ خوا ئەوانیش بە دەم بانگەکەیەوە هاتوون .

ئیمام ئەحمەد ( ٤/ ٧٤ ) لە ئیبن سەعدی ئەسلەمی‌یەوە ، کـە ئـەو سـەعدیە دەلیلی کۆچکردن بووە ، خوا لێی رازیی بێ ، تەخریجی کردووە کـە ئـیبن سـەعد وتوویە : باوکم بۆمی گێڕاوەتەوە کە : پێغەمبەری خـوا ﷺ لەگـەڵ ئەبوبـەکردا خوا لێی رازیی بێ تەشریف دێنن و ، ئەبوبەکریش کچێکی شـیرەخۆری لـەلامان بوو ، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەیویست رێگای مەدینە کورت بکاتـەوە .. ئـیبن سەعد وتی : ئەمە رێگای غائیرە کە لـە رەکووبـەوە بـۆی ئەچیت و ، دوو دزی نەوەی ئەسلەمی لێیە کە پێیان ئەوترێ : ( المهانان : جووتـە سـووکەکە ) ، جـا ئەگەر بفەرمووی لەلای ئەوانەوە ئەڕۆین . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( خذ بنا عليهما )) . فەرمووی : لەلای ئەوانەوە بمانبە .

سەعد ئەڵێ : کەوتینە رێ تا ئەوەبوو لە شوێنێکی بەرزەوە نواڕیـان بەسـەریاندا و، یەکێکیان بە هاوڕێکەی وت : ئەوە کابرای یەمەنی‌یە . پێغەمبەری خواش ﷺ بانگیکردن و باسی ئیسلامی بۆ کردن و ، ئەوانیش هەردووکیان موسڵمان بـوون ، پاشان لێی پرسین کە ناویان چی‌یە؟ وتیان : ئێمە ناومـان ( المهانان ) ە . فەرمووی: (( بل أنتما المكرمـــان )) . فـەرمووی : بـەڵکو ئێـوە جووتـە رێـزلێ گیراوەکـەن . فەرمانیشی دا لە مەدینە سەری لێ بدەن .

هەروەها ئیبن سەعد ( ٤/ ٢٤٢ ) لـە عاصـم ی کـوڕی ئەسـلەمی‌یەوە تـەخریجی کردووە کە وتوویە : کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە کۆچی بۆ مەدینە کـرد و گەیشـتە غـەمیم ، لـەوێ بورەیـدەی کـوڕی حەصـیب [٢٨٢] هاتـە خزمـەتی و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ بانگی ئەکات بـۆ سـەر ئیسـلام و ، ئـەویش بـە خـۆی و

---

[٢٨٢] لە هەردوو صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتووە کە بورەیدە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی شانـزە غەزای کردووە و ، هەواڵ و پایەداریی بورەیدە بەناوبانگە . لە سەردەمی خەلیفە عوثماندا چووە بۆ غەزای خۆراسان و لەوێوە رووی لە مەرۆ ناوە و ، لەوێ نیشتەجێ بووە تا ساڵی شەست و دوو یان سێ و ، لەوێ کۆچی دوایی کردووە و ، دواهاوەڵیش بووە کە لە خۆراسان کۆچ بکات . ( الإصابة : ١ / ١٥٠ ) .

ئەوانەشەوە کە لەگەڵی بوون موسڵمان بوون ، کە نزیکەی هەشتا ماڵ ئەبوون .
ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای بۆ کردن و ئەوانیش لە پشتی سەریەوە نوێژەکەیان بەجێ هێنا .

**ئەوتەم** : ئەوەبوو قورەیش بەخشیشێکی دانا بوو ، کە بریتیی بوو لە صەد سەر وشتر ، بۆ هەر کەسێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ ، یان ئەبوبەکری صدديق خوا لێی رازیی بێ ، بە زیندوویی یان بە مردوویی ، بخاتە دەستیان . جا ئەم دەنگ و باسە لە دەر و دەشت بلاوەی کرد و ، خەڵکێکی زۆر کەوتنە تەماعی ئەو هەمووە وشترە و ، هەوڵیان ئەدا شوێن پێیان هەڵ بگرن و دەست گیریان بکەن ، تا ئەوەبوو سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشومی مودلیجییش یەکێ بوو لەو هەوڵ دەرانە ، کە بە راستیی سوارێکی ئازا و لێهاتوو و کۆڵنەدەر بوو .

سوراقە ئەڵێ :

لە کاتێکدا کە لە کۆڕێکی قەومەکەمدا ، کە نەوەی مودلیج بوون ، دانیشتبووم ، پیاوێکی هۆزەکەمان هات و لەسەر سەرمان وەستا و ئێمەش دانیشتبووین . وتی : سوراقە ! کەمێك لەمەو پێش لە کەناری دەریادا رەشایەتیی چەند کەسێکم بەر چاو کەوت ، وای ئەبینم کە موحەممەد و هاوەڵەکانی بوو بن . ( مەبەستی ئەوەیە سوراقە ئاگادار بکات تا پێکەوە ، بۆ بەدەست هێنانی خەلاتەکەی قورەیش دوایان بکەون ) . سوراقە ئەڵێ : زانیم ئەوان بوون ، بەلام وتم : ئەوانە ئەوان نەبوون ، ئەوە فلان و فلان بوون بە بەر چاومانەوە رۆیشتن و بە دوای ئاژەڵی گومبوودا ئەگەڕێن . ( سوراقە ئەیەوێ خەڵکەکە واز بهێنن و دوایان نەکەون ، تا خۆی بە تەنیا دەست گیریان بکات ) . ئیتر کابراش بێ دەنگ ئەبێت .

سوراقە ماوەیەك لە کۆڕەکەدا ئەمێنێتەوە و ، پاشان بەبێ دەنگ هەڵ ئەسێ و ئەگەڕێتەوە ماڵەوە و ، فەرمان ئەدا بە کەنیزەکەکەیدا تا ئەسپەکەی بۆ بەرێت بۆ ئەودیوی گردەکە و لەوێ بیبەسێتەوە ، هەتا خۆیشی رمەکەی هەڵ گرێ و بە ئەسپایی بگاتە لای ئەسپەکەی .. ئەوەبوو لە پشتەوە لە ماڵ دەرچوو و ، رمەکەی بە شێوەیەك لێ کرد کە دەر نەکەوێ . کە ئەگاتە لای ئەسپەکەی ، خۆی هەڵ ئەداتە سەری و بە پەلە لێی ئەخوڕێ هەتا نزیکی پێغەمبەر و هاوەڵانی ئەکەوێتەوە ، لەو کاتەدا بە فەرمانی خوا ئەسپەکەی پێی هەڵ ئەکەوێ و سوراقەش بەسەریەوە ئەکەوێتە خوارەوە و ، دەست ئەبا بۆ تیردانەکەی و چیی

ئەزلامی تێدا ئەبێ ( ئەو تیرانەی کە پەڕ و کلکیان پێوە نیە ) دەریان ئەهێنێ و شانسی خۆی پێیان تاقیی ئەکاتەوە ، تا بزانێ دەستی پێیان ئەگات یان نا ، کەچیی ئەوەی بۆ دەرچوو کە ئەو پێی ناخۆش بوو ، چونکە پێی خۆش بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بگێڕێتەوە و صەد وشترەکە وەربگرێ ..

لەبەر تەماع گوێ بە ئەزلامەکان نادات و ، سواری ئەسپەکەی ئەبێتەوە و ، دوایان ئەکەوێ تا دیسان لێیان نزیك ئەکەوێتەوە .. ئەوەندە نزیك ئەکەوێتەوە کە گوێی لە قورئانخوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبێت ، کە ئەو ئاوڕی نەئەدایەوە ، بەلام ئەبوبەکر زۆر ئاوڕی ئەدایەوە و ، زۆریش ئەترسا کە پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی ناڕەحەتیی ببێ . ئەبوبەکر فەرمووی : ئەی پێغەمبەری‌خوا ! ئەوە سوارێکە و وا گەیشتە لامان .

لە ریوایەتێکی تردا ئەبوبەکر ئەفەرموێ : وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوەی بە دوامانەوەیە وا گەیشتە لامان . فەرمووی : (( لا تحزن إن الله معنا )) . فەرمووی : خەم‌بار مەبە خوامان لەگەڵە . جا کە نزیك‌تر کەوتەوە ، کە ئەوەندەی رمێك یان دوو رم ، یان ئەفەرموێ : ئەوەندەی دوو یان سێ رمی ما بگاتە لامان، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوەی بە دوامانەوەیە وا گەیشتە سەرمان و ، دەستیشم بە گریان کرد . فەرمووی : (( لِمَ تبكي ؟ )) . فەرمووی : بۆچ ئەگریت ؟ وتم : بەخوا بۆ خۆم ناگریم ، بەڵکو بۆ تۆ ئەگریم .

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دۆعای لێ کرد و فەرمووی : (( أللهم اصرعه ، أللهم اكفناه بما شئت )) . فەرمووی : خوایە ! بیدە بە زەوییدا .. خوایە ! بە شتێ کە خۆت ویستت لەسەری بێ لە کۆڵمانی بکەرەوە ..

سوراقە ئەڵێ : هەردوو دەستی ئەسپەکەم تا ئانیشکی چوون بە ناخی زەوییدا و ، منیش لەسەری کەوتم و دامی بە زەوییدا ، پاشان پیایا هەڵ شاخییم .. هەر ئەوەندە بوو کە هەردوو دەستی لە زەوییەکەدا دەرهێنان و رێك وەستا ، ئەبینم لە شوێنی دەستەکانیەوە تۆز و گەردێکی وەك دووکەڵ بۆ ئاسمان بەرز بوویەوە . جارێکی تر بە ئەزلامەکان بەختی خۆم تاقیی کردەوە ، کەچیی هەر ئەوە دەرچوویەوە کە من پێم خۆش نەبوو ، بۆیە بانگم لێ کردن تا ئەمانیان لێ وەربگرم و وتم : من سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشومم ، بوەستن هەتا قسەتان لەگەڵدا بکەم ، دە بەخوا کارێك گومانی لێ بکرێ بەرامبەرتان نایکەم

و، شتێکیشتان لەگەڵدا ناکەم کە پێتان ناخۆش بێ . لە خوا بۆم بپارێرەوە و ، زیانت پێ ناگەیەنم . پێغەمبەری خواش ﷺ دۆعای بۆ کرد ..

سوراقە ئەڵێ : ئەوان وەستان و ، منیش سواری ئەسپەکەم بووم و هاتم تا گەیشتمە لایان و ، کاتێك کە ئەو شتانە هاتنە رێم ئەوە کەوتە دڵمەوە کە لە لایەن خواوە پارێزراوە و ، کاری پێغەمبەری خوا ﷺ سەر ئەگرێ ، بۆیە پێم وت: خزمەکانت خەلاتیان داناوە بۆ دەست خستنت . هەواڵی ئەوەشم دایە کە خەڵکیی چۆن هەوڵ ئەدەن دەستی بخەن . هەروەها داوام کرد نان و کەل وپەلم لێ وەربگرن ، کەچیی هیچێکی لەوەی کە پێم بوو وەریان نەگرت و ، داوای هیچیشیان لێم نەکرد .. ئەوەبوو وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! چیت پێ خۆشە فەرمانم بەسەردا بدە . فەرمووی: (( قف مكانك ، ولا تترك أحداً يلحق بنا ، وأخْفِ عنا )) . فەرمووی : لەو شوێنەی خۆتدا بوەستە و مەهێڵە هیچ کەس پێمان بگاتەوە و دەنگ و باسمان ئاشکرا مەکە ..

سوراقە خوا بۆی کرد تا گەشتەکەی بە قازانج بۆی تەواو ببێ .. ئەیویست لەسەر خوێنی پێغەمبەر و یارانی دەوڵەمەند ببێ ، کەچیی خوای گەورە بە پاسەوان و بەرگرییکەری بانگی خوای گێڕا .

سوراقە ئەڵێ : داوام لێ کرد نامەیەکی ئەمانم بۆ بنووسێ . ئەویش فەرمانی بەسەر عامیری کوڕی فوهەیرەدا دا تا لەسەر چەرمێك بۆی بنووسێ .. پاشان هەڵی دا بۆم و ، منیش هەڵم گرت و خستمە ناو تیردانەکەمەوە و گەڕامەوە ..

چیرۆکی سوراقە هەر بەمەوە نەوەستا کە بریتیی بێ لە دەرکەوتنی موعجیزەیەکی گەورە ، کە بە ئاشکرا دەربکەوێ ئەم پیاوە راست ئەکا پێغەمبەری خوایە و ، خوای گەورە هێزی ئەخاتە کار بۆ پاراستنی ، بەڵکو ئازیز ﷺ هەواڵێکی دوارۆژی راگەیاند کە بە ئەندێشەی هیچ کەسێکدا نەئەهات ، تا بیسەلمێنێ کە ئەم هەواڵە تەنها پێغەمبەرێك ئەتوانێ رای بگەیەنێ کە خوای گەورە خستبێتیە دڵیەوە .

کاتێك کە سوراقە ویستی بەدوای خۆیدا بگەڕێتەوە ، پێغەمبەر ﷺ ئاوڕی دایەوە بۆ لای و فەرمووی : (( كأني بك ، يا سراقة ! تلبس سواري كسرى )) . فەرمووی : وا ئەبینم ، سوراقە ! جووتە بازووبەندەکەی کیسرا لە دەست بکەیت . سوراقە بە سەرسوڕمانەوە پرسیی : کیسرای کوڕی هورموز ؟! فەرمووی : (( نعم )) .

سوراقە ئەوپەڕی سەرسامیی رووی تێ کرد .. هەواڵێکی سەیرە ! شتی زۆر بە دڵیدا هات .. بە بۆنەی موعجیزەکەوە بڕوای بەمەیش ئەکرد ! بەڵام چۆن ؟ زۆر سەیرە !! موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای قورەیشیی خۆی لە خزمەکانی ئەشارێتەوە ، نەوەکو بیگرن و بیکوژن .. کەچیی بەڵێنی وەهای بە سوراقە ئەدا .. ئەبێ سوراقە بمێنێ تا ئەو رۆژەی کە ئەم دینە کەمدەسەڵاتە پەرە ئەسێنێ و ، بەسەر دەوڵەتی ساسانییدا سەر ئەکەوێ و ، کەل و پەل و تاج و بازووبەندەکانی پادشا کیسرا دەست موسڵمانەکان ئەکەون و ، سوراقەش بازووبەندەکان لە دەست ئەکات ! بە راستیی بەڵێنێکی گەورەیە .

سوراقە ئەو رۆژە بەڵێنی دا کە زیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی نەگەیەنێ و ، تووشی هەر کەسیش ببێ کە بیەوێ دوایان بکەوێ و بیانگرێ ، بیگێڕێتەوە . ئەوەبوو بە چاکیی بەڵێنەکەی بەسەر برد و ، تووشی هەر کەس ببوایە ئەیوت : من ئەم ناوە گەڕاوم .. چەند رۆژێك دەنگی نەکرد هەتا دڵی لەوە بێخەم بوو کە کۆچکەران بە سەلامەتیی گەیشتوونەتە مەدینە ، ئەوسا باسەکەی خۆی و موعجیزەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ خەڵك ئەگێڕایەوە کە چۆن بەسەر ئەسپەکەیەوە چەند جارێك کەوتۆتە خوارەوە و ، دەست و پەلی ئەسپەکەشی بەناو زەوییدا رۆچوون ، تا ئەم دەنگ و باسە بەسەر زمانی خەڵکییەوە گەیشتەوە مەککە و ، سەردارانی قورەیش لەوە ترسان کە ئەم رووداوە ببێتە هۆیەك بۆ موسڵمانبوونی هەندێ لە دانیشتوانی مەککە . بۆ ئەمە ئەبوجەهل نامەیەکی بۆ نەوەی مودلیج نووسیی ، کە سوراقە ئەمیر و سەرۆکیان بوو ، تا بە گوێی نەکەن و ، کۆمەڵیان تێك نەدا بەوەی کە بڕوای پێ بکەن و موسڵمان ببن و پارچە پارچە ببن :

بني مدلج إنـي أخاف سفيهكم سراقة مستغو لنصر محمد
عليكم بـه ألا يفرق جـمعكم فيصبح شتى بعد عز وسؤدد

سوراقەش وەڵامی ئەداتەوە و سوێندی بۆ ئەخوا کە ئەگەر چاوی لێ بوایە چۆن دەست و پەلی ئەسپەکەی ئەچوون بە زەوییدا ، گومانی لەوە نەئەما کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە و ، کەسیش ناتوانێ دژایەتیی بکات :

أباحكم ! والله لو كنتَ شـاهداً لأمر جوادي إذ تسوخ قوائمـه
علمت ولم تشكك بأن مـحمداً رسول وبرهان فمن ذا يقاومـه

رۆژان رابوردن و، موسڵمانان مەردانە دانیان بە خۆیاندا گرت و ، وەك رۆژانی رەش و سەختی مەککەیان بەسەر بردن ، رۆژانی برسێتیی و نارەحەتیی و گەمارۆ و جەنگ و هەرای مەدینەشیان بەسەر بردن ، تا ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی کرد و ، طائیفیش رزگار کرا و دوای جەنگی حونەین سوراقە لە (جعرانە) هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و نامەکەی رۆژی کۆچ کردنی پیشان دا .. فەرمووی : (( الیوم یوم الوفاء والبرِّ ، أُدنُ )) . فەرمووی : ئەمرۆ رۆژی وەفا و چاکەکردنە ، وەرە پێشەوە .. سوراقەش لە ئازیز چووە پێشەوە و شایەتمانی حەقی هێنا .

خوای گەورە تەمەنی بە سوراقە بەخشیی و ، تا سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەططاب ژیا ، تا ئەوەبوو سوپای رزگاریی‌خوازی ئیسلامیی ، بۆ رزگارکردنی گەلان لە ژێر چنگی زاڵمان کەوتە رێ .. سوپای ئیسلام زرمەی لە قەڵای پڕستەمی ساسانییش هەڵسان و ، پایتەختی زوڵم و ستەمی رزگار کرد .. پادشای خوانەناس مەدائینی بەجێ هێشت و ، تاج و جل و بەرگ و جووتە بازووبەندەکەی بەجێ مان و ، لەگەڵ گەنجینە و ئاڵتوون و زیوی دەوڵەت کەوتنە دەست موسڵمانەکان .. بە دەستێکی ئەمین و پاکەوە هاوەڵان ئەو دەست کەوتانەیان هێنانەوە مەدینەی پایتەخت .. ئەو زێڕ و دوڕڕ و گەوهەرانە ئەوەندە زۆر بوون کە بە ملیۆنەها دینار و دیرهەم مەزەنە ئەکران ..

خەلیفە عومەر خوا لێی رازیی بێ سەری لە دەستپاکیی سەرباز و فەرماندەکانی سوپای ئیسلام سوڕ ئەما چۆن ئەم هەمووەیان لە مەدائینەوە گەیاندۆتە مەدینە بێ‌ئەوەی هیچی لێ لا بدەن .. بۆیە فەرمووی : بە راستیی کەسانێك ئەمەیان هێنابێتەوە خاوەن ئەمانەتن . ئیمام عەلییش خوا لێی رازیی بێ ، کە لەلایدا ئامادە بوو ، فەرمووی : تۆ خۆت دەستپاکیت ، بۆیە رەعیەتەکەشت دەستپاك دەرچووە !!

خەلیفە ئەو هەمووە دەستکەوتە بەنرخانەی دابەش کردن بێ‌ئەوەی هیچێ بۆ خۆی گل بداتەوە .

لەو کاتەدا خەلیفە بەڵێنەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ هاتەوە یاد ، کە بە سوراقەی فەرموو بوو جووتە بازووبەندەکەی کیسرا لە دەست ئەکات ..

بەڵێ جووتە بازووبەندەکە کەوتنە دەست موسڵمانان و ، بە فەرمانی خوا گەیشتنە مەدینە ، تا بەڵێنەکەی ئازیز سەر بگرێت .. عومەر بانگی کردە سوراقە و ، هەردوو بازووبەندەکەی کیسرای کردە دەستی .. جا ئەڵێن هەردوو قۆڵی سوراقە مووی زۆریان پێوە بووە . دوای لە دەست کردن عومەر فەرمووی : الله أكبر ! سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەم جووتە بازووبەندەی لە کیسرای کوڕی هورموز سەندەوە و ، کردنیە دەستی ئەعرابی‌یەکی نەوەی مودلیج ، کە سوراقەی کوڕی جوعشومە . خەلیفە دەنگی بەرز کردەوە و ، پاشان سوراقەی سواری ولاغێك کرد و ، شاری مەدینەی پێوە گەڕا و خەڵکیش دەورەیان لێ دابوو و ، سوراقەش بە دەنگی بەرز فەرمایشتەکەی خەلیفە عومەری دووبارە ئەکردەوە : الله أكبر ! الحمد لله الذي سلبهما كسرى بن هرمز ، وألبسهما سراقة بن جعشم أعرابياً من بني مدلج !!

بە راستیی ئەو رۆژە دانیشتوانی مەدینە ، گەورە و بچووك ، هەر هەموو کۆبووبوونەوە تا بەڵێن .. فەرمایشت .. موعجیزەی دەمی ئازیز ﷺ بە چاوی خۆیان ببینن . بە راستیی رۆژێك بوو لە رۆژە ناودارەکانی مەدینە .. کە موسڵمانان سوپاسی پەروەردگاریان ئەکرد لەسەر ناردنی قورئان و پێغەمبەر و سەرکەوتن .. سوپاسی خوایان ئەکرد وا لە سایەی ئەم دینە پاکەدا بوونەتە خاوەنی بوون و رێز و شەرەف و سەربەرزی دنیا و قیامەت .

**هەشتەم** : هەر لە سەفەری کۆچدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و هاوەڵانیەوە لە جوحفە دایان بەلای رانە وشترێکی مالیکی کوڕی ئەوسی ئەسلەمیی‌دا کە منداڵێکی شوانیان بەلاوە بوو . فەرمووی : (( لمن هذه ؟ )) . فەرمووی : ئەمانە وشتری کێن ؟ وتی : هی پیاوێکن لە هۆزی ئەسلەم . پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی دایەوە بۆ لای ئەبوبەکر و فەرمووی : (( سلمتَ إن شاء الله )) . فەرمووی : إن شاء الله سەلامەت ئەبی . بە منداڵەکەی فەرموو : (( ما إسمك ؟ )) فەرمووی : ناوت چی‌یە ؟ وتی : مەسعوود . دیسان ئاوڕی بۆ لای ئەبوبەکر دایەوە و فەرمووی : (( سعدتَ إن شاء الله )) فەرمووی : إن شاء الله بەختەوەر ئەبی . جا عادەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەها بوو کە حەزی لە گەش‌بینیی و ، رقی لە رەش‌بینیی بوو .

**نۆهەم** : یەکێ تر لە رووداوەکانی رێی مەدینە ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی کاروانێکی موسڵمانان ئەبێت کە زوبەیری کوڕی عەووامیشیان لەگەڵ دا ئەبێ و ، لە بازرگانیی و لە وڵاتی شامەوە ئەگەڕانەوە . ئەوەبوو زوبەیر دەستەیەك پۆشاکی سپیی بە هەر یەکە لە پێغەمبەر و ئەبوبەکر بەخشیی . هەروەها ئەگێڕنەوە کە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلاش لە شامەوە ئەگەڕێتەوە و تووشیان ئەبێت و ، ئەویش هەندێ پۆشاکیان پێشکەش ئەکات ..

کە موسڵمانە کۆچکەرەکان لە مەدینە هەواڵی دەرچوونی پێغەمبەری خوایان ﷺ لە مەککە زانیی ، هەموو رۆژێك سەر لە بەیانیی ئەهاتنە قەراغی شار و ، هەتا قوڵەی گەرمای نیوەڕۆ ناچاری گەڕانەوەی ئەکردن ، لەوێ چاوەڕوانییان ئەکرد .. ماوەیەك ئەمە پیشەیان بوو ، هەتا ئەوەبوو رۆژێکیان چاوەڕوانیی زۆریان کرد و ، کە لەبەر گەرما گەڕانەوە ماڵەوە ، جوولەکەیەك بۆ کارێکی خۆی سەرکەوتبووە سەر قەڵایەکی مەدینەییەکان . کە سەرنجی دا لە دوورەوە پێغەمبەر و هاوەڵانی بەدیی کردن کە بەرگی سپییان لەبەردا بوو و ، لەناو سەرابی بیابانەکەدا نوقووم ئەبوون . جوولەکەکە خۆی پێ نەگیرا و بە دەنگی بەرز هاواری کرد : ئەی کۆمەڵی عەرەب ! ئەوە گەورەکەتانە کە چاوەڕوانییتان ئەکرد.. موسڵمانەکان هەر هەموو هەڵمەتیان دایە چەکەکانیان ( تا هێز و دەسەڵاتی موسڵمانان بنوێنن و ، دەری بخەن کە پارێزگاری پێغەمبەرن ) و ، بەرەو رووی رۆیشتن .

ئیبنولقەییم ئەڵێ : لە ناو نەوەی عەمری کوڕی عەوفدا دەنگی ( الله أكبر ) ئەبیسترا و ، موسڵمانەکانیش لە خۆشیی گەیشتنیدا تەکبیریان کرد و ، هەموو هاتن بە پیریەوە و، پێشوازییان لێ کرد و ، هەموو بە جارێ دەورەیان لێ دابوو ، بە دەوریشیا ئەسووڕانەوە و ، هێمنیی و دامەزراوییش باڵی بەسەریا کێشا بوو .. لەو کاتەدا ئایەتی پیرۆزی : ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوْلَىٰهُ وَجِبْرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ . ( التحريم : ٤ ) یش هاتە خوارەوە بۆی .

کە بە خزمەتی گەیشتن بەرەو لای راست لای پێ دان ، تا ئەوەبوو تەشریفی لەناو نەوەی عەمری کوڕی عەوفدا دابەزیی .

مەنزڵ و هەواری نەوەی عەمری کوڕی عەوف لە قوباء بوو و ، لە رۆژی دووشەممەی هەشتەم رۆژی مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی چواردەهەمی هاتنی

وەحی ، کە بریتی‌یە لە ساڵی یەکەمی کۆچیی و ، بەرامبەر بە بیست و سێ‌هەم ڕۆژی ئەیلوولی ساڵی ( ٦٢٢ ) ی زاینیی بووە ، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی گەیشتن و ، بۆ ماوەی چوار ڕۆژ ، واتە دووشەممە و ، سێ‌شەممە و ، چوارشەممە و، پێنج شەممە لەوێ مانەوە و ، پاشان لە ڕۆژی جومعەدا تەشریفیان بردە ناو مەدینەوە .

بەڵام لە صەحیحی بوخاریی‌دا وەها هاتووە کە لە قوباء چواردە ڕۆژ مابێتەوە. جا حافیظ ئیبن حەجەر وەهای لێك داوەتەوە کە مەبەست لەو چواردە ڕۆژە ، ئەو ڕۆژانەیشە کە لە ئەشکەوتەکە دەرچوون هەتا گەیشتنیان بە قوباء .

لەو ڕۆژەدا کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ گەیشتە قوباء ، تەمەنی پیرۆزی بووە پەنجا و سێ ساڵی ڕێك بەبێ زیاد و کەم . هەروەها بە پێی وتەی ئەوانەی کە ڕایان وەهایە لە نۆهەم ڕۆژی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چل و یەکەمی دوای ساڵی فیل‌دا وەحی بۆ هاتووە ، تەمەنی پێغەمبەرایەتییشی سیانزە ساڵی تەواو کرد . بەڵام بە پێی وتەی ئەوانەی کە ڕایان وەهایە لە ڕەمەزانی ساڵی چل و یەکەمی دوای ساڵی فیل‌دا وەحی بۆ هاتووە ، لە ڕۆژی گەیشتنی قوباءدا تەمەنی پێغەمبەرایەتیی بریتیی بوو لە دوانزە ساڵ و پێنج مانگ و هەژدە یان بیست و دوو ڕۆژ .

کە گەیشتنە بەرەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ‌دەنگ دانیشت و ئەبوبەکریش بۆ پێشوازیی لە هاتنی خەڵکەکە هەستایە سەر پێ . جا ئەو ئەنصارانەی کە هێشتا پێغەمبەری خوایان ﷺ نەدیی بوو و نەیان ئەناسیی ، سەلامیان لە ئەبوبەکر ئەکرد و وایان ئەزانی ئەو پێغەمبەرە ، تا ئەوەبوو سێبەرەکە هەڵ کشا و خۆر بەر پێغەمبەری خوا ﷺ کەوت ، ئەوسا ئەبوبەکر بە عەباکەی خۆی سێبەری بۆ کرد تا خۆر لێی نەدا . بەمە خەڵکەکە پێغەمبەری خوایان ناسیی .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە قوباء بووە میوانی پیاوێکی ناوداری عەمری کوڕی عەوف کە ناوی کولثوومی کوڕی هیدم بوو . هەندێکیش ئەڵێن : بۆتە میوانی سەعدی کوڕی خەیثەمە . جا ئەم دوو وتەیە هەردووکیان ڕاستن ، چونکە پێغەمبەر ﷺ شەو لە ماڵی کولثوومی کوڕی هیدم ئەمایەوە و ، بە ڕۆژیش‌دا لە ماڵی سەعدی کوڕی خەیثەمە دائەنیشت ، لەبەر ئەوەی کە کولثووم ژن و منداڵی

نەبوون و خۆی بە تەنیا ئەژیا .. شایانی باسە کولثووم پێش گەیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمان بوو بوو .

ئەبوبەکریش خوا لێی رازیی بێ بووە میوانی خوبەیبی کوڕی ئیساف ، کە لە نەوەی حاریثی کوڕی خەزرەج بوو ، لە سونح ، کە شوێنێك بووە لە دەرەوەی مەدینە و نزیکی قوباء . هەندێکیش وتوویانە : بۆتە میوانی خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ئەبوزوهەیر کە ئەویش لە نەوەی حاریثی کوڕی خەزرەج بووە .

یەکەم کارێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە گەیشتنە قوباء ئەنجامی دا ، بنیات نانی مزگەوتی قوباء بوو ، تا موسڵمانەکان نوێژی تێدا بکەن و ، بۆ ئەنجامدانی خێر و چاکە لە مزگەوت‌دا کۆببنەوە .. ئەم مزگەوتە ئەوەیە کە لەسەر تەقوا بنیات نراوە و ، یەکەم مزگەوتێکیشە کە لە ئیسلام‌دا بنیات نراوە . ئەوەتا قورئانی پیرۆز باسی پیرۆزیی و پاکیی ئەو مزگەوتە ئەکات :

﴿ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ ( التوبة : ١٠٨ ) .

دوای بەسەر چوونی چوار رۆژەکەی قوباء و دروست کردنی مزگەوتەکە و ، بەجێ‌هێنانی نوێژ تیای‌دا ، پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژی جومعە سواری وشترەکەی بوو و ، ئەبوبەکریش لە پاشکۆی‌دا بوو و ، ناردی بە دوای پیاوانی نەوەی نەججاردا کە خاڵوانی بوون ، ئەوانیش بە شمشێرەکانیانەوە هاتن و بەرەو مەدینە کەوتنە گەلی و ، خەڵکەکەش لەگەڵیا بەرێوە ئەچوون ، هەتا گەیشتنە مەنزڵی نەوەی سالم ی کوڕی عەوف و ، کاتی نوێژی جومعە هات و ، لەوێ لەو مزگەوتەدا کە ئەکەوێتە ناوەڕاستی شیوەکەوە ، نوێژی جومعەی بۆ کردن و ، ژمارەی نوێژکەرانیش صەد پیاو ئەبوون . دوای نوێژی جومعە پێغەمبەر ﷺ چووە ناو شارەوە و ، لەو رۆژەوە شاری یەثریب ناونرا ( مدینة الرسول ) ، کە وشترەکەی گەیشتە شوێنی مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆکی دا دا .. ئەو شوێنە خەرمانی وشك‌کردنی خورما بوو کە هی دوو برای هەتیو بوو ، بە ناوی سوهەیل و سەهل ، کە لەژێر چاودێریی ئەسعەدی کوڕی زورارەدا بوون خوا لێی رازیی بێ .

کە وشترەکە چۆکی دا دا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هذا ـ إن شاء الله ـ المنزل )) . پاشان جووتە براکەی بانگ کردن و موعامەلەی لەگەڵ‌دا کردن تا خەرمانەکە بکڕێ و بی‌کات بە مزگەوت . جووتە براکە ، کە هێشتا منداڵ بوون و

باڵغ نەبوو بوون ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! پێشکەشتی ئەکەین . بەلاّم پێغەمبەر ﷺ بەوە رازیی نەبوو ، بەڵکو لێی کڕین بە دە دینار و ، پاشان کردی بە مزگەوت . هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی خشتی قوڕینی لەگەڵ موسڵمانەکان دا ئەگواستەوە و ، بۆ تاسە و شەوقی موسڵمانان شیعریشی ئەفەرموو .

لەلایەکی ترەوە دانیشتوانی مەدینە ، بە پیاو و ئافرەتەوە ، هەر هەموویان هاتبوونە پێشوازیی و ، لە ماڵەکان و لە کۆلاّنەکانەوە دەنگی تەحمید و تەقدیس بەرز ئەبوویەوە و ، کچە ئەنصارەکانیش لە خۆشیی هاتنی ئازیزدا ﷺ ئەم شیعرانەیان ئەوت :

أَشْـرَقَ البَـدرُ عَـلَيـنا   مِـن ثَنِـيّات الـوَداعِ
وَجَـبَ الشُّـكـرُعَلَيـنا   مَـا دَعـا لِلَّـهِ داعٍ
أَيُّـها الـمَبـعُوث فِيـنا   جِئـتَ بالأمـرِ المطاعِ

بەڵێ ، ئەنصارەکان خاوەنی سەروەت و سامانێکی یەکجار زۆر نەبوون ، بەلاّم هەر یەکەیان لەکرۆکی دڵی‌دا ئاواتی ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ ببێتە میوانی ئەو .. ئەوە بوو هەرچیی بەلای ماڵێکی ئەنصارییدا تێپەڕی ئەکرد ، لغاوی وشترەکەی ئەگرت و ، ئەیان وت : فەرموو بۆ لای پیاو و تفاق و چەك و پارێزگاریی .. ئەویش ئەی‌فەرموو : (( خلوّا سبيلها فإنـها مأمورة )) . ئەی‌فەرموو: وازی لێ بهێنن ، فەرمانی پێ دراوە . هەروا ئەڕۆیشت هەتا گەیشتە شوێنی ئێستەی مزگەوتی پێغەمبەر و ، لەوێ چۆکی دا دا .. بەلاّم لەسەری دانەبەزیی ، تا ئەوەبوو هەستایەوە و ، کەمێك رۆیشت و ، پاشان ئاوڕی دایەوە و ، گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی و لەوێ چۆکی دا دایەوە و لەسەری دابەزیی .. ئەم ناوچەیە مەنزڵی نەوەی نەججاری خاڵوانی بوون ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ رێزلێنانیان حەزی ئەکرد لای ئەوان دابەزێ .. خەڵکەکە هاتن و خولکی پێغەمبەریان ئەکرد تا ببێتە میوانیان ، کەچیی ئەبوئەییووبی ئەنصاریی هەڵمەتی دا و کەل و پەلەکەی بردە ماڵی خۆیان چونکە نزیکترین ماڵ بوو و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ ئەی‌فەرموو : (( المرء مع رحلـه )) . ئەی‌فەرموو : پیاو ئەبێ لەگەڵ کەل و پەلەکەی‌دا بێت . ئەسعەدی کوڕی زورارەش هات و رەشووی وشترەکەی گرت و بردیە لای خۆی .

لە ریوایەتەکەی ئەنەسیش‌دا لای بوخاریی وەها هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( أي بيوت أهلنا أقرب ؟ )) . فەرمووی : چ ماڵە خزمێکمان نزیکە ؟

ئەبوئەییووب وتی : من ئەی پێغەمبەری خوا .. ئەمە ماڵەکەمە و ئەمەش دەرگاکەمە . فەرمووی : (( فانطلق فهيء لنا مقيلاً )) . فەرمووی : دە بڕۆ شوێنێکی حەسانەوەمان بۆ ئامادە بکەن . وتی : دەی هەردووکتان بە ناوی خواوە هەستن با لە خزمەتتانا بین .

ئەو جوولەکانەش کە چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەری ئاخرزەمان بوون ﷺ بە چاوی خۆیان راستیی مژدەکەی حبقوق پێغەمبەریان دیی کە ئەی‌فەرموو: (( إن الله جاء من التيمان ، والقدوس من جبال فاران )) . ( صحيفة حبقوق : ٣ / ٣ ).

ئیمام عەلییش ، بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە مەککە مایەوە تا ئەو سپاردانەی کە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ دانرا بوون تەسلیمی خاوەنەکانیان بکاتەوە . ئەوەبوو سێ شەو و سێ رۆژ مایەوە ، پاشان ئەویش بەرەو مەدینە کەوتە رێ و ، دوای گەیشتنیان بە دوو یان سێ شەو ئەویش گەیشتە قوباء و ، شەوێك یان دوو شەو لە قوباء لە ماڵی کولثوومی کوڕی هیدم مایەوە و ، دوای ئەوە لە خزمەتی ئازیزدا هاتنە ناو مەدینەوە و بوونە میوانی ئەبوئەییووب .

( إبن عبد البر ) لە عائیشەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی‌کرد ئێمەیش و کچەکانیشی بەجێ هێشتن . کە لەوێ جێگیر بوو زەیدی کوڕی حاریثەی نارد و ئەبورافیعی خزمەت گوزاریشی خوا لێیان رازیی بێ لەگەڵیا نارد و ، دوو وشتری پێ دان لەگەڵ پێنج صەد دیرهەم‌دا کە لە ئەبوبەکری خوا لێی رازیی بێ وەرگرتن ، تا لەوێ چیی ولاغیان پێویستە بەو پارەیە بی‌کڕن . ئەبوبەکریش عەبدوڵڵای کوڕی ئورەیقیطی خوا لێی رازیی بێ بە دوو یان بە سێ وشترەوە لەگەڵیانا نارد و ، نامەیشی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ نارد تا ئوم روومانی دایکم و من و ئەسمائی خوشکم ، هاوسەری زوبەیر خوا لێی رازیی بێ سوار بکات . ئەوەبوو پێکەوە دەر چوو بوون . کە گەیشتنە قودەید ( کە شیوێکە لە شیوەکانی حیجازی توهامە ) بەو پێنج صەد دیرهەمە زەیدی کوڕی حاریثە سێ وشتری کڕیی و ، پاشان هەموویان چوونە ناو شاری مەککەوە . لەوێ تووشی طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا خوا لێی رازیی بێ بوون ، کە ئەویش نیازی کۆچ کردنی بوو و پێکەوە هەموویان

کۆچیان کرد .. ئەوەبوو زەید و ئـەبورافیع فـاطیمـە و ئـومکـولثـووم ( ی کچـانی پێغەمبەر ﷺ ) و سەودەی کچی زەمعـە ( ی هاوسـەری ) خـوا لێـی رازیـی بـێ هێنان و ، زەید ئومئەیمەنی هاوسەری و ئوسامەی کوڕی سـوار کـردن ، هـەتا کـە گەیشتینە ( البیداء ) وشترەکەی من واتە عـائیشە ، کە لەناو کەژاوەدا بووم لەگەڵ دایکمدا ، سڵەمی‌یەوە و دایکیشم هاواری ئەکرد : کچەکەم ڕۆ ! بووکەکەم ڕۆ ! تا ئەوەبوو وشترەکەمان وەستایەوە و لە بەرزاییەکەی ( هەرشا ) دابـەزیی و خـوای گەورە سەلامەتی کردین . پاشان گەیشـتینە مەدینـە و مـن لەگـەڵ خـاوخێزانی ئەبوبەکردا دابەزیم و ، خاوخێزانی پێغەمبـەریش ﷺ ( لـەلای ئـەو ) دابـەزین . بەڵام زەینەبی کچی پێغەمبەر ﷺ لای ئەبولعاصی مێردی ، کە هێشتا موسـڵمان نەبوو بوو ، لە مەککە مایەوە و ، بۆی نەکرا کۆچ بکات بـۆ مەدینـە هـەتا دوای جەنگی بەدر ..

عائیشە خوا لێی ڕازیی بێ دەربارەی موسـڵمانە کـۆچ کـەرەکان ئەگێڕێتـەوە و ئەڵێت : کاتێ پێغەمبەری خـوا ﷺ تەشـریفی‌هاتە مەدینـە ، ئەبوبـەکر و بـیلال نەخۆش کەوتن . منیش چوومە لایان و وتم : بابەگیان چۆنی؟ بیلال تـۆش چـۆنی؟ ئەڵێت : کاتێك کە ئەبوبەکر ( تا ) ئەی‌گرت بە شیعر دەری ئەبڕیی کە مـردن لـە هەموو کەسێکەوە یەکجار نزیکە کە ئەی‌فەرموو:

کل امريء مصبِّح في أهـــله　　　والموت أدنـــى من شراك نـــعله

کاتێك کە بیلالیش ( تا ) کە بەری ئەدا ، ئاواتی بۆ شوێنە جۆر بە جۆرەکـانی مەککە ئەخواست کە ئەی‌وت :

أَلا لَيت شعري هل أبيتنَ ليلةً　　　بـــواد وحولي إذخرٍ وجليلُ
وهل أَرِدَنْ يوماً مياهَ مـــجنَّة　　　وهل يَبْدون لي شامة وطفيلُ

عـائیشە ئەڵێت : هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەم دایە . ئـەویش فەرمووی : (( أَللهمَّ حَبِّب إلينا المدينة كحُبِّنا مكةَ أو أشدَّ حُباً ، وَصَحِّحها ، وبارك في صاعها ومُدِّها ، وانقـــل حُمَّاهـــا . فاجعَلـــها بالجُحفَـــة )) . فـەرمووی : خوایـە ! مەدینەشمان وەك مەککە ، بەڵکو زیاتریش ، بەلاوە خۆشەویست بکە و ، لـە دەرد و دا پاکی بکـەرەوە و ، بەرەکـەت بـــخەرە مـەن و پێوانەیـەوە ، ( تـا ) کەشـی بگوێزەرەوە بۆ جوحفە .

لەو ماوەیەدا کە ئیمام عەلیی گەیشتبووە قوبــاء ســەرنجی دا وا ئــافرەتێکی موسڵمان لەوێیە و مێردیشی نیە و ، لە نیوەی شەودا کەسـێك دێـت بـۆ لای و تەقە لە دەرگاکەی ئەدا و ، ئەویش دێتە دەرەوە و ، کابرا شتێکی پێ‌یــە و ئــەی دا بە ئافرەتەکە و ، ئەویش لێی وەرئــەگرێ . ئەفــەرموێ : لــەم کــارەی کەوتمــە گومانەوە ، بۆیە وتم : ئەی کەنیزەکی خوا ! ئەو پیاوە کێ‌یە هەموو شەوێك تەقە لە دەرگاکەت ئەدا و ، تۆیش دێیتە دەرەوە و ، شتێکت ئەداتێ کە نازانم چی‌یە؟ تۆ ئافرەتێکی موسڵمانی و مێردیشت نیە ! وتی : ئەوە سەهلی‌کوڕی حونەیفە و زانیویەتی من ئافرەتێکی بێ‌کەسم . جا هەر کە ئێوارەی لێ دێ هەڵمەت ئەداتە بتی خزمەکانی و ئەیان شکێنێ و ، پاشان دار و تەختەکانم بـۆ دێنــێ و ئــەڵێ : ئەمانە بسووتێنە . ئیمام خوا لێی رازیی بێ کە سەهل لەگەڵیا لە عێراق کۆچــی دواییکرد ، ئەم هەڵوێستەی هەر لە یاد بوو .[٢٨٣]

بەم شێوەیە پێغەمبەری ئازیز و هــاوەڵانی گەیشــتنە مەدینــەی مونــەووەرە .. بەمە پیرۆزترین کۆچ لە مێژووی مرۆڤایەتیی‌دا رووی دا .. ئیمان‌داران بڕیاریان دا سەر و ماڵیان بکەنە قوربانی دینــی خــوا .. چ کــۆچ‌کــەران و چ ئەنصــار خۆیــان فرۆشت بە خوا .. بە نیــازی رازیی‌کردنــی خــوا و ، هیدایــەت‌دانــی مرۆڤایــەتیی گەورەترین ئاڵ و گۆڕیان بە سەر ژیانی خۆیان‌دا هێنا ..

---

[٢٨٣] السيرة النبوية لأبــي شهبة : ١ / ٤٥٧ - ٤٩٨ ، والرحيق المختوم : ١٥٨ - ١٧٧ ، وشرح حياة الصحابة : ١ / ٢٠٥ ، ٢٠٧ ، ٥٤٤ - ٥٨٧ ، ٧٤٦ ، ٤ / ٣٥١ - ٣٥٢ ، ٣٩٢ ، ٣٩٣ ، ٤٩٢ - ٤٩٣ .

# بەشی شانزەهەم
# گەیشتنە مەدینە

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەدا بۆ ماوەی سیانزە ساڵی رەبەق خەریکی بانگ‌کردن بوو بۆ لای خوا و ، دانیشتوانیشی بووبوونە کۆسپی بەردەم بانگەواز و ، لەو ماوە زۆرەدا تەنها کەمێکیان لێ موسڵمان بوون ، تا پێغەمبەری خوا ﷺ ناچار بوو دەست لە قورەیش بشوات و ، هانا بۆ هۆزەکانی تر بەرێت ، تا بەڵکو موسڵمان بن و ، ببنە کۆمەك و پشتیوان بۆ دینی خوا . لە وەرزی حەجدا سەردانی هۆزەکانی ئەکرد و بۆ تەوحید بانگی ئەکردن ، کەچیی هیچ هۆزێك بە دەمیەوە نەهات ، تا دانیشتوانی یەثریب رێیان لێی کەوت و ، مەردانە گوێیان بۆ دەنگی حەق راگرت و ، دڵ و مێشکیان بۆ کردەوە و ، باوەشیان بە نووری قورئان‌دا کرد و ، بردیانەوە بۆ مەدینە ، تا لەوێ ئەو نوورە هەموو ماڵەکان رۆشن بکاتەوە .. بەڵێ باوەشی خۆشەویستی‌یانِ بۆ نووری هیدایەت کردەوە و ، بوونە چاك‌ترین کۆمەك و پشتیوان بۆ ئیسلام و ، موسڵمانانی مەککەش سوپاسی خوایان ئەکرد وا ئەم بەرێزە هیمەت‌بەرزانەی کردۆتە هەڵگری دینەکەی و ، بە سنگێکی فراوانەوە هەموو گران‌بەهایەك ئەبەخشن و ، براکانی مەککەیان ئەکەنە برابەشیان .

کاری سەرەکیی بانگەوازی مەککە بزیتیی بوو لە ریشەدەرهێنانی بیروباوەڕە زیان‌بەخشەکان ، کە شەریك‌دانان بۆ خوا و ، باوەڕنەبوون بە پێغەمبەران و زیندووبوونەوەیان لە خۆگرتبوو ، تا بیروباوەڕی راست و پاك ، کە بریتی‌یە لە تەوحید و ئیمان بە خوا و مەلائیکەت و کتێب و پێغەمبەرەکانی و ، رۆژی دوایی ، لە دڵاندا بچەسپێ و ، مرۆڤەکان ماوەیان بدرێ بە جوانیی بیر بکەنەوە و، بۆ بەرژەوەندیی هەردوو ژیانیان ژیریی و سەلیقەیان بخەنە کار و ، هەموو کەسێ لە هەڵبژاردنی رێبازی ژیانی‌دا سەربەست بێت ..

لە سەرانسەری سەردەمی مەککەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بەبێ وچان خەریکی فێرکردن و پەروەردەکردنی هاوەڵانی بوو ، کۆمەڵە پیاوێکی ناوازە و بێوێنەی پێ

گەیاند ، کە بوونە بەردی بناغەی دامەزراندنی پاكترین و بەرێزترین کۆمەڵ بۆ خزمەتکردنی مرۆڤ و ، بەرپاکردنی گەورەترین و بێگەردترین شارستانییەت لە مێژووی مرۆڤ دا ..

شایانی باسە کە بیروباوەڕی ئیسلامیی و رەوشتە ئیسلامییەکان لەناو ئەو کۆمەڵە بتپەرستەدا یەکجار نامۆ بوون و ، غیرەتێکی بێوێنەیان ئەویست تا کۆمەڵیان پێ ئاشنا بکرێت و پاشانیش لەگەڵ خوێن و گۆشتی ئەندامەکانی کۆمەڵی موسڵماندا تێکەڵ بکرێن ..

ئەو بناغە شەرعیی و کردەوە چاکانەی کە بە ئاڵ و گۆڕی کات و شوێن ئاڵ و گۆڕیان بەسەر نایەت ، وەك دامەزراویی لەسەر بیروباوەڕ و ، ئارام و دانبەخۆدا گرتن لە پێناوی بیروباوەڕدا و ، فەرماندان بە نوێژکردن و ، راستگۆیی و پاك داوێنیی و ، چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا و ، سیلەی رەحم و ، داد و ئامۆژگاریی لە سەر خێر و چاکە و ، قەدەغەکردنی کارە سووك و بێکەڵکەکان وەك کوشتن و ، زیندەبەچاڵی کچان و ، ستەم و ، زینا و ، خواردن و داگیرکردنی ماڵ و سامانی خەڵکیی بە ناڕەوا .. ئا ئەمانە هەر هەموویان و وێنەیان لە سەردەمی مەککەدا بە چاکیی بایەخیان پێ ئەدرا و ، پەروەردەی موسڵمانەکانیان لە سەر ئەکرا ..

بەڵام لە سەردەمی مەدینەدا بارودۆخ گۆڕرا .. وەك جاران بانگەواز تەنها بە مەککە و دەوروبەری پێشکەش نەئەکرا ، بەڵکو ئیسلام پەڕ و باڵی بە هەموو لایەکدا بڵاوکردەوە و ، ناوچەیەکی فراوان لە دوورگەی عەرەبیی و دەوروبەری باوەشی بۆ دینی ئیسلام کردەوە و ، زۆر بە چاکیی ئیسلام وەرگیرا و ، دوای چەند ساڵێك پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی بۆ سەرۆك و پادشاکان نارد تا بێن بە ئیسلامی پیرۆز ئاشنا بن و ، شوێنی بکەون تا بە خۆیان و گەلەکانیانەوە سەرفرازی دنیا و قیامەت بن .

جا هەندێ گوێڕایەڵییان کرد و هەندێکیش بە ناشیرینیی وەڵامیان دایەوە . بەمە جیهانیەتیی ئیسلام سەلما و ، دەرکەوت کە دینی عەرەب بە تەنیا نیە ، چونکە جیاوازیی ناخاتە نێوان گەلان و بۆ هەموان هاتووە :

﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾ (الأعراف : ١٥٨)

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴾ (الأنبياء : ١٠٧) .

لەم فەرموودەیەشدا کە بوخاریی ریوایەتی کردووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( أعطيت خمساً لم يُعطهن أحدٌ قَبلي : كان كل نبي يبعث إلى قومه خاصة، وبعثت إلى الناس عامة ... )) . ورواه مسلم بلفظ : (( وبعثت إلى كل أحمر وأسود )) . وفي رواية : (( وبعثت إلى الخلق كافة )) .

فەرموویە : پێنج شتم پێ دراون کە پێش خۆم بە هیچ کەس نەدراون : هەموو پێغەمبەرێك بە تایبەتیی بۆ گەلەکەی خۆی رەوانە ئەکرا ، بەلاّم من بۆ تێکڕای خەلّکیی رەوانە کراوم ...

بەلّێ ، ئیسلام دینی حەق بوو ، بەلاّم ئەگەر هێزێك نەبێ پشتی بگرێ و بەرگریی لێ بکا و ، رێی بۆ پاك بکاتەوە ، تا دلّ و مێشکەکان رۆشن بکاتەوە ، ئەوا ئەو حەقە دەوری خۆی نابینێ ، بۆیە لەو سەردەمەدا ، کە ئیسلام پەرەی ئەسەند ، پێویست بوو هێزێك بۆ حەق بەرپا بکرێ و ، یاسای جیهاد بۆ موسلّمانان دیاریی بکرێ ، تا بەرگریی لە خۆیان و لە ناوچەکەیان بکەن ، چونکە ناحەزان کەوتنە بەکارهێنانی هێز بۆ لە ناوبردنی موسلّمانان و ، موسلّمانانیش مافی خۆیان بوو کە بەرگریی لە خۆیان بکەن .

بەمە کۆمەلّی موسلّمان و حکوومەتی موسلّمان و نیشتمانی موسلّمانان بەرپا بوون ، بۆیە لەو سەردەمەدا حوکمە شەرعی‌یەکان بە درێژە پێشکەش بە موسلّمانان کران ، تا کاروباری کۆمەلّەکەیان بەو پێیە هەلّ سوورێنن و ، هەموو حەلاّلّ و حەرام و ، رێپێدراو و قەدەغەلێکراوێکیان بەلاوە روون بێ ..

لە لایەکی تریشەوە حوکمە شەرعی‌یەکان پێویستی‌یان بە دەسەلاّتێك هەیە کە بتوانێ جێ بەجێیان بکات ، ئەمەش پێویستیی بە کۆمەلّێکی تێگەیشتوو هەیە کە ملکەچیی بۆ ئەو فەرمانانە بکات . چونکە ئەگەر ئیسلام ئەو خەلّکە لەسەر ملکەچیی و گوێڕایەلّیی رانەهێنێ ، ئەوا کەسێك کە حەددی زینا ، یان کوشتن، یان عەرەق خواردنەوە ، یان دزیی ئەکەوێتە ئەستۆ ، نە خۆی و نە کەس وکاری رێ نادەن حوکمی شەرعی بەسەردا جێ بەجێ بکرێ .

ئەوەتا دایکی بەڕێزی زانا و شارەزای ئیسلامان خاتو عائیشە خوا لێی رازیی بێ ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە خەلّکەکە لە پێشەوە فێری ئیمان ئەکران .. باسی بەهەشت و دۆزەخیان بۆ ئەکرا ، تا خەلّکیی بە چاکیی دلّیان بە ئیسلامەوە بەسترا ، حەلاّلّ و حەرام هاتە خوارەوە ، ئەگینا راستەوخۆ خەلّك بە گوێی

ئیسلامیان نەئەکرد و وازیان لە عەرەق و زینا ـ بۆ نموونە ـ نەئەهێنا .. ئەڵێت : ( إنما نزل من القرآن أول ما نزل منه سورة من المفصّل فيها ذكر الجنة والنار ، حتى إذا ثاب الناس إلى الإسلام نزل الحلال والحرام ، ولو نزل أول شيء : (( لا تشربوا الخمر )) . لقالوا : لا ندع الخمر أبداً ، ولو نزل : (( لا تزنوا )) . لقالوا : لا ندع الزنا أبداً ) . رواه البخاري .

جا هەروەك موسڵمانەکان لە مەککەدا تووشیان بە تووشی بتپەرستەکانەوە بوو بوو ، لە مەدینەش‌دا تووشیان بە تووشی جوولەکە و مونافیقەکانەوە بوو . بەمە موسڵمانەکان لە مەدینەدا بەرامبەر بە سێ دوژمن وەستا بوون و ، ئەبوا لە مەترسیی هەر سێکیشیان خۆیان بپارێزن و ، سەرەنجام بەسەریشیان‌دا زاڵ ببن کە بریتیی بوون لە : هێزی موشریکان و ، هێزی مونافیقان و، هێزی جوولەکە .. خۆ دیارە مەترسیی عەرەب و جوولەکە مونافیقەکان لە مەترسیی دوژمنە ئاشکراکان زیاتر بوو . چونکە دوژمنی دیار چاکتر بەرهەڵستیی ئەکرێ و ، دەربازبوونیش لە مەترسیی ئاسانترە . ئەوەبوو خوای گەورە کۆمەکیی حەق ویستانی کرد و سەرەنجام هێزی خواناسان ئەو سێ هێزە زۆر و زەبەندەیەی دا بە زەوییدا و ، لەسەر هەموو لووتکە بەرزەکانی زەوییدا ئاڵای راستیی و پاکیی هەڵ کرا ، تا دڵە پاکەکان ئۆخەی بکەن و ، زامی ستەم لێ کراوان سارێژ ببێ ..

خوای گەورە کۆمەکیی موسڵمانان بکات ، لەم سەردەمەش‌دا بچنەوە دۆخی جارانیان و ئاڵای ئیسلام بە سەر تەلارە بەرزەکانەوە هەڵ بکەن و ، مرۆڤایەتیی لە چنگی تاعوونە سامناکەکەی سیاسەت دەرباز بکەن و ، نرخ و رێز بگەڕێتەوە بۆ ئەو مرۆڤەی کە خوا رێزی لێ گرتووە ، بەڵام کاربەدەستە خوانەناسەکان هیچ مافێکی رەوای خۆی بۆ ناهێڵنەوە .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە قوباء لەو ماوە کەمەدا مزگەوتی فریای موسڵمانەکان خست ، کە تەشریفیشی بردە مەدینەوە پێش هەموو شتێك دەستی بە دروستکردنی مزگەوت کرد ..

جا با شتێك دەربارەی پلە و پایەی مزگەوت بزانین .

مزگەوتەکانی سەرزەویی ماڵی خوان :

﴿ وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا ﴾ ( الجن : ١٨ ) .

هەروەها مزگەوتەکان شوێنی دابەزینی مەلائیکەتن و ، شوێنی حەوانەوە و دڵ ئارامیی خواناسانن .. لە مزگەوتدا موسڵمان پەیوەندیی بە ئاسمانەوە ئەکات .. دڵی پاك ئەکاتەوە .. رۆحی خاوێن ئەبێتەوە و ، بە پلەکانی ئیماندا سەر ئەکەوێ .. مزگەوتەکان وەك شوێنی دروستیی رۆحەکانن ، هەروەها شوێنی دروستیی تەن و لاشەکانیشن .. بۆیە خواناسان بە لەش و بەرگی خاوێنەوە ئەچنە مزگەوتەوە و ، مزگەوتەکانیش یەکجار پاك وخاوێن را ئەگرن ، تا ببنە دڵگیرترین شوێنی سەرزەویی و ، پەنا و هانای شەیدایانی خواپەرستیی بن ..

بەڵێ ، سەرزەویی پڕیەتی لە مزگەوت ، کە هەموویان شوێنی رێز و حورمەت و ویقارن .. نابێ هیچ کەس تیایانا دەنگ بەرز بکاتەوە .. یان دەمە دەمێ بکات .. یان وشەی نەشیاو بە دەمیدا بێت .. شوێنی پاك و خاوێنیی و ذیکر و نوێژ و قورئانخوێندنن .. کڕین و فرۆشتنیان تێدا حەرامە .. جاڕیان تێدا نادرێ .. شوێنی دژایەتیی و ناکۆکیی و بەرابەرکێی سیاسیی و جیاوازیی دینیی نین ..

لە سەرەتای مێژووی ئیسلامدا مزگەوتەکان ، بە تایبەت مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە ، خزمەتێکی زۆری بە موسڵمانان پێشکەش ئەکرد .. خزمەتی دینیی .. زانستیی .. کۆمەڵایەتیی .. تەندروستیی .. سوپایی ..

مزگەوتەکان شوێنی خواپەرستیی بوون .. هەروەها بۆ پەروەردە و فێرکردن دەوری پەیمانگا و زانکۆکانیان ئەبینیی .. بۆ کۆکردنەوەی یارمەتیی و کۆمەکیی و پشتگیریی لە سەر چاکە دەوری کۆمەڵە چاکەخوازەکانیان ئەبینیی .. بۆ هەژار و نەدار و رێبواران دەوری مەڵبەندی کۆمەکیی هەژارانیان ئەبینیی ، کە خێرۆمەندان ئەبوونە داڵدەی نان و ئاو و حەوانەوەی ئەو دەستکورتانە ، وەك ئەهلی صوففە کە لە مەدینەدا لە مزگەوتدا ئەمانەوە ..

مزگەوتەکان شوێنی کۆبوونەوەی موسڵمانان بوون .. تیایانا کۆ ئەبوونەوە و تەگبیر و راوێژیان ئەکرد و ، فێری یەکێتیی و برایەتیی و هاوکاریی ئەبوون ، بیریان لە قازانجی دنیا و قیامەتی خۆیان ئەکردەوە و ، بڕیاری گونجاویان جێ بەجێ ئەکرد .. هەتا لە مزگەوتی مەدینەدا تیر و کەلوپەلی جیهاد دروست ئەکرا و چادریان هەڵ ئەدا تا زامدارانی جەنگ بهێننەوە ئەوێ و ، لەوێ دەرمانیان بکەن .. هەتا هەندێ لە موسڵمانان لەوێ خەریکی راهێنان ئەبوون تا خۆیان ئامادەی جەنگ و کوشتار بکەن ..

بۆ ئەم هەموو خزمەتانە مزگەوتەکان بەکار ئەهێنران .. بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ماوە کەمەی قوباءدا مزگەوتی دروست کرد .. ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ﴾ (التوبة : ١٠٨) .

طەبەرانیی لە ئیبن عەباسەوە ریوایەتی کردووە کە کاتێك ئەم ئایەتە : ﴿ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ ﴾ هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ لای عوەییمی کوڕی ساعیدە و فەرمووی: (( ما هذا الطهور الذي أثنى الله عليكم ؟ )) . فەرمووی : ئەم پاکی‌یە چی‌یە کە خوای گەورە بە بۆنەیەوە ستایشی ئێوەی کردووە ؟ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! هەر پیاو و ئافرەتێکمان دەست بە ئاو بگەیەنن بە پاکیی عەورەتیان ئەشۆن . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( هو هذا )) .
وروى نحوه أيضاً أبوداود والترمذي وابن ماجه .

دەربارەی مزگەوتی قوباءیش گێڕراوەتەوە کە جیبریل سەلامی لێ بێ شوێنی قیبلەی بۆ پێغەمبەر ﷺ دیاریی کردووە .

جا لەبەر ئەوەی کە مزگەوتی قوباء یەکەم مزگەوتێك بوو کە لە ئیسلامدا دروست کرابوو و ، کرابوویە مزگەوتی گشتیی ئوممەتی ئیسلام ، ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویستی‌یەکی تایبەتیی لە دڵیا بۆ ئەم مزگەوتە حەشار دابوو ..

لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە هەموو رۆژانێکی شەممە ، جارێ بە سواریی و ، جارێکیش بە پیادە ، سەری لێ ئەدا ..

لە فەرموودەیەکی صەحیحی تریشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەری بڕیوە کە نوێژێکی مزگەوتی قوباء خێری عومرەیەکی هەیە کە فەرموویە :
(( صلاة في مسجد قباء كعمرة )) . رواهما الشيخان .

تیرمیذییش لە ئوسەیدی کوڕی ظوهەیرەوە ریوایەتی کردووە کە لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویە : (( الصلاة في مسجد قباء ركعتين أحبُّ إليّ من أن آتيَ بيت المقدس مرتين ، لو يعلمون ما في قباء لضربوا إليه أكباد الإبل )) . فەرموویە: دوو رەکعەت نوێژی مزگەوتی قوباءم بەلاوە خۆشەویستترە لەوەی دوو جار

زیارەتی ( بيت المقدس ) بکەم . ئەگەر خەڵك بیانزانیایە لە مزگەوتی قوبـاءدا چ خێر و چاکەیەکیان تووش ئەبێت ئەوا بە سواریی وشتر بۆی ئەهاتن .

ئیبن ماجەش لە سەهلی کوڕی حونەیفەوە ئەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـە : (( مـن تطهر في بيته ، ثم أتى مسجد قباء فصلى فيه صلاة كان كـأجر عمرة )) . فەرموویە : هەر کەس لە ماڵەوە دەستنوێژی گرت و ، دوای ئەوە هات بۆ مزگەوتی قوباء و نوێژێکی تیا بـەجێ هێنـا ئەوەنـدەی پاداشـتی عومرەیـەك خێری بۆ ئەبێ .

لە پێشەوە ئەوەمان باس کرد کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕۆژانـی دووشـەممە و سێشەممە و چوارشـەممە و پێنجشـەممە لە قوباء مایەوە و ، ڕۆژی جـومـعـە بـەرەو ( طيبة ) واتە مەدینە کەوتە ڕێ و ، لە ڕێدا کە گەیشتە مەنزڵی نـەوەی سـالم ی کوڕی عەوف کاتی نوێژی جومعە هاتە بەرەوە و ، لەو مزگەوتەدا کە ئەکەوێتە ناو شیوی ( رانوناء )ەوە و ، ئێستە پێی ئەوترێ مزگەوتی جومعە ، نوێـژی جومعـەی لەگەڵ موسڵمانەکاندا بەجێ هێنا و ، ئەمـەش یەکـەم نوێـژی جومعـە بـوو کـە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی دابێ . چونکە پـێش گەیشـتنی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ مەدینە ، ئەبوئومامە ئەسعەدی کوڕی زورارەی نەججاریی ـ کـە یـەکێ بـوو لـەو دوانزە پیاوەی کە لە پـەیمانی دووهـەمی عەقەبـەدا بـۆ نـەقیبیی موسـڵمانەکانی مەدینە هەڵ بژێررا ـ بۆ یەکەم جار نوێژی جومعەی لەگەڵ موسڵمانەکاندا ئـەنجام دابوو .. لەلایەکی ترەوە لـە مەککـەدا موسـڵمانەکان ، لـە بـەر سزا و ئـازاری قورەیش و دژایەتییان ، نەیان ئەتوانیی کۆ ببنەوە و بە ئاشکرا نوێـژی جومعـە و جەماعەت بەجێ بهێنن .

لە وتاری یەکەم جومعەیدا پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ زۆر بە کاریگەریی باسـی ئیمان و یەقینی کرد و ، ئامۆژگاریی موسڵمانانی کرد کە ئەی فەرموو :

(( ألحمدُ لله ، أحمدُه وأستعينُه ، وأستغفرُه وأستهديه ، وأومـن بـه ولا أكفـره ، وأُعادي مَن يَكفُرُه ، وأَشهَدُ أن لاَّ إلهَ إلا الله وحده لا شريك له ، وأنَّ مُحمداً عبـده ورسوله ، أرسلَهُ بالهُدى ودينِ الحقِّ ، والنورِ والموعظةِ على فترةٍ منَ الرُّسُلِ ، وقلَّةٍ من العـلمِ ، وضَلالةٍ منَ الناسِ ، وانقطاعٍ منَ الزَّمانِ ، ودُنُوٍّ من السَّاعَةِ ، وقُـربٍ مـنَ

الأَجَلِ ، مَن يُطعِ اللهَ ورسولَهُ فقدْ رَشَدَ ، ومن يَعصِهما فقد غَوى وفَرَطَ، وضلَّ ضلالاً بَعيداً .

وأُوصِيكُم بتقوى الله ، فإنَّهُ خيرُ ما أوصى به المسلمُ المسلمَ أن يَحُضَّه على الآخرةِ ، وأن يأمُرَه بتقوى الله ، فاحذَروا ماحذَّركم اللهُ من نفسه ، ولا أفضلَ من ذلك نصيحةً ، ولا أفضلَ من ذلكَ ذكرى ، وإنَّه تقوى لمن عَمِلَ به على وَجَلٍ ومَخافةَ ، وعون صدق على ما تَبتغونَ من أمرِ الآخرة ، ومَن يُصلِح الذي بينه وبينَ اللهِ من أمرِ السِّرِّ والعلانيةِ ولا ينوي بذلكَ إلا وَجهَ اللهِ يكُن لهُ ذكراً في عاجلِ أمرِه ، وذُخراً فيما بعدَ الْمَوتِ حينَ يفتَقِرُ المرءُ إلى ما قدَّم ، وما كان مِن سوى ذلك يَوَدُّ لو أنَّ بينه وبينَه أمداً بَعيداً ، ﴿ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٣٠﴾ ﴾ . هو الذي صدّق قوله ، وأنجز وعدَهُ ، لا خلفَ لذلكَ ، فإنه يقول تعالى : ﴿ مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٢٩﴾ ﴾ .

واتقوا اللهَ في عاجلِ أمركم وآجله ، في السرِّ والعَلانية ، فإنَّه ﴿ من يتق الله يكفر عنه سيئاته ويُعظم له أجراً ﴾ ، ومَن يتَّقِ اللهَ فقد فازَ فَوزاً عَظيماً . وإن تقوى الله تُوقي مَقتَه ، وتوقي عقوبته ، وتوقي سُخطَه ، وإن تقوى الله تُبَيِّضُ الوجهَ ، وتُرضِي الرَّبَّ ، وتَرفَعُ الدَّرَجَةَ .

خُذُوا بحَظِّكُم ، ولا تَفرطُوا في جَنبِ الله ، قَد عَلَّمَكُم اللهُ كتابَهُ ، ونَهَجَ لكُم سبيلَهُ ليعلَمَ الذينَ صدَقُوا ويعلَمَ الكاذبينَ ، فأَحسنوا كَما أَحسَنَ اللهُ إليكُم ، وعادُوا أعداءَهُ، وجاهِدُوا في اللهِ حَقَّ جِهادِه ، هو اجتباكُم وسَمَّاكُمُ المسلمينَ ، لِيَهلِكَ مَن هَلَكَ عَن بَيِّنةٍ ، ويحيى من حيَّ عن بينة ، ولا قوة إلا بالله .

فأكثروا ذكرَ الله ، واعمَلوا لما بعد الموت ، فإنَّه من أصلحَ ما بينه وبينَ اللهِ يَكفيه ما بينه وبين الناس ، ذلك بأن اللهَ يَقضي على الناسِ ولا يَقضونَ عَلَيه ، ويملكُ من الناس ولا يَملِكونَ منهُ ، اللهُ أكبر ولا قوة إلا بالله العلي العظيم )) .[٢٨٤]

**دوای نوێژی جومعه نەوەی سالم ی کوڕی عەمری کوڕی عەوف هاتنە خزمەتی و، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! لەناومان‌دا ، لەناو پیاوی زۆر و چەك و هێز و**

---

[٢٨٤] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٢.

پارێزگارییدا ، بمێنەرەوە . دەستیان بە جڵەوی وشترەکەیەوە ئەگرت بەشکو لەلایان بمێنێتەوە . ئەویش ئەیفەرموو : (( خلّوا سبيلها فإنها مأمورة )) . جڵەوی وشترەکەشی شل ئەکرد و ، هەرچیی بەلای ماڵێکی ئەنصارییدا ، کە لە رێگاکەیدا بوو ، تێ ئەپەڕیی داوایان ئەکرد لەلای پیاوی زۆر و چەك و پارێزگارییدا بمێنێتەوە و ، هەمان فەرمایشتی پێ ئەفەرموونەوە .. هەتا ئەوەبوو گەیشتە شوێنی مزگەوتە پیرۆزەکەی و لەوێ وشترەکە چۆکی دا دا و پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەریەوە دانەبەزیی و ، وشترەکە هەستایەوە و ، کەمێك رۆیشت و پێغەمبەری خواش ﷺ جڵەوی بۆ شل کردبوو ، کەچیی وشترەکە ئاوڕی بۆ دواوە دایەوە و گەڕایەوە شوێنی چۆك دادانی یەکەم جاری و ، چۆکی دادایەوە ..

پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری دابەزیی و خەڵکەکە هەر یەك لە لایەکەوە هەوڵی ئەدا ببێتە میوانیان . فەرمووی : (( إني أنزل على أخوال عبد المطلب ، أكرمهم بذلك )) . فەرمووی : بۆ رێزلێنان لە خاڵوانی عەبدولموطەللیب ئەبمە میوانی ئەوان .

ئەمە کارێکی زۆر چاك بوو تا هیچ کەس دڵی لە خۆی دانەمێنێ ، چونکە مافی خۆیەتی ببێتە میوانی خزمەکانی .

پاشان پرسیی : (( أي دور أهلنا أقرب ؟ )) . فەرمووی : ماڵی کام لە خزمانمان نزیکە ؟ خێرا هاوەڵی پایەدار ئەبوئەییووبی ئەنصاریی هاتە وەڵام : ماڵی من . خێرا کەل و پەلەکەی پێغەمبەری خوای بردە ماڵەوە . ئیتر بە شێوەیەکی نەرم و نیان پێغەمبەری خوا ﷺ عوزری هێنایەوە کە نەبۆتە میوانی ماڵەکانی تری غەیری نەوەی نەججار کە فەرمووی : (( المرء مع رحله )) .

پاشان ئەسعەدی کوڕی زورارە ، کە لە شەوی پەیمانی دووهەمی عەقەبەدا نەقیبی نەوەی نەججار بوو و ، کۆمەکی موصعەبیش بوو تا بانگەوازەکەی لە مەدینەدا بڵاو بکاتەوە ، هات و ، سەیری کرد پێغەمبەری خوای ﷺ لە دەست چووە و ، شەرەفی میواندارێتیی ئەوی پێ نەبڕاوە ، بۆیە جڵەوی وشترەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ گرت و لای خۆی هێشتیەوە .. ئەمەشی بە رێز و پایەیەك بۆ خۆی دائەنا ..

ئەم میوانداریەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوپەڕی پایەدارییی بوو بۆ ئەبوئەییووب و ، بۆ تێکڕای نەوەی نەججار .

شایانی باسە کە ئەنصار هەر هەموویان خۆیان ئامادە کردبوو و ، زۆریشیان پێ خۆش بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ببێتە میوانیان ، بۆیە پێغەمبەری خواش ئەوپەڕی ستایشی ئەکردن و خۆشەویستیی خۆی دەرئەبڕیی بۆیان ..

ئەوەتا لە هەردوو صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا ، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت کراوە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( خَيرُ دُورِ الأنصارِ بَنو النَّجَّارِ ، ثُمَّ بَنو عبدِ الأشهَلِ ، ثم الحارثُ بنُ الْخزرَجِ ، ثم بنو ساعِدَةَ ، وفي كلِ دورِ الأنصارِ خيرٌ )) .

فەرموویە : چاکترین بنەماڵەی ئەنصار نەوەی نەججارن ، پاشان نەوەی عەبدولئەشهەل ، پاشان نەوەی حاریثی کوڕی خەزرەج ، پاشان نەوەی ساعیدە و ، هەموو بنەماڵەکانی ئەنصار پڕن لە خێر .

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە کاتێ سەعدی کوڕی عوبادە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگات ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! بنەماڵە چاکەکانی ئەنصارت دیاریی کردوون و ، ئێمەت لە دوای دواوە داناوە ؟ خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ بە سنگێکی فراوان و ، عەقڵێکی گەورە و ، زمانێکی پاراوەوە ، وەڵامێکی ژیرانەی ایەوە کە فەرمووی : (( أو ليس بحسبكم أن تكونوا من الأخيار؟ )) . فەرمووی : گوایا ئەوەندەتان بەس نیە کە لە ریزی پیاوچاکاندا بن ؟

بە راستیی ئەو رۆژەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە سواریی وشترەکەی گەیشتە ناو مەدینە و ئەبوبەکریش لە پاشکۆیدا بوو [٢٨٥] رۆژێکی ناوازە و تاقانەی ئەو شارە بوو .. نەوەی نەججاریش بە خۆیان و شمشێرەکانیانەوە ئەو ناوەیان تەنی بوو، تا ترس و لەرز بخەنە دڵی دوژمنانی خوا و پێغەمبەرەوە و ، هیچ کەس نەوێرێ لە ئاستی ئازیزدا بە خراپە چاو بەرز بکاتەوە ، بە تایبەتیی جوولەکە و بت پەرستەکان و ، تا هەموانیش تێ بگەیەنن کە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ کەس وکار و نیشتمانی بەجێ هێشتبێ و بۆ لای خوا کۆچی کردبێ ، هەر وا لەژێر چاودێریی و پارێزگارییدا و ، بنەماڵەی خاڵوانی و شوێنکەوتوانی و موسڵمانان بە سەر و بە ماڵ بەرگریی لێ ئەکەن و ، تا ئاو لە چاویانا مابێ کەسێ ناتوانێ بە خراپە دەستی بۆ بەرێ ..

---

[٢٨٥] ئەبوبەکر خۆی وشتری هەبوو بۆ سواریی ، بەڵام بۆ رێزلێنانی زیاتر لە ئەبوبەکر و بۆ دەرخستنی پایەی ئەو، پێی خۆش بوو لە پاشکۆی خۆیدا بێت .

بە راستیی دیمەنێکی ناوازە و دڵڕفێن بوو ..

دانیشتوانی مەدینە هەر هەموویان بە پیر و گەنجەوە .. بە ژن و منداڵەوە ، هاتبوونە دەرەوە تا پێشوازیی لە میوانی ئازیز و بەڕێز بکەن و ، تێر تێر سەیری ئەو خۆشەویستە بکەن ، کە بەبێ ئەوەی هێشتا چاویان پێ کەوتبێ ، چۆتە ناو کرۆکی دڵیانەوە ..

جا بۆ وەسفکردنی ئەو دیمەنە قەڵەباڵغە ، ئیمام ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : لەگەڵ منداڵاندا رام ئەکرد و خەڵکیی ئەیانوت : موحەممەد هات . هەر رام ئەکرد و هیچم نەئەدیی . دیسان دەیانوت: موحەممەد هات و ، منیش رام ئەکرد و هیچم نەئەدیی ، تا ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکری هاوەڵی هاتن و ، ئێمەش لە یەکێ لە کەلاوەکانی مەدینەدا خۆمان حەشار دا . دوای ئەوە هەردووکیان پیاوێکی دەشتەکییان نارد تا ئەنصار لە هاتنیان ئاگادار بکا . ئەوەبوو نزیکەی پێنج صەد پیاوی ئەنصار هاتنە پێشوازییان و گەیشتنە لامان و ، بە پێغەمبەر و ئەبوبەکریان وت : بە سەلامەتیی و گوێڕایەڵییکراویی بفەرموون . ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکەی لە نێوانیاندا هاتن و ، خەڵکی مەدینەش هەموو هاتنە دەرەوە ، هەتا کچە گەنجەکانیش بە سەربانەکانەوە سەیریان ئەکرد و ئەیان وت : کامیان ئەوە ؟ تا ئێستە دیمەنی وەهامان نەدیی بوو .

ئەنەس ئەڵێ : ئەو رۆژەی کە تەشریفی هێنایە ناومان و ، ئەو رۆژەش کە کۆچی دوایی کرد ، ئاگادار بووم ، دوو رۆژی ترم نەدین کە لەو دوو رۆژە بچن .

چەند کچۆڵەیەکی نەوەی نەججاریش هاتنە پێشوازیی و بە دەف لێدانەوە ئەیان وت :

نَحنُ جَوارٍ مِن بَني النَّجَّارِ       يا حَبذا محمدٌ مِن جارِ

ئەیان وت : ئێمە چەند کچۆڵەیەکی نەوەی نەججارین و خۆزگە موحەممەد دراوسێمان بوایە .

پێغەمبەری خوا ﷺ روو بە رووی ئەو منداڵانە رۆیشت و فەرمووی : « أتحبينني ؟ » فەرمووی : ئایا منتان خۆش ئەوێ ؟ وتیان : ئەرێ ، بەخوا ، ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی : « وأنا واللهِ أحبكم » سێ جار فەرمووی : بەخوا منیش ئێوەم خۆش ئەوێن .

لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمیش‌دا لە باسی کۆچ کردن‌دا هاتووە ، کاتێک کە هەردووکیان گەیشتنە مەدینە ، خەڵکەکە هەر هەمووی دەرچوونە کۆڵانەکان و سەربانەکان و ، منداڵ و خزمەت‌کارەکانیش هاواریان ئەکرد : ألله أكبر ، جاء رسول الله . ألله أكبر ، جاء رسول الله .

بەڵێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ بووە میوانی ئەبوئەییووبی ئەنصاریی و ، بەوپەڕی ڕێز و پایەداری‌یەوە بۆ ماوەی حەوت مانگ مایەوە ، هەتا ئەوەبوو مزگەوت دروست کرا و خانووی ماڵ و منداڵ و هاوسەرەکانی تەواو کران و گواستیەوە بۆ ئەوێ ..

یەکەم جار پێغەمبەری خوا ﷺ لە نهۆمی خوارەوەی ماڵەکەی ئەبوئەییووبدا مایەوە . بەڵام ئەبوئەییووب زۆری پێ ناخۆش بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوارەوە بێ و هەوڵی زۆری لەگەڵ دا هەتا تەشریف بەرێتە سەرەوە . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی روون کردەوە کە بۆ ئەوانیش و موسڵمانانیش کە سەردانیان ئەکەن ئەوە ئاسانە ، چونکە لەو ماوەیەدا کە مزگەوت تەواو نەبوو بوو ئەو ماڵە شوێنی کۆبوونەوەی موسڵمانان بوو .

زۆر لە رادەبەدەر ئەبوئەییووب رێزی لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگرت و ، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ نانی نەخواردایە ، نانی نەئەخوارد .. کە خواردنیشی دروست ئەکرد و ئەی‌نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ چاوەڕوانیی ئەکرد هەتا قاپی چێشتەکە بگەڕێتەوە ، ئەوسا ئەگەڕا بە دوای شوێن پەنجەی ئازیزدا و لەو شوێنەدا نانی ئەخوارد .. جارێکیان خواردنی دروست کرد و سیری پێوە کرا بوو ، بەڵام بۆنی سیرەکە نەڕۆیشتبوو ، ئەویش دەربارەی شوێنی پەنجەی پێغەمبەر پرسیاری کرد و، پێ‌یان وت : لێی نەخواردووە .. ترس و لەرز دای‌گرتەوە و رای کرد بۆ خزمەتی و پرسیی : ئایا سیر حەرامە ، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی : (( لا ، ولكنني أكرهه ، فإني أناجي من لا تناجي )) ( رواه الشيخان ) . فەرمووی : نەخێر ، حەرام نیە ، بەڵام من خۆشم لێی نایەت ، چونکە من وت و وێژ لەگەڵ کەسانێك ئەکەم کە تۆ وت و وێژیان لەگەڵ ناکەیت . مەبەستی لە مەلائیکەتە کە ئەوانیش بەو شتانەی کە ئازاری ئادەمیی ئەدەن ئازاریان پێ ئەگات ..

جارێکی تریش گۆزەیەکی پڕ لە ئاوی ماڵی ئەبوئەییووب شکا و ئاوەکەی رژایە ناو ژوورەکەیانەوە کە بەسەر ژوورەکەی پێغەمبەری خواوە بوو .

ئەبوئەییووب و هاوسەرەکەی ترسان ئاوەکە بڕژێتە خوارەوە ، بۆیە هەڵمەتیان دایە پارچە قەدیفەیەك ، کە هەر ئەوەیان هەبوو تا بیکەنە لێفە و بیدەن بە خۆیان دا و ، ئاوەکەیان پێ هەڵ مژیی ، نەوەکو بڕژێتە خوارەوە و پێغەمبەری خوا و میوانەکانی ئازاریان پێ بگات .

ئەبوئەییووب و هاوسەرەکەی زۆر ڕێزیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگرت ، هەتا ئەوەبوو کە تەشریفی نەبردە سەرەوە ، نەئەچوونە ئەو شوێنەوە کە پێغەمبەری لە ژێردا بوو ، بەڵکو لەو ژوورەی سەرەوە ئارامیان نەبوو ، تا ئەوەبوو ئەوەندە پاڕایەوە کە تەشریف بەرنە سەرەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ داواکەی قبووڵ کرد ..

نەك هەر ئەبوئەییووب ، بەڵکو هەموو ئەنصار بە شێوەیەکی بێوێنە ڕێزیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگرت و ، لە ڕادەبەدەر خزمەتیان ئەکرد .. هەتا ئەوەبوو هەموو ئێوارەیەك ئەوەندە قاپ و قابلەمە خواردن ئەهات بۆ ماڵی ئەبوئەییووب ، بە مەرجێ ئەبوئەییووب خۆیشی زۆر دەوڵەمەند و خێرۆمەند بوو ، ئامادەبووان نەیان‌ئەزانی چیی بخۆن .. لە هەمان کات‌دا لە ڕێز و بەخێرهاتنی برا کۆچ کەرەکانیان هیچ درێغی‌یەکیان نەکرد ، هەتا ئامادە بوون ماڵ و سامان و خانوو بەرەیان لەگەڵیان‌دا بەش بکەن .. بگرە لەوە زیاتریش هەنگاویان نا .. هی وایان هەبوو ئامادە بوو ژنێکی خۆی تەلاق بدا تا برا کۆچ‌کەرەکەی بە شێوەیەکی شەرعیی مارەی بکات .. بە ڕاستیی ئەو بەخێرهاتن و پێشوازیی‌کردنە شتێکی ناوازەی مێژوو بوو .. مرۆڤایەتیی کۆمەڵێکی وەها بەخشندە و لێبووردە و سنگ فراوانی بۆ بانگەوازی خوای بە خۆوە نەدیی بوو ..

ئەم خانووەی ئەبوئەییووب ، کە ئەم ڕێزو شەرەفەی دەست کەوت ، دوای کۆچی دوایی خۆی کەوتە دەست ( ئەفلەح ) ی خزمەت‌گوزاری و ، موغیرەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاریثی کوڕی هیشام لێی کڕیی بە هەزار دینار ، واتە هەزار مسقاڵ ئاڵتوون و ، دەستێکی پیا هێنا و ڕێك و پێکی کردەوە و ، پاشان بە خانەوادەیەکی هەژاری دەست‌کورتی بەخشیی .. ئەو خانووە ئێستاش هەر ماوە و لە نزیك مزگەوتی پێغەمبەری خوادایە ﷺ و میوانان بۆ بیرەوەریی مێژووی پڕ سەروەریی موسڵمانان و خزمەت‌کردنیان سەری لێ ئەدەن ..

ڕۆژان ڕابووردن و ، چەرخ و زەمانە گۆڕا و ، دەوڵەتی ئیسلامیی نەونەمامی مەدینە گەشەی کرد و ، ئیسلام بە هەموو لایەك‌دا بڵاوەی کرد و دەوڵەتێکی

ئیسلامیی گەورە و بەهێز بەرپا بوو و ، ئەبوئەییووبی ئەنصارییش ڕێی لە شاری بەصرە کەوت .. ئەو کاتەش والیی بەصرە هاوەڵی پایەدار و ناودار و سەردار عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بوو خوا لێیان ڕازیی بێ ، ئەمەش لە سەردەمی ئەمیری ئیمان‌داران ئیمام عەلیی‌دا خوا لێی ڕازیی بێ ..

کە ئیبن عەبباس هەواڵی هاتنی هاوەڵی بەڕێز ئەبوئەییووبی بیست ، ئەو سەخاوەت و لێبووردنەوەی سەردەمی کۆچ‌کردنی ئازیزی ﷺ هاتەوە یاد ، بۆیە پێی خۆش بوو ئەمیش ئەمڕۆ چاکەیەك لەگەڵ ئەودا بکات و پاداشتی ئەو چاکەیەی بداتەوە .. ئەوەبوو ماڵەکەی خۆی لە کەس وکاری چۆڵ کرد و ، چیی تفاق و کەل و پەلی بوو تیایا بەجێ هێشت و ، داوای لە ئەبوئەییووب کرد کە بێتە ماڵەکەیەوە ، وەك چۆن ئەو ماڵەکەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ چۆڵ کرد .. ئیتر ئەو خانوو و کەل و پەلە لەژێر دەستی ئەبوئەییووب‌دا بوو هەتا کاتێ ویستی بەصرە بەجێ بهێڵێ ، ئەو کاتەش ئیبن عەبباس بەخشش‌ێکی چاکی پێ بەخشیی و، زۆر بە جوانیی خواحافیزیی لێ کرد ..

خۆ دیارە ئەو ڕۆژە ئەبوئەییووب ئەو میوان‌داریی و سەخاوەتەی بۆ ئەوە نەکرد کە ڕۆژێ لە ڕۆژان پاداشتی بدرێتەوە ، بەڵکو ئەو ڕەزامەندیی خوای پەروەردگاری ئەویست . لە هەمان کات‌دا پاداشت‌دانەوەکەی ئیبن عەبباسیش لە جێی خۆی‌دا بوو و ، ئەوەی سەلماند کە موسڵمانان تاسەمەندی هەموو ڕەوشتێکی بەرزن و ، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان تەمەنیان بە خزمەت‌کردن بەسەر بەرن . ئەوەتا ئازیزمان ، ڕۆشنایی چاوەکانمان مامۆستای ڕەوشت و چاکەخوازیی ﷺ ئامۆژگارییمان ئەکات و ئەفەرموێ : (( مَن أسدى إِلَيكُم مَعرُوفاً فَكافِئوهُ عليه ، فإن لم تَقدِروا فادعوا له بخَيرٍ )) . رواه أبوداود والنسائي بإسناد صحيح . ئەفەرموێ : هەرکەس چاکەیەکی لەگەڵتانا کرد ، پاداشتی لەسەر بدەنەوە ، ئەگەر نەتان توانیی چاکەی لەگەڵا بکەنەوە ، دۆعای خێری بۆ بکەن .

بەڵێ ، ئازیزان ! قوتابخانەی ئیسلام ، کە هەر هەمووی خووڕەوشتی بەرزە ، قوتابخانەی خزمەتی مرۆڤە .. هەموو مرۆڤەکان .. بەبێ جیاوازیی .. بە موسڵمان و ناموسڵمانەوە ..

کاتێك کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە ماڵی ئەبوئەییووبی ئەنصاریی‌دا میوان بوو خەڵکێکی زۆر ئەبوونە میوانی و سەریان لێ ئەدا ، تا لە نزیکەوە بە خزمەتی

بگەن و ، بزانن ئەوەی دەربارەی ئەوی بەڕێز بیستوویانە راستە یان نا . جا بەم بۆنەوە خەڵك دەستە دەستە ئەهاتن و ، کە راستیی و پاکیی ئیسلامیان بۆ دەر ئەکەوت موسڵمان ئەبوون .

جا هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی تری بۆ سەر ئیسلام بانگ ئەکرد ، جوولەکەشی بانگ کردن و زیاتر لە خەڵکییش قورئانی دا بە گوێیان‌دا ، بە بۆنەی ئەوەوە کە ئەمان ئەهلی کیتابن و ، لە کتێبەکانیان‌دا راستیی پەیامی ئیسلامیان بۆ دەرکەوتووە .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی دەرخست کە کاری پێغەمبەران یەکێکە و ، بناغەی بیروباوەڕیان وەك یەکە و ، ئەم دینەی ئەمیش بۆ ئەوە هاتووە کە یەکەم : هەرچیی لادان و لاریی‌یەك ، بە هۆی ئارەزووپەرستانەوە ، تێکەڵ بە شەریعەتە پێشووەکان کراوە ، لا بەرێت و ، دینی خوا بچێتەوە سەر نەخشە پاك و خاوێنەکەی خۆی و ، دووهەم : تا هەر حوکم و بڕیارێکی کاتیی لەو شەریعەتانەدا هاتووە تەعدیلی بکات بەو شێوەی کە بۆ هەمیشەیی دەست بدات و ، سێهەمیش : شەریعەت لە تەواوترین شێوەی‌دا پێشکەش بە مرۆڤ بکرێ ، بۆ ئەوەی تا ئاخرزەمان دەستکاریی نەوێ . ئەوەبوو فەرمووی :

(( مَثلي وَمَثَلُ الأنبياء من قَبلي كَمَثَل رَجُلٍ بنى بُنياناً فَأَحسَنَهُ وَأَجمَلَه ، إلاَّ موضعَ لبنَة من زاويةٍ مِن زَواياهُ ، فَجَعَلَ الناسُ يَطوفونَ به ويعجبون له ويقولون : هلاّ وضعت هذه اللبنَة . قال صلوات الله عليه : فأنا اللبنة وأنا خاتم النبيين )) . رواه مسلم عن أبي هريرة .

ئەفەرموێ : نموونەی کاری من و کاری پێغەمبەرانی پێشم ، وەك کاری پیاوێك وەهایە کە کۆشکێکی زۆر نایابی دروست کردبێ و ، بە جوانیی رازاندبێتیەوە ، تەنها لە گۆشەیەکی‌دا شوێنی خشتێکی مابێ و دانەنرابێ . خەڵکییش بە کۆشکەکەدا ئەگەڕان و پێی سەرسام ئەبوون و ، کە شوێنی خشتەکەیان ئەدیی ، ئەیان وت : خۆزگە ئەم خشتەش دابنرایە ، فەرمووی : جا من ئەو خشتەم .. من دوا پێغەمبەرم .

بەڵام جوولەکە ملیان بادا و ، بە فیز و تەکەبورەوە بڕیاری دژایەتی‌یان دا .. جا لەبەر ئەوەش کە بێغیرەت و ترسنۆك بوون ، کەوتنە غەدر و ناپاکیی و پیلان گێڕان . هەر کەسیش موسڵمان ببوایە ، ئەوپەڕی دژایەتی‌یان ئەکرد .

بۆ نموونه : یەکێ لە زانا خواناسە خاوەن تەقواکانیان ، کە بە چاکیی شارەزای تەورات بوو ، خوا نووری خستە دڵیەوە و ، دڵی چووە سەر ئیسلام .. ئەوەبوو ئەویش وەك زانا جوولەکەکانی تر هاتە خزمەتی ئازیز تا هەڵگری دینی تازە ببینێ و بزانێ چۆن پیاوێکە . ئەم زانایە ناوی حوصەین ی کوڕی سەلام بوو و ، کە ئیمانی هێنا پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا عەبدوڵلاٰ ..

عەبدوڵلاٰ خۆی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : کاتێك دەنگ و باسی پێغەمبەری خوام ﷺ زانیی ، لە سیفەت و ناو و ئەو سەردەمەی کە چاوەڕوان بووین تیایا بێت ئاگادار بووم ، ئەمشاردنەوە و دەنگم نەئەکرد ، تا ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە مەدینە و ، لە قوباء لە ناو نەوەی عەمری کوڕی عەوفدا لای دا و ، پیاوێك هات و هەواڵی گەیشتنی ئەوی هێنا ، منیش بەسەر پۆپەی دارخورمایەکمەوە بووم و کارم ئەکرد و ، خالیدەی کچی حاریثی خوشکی باوکیشم لە ژێر دارخورماکەدا دانیشتبوو . کە هەواڵی گەیشتنی پێغەمبەری خوام ﷺ بیست ، ( اللّٰه أکبر) م وت . کاتێك کە پوورم ( اللّٰه أکبر )ەکەی منی بیست ، پێمی وت : خوا خەجاڵەتت کا ، بەخوا ئەگەر بتبیستایە مووسای کوڕی عیمرانیش هاتووە لەوە زیاتر هیچت نەئەکرد ! ئەڵێ : منیش پێم وت : پوورەگیان ! بەخوا ئەویش برای مووسای کوڕی عیمرانە و ، لە سەر دینی ئەوە و ، ئەوەی کە ئەوی پێ ڕەوانە کرابوو ئەمیشی پێ ڕەوانە کراوە . وتی : ئێی کوڕی برام ! ئایا ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە هەواڵمان پێ درا لەم کاتانەدا ڕەوانە ئەکرێ ؟ پێم وت : بەڵێ . وتی : کەواتە ئەوەیە .

ئەڵێ : پاشان چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بووم . دوای ئەوە گەڕامەوە ناو کەس وکارم و فەرمانم پێ دان موسڵمان بن . ئەوانیش هەموویان موسڵمان بوون .

ئەڵێ : موسڵمان بوونەکەمم لای جوولەکە ئاشکرا نەکرد .. پاشان گەڕامەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و عەرزم کرد : ئەی پێغەمبەری خوا ! جوولەکە قەومێکی بوختان کەرن ، واتە درۆزنن و ، کەسێك ناتەواوی‌یەکی پێوە نەبێ ، بۆی هەڵ ئەبەستن . جا من پێم خۆشە بچمە یەکێ لەم ژوورانەتەوە و ، لەوان بم شاریتەوە و ، بەر لەوەی بە موسڵمانبوونم بزانن ، دەربارەی من پرسیاریان لێ

بکەیت تا هەواڵت بدەنێ کە من لە ناویاندا چۆن پیاوێکم ، چونکە ئەگەر بزانن موسڵمان بووم بوختانم بۆ ئەکەن و عەیبداریشم ئەکەن .

ئەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ کردمیە ژوورێکەوە و ، جوولەکەش هاتن بۆ لای و دەستیان کرد بە وت و وێژ و پرسیارکردن . پاشان پێیانی فەرموو : (( أيّ رجل الحصين بن سلام فيكم ؟ )) فەرمووی : حوصەینی کوڕی سەلام چۆن پیاوێکە لە ناوتاندا ؟ وتیان : سەرداری کوڕی سەردار و شارەزا و زانامانە .

ئەڵێ : کە لە قسەکانیان بوونەوە هاتمە دەرەوە ناویان و پێم وتن : ئەی کۆمەڵی جوولەکە ! لە خوا بترسن و ، ئەوەی کە بۆی هێناون لێی وەربگرن . دە بەخوا ئێوە ئەزانن ئەو پێغەمبەری خوایە و ، بە چاوی خۆتان ناو و سیفەتی ئەبینن کە لە تەوراتدا نووسراوە . من شاهێدیی ئەدەم کە ئەو پێغەمبەری خوایە و ، ئیمانی پێ ئەهێنم و ، تەصدیقی ئەکەم و ، ئەشیناسم . وتیان : درۆت کرد . ئیتر دەستیان بە قسە پێوتنم کرد و ، وتیان : خراپی کوڕی خراپمانی . منیش بە پێغەمبەری خوام ﷺ وت : ئەی پێغەمبەری خوا ! هەواڵم نەدایتێ کە ئەمانە کۆمەڵێکی بوختانکەر و غەدرکەر و درۆزن و ڕەوشت پیسن ؟!

ئەڵێ : موسڵمانبوونی خۆم و ماڵ و منداڵم ئاشکرا کرد و خالیدەی کچی حاریثی پووریشم بە چاکیی موسڵمان بوو .

کاتێك کە موسڵمان بوو حویەیی کوڕی ئەخطەب و کەعبی کوڕی ئەسەد و ئەبونافیع و ئەشیەع و ، شەمۆییلی کوڕی زەید پێیان وت : پێغەمبەرایەتیی لە عەرەبدا هەڵ ناکەوێ ، کابرای لای تۆ پادشایە . ئەیانویست بەمە لە دینەکەی پەشیمانی بکەنەوە ..

## بەشی حەڤدەهەم
# دروست کردنی مزگەوتی مەدینە

لەو ماوەیەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی ئەبوئەییووبی ئەنصاریی‌دا مایەوە ، مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە بنیات نرا . ئەوەبوو لەو شوێنەدا بنیاتیان نا کە وشترەکەی چۆکی دادا ، کە لە بنەڕەت‌دا باخ بوو و ، هەندێکی وێران بوو بوو و کرابوویە قەبرستان و ، هەندێکیشی کرابووە خەرمانی وشك کردنی خورما و ، هی دوو برای هەتیو بوو ، بە ناوی سەهل و سوهەیلی کوڕانی عەمر ، کە ئەسعەدی کوڕی زوراره سەرپەرشتیی ئەکردن . پێغەمبەر ﷺ ویستی موعامەلەیان لەگەڵدا بکات هەتا شوێنەکە بکڕێ بۆ مزگەوت ، کەچیی دوو براکە رازیی نەبوون بی‌فرۆشن و وتیان : ئەی‌بەخشین بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی . بەلاّم ئازیزیش رازیی نەبوو و بڕیاری دا ئەبێ بە کڕین بێ . ئەوەبوو کڕی بە دە دینار و ، ئەبوبەکری صددیقیش پارەکەی دا . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا دارخورماکان ببڕێن و زەوی‌یەکەشی تەخت بکرێ ..

موسڵمانەکانی مەککە لە سزا و ئازار رزگاریان بوو بوو و ، بە هەوای ئازادیی یەکجار شادمان بوون .. ئەنصاریش کە ئیمان و تەقوای مامۆستایانی مەککەیان سەرنج ئەدا ، لە خۆشیانا خەریك بوو باڵیان ئەگرتەوە ، وا خوای میهرەبان ئەم ناز و نیعمەتی ئیمانەی هێناوەتە رێیان . بۆیە هەردوو لا سەرگەرمی کارکردن ئەبوون و ، نەیان‌ئەزانیی ماندووبوون چی‌یە .. کە ئەوان خەریکی کارکردن بوون ، پێغەمبەری ئازیزیش ﷺ خەریکی گواستنەوەی خۆڵ و خشت بوو .. موسڵمانەکانیش سروودی جۆرا و جۆریان ئەوت ، تا شەوق و تاسەیان بۆ کارکردن زیاتر ببێت و، بە زووترین کات مزگەوت تەواو ببێ .. ئەیان وت :

أللهم إنَّ الأجرَ أجرُ الآخـرَة      فَارحَمِ الأنصارَ وَالْمُهاجِرَة

ئیمام عەلییش ئەی‌فەرموو:

لا يستوي مَن يَعمرُ المساجدا      يدأب فيها قائماً وقاعداً

ومن يُرى عن التراب حائداً

هاوەڵان گلەییشیان لە خۆیان ئـەکرد کـە ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـاری بکردایه و ئەوان دانیشتنایه :

لئن قَـــعَدنا والنبـــيُّ يَعـــمَلُ ذاكَ إذاً للعـــمَلُ المضَـــلَّلُ

بەم سروودانە دڵیان ئەگەشایەوە و ماندووبوونی جەستەیان لا ئەچـوو و ، بـەبێ وچان کاریان ئەکرد ..

کە مزگەوت تەواو بوو ، بووە مەڵبەندێکی گرنگ بـۆ موسـڵمانان تـا چـەندین خزمەتیان پێشکەش بکات . ئەوەبوو شوێنی نوێژی کۆمەڵ و جومعەی موسڵمانان بوو .. شوێنی کۆبوونەوە و تـەگبیر و راوێـژیان بـوو .. تیایـا زانسـتی قورئـان و سوننەتیان وەرئەگرت .. هەروەها لە لایەکی مزگەوتدا سەکۆیەك هەبوو کە هـەژارە دەستکورت و بێکەسەکانی تێدا کۆ ئەبوونەوە و ، لەوێ ئـەژیان ..

سەرەتا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دیواری مزگەوتەکە لە خشتی قوڕ دروست کرابـوو و ، کۆڵەکەکانیشـی دارخورمـا و ، سەربانەکەشـی بـە دارخورمـا و لقـە دارخورما سەرگیرا بوو . لەو سەردەمەدا مزگەوتەکان وەهـا بـە سـادەیی دروسـت ئەکران .

لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەکریش‌دا خوا لێی رازیی بێ مزگەوتی مەدینـە وەك خۆی مایەوە . بەڵام لە سەردەمی خەلیفە عومەردا خوا لێی رازیـی بـێ ، لەبـەر ئـەوەی کە وڵاتی ئیسلام فـراوان بـوو بـوو و ، میـوانی زۆر روویـان لـە مەدینـە ئـەکرد، مزگەوتەکە گـەورە کـرا ، بـەڵام دیوارەکـەی و سـەربانەکەی وەك خـۆی هێشتەوە و ، کۆڵەکەکانیشی ، کە لە دارخورما دروست کرا بـوون ، گـۆڕینی بـە تەختە ، بەڵام خەلیفە حەزی لە بەکارهێنانی شتی زرق و برق نەبوو .

کە سەردەمی خەلیفەی بەشەرم و حەیا عوثمانی کوڕی عەففان خوا لێی رازیی بێ هاتە بەرەوە ، زۆری بۆ مزگەوتەکە زیاد کرد .. ئەوەبوو دیوارەکەی بە بـەردی نەخشین و گەچ دروست کرد و ، کۆڵەکەکانیشی گۆڕین بـۆ بـەردی نەخشـین و ، سەربانەکەشی بە تەختەی ساج ـ کە لە وڵاتی هیندەوە ئەهێنرا ـ سەر گرت .

بۆ ئەم کارەی خەلیفە عوثمان نارەزایی‌یان دەربڕیی و ، وەهایـان لـە قەڵـەم دا کە ئەمە ئیسراف و زیـادەڕەویی بـێ . بوخـارییش ریوایـەتی کـردووە کـە کـاتێ خەڵکیی قسەیان بە عوثمان ئەوت لەسەر دروستکردنەوەی مزگـەوتی مەدینـە ، ئەویش ئەی‌فەرموو : پێی زیادەتان راکێشا .. من خۆم گوێم لە پێغەمبـەری خـوا

بووه ﷺ كه ئەیفەرموو : (( مَن بَنى لله مَسجداً بَنى اللهُ لَهُ مثلَهُ في الجنة )) . ئەیفەرموو : هەر كەس مزگەوتێك دروست بكات ، ئەوا خوای گەورە بەو شێوەیە لە بەهەشتدا كۆشكێكی بۆ دروست ئەكات .

خۆ خوای گەورە خۆی ئەیزانیی كه عوثمان مزگەوتەكەی بەو شێوە نوێ كردەوە ، مەبەستی لە زرق و برق نەبوو و ، حەزیشی لە ئیسراف نەبوو . ئەوەندە هەبوو كه بیت المال لە سەردەمی ئەوا پارە و سامانێكی زۆری تێدا بوو ، بە رادەیەك كه لە ژمارە نەئەهات ، لەگەڵ ئەوەشدا پێویست بوو مزگەوت گەورە بكرێ ، چونكە پایتەخت یەكجار قەڵەبالغ بوو . ئەوەشمان لە یاد نەچێ كە رەخنەگران لە گەورە هاوەڵان و ناودارانیان نەبوون ، بەڵكو دەم بەتاڵەكان ئەو شتانەیان بڵاو ئەكردەوە ، كه دیارە عوثمان لە هەموویان خواناس‌تر بوو .

هەروەها لە سەردەمی خەلیفە وەلیدی كوڕی عەبدولمەلیكدا مزگەوتی مەدینە گەورەتر كرا .. ئەوەبوو مزگەوتی گەورەی دیمەشق ، كە ئێستەش ماوە و بە مزگەوتی ئومەویی ناوبانگی دەركردووە ، بە فەرمانی خەلیفە وەلید بنیات نرا و، فەرمانیشی بۆ والیی مەدینە ، عومەری كوڕی عەبدولعەزیز خوا لێی رازیی بێ دەركرد تا مزگەوتی مەدینە گەورە بكات ، هەتا ئەوەبوو ژوورەكانی دایكانی ئیمانداران ، بە تایبەت ژوورەكەی عائیشە خوا لێی رازیی بێ ، كە قەبری شەریفی ئازیزی تێدایە ، خرانە سەر مزگەوت . دواتریش زیاتر مزگەوت فراوان كرا .

شایانی باسە كه قەبری شەریفی پێغەمبەری خوا ﷺ ، یەكەم جار نەبوو لەناو مزگەوتدا ، بەڵكو لە دواییدا ، بە ناچاریی بۆ فراوانكردنی مزگەوت خرایە ناو مزگەوتەوە .. جا لە فەرموودەی صەحیحدا لەعنەت لە جوولەكە و گاور كراوە ، لە سەر ئەوەی كه قەبری پێغەمبەران و پیاوچاكانیان كردووە بە مزگەوت ، واتە روو بەو قەبرانە نوێژیان كردووە . پێغەمبەری خواش ﷺ موسڵمانانی لە كاری وەها قەدەغە كردووە و ، لە خوای گەورەش پاڕاوەتەوە تا خوای گەورە نەهێڵێ قەبرەكەی بكرێتە بت و بپەرسترێ . داواش ئەكا كه غەزەبی خوا بە سەر ئەوانەدا بباریێ كه قەبری پێغەمبەرەكانیان ئەكەنە مزگەوت ، كه ئەی فەرموو : (( أللهم لا تَجعَلْ قَبرِي وَثناً يُعبَدُ ، غَضِبَ اللهُ عَلى قَومٍ اتَّخَذُوا قُبورَ أَنبيائِهم مَساجِدَ )) .

جا موسڵمانە پێشینەكان ـ خوا پاداشتی چاكەیان بداتەوە ـ ئەوەیان لەبەر چاو گرتبوو ، كه نەهێڵن عەوام و نەزانەكان روو بە قەبری شەریف نوێژ بكەن ، ئەمەش

بەوەی کە دیوارێکی ئەوەندە بەرزیان کردبوو تـا قەبرەکـە لـە نوێژکەرانـەوە دیـار نەبێت .

بە درێژایی مێژوو موسڵمانان خزمەتێکی باشی مزگەوتیان ئەکرد .. لە هەموو شار و گوندێکی جیهانی ئیسلامیی‌دا هەزاران مزگەوت دروست کران و رازێنرانەوە و ، مەسرەفی باشیان بـۆ کـرا ، تـا ببنـە مەڵبەنـدی خواپەرسـتیی و زانسـت وەرگرتن .. لە هەمان کات‌دا لـە پـاڵ ئـەم خزمـەتکـردن و خـەرجی کێشـانەی مزگەوت‌دا ، هەندێ زیادەڕەویی لە رازاندنەوەی مزگەوتەکان‌دا ئـەکرا ، ئەمـەش هەر لەبەر پایەداریی و خۆش‌ویستنی مزگەوت ..

یەکەم کەسێك کە دەستی بـە رازاندنـەوەی مزگەوتـەکان کـرد وەلیـدی کـوڕی عەبدولمەلیك بوو .. بـەڵام خۆزگـە موسـڵمانان مزگەوتـەکانیان زۆر بـە سـادەیی دروست بکردایە ، تا لە سنووری سوننەت دەرنەچوونایە و ، ئەو زیادەڕەوی‌یەش لە پێویستیی تری موسڵمانان‌دا خەرج بکرایە .

ئەوەتا پێغەمبەری خواش ﷺ هەواڵی ئەوەی داوە کە لـە دواڕۆژدا موسـڵمانان چۆن مزگەوتەکانیان ئەڕازێننەوە . ئەنەس ئەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویە: (( يأتـي على أُمَّتي زمانٌ يَتَباهَونَ بالمساجد، ثم لا يعمرونـها إلا قليلاً )) .

فەرموویە : سەردەمێك بە سەر ئوممەتەکەم‌دا دێت کە بـە جـوانیی و رازاوەیـی مزگەوتەکانەوە شانازیی ئەکەن و ، خواپەرستی‌یەکی کەمیشیان تێدا ئەکەن .

هەروەها فەرموویە : (( لتزخرِفَنّها ــ أي المســاجد ــ كمــا زخرفــت اليهــود والنصارى )) . فەرموویە : هەر وەك گاور و جوولەکە پەرستگاکانیان ئەڕازاندەوە ، ئێوەش مزگەوتەکان ئەڕازێننەوە .

ئەم دوو فەرموودەیەی سەرەوە ئەبوداوود ریوایەتی کردوون .

ئیتر لەو رۆژەوە خەلیفە و پادشایانی دەوڵەتی ئیسلام خـەریکی نوێکردنـەوە و فراوان‌کردنـی مزگـەوتی پێغەمبـەرن لـە مەدینـەدا تـا بـەم شـێوەیەی ئـەمڕۆی گەیشتووە ، کە سوپاس بۆ خوا هەموو ساڵێك لە هەموو لایەکی گـۆی زەوی‌یـەوە حاجیان سەردانی مەککە و مەدینە ئەکەن و ، هەر ساڵەی چەند ملیۆنێك حـاجیی ئەبن .

دەربارەی گەورەیی و پایەدارییش ، مزگەوتی مەدینە ، یەکێکە لـەو مزگەوتـە خاوەن‌ڕێزانەی کە موسڵمانان بۆیان هەیە لە هەموو کون و قوژبنێکەوە هەوڵ بـدەن

سەردانی بکەن و ، بە دووهەم مزگەوتی پایەدار ئەژمێررێ لە دوای مزگەوتی حەرام و ، بە پێی سەردەمی بنیاتنانیشی بە سێهەم مزگەوت ئەژمێررێ .
هەردوو ئیمام بوخاریی و موسلیم لە هەردوو صەحیحەکەیاندا ریوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( لا تُشَدُّ الرِّحالُ إلاَّ إلى ثَلاثَةِ مَساجدَ : مسجدي هذا ، والمسجد الحرام ، ومسجد بيت المقدس )) . ئەفەرموێ : بۆ سێ مزگەوت سەردان دروستە : مزگەوتی مەدینە و ، مزگەوتی حەرام و ، مزگەوتی بەیتولمەقدیس .
هەروەها هەردووکیان ریوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( صلاةٌ في مسجدي هذا خيرٌ مِن ألف صلاة فيما سواهُ إلاَّ المسجد الحرام )) . لای ئیمام ئەحمەدیش ئەمەی بۆ زیاد کراوە : (( فإن ذلك أفضل )) . ئەفەرموێ : یەك نوێژی ئەم مزگەوتەی من لە هەزار نوێژی مزگەوتەکانی تر چاکترە ، جگە لە مزگەوتی حەرام ، کە ئەو پایەدارترە لە مزگەوتی مەدینە .
لەوەش زیاتر مزگەوتی مەدینە رەوضەی شەریفی تێدایە ، کە بریتییە لە باخچۆڵەیەك لە باخچۆڵەکانی بەهەشت . لە هەردوو صەحیحدا ریوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( ما بَينَ بَيتي ومنبَري رَوضَةٌ مِن رِياضِ الجنة ، ومنبري على حَوضِي )) . ئەفەرموێ : نێوانماڵەکەم و مینبەرەکەم باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت و ، مینبەرەکەشم وا بەسەر حەوزەکەمەوە .
بەڵێ ئەم مزگەوتە مافی خۆیەتی ئەوەندە پیرۆز بێ و ، باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشت بێت ، وا خواپەرستیی تیایا بەو پلەیە موسڵمان لە خوا نزیك ئەکاتەوە و ، بەرەو بەهەشتی ئەبات و لە ئاگری دۆزەخی دوور ئەخاتەوە ، چونکە پاداشتی کردەوە چاکەکان تیایا چەند جارە ئەبێتەوە و ، دوعا و پاڕانەوەش تیایا هیوای گیرابوونی زۆرە و ، لە هەمووی خۆشتر ئەو شوێنە گەورەترین و پیرۆزترین لاشەی بەرەی مرۆڤی لە خۆ گرتووە ، کە لاشەی پیرۆزی پێغەمبەری خوایە ﷺ سەرەڕای ئەوەش کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماوەی ژیانیدا ، تەمەنێکی زۆری لەوێ بە نوێژ و پاڕانەوە و قورئانخوێندن و ئامۆژگاریی ئیمانداران بە سەر بردووە . ئیتر با تەگبیر و راوێژی بەرژەوەندیی موسڵمانان و نەخشە و پلانی جەنگ بۆ سوپای رزگاریی‌خوازی ئیسلام لەولاوە بووەستێ .. هەرکەسێ خوا پێداو بێ و سەردانی ئەو شوێنە پیرۆزە بکات هەست بە رۆح سووکیی و ، دەروون حەساوەیی

و ، دڵ گەشاوەیی و ، سنگ کرانەوە ئەکات و ، هەرچیی دەرد و مەینەت و خەم و خەفەت و ئێش و ئازاری دنیا هەیە هەر هەمووی لە بیر ئەچێتەوە و ، نوقمی ناو نووری ئیمان ئەبێت و ، رۆحیشی لە شەقەی باڵ ئەدات و ، بۆ شوێنە بەرز و پیرۆزەکان بەرز ئەبێتەوە ..

دەربارەی پایەداریی مزگەوتی مەدینە ، ئیمام مالیك و هاوەڵانی بۆ ئەوە ئەچن کە مزگەوتی مەدینە پایەدارتر بێ لە مزگەوتی کەعبە ، بە بۆنەی ئەوەوە کە کەعبە ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی لێ بێ بنیاتی ناوە ، بەڵام مزگەوتی مەدینە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ بنیاتی ناوە ..

بەڵام رای بەهێز ئەوەیە کە جومهووری زانایان هەڵیان بژاردووە کە بریتییە لە پایەداریی مزگەوتی حەرام ، چونکە وا لە خاکێکدا ، ئەو خاکە لەو کاتەوە کە خوای گەورە ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە ئەویشی بە ناوچەیەکی حەرام داناوە ، هەروەها ئیبراهیمیش و پێغەمبەری خۆشمان بە حەرامیان داناوە و ، ئەو نوێژەش کە لەوێ بەجێ ئەهێنرێ لە نوێژی مزگەوتی مەدینە خێری زیاترە و ، حەجی ئەوێش فەرزە و ، هەر کەسیش بچێتە کەعبەوە پەنا ئەدرێت . قورئانی پیرۆزیش دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی کەعبە فەرموویە :

﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ۝ فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴾ ( آل عمران : ٩٦ ـ ٩٧ ) .

ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە روونی ئەکەنەوە کە یەکەمماڵێك لە سەرزەوییدا بڕیار درابێ شوێنی خواپەرستیی بێ ، ئەو ماڵە پیرۆزەی مەککەیە کە مایەی هیدایەتە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی . ( بەککە ) هەر مەککەی ( بلد الحرام ) ە و ، لەبەر ئەوەش ئەو ناوەی لێ نراوە چونکە ملی ئەو ستەمکارە ملهوڕانە ئەشکێنێ کە ستەم و بێدینیی تێدا ئەکەن . هەروەها ئەم مزگەوتە چەندین نیشانەی روونی تێدایە ، هەر کەسیش خۆی گەیاندە ئەوێ نابێ کەس دەستی بۆ بەرێ و ، هەر کەسیش توانای ئەنجامدانی حەجی ماڵی خوای هەبوو ، پێویستە حەج بکات .

هەر بە دەوری مزگەوتیشدا چەند ژوورێك بۆ خاوخێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بنیات نران ، کە ئەوانیش بە وێنەی مزگەوتەکەی سادە بوون و ، لە خشت و قوڕ و

هەندێ بەرد بنیات نرابوون و ، سەربانەکەشیان بە قەد و لقی دارخورما سەر گیرابوو و ، ئەوەندەش نزم بوون دەستی منداڵی باڵا بەرزیان ئەگەیشتێ . حەسەنی بەصریی منداڵ ئەبێت و لەگەڵ خەیرەی دایکیا ئەبێت ، کە کەنیزەکی ئوم سەلەمە بووە ، ئەڵێت : دەستم ئەگەیشتە بن میچی بەرزترین ژوور لە ژوورەکانی پێغەمبەر ﷺ .

دوای گەیشتنی پێغەمبەر و ئەبوبەکر ، عەبدوڵڵای کوڕی ئورەیقیطی دەلیلیان گەڕایەوە مەککە و ، هەردوو خزمەتگوزاری پێغەمبەریش ﷺ، زەیدی کوڕی حاریثە و ئەبورافیع یان ناردن بۆ مەککە هەتا کەس وکاریان بهێنن . ئەوەبوو هەردوو کچەکەی پێغەمبەر : ئوم کولثووم و و فاطیمە و ، خاتو سەودەی کچی زەمعەی هاوسەری پێغەمبەر و ، ئوم ئەیمەنی هاوسەری زەید و ، ئوسامەی کوڕیان هێنان .

زەینەبی کچی پێغەمبەریش لە ماڵی ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیعی مێردیا بوو و تا دوای جەنگی بەدر لە مەککە مایەوە .

روقیەش لەگەڵ عوثمانی کوڕی عەففانی مێردیدا بوو .

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر عائیشەی خوشکی و ئوم ڕوومانی دایکی و ، ئەسمائی کچی ئەبوبەکر کە هاوسەری زوبەیری کوڕی عەووام بوو و ، بە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە سکی پڕ بوو ، هێنانی بۆ مەدینە . ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها سەودە هاوسەری بوو ، کە دوای خەدیجە مارەی کردبوو و ، عائیشەش دەستگیرانی بوو و ، دوای کۆچکردن بە حەوت مانگ ئەوسا گواستیەوە .. جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ژنێکی بۆ خۆی مارە ئەکرد ژوورێکی سادەی لەلای ژوورەکانی تردا بۆ دروست ئەکرد و ، هەر ژوورێکیش دوو دەرگای هەبوون : دەرگایەك بۆ دەرەوە و، دەرگایەکیش بۆ ناو مزگەوت ، تا هات و چۆی پێغەمبەر ﷺ بۆ مزگەوت ئاسان بێت .. تا ئەوەبوو لە سەردەمی ئومەوییەکاندا هەموو ئەو ژوورانە خرانە سەر مزگەوت ..[٢٨٦]

[٢٨٦] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٠ ـ ٣٦ والرحيق المختوم : ١٨٧ ـ ١٨٨ .

## بەشی هەژدەهەم
# کۆمـەڵگـای مـەدینـە

مەبەست لە کۆچ‌کردن بۆ مەدینە هەر ئەوەندە نەبوو موسـڵمانەکان لـە سـزا و ئازاری قوڕەیش رزگـار بکـرێن و بـەس ، بـەڵکو لەگـەڵ ئـەوەش‌دا مەبەسـتێکی گەورەتر و فراوان‌تری هەبوو ، کە ئەویش بریتیی بوو لە بەرپاکردنی کۆمەڵگایەکی نوێ ، لە وڵاتێکی هێمن و پڕ لە ئاسایش‌دا ، کـە ئـەویش مەبەسـتی بەرنامـەی ئیسلامە . بۆیە هەموو ئیمان‌دارێ ئـەبوا بـە پێـی توانـا و لێ‌هـاتنی خـۆی لـە بەرپاکردنی ئەو کۆمەڵگایە و ، دامەزراندنی حکوومەتەکەی‌دا بەشداریی بکـا و ، هەوڵی ئەوەش بدا کە بەهێزی بکا و ، لە هەموو نەهامەتی‌یەکیش لای بدات .

دیارە یەکەم کەسێك کە لەم کارە بەرپرس بێ و ، ئەرکی سـەرەکیی کەوتبێتـە سـەرشانی ، یەکەم سەرکردە و پێشەوای موسڵمانانە ، کـە پێغەمبـەری خوایـە ﷺ . پێویست بوو زۆر بە حەکیمانە لەناو ئەم کۆمەڵگایەدا کار بکات .. چـونکە دەوڵەتە نەونەمامەکەی ئیسلام یەکجار ساوا بوو و ، دوژمنانیشی زۆر و زەبەنـدە و مل‌هوڕ بوون .. ژمارەی موسڵمانەکان لە چاو دانیشتوانی دوورگەدا یەکجار کەم بوو ، کە هەندێکیشیان بە بۆنەی کـۆچ‌کردنـەوە یـەکجار هـەژار و دەسـت‌کـورت کەوتبوون .

ئەو کۆمەڵگایە لە چەند توێژێك پێك هاتبوو و ، پێویست بوو لەگەڵ هەر یەکە لەو توێژانە هەڵس‌وکەوتی تایبەتیی و حەکیمانە بکات .. چونکە هەر توێژێك حاڵ و بارودۆخی تایبەتیی خۆی هەبوو ..

بەڵێ ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ مـەدینە ، دانیشتوانی مەدینە لە چوار توێژی سەرەکیی پێك هاتبوون : ١ ـ کـۆچ کـەرەکـان . ٢ ـ ئـەنصـار . ٣ ـ مونافیقەکان . ٤ ـ جوولەکە .

### ( ١ ) کۆچ کەرەکان

ئەو ئیمان‌دارانە بوون کە لەبەر پاراستنی دینەکەیان لە مەککـەوە کۆچـیان بـۆ مەدینە کرد و ، جگە لە ئیمان نەیان‌توانیی هیچ شتێك لەگەڵ خۆیـان دەربکـەن .

جا هی وایان هەبوو کە ژن و منالّیشی لەگەلّ خۆیدا دەرکردبوون و ، هی واشیان هەبوو کە بەجێی هێشتبوون . کۆچکەرەکان لە سەرەتاوە تووشی زەحمەت و نارەحەتیی و غەریبیی و بێتاقەتیی و نەخۆشیی بوون .. چونکە ئەوان لەگەلّ مەککە و دەوروبەریدا راهاتبوون و ، بارودۆخی مەدینە جیاواز بوو .. سەرەرای دەستکورتیی و بیرکردنەوە لە نیشتمان و لە شوێنی تەمەن بەسەربردن . بەلاّم بە هیممەت و غیرەت و جوامێریی برا ئەنصارەکان لەگەلّ بارودۆخەکە راهاتن و ، مەدینە بووە نیشتمانیان و ، خوای گەورەش شوێنی ئەو مالّ و سامانەی بۆ پڕ کردنەوە ..

پێش فەتحی مەککە ، کە لە سالّی هەشتەمی کۆچییدا بوو ، کۆچکردن بۆ مەدینە و بەجێهێشتنی مەککە لە سەر موسلّمانان واجب و فەرز بوو ، ئەمەش تا ببنە کۆمەکی پێغەمبەری خوا ﷺ و دلّخۆشی بکەن و ، بە کۆبوونەوەشیان لە شوێنێکدا هێزێکی ئەوتۆ دروست بکەن تا دوژمنان نەتوانن دەستیان بۆ بەرن . بۆیە قورئانی پیرۆز لۆمە و هەڕەشە لەوانە ئەکات کە توانای کۆچکردنیان هەیە و کۆچ ناکەن . بگرە قورئان تەنها چاوپۆشیی لەوانە کرد کە لاواز و بێدەسەلاّت بوون و توانای کۆچکردنیان نەبوو ، ئەویش بە شێوەیەك کە بەلّکو خوا چاوپۆشییان لێ بکات :

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ﴾ ( النساء : ٩٧ـ ٩٩) .

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا دەرئەکەوێ کە ئەوانەی کۆچیان نەکردووە ستەمیان لە خۆیان کردووە و هەڕەشەی دۆزەخیشیان لێ ئەکرێ .

بەلاّم دوای فەتحی مەککە ئیتر کۆچکردن واجب نەبوو ، ئەوەتا بوخاریی و موسلیم لە سەر صەحیحیی ئەم فەرموودەیە یەك ئەگرن کە ئەفەرموێ : (( لا هجرة بعد الفتح ولكن جهاد ونية )) . ئەفەرموێ : ئیتر دوای فەتحی مەککە کۆچ کردن نەما ، ئیتر نۆبەی جیهاد و نیەتی چاکە .. لەگەلّ ئەوەشدا خوا و

پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیاریان وەهایە کە مەدینە نیشتمانی ئەو کۆچکەرانەی مەککە بێت ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ نیشتەجێبوونی مەککەی ، دوای فەتحی مەککە ، لەسەر ئەوانە حەرام کرد کە پێش فەتحی مەککە کۆچیان کردبوو .. بەڵام مۆڵەتی ئەوەی دا کە هەر کەسێ لەوانە بە نیازی حەج و عومرەوە بچێتە مەککەوە ، سێ ڕۆژ تیایا بمێنێتەوە ، بەڵام زیاتر نا . ئەوەتا لەم فەرموودەیەدا ، کە بوخاریی و موسلیم لە سەر صەحیحیی یەکیان گرتووە و ، لەفزەکەش هی موسلیمە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( يقيم المهاجر بمكة بعد قضاء نسكه ثلاثاً )) . فەرموویە : ئەو کەسەی کە لە مەککەوە کۆچی کردووە ، بۆی هەیە دوای حەج و عومرە سێ ڕۆژ لە مەککەدا بمێنێتەوە . هەر لەبەر ئەوەش بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەزەیی بە سەعدی کوڕی خەولەدا ئەهاتەوە کە لە مەککەدا کۆچی دوایی کردبوو ..

حیکمەتی حەرامکردنی مانەوە لە مەککەدا بۆ ئەو کەسەی کە لە مەککەوە بۆ مەدینە کۆچی کردبوو ، لە ترسی ئەوەبوو نەوەکا ئەوە گەڕانەوە و وازهێنان لە کۆچکردن بێت ، چونکە ئەو بەڕێزانە لە ڕۆژی سەخت و ناهەمواردا و ، لە بارودۆخێکی زۆر ترسناك و نادیاردا ، خۆیان بەخوا فرۆشت و ، ماڵ و سامان و کەس وکار و نیشتمانیان بۆ ڕەزامەندیی خوا و ، سەرخستن و کۆمەکییکردنی پێغەمبەر ﷺ بەجێ هێشت . جا خوای گەورە ویستی ئەو وازهێنانە و ، ئەو دەستهەڵگرتنەیان هەر بەردەوام بێت ، تا هێزی ئیخلاص و ، گەورەیی و پاکیی دەروون و ، بەرزیی و بڵندیی ڕەوشتیان بە جوانیی بسەلمێ و ، ببنە نموونەیەکی بەرز و پیرۆزیش بۆ بەرەکانی دواوە ، تا چاویان لێ بکەن و بزانن کە هەر کەسێ لە بەرخوا وازی لە شتێك هێنا ، با لەو بڕیارە پاشگەز نەبێتەوە ..

لە هەمان کاتدا مەدینەی خانەی هیجرەت و پایتەختی یەکەمی دەوڵەتی قورئان ، بوو بووە دڵی هۆشیاری ئیسلام و ، مەڵبەندی پەخشکردنی بانگەوازی ئیسلام ، چونکە پێغەمبەری ئازیز ﷺ دوای کۆچکردن تیایا مایەوە و کردیە بنکەی یەکەمی ئیسلام و ، خەلیفە ڕاشیدەکانیش چاویان لێ کرد و ئەوێیان بە پایتەخت هێشتەوە . کەواتە پێویست بوو ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانە پێشینە و ، قوڕەیشییە کۆچکەرەکانی مەککەی تێدا بمێنێتەوە ، چونکە هەر هەموو عەرەب گوێڕایەڵی فەرمانیان ئەبوون و ، ئەوانیان بە سەرچاوەی زانستەکانی

قورئان و فەرموودە ئەزانیی ، دوای پێغەمبەری خوا ﷺ . بۆ ئەمە گەڕانەوە بۆ مەککە ، دوای فەتحی مەککە ، لەو کۆچکەرە پێشینانە حەرام کرا ، تا مەدینە بەجێ نەهێڵن و شان بە شانی ئەنصار خزمەتی میوانەکانی پایتەخت بکەن .. خۆ ئەگەر حەرام نەکرایە ئەوا بە هۆی تاسەی نیشتمانەوە زۆرێك لەو کۆچکەرانە ئەگەڕانەوە مەککە .

ئەوەبوو لە کاتی حەجیماڵئاواییدا سەعدی کوڕی ئەبووەققاص خوا لێی رازیی بێ نەخۆش کەوت و ، سەعد ئەترسا بەو نەخۆشیەی لە مەککەدا بمرێ و پاداشتی کۆچکردنەکەی لە کیس بچێ ، کەچیی پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی دایەوە و ئاماژەشی بۆ ئەوە کرد کە تەمەنی درێژ ئەبێت و ، لە خوای گەورەش پاڕایەوە هاوەڵانی لە خێر و بەرەکەتی کۆچکردنەکەیان بەهرەمەند بکات و ، لەو کارە پیرۆزە بێبەش نەبن کە فەرمووی : (( أَللهم أمضِ لأصحابي هجرتهم ولا تردهم على أعقابهم )) . رواه البخاري .

بەڵێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی بۆ ئەوە هەڵ ئەنا کە لە مەدینەدا دان بە خۆیاندا بگرن ، چونکە خێر و بەرەکەت وا لە ژیانی مەدینەدا ..

موسلیم لە صەحیحەکەیدا دوو فەرموودە لە سەعدی کوڕی ئەبووەققاصەوە ریوایەت ئەکات کە ئەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( إني أُحَرِّمُ ما بين لابَتَي المدينة : أن يقطع عضاهها أو يقتل صيدها )) . ئەفەرموێ : بڕینی درەختی دڕكدار و کوشتنی گیانداری نێوان ئەو دوو ( حەڕڕە ) یەی مەدینەم حەرام کردووە .

هەروەها ریوایەتی کردووە کە فەرموویە : (( المدينة خير لهم لو كانوا يعلمون ، لا يدعها أحد رغبة عنها إلا أبدل الله فيها من هو خير منه ، ولا يثبت أحد على لأوائها وجهدها إلا كنت له شفيعاً ، أو شهيداً يوم القيامة ، ولا يريد أحدٌ أهل المدينةِ بسوءٍ إلا أذابه الله في النار ذوب الرصاصِ ، أو ذوب الملح في الماء )) .

ئەفەرموێ : ئەگەر موسڵمانان بزانن ئەوا مەدینە چاکترە بۆیان . هەر کەسیش دڵی بە مەدینەوە نەبێ و بەجێی بهێڵێ ، ئەوا خوای گەورە کەسی لەو چاکتر بۆ مەدینە پەیدا ئەکات .. هەر کەسیش لەسەر گەرما و سەرما و ناڕەحەتیی مەدینە دان بە خۆیدا بگرێ ، ئەوا من لە رۆژی قیامەتدا یان ئەبمە شەفاعەتکەر ، یان شاهێد بۆی .. هەر کەسیش بیەوێ بەرامبەر بە دانیشتوانی مەدینە بە

خراپیی بجووڵێتەوە ، ئەوا خوای گەورە لە ناو ئاگری دۆزەخدا بە وێنەی توانەوەی قورقوشم ، یان توانەوەی خوێ لە ناو ئاودا ، ئەی توێنێتەوە .

کۆچ کەران کە هاتنە مەدینەوە کەوتنە بارودۆخێکەوە کە زۆر لە بارودۆخی مەککە جیاواز بوو :

ئیمان دارانی مەککە هەر هەموویان بڕیاریان دابوو تا مردن لە سەر بیروباوەڕی خۆیان بەردەوام بن ، بەڵام زۆر بێ دەست و بێ هێز بوون .. بە دەستی کافرەکان ئەچەوسێنرانەوە . بۆیە توانای بەرپاکردنی کۆمەڵگای ئیسلامی یان نەبوو ، هەر لەبەر ئەوەش بوو قورئانی مەککیی بایەخی زۆری بە عەقیدە ئەدا و ، بە چیرۆك و ئامۆژگاری یەکانی ورەی ئیمان دارانی بەرز ئەکردەوە ، بەڵام لە مەدینەدا ئیمان داران بوونە خاوەنی دەسەڵات .. مەدینە بە دەست خۆیانەوە بوو .. کەسێك دەستی بە سەریاندا نەئەڕۆی .. کەسێك نەبوو ستەمیان لێ بکات .. کەواتە پێویستی یان بە هەموو بەشەکانی شەریعەت هەبوو تا شارستانییەتی ئیسلام بەرپا بکەن و ، کاروباری دەوڵەت و حکوومەت بە دەستی خۆیان هەڵ بسووڕێنن . بۆیە قورئانی مەدەنیی هەموو حوکمە شەرعی یەکانی پێشکەش بە ئیمان داران کرد، تا هەموو وزە و لێهاتنێکیان بخەنە کار و ، لە سایەی دینی خوادا سەرزەویی ئاوەدان بکرێتەوە .

**( ٢ ) ئەنصار**

ئەنصاریش بریتین لە دانیشتوانی مەدینە ، بە ئەوس و خەزرەجەوە ، کە لە پەیمانی یەکەم و دووهەمی عەقەبەدا هاتن بە دەم بانگەوازی ئیسلامەوە و ، کە گەڕانەوە مەدینە ، مژدەی بانگی سەرفرازی یان بە خزم و کەس وکاریان دا و ئەوانیش موسڵمان بوون و بوونە بنکەیەکی بەهێز بۆ دینی خوا و ، باوەشی خۆشەویستیی و برایەتیی و هاوکاری یان بۆ خوشك و برا کۆچ کەرەکانیان کردەوە و ، بە شێوەیەکی بێ وێنە لە مێژووی مرۆڤ دا ، شانیان دایە بەر خزمەت و ، لەگەڵ کۆچ کەرەکاندا ، پاکترین و بەهێزترین کۆمەڵگا و شارستانیێتی یان بەرپا کرد ، کە بە راستیی بە شێوەیەکی بێ وێنە ئیسلامیان لە ژیانیاندا جێ بەجێ کرد و ، بە هەردوو لایانەوە چاوی پێغەمبەری خوایان ﷺ رۆشن کردەوە و ، بۆ مرۆڤایەتییشیان سەلماند کە بانگی ئیسلام مایەی سەرفرازیی تێکڕای مرۆڤە ..

لە مەدینەدا سێ هۆزی جوولەکە لەگەڵ ئەوس و خەزرەج دا ئەژیان .. ئەمانە لە شام دەرپەڕێنرا بوون و بە ناچاریی خۆیان گەیاندبوویە مەدینە و ، لەوێ جێگیر بووبوون و ، بە هەموو شێوەیەکیش هەوڵیان ئەدا دەست بەسەر کاروکاسپیی و باخ و باخاتی ئەو ناوەدا بگرن .. لە هەمان کات‌دا ئەبوونە مایەی پشێویی و ناکۆکیی نێوان ئەوس و خەزرەج ، تا جەنگی خوێناویی لە نێوانیان‌دا روو بدات و ، هەردوو لا لاواز بن .. بەینا و بەینیش لە نێوان ئەوس و خەزرەج و جوولەکەدا جەنگ و هەرا ئەبوو .. جا هەر کاتێ عەرەبەکان بە سەر جوولەکەدا سەر بکەوتنایە و ، بێ‌دەسەلاتیان بخستنایە ، ئەوا دەستیان بە هەڕەشە ئەکرد و ئەیان وت : سەردەمی پێغەمبەرێك ، کە لە عەرەب‌دا رەوانە ئەکرێ ، نزیك بۆتەوە و ، ئێمەش ئەچینە ژێر بەیداخی و ، بە وێنەی کوشتاری عاد و ئیرەم ئێمەش لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەدا کوشتاری ئێوە ئەکەین .

جا ئەوس و خەزرەج ئەم هەڕەشەیەی جوولەکەیان هەر لە یاد بوو و ، ئاواتە خواز بوون ئەو پێغەمبەرە دەر بکەوێ ، تا ئەمان خێرا ئیمانی پێ بهێنن و نەهێڵن جوولەکە پێشیان بکەون . بۆیە هەر کە لە وەرزی حەج‌دا بانگەوازی پێغەمبەری خوایان ﷺ بیست ، خێرا لە نێوان خۆیان‌دا وتیان : ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جوولەکە باسی ئەکەن ، نەکەن بهێڵن ئەوان بۆ ئیمان‌هێنان پێی پێشتان بکەون . جا ئەمە یارمەتی‌یەکی خوایی بوو بۆ ئەوەی بەبێ سێ و دوو لێ کردن ئەوس و خەزرەج ئیمان بهێنن و ، لەو فەڕ و بەرەکەتە دوا نەکەون ..

ئەوس و خەزرەجیش لە سەردەمی نەفامیی‌دا زۆر جار بە گژ یەك‌دا ئەچوون و کوشتاری زۆریان لە یەك ئەکرد ، وەك جەنگی رۆژی ( بوعاث ) . جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم دەستەی بانگ کردن بۆ موسڵمان بوون و باوەش کردنەوە بۆ دینی خوا ، بە ژیرانە وتیان : ئێمە کە هاتووین لە نێوان خزمەکانمان‌دا شەڕ و ناکۆکیی و دوژمنایەتیی هەبووە ، جا ئەگەر خوای گەورە بە بۆنەی تۆوە یەکیان بخاتەوە ، ئەوا لە ناو عەرەب‌دا هیچ کەس ئەوەندەی تۆ پایەدار نابێت .

هەرواش بوو .. دوای ئیمان‌هێنانی ئەوس و خەزرەج بە خوای تاك و تەنیا و شوێن‌کەوتنی قورئان ، بوونە برای خۆشەویست و یەك‌گرتوو و ، ئیسلام بووە خێر و بێر و رژا بەسەر مەدینەدا ..

ئەوەبوو قورئان هاتە خوارەوە و ، ئەو نیعمەتە گەورەیەی وەبیر ئەهێنانەوە کە بە هۆی بانگی قورئانەوە ، دوای دوژمنایەتیی و ناکۆکیی ، خوای گەورە کردنیە برای یەکتر و ، لە سەر رۆخی چاڵێکی ئاگردا بوون و خوای گەورە بە ئیمان رزگاری کردن . جا با ئیمانداران دەست بە رێبازی قورئانەوە بگرن و ، بە هیچ شێوەیەك جیاواز و پەرتەوازە نەبن ، کە ئەیفەرموو:

﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٠٣ ) .

ئەنصار زۆر مەردانە دڵی برا کۆچکەرەکانیان دایەوە و ، ئەوپەڕی رێزیان لێ گرتن و ، دەستیان لە ماڵ و سامانیان هەڵ گرت بۆیان ، بە رادەیەك کە خوای گەورە دەربارەی سەخاوەت و پیاوچاکی‌یان قورئانی ناردە خوارەوە ..

ئەم لێبڕانەی ئەنصار بووە مایەی خۆشەویستیی و هاریکاریی نێوان کۆچکەران و ئەنصار ، بە رادەیەك کە وەك یەك لاشەیان لێ هات و ، بە هەموویانەوە بوونە دەستێکی پۆلایین بۆ پەرچدانەوەی پیلانە ژەهراوی‌یەکانی موشریك و مونافیق و جوولەکەکان و ، بەبێ وچان و بەبێ کۆڵدان دانیان بە خۆیاندا گرت تا ئەو سێ هێزە ملهوڕە دوڕندەیان تەفروتوونا کردن ، کە هەر یەکەیان ئەوەندە بە هێز بوو بە تەنیا دەیتوانیی سوپای موسڵمانان لە ناو بەرێت ، ئەگەر سوپایەکی ئیماندار نەبوایە و ، خوای گەورە خۆی کۆمەك و پشتیوانی نەبوایە .. سوپاس بۆ خوا هەر سێ سوپاکە تیاچوون و ، دینە پاکەکەی خواش بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا پەڕ و باڵی بڵاو کردەوە و ، مرۆڤە چاكویستە دڵسۆزەکانی لە تاریکیی دەرهێنان و ، خستنیە سەر راستە شەقامی خزمەتکردن و چاکەکردن و یارمەتیی‌دان ..

**( ٣ ) مونافیقەکان**

ئەمانەش بریتین لە دانیشتوانی مەدینە کە موسڵمان نەبوو بوون .. ئەمانە بە دەم خۆیان وەها دەرئەخست کە موسڵمان بوون ، کەچیی لە ژێرەوە دژایەتیی موسڵمانانیان ئەکرد و ، لەگەڵ دوژمناندا دەستیان تێکەڵ کردبوو .

لە مەککەدا پێش کۆچکردن مونافیق دروست نەبوون ، چونکە هەرکەس ئامادەی هەموو سزا و ئازارێك نەبوایە و ، سەروماڵی نەخستایەتە ئەولاوە ، لە

موسڵمانەکان نزیك نەئەکەوتەوە .. ئیتر یا ئیمانێکی رێك و پێك یان کوفرێکی ئاشکرا .. بەڵام لە مەدینەدا عەرەبەکان خۆیان بە تەنیا نەبوون تا لەسەر سیفەتی خۆیان بمێننەوە ، بەڵکو هەندێکیان سیفەتی نیفاق و دووڕوویی‌یان لە جوولەکە وەرگرتبوو ، بۆیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد و ، کۆچ‌کەران و ئەنصار یەکیان گرت و ، لە بەر رەزامەندیی خوا بوونە برای یەکتریی و ، هێزێکی لێ هاتوویان پێك هێنا کە هەموو کەسێ حیسابی بۆ بکا و ، دەسەڵاتی راستەقینەی مەدینە کەوتە دەست پێغەمبەری خوا ﷺ ..

بەڵام ئەوەبوو پێش کۆچ‌کردن هەندێ پیاوی ناوداری مەدینە سەرداری هۆزەکانیان بوون ، بگرە هی وایان هەبوو کە بە تەمای ئەوەبوو بی‌کەنە پادشای مەدینە . کە ئەمانە دەسەڵاتی پێغەمبەریان دیی و ، سەرنجیان دا موسڵمانەکان چۆن گوێڕایەڵیی ئەکەن و ، فەرمان‌بەردارن ، کەوتنە حەسادەت و ، دژی ئیسلام و موسڵمانەکان وەستان .

هەروەها جوولەکەش چاوەڕوان بوون کە پێغەمبەری ئاخرزەمان لە ناو خۆیاندا هەڵ بکەوێ ، بەڵام کە دی‌یان لە ناو عەرەبدا هەڵ کەوت کەوتنە دژایەتیی و پیلان گێڕان ..

چ عەرەب و چ جوولەکە داخ لە دڵەکان ، لەبەر بێ‌هێزیی و ترسنۆکی‌یان نەیان توانیی بە ئاشکرا دوژمنایەتیی خۆیان بۆ ئیسلام و پێغەمبەرەکەی دەربڕن ، لەبەر ئەوە کەوتنە چرپ و چاپ و ، بە نهێنیی دژایەتی‌یان ئەکرد .. عەرەبەکان بە دەم موسڵمان بوون و ، جوولەکەش بە رووکەش پەیمانی هاوکاریی و پێکەوە ژیانیان مۆر کرد ، بەڵام هەردوولاشیان دوژمنی داخ‌لەدڵی موسڵمانەکان بوون .. ئەمانە لە ئیسلامدا ناوی موونافیقانیان لێ نرا و ، پیاوێکیش کە ناوی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول بوو و ، لەو کاتەدا خەڵکی مەدینە خەریك بوون تاجی بۆ دروست بکەن و بی‌کەنە پادشای خۆیان ، لە سەر ئەوەی کە خەڵکەکە ـ هەتا کوڕ و کەس وکارەکەشی ـ ئیمانیان بە ئیسلام هێنا و ، پشتیان لە پادشایەتیی ئەو کرد ، بووە سەرۆکی موونافیقان و بووە دوژمنی داخ‌لەدڵی موسڵمانان و ، بە رواڵەتیش خۆی وەها دەر ئەخست کە موسڵمان بووە ..

کوڕی ئوبەی بە نهێنیی ئاڵای نیفاقی هەڵ کرد و ، کۆمەڵێکیش خۆی ئاسا چوونە ژێر سایەی ئاڵاکەیەوە و ، کەوتنە چرپ و چاپ و دژایەتیی ئیسلامی پیرۆز .

یەکێ لەو مونافیقانە ناوی ئەبوعامیری راهیب بوو ، کە ئەوەبوو لە سەردەمی نەفامییدا جل‌وبەرگی راهیبی لە بەر کردبوو ، کە گوایە بۆتە مەسیحیی . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( لا تقولوا : الراهب ، ولكن قولوا : الفاسق )) . فەرمووی : پێی مەڵێن راهیب ، بەڵکو بڵێن : فاسق .

ئەم مونافیقە لە وڵاتی شامدا بەبێ‌کەس و بە تاقی تەنیا و سەرگەردان مرد .. بەڵام کوڕێکی هەبوو نموونەی موسڵمانی راستەقینە بوو ، کە ناوی حەنظەلە بوو و، لە رۆژی ئوحوددا بە شەهیدیی سەری نایەوە و ، نازناوی (( غسيل الملائكة )) ی لێ نرا ، چونکە مەلائیکەت شۆردبوویان ..

یەکێ تر لەو مونافیقانە جولاسی کوڕی سووەیدی کوڕی صامیت بوو . بەڵام جولاس تەوبەی کرد و بە چاکیی و پاکیی گەڕایەوە و ، موسڵمانێکی چاکی لێ دەرچوو ، وەك ئیبن ئیسحاق دەری بڕیوە .

یەکێ تریش ناوی نەبتەلی کوڕی حاریث بوو ، کە ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەی‌فەرموو : (( مَن أحبَّ أن ينظر إلى شيطان فلينظر إلى هذا )) . ئەی‌فەرموو: هەرکەس پێی خۆشە سەیری شەیتانێك بکات با سەیری ئەمە بکات . ئەم پیاوە زۆر کەتە بوو و ، قژێکی دژراو و ، جووتێ چاوی سووری پێوە بوون . گوێی لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگرت و ، دوایییش ئەی‌گەیاندن بە مونافیقەکان . هەر ئەم پیاوە بوو کە ئەی‌وت : موحەممەد لە خۆیەوە شت ئەبیستێ ، هەرکەس شتێکی بۆ باس بکا ، خێرا بڕوای پێ ئەکات . ئەوەبوو خوای گەورە بە درۆی خستەوە و قورئانی لەو بارەوە ناردە خوارەوە ..

یەکێکی تریشیان عەببادی کوڕی حونەیف بوو . ئەمیش یەکێ بوو لەوانەی کە مزگەوتی ( ضیرار ) یان دروست کرد ..

یەکێکی تریش مورەببەعی کوڕی قەیظیی بوو ، کە پیاوێکی کوێر بوو و ، لە رۆژی ئوحوددا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی لە باخەکەیەوە تێپەڕ بکات ، وتی: ئەگەر تۆ پێغەمبەری من رێگەت پێ نادەم لە باخەکەمەوە تێپەڕ بکەیت . پاشان مشتێ خۆڵی هەڵ گرت و وتی : ئەگەر بزانم جگە لە تۆ ئەم خۆڵە بەر هیچ کەسی

تر ناکەوێ ، ئەوا بۆم ئەهاویشتی . خەڵکەکە هەڵمەتیان دا بی‌کوژن ، کەچیی پێغەمبەری خوا ﷺ نەی‌هێشت کە فەرمووی : (( دعوه فهـذا الأعمى ، أعمى القلب، أعمى البصر )) . فەرمووی : وازی لێ بهێنن ، کوێرە ، کوێری دڵ و ، کوێری چاویشە .. ئەوەبوو سەعدی کوڕی زەیدی ئەشهەلیی هەڵمەتی دایە و بە کەوانەکەی لێی دا و سەری شکاند . هەروەها برایەکی مونافیقیشی هەبوو بە ناوی ئەوسی کوڕی قەیظیی .

یەکێکی تریش حاطبی کوڕی ئومەییەی کوڕی رافیع بوو ، کە پیاوێکی کەتەی بەساڵدا چوو بوو .. ئەمەش کوڕێکی هەبوو بە ناوی یەزیدی کوڕی حاطب ، کە موسڵمانێکی دامەزراو و رێك و پێك بوو و ، لە رۆژی ئوحوددا لە چەند لایەکەوە زامدار بوو و دواییش بە شەهیدیی سەری نایەوە .

ئەم مونافیقانەی پێشەوە هەموویان لە هۆزی ئەوس بوون .

ئەمانەش هەندێ لە مونافیقانی هۆزی خەزرەج بوون : رافیعی کوڕی وەدیعە و، جیددی کوڕی قەیس و ، زەیدی کوڕی عەمر و ، عەمری کوڕی قەیس و ، قەیسی کوڕی عەمر .

لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرۆکی مونافیقانی مەدینە ، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵڵا کە لە موسڵمانە هەرە راستگۆکان ئەژمێررا .. خاوەنی ئیمانێکی دامەزراو بوو .. هەر کە بیستی ناپاکیی باوکی بەرامبەر بە پێغەمبەر و موسڵمانان دەرکەوتووە ، ترسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان بدا و موسڵمانێکی تر بی‌کوژێ . بۆیە داوای کرد ماوەی بدا خۆی بی‌کوژێ . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە دڵە فراوانەکەیەوە دڵخۆشیی عەبدوڵڵای دایەوە و پێی راگەیاند کە ئارامی لەگەڵدا ئەگرن و نیازی کوشتنی ناکەن ، کە فەرمووی : (( لا ، بَل نُحسِنُ صُحبَتَهُ مادامَ بَينَنا )) !!

هەروەها هەندێ لە جولەکە ، کە بە رواڵەت موسڵمان بوو بوون ، کەوتنە شوێن چرپ و چاپی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کە ئەمانە هەندێکیانن : سەعدی کوڕی حەنیف و ، زەیدی کوڕی لوصەیت و ، رافیعی کوڕی حەرمەلە ، کە ئەوەبوو لە رۆژی مردنی‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ شاهێدیی بۆ دا کە یەکێ بووە لە گەورە مونافیقان ، کە فەرمووی : (( قد ماتَ اليومَ عظيمٌ مِن عُظماءِ الْمُنافقين )) .

هەروەها ریفاعەی کوڕی زەیدی کوڕی تابووت ، کە ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ

لە کاتی گەڕانەوەیدا لە جەنگی تەبووك هەواڵی مردنی ئەو پیاوەی ڕاگەیاند . هەروەها نوعمانی کوڕی ئەوفا و ، عوثمانی کوڕی ئەوفا و هی تریش ..

ئەم مونافیقانە ئەوەندە سەرلێشێواو بوون ، وەك موسڵمان ئەهاتنە مزگەوت و ، گوێیان لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوو ، کەچیی گاڵتەیان بە موسڵمانەکان و بە دینەکەیان ئەکرد و ، هەوڵیان ئەدا نهێنیی موسڵمانەکان بە دوژمنانیان بگەیەنن ..

ئەم دەستە چەپەڵە دەروون نزمە ، کە ئەوپەڕی ترسنۆکیی و نامەردییان لێ وەشایەوە ، نە ئەوەبوو وەکو کافران کافر بن ، وە نە ئەوەش بوو وەك موسڵمانان موسڵمان بن .. ئەمانە کۆمەڵێکی یەکجار سووك و ڕیسوایان لێ دەرچوو .. ئابڕووی خۆیانیان برد و هیچیشیان بۆ نەکرا .. هەرچەندە هەوڵیان دا و ، نەخشەیان کێشا و ، چرپ و چاپیان کرد ، سەرەنجام خوای گەورە سەرشۆڕی کردن .. خێرا خێرا قورئانی پیرۆز ئەهاتە خوارەوە و ، نەخشە و پیلانەکانیان ئاشکرا ئەکرد و ، ئابڕووی ئەبردن .. هەر فێلێکیان بەکار ئەهێنا ، بەسەر خۆیاندا ئەشکایەوە .. هەتا لە ناو خزم و کەسەکانیاندا سووك و ڕیسوا بوون .. ئەوەبوو بەشێکی زۆر لە سوورەتی ( التوبة ) و ، زۆرێك لە ئایەتەکانی سوورەتی ( البقرة ) و ( آل عمران ) و ( الأحزاب ) هاتنە خوارەوە و ، سوورەتێکی تەواویش بە ناوی ( المنافقون ) دەربارەی مونافیقان هاتە خوارەوە کە خورپەی دڵی مونافیقانیشیان ئاشکرا ئەکرد و ، ئابڕووی ئەبردن .. سەرەنجام ڕووڕەش و خەجاڵەت و سەرشۆڕی دنیا و قیامەت بوون و ، ئیماندارە ڕاستگۆ بەوەفاکانیش ، لە ژێر سایەی قورئانی پیرۆزدا ، سەرکەوتنی دنیا و قیامەتیان بە دەست هێنا و ، لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششی بێوچانیاندا ئیسلام بە هەموو لایەکدا بڵاوەی کرد و ، زۆرێك لە گەلان لە دەست ستەم و زوڵم ڕزگاریان بوو .

## ( ٤ ) جوولەکە

جوولەکە کۆمەڵێکی خراپی زیانەخرۆی دەروونەخۆشی مێژووی دوور و درێژی مرۆڤن .. ڕەگەزی جوولەکە ئەگەڕێتەوە سەر بەنیئیسرائیل کە بریتین لە یوسف و یانزە براکەی کە کوڕانی یەعقووب پێغەمبەری کوڕی ئیسحاق پێغەمبەری کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەرن ، سەلام لە هەموو پێغەمبەرانی خوا .

لە يەكەم رۆژی مێژووی ژيانيانەوە بە دڵپيسيی و ، رق و قين و ، ئاژاوە و ، دوژمنايەتيی و ، كوشت و بڕ هاتوون .

* ئەوەبوو كەوتنە پيلانگێڕان دژی يووسف پێغەمبەری برايان سەلامی خوای لێ بێ و هەوڵيان دا لە ناوی بەرن .

* كە يووسف لە دەستيان رزگاری بوو و ، دەسەڵاتی ميصری گرتە دەست و ، براكانی هێنايە لای خۆی و ، چاوپۆشيی لێ كردن ، براكانی دەستيان گەيشتە كاروكاسپيی و سەروەت و سامان ، پاشان وەچە و بەرەكانيان پووڵ و پارەيان ئەپەرست و ، دەستيان دايە خۆپەرستيی و رەزيليی و چاوچنۆكيی و ، بەلای دانيشتوانی ميصرەوە سووك و رسوا بوون و ، سەرەنجام بوونە ژێر چەپۆك و سزا و ئازاريان چەشت .

* كە لە سەردەمی مووسا پێغەمبەردا سەلامی لێ بێ خوای گەورە دەرووی لێ كردنەوە و ، بە لەتبوونی دەرياكە بۆيان ، لە دەست فيرعەون و سوپاكەی رزگاريان بوو و ، فيرعەون و سوپاكەشی نوقم بوون ، هەر ئەوەندە بوو كە مووسا پێغەمبەر لە بيابانی سيناوە بەرەو فەلەسطينی خاكی پيرۆز لەگەڵيانا كەوتە رێ ، لە رێگادا لە مووسا و هاروونی برای هەڵ گەڕانەوە و كەوتنە بۆڵە بۆڵ و ، وەك لە تەوراتدا هاتووە وتيان :

(( خۆزگە لە ميصردا بمردينايە . چونكە ئێمە لەوێ لە لای قابلەمە گۆشتدا پاڵمان لێ دابوويەوە و بۆ تێربوون نانمان ئەخوارد ، كەچيی ئێوە هەردووكتان هاتن و ئێمەتان هێنايە ئەم چۆڵەوانیيە تا ئەم هەموو جەماوەرە بە برسێتيی بكوژن .

بۆچيی ئێمەتان لە ميصر دەرپەڕاند ؟

بۆ ئەوەی بە خۆمان و منداڵ و ئاژەڵمانەوە لە تينواندا بمرين ؟ )) .

لە بەرامبەر ئەم نەفاميیەياندا ، هێشتا خوای گەورە هەر بەزەيی پيايانـدا ئەهاتەوە و ، ئەوەبوو لە بيابانی سيناءدا دوانزە كانيی بۆ هەڵ قوڵاندن و ، هەموو رۆژێكيش رزقێكی پاك و خاوێنی پێشكەش ئەكردن كە بريتيی بوو لە گەزۆ و گۆشتی باڵندەی ( السلوى ) .

* ئەوەبوو مووسا سەلامی لێ بێ لەگەڵ حەفتا پياوە هەڵبژاردەكەدا چوون بۆ گفتوگۆ لەسەر كێوی ( طوور ) و جوولەكەش هاروونيان بەلاواز ئەزانيی و دەستيان دايە پەرستنی ئەو گوێرەكەيەی كە سامريی لەو زێڕە بۆی دروست كردن

کە جوولەکە لە میصریی‌یەکانیان دزیی بوو .. دوای چل ڕۆژ کە مووسا گەڕایەوە ئەبینیٚ وا دەستیان داوەتەوە بتپەرستیی و ، ئەویش لە تووڕەیی‌دا ئەو ئەلواحانەی فڕیٚ دان کە ئەو دەستوورەیان لەسەر نووسرابوو کە خوای گەورە لە کاتی گفت‌وگۆ و موناجات‌دا بە مووسای بەخشیی بوون .

* دوای ماوەیەك کەوتنە بیانووگرتن لە مووسا و وتیان : ئەی مووسا ! ئیمانت پیٚ ناهێنین هەتا بە ئاشکرا خوا نەبینین . ئەوەبوو خوای گەورە مراندنی و، پاشان زیندووی کردنەوە و ، لە ترسانا تەوبە و پەشیمانی‌یان نواند ..

* خوای گەورە فەرمانی بە سەر مووسادا دا تا پەیمان لە جوولەکە وەربگریٚ ، بۆ ئەوەی بە گوێی فەرمانەکانی خوا بکەن و شوێن تەورات بکەون ، کەچیی ڕازیی نەبوون و ، پەیمانیشیان نەدا .. بۆ ئەم مل پێچی‌یەیان خوای گەورە فەرمانی دا کێوی طوور بەسەر سەریانەوە بەرز کرایەوە ، بۆ ئەوەی بترسێن . کە ئەوەیان دیی لە ترسان‌دا خۆیان بە دەستەوە دا و ، پەیمانیان بەست ..

* هەتا بۆیان بکرایە لەو پەیمانانەیان‌دا فێڵیان ئەکرد . ئەوەبوو خوای گەورە فەرمانی دابوو ڕۆژی شەممە بۆ خواپەرستیی دیاریی بکریٚ و ، لەو ڕۆژەدا ڕاوی ماسیی نەکەن .. جا بۆ تاقیی‌کردنەوەیان خوای گەورە بڕیاری وەها بوو کە ڕۆژانی شەممە ماسی‌یەکی زۆر ئەهاتنە شوێنی ڕاوە ماسی‌یەکان و ، لە ڕۆژانی تردا نەئەهاتن . ئەوەبوو فەرمانیان شکاند و فێڵیان بەکار ئەهێنا . خوای گەورەش لە تۆڵەی ئەوەدا کردنیە مەیموون .

* کاتێك کە مووسا سەلامی لیٚ بیٚ بەرەو فەلەسطین ئەڕۆیشت تا لە پێناوی خوادا جیهاد بکات و ڕزگاری بکات ، بە ئەندازەی ژمارەی دوانزە تایەفەکەی بەنی ئیسرائیل ، دوانزە نەقیبی لە ناو جوولەکەدا هەڵ بژارد و ، فەرمانی بە سەریان‌دا دا با پێشی بکەون و ، هەواڵی وڵاتەکە و دانیشتوانی بزانن . ئەوانیش ڕۆیشتن و فەرمانەکەیان جیٚبەجیٚ کرد و ، گەڕانەوە و ، وتیان : خاکی پیرۆز پڕیەتی لە شیر و هەنگوین ، بەڵام دانیشتوانەکەی بەدەسەڵات و بەهێزن . هەروا هەر نەقیبێك ترسێکی زۆری خستە بەر کۆمەڵەکەی خۆیەوە تا نەوێرن هەنگاو بۆ پێشەوە بنێن ، جگە لە دوو نەقیبیان ، کە گەڕانەوە هەریەکەیان تایەفەکەی خۆی لەوە ئاگادار کرد کە نەترسن و ، هێرش بکەن بۆیان و ، بە پشتیوانیی خوا ، زاڵ ئەبن ، بەو مەرجەی ئیمان‌دار بن .

بەڵام بەنی‌ئیسرائیلی جوولەکە بڕیریان دا واز لە جیهاد بهێنن .. روویان لە مووسا کرد و وتیان : ئەو وڵاتە کۆمەڵێکی وەها بەهێزی تیادان کە ئێمە توانای جەنگمان لەگەڵیانا نیە . هەتا ئەوان چۆڵی نەکەن ئێمە ناچینە ناویەوە ..

دوو نەقیبە مەردەکە هەوڵی زۆریان دا تا قەناعەت بە جوولەکە بکەن بۆ جیهاد لە پێناوی خوادا ، کەچیی بێ‌هوودە بوو و بەرەو خاکی پیرۆز نەکەوتنە رێ و بە مووسایان وت : هەتا فەلەسطین دانیشتوانەکەی تێدا بن ئێمە ناچینە ناویەوە . تۆ و پەروەردگارت بڕۆن کوشتاریان بکەن و ، ئێمە لێرە دائەنیشین چاوەڕێ ئەکەین .

لە سەر ئەم ترسنۆکی‌یە خوای گەورە سزای دان و ، بۆ ماوەی چل ساڵ خاکی پیرۆزی لێ حەرام کردن و ، لەو دەرودەشتەدا بە سەرگەردانیی مانەوە .

* دوای کۆچی دوایی هاروون و مووسا سەلامیان لێ بێ و ، دوای بەسەر چوونی چل ساڵەی سەرگەردانیی بە سەرکردایەتیی ( یووشەعی کوڕی نوون ) چوونە ناو خاکی پیرۆزەوە .. جا کە خوای گەورە ئەو وڵاتەی بۆ فەتح کردن و ، بەسەر دوژمنەکەیان‌دا سەری خستن ، یووشەعی پێغەمبەریان پێی ڕاگەیاندن کە خوای گەورە فەرمانی وەهایە ، لەسەر ئەم نیعمەتی سەرکەوتنە ، کاتێ کە لە دەرگای شار ئەچنە ژوورەوە سەجدەی شوکر ببەن و بڵێن : (( حِطَّةٌ )) ، واتە : خوایە ! گوناهەکانمان لێ داوەرێنە و لێمان خۆش ببە . کەچیی ئەم فەرمانەی خواشیان بەجێ نەهێنا و ، دەستیان دایە ستەم و لەخۆبایی‌بوون .

دوای ئەوەی کە خاکی پیرۆز کەوتە دەست بەنی ئیسرائیل و ، دەسەڵاتیان تیایا دامەزرا ، چەند قازی‌یەك حوکمی وڵاتیان کەوتە دەست و ، ماوەی صەد ساڵێکی خایاند ، وەك پادشا دەستیان ئەڕۆیشت . لەو سەردەمەدا خەڵکێکی زۆر لە خواپەرستیی هەڵ گەڕانەوە و ، دەستیان دایە بت‌پەرستیی .. گوناه و تاوانیان لە ناودا زۆر بوو .. رەوشت نزمیی پەرەی سەند .. زینا و داوێن‌پیسیی تەشەنەیان کرد .. هەر کە پیاوچاکێك دەستی بدایەتە بانگ‌کردنی خەڵکەکە بۆ لای خوا ، یەکسەر ئەیان‌کوشت .. ئەوەبوو لەسەر ئەم هەڵوێستە لارە و ، لەسەر ئەو هەموو تاوان و داوێن‌پیسی‌یە خوای گەورە چەندین بەلا و موصیبەتی بۆ ناردن و ، هەر لەم ماوەیەدا خوای گەورە کەسانی بەدەسەڵاتی بۆ ناردن تا وڵاتیان داگیر بکا و ، خۆیان و ماڵ و منداڵیان زەلیل و سەرشۆڕ بکات . بۆ نموونە: لەو ماوەیەدا ((

(( شەنعائیم )) ی پادشای نـەهـرەین و ، (( حەجلوون )) ی پـادشـای موئـاب و ، (( یابین )) ی پادشای حاصووری کەنعانیی و هی تریش جوولەکەیان زەلیل کرد .

لە کتێبەکانیاندا ئەوە هاتووە کە لەسەر ئەوەی لە فەرمانی خوا یاخیی بوون و لە دین هەڵگەڕاونەتەوە ، خوای پەروەردگار غەزەبی لێ گرتوون و، کەسانێکی بـۆ گـەیـاندوون تـا تالاّنیان بکەن و ، سـەرەنجامیش زەلیلیی و ژێرچەپۆکیی بەشـیان بێت ..

* پاشان داوایان لە پێغەمبەرێکیان کرد تا پادشایەکیان بۆ دیاریی بکـات بـۆ ئەوەی فـەرماندەیان بێت و ، ئەمانیش لە پێناوی خوادا بچن بە گژی دوژمنـاندا و ، پایە و دەسەلاّتی جارانیان دەست بکەوێتەوە .. پێغەمبەرەکەشـیان کـە چـاك ئەیناسین چ بابەتێکن ، بەڵێنی لێ وەرگرتن کە غیرەتیان هەبێ و پشت لە دوژمـن نەکەن . جا کە هەواڵی دانێ ( طـالووت ) پادشـایانە ، کەوتنـە بـڕو بییـانوو کـە طالووت بۆ پادشای ئەوان ناشێ و ، خۆیان بەوە شایان ترن و ، طـالـووت خـاوەنی سامانی زۆر نیە ..

بە هەر حاڵ قەناعەتی پێ کردن و ، بە پادشایەتیی طالووت رازیی بوون ، کـە جیهادیان لەسەر فەرز کرا و پادشاش بانگی کردن تا جیهـاد بکـەن ، کـەمێکیان نەبێ هەموو پشتیان هەڵ کرد .. کە لەشکر کەوتە رێ ، تووشی رووبارێك هاتن و ئەبوا لە ئاوی رووبارەکەیان نەخواردبایەتەوە ، کەچیی دیسان کەمێکیان نەبێ هەر هەموو لێیان خواردەوە .. کە چوونە ئەو بەرەوە دەستە کەمەکە پشتیان بـە خـوا بەست و چوونە مەیدانی دوژمن و ، بە کۆمەکیی خوا سەرکەوتن ..

* لە سەردەمی داوود و سولەیماندا سەلامیان لێ بێ دەوڵەتی بەنی ئیسـرائیل بەهێز بوو ، بەلاّم جوولەکە نەیانتـوانیی بـە پـاکیی ژیـان بدەنـە سـەر ، بـەڵکو دەستیان دایە بەدڕەوشتیی و خراپە و سەرزەوییان پڕ لە فەسـاد کـرد و ، دەسـت کاریی دینی خوایان کـرد و ، هـەر پێغەمبەرێکیشـیان دەسـتی بهێنایەتـە رێـی حیبرەکانیان ، خێرا ئەیانکوشت . بەمـە بـە یـەکجاریی لـە فـەرمانی خـوا دوور کەوتنەوە ..

* بە هۆی فەساد و لادانیانەوە ، لە سـەرەتای صەدەی شـەشەمی پێش زایـین دا ، خوای گەورە یەکێ لە پادشـاکانی بـابلی ، بـە نـاوی ( نـەبوخوذنەصـر یـان بوختونەصەر ) ، بەسەریاندا زاڵ کرد .

ئـەوەبوو لە ساڵی ( ٥٨٧ ) ی پ . ز پادشای بابل لەشکرێکی پێکەوە نـاو ، بەرەو فەلەسطین کەوتە رێ ، بەڵام مێژوو باسی هۆی ئەم هێرشە ناکات .

کە گەیشتە وڵاتی جوولەکە ، جوولەکە بەرگەی هیچیان نەگرت و نەبوخوذنەصر بە خۆی و سوپاکەیەوە چـووە ( بیـت المقـدس ) و رووخانـدیان و ، دەسـتیان دایـە کوشت و بڕ و تـاڵان و بـە دیـلگرتنـی جوولەکـە . هەرچـییش خـاوەنی توانـا و دەسەڵاتبوون بە دیلیی بەرەو بابل خستنیە رێ ..

* جوولەکە لە مێـژوودا نامـەردیی زۆریـان کـردووە ، بـە تایبـەت کوشـتنی پێغەمبەرەکانیان ، تا رێ لە ئارەزووەکانیان نەگرن و ، بە ویسـتی خۆیـان دەسـت کاریی دینی خوا بکەن . جا لە مێژوودا چەسپاوە کـە پێغەمبـەران : حزقیـال و ، ئەشعیا و ، ئەرمیا و ، یەحیا و ، زەکەرییایان کوشتوون و ، ئەوەبوو هەوڵیشـیان دا عیسا بکوژن ، بەڵام خوای گەورە دەرفەتی نەدان ..

بۆ نموونە : یەحیا سەلامی‌لێ بێ دژی هەڵوێستی هیرۆدسـی پادشـای جوولەکـە وەستاوە کە ویستوویە کچێکی برازای خۆی بکاتە ژنی خۆی .. لەسەر ئەمە یەحیا شەهید ئەکرێت .

* کاتی لەدایکبوونی عیسا پێغەمبەر سەلامی لێ بێ نزیك بـوو بوویـەوە و ، کۆمەڵگای جوولەکەش گەیشـتبووە چڵەپۆپەی فەسـاد و خراپکـاریی و ، دەسـت کاریەکی بنەڕەتیی دینی خواشیان کردبوو ..

عیساش داوای لە بەنی ئیسرائیل کرد بگەڕێنەوە سـەر رێگـای راسـت و ، بـە پاکیی خواپەرستیی بکەن ، کەچیی سەرۆك و سەرداره دینییەکانیان لێـی هاتنـە دژایـەتیی و ، تـەنها کۆمـەڵێکی کـەمیان ئیمانیـان پـێ هێنـا .. سـەرەنجام گەورەکانیان و حیبرەکانیان کۆبوونەوە و وتیان : ئێمە ئەترسین عیسا دینەکەمان لێ تێك بدات و خەڵکیش شوێنی بکەون ..

سەرۆکی کاهینەکانی ئەو رۆژە ناوی ( قیافـا ) بـوو ، هاتـە گوفتـار و وتـی : مردنی تاقە پیاوێك لە تیاچوونی گەلێك هەر هەمووی چاکترە !

ئەمە فـەتوا بـوو بـۆ حـەڵاڵبـوونی خـوێنی عیسـا سـەلامی لێ بـێ ، بۆیـە گەورەکانیان و حیبرەکانیشیان بە یەكدەنگیی بڕیاری کوشتنی ئـەویان دەرکـرد .. بۆ ئەمە کەوتنە شـکاتکردنـی بـەلای حـاکمی رۆمانییـەوە لـە فەلـەسطین و ، ئەوەشیان دا بە گوێیدا کە عیسا بکوژرێ و لە دار بدرێ .

عیسا کە ئەم هەواڵەی زانیی خۆی حەشار دا .. ئەوەبوو چووە ئۆرشەلیم ( قودس ) و ، یەکێ لە دوانزە حەواریەکەی ، کە ناوی یەهووذای کوڕی شەمعانی ئیسخریوطیی بوو ، شوێنی خۆشاردنەوەکەی عیسای ئاشکرا کرد و ، دەست و پێوەندی حکوومەت چوونە سەری . بەڵام کە چوونە ژوورەوە ، شێوەی یەهووذا وەك شێوەی عیسای لێ هات و ، وایان زانیی عیسایە و ، ئەویان گرت و ، لە ئاستی عیسادا چاویان کوێر بوون و نەیانبینیی . کە دوای لە سێدارەدان بۆیان دەرکەوت عیسا لە سێدارە نەدراوە ، کارەکەیان شاردەوە ، تا خەڵکیی پایەداریی‌عیسایان بۆ دەرنەکەوێ ، بەوەی کە خوا هەڵی کێشاوە و لە دەستیان رزگاری کردووە ، نەوەکو ئیمان بە دینەکەی ئەو بهێنن . بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە نەیانتوانیوە بیکوژن و چوارمێخەی بکێشن ، بەڵکو خوای گەورە لە ئاستیا چاوانیانی کوێر کردووە و کەسێکی تریان بەو زانیوە و کوشتوویانە و ، خوای گەورەش ئەوی بەرز کردۆتەوە بۆ ئاسمان و دەربازی کردووە ، ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە ئەفەرموێ :

﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ ﴾ ( النساء : ١٥٧ ـ ١٥٨ ) .

ئەمە رەفتاری جوولەکەیە و ، خۆیشیان بە کوڕ و خۆشەویستی خوا ئەژمێرن .

جوولەکە هەر بەمەوە نەوەستان ، بەڵکو پیلانێکی گەورەیان بۆ تێكدانی عەقیدەی نەصرانیی نەخشە کێشا . ئەوەبوو هەوڵیان دا تا پیاوێکی یەکجار لێهاتوو خۆی بگەیەنێتە چڵەپۆپەی دینی مەسیحیی و هەر لە ریشەکەوە دەست کاریی بکات .. ئەو پیاوەش ناوی پۆڵس بوو کە توانیی بنچینەی دینی مەسیحیی دەربهێنێ و لەسەر ئەو شێوە پاکە لای بدا ، کە خوای گەورە ناردی بۆ عیسا سەلامی لێ بێ .

لە بنەڕەت‌دا پۆڵس ناوی شائوول بوو ، کە یان جوولەکەیەکی طەرسووسیی ، یان رۆمانی‌یەك لە فریسی‌یەکان بوو .. جا هەرچەندە پۆڵس فریای سەردەمی مەسیح کەوتبوو ، بەڵام نە چاوی پێ کەوتبوو و ، نە گوێیشی لە بانگەوازی بوو بوو ..

هەتا ئەڵێن : لە سەرەتادا گەورەترین دوژمن و ناحەزی مەسیحی‌یەکان بوو و ، لە کوشتن و بڕین و سزادانیان دریغیی نەئەکرد ..

ئەوەبوو ماوەیەك دوای بەرزبوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان بە شێوەیەکی ناخلۆفیی پۆڵس بلاوی کردەوە کە هاتۆتە سەر دینی مەسیح و ، ئەوەشی بلاو کردەوە کە عیسا کوڕی خودایە .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە مەدینە ، سێ تیرەی جوولەکە لە مەدینەدا بوون : نەوەی قەینوقاع و ، نەوەی نەضیر و ، نەوەی قورەیظە . جا رای بەهێزی زانایان لەسەر ئەوەیە کە لە ساڵی حەفتای زاینیی‌دا ، دوای سزا و ئازاری رۆمەکان ، ناچار بوون شام بەجێ بهێڵن و خۆیان بگەیەننە حیجاز . چونکە طەیطووسی رۆمانیی هێرشی کردبووە سەر ولاتەکەیان و دەستی بەسەر ئوورشەلیم‌دا گرتبوو و ، بۆ دووهەم جار هەیکەلی رووخاندبوو و ، کوشت و بڕێکی خەست و خۆڵی جوولەکەی کردبوو .

جوولەکە ناونیشانی پێغەمبەری ئاخرزەمانیان لە کتێبەکانیان‌دا ئەدیی ، بۆیە زۆریان خۆیان بۆ ئەوە ئامادە ئەکرد کە بەڵکو بۆ ئەو کارە پیرۆزە هەڵ ببژێررێن ، لەبەر ئەمە کۆچیان بۆ دەوروبەری مەدینە ئەکرد و ، لەسەر رێی شامیش قەلایان دروست ئەکرد ، بەو هیوایەوە کە ئەگەر دوا پێغەمبەر لەوان هەڵکەوت ئەوا بۆ کوشتاری عەرەب لە ژێر بەیداخی ئەو پێغەمبەرەدا پێویستی‌یان بەو قەلایانە ئەبێت .

بەناو خەڵك‌دا ئەوەیان بلاو ئەکردەوە کە دواپێغەمبەر پێویستە لەناو بەنی ئیسرائیل‌دا هەڵ بکەوێ ، بۆیە ئەوانەی کۆچیان بۆ ناوچەکانی حیجاز کردبوو چاوەڕوانی ئەوە بوون خوای گەورە ئەو پێغەمبەرە بە شەریعەتێکی تیژ و تەواوەوە رەوانە بکات .. هەتا لە خوا ئەپاڕانەوە تا ئەو بەرێزە چاوەڕوان کراوە لەناو خۆیان دا هەڵ بکەوێ ، هەتا شوێنی بکەون و ، کوشتاری ئەو عەرەبە بت پەرستانەی دوورگەی عەرەبیی بکەن و ، موڵك و دەسەلاتی ئیسرائیل بەرپا بکەنەوە ، چونکە ئەیان‌زانیی خوای گەورە سەرکەوتن و فەتحی ولاتانی پێشکەش ئەکات .. چونکە دەمێك بوو بەنی‌ئیسرائیل بە بۆنەی گوناه و تاوانیانەوە خوا غەزەبی لێ گرتبوون و ، لە نێو گەلان‌دا سووك و مەهتووکی کردبوون . جا کە دواپێغەمبەر لەوان هەڵ نەکەوت ، بگرە لەناو عەرەب‌دا و لە نەوەی ئیسماعیل هەڵ کەوت ، کەوتنە

حەسادەت و دژایەتیی ، بە مەرجێ بە چاوی خۆیان هەموو سیفەتەکانیان ئەبینیی و یەقینیشیان لەوە هەبوو کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری ئاخرزەمانە :

﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾ ( البقرة : ٨٩ ) .

﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ﴾ ( البقرة : ١٤٦ ) .

جوولەکە رۆژێك لە رۆژان لەگەڵ دینی خوادا راستیان نەکردووە ، بەڵکو تەنها چاویان لە بەرژەوەندیی خۆیان بووە ، بۆیە کە دواپێغەمبەر لە خۆیان هەڵ نەکەوت پشتیان لە حەق و راستیی هەڵ کرد ، هەر چەند وەك ناسینی کوڕەکانی خۆیان پێغەمبەری خواشیان ئەناسیی ..

بە درۆ و بە هەڵبەستن ئەوەیان رائەگەیاند کە ئەوان گەلی هەڵبژاردەی خوان و ، پێغەمبەرایەتییش نابێ لەوان دەرچێ . بۆیە کەوتنە دژایەتیی ئیسلام و پێغەمبەری ئازیز و ، تەنها کەمێکیان لێ موسڵمان بوون ، وەك عەبدوڵلای کوڕی سەلام و کەس و کاری و ، وەك موخەیریق .

موخەیریق زانایەکی زۆر شارەزای جوولەکە بوو و ، لە هەمان کاتدا پیاوێکی دەوڵەمەندی خاوەن باخی دارخورما بوو .. بە چاکیی ئاگاداری سیفەتەکانی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ ، بەڵام هۆگری دینەکەی خۆی بوو بوو و ، ئاوڕی لە ئیسلام نەئەدایەوە هەتا رۆژی جەنگی ئوحود ، ئەو رۆژە دیتی وا سوپایەکی گەورەی قوڕەیش هاتۆتە سەر موسڵمانەکان .. ئەو رۆژەش شەممە بوو .. موخەیریق هەستی کرد موسڵمانەکان بێتاوانن و قوڕەیش تەپی کوتاوەتە سەریان .. ئەو هەموو ماوەیەش کە هاتبوونە مەدینە خراپەیان بۆ هیچ کەس نەبوو بوو .. لە هەمان کاتدا پەیمان و بەڵێنێك لە نێوان موسڵمانەکان و جوولەکەدا هەبوو کە پشتی یەکتریی بەر نەدەن .. ئەو رۆژە رووی لە کۆمەڵی جوولەکە کرد و وتی : ئەی کۆمەڵی جوولەکە ! بەخوا خۆتان چاك ئەزانن کە پشتگیریی موحەممەد لەسەرتان پێویستە . وتیان : ئەمڕۆ رۆژی شەممەیە . وتی : شەممەی چیی ؟ پاشان دەستی دایە چەکەکەی و خۆی گەیاندە ئوحود و بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ

گەیشت و ، وەسیەتیشی بۆ خزمانی کرد و وتی : ئەگەر ئەمڕۆ کوژرام ، سامانەکەم بۆ موحەممەد بێت ﷺ ، تا بەو شێوەی لێ بکا کە خوا پێی خۆشە . کە جەنگ دەستی پێ کرد ، دەستی دایە کوشتار هەتا شەهید کرا.. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیفەرموو : (( مخيريق خير يهود )) . ئەیفەرموو : موخەیریق چاکترین پیاوی جوولەکەیە ، پاشان سامانەکەی وەرگرت و کردی بە صەدەقە و بەسەر موسڵمانەکاندا دابەشی کرد ..

جوولەکە هەندێکیشیان بە نیفاق خۆیان وا دەرخست کە موسڵمان بوون ، ئەوانە پاڵیان دا بە سەرۆکی نیفاقی مەدینەوە و ، بەشی هەرە زۆریشیان کەوتنە دژایەتیی ئیسلام وەك : حویەیی کوڕی ئەخطەب و ، ئەبویاسری برای و، سەللامی کوڕی میشکەم و ، کینانەی کوڕی رەبیعی کوڕی ئەبولحوقەیق و ، سەللامی کوڕی ئەبولحوقەیق و ، رەبیعی کوڕی رەبیعی کوڕی ئەبولحوقەیق و ، عەمری کوڕی جەححاش و ، کەعبی کوڕی ئەشرەف و ، شاسی کوڕی قەیس و، مالیکی کوڕی صەیف و ، کەعبی کوڕی ئەسەد و ، وەهەبی کوڕی یەهوودا ..

ئەم ناودارانەی جوولەکە هەر لە یەکەم رۆژەوە کەوتنە دژایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، هەموو هەوڵێکیان دژی موسڵمانان دا و ، لە هیچ خراپەیەك بەرامبەریان سڵیان نەکردەوە .. هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی پێکەوە ژیان و سەربەستیی دینیی پێیان دا و ، لە پاراستنی سامان و دارایییان بێخەمی کردن ، بەو مەرجەی بە هاوبەش بەرگریی لە مەدینە بکەن و ، بەرامبەر بە موسڵمانەکان ناپاکیی نەکەن و ، نەبنە کۆمەکی دوژمنیان و ، دەست درێژیی نەکەنە سەر موسڵمانان ..

یەکێك لەوانەی کە بە چاکیی لای یەقین بوو موحەممەدی خۆشەویستمان پێغەمبەری ئاخرزەمانە و ، لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری دا دژایەتیی بکات ، یەکێ لە کەڵە زاناکانی جوولەکەی نەوەی نەضیر بوو بە ناوی حویەیی کوڕی ئەخطەب .. هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە یەثریب و ، حویەیی گەیشتە خزمەتی ، بۆی دەرکەوت راست ئەکا و ، ئەو پێغەمبەرەیە کە ئەوان چاوەڕوانی ئەکەن . بەڵام مادەم خوا لە ناو عەرەبدا هەڵی بژاردووە و ، پێغەمبەرایەتیی لە بەنیئیسرائیلیی سەندۆتەوە ، بڕیاری دا ئیمانی پێ نەهێنێ ..

صەفیەی کچی حویەیی ـ کە دوایی ئەبێتە هاوسەری پێغەمبەر و دایکی ئیمان داران ـ خوا لێی رازیی بێ باسی هەڵوێستی باوکی و ئەبویاسیری مامەی ئەکات و ئەڵێت : خۆشەویستترین منداڵی باوکم بووم بە لای باوکیشم و ئەبویاسیری مامەشمەوە . هەرچیی جارێك لەگەڵ منداڵێکی تریانا تووشم ببونایە ، روویان ئەکرد بە لای منەوە و وازیان لەو ئەهێنا . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە و ، لە قوباء لەناو نەوەی عەمری کوڕی عەوفدا لای دا ، سەر لە بەیانیی زوو باوکم حویەیی کوڕی ئەخطەب و ، مامم ئەبویاسیری کوڕی ئەخطەب چوونە خزمەتی .

صەفیە ئەڵێت : ئیتر ئەوەبوو لەگەڵ خۆرئاوابووندا گەڕانەوە .. هەردووکیان ماندوو و ، تەمەڵ و ، هیلاك و ، خاوە خاو بەڕێوە ئەچوون ..

ئەڵێت : گوێم لە ئەبویاسیری مامەم بوو کە بە حویەیی کوڕی ئەخطەبی باوکمی ئەوت : خۆیەتی ؟! وتی : ئەرێ ، بەخوا . وتی : چاك ئەیناسیی و ، ئەیسەلمێنی ؟ وتی : بەڵێ . وتی : ئەی دڵت چۆنە بەرامبەری ؟ وتی : بەخوا ، هەتا ماوم هەر دژایەتیی ئەکەم .

بەم جۆرە دیمان کە ئەم دوو کەڵەزانایەی جوولەکە لەبەر نەشارەزایی و ، جوان دەرنەکەوتنی راستیی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو ، کە دژایەتیی ئیسلامیان ئەکرد، بەڵکو دڵیان لە رق و قین ، بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان پڕ بوو .. بە مەرجێ ئەمە لە کاتێکدا دەرئەبڕن کە هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە قوباءە و ، نەگەیشتۆتە ناو مەدینە و ، هیچ هەڵوێست و هەڵسوکەوتێکی پێوە نەبینرا بوو کە دژ بە بەرژەوەندیی جوولەکە بێت .. هێشتا موسڵمانێك هەنگاوێکی بۆ دژایەتیی جوولەکە نەنابوو ..

بەڵام چونکە زانا و سەردار و گەورەکانیان بەتەما بوون پێغەمبەری ئاخرزەمان، کە کاتی دەرکەوتنی نزیك بۆتەوە ، لە بەنیئیسرائیلدا هەڵ بکەوێ ، زۆریان پێ ناخۆش بوو کە لە ناو عەرەبدا هەڵ کەوت . لەبەر ئەوەی ئەوان بە تەمابوون لە سایەی ئەم پێغەمبەرەدا دەسەڵات پەیدا بکەن و ، بەسەر هەموو دنیادا سەر بکەون ، چونکە لەناو کتێبەکانیاندا بەڵێنی سەرکەوتنی درا بوو ..

خۆ ئەگەر بەنیئیسرائیل بە پێی ئەو بەڵێنە هەنگاویان هەڵ گرتبایە کە لەوە و پێش بە خوای پەروەردگاریان دابوو ، کە بریتیی بوو لە کۆمەکیی و

پشتیوانییکردن له دوا پێغەمبەر ، ئەوا هەموو ئاوات و خواستێکیان ئەهاتە دیی و ، سەربەرزیی دنیا و قیامەتیان دەستگیر ئەبوو ، چونکە ئیسلام دینی چینێك ، یان کۆمەڵێك ، یان گەلێك نەبوو ، بەڵکو دینی تێکڕای سەرزەوییە، بۆیە هەموو کەس و کۆمەڵێك لـە سـایەیدا ئەحەسـێتەوە و ، بـە هـەموو ئـاواتێکی دنیـا و قیامەتی ئەگات ..

بەڵام جوولەکـە ئەوەنـدە خۆپەرسـت و دنیاپەرسـت و پـوولپەرسـت بـوون و ، ئەوەندەش خۆیان لە مرۆڤەکان بە بەرزتر ئەگرت و ، ئەوەندەش دڵڕەق و بێسۆز و بێویژدان بوون ، کەوتنە رەخنەگرتن لە خـوای بـە دەسـەڵات .. نارەزاییـیـان لـە قەدەری خوایی دەربڕیی کە بۆچ پێغەمبـەری ئاخرزەمـانی لـەوان هـەڵ نەبـژارد ؟ پاشان دەستیان دایە دژایەتیی قورئان و شوێنکـەوتوانی .. بـە تایبـەت حویـەیی کوڕی ئەخطـەب و ئەبویاسیری برای هەوڵیان ئەدا خەڵك لە ئیسلام دوور بخەنـەوە ، تا ئەوەبوو قورئانی پیرۆز هات و ئەو حاڵەتەی ئەوانی دەرخست :

﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ ( البقرة : ١٠٩ ) .[٢٨٧]

[٢٨٧] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٣٩ ـ ٤٨ ، والرحيق المختوم : ١٨٠ ، و مكائد يهودية عبر التأريخ للميداني : ٢١ـ ٤٦ .

# بەشی نۆزدەهەم
# ژیانی مەدینە

هەرکە موسڵمانەکان لە مەدینە دامەزران ، خوای گەورە بە سۆز و شەفەقەتی خۆی کارێکی یەکجار گەورە و بە نرخی خستە دڵی پێغەمبەری ئازیزەوە ﷺ ، تا بۆ بەرژەوەندیی موسڵمانەکان ئەنجامی بدات .. ئەو کارە ئەوپەڕی نەخشەجوانیی و بیرتیژیی و راجوانیی پێغەمبەری خوای ﷺ دەرئەخست .. ئەوەبوو پەیوەندیی برایەتیی لە نێوان موهاجیر و ئەنصاردا دروست کرد ، کە لەوە ئەچێ دوای کۆچ کردن زۆری نەخایاندبێ و ئەم برایەتی‌یە بەسترابێ ، چونکە یەکڕیزیی و تەبایی موسڵمانان پێویستترین کارێك بوو کە بانگەوازی ئیسلام پێی گەشەی ئەکرد ، لە فێڵ و تەڵەکەی دوژمنان ، بە تایبەت جولەکە و مونافیقان ، سەر فراز بن .

پێغەمبەری خوا ﷺ و عەلیی کوڕی ئەبوطالیب بوونە برا ..

ئەبوبەکر و خاریجەی کوڕی زەیدیش بوونە برا ..

عومەر و عوتبانی کوڕی مالیك‌یش بوونە برا ..

حەمزە و زەیدی کوڕی حاریثەش بوونە برا ..

حاطبی‌کوڕی ئەبوبەلتەعە و عووەییمی‌کوڕی ساعیدەش بوونە برا ..

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ڕەبیع‌یش بوونە برا ..

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود و موعاذی کوڕی جەبەل‌یش بوونە برا ..

موصعەبی کوڕی عومەیر و ئەبوئەییووبی ئەنصارییش بوونە برا ..

ئەبوحوذەیفەی کوڕی عوتبە و عەببادی کوڕی بیشریش بوونە برا ..

بیلال و ئەبوڕوەیحەش بوونە برا ..[٢٨٨]

---

[٢٨٨] ئەبوڕوەیحە ناوی عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڕڕەحمان بووە . ئەگێڕنەوە کاتێك کە عومەر لە شام ناونووسی موسڵمانانی کرد و دیوانی دروست کرد ، لەو کاتەش‌دا بیلال لە شام بوو و ، لەوێ خەریکی جیهاد بوو ، عومەر لێی پرسیی : بیلال ! مووچەکەت بۆ کێ بێ دوای خۆت ؟ وتی : وام لەگەڵ ئەبوڕوەیحەدا و هەرگیز لێی جوێ نابمەوە ، ئەویش بە بۆنەی ئەو برایەتی‌یەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوانمان دا دروستی کرد .. عومەریش لێی وەرگرت .

ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح و ئەبوطەلحەی ئەنصارییش بوونە برا ..
زوبەیری کوڕی عەووام و سەلەمەی کوڕی سەللامەی کوڕی وەقش‌یش بوونە برا ..
طەلحەی کوڕی عوبەیدوللا و کەعبی کوڕی مالیکیش بوونە برا ..
سەعیدی کوڕی زەید و ئوبەی کوڕی کەعب‌یش بوونە برا ..
عەممار و حوذەیفەی کوڕی یەمانی هاوپەیمانی نەوەی عەبدولئەشهەلیش بوونە برا ..

ئیبن سەعد دەری بڕیوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ صەد کەس لە هاوەڵانی کردوونەتە برای یەکتریی .. پەنجا هاوەڵی موهاجیریی و پەنجا ئەنصاریی .. دیارە ئەمە لە سەرەتاوە ، تا بەرە بەرە هەموو هاوەڵانی کردوونەتە برا ، بە پێی ئەوەی کە هەر کەسێ کۆچی بۆ مەدینە ئەکرد ، یان تازە موسڵمان ئەبوو ..

شایانی باسە کە ئەم برایەتی‌یە بۆ هاوکاریی و هاوڕێیەتیی و کۆمەکیی و ، میراث بردن بوو .. بەڵام کە ئیسلام بەهێز بوو حوکمی میراث‌بردن لە نێوان ئەم برایانەدا نەسخ کرا و ، میراث تەنها بۆ خزمان بوو ، ئەمەش دوای ئەوەی کە ئایەتی :

﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ﴾ ( الأنفال : ٧٥ ) هاتە خوارەوە .

ئەم برایەتی‌یە کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە نێوان موهاجیر و ئەنصاردا بەرپای کرد ، کاریگەری‌یەکی بێ‌وێنەی هەبوو .. موسڵمانەکان ئەوپەڕی یارمەتیی یەکتریان ئەدا .. بە تایبەت ئەنصار لە مێژوودا غیرەت و جوامێری‌یەکی وەهایان تۆمار کردووە کە لە مێژوودا دووبارە نەبۆتەوە .. وا مێژووی مرۆڤایەتیی لەبەر دەستی هەموو خاوەن‌ویژدانێك‌دایە ، با بزانێ چ کۆمەڵێك ئەو رەوشتە بەرزانەی لێ‌وەشاوەتەوە ؟

ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە پێش ئەم برایەتی‌یەی مەدینە ، برایەتی‌یەکی تریش لە مەککەدا لە نێوان موسڵمانەکاندا بەرپا کرا ، کە بە یەکەم برایەتیی ئیسلام ئەژمێررێت .. مەبەست لەم برایەتی‌یەش ئەوەبوو هەر برایەك لاوازە ، یان هەژارە، یان بێ‌کەسە ، لە لایەن برا دەوڵەمەندە ، بەهێزە ، کەس‌دارەکەیەوە چاودێریی بکرێ ..

ئێستەش وا چاکە بەسەر پێیی سەرنجێکی جوامێریی و نەجابەتی ئەنصار بدەین ، خوا لە هەموویان رازیی بێ ، کە چۆن مەردانە و جوامێرانە باوەشی خۆشەویستیی و سۆز و شەفەقەتیان بۆ پێغەمبەر و هاوەڵانی کۆچکردووی مەککە کردەوە ، تا هیچ کەسیان هەست بە غەریبیی و هەژاریی و دەربەدەریی نەکات ؟

هەر کەسێ بە وردیی سەرنجی رەفتاری بەرزی ئەو پیاوە نەجیبانە و ئەو شێرە ئافرەتانە بدا ، یەکجار بە لایەوە سەیر ئەبێ .. بۆچ ئەمانە مرۆڤن وەها لێبڕاون و، وەهاش لێ بووردە و خۆنەویستن ؟!

بە چیی ئەمانە بەو پلە بەرزەی رەوشت و خووی بەهەشتی‌یان گەیشتن ، کەوا قورئانی پیرۆز باسی بەخششی یەکگرتنی دڵەکانیان ئەکات ، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچیی وا لە زەویی‌دا خەرجی بکردایە بۆ یەکگرتنی موسڵمانان ، نەیئەتوانیی دڵەکانیان یەك پێ بگرێ ، کەچیی خوای گەورە یەکی پێ گرتن ، کە ئەفەرموێ :

﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ﴾ ( الأنفال : ٦٣ ) ؟

خۆ پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها چەند سەعاتێك لە تاریکیی شەودا لەگەڵ ئەنصاردا کۆ بوویەوە ، ئەویش هەندێکیان و ، لەو ماوە کورتەدا باسی ئیسلامی بۆ کردن و بەڵێن و پەیمانی لێ وەرگرتن ، ئیتر زۆر لەگەڵیانا نەژیا بوو ، تا وەك موهاجیرەکان پەروەردەیان بکات و ، کاتێکیش تەشریفی بردە ناویان ، ساڵێك کەمتر بەسەر موسڵمان بوونیان‌دا تێپەڕیی بوو ، کەچیی ئەو پیاوە قارەمان و سنگ فراوانەیان لێ دەرچوو ..

هۆی پێگەیشتنی ئەم کۆمەڵە رەببانی‌یە تەنها فەزڵ و بەخششی خوای گەورەیە ، کە بەو شێوە ناوازەیە سەروماڵیان ئەکردە قوربانی پێغەمبەر و رێبازەکەی و برا ئیمان‌دارەکانیان ..

بە شێوەیەکی بێوێنە و ناوازە باوەشی خۆشەویستیی و بەخێرهاتنیان بۆ ئازیزە کۆچکردووەکان کردەوە .. ئەوەندە بە دڵپاکیی و لێبووردنەوە پێشوازی‌یان لێ ئەکردن ، هەندێ جار ، لەبەر زۆریی ئەنصار و کەمیی میوانەکان ، ناچار ئەبوون

پەنا بۆ قورعە بەرن ، تا میوانیان بەر بکەوێ .. تا خزمەتیان بەر بکەوێ .. تا خێر و ئیحسان و چاکەیان دەست بکەوێ ..

ئەو کۆمەڵە خواناسە لە خۆنەویستیی و ئیثار و ، لە سەخاوەت و لێبووردەیی و ، لە سنگ فراوانیی‌دا ، کاری وەهایان لێ وەشایەوە ، کە تا ئێستاش ، دوای پتر لە هەزار ساڵ ، دەستە بە دەستە ، چین و بەرەکان ، لە هەموو ناوچەیەکی سەرزەوییدا ، بەوپەڕی فەخر و شانازی‌یەوە ، باسی لێوە ئەکەن و ، بە چاوی ڕێزەوە سەیری ئەو مرۆڤە فیداکارە خۆبەخشانە ئەکەن .. کوا مێژووی مرۆڤ شتی وەهای تێدایە ؟!

بوخاریی لە صەحیحەکەی دا ، لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو و سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاریی ئەکاتە برا .. جا سەعد دێت و پێشنیاری ئەوە ئەکات تا ماڵ و سامانەکەی لەگەڵ عەبدوڕڕەحمان‌دا بکا بە دوو کەرتەوە و ، پێیشی ئەڵێت : سەیر بکە بزانە هەردوو ژنەکەم کامیانت بە دڵە تا وازی لێ بهێنم بۆت و ، کە ماوەی عیددەی تەواو بوو مارەی بکە .. عەبدوڕڕەحمان بەوە ڕازیی نەبوو و وتی : خوای گەورە فەڕ و بەرەکەت بخاتە ماڵ و منداڵتەوە . تەنها بازاڕم پیشان بدە .. ئەویش بازاڕی پیشان دا و ، عەبدوڕڕەحمان دەستی بە کڕین و فرۆشتن کرد ، هەتا پارە و پووڵی هاتە مشت و ، ئافرەتێکی ئەنصاریی مارە کرد لەسەرکێشی ناوکە خورمایەك زێڕ . ئەوەبوو پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی بەسەردا دا کە ئەگەر بە سەربڕینی مەڕێکیش بووە ، با دەعوەتێك بۆ موسڵمانان بکات کە فەرمووی : (( أَوْلِمْ ولو بشاةٍ )) .

بەم شێوەیە سەعدی کوڕی ڕەبیع هەنگاوێکی بێ‌وێنەی لە خۆنەویستن‌دا نا.. دابەش کردنی ماڵ و سامان و ژن لەگەڵ برای دینیی‌دا .. هەروەها عەبدوڕڕەحمانیش کارێکی پیرۆزی ئەنجام دا .. پشت نەبەستن بە خێر و خێرات و یارمەتیی و کۆمەکیی .. بەڵکو کاسپیی‌کردن و کارکردنی مایەی سەربەرزیی .. تا خوای گەورە بەرەکەتی بەسەردا هەڵ ڕێژا و ، بووە دەوڵەمەندی دەوڵەمەندان ، لە حکوومەتی داد و یەکسانیی‌دا ..

نەك تەنها سەعد ئەم سنگ فراوانی‌یەی لێ بووەشێتەوە ، بەڵکو ئەنصار هەر هەموویان ئەمە تەبیعەتیان بوو .. هەموو شەیدای دینی تازە بوون و ، ئاواتیان ئەوە بوو سەروماڵیان بکەنە قوربانیی بۆ ڕەزامەندیی خوا .. ئەوەبوو ئەنصار

هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خـوا ﷺ و وتیـان : دارخورماکـان لـە نێوان ئێمـە و براکانمان‌دا دابەش بکە .. بـۆ ئـەم داوایـەیان پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕەزامەنـدیی نەنواند .. ئەمجار چوون یەخـەی کـۆچ‌کـەرەکانیان گـرت و ، وتیـان : وەرن لـەناو باخەکان‌دا کار بکەن و یارمەتییمان بدەن ، تا لە بەروبووم‌دا هاوبـەش بـین .. تـا بەرهەمی باخەکان بەش بکەین . موهاجیرەکانیش وتیان : (( سمعنا وأطعنـا )) رواه البخاري في صحيحه . وتیان : بە چاوان .

هـەروەها بوخـاریی لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیـك‌ەوە خـوا لێـی ڕازیـی بـێ ڕیوایەتی‌کردووە و وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە ئەنصار کرد تا ناوچـەی بەحرەین‌یان بۆ بڕ بدات . وتیان : شتی وەها ناکـەین ، هـەتا ئەوەنـدەش بـۆ بـرا موهاجیرەکانمان بڕ نەدەیت . فـەرمووی : (( إما لا ، فاصبروا حـتى تلقـوني ، إنـه سيصيبكم بعدي أَثَرة )) . فەرمووی : ئەگەر ئەمە قبووڵ ناکەن ، ئەوا ئارام بگـرن هەتا لە قیامەت‌دا پێم ئەگەنەوە ، چـونکە دوای خـۆم تووشـی کەسـانێکی هـەل پەرست و چاوچنۆك ئەبن ..

پێغەمبەری خوا ﷺ بە بڕدانی ناوچەی بەحرەین بۆ ئەنصار ئەی‌ویسـت هەنـدێ پاداشتی ئەو خزمەت و چاکە و دڵدانەوە و جێ‌کردنەوەیەی ئەنصـار بداتـەوە کـە بەرامبەر بە خۆی و بە هاوەڵە موهاجیرەکان کردیان ، کەچیی ئەنصار بەرزتر لەوە بیریان ئەکردەوە و ، بڕیاریان دا کارەکەیان تێکەڵ بە هیچ بەرژەوەندی‌یەکی دنیایی نەکەن و ، بە پاك و پوختـەیی بـۆ ڕەزامەنـدیی خـوا بێـت و ، چـاوەڕوانی هـیچ پاداشتێکیش نەکەن ..

هەروەها دەربارەی خۆنەویستیی ئەنصار با سەرنجێکی ئەم هەڵوێستە بەرزەشیان بدەین : عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێ‌یان ڕازیی بـێ ئەگێڕێتـەوە و ئـەڵێت : ڕۆژی تێك شکانی جوولەکەی نەضیـر پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەنصاری فـەرموو : (( إنْ شئتمُ قسمتم للمهاجرين من أموالكم وديار كم ، وتشار كوهم في هذه الغنيمة ، وإن شئتم كانت لكم أموالكم وديار كم ولم نُقَسِّمْ لكم شيئاً من الغنيمة )) . فەرمووی: ئەگەر پێتان خۆش بێ لە ماڵ و سامانتان بەشی موهاجیرەکان ئەدەین و ، ئێوەش لەم دەست‌کەوتی جەنگەدا لەگەڵیان بەشدار ئەبن .. ئەگەر پێشتان خۆش بێ مـاڵ و سامانی خۆتان بۆ خۆتان و ، لە دەست‌کەوتی جەنگ بەشتان نـادەین . ئەنصـار

دیسان به بەرزتر بیریان کردەوە و وتیان : بەڵکو ماڵ و سامانەکەمان لەگەڵیان بەش ئەکەین و ، دەستکەوتەکەش ئەدەین بەوان !!

بەڵێ ، ئەمانە مەلائیکەت بوون لە بەرگی مرۆڤدا ..

جا با شارەزایانی مێژوو بێن و نموونەیەکی تری ئەم هەڵوێستە بەرزانەی مێژووی ئیسلامان نیشان بدەن ، تا بزانین چ دینێك بەرەی وەها بەرێز و خۆنەویستی پێ گەیاندووە ؟ خۆ ئەگەر سەرنجی مێژووی دوور و درێژی مرۆڤایەتیی بدەین ئەبینین چیی زوڵم و ستەم لە مرۆڤ کراوە و ، چیی مافی بنەڕەتیی مرۆڤ پێ شێل کراوە ، هۆی هەر هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەنانییەت .. بۆ خۆخۆش ویستن .. بۆ ماددەپەرستیی .. بۆ پلە و پایە دەستخستن .. بۆ خۆشویستنی دنیا .. بۆ تۆڵەسەندن و ، ژێربارکردنی مرۆڤە بەستەزمانەکان ، تا کەسانێکی زۆر و زەبەندە رەنج بدەن و عارەق برێژن و ، چینێکی ستەمکاری خوێنمژ بیخۆن ..

بەڵێ ، ئەنصار ئەوەندە بەڕێز و خۆنەویست بوون .. ئەوەندە سەخیی و خزمەت گوزار بوون ، بوونە خۆشەویستی خوا .. بە رادەیەك کە ئایەتی قورئان بێنە خوارەوە و ستایشی ئەوان بکەن و تا رۆژی قیامەت موسڵمانان لە پایەی بەرزیان ئاگادار بن .. ئەوەتا قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ ( الحشر : ٩ )

بە لای پێغەمبەری خوایشەوە ﷺ ئەنصار زۆر بەڕێز بوون ، بۆیە ئەیفەرموو :

(( لولا الهجرة لكنت امرءاً من الأنصار )) .

ئەیفەرموو : ئەگەر لەبەر پاداشتی کۆچ کردن نەبوایە خۆم بە پیاوێك لە ئەنصار ئەژمارد . هەتا خۆشویستنی ئەنصاری بە نیشانەی ئیمان و ، رق لێ بوونیشیانی بە نیشانەی نیفاق ئەژمارد کە ئەیفەرموو :

(( آية الإيمان حب الأنصار وآية النفاق بغض الأنصار )) .

هەروەها دەری ئەبڕیی کە ئیماندار ئەنصاری خۆش ئەوێن و ، مونافیقیش رقی لێیان ئەبێتەوە . جا هەرکەسێ ئەوانی خۆش بوێ ، ئەوا خواش ئەو کەسەی

خۆش ئەوێت و ، هەر کەسیش رقی لێیان بێت ئەوا خواش رقی لەو کەسە ئەبێت، کە ئەیفەرموو :

(( الأنصار لا يحبهم إلا مؤمن ، ولا يبغضهم إلا منافق ، فمن أحبهم أحبه الله ، ومن أبغضهم أبغضه الله )) .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریی موسڵمانانی کرد تا بە چاکە لەگەڵ ئەنصاردا هەڵس و کەوت بکەن .

ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی رازیی بێ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ : ئەبوبەکر و عەبباس خوا لێیان رازیی بێ بە لای کۆڕێکی ئەنصاردا تێ پەڕین ئەبینن ئەگرین. ئەبوبەکر فەرمووی : بۆ ئەگرین ؟ وتیان : بیرمان لە دانیشتنمان کردەوە لە کۆڕی پێغەمبەردا ﷺ . ئەبوبەکر چووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و لە هەواڵەکە ئاگاداری کرد . ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ بە قوماشێك سەری بەستبوو و ، هاتە دەرەوە و ، سەرکەوتە سەر مینبەر ، کە دوای ئەو جارە ئیتر سەرنەکەوتەوە سەری . ( دیارە ئەمە لەو نەخۆشییەیدا بووە کە پێی کۆچی دوایی کردووە ) . سوپاس و ستایشی خوای کرد پاشان فەرمووی : (( أوصيكم بالأنصار فإنهم كَرِشي وعيبتي ، وقد قضوا الذي عليهم ، وبقي الذي لهم ، فأقبلوا من محسنهم وتجاوزوا عن مسيئهم )) . رواه البخاري .

ئامۆژگاریی کردن کە لەگەڵ ئەنصاردا چاك بن ، چونکە بە جەرگ و هەناوی خۆی لە قەڵەمیان ئەدا و ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێ هێناوە ، بەڵام هێشتا پاداشتیان نەدراوەتەوە .. جا با موسڵمانان چاکەی چاکەکاریان وەربگرن و چاوپۆشییش لە خراپکاریان بکەن ..

ئەمە دەرهەق بە ئەوس و خەزرەج کە عەرەبی مەدینە بوون و ، موسڵمانیش بووبوون .

هەروەها بەرامبەر بە جوولەکەی مەدینە کارێکی یەکجار مەزنی ئەنجام دا .. ئەوەبوو دۆستایەتیی لەگەڵ کردن .. رێزی لێ گرتن .. پەیمانی دۆستانەی لەگەڵ بەستن تا بە هەردوو لایانەوە پارێزگاریی لە مەدینە بکەن و ، نەهێڵن هیچ کەس دەستدرێژیی بکاتە سەریان .. رێزی لە خۆیان و دینیان گرت .. لە سەروماڵیان بێخەمی کردن ، وەك لە بەڵگەنامەکەی مەدینەدا دەرئەکەوێت .. بەڵام جوولەکە کۆمەڵێك نەبوون کە بە پێی خۆیان خەریکی خواپەرستیی بن ، بەڵکو کۆمەڵێکی

دنیایی هەڵپەرست و بەرژەوەندییپەرست بوون .. هەموو لێهاتن و زیرەکییەکی خۆیان بۆ پووڵ کۆکردنەوە بەکار ئەهێنا .. هەوڵیان ئەدا بە بازرگانیی پارە و پووڵێکی زۆر دەست بخەن .. چیی پارە و پووڵیان هەبوو ئەیان دا بە عەرەبەکان بە سوو .. بەمە پارەیەکی زۆریان لەو خەڵکە ئەکێشایەوە .. پارەیان بە سوو ئەدا بە سەرۆك خێڵەکان و ئەوانیش لە شتی هیچ و پووچ دا خەرجیان ئەکرد ، خۆ ئەگەر پارەکە ئامادە نەبوایە ئەوا زەویی و زار و باخ و باخاتیان بە رەهن وەرئەگرت و ، دوای چەند ساڵێك ئەبوونە موڵکی جوولەکە ..

لە لایەکی ترەوە جوولەکە خاوەن فێڵ و تەڵەکە بوون .. خراپکار و نیازپیس بوون .. حەزیان لەوە بوو دژایەتیی و ناکۆکیی بخەنە نێوان تیرە عەرەبەکانەوە .. هەر تیرەیەك لە جوولەکە خۆی بە هاوپەیمان و پاڵ پشتی چەند تیرەیەکیان لە قەڵەم ئەدا ، بەڵام لە راستییدا یارییان پێ ئەکردن و ، بە جەنگیان ئەدان .. لە کاتی جەنگ و هەراشدا بە سوو قەرزیان ئەدانێ ، تا توانای کوشتاری یەکتریان زۆرتر بێ و ، لە هەمان کاتیشدا بن بە ژێر قەرزەوە و ، لە ئەنجامی زیادکردنی قەرزەکەشدا ماڵ و سامانیان لێبستێنن و ، لە لایەکی تریشەوە تا خۆیان سەلامەت بن و کەس جەنگیان پێ نەفرۆشێ و بە سوو سامانێکی زۆر پێکەوە بنێن ..

لە مەدینەدا ، لە پاڵ ئەوس و خەزرەجدا سێ تیرەی جوولەکە ئەژیان :

١ ـ نەوەی قەینوقاع ، کە هاوپەیمانی خەزرەج بوون و ، خانوو و بەرەیان لەناو شاردا بوو ..

٢ ـ نەوەی نەضیر .

٣ ـ نەوەی قورەیظە ، ئەم دوانەش هاوپەیمانی ئەوس بوون و خانوو و بەرەیان لە دەوری مەدینەدا بوو .

ئەم سێ تیرەیە هەمیشە ئاگری جەنگی نێوان ئەوس و خەزرەجیان خۆش ئەکرد، هەتا ئەوانیش لەگەڵ هاوپەیمانی خۆیاندا بەشداریی جەنگی بوعاثیان کردووە .

هەر لەیەکەم رۆژەوە کە ئیسلام هاتە مەدینە ، جوولەکە خۆیان بۆ دژایەتیی پێغەمبەری چاوەڕوانکراو یەكلایی کردەوە ، چونکە لەگەڵ بەرژەوەندیی ئەواندا نەئەگونجا ..

ئەوان خۆیان وەها ئامادە کردبوو ببنە خاوەنی دوورگە .. بەوەی کە هۆز و تیرە عەرەبەکان بە جەنگ بێنن و ، خۆیان سامان کۆ بکەنەوە .. کاتێکیش پێغەمبەری ئاخرزەمان ئاشکرا بوو ، خێرا خۆیان شوێنی بکەون و ، هەموو دوورگە داگیر بکەن و لە دانیشتوانی پاکی بکەنەوە ..

بەلاّم کە دی‌یان وا دوا پێغەمبەر لە خۆیان هەلّنەکەوت ، بەلّکو لە ناو عەرەبەکان‌دا هەلّ کەوت و ، خۆیان شوێنی نەکەوتن ، بەلّکو ئەوس و خەزرەج پێشیان کەوتن ، ئیتر کەوتنە بیرکردەونەیەکی تر .. چونکە ئەوەی ئەوان بە تەمای نەبوون و ، حیسابیان بۆ نەکردبوو ، وا یەخەی پێ گرتن ..

ئەم دینە تازەیە عەرەبەکان شوێنی کەوتوون و ، تیرەکان یەك پێ ئەگرێ و ، دوژمنایەتیی چەند سالّەیان ریشەکەن ئەکات و ، هەموو رەوشتێکی چاکیان لەناودا بلاّو ئەکاتەوە و ، هەرچیی رەفتارێکی خراپ و ناشیرین هەیە لێ‌یان دوور ئەخاتەوە و ، فێری حەلاّلّخۆریی و ، کۆکردنەوەی سامانی پاك و خاوێنیان ئەکات و ، ئەو کاتە ئوممەتێکی بە هێزی وەهایان لێ دەرئەچێ ، کە نەك بە جوولەکە لە ناو نابرێن بەلّکو هیچ هێزێکی سەرزەوییش چاریان ناکات ..

کە تیرە و هۆزە عەرەبەکان بەم حالّە گەیشتن ، ئەوا بیرێك لەو هەموو ستەمە ئەکەنەوە کە پێش موسلّمان بوونیان جوولەکە لەوانی سادەی کردووە .. ئەوانی بە جەنگ داوە و ، لێ‌یان کوژراوە و ، سامانێکی زۆریان خەرج کردووە و ، مالّ و سامان و باخ و باخاتێکی زۆریان جوولەکە لە بریی قەرز و سوو بردوویەتی .. خۆ ئەگەر ئیسلام نەهاتبایە و ، لەو ستەم و پیلانە ژەهراوی‌یانە رزگاری نەکردبانایە ، ریشەیان دەرئەهات و ، بە خۆشیان نەئەزانیی .. کە تیرە و هۆزە عەرەبەکان ئەمەیان زانیی و ، ئەو دەسەلاّتەشیان هەبوو ئەوا تۆلّەی خۆیان لە جوولەکە ئەکەنەوە و ، چیی سەروەت و سامان و مولّکیان زەوت کردووە لێ‌یان ئەسێننەوە ..

لەبەر ئەمانە هەر لە یەکەم رۆژدوە جوولەکە بڕیاری دژایەتیی ئیسلامیان دا ئەگەر چیی ئاشکرایان نەئەکرد ، وەك خاتو صەفیەی دایکی ئیمانداران باسی هەلّوێستی باوکی و مامەی بۆمان گێڕایەوە و ، وەك ئەو هەلّوێستەشیان کە لە کاتی موسلّمانبوونی عەبدوللاّی کوڕی سەلام‌دا نواندیان ..

بەلاّم لەگەلّ هەموو ئەمانەش‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێی ئەو بەرنامەیەی کە خوای گەورە بۆی دارِێژا بوو بڕیاری دا ئەوپەڕی نەرم و نیانیی و سازیی لەگەلّ جوولەکەدا بنوێنێ .. پێی خۆش بوو ناوچەکە لە ئاسایش و هێمنی‌دا بژیی و ، هەموو کەسێکیش بە دلّی خۆی بەرنامەی ژیانی خۆی هەلّ ببژێرێ و ، دەست درێژیی نەکرێتە سەر مافی هیچ کەس ..

بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمان نامەیەکی نووسیی تا مافی هەموو لایەك پارێزراو بێت کە بەم شێوە بوو :

(( بسم الله الرحمن الرحيم . هذا كتابٌ من محمد النبيِّ الأُميِّ بين المؤمنينَ والمسلمينَ من قريش ويثرب ، ومن تبعهم فلحق بهم ، وَجاهدَ معهم ، أنهم أمةٌ واحدةٌ من دونِ الناسِ [٢٨٩] : المهاجرون من قريش على ربعتهم يتعاقلون بينهم ، وهم يفدون عانيهم بالمعروف والقسط، وبنو عوف على ربعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى ، وكل طائفة تفدي عانيها بالمعروف والقسط بين المؤمنين ، ثم ذكر كل بطن من بطون الأنصار وأهل كل دار :

بني ساعدة ، وبني جشم ، وبني النجار ، وبني عمرو بن عوف ، وبني النبيت [٢٩٠] ... إلى أن قال :

وإن المؤمنين لايتركون مفرحاً بينهم أن يعطوه بالمعروف في فداء وعقل [٢٩١] ، ولا يحالف مؤمن مولى مؤمن دونه ، وأن المؤمنين المتقين على من بغى منهم ، أو ابتغى دسيعة ظلم أو إثم أو عدوان ، أو فساد بين المؤمنين ، وأن أيديهم عليه جميعهم ، ولو كان ولد أحدهم [٢٩٢] ، ولا يقتل مؤمن مؤمناً في كافر ، ولا ينصر كافراً على مؤمن

---

[٢٨٩] ئیمان‌داران و موسلّمانانی قورەیش و یەثریب و ئەوەش کە هاتۆتە ریزیانەوە و لەگەلّیان جیهاد بکات ، یەك ئوممەتن ..

[٢٩٠] یەك بە یەك هەموو هۆزەکانی ناو بردن کە هەر یەکەیان خوێن و فیدیەی کەس وکاری خۆیان ئەدەن ..

[٢٩١] هەروەها ئیمان‌داران دەست بەرداری کەسێك نابن کە بووە بە ژێر قەرزەوە و مالّ و منداڵێکی بەسەردا کەوتووە ، بەلّکو بە شێوەیەکی چاك بۆ فیدیە و بۆ خوێن یارمەتیی ئەدەن .

[٢٩٢] هەروەها ئیمان‌دارە خاوەن تەقواکان دژی هەر کەسێ ئەوەستن کە دەست‌درێژی‌یان بکاتە سەر ، یان ستەم و تاوان و دژایەتی‌یان بەرامبەر بکات ، یان نێوان ئیمان‌داران تێك بدات .. هەموو ئیمان‌داران دژی ئەو کەسە ئەوەستن ، ئەگەرچیی کوڕی یەکێ لە ئیمان‌داران بێ .

، وأن ذمة الله واحدة يجير عليهم أدناهم ، وأن المؤمنين بعضهم موالي بعض دون الناس ..[٢٩٣] [٢٩٤]

وأنه من تبعنا من يهود فإن له النصر والأسوة غير مظلومين ، ولا متناصرعليهم ، وأن سلم المؤمنين واحدة ، لا يسالم مؤمن دون مؤمن في قتال في سبيل الله إلا على سواء وعدل بينهم ، وأن كل غازية غزت معنا يعقب بعضها بعضاً ، وأن المؤمنين يبيء بعضهم بعضاً بما نال دماءهم في سبيل الله ، وأن المؤمنين المتقين على أحسن هدى وأقومه .[٢٩٥]

وأنه لا يجير مشرك مالاً لقريش ولا نفساً ، ولا يحول دونه على مؤمن ، وأنه من اعتبط مؤمناً قتلاً عن بينة فإنه قود به إلا أن يرضى ولي المقتول ، وأن المؤمنين عليه كافة ، ولا يحل إلا قيام عليه .[٢٩٦]

وأنه لا يحل لمؤمن أقر بما في هذه الصحيفة ، وآمن بالله واليوم الآخر أن ينصر محدثاً ولا يؤويه ، وأن من نصره أو آواه فإن عليه لعنة الله وغضبه يوم القيامة ، ولا يؤخذ منه صرف ولا عدل ، وأنكم مهما اختلفتم فيه من شيء فإن مرده إلى الله عزوجل ، وإلى محمد ﷺ .[٢٩٧]

وأن اليهود يتفقون مع المؤمنين ما داموا محاربين ، وأن يهود بني عوف أمة مع المؤمنين . لليهود دينهم ، وللمسلمين دينهم ومواليهم وأنفسهم إلا من ظلم وأثم فإنه لا يوتغ إلا نفسه وأهل بيته . وأن ليهود بني النجار وبني الحارث ، وبني ساعدة ، وبني جشم ، وبني الأوس ، وبني ثعلبة ، وجفنة ، وبني الشُطَيبة مثل ما ليهود بني عوف ،

---

[٢٩٣] ئیمان دارێك لەسەر كافرێك نابێت ئیمان دارێك بكوژێتەوە .. هەروەها پشت گیریی كافرێك ناكات دژی ئیمان دارێك .

[٢٩٤] بچووكترین ئیمان دار بۆی هەیە پەنای هەر كەسێ بدات و ، ئیمان داران لە نێوان خۆیان دا پشت و كەسی یەكترن .

[٢٩٥] هەر جوولەكەیەكیش شوێن ئەم پەیمان نامەیە بكەوێت و لەگەڵ موسڵمانان دا بە پاكیی هەڵس و كەوت بكات ، ئەوا كۆمەكیی ئەكرێت و ، ستەمی لێ ناكرێ و ، پشت گیریی لە دوژمنی ناكرێ . هەركەسیش یارمەتیی موسڵمانان بدات خزمەتی ئەویش لە بەرچاو ئەبێت ..

[٢٩٦] بەڵام هیچ موشریكێك بۆی نیە پەنای سەر وماڵی هیچ قورەیشی یەك بدات ، یان لە ئیمان دارێك بی پارێزێت . هەر كەسیش ئیمان دارێك بكوژێ ئەوا ئەكوژرێتەوە ، مەگەر وەلیی كوژراوەكە رازیی بكرێ و هەموو ئیمان دارانیش بە جارێك دا دژی ئەوەستن ..

[٢٩٧] هەر ئیمان دارێك كە دانی بەم پەیمان نامەیەدا نابێ و ئیمانی بە خوا و بە قیامەت هێنا بێ ، بۆی حەڵاڵ نیە جێی تاوان بارێك بكاتەوە ، یان پشت گیریی لێ بكات . خۆ هەر كەسێ جێی بكاتەوە یان پشت گیریی لێ بكا، ئەوا ئەكەوێتە بەر لەعنەت و غەزەبی خوای گەورە و ، نە تەوبە و نە فیدیەشی لێ وەرناگیرێن و ، هەر ناجۆری یەكیش كەوتە نێوان موسڵمانان پێویستە بی گێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ .

سووکایەتیی‌کردن بە موسڵمانان ، تا ئەوەبوو موسڵمانان لێیان هاتنە دەست و زەلیلی دنیا و قیامەتیان کردن ..

ئەم نەخشە جوانە پڕ حیکمەتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە هۆی بەرپابوونی کۆمەڵگەی ئیسلامیی ڕێك‌وپێك ، تا لەژێر دەستی ئازیزدا فێری برایەتیی و ، دۆستایەتیی و ، چاوپۆشیی و ، بەخشین و ، خواپەرستیی بن .. پیاوێك پرسیاری کرد : چ کردەوەیەکی ئیسلام چاکە ؟ فەرمووی :

(( تطعم الطعام ، وتقريء السلام على من عرفت ومن لم تعرف )) .[٣٠١]

فەرمووی : خۆراك بەخشین و، سەلام‌کردن لەوەی ئەی‌ناسیت و ، لەوەش کە نای‌ناسیت .

عەبدوڵڵای کوڕی سەلامیش ئەی وت : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە هاتم بۆ لای ، کە سەرنجی دەم و چاویم گرت ، زانیم ئەو دەم وچاوەی ئەو لە دەم وچاوی پیاوی درۆزن ناکات . یەکەم قسەی فەرمووی :

(( يا أيها الناس ! أفشوا السلام ، وأطعموا الطعام ، وصِلوا الأرحام ، وصلوا بالليل والناس نيام ، تدخلوا الجنة بسلام )) .[٣٠٢] ئەی‌فەرموو : خەڵکینە ! سەلام و ئاشتیی پەخشان بکەن و ، خۆراك ببەخشن و ، سیلەی ڕەحم بەجێ بهێنن و ، بە شەودا ، کاتێك کە خەڵکیی خەوتووە نوێژ بەجێ بهێنن ، بەبێ وەی ئەچنە بەهەشتەوە .

هەروەها ئامۆژگاریی ئەکردن لەگەڵ دراوسێ‌کانیان دا چاك بن ، چونکە هەر کەس دراوسێ‌کەی لێی ئەمین نەبێ ، ناچێتە بەهەشتەوە ، کە ئەی‌فەرموو :

(( لا يدخل الجنة من لا يأمن جاره بوائقه )) .[٣٠٣]

ناونیشانی موسڵمانی ڕاستەقینەی هەڵ ئەدا کە بریتیی یە لە سەلامەتیی موسڵمانان لە زمان و دەستی ، کە ئەی‌فەرموو :

(( المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده )) .[٣٠٤]

ئامۆژگاریی ئیماندارانیشی ئەکرد تا ئەوەی بۆ خۆیان پێیان خۆشە ، با بۆ خوشك و برای ئیمانداریشیان پێیان خۆش بێ ، تا ببنە خاوەنی ئیمانی کامڵ، کە ئەی فەرموو : (( لايؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه )) .[٣٠٥]

---

[٣٠١] صحيح البخاري : ١/ ٦ ، ٩ .
[٣٠٢] رواه الترمذي وابن ماجه والدارمي . مشكاة المصابيح : ١ / ١٦٨.
[٣٠٣] رواه مسلم ، مشكاة المصابيح : ٢ / ٤٢٢ .
[٣٠٤] صحيح البخاري : ١ / ٦ .

دەربارەی یەك پارچەیی ئیماندارانیش دەری ئەبڕێ کە ئیمانداران وەك لاشەیەك وەهان کە هەر بەشێکی ئێش بکات ، هەموو بەشەکانی تریش ئێش ئەکەن کە ئەفەرموێ :

(( المؤمنون کرجل واحد إن اشتکی عینه اشتکی کلّه ، وإن اشتکی رأسه اشتکی کلّه )) . [٣٠٦]

هەروەها ئیمانداران بە بینایەك لە قەڵەم ئەدات کە هەر خشتێکی ئەندامێکی کۆمەڵەکەیان بێت و بە توندیی پاڵیان بە یەکەوە دابێت کە ئەفەرموی : (( المُؤمِنُ للمُؤمِنِ کالبُنیانِ یَشدُّ بَعضُهُ بَعضاً )) . [٣٠٧]

هەروەها لە رقوقین و حەسوودیی و پشتلەیەك هەڵکردن و لێك دابڕان دوورەپەرێزییان ئەکات کە ئەفەرموێ : (( لا تباغضوا ، ولا تحاسدوا ، ولا تدابروا ، وکونوا عباد الله إخواناً ، ولا یحل لمسلم أن یهجر أخاه فوق ثلاثة أیام )) . [٣٠٨]

هەروەها موسڵمانان بۆ هاریکاریی و یارمەتیی یەکتر هەڵ ئەنێ کە ئەفەرموێ: (( المسلمُ أخو المسلمِ لا یظلمُهُ ولا یُسلمُهُ ، ومَن کان في حاجة أخیه کان الله في حاجته ، ومن فرّج عن مسلمٍ کربةً فرّجَ اللهُ عنهُ کُربَةً من کرباتِ یومِ القیامةِ ، ومَن سَتَرَ مُسلماً سترهُ اللهُ یومَ القیامة )) . [٣٠٩]

سۆز و بەزەیی لە دڵی موسڵماناندا ئەڕوێنێ بە هیوای دەست خستنی سۆز و بەزەیی خواوە، کە ئەفەرموێ : (( إرحموا من في الأرض یرحمْکم مَن في السماء )) . [٣١٠]

خەمخواردنی خەڵکیی ترو دڵسۆزیی بۆ ئادەمییەکان، بە تایبەت بۆ دراوسێ ، رەوشتێکی بەرزە ، بۆیە ئیماندار ئەوە نیە کە خۆی تێر بێ و براکەی لە پاڵیا برسیی و ئاتاج بێ : (( لیسَ المؤمنُ بالذي یَشبَعُ وجارُهُ جائعٌ إلی جانبه )) . [٣١١]

بە هەزارەها فەرموودەی شەریف ، دوا بە دوای ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان ، ئامۆژگاریی ئیماندارانیان ئەکرد ، تا ئەو کۆمەڵە نایابە و ، ئەو شارستانیەتە

---

[٣٠٥] صحیح البخاري : ١ / ٦ .

[٣٠٦] رواه مسلم ، مشکاة المصابیح : ٢ / ٤٢٢ .

[٣٠٧] متفق علیه ، مشکاة المصابیح : ٢ / ٤٢٢ ، صحیح البخاري : ٢ / ٨٩٠ .

[٣٠٨] صحیح البخاري : ٢ / ٨٩٦ .

[٣٠٩] متفق علیه مشکاة المصابیح : ٢ /٤٢٢ .

[٣١٠] سنن أبي داود : ٢ / ٣٣٥ ، جامع الترمذي : ٢ / ١٤.

[٣١١] رواه البیهقي في شعب الأیمان ، مشکاة المصابیح : ٢ / ٤٢٤ .

مەزنە بێوێنەیە لە مێژوودا هاتنە کایەوە و چەندین ملیار مرۆڤی چاك‌ویست پێ گەیشتن و تا ئێستاش ئەو هەڵمەتە چاکەخوازی‌یە هەر بەردەوامە و ، دەستە بە دەستە مرۆڤەکان هیدایەت وەرئەگرن و ، دێنە سەر رێبازی ئازیز و ، دەست لە هەموو خراپەیەك هەڵ ئەگرن و ، هەموو توانا ولێ‌هاتنێکیشیان بۆ خزمەتی مرۆڤایەتیی ئەخەنە کار ..

ئەوەبوو لە مانگی شەووالی ساڵی یەکەمی کۆچیی‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ عائیشەی هاوسەری گواستەوە ، کە لەوەوپێش و لە تەمەنی شەش تا حەوت ساڵیی‌دا خوازبێنیی لە باوکی کرد و ، کاتێکیش کە گواستیەوە نۆ ساڵان بوو .. شایانی باسە کە لەناو هاوسەرانی پێغەمبەردا ﷺ تەنها عائیشە کچ بووە و ، پێش داواکردنی ، جیبریل سەلامی‌لێ بێ ، لەسەر پارچە ئاوریشمێکی صەوز وێنەی عائیشەی پیشان داوە ..

بوخاریی بە سەنەدی خۆی لە صەحیحەکەی‌دا لە عائیشەوە ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە : (( أُريتُك في المنامِ مَرَّتَين ، إذا رجل يحملك في سَرَقة من حرير فيقول : هذه امرأتُك ، فأكشفها فإذا هي أنت ، فأقول : إن يكن هذا من عند الله يمضه )) . پێی فەرموو : لە خەوم‌دا دوو جار تۆیان پیشان دام . پیاوێك لەناو پارچەیەك ئاوریشم‌دا تۆی هەڵ گرتبوو و ئەی‌وت : ئەمە هاوسەرەکەتە . منیش کە سەرم هەڵ ئەدایەوە ، ئەبینم تۆی و ، ئەم وت : ئەگەر ئەمە لەلایەن خواوە بێ خۆی جێ بەجێی ئەکات .

کاتێکیش کە پێغەمبەر ﷺ لە باوکی خوازبێنیی کرد فەرمووی : من براتم . ( واتە بۆت ناشێ ) . پێغەمبەر ﷺ ئەی‌فەرمووی : (( أنت أخي في دين الله وكتابه، وهي لي حلال )) . رواه البخاري . فەرمووی : بەڵێ تۆ برای دینییمی ، بەلاّم کچەکەت بۆم حەلاڵە .

عائیشە لە خزمەت ئازیزدا، لەخانەی پێغەمبەرایەتیی‌دا پەروەردە بوو .. بۆیە جوانترین پەروەردەی وەرگرت و ، خاوەنی بەرزترین رەوشتیش بوو .. بەو جۆرە بوو کە دڵی پێغەمبەر پێی رازیی بێ ، بە شێوەیەك کە لە هەموو هاوسەرەکانی تری بەلایەوە خۆشەویست بوو .

عائیشە ئافرەتێکی ژیر و بەسەلیقە و زانا بوو .. فەرموودەی لە پێغەمبەر و لە باوکی و هاوەڵانی تریشەوە ریوایەت کردووە .. زۆرێك لە هاوەڵان و تابیعی‌یان

فەرموودەیان لێ وەرگرتووە و ، زۆرێك لە حوكە شەرعی یەكان لەوەوە وەرگیراون، بە تایبەت هەڵس وكەوتی پێغەمبەر ﷺ لەماڵەوە و ، لەگەڵ هاوسەرەكانی دا ..

مەسرووق ئەڵێت : چاوم لە هاوەڵە بەساڵا چووەكانی موحەممەد بووە كە دەربارەی ( فەرائیض ـ میرات بەش كردن ) پرسیاریان لە عائیشە كردووە .

ئەبومووسای ئەشعەرییش خوا لێی رازیی بێ ئەڵێت : ئێمەی هاوەڵانی موحەممەد ﷺ هەر باسێكمان بەلاوە روون نەبوایە ، كە پرسیارمان لە عائیشە ئەكرد ئەو بە چاكیی ئەیزانیی .

عائیشە ئەوەندە پایەدار بوو بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ لە دوا نەخۆشیی دا ماوەی لە هاوسەرەكانی تری خواست تا لە ماوەی ئەو نەخۆشی یەی دا لە ماڵی عائیشە بمێنێتەوە .. ئەوەبوو عائیشە خەریكی خزمەت كردنی بوو تا كۆچی دوایی كرد سەری لەسەر سنگی عائیشە بوو . خوا لێی رازیی بێ .

دەربارەی شەرعییەتی بانگ دانیش ، ئەوەبوو لە شەوی ئیسرا و میعراج دا ، پێش كۆچ كردن ، لە شەو و رۆژێك دا پێنج نوێژ لەسەر ئوممەتی ئیسلام فەرز كران .. بۆ ئەمە موسڵمانەكان نوێژە فەرزەكانیان بەجێ ئەهێنا ، بەڵام لەبەر بارودۆخی مەككە ، كە كافرەكان زاڵ بوون و ، ئیماندارن لاواز بوون ، كە نەئەكرا بە ئاشكرا بانگی بۆ بكەن ، بانگیان نەئەدا ، تا ئەوەبوو كۆچ بۆ مەدینە كرا و ، موسڵمانەكان هەروا نوێژیان ئەكرد و بانگیان نەئەدا ..

جا كە پێغەمبەر و موسڵمانەكان لە مەدینەدا لە خۆیان و لە دینەكەیان بێ خەم بوون و ، كەسێ نەبوو دەست بهێنێتە رێیان و ، حوكمە شەرعی یەكان ئەهاتنە خوارەوە و ، پێویست بوو نوێژ بە ئاشكرا ئەنجام بدرێ ، چ پێغەمبەری خوا ﷺ و چ موسڵمانەكان بیریان لە چۆنیەتیی ئاگاداركردنی خەڵكەكە كردەوە و كەوتنە ئەگبیر و راوێژ ..

بوخاریی لە ئیبن عومەرەوە ریوایەتی كردووە كە وتوویە : كاتێك كە موسڵمانەكان هاتنە مەدینەوە ، كۆئەبوونەوە و كاتی نوێژیان دیاریی ئەكرد ، بەڵام بانگیان بۆ نەئەدا .. رۆژێكیان كەوتنە باسی ئەو كارە .. هەندێكیان وتیان : زەنگێك وەك زەنگی گاورەكان بەكار بهێنن . هەندێكی تریان وتی : كەڕەنایەك وەك كەڕەنای جوولەكە . عومەریش فەرمووی : ئەی بۆ پیاوێك نانێرن با بۆ نوێژكردن بانگ بكات ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : (( قم ، یا بلال ! فناد

بالصلاة )) . فەرمووی : هەستە بیلال ! بانگ بدە بۆ نوێژ . شایانی باسە کە ئەم بانگدانەی سەرەتا بریتیی بوو لە : (( الصلاة جامعة )) ، نەك وەك ئەم بانگەی ئێستا .

کاتێ کە موسڵمانەکان لەم هەڵوێستەدا بوون عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی ( عبد ربه ) کەسێك هاتە خەوی و بانگی پێ ڕەوان کرد .. ئەویش هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی دایە . ئەویش فەرمووی : (( إنها لرؤيا حق )) . بەمە ئیقراری لە سەر بە شەرعیی بوونی ئەم بانگە کرد و ، فەرمووی : (( ألقها على بلال فإنه أندى صوتاً منك )) . فەرمووی : بە بیلالی بڵێ ، با ئەو بە دەنگی بەرز بانگ بدات ، چونکە ئەو دەنگی لە دەنگی تۆ خۆشترە ..

بەم بۆنەوە پێویستە موسڵمانان هەوڵ بدەن ئەوەی دەنگی خۆش و سازگارە بانگ بدات .. ئەوانەش دەنگیان خۆش نیە خۆیان بەسەر ئەو کارەدا نەبڕن ، نەوەکو تووشی گوناهـ بن ..

کاتێك کە بیلال بانگی ئەدا ، عومەر خوا لێیان ڕازیی بێ ، بە پەلە ئیزارەکەی بە دوای خۆیدا ڕائەکێشا و هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوەی کە ئێستە ئەیبینم لە خەویشدا دیومە . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( فلله الحمد )) .

ئەمەش ڕیوایەتەکەی ئیبن ئیسحاقە لەو بارەوە ، کە لە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدەوە ئەیگێڕێتەوە وتوویە : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاتە مەدینەوە ، بەبێ بانگ کردن ، خەڵکەکە لە کاتی نوێژەکاندا ، لە دەوری کۆ ئەبوونەوە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ نیازی ئەوەی کرد کە کەڕەنایەك وەك کەڕەنای جوولەکە کە خەڵکی بۆ نوێژ پێ بانگ ئەکەن ، بەکار بهێنن ، پاشان بە دڵی نەبوو . دوای ئەوە فەرمانی دا زەنگێك بێنن ، تا لێی بدرێ و موسڵمانان بۆ نوێژ ئاگادار بکرێن .[٣١٢] جا لە کاتێك دا کە موسڵمانان لەم بارەدا بوون عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی عەبدڕەببە لە خەویا بانگیان فێر کرد ..هاتە

---

[٣١٢] لە هەندێ ڕیوایەتی تردا هاتووە کە موسڵمانەکان ئەوەشیان بە دڵ نابێ ، چونکە موسڵمانان بۆ خۆیان ئوممەتێکی سەربەخۆی خاوەن کەسایەتیی تایبەتین و ، پێویست ناکات لاسایی هیچ کۆمەڵێکی تر بکەنەوە ، بە تایبەت جوولەکە و گاور ، کە دەست کارییەکی سەرتاسەریی دینی خوایان کردووە و ، دینیان تەنها بۆ بەرژەوەندیی دنیایی ئەوێت . چونکە موسڵمانان پێویستە چاو لە هیچ کۆمەڵێکی تر نەکەن ، بەڵکو خۆیان بناغەی شارستانێتیی ئیسلامیی جیهانیی دابڕێژن ..

خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمشەو لەخەومدا پیاوێك کە دوو کراسی صەوزی لەبەردا بوون بە لاما تێپەڕیی و زەنگێکی بە دەستەوە بوو . منیش وتم : ئەی بەندەی خوا ! ئەو زەنگە ئەفرۆشیی؟ وتی : جا چیی پێ ئەکەی ؟ وتم : خەڵکیی پێ بانگ ئەکەین بۆ نوێژ . وتی: ئەی لەوە چاك ترت پیشان نەدەم ؟ وتم : ئەوە چی‌یە ؟ وتی : بڵێیت : (( الله أكبر الله أكبر .. الله أكبر الله أكبر .. أشهد أن لا إله إلا الله .. أشهد أن لا إله إلا الله . أشهد أن محمداً رسول الله .. أشهد أن محمداً رسول الله .. حيَّ على الصلاة .. حيَّ على الصلاة .. حيّ على الفلاح .. حي على الفلاح.. الله أكبر الله أكبر.. لا إله إلا الله )) .

کاتێك کە ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد ، فەرمووی : (( إنها لرؤيا حق إن شاء الله ، قم مع بلال ، فألقها عليه فليؤذن بها ، فإنه أندى صوتاً منك )) . فەرمووی : إن شاء الله خەوی حەق و راستە . هەستە لەگەڵ بیلالدا بڕۆ و ئەو وشانەی بۆ بڵێ تا ئەویش بانگیان پێ بدا ، چونکە ئەو دەنگی لە دەنگی تۆ خۆشترە ..

کاتێك کە بیلال بانگی دا ، عومەری کوڕی خەططاب کە لە ماڵی خۆیان بوو و گوێی لێ بوو ، هەستا و ئیزارەکەی بە دوای خۆی‌دا را ئەکێشا و هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەی‌فەرموو : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەو خوایەی کە تۆی بە حەق رەوانە کردووە ، ئەوەی ئێستە ئەی‌بینم لە خەومدا بینیومە . پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : (( فلله الحمد )) .

بەڵام وەنەبێ بانگ تەنها بە خەوبینین شەرعی‌یەتی وەرگرتبێ ، بەڵکو وەحیش پشت‌گیریی کردووە ، چونکە لە ریوایەتەکەی ئیبن جورەیج‌دا ئەوە هاتووە کە کاتێ عومەر باسی خەوەکەی خۆی ئەکا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ : (( قد سبقك بذلك الوحي )) . هەروەها کە پێغەمبەر ﷺ ئیقراری لەسەر خەوەکەی عەبدوڵڵای کوڕی زەید کرد ، فەرمووی : (( إنها لرؤيا حق )) ، جۆرێکە لە جۆرەکانی سوننەت .

•

ئەم کارە پیرۆزە بە بیلال سپێررا و ، بیلال بووە بانگ‌وێژی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، هەندێ جاریش یارمەتیی‌دەری هەبوون .. ئەوەبوو بیلالیش لە بانگی فەجردا ، دوای ( حي على الفلاح ) ی دووهەم دووجار ئەی وت : ( الصلاة خير من النوم ) . پێغەمبەریش ﷺ رەزامەندیی لەسەر نواند .

حیکمەتی دیاریی‌کردنی بیلال بە بانگ‌وێژ دوو شت بوون : یەکەمیان : دەنگی یەکجار خۆش بوو ، بە رادەیەك بیلال پێش موسڵمان‌بوونی گۆرانیی‌بێژی ناوداری مەککە بوو و ، هەر شایی‌یەك بەناوبانگ بوایە ، ئەبوا بیلالی بۆ بانگ بکرایە . دووهەمیش : لەپاداشتی ئەو هەموو سزا و ئازارەدا کە لە مەککە بە دەستی کافرەکان چەشتی .. ئەوەبوو کە سزا و ئازاری زۆریان ئەدا ، جار لە دوای جار (( أحد ، أحد ))ی دووبارە ئەکردەوە و ، کۆڵی نەئەدا ، بۆیە مافی خۆی بوو بە کردەوەیەکی وەها پاداشتی بدرێتەوە کە خێرێکی زۆری تووش بکات و ، وەك لە مەککەدا تەوحیدی رائەگەیاند ، لە مەدینەش و هەتا کۆتایی تەمەنی هەر تەوحید را بگەیەنێ ..

شایانی باسە کە بانگ یەکێکە لە دروشمەکانی ئیسلام و ، بە هیچ شێوەیەك نابێت وازی لێ بهێنرێ . خۆ ئەگەر دانیشتوانی شارێك بە یەك دەنگ بڕیاریان دا واز لە بانگ بهێنن ، ئەوا خاوەن دەسەڵات ئەتوانێ کوشتاری ئەو شارە بکات . بەهێزترین بەڵگەی ئەمەش ئەو فەرموودە شەریفەیە کە بوخاریی و موسلیم ریوایەتیان کردووە و ، ئەنەس ئەی‌گێڕێتەوە کە وتوویە : لەگەڵ فەجردا پێغەمبەری خوا ﷺ هێرشی ئەبردە سەر دوژمن . ئەوەبوو گوێی بۆ بانگ ئەگرت، جا ئەگەر بانگی ببیستایە ئەوا لە هێرش ئەوەستا ، ئەگەر نا هێرشی ئەبرد .[٣١٣]

[٣١٣] السيرة النبوية : ٢ / ٤٩ ـ ٦٦ ، والرحيق المختوم : ١٨٨ ـ ١٩٦ .

## بەشی بیستەم
# ساڵی یەکەمی کۆچیی

لە باسەکانی پێشەوە دیمان چۆن قورەیش هەموو ڕێگایەکی دژی موسڵمانەکانی مەککە بەکار هێنا ، بەو نیازەوە کە واز لە دینی تازە بهێنن و ، بگەڕێنەوە سەر بتپەرستیی بە رادەیەك کە ئەو بەستەزمانانە ناچار بوون نیشتمان و حاڵ و گوزەران و کەس و کاریان بەجێ بهێڵن و کۆچ بکەن بۆ مەدینە و ، بە هەژاریی و دەستکورتی و لێقەوماویی ژیان بەسەر بەرن .

دوای ئەمەش هێشتا قورەیش دەستبەرداریان نەئەبوون و ، هەموو ڕێیەکیان ئەگرتە بەر ، تا نەهێڵن موسڵمانەکان بحەسێنەوە و ، هەر بە کولەمەرگیی بژین .

ئەوەبوو نامەیان بۆ عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول نووسیی ، کە ئەو کاتە موشریك بوو و ، پێش کۆچکردنیش خۆی بە سەرۆکی ئەنصار ئەزانیی و ، خەریك بوو بیکەنە پادشای خۆیان ، ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە نەکردایە و ئەنصار ئیمانیان پێ نەهێنایە .. بەوپەڕی هەڕەشەوە نامەیان بۆ نووسیی و پێیان وت :

ئێوە ئەو پیاوەی لای ئێمەتان جێ کردۆتەوە و ، ئێمەش سوێند بەخوا ئەخۆین کە یا کوشتاری ئەکەن ، یان دەری ئەکەن ، ئەگینا ئێمە بە هەموومانەوە دێینە سەرتان و ، چیی جەنگاوەرتان هەیە ئەیکوژین و ، ئافرەتەکانیشتان ئەکەینە کەنیزەك .

هەرکە نامەکە بە دەستی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی گەیشت ، لەبەر ئەوەی خۆیشی داخ لە دڵی موسڵمانەکان بوو ، ئامادەبوو زۆر بە جوانیی بە گوێی برا بت پەرستەکانی بکات ، چونکە وەهای لێك ئەدایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پاشایەتیی لە دەست دەرکردووە .. بۆ ئەمە عەبدوڵلا و هاوەڵە موونافیقەکانی تری هاتنە سەر ئەو بڕیارە کە کوشتاری پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن . کە ئەم هەواڵە بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت تووشیان بوو و ، فەرمووی : (( لَقَد بَلَغَ وَعيدُ قُريشٍ منكمُ المبالِغَ ، ما كانَت تكيدُكم بأكثرَ مما تُريدونَ أن تَكيدُوا به أنفسَكم ، تريدونَ أنْ

تُقاتلوا أبناءَكم وإخوانَكم )) . فەرمووی : دیارە هەڕەشەکەی قوڕەیش چاك کاری کردۆتە سەرتان ، ئەوان لەوەی کە ئەتانەوێ بە خۆتانی بکەن زیاتریان ناوێ پێتان بکەن .. ئەتانەوێ کوشتاری کوڕەکانتان و براکانتان بکەن ..

کە ئەمەیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیست بلاوەیان لێ کرد .. عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیش ئەیزانی خزمەکانی ، بە بۆنەی تێگەیشتنیانەوە لە ئیسلام ، پشتگیریی لەو ناکەن و جەنگی بۆ ناکەن وازی لەوە هێنا دەست بداتە شمشێر بۆ دەرپەڕاندنی موسڵمانەکان لە مەدینەدا .. بەلاّم وا دەرئەکەوێ کە لەگەڵ قوڕەیشدا دەستی تێکەڵ بووبێ و ، چیی هەلی بۆ هەڵ کەوتبێ لە کیسی نەداوە و ، پێی خۆش ئەبوو موناfیقانی مەدینە ، بە پشتگیریی جوولەکە ، بدات بە گژی موسڵمانەکان دا ، تا بەڵکو موسڵمانەکان لاواز بن و لەناو بچن . بەلاّم پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جارێ دانایەتیی بەکار ئەهێنا و ، خۆی و موسڵمانەکانی لە شەڕی جوولەکە و موناfیقان ئەپاراست و ، حەزی نەئەکرد لە موناfیقان بدات و ، لە دوورەوە پاگاندەی بۆ بکرێ .

پاشان سەعدی کوڕی موعاذ ، بۆ عومرە ، سەر لە مەککە ئەدات و ، لە مەککە ئەبێتە میوانی ئومەییەی کوڕی خەلەف و ، سەعد داوای لێ ئەکات کاتێکی بۆ دیاریی بکات تا طەوافێکی کەعبەی پیرۆز بکات .. ئومەییەش لەگەڵیا لە ماڵ دەرئەچێ و تووشی ئەبوجەهل ئەبن و ئەڵێت : ئەبوصەفوان ! ئەمە کێیە لەگەڵتا ؟ ئەویش ئەڵێ : ئەمە سەعدە . ئەبوجەهل روو لە سەعد ئەکا و ئەڵێ : ئێوە لە دین هەڵگەڕاوەکانی ئێمەتان جێ کردوونەتەوە و، واشی ئەگەیەنن کە پشتیوانیی و کۆمەکیان ئەکەن و یارمەتییشیان ئەدەن ، کەچیی ئەت بینم بەبێ خەم لە مەککەدا طەواف ئەکەیت .. بەخوا ، ئەگەر لەگەڵ ئەبوصەفواندا نەبوویتایە بە سەلامەتیی نەئەگەڕایتەوە ناو کەس و کارت .. سەعد رووی لە ئەبوجەهل کرد و بە دەنگێکی بەرز و زوڵاڵەوە ئەینەڕاند بەسەریدا : بەخوا ئەگەر تۆ من لەم عومرەیە قەدەغە بکەیت ، ئەوا منیش لە شتێ لەوە نارەحەتتر بۆت قەدەغەت ئەکەم ، کە ئەویش رێگای هاتوچۆتە بەلای مەدینەدا . ( صحيح البخاري ،كتاب المغازي ) .

سەرەڕای ئەمەش قورەیش جوابی بۆ موسڵمانەکان نارد و پێی وتن : بەوەی کە لەدەستمان دەرچوون بۆ یەثریب لە خۆتان بایی مەبن ، خۆمان ئەگەیەنینە لاتان و ریشەکەنتان ئەکەین و ، لەناوجەرگەی ماڵەکانتاندا تاقتان ئەبڕینەوە ..

ئەمەش وەنەبێ هەر هەڕەشەبێ و بەس ، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ لای یەقین بوو کە قورەیش ستەمکارن و هەموو رێیەك بۆ لەناو بردنی خۆی و دینەکەی ئەگرنە بەر و ، هەر خراپەیەکیشیان لە دەست بێ درێغیی ناکەن بۆیە بە حەکیمانە حیسابی بۆ هەموو شتێ ئەکرد :

**یەکەم :** خۆی لە ماڵەوە لە دەستوەشاندنی قورەیش و مونافیقان ئەپاراست ، یان ئەبوا خۆی بەخەبەر بوایە ، یان هاوەڵانی پاسەوانی بوونایە.

**دووهەم :** نەخشەی لاوازکردن و لەناوبردنی بۆ هەموو دوژمنێك دائەنا ، بە تایبەت قورەیش ، چونکە ئەگەر موسڵمانان هەوڵی لەناوبردنی دوژمنانیان نەدەن، ئەوان ئەمان لەناو ئەبەن ..

موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە عائیشەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەتی کردووە کە وتوویە : شەوێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ کە تازە هاتبووە مەدینەوە نەخەوت و، فەرمووی : (( لیتَ رجُلاً صالحاً من أصحابِي يحرُسُني الليلَةَ )) . فەرمووی : خۆزگە پیاوچاکێکی هاوەڵانم بهاتبایە و ئەمشەو پاسەوانیی بکردمایە . عائیشە ئەڵێت : کە ئێمە لەم باسەدا بووین گوێمان لە خشەخشی شمشێر بوو ، فەرمووی : (( من هذا ؟ )) . وتی : سەعدی کوڕی ئەبووەققاصم . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ما جاء بك؟ )) . فەرمووی : بۆچیی هاتووی ؟ وتی : دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ ترسێك بە دڵمدا هات ، بۆیە هاتم پاسەوانیی بکەم[٣١٤] . ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی پاڕایەوە و، پاشان خەوت .

جا ئەم پاسەوانییە بۆ چەند شەوێك نەبووە ، بەڵکو هاوەڵان بە بەردەوامیی بە نۆرە ئەبوونە پاسەوان . ئەوەتا لە عائیشەوە ریوایەت کراوە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەودا پاسەوانیی ئەکرا ، هەتا ئەوەبوو ئایەتی : ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ ﴾ ( المائدة : ٦٧ ) هاتە خوارەوە . ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ لە ( قبة ) کەوە سەری دەرهێنا و فەرمووی : (( يا أيها الناس انصرفوا عني فقد عصمني

---

[٣١٤] ئەمە کەرامەتێکی روون و ئاشکرای سەعدی تیا بەدیی ئەکرێت .

الله عزوجل )) ( جامع الترمذي ) . فەرمووی : خەڵکینە دەست لە پاسەوانی مـن هـەڵ بگرن ، چونکە خوای گەورە خۆی ئەم پارێزێ..

هەر تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەترسیی‌دا نەبوو و ، هەر تەنها قورەیشیش دوژمنی موسـڵمانان نەبوو ، بەڵکو هـەموو عـەرەب لـە هـەر چوار لاوە دژیـان وەستان .

ئوبەی کوڕی کەعب ریوایەتی کردووە و ئەڵێت : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی هاتنە مەدینە و ، ئەنصار جیٚیان کردنەوە ، هەموو عەرەب بە جارێك دا بوونە دوژمنیان ، بۆیە موسڵمانەکان بە چەکەوە ئەخەوتن و ، بە چەکیشەوە لە خەو هەڵ دەستان ..

جا بۆ ئەوەی لەهێزی قورەیش کەم بکرێتەوە ، تا دەسـت درێـژیی لـەوە زیـاتر نەکاتە سەر موسڵمانەکان ، پێویست بوو موسـڵمانەکان قـورەیش تـەمێ بکـەن ، بەوەی کە دەسەلاتیان بەسـەر ئـەو ناوچـانەدا بسـەپێنن کـە رێـی هـات و چـۆی کاروانەکانی قورەیشە بەرەو شام . بۆ ئەم مەبەستە گەورەیە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دوو کاری گرنگی ئەنجام دا :

**یەکـەم** : پەیمان بەستن لەگەڵ ئەو هۆزانە دا کە لە دەوروبەری ئەو ریٚیەدان ، یان وان لە نێوان ئەو ریٚیە و مەدینەدا ، تا لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا ئاشت بن و دەسـت بۆ یەکتر نەبەن ، کە ئەوەبوو پێشتر پەیمانی ئاشتیی لەگەڵ جوولەکەکانی مەدینەدا بەست . هەروەها پەیمانی لەگەڵ جوهەینەدا بەست کـە مـەنزلیان سـێ قۆنـاغ لـە مەدینەوە دوور بوو .

**دووهەم** : ناردنی سریە و چەکدار ، یەك لە دوای یەك ، بۆ سەر ئەو ریٚیە ، تـا ریٚ لە چالاکیی قورەیشی دوژمـن‌کـار بگـرن و ، لـە هـەمان کـاتیش‌دا بـۆ بـت پەرستەکانی مەککە و ، بۆ بتپەرست و جوولەکەی مەدینە و ، ئەعرابی بیابـانی بسـەلمێنن کـە موسـڵمانەکان یـەکجار بـەهێزن و ، قورەیشـیش چـاك ناکـات وا دژایەتی‌یان ئەکات ، چـونکە رۆژێ دێـت لـە بەردەسـتی موسـڵمانان‌دا زەلیـل و دەستەپاچە داکەون ، سـەرەڕای ئـەو زیانـەی کـە لـە ئـابووریی و بازرگانی‌یـان ئەکەوێت .

ئەمەش ئەو سریانەن [٣١٥] کە لە سالّی یەکەمی کۆچیی‌دا لەلایەن موسلّمانە ـ کانەوە بۆ ڕێگرتن لە کاروانەکانی قوڕەیش دەرچوون :

١ ـ سریەی ( سیف البحر ) : لەمانگی ڕەمەزانی سالّی یەکەمی کۆچیی‌دا ، بەرامبەر بە مانگی مارسی سالّی ٦٢٣ زاینیی ، پێغەمبەری خوا ﷺ سیی پیاوی لە موهاجیرین هەلّ بژارد و بە شێوەی سریە ڕەوانەی کردن و ، حەمزەی کوڕی عەبدولموطەللیبی کردە ئەمیریان و ، ئالایەکی سپیی دایە دەستیان کە ئەبومەرثەدی غەنەویی [٣١٦] هەلّی ئەگرت و ، فەرمانی بەسەریان‌دا دا تا ڕێ لە کاروانێکی قوڕەیش بگرن کە لە شامەوە ئەگەڕایەوە و ، سێ‌صەد پیاوی بت پەرستی مەککە و ئەبوجەهلیان لەگەلّ بوون . ئەوەبوو حەمزە خوا لێی ڕازیی بێ بە خۆی و سریەکەیەوە ڕێ‌یان بڕیی هەتا گەیشتنە ( سیف البحر ) لە ڕووکاری ( عیص ) ەوە ، لە قەراغی دەریای سووردا . لەوێ لەگەلّ کاروانەکەی قوڕەیش بە یەك گەیشتن و ، بەرامبەر بە یەك ڕیزیان بەست بۆ جەنگ . لەم کاتەدا موجدیی کوڕی عەمری جوهەنیی ، کە هاوپەیمانی هەردوو لابوو ، هات و داوای لە هەردوو لا کرد کە جەنگ و هەرا بەرپا نەکەن . بەمە جەنگ ڕووی نەدا .

٢ ـ سریەی ( رابغ ) : لە مانگی شەووالی سالّی یەکەمی کۆچیی‌دا ، بەرامبەر بە مانگی نیسانی سالّی ٦٢٣ زاینیی ، پێغەمبەری خوا ﷺ عوبەیدەی کوڕی حاریثی کوڕی موطەللیبی کردە سەرکردەی هەشتا ( لە ریوایەتێکی تردا شەصت ) سوارچاکی موهاجیریی ، کە تاقە ئەنصاری‌یەکیان لەگەلّ‌دا نەبوو و ، فەرمانی بەسەریان‌دا دا ڕێ لە کاروانێکی قوڕەیش بگرن ، کە فەرماندەی کاروانەکە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب بوو و دووصەد پیاوی چەك‌داری لەگەلّ‌دا بوون .. ئەوەبوو موسلّمانەکان لە ( بطن رابغ ) لە نزیکی ( عیص ) دا بە کاروانەکە گەیشتن و هەندێ تیریان گرتە یەکتریی ، بەلاّم بە شمشێر و چەکی تر کوشتاریان نەکرد . بت پەرستەکان لەوە ئەترسان کە موسلّمانەکان سوپای تریان لە کەمین‌دا هەبێت و دەست بەسەر کاروانەکەدا بگرن ، بۆ ئەمە پاشەکشەیان کرد و ، موسلّمانەکانیش دوایان نەکەوتن .. ئالاّی ئەم سریەیە ئالاّیەکی سپیی بوو ، کە

---

[٣١٥] سریە : بەو کۆمەلّە سەربازە ئەوترا کە پێغەمبەری خوایان ﷺ لەگەلّ دا نەبوو ، بەلاّم ئەو سوپایەی کە بە سەرکردایەتیی پێغەمبەر ﷺ دەرئەچوو پێی ئەوترا ( غەزوە ) .

[٣١٦] ناوی ( كناز بن حصين الغنوي ) بووە ..

میسطەحی کوڕی ئەثاثەی کوڕی موطەللیبی کوڕی عەبدمەناف ( کە ئامۆزای عوبەیدەی فەرماندە بوو و ، هەردووکیشیان ئامۆزازای عەبدوڵڵای باوکی پێغەمبەر بوون ) هەڵی گرتبوو .

شایانی باسە کە لە کاتی بەیەك گەیشتنی ئەم دوو سوپایەدا دوو پیاو لە سوپای مەککە جیا ئەبنەوە و دێنە ریزی موسڵمانەکانەوە .. ئەم دوانەش میقدادی کوڕی ئەسوەد و عوتبەی کوڕی غەزوان بوون کە هەردووکیان زووتر موسڵمان بوو بوون و ، ئەو رۆژە هەلیان بە دەست هێنا و خۆیان گەیاندە لای موسڵمانەکان .

یەکەم تیرێك کە موسڵمانەکان لە پێناوی خوادا هاویشتیان لەم سریەدا بوو و ، ئەوەش کە هاویشتی عوبەیدەی کوڕی حاریث بوو و ، هەندێکیش وتوویانە سەعدی کوڕی ئەبووەقاص بووە ..

٣ ـ سریەی ( الخرَّار ) : لە مانگی ذولقەعیدەی ساڵی یەکەمی کۆچییدا ، کە بەرامبەر بە مانگی مایسی ساڵی ٦٢٣ زاینیی بووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەعدی کوڕی ئەبووەققاصی کردە فەرماندەی بیست موسڵمان و ناردنی تا رێ بە کاروانێکی قورەیش بگرن و ، فەرمانی بەسەردا دان کە لە ( خرار ) تێپەڕ نەکەن . ئەوانیش بە پیادە و بێوڵاغ کەوتنە رێ ، بە رۆژ خۆیان ئەشاردەوە و ، بە شەودا رێیان ئەبڕیی ، تا ئەوەبوو لە بەرەبەیانی پێنجەم رۆژدا گەیشتنە ( خرار ) ، بەڵام فریای کاروانەکە نەکەوتن ، چونکە رۆژێ پێشتر لەوێوە تێپەڕیی بوو . ئاڵای ئەم سریەیەی سەعد سپیی بوو و ، میقدادی کوڕی عەمر هەڵی گرتبوو ..

ئەم سێ سریەیە بە رای واقیدیی لە ساڵی یەکەمدا روویان داوە و ، ئیبن کەثیریش لە ( البداية والنهاية : ٣ / ٢٤٣ ) دا پشتگیریی لەو رایەی واقیدیی کردووە .

ئەمەش هۆی رەوانەکردنی ئەم سێ سریەیە لە ساڵی یەکەمی کۆچکردندا :

١ ـ بۆ سزادانی ئەو بتپەرستانەی کە چەندەها ساڵ سزای موسڵمانە بەستەزمانەکانیان دا و ، دەستخستنی ئەوەی کە دەست ئەخرێت لە بازرگانیی و سامانیان لە بەرامبەر ئەو ماڵ و سامانەی موسڵمانانی مەککە کە کافران دەستیان بەسەردا گرتبوو ، ئەمەش تا لاواز بن و ، توانای دژایەتیی موسڵمانانیان نەبێت ، چونکە سامان هۆیەکی گرنگە بۆ ژیان و دەسەڵات ..

٢ ـ بۆ ئەوەی قورەیش تێ بگات کە موسڵمانان بوونەتە خاوەنی هێزێك کە ئەتوانن بەرژەوەندی‌یەکانی قورەیش بخەنە مەترسی‌یەوە .. کەواتە وا چاکە لەگەڵ موسڵمانەکاندا لە یەك بگەن و ، دەست لە دژایەتیی هەڵ بگرن و ، روو لە ئاشتیی بکەن ، چونکە دژایەتیی زیانی بۆ هەردوو لا هەیە .. لە هەمان کاتدا تا موسڵمانەکان سەربەستیی بلاّوکردنەوەی دینیان هەبێت و ، رێیان لێ نەگیرێ و مافی ئەوەیان هەبێ کە بچنە مەککەوە و ، خواپەرستیی خۆیان لەو شوێنە پیرۆزەدا ئەنجام بدەن و ، قورەیشیش بازرگانیی و بەرژەوەندیی پارێزراو بێت و دەست نەهێنرێتە بەر رێی کاروانەکانی . دیارە هەتا قورەیش هەست بە هێز و توانای موسڵمانە کۆچکەرەکان نەکات ، بیر لەم رێك کەوتنە ناکاتەوە

شایانی باسە ناردنی ئەم سریانە بۆ جەنگ و کوشتار نەبووە ، بەڵکو بۆ رێ گرتن لە کاروان و بازرگانیی قورەیش بووە ، ئەگینا موسڵمانەکان سەربازی زیاتریان ئەناردن .. دیارە موسڵمانەکانیش مافی خۆیان بووە ، تا بۆیان دەست بدا سامان و بازرگانیی لە قورەیش بستێنن لە تۆڵەی ئەو ستەمەدا کە قورەیش لەوانی کردووە ..

هەروەها شایانی باسە کە لەساڵی یەکەمی کۆچیی‌دا و لە مانگی شەووالدا عەبدوڵلاّی کوڕی زوبەیر لەدایك بوو ، کە ئەوە یەکەم منداڵ بوو کۆچکەرانی مەککە لەمەدینەدا بیان بێت .. کاتێك کە خاتوو ئەسمائی کچی صددیق عەبدوڵلاّی بوو ، موسڵمانەکان لە خۆشیی لە دایك بوونی بە دەنگی بەرز تەکبیرەیەکی گەورەیان کرد ، چونکە وەهایان بەرگوێ کەوتبوو کە جوولەکە سیحری لە موسڵمانەکان کردووە تا دوای کۆچکردنیان منداڵیان نەبێت .

کاتێك کەئەسماء عەبدوڵلاّی بوو هێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، خستیە کۆشی و ، پاشان خورمایەکی کرد بە دەمیەوە و ، داوای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کرد . یەکەم منداڵێکی ئەنصاریش دوای هیجرەت لە دایك بوو بێ نوعمانی کوڕی بەشیرە ..

هەروەها لەم ساڵەدا کولثوومی کوڕی هیدمی ئەنصاریی پاشان ئەوسیی کە لە نەوەی عەمری کوڕی عەوف بوو ، کۆچی دوایی کرد .. طەبەریی وەهای دەربڕیوە کەپاش کۆچی پێغەمبەر ﷺ بە ماوەیەکی کەم کولثووم مردووە ، کە پیاوێکی بەساڵاچووبوو و ، پێش هیجرەت موسڵمان بوو بوو .. وەك لە پێشەوە باس کرا ،

که پێغەمبەر کۆچی کرد و گەیشتە قوباء بە شەو لە ماڵی کولثووم ئەمایەوە ، چونکە خۆی بە تەنیا بوو و ماڵ و منداڵی نەبوو و ، بە رۆژیش‌دا لەگەڵ هاوەڵان دا لە ماڵی سەعدی کوڕی خەیثەمە ئەمانەوە ..

هەروەها ئەبوئومامە ، ئەسعەدی کوڕی زورارەی نەججاریی خەزرەجیی ، کە یەکێ بوو لە دوانزە نەقیبە هەڵ بژێرراوەکەی شەوی عەقەبە و کرایە نەقیبی نەوەی نەججاری خزمانی ، کۆچی دوایی‌کرد . ئەسعەد ئامادەی هەردوو پەیمانی عەقەبە بوو و ، یەکەم کەسیش بوو کە لە خەزرەج‌دا موسڵمان بوو و ، یەکەم کەسیش بوو پێش کۆچ‌کردنی ئازیز لە مەدینەدا نوێژی جومعە بکات . کاتێك کە موسڵمانان خەریکی دروست کردنی مزگەوتی پێغەمبەری خوا بوون ، ئەو کۆچی دوایی کرد ..

کە نەوەی نەججار نەقیبەکەیان کۆچی دوایی کرد داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە نەقیبێکیان بۆ دیاریی بکات ، وای بە چاك زانیی خۆی ببێتە نەقیبیان چونکە خزمی بوون ، بۆیە فەرمووی : (( أنتم أخوالي وأنا بما فيكم ، وأنا نقيبكم )) . ئەمەش بووە رێزێك بۆ نەوەی نەججار کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەقیبیان بێت . ئەوپەڕی حیکمەت بوو ، چونکە زۆریان خۆیان بە شیاوی نەقیبیی ئەزانیی .[٣١٧]

---

[٣١٧] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ٦٧ ـ ٧٢ ، والرحيق المختوم : ١٩٧ ـ ٢٠١ .

## بەشی بیست و یەکەم
# جیهاد لە ئیسلامدا

گرنگ‌ترین رووداوی ساڵی دووهەمی کۆچیی بریتیی بوو لە ماوەدانی خوای گەورە بە ئیمان‌داران تا جیهادی کافران بە چەك بکەن و ، چیی تر نەهێڵن دەست درێژی‌یان بکەنە سەر ، چونکە ئەوە پانزە ساڵە ئیمان‌داران دینێکی پاك و بێ‌گەردیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە و ، زیان بە کەس ناگەیەنن و، بەرامبەر بە سزا و ئازاری قورەیشیش بێ‌دەنگ وەستاون و دەست ناکەنەوە ، تا هەموو سەرزەویی شاهێد بێ کە هەڵگرانی قورئان ئاشتیی‌خوازن و ، تا سزای کافران لە سنوور دەر نەچێ ئەوان دەست ناکەنەوە .. کە دەستیشیان کردەوە، دەستی چاك ئەوەشێنن .. هەر موسڵمانێکیش بەو پێیە هەنگاو هەڵ نەگرێ ئەوا لە ئیسلام نەگەیشتووە و زیانیشی لە قازانجی زۆرترە .. بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ و کۆمەڵی ئیمان‌دار سیانزە ساڵی رەبەق لە مەککەدا بە ژیرانە و مەردانە خەریکی خواپەرستیی بوون و ، مەردومیان بۆ لای خوا بانگ ئەکرد ، بێ ئەوەی تەنگ بە هیچ کەس هەڵ بچنن و ، بێ ئەوەش ئەمن و ئاسایش لە دەوروبەر تێك بدەن ، کەچیی دانیشتوانی مەککە بێ‌ڕەحمانە ئالآی دژایەتیی قورئانیان بەرز کردەوە و ، سزا و ئازارێکی سەختی پێغەمبەر و هاوەڵانیان دا ، بەڵام چۆن سزایەك ، لەگەڵ ئەوەش دا ئیمان داران لە زیادکردن‌دا بوون و ، بەوپەڕی ورەی بەرزەوە لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بوون ، چونکە ئاگایان لێ بوو ئایەتەکانی قورئان ئەهاتنە خوارەوە و ئامۆژگاریی دەستەی ئیمان‌داریان ئەکرد تا دان بە خۆیان‌دا بگرن و ، چاو ببڕنە قیامەت و ، دڵیان لە کەمژمارەیی خۆیان دانەمێنێ ، چونکە خوای گەورە خۆی چاودێری‌یان ئەکات ، وەك :

﴿ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴾ ( النحل : ١٢٧ ) .

﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾ ( الشورى : ٤٣ ).

﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴾ ( الأحقاف : ٣٥ ) .

﴿ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا ﴾ ( المزمل : ١٠ ) .

زۆرجاریش موسڵمانان دادیان ئەهێنایە لای پێغەمبەر ﷺ ، کە هی وایان هەبوو لێی درابوو و ، هی واشیان هەبوو زامدار کرابوو و ، هی واشیان هەبوو سزا و ئازار درابوو .. ئەهاتنە خزمەتی شکاتی حاڵی خۆیان ئەکرد .. ئەویش لەسەر خۆ و بەوپەڕی دامەزراوییەوە نموونەی بۆ ئەهێنانەوە و پێیشی ئەفەرموون : (( اصبروا ، فإني لم أؤمر بقتال )) . ئەیفەرموو : دان بە خۆتاندا بگرن ، فەرمانی جەنگم پێ نەدراوە .. هەتا ئەوەبوو خوای گەورە ، بە سۆزی بەلێشاوی ، دەرگای رەحمەتی لێ خستنە سەر پشت و ئەنصار موسڵمان بوون و ، کۆچیان کرد بۆ ناویان و ، لە مەدینە بوونە خاوەنی دەسەلاّت .. هێزیان پەیدا کرد .. کاتی ئەوە هات کە دەستی خوێنمژان لە ستەم کۆتا بکەن ..

یەکەم ئایەتێك کە مۆڵەت بە موسڵمانان بدات تا کوشتاری کافرەکان بکەن و ، بەڵێنی سەرکەوتن بە ستەملێکراوان بدات ، ئەوانەی کە لەسەر ماڵ و حاڵیان دەرکراون بێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان ئەنجام دابێ ، ئەو ئایەتانەی سوورەتی حەج بوون کە ئەفەرموون :

﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴾ ( الحج : ٣٩ ـ ٤١ ) .

دیارە مۆڵەتدان بۆ هەر کارێك دوای قەدەغە ئەبێت ، ئەمەش ئەبێتە بەڵگەی ئەوە کە ئەم ئایەتانە بۆ فەرماندان بە جیهاد هاتوونەتە خوارەوە . ئەمەش رای ئیبن عەبباس و زوهەرییە ..

ئیبن جەریریش لە ئەبولعالییەوە ، کە تابیعییە ، تەخریجی کردووە کە یەکەم ئایەت لەو بارەوە ئەمەیە :

﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾ ( البقرة : ١٩٠ ) .

هەندێکی تریش وەها ئەبینن کە یەکەم ئایەت ئەمەیە :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ۚ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ ۖ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ ۚ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ۚ فَٱسْتَبْشِرُوا۟ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعْتُم بِهِۦ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ ( التوبة : ١١١ ) .

بەڵام رای یەکەم لەوانی تر راستترە ..

لەوە ئەچێ کە تەشریعی جیهاد لەسەرەتای ساڵی دووهەمی کۆچیدا بووبێت ، چونکە موسڵمانەکان لەساڵی یەکەمدا بە رێكوپێك کردنی مزگەوت و ، کاروباری گوزەرانیان و ، رێك خستنی کاروباری سیاسییان وەك : بەستنی پەیوەندیی برایەتییان و ، گونجانیان لەگەڵ جولەکەکانی مەدینەدا ، پەشۆکابوون ..

جاوا چاکە بە پێی ئایەتەکانی سوورەتی ( الحج ) ، کە لە پێشەوە مۆڵەتی جیهادیان بە موسڵمانان دا ، حیکمەتەکانی جیهاد بخەینە بەردەست ئازیزان ، تا تێ بگەن کە جیهاد چ مەبەستێکی بەرزی بەکەڵکی تیایە بۆ گرۆی مرۆڤ و ، ئەو جیهادەش کە موسڵمانانی سەرەتای ئیسلام کردوویانە گەورەترین خزمەت بووە کە پێشکەش بە مرۆڤایەتییان کردووە :

١ ـ پاراستنی بانگەوازی ئیسلام : خوای گەورەی دروستکەری ئاسمانەکان و زەویی بڕیاری داوە ئیسلام دینی هەتا هەتایی تێکڕای مرۆڤ بێت ، تا ژیانیان رێك و پێك بکات و بیشیان خاتە سەر رێبازی سەرفرازیی قیامەت ، تا لە تالاوی ژیانی ئەم دنیایە و ، لە ئاگری دۆزەخ لایان بدات .. بۆ ئەمە جیهاد بەرگریی لەو بانگەوازە رزگارییە خوازە مەزنە ئەکات ، هەتا دینی خوا بە چاکترین شێوە بە مرۆڤ را بگەیەنرێ ، چونکە قورئان فەرمانی داوە :

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ ( المائدة : ٦٧ ) .

هەروەها فەرموویە :

﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾ ( الأنعام : ١٩) .

ئەم فەرمانە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرز کردووە کە بانگی خوا بگەیەنێ و ، موسڵمانانیش ئەبێ شوێن پێی ئەو هەڵ بگرن و ، ئەوانیش بانگ بکەن ..

کەواتە کۆمەڵی ئیمان‌داریش پێویستیی بە بەرگریی هەیە لە خۆی و لە بیروباوەڕەکەی ، تا هێزی کوفر و ستەم لە ناوی نەبات و ، کاری پیرۆز پەکی نەکەوێت .. ئەی بۆچ مل‌هوڕان هێز پێکەوە ئەنێن تا بەرگریی لە زوڵم و ستەمەکەیان بکەن ؟ کەواتە موسڵمانانیش مافی خۆیانە بەرگریی لە خۆیان و لە دینەکەیان بکەن ، بە تایبەت کاتێك کە چەندین ساڵ دانیان بە خۆیان‌دا گرتبێ و مل‌هوڕان سزای سەختیان پێ چەشتبن و ، ئافرەتی بەستەزمانی وەك سومەییەیان لەسەر ئەو لە سوورەوە بووەی مەککە بەستبێتەوە و ، سەرەنجامیش خوێنەکەی بەسەر لمەکەدا رژابێ ، بە جۆرێ کە ئایەتەکانی سوورەتی ( الحج ) بە ستەم‌لێ‌کراو لە قەڵەمیان دابن کە ئەفەرموون :

﴿ بأنــهم ظلموا ﴾ .

گەورەترین ستەم ئەوەیە کە کەسانێك بیانەوێ دەست لە خراپە هەڵ بگرن و ، بچن بە گژی دەروونی بەدخوازیان‌دا و ، بڕیار بدەن پەروەردگاریان رازیی بکەن ، بەوەی کە بە تاك و تەنیا بی‌پەرستن و ، لە هەموو رەوشتێکی خراپ و زیان بەخش دوور بکەونەوە و ، چیی چاکە و پیاوەتی‌یە لەگەڵ مرۆڤ دا ئەنجامی بدەن ، کەچیی مل‌هوڕان تەنگیان پێ هەڵ بچنن و ، نەهێڵن هەناسەیەکی پاك هەڵ بمژن .. هەوڵ بدەن بیان‌ترسێنن تا پەشیمان ببنەوە و ، گەر کۆڵیشیان نەدا دەست بە گرتن و کوشتنیان بکەن ..

لە هەمووی خۆشتر خوای باڵادەست بەڵێنی داوە و ، ئاشکرای کردووە کە خۆی خاوەنی توانا و دەسەڵاتە تا ئەو ستەم‌لێ‌کراوانە ، دوای ئەنجام‌دانی ئەرکی سەرشانیان بە چاکیی و گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانەکانی ئیسلام ، سەربخات و ، بیان‌کاتە کاربەدەستی سەرزەویی و ، لە قیامەتیش‌دا سەرفراز بن ..

٢ ـ تۆڵەسەندن لە ستەم‌کار و ، رزگارکردنی نەفس لە زەلیلیی و ژێرچەپۆکیی :

ئەوەبوو بت‌پەرستان جۆرە ئازارێکی موسڵمانانیان دا تا لە دین واز بهێنن . جا کە بەو شێوە سەرنەکەوتن ناچاریان کردن وڵات بەجێ بهێڵن ، تا دەست بە سەر

ماڵ و سامانیاندا بگرن .. کەواتە تۆڵەسەندن مافێکی فیطریی هەموو کەسێکە و هەموو شەریعەتێکی ئاسمانیی دانی پیاداناوە . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعۡدَ ظُلۡمِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَا عَلَيۡهِم مِّن سَبِيلٍ ﴾ ( الشورى : ٤١) .

ئەوەبوو خوای گەورە بە درێژایی سەردەمی مەککە و سەرەتای سەردەمی مەدینەش فەرمانی بەسەر ئیمانداراندا دابوو تا بەرامبەر بە سزای کافران دان بە خۆیاندا بگرن و دەستیان لیٚ نەکەنەوە ، بەڵکو هۆشیان بە خۆیاندا بێتەوە و ، واز بهێنن ، کەچیی رۆژبەرۆژ زیاتر پیٚیان لیٚ رائەکێشا و ، زیاتر لە خۆیان بایی ئەبوون . ئیتر ئەوەبوو خوایگەورە فەرمانی دا با دەستیان لیٚ بووەشێنن و تۆڵەی خۆیان بکەنەوە .. چونکە ئەوەش عەدالەت نیە واز لە بتپەرست و گومڕایان بهێنریٚ لەسەر زەوییدا هەموو خراپە و تاوانێك بکەن ، کەچیی دەستی ئیمانداران لە ئاستیانا ببەستریٚ و ، ماوەیان نەدریٚ بەرگریی لە خۆیان و لە دینە خۆشەویستەکەیان بکەن .. ئەمە ئەوپەڕی ستەمە.. مادام کافران هەموو ڕیٚیەکیان دژی ئیمانداره چەوساوەکان گرتە بەر ، ئەوا با ئیماندارانیش چیی لە تواناياندا هەیە بە کاری بهێنن و تۆڵەی خۆیان بکەنەوە .. کافران چۆن ماڵ و سامانی ئەمانیان داگیر کرد و ، چۆن تەنگیان پیٚیان هەڵ چنی ، با ئەمانیش سامانی ئەوان داگیر کەن و ، تەنگیشیان پیٚ هەڵ بچنن .. قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡبَغۡيُ هُمۡ يَنتَصِرُونَ ۝٣٩ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا ﴾(الشورى : ٣٩-٤٠)

جا قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەو کەسانە کردووە کە ستەمیان لیٚ کراوە .. ئەوانەی کە بە ناڕەوا لەسەر ماڵ وحاڵی خۆیان دەرکراون و هیچ تاوانێکیان نیە جگە لەوەی کە بە تاك و تەنیا خوایان پەرستووە :

﴿ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ ﴾ ( الحج : ٤٠ ) .

٣ ـ دانانی یاسای جیهاد ئەبێتە مایەی ئاشتیی و بیٚوەیی لەسەر زەوییدا و ، هەموو خاوەن دینێك لە دینی خۆی بیٚخەم ئەبیٚ و ، ڕێز لە هەموو دینێك ئەگیرێت : ئەمەش لە روانگەی ئەوەوە کە دینی ئیسلام لەسەر شوێنکەوتوانی فەرز کردووە کە بڕوایان بە هەموو پێغەمبەرێکی خوا و کتێبەکانیان هەبیٚ کە خوا رەوانەی کردوون .. ئەوەندە هەیە سەردەمی ئەو بەرێزانە بەسەر چووە و ، دینەکەیان بە دینی ئیسلام نەسخ کراوە و ، لە کتێبە ئاسمانییەکانیشدا تەنها

قورئان بەو شێوەیەی کە خوا ناردوویەتی بە سەلامەتیی ماوەتەوە ، ئیتر ئەوانی تر دەستکاریی کراون . جا هەرکاتێ موسڵمانان لەسەر زەوییدا بوونە خاوەنی دەسەڵات ئەوا نابێ خاوەنی دینەکانی تر هیچ ترسێکیان لێیان هەبێ ، چونکە دینی ئیسلام موسڵمانانی لە ستەم و دەست درێژیی قەدەغە کردووە .. دیارە موسڵمانان پابەندی ئەم دەستوورە ئەبن .. جا هەر کەسێ لە مێژوودا دەستی رۆیشتبێ بەرامبەر بە موسڵمانان درێغیی نەکردووە و ، دەستی وەشاندووە و ، هەموو جۆرە سزا و کوشت و بڕو سووتاندن و ماڵکاول کردن و دەستدرێژیی یەکی دەرهەق بە موسڵمانان ئەنجام داوە .. کەچیی کاتێك کە موسڵمانان دەستیان رۆیشتبێ ئەوا هیچ ناموسڵمانێکی ژێر دەستیان ، چ لە بارەی دینەوە و ، چ لە بارەی دنیاوە و ، چ لە بارەی شەرەف و سامان و بەرژەوەندییەوە ، هیچ زیانێکیان لێ نەکەوتووە ، بگرە لەوپەڕی ئیسراحەت و حەسانەوەدا بوون . هەر ئەمەش وای کردووە کە لەناو شار و دێهاتی خاکی ئیسلامدا ناموسڵمان بوون و ، بەوپەڕی سەربەستییەوە ژیانیان داوەتە سەر و ، ناچار نەکراون نە کۆچ بکەن ، نە وڵاتی ئیسلام بەجێ بهێڵن .. بەڵکو ئیسلام داوای لێ کردوون بە ویستی خۆیان موسڵمان بن ، خۆ ئەگەر موسڵمان نابن ، ئەوا بالەسەر دینی خۆیان بمێننەوە و ، بە سەربەستیی دینی خۆیان راگیر بکەن ، تەنها ئەوەندە هەیە لە جیاتی ئەو خزمەتەی کە دەوڵەتی ئیسلامیی بە ئەندامانی ئەوانی پێشکەش ئەکات ( جزیە ـ سەرانە ) بدەن ، ئەویش بە پێی دەوڵەمەندیی و هەژاریی دیاریی ئەکرێ ، بەرامبەر بەوەی کە ئەوان وەك موسڵمانان خزمەتی سەربازیی و پارستنی خاکی ئیسلام نایانگرێتەوە و ، زەکاتیشیان لەسەر نیە .

ئەوەتا قورئان دەری ئەبڕێ کە جیهادی ئیسلامیی پارێزگاریی لە پەرستگا و کەنیسە و مزگەوتەکان ئەکات ، تا کەس بە خراپە دەستیان بۆ نەبات ، چونکە ئەو شوێنانە یادی خوا و خواپەرستییان تێدا ئەکرێت .. خوای بەهێز و دەسەڵات داریش ئەوانە سەر ئەخات کە پشتیوانیی لە دینەکەی ئەکەن کە ئەفەرموێ :

﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾

( الحج : ٤٠ ) .

٤ ـ بە بۆنەی ئەوەشەوە کە ئیسلام دینی تێکڕای مرۆڤایەتییە ، چونکە عەقیدە و شەریعە و ئاداب و ڕەوشتەکانی ئیسلام بۆ هەموو کات و شوێنێك دەست ئەدەن و ، مرۆڤایەتیی تەنها لە سایەی ئەودا ، بە موسڵمان و ناموسڵمانەوە، ئەحەسێتەوە ، ئەوا ئیسلام مافی خۆیەتی لە هەموو سەرزەوییدا دەستی بڕوا و ، ئەو موسڵمانانەش کە بە پاکیی و ئیخلاصەوە دەستیان پێوە گرتووە مافی خۆیانە کاربەدەست بن و ، جڵەوی کاروباری مرۆڤایەتیی لە دەستی ئەواندا بێ ، چونکە هەر تەنها ئەوان ئەتوانن بە پاکیی عەدالەت و یەکسانیی و خێر و چاکە وحەق و هیدات بچەسپێنن و ، هەر تەنها ئەوانیش ئەتوانن فەرمان بە چاکە بدەن و ، دوورەپەرێزییش لە خراپە بکەن ، کە بەم دوانە ژیانی مرۆڤ رێك و پێك ئەبێت . جا کە کاروبار لە مشتی کەسانی تردا ئەبێت ، ئەوا فەساد و خراپەکاریی روو لە ژیان و گوزەرانی مرۆڤ ئەکات .. کەواتە هەموو یاسایەك جگە لە یاسای ئیسلام و ، هەموو کۆمەڵ و گرووپێك جگە لە موسڵمانە پاکەکان کاریان زیان بەخشە و ، لە تەرازووی یاسای خوادا ئەو کارەیان قاچاخە و پێویستە هێز بخرێتە کار بۆ لابردنی فەساد و ، خێر و چاکە سەر بخرێت کە ئەمەش بە جیهادی ئیسلامیی ئەکرێت و ، پێویستی بە سەروماڵ بەخشین هەیە ، تا ئەو مەبەستە بەرز و پیرۆزە بێتە دیی و ، مرۆڤەکان وەك ژیانی ئەم دنیایەیان چاك ئەبێ ، بکەونە سەر رێبازی قیامەت و لەوێش سەرفراز بن . ئەوەتا قورئان ئەفەرموێ :

﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴾ ( الحج : ٤١ ) .

بەڵێ ، ئەو ئیمانداره چاكویستانەی کە خوای گەورە کاروباری سەرزەوییان پێ ئەسپێرێ ، کاروباری نوێژ و زەکات بە جوانیی جێ بەجێ ئەکەن و ، فەرمان بە چاکە ئەدەن و دوورەپەرێزیی لە خراپە ئەکەن .. سەرەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خوایە ..

ئێستاش وا چاکە بە کورتە باسێکی حوکمی جیهاد بکەین ..

بە لای جومهووری زانایانەوە ، چ زانایانی سەلەف و چ زانایانی خەلەف ، جیهادی ئیسلامیی یەکێکە لە فەرزە کیفائییەکان ، بەو مانایە کە ئەگەر

دوژمنان هێرشیان هێنایە سەر خاکی ئیسلام ، ئەگەر کۆمەڵێك لەبەردەم ئەو هێرشەدا وەستان و توانییان دوژمن بشکێنن و ، موسڵمانان لە شەڕ و خراپەیان رزگار بکەن ، ئەوا ئەو فەرزە لەسەر شانی موسڵمانەکانی تر لاچووە و ، گوناهبار نابن . خۆ ئەگەر وایان نەکرد ، ئەوا یەك بەیەکی ئەندامانی ئوممەتی ئیسلام تاوان بار ئەبن و، مەگەر ئەوەندەی پێویست بێ موسڵمان بچنە مەیدانی کافران و هێرشیان پەرچ بدەنەوە ، ئەوسا تاوان لەسەر هەموان هەڵ بگیرێ .. بەڵگە لەسەر ئەمەش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە :

﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴾ ( التوبة : ١٢٢ ) .

بەڵام لە سێ کاتدا جیهاد ئەبێتە فەرزی عەین و ، پێویستە موسڵمانان هەر هەموویان بەشداریی بکەن :

یەکەم : ئەگەر سوپای موسڵمانان و سوپای دوژمنان بە یەك گەیشتن ، ئەوا ئەوەی لەوێ ئامادەیە نابێ بەجێ بهێڵێ و پشت هەڵ کردنی حەرامە ، مەگەر بە فەرمانی سەرکردە کەسێك یان کۆمەڵێك لەو سوپایە بگەڕێنە دواوە و ، بە پێی نەخشەی سەرکردایەتیی ئەو شوێنە چۆڵ بکەن ، تا بچنە شوێنی چاك تر ، یان بچنە کۆمەکیی دەستەیەکی تری سوپای موسڵمانان .. ئەوەتا قورئان فەرمانی بەسەر ئیمان داراندا داوە تا ئەگەر لەگەڵ دوژمن روو بە روو بوونەوە ، ئەوپەڕی دامەزراویی بنوێنن و ، ذیکری زۆری پەروەردگار بکەن بەڵکو خوا سەریان بخات :

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ ( الأنفال : ٤٥ ) .

هەروەها فەرمان ئەدات با سوپای ئیسلام پشت هەڵ نەکات ، چونکە لەو رۆژەدا هەر سەربازێك پشت هەڵ بکات ئەوا غەزەبی خوای بەسەردا ئەبارێ و مەنزڵیشی ناو ئاگری دۆزەخ ئەبێت ، جگە لەوانەی کە بۆ بەرژەوەندیی ئیسلام فەرماندە رەوانەیان ئەکات :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ ( الأنفال : ١٥ ـ ١٦ ) .

لە فەرموودەی صەحیحیشدا کە بوخاریی موسلیم ریوایەتیان کردووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( اجتنبوا السبع الموبقات )) . فەرموویە : خۆتان لە حەوت کارە زۆر خراپە لەناوبەرەکە بپارێزن . وتیان : ئەوانە کامانەن ، ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : (( الشرك بالله ، والسحر ، وقتل النفس التي حرَّم اللهُ إلا بالحق ، وأكل الربا ، وأكل مال اليتيم ، والتولي يوم الزحف ، وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات )) . فەرمووی : شەریك بۆ خوا دانان و ، سیحرکردن و ، کوشتنی هەر نەفسێك کە خوا حەرامی کردبێ مەگەر بە حەقی ئیسلام و ، خواردنی سوو و ، خواردنی ماڵ و سامانی هەتیو و ، پشت هەڵ کردن لە مەیدانی جەنگی کافران و، بوختان کردن بۆ ئافرەتی ئیمان داری پاك داوێن ..

بە بۆنەی ئەمانەی پێشەوە هەندێ لە زانایان رایان وەهایە کە پشت هەڵ کردن و هەڵاتن لە جەنگ گوناهی کەبیرەیە ، ئیتر سا ژمارەی دوژمن هەر چەندە بێ .

بەڵام هەندێ لە زانایان بۆچوونیان بەو شێوەیە کە ئەگەر ژمارەی دوژمن لە دوو ئەوەندەی ژمارەی موسڵمانان زیاتر نەبوو ، ئەوا پشت هەڵ کردن کەبیرەیە ، بەلاّم ئەگەر زیاتر بوون ئەوا بە کەبیرە ناژمێررێ . دەلیلی ئەمانیش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە:

﴿ ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ ( الأنفال : ٦٦ ) .

لەوەو پێش هەتا سوپای دوژمن لە دە ئەوەندەی سوپای موسڵمانان زیاتر نەبوایە ئەبوایە بە دامەزراویی جەنگیان بکردایە .

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ رایان لەسەر ئەوە بووە کە ژمارەی دوژمن هەر چەندە ببێ ، پێویستە موسڵمانان بە دامەزراویی جەنگ بکەن و ، پشت هەڵ نەکەن . بۆ نموونە : لە جەنگی موئتەدا ژمارەی سەربازە موسڵمانەکان تەنها سێ هەزار بوو و، ژمارەی سوپای رۆمیش بە خۆیان و بە عەرەبە بەکرێگیراوەکانی لەخم و جوذامەوە دووصەد هەزار بوون ، کەچیی موسڵمانەکان پشتهەڵکردنیان بەلاوە پەسەند نەبوو ..

بەلاّم ئەگەر فەرماندەی موسلّمانان وای بە چاك زانیی پاشەكشە بە سوپای موسلّمانان ، یا هەندێكی بكات ، ئەوە بە پشتهەلّكردن و هەلاّتن نـاژمێررێ ، چونكە ئـەو فەرماندەیـە خـۆی چـاك ئـەزانێ و ، هـەر كارێـك بـۆ بەرژەوەنـدیی موسلّمانەكان ئەنجام بدات ، ئەوا فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ إلا متحرفاً لقتال أو متحيزاً إلى فئة ﴾ ئەیگرێتەوە ، وەك ئەو پاشەكشەیەی كە خالیدی كـوڕی وەلیـدی شێری خوا لە موئتەدا ئەنجامی دا و ، موسلّمانەكانی رزگار كرد ، دوای ئەوەی كە كوشتارێكی یەكجار زۆری سوپای رۆمیان كرد ، هەر چـەندە هێشـتا دانیشـتوانی مەدینە ، هەر هەموویان ، بە یەك دەنگیی ئەو پاشەكشەیەی خالیدیشیان بـە لاوە هەلاّتن و پشـتهـەلّكـردن بـوو و ، ژنـەكان دەرگایـان لـە رووی مێردەكانیـاندا دائەخست ، كە گوایا ترسنۆك بوون و ، لە جەنگ هەلاّتوون ، كەئەوەبوو پـێیـان ئەوتن : ( یـا فُـرَّار ) . بـەلاّم پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـەرگریی لێ ئـەكردن و ، ئەیفەرموو : (( بل هم الكُرَّار )) .

ئـەم رووداوە دەری ئەخـات كـە كۆمـەلّگای ئیسـلامیی بـە ژن و منـداڵ و پیاویەوە .. بە پیر وگەنج و پەك كەوتەیەوە ، هەر هەمووی پالّـەوانی مەیـدان و ، گیانی ئازایەتیی و كۆلّ نەدانی لەبەرایە ..

**دووهەم** : ئەگەر كافران هێرشیان كردە سەر ناوچەیەكی ولاّتـی ئیسـلام ، ئـەوا لەسەر دانیشتوان پێویستە بچن بە گژی دوژمندا و كوشتاریان بكەن . خۆ ئەگـەر دوژمنەكە بەوان چار نەئەكرا ، ئەوا لەسەر موسلّمانانی ولاّت و ناوچەكانی تـریش پێویست ئەبێت كـە بچـن بـە هانـای ئـەو خوشـك و بـرا لێقەوماوانەیانـەوە و ، دوژمنیان لە كۆلّ بكەنەوە ..

موسلیم فەرموودەیەك ریوایەت ئەكات كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمـوویـە : (( المسلم أخو المسلم ، لا يظلمه ولا يخذله )) . لە ریوایەتێكی تـریشدا وا هـاتووە : (( ولا يُسلمه )) . ئەفەرموێ : موسلّمان برای موسلّمانە ، نە ستەمی لێ ئەكات و، نە پشتیشی بەر ئەدات . واتە دەستبەرداری نابێت كافران دەستی بۆ بەرن ..

**سێهەم** : ئەگەر گەورەی موسلّمانان فەرمانی دا بەسەر كۆمەلّێكدا تـا خۆیـان بۆ جیهاد ئامادە بكـەن ئـەوا لەسـەریان پێویسـت ئـەبێ كـە خۆیـان بـۆ جیهـاد بپێچنەوە ، ئەمەش بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزانە :

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِي ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔا ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ ( التوبة : ٣٨ ـ ٣٩ ).

لە فەرموودەی صەحیحیش‌دا ، کە بوخاریی و موسلیم لەسەر صەحیحیی رێک کەوتوون ، هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : (( لا هجرة بعد الفتح ، ولكن جهاد ونية ، وإذا استنفرتم فانفروا )) . فەرموویە : دوای فەتحی مەککە ئیتر هیجرەت لە مەککەوە نەما ، ئیتر لەمەولا جیهاد و نییەتی پاك گرنگیی هەیە .. موسڵمانان ! ئەگەر داوای نەفیرتان لێ کرا خۆتانی بۆ ئامادە بکەن .

بەڵام هەندێك لە پیاوچاکانی ئوممەتی ئیسلام وەهای بۆ ئەچن کە جیهاد بە هەمیشەیی و لە هەموو حاڵەتێك‌دا و لە هەموو کاتێك‌دا فەرزی عەینە . واتە هەموو موسڵمانێك بە هەمیشەیی و بە پێی توانا و لێ‌هاتنی خۆی ، پێویستە خەریکی جیهاد بێت .. ئەبێ هەتا مردن بەردەوام بێ ، بەڵگەشیان ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە فەرمان بەسەر پیر و گەنج و ، سوار و پیادە و ، دەوڵەمەند و هەژار و، بەهێز و لاوازیان‌دا ئەدا تا بە سەروماڵ لە پێناوی خوادا هەڵمەت بەرن و بەرامبەر بە هێزی خراپ‌ویستان بووەستن کە ئەفەرموێ :

﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَـٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ ( التوبة : ٤١ ) .

بە راستیی راستیان فەرمووە .. پاك‌کردنەوەی سەرزەویی لە خراپە و ستەم و رەوشت نزمیی ئەوەی پێویستە .. هەتا دینی خوا لە هەموو سەرزەوییدا بڵاو ببێتەوە .. جا ئەگەر موسڵمانان بە درێژایی مێژوو ئەم بۆچوونەیان وەربگرتایە ئەوا نە بەغدا و ، نە قورطوبە و ، نە ئەستەنبووڵ و ، نە ئەزهەر نەئەکەوتنە دەست خوانەناسان .. کاتێك کە موسڵمانان دەستیان ئەڕۆیشت ئەبوا دانەنیشتنایە تا وڵاتانی تریشیان لە بێ‌ڕەوشتیی و سووکیی رزگار بکردایە . بەڵام کە دانیشتن ، ئەوا خوانەناسان ، وەك تۆڵەیەکی خوایی ، هێرشیان کردە سەریان و پایتەختەکانیان کەوتنە دەست دوژمنان و ، ئاڵاکەشیان کەوتە ژێر پێی داگیرکەران و ، بە کوشت و بڕ و ، سووتاندن لەناویان بردن ..

بەڵێ ، هاوەڵان جیهادیان بۆ هەموو کەسێك و هەموو کات و شوێنێك بە پێویست ئەزانیی ، بە تایبەت ئەبوئەییووبی ئەنصاریی و ، ئەبوطەلحەی ئەنصاریی و ، میقدادی کوڕی ئەسوەد و ، لە تابیعی‌یانیش‌دا سەعیدی کوڕی موسەییەب . هەتا ئەبوئەییووب ئایەتی ژمارە (٤١) ی ( التوبة ) ی بە دەلیل وەرئەگرت و ، وەهایشی بۆ ئەچوو کە هەرکەس پشت لە جیهاد بکات و ، خۆی بە کاروکاسپیی و ماڵ و منداڵەوە دەست خەرۆ بکات ئەوا ئەکەوێتە بەر هەڕەشەی ئەم ئایەتەوە کە فەرمان ئەدات موسڵمانان ماڵی خۆیان کاول نەکەن و ، خۆیان بە هیلاك نەبەن ، ئەویش بە کۆڵدان و ساردبوونەوە لە جیهادی کافرێتیی لە سەرزەویی‌دا ئەفەرموێ :

﴿ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾ ( البقرة : ١٩٥ ) .

بۆیە ئەبوئەییووب خوا لێی رازیی بێ لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا و لە دوای کۆچ‌کردنیشی هەر خەریکی جیهاد بوو .. لە هیچ غەزایەك دوا نەئەکەوت .. تا ئەوەبوو ناکۆکیی کەوتە نێوان ئیمام عەلیی و موعاویەوە خوا لێ‌یان رازیی بێ و ، ئەبوئەییووب بە سەلیقەی جوانی چووە پاڵ ئیمام و بەشداریی جەنگی خەواریجیشی لەگەڵ دا کرد ..

کە موعاویە یەزیدی کوڕی کردە فەرماندەی سوپایەك و بەرەو شاری ئەستەنبووڵ رەوانەی کرد تا ئەو شارە فەتح بکات ، سەرەتا ئەبوئەییووب لای گران بوو لەگەڵ سوپایەك‌دا بچێ بۆ غەزا کە سەرکردەکەی یەزید بێت ، بەڵام دڵی وەها ئەگرا بۆ جیهاد ، خۆی پێ نەگیرا و بە خۆی وت : هیچ زیانێکی بۆ من نیە هەر کەسێ ئەمیری سوپا بێت .. ئەوەبوو خۆی گەیاندە سوپا و ، ناڕەحتیی زۆری هاتە رێ .. پاشان نەخۆش کەوت و ، یەزیدی فەرماندەش هات بۆ سەردانی و پێی وت : پێویستییت چی‌یە ؟ ئەبوئەییووب وتی: پێویستییم ئەوەیە ئەگەر من مردم، هەتا ئەتوانی بە لاشەکەمەوە بچۆرە ناو خاکی دوژمنەوە و لەوێ بم‌نێژە و خۆت بگەڕێرەوە .

کە کۆچی دوایی کرد یەزید و موسڵمانان نوێژیان لەسەر کرد و ، وەسیەتە - کەشیان بۆ جێ بەجێ کرد ، ئەوەبوو گەیاندیانە نزیك شووراکانی ئەستەنبووڵ و لەوێ ناشتیان .. بێ‌ئەوەی گاورەکان بوێرن دەستی بۆ بەرن .. وەك بڵێی

ئەبوئـەییوب لـەوێ چـاوەڕوان بـێ هـەتا سـوپاکەی موحەممـەدی فـاتح بێـت و ئەستەنبوولّ ئازاد بکات و ئۆخەی بە دڵی ئەبوئەییوبیش بگات .

هەروەها ئەبوطەلحەی ئەنصاریی هاوەڵی پێغەمبەری خـوا ﷺ کـە یـەکێ بـوو لەوانەی دەوری پێغەمبەریان لە ئوحوددا گرتبوو ، ئەگێڕنەوە جارێکیان لە کاتێـك دا کە یەکجار پیربووبوو سوورەتی ( التوبة ) ئەخوێنێ . کە ئەگاتە سەر ئایـەتی : ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالاً وَجَـٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ ئەڵێت : وا ئەبینم کـە خـوای گـەورە فـەرمانی داوە هـەر هەمووتمان ، بە پیر وگەنجەوە ، هێرش بەرین .. رۆڵە ! کەلوپـەلم بـۆ بپێچـنەوە . کوڕەکانی پێیان وت : رەحمـەتی خـوات لێ بـێ ، تـۆ لـە خزمـەتی پێغەمبـەری خوادا ﷺ غەزات کردووە هەتا کۆچی دوایی کردووە و ، لە خزمەتی ئەبوبـەکریش دا هەتا کۆچی دوایی کردووە و ، لـە خزمەتی عومەریشدا هـەتا کۆچـی دوایـی کردووە .. ئەمڕۆش ئێمە لە جیاتی تۆیش غەزا ئەکەین . کەچیی کـوڵی نـەدا و ، بۆ غـەزا سواری کەشتیی بوو و ، لە رێدا کۆچی دوایی کـرد و ، دوای نـۆ رۆژ لـە کۆچ کردنی دوورگەیەکیان دەست کەوت و ئەویان تێدا ناشت و، هیچ گۆڕانێکیشی بەسەردا نەهاتبوو ..

هەروەها ئیبن جەریری طەبەرییش لە ئەبوڕاشـیدەوە ریوایـەتی کـردووە کـە لـە حیمص چاوی بە سـوار چـاکی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ، میقـدادی کـوڕی ئەسـوەد کەوتووە کە ویستوویەتی بچێ بۆ غەزا ، کە لەوکاتەدا پیرێکـی بەساڵاچـوو بـووە هەردوو برۆی هاتبوون بەسەر هەردوو چـاویدا ، ئەبوڕاشـید پێـی ئـەڵێ : خـوای گەورە چاوپۆشیی لە تۆ کردووە . ئەویش ئەڵێت : ( البعوث ) واتـە ئـەو ئایەتـەی سەرەوەی سوورەتی ( التوبة ) دەستبەردارمان نابێت .

ئیمام زوهەرییش وتوویە : سەعیدی کوڕی موسەییەب بە نیازی غەزاوە کەوتـە رێ ، کە ئەوەبوو چاوێکی لە دەست دابوو . پێـی وتـرا : تـۆ نەخۆشـی و لاشـەت ناتەواوە . وتی: خوای گەورە داوای نەفیری لەسووك و قورس کردووە . خۆ ئەگـەر من توانای جەنگم نەبێت ، ئەوا ژمارەی جەنگاوەران زیاد ئەکەم و ، پارێزگارییش لە کەل وپەل ئەکەم .

بەم غیرەتەوە ئیسلام بە هەموو دنیادا بلاوەی کرد و ، ئـەمڕۆش مەگـەر خـوا خۆی بزانێ چەند ملیۆن ئیماندارى راستگۆ خەریکی بلاوکردنەوەی دینی حەقن و، مرۆڤەکان لە خراپە رزگار ئەکەن و ، ئەیانخەنە ژێر سایەی بەیـداخی قورئـان تـا سەرفرازی قیامەت بن ..

سوپاس بۆ خوا نیعمەتەکانی لەژمارە نایەن ..

جا لەبەر ئەوەی کە جیهاد لە ئیسلامدا هۆی پاراسـتنی عەقیـدە و ، بێوەیـی بانگەوازو ، مایەی بلاوکردنەوەی شەریعەتی تەوحید و حەق و عەدالـەت و خێـرو چاکەیە ، ئەوا خوا و پێغەمبەرەکەی هانێکی زۆری ئیماندارانیان داوە بۆی .

ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەری بڕیوە کە خوای گەورە سەر و ماڵی لـە ئیمـانداران کڕیوە بەرامبەر بەوەی کە بەهەشتیان پێ ببەخشێ .. بەو مەرجەی ئیمانداران لـە پێناوی خـوادا جەنگ و کوشتار بکەن .. کافران بکوژن و کافرانیش ئەوان بکوژن، کە ئەفەرموێ :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ ( التوبة : ١١١) .

هەروەها دەری ئەبڕێ کە وازهاوردوان لە جیهاد و جیهادکەران لە پێناوی خوادا بەسەر و ماڵیان یەکسان نابن .. جیهادکەران خاوەنی ئەجر و پاداشتێکی زۆرن کە ئەفەرموێ :

﴿ لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلۡمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ عَلَى ٱلۡقَٰعِدِينَ دَرَجَةٗۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلۡقَٰعِدِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾( النساء : ٩٥).

هەروەها ئاماژە بۆ بازرگانی یەکی وەها ئەکات کە ئیمانداران لە سزای سەختی قیامـەت سـەرفراز ئـەکات ، کـە بریتـی یـە لـە ئیمـانهێنـان بـە خـوا و بـە پێغەمبەرەکەی ﷺ و جیهادکردن بەسەر و ماڵ لە پێناوی خوادا کە ئەفەرموێ :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ۝ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ ( الصف : ١٠ ـ ١١ ) .

ئاماژەش بۆ ئەوە ئەكات کە بە فیطرەت مرۆڤ حەزی لە جەنگ و کوشتار نیە ، بەلاّم ئەگونجیّ خێر و چاکەی زۆری تێدا بێت کە ئەفەرمویّ :

﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ ( البقرة : ٢١٦ ) .

جا ئەگەر هەموو کەسیّ بۆی بشیّ لە جیهاد بترسیّ ، ئەوا بۆ ئیماندار ناشیّ بترسیّ ، چونکە قازانجی جیهاد بۆ موسڵمان مسۆگەرە و ، یەکیّ لەو دوو شتەی بۆ ئەبن : یان سەرکەوتن و دەستکەوت ، یان پاداشتی شەهیدیی :

﴿ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴾ ( التوبة : ٥٢ ) .

لە سوننەتی پاك و بیّگەردیشدا فەرموودەی زۆر هەن بۆ خۆشەویستکردنی جیهاد و ، دەستبەردار نەبوون لێی :

لە هەردوو صەحیحی بوخاریی‌و موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویە:
(( تَضمَّن اللهُ لمَن خرجَ في سبيله ، لا يُخرجُه إلاّ جهادٌ في سبيلي ، وإيمانٌ بي وَبرُسُلي أن يُدخله الجَنَةَ ، أو يُرجعَهُ إلى مَسكنه الذي خَرجَ منهُ ، بما نالَ من أجرٍ أو غنيمة . والذي نفس محمد بيده لولا أن أشقَّ على المسلمين ما قَعدتُ خلافَ سَرية تغزو في سبيلِ الله ، ولكنْ لا أجدُ سَعةً فأحملهُم ، ولا يجدون سَعَةً وَيَشقُّ عليهم أنَ يتخلّفوا عَنّي ، والّذي نفسُ محمدٍ بيدهِ لَوَددتُ أن أغزُوَ في سبيل الله ، فأقتل ، ثم أغزو فأقتل ، ثم أغزوَ فأقتل )) .

فەرموویە : خوای گەورە بووە بە زامنی ئەو کەسەی لە پێناوی ئەودا لە ماڵ دەرئەچیّ ، بەلاّم تەنها بۆ رەزامەندیی خوا و ، ئیمان بە خوا و بە پێغەمبەرەکانی لە ماڵ دەر بچیّ ، کە بیخاتە بەهەشتەوە ، یان بە سەلامەتیی دوای دەستکەوتنی ئەجر و غەنیمەت بیگێڕێتەوە بۆ ئەو ماڵەی کە لێوەی دەرچووە . بەو خوایەی کە گیانی موحەممەدی بە دەستە ، ئەگەر لەبەر نارەحەتکردنی موسڵمانەکان نەبوایە ، بە سریەیەکەوە دانەئەنیشتم هەر غەزام لە پێناوی خوادا

پیێ ئەکرد . بەڵام دەستم ناڕوات تا بیانخەمە ڕێ و ، ئەوانیش دەستیان ناڕوات و، پێشیان ناخۆش ئەبێ ئەگەر لەگەڵم نەیەن و دوا بکەون .. بەو خوایەی کە گیانی موحەممەدی بە دەستە ئاواتەخواز بووم لە پێناوی خوادا غەزا بکەم و ، بکوژرێم ، پاشان غەزا بکەم و بکوژرێم ، پاشان غەزا بکەم و بکوژرێم .

هەروەها لە صەحیحی بوخاریی‌دا بە مەرفوعیی هاتووە : (( رباطُ يومٍ في سبيلِ الله خيرٌ من الدنيا وما فيها ، وموضعُ سَوْطِ أحدكم في الجنة خير من الدنيا وما فيها )) . ئەفەرموێ : پاسەوانیی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا لە دنیا و هەرچیی وا تیایا چاکترە و ، ئەوەندەی شوێنی قامچیی یەکێکیشتان لە بەهەشتدا لە دنیا و هەرچیی وا تیایا چاکترە ..

لە صەحیحی موسلیمیش‌دا بە مەرفوعیی هاتووە : (( رباطُ يوم وليلة خيرٌ من صيام شهر وقيامه )) . ئەفەرموێ : پاسەوانیی شەو و ڕۆژێك لە ڕۆژوو و شەونوێژی مانگێك چاکترە .

ئەو چاوانەش کە پاسەوانیی ئەکەن و ، خەو لە خۆیان دەزڕێنن و ، لە پێناوی ڕەزامەندیی خوادا چاودێریی دوژمنان ئەکەن و ، حەسانەوەیان نیە ، ئەوانە ئەو چاوانەن کە خوای گەورە بەهەشتی بۆ ئامادە کردوون .

بۆ ئەمەش تیرمیذیی بە مەرفوعیی ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردووە : (( عينان لا تمسهما النار : عين بكت من خشية الله ، وعين باتت تحرس في سبيل الله )) . حديث حسن . فەرموویە : دوو چاو هەن کە ئاگری دۆزەخیان بەر ناکەوێ : چاوێك کە لە ترسی خوادا گریا بێت و ، چاوێکیش لە پێناوی خوادا پاسەوانیی موسڵمانانی کردبێ .

هەڵوێستی پاڵەوانانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە درێژایی تەمەنی ، بە تایبەت لە غەزاکان‌دا و لە کاتە ناڕەحەتەکانیش‌دا ڕێبازی پەروەردەی موسڵمان بووە تا غیرەت بخەنە بەر خۆیان و زۆر پیاوانە بچنە مەیدانی دوژمنانەوە و ، ڕۆژی ڕووناکیان لێ بکەنە شەوەزەنگ ..

هەروەها ئیسلام موسڵمانانی هەڵ ناوە بۆ دەست خستنی شەهیدیی . ئەوەتا قورئانی پیرۆز لەو بارەوە ئەفەرموێ :

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًاۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٦٩ ـ ١٧٠ ) .

**بەڵێ ، ئەوانەی کە لە پێناوی دینی خوادا شەهید ئەبن ، ئەوانە بە مردوو ناژمێررێن ، چونکە وان لە ژیانێکی بەرزەخیی وەهادا کە رۆحەکەیان هەموو لەزەتێکی هەستیی و مەعنەویی ئەچێژێ .**

**موسلیم لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : دەربارەی ئەم ئایەتە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا ، ئەویش فەرمووی :** (( أَرواحُهُم في جَوف طيور خُضرٍ ، لها قَناديلُ معلَّقةٌ بالعَرش ، تَسرحُ منَ الجنَّة حيثُ شاءَت ، ثم تَأوي إلى تلك القنـاديل ، فاطَّلع اللهُ عليهم إطلاعةً ، فقالَ : هلْ تَشتهُون شيئاً ؟ فقالوا : أيُّ شيءٍ نَشتَهي ، ونحن نسرحُ من الجنة حيثُ شئنا ؟ ففعل ذلك بهم ثلاث مرات ، فلما رأوا أنَّهم لن يُتركوا من أن يسألوا قالوا : يا ربِّ نريدُ أن تَرُدَّ أرواحَنا في أجسادِنا حتى نُقتَل في سبيلكَ مرةً أُخرى ، فلمَّا رأى أن ليس لهم حاجة تركوا )) .

**ئەفەرموێ : رۆحەکانیان لەناو لاشەی باڵندەی سەوزدان ، کە لەناو جۆرە چرایەکی وەهادان کە بە عەرش‌دا هەڵ واسراون ، چەندیان پێ خۆش بێ لە بەهەشت‌دا بە ئازادیی ئەسووڕێنەوە و ، پاشان ئەگەڕێنەوە ناو ئەو چرایانە . جا خوای گەورە بە سۆزی خۆی ئاوڕێکی لێ دانەوە و فەرمووی : ئایا دڵتان حەزی لە شتێك هەیە ؟ وتیان : جا دڵمان حەزی لە چیی بێت ، لە کاتێك‌دا کە ئێمە چۆنمان پێ خۆش بێ لە بەهەشت‌دا ئەسووڕێینەوە ؟ ئەمەی لەگەڵیان‌دا سێ بارە کردەوە، کە دییان وازیان لێ ناهێنرێت وتیان : پەروەردگارمان ! ئەمانەوێ رۆحەکانمان بچێتەوە بە بەر لاشەکەمان‌دا ، هەتا جارێکی تریش لە پێناوی تۆدا بکوژرێینەوە. کە خوای گەورە دیی وا هیچ پێویستی‌یەکیان نیە ، وازیان لێ هێنرا .**

**لە موسنەدی ئیمام ئەحمەدیش‌دا فەرموودەیەك بە وێنەی ئەم فەرموودەی سەرەوەی موسلیم هاتووە ، کە لە کۆتایی‌یەکەی‌دا ئەمەش هاتووە :** (( فلما وجدوا طيبَ مَأكَلِهم ومَشرَبِهم ومَقيلِهم ، قالوا : مَن يُبلِّغُ عنَّا إخوانَنا أنَّا أَحياءٌ في الجنَّة نُرزَقُ لِئَلاَّ يَزهَدُوا في الجِهادِ ، ولا ينكلوا عَنِ الحربِ ؟ فقال سبحانه: ﴿ ولا تحسبن ... ﴾))الآية.

ئەفەرموێ : کە خـواردن و خواردنـەوە و جـا و مـەنزڵی چـاکی خۆیانیـان لـە بەهەشتدا دیی ، وتیان : کێ بە براکانمان رابگەیـەنێ کـە ئێمـە لـە بەهەشـتدا زیندووین و رزق و رۆزیمان پێشکەش ئـەکرێ ، هـەتا لـە جیهـاد کەمتەرخـەمیی نەکەن و ، لە جەنگ و غەزا واز نەهێنن ؟ خوای گەورەش بەڵێنی دا کە خۆی بـەم ئایەتە پیرۆزە : ﴿ ولا تحسبن... ﴾ ئاگاداریان بکات ..

هەر ئەم هەڵوێستە بەرزەی قورئان و سوننەت بـوو وا موسـڵمانە پێشـینەکانی کردە پاڵەوانی سەرزەویی و شەهیدبوونیان لە ژیان بە لاوە خۆشەویستتر بوو ، تـا ئیسلام بە هەموو گەلانی سەرزەویی گەیشت و لە سـووکیی و ریسـوایی رزگـاری کردن و ، خستنیە سەر شەقامی حەیا و حورمەت و داوێنپاکیی ..

هەر لەسەر باسی جیهاد بەردەوام ئەبین و سەرنجی ئـەو قۆناغانـە ئـەگرین کـە جیهادی ئیسلامیی پیایا تێپەڕیی :

قۆناغی یەکەم :

لەم قۆناغەدا جیهادی موسڵمانەکان تەنها بەرامبەر بەو قورەیشیـیانە بـوو کـە سزا و ئـازاری موسـڵمانەکانیان دابـوو و ، لەسـەر مـاڵ و حـاڵی خۆیـان دەریـان پەڕاندبوون و ، تا ئەو کاتـەش لەسـەر سـزادانی موسـڵمانە لاوازەکـانی مەککـە بەردەوام بوون کە توانایان نەبوو کۆچ بکەن .. بەڵام هـەر ناموسـڵمانێ دژایـەتیی موسڵمانەکانی نەکردبا ، موسڵمانەکانیش جـەنگیان لەگـەڵ نەئـەکرد .. چـونکە قورئان وەها فەرمانی دابوو کە هەر کەس کوشتاری موسڵمانەکان ئەکات ئەوانیش کوشتاری ئەو بکەن ، بەڵام زیادەڕەویی و دەستدرێژیی نەکەن ، چونکە خوا هـیچ دەستدرێژییکەرێکی خۆش ناوێت ، وەك ئەفەرموێ :

﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾ ( البقرة : ١٩٠) .

قۆناغی دووهەم :

هەنـدێ هـۆز هـەبوون هاوپـەیمانی قـوڕەیش بـوون ، یـان دوای کـۆچ کردنـی موسڵمانەکان بۆ مەدینە بوونە هاوپەیمانی ، بـەم بۆنـەوە ئـەوانیش وەك قـوڕەیش بیـریان ئەکردەوە و ، حـەزیان لە دژایەتیی موسڵمانەکان یـان تۆڵەسـەندن لێـیان بوو .. هەتا هی وایان هەبوو بیری لەوە ئەکردەوە کە هێرش بکاتە سەر مەدینە و، وەك ئەوەی کە کورزی کوڕی جابیری فیهریی ئـەنجامی دا ، کـە ئـەوەبوو هێرشـی

کردە سەر مۆڵگای مەدینە و ، سەرەنجام موسڵمانەکان لە غەزای بەدری یەکەمدا دوای کەوتن ، بەڵام فریای نەکەوتن .
هی واشیان هەبوو کە بە ستەم و ناڕەوا چەندین موسڵمانیان شەهید کردن ، وەك لە هەردوو سریەی ڕەجیع و قورئان خوێنەکاندا رووی دا .. جا بەرامبەر بەم ناپاکی‌یە پێغەمبەری خوا ﷺ سریەی ئەنارده سەریان تا سزایان بدات و تۆڵەی شەهیدانیان لێ بکاتەوە . وەك هۆزی غەطەفان و سولەیم و عامیر و ئەحابیش و هۆزەکانی نەجد و ثەقیف . کە هێرش ئەکرایە سەر ئەمانە تەمێ ئەبوون و هۆزی تریش تەمێ ئەبوون . لە هەمان کاتدا هەندێکی تر لە ئیسلام و لە چاوپۆشیی و ڕەوشت بەرزیی ئیسلام شارەزا ئەبوون ، بەمە زۆرێك موسڵمان ئەبوون و ئەبوونە دۆست و پشتیوانی ئیسلام و موسڵمانان ..

قۆناغی سێهەم :

لەم قۆناغەدا بتپەرستانی مەککە و دەوروبەری یەکیان گرت و ، بوونە هێزێکی گەورە ، تا بە هەموویانەوە دژی موسڵمانەکان بووەستن و کوشتاریان بکەن ، بۆیە موسڵمانان ناچار بوون بچن بە گژ ئەو هەمووە دوژمنە داخ لە دڵانەدا .. ئەوەبوو قورئانی پیرۆز لەم قۆناغەدا فەرمانی دا : ئەی موسڵمانەکان ! وەك چۆن کافران هەر هەموویان بە جارێکدا دێن بە گژتاندا ، ئێوەش بچن بەگژ هەموویاندا و ، بێخەمیش بن کە هێزی خوا و دەسەڵات و توانای وا لەگەڵ ئیماندارە خاوەن تەقواکاندا ، کە ئەیفەرموو :

﴿ وَقَٰتِلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ ( التوبة : ٣٦ ) .

بەم فەرمانە قورئانی‌یە جیهادی کافران بە گشتیی ، هەر کەس کتێبێکی ئاسمانیی بە دەستەوە نەبێ ، خرایە ئەستۆی موسڵمانان .. لەم قۆناغەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ : (( أمرتُ أن أقاتلَ الناسَ حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله ، ويقيموا الصلاة ويؤتوا الزكاة ، فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءَهم وأموالهم إلا بحق الإسلام ، وحسابهم على الله )) . ( صحيح البخاري / كتاب الإيمان ) .

ئەفەرموێ : فەرمانم بەسەردا دراوە کوشتاری ئەو خەڵکە بکەم هەتا شایەتیی حەق بدەن بە تاك و تەنیایی خوا و ، پێغەمبەرایەتیی موحەممەد و نوێژ بەجێ

بهێنن و زەکات بدەن . جا کە ئەوەیان ئەنجام دا ئەوا سەروماڵیان پارێزراو ئەبێ ، مەگەر بە حەقی ئیسلام ..

**قۆناغی چوارەم :**

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی دۆستایەتیی و پێکەوە ژیانی لەگەڵ جوولەکەکانی مەدینەدا بەستبوو ، وەك لە پێشەوە باس کرا . بەمە لە سەروماڵ و شەرەف و نامووسیان بێخەمی کردن ، کەچیی ئەو ناپاکانە ئەوەندەی پێ نەچوو پەیمانەکەیان شکاند و ، بوونە پاڵپشتی موشریکەکان و هەڵیان ئەنان تا بچن بە گژی موسڵمانەکاندا ، وەك لە ئوحوددا رووی دا ، بگرە هەوڵیان دا لە پشتەوە خەنجەر لە موسڵمانەکان بدەن ، وەك لە جەنگی ئەحزابدا رووی دا .. بەردەوام خەریکی تێكدانی نێوان ئەوس و خەزرەج و ، موهاجیر و ئەنصار بوون . جوولەکە نەرمیی و لێبووردنی موسڵمانەکانیان بە هەل ئەزانیی ، بۆیە بوو بوونە میکرۆبی خراپکاریی و کۆمەڵگای مەدینەیان تێك ئەدا ، بۆیە پێویست بوو لە ناو ببرێن .. ئەوەبوو خوای گەورە فەرمانی بەسەر پێغەمبەرەکەیدا دا تا ئەو پەیمانەی کە لەگەڵیانا بەستوویەتی بیداتەوە بەناو چاویاندا و ، پاشان کوشتاریان بکات :

﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴾

( الأنفال : ٥٨ ) .

ئەمەش رەوشتێکی بەرزی ئیسلامە ، هەتا لەگەڵ دوژمندا ، کە ئاگاداری بکات و پێی رابگەیەنێ : وا پەیمانی ئاشتییمان تەواو بوو و ، پاشان بچێت بە گژیا .. ئەم رەوشتە بەرزە تەنها ئیسلام رەچاوی کردووە ..

ئەوەبوو موسڵمانەکان کوشتاری هەندێ لەو جوولەکانەیان کرد و ، هەندێکیشیان بار پێ کردن ، تا ئەوەبوو لە دوورگەی عەرەبییدا شوێنەواریان نەما و ، موسڵمانەکان لە دەستیان رزگاریان بوو ..

**قۆناغی پێنجەم :**

ئەم قۆناغەش لەو کاتەوە دەست پێ ئەکات کە موسڵمانەکان مەککەیان رزگار کرد و ، خەڵکی پۆل پۆل هاتن موسڵمان بوون و ، طائیف و نەجد و دەوروبەریشیان تەسلیم بە سوپای ئیسلام بوون ، ئیتر ئەوەندەی نەبرد دانیشتوانی سەرانسەری دوورگە موسڵمانێکی ئیماندار و خواناسیان لێ دەرچوو و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ نامە و نێرراوی رەوانەی لای پادشا و میرەکانی دەوروبەری

دوورگه کرد ، تا ئیمان بهێنن . ئەمەش له نێوان پەیماننامەی حودەیبیەو و فەتحی مەککەدا رووی دا .. داوای لێ ئەکردن با بێن و ئیمان بە قورئان بهێنن . ئەوانیش هی وایان هەبوو کە موسڵمان ئەبوون و ، هی واشیان هەبوو وەك موسڵمان نەئەبوو ، هەڕەشەیشی ئەکرد ..

بەم شێوەیە بانگی ئیسلام گەیشتە دەوڵەتان و وڵاتانی دەوروبەری دوورگە .. ئەوەبوو پادشای فارس هەوڵی خۆی دا بۆ دەستگیرکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و، پادشای رۆمیش کەوتە بیری ئەوەی کە هێرش بکاتە سەر موسڵمانەکان . کە پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەی بیست سوپایەکی سیی هەزاریی کۆ کردەوە و بەرەو باکوور کەوتە رێ تا بۆ هەموو لایەکی بسەلمێنێ کە ئیسلام وەك نەرم و نیان و خاوەنی سۆز و بەزەیی‌یە ، خاوەنی گورزی کاریگەرە و ، سەربازە بەوەفاکانی هەردەم گیان لەسەر دەستن و سڵ لە هیچ هێزێك ناکەنەوە و ، ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە رۆژێك بێت بەڵێنی قورئان بێتە دیی کە ئەفەرموێ : ﴿ لیظهره علی الدین کله ﴾ . واتە سەرتاپای زەویی تەسلیمی دەسەڵاتی قورئان ببێ ..

لەم قۆناغەدا بانگی خواناسیی چووە قاڵبی بانگەوازێکی جیهانی‌یەوە . بەمە جەنگ لە دوورگەدا نەما و گوازرایەوە بۆ بەر دەرگای دەوڵەتە بەدەسەڵاتەکان و ، موسڵمانەکان مەردانە تەقەیان لە دەرگای ئەو دەوڵەتانە ئەدا تا گەلان ئازاد بکەن ، با بە ویستی خۆیان دینی خۆیان هەڵ ببژێرن ..

بەڵێ سوپای تازە پێگەیشتوو هەردوو ئیمپراتۆریەتە گەورەکەی تێ گەیاند کە ئەوان سەربازی وەهایان نیە کە بتوانن بێنە مەیدانی نەڕە شێرەکانی ئیسلامەوە .. هەتا پادشای ئێران داوای لە پادشای چین کرد کە یارمەتیی بۆ بنێرێ . ئەویش وەها وەڵامی دایەوە کە ئەو سەربازی وەهای بەلاوە نیە بتوانن بە گژی کەسانێكدا بچن کە مردنیان لە ژیان بەلاوە خۆشەویستتر بێت ..

بەڵێ ئیمانداران بە هۆی نیەتی پاك و تەقوا و ئیخلاصەوە بوونە ئەو پیاوە کە شایانی کۆمەکیی خوا بن .. خوای گەورە سۆز و بەزەیی خۆی رژاند بەسەریاندا :

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾ ( القصص : ٥ ) .

کوشت و بڕیان تێ بخەن ، لەولاشەوە ناوی جەنگی پیرۆز و ڕەواشیان لێ دەنا و ، بە ناوی دینی خواوە ئاژاوەیەکی خوێناوییان بەرپا ئەکرد ..

ئەمە لە صەدەکانی ناوەڕاستدا ، تا کە صەدەی نۆزدە و بیست هاتنە بەرەوە ئەوروپای مەسیحیی ، بە دەستکیسەی جوولەکەی داخ لەدڵ ، کەوتنە هێرش کردنە سەر وڵاتانی ئیسلام و ، بە تازەترین چەك ، بەبێ شەرمانە لە موسڵمانانیان ئەکوشتن و ، وڵاتیان داگیر ئەکردن و ، خێر و بێریان بە تاڵان ئەبرد و ، حکوومەتی جاش و نۆکەرییان لە خۆفرۆشە مونافیقەکان دروست ئەکرد ، تا بە زوڵم و ستەم ، کاروباری موسڵمانان بەڕێوە بەرن و ، هەموو بێڕەوشتییەکیش لە ناو کۆمەڵدا پەرە پێ بدەن ..

تا ئەوەبوو ( لۆرد ئەللەنبیی ) نوێنەری هاوپەیمانان : ئینگلتەرا و ، فەرەنسا و، ئیطالیا و ، ڕۆمانیا و ، ئەمەریکا ، لە کۆتایی جەنگی جیهانیی یەکەمدا ، لە ساڵی ١٩١٨ ز ، کە دەستی بەسەر ( بيت المقدس ) دا گرت ، لەوێ ڕاوەستا و ، بێشەرمانە وتی : ( جەنگەکانی خاچ پەرستیی ئەمڕۆ تەواو بوون ) !!

هەروەها ( گۆرۆ ) ی سەرکردەی فەرەنسیی کە ئەویش نوێنەری هاوپەیمانان بوو، کە چووە ناو شاری دیمەشقەوە چووە بەردەم قەبرەکەی پاڵەوانی ئیسلام صەلاحەددینی ئەییووبیی و وتی : ( صەلاحەددین ! وا هاتینەوە ) .

بەمە دەرکەوت کە موسڵمانان ئیسلامی بێگەرد کەمەندکێشی کردوون ، ئەویش بە عەقیدە و ، خواپەرستیی و ، ڕەوشت و ، هەڵس وکەوتە ڕێك و پێکەکەی کە ڕۆشنایی و ڕەحمەتە بۆ هەموو کەسێك ، هەتا بۆ کافرانیش .. بەڵێ بۆ کافرانیش .. ئەگەر کافران زیانەخرۆ نەبن و ، ئاژاوەگێڕ نەبن ، موسڵمانان خزمەتیان ئەکەن .. شاهێدییشمان بۆ ئەمە ژیان و گوزەرانی ئەو هەمووە گاور و جووە بووە کە بە ڕێك و پێکیی لەناو موسڵماناندا بەسەریان بردووە ..

ئێستەش با سەرنجێکی بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەین پێش فەرزبوونی جیهاد لەسەریان ، تا بۆمان دەر بکەوێ کە شوێنکەوتوانی ئیسلام چەند عەرەق و خوێنیان لە پێناوی دیندا ڕێژاوە و ، چۆن سەروماڵیشیان ئەکردە قوربانی ، هەتا لەم سەردەمەشدا چۆن زاڵمان بە ئاگر و بە ئاسن بەربوونەتە موسڵمانان تا واز لە دینەکەیان بهێنن و ، ئەوانیش لە پێناویدا بە شەهیدیی سەر ئەنێنەوە :

---

[٣٢٠] إنجيل متى الإصحاح العاشر فقرة ٣٥ .

١ ـ پێغەمبەری خوا ﷺ له مەککەدا سیانزه ساڵ دانی به خۆیدا گرت و ، به دڵ و به گیان و به وتەی شیرین خەڵکی بانگ ئەکرد تا ئیمان بهێنن و واز له بت پەرستیی بهێنن .. لەم قۆناغەدا ئیمانداره ناوداره دامەزراوەکان ئیمانیان هێنا و، شانیان دایه بەر ئەشکەنجه و ئازاری مل‌هوڕان و ، زۆربەی موسڵمانانیش هەژار و دەست‌کورت بوون و ، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەنده سامانی له دەستدا نەبوو که دەستی هەژارەکان بگرێت و ، ئەوانیش بەو نیازەوه شوێنی کەوتبن .. بەڵکو سزا و ئازارێکیان بەسەردا رژا که هەرکەس به یەکجاریی خۆی بەخوا نەفرۆشتبایه و به تەمای پاداشتی قیامەت نەبوایه ، تاقه رۆژێك بەرگەی ئەو ئازارەی نەئەگرت ، کەچیی ئەوان ، بەو هەژاریی و دەست‌کورتی‌یه ، پاڵەوانانه دانیان به خۆیاندا گرت و ، نەمان بیست یەکێکیان بۆ ماڵی دنیا ، یان بۆ هەر بەرژەوەندی‌یەك پشتی له دینەکەی کردبێ و هەڵ گەڕابێتەوه .. هەتا هی وایان هەبوو به سزا و ئازار لەزەتی دەست ئەکەوت .. هی واشیان هەبوو دوو جار بۆ حەبەشه کۆچی کردبوو .. غەریبیی و بێ‌کەسیی و دەست کورتیی لەبەر رەزامەندیی خوا قبووڵ ئەکرد .. پاشان هەر هەموو پێکەوه کۆچیان بۆ مەدینه کرد و ، ماڵ و سامان و منداڵ و نیشتمانیان بەجێ هێشت و ، غەریبیی و دەست کورتیی و نەداری‌یان قبووڵ کرد ، تا ئەوەبوو زیاتر له ساڵێکیش له مەدینه مانەوه و ، لەوێش به هەمان شێوه به نەرم و نیانیی خەڵکیان بۆ سەر ئیسلام بانگ ئەکرد ، تا ئەوەبوو خەڵکێکی زۆر موسڵمان بوون ، بێ‌ئەوەی موسڵمانان هێزێکی وەهایان هەبێت که کەسێك ناچار بکەن ئیمان بهێنێ و شوێنیان بکەوێ ..

٢ ـ له پێشەوه باسی حیکمەتەکانی جیهاد و قۆناغەکانیشی کرا و ئەوەشمان بۆ سەلما که جیهاد بۆ پارێزگاریی ئیماندارانه .. بۆ پەرچ‌دانەوەی هێرش و دەست درێژیی زاڵمانه .. بۆ چەسپاندنی پایەکانی حەق و راستی‌یه .. بۆ بڵاوکردنەوەی خواپەرستیی و رەوشتی بەرزه .. موسڵمانەکانیش کاتێك لەلایەن خواوه فەرمانی جیهادیان پێ سپێررا ستەم و دەست‌درێژیی کافران له سنوور دەرچوو بوو و ، ئەگەر ئەو هێز و دەسەڵاتەیان شك نەبردایه تاقی موسڵمانەکانیان ئەبڕی‌یەوه . هێشتا لەگەڵ ئەوەش‌دا قورئان ناهێڵێ موسڵمانان دەست‌درێژیی بکەن .. بگره داوای ئاشتیی و تەبایی ئەکات ، زیاد لەوەش فەرمان ئەدا به موسڵمانەکان که

هەر بت پەرستێك كوشتاری موسڵمانەكان نەكات ، ئەوا خوا پێی خۆشە موسڵمانەكان چاكە لەگەڵ ئەو جۆرانەدا بكەن و ، دۆستایەتی‌یان لەگەڵدا ببەستن، كە ئەفەرموێ :

﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ ( الممتحنة : ٨ ) .

٣ ـ دەقی قورئان و فەرمووده دەرێ ئەبڕی كە نابێ هیچ كەسێك بە زۆر موسڵمان بكرێ . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّـٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ ( البقرة : ٢٥٦ )

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە بە لای زانا باوەڕ پێكراوەكانی تەفسیرەوە ئەمەیە :

ریوایەت كراوە كە پیاوێكی ئەنصاریی لە نەوەی سالم ی كوڕی عەوف ، پێش هاتنی وەحیی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دوو كوڕی ئەبن بە گاور . كە پێغەمبەر ﷺ كۆچ ئەكات بۆ مەدینە و پیاوەكە موسڵمان ئەبێ ، دوو كوڕەكەی لەگەڵ چەند پیاوێكی گاوردا ڕۆنیان پێ ئەبێ و دێنەوە بۆ مەدینە . باوكەكە یەخەی دوو كوڕەكە ئەگرێ و ، پێیان ئەڵێ : هەتا موسڵمان نەبن وازتان لێ ناهێنم .. ئەم ناكۆكییە ئەگەیەننە لای پێغەمبەر ﷺ و پیاوەكە ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا ڕەوایە بە چاوی خۆم سەیر بكەم و هەندێكم بچێتە ناو ئاگرەوە ؟! ( واتە : كوڕەكانم بەشێكن لە خۆم ) . بۆ ئەمە خوای گەورە ئەم ئایەتەی : ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ﴾ ی ناردە خوارەوە و ئەویش دەست بەرداری هەردوو كوڕەكەی بوو .

هەروەها قورئان ڕوو ئەكاتە پێغەمبەری خوا ﷺ و بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری لێ ئەكات كە : ئایا ئەتەوێ خەڵك بە زۆر موسڵمان بكەیت :

﴿ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴾ ( يونس : ٩٩ ) ؟

هەروەها قورئان دەری ئەبڕێ كە مرۆڤەكان سەربەستیی هەڵ بژاردنی دینیان پێ دراوە ، هەرچەندە خوای گەورە پێی خۆشە بەندەكانی ئیمان بهێنن :

﴿ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ ( الكهف : ٢٩ ) . لەم دنیادا کەس بۆی نیە زۆر بەکار بهێنێ بۆ موسڵمانبوون ، بەڵام خوای گەورە هەڕەشە لە کافران ئەکات کە ئەوان یەکجار ستەمکارن ، کاتێك کە ڕێبازی کوفر هەڵ ئەبژێرن ، بۆیە لە قیامەتدا سزایان ئەدات :

﴿ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ﴾ ( الكهف : ٢٩ ) .

کەواتە سەربەستیی دان بە مرۆڤ بۆ هەڵ بژاردنی کوفر یان ئیمان ، ئەوە ناگەیەنێ ئەم دوو شتە یەکسانن و خوا بە هەڵبژاردنی کوفر ڕازیە . نەخێر ڕازیی نیە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ هەرچیی هەڵ بژارد ئەنجامەکەی بۆ خۆی ئەبێ :

لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەق هاتووە بۆ پشتگیریی دەقە قورئانییەکان ، کە مرۆڤ لە هەڵبژاردنی عەقیدەدا سەربەستە :

ئیمام موسلیم بە سەنەدی خۆی لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ هەر کەسێکی بە ئەمیری سوپایەك یان سریەیەك دیاریی بکردایە ، بە تایبەتیی ئامۆژگاریی ئەکرد کە تەقوای خوای لە یاد نەچێت و ، لەگەڵ ئەو موسڵمانانەشدا کە وان لەگەڵیدا بە چاکە بجووڵێتەوە . پاشان ئەیفەرموو : (( أُغزُوا باسمِ اللهِ في سبيلِ اللهِ ، قاتلوا مَن كَفَرَ باللهِ ، أُغزوا ولا تَغُلُّوا ولا تغدُرُوا ، ولا تُمَثِّلُوا ، ولا تَقتُلُوا وليداً ، وإذا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشرِكينَ فَادعُهُم إلى ثَلاثِ خصالٍ ، أو خلالٍ ، فأَيَّتُهنَّ ما أجابوكَ فاقبَل منهُم ، وكُفَّ عَنهم .. أُدعهم إلى الإسلامِ فإن أجابوكَ فاقبلْ منهم وكفَّ عنهم ، فإن هم أبوا فاستَعِن باللهِ وقاتِلهُم )) . ( شرح النووي : ١٢ / ٣٧ ، ٣٩ ).

ئەیفەرموو : بە ناوی خواوە و لە پێناوی خوادا غەزا بکەن .. کوشتاری ئەوانە بکەن کە بە خوا کافرن .. غەزا بکەن ، بەڵام لە دەستکەوت و غەنیمەتدا ناپاکیی نەکەن و، غەدر نەکەن ، واتە پەیمانی جەنگ نەشکێنن و ، لووت و گوێی کوژراو نەبڕن و ، منداڵ نەکوژن و ، کە بە دوژمنە بت پەرستەکانیشت گەیشتی سێ کاریان بخەرە بەرچاو و ، هەر کامیان لێ وەرگرتی قبووڵی بکە و دەستیان لێ بگرەوە . پێش هەموو شتێ بانگیان بکە بۆ موسڵمان بوون . ئەگەر بە گوێیان کردی ئەوا لێیان قبووڵ بکە و دەستیان لێ بگرەوە . بەڵام ئەگەر ملیان نەدا ئەوا داوای ( جزیە ) یان لێ بکە . ئەگەر ملیان نەدا ئەوا پشت بەخوا ببەستە و کوشتاریان بکە ..

جەنگ و کوشتار لە ئیسلامدا دوا هەنگاوە ، بۆیە دوای هەموو شتێك فەرمانی جەنگ دەر ئەکرێت . شایانی باسە کە جزیە بۆ ئەوە ناسێنرێ تا ئەو کەسانە ناچاری موسڵمان بوون بکرێن ، بەڵکو ئەوە مافی دەوڵەتی ئیسلامە بەرامبەر بە پاراستنی سەر و ماڵی ئەو نامۆسڵمانانە و پێشکەشکردنی هەموو خزمەتێك پێیان . بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەو باسەیە کە بەلازەریی لە ( فتوح البلدان ) دا ئەیگێڕیتەوە کە : کاتێك هەرقەل سوپایەکی گەورەی بۆ لێدانی موسڵمانەکان کۆکردبوویەوە و ، ئەم هەواڵەش گەیشتە موسڵمانەکان کەوا بەرەو یەرمووك دێن ، موسڵمانەکان ئەو پارەیان گێڕایەوە بۆ دانیشتوانی شاری حیمص کە بە ناوی جزیەوە لێیان وەرگرتبوون و پێیان ڕاگەیاندن کە نەوەکو چاری سوپاکەی هەرقەلیان پێ نەکرێ و توانای پارێزگاریی ئەوانیان نەبێ ، وا پارەکەیان بۆ گێڕانەوە . دانیشتوانی حیمصیش ، کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوون و گاور بوون دەریان بڕیی کە پێیان خۆشە موسڵمانەکان کاربەدەستیان بن و دڵیان بە عەدالەتی ئەوان ئەکرێتەوە و ، گاورەکان زوڵم و ستەمیان لێ ئەکەن و ، ئامادەشن شان بە شانی کاربەدەستی موسڵمانان لەگەڵ سوپای هەرقەلدا بجەنگن و پارێزگاریی لە شار بکەن ، ئەگەرچیی ئەوان هاودینیانن ..

هەروەها دانیشتوانی شارەکانی تریش ، کە لەگەڵ موسڵمانەکاندا ڕێك کەوتبوون و هێشتا بە گاور و جوولەکەیی مابوونەوە ، هەمان هەڵوێستیان هەبوو و ئەیان وت : ئەگەر ڕۆمەکان و شوێنکەوتوانیان سەر بکەون بەسەر موسڵمانەکان دا ئێمە وەك جارانمان لێ دێتەوە ، بەڵام هەتا موسڵمانەکان توانا و دەسەڵاتیان هەبێ ئێمە لەسەر پەیمانی خۆمانین .

بەڵام کە لە فەرموودەدا هاتووە : (( أمرتُ أن أُقاتلَ الناسَ حَتى يقولوا : لا إله إلا الله وأنَّ محمداً رسولُ الله )) مەبەست پێی کۆمەڵێکی تایبەتییە لە بتپەرستە عەرەبەکان . ئیتر لەوان بەولاوە ، لە ئەهلی کیتاب هەڵ بژاردنی ئەو سێ کارە وا لە ئیختیاریانا : موسڵمان بوون ، یان جزیەدان ، یان جەنگ .

هەندێك لە ئیمامە گەورەکانیش وەك ئیمام مالیك و ئیمام ئەوزاعیی ڕایان وەهایە کە فەرموودەی : (( أمرت أن أقاتل الناس ... )) نەسخ بووە و حوکمی موشریکە عەرەبەکانیش وەك حوکمی هەموو خەڵکیی تر وەهایە و یەکێ لەو سێ کارە هەڵ ئەبژێرن . ( فتح الباري : ١ / ٦٤ ).

٤ ـ لە ژیان و سیرەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ رووداوی زۆر هەن کە کەسانی موشریك و بتپەرست بەر دەستی کەوتوون ، یان بە دیل گیراون ، کەچیی ناچاری موسڵمانبوونی نەکردوون و هەڕەشەی لێ نەکردوون ، بەڵکو وازی لێ هێناون تا بە ویستی خۆیان رێی خۆیان هەڵ ببژێرن .. بەڵێ پێی خۆش بووە ئەوانەش و هەموو کەسێکیش موسڵمان بن ، بەو هیوایەوە لە دۆزەخ رزگار بن ، بەڵام ناچاری نەکردوون .

ئەگێڕنەوە کە موسڵمانەکان لە یەکێ لە سریەکاندا سەرداری نەوەی حەنیفە ثومامەی کوڕی ئوثالی حەنەفیی بە دیل ئەگرن ، بەڵام نایناسن کە ثومامەیە . کە هێنایانەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ناسیی و رێزێکی باشی لێ گرت و ، سێ رۆژ لەلای خۆی هێشتیەوە . هەموو رۆژێك بە شێوەیەکی پڕڕێز داوای لێ ئەکرد کە موسڵمان ببێ ، ئەویش موسڵمان نەئەبوو و ئەشی وت : ئەگەر سامانت بوێ پێت ئەدرێت و ، گەر بم کوژی خاوەن خوێنێك ئەکوژی و ، گەر چاکەیشم لەگەڵدا بکەیت و بەرم بدەی ئەوە چاکە لەگەڵ سوپاسکەرێکدا ئەکەی .. پێغەمبەر ﷺ وای بە چاك زانیی بەری بدات و بڕوات ..

کەچیی ئەم هەڵس وکەوتە نەرم و نیانە و رێزلێگرتنە بێوێنەیە دڵی ثومامەی نەرم کرد ، هەر کە بەریان دا ، لە جیاتی ئەوەی بەرەو وڵاتی خۆی بڕواتەوە ، چوو خۆی شۆرد و ، گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ، بە ویستی خۆی و بەبێ ترس موسڵمان بوو و وتی : ( ئەی موحەممەد ! بەخوا لەسەر زەویدا دەم و چاوێکی تر نەبوو ئەوەندەی دەم و چاوی تۆ رقم لێی بێ ، کەچیی وا دەم و چاوت بۆتە خۆشەویستترین دەم و چاو بە لامەوە .. بەخوا لەسەر زەوییدا دینێکی تر نەبوو ئەوەندەی دینەکەی تۆ رقم لێی بێ ، کەچیی وا دینەکەت بۆتە خۆشەویست ترینی هەموو دینەکان بە لامەوە .. بە خوا وڵاتێکیش نەبوو ئەوەندەی وڵاتەکەی تۆ رقم لێی بێ ، کەچیی وا بۆتە خۆشەویست ترین وڵات بە لامەوە ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانبوونی ثومامەی زۆر بە دڵ بوو و پێی گەشایەوە، چونکە ثومامە پیاوێکی کەم نەبوو .. هەروەك گەورەی ناوچەیەك بوو پیاوێکی سەنگین بوو ، بۆیە بە موسڵمانبوونی ئەو خەڵکێکی زۆر لە قەومەکەشی موسڵمان بوون . ئەم رەوشتە بەرزە و چاوپۆشییە پڕ لە حیکمەتەی ئازیز ، هەر بەوەوە

نەوەستا بەڵکو بە درێژایی مێژوو بووە دەرس و ئامۆژگاریی بۆ موسڵمانان تا بزانن کە پێویستە ئەوانیش وەك ئازیزیان لەگەڵ خەڵكدا هەڵس وكەوت بكەن .

ئەوەبوو ثومامە چوو بۆ مەككە بۆ عەمرە و خەڵكی مەككە ویستیان ئازاری بدەن ، گوایا موسڵمان بووە ، بەڵام هاتەوە یادیان كە ئەوان بۆ دانەوێڵەی یەمامە دائەمێنن ، بۆیە وازیان لێ هێنا . بەڵام ثومامە بڕیاری دا هەتا قوڕەیش ئیمان نەهێنن نەهێڵێ دانەوێڵەی یەمامەیان بۆ بڕوا .. ئەوەبوو قوڕەیش بە یەكجاریی پەكیان كەوت و ، ناچار بوون پەنا بەرنە بەر پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەگەرچیی ناكۆكیش بوون ، تا بە بۆنەی سیلەی رەحمەوە لە ثومامە داوا بكات تا ماوە بدات دانەوێڵەی یەمامەیان بۆ بڕوا .

ئەبێ هەڵوێستی ئازیز چۆن بێ ؟ قوڕەیش هەموو كارێكی چەوتیان لێ وەشایەوە و ، وا ئێستە پەكیان كەوتووە . بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە لێبووردن هیچی لێ ناوەشێتەوە ، بۆیە نامەی بۆ ثومامە نووسیی تا دانەوێڵەی یەمامەیان بۆ رەوانە بكەن و، ئەویش بە گوێی كرد! بە مەرجێ ئەمە هەلێكی چاك بوو كە هەڵ كەوتبوو تا یا قوڕەیش ناچاری ئیمان هێنان بكەن ، یان برسێتیی بە هیلاكیان بەرێ ، وەك ئەوان چەند ساڵێك گەمارۆی ئابوورییان خستە سەر موسڵمانە بێكەسەكان و ، لە شیوی ئەبوطالیبدا بەندیان كردن .

موسڵمانبوونی ثومامە ئەوەندە رێك و پێك بوو هەتا بۆ دوای كۆچی دوایی پێغەمبەری خواش ﷺ كاریگەریی هەبوو .. ئەوەبوو كە هەندێ لە دانیشتوانی یەمامە لە ئیسلام هەڵ گەڕانەوە ثومامە بە دامەزراویی لەگەڵ خزمەكانیدا لەسەر ئیسلام مانەوە و ، ئەو هەڵگەڕاوانەشی ئاگادار ئەكردنەوە كە شوێن موسەیلەمەی درۆزن كەوتبوون و هەولّی ئەدا واز لە ئیسلام نەهێنن . كە دیتی وا ئامۆژگاریی كەڵك بەوانە ناگەیەنێ ، خۆی و ئەو موسڵمانانەی كە لەگەڵیا بە دامەزراویی مابوونەوە پاڵیان دا بەو سوپایەی ئیسلامەوە كە عەلائی كوڕی حەضرەمیی سەركردەی بوو و ، بوونە كۆمەكی ئەو و ، بەمە پشتی هەڵ گەڕاوەكان شكا و جەنگیان دۆڕاند .

نموونەیەكی تریش :

کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی کرد و بە سەرکەوتوویی دەستی بەسەر شاردا گرت ، صەفوانی کوڕی ئومەییە [٣٢١] یەکێ بوو لەوانەی کە زۆر دژایەتیی ئیسلامیان کردبوو و ، پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دابوو کە ئەوانە ئەگەر دەستیش بە پەردەکانی کەعبەوە بگرن هەر بکوژرێن .

صەفوان کە ئەمەی زانیی خۆی حەشار دا و لە مەککە هەڵات و ویستی خۆی بخاتە دەریاوە . لێرەدا عومەیری کوڕی وەهب ، کە ئامۆزای بوو ، بەزەیی بە صەفواندا هاتەوە و هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! صەفوان سەرداری خزمەکانیەتی و ، رای کردووە تا خۆی بخاتە دەریاوە . داوات لێ ئەکەم ئەمانی بدەی . ئەویش بۆ ناونیشان مێزەرەکەی خۆی پێ دا و ، عومەیریش وەریگرت و کە گەیشتە لای صەفوان پێی وت : دایك و باوکم بە قوربانت بن .. لەلایەن چاکترین و، بە بەزەییترین و، نەرم و نیانترین و، باشترین کەسەوە هاتوومەتە لات ، کە ئامۆزای خۆتە و ، دەسەڵاتی ئەو دەسەڵاتی تۆیە و، پایەداریی ئەو پایەداریی تۆیە و ، موڵکی ئەو موڵکی تۆیە .

صەفوان وتی : لە خۆم ئەترسم .

عومەیر وتی : لەوە نەرم و نیانتر و بەرێزترە .. ناونیشانی ئەمانەکەشی پیشان دا کە مێزەرەکەی بوو و ، گەڕاندیەوە مەککە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەمە وەهای رائەگەیەنێ کە ئەمانت داوم . فەرمووی : راست ئەکات .

صەفوان وتی : دوو مانگ مۆڵەتم بدە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( بل أربعة أشهر)) . فەرمووی : با چوار مانگ مۆڵەتت بێ .. پاشان بە چاکیی ئیمانی هێنا و موسڵمان بوو .

کوا بە زۆر موسڵمان کردن ؟

---

[٣٢١] صەفوان : یەکێ لە پیاوماقوڵانی قورەیش بوو ، عومەیری کوڕی وەهبی هەڵ نا تا بچێت بۆ مەدینە و پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت ، بەو مەرجەی سەروکاریی منداڵەکانی بۆ بکات و قەرزەکانیشی بۆ بداتەوە . ئەمەش دوای جەنگی بەدر بوو کە وەهبی کوڕی عومەیر بە دیلیی کەوتبووە دەست موسڵمانەکان . کە عومەیر گەیشتە مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی وت و وێژە نهێنییەکەی خۆی و صەفوانی پێ دا و ، عومەیریش خۆی پێ نەگیرا دانی بە راستییدا نا و ، بە چاکیی موسڵمان بوو ، ئەمەش دوای ئەوەی کە بە لایەوە یەقین بوو کە ئەم هەواڵە جگە لە خوای گەورە هیچ کەس بە پێغەمبەری نەگەیاندووە . بەمە بۆی سەلما کە راست ئەکا پێغەمبەری خوایە و وەحی بۆ دێت .

عەرەبەکانی دوورگە موسڵمان بوون و ئیسلامیان بە خۆرهەڵات و خۆرئاوا گەیاند .. لە خۆرهەڵاتەوە گەیشتنە وڵاتی چین و ، لە خۆرئاوایشەوە گەیشتنە چیاکانی پیرانس .. دەوڵەتێکی گەورە بۆ ئیسلام دروست بوو .. لەگەڵ ئەوەشدا ناموسڵمانێکی زۆر لە خاکی ئیسلامدا ئەژیان .. بۆ هەموو کار وکاسپی‌یەك سەربەست بوون .. بۆ خواپەرستیی سەربەست بوون .. کەس نەی‌ئەتوانی دەست درێژیی بکاتە سەر پەرستگاکانیان .. جاری وا ئەبوو ناموسڵمانێك ئەگەیشتە پلەی وەزیریی .. دواییش کە ئیسلام دەوڵەتی نەما ، موسڵمانان ـ بە تایبەتیی نا عەرەب ـ بە پاکیی لەسەر ئیسلام مانەوە .. بەڵکو هەڵمەتێکی هیدایەت‌دانی زۆر گەورە بۆ شوێنە دوورەکان دەستی پێ کرد .. بۆ ئەو شوێنانەی کە سوپای ئیسلامی نەگەیشتێ .. بە رووخانی دەوڵەتی عوثمانیی ، ئیسلام حکوومەت و سوپای نەما .. کاریگەریی ئیسلام و ئیعجازی قورئان کەوتنە بەرگریی لە ئیسلام .. تۆ بڵێ کەوتنە بڵاوکردنەوەی ئیسلام .. لە ئەورووپا .. لە ئەمەریکا .. لە ئەفریقا .. لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا .. لە ئوستralیا .. هەر چەندە کوفری جیهانیی بە هەموو توانایەکیەوە دژی ئیسلام کار ئەکات و ، هەر چەندە موسڵمانان دواکەوتوو و دەستەپاچەن ، کەچیی ئیسلام هەر بڵاو ئەبێتەوە .. خوێندەوارە بەرزەکان کەمەندکێش ئەکات .. مرۆڤە بەویژدانەکان هیدایەت ئەدات .. زیاتر لە ملیارێك لە ژێر بەیداخی پێغەمبەری خوادا ﷺ ریز بوون و ، کەسیش زۆری لێ نەکردوون تا لەگەڵ ئیسلامدا بن .. بگرە بە پێچەوانەوە لە زۆربەی شوێندا تووشی سزا و چەرمەسەریی ئەبن لەسەر دین و ، ئەوانیش مەردانە دان بە خۆیاندا ئەگرن .. سوپاس بۆ خوا ..

ئەگەر ئیسلام بە زۆر بڵاو بکرایەتەوە زیاتر لە هەزار ساڵ لە وڵاتە جۆر بە جۆرەکاندا خەڵك دەستیان پێوە نەئەگرت .. خۆ شوێنی زۆریش هەن کە سەربازێکی موسڵمانی بۆ نەچووبێ ، کەچیی بە هۆی زانایان و بازرگانان و کەشتی‌یەوانانەوە ئیسلامیان تێدا بڵاو بۆتەوە ، وەك ئەندەنووسیا و چین و هەندێ وڵاتی تر .

کورتەی باس : ئیسلام دینێکی گونجاوە لەگەڵ دڵ و مێشك و رۆحی مرۆڤ دا ، بۆیە ئەبینین کە خاوەن ویژدان و حەق ویستان دڵی بۆ ئەکەنەوە و ، باوەشی خۆشەویستیی پیا ئەکەن . بەڵام داخەکەم موسڵمانان زۆر کەمتەرخەمن ..

ئەوانەی هەوڵ ئەدەن ئیسلام بە مرۆڤ بناسێنن یەکجار کەم و کەم دەسەلاّت و کەم تفاقن ، لە چاو ئەو خۆرئاواییی‌یانەدا کە بە شەو و بە رۆژ ، بە سەر و بە ماڵ ، خەریکن دین و فیکری خۆیان بە مرۆڤ ئەناسێنن ، کەچیی سوپاس بۆ خوا خەڵك باوەش بۆ ئیسلام ئەکەنەوە و، بە هیچ شێوەیەکیش دەستبەرداری نابن .[٣٢٢]

[٣٢٢] السيرة النبوية لأبـــي شهبة : ٢ / ٧٣ ـ ١٠٢ .

# بەشی بیست و دووهەم
# ڕووداوەکانی ساڵی دووهەمی کۆچیی

لە ساڵی دووهەمدا هەروەك جیهاد لەسەر موسڵمانان فەرز کرا و ، ماوەیان درا کە دەست لە دوژمنەکانیان بکەنەوە و ، تۆڵە لە دەست درێژیی کەران بسێنن ، چەند ڕووداوێکی تریش ڕوویان دا ، کە ئەمانە گرنگەکانیانن :

## ( ١ ) ڕووکردنەوە کەعبەی پیرۆز :

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد ، خوای گەورە فەرمانی بەسەریدا دا ڕوو بکاتە ( بيت المقدس ) و ئەوێ بکاتە قیبلەی خۆی ، ئەمەش بۆ دڵنەواییکردنی جوولەکە ، تا بەڵکو ئیسلامیان بەلاوە خۆشەویست ببێ و موسڵمان بن .. بەڵام جوولەکە زۆر بایەخیان بە بیروباوەڕ نەئەدا .. تەنها بیریان لە بەرژەوەندیی خۆیان ئەکردەوە ، بۆیە ئەم حیکمەتە بە کەڵکی ئەوان نەهات ، بگرە بە پێچەوانەوە وەریان گرت و ، ئەو ڕووکردنەی پێغەمبەریان ﷺ کردە ڕەخنە و تانەیان لێی ئەدا و ئەیانوت : بە پێچەوانەمان هەڵس وکەوت ئەکات و ، ڕوو لە قیبلەکەشمان ئەکات ! ئەم کارە زۆر ئازاری دڵی پێغەمبەری ﷺ دا و ، پێی خۆش بوو هەر کەعبەی پیرۆز ، کە قیبلەی ئیبراهیمی باوکی بووە و ، جێی شانازیی باو باپیرانی بووە ، قیبلەی بێت .[٣٢٣] جا پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جار سەری بۆ ئاسمان بەرز ئەکردەوە و ، لە خوا ئەپاڕایەوە تا ماوەی بدا ڕوو بکاتەوە کەعبە . ئەوەبوو شانزە یان حەڤدە مانگ ( بيت المقدس ) قیبلەی بوو ، تا خوای گەورە دوعاکانی گیرا کرد و ، ئاواتەکەی بۆ هێنایە دیی و ، فەرمانی دا ڕوو بکاتەوە کەعبەی پیرۆز . خوای گەورە فەرموویە :

---

[٣٢٣] لە مەککەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ئەکرد ـ بە پێی ئەو ڕیوایەتەی کە ئیبن عەبدولبیر بە ڕاستی لە قەڵەم داوە ـ ڕووی ئەکردە کەعبە و ، کە کۆچی کرد فەرمانی پێ درا کە ڕوو بکاتە ( بيت المقدس ) ، هەتا ئەوەبوو نەسخ کرا

﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴾ ( البقرة : ١٤٤ ) .

بەمە موسڵمانەکان پایەیەکی یەکجار بڵندیان دەستگیر بوو . کە ئەویش ئەوەبوو روویان کردە هەردوو قیبلەکە ..

شایانی باسە کە گۆڕینی قیبلە بۆ کەعبە لە ناوەڕاستی مانگی رەجەبی ساڵی دووهەمی کۆچیی‌دا بووە ، کە رای جومهووری زانایانی لەسەرە و حاکم بە ریوایەتێکی صەحیح لە ئیبن عەبباسەوە گێڕاویەتەوە .

چۆنیەتی ئەم گۆڕینەش ئەمەیە :

پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی دایکی بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعرووری کرد ، کە لە دەرەوەی مەدینە ، لە مەنزڵی نەوەی سەلیمە بوو ، ئافرەتەکە خواردنی بۆ ئامادە کردن و ، نوێژی نیوەڕۆ هاتە کایەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی هەستان لە مزگەوتەکەیان‌دا نوێژ بکەن .. کە دوو رەکعەت نوێژی پێ کردن ، جیبریل هاتە خوارەوە و فەرمانی گۆڕینی قیبلەی پێ دا .. پێغەمبەریش ﷺ هەر لە نوێژەکەدا رووی کردە کەعبە و ، هاوەڵەکانیشی لەگەڵیا روویان وەرچەرخان و ئەو مزگەوتەش بە ناوی ( ذو القبلتين ) ناونرا و ، تا ئێستاش شوێنەواری ماوە ..

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو مەدینە کەوتە رێ و ، کە نوێژی عەصر هاتە کایەوە روو بە کەعبە ئەنجامی دا .. پاشان پیاوێک لەوانەی کە لە مزگەوتی پێغەمبەردا لەگەڵ ئەودا نوێژی بەجێ هێنا ، بەلای نەوەی حاریثەدا کە لە مزگەوتەکەی خۆیان‌دا روو بە ( بيت المقدس ) نوێژیان بەجێ ئەهێنا ، هەواڵی گۆڕینی قیبلەی دانێ و ، ئەوانیش هەر لە نوێژەکەدا بەرەو کەعبە وەرچەرخان .

پاشان ئەم پیاوە ، یان یەکێکی تر رۆیشت بۆ قوباء و فریای ئەوە کەوت کە نوێژی فەجریان لەگەڵدا بکات و ئەوانیش روو بە ( بيت المقدس ) نوێژیان ئەکرد و ، هەواڵی دانێ کە قورئان هاتۆتە خوارەوە و فەرمانی داوە موسڵمانەکان روو لە کەعبە بکەن . ئەوانیش هەر لە نوێژەکەدا روویان وەرچەرخان ..[٣٢٤]

---

[٣٢٤] صحيح مسلم بشرح النووي : ٥ / ٩ ، وفتح الباري : ١ / ٧٩ ـ ٨١ .

دیسان جوولەکە دەمیان دایەوە لە چەرخ و کەوتنەوە رەخنەگرتن و توانج‌دان لە پێغەمبەر و موسڵمانەکان ، کە بۆچ روویان کردەوە کەعبە .. دەمێکی زۆریان وەشاند ، ئەگەرچیی ئەشیان‌زانیی کە لە کتێبەکانیان‌دا نووسراوە کە ئەوە روو ئەدا و ، رووکردنە ( بیت المقدس ) لەلایەن موسڵمانەکانەوە زۆر ناخایەنێ .
قورئانی پیرۆز باسی ئەم هەڵوێستەی جوولەکە ئەکات و ئەفەرموێ :

﴿ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ ( البقرة : ١٤٢ ـ ١٤٣ ) .

پێش هەموو شتێك قورئان سیفەتی سەفاهەتی داوەتە پاڵ جوولەکە و ، موسڵمانانیش پلەی ئوممەتی مام ناوەندی‌یان وەرگرت تا هەر وەك پێغەمبەری خوا ﷺ شاهێدە لەسەر موسڵمانان ، موسڵمانانیش شاهێد بن لەسەر مرۆڤایەتیی .. تا ئەرکی هیدایەتی مرۆڤ بگرنە ئەستۆ ..

پاشان خوای گەورە روونی کردەوە کە ئەم قیبلە گۆڕینە تاقیی‌کردنەوەیەکی گەورە بوو بۆ موسڵمانەکان ، تا ئەوانەی بە پاکیی و ئیخلاصەوە شوێن فەرمایشتی خوا و پێغەمبەر ئەکەون لەوانە جیا ببنەوە کە بە دەمارگیریی شوێن ئیسلام ئەکەوتن ، چونکە عەرەبەکان پێش هاتنی ئیسلام کەعبەیان زۆر خۆش ئەویست . خوای گەورەش پێی خۆش بوو ئەوانەی کە بۆ خواپەرستیی شوێن ئیسلام کەوتوون لەوانە جیا ببنەوە کە بە بۆنەی باوی کۆنەوە روو ئەکەنە کەعبە ..

کێ خوا ئەپەرستێ ، خوا ئەفەرموێ : روو بکاتە ( بیت المقدس ) . هەموو موسڵمانەکان روویان کردە ( بیت المقدس ) . پاشان فەرمووی : کێ من ئەپەرستێ با روو بکاتەوە کەعبەی پیرۆز .. دیسان موسڵمانەکان هەر هەموو بە گوێیان کرد .. دیارە بە پێچەوانەی جوولەکەوە کە ـ وەك قورئان باسی کردوون ـ هەموو هەنگاوێکیان پێچەوانەی مووسای پێغەمبەریان بووە ، سەلامی‌لێ بێ . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ ( البقرة : ١٤٣ ) .

یەکەم نەسخ لە ئیسلامدا نەسخی قیبلە بوو .. شتێکی تازە بوو .. هەروەها مونافیقان و جولەکە دەستیان کرد بە فات و فیت و رەخنەگرتن ، بۆیە خوای گەورە لە سێ شوێنی نزیکدا فەرمانەکەی دووپات کردەوە ، تا موسڵمانەکان گوێ بە فات و فیت نەدەن :

﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ﴾ ( البقرة : ١٤٤ ) .

﴿ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ ( البقرة : ١٤٩ ) .

﴿ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِى وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ ( البقرة : ١٥٠ ) .

جا هەردوو ئیمامی پایەبەرز بوخاریی و موسلیم خوا لێیان رازیی بێ چیرۆکی گۆڕینی قیبلەیان گێڕاوەتەوە ، کە ئەمەی خوارەوە ریوایەتەکەی بوخارییە :

لە بەرائی کوڕی عازیب ەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ یەکەم جار گەیشتە مەدینە لای دایە لای باپیرانی یان خاڵوانی لە ئەنصار ( نەوەی نەجار ) و ، شانزە یان حەڤدە مانگ روو بە ( بیت المقدس ) نوێژی کرد .[٣٢٥] بەڵام خۆی پێی خۆش بوو کە روو بکاتە بەیت ( واتە کەعبە ) . ئەوەبوو یەکەم نوێژێك کە کردی ( بەرەو کەعبە) نوێژی عەصر بوو ، کە کۆمەڵێکیش لەگەڵیا کردیان . پاشان پیاوێك لەوانەی کە ئەو نوێژەیان لەگەڵیا کرد لەوێ دەرچوو و ، دای بە لای کۆمەڵێکدا کە لە مزگەوتێکدا بوون . کە نەوەی حاریثە بوون ــ و لە رکووع دا بوون . پیاوەکە وتی : شاهێدیی ئەدەم کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ روو بە بەیت نوێژم کردووە . ئەوانیش خۆیان تێك نەدا روویان بەرەو کەعبە وەرچەرخاند .

لە ریوایەتێکی تری بوخارییدا : ئیتر ئەوەبوو :

﴿سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ ...﴾ هاتە خوارەوە .

---

[٣٢٥] پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی رەبیعی یەکەمدا گەیشتۆتە مەدینە و ، گۆڕینی قیبلەش ، بە پێی ریوایەتی صەحیح ، لە ناوەڕاستی رەجەبدا بووە ، جا ئەگەر دوو مانگی گەیشتن و قیبلە گۆڕین بە یەك مانگ حسێب بکرێن ئەوا ماوەکە شانزە مانگ ئەکات . بەڵام ئەگەر بە دوو مانگ حسێب بکرێن ئەوا حەڤدە مانگ ئەکات .

له ریوایەتێکی تریش‌دا ئەوە هاتووە کە هەندێ خەمیان بووە ئەوانەی کە لە ماوەی رووکردنە ( بیت المقدس ) دا مردوون یان کوژراون ، خواپەرستی‌یان بەتاڵ بووبێتەوە . ئەوەبوو ئایەتی : ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ﴾ ( البقرة : ١٤٣ ) هاتە خوارەوە کە راستەوخۆ دڵی موسڵمانانی خۆش ئەکرد کە هەر کەسێ رووی لە ( بیت المقدس ) کردبێ نوێژ و خواپەرستیی نافەوتێ .

**( ٢ ) فەرزبوونی رۆژوو :**

لە مانگی شەعبانی ساڵی دووهەمی کۆچیی‌دا خوای گەورە رۆژووی رەمەزانی لەسەر موسڵمانان فەرز کرد کە یەکێکە لە ئەحکامە مەزنەکانی ئیسلام و پایەیەکە لە پایەکانی .

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاتە مەدینە ئەبینێ وا جوولەکە رۆژی عاشوورا ، کە دەهەم رۆژی مانگی موحەڕڕەمە ، بە رۆژوو ئەبن .. کە لە هۆی ئەم بەڕۆژوو بوونەیان پرسیاری لێ کردن ، وتیان : ئەمە ئەو رۆژەیە کە خوای گەورە مووسا و قەومەکەی تێدا رزگار کردووە ، جا بۆ سوپاس‌گوزاریی خوا مووساش تیایا بە رۆژوو ئەبوو . پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون : (( نحن أولى بموسى منكم )) . فەرمووی : ئێمە لە ئێوە لە پێش‌ترین بۆ مووسا .. ئەوەبوو خۆی ئەو رۆژە بە رۆژوو بوو و فەرمانیشی دا موسڵمانەکان بە رۆژوو بن تیایا .. ئەمە بوخاریی و موسلیم ریوایەتیان کردووە . جا کە رۆژووی رەمەزان فەرز بوو ئیتر رۆژووی عاشوورا بە شێوەی واجب نەمایەوە .. بەڵکو هەر کەسە بە دەستی خۆی بوو بە رۆژوو ببوایە یان نەء . ئەمەش بوخاریی و موسلیم لە عائیشەوە ریوایەتیان کردووە .

خوای گەورە بە پێی ئەم ئایەتانەی خوارەوە رۆژووی لەسەر موسڵمانان فەرز کرد :

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ۚ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ ( البقرة : ١٨٣ ـ ١٨٤ ) .

لە سەرەتاوە ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان بە هەڵ بژاردن بوو . هەر موسڵمانێ بیویستایە ئەوا بە ڕۆژوو ئەبوو و فەرزەكەی بەجێ ئەهێنا و ، هەر كەسیش بیویستایە ئەوا بە ڕۆژوو نەئەبوو و فیدیەی لەسەر واجب ئەبوو ، كە بریتیی بوو لە تێركردنی هەژارێك بۆ هەر ڕۆژێك . جا كە موسڵمانەكان لەسەری ڕاهاتن و ڕۆژووگرتن بە لایانەوە بووە شتێكی ئاسایی ، خوای گەورە هەڵ بژاردنی گرتن و فیدیەی نەسخ كردەوە و ، بە ڕۆژووبوونی لەسەریان بە پێویست گێڕا ، بە پێی ئایەتی :

﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ ( البقرة : ١٨٥ ) .

ئەمە بوخاریی و موسلیم لە سەلەمەی كوڕی ئەكوەعەوە ڕیوایەتیان كردووە ، كە ئەڵێت : كاتێك كە ئەم ئایەتە : ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾ هاتە خوارەوە هەركەس بیویستایە ڕۆژووی ئەشكاند و فیدیەی ئەدا ، هەتا ئایەتەكەی دواتر هاتە خوارەوە و ئەمی نەسخ كردەوە ، كە بریتییە لە ئایەتی : ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ . جا هەردوو ئایەتەكە تەئكیدیان لەسەر ئەوە كرد كە نەخۆش و سەفەریی ڕوخصەتی ئەوەیان ئەدرێت كە ڕۆژوو بشكێنن تا نارەحەتیی نەیەتە پێش و ، لەلایەن خواوە ئاسانكارییەك بۆ موسڵمانان بكرێت : ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴾ .

ئەمە ڕایەك .. ڕایەكی تری زانایان ، كە لە سەروویانەوە ئیبن عەبباسە ، ئەمەیە كە نەسخ نیە و هەردوو ئایەتەكە موحكەمن و ، خوای گەورە كە فەرموویە : ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾ مەبەستی لە پیاو و ئافرەتی پیرن كە مادام ناتوانن بە ڕۆژوو بن ، با لە بریی هەر ڕۆژێك هەژارێك تێر بكەن . جا بە پێی ڕای ئیبن عەبباس و شوێنكەوتوانی دەرئەكەوێ كە هەردوو ئایەتەكە پێكەوە هاتبنە خوارەوە ..

لە سەرەتادا ، كە ڕۆژوو فەرز كرا موسڵمان كە ڕۆژووی ئەشكاند بۆی هەبوو بخوا و بخواتەوە و ژن و مێردیی بكات ، بەڵام تا نوێژی عیشای بكردایە ، یان

بخەوتایە ، ئیتر خـواردن و خواردنـەوە و ژن و مێردیـی لێ قەدەغـە بـوو . ئەمـە کارێکی یەکجار گران بوو لەسەر شانی موسڵمانەکان .

ئیمام ئەحمەد لە موسنەددا لە موعاذی کوڕی جەبەڵەوە ، لە فەرموودەیەکی درێژدا دەربارەی نوێژ و زەکات ریوایەتی کردووە کە وتوویە : موسڵمانەکان مادام نەخەوتبوون خواردنیان ئەخوارد و ئاویان ئەخواردەوە و ژن و مێردییان ئەکرد . کە ئەخەوتن دەستیان ئەگرتەوە . پاشان ئەوەبوو پیاوێکی ئەنصاریی کە پێی ئەوتـرا ( صِرمة ) - واتە کوڕی قەیس - بە رۆژوو بوو و کاری ئەکرد هەتا ئێوارەی لێ هات . هاتەوە ماڵەوە و نوێژی عیشای کرد و خەوت ، ئیتر نە نانی خوارد و نە ئاوی خواردەوە هەتا رۆژی لێ بوویەوە و ، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێ کەوت زۆر ماندوو دیار بوو بۆیە فەرمووی : (( ما لي أراكَ قد جهدت جهداً شديداً ؟ )) فەرمووی : چی‌یە وا زۆر ماندوو و هیلاك ئەت‌بینم ؟ ئەویش هەواڵەکەی دایە . هەروەها عومەریش دوای ئەوەی کە خەوی پێ‌دا کەوتبوو چووبووە لای ژنەکەی . ئەویش هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و لە پەشیمانیی کارەکەی‌دا ئەگریا و ، باسەکەی بۆ گێڕایەوە . ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی : ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ ۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾ ( البقرة : ١٨٧ ) . ناردە خوارەوە . ( رواه أبوداود في سننه ، والحاكم في مستدركه وغيرهما ) .

بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە لـە بـانگی مەغریبـەوە هـەتا فـەجر بـۆ خـواردن و خواردنەوە و ژن و مێردیی رێگـە بـە موسـڵمانان درا و ، بـە پێـی فەرمایشـت و کرداری پێغەمبەر و هاوەڵانی موسڵمانان لەسەر فەرزبوونی رۆژووی رەمەزان یـەك دەنگ بوون ..

## ( ٣ ) زەكاتی فیطر :

لە مانگی رەمەزانی هەمان ساڵدا زەکـاتی فیطـر ــ سـەر فـیترە ـ ی لەسـەر هەموو موسڵمانێکی ئازاد و بەندە و ، نێر و مێ و ، گەورە و بچووك ، فەرز کـرد

تا ئەو زەکاتە ببێتە خۆراکی فەقیر و هەژاران و ، ڕۆژووەوانیش لە گوناهەکانی کاتی بەڕۆژوو بوون ، وەك قسەی هەڵە و ناشیرین ، پاك بکاتەوە .

لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە خوا لێیان ڕازیی بێ ئەگێڕنەوە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی فیطری تەواوبوونی ڕەمەزانی لەسەر بەندە و ئازاد و، نێر و مێ و ، بچووك و گەورەی موسڵمانان فەرز کرد کە بریتیی بوو لە یەك ( صاع ) خورما یان یەك صاع جۆ . ( رواه الجماعة ) .

ئەم زەکاتە لای جومهووری ئیمامەکان فەرزە و لای حەنەفییەکان واجبە ، چونکە بە لای ئەوانەوە فەرز و واجب دوو شتی جیاوازن .

**( ٤ ) نوێژی جەژن :**

هەر لە ساڵی دووهەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جەژنیشی بەجێ هێنا .. ئەمە یەکەم نوێژێکی جەژن بوو کە بەجێی هێنا و ، بە پێی سوننەتی خۆی موسڵمانانی لە شار بردە دەرەوە بۆ (( مُصَلَّى )) و دەستیان بە وتنی : (( لا إله إلا الله )) و (( الله أكبر )) کرد و ، تەعظیمی خوای گەورەیان ، لە سوپاسی ئەو نیعمەتە یەك لە دوای یەکانەیان ، ئەکرد ، بە تایبەتیی نیعمەتی سەرکەوتن ، کە لە ڕۆژی بەدردا و لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا خوای گەورە پێشکەش بە موسڵمانانی کرد ، کە ئەوەبوو سوپای مل‌هوڕی قوڕەیش و سوپا خنجیلانەکەی ئیسلام دایان لە یەك و لووتی کافران چەقییە ناو خۆڵ و ئالای ئیسلام بە سەرکەوتوویی ئەشۆکایەوە ..

ئەوەبوو موسڵمانەکان ئەو حەربەیەیان خستە پێشی پێغەمبەری خواوە ﷺ کە نەجاشیی پێشکەشی کردبوو و ، لەوە و دواش بۆ هەموو جەژنێك ئەیان‌خستە پێشیەوە . پاشان کاربەدەستانی موسڵمانانیش ئەو کارەیان کردە دەستووری خۆیان و ، لە جەژنەکان‌دا حەربەیان ئەخستە پێش خۆیانەوە .

ئەڵێن ئەو حەربەیە هی زوبەیری کوڕی عەووام بووە ، کە نەجاشیی پێشکەشی ئەوی کردووە و ، ئەویش پێشکەشی پێغەمبەری خوای ﷺ کردووە ..

بەڵێ ، بە فەرمان‌دان بە ڕۆژوو و بە زەکاتی فیطر و بە جەژن کردن ، ئیسلام سێ دەرگای خێری لەسەر کۆمەڵی موسڵمانی نەونەمام والا کرد ، تا خێر و

خۆشیی بەسەر موسڵمانان‌دا بباریّ و ، موسڵمانان فێری چاکەکردن و دەست‌گرۆیی بین و ، هەردەم بیریان بە لای هەژارانی کۆمەڵەکەیانەوە بێت ..

یەکەم رۆژوو موسڵمان لەسەر سەخاوەت و بەخشین و بەزەیی و چاکە را ئەهێنیّ . کە خۆی برسیی بوو ، لە حاڵی ئەو هەژارانە ئاگادار ئەبێت کە هەمیشە برسی‌یانە .. کە خۆی حەزی لە خواردنێك بوو و لەبەر رۆژووەکەی نەی‌توانی تامی بکا ، بۆی دەر ئەکەوێت کە هەژاران هەمیشە حەزیان لەو جۆرە خواردنانەیە ، بەلاّم لەبەر نەبوونیی دەستیان نایان‌گاتیّ .. بەمە سۆز و بەزەیی بەرامبەر بە دەست‌کورتان لە دڵی‌دا سەوز ئەبیّ و ، دڵی بەوە خۆش ئەبیّ کە خێر و بەخشینی رەمەزان پاداشتی زۆرە ، بە تایبەت ئەگەر کەسێك خواردن بە رۆژووەوانێك پێشکەش بکات و رۆژووەکەی پیّ بکاتەوە ، ئەوا ئەوەندەی رۆژوو گرەکە پاداشت بۆ خێرۆمەندەکە ئەنووسریّ ..

دووهەمیش زەکاتی سەر فیترە ، دڵ گوشادیی و سەخاوەت و خۆش‌ویستنی موسڵمان لە دڵ‌دا دروست ئەکات و ، موسڵمانان هەر هەموویان پێکەوە جەژن ئەکەن و کەس لە خۆشیی جەژن بیّ‌بەش نابیّ .. هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جار ئامۆژگاریی موسڵمانانی ئەکرد کە با دەستی هەژاران بگرن و لە جەژن‌دا کەس موحتاج نەبیّ ، کە ئەی فەرموو : (( أغنوهم عن السؤال في هذا اليوم )) .

سیّ‌هەمیش جەژن کە ئەهات خێر و خۆشیی و سۆز و بەزەیی و بەرەکەتی لەگەڵ‌دا ئەهات .. وەك جەژنەکانی ئێستا نەبوو کە هەر کەسە هەوڵ ئەدا گران ترین جل و بەرگ بۆ منداڵەکانی خۆی بکرێت و ، ئاوڕ لە هیچ هەژارێك نەداتەوە .. رەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەها بوو کە لە نوێژی جەژن ئەبوویەوە وتاری بۆ موسڵمانان ئەدا .. قیامەتی وەبیر ئەهێنانەوە .. سەختیی دۆزەخی بۆ باس ئەکردن .. خۆشیی و نیعمەتی بەهەشتی ئەخستە بەر چاویان .. بۆ ئەمە گەورە و بچووك ، پیاو و ئافرەتی موسڵمانان دەستیان بە بەخشین ئەکرد .. هەتا ئافرەتان، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسەریان‌دا ئەدا تا خێر و صەدەقە بکەن ، بۆ دەست‌گرۆیی هەژارە موسڵمانەکان ، بەوپەڕی رەزامەندی‌یەوە هەڵمەتیان ئەدا گوارەکانیان لە گویّ‌یان دائەماڵیی و ملوانکەکانیان لە ملیان دائەکەند و ، ئەیان‌دایە دەست بیلال کە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوو ، تا کۆ بکرێتەوە و پاشان ببەخشرێتەوە ..

بوخاریی بە سەنەدی خۆی ، لە صەحیحەكەیدا ، لە ئیبن عەبباسەوە ڕیوایـەتی كردووە كە وتوویە : (( أنَّ النَّبيَّ ﷺ صلَّى يومَ الفطرِ ركعتينِ لم يُصلِّ قبلَها ولا بعدَها، ثم أتى النســاءَ ومعهُ بلالٌ فأمَرَهُنَّ بِالصدَقة ، فجَعلن يُلقِينَ : تُلقي المرأةُ خرصــها ، وسخابها )) .

## ( ٥ ) فەرزبوونی زەكات :

هەروەها لە ساڵی دووهەمی كۆچییدا خوای گەورە زەكاتی لەسەر موسـڵمانان فەرز كرد ، كە ڕوكنێكی گرنگی ئیسلامە . ئەمـە دوای مـانگی ڕەمـەزان ڕووی داوە ، چونكە فەرزبوونی زەكات دوای زەكاتی فیطر بـووە و ، زەكـاتی فیطـریـش دوای فەرزبوونی ڕۆژووی ڕەمەزان بووە . بەڵگەی ئەمەش ئەو فەرموودەیەیـە كـە ئیمامـان : ئەحمەد و ، ئیبن خوزەیمە و ، نەسسائیی و ، ئـیبن ماجـە و ، حـاكم لـە قەیسی كوڕی سەعدی كوڕی عویـادەوە گێڕاویانەتـەوە كـە وتوویـە : بـەر لـەوەی زەكات فەرز ببێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەسـەرمان‌دا دا كـە صـەدەقەی فیطر دەربكەین ، پاشان زەكات فەرز كرا ، ئێمە صەدەقەی فیطرمـان دەر ئـەكرد و، ئەویش نە فەرمانی پێ ئەدایـن و نە قەدەغەی ئەكردین .. ئیبن حەجەر وتوویە : (( إسناده صحيح )) ( فتح الباري : ٣ / ٢٠٧ ) .

بەڵێ ، فەرزبوونی زەكات بە قورئان و سوننەت و ئیجماع چەسپاوە .. هـاوەڵان لەسەر كوشتاری زەكات نەدەر یەكدەنگ بوون .

بوخاریی و موسلیم و غەیری ئەوانیش لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان كردووە كـە وتوویـە : كـاتێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ كۆچـی دوایـی كـرد و ، ئەبوبـەكر بـووە كاربەدەست و ، ئەو عەرەبانەی كە كافر بووبوونـەوە پاشـگەز بوونـەوە ، عومـەر فەرمووی : چۆن كوشتاری ئەو خەڵكە ئەكەیت لە كاتێكدا كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویە : (( أُمرتُ أَن أُقاتل الناسَ حتى يَقولوا : لا إلهَ إلا الله ، فمَن قالها فَقَـد عَصَمَ مِنِّي مالَه ونفسَه إلا بِحَقِّه وَحسابُه على الله )) ؟

ئەبوبەكر فەرمووی : بەخوا كوشتاری ئەوانە ئەكەم كە نوێژ و زەكات لێك جیـا ئەكەنەوە ، چونكە زەكات مافی سامانە . بەخوا ئەگەر گیسكێك یـان پـەتێكیان دابێ بە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئێستە لە منی بگرنەوە ، لەسـەر ئـەوە ئەچم بـە گژیاندا .. عومەر ئەفەرموێ : بەخوا هەر ئەوەندە بوو بۆم دەركـەوت كـە خـوای

گەورە دڵی ئەبوبەکری خستۆتە سەر ئەو رایە کە ( لەگەڵ پاشگەزبووەکان‌دا ) بجەنگێت . ئیتر زانیم ئەوە حەق و راستی‌یە ..

پاشان قورئانی پیرۆز بە حەکیمانە دیاریی کرد کە زەکات بە کێ بدرێت .. هەشت تاقمەی دیاریی کرد تا موسڵمانان زەکاتی خۆیان بخەنە مشتیانەوە :

﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾ ( التوبة : ٦٠ ) .

ئەوەبوو خەلیفە عومەر لە سەردەمی خەلافەتی خۆی‌دا ، کە موسڵمانان بەهێز بوون ، بەشی ئەوانەی بڕیی کە بۆ دڵدانەوەیان تا دژایەتیی ئیسلام نەکەن ، بۆیان دیاریی کرابوو ، چونکە ئیتر ئیسلام پێویستیی بە دڵ ڕاگیرکردنی ئەوانە نەمابوو .. جا جومهووری فەقیهەکان لەسەر ئەوەن کە ئەو بەشە کۆتایی پێ هاتووە ، بەڵام هەندێك رایان وایە کە هەر کاتێ موسڵمانان لەو قۆناغەدا بوون پێویستە بەشی ئەو جۆرانە دیاریی بکەن .

ئەم دەستوورە جوانەی ئیسلام لەو چەرخە دوورەدا جێی سەرنجە .. بە راستیی خوای گەورە دینێکی پاك و بێگەردی پێشکەش بە موسڵمانان کردووە ، تا تێکڕای مرۆڤ لە سایەی‌دا بحەسێنەوە . بە تایبەتیی فەرزکردنی زەکات کە لەو رۆژەدا بەشێکی زۆری دانیشتوانی دوورگەی عەرەبیی ، بگرە سەرتاسەری جیهان هەژار و دەست کورت بوون و بە زەکات‌دان هەژار و دەست‌کورتان ئەبووژانەوە و ، هەستیان بە سۆز ئەکرد .. سۆزی پەروەردگار و ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ و ، خوشك و برای ئیمان‌داری دەوڵەمەندیان .. هەستیان ئەکرد دینی تازە بۆ راستیی و یەکسانیی و دادپەروەریی هاتووە .. مافی مرۆڤ لە سایەی‌دا مسۆگەرە ..

کە پێغەمبەری خوا ﷺ موعاذی بە کاربەدەست نارد بۆ یەمەن پێی‌فەرموو : (( أخبرهم أن الله فرض عليهم صدقة تؤخذ من أغنيائهم ، وترد إلى فقرائهم )) . رواه البخاري .. فەرمووی : پێ‌یان رابگەیەنە کە خوای گەورە زەکاتی لەسەریان فەرز کردووە ، تا لە دەوڵەمەندەکانیان وەربگیرێت و بدرێتەوە بە هەژارەکانیان ..

ئەمڕۆش مرۆڤێکی زۆر برسیی و ئاتاج لەسەر زەوییدا بە کولەمەرگیی ئەژین و ، دەوڵەمەندەکانیش پارە و پوولیان لە ژمارە نایەت و بە هیچ جۆرێك بنی

ئایەت ، کەچیی جگە لەو دەوڵەمەندە ئیماندارانەی کە چاوەڕوانی پاداشتی قیامەتن ، هیچ کەس ئاوڕ لە هەژارێك ناداتەوە .. خۆ ئەگەر بە پێی شەریعەتی ئیسلام زەکات بدرێت ، ئەوا نە هەژاریی .. نە برسێتیی .. نە ئاتاجیی .. نە نەخۆشیی .. نە نەخوێندەواریی لەسەر زەویی‌دا نامێنێ .. چونکە هەژاریی کۆسپێکی گەورەیە لە ڕێی چارەسەریی نەخۆشیی‌دا .. بگرە هەژاریی کانگای بڵاوبوونەوەی نەخۆشی‌یە ، هەروەك خەڵکێکی زۆریش لەبەر دەستکورتیی و گوزەرانی تاڵ توانای خوێندنیان نیە ..

## ( ٦ ) غەزای ئەبواء یان وەددان :

ئەم غەزایە یەکەم غەزای پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بوو ، کە لە مانگی صەفەری ساڵی دووهەمی کۆچیی‌دا ، بەرامبەر بە مانگی ئابی ساڵی ( ٦٢٣ ) ی زاینیی‌دا ڕووی دا .. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ حەفتا لە هاوەڵانی لە مەدینە دەرچوون و سەعدی کوڕی عوبادەی سەرۆکی خەزرەجی کردە جێ‌نشینی خۆی لەسەر مەدینە .. بۆ ئەوە دەرچوون هەتا ڕێ لە کاروانێکی قوڕەیش بگرن .. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە وەددان ، [٣٢٦] ئەبینن کاروانەکە لە دەستیان دەرچووە .. ئاڵای ئەو سوپایە سپیی بوو و ، حەمزەی شێری خوا هەڵی گرتبوو .

لەم غەزایەدا پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی دۆستایەتیی لەگەڵ مەخشیی کوڕی عەمری ضەمریی‌دا بەست ، کە لە سەردەمی خۆی‌دا سەرۆکی نەوەی ضەمرە بوو .. پەیمانی لەگەڵدا بەستن تا لە خۆیان و سامانیان بێ‌خەم بن و ، هەرکەس بێتە سەریان موسڵمانان لەسەریان ئەکەنەوە و ، پێویستە ئەوانیش بێن بە هانای موسڵمانەکانەوە .. ئەم پەیمانە یەکەم پەیمان بوو دوای پەیمانەکەی نێوان موسڵمانان و جوولەکەی مەدینە و، سەرکەوتنێکی باشیشی بۆ موسڵمانان بە دەست هێنا .. ئەمەش دەقی ئەو پەیمانەیە :

(( هذا كتاب من محمد رسول الله لبني ضمرة ، فإنهم آمنون على أموالهم وأنفسهم ، وإن لهم النصرَ على من رامهم ، إلا أن يحاربوا دينَ الله ، ما بلَّ بحرٌ صوفة ، وإن النبي إذا دعاهم لنصره أجابوه )) .

بۆ ئەم غەزایە موسڵمانەکان پانزە شەویان پێ چوو ..

[٣٢٦] وەددان : شوێنێکە لە نێوان مەککە و مەدینەدا و بیست و نۆ میل لە ( رابوغ ) ە وە دوورە . ئەبواء یش لە نزیکی ئەودایە .

( ٧ ) **غەزای ( بواط ) :**

پێغەمبەر و هاوەڵان لە مەدینەدا بوون هەتا مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی دووهەمی کۆچیی ، بەرامبەر بە مانگی ئەیلوولی ساڵی (٦٢٣).ی زایینیی . ئەوەبوو بەرگوێیان کەوت کە کاروانێکی قورەیش لە شامەوە گەڕاوەتەوە و، ئومەییەی کوڕی خەلەف و، صەد پیاوی قورەیش و، دوو هەزار و پێنج صەد وشتری بەبارەوە لەگەڵدان . بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و دووصەد هاوەڵییەوە لە مەدینە دەرچوون و ، سەعدی کوڕی موعاذی سەرۆکی ئەوسیشی کردە جێنشینی خۆی لەسەر مەدینە و ، ئاڵای ئەم سوپایەش ئاڵایەکی سپیی بوو و، درابوویە دەست سەعدی کوڕی ئەبووەققاص .. بە پەلە رۆیشتن هەتا گەیشتنە ( بواط ) ، کە چیایەکە لە زنجیرە چیاکانی جوهەینە و لە نزیک ( ینبع ) دایە ، بەڵام ئومەییە بیستبووی کە موسڵمانەکان نیازیانە رێی پێ بگرن ، بۆیە بە پەلە لە کاروانەکە خوڕیی و لە دەستی موسڵمانەکان دەربازی کرد ..

( ٨ ) **غەزای عوشەیرە :**

لە مانگی جومادی یەکەم و دووهەمی ساڵی دووهەمی کۆچیی‌دا ، بەرامبەر بە مانگی تەشرینی دووهەم و کانوونی یەکەمی ساڵی ( ٦٢٣ ) ی زایینیی دەنگ و باس گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ کە قورەیش گەورەترین کاروانیان خستۆتە رێ و، چیی ماڵ و سامانیان هەیە هەر هەموویان لەگەڵ ئەم کاروانەدا رەوانە کردووە و ، ئەبوسفیانی کوڕی حەربیش کاربەدەستی ئەم کاروانەیە و بیست و ئەوەندە پیاوی قورەیشییشی لەگەڵ دایە و ، بەرەو شام کەوتوونەتە رێ ..

بە گەیشتنی ئەم هەواڵە پێغەمبەری خوا لەگەڵ صەد و پەنجا ، هەندێکیش ئەڵێن : دووصەد هاوەڵی موهاجیردا لە مەدینە دەرچوون و ، زۆریشی لە کەس نەکرد بۆ دەرچوون. ئەم سوپایە سیی وشتریان پێ بوو کە بە نۆرە سواریان ئەبوون..

لەم غەزایەدا پێغەمبەری خوا ﷺ کاروباری مەدینەی بە دەست ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومیی سپارد و ، ئاڵای سوپاکەشی دایە دەست حەمزەی مامی . هەروا بە نهێنیی رۆیشتن ، کە بە شەودا ئەرۆیشتن و ، بە رۆژدا خۆیان حەشار ئەدا هەتا گەیشتنە عوشەیرە ، کە شوێنێکە لەلای ( ینبع )ەوە . کە گەیشتن دییان وا کاروانەکەیان لە دەست دەرچووە ، چونکە قورەیش وریا بووبوونەوە و سیخوڕیان بەو ناوەدا بڵاو کردبوویەوە .

شایانی باسە کە هەر ئەم کاروانە بوو لەو سەرەوە لە شامەوە گەڕایەوە و موسڵمانەکان ڕێیان پێ گرت و ، بووە هۆی بەرپابوونی جەنگی بەدری گەورە ..

لە کاتی گەڕانەوەیدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بەو شێوەی کە پەیمانی دۆستایەتیی لەگەڵ نەوەی ضەمرەدا بەست ، پەیمانی دۆستایەتییشی لەگەڵ نەوەی مەدلەج و هاوپەیمانەکانیاندا بەست . بەمە هۆزێکی تری سەرەڕێی کاروانەکانی قورەیشی کردە دۆستی ئیسلام و موسڵمانەکان ، بۆ ئەوەی ئەم هۆزانە نەبنە پشت گیری قورەیش .

**( ٩ ) غەزای بەدری یەکەم ( غەزای سەفوان ) :**

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای عوشەیرە گەڕایەوە ، دوای چەند شەوێك کوزری کوڕی جابیری فیهریی بە خۆی و چەند چەکدارێکی بت پەرستەوە هێرشیان کردە سەر سەرح کە لەوەڕگای مەدینە بوو ، تا ئەوەی کە دەستی ئەیگاتێ لە مەڕومالاّت بە تالاّن بیبات . کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بیست بە خۆی و حەفتا کەس لە هاوەڵانەوە کەوتنە سەریان ، دوای ئەوەی کە زەیدی کوڕی حاریثەی خزمەتگوزاری کردە جێنشینی خۆی لەسەر مەدینە و ، ئالاّیەکی سپییشی دایە دەست ئیمام عەلیی . ئەوەبوو ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە سەفوان لە ناوچەی بەدر ، بەلاّم کورز ڕای کردبوو و ئەمان فریای نەکەوتن .

پێغەمبەری خوا ﷺ بەم کردەوەیەی سەلماندی کە موسڵمانان خاوەنی هێزێکی ئەوتۆن کە ناهێڵن هیچ کەس دەستدرێژییان بکاتە سەر و ، ئەوەی بیر لە دژایەتییان بکاتەوە لە دەستیان دەرباز نابێت .

لە ( الرحيق المختوم ) دا وەها هاتووە کە ئەم غەزایە لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی دووهەمی کۆچییدا ، بەرامبەر بە مانگی ئەیلوولی ساڵی ( ٦٢٣ ) ی زاینیی ، ڕووی دابێ ..

**(١٠) سریەی عەبدوڵلاّی کوڕی جەحش ( نەخلە ) :**

لە مانگی ڕەجەبی ساڵی دووهەمی کۆچییدا ، بەرامبەر بە ساڵی ( ٦٢٤ ) ی زاینیی ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەشت یان حەوت لە هاوەڵانی[٣٢٧] بە سەرکردایەتیی

---

[٣٢٧] کە ئەمانە بوون : ئەبوحوذەیفەی کوڕی عوتبە و ، عوکاشەی کوڕی میحصەن و ، عوتبەی کوڕی غەزوان و ، سەعدی کوڕی ئەبووەققاص و ، عامیری کوڕی ڕەبیعە و ، واقیدی کوڕی عەبدوڵلاّی تەمیمیی و ، خالیدی کوڕی بوکەیر و ، سوهەیلی کوڕی بەیضای فیهریی

عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی ئەسەدیی ڕەوانە کرد و ، نامەیەکی داخراوی دایە دەست عەبدوڵڵا و پێی فەرموو :

(( لا تفتحه إلا بعد يومين ، فإذا فتحته فامضِ لما أمرتك به ، ولا تستكره أحداً من أصحابك )) . پێی فەرموو : دوای ئەوەی کە دوو ڕۆژ ڕێت بڕیی ئەوسا نامەکە بخوێنەرەوە . کە خوێندتەوە بچۆ بە دەم ئەو کارەوە کە فەرمانم داوە بە سەرت دا ، بەڵام هیچ یەکێ لە هاوەڵانت ناچار مەکە .

کە ماوەی دوو ڕۆژ ڕێ ڕۆیشتن نامەکەی خوێندەوە ، ئەبینێ تیایا نووسراوە :

(( إذا نظرت في كتابي هذا فامض حتى تنـزل نخلة بين مكة والطائف ، فترصَّد بها قريشاً و تعلَّم لَنا مِن أخبارهم )) .

فەرمووبووی : کە ئەم نامەیەمت خوێندەوە ئەوا تا نەخلەی نێوان مەککە و طائیف بڕۆ و ، چاودێریی کاروانی قوڕەیش بکە و هەواڵیان بۆمان بزانە ..

کە نامەکەی خوێندەوە وتی (( سمعاً و طاعة )) . هەواڵیشی بە هاوەڵانی دا کە نامەکە چیی تێدا نووسرابوو و ، پێیشی وتن کە لەوە قەدەغەی کردووە ئەوان ناچاری ڕۆیشتن بکا . جا هەرکەس شەهیدیی ئەوێ و حەزی لێیەتی ئەوا با بکەوێتە ڕێ و ، کێش پێی ناخۆشە با بگەڕێتەوە . وا من خۆم بە دوای فەرمانی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەڕۆم .. هاوەڵانی هەر هەموو بە ویستی خۆیان کەوتنە گەڵی و هیچ کەسیان دوانەکەوت .[٣٢٨]

ئەو شوێنە یەکجار لە مەدینەوە دوور بوو ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دانیشتوانی مەککە ئەیانزانیی موسڵمانەکان لە ڕێگرتن لە کاروانەکانیان یەکجار چالاکن ، ئەوا خۆیان زۆر لێیان ئەپاراست و ، هەوڵیان ئەدا موسڵمانەکان هەواڵی هات و چۆیان نەزانن ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شوێنە دوورەی هەڵ بژارد ، تا هەر چۆن بووە قوڕەیش نەتوانن کاریان لەو بشارنەوە . لە هەمووی گرنگ‌تر ئەو نەخشە جوانە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاوەڵەکانی کێشا کە بە هیچ کامیانی نەفەرمووە بۆ کوێ ئەچن ، بەڵکو فەرمووی دوو ڕۆژ ڕێ ببڕن ئەوسا نامەکەی هەڵ بپچڕن و بیخوێننەوە ، تا بە هیچ شێوەیەك گەشتەکەیان ئاشکرا نەبێ و بە

[٣٢٨] لە ( الرحيق المختوم ) دا هاتووە کە عەبدوڵڵا سەرکردەی دوانزە هاوەڵی موهاجیر بووە و ، هەر دوانیان بە ره سواری وشترێك بوون .

قورەیش نەگاتەوە کۆمەڵێکی حەوت هەشت کەسیی گەیشتوونەتە ناوچەی ( نەخلە ) ی نێوان مەککە و طائیف و ، هەڵمەتیان بۆ ببات و لەو شوێنە دوورەدا بیان کوژێت ..

دەستە موسڵمانەکە رۆیشتن هەتا گەیشتنە شوێنێك کە پێی ئەوترا (( بەحران )) لەوێ سەعدی کوڕی ئەبووەققاص و عوتبەی کوڕی غەزوان وشترەکەی خۆیان کە بە نۆرە سواری ئەبوون لێ ون بوو و ، بە هۆی گەڕان بە دوایدا بەجێ مان و ، ئەوانی تر لەسەر رەوتی خۆیان بەردەوام بوون هەتا گەیشتنە نەخلە . ئەوەبوو لەو کاتەدا کاروانێکی قورەیش بە کەلوپەل و بازرگانییەوە تێپەڕی کرد کە عەمری کوڕی حەضرەمیی و ، عوثمان و نەوفەلی کوڕانی عەبدوڵڵای کوڕی موغیرە و ، حەکەمی کوڕی کەیسانی خزمەتگوزاری نەوەی موغیرەی لەگەڵدا بوون . کە قورەیشییەکان چاویان بە موسڵمانەکان کەوت و ، لە نزیکیانا باریان خسبوو ، ترسان .. بەڵام کە عوکاشە لێیان نزیك کەوتەوە و سەریشی تاشیی بوو ، ترسیان نەما و وتیان : بۆ عەمرە هاتوون و مەترسییان لێ ناکرێ ..

موسڵمانەکان کەوتنە تەگبیر و راوێژ ، چونکە لە دوارۆژی مانگی رەجەبدا بوون ،[٣٢٩] وتیان : بەخوا ئەگەر ئەمشەو وازیان لێ بهێنن ئەچنە ناو حەرەمەوە و، خۆیان لە دەستتان پێی رزگار ئەکەن . ئەگەر بیشیان کوژن ئەوا لە مانگی حەرام دا کوشتووتانن .

موسڵمانەکان دوودڵ مان و نەشیان ئەوێرا دەستیان بۆ بەرن ، پاشان غیرەتیان خستە بەر خۆیان و رایان هاتە سەر ئەوە کە بیانکوژن و چییان پێیە لێیان بستێنن . ئەوەبوو واقیدی کوڕی عەبدوڵڵای تەمیمیی تیرێکی گرتە عەمری کوڕی حەضرەمیی و کوشتی و، عوثمان و حەکەمیان بە دیل گرتن و ، نەوفەل لە دەستیان دەرباز بوو .. پاشان کاروانەکەیان دایە بەر و ، بە دوو دیلەکەوە گەڕانەوە مەدینە و هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .. ئەمە یەکەم کەسێك بوو کە بە دەستی موسڵمانەکان بکوژرێت و ، یەکەم جاریش بوو کە موسڵمانان لە کافران دیل بگرن .

---

[٣٢٩] ئەمشەو کە گەیشتمە سەر ئەم باسە شەوی بیست و نۆیەمی مانگی رەجەبی ساڵی ١٤٢٤ ی کۆچیی بوو ، بەرامبەر بە شەوی بیست و پێنجەمی مانگی ئەیلوولی ساڵی ٢٠٠٣ ی زایینیی .. هەر ئەمشەویش ئاگاداری ئەو باسە بووم و ئەو بەروارەم لەوە و پێش نەئەزانی .

که پێغەمبەری خوا ﷺ زانیی لە مانگی لە ڕەجەبدا کوشتاریان کردووە ، فەرمووی : (( ما أمرتكم بقتال في الشهر الحرام )) . فەرمووی : فەرمانم پێتان نەداوە لە مانگی حەرامدا کوشتار بکەن . کاروانەکەش و دیلەکانیشی ڕاگرتن و ، هیچی لێیان گل نەدایەوە .. پیاوانی سریەکە گیریان خوارد .. وەهایان زانیی کە تیا چوون .. موسڵمانەکانیش کەوتنە بۆڵە و لۆمەکردنیان کەوا کارێکی چاکیان نەکردووە . لە هەمان کات دا بتپەرستەکان هەلیان دەست کەوت تا موسڵمانەکان تاوانبار بکەن و ، تانەیان لێ بدەن و بڵێن : موحەممەد و هاوەڵانی حورمەتی مانگەکانی حەرامیان شکاندووە و ، خوێنیان ڕێژاوە و ، دەستیان بە سەر ماڵ و ساماندا گرتووە و ، پیاویان بە دیل گرتووە .. لە هەمووی خراپتر جوولەکە و مونافیقەکانی مەدینە پاگاندەیان ئەکرد و ئاگری ئاژاوەیان خۆش ئەکرد ..

لەم هەڵوێستە ناسکەدا پێغەمبەر و موسڵمانەکان ئەژیان .. نەفامان و جوولەکە و مونافیقان خەریك بوو ئەم ڕووداوە بکەنە تاوان بۆ موسڵمانان و ، خۆیان و بانگەوازەکەیان بشکێنن .. ئا لەم کاتەدا سۆزی بەلێشاوی پەروەردگار جوولاً و جیبریلی ئەمینی ڕەوانە کرد تا وەحی بۆ ئازیز بهێنێ .. تا خەم و خەفەتی دڵەکانیان بڕەوێتەوە و، ڕەزامەندیی خوا لەم کارەدا دەر بخات و ، ئەم کارەی کۆمەڵە موسڵمانەکە بە چاك لە قەڵەم بدات ، چونکە کافران تاوانی گەورەتریان ئەنجام داوە و ، موسڵمانان ناچار بوون دەست لە قوڕەیش بووەشێنن ، چونکە ساڵەهای ساڵە قوڕەیش ئاڵای دژایەتیی قورئانی هەڵ گرتووە و بە هیچ شێوەیەك دەست بەرداری موسڵمانەکان نابێت ، چ لە مەککەدا و چ لە مەدینەدا و ناهێڵێ لە مزگەوتی حەرامدا خواپەرستیی ئەنجام بدەن .. قوڕەیش یەکجار تاوان بارە ، چونکە دژی ڕێبازی خوا وەستاوە و ، موسڵمانانی بەبێ تاوان لە پەنای کەعبەدا دەرپەڕاندووە و ، هەوڵیشی داوە لە دین پەشیمانیان بکاتەوە . بە بۆنەی ئەم تاوانە گەورانەوە قوڕەیش بە ستەمکار لە قەڵەم ئەدرێ و خوای گەورە چاوپۆشیی لە موسڵمانە ناچارەکان ئەکات کە لە مانگی حەرامدا کوشتاریان کردووە :

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ

ٱلۡقَتۡلِۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْۚ وَمَن يَرۡتَدِدۡ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتۡ وَهُوَ كَافِرٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾

( البقرة : ٢١٧ ـ ٢١٨ ) .

بەم شێوەیە قورئانی پیرۆز گلەیی و لۆمەی لەسەر ئەو کۆمەڵە ئیمان‌دارە لا برد ، کە لەوپەڕی جوامێریی و ئازایەتیی‌دا دەستیان بە دینەکەیانەوە گرتبوو ، و بەوپەڕی غیرەتەوە فەرمانی ئازیزیان بەجێ هێنا بوو و گەیشتبوونە ئەو شوێنە دوورە و لەوێ ترس و لەرزیان ئەختستە دڵی دوژمنەوە .

بە هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز خەم و خەفەت لەسەر دڵی پێغەمبەر و هاوەڵانی و کۆمەڵە هێرش بەرەکە رەوی‌یەوە . ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ کاروانەکە و دیلەکانی گل دانەوە و ، قورەیشیش فیدیەی بۆ بەردانی دوو دیلەکە نارد ، بەلآم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لا نفديكموها حتى يقدم صاحبانا ــ يريد سعدا وعتبة ــ فإنا نخشاكم عليهما ، فإن قتلتموهما نقتل صاحبيكم )) . فەرمووی : هەتا سەعد و عوتبە نەگەڕێنەوە فیدیەتان لێ وەرناگرین ، چونکە ئەترسین بیان‌کوژن . خۆ ئەگەر ئێوە ئەوانتان کوشت ، ئەوا ئێمەش ئەم دوو دیلەتان ئەکوژینەوە ..

ئەوەبوو سەعد و عوتبە بە هۆی ونبوونی وشترەکەیانەوە لە هاوەڵانیان بڕ بووبوون و دواش کەوتبوون .. کە سەعد و عوتبە بە سەلامەتیی گەیشتنەوە مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فیدیەی بۆ جووتە دیلەکە وەرگرت و ، ئازادی کردن ، هەروەها خوێنی کوژراوەکەشی دا بە کەس‌وکاری .

یەکێك لەو جووتە دیلە کە حەکەمی کوڕی کەیسان بوو ، کە بەر درا هەر لە مەدینە مایەوە و ، بە چاکیی موسڵمان بوو ، تا ئەوەبوو لەگەڵ شەهیدانی بیری مەعوونە ئەویش بە شەهیدیی سەری نایەوە ، وەك لە دواوە بە درێژە باسی دێت..

ئەوی تریشیان کە عوثمانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موغیرە بوو ، گەڕایەوە و لەوێ بە کافریی سەری نایەوە ..[٣٣٠]

[٣٣٠] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ١٠٣ ـ ١٢٢ ، والرحيق المختوم : ٢٠١ ـ ٢٠٦ .

## بەشی بیست و سێ‌هەم
# غـەزای بـەدری گـەورە

پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانەکان چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەو کاروانە گەورەی قوڕەیش بوون کە لە غـەزای عوشـەیرەدا لـە دەسـتیان دەرچـوو و ، ئەبوسـوفیان سەرکردەی بوو و ، بریتیی بـوو لـە بـاری هـەزار وشـتر ، کـە زۆربـەی سـامانی قوڕەیشی تێدا بوو .. چاوەڕوان بوون لە شامەوە بگەڕێتەوە و ڕێـی پـێ بگـرن و ، زیانێکی گەورە لە قوڕەیشی دوژمـن بدەن ، کە هەمیشە بۆ هەل ئەگەڕا تا دەسـت لە موسـڵمانەکان بووەشـێنێ .. بـۆ ئـەوە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دوو پیـاوی لـە هاوەڵانی ، کە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلاّ و سەعیدی کوڕی زەید بـوون ، نـارد بـۆ حەوراء لەسەر دەریای سوور ، کە یەکێ بوو لەو وێسـتگانەی کاروانـەکانی نێـوان شام و حیجاز تیایا ئەوەستان و ، هەر ئەبوا لـەوێوە تێپـەڕ بکـەن .. نـاردنی تـا هەواڵی کاروانەکەی بۆ وەربگـرن .. ئـەوانیش بـە ژیرانـە توانی‌یـان دڵـی هـۆزی جوهەینە نەرم بکەن و ، لەو نـاوەدا هـەواڵ وەربگـرن کـە چ کاتێـك کاروانەکـەی ئەبوسوفیان لە شام دەرچووە . ئیتر گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەر و هەواڵیان دایە . ئەشڵێن لەوێ مانەتەوە هەتا کاروانەکەی قوڕەیش بە لایـاندا تـێ ئەپـەڕێت و ، ئەوسا ئەوانیش ئەگەڕێنەوە مەدینە و هەواڵەکە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەیەنن .

هەروەها وتوویانە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ چـاوەڕوانیی گەڕانـەوەی جووتـە نێرراوەکەی نەکردووە ، بەڵکو بڕیاری داوە لە مەدینەوە بەرەو ڕێی شـام و حیجـاز بکەوێتە ڕێ ، نەوەکو کاروانەکە ، وەك لەو سەرەوە لـە دەسـتیان دەرچـوو ، لـەم سەریشەوە لە دەستیان دەرچێ ، بە تایبەت کە سامانی ئەو کاروانە بە پەنجا هەزار دیناری زێڕ مەزەندە ئەکرا ..

پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی ئاگادار کرد کە نیازی وەهایە بکەوێتە ڕێ و هەر هاوەڵێکیش ویستی لێیە با دەرچێت ، بەڵام بەبێ ناچارکردن . ئەوەبوو فەرمووی : (( هذه عير قريش ، فاخرجوا إليها لعل الله أن ينفلكموها )) . فەرمووی : ئەوە کاروانەکەی قوڕەیشە ، ڕێی پێ بگرن ، بەڵکو خوای گەورە دەستتانی بخات .

هەندێك لە هاوەڵان سووك و ئاسان خۆیان ئامادە کرد و ، هەندێکیش بە ئاسایی گوێیان نەدایە و ، وەها بیریان ئەکردەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نیازی جەنگی نیە ، بە تایبەت کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا هەر کەس ولاغەکەی ئامادەیە با لەگەڵیانا بکەوێتە ڕێ ، کە فەرمووی : (( من كان ظهره حاضراً فليركب معنا )) . ئیتر چاوەڕوانی ئەوانەی نەکرد کە ولاغەکەیان ئامادە نەبوو .

ئەوەبوو کە کەوتنە ڕێ سێ یان هەشت شەوی ڕەمەزان تێپەڕی بوون .. ژمارەی موسڵمانە بەشدارەکانی غەزای بەدریش ئەگەیشتە سێصەد و سیانزە کەس کە دووصەد و چل و ئەوەندەیان لە ئەنصار و ، ئەوانی تریان لە موهاجیرین بوون .[331]

لەم پیاوانە تەنها عوثمانی کوڕی عەففان دوا کەوت و لە مەدینە مایەوە ، ئەویش بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ تا چارەسەریی هاوسەرەکەی ، ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ، بکات کە نەخۆشی یەکەی لەسەری کۆی گرتبوو .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوومی ، کە هاوەڵێکی پایەداری مەککە بوو و ، چاویشی نابینا بوون ، لە مەدینە بەجێ هێشت تا پێش

---

[331] لە کتێبی ( غزوة بدر الكبرى ) ی مامۆستا محمد أحمد باشمیلدا وا هاتووە کە ژمارەی سوپای مەدینە سێصەد و حەڤدە پیاو بووە ، کە دوو صەد و سیی و یەکیان ئەنصار و موهاجیرەکانیش هەشتا و شەش بوون ، ئەنصاریش صەد و حەفتایان لە خەزرەج و شەصت و یەکیان لە ئەوس بوون . موهاجیرەکانیش تەنها چل و یەك پیاویان قوڕەیشیی بوون : لە نەوەی هاشم سیان و ، لە نەوەی موطەللیب چوار و ، لە عەبد شەمس پیاوێك و ، لە نەوەی عەبدولعوززا پیاوێك و ، لە نەوەی عەبدوددار دوان و ، لە نەوەی زوهەرە سیان و ، لە نەوەی تەیم پیاوێك و ، لە نەوەی مەخزووم سیان و ، لە نەوەی عەدیی چوار و ، لە نەوەی جومەح پێنج و ، لە نەوەی سەهم پیاوێك و ، لە نەوەی عامیر پێنج و ، لە نەوەی حاریثیش شەش پیاو . ئیتر ئەوانی تر هاوپەیمان و بەندەکانیان بوون . مامۆستا محمد فتح الله گولەنیش لە ( مجموعة الأدعية المأثورة ) دا ناوی بەشداربووانی غەزای بەدری گەورەی یەك بە یەك هێناوە ، بەڵام لای ئەو ژمارەی سەربازان سێ صەد و هەژدە پیاوە ، کە هەشتا و حەوتیان کۆچ کردووی مەککەن و ، دووصەد و سیی و یەکیشیان لە ئەنصارن ، کە حەفتا و یەکیان لە ئەوس و صەد و شەصتیشیان لە خەزرەجن . ( سەیری کتێبی (( القلوب الضارعة )) ص٢٣٦ بکە ) .

نوێژیی بۆ خەڵکەکە بکات و ، کاتێکیش گەیشتنە ڕەوحاء ئەبولوبابەی لەوێوە گێڕایەوە و کردیە ئەمیری قوباء و عالیە .

کە سوپای ئیسلام لە مەدینە دەرچوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڵای فەرماندەی گشتیی دایە دەست موصعەبی کوڕی عومەیری قوڕەیشیی ، کە ئاڵایەکی سپیی بوو . هەروەها لەسەر بنەمای هۆزایەتیی سوپای کردە دوو کەتیبەوە کەتیبەی موهاجیرین کە ئاڵاکەی دایە دەست عەلیی کوڕی ئەبوطالیب و ، کەتیبەی ئەنصاریش کە ئاڵاکەی دایە دەست سەعدی کوڕی موعاذ و ، سەرکردایەتیی گشتیی سوپاش لە دەستی خۆیدا بوو بە شێوەی فەرماندەی باڵای سوپا .. ئەم دوو ئاڵایەش ڕەش بوون . هەروەها فەرماندەیی دەستە ڕاستی سوپای دایە دەست زوبەیری کوڕی عەووام و ، هی دەستە چەپیشی دایە دەست میقدادی کوڕی عەمری کیندیی کە میقدادی کوڕی ئەسوەدیشی پێ ئەوترێت ، کە تەنها ئەم دوانە ئەسپ سوار بوون لە سوپای مەدینەدا . هەروەها فەرماندەیی پاشکۆی سوپای دایە دەست قەیسی کوڕی ئەبوصەعصەعە .

شایانی باسە کە سوپای مەدینە لەگەڵ ئەو دوو ئەسپەدا تەنها حەفتا وشتریشیان پێ بوو ، کە هەر سێ چوار پیاو بە نۆرە سواری یەکێ لەو وشترانە ئەبوون ..

جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئیمام عەلیی و ئەبولوبابەدا وشترێکیان هەبوو ، کاتێك کە ئەبولوبابە گەڕایەوە بۆ مەدینە مورثیدی کوڕی ئەبومورثید هاتە جێگەی . پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەم دوو هاوەڵەیدا ئەوپەڕی عەدالەت و بەزەیی بە کار هێنا .. ئەوەبوو کە نۆرەی هات بە پێ بچێ بەڕێوە هەردوو هاوەڵەکە ئامادەیی‌یان دەربڕیی کە با ئەو بە پێ نەچێ بەڕێوە و ئەوان بەشە سوارییەکەی خۆیان ئەبەخشن بەو .. دیارە ئەو سەفەرە دوور و درێژ بووە و ، هاوەڵانیش نە خۆراك و نە پێڵاوی چاکیان پێ نەبووە .

کەچیی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ما أنتما بأقوى مني ، ولا أنا بأغنى عن الأجر منكما )) . فەرمووی : ئێوەش وەك من پێویستتان بە حەسانەوە و پشوودان هەیە و ، منیش وەك ئێوە پێویستم بە ئەجر و پاداشت هەیە .. هەروەها ئەبوبەکر و عومەر و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بە نۆرە سواری وشترێك ئەبوون و ، حەمزە و زەیدی کوڕی حاریثە و ئەبوکەبشە و ئەنەسەش وشترێك ..

سوپای ئیمان سوپایەکی بچکۆلە بوو ، بەلاّم خاوەنی ورە و هێزێکی مەزن بوو .. مەلائیکەتەکان لەوپەڕی شادمانییدا بوون کاتیّ کە ئالاّی سوپای تەوحیدیان ئەدیی و ئەشۆکایەوە ، چونکە دەمێك بوو سەرزەویی سوپای تەوحیدی تیا نەبوو ..

ئەم سوپا بەرێز و نییەت پاکە کەوتە ریّ تا ئەوەبوو گەیشتە قەراغی مەدینە و ، لەویّ جەم بوو و ، پێغەمبەر ﷺ سەربازەکانی بەسەر کردنەوە تا بزانیّ کێی لەگەلاّ هاتووە .. هەر لەویّ ئەوانەی گێڕایە دواوە کە منداڵ بوون و بەرگەی جەنگیان نەئەگرت ، وەك بەرائی کوڕی عازیب و ، عەبدوڵلاّی کوڕی عومەر . لە صەحیحی بوخارییدا لە بەرائەوە هاتووە کە وتوویە : من و ئیبن عومەر لە رۆژی بەدردا بە بچووك لە قەڵەم دراین . رۆژی بەدر موهاجیرەکان شەصت و ئەوەندە ئەبوون و ، ئەنصاریش دووصەد و چل و ئەوەندە ئەبوون . ( صحيح البخاري ـــ كتاب المغازي ـ باب عدة أصحاب بدر ) .

هەروەها لە بەرائەوە گێڕراوەتەوە کە وتوویە : هاوەلاّنی بەدر ئەوەندەی ژمارەی سوپاکەی طالوت بوون دوای پەڕینەوەیان لە رووبارەکە ، سیّ صەد و ئەوەندە ئەبوون .

بۆ وشەی ( بضعة عشر ) وتراوە : سیانزەن و ، وتراویشە : چواردەن و ، وتراویشە پانزەن .

جا با بە جوانیی سەرنجی هەڵوێستەکە بدەین :

موسڵمانەکان ساڵەهای ساڵ بوو بەبیّ تاوان قوڕەیشییە ملهوڕەکان سزا و ئازاریان ئەدان هەتا لە دینی ئیسلام پەشیمانیان بکەنەوە . ئەوانیش کە نووری قورئانیان پیّ گەیشتبوو و ، لە هیچ و پووچیی عەقیدەی شیرك شارەزا بوو بوون ، مردنیان لەلا ئاسایی بوو نەك لە خواناسیی پاشگەز ببنەوە ، تا ئەوەبوو سەرەنجام لە دەست قوڕەیش خۆیان دەرباز ئەکرد ، جاریّ بەرەو حەبەشە و جارێکیش بەرەو یەثریب و ، ماڵ و سامان و گوزەرانیان کەوتە دەست ستەمکاران . قوڕەیش هێشتا بەوەیشەوە نەئەوەستا . پێی خۆش بوو لە مەدینەشدا جیّ بە خواناسان لێژ بکات . بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی بە مەترسیی قوڕەیش ئەکرد و ، وای بە چاك ئەزانیی ساتێك لێی بیّخەم نەبن ، چونکە قوڕەیش وا لە حاڵەتی جەنگ و دژایەتییدا ..

جا دەست گرتنی موسڵمانەکان بەسەر کاروانێکی وەها دەوڵەمەنددا کارێکی یەکجار گونجاو بوو بۆ موسڵمانەکان ، تا گورزێکی سەربازیی و سیاسیی و ئابووریی جەرگ بڕ لە قورەیش بدەن و ، تۆڵەی موسڵمانە چەوساوەکانیان لێ بکەنەوە .. چونکە ئەگەر موسڵمانەکان ئەو سامانەیان دەست گیر ببێ پشتی قورەیشی پێ ئەشکێ .

کەواتە مەدینە مافی خۆیەتی هەوڵ بدات دەست بەسەر ئەو سامانە یەکجار زۆرەدا - بۆ ئەو رۆژە - بگرێت و ، دوژمنەکەی پێ بێنێ بە چۆکدا ، چونکە وەك وتمان قورەیش و موسڵمانەکان وان لە حاڵەتی جەنگدا و ، خاوەنانی ئەم سامانەشن وا بڕیاری جەنگ و هەرایان داوە و ، هەر ئەوانیشن دەستیان بەسەر ماڵ و سامانی موسڵمانە کۆچ کردووەکاندا گرتووە ..

هەر کەسێ لەسەر ماڵ و حاڵی دەرنەکرابێ و ، ماڵ و سامانی لەلایەن دوژمنەکەیەوە داگیر نەکرابێ و ، موحتاج و ئاتاج بە شار و دێهاتاندا نەسووڕابێتەوە ، نازانێ چ ئێشێك بە دڵی ئەو هاوەڵە بێتاوانانە گەیشتووە .

کەواتە مافی خۆیان بوو موسڵمانەکان هەوڵ بدەن دەست بەسەر سامانی دوژمنی جەنگاوەردا بگرن . بەڵام هەندێ لە خۆرهەڵات ناسان و نۆکەرەکانیان ئەم هەڵمەتەیان بە پێچەوانەوە لێك داوەتەوە ، هەروەك قورەیش مافی خۆی بێ ئەو هەموو سزا و ئازارەی موسڵمانەکان بدات ، بەڵام ئەمان تاوان بێ دەستێکی لێ بووەشێنن .

جارێکیان سەربازێکی ئینگلیزیی ، لەوانەی کە هێرشیان کردبووە سەر ئەفریقیا بۆ کوشتنی دانیشتوانی و ، داگیرکردنی وڵاتەکەیان و ، تاڵانکردنی خێر و بێری ، باسی بۆ هاوڕێیەکی خۆی ئەکرد و ئەیوت : ئەو ئەفریقیانە بەخوا وەحشیین ، وەحشیی . برادەرەکەی وتی : چۆن ؟! وتی : کاتێك کە خەریك بووم بە تفەنگ ئەم کوشت ، ئەو گازێکی لێ گرتم !!

مامۆستا ئەبولحەسەنی نەدەوییش لە ( السيرة النبوية : ٢١٤ ) دا پەراوێزێکی جوانی بۆ هۆی ئەو هەڵمەتە نووسیوە ..

مامۆستا دەری بڕیوە کە بە وردبوونەوە دەرئەکەوێ ئەو کاروانە بازرگانییەی کە لە مەککەوە بەرەو شام رۆیشتووە ، خۆ ئامادەکردن بووە بۆ هێرش کردنە سەر مەدینە ، چونکە ئەوە سەلماوە کە هەموو دانیشتوانی مەککە بەشداریی

ڕەوانەکردن و بەرێ خستنی ئەم کاروانەی هەبووە ، تا قوڕەیش بتوانێ هێرش بکاتە سەر مەدینە . هەتا ئافرەتانیش بە سامانی خۆیان بەشداریی بەرێ خستنی ئەم کاروانەیان کردووە و ، وەك لە پێشەوە باس کراوە نرخی باری ئەم کاروانە پەنجا هەزار دیناری زێڕ بووە و ، مەبەستیش لەم سامانە زۆرە هێرش‌کردنە سەر مەدینە بووە .

لە ( دلائل النبوة ) ی بەیهەقیی و لە ( الطبقات ) ی ئیبن سەعددا ئەوە هاتووە کە کاروانەکە هەزار وشتر بووە و ، هەر قورەیشی‌یەکیش ئۆقیەیەك زیاتر سامانی بووبێ لەگەڵ ئەبوسوفیان‌دا ناردوویەتی .

مامۆستا دەریشی بڕیوە کە بە دەلیلی عەقلیی سەلماوە کە ئەو کاروانە چەکێکی جەنگیی زۆری پێ بووە کە لە شامەوە هێناویانە ، چونکە مەککە و حیجاز توانای دروست‌کردنی چەکی جەنگیان نەبووە . جا ئەم چەکەیان بۆ ئەوە ویستووە دژی موسڵمانەکانی مەدینە بەکاری بهێنن .

جا کەواتە زۆر پێویست بوو موسڵمانەکان بەر لەم هەڵمەتە بگرن و ، بە هەر شێوەیەك بووە نیازی قوڕەیش پووچەڵ بکەنەوە ، ئیتر نەیان ئەزانی ، لەسەر نییەتی پاك و خاوێن و ئیخلاصی دڵیان ، خوای گەورە لەوە چاکتریشی بۆ ئامادە کردوون !!

کە سوپای ئیسلام کەوتە ڕێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا زەنگ لە ملی وشترەکان بکەنەوە ، تا دەنگی سوپا نەیەت و ، دوژمن پێیان نەزانێت . هەروەها بۆ وریایی و ئاگاداریی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوانی خۆی خستە پێش سوپاوە تا بە هەموو لایەك‌دا بڕۆن و ، دەنگ و باسی دوژمنانی بۆ کۆ بکەنەوە .

کە سوپا لە شار دەرچوو ڕێی ئاسایی نێوان مەککە و مەدینەی گرتە بەر هەتا گەیشتە بیری ڕەوحاء . کە لەوێ دەرچوو ڕێی مەککەی خستە لای دەستە چەپی خۆی و، بە ڕاست‌دا شکاندی بەسەر ( نازیە ) دا . هەتا گەیشتە دۆڵێك کە پێی ئەوترا ڕەحقان ، کە ئەکەوێتە نێوان نازیە و دەربەندی صەفراء . پاشان بە دەربەندەکەدا تێپەڕیی تا نزیکی صەفراء کەوتەوە .. لەوێ بەسبەسی کوڕی عەمری جوهەنیی و عەدیی کوڕی ئەبوززەعبای جوهەنیی بەرەو بەدر ناردن تا هەواڵی کاروانەکەی ئەبوسوفیانی بۆ بزانن .

ئەبوسوفیانیش وەك مرۆڤێكی دونیادیدە وخاوەن تاقیی‌كاریی ، زۆر بە وردیی هەنگاوی هەڵ ئەگرت .. ئەترسا موسڵمانەكان رێی پێ بگرن و ، كاروانەكەی لێ بسێنن ، بۆیە بە چاكیی هەواڵی رێی وەرئەگرت .. پرسیاری لە رێبواران ئەكرد .. ئەوەبوو هەواڵی ئەوەی وەرگرت كە موحەممەد ﷺ سوپای پێكەوە ناوە و ، لە مەدینە دەرچووە بە نیازی دەست بەسەرا گرتنی كاروانەكەی ئەو . ئەبوسوفیان سیی چل پیاوی قورەیشیی لەگەڵدا بوون بۆ پاسەوانیی كاروانەكەی ، دیارە ئەم ژمارەیەش توانای بەرگریی نیە لەو كاروانە كە ئەگەر سوپای مەدینە رێیان پێ بگرێ ، بۆیە وای بە چاك زانیی قورەیش ئاگادار بكات لەم هەڵویستە پڕمەترسی‌یە ..

ئەوەبوو ضەمضەمی كوڕی عەمری غیفاریی بە كرێ گرت ، تا بە پەلە خۆی بگەیەنێتە مەككە و ، هاوار بەرێتە بەردەم قورەیش ، كە ئەگەر فریای كاروانەكەتان نەكەون ، چیی سامانتان هەیە بە تالآن ئەبرێ و ، سوپای مەدینەش بەو چار ناكرێ ..

ضەمضەم بە پەلە خۆی گەیاندە مەككە و ، دوای ئەوەی كە هەردوو گوێ و لووتی وشترەكەی بڕیی بوو و ، كورتانەكەی بەرو دوا كردبوو و ، كراسەكەی خۆی چاك چاك كردبوو ، لە ناوجەرگەی شێوەكەدا بەسەر وشترەكەیەوە وەستا بوو و ، بە دەنگی بەرز هاواری ئەكردە قورەیش : ئەی كۆمەڵی قورەیش ! ئەو كاروانەی كە بازرگانی‌یەكەتانی پێیە .. ئەو كاروانەی كە بازرگانی‌یەكەتانی پێیە .. ئەو ماڵ و سامانەتان كە وا لەگەڵ ئەبوسوفیان‌دا موحەممەد و هاوەڵانی رێیان پێ گرتووە و ، وا نابینم بیگەنێ .. هەی هاوار ! هەی هاوار !

هەر كە ئەبوجەهل ئەمەی بیست ، هاواری كردە خەڵكەكە و ، خۆی گەیاندە لای كەعبە تا خەڵكەكە جەم بكا و ، سوپایەكی بەهێز دروست بكات .. ئەبوجەهل پیاوێكی سووك و سۆڵ و گورج و گۆڵ بوو ، قورەیشیش ، چونكە ماڵ و سامانی هەموویان لەگەڵ كاروانەكەدا بوو ، پێویستی‌یان بەوە نەبوو كەسێك هەڵیان بنێ ، خێرا دەنگ و باسەكە وەك بروسكە گەیشتە هەموو ماڵێك و ، خەڵكەكە بە پەلە خۆیان پێچایەوە و ئەیان‌وت : موحەممەد و هاوەڵانی وا ئەزانن وەك كاروانەكەی كوڕی حەضرەمیی لێ دەرئەچێت ؟ بەخوا تێ ئەگا كە بەو شێوە نابێت .

خەڵکەکە بوون بە دوو بەشەوە : یان کابرا خۆی چەکی هەڵ ئـەگرت و ئەکەوتـە ڕێ ، یان کەسێکی لە بریی خۆیدا ئەنارد .. بەمە قوڕەیش هەمووی کەوتە ڕێ و، لە ناو پیاوماقووڵاندا ، جگە لە ئەبولەهەبی کوڕی عەبدولموطەللیب ، هیچ کـەس دوا نەکەوت ، ئەوەبوو ئەویش عاصی کوڕی هیشامی کـوڕی مـوغیرەی بـە چـوار هەزار دیرهەم ، کە قەرزاری بوو ، بە کرێ گرت . عاص خـاڵۆی عومـەری کـوڕی خەططاب بوو و لەو جەنگەدا بە دەستی عومەری خوشکەزای کوژرا .. ئومەییـەی کوڕی خەلەفیش ، کە پیاوێکی پیری کەتەی لاشە قـورس بـوو ، خـەریك بـوو دوا بکەوێ و بەشداریی نەکات ، چونکە ئەوەبوو سـەعدی کـوڕی موعـاذ دوای کـۆچ کردنی هاوەڵان بۆ بەجێهێنانی عومرە سەردانی مەککەی کردبـوو .. جـا سـەعد دۆستی ئومەییە بوو و ، پێی گەیاند بوو کە لە پێغەمبـەری خـوای ﷺ بیسـتووە فەرموویەتی بە دەستی موسڵمانەکان ئەکوژرێت . پرسیی : لە مەککەدا ؟ سـەعد وتی : نازانم . جا کە سوپا جەمکردن هاتە کایەوە ئومەییە ئـەوەی هاتـەوە یـاد و ترسێکی زۆر چووە دڵیەوە .

بەڵام کە خوای گەورە ویستی لە ئەنجامدانـی کارێـك هـەبوو ، ئـەوا هـۆی بـۆ ئەرەخسێنێ و ، هیچ هێزێکیش نـاتوانێ تـەفرەی بـدات .. کـە ئەبوجـەهل ئـەو هەواڵەی زانیی لەگەڵ عوقبەی کوڕی ئەبوموعیطدا بە پەلە خۆیان گەیانـدە لای . عوقبە بخوردانێکی پڕ لە بخور و ، ئەبوجەهلیش کلدانێکیان بە دەستەوە گرتبوو . عوقبە بخوردانەکەی خستە بەردەمی و وتی : ئەبوعەلیی ! تـۆ وەك ژنـان وەهایـت بخور دابگیرسێنە و ، ئەبوجەهلیش وتـی : ئەبوعـەلیی ! چـاوت بـە کـل بڕێـژە ، چونکە تۆ ئافرەتی . ئومەییە چاری نەما و بەم توانجانە غیرەتی جووڵا ، بەڵام پێی وتن : چاکترین وشتری مەککەم بۆ بکڕن .. ئەوەبوو لەگەڵیان کەوتـە ڕێ ، بـەڵام نیازی وەها بوو دوای ماوەیەك خۆی بدزێتەوە و بگەڕێتەوە ، بەڵام ئەجـەل هـەڵی پێچا و بەرەو مەرگ کەوتە ڕێ .

بەم شێوەیە لە مەککەدا هیچ پیاوێك کە توانای جەنگی بووبێ دوا نەکـەوت ، جگە لە ئەوەی عەدیی کە تاقە پیاوێکیان بەشداریی جەنگیان نەکرد ..

لە لایەکی ترەوە قوڕەیش لەگەڵ ئـەوەی بـەکری کـوڕی عەبـد مـەناتی کـوڕی کینانە ناکۆك بوون ، بۆیە ئەترسان ئەگـەر ئـەمان سـوپا بـەرەو بـەدر بنێـرن بـۆ بەگژداچوونی موسڵمانەکان ، ئەوەی بەکر هێرش بکەنە سەریان و ، تۆڵەی جـەنگ

و خوێنی سەردەمی نەفامی‌یان لێ بکەنەوە ، هەتا خەریك بوو لە هەڵمەت بردن بۆ سەر موسڵمانەکان سارد ببنەوە ، ئەگەر سوراقەی کوڕی مالیکی جوعشومی مەدلەجیی ـ کە یەکێك لە پیاوماقووڵانی نەوەی کینانە بووە ـ نەهاتایەتە لایان کە پێی وتن : من لە پشتی ئێوەم و ناهێڵم کینانە لە دواوە هیچ خراپەیەکتان بەرامبەر بکات . بەمە ترسیان نەما و کەوتنە رێ .

ئیتر ئەوەبوو بە فیز و دەمارێکەوە کەوتنە رێ ، قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی بۆ ئەو هەڵوێستە کردووە :

﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٤٧﴾ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ ۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ ۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ ( الأنفال : ٤٧ ـ ٤٨ ) .

ئەڵێن : ئیبلیس لە شێوەی سوراقەدا هاتۆتە لای قورەیش و ، بەڵێنی پێ داون کە خەمی نەوەی بەکریان نەبێت و خۆی لە پشتیانە و ، لەگەڵیان کەوتۆتە رێ ، هەتا جەنگ روو ئەدات و ، مەلائیکە دێنە کۆمەکیی ئیمانداران شەیتان پشت هەڵ ئەکا و ، هەڵ دێت ، وەك لە ئایەتەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە .

ژمارەی جەنگاوەرانی سوپای بت پەرستان نۆصەد و پەنجا پیاو بووە ،[٣٣٢] کە صەد ئەسپ و حەوت‌صەد وشتریان پێ بووە و ،[٣٣٣] بە نۆرە سواریان ئەبوون و ، لە بەر دەمیانەوە کەنیزەکی گۆرانی‌بێژ ئەڕۆیشتن و ، دژی موسڵمانان گۆرانییان بۆ ئەوتن .. کە بەڕێوە ئەچوون ئەوپەڕی فیز و دەماریان ئەنواند ، تا ئەوەبوو بەو دەردە چوون کە تا ئاخرزەمان هەر باس بکرێن .

---

[٣٣٢] سەرەتا سوپای بت پەرستان بریتیی بوو لە هەزار و سێ‌صەد جەنگاوەر کە ئەوەبوو لە رێدا هەندێك جەنگاوەر گەڕانەوە ، وەك لە دواوە باسی دێت .

[٣٣٣] ئەو ژمارەی سەرەوە لە ل١٢٧ ی بەرگی دووەهەمی ( السيرة النبوية ) ی دکتۆر ( أبوشهبة ) دا هاتووە ، بەڵام مامۆستا باشمیل لە ( بەدر ) دا ل١٣٢ شەست ئەسپ و شەش صەد قەڵغان و کۆمەڵە وشترێکی زۆر کە ژمارەیان بە تەواویی نەزانراوە ، باس کردووە .

ماوەتەوە بزانین کێ مەسرەفی ئەم هەمووە جەنگاوەرە ئەکێشێ ؟ لە راستییدا نۆ پیاوی گەورە و ناوداریان نان و مەسرەفی ئەم سوپایەیان گرتبووە ئەستۆ ، کە ئەمانەن :

١ ـ ئەبوجەهلی کوڕی هیشام ، کە ئەوەبوو کاتێك لە مەککە دەرچوون دە سەر وشتری بۆیان سەر بڕیی .

٢ ـ ئومەییەی کوڕی خەلەف ، کە لە عوسفان نۆ سەری بۆ سەر بڕین .

٣ ـ سوهەیلی کوڕی عەمر ، کە لە قودەید دە سەری بۆ سەر بڕین .

٤ ـ شەیبەی کوڕی رەبیعە ، کە لەسەر رۆخی دەریا لە نزیك قودەیددا نۆ سەری بۆ سەر بڕین .

٥ ـ عوتبەی کوڕی رەبیعە ، کە لە جوحفە دە سەری بۆ سەر بڕین .

٦ ، ٧ ـ نەبیھ و مونەببیھی جووتە کوڕی حەججاج ، کە لە ئەبواءدا دە سەریان بۆ سەر بڕین .

٨ ـ عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب ، کە لە نێوان ئەبواء و بەدردا دە سەری بۆ سەر بڕین .

٩ ـ ئەبولبوحتەریی کوڕی هیشام ، کە لە بەدردا دە سەری بۆ سەر بڕین ..

ئا لەم کاتەدا کە هەرچیی دەستی چەکی ئەگرت لە دانیشتوانی مەککە بەرەو بەدر کەوتبووە رێ ، تا کاروانە دەوڵەمەندەکەی ئەبوسوفیان رزگار بکەن ، ئەبوسوفیان بە وردیی و ئاگاداری‌یەوە نەخشەی دەربازبوونی خۆی ئەکێشا ، نەوەکو پێش فریاکەوتنی سوپای مەککە تووشی کارەسات ببێ .. هەوڵی ئەدا زوو ئەو ناوچەیە ببڕێت و لە چنگی سوپای مەدینە رزگاری بێت .

ئەبوسوفیان خەریك بوو بە خۆی و کاروانەکەیەوە بکەوێتە دەست سوپای ئیسلام ، بەڵام بە پێی ئەو نەخشەیەی کە خوا بۆ ئیسلامی کێشابوو ، ئەبوسوفیان تووشی مەجدیی کوڕی عەمر بوو و ، دەربارەی سوپای موسڵمانان پرسیاری لێ کرد . ئەویش وتی : شتێکی ئەوتۆم نەدیوە ، بەڵام دوو سوارم دیتن کە لەسەر ئەو گردە خستیان ، دەستی راکێشا بۆ شوێنەکەیان .

ئەبوسوفیان بە پەلە خۆی گەیاندە شوێنی لادانی وشتری هەر دوو پیاوەکە و ، دەستی دایە چەند پشقلێکی وشترەکانیان ، کە سەرنجی دان ناوکە خورمای لە ناویاندا دیی ، بۆیە وتی : بەخوا ئەمە ئالیکی مەدینەیە . بەمە بۆی دەرکەوت

كه ئەو دوو پیاوە لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر بـوون و ، بێگومـان سوپاكەشـی لـە كاروانەكەوە نزیكە ، كە ئەم سات و ئەو ساتیەتی بكەوێتـە دەسـتیان . بۆیـە بـە پەلە گەڕایەوە لای كاروانەكەی و ، شكاندی بـە لای دەسـتە راسـتدا و ، نزیكـی رۆخی دەریای سوور كەوتەوە ، ئەویش بە وازهێنان لە رێی ئاسایی نێوان حیجاز و شام . بەم شێوەیە كاروانەكەی رزگار كرد ..

ئەبوسوفیان كە لە دەربازبوونی كاروانەكەی بێخەم بوو ، پێی خۆش بوو سوپای مەككە بگەڕێتە دواوە و ، خۆیان تووشی جەنگ و هەرا نەكەن . بۆیە بـە شـێوەی ئامۆژگاریی ، نامەیەكی بۆ ناردن . كە كاتێ گەیشتە دەست قورەیش گەیشـبوونە جوحفە .. لە نامەكەدا پێی راگەیاندن كە با بگەڕێنـەوە دوا ، چـونكە ئـەوان بـۆ یارمـەتییدانی پاسـەوانەكانی كاروانەكـە و دەربـازبوونی مـاڵ و سـامانەكەیان كەوتوونەتە رێ و ، وا خوا دەربازی كردوون ..

خەڵكێكی زۆر لەسەر ئەم رایە بوون ، كە مادەم كاروانەكە دەربـاز بـووە ئـیتر پێویست بە جەنگ و هەرا ناكات . بەلآم كە ئەبوجەهل ئەمەی بیسـت ، هـاواری كرد و نەڕاندی : بەخوا ناگەڕێینەوە تا ئەچینە بـەدر و ، سـێ شـەو و رۆژ تیایـا ئەمێنینەوە و ، وشتر سەر ئەبڕین و ، خۆراك ئەبەخشین و ، عەرەق ئەخۆینەوە و ، كەنیزەكە گۆرانیی بێژەكان گۆرانییمان بـۆ ئـەڵێن و ، عـەرەبیش دەنـگ و باسـی خۆمان و ئەم رۆیشتنەمان ئەبیستن و، هەتا هەتایە لێمان ئەترسن .. بڕۆن ..

هاش و لووشی ئەبوجەهل لە رادەیەكدا بوو كە بە هیچ كەس ناچار نەئەكرا و ، ئامۆژگاریی لە كەس نەئەبیست . بۆیە ئەیویست دانیشتوانی سەرانسەری دوورگە لە دەنگ و باسی سوپاكەی ئاگادار بن و هەموو هۆزێـك حیسـابی تایبـەتیی بـۆ قورەیش بكات .

بەلآم ئەخنەسی كوڕی شەریقی ثەقەفیی ، كـە هاوپـەیمانی نـەوەی زوهـەرە و ، فەرماندەی هۆزەكەشیان بوو لەم هەڵمەتەدا ، ئەم رایەی ئەبوجەهلی بـە دڵ نـەبوو و، لە بەردەم سوپای قورەیشدا بە پێـوە وەسـتا و رووی كـردە نـەوەی زوهـەرە و دەستی بە وتار كرد و وتی :

ئەی نەوەی زوهەرە ! خوای گەورە سامانەكەتانی دەربـاز كـرد و ، مەخرەمـەی كـوڕی نەوفـەلی خزمتانیشـی رزگـار كـرد . جـا ئێـوە بـۆ رزگـاركردنی ئـەو و سـامانەكەتان كەوتبوونـە رێ ، جـا ترسـنۆكیی ئەمـە بخەنـە ئەسـتۆی مـن و

بگەڕێنەوە، چونکە پێویست ناکات ئێوە بەبێ ئەوەی هیچتان لە کیس چووبێ دەرچن ، نەك ئەمەی کە ئەم پیاوە ئەیڵێ ، واتە ئەبوجەهل ..

ئەخنەس پیاوێکی ڕێزدار بوو لەناو نەوەی زوهەرەدا بۆیە تاقە پیاوێکیان بەشداریی جەنگی بەدریان نەکرد و ، هەر هەموو گەڕانەوە کە نزیکەی سێ‌صەد پیاو بوون .. هەروەها نەوەی عەدییش بەشداری‌یان نەکرد .

لە هەمان کات‌دا طالیبی کوڕی ئەبوطالیب ، کە ئەو ڕۆژە لەگەڵ قوڕەیش‌دا بوو ، لەگەڵ پیاوێکی قوڕەیشیی‌دا وت و ویژێك لە نێوانیان‌دا ڕووی دا . کابرا وتی: بەخوا ئەی نەوەی هاشم ، هەرچەندە لەگەڵمان‌دا هاتوون ، بەڵام زانیومانە کە دڵتان هەر لای موحەممەدە . بەمە طالیب هەڵی بۆ هەڵ کەوت و لەگەڵ ئەوانەدا کە گەڕانەوە ، ئەویش گەڕایەوە مەککە و ، لەشکری زۆر و زەبەندەی قوڕەیشیش بەرەو بەدر کەوتنە ڕێ و ، ئەوەبوو لە دەشتێکی تەخت‌دا لە پشت تەپۆڵکەیەکەوە ، لە ( العدوة القصوى ) باریان خست ..

لەولاوە پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانان بەرەو بەدر ئەهاتن و ، بە تەماش بوون کاروانەکەی ئەبوسوفیان لە ناوچەی بەدرەوە تێپەڕ بکات ، ئیتر نەیان ئەزانیی ئەبوسوفیان چۆن خۆی و کاروانەکەی دەرباز کردووە و ، نەشیان ئەزانیی کە قوڕەیش چ سوپایەکی مل‌هوڕی بەرەو بەدر خستۆتە ڕێ ، هەتا ئەوەبوو گەیشتنە دۆڵی ( ذەفران ) یان دۆڵی ( رەوحاء ) و ، لەوێ هەواڵیان پێ گەیشت ، کە کاروانەکە ڕزگاری بووە و ، سوپای مەککەش بەرەو ڕوویان دێت ..

قوڕەیش بە گاڵە و هاش و لووشەوە بەرەو بەدر ئەهاتن و ، موسڵمانەکانیش بە سەرباز و تفاقێکی کەمەوە هەواڵەکەیان بیست .. ئەوان بە تەمای بەرەنگاربوونەوەی کاروانەکە بوون ، کەچیی وا ئێستا سوپایەکی بەهێز بەرەو ڕوویان دێت .. تازە چاریان نیە ، مەگەر بچن بە پیریەوە و ، ئازایەتیی و غیرەتی سوپای بچکۆلەی ئیمان‌داران بۆ قوڕەیشیش و ، بۆ هەموو هۆزەکانی نێوان مەککە و مەدینە بسەلمێنن ، ئەگینا ماوەدان بە سوپای کوفر لەو ناوچانەدا خۆی رابووەشێنێ ، ئەوپەڕی پاگاندەیە بۆ هێز و دەسەڵاتی قوڕەیش و ، لە هەمان کات دا لاوازیی سوپای مەدینە ئەسەلمێت ، کە یەك دوو ساڵە موسڵمانەکان کۆچیان بۆ مەدینە کردووە ، خەریکە دەنگ و باسی ئازایەتیی و لێهاتنیان بلاوە ئەکات .

ئەگەر موسڵمانەکان دەستێکی چاك لەو سوپا زلەی قورەیش نەوەشێنن ، ئەوا ، نەك هەر قورەیش ، بەڵکو هەموو هۆزەکان دەمسوور ئەبن و ، تەماعی داگیرکردنی مەدینە ئەیانگرێ ، ئەو کاتە دەربازبوونی موسڵمانەکان لە دەست ئەو هەمووە عەرەبە بت پەرستە تالاَن و بڕۆکەرە شتێکی موستەحیلە .

بە بۆنەی ئەم ئاڵ و گۆڕەوە پێغەمبەری خوا ﷺ گەورە پیاوانی سوپاکەی کۆ کردەوە و پێی فەرموون : (( أيها الناس ! إن الله وعدني إحدى الطائفتين أنها لكم : إما العير ، وإما النفير )) . فەرمووی : خەڵکینە ! خوا بەڵێنی یەکێ لەو دوانەی پێ داوم کە دەستتان ئەکەون : یان کاروانەکە ، یان سوپاکە . ئیتر ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دەرکەوت کە هەندێکیان پێیان خۆشە کاروانەکەیان دەست بکەوێ و ، حەزیان لە بەگژاچوونی سوپاکە نیە . هەتا هەندێکیان وتیان : خۆزگە باسی کوشتارت بکردایە ، تا خۆمان ئامادە بکردایە . بەلاَم زۆربەی سوپا حەزی لە بەگژاچوونی سوپاکە بوو .. خوای گەورەش لە قورئاندا ئەمەی باس کردووە :

﴿ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ۝٦ وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ۝٧ لِيُحِقَّ ٱلۡحَقَّ وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾ ( الأنفال : ٧ ـ ٨ ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر چەندە لە ئاسمانەوە وەحی بۆ ئەهات ، لەگەڵ ئەوەیش دا پێی خۆش بوو راوێژ بە هاوەلاَنی بکات ، تا فەرمانی قورئان : ﴿ وشاورهم في الأمر ﴾ جێ بەجێ بکات .

ئەم راوێژکردنە تاقیکردنەوەی هاوەلاَن بوو تا بەرزیی ئیمان و پتەویی عەقیدەیان دەر بکەوێت و ، بسەلمێت کە بە راستیی پیاوی ئەوەن ببنە هەڵگری سپاردەی ئاسمان و ، شیاوی ئەوەن ببنە پێشەوای مرۆڤ و هیدایەتی بدەن بۆ سەر راستە شەقام .

پێغەمبەری خوا ﷺ وای بە چاك زانیی دەربارەی جەنگ و کوشتار لەگەڵ هاوەلاَندا راوێژ بکات ، بۆیە کە باسەکەی لەگەڵیانا کرد ، ئەبوبەکری صددیق خوا لێی رازیی بێ هەستایەوە و ، بە چاکیی فەرمایشتی کرد و ، فارووقیش خوا

لێی رازیی بێ هەستایەوە و ، بە چاکیی فەرمایشتی کرد . پاشان میقدادی کوڕی ئەسوەد [٣٣٤] هەستا و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەرەو ئەوەی کە خوا پیشانی داوی بڕۆ و ئێمەش واین لەگەڵتدا . بەخوا ئێمە ئەوەت پێ نالێین کە بەنی ئیسرائیلی‌یەکان بە مووسایان وت : بڕۆ خۆت و خواکەت کوشتار بکەن و ئێمە لێرە دانیشتووین ، بەڵکو ئەڵێین : بڕۆ خۆت و خواکەت کوشتار بکەن و ، ئێمەش لەگەڵتانا کوشتار ئەکەین . ( لە ریوایەتەکەی بوخارییدا هاتووە : بەڵکو ئێمە لەلای راست و لەلای چەپ و ، لە بەر و دواتدا کوشتار ئەکەین ) . بەو خوایەی کە تۆی بە حەق رەوانە کردووە ئەگەر بەرەو ( برك الغماد )[٣٣٥] بمانخەیتە رێ ، ئەوا هەتا ئەیگەیتێ ئێمە کۆمەکت ئەبین .

پێغەمبەری خوا ﷺ چاکی پێ فەرموو و دوعای خێریشی بۆ کرد .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أشيروا عليّ أيها الناس )) .

بەم فەرمایشتەی مەبەستی لە ئەنصار بوو ، چونکە کۆچ کەرانی مەککە کە شوێن و مەنزڵی خۆیان بەجێ هێشتبوو ، ئامادەی هەموو شتێك بوون ، بەلام دانیشتوانی مەدینە کە شەوی عەقەبە بەیعەتیان پێ دا بەیعەتی ئەوەیان پێ دا هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و هاوەڵانی‌یەوە لە ناویاندا بمێننەوە ، ئەوا وەك چۆن منداڵ و خێزانەکانیان ئەپارێزن ئەوانیش بپارێزن . ئیتر بەیعەتیان نەدابوو لە دەرەوەی مەدینە جەنگ بکەن ..

بەڵێ ، بەم راوێژکردنە ویستی هەڵوێستی ئەنصار بزانێ .. ئەوەبوو هاوەڵی پایەدار و بەغیرەت سەعدی کوڕی موعاذ خوا لێی رازیی بێ هەستی بە مەبەستەکەی ئازیز کرد ، بۆیە وتی : بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەڵێی مەبەستت لە ئێمەیە ؟ فەرمووی : بەڵێ . وتی : ئێمە ئیمانمان هێناوە پێت و ، تەصدیقمان کردووی و ، شاهێدییشمان داوە کە ئەوەی هێناوتە حەقە و ، لەسەر

---

[٣٣٤] میقدادی کوڕی عەمری کوڕی ثەعلەبەی کیندی‌یە . باوکی ناوچەکەی خۆی بە جێ هێشتبوو و گەیشتبووە حەضرەمەوت . لەوێ ژنی هێنا بوو و خوا میقدادی پێ بەخشیی بوون . کاتێ کە میقداد گەورە بوو لەگەڵ پیاوێك دا تێك چوون و شمشێرێکی لە پیاوەکە دابوو و بەرەو مەککە هەڵ هاتبوو و ، لەوێ بوو بووە هاوپەیمانی ئەسوەدی کوڕی عەبد یەغووثی زوهەریی و ، ئەویش میقدادی کردبووە کوڕی خۆی . کە ئیسلام یاسای بە کوڕکردنی بەتاڵ کردەوە ، بە میقدادی کوڕی عەمر بانگ ئەکرا .. میقداد هەر دوو کۆچەکەی کردوون و ، پیاوێکی ئازا و بەجەرگ بووە . ساڵی سیی و سێی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

[٣٣٥] برك الغماد : شوێنێکە لە مەککەوە پێنج شەو رێگا بەرەو یەمەن دوورە .

ئەوەش پەیمان و بەڵێنمان پێ داوی کە گوێڕایەڵ و فەرمان بەردار ئەبین . جا تۆش هەر کارێکت بە دڵە هەنگاوی بۆ هەڵ بگرە و ، ئێمەش لەگەڵتداین .. بەو خوایەی کە حەقی پێدا ڕەوانە کردووی ، ئەگەر ئەم دەریامان پێ بگریتە بەر و لێی بدەی ئێمەش لەگەڵتدا لێی ئەدەین و تاقە پیاوێکیشمان لێت دوا ناکەوێ و، پێشمان ناخۆش نیە لەگەڵ دوژمنەکەماندا سبەینێ بەرامبەر بینەوە .. ئێمە لە جەنگدا خاوەنی ئارامین و ، بە ڕاستییش ئەچینە مەیدان . جا بە پشتیوانیی خوا بکەوەرە ڕێ ، بەڵکو ئەوەی چاوتی پێ ڕوون ئەبێتەوە خوا بۆتی بێنێتە پێش .

بەم وتە جوانانەی سەعد دەم و چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ گەشایەوە و ، یەکجار دڵی شادمان بوو . پاشان مژدەی سەرکەوتنی بە موسڵمانان دا کە فەرمووی : (( سيروا وأبشروا ، فإن الله قد وعدني إحدى الطائفتين ، والله لكأني الآن أنظر إلى مصارع القوم )) .

فەرمووی : بکەونە ڕێ و مژدە بێت لێتان . خوای گەورە لەو دوانە بەڵێنی یەکێکیانی پێ داوم . بەخوا وەك ئەوە وەهایە هەر ئێستا تیاچوونی ئەو خەڵکە بە چاوی خۆم ببینم .

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە : کە سەعدی کوڕی موعاذ بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەڵێت : لەوە ئەچێ ترسی ئەوەت هەبێ کە ئەنصار ئەوە بەسەر خۆیانەوە بە حەق ببینن کە تەنها لە ماڵ و حاڵی خۆیاندا کۆمەکیی تۆ بکەن . جا من بە ناوی ئەنصارەوە ئەڵێم و ، بە ناوی ئەوانیشەوە وەڵام ئەدەمەوە : بۆ کوێ پێت خۆشە بار بکە .. لەگەڵ کێدا پێت خۆشە پەیوەندیی ببەستە .. پەیوەندیی کێت پێ خۆش نیە بیپچڕێنە .. لە ماڵ و سامانمان چەندت پێ خۆشە بۆ خۆت وەری بگرە و ، چەندیشت پێ خۆشە بیدە بە ئێمە . جا ئەوەی بۆ خۆت وەرت گرتووە بە لامانەوە خۆشەویستترە لەوەی کە بۆمانت هێشتۆتەوە .. هەر کارێکیش تۆ فەرمانی پێ بدەی ئەوا ئێمەش واین بە دوای فەرمانەکەی تۆوە . دە بەخوا ئەگەر بکەویتە ڕێ هەتا ئەگەیتە گۆمی غەمدان ئێمەش لەگەڵت دێین .. بەخوا ئەگەر فەرمانمان پێ بدەی بنیشینە مل ئەم دەریایە ، کە خۆت خستە ناویەوە ، ئێمەش لەگەڵتدا خۆمان ئەخەینە ناویەوە ..

پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵوێستی موهاجیر و ئەنصاری بۆ دەرکەوت و ، بۆی ڕوون بوویەوە کە هەر دوو لا پیاوی مەیدانن و ، خوای گەورە بۆ ئەوەی پەروەردە

کـردوون دەورێکـی گـرنگ لـە مێـژووی مـرۆڤ دا ببیـنن ، چـونکە مرۆڤایـەتیی چاوەڕوانی رزگارکەرە و ، تەنها ئیسلامیش ئەو رزگارکەرەیە .. بۆیە پێویست بوو کۆمەڵێك بەوپەڕی لێبڕان و لێبووردنەوە دەست بە ئیسلامەوە بگرن و ، بە پاکیی پێشکەش بە مرۆڤایەتیی بکەن و ، بۆیشـی دەرکـەوت کـە ئـەمان جیـاوازن لـەو جوولەکانەی کە هەڵوێستێکی مەردانەیان لە خزمەت مووسـای پێغەمبـەریاندا ، سەلامی لێ بێ ، نەبوو و ، هەمیشە سەرشۆڕ و خەجاڵەت ئەبوون .

دوای ئەم راوێژە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ( ذەفران ) ەوە کەوتە رێ هـەتا نزیـك بەدر کەوتەوە و لەوێ باری خست .

کە گەیشتنە بەرەوە پێغەمبەری خوا ﷺلەگەڵ ئەبوبەکردا خوا لێی رازیـی بـێ سواری ولاغەکانیان بوون و بە جووتە کەوتنە رێ تا گەیشتنە لای ریش سـپی‌یەکی عەرەب کە ناوی سوفیانی کوڕی ضەمریی بوو . پێغەمبەر ﷺ دەربارەی قـوڕەیش و موحەممەد و هاوەڵانی پرسیاری لە ریش سپی‌یەکە کرد ، تا بزانـێ چ هـەواڵێکی لایە .

ریـش سـپی‌یەکە وتـی : هـەواڵتان نـادەمێ هـەتا پـێم نـەڵێن ئێـوە کـێن ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إذا أخبرتنا أخبرناك )) . فەرمووی : ئەگـەر تـۆ هەواڵمان بدەیتێ ئێمەش پێت ئەڵێین . وتی : ئەوە بەوە ؟ فەرمووی : بەڵێ .

پیاوەکە وتـی : پـێم گەیشـتووە کـە موحەممـەد و هـاوەڵانی لـە فلاّنـە رۆژدا کەوتوونەتە رێ .. جا ئەگەر ئەو کەسەی کە هەواڵی پێم داوە راستی وتبێ ، ئـەوا ئەمڕۆ وان لە فلاّنە شوێن‌دا ، بەو شوێنەی کە سوپاکەی پێغەمبەری خوای ﷺ لێ بوو . هەروەها پێم گەیشتووە کە قوڕەیش لـە فلاّنـە رۆژدا کەوتوونەتـە رێ . جا ئەگەر ئەو کەسەی کە هەواڵی پێم داوە راستی وتبێ ، ئەوا ئـەمڕۆ وان لـە فلاّنـە شوێن دا ، بەو شوێنەی کە قوڕەیشی لێ بوو .

کە لێبوویەوە وتی : ئەی ئێوە کێن ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( نحـن من ماء )) . واتە : ئێمە لە ئاو دروست بـووین . بـەلاّم کـابرا وایئـەزانی خـەڵکی شوێنێکن کە ناوی ( مـاء ) ە . ئەوەبوو کە ئەوان رۆیشتن ریش سپی‌یەکە ئەیوت: ( ما من ماء ؟ ) واتە خەڵکی چ ( ماء ) ێك بن ؟ ئایا خەڵکی ( مـاء ) ی عێراق بن ؟

دوای ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکری هاوەڵی گەڕانەوە ناو سوپای هاوەڵان و ، کە ئێوارەی لێ هات سێ فەرماندەی موهاجیری هەڵ بژاردن ، کە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب و ، زوبەیری کوڕی عەووام و ، سەعدی کوڕی ئەبووەققاص بوون و ، لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا ناردنی بۆ سەر ئاوێکی بەدر تا دەنگوباسی زیاتری قورەیش وەربگرن . ئەوەبوو تووشی کاروانە وشترێکی قورەیش بوون کە ئاویان بۆ قورەیش ئەبرد و ، دوو خزمەتگوزاریان لەگەڵدا بوو ، کە یەکێکیان هی نەوەی حەججاج و ، ئەوی تریشیان هی نەوەی عاصی کوڕی سەعید بوو . هەردووکیان گرتن و هێنانیانەوە و ، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی بەجێ ئەهێنا . کە ئەیان پرسیی لە دوو خزمەتکارەکە : ئێوە کێن ؟ ئەیان وت : ئێمە ئاوکێشی قورەیشین و ، ئێمەیان ناردووە ئاویان بۆ ببەین . موسڵمانەکان ئەم هەواڵەیان بە دڵ نەبوو و پێیان خۆش بوو سەر بە ئەبوسوفیان بن ، بۆیە دەستیان بە لێدانیان ئەکرد و ، کە ئەوانیش ئازاریان پێ ئەگەیشت ، لە ترسی لێدان ئەیان وت : ئێمە لەگەڵ ئەبوسوفیانین ، ئیتر دەست بەرداریان ئەبوون . کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بوویەوە فەرمووی : (( إذا صدقاكم ضربتموهما، وإذا كذباكم تركتموهما ، صدقا ـ والله ـ إنهما لقريش )) . فەرمووی : ئەگەر راستتان پێ بڵێن لێیان ئەدەن و ، گەر درۆشتان پێ بڵێن وازیان لێ دێنن . راست ئەکەن ، بە خوا لەگەڵ سوپای قورەیشن . پاشان بە دوو خزمەتگوزارەکەی فەرموو : (( أخبراني عن قريش )) . فەرمووی : دەربارەی قورەیش هەواڵم بدەنێ . وتیان : وان لە پشت ئەو گردۆڵکەوە کە لە ( عدوة القصوى ) دا دیارە . لێی پرسین : (( كم القوم ؟ )) . فەرمووی : سوپای قورەیش چەند ئەبن؟ وتیان : زۆرن . فەرمووی: (( ما عدّهم ؟ )) فەرمووی: چەند کەس ئەبن ؟ وتیان : نازانین . فەرمووی : (( كم ينحرون كل يوم ؟ )) فەرمووی : هەموو رۆژێ چەند وشتر سەر ئەبڕن ؟ وتیان : رۆژێك نۆ و ، رۆژێکیش دە . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( القوم ما بين التسعمائة والألف )) . فەرمووی : قورەیش لە نێوان نۆصەد و هەزار کەسدان . دوای ئەوە لێی پرسین : (( فمن فيهم من أشراف قريش ؟ )) . فەرمووی : لە پیاوماقوولانی قورەیش کێیان لەگەڵدایە ؟ ناوی عوتبەی کوڕی رەبیعە و ، شەیبە و ، ئەبوجەهل و ، ئومەییەی کوڕی خەلەف و ، سوهەیلی کوڕی عەمریان لەگەڵ چەند ناودارێکی تری قورەیش دا برد . پێغەمبەری خوا ﷺ رووی کردە هاوەڵانی و پێی فەرموون : (( هذه مكة

قد ألقت إليكم أفلاذ كبدها ! )) . فەرمووی : ئەوەتا مەککە چیی پیاوی تیا بوو هەر هەمووی ناردۆتە بەردەمتان بۆ جەنگ ..

موسڵمانەکان رۆیشتن تا گەیشتنە ( عدوة الدنیا )[٣٣٦] ی دۆڵی بەدر و ، لە شوێنێکی دوور لە ئاودا خستیان .. ئاویان لێ بڕا و تینوویان بوو . هەندێکیشیان لەش گران بوون و ، هەندێکیش بێ دەست نوێژ . لەم کاتەدا ئیبلیس هەلی بۆ هەڵ کەوت تا گومان و دوودڵیی بخاتە دڵی موسڵمانەکانەوە کە ئەمان بەم تینوویەتی‌یە بەرگەی کافران ناگرن ..

بەڵام خوای خاوەن سۆز ، دەرگای رەحمەتی خۆی لە موسڵمانان خستە سەر پشت و ، لە ئاسمانەوە بارانی رەحمەتیان بۆ باریی .. ئەوانیش تێراو بوون و ، دەست نوێژیان گرت و ، خۆیان شۆرد و ، دەفرەکانیان پڕ لە ئاو کرد و ، بارانەکە بووە هۆی پتەوبوونەوەی خۆڵی سەر زەوی‌یەکە ، تا بەڕێوەچوونیان ئاسان بکات . کەچیی هەر ئەو بارانە لە هەمان کات‌دا بووە غەزەب و سزا بۆ سوپای قوڕەیشی بت‌پەرست .. لەلای ئەوانەوە ئەوەندە باران باریی زەوی‌یەکە بووە قوڕێك کە نەیان ئەتوانی هەنگاو هەڵگرن . ئەوەتا قورئانی پیرۆزیش ئەو کۆمەکیی و یارمەتی‌یە خوایی‌یە باس ئەکات کە ئەفەرموێ :

﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴾ ( الأنفال : ١١ ) .

ئایەتەکە نیعمەتێکی تری خوا بۆ موسڵمانان باس ئەکات کە ئەوەبوو لەو شەوەدا کە بۆ سبەینێ جەنگی بەدر رووی دا ، بە سۆزی خوای گەورە هەر سەر لە ئێوارە خەوێکی قورس یەخەی بە موسڵمانان گرت و زوو خەوتن و ، بۆ بەیانیی زوو سووك و وریا لە خەو هەستان ، کەچیی کافران تا شەوێکی درەنگ خەریکی گۆرانیی و سەما و عەرەق خواردنەوە بوون و ، بۆ سبەینێ هەموو خەواڵوو و هیلاك بوون .

دوای ئەوە سوپا رۆیشت هەتا گەیشتە سەر نزیکترین ئاوی بەدر .

---

[٣٣٦] ( العدوة الدنیا ) مەبەست ئەو لایەی دۆڵی بەدرە کە لە مەدینەوە نزیك بوو و ، ( العدوة القصوی ) ش ئەو لایەی کە لە مەدینەوە دوور بوو .

بەڵێ لە رۆژی شانزەهەمی رەمەزانی ساڵی دووهەمی کۆچییدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی دا سوپای موسڵمانان پێش قورەیش بدەنەوە و ، خۆیان بگەیەننە سەر ئاوی بەدر و ، نەهێڵن کافران لێیان داگیر بکەن .

کاتێك کە موسڵمانەکان لەو شوێنەدا باریان خست ، خێرا یەکێ لە هاوەڵە وریا و شارەزاکانی جەنگ و نەخشەکێشان ، کە ناوی حوبابی کوڕی مونذیری خەزرەجیی بوو ، هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت : ئایا ئەم شوێنە کە بارت خستووە تیایدا شوێنێکە خوا فەرمانی پیا داوی لێرە بار بخەیت ، تا ئیتر ئێمە نەتوانین بەر و دوای تیا بکەین ، یان ئەمە را و جەنگ و فڕوفێڵە ؟ فەرمووی : (( بل هو الرأي والحرب والمكيدة )). وتی : دەی ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمە شوێنی بارخستن نیە . خەڵکەکە ببە هەتا ئەگەیتە نزیکترین ئاو لە قورەیشەوە و ئێمە لەلایدا بار ئەخەین و هەرچی بیرەکانی ترن پڕیان ئەکەینەوە . پاشان لەسەر ئاوەکە حەوزێك دروست ئەکەین و ، لە ئاوی پڕ ئەکەین . پاشان کە چووین بە گژ قورەیشدا ئێمە ئاومان هەیە و ئەوان ئاویان نیە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لقد أشرت بالرأي )) . فەرمووی : رای چاکت دەستنیشان کرد .. ئەوەبوو ئەوەی حوباب دەست نیشانی کرد هەمووی جێبەجێ کرد ..

نەرم و نیانیی و سنگفراوانیی پێغەمبەری خوا ﷺ لە رادەیەکدا بوون کە ماوە هەبێت هاوەڵانی خزمەت بکەن و خەمی دینەکەیان بخۆن . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٥٩ ) .

هەروەها یەکێ تر لە کارە جوانەکانی هاوەڵان ئەو راوێژەی سەعدی کوڕی موعاذی ئەوسیی بوو کە چووە خزمەت پێغەمبەر و وتی : (( ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا کەپرێکت بۆ دروست نەکەین تا تیایا بمێنیتەوە و ، ولاغ و بارەکان لە لاتدا ئامادە بکەین ؟ پاشان بچینە مەیدانی دوژمنمانەوە . جا ئەگەر خوا دەسەڵاتی پێ داین و بەسەر دوژمنەکەماندا زاڵی کردین ئەوە ئەوەیە کە ئێمە پێمان خۆشە . خۆ ئەگەر بارەکەی تر بوو ئەوا سواری ولاغەکانت ئەبیت و

ئەگەڕێیتەوە لای ئەوانەمان کە لەوێ بەجێ ماون ، چونکە بە راستیی کەسانێك لێت بەجێ ماون ئێمە لەوان زیاتر تۆمان خۆش ناوێیت و ، گەر بیانزانیایە تۆ تووشی جەنگ ئەبیت ، لێت بەجێ نەئەمان .. بەوانە خوای گەورە پشتت ئەگرێ و، ئەوانە چاوساغییت ئەکەن و لەگەڵتدا جیهاد ئەکەن .

پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەم را جوانە ستایشی سەعدی کرد و ، دوعای خێریشی بۆ کرد . پاشان بەسەر گردێکەوە کە بەسەر مەیدانی جەنگدا ئەیڕوانی ، کەپرێکیان بۆ کرد کە تیایا ئەمایەوە کە یەکەم هاوەڵی پایەداری ، ئەبوبەکری صددیقی لەگەڵدا بوو و پاسەوانیی ئەکرد .

ئەم رایەی سەعد رایەکی زۆر جوان بوو و ، وردترین نەخشەی جەنگە . چونکە پێویستە فەرماندە لە مەیدانی جەنگەوە دوور بێ ، تا بتوانێ رێنمایی سوپا بکا و، فەرمانی پێویست دەر بکا و ، لە هەمان کاتدا دوژمن نەتوانێ دەستی لێ بووەشێنێ . چونکە فەرماندەی هەر سوپایەك بکەوێتە بەر پەلاری دوژمن ئەوا سوپا سەری لێ ئەشێوێ و ، ورەی ئەڕووخێ و ، جەنگی بۆ ناکرێ و ، سەرەنجام تێك ئەشکێ ..

ئەو شەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکردا خوا لێی رازیی بێ لە کەپرەکەدا مانەوە و ، سەعدی کوڕی موعاذیش خوا لێی رازیی بێ ئەویش لە دەرگای کەپرەکەدا بە شمشێرەکەیەوە وەستا و پاسەوان بوو ، کەچیی موسڵمانەکانی تر بە فەرمانی خوا خەوێکی قووڵیان لێ کەوت و ، ماندوێتیی گەشتەکەیان رۆیشت و چاك حەسانەوە .

شایانی باسە کە سەعد خۆی بە تەنیا پاسەوانی فەرماندەیی نەبووە ، بەڵکو کۆمەڵێك گەنجی ئەنصاری بە سەرکردایەتیی خۆی ، بۆ ئەو کارە هەڵبژارد ..

ئەو شەوە شەوی جومعەی حەڤدەی رەمەزانی ساڵی دووهەمی کۆچیی بوو و ، بەڕێ کەوتنیشی لە مەدینەوە لە هەشتەم یان دوانزەهەم رۆژی رەمەزاندا بوو .

کە رۆژ بوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سەربازەکانی ریز کردن ، ریز لە دوای ریز ئامادەی کردن بۆ جەنگ ، بێ‌ئەوەی بۆشایی و خوار و خێچییان تیا هەبێت .. ئەمەش تا بەلای خواوە خۆشەویست بن ، ئەوەتا قورئان ئەفەرموێ :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ﴾

( الصف : ٤ ) .

قوڕەیشیش کە ڕۆژی لێ بوویەوە خۆی پێچایەوە و باری کرد . کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی لە سوپای مەککە بوو لە پشتی تەپۆڵکەکەوە بەرەو شیوەکە ئەهات فەرمووی : (( أللهم هذه قريش قد أقبلت بخيلائها وفخرها تحادّك وتكذب رسولك ، أللهم فنصرك الذي وعدتني ، أللّهم أحنهم الغداة )) . فەرمووی : خوایە ! ئەمە قوڕەیشە بە فیز و دەمارەوە هاتووە دژایەتیی تۆ ئەکات و پێغەمبەرەکەت ئەخاتە درۆوە . دەی خوایە ! ئەو سەرکەوتنەم پێشکەش بکە کە بەڵێنت پێ داوم . خوایە ! سبەینێ لە ناویان بەرە .

هەردوو سوپاکە بەرامبەر بە یەك وەستان .. کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە ناو خەڵکەکەدا ، چاوی بە عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کەوت ، کە سواری وشترێکی سووری خۆی بوو بوو ، فەرمووی : (( إن يكن في أحد من القوم خير فعند صاحب الجمل الأحمر ، إن يطيعوه يرشدوا )) . فەرمووی : ئەگەر لەناو ئەو خەڵکەدا کەسێك خێری تیا بێ ، عوتبەی کوڕی ڕەبیعەیە .. ئەگەر بە گوێی بکەن ڕێی ڕاست ئەدۆزنەوە ..

شەوی ئەو ڕۆژەی کە هەردوو سوپا بە یەك گەیشتن پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەویدا سوپای بتپەرستەکانی بە کەم بینیی ، هەتا پێیان بوێرن و لێیان نەترسن . خوای گەورە فەرموویە :

﴿ إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا ۖ وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ ( الأنفال : ٤٣ ) .

جا هەروەك خوای گەورە سوپای کافرانی هێنایە پێش چاوی موسڵمانەکان ، بە هەمان شێوە سوپای موسڵمانەکانیشی بە کەم هێنایە پێش چاوی کافرەکان ، تا هەردوو سوپا بوێرن لە یەك بێنە پێش و ئەو ڕووداوە مێژوویییە ڕوو بدات و ، سەرکەوتن و سەربەرزیی پێشکەش بە موسڵمانان بکرێ ، کە ساڵەهای ساڵە بڕیاریان داوە بەندەی خوا بن و ، ستەمکاران بە ناڕەوا ئازاریان ئەدەن و ، لە هەمان کاتدا تێك شکان و زەلیلییش ببێتە بەشی ئەو بتپەرستە خوانەناسانە کە بە فیز و دەمارەوە خۆیان ڕاوەشاند و بە تەمابوون موسڵمانان ببڕنەوە و چرای ئیسلامیش بکوژێننەوە .. ئیتر یاسای خوای گەورەش وەهایە کە هەر کارێکی ویست ڕێکی بخات ، هۆیەکانی بۆ ئامادە ئەکات . قورئانی پیرۆز ئەفەرموێ :

﴿وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ ( الأنفال : ٤٤ ) .

عەبدوڵلاّی کوڕی مەسعوود ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ڕۆژی بەدر کافرەکان لەبەر چاومان ئەوەندە کەم بوونەوە ، تا ئەوەبوو من لە پیاوێکم ئەپرسیی کە لە تەنیشتما بوو : ئایا بە حەفتا کەس دێنە بەر چاوت ؟ ئەویش ئەی وت : وایان ئەبینم صەد کەس بن !!

ئەمە لە کاتێکدا کە هەردوو سوپا لە دوورەوە سەیری قەبارەی یەکتریان ئەکرد . بەڵام کاتێ کە تێك ڕژان و ، دەستیان دایە یەخەی یەکتریی و ، خوای گەورە مەلائیکەتی ناردنە کۆمەکی موسڵمانان تا یارمەتیيان بدەن و ، دڵیان دامەزراو بکەن و ، لە هەمان کاتدا ترسیش بخەنە دڵی دوژمنەکانیانەوە ، بەوەی کە ژمارەی موسڵمانەکان بە زۆر بێتە بەر چاویان ، ئەوەبوو کافرەکان موسڵمانەکانیان بە دووقاتی خۆیان ، واتە بە دوو هەزار کەس ئەهاتنە پێش چاو . بۆ ئەمەش قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە :

﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَـٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ ۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَـٰرِ﴾ ( آل عمران : ١٣ ) .

کاتێك کە قوڕەیشیش گەیشتنە مۆڵگای خۆیان لە ( العدوة القصوى ) ، عومەیری کوڕی وەهبیان نارد و فەرمانیان بەسەریدا دا بە وردیی ژمارەی موسڵمانەکانیان بۆ دیاریی بکات و ، بزانێ هێزیان تا چ ئەندازەیەکە . ئەویش سواری ولاغەکەی بوو و بە دەوری سوپای موسڵمانەکاندا ، بێ ئەوەی پێی بزانن ، سووڕێکی خوارد و ، پاشان گەڕایەوە و هەواڵی بە قوڕەیش دا کە سوپای مەدینە سێصەد کەس ، یا کەمێك زیاتر ، یا کەمێك کەمتر ئەبن . پاشان جڵەوی بۆ ئەسپەکەی شل کردەوە و بە شیوەکەدا ڕۆیشت هەتا کەوتەوە پشت موسڵمانەکان و سەیری کرد کەمین و کۆمەکیان نیە .. هەر ئەوانەن کە هەن و دیارن ..

گەڕایەوە لای قوڕەیش و هەواڵی دانێ کە کەمین و کۆمەکیان نیە ، بەڵام دەستی بە ئامۆژگاریی سەرکردەکانی مەککە کرد و ئاگاداری کردنەوە کە وا

نەزانن سوپای مەدینە کەمە و بە ئاسانیی بۆیان ئەشکێت .. تێی گەیاندن کە ئەوانە مەردانە هاتوونەتە مەیدان و ، لە مەرگیش ناترسن .. بەڵێ ، ئەوان جگە لە شمشێرەکانی دەستیان هیچ کۆمەك و پشتیوانێکیان نیە ، بەلاّم هیچ پیاوێکیان لێ ناکوژرێ ، هەتا ئەو پیاوێك لەمان نەکوژێ .. جا دیارە ئەگەر ئەوەندەی ژمارەی خۆیان لە قورەیش بکوژن ، ئیتر قورەیش ژیانی بۆ چی‌یە ؟ داوای لێ کردن تا بە چاکیی بیر لەم هەڵوێستە بکەنەوە .

دوای ئەم راگەیاندنەی عومەیری کوری وەهب ، لە ناو قورەیش‌دا بەرهەڵستی‌یەکی تر دژی ئەبوجەهل دروست بوو ، تا واز لە جەنگ و کوشتار بهێنرێت و بگەرێنەوە .. ئەم بەرهەڵستی‌یە دووهەم بەرهەڵستیی بوو دژی بۆچوونەکەی ئەبوجەهل کە حەزی لە جەنگ بوو و ، لە یەکەم بەرهەڵستییش گەورەتر بوو کە ئەوەبوو لە رابوغ ئەخنەسی کوری شەریق بەرپای کرد و ، بە خۆی و سێ‌صەد جەنگاوەری نەوەی زوهرەوە گەرایەوە مەککە و بەشداریی جەنگی نەکرد .

ئەم بەرهەڵستی‌یە گەورەیە عوتبەی کوری رەبیعەی سەرداری نەوەی عەبد شەمس بەرپای کرد و حەکیمی کوری حەزامیش پشت‌گیریی لێ ئەکرد .. ئەمان پێش دەست پێ‌کردنی جەنگ رایان وابوو جەنگ و کوشتار نەکەن و ، دەست بەرداری سوپای مەدینە بن و ، بەرەو مەککە بگەرێنەوە .

ئەوەبوو حەکیمی کوری حەزام چوو بۆ لای عوتبەی کوری رەبیعە و پێی وت : باوکی وەلید ! تۆ گەورە و سەردار و گوێرایەڵیی‌کراوی قورەیشیت . ئایا کارێکت بە دڵە کە هەتایە لەناو قورەیش‌دا هەر بە چاکە ناوت ببرێت ؟ وتی : ئەو کارە چی‌یە ، ئەی حەکیم ؟ وتی : ئەوەیە کە ئەو خەڵکە بگێرپیتە دواوە و ، کاری ئەو پیاوە هاوپەیمانەت ، عەمری کوری حەضرەمیی ـ کە لە سریەی نەخلەدا بە دەستی موسڵمانەکان کوژرابوو ـ بگریتە ئەستۆ .. وتی : بریار بێ وا بکەم ، بۆ ئەوەش تۆ زامنم بە ، ئەو هاوپەیمانم بووە .. خوێنەکەی و چیی سامانیشی فەوتاوە لەسەر خۆم بێ ..

پاشان عوتبە بە حەکیمی وت : برۆ بۆ لای کوری حەنضەلییە ـ واتە ئەبوجەهل ، چونکە دایکی ناوی حەنضەلییە بووە ـ ، لەبەر ئەوەی جگە لەو لە هیچ کەس ناترسم کاری ئەو خەڵکە بشێوێنێ ..

دوای ئەوە عوتبە لە بەردەم سوپای قورەیش‌دا وەستا و ، دەستی بە وتاردان کرد و وتی :

ئەی کۆمەڵی قورەیش ! بەخوا ئەگەر ئێوە بچنە مەیدانی موحەممەد و هاوەڵانی ئەوا هیچتان نەکردووە .. بەخوا ئەگەر تووشی زەرەر و زیانی بکەن ئەوا هەتا هەتایە پیاوێکتان سەیری دەم و چاوی پیاوێکی ترتان ئەکات و پێیشی ناخۆشە سەیری بکات ، لەسەر ئەوەی کە ئامۆزاکەی ، یان خاڵۆزاکەی ، یان پیاوێکی عەشیرەتەکەی کوشتووە . بگەڕێینەوە و واز لە موحەممەد و عەرەبەکانی تر بهێنن ( ئەوان ئەچن بە گژیا ) جا ئەگەر شکستیان پێ هێنا ئەوا ئەوەیە کە ئێوە ویستووتانە . خۆ ئەگەر شتێکی تر بوو ( واتە ئەو سەرکەوت بە سەر عەرەب دا ) ئەوا هەرچیی ئێوە پێتان ناخۆش بێ لەلایەن ئەوەوە تووشمان نابێت . حەکیم خۆی گەیاندە لای ئەبوجەهل ، کە خەریکی ئامادەکردنی قەڵغانێکی بوو و ، پێی وت : ئەبولحەکەم ! عوتبە ناردوومی بۆ لات بۆ کارێکی وەها و وەها . ئەبوجەهل چونکە نەگبەتیی هاتبوو ، دەستی دایە گاڵە و هاش و لووش و ، عوتبەی بە ترسنۆك دایە قەڵەم و ، وەهای گەیاند کە خەمی ئەبوحوذەیفەی کوڕیەتی بکوژرێ، کە وا لە ریزی موسڵمانەکان‌دا و ، دەستی کرد بە سوێندخواردن کە ناگەڕێینەوە دوا هەتا خوا حوکمێك بۆ نێوان پێغەمبەری خواﷺ و ئەوان دەر بکات .

کە ئەو قسانە بە عوتبە گەیشتنەوە زۆری پێ ناخۆش بوو . ئەبوجەهل بۆ ئەوەی کارەکەی سەر بگرێ و جەنگەکە هەڵ بگیرسێنێ ، فەرمانی دا عامیری کوڕی حەضرەمیی ، برای عەمری کوڕی حەضرەمیی کە لە سریەی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش‌دا کوژرا بوو ، بانگ بکەن بۆی . کە هات پێی وت : ئەمە هاوپەیمانەکەتە ( واتە عوتبە ) ئەیەوێ خەڵکەکە بگێڕێتەوە دوا ، تۆ وا ئەمڕۆ بە چاوی خۆت تۆڵەی خۆت ئەبینی . دە هەستە دادی خۆت و کوژرانی براکەت بکە . عامیریش هەستا و لە نێوان خەڵکەکەدا کۆمی خۆی رووت کرد و ، هاواری کرد : وا عمراه ، وا عمراه . بەمە دڵی خەڵکەکەی جۆشاند و ، هەموو بڕیاری جەنگ و کوشتاریان دا .. بە مەرجێ وەك لە پێشەوە باسمان کرد عوتبە چووە ژێر ئەوە کە خوێنی عەمر و سامانە فەوتاوەکەشی بخاتە ئەستۆی خۆیەوە .. بەمە ئەبوجەهل ئەو نەخشە جوانەی عوتبەی تێك دا کە داوای سەلامەتیی و بێوەیی ئەکرد و ، نەخشە پڕ ئاژاوە و شەڕەنگێزەکەی فەرز کرد بەسەر سوپای مەککەدا .. بەمە ئەم

بەرهەڵستکارییەشی بەزاند و ، جەنگ بووە کارێکی حەتمیی کە سوپای مەککە تەنها بەوە رازیی ئەبوو ..

ئەبوجەهل رقێکی یەکجار زۆری لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەبوو . ئەو کاتەش کە ویستیان بیکوژن ئەو نەخشەی پیلانەکەی داڕێژرابوو . کە لە دەستیان دەرچوو خەریك بوو لە داخانا بتەقێ . جا کە ئێستا سوپای مەککەی زۆر و پڕچەك ئەبینیی و ، سوپای موسڵمانانیش کەم و کەم تفاق ، ئەمەشی بە هەل ئەزانی و نەیئەویست ئەمیشی لە دەست دەربچێ . تا ئەوەبوو بە سەرەنجامی رەشی خۆی گەیشت .

مێژوونووسان ئەگێڕنەوە کە ئەخنەسی کوڕی شەریق ، کە ئەوەبوو لە رابوغ بە خۆی و سێصەد چەکداری نەوەی زوهرەوە گەڕایەوە ـ لە رابوغ لە ئەبوجەهل ئەپرسێ و ئەڵێ :

باوکی حەکەم ! ئایا تۆ موحەممەد بە درۆزن ئەزانی ؟

ئەبوجەهل وتی : ئەو چۆن بە ناوی خواوە درۆ ئەکات ، لە کاتێکدا ئێمە ناوی ( الأمين ) مان لێ نابوو ، لەبەر ئەوەی کە هەرگیز درۆیەکی نەکردبوو ؟ بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەگەر ( سقاية ) و ( رفادة ) و ( حجابة ) و ( شورى ) هەر هەموویان لە دەستی نەوەی عەبدمەنافدا بن و ، پاشان پێغەمبەرایەتییش لەناو ئەواندا بێت ، دەی ئیتر چیی بۆ ئێمە ماوەتەوە ؟!

بەر لەوەی جەنگ بەرپا ببێ لەناو ریزی بتپەرستەکاندا پیاوێك بە ناوی ئەسوەدی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومیی هاتە دەرەوە و وتی : پەیمان بە خوا ئەدەم کە لە حەوزەکەیاندا ئاو بخۆمەوە ، یان بیڕووخێنم ، یان سەر بنێمەوە .

بەرەو حەوزی ئاوەکە هاتە پێشەوە و ، خێرا حەمزەی شێری خوا خۆی گەیاندە لای و بە یەك شمشێر نیوەی قاچی قرتاند و کەوتە سەرزەویی و ، بۆ ئەوەی سوێنەکەی بەسەر بەرێت بە سکە خشکە بەرەو حەوزەکە رۆی هەتا گەیشتە لای و ، حەمزە بە شمشێری دووهەم یەکجاری کرد و کوشتی . هەر کە خوێنیان بینی هەموو بە جارێ چاویان پەڕییە تەوقی سەریان و خۆیان ئامادەی جەنگ کرد ..

کەمێك پێش هەڵگیرسانی جەنگ ئەبوجەهل دەستی بە پاڕانەوە کرد و داوای لە خوا کرد کە هەرکام لەم دوو سوپایە سیلەی رەحمی پچڕاندووە و ، شتی خراپی داهێناوە کە رۆژی لێ بوویەوە لە ناوی بەرێت .

هەتا قورەیشیەکانیش کە ویستیان لە مەککەوە بەرەو بەدر بکەونە رێ ، روویان لە کەعبە ناو دەستیان بە پەردەکانیەوە گرت و ، بەم دوعایە پاڕانەوە تا ئەوەی راستە و دینەکەی راستە سەری بخات کە ئەیان وت :

(( أللهم انصر أهدى الفئتين ، وأعلى الجندين ، و أكرم الحزبين ، وأفضل الدينين )).

خوای گەورەش دوعاکەی گیرا کردن . ئەوەبوو موسڵمانەکانی سەرخست و ئەوانیشی زەلیل کرد .. دوای کوژرانی ئەسوەد بە دەستی حەمزە خوا لێی رازیی بێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان هاوەڵەکانیدا وەستا و غیرەت و جوامێریی ئەخستە بەریان و دڵی گەرم ئەکردن کە ئارام گرتن لە هەڵوێستی سەخت دا مایەی رەواندنەوەی خەم و خەفەتە کە ئەیفەرموو :

(( و إن الصبر في مواطن البأس مما يفرِّج الله به الهم ، وينجِّي به من الغم )) .

دوای ئەوەی کە ئەسوەدی کوڕی عەبولئەسەد هەوڵی دا خۆی بگەیەنێتە حەوزی موسڵمانەکان و ئاوی لێ بخواتەوە و ، حەمزەش خوا لێی رازیی بێ خۆی گەیاندێ و بە دۆزەخی گەیاند ، جەنگ دەستی پێ کرد ، بەلاَم هەردوو سوپا هێشتا هێرشیان دەست پێ نەکرد بوو .. سەرەتا جەنگ بە زۆرانبازیی دەستی پێ کرد .. ئەوەبوو عوتبەی کوڕی رەبیعە و ، شەیبەی برای و ، وەلیدی کوڕی لە ناو سوپای قورەیش دا دەرپەڕین و هاتنە مەیدانی نێوان هەردوو سوپاکە و ، بە دەنگی بەرز نرکاندیان کە با لە سوپای موحەممەددا پیاو دەرچن و زۆرانبازیی بکەن ..

خێرا سێ گەنجی ئەنصارییش لە ریزی موسڵمانەکاندا دەرپەڕین و هاتنە مەیدان .. هەردوو سوپا چاویان بڕیی بووە مەیدان و ، لەسەر خۆ هەناسەیان هەڵ ئەمژیی تا ئاگاداری سەرەنجامی زۆرانبازیی بن ..

سێ قورەیشیەکە روویان کردە سێ گەنجە ئەنصارییەکە و لێیان پرسین : ئێوە کێن ؟ وتیان : کۆمەڵێکی ئەنصارین .[٣٣٧] وتیان : هاوشان و بەڕێزن ، بەلاَم با لە ئامۆزا هاوشانەکانی خۆمان بۆمان بێنە مەیدان .

هەندێ لە لێکۆڵەرانی سیرەت ئەوەیان باس کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش نەبووە بۆ یەکەم جەنگ و بەرامبەربوونەوە ئەو گەنجە ئەنصارییانە دەرچن ،

---

[٣٣٧] ئەم سێ گەنجە عەوف و موعەووەذی کوڕانی حاریث و عەبدوڵلاّی کوڕی رەواحە بوون ، لە یادمان بێ کە ئەو دوو برایە کوڕەکانی عەفران و هەردووکیان رۆژی بەدر شەهید بوون و موعەووەذیان بەشداریی کوشتنی ئەبوجەهلی کردووە .

بەڵکو پێی خۆش بووە خزم و کەسە نزیکەکانی بن ، تا ئەگەر ناخۆشی‌یەك بێتە ڕێیان بۆ ئەمان بێ . جا کە جەنگاوەرەکانی قوڕەیش ڕازی‌یان نەبوو ئەنصار بچنە مەیدانیان ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بگەڕێنەوە جێی خۆیان و فەرمووی : (( قم یا عبیدة بن الحارث ، وقم یا حمزة ، وقم یا علي )) . فەرمانی دا سێ خزمی نزیکی هەستن و بچنە مەیدانی ئەو خزمانەیان .. چونکە عوتبە کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبد شەمس بوو ، کە ئەویش برای هاشمی باپیرە گەورەی پێغەمبەر بوو .. فەرمانی دا حەمزەی مامەی و ، عەلیی ئامۆزای کە هەردووکیان هاشمین و ، عوبەیدەی کوڕی حاریثی کوڕی موطەللیب بچنە مەیدانیان ، کە موطەللیبیش - وەك لە پێشەوە باس کراوە - برای هاشم و عەبد شەمس بووە . لە بیرمان نەچێ کە قوڕەیش نەوەی هاشم و نەوەی موطەللیبی بە یەك چاو سەیر ئەکردن و ، ئەوەبوو لە گەمارۆو ئابووری‌یەکەی مەککەدا نەوەی موطەللیبیش بە وێنەی نەوەی هاشم دەرکرابوونە شیوی ئەبوطالیب و ، کافر و موسڵمانیان لە هەموو مافێك بێ‌بەش کرابوون ..

هەرسێکیان خۆیان گەیاندە مەیدان و ، قوڕەیشی‌یەکان لێ‌یان پرسین کە کێن . ئەوانیش خۆیان پێ‌یان ناساند . وتیان : هاوشان و بەڕێزن . ئەوەبوو عوبەیدە ، کە پیرترینی هەرسێ موسڵمانەکە بوو ، چووە مەیدانی عوتبە و ، حەمزەش چووە مەیدانی شەیبە و ، عەلییش چووە مەیدانی وەلیدی کوڕی عوتبە ، کە هەردووکیان لە هەموویان گەنج‌تر بوون .

زۆری پێ نەچوو عەلیی و حەمزە نێچیری خۆیان کەوڵ کرد ، بەڵام عوبەیدە و عوتبە هەریەکەیان شمشێرێکی کاریگەری لە بەرامبەرەکەی دابوو و ، یەکتریان پەك خستبوو . خێرا عەلیی و حەمزە تەپیان کوتایە سەر عوتبە و کوشتیان و ، پێکەوە دەستیان دایە عوبەیدە و هەڵیان گرت و هێنایانەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، ئەویش پێی موبارەکی بۆ کردە سەرین و کوڵمی خستە سەری و ، دڵی زۆر حەسایەوە . پاشان عوبەیدە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەخوا بە ئاواتەوە بووم کە ئێستا ئەبوطالیب زیندوو بوایە تا بی‌زانیایە کە من شایان‌ترم لەو بەو شیعرەی کە ئەڵێ :

ونسلمه حتى نصرّع حوله ونذهل عن أبنائنا والحلائل

کاتێك کە ئەبوطالیب لە ژیاندا بوو قەسیدە بەناوبانگەکەی وتبوو و تیایا دەری بڕیی بوو کە مەگەر خۆیان و رۆڵە و هاوسەرەکانیان لە پێناوی پاراستنی پێغەمبەری خوادا ﷺ تیا بچن ، ئەگینا هەرگیز نایدەن بە دەستەوە و ، پشتیشی بەر نادەن .. جا لێرەدا عوبەیدە ئەوە دەرئەبڕێ کە ئەمان وا ئەمڕۆ ئەو بەڵێنەی ئەبوطالیبیان بردە سەر و ، گیانیان کردە قوربانیی بۆ پاراستنی دینی خوا ..

عوبەیدە قاچێکی قرتابوو و مۆخی دەرکەوتبوو .. هەروا بە بێدەنگ مایەوە هەتا چوار یا پێنج رۆژ دوای بەدر . ئەوەبوو لە کاتی گەڕانەوەیان لە دۆڵی ( الصفراء ) دا کۆچی دوایی کرد و ، پێغەمبەری خواش ﷺ شاهێدیی بۆ دا کە شەهیدە ، فەرمووی : (( أشهد أنك شهيد )) .

ئیمام عەلییش سوێندی بە خوا ئەخوارد کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەربارەی ئەوان هاتۆتە خوارەوە کە ﷻ فەرموێ :

﴿ هَـٰذَانِ خَصۡمَانِ ٱخۡتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمۡ ﴾ ( الحج : ١٩ )

مامۆستا ( محمد أحمد باشميل ) لە ( غزوة بدر الكبرى ) دا وەهای دەر بڕیوە کە شەیبە خۆی بە زامەکە ئەمرێت و ، عەلیی و حەمزەش عوبەیدە ئەگێڕنەوە دوا، واتە ئەوان هێرشیان نەکردۆتە سەر شەیبە ..

دوای زۆرانبازییەکە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە لای سوپای موسڵمانان و دەستی بە ڕێكکردنی ریزەکانی کرد و داردەستێکیشی بە دەستەوە بوو . ئەوەبوو دای بە لای سوادی کوڕی غەزییەدا ، کە پیاوێکی هاوپەیمانی نەوەی نەججار بوو ، لە ریزەکە هاتبووە دەرێ . بە داردەستەکە دای لە سکی سواد و فەرمووی : (( استقم يا سواد )) . فەرمووی : سواد ! ڕێك بووەستە . سواد وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئازارت پێ گەیاندم . خوای گەورەش بۆ حەق و عەدالەت رەوانەی کردووی . ماوەم بدە تا منیش تۆڵەی خۆمت لێ بکەمەوە . بەوپەڕی رەزامەندییەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سکی خۆی رووت کرد و فەرمووی : (( إستقد يا سواد )) . فەرمووی : سواد تۆڵەی خۆت بسێنە . سواد هەڵمەتی دا باوەشی بە پێغەمبەری خوادا ﷺ کرد و سکی ماچ کرد !! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( وما حملك على هذا يا سواد ؟ )) . فەرمووی : سواد! چیی پاڵی پێوە نای ئەو کارە بکەی ؟

وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوەی کە ئەیبینیی هاتۆتە پێش و ، منیش ویستم دوا پەیوەندییم پێتەوە ئەوە بێت کە پێستم بەر پێستت بکەوێ ..
پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای چاکیی بۆ کرد!!

ئەمە مافی مرۆڤە لە بەرزترین شێوەیدا .. ئەمە رێزی راستەقینەیە بۆ ئادەمیزاد .. گەورەترین و خۆشەویستترین پێغەمبەر ماوە بدا بە سەربازێکی خۆی تۆڵەی لێ بکاتەوە .. داردەستێکی داوە لە سکی ، ئەویش داوای ئەوە ئەکات ماوەی بدا ئەو دارە لە سکی بداتەوە .. لە کاتێکی یەکجار ناسكدا .. سوپایەکی ملهوڕی خوێنمژی داخ لە دڵیش لە بەرامبەریاندا وەستاوە و ، لاشەی سێ پاڵەوانیشی لە مەیدانی جەنگدا کەوتوون .. لەم هەڵوێستە ناسکەدا سواد هۆشی وا بە لای شەهیدیی و بازاڕی قیامەتەوە .. ئەیەوێ مسۆگەری بکات کە ئەگەر شەهید بوو با سەلماندبێتی ئازیزی یەکجار خۆش ویستووە ، تا دڵەکەی ئارام بگرێ و بێخەم ببێ .

لە ناو هەردوو سوپاکەدا پاڵ پاڵێن دروست بوو و ، لە یەکتر نزیك کەوتنەوە .. کافرەکان بە کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو سەربازگەی موسڵمانەکان ئەکشان .. موسڵمانەکانیش لە شوێنی خۆیاندا دامەزراو بوون ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریی کردبوون کە تا فەرمانیان پێ نەدات ئەمان هەڵمەت نەبەن ، بەلاّم ئەگەر زۆریان بۆ هێنان ئەوا بە تیر دایان بگرنەوە و ، تا نەیەنە سەریان شمشێریان بۆ دەرنەهێنن ، کە فەرمووبووی : (( لا تحملوا حتى آمركم ، وإن اكتنفكم القوم فانضحوهم بالنبل ، ولا تسلّوا السيف حتى يغشوكم )) .

ئەمە ئەوپەڕی ئاگاداریی و شارەزایی بوو لە هونەری جەنگ و کوشتاردا .. سیاسەتێکی یەکجار حەکیمانە بوو .. چونکە موسڵمانەکان تەنها دوو ئەسپیان پێ بوو و ، هێرش بردنیش بە ولاّغ و سوارچاکی لێهاتوو ئەبێ ، ئەمە یەك ، دووهەمیش دوژمن سوپاکەی یەکجار زۆرە ، بۆیە وا چاك بوو موسڵمانەکان بە دامەزراوییەوە بەرگریی بکەن ، نەك هێرش بکەن .

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکری هاوەڵیدا گەڕانەوە بۆ ناو کەپرەکە و ، سەعدی کوڕی موعاذیش لە دەرگای کەپرەکەدا پاسەوان بوو و شمشێرەکەشی لە کێلان دەرهێنا بوو .. پێغەمبەری خوا ﷺ کە سەرنجی کەمیی موسڵمانەکانی ئەدا بەزەیی پیایانا ئەهاتەوە و ، ترسێکی زۆری هەبوو کە لەو رۆژەدا چاری دوژمن

نەکەن و، دەوڵەتە نەونەمامەکەی ئیسلام بکەوێت ..بۆیە بە هەموو دڵێکیەوە و، بەوپەڕی ئیخلاص و زەلیلیەوە رووی کردە پەروەردگار و ، لێی ئەپاڕایەوە تا ئەو بەڵێنەی کە پێی داوە بیباتە سەر و ، سەرکەوتن بە خۆی و بە هاوەڵانی پێشکەش بکات ، کە ئەی فەرموو : « أللهم أنجز لي ما وعدتني . أللهم إن تهلك هذه العصابة من أهل الإسلام فلا تعبد بعد في الأرض أبداً » . ئەیفەرموو : خوایە ! ئەو بەڵێنەی کە پێمت داوە بۆم بەجێ بهێنە .. خوایە ! ئەگەر ئەم کۆمەڵە بچکۆلەی ئوممەتی ئیسلام تیا بچێت ، ئەوا هەرگیز لەسەر زەوییدا تۆ ناپەرسترێیت .

وەك بفەرموێ : هەرچیی هەڵبژاردەی سەرزەویی هەیە هەتا ئاخرزەمان ، هەمووی بریتییە لەو هاوەڵانەی کە پانزە ساڵە پەروەردەیان ئەکەیت و ، بە دەستی کافرە بێویژدانەکان سزا ئەدرێن .. ئەگەر ئەمانە تیا بچن تا ئاخرزەمان کۆمەڵێکی تری وەها ئیمان دامەزراو بەرپا نابێتەوە هەتا شەریعەتی خوا سەر بخەن و ، لە پێناوی خوادا پارێزگاریی لە دینی خوا بکەن .

هەروا پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام خەریکی پاڕانەوە و هانا و پەنابردن بوو هەتا عەباکەی سەرشانی کەوت بە دوادا و ، ئەبوبەکر دەستی دایە و خستیەوە سەر هەردوو شانی و ، پاشان فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! نزا و پاڕانەوەکەت لە پەروەردگارت بەسە ، چونکە ئەو بەڵێنەی کە پێی داوی بۆت ئەباتە سەر .

هەر لە کەپرەکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ سەرخەوێکی شکاند و پاشان بە ئاگا هات و فەرمووی : « أبشر يا أبابكر ! فقد أتاك نصرالله ، هذا جبريل آخذ بعنان فرسه يقوده على ثناياه النقع » . مژدەی بە ئەبوبەکر دا کە سەرکەوتنی خوا پێشکەش بە موسڵمانەکان کرا و ، چاویشی لە جیبریلە کە جڵەوی ئەسپەکەی گرتووە و هەموو گیانی بە عەرەق خووساوە ..

خوای گەورەش یاسا پیشان ئیمانداران ئەدات .. ئەو یاسایەی کە بریتیی بێ لە کۆمەکییکردنی ئیمانداران ، ئەگەرچیی بە ناردنی مەلائیکەتیش بێ . ئەوەتا ئەفەرموێ :

﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴾ ( الأنفال : ٩ ) .

پاشــان پێغەمبــەری خــوا ﷺ لــە کەپرەکــە هاتــە دەرەوە و ، دەســتی بــە ئامۆژگاریی ریزە ئیمانداره‌کان کرد تا که جەنگ رووی دا دامەزراو بن و ، بەڵێنی ژیانی هەتا هەتایی ئەدانێ لە بەهەشتی بەریندا .. بۆ نموونــە ئــەی فــەرمووو : ﴿ «والذي نفس محمد بيده لا يقاتلهم اليوم رجل ، فيقتل صابراً محتسباً ، مقبلاً غيرَ مُدبرٍ ، إلا أدخله الله الجنة ، ومن قتل قتيلاً فله سلبه » .

ئەیفەرموو : سوێند بەو خوایەی کە گیانی موحەممــەدی بــە دەســتە هــەر کەسێ ئەمرۆ کوشتاری ئەم کافرانە بکا و ، بە تەمای پاداشتی خــوا بــێ و ، بەرەو پێش چووبێ و ، پشتی هەڵ نەکردبێ ، ئەوا خوا ئەیخاتــە بەهەشــتەوە و، هەرکەسیش کەسێکی کوشت ئەو کەل‌وپەلەی کە لێی بــەجێ ئــەمێنێ بــۆ ئەو ئەبێت .

هەروەها ئەی فــەرموو : « قوموا إلى جنــة عرضــها الســموات والأرض » . ئەیفــەرموو : هەســتن خۆتــان بگەیەننــە ئــەو بەهەشــتەی کــە پانایی‌یەکــەی ئەوەنــدەی ئاسمانــەکان و زەویــی ئــەبێت . کــە عومــەیری کــوڕی حومــامی ئەنصاریی ئەم مژدەیەی بیست ، وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەهەشتێك کە پانایی‌یەکەی ئەوەندەی ئاسمانەکان و زەویی بێت ؟! فەرمووی : « نعم » . وتی: بەخ بەخ !! پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فــەرموو : « مــا يــحملك على قول : بخ بخ ؟ » . فەرمووی : چیی پاڵی پێوە نــای بڵێــی : بــەخ بــەخ ؟ وتــی : ئــەی پێغەمبەری خوا ! بەخوا بەو هیوایەوە وتم کە بەڵکو من ئەهلی ئەو بەهەشــتە بم . فەرمووی : « فإنــك مــن أهلــها » . فــەرمووی : دەی تــۆ ئــەهلی ئــەو بەهەشتەی .

عومەیر چاوێکی بە خۆیدا گێڕا .. من ئەچمە بەهەشت ؟ دەی ئــیتر مــن خەریکی چیم ؟! خەریك بــوو چــەند خورمایــەکی بــە دەســتەوە بــوون و لێــی ئــەخواردن . وتــی : مــن بمێــنم هــەتا ئــەم خورمایانــە تــەواو بکــەم ، ئــەوە تەمەنێکی درێژە . وەك بڵێــی ئــەوە زۆری پــێ ئەچــێ و ، منــیش درەنگمــە بگەمە بەهەشت . بۆیە خورماکانی فڕێ دا و ، کە جەنگ گەرم بوو خۆی کرد بە ناو دوژمناندا و دەستی بە کوشتار کرد و ئەم شیعرەشی ئەوت :

رکضاً إلى الله بغيــر زاد　　إلا التقى وعملِ المعاد
والصبر في اللهَ على الجهادَ　　وكلُّ زادِ عرضةُ النفادَ
غيــر التقى والبــر والرشاداً

لە شیعرەکەیدا وەسیەتێك و ئامۆژگاریەکی بەنرخ بۆ ئیمانداران بە جێ ئەهێڵێ ، تا بە راکردن بەرەو خوای پەروەردگار بڕۆن و ، گوێ نەدەن بە هیچ توێشوویەك ، جگە لە تەقوا و کاری قیامەتیی و ئارام گرتن لە جیهادی پێناوی خوادا ، چونکە جگە لە تەقوا و چاکە و کاری ژیرانە هەموو توێشوویەك تەواو ئەبێ .

هەروا خەریکی جەنگ و کوشتار بوو هەتا بە شەهیدیی سەری نایەوە ، خوای گەورەی لێ رازیی بێ .

هەروەها عەوفی کوڕی حاریثیش ، کە دایکی ناوی عەفراء بوو و ، یەکێکیش بوو لەو سێ گەنجە ئەنصاریەی کە هاتنە مەیدانی عوتبە و شەیبە و وەلید بۆ زۆرانبازیی و، گێڕانیانەوە دوا ، پرسیی : ئەی پێغەمبەری خوا ! چ کارێك کە بەندە ئەنجامی بدا پەروەردگاری دێنێتە پێکەنین پێی ؟ فەرمووی : (( غمسه يده في العدو حاسراً )) . فەرمووی : بە رووتیی - بەبێ قەڵغان و زریپۆش - بچێتە مەیدانی دوژمنەوە و شمشێر بخاتە گەردنیانەوە . خێرا عەوف دەستی دایە ئەو زریێەی کە لە بەریدا بوو و دایکەند و فڕێی دا و ، دەستی دایە جەنگ و کوشتار هەتا دەستی لە شەهیدیی گیر بوو خوا لێی رازیی بێ ..

لەم دوو نموونەوە بۆمان دەر ئەکەوێ کە ئەوانەی لە بەدردا شەهید بوون ، هەر چەندە یەکجار کەم بوون ، خۆیان تینووی شەهیدیی و رەزامەندیی خوا بوون . هەروەها هاوەڵانی تریش کە لە هەر غەزایەك بە سەلامەتیی ئەگەڕانەوە دەستیان بە ئەژنۆیاندا ئەکێشا و ، ئاخ و حەسرەتیان دەرئەبڕیی لە سەر ئەوەی کە لەم غەزایەدا خوای گەورە پلەی شەهیدیی پێ نەبەخشیون .

یەکێکی تریش لەوانەی کە عاشقی شەهیدیی بوو و خوای گەورەش بێدڵیی نەکرد و پێی بەخشیی عومەیری کوڕی ئەبووەققاص بوو ..

کاتێك کە سوپای موسڵمانەکان بەرەو بەدر کەوتە رێ ، عومەیریش کە منداڵێکی شانزە ساڵان بوو کەوتە گەڵ سوپا و ، ئەش ترسا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر منداڵیی وەری نەگرێ و بیگێڕێتە دواوە و نەهێڵێ بەشداریی غەزا بکات .

بۆ ئەمە هەوڵی ئەدا خۆی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بشارێتەوە و ، خۆی ئەدایە پەنای سەعدی کوڕی ئەبووەقاصی برا گەورەی . کە سەعد لە هۆی ئەو خۆشاردنەوەی پرسیاری لێ کرد ، وتی : ئەترسم پێغەمبەری خوا ﷺ بم گێڕێتەوە و ، منیش پێم خۆشە بەشداریی بکەم ، بەڵکو خوای گەورە شەهیدییم دەست بخات .. هەرواش بوو ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی زانیی و ویستی بیگێڕێتە دواوە ، چونکە منداڵە و بەرگەی جەنگ ناگرێ ، عومەیر دەستی بە گریان کرد و ، دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی هاتە جۆش و بەزەیی پێدا هاتەوە و ماوەی دا کە بێت لەگەڵیانا .. ئەوەبوو ئەویش لە غەزای بەدردا بە شەهیدیی سەری نایەوە .

بەڵێ ، کە کافرەکان کوژرانی عوتبە و شەیبە و وەلیدیان دیی ، ئیتر خۆیان پێ نەگیرا و دەستیان بە هێرش کرد .. بەلاّم چۆن هێرشێك .. سەرەتا تیر بارانێکی چڕ و پڕی سوپای موسڵمانانیان کرد ، پاشان تەپیان کوتایە سەریان ..

تەپ و تۆزی هەردوو لەشکرەکە کەوتە ئاسمان .. بریسکەی شمشێر و ، قرچەی دەمی شمشێر و ، حیلەی ئەسپ و، هاوار و نەڕەی کافران و ، ( الله اکبر ) ی موسڵمانان ئەو مەیدانەیان هەژاندبوو ..

هێشتا موسڵمانەکان هێرشیان دەست پێ نەکردبوو .. ئەوان بەرگرییان ئەکرد .. فەرمانی ئازیز بەو شێوە بوو .. ئەمەش بووە هۆی بەهێزبوونی موسڵمانان و لاوازبوونی دوژمن ، چونکە موسڵمانەکان دامەزراو بوون و بت پەرستانیش بە هەر هێرشێکیان تووشی زیانی گەورە ئەبوون ، تا ئەوەبوو هێزیان لێ برا..

پاش ئەم خۆماندووکردنەی قوڕەیش ، فەرمان بۆ کەتیبەکانی ئیسلام دەرچوو ، تا هێرش بکەنە سەر دوژمنی هیلاك و ماندوو ..

لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ مشتێك چەوی هەڵ گرت و ، رووی کردە قوڕەیش و ، فەرمووی : (( شاهت الوجوه )) . دوعای تیاچوونی لە قوڕەیش کرد و ، پاشان چەوەکەی تێ گرتن و فەرمانی بەسەر هاوەڵانیش‌دا دا تا هێرش بکەن و دەست لە دوژمن بوەشێنن ، کە فەرمووی : (( شدوا )) . ئەوانیش مەردانە دەستیان کردەوە .

هەردوو سوپا تێکەڵ بوون .. کەتیبەکانی ئیمان و کەتیبەکانی شەیتان تێك رژان .. جەنگ گەرم بوو .. شمشێر و رم و تیر لافاوی خوێنیان هەڵساندبوو ..

لەشکرە بچکۆلەکەی ئیسلام خۆی دابووە دەست خوا .. لە پاداشتی ئەم تەسلیم بوونەش دا خوای گەورە کۆمەکیی بۆ ناردن .. فەرمانی دا مەلائیکەت بێنە مەیدانی جەنگ تا دڵی موسڵمانەکان دامەزراو بێت و ، مژدەی سەرکەوتنیان پێشکەش بکەن و ، ترس و لەرزیش بخەنە دڵی کافرانەوە و ، جاروباریش بەشداریی جەنگ بکەن ..

موسڵمانەکان پیاوانە دەستیان لە خوانەناسان ئەوەشاند .. بۆ هەموو دنیایان سەلماند کە هێزی عەقیدە و بیروباوەڕ بە هێزی ماددیی چار ناکرێت .. ئەوانەی بەندایەتیی راستەقینە بۆ خوا ئەکەن ، ئەوانە هێز نیە بەرگەیان بگرێ .. هەر کاتێك دڵەکان لە ئیمان پڕ بوون و ، خۆشەویستیی شەهید بوون چووە کرۆکیانەوە، ئەوا کێوی دامەزراو لە بەردەمیاندا خۆی ناگرێ ، چ جای دڵە بە پێز و بێ‌زۆرەکان .. سەلماندیان کە راست ئەکەن ، بەوەی کە خوا کۆمەکیی بۆ ئەناردن ..

لە رۆژی بەدردا دروشمی موسڵمانەکان بریتیی بوو لە (( أحدٌ ، أحد )) . دوای ماوەیەك قورەیش تێك شکان و ، مەیدانیان بۆ موسڵمانەکان چۆڵ کرد .. ئەوەبوو حەفتا لە کافران کوژران و ، حەفتاشیان لێ بە دیل گیران و ، هەرکەسیش لە کوشتن و دیل کردن دەرباز ئەبوو تا ئەی‌توانیی بە پەلە رای ئەکرد و ، بەرەو دوا بەرەو مەککە رێی ئەگرتە بەر .. لە هەمان کات‌دا لە موسڵمانەکان تەنها چواردە کەس شەهید بوون ، هەرچەندە ژمارەیان کەم بوو و چەك و تفاقیشیان کەمتر بوو، بەڵام خوای گەورە پشتی ئەگرتن و ، بە هێز و کۆمەکیی خۆی سەری ئەخستن . شایانی باسە کە ئەو چواردە شەهیدە شەشیان لە موهاجیرەکان و هەشتیشیان لە ئەنصار بوون .

ئەو مشتە چەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ گرتیە سوپای قورەیش ، هەر دەنکە چەوێکیان دەوری تیرێکی بینی ، ئەوەتا خوای گەورەش ئەفەرموێ :

﴿ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴾ ( الأنفال : ١٧ ) .

﴿ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ ( الأنفال : ١٠ ) .

﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾( آل عمران : ١٢٣ ) .

قورئانی پیرۆز پێغەمبەر ئاگار ئەکات کە ئەو چەوەی ئەو بەرەو قورەیش هاویشتی دەستی قودرەتی خوای لەگەڵدا بوو ، بۆیە کاری خۆی کرد . هەروەها ئامۆژگاریی موسڵمانان ئەکات هەتا چاوەڕوانی سەرکەوتن لەلایەن خواوە بکەن .. موسڵمانانیش لە بەدردا ، یەکجار کەم و کەم تفاق بوون و ، یەکجار زەلیل و بێدەست بوون ، بەلاّم خوای گەورە بە قودرەتی خۆی سەرکەوتنی پێشکەش کردن .. دەی وا چاکە ئیمانداران شەرمی خوا بکەن و لەسەر ناز و نیعمەتی نەبڕاوەی هەردەم سوپاسی بکەن .

ئەم سەرکەوتنە خواییە لە رۆژی جومعەی حەڤدەی رەمەزانی ساڵی دووهەمی کۆچییدا بوو ، کە قورئان ناوی ( یوم الفرقان ) ی لێ نا ، چونکە ئەو رۆژە حەق و ناحەق ، هیدایەت و گومڕایی لێك جیا بوونەوە .. چواردە ساڵ لەوەو پێشیش لە هەمان مانگدا بوو کە قورئان هاتە خوارەوە .

جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوەشدا کە خەریکی دوعا و پاڕانەوە بوو و ، موسڵمانەکانیشی بۆ ئازایەتیی و مەردایەتیی هەڵ ئەنا ، لە هەمان کاتدا بەشداریی جەنگیشی ئەکرد ..

ئیمام ئەحمەد لە ئیمام عەلییەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویە : لە رۆژی بەدردا خۆمان ئەدایە پەنای پێغەمبەری خوا ، کە لە هەموومان زیاتر لە دوژمنەوە نزیك بوو و ، لە هەموو کەسیش زیاتر لەو رۆژەدا ئازا و بەغیرەت بوو ..

بوخارییش لە ئیبن عەبباسەوە ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژی بەدر لە کەپرەکەی دێتە دەرەوە و ، بە قەڵغانەکەیەوە بازی ئەدا و ئەیفەرموو :

﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ۝٤٥ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴾ .

دیارە ئەم ئایەتە پیرۆزە لە مەککە هاتۆتە خوارەوە ، بەلاّم لە رۆژی بەدردا ماناکەی هاتە دیی . واتە پێش ئەوەی ماناکەی بزانرێ هاتۆتە خوارەوە .. جا کاتێك کە ئەم ئایەتە لە مەککەدا هاتە خوارەوە عومەر پرسیی : ئەم کۆمەڵە کامەیە ؟! تا کە رۆژی بەدر هات ئەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ بە قەڵغانەکەیەوە باز ئەدات و ئەفەرموێ :

﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ...﴾ ئەوەبوو ئەو رۆژە ماناکەیم زانیی .

ئەبوبەکری صددیقیش خوا لێی رازیی بێ لە رۆژی بەدردا ، چ لە کەپرەکەدا و چ لە دەرەوەیدا ، لە پێغەمبەر ﷺ جوێ نەئەبوویەوە .. ئەو رۆژە شمشێری هەڵ کێشا بوو و بەرگریی لەو ئەکرد .

ئەگێڕنەوە کە عەلیی خوا لێی رازیی بێ رۆژێکیان وتاری ئەدا و ئەیفەرموو : خەڵکینە ! ئازاترینی خەڵك کێیە ؟ وتیان : تۆ ، ئەی ئەمیری ئیمانداران . فەرمووی : من لەگەڵ هەر کەسدا زۆرانبازییم کردبێ بەزاندوومە . بەلاّم ئازاترینی خەڵك ئەبوبەکرە . ئەوەبوو کەپرێکمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست کرد و ، وتمان : کێ لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بێت تا دەستی هیچ بت پەرستێکی نەگاتێ ؟ دەی بەخوا ، هیچ کەسمان لێی نەهاتە پێش جگە لە ئەبوبەکر کە شمشێرەکەی هەڵ کێشا بوو و ، بەسەر سەری پێغەمبەری خواوە وەستا بوو ، تا هەر بتپەرستێ هەڵمەت بداتە سەر پێغەمبەری خوا ئەو یەکسەر هەڵمەتی بداتێ . ئەو لە هەموو کەس ئازاتر بوو .

پاشان فەرمووی : هەروەها چاوم لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ کە قورەیش خەریکی ئازاردانی بوون ، یەکێ بەرهەڵستیی ئەکرد و ، یەکێکیش پاڵی پێوە ئەنا و ئەشیان وت : تۆی هەموو خواکانت کردوون بە یەك خوا ؟ دە بەخوا هیچ کەسێك لێی نەچووە پێش جگە لە ئەبوبەکر . ئەوەبوو ئەی دا لەمە و ، ئەچوو بە گژی ئەوەدا و ئەیفەرموو: تیاچن ! ئەتانەوێ پیاوێك بکوژن کە ئەفەرموێ : الله پەروەردگارمە ؟ پاشان ئیمام عەلیی ئەو عەبایەی بەرز کردەوە کە لە سەر شانی بوو و ئەوەندە گریا هەتا ریشی بە فرمێسك خووسا ، پاشان فەرمووی : لەبەر خوا وەلاّمم بدەنەوە ئایا ئیماندارەکەی ئالی فیرعەون چاکترە یان ئەو ( واتە ئەبوبەکر ) ؟

خەڵکەکە بێدەنگ بوون و ، ئیمام فەرمووی : بەخوا سەعاتێکی ژیانی ئەبوبەکر چاکترە لە پڕ بە پڕی سەرزەویی لە ئیماندارەکەی ئالی فیرعەون : چونکە ئەوە پیاوێك بوو ئیمانەکەی ئەشاردەوە ، بەلاّم ئەم پیاوێك بوو ئیمانەکەی ئاشکرا ئەکرد . ( البداية والنهاية ) .

ئەوەبوو ئیبلیسی لەعنەتیی - وەك لە پێشەوە باس کرا - لە شێوەی سوراقەی کوڕی مالیکی مودلەجییدا هاتبووە لای سوپای قورەیش تا بۆ جەنگ هەڵیان بنێ و بەڵێنی پێ دان کە کۆمەك و پشتیوانیان بێت . کە جەنگ گەرم بوو و دیتی وا

مەلائیکەتی ئاسمان یارمەتیی سوپای ئیمان‌دار ئەدەن و ، پشتی کافران ئەشکێنن، ئەوەندەی بۆ کرا هەڵ بێت و پاشەکشە بکات . هەتا ئەوەبوو حاریثی کوڕی هیشام ، کە وای ئەزانیی سوراقەیە ، لێی پاڕایەوە کە بە جێ‌یان نەهێڵێ ، ئەویش دای بەسەر سنگی حاریثدا و خستی و ، خۆی دەرباز کرد و ، بت پەرستەکانیش بانگیان ئەکرد بە دوایدا : سوراقە بۆ کوێ ؟! ئەی تۆ نەت وت : کۆمەك و پشتیوانمانی و بەجێمان ناهێڵی ؟ وتی : ئەوەی من ئەی‌بینم ئێوە نای‌بینن .. من لە خوا ئەترسم و ، سزای خواش سەختە .. هەروا هەڵات هەتا خۆی خستە ناو دەریاوە ..

دەربارەی بەشداریی‌کردنی مەلائیکەت لە رۆژی بەدردا ، هەر هەموو زانایان لە سەر ئەوە یەك‌دەنگن کە خوای گەورە مەلائیکەتی بۆ کۆمەکیی موسڵمانەکان ناردووە ، ئەمەش بە بەڵگەی ئایەتی:

﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ ( الأنفال : ٩ ـ ١٠ ) .

﴿ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰ ۚ إِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِ ۗ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا خَائِبِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٢٤ ـ ١٢٧ ) .

ئەم کۆمەکی‌یەش چەند جارێك بووە : یەکەم جار هەزار مەلائیکەت و ، پاشان سێ هەزار و ، پاشان پێنج هەزار ..

بەڵام لەسەر کوشتار و جەنگی مەلائیکە زانایان جیاوازن . زۆربەیان رایان لەسەر ئەوەیە کە مەلائیکە سەرەڕای مژدەدان و دامەزراندن و دڵ خۆش کردنی موسڵمانان جەنگیشیان کردووە ، ئەمەش بە بەڵگەی فەرمایشتی خوای گەورە :

﴿ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا ۚ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴾ ( الأنفال : ١٢) .

هەروەها فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە صەحیحی موسلیمدا لە ئیبن عەبباسەوە هاتووە وتوویە : لە کاتێکدا کە پیاوێکی موسڵمان بە دوای موشریکێکدا رای ئەکرد ، گوێی لە لێدانی قامچیی بوو بەسەر سەریەوە و ، سوارەکەش ئەی وت : بەرەو پێش بچۆ ( حەیزووم ) ـ ناوی ئەسپی ئەو مەلائیکەتە بوو ـ کە موسڵمانەکە سەیری موشریکەکەی کرد ئەبینێ وا لەبەر دەمیا کەوت بە پشتا و ، کە لێی ورد بوویەوە ئەبینێ وا ، بە شێوەی لێدانی قامچیی ، داویەتی لە ناوەڕاستی لووتی و ، دەم و چاوی لەت کردووە و هەر هەمووشی شین بۆتەوە . موسڵمانە ئەنصاری‌یەکە دێت و باسەکە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگێڕێتەوە و ئەویش ئەفەرموێ : (( صدقت ، ذلك من مدد السماء الثالثة )) . ئەفەرموێ : راست ئەکەیت ، ئەوە لە کۆمەکیی ئاسمانی سێهەم بووە .

هەروەها ئیبن ئیسحاق لە ئیبن عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : مەلائیکەت جگە لە رۆژی بەدر لە هیچ رۆژێکی تردا جەنگیان نەکردووە . ئەوان بۆ زۆر بوون و کۆمەکیی ئەهاتن و جەنگیان نەئەکرد .

هەندێ لە زانایانیش رایان لەسەر ئەوەیە کە لە رۆژی بەدریشدا مەلائیکەت جەنگیان نەکردووە ، بەڵکو بۆ یارمەتیی و دڵ دامەزراندن و ، مژدەدان بە سەرکەوتن و ، زۆربوونی ژمارەی موسڵمانان ئەهاتن . بەڵگەشیان ئەم دوو ئایەتە پیرۆزەیە :

﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ وَلِتَطۡمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمۡۚ﴾ ( الأنفال : ١٠ ) .

﴿ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ لَكُمۡ وَلِتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ ﴾ ( آل عمران : ١٢٦ ) .

لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانەکانی بۆ دان بەخۆداگرتن و ئازایەتیی هەڵ ئەنا ، هاتەوە یادی کە هەندێ پیاوی ناو سوپای قورەیش حەزیان لە جەنگی موسڵمانەکان نەبووە و بە زۆر و ناچاریی هێنراون . ئەوانە لە هەمان کاتدا دژایەتیی موسڵمانانیان نەکردووە ، بەڵکو هی واشیان هەبووە پارێزگاریی لە موسڵمانان کردووە ، بۆیە فەرمانی بەسەر موسڵمانەکاندا دا تا چاویان لەوانە بێ و ئاگادار بن و نەیان کوژن . ئەوەبوو بە هاوەڵانی فەرموو : (( إني قد عرفت رجالاً من بني هاشم وغيرهم قد أخرجوا مكرهين ، لا حاجة لهم بقتالنا ، فمن لقي منكم أحداً من بني هاشم فلا يقتله . ومن لقي أبا البختري بن هشام بن الحارث بن

أسد فلا يقتله ، ومن لقي العباس بن عبدالمطلب عم رسول الله ﷺ فلا يقتله ، فإنه إنما خرج مستكرهاً )) .

فــەرمانی دا پیــاوانی نــەوەی هاشــم و ئەبولبوختــەریی و عەبباســی مامــەی نەکوژن .

وە نەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەم هەڵوێستەیدا چاودێریی لە خزمــەکانی خــۆی کرد بێت . نەخێر ، دەروونی پاك و پاڵفتەی ئەو پێغەمبەرە نازدارە لــەوەوە دوورە کە خزمەکانی خۆی پێش بخات .. بەڵام ئەوەندە هەیە کە نەوەی هاشم لــە مــاوەی سیانزە ساڵی رەبەقی مەککەدا بەرگرییان لــە ئیســلام و پێغەمبــەر کــرد و ، لــە ماوەی سێ ساڵی ئابڵوقە ئابووری‌یەکەی قورەیش‌دا دژی موســڵمانەکان ، نــەوەی هاشم ، بە کافر و موسڵمانیانەوە ، جگە لە ئەبولەهەب ، هەر هەموویان دەرکرانە شیوی ئەبوطالیب و ، یەکجار برسیی و ئاتاج بوون ، بە رادەیەك کە لــە برســان‌دا گەڵای درەختیان خوارد .. عەبباسیش لە پەیــمانی عەقەبەی دووهەم‌دا هەڵوێستی مەردانە و دڵسۆزانەی بەرامبەر بە موحەممەدی برازای هەبوو .. هەتا بە ئەنصــاری راگەیاند کە موحەممەدی برازای وا لەناو خزم و کەسیا و پارێزراوە ، جا کــە ئــەوان ئەیبەن بۆ مــەدینە با چــاك بیپــارێزن .. ئەبولبوختــەرییش دەورێکــی کاریگــەری هەبوو بۆ هەڵوەشاندەوەی لاپەڕە ستەمکارەکــەی قــورەیش کــە لــە کەعبــەدا دژی موسڵمانەکان هەڵیان واسیی بوو .. جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم چاکانەی نەوەی هاشــم و عــەبباس و ئەبولبوختــەریی لــە یــاد بــوون و ، لــە رۆژی ســەخت و پڕمەترسیی‌دا ئەیویست چاوی لێیان بێ ، ئەوپەڕی وەفاداریی بوو !! جا کێ هەیە ئەوەندەی ئازیز بەوەفا بێت ؟! کێ هەیە ئەوەنــدەی ئــازیز رەوشــت بــەرز بێــت .. هەموو رەوشتێك ؟!

قوڕ بەسەر ئەوانەی لە ژێر بەیداخی ( محمد المصطفى ) دەرئەچن و ئەچــنە ژێــر پەڕۆ شڕەی مرۆڤە نەخۆشەکانەوە !

ئەم ئامۆژگاریی‌یە پڕ وەفایە ، بە شێوەیەکی تر کاری کردە ســەر دڵ و دەروونــی هاوەڵێکی زۆر چاك و ئیمان‌دامەزراوی وەك ئەبوحوذەیفەی کوڕی عوتبــەی کــوڕی رەبیعە و ، قسەیەکی نەشیاوی لە دەم دەرچوو و وتی : گوایا ئێمە بــاوك و کــوڕ و برای خۆمان بکوژین دەست‌بەرداری عەبباس ببین ؟ بەخوا ئەگەر تووشــی بــبم بــە شــمشێر دای ئەگرمەوە ..

ئەم قسەیەی ئەم هاوەڵە بەرێزە گەیشتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش بە عومەری فەرموو : (( یا أبا حفص ! أیُضرب وجه عم رسول الله بالسیف ؟ )) . فەرمووی : ئەی عومەر ! دروستە شمشێر لە دەم و چاوی مامەی پێغەمبەری خوا بدرێ ؟ عومەر فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ماوەم بدە تا بە شمشێر لە ملی بدەم ، دە بەخوا بە مونافیق دەرچوو . بەلاَم پێغەمبەری خوا بەوە رازیی نەبوو و ، لەبەر نییەت و ئیمان و راستگۆیی لەو هاوەڵە بەرێزە خۆش بوو .

بەلاَم ئەبوحوذەیفە ئەو وشە سامناکەی لەبیر نەئەچوو .. هەمیشە وەك تارماییەکی ترسناك لە بەرچاوی بوو و ، خۆشیی و ئارامی دڵ و دەروونی لا هەڵگرت بوو .. ئەوەندە لەو وتەیەی ئەترسا ، قەناعەتی وەها بوو مەگەر شەهیدیی رێی خوا پاکی بکاتەوە لێی .. دڵی ئاوی نەئەخواردەوە کە هیچ کردەوەیەکی تر پاکی بکاتەوە جگە لە شەهید بوون .. ئەوەبوو لە جەنگی پاشگەزبووەکاندا و ، لە رۆژی جەنگی یەمامەدا بە ئاوات گەیشت و بە شەهیدیی سەری نایەوە ، خوا لێی رازیی بێ ..

ئەمە هاوەڵێك بوو بە حیسابی خۆی لە تاقییکردنەوەدا دەرنەچوو بوو ، ئەمە لاوازترین سەربازی سوپای ئیسلام بوو .. خۆ ئەگەر سەیرێکی سەربازە بەهێزەکان بکەین ، سەرمان سوڕ ئەمێنێ .. بۆچ ئەمانە مرۆڤن ؟ ئەم مرۆڤانە تا ئەم رادە بەرزە قورئان کاری کردۆتە سەریان ؟

بەڵێ لە غەزای بەدردا پیاوان دەرکەوتن .. پاڵەوانان هاتنە مەیدان .. بەغیرت و ئارامگران دەستیان دایە چەك .. خۆنەویست و عەقیدەناسان جەنگی عەقیدەیان لەگەڵ کەس وکاری بێئیمانیاندا کرد .. هەر یەکەیان بەوپەڕی لێبڕانەوە شمشێری داهێنایەوە بۆ خزمە بتپەرستەکەی ..

یەکێ لەو پاڵەوانانە ئەبوعوبەیدەی خاوەن ئیمان بوو . ئەوەبوو هەرچیی بەرەو رووی باوکی ببوایەتەوە خۆی لێ لا ئەدا تا لەبەر مافی باوکایەتیی دەستی لێ نەوەشێنێ . کەچیی عەبدوڵلای کوڕی جەڕڕاحی باوکی بت پەرستی ئەوەندە دڵڕەق بوو ئەیویست خوێنی جگەرگۆشەکەی خۆی برێژێ .. ئەبوعوبەیدە خۆی لا ئەدا و باوکی کۆڵی نەئەدا رێی پێ ئەگرت ، تا ئەبوعوبەیدەی ناچارکرد کە باوکی بکوژێت ..

یەکێ تر لەو پاڵەوانانە ئەبوبەکری صددیق بوو ، کە بانگی کردە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی تا بێتە مەیدانی و پێکەوە زۆرانبازیی بکەن .. ئەبوبەکر فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ماوەم بدە با من لە یەکەم دەستە بم بۆ جیهاد و شەهیدیی ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو . (( متعنا بنفسك يا أبابكر ! أما تعلم أنك عندي بمنزلة السمع والبصر ؟ )) . فەرمووی : ئەبوبەکر ! خۆتمان بۆ بهێڵە . ئەی تۆ نازانی تۆ بە لامەوە لە جێی چاو و گوێی ؟

یەکێ تر لەو مەردانە عومەری کوڕی خەططاب بوو کە عاصی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی ئامۆزای دایکی کوشت ، کە وەك خالۆی وەهایە . سەیری پەراوێزی ژمارە ( ١٩٠ ) بکە .

حەمزە و عەلییش عوتبە و شەیبە و وەلیدی ئامۆزای خۆیان کوشت و ، موصعەبی کوڕی عومەیریش عوبەیدی کوڕی عومەیری برای خۆی کوشت .

موسڵمانەکان بە وردیی گوێڕایەڵیی قورئانیان ئەکرد و ، قورئانیش دەرسی مەردایەتیی دائەدان . ئەوەتا دەری ئەبڕێ کە پێویستە دین لە باوك و ڕۆڵە و برا و عەشرەت خۆشەویستتر بێت :

﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾

( المجادلة : ٢٢ ) .

لە پێشەوە وتمان کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە هاوەڵانی کە ئەگەر تووشی ئەبولبوختەریی بوون نەیکوژن ، چونکە پیاوێکی بێزیان بوو بۆ موسڵمانەکان ، بگرە کۆمەکیی ئەکردن . کەچیی ئەبولبوختەریی سەرەڕای ئەوەش کوژرا .. ئەوەبوو مەجذەری کوڕی زیادی بەلەویی لە مەیدانی جەنگدا گەیشت بە ئەبولبوختەریی کە لەگەڵ پیاوێکی هاوەڵیدا بوو و پێکەوە جەنگیان ئەکرد . مەجذەر وتی : ئەبولبوختەریی !. پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوشتنی تۆ قەدەغەی کردووین . وتی : ئەی هاوەڵەکەم ؟ مەجذەر وتی : نا بە خوا ئێمە واز لە هاوەڵەکەت ناهێنین . واتە : کوشتنی ئەومان لێ قەدەغە نەکراوە . وتی : دەی

بەخوا کەواتە ئەبێ من و ئەو هەردووکمان پێکەوە بمرین . دەستیان بە جەنگ کرد و مەجذەریش ناچار بوو ئەبولبوختەریی بکوژێت .

لە کاتی جەنگ دا شمشێرەکەی عوکاشەی کوڕی مەحصەنی ئەسەدیی شکا و ، هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەویش لقەدارێکی دا بە دەستیەوە و فەرمووی : (( قاتل بهذا یا عكاشة )) .. فەرمووی : عوکاشە بەمە جەنگ بکە . هەرکە لە دەستی پێغەمبەری خوا وەری گرت و شۆکانیەوە ، یەکسەر بوو بە شمشێرێکی درێژی ، ئەستووری ، دەم سپیی تیژ و ، جەنگی پێ کرد هەتا خوا سەرکەوتنی بۆ موسڵمانەکان نارد . ئەم شمشێرە ناوی ( العون ) بوو ، هەروا بە دەستی عوکاشەوە بوو و ، لە هەموو جەنگەکاندا جەنگی پێوە ئەکرد ، تا ئەوەبوو لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا عوکاشە شەهید بوو .

لەم جەنگە ناهەموارەدا ئەبوجەهل دەوری گرنگی هەبوو .. خۆی سەرکردەی گشتیی سوپای قورەیش بوو .. لە هەموو کەس زیاتر داخ‌لەدڵی موسڵمانەکان بوو .. بۆیە جەنگی سەرومالیی ئەکرد .. بەڵام دوای ماوەیەك هەستی کرد کە رەنج و تەقالای بێ هوودەیە و ، وا خەریکە ریزەکانی سوپاکەی هەرەس دێنن ، لەگەڵ ئەوەش‌دا ئەی‌ویست لە بەردەم ئەو مەترسی‌یەدا بوەستێ و ، هەر خەریك بوو جەنگاوەرە قورەیشی‌یەکانی هەڵ ئەنا و غیرەتی ئەخستە بەریان و بەوپەڕی فیز و دەمارەوە پێی ئەوتن : پشت هەڵکردنی سوراقە نەتان بەزێنێ ، چونکە سوراقە لەگەڵ موحەممەددا رێك کەوتبوو و ، کوژرانی عوتبە و شەیبە و وەلیدیش نەتان ترسێنێ ، چونکە خۆیان پەلەیان کرد .. دە بە لات و عوززا ناگەڕێینەوە هەتا بە گوریس دەست و پێیان نەبەستین .

ئەوەندەی پێ نەچوو هاش و لووشەکەی نیشتەوە و ، قورەیش دەستیان دایە هەلاتن و، ئەویش کۆمەڵێك جەنگاوەری لە دەوردا مابوونەوە ، کە بە شمشێر و رم پەرژینیان بۆ دروست کردبوو و ، ئەیان‌ویست بە سەرومالْ بی‌پارێزن ، کەچیی کە شالاو و هێرشی موسڵمانەکان هات ، رم و شیر و تیری دەوری ئەبوجەهل دادیان نەدا و ، بە هێزی بازووی موسڵمانان پەرژینەکە پێچرایەوە و ، ئەبوجەهل دەرکەوت و ، موسڵمانان سەیریان کرد وا بە سواریی ئەسپەکەی لە مەیدان‌دا هات وچۆ ئەکات و ، چاوەڕوانیی ئەجەلی ئەکات ..

عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف ئەڵێت : لە ڕۆژی بەدردا لە ڕیزی سوپادا وەستابووم ، کە ئاوڕم دایەوە ، ئەبینم لەلای ڕاستم و چەپمدا دوو گەنج وەستاون ، هەروەك بە شیاویان نەزانم ( لەبەر منداڵیی ) . یەکێکیان بە نهێنیی ، بێ ئەوەی بهێڵێ هاوەڵەکەی ئاگادار بێ وتی : مامەگیان ! ئەبوجەهلم پیشان بدە . منیش وتم : کوڕی برام ! ئەبوجەهلت بۆ چی‌یە ؟ وتی : هەواڵم پێ دراوە کە جنێو بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدات . وتی : بەو خوایەی کە گیانی بە دەستە ئەگەر بی‌بینم ناهێڵم سێبەرمان جیا بێتەوە هەتا یەکێکمان نەکوژێ . منیش بەمە سەرسام بووم . ئەڵێت : ئەوی تریش دەستی تێ ژەندم و وەك ئەوی پێ وتم . ئەوەندەی پێ نەچوو سەیرم کرد ئەبینم ئەبوجەهل لە ناو خەڵکەکەدا هاتوچۆ ئەکات . وتم : نابینن ؟ ئەوە ئەو پیاوەیە ئێوە هەواڵی ئەپرسن .

ئەڵێت : بە شمشێرەکانیانەوە هەڵمەتیان دایە و ، بە شمشێر دایانگرتەوە هەتا کوشتیان . پاشان چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی : (( أيكما قتله ؟ )) . فەرمووی : کامتان کوشتتان ؟ هەریەکەیان ئەی وت : من کوشتم . فەرمووی : (( هل مسحتما سيفيكما ؟ )) فەرمووی : شمشێرەکانتان سڕیون ؟ وتیان : نەخێر . پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری هەردوو شمشێرەکەی کرد و ، فەرمووی : (( كلاكما قتله )) . فەرمووی : هەردووکتان کوشتووتانە . ئەو دوو گەنجەش موعاذی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح و موعەووەذی کوڕی عەفراء بوون و ، سەرەنجام پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵ و پەلە دەست کەوتەکەی ئەبوجەهلی دا بە موعاذی کوڕی عەمر ، چونکە موعەووەذ هەر لەو جەنگەدا بە پلەی شەهیدیی گەیشت ..

ئیبن ئیسحاق ئەڵێت : موعاذی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح ئەی‌وت : گوێم لە خەڵکیی بوو و ، ئەبوجەهلیش وەك لەناو دارستانێکی چڕدا بێت و دەوری درابێ ، ئەیان‌وت : کەس دەستی ناگاتە ئەبولحەکەم . کە ئەمەم بیست ، خستمە ئەستۆی خۆمەوە و، بەرەو رووی ڕۆیشتم .. کە لێی نزیك کەوتمەوە ، هەڵمەتم دایە سەری و ، شمشێرێکم لێ دا و نیوەی قاچیم قرتاند و پەڕی . دە بەخوا کاتێك کە پەڕی بەو ناوکەم شوبهاند کە لە ژێر دەسکەواندا دەر ئەپەڕێ .. ئەی‌وت : عیکریمەی کوڕی شمشێرێکی دا لەسەر شانم و قۆڵمی پەڕاند و ، تەنها بە پێستێکی لا تەنیشتمەوە هەڵ واسرابوو و ، جەنگ و کوشتار ئەوی لە بیر بردبوومەوە ..

سەرانسەری ئەو رۆژەم خەریکی جەنگ و کوشتار بووم و ، قۆڵەکشم بە دوای خۆم دا رائەکێشا .. کە ئازاری دام ، پێم خستە سەری و خۆم دا بە سەریدا و فڕێم دا. پاشان کە ئەبوجەهل بە زامدارییی کەوتبوو موعەوویذی کوڕی عەفراء دای بە لایدا و بە شمشێرێك لە جووڵەی خست و ، لە گیانکەنشتدا بوو بە جێی هێشت و ، موعەوویذ هەروا خەریکی کوشتار بوو هەتا شەهید بوو . بەڵام موعاذ هەتا سەردەمی خەلیفە عوثمان ژیا ..

ئەبوجەهل وەك قوڕی بەسەر خۆیدا کرد ئابڕووی قوڕەیشیشی برد و ، لەبەر چاوی هۆزەکانی دوورگەدا کردیە پەندی زەمانە..

بەڵێ ، لەشکری فیز و دەمار ورەی نەما و ، هەر کەسە هەوڵی ئەدا خۆی دەرباز بکات .. هەتا رم و شیرەکانی دەوری ئەبوجەهلیش هەڵاتن .. ئەبوجەهل لە دوا ساتەکانی ژیانیدا ، لە مەیدانی جەنگدا بە تەنیا کەوتبوو و ، پاڵەوانە گۆشت خۆرەکانی قوڕەیشیش ، وەك ئەو رانە ئاسکەی کە راوچیی راویان بنێ ، دەر و دەشتیان دابووە بەر و ، هەریەکە بە دوای کونێکدا ئەگەڕا کە خۆی تیا حەشار بدات ..

بەمە موسڵمانەکان دەستیان بەسەر مەیدانی جەنگدا گرت کە حەفتا کوژراو و حەفتا دیلی تێدا بە جێ مابوو و ، کەوتنە دەست موسڵمانەکان ، ئیتر با کەرەسە و کەلوپەلی زۆر و زەبەندەی سوپای تێك شکاو لەولاوە بوەستێ ، کە هەڵاتووان بە جێیان هێشتبوو .

کاتێك کە جەنگ تەواو بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( من ينظر ما صنع أبوجهل ؟ )) فەرمووی : کێ ئەچێ بزانێ ئەبوجەهل چیی بەسەر هاتووە ؟

موسڵمانەکان دەستیان دایە گەڕان بە دوای ئەبوجەهلدا ، تا ئەوەبوو عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێی رازیی بێ دۆزییەوە و ، ئەبینێ وا بە حاڵە حاڵە گیانی تێدا ماوە . ئەمیش پێی خستە سەر ملی و ریشی گرت تا سەری لە لاشەی جیا بکاتەوە و وتی : ئەی دوژمنی خوا ! ئایا خوا سەرشۆڕی کردی ؟! وتی: بە چیی سەرشۆڕی کردووم ؟ هەر ئەوە نیە پیاوێکیان کوشتووە ؟ خۆزگە بەندەیەك نەیکوشتمایە . پاشان وتی : هەواڵم بدەرێ ئەمڕۆ سەرکەوتن بۆ کێیە ؟ وتی : بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی . پاشان بە ئیبن مەسعوودی وت ، کە ئەوەبوو

پێی خستبووه سەر ملی : ئەی شوانی مەڕ! سەر کەوتوویتە سەر شوێنێکی بەرز . ئەوەبوو عەبدوڵلاّ لە مەککەدا شوانی مەڕ بوو .

دوای ئەم وت و وێژە عەبدوڵلاّ سەری لە لاشەی جیا کردەوە و ، سەرەکەی هێنایەوە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمە سەری ئەبوجەهلی دوژمنی خوایە . فەرمووی : (( ألله الذي لا إله إلا هو ؟ )) سێ جار فەرمووی ، پاشان فەرمووی : (( الله أكبر ، الحمد الله الذي صدق وعده ، ونصر عبده ، وهزم الأحزاب وحده ، وانطلقْ أرِنيه )) . فەرمووی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەڵێنی خۆی بەسەر برد و ، بەندەکەی خۆی سەر خست و ، بە هێزی خۆی سوپای دوژمنانی تێك شکاند . وەرە لەگەڵمدا پیشانم بدە .

عەبدوڵلاّ ئەڵێ : پێکەوە رۆیشتین و پیشانم دا و ، فەرمووی : (( هذا فرعونُ هذه الأمة )) . فەرمووی : ئەمە فیرعەونی ئوممەتی ئیسلامە .

کاتێك کە قورەیش تێك شکا و ، هەندێکیان ناچار بوون لە ترساندا دەست بەرز بکەنەوە ، تا موسڵمانەکان قۆڵ بەستیان بکەن ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو کەپرەکەیدا بوو و ، سەعدی کوڕی موعاذیش شمشێرەکەی دەرهێنابوو و ، لە دەرگای کەپرەکەدا بۆ پاسەوانیی پێغەمبەر وەستا بوو .. پێغەمبەری خوا ﷺ کە سەرنجی دەم و چاوی سەعدی دا هەستی کرد کە سەعد ئەو کارەی موسڵمانانی بە دڵ نیە ، بۆیە لێی پرسیی : (( والله لكأنك يا سعد تكره ما يصنع القوم ؟ )) فەرمووی : بەخوا لەوە ئەچێ ، ئەی سەعد ! ئەو کارەی خەڵکەکەت پێ ناخۆشە ؟ وتی : ئەرێ ، بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ! چونکە یەکەم تێکشکانێك بوو کە خوا بەسەر ئەهلی شیرك دا هێنای ، کوشتنی ئەهلی شیرك بە لامەوە باشتر بوو لە هێشتنەوەی پیاوەکان بە زیندوویی .

بەڵێ ، جەنگی بەدر بە تێکشکانی قورەیش و سەرکەوتنێکی چاکی موسڵمانان کۆتایی هات . ئەوەبوو لە ریزی موسڵمانەکاندا چواردە کەس شەهید بوون کە شەشیان لە موهاجیرەکان و هەشتیان لە ئەنصار بوون ، کە ئەمانەن :

أ ـ شەهیدەکانی موهاجیرەکان ئەمانە بوون :

( أ ) لە نەوەی موطەللیبی کوڕی عەبدمەناف یەك پیاو شەهید بوو ، کە ئەویش عوبەیدەی کوڕی حاریثی کوڕی موطەللیبی کوڕی عەبدمەناف بوو ، کە عوتبەی کوڕی رەبیعەی کوڕی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف لە کاتی

زۆرانبازی‌یەکەدا قاچی پەڕاند و ، بە زامدارییی گەڕایەوە دوا و ، کاتێ کە سوپای موسڵمانان بەرەو مەدینە گەڕایەوە و، گەیشتە دۆڵی ( صەفراء ) لەوێ کۆچی دوایی کرد . شایانی باسە کە موطەللیب و عەبدشەمس و هاشمی باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ هەرسێکیان برا بوون .

( ب ) لە نەوەی زوهرەی کوڕی کیلاب دوو پیاو شەهید بوون :

١ ـ عومەیری کوڕی ئەبووەققاص برای سەعدی کوڕی ئەبووەققاص ، کە لە پێشەوە باس کرا چۆن بەو منداڵی‌یە حەزی لە شەهیدیی بوو .

٢ ـ ( ذو الشمالين ) کوڕی عەبد عەمری کوڕی نەضلەی خوزاعیی ، کە هاوپەیمانی نەوەی زوهرە بوو .

( ج ) لە نەوەی عەدیی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی دوو پیاو شەهید بوون :

١ ـ عاقلی کوڕی بوکەیر ، کە هاوپەیمانی نەوەی عەدیی بوو و ، یەکەم کەسێك بوو کە لە ڕۆژانی سەختی مەککەدا لەماڵی ئەرقەمدا بەیعەتی بە پێغەمبەر ﷺ دا و ، یەکێ بوو لە موسڵمانە پێشینەکان و ، لەوەو پێش ناوی ( غافل ) بوو و پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا ( عاقل ) .

٢ ـ میهجەع ، کە بەندەی عومەری کوڕی خەططاب بوو و لە ڕێی خوادا ئازادی کرد . یەکێ بووە لەوانەی کە زوو بە زوو موسڵمان بووە و یەکەم شەهیدی بەدریش بووە . لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس‌ەوە ریوایەت کراوە کە میهجەع ئەو پیاوە بووە کە خوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی دەربارەی ئەو ناردۆتە خوارەوە :

﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾ . ( الأنعام : ٥٢ ) .

ئەمەش لە قەدەغە کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە خوارەوە تا ئەو ئیمان‌دارە هەژارانە ، لەسەر داوای مل‌هوڕەکانی قوڕەیش ، لە کۆڕ و دانیشتنەکانی خۆی دەر نەکات.

( د ) لە نەوەی حاریثی کوڕی فیهر یەك پیاو شەهید بوو کە ئەویش صەفوانی کوڕی وەهبی کوڕی رەبیعەی کوڕی هیلالی فیهری‌یە و صەفوانی کوڕی بەیضائیشی پێ ئەڵێن . صەفوان لە بەدردا بە دەستی طوعەیمەی کوڕی عەدیی نەوفەلیی شەهید کرابوو .

ب ـ شەهیدەکانی ئەنصاریش ئەمانە بوون .

( أ ) له نهوهی عهمری کوڕی عهوف ( که تیرهیهکی ئهوس بوون ) دوو پیاو شههید بوون .

١ـ سهعدی کوڕی خهیثهمه ، که یهکێك بوو لهو موسڵمانانهی مهدینه که زوو موسڵمان بوو و، یهکێکیش بوو له دوانزه نهقیبهکهی بهیعهتی عهقهبهی دووههم . ئهوهبوو له ڕۆژی بهدردا سهعد و خهیثهمهی باوکی ههریهکهیان حهزی ئهکرد خۆی بهشداریی بکات بۆ ئهمه قورعهیان کێشا و بۆ سهعد دهرچوو که گهنج بوو . باوکی داوای لێ کرد ڕێی بدا تا دهرچێ ، کهچیی سهعد له وهلاٚمدا وتی : بابهگیان ! ئهگهر جگه له بهههشت شتێکی تر بوایه وهام ئهکرد .

٢ـ مویهششیری کوڕی عهبدولمونذیری کوڕی زهنبهر ، که برای ئهبولوبابهی ئهنصاریی بوو که پێغهمبهری خوا ﷺ له ڕهوحاء گێڕایهوه بۆ مهدینه تا ئهو ماوهیهی خۆی له مهدینه نیه ئهو ئهمیر بێ .

( ب ) له نهوهی حاریثی کوڕی خهزرهج ( که ئهوانیش تیرهیهکی خهزرهج بوون ) پیاوێك شههید بوو که ئهویش یهزیدی کوڕی حاریث بوو .

( ج ) له نهوهی سهلیمه ( که ئهوانیش تیرهیهکی خهزرهج بوون ) پیاوێك شههید بوو که ئهویش عومهیری کوڕی حومام بوو ، که ئهوهبوو له پێشهوه باسی شههیدبوونی کرا .

( د ) له نهوهی حهبیب ( که ئهوانیش تیرهیهکی خهزرهج بوون ) پیاوێك شههید بوو که ئهویش رافیعی کوڕی موعهللا بوو ، که به دهستی عیکریمهی کوڕی ئهبوجههل شههید کرا .

( هـ ) له نهوهی نهججار ( که تیرهیهکی خهزرهج بوون ) سێ پیاو شههید بوون :

١ ـ حاریثهی کوڕی سوراقهی کوڕی حاریث .

٢ ـ عهوفی کوڕی حاریثی کوڕی ریفاعهی کوڕی سهواد .

٣ ـ موعهوویذی کوڕی حاریثی برای ، که ههردووکیان کوڕی عهفرائن و ، ههردووکیشیان له کوشتنی ئهبوجههلدا بهشدارییان کرد ، دوای ئهوهی پیاوێکی ئهنصاریی زامداریی کردبوو .

بهلاٚم کوژراوانی قورهیش که ئهگهیشتنه حهفتا پیاو ئهمانه بوون :

( أ ) له نهوهی عهبدشهمسی کوڕی عهبدمهناف دوانزه پیاو کوژرا بوون که ئهمانهن :

١ ـ شەیبەی کوڕی ڕەبیعە ، کە حەمزە بە زۆرانبازیی کوشتی .

٢ ـ عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ، کە عوبەیدەی کوڕی حاریث لە زۆرانبازیی‌یەکەدا زامداری کرد و ، دواییش عەلیی و حەمزە هەڵمەتیان دایێ و یەکجاریان کرد .

٣ ـ وەلیدی کوڕی عوتبە ، کە بە زۆرانبازیی ئیمام عەلیی کوشتی .

٤ ـ حەنظەلەی کوڕی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب ، کە زەیدی کوڕی حاریثەی خزمەتگوزاری پێغەمبەری خوا کوشتی .

٥ ـ حاریثی کوڕی حەضرەمیی ، کە هاوپەیمانی نەوەی عەبدشەمس بوو و نوعمانی کوڕی عەصر کوشتی .

٦ ـ عامیری کوڕی حەضرەمیی ، کە ئەویش هاوپەیمانیان بوو و ، هەڵ گیرسێنەری ئاگری جەنگ بوو . ئەوەبوو خۆی دەرخست . عەمماری کوڕی یاسر کوشتی .

٧ ـ عومەیری کوڕی ئەبوعومەیر .

٨ ـ کوڕێکی ئەو عومەیرە . کە هەردووکیان بەندەی نەوەی عەبدشەمس بوون.

٩ ـ عوبەیدەی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص ، کە زوبەیری کوڕی عەووام کوشتی .

١٠ ـ عاصی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص ، کە ئیمام عەلیی کوشتی .

١١ ـ عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیط ، کە عاصیمی کوڕی ثابیت کوشتی ، ئەویش لە کاتی گەڕانەوەی سوپای ئیسلامدا بەرەو مەدینە ، لە شوێنێكدا کە پێی ئەڵێن ( عرق الظبية ) .

١٢ ـ عامیری کوڕی عەبدوڵڵای نەمریی ( هاوپەیمانیان بوو ) ، کە ئیمام عەلیی کوشتی .

( ب ) لە نەوەی نەوفەلی کوڕی عەبدمەناف دوو پیاو کوژرابوون ، کە ئەمانەن:

١ ـ حاریثی کوڕی عامیری کوڕی نەوفەل ، کە خوبەیبی کوڕی ئەساف کوشتی.

٢ ـ طوعەیمەی کوڕی عەدیی کوڕی نەوفەل ، کە ئیمام عەلیی کوشتی .

( ج ) لە نەوەی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا حەوت پیاو کوژرا بوون کە ئەمانەن :

١ ـ زەمعەی کوڕی ئەسوەدی کوڕی موطەللیب ، کە ثابیتی کوڕی جەذع کوشتی . ئەشڵێن عەلیی و حەمزە لە کوشتنیدا بەشداری‌یان کردووە .

٢ ـ ئەبولوختەریی کوڕی هیشام کە ناوی ( عاص ) بووە ، مەجذەری کوڕی زیادی بەلەویی کوشتی .
٣ ـ حاریثی کوڕی زەمعە ، کە عەمماری کوڕی یاسر کوشتی .
٤ ـ نەوفەلی کوڕی خوەیلیدی کوڕی ئەسەد ، کە برای خاتووخەدیجەی دایکی ئیمانداران بوو و ، یەکێ بوو لە شەیتانەکانی قورەیش و ئیمام عەلیی کوشتی .
٥ ـ عەقیلی کوڕی ئەسوەدی کوڕی موطەللیب ، کە حەمزە و عەلیی کوشتیان .
٦ ـ عوقبەی کوڕی زەید کە پیاوێکی یەمەنیی بوو و هاوپەیمانی نەوەی ئەسەد بوو .
٧ ـ بەندەیەکی نەوەی ئەسەد کە ناوی عومەیر بوو .
( د ) لە نەوەی عەبدودداری کوڕی قوصەی چوار پیاو کوژرابوون :
١ ـ نەضری کوڕی حاریثی کوڕی کیلدەی کوڕی عەلقەمە . ئەم نەضرە هەڵگری ئاڵای بت پەرستەکان بوو و ، لە جەنگی بەدردا بە دیل گیرا ، بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بکوژرێت و ، ئیمام عەلیی ، لە ( وادي الصفراء ) کوشتی ، چونکە ئەم پیاوە یەکێ بوو لە شەیتانەکانی قورەیش و ، گەورەترین تاوانباری جەنگ بوو و ، سزای موسڵمانەکانی زۆر ئەدا ..
٢ ـ زەیدی کوڕی مولەیص کە بەندەی عومەیری کوڕی هاشمی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی عەبدوددار بوو و ، بیلالی کوڕی رەباح کوشتی .
٣ ـ نەبیهی کوڕی زەیدی کوڕی مولەیص کە هاوپەیمانیان بوو .
٤ ـ عوبەیدی کوڕی سولەیط ، کە هاوپەیمانیان بوو .
( هـ ) لە نەوەی تەمیمی کوڕی موڕڕە چوار پیاو کوژرابوون :
١ـ مالیکی کوڕی عوبەیدوڵلای کوڕی عوثمان ، کە برای هاوەڵی پایەدار طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا بوو . مالیك بە دیلیی کەوتە دەست موسڵمانەکان و لە ماوەی دیلیی‌دا کۆچی دوایی کرد و ، بە یەکێ لە کوژراوانی بەدر لە قەڵەم درا .
٢ ـ عەمری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی جەدعان .
٣ ـ عومەیری کوڕی عوثمانی کوڕی عەمری کوڕی کەعب کە ئیمام عەلیی کوشتی .
٤ ـ عوثمانی کوڕی مالیکی کوڕی عوبەیدوڵلا ، کە صوهەیب کوشتی .

( و ) لە نەوەی مەخزووم ( هۆزەکەی خالیدی کوڕی وەلید ) بیست و چوار پیاو کوژرابوون ، کە ئەمانەن :

١ ـ فەرماندەی گشتیی سوپای مەککە ( ئەبوجەهلی کوڕی هیشام ) کە ناوی عەمر بوو و لە پێشەوە کوژرانی باس کرا .

٢ ـ عاصی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرە کە برای ئەبوجەهل بوو و ئامۆزای دایکی عومەری کوڕی خەططاب بوو و عومەر خۆی کوشتی .

٣ ـ یەزیدی کوڕی عەبدوڵلا کە هاوپەیمانیان بوو و ، عەممار کوشتی .

٤ ـ ئەبوموسافیحی ئەشعەریی کە ئەمیش هاوپەیمانیان بوو و ئەبو دوجانە کوشتی .

٥ ـ حەرمەلەی کوڕی عەمر کە هاوپەیمانیان بوو و خاریجەی کوڕی زەید کوشتی. خاریجەش لە ئوحوددا شەهید کرا .

٦ ـ مەسعوودی کوڕی ئەبوئومەییەی کوڕی موغیرە کە ئامۆزای خالید بوو و ئیمام عەلیی کوشتی .

٧ ـ ئەبوقەیسی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرە کە برای خالید بوو و ، حەمزە کوشتی .

٨ ـ ئەبوقەیس کوڕی فاکیهەی کوڕی موغیرە کە ئەویش ئامۆزای خالید بوو و ئیمام عەلیی کوشتی .

٩ ـ ریفاعەی کوڕی عابیدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی مەخزووم کە سەعدی کوڕی رەبیع کوشتی .

١٠ ـ مونذیری کوڕی ئەبوریفاعەی کوڕی عابید کە مەعنی کوڕی عەدیی کوشتی .

١١ ـ سائیبی کوڕی ئەبوسائیبی کوڕی عابید کە زوبەیری کوڕی عەووام کوشتی . لە ریوایەتێکی تردا وا هاتووە کە ئەم پیاوە بە چاکیی موسڵمان ئەبێت.

١٢ ـ ئەسوەدی کوڕی عەبدولئەسەد کە حەمزە کوشتی .

١٣ ـ حاجیبی کوڕی سائیبی کوڕی عوەیمیر کە عەلیی کوشتی .

١٤ ـ عوەیمیری کوڕی سائیبی کوڕی عوەیمیر کە بە زۆرانبازیی نوعمانی کوڕی مالیک کوشتی .

١٥ ـ عەمری کوڕی سوفیان ، کە هاوپەیمانیان بوو و ، لە هۆزی طەی بــوو و ، یەزیدی کوڕی رەقیش کوشتی .

١٦ ـ جابیری کوڕی سوفیان ، کە ئەویش هاوپەیمانیان بوو و ، لە هــۆزی طـەی بوو و ، جابیری ئەبوبوردەی کوڕی نیار کوشتی .

١٧ ـ عەبدوڵڵای کوڕی مونذیری کوڕی ئەبوڕیفاعە، کە ئیمام عەلیی کوشتی.

١٨ ـ حوذەیفەی کوڕی ئەبوحوذەیفەی کوڕی موغیرە ، کە ئامۆزای خالید بــوو و، سەعدی کوڕی ئەبووەققاص کوشتی .

١٩ ـ هیشامی کوڕی ئەبوحوذەیفەی کوڕی موغیرە ، کە ئامۆزای خالید بوو و صوهەیبی کوڕی سینان کوشتی .

٢٠ ـ زوهەیری کوڕی ئەبوڕیفاعە ، کە ئەبوئوسەید ، مــالیکی کــوڕی رەبیعــە کوشتی .

٢١ ـ سائیبی کوڕی ئەبوڕیفاعە ، کە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف کوشتی .

٢٢ ـ عــائیذی کوڕی سائیبی کوڕی عوەیمیر ، کە لە جەنگدا حەمزە زامداری کرد و ، پاشان بە دیل گیرا و ، فیدیەی دا و بەر بــوو ، کەچــیی دواتــر بــە هــۆی زامەکەیەوە مرد .

٢٣ ـ پیاوێکی هۆزی طەی کە ناوی عومەیر بووە و هاوپەیمانیان بووە .

٢٤ ـ پیاوێکی تر کە ناوی ( خیار ) و لە هۆزی قارە بــووە و ، هـــاوپەیمانیان بووە .

( ز ) لە نەوەی سەهمی کوڕی عەمر ( هۆزەکەی عەمری کوڕی عاص ) حەوت پیاو کوژرابوون ، کە ئەمانەن :

١ ـ مونەببیهی کوڕی حەججـاجی کوڕی حوذەیفــەی کــوڕی ســەعدی کــوڕی سەهم ، کە ئەبولیوسری خزمی نەوەی سەلیمە کوشتی .

٢ ـ کوڕەکەی ، عاصی کوڕی مونەببیه ، کە ئیمام عەلیی کوشتی .

٣ ـــ براکــەی ، نــەبیهی کــوڕی حــەججاج ، کــە حــەمزە و ســەعدی کــوڕی ئەبووەققاص بە هاوبەشیی کوشتیان .

٤ ـ ئەبولعاصی کوڕی قەیسی کوڕی عەدیی کوڕی سەعدی کوڕی سەهم ، کــە ئیمام عەلیی کوشتی . هەندێکیش ئەڵێن : نوعمانی کوڕی مالیك و ، هەنــدێکی تریش ئەڵێن : ئەبودوجانە کوشتوویانە .

٥ ـ عاصمی کوڕی ضوبەیرەی کوڕی سەعیدی کوڕی سەعدی کوڕی سەهم کە ئەمیش ئەبولیوسر کوشتی .

٦ ـ حاریثی کوڕی مونەببیهی کوڕی حەججاج ، کە صوهەیب کوشتی .

٧ ـ عامیری کوڕی عەوفی کوڕی ضوبەیرەی برازای عاصم ، یان عەبدوڵڵای کوڕی سەلەمەی عیجلانیی ، یان ئەبودوجانە کوشتوویانە .

( ح ) لە نەوەی عامیری کوڕی لوئەی دوو پیاو کوژراون کە ئەمانەن :

١ ـ موعاویەی کوڕی عامیر کە هاوپەیمانیانە و لە نەوەی عەبدولقەیسە . عوکاشە کوشتوویە .

٢ ـ مەعبەدی کوڕی وەهب کە هاوپەیمانیانە و لە نەوەی کەلبی کوڕی عەوفە و، خالید و ئەیاسی کوڕانی بوکەیر کوشتوویانە .

( ط ) لە نەوەی جومەحی کوڕی عەمری کوڕی هەصیص چوار پیاو کوژراون کە ئەمانەن :

١ ـ ئومەییەی کوڕی خەلەف ، کە پیاوێکی ئەنصاریی لە نەوەی مازین کوشتی . ئومەییە ئەو ستەمکارە بوو کە لە مەککە سزای بیلالی ئەدا . کە بیلال چاوی بە ئومەییە کەوت هاواری کرد : سەرۆکی کوفر ، ئومەییەی کوڕی خەلەف . رزگار نەبم گەر بهێڵم ئەو رزگاری ببێ . ئەوەبوو ئومەییە و عەلیی کوڕی بە دیلیی کەوتبوونە دەست عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ، کە دەیویست لە دەستی بیلال رزگاریان بکات . دیسان بیلال وتی : رزگار نەبم گەر بهێڵم ئەو رزگاری ببێ . پاشان بە هەموو دەنگی هاواری کرد : ئەی کۆمەکانی خوا ! سەرۆکی کوفر ، ئومەییەی کوڕی خەلەف . رزگار نەبم گەر بهێڵم ئەو رزگاری ببێ .. موسڵمانەکان دەورەیان لە خۆی و کوڕەکەیان دا و کوشتیان .

٢ ـ کوڕەکەی ، عەلیی کوڕی ئومەییە ، کە عەممار کوشتی .

٣ ـ ئەوسی کوڕی مەعیر کە ئیمام عەلیی ، یان حوصەینی کوڕی حاریث ، یان عوثمانی کوڕی مەظعوون کوشتوویانە .

٤ ـ سەبرەی کوڕی مالیك کە هاوپەیمانیان بووە .

کە جەنگ تەواو بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاتە سەر کوژراوەکان و فەرمووی : (( بئسَ العشيرةِ كُنتُم لنبِيِّكُم ، كذَّبتُموني وصدَّقَني الناسُ ، وخذلتُموني ونَصَرَني الناسُ ، وأَخرَجتُموني وآواني الناسُ )) . فەرمووی : ئێوە خراپترین کەس و

کار بوون بۆ پێغەمبەرەکەتان .. ئێوە بە درۆتان خستمەوە ، کەچیی خەڵکیی بڕوایان پێ کردم .. ئێوە پشتتان بەر دام ، کەچیی خەڵکیی کۆمەکی‌یان کردم .. ئێوە دەرتان کردم ، کەچیی خەڵکیی جێیان کردمەوە . پاشان فەرمانی دا و رایان کێشان و خستنیانە بیرێك لە بیرەکانی بەدر .

لە ئەبوطەلحەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ رۆژی بەدر فەرمانی دا لاشەی بیست و چوار پیاوی مل‌هوڕانی قورەیش بهێنن و ، فڕێیان بدەنە ناو بیرێکی بەدرەوە . ئەوەبوو هەرچیی بەسەر کۆمەڵێك‌دا سەربکەوتایە لەو ناوەدا سێ شەو ئەمایەوە . جا کە دوای جەنگی بەدر بووە سێ‌هەم رۆژ ، فەرمانی دا وڵاغەکەی بۆ بهێنن و بۆی ئامادە بکەن ، پاشان رۆیشت و هاوەڵانیش بە دوای‌دا رۆیشتن ، هەتا گەیشتە سەر لێواری بیرەکە و ، دەستی کرد بە بانگ کردنیان بە ناوی خۆیان و باوکیانەوە: (( یا فلان بن فلان ! یا فلان بن فلان ! أَیَسُرُّکُم أنّکُم أطعتُم اللهَ ورَسولَهُ ؟ فإنّا قد وجَدنا ما وَعَدَنا ربُّنا حقاً ، فهل وجدتُّم ما وعَدَ رَبُّکُم حقاً ؟ )) . ئەی فەرموو : ئەی فلانی کوڕی فلان ! ئایا پێتان خۆشە گوێڕایەڵیی خوا و پێغەمبەرتان بکردایە ؟ ئێمە بە راستیی بە چاوی خۆمان ئەو بەڵێنەمان دیی کە پەروەردگارمان پێمانی دا، جا ئایا ئێوەش بە چاوی خۆتان ئەو بەڵێنەتان دیی کە پەروەردگارتان پێتانی دا ؟

عومەر فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمایشتی چیی ئەکەی لەگەڵ کۆمەڵە لاشەیەك‌دا کە گیانی تێ‌دا نیە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( والذي نفس محمد بیده ما أنتم بأسمع لما أقول منهم )) . لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : (( ما أنتم بأسمع منهم ، ولکن لا یجیبون )) . (متفق علیه) . سوێندی بۆ خواردن کە ئەوانیش وەك ئەمان گوێیان لێیە ، ئەوەندە هەیە وەڵام نادەنەوە .

شاردنەوەی لاشەی ئەو کوژراوانە رەوشتێکی بەرزی پێغەمبەری ئازیز بوو ﷺ ، چونکە سوننەتی وەها بووە هەر لاشەیەکی مردووی ببینیایە ، نەی ئەپرسیی ئەوە کافرە یان موسڵمان ، فەرمانی ئەدا بە هاوەڵانی تا بی‌کەن بە ژێر خۆڵەوە . قورەیشی‌یەکانیش هەرچی‌یان لێ هات لە خراپە و تاوان دەرهەق بە پێغەمبەر و موسڵمانان درێغی‌یان نەکرد ، کەچیی پێغەمبەر ﷺ رێزی مرۆڤانەی لێ گرتن و هەموویانی داپۆشیی .

کاتێـك کـە عوتبـەی کـوڕی ڕەبیعـەیان هێنـا تـا بی‌خەنـە نـاو بیرەکـەوە ، ئەبوحوذەیفەی کوڕی لەوێ ئامادە بوو . جا پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـەرنجی دەم و چاوی ئەبوحوذەیفەی دا ئەبینێ وا خەم بارە و ڕەنگی گۆڕاوە ، فـەرمووی : (( یـا أبا حذيفة ! لعلك قد دخلك من شأن أبيك شيء ؟ )) . فەرمووی : ئـەبوحوذەیفـە ! لەوە ئەچێ دەربارەی باوکـت شـتێك چـووبێتە دڵـتـەوە ؟ وتـی : نـە بـەخوا ئـەی پێغەمبەری خوا ! گومانم دەربارەی باوکم و کوژرانی نیە ، بەڵام مـن را و نـەرم و نیانیی و چاکی‌یەکم بە باوکمەوە ئەبینیی ، کە هیوادار بووم ئەوە هیدایەتی بدا بۆ سەر ئیسلام ، بەڵام کە دیتم چیی بەسەر هات و ، ئەوەشم هاتەوە یاد کـە لەسـەر کوفر مرد ، دوای ئەوەی کە هیوام پێی بوو ، ئەوە خەمباری کـردم . پێغەمبـەری خوا ﷺ دوعای خێری بۆ ئەبوحوذەیفە کـرد . شـایانی باسـە لـە پێشـەوە باسـی نارەزایی عوتبەمان کرد کە چۆن حەزی لـە جـەنگ نـەبوو و ، پێغەمبـەریش ﷺ شاهێدیی بۆ دا کە عوتبە ، کە سواری وشترە سـوورەکەیە ، خێـری تیایـە و گـەر قورەیش بە گوێی بکەن ڕێی کەڵك و قازانج ئەگرنە بەر .

کاتێك کە موسـڵمانەکان سـەرکەوتن ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ دوو پیـاوی بـە شێوەی مژدەدەر ناردەوە دوا بۆ مەدینە ، کە یەکێکیان عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحـە بوو ، بۆ دانیشتوانی ( العالية ) واتە دێهاتەکانی دەوری مەدینە وەك ( قوباء ) و ، ئەوی تریشیان زەیدی کوڕی حاریثە بۆ دانیشتوانی مەدینە و سـواری وشـترەکەی پێغەمبـەری خـوا بـوو بـوو . کـە گەیشـتنە مەدینـە دەنگیـان بـەرز کـردەوە و موسڵمانیان لە سەرکەوتن ئاگادار کرد . ئیتر ئەوەبوو پیاوان و منداڵان هـاتن بـە دەمیانەوە و بە مەدینە و گەڕەکەکانی دەوروبەری‌دا ئەگەڕان و خەریکی وتنی ( لا إله إلا الله ) و ( الله أكبر ) بوون .

ئەوەبوو پـێش گەیشـتنی دەنـگ و باسـی سـەرکەوتن جوولەکـە و مونافیقـان مەدینـەیان لـە پاگانـدە پـڕ کردبـوو کـەوا پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـوژراوە و موسـڵمانەکانیش تێك شکاون . بەڵام کە مژدەدەرەکان گەیشتنە بـەرەوە ، ئـەوان کەوتنە درۆوە .

یەکێ لە مونافیقـان کـە چـاوی بە زەیـدی کـوڕی حـاریثـە کـەوت ، سـواری ( القصواء ) ، وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بـوو بـوو ئـەی وت : موحەمـەد

کوژراوه و ، ئەمەش وشترەکەی ئەوە و ئەی‌ناسینەوە و ، ئەمەش زەیدە لە ترسان دا نازانێ چیی بلێ و ، بە تەنیا هەڵاتووە .

بەڵام کە دەنگ‌وباسی سەرکەوتنیان ڕاگەیاند ، موسڵمانەکان یەکجار دڵ خۆش بوون و ، سەرەڕای تەهلیل و تەکبیر لە کۆڵانەکانی مەدینەدا ، پیاوە ناودارەکانی موسڵمانان ـ کە لە مەدینەدا مابوونەوە ـ بەرەو بەدر کەوتنە ڕێ ، تا پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنە خوایی‌یە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن .

لەولاوە جوولەکە و مونافیقان یەکجار سەرشۆڕ بوون ، هەتا یەکێ لە سەرۆکی جوولەکەکان ئەی وت :

ئەمڕۆ ، دوای ئەوەی کە پیاوماقووڵ و سەرداری هەموو خەڵك و ، پادشاکانی عەرەب و خاوەنانی حەرەمی مەککە کوژراون ، ناو سکی زەویی چاکترە لە سەرزەویی .

کاتێك کە ئەم مژدەیە گەیشتە مەدینە ، موسڵمانەکان لەسەر قەبران ئەگەڕانەوە ، کە ئەوەبوو روقیەی کچی پێغەمبەریان ناشتبوو . کاتێ کە موسڵمانەکان بەرەو بەدر کەوتنە ڕێ روقیە نەخۆش بوو و ، فەرمانیشی دا کە عوثمانی مێردی لەلای بمێنێتەوە ، جا ئەم سەرکەوتنە بووە هۆی سووکبوونی خەم و خەفەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر کۆچ‌کردنی کچە خۆشەویستەکەی .

لە کاتێك‌دا کە سوپای موسڵمانان لەژێر ئالا و سەرکردایەتیی پێغەمبەری خوادا ﷺ سەرکەوتنی بە دەست هێنا بوو ، سوپای سەرگەردانی مەککە ئەبوجەهلی سەرۆکی کوژرابوو و ، زۆربەی پیاوماقووڵ و سەرکردەکانی تریشی یان کوژرابوون یان بە دیل گیرا بوون . بۆیە هەر قوڕەیشی‌یەك هەوڵی ئەدا لە مەیدانی جەنگ خۆی دەرباز بکات و لەو چەم و شیوانەدا خۆی حەشار بدا و ، بەوپەڕی شەرمەزاریی و ئابڕووچوونەوە روو لە مەککە بنێ .. بەو هەموو ترس و لەرزەوە هەرکەسە خۆی دەرباز ئەکرد و ، نەیشی ئەزانیی بە چ روویەکەوە خۆی بکاتەوە بە شاری مەککەدا !!

یەکەم کەسێك کە دەنگ‌وباسی جەنگی بەدری گەیاند بە قوڕەیش پیاوێك بوو بە ناوی حەیسەمانی کوڕی عەبدوڵلای خوزاعیی . وتیان : چ دەنگ‌وباسێکت لایە؟ وتی : عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و ، شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و ، ئەبولحەکەمی کوڕی هیشام واتە ئەبوجەهل و ، ئومەییەی کوڕی خەلەف و ، لەگەڵ چەند

سەرکردەیەکی تردا کە ناوی دان ، کوژراون . کاتێك کە ناوی پیاوماقوولانی قورەیشی هەڵ دا ، صەفوانی کوڕی ئومەییە ، کە لەلای حیجردا دانیشتبوو ، وتی: بەخوا ئەمە عەقڵ نای‌گرێ ، تا دەربارەی منیش پرسیاری لێ بکەن . پرسی‌یان : ئەی صەفوانی کوڕی ئومەییە چیی بەسەر هات ؟ وتی : ئەوەتا ئەو لەلای حیجردا دانیشتووە . بەخوا کاتێك کە باوك و براکەی کوژران چاوم لێیان بوو .

دەنگ‌وباسی تێك شکانی قورەیش بەلای دانیشتوانی مەککەوە شتێکی یەکجار سەخت و دژوار بوو .. بە تەمای ئەو زەلیلیی و نەگبەتی‌یە نەبوون ، بەلام بەرە بەرە لایان روون بوویەوە کە راستە .

لە هەموو کەسێك زیاتر ئەبولەهەب پێی ناخۆش بوو .. ئەوەبوو بیستی وا ئەبوسوفیانی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەللیب ، کە برازای بوو ، تازە لە جەنگی بەدر گەڕاوەتەوە ، ئەبولەهەب بانگی کرد تا بێتە لای و دەنگ‌وباسی بۆ بگێڕێتەوە . ئەویش هاتە لای دانیشت و خەڵکەکەش بە پێوە وەستان و دەورەیان لێ دان .

وتی : کوڕی برام ! ئادەی هەواڵم بدەرێ دەنگ‌وباسی ئەو خەڵکە چۆن بوو ؟ وتی : هەر ئەوەندە بوو بەو خەڵکە ( واتە موسڵمانەکان ) گەیشتین ، ئیتر شانمان بۆیان شل کرد و ، ئەوانیش چۆنیان بویستایە لێمانیان ئەکوشت و ، دیلیان ئەکردین . جا سوێند بەخوا ئەخۆم کە گلەییشم لەو خەڵکە ( واتە قورەیشی‌یەکان ) نەبوو ، چونکە تووشمان بوو بە تووشی کۆمەڵە پیاوێکی بەرگ سپی‌یەوە کە سواری ولاغی بەڵەك بوو بوون و ، لە نێوان ئاسمان و زەویی‌دا بوون ، کە بەخوا دەست بەرداری هیچ شتێك نەئەبوون و ، هیچ شتێکیش بەرگەی نەئەگرتن .

ئەم رووداوە ئەبورافیعی خزمەت‌گوزاری پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی‌گێڕێتەوە ، کە لەو کاتەدا لە مەککەدا بووە و ، بەندەی عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب بووە و، عەبباس و ئوم فەضلی هاوسەری و ئەبورافیعیش بە نهێنیی ئیمان ئەهێنن .. کە ئەبورافیع ئەمە ئەبیستێ ئەڵێت : بەخوا ئەوانە مەلائیکەت بوون . ئەبولەهەب دەستی بەرز ئەکاتەوە و بە توندیی ئەی‌دا لە دەم و چاوی ئەبورافیع و ئازاری پێ ئەگەیەنێ و ، ئەشی دا بە زەویی‌دا و ، بە ئەژنۆی ئەچێتە سەری و ، دەست بە لێدانی ئەکا و ، بەستەزمانە ئەویش پیاوێکی لاواز ئەبێت . لەو کاتەدا ئوم

فەضلیش ئامادە ئەبێت ، هەڵمەت ئەدات کۆڵەکەیەك هەڵ ئەگرێت و ئەیدا بە سەری ئەبولەهەبدا و زامێکی گەورەی تێ ئەکات و ، ئەڵێت : بە بۆنەی ئەوەوە کە ئاغاکەی ( واتە عەبباس ) لێرە نیە بە لاوازی ئەزانی ؟ ئیتر ئەبولەهەب بە سەری شۆڕەوە هەڵ ئەسێت و ئەڕوا .

جا ئەبورافیع سوێند ئەخوا کە ئەبولەهەب تەنها حەوت شەو ما و خوای گەورە تووشی نەخۆشی‌یەکی زۆر پیسی کرد کە ناوی ( عەدەسە ) یە ، کە ئەو کاتە عەرەبەکان زۆر لێی ئەترسان و نزیکی ئەو جۆرە نەخۆشانە نەئەکەوتنەوە . کە مردیش هەردوو کوڕەکەی نەیان‌ئەوێرا سێ ڕۆژ بچن بە لایدا ، تا ئەوەبوو بۆگەنی کرد و ، پیاوێکی قوڕەیشیی لۆمەی کردن و وتی : شەرم ناکەن ؟ باوکتان لە ماڵەکەیدا بۆگەنی کردووە ، ئەی نای‌نێژن ؟ وتیان : ئەترسین ئەو نەخۆشی‌یەمان بۆ بگوێزرێتەوە . وتی : وەرن من یارمەتییتان ئەدەم . هەر لە دوورەوە ، بێ ئەوەی لێی نزیك بکەونەوە ئاویان بەسەرا کرد و شۆردیان ، پاشان بردیان بۆ ژووروی مەککە و پاڵیان دا بە دیوارێکەوە و، بەردیان لەسەر کەڵەکە کرد .

بەم شێوەیە خوای پاك و بێ‌گەرد ئەو نەخۆشی‌یە پیسە و ئەو مەرگە سووکەی پێشکەش بەو ئەبولەهەبە کرد کە دژایەتیی پێغەمبەر و ئیسلامی ئەکرد و ، بێ‌بەزەیی‌یانە سزای موسڵمانانی ئەدا ..

ئەم تێك‌شکان و کوژران و دیل‌کردنە کارێکی گەورەی کردە سەر قوڕەیش و ، بۆ ماوەیەك شیوەنیان بۆ کوژراوەکانیان کرد ، بەڵام لە دواییدا هاتنە سەر ئەوە با ئیتر واز لە شیوەن و ڕۆ ڕۆ بهێنن ، تا موحەممەد و هاوەڵانی دەست بەسەر دڵیانا نەهێنن ، هەروەها داوایان لە کەس‌وکاری دیلەکان کرد کە با لە فیدیەداندا پەلە نەکەن با موسڵمانەکان پێ ڕانەکێشن و داوای پارەی زۆریان لێ نەکەن ..

ئەوەبوو ئەسوەدی کوڕی موطەللیب لە جەنگی بەدردا دوو کوڕ و کوڕەزایەکی کوژرابوون : زەمعە و عەقیل و حاریثی کوڕی زەمعە . ئەسوەد هەردوو چاوی لە دەست دابوو و ، زۆریشی حەز ئەکرد بگری و ، بە خزمەتگوزارەکەی ئەوت : ئایا قوڕەیش بۆ کوژراوەکانیان ئەگرین ، تا منیش بۆ کوڕەکانم بگریم ، بە ڕاستیی ناوسکم ئاگری تێ بەر بوو .

با مەککە بەجێ بهێڵین و بگەڕێینەوە بۆ بەدری مەیدانی جەنگ . قوڕەیشی‌یەکان بە شێوەیەك لە مەیدان هەڵاتن هەرچیی کەلوپەل و کەرەسەی

جەنگیان پێ بوو هەموویان لێ بەجێ ما و ، موسڵمانان بۆ خۆیان کۆیان کردەوە .
کاتێك کە ویستیان بەشی بکەن هەر دەستەیەکیان ئەو دەستکەوتانەی بە مافی خۆی ئەزانی .

ئەو گەنجانەی کە هەڵمەتیان دابوو و کافرەکانیان راو نابوون ئەیان وت : ئێمە دوژمنمان راو ناوە و ئێمە نەبووینایە دەستتان نەئەکەوت .

ئەوانەش کە دەوری پێغەمبەریان ﷺ گرتبوو ، تا لە دوژمنان بیپارێزن ئەیان وت : ئێمە ئەترساین دوژمن دەستی بگاتە پێغەمبەر و بیکوژێ ، بۆیە فریا نەکەوتین دەست کەوتەکان کۆ بکەینەوە .

ئەوانەش کە هەڵمەتیان دا و کەلوپەلەکەیان کۆکردەوە ئەیان وت : ئێمە خۆمان کۆمان کردۆتەوە و بەشی هیچ کەسێکی پێوە نیە .

پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ بڕیارێکی نەدا ، بەڵکو فەرمانی دا دەستکەوتەکان کۆ بکرێنەوە تا خوای گەورە حوکمیان بۆ دەر بکات . ئەوەبوو ئایەتی پیرۆز هاتە خوارەوە : ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ( الأنفال : ١ ) .

جا هەندێ لە مێژوونووسان و زانایان رایان وەهایە کە پێغەمبەر ﷺ دەستکەوتەکانی بەسەر هەموو موجاهیدەکاندا دابەش کردووە و پێنج یەکی لێ وەر نەگرتووە ، پاشان ئەم حوکمە بە ئایەتی پیرۆزی :
﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ ( الأنفال : ٤١ ) نەسخ بۆتەوە .

بەڵام رای زۆربەی زانایان لە فەرموودەناسان لەسەر ئەوەیە کە پێنج یەکی لێ جیا کردۆتەوە بۆ خۆی و خزمانی و هەتیوان و هەژاران و رێبواران و ، چوار لەسەر پێنجەکەی تری بەسەر موجاهیدەکاندا دابەش کردووە .

لە دەستکەوتەکانی بەدر پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی بۆ چەند کەسێك دانا ، هەرچەندە ئامادەی بەدریش نەبوون ، بە بۆنەی ئەوەوە کە بە فەرمانی خۆی ئامادە نەبووبوون ، کە ئەمانەن :

ئەبولوبابەی ئەنصاریی چونکە ئەمیری مەدینە بوو و ، عاصیمی کوڕی عەدیی ئەویش ئەمیری قوباء و عالیە بوو و ، حاریثی کوڕی حاطەب ئەمیری ئەوەی

عەمری کوڕی عەوف بوو و ، حاریثی کوڕی صوممە و خەوواتی کوڕی جوبەیر کە لە رەوحاء گەڕانەوە و نەیانئەتوانی رێ ببڕن و ، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا و سەعیدی کوڕی زەید کە پێغەمبەر ﷺ ناردنی تا هەواڵی کاروانەکەی قورەیش بزانن و دوای جەنگ گەڕانەوە دوا و ، عوثمانی کوڕی عەففان کە لەلای روقیە مایەوە تا سەروکاریی چارەسەریی نەخۆشییەکەی بکات .

هەروەها ئەوانەش کە شەهید بوون لە دەستکەوتەکان بەشیان درا و ، درایە دەست کەسوکاریان کە چواردە کەس بوون ، وەك لە پێشەوە ناویان هێنراوە . ئەمەش ئەوپەڕی ژیریی و سەلیقە و داد و ویژادان بوو ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرهەق بە خێزانی شەهیدەکان بەکاری هێنا ، تا ئەو بەڕێزانە پشتگوێ نەخرێن و مافیان پێشێل نەکرێ .

بەڵێ ، موسڵمانەکان سوپاسی خوای پەروەردگاریان کرد و ، دوای ئەوەی سێ شەو لە بەدردا مانەوە ، بەرەو مەدینە کەوتنە رێ . دیلەکان و دەستکەوتەکانی جەنگیشیان پێ بوون . هێشتا دەستکەوتەکان بەش نەکرابوون هەتا گەیشتنە دەربەندی ( صەفراء ) و لەوێ دابەشی کردن . کە لە صەفراء دەر چوون گەیشتنە ( رەوحاء ) و لەوێ تووشی سەرۆکەکانی موسڵمانەکان بوو کە لە مەدینەوە هاتبوونە پێشوازیی و ، پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنە خواییەیان لێ کرد ..

هەندێ لە موسڵمانە بەغیرەتەکان دواکەوتن لە بەدریان پێ ناخۆش بوو ، چونکە نەیانئەزانیی جەنگ ئەبێت ، بۆیە عوزری دواکەوتنیان ئەهێنایەوە . بۆ نموونە : ئەنصارییەکی بەغیرەتی وەك ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ، کە دەورێکی باشی هەبوو لە خزمەت موصعەبی مامۆستای مەدینەدا ، تا دانیشتوانی مەدینە دڵ خۆش بکا و ، بۆ سەر ئیسلام رایان بکێشێ ، هاتە خزمەتی و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە سەری خستی و ، چاوتی رۆشن کردەوە . بەخوا ، ئەی پێغەمبەری خوا ! کە من لە بەدر دواکەوتم نەم ئەزانی تووشی دوژمن ئەبی ، وامزانی تەنها کاروانەکەیە ، خۆ ئەگەر بم زانیایە تووشی دوژمن ئەبی دوا نەئەکەوتم . ئەویش فەرمووی : ( صدقت ) .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەری بەرز و سەرکەوتنەوە بە خۆی و سوپاکەیەوە گەیشتەوە مەدینە . بەمە سام و هەیبەتی سوپای ئیسلام چووە دڵی دوژمنانەوە و، خەڵکێکی زۆری دانیشتوانی مەدینە موسڵمان بوون .. هەتا

ئەوەبوو عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی و هاوەڵانیشی بە رووکەش هاتن و موسڵمان بوون و ، بە نیفاق وەهایان دەربڕیی کە ئیمانیان هێناوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژێک پێش گەیشتنی دیلەکان گەیشتەوە مەدینە . ئەوەبوو دیلەکانی بەسەر هاوەڵەکانیدا دابەش کردبوون و فەرمووبووی : (( استوصوا بهم خيراً )). فەرمانی دابوو بە چاکە لەگەڵیانا بجووڵێنەوە . لەگەڵ ئەو دوژمنە داخ لە دڵانەدا کە ئەمە پانزە ساڵە دژایەتیی ئەکەن و پێغەمبەر و موسڵمانەکان سزا ئەدەن ، بە چاکە لەگەڵیانا بجووڵێنەوە . هاوەڵانیش مەردانە ئامۆژگاری‌یەکەی ئازیزیان بە جوانیی جێ‌بەجێ کرد . وا بۆ نموونە یەکێ لەوانە ، کە ئەبوعەزیزی کوڕی عومەیری برای موصعەبە ، باسی خۆیان ئەکات : کاتێک کە ئێمەیان لە بەدرەوە بردەوە ، من لەگەڵ کۆمەڵێک ئەنصاردا بووم ، کە خواردنی نیوەڕۆ و ئێوارەیان دا ئەنا نانیان بە تایبەتیی بە من ئەدا و خۆیان خورمایان ئەخوارد ، ئەویش بە بۆنەی ئامۆژگاری‌یەکەی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی ئێمە ، هەر پیاوێکیان پارچە نانێکی دەست بکەوتایە پێشکەشی منی ئەکرد ، منیش شەرمم ئەکرد و ئەم گێڕایەوە ، کەچیی ئەو دەستی لێ نەئەدا و ئەی‌گێڕایەوە بۆم .

ئەم ئەبوعەزیزە دوای نەضری کوڕی حاریث هەڵ گری ئاڵای بت پەرستەکان بوو، ئەوەبوو کە موسڵمانەکان خەریکی قۆڵ بەستی دیلە قورەیشی‌یەکان بوون ، موصعەبی کوڕی عومەیری عەبدەریی دای بەلای ئەبوعەزیزی کوڕی عومەیری برای‌دا ، دیتی وا موسڵمانێکی ئەنصاریی خەریکی قۆڵ بەستی ئەبوعەزیزە . موصعەب بە ئەنصاری‌یەکەی وت : هەردوو دەستی توند ببەستە ، چونکە دایکی دەوڵەمەندە ، بەڵکو بێت و فیدیەی بۆ بدات . ئەبوعەزیز ئەمەی زۆر پێ ناخۆش بوو ، بۆیە بە موصعەبی برای وت : بەم شێوەیە یارمەتییم ئەدەی ؟ موصعەبیش وەڵامی دایەوە : ئەو برامە ـ واتە ئەنصاری‌یەکە ـ نەک تۆ !! ئەوەبوو دایکی پرسیاری کرد کە زۆرترین فیدیەیەک کە قورەیشی‌یەک دابێتی چەندە ، پێیان وت : چوار هەزار دیرهەم . ئەویش پارەکەی نارد و ئەبوعەزیزیان بەر دا .. دواتر ئەبوعەزیز بە چاکیی موسڵمان بوو و ، ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە .

لە گەڕانەوەدا بەرەو مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا لەو حەفتا دیلەی دەستیان دوانیان بکوژرێن ، کە یەکێکیان نەضری کوڕی حاریث و ، ئەوی تریشیان

عوقبەی کوڕی ئەبوموعیط بوون ، وەك لە پێشەوە باس کران . ئەم دوانە لە رادە بەدەر کافر و دوژمن و ستەمکار و سزادەری موسڵمانەکان بوون .. سەرەڕای ئەوەی کە قسەی سووکیان پێ ئەوتن .

کاتێك کە گەیشتنە ( الصفراء ) پێغەمبەری خوا ﷺ چاوێکی بە دیلەکان‌دا گێڕا .. کە سەیری نەضری کرد ، نەضر مەرگ هاتە پێش چاوی ، کە ئەوەی دیی، بە موصعەبی کوڕی عومەیری وت ، کە لەو شوێنەدا نزیکترین خزمی بوو : لەگەڵ گەورەکەت‌دا قسە بکە تا منیش وەك یەکێ لە هاوەڵەکانم تەماشا بکات، ئەگینا بەخوا وا نەکەیت ، ئەمکوژێ .

موصعەب وتی : تۆ دەربارەی قورئان و پێغەمبەر وەها و وەهات ئەوت و ، سزای هاوەڵەکانیشت ئەدا . نەضر وتی : ئەگەر قوڕەیش تۆی بە دیل بگرتایە ، هەتا من زیندوو بوومایە نەیئەتوانی تۆ بکوژێت .

موصعەب وتی : بەخوا ئەزانم تۆ راست ئەکەیت ، بەڵام من وەکو تۆ نیم ، ئیسلام هەموو پەیمانێکی پچڕاندووە ..

نەضر دیلی میقدادی کوڕی ئەسوەد بوو ، بە تەما بوو لە فیدیەی‌دا سامانێکی چاکی دەست بکەوێ . جا کە ویستیان بیکوژن هاواری کرد : نەضر دیلی منە . پێغەمبەر ﷺ بە عەلیی فەرموو : (( إضرب عنقه ، واللهم أغن المقداد من فضلك )) . فەرمووی : لە ملی بدە و ، خوایە ! لە فەزڵ و بەرەکەتی خۆت میقداد دەوڵەمەند بکەیت .

بەڵام عوقبەی کوڕی ئەبوموعیط لە ( عرق الظبية ) کوژرا .. کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە کوشتنی دا ، عوقبە وتی : ئەی کێ بۆ منداڵەکان ، ئەی موحەممەد ؟ فەرمووی : (( النار )) . پاشان وتی : لەناو قوڕەیش‌دا من ئەکوژی؟ فەرمووی : (( نعم )) . پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لای هاوەڵانی و فەرمووی : (( أتدرون ما صنع هذا بي ؟ جاء وأنا ساجد خلف المقام فوضع رجله على عنقي ، وغمزها ، فما رفعها حتى ظننت أن عيني ستندران ، وجاء مرة بسلا شاة فألقاه على رأسي وأنا ساجد ، فجاءت فاطمة فغسلته عن رأسي )) .

فەرمووی : ئایا ئەزانن ئەمە چیی پێ کردووم ؟ جارێکیان لە پشتی مەقامەوە لە سەجدەدا بووم ، هات و پێی خستە سەر ملم و شێلای و ، لای نەبرد هەتا وام ئەزانی هەردوو چاوم دەر ئەپەڕن . جارێکی تریش منداڵدانی مەڕێکی هێنا و

خستیە سەر سەرم و منیش لە سەجدەدا بووم ، تا ئەوەبوو فاطیمە هات و سەرمی داشۆریی .

چیرۆکی ئەمە بە درێژە لە باسی سزا و ئازاری مەککەدا لە پێشەوە پیشکەش کراوە .

کاتێك کە موسڵمانەکان دیلەکانیان گەیشتنەوە مەدینە ، خاتوو سەودەی کچی زەمعەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ چووبووە سەردانی بنەماڵەی عەفراء بە بۆنەی ئەوەوە کە دوو کوڕی عەفراء ، عەوف و موعەوویذ ، لە بەدردا شەهید بووبوون ، ئەمەش پێش ئەوەی ئایەتی حیجاب بێتە خوارەوە . کاتێك خاتوو سەودە هەواڵی گەیشتنی دیلەکانی پێ درا ، گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان و ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ بوو و ، ئەبینێ کە ئەبوزەید ، سوهەیلی کوڕی عەمر بە پەتێك هەردوو دەستی بەستراون بە ملیەوە . شایانی باسە سوهەیلی کوڕی عەمری کوڕی عەبدشەمس ئامۆزای باوکی سەودە بووە ، زەمعەی کوڕی قەیسی کوڕی عەبدشەمس ، لە هەمان کاتدا پیاوێکی ماقووڵ و پیاوانە بووە . کە خاتوو سەودە سوهەیلی بەو حاڵەوە دیت خۆی پێ نەگیرا و وتی : ئەبوزەید ! دەستتان بەرز کردەوە بۆ دیل بوون ، ئەی نەئەکرا بە مەردانە بمرن ؟!

خاتوو سەودە ئەڵێت : بەخوا بە دەنگی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاگا هاتم کە فەرمووی : (( يا سودة ! أعَلى الله وعلى رسوله تُحَرِّضين ؟! )). فەرمووی : سەودە ! ئەوە خەڵك لە دژی خوا و لە دژی پێغەمبەرەکەی هەڵ ئەنێیی ؟!

خاتوو سەودە ئەڵێت : بەو خوایەی کە تۆی بە دینی حەق رەوانە کردووە ، هەر کە ئەبویەزیدم دیت هەردوو دەستی بە ملیەوە بەسترابوون ، خۆمم پێ نەگیرا و ئەوەم بە دەمدا هات . پێغەمبەری خواش ﷺ عوزرەکەی لێ قبووڵ کرد ..

ئەم چیرۆکە جوامێریی و غیرەتی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەمان پیشان ئەدات ، هەتا ئافرەتانیش .

کە دوای جەنگی بەدر موسڵمانەکان گەیشتنەوە مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ راوێژی بە هاوەڵانی کرد کە چیی بە دیلەکان بکەن .

ئەبوبەکری صدیق خوا لێی رازیی بێ ، کە زۆر دڵ نەرم و ناسك و بەسۆز بوو ، فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمانە خزم و کەسوکارتن ، من وای بە چاك

ئەزانم فیدیەیان لێ وەربگرێت ، تا کە وەری ئەگرین ببێتە هێز بۆمان بەرامبەر بە کافران و ، بەڵکو خوای گەورەش هیدایەتیان بدات و ببنە کۆمەکمان .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ما تری یا ابن الخطاب ؟ )) فەرمووی : عومەر ! ئەی تۆ چیی ئەڵێی ؟

عومەر ، لە بەرگریی حەق‌دا توند و پتەو بوو ، فەرمووی : بەخوا رای من وەك رای ئەبوبەکر نیە . من وەهای ئەبینم کە ماوەم بدەی تا لە ملی فلانەکەس ـ کە خزمێکی عومەر خۆی بوو ـ بدەم و ، ماوەی عەلییش بدەی تا لە ملی عەقیلی برای بدات و ، ماوەی حەمزەش بدەی تا لە ملی فلانی برای بدات ، هەتا خوای گەورە بزانێ کە هیچ خۆشەویستی‌یەك لە دڵمانا بەرامبەر بە موشریکان نیە و ، ئەوانەش مل هوڕ و ، پێشەوا و ، فەرماندەیانن .

عەبدوڵلای کوڕی رەواحەش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! تەماشا بکە چ دۆڵێك داری زۆری تێدایە ، دیلەکانی تێ بکە و ، ئاگر بەر بدەرە شیوەکە .

پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و تەشریفی بردە ژوورەوە و ، وەڵامی هیچ کامیانی نەداوە و ، دوای سەعاتێك تەشریفی هاتە دەرەوە و ، هاوەڵانیش هەیان بوو ئەی وت راکەی ئەبوبەکر پەسەند ئەکات و ، هی واشیان هەبوو ئەی وت راکەی عومەر پەسەند ئەکات و ، هی واشیان هەبوو ئەی وت راکەی کوڕی رەواحە پەسەند ئەکات . کە هاتە دەرەوە فەرمووی : (( إنَّ اللهَ لَيُلَيِّنُ قلوبَ رجالٍ فيه حتى تكونَ أَلْيَنَ منَ اللَّبَنِ ، وإنّ اللهَ ليشدِّدُ قلوبَ رجالٍ فيه حتى تكونُ أَشَدَّ مِنَ الحجارَةِ ، و إنَّ مَثَلَكَ يا أبا بكرٍ كمثلِ إبراهيم قالَ : ﴿ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّي وَمَنۡ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ ( إبراهيم : ٣٦ ) ، وكمثل عيسى قال : ﴿ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ . ( المائدة : ١١٨ ) . وإنَّ مَثَلَكَ يا عمر كمثلِ نوحٍ قال : ﴿ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴾ ( نوح : ٢٦ ) ، وكمثلِ موسى قال : ﴿ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾ ( يونس : ٨٨ ) . أنتم اليومَ عالة ، فلا يفلتَنَّ أحَدٌ إلا بفداءٍ أو ضربة عنق )) .

فەرمووی : خوای گەورە دڵی کۆمەڵە پیاوێکی خۆی وەها نەرم ئەکات کە لە شیر نەرم ترە و ، دڵی کۆمەڵە پیاوێکیشی وەها توند و پتەو ئەکات کە لە بەرد

رەقترە . جا نموونەی تۆ ، ئەی ئەبوبەکر ! وەك ئیبراهیمە کە فەرموویە : هەر کەسێ شوێنم کەوێ ئەوە سەر بە منە و ، هەرکەسیش لێم یاخیی ببێ ئەوا خۆت خوایەکی لێ بووردە و بە سۆزیت . نموونەشت وەك عیسایە کە فەرموویە : گەر سزایان بدەیت ئەوان بەندەی خۆتن و ، گەر چاوپۆشییشیان لێ بکەیت خۆت خوایەکی بە دەسەلات و دانایت . نموونەی تۆش ، ئەی عومەر ! وەك نووحە کە فەرموویە : خوایە ! تاقە کافرێك لەسەر زەوییدا مەهێڵە . نموونەشت وەك مووسایە کە فەرموویە : خوایە ! ماڵ و سامانیان نغرۆ بکە و، دڵیان رەق بکە ، بۆ ئەوەی ئیمان نەهێنن هەتا سزای سەخت ببینن . ئێوە ئەمرۆ هەژاری ماڵ و سامانن ، هیچ کەسیان لە دەستتان دەرنەچن مەگەر بە فیدیە یان لە مل دان .

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود وتی : جگە لە سوهەیلی کوڕی بەیضاء ، چونکە گوێم لێی بووە باسی ئیسلامی کردووە . پێغەمبەر بێدەنگ بوو . عەبدوڵڵا ئەڵێ : لە هیچ رۆژێكدا ئەوەندەی ئەو رۆژە نەترساوم کە لە ئاسمانەوە بەردم بە سەردا بباریێ ، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إلا سهيل بن بيضاء )) . ئیتر باری سەرشانی سووك بوو .

بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ راکەی ئەبوبەکری وەرگرت ، چونکە خۆیشی خاوەنی دڵێکی نەرم و نیان بوو .

با ئێستەش لیستی دیلەکانی بەدر بخەینە بەرچاوی خوێنەری ئازیز :

( أ ) لە نەوەی هاشم چوار پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیب ، مامەی پێغەمبەری خوا ﷺ .

ئیبن ئیسحاق وتوویە : کە پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژی بەدر ئێوارەی لێ هات و دیلەکان دەست و پێیان بەسترابوو ، پێغەمبەر لە سەرەتای شەودا خەوی لێ زڕا هاوەڵان پێیان وت : ئەوە بۆچ ناخەوی ، ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : (( سمعت أنين العباس في وثاقه )) . فەرمووی : گوێم لە ناڵەی عەبباسی مامەم بوو بە دەست و پێی بەستراوەوە . ئەوەبوو هاوەڵان دەست و پێیان کردەوە و، ئەویش بێدەنگ بوو و ، پێغەمبەریش خەوت .

حاکمیش لە ( المستدرك )دا لە ئیبن عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : کاتێك کە عەبباس لەگەڵ دیلەکانی بەدردا گیرا ، ئەنصار هەڕەشەی کوشتنیان لێ کردبوو و ، ئەو هەواڵەش بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتبوو و ئەویش فەرموبووی : (( إني لَم أَنَم

الليلةَ مِن أجل عمي العباس ، وقد زعمت الأنصارُ أهُم قاتلوهُ )) . فەرمووبووی : ئەمشەو لەبەر عەبباسی مامەم نەخەوتووم ، چونکە ئەنصار وەهایان دەربڕیی بوو کە ئەیکوژن . عومەر فەرمووی : ئایا بچم بۆ لایان ؟ فەرمووی : (( نعم )) . ئەوەبوو عومەر چوو بۆ لای ئەنصار و پێی فەرموون : عەبباس بەر بدەن . وتیان : نا ، بەخوا بەری نادەین . عومەر فەرمووی : ئەی ئەگەر پێغەمبەری خوا ڕەزامەندیی وەها بوو ؟ وتیان : دەی ئەگەر ڕەزامەندیی ئەو وەها بێ ، بیبە . عومەر لەگەڵ خۆی بردییەوە و پێی فەرموو : عەبباس ! موسڵمان ببە ، بەخوا موسڵمان بوونی تۆم پێ خۆشترە لە موسڵمانبوونی خەططاب ، هەر لەبەر ئەوەش کە پێغەمبەری خوا موسڵمانبوونی تۆی زۆر بە دڵە .

لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوەندە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ حاڵی عەبباس پەرێشان بوو ، لەگەڵ ئەوەشدا بەبێ فیدیە بەری نەدا . ئەوەبوو عەبباس صەد ئۆقیە ئاڵتوون فیدیەی بۆ خۆیشی و بۆ هەردوو برازاکەی : عەقیلی کوڕی ئەبوطالیب و ، نەوفەلی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەللیب و ، عوتبەی کوڕی عەمری هاوپەیمانی دا ، کە پیاوێکی نەوەی حاریثی کوڕی فیهر بوو .

کاتێك کە عەبباس دەری بڕیی پارە و سامانی نیە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( فأينَ المالُ الذي دفنتَه أنتَ وأم الفضلِ ، وقلت لها : إنْ أُصبتُ في سفري فهذا لبنيّ : الفضل ، وعبدالله ، وقُثَم ؟ )) . فەرمووی : ئەی ئەو سامانە کوا کە تۆ و ئوم فەضلی هاوسەرت شاردتانەوە و پێیشت وت : ئەگەر لەم سەفەرەمدا شتێکم لێ هات ئەمە بۆ فەضل و عەبدوڵلا و قوثەمی کوڕم ؟

عەبباس وتی : دەی بەخوا بۆم دەرکەوت کە تۆ پێغەمبەری خوایت . ئەم شتە جگە لە من و ئوم فەضل کەس پێی نەزانیوە !!

کاتێکیش پێی وت : کە بە زۆر هێنراوە بۆ جەنگ و موسڵمانیش بووە ، فەرمووی : (( أما ظاهرك فكان علينا ، والله أعلم بإسلامك وسيجزيك )) . فەرمووی : ڕواڵەتت لە دژمان بووە ، خوایش بە موسڵمان بوونەکەت ئەزانێ و ، پاداشتیشت ئەداتەوە .

ئیتر نەشی هێشت ئەنصار دەستبەرداری فیدیەکەی مامەی بن . بوخاریی لە صەحیحەکەیدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : چەند پیاوێك لە ئەنصار ( کە نەوەی نەجاری خاڵوانی عەبدولموطەللیب بوون ، چونکە

سەلمای کچی عەمر ، دایکی عەبدولموطەللیب لە نەوەی نەجار بووە ) داوای مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خواﷺ کرد و وتیان : ماوەمان بدە تا واز لە فیدیەی عەبباسی خوشکەزامان بهێنین . ( لە ڕاستییدا عەبدولموطەللیب خوشکەزایانە ) . فەرمووی : (( لا واللە ، لا تذرون لە درهماً )) . فەرمووی : نا ، بەخوا واز لە دیرهەمێك ناهێنن بۆی .

ئەمەش ئەوپەڕی داد و یەکسانییە کە مرۆڤ ئاواتی بۆ بخوازێ .

٢ ـ عەقیلی کوڕی ئەبوطالیب .[٣٣٨]

٣ ـ نەوفەلی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەللیب .[٣٣٩]

٤ ـ عوتبەی کوڕی عەمری هاوپەیمانیان .

( ب ) لە نەوەی موطەللیبی کوڕی عەبدمەناف پێنج پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ سائیبی کوڕی عوبەیدی کوڕی عەبدیەزید ، باپیرە گەورەی ئیمام شافیعیی، لە ڕۆژی بەدردا هەڵگری ئاڵای نەوەی هاشم بوو . پاشان بە چاکیی موسڵمان بوو .

٢ ـ نوعمانی کوڕی عەمری کوڕی عەلقەمەی کوڕی موطەللیب .

٣ ـ عەقیلی کوڕی عەمر کە هاوپەیمانیان بوو .

٤ ـ تەمیمی برای عەقیل کە ئەویش هاوپەیمانیان بوو .

٥ ـ کوڕێکی تەمیم کە ناوی نەزانراوە و ئەویش هاوپەیمانیان بوو .

( ج ) لە نەوەی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف نۆ پیاو ، کە ئەمانەن :

١ ـ عەمری کوڕی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب . ئەوەبوو دوای بەدر بە ئەبوسوفیانیان وت : فیدیە بۆ عەمری کوڕت بدە . وتی : خوێنیش و سامانیش بە جارێکدا نادەم . حەنظەلەیان کوشتووە و فیدیە بۆ عەمریش بدەم ؟ وازی لێ بێنن با هەتا پێیان خۆشە لای خۆیان گلی بدەنەوە . ئەمە ئەوپەڕی دامەزراوییە . لەو

---

٣٣٨ عەقیل برای ئیمام عەلییە و ساڵی فەتحی مەککە موسڵمان ئەبێ . بەشداریی جەنگی حونەینی کرد و ، یەکێ بوو لەوانەی کە لە مەیداندا بە دامەزراویی مانەوە . هەروەها بەشداریی جەنگی موئتەی کردووە . عەقیل زۆر زیرەك بووە و بە وەلامی بێدەنگ‌کەر ناوبانگی دەرکردووە . لە جەنگی صیففیندا لەگەڵ سوپای موعاویە بوو. لە ڕۆژێکی جەنگەکەدا موعاویە پێی ئەڵێ : ئەمڕۆ تۆ لەگەڵمانی . ئەویش خۆی ئاسا وەلامی ئامادە ئەڵێت : ڕۆژی بەدریش لەگەڵتان بووم . واتە مەرج نیە ئەمڕۆ پێکابێتم کە وام لەگەڵتانا ، وەك ڕۆژی بەدریش نەم پێکابوو. تەنها فەرمودەیەکی ریوایەت کردووە و ، لە سەرەتای خەلافەتی یەزیددا کۆچیی دوایی کردووە . خوا لێی ڕازیی بێ .

٣٣٩ نەوفەلیش ئامۆزای پێغەمبەری خوا بووە ، کاتێك کە موسڵمان بوو بە تەمەنترین پیاوی موسڵمانی نەوەی هاشم بوو . دوای دوو ساڵ لە خەلافەتی عومەر کۆچی دوایی کردووە و عومەریش شوێن تەرمەکەی کەوتووە .

کاتەدا سەعدی کوڕی نوعمان ـ کە موسڵمانێکی بەساڵا چوو بوو ـ هات بۆ مەککە بۆ عومرە و ، ئەبوسوفیانیش گرتی و لە جیاتیی عەمری کوڕی بەندی کرد. خزمەکانی سەعد چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەیان پێ گەیاند و ، داوایان لێ کرد کە عەمری کوڕی ئەبوسوفیانیان بداتێ تا خزمەکەیان پێی ئازاد بکەن . ئەویش پێی دان و ناردیانەوە بۆ ئەبوسوفیان و ، ئەویش سەعدی بەردا ..

٢ ـ حاریثی کوڕی ئەبووەجزە .

٣ ـ ئەبولعاصی کوڕی رەبیع ، کە مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا بووە. پیاوێکی بەڕێز بوو و بە ئامانەت ناوبانگی دەرکردبوو ، هەتا نازناوی (( الأمین )) ی لێ نرابوو و قورەیشی یەکان متمانەیان پێ ئەکردو سامانیان ئەدایە دەستی . بۆیە بە سامانی زۆرێك لە قورەیشی‌یە دەوڵەمەندەکان بە هاوبەشیی بازرگانیی ئەکرد . لە ژیاننامەی خاتوو خەدیجەدا بە درێژە باسی ئەبولعاص هاتووە .

٤ ـ ئەبولعاص ی کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدشەمس .

٥ ـ ئەبورپیشەی کوڕی عەمر کە هاوپەیمانیان بووە .

٦ ـ عەمری کوڕی ئەزرەق کە ئەویش هاوپەیمانیان بووە .

٧ ـ عوقبەی کوڕی عەبدولحاریث کە ئەویش هاو پەیمانیان بووە .

٨ ـ خالیدی کوڕی ئوسەید .

٩ ـ یەسار کە بەندەی عاصی کوڕی ئومەییە بووە .

( د ) لە نەوەی نەوفەلی کوڕی عەبدمەناف چوار پیاو ، کە ئەمانە بوون :

١ ـ عەدیی کوڕی خەیار کوڕی عەدیی کوڕی نەوفەل .

٢ ـ عوثمانی کوڕی عەبدشەمس ، کە هاوپەیمانیان بووە .

٣ ـ ئەبوثەور کە هاوپەیمانیان بووە .

٤ ـ نەبهان کە ئەویش هاوپەیمانیان بووە .

( هـ ) لە نەوەی عەبدوداری کوڕی قوصەی سێ پیاو کە ئەمانە بوون :

١ ـ ئەبوعەزیزی برای موصعەبی کوڕی عومەیر .

٢ ـ ئەسوەدی کوڕی عامیر کە هاوپەیمانیان بووە .

٣ ـ عەقیل کە پیاوێکی یەمەنیی بووە و هاوپەیمانیشیان بووە .

( و ) لە نەوەی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا چوار پیاو کە ئەمانە بوون :

١ ـ سائیبی کوڕی ئەبوحوبەیش .

٢ ـ حوەیریث کوڕی عەبیادی کوڕی عوثمان .

٣ ـ سالمی کوڕی شەمماخ کە هاوپەیمانیان بووە .

٤ ـ عەبدوڵلای کوڕی حەمیدی کوڕی زوهەیر .

( ز ) لە نەوەی مەخزووم دە پیاو کە ئەمان بوون :

١ ـ خالیدی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرە .

٢ ـ ئومەییەی کوڕی ئەبوحوذەیفەی کوڕی موغیرە .

٣ ـ عوثمانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موغیرە ، کە هەرسێکیان ئامۆزای خالیدی کوڕی وەلید بوون .

٤ ـ ئەبولمونذیر کوڕی ئەبوریفاعە .

٥ ـ ئەبوعەطاء عەبدوڵلای کوڕی ئەبوسائیب .

٦ ـ موطەللیبی کوڕی حەنطەبی کوڕی حاریث .

٧ ـ خالیدی کوڕی ئەعلەم کە هاوپەیمانیان بووە . ئەمە یەکەم کەسێك بوو کە لە مەیدانی جەنگدا ورەی رووخاو هەڵات ، ئەگەر چیی پێشتر بە پێچەوانەی ئەم هەڵوێستەیەوە دێڕە شیعرێکی وتبوو ، کە گوایە ئەو لەو پیاوانە نیە هەڵ بێ و پشت لە جەنگ بکات ، بە رادەیەك کە شیعرەکەی بۆ دامەزراویی نموونەی پێ ئەهێنرێتەوە ، کە ئەڵێ :

ولسنا على الأعقاب تدمي كلومنا ولكن على أقدامنا يتقطر الدم

٨ ـ وەلیدی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرە ، برای خالید ، کە ئەوەبوو هەر دوو براکەی ، خالید و هیشام فیدیەکەیان بۆ دا و ، کە گەیشتەوە مەککە لەوێ موسڵمان بوو . پێیان وت : کە تۆ موسڵمان ئەبووی ، دەبا پێش فیدیەدانەکە موسڵمان ببوویتایە . وتی : لەوە ترسام کە موسڵمانبوونەکەم لەبەر ترس لە قەڵەم بدەن . کاتێکیش ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە هەردوو براکەی قەدەغەیان لێ کرد و، ئەویش ناچار لە مەککە مایەوە ، تا ئەوەبوو لە کاتی ( عمرة القضاء )دا هەڵات و خۆی گەیاندە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .

٩ ـ صەیفیی کوڕی ئەبو ریفاعە .

١٠ ـ قەیسی کوڕی سائیب .

( ح ) لە نەوەی سەهمی کوڕی عەمری کوڕی هەصیص پێنج پیاو کە ئەمانەن:

١ ـ ئەبو وەداعەی کوڕی ضوبەیرەی کوڕی سەعید . هەرچەندە قوڕەیش بڕیاری ئەوەیان دا کە هیچ کەس بۆ بەردانی دیلەکان و فیدیەدانیان پەلە نەکات ، بۆ ئەوەی موسڵمانەکان پێی زیادە رانەکێشن ، لەگەڵ ئەوەش‌دا بڕیارەکەیان نەبردە سەر و ، یەك لە دوای یەك ژێر بە ژێری خۆیان گەیاندە مەدینە . پێغەمبەری خواش ﷺ دەربارەی ئەبووەداعە فەرمووی : (( إن له بمكة إبناً كيّساً تاجراً ذا مالٍ ، وكأنكم به قد جاءكم في طلب فداء أبيه )) . فەرمووی : ئەم پیاوە لە مەککەدا کوڕێکی ژیری هەیە کە بازرگانێکی دەوڵەمەندە ، هاکا هات بە دوای فیدیەدانی باوکی‌دا .. کاتێك قوڕەیش بڕیاری پەلە نەکردنیان دا بۆ بەردانی دیلەکان ، موطەلیبی کوڕی ئەبو وەداعە وتی : راست ئەکەن ، پەلە مەکەن . ئەمە یەکەم کەس بوو کە ئەو پەیمانەی شکاند .. ئەوەبوو شەو بە دزە لە مەککە دەرچوو و خۆی گەیاندە مەدینە و ، چوار هەزار دیرهەمی بۆ فیدیەی باوکی دا .. ئەم پیاوە یەکەم دیل بوو کە فیدیەی بۆ بدرێ . دوای ئەو ئیتر قوڕەیش پارەیان نارد بۆ بەردانی دیلەکانیان .

٢ ـ وەفرەی کوڕی قەیس .

٣ ـ حەنظەلەی کوڕی قەبیصە .

٤ ـ حەجحاجی کوڕی قەیس .

٥ ـ پیاوێك کە ناوی ئەسلەم بوو و ، بەندەی نەبیهی کوڕی حەجحاج بوو .

( ط ) لە نەوەی جومەحی کوڕی عەمری کوڕی هەصیص یانزە پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی خەلەفی کوڕی وەهب .

٢ ـ ئەبو عیززەی شاعیر ( عەمری کوڕی عەبد ) ، کە پیاوێکی هەژاری خاو خێزان زۆر بوو . وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! خۆت چاك ئەزانی کە من سامانم نیە و ، دەست کورت و خاوەن کووژەڵێك منداڵم ، یارمەتییم بدە . ئەویش یارمەتیی دا و ، بەڵێنیشی لێ وەرگرت کە لە دژی ئیسلام پشت‌گیریی لە هیچ کەس نەکات . بەڵێنی دا و بە چەند شیعرێکیش ستایشی پێغەمبەری کرد .

زۆری پێ نەچوو بت پەرستەکان کەوتنەوە سەروخواری تا هەجووی پێغەمبەر و موسڵمانەکان بکات . ماوەیەك خۆی گرت کەچیی لە ئەنجام‌دا دەستی کرد بە هێرش و ، خەڵکیی بۆ جەنگی ئوحود هەڵ ئەنا . هەتا خۆیشی بەشداریی جەنگی

ئوحودی کرد و ، دیسان دیل کرایەوە . ئەمجارەش داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا وەك جاری یەکەم بەبێ بەرامبەر ئازادی بکاتەوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لا أدعك تمسح عارضيك بمكة وتقول : خدعتُ محمداً مرتين )) . فەرمووی : وازت لێ ناهێنم بچیتەوە مەککە و دەست بە لاجانگتدا بێنی و بڵێی : دوو جار موحەممەدم خەڵەتاند . پاشان فەرمانی دا تا لە ملی بدەن .

وتراویشە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە : (( لا يُلدَغُ المؤمن من جُحرٍ مرتين )) . فەرموویە : ئیماندار لە کونێكدا دوو جار ناگەزرێت . وتووشیانە کە ئەم پەندە یەکێکە لەو پەندانەی کە یەکەم جار لە دەمی ئازیز بیستراون .

٣ ـ فاکیهە ، بەندەی ئومەییەی کوڕی خەلەف .

٤ ـ وەهبی کوڕی عومەیری کوڕی وەهب ، کە باوکی پێش موسڵمان بوونی یەکێك بوو لە شەیتانەکانی قوڕەیش و ، زۆر ئازاری پێغەمبەر و هاوەڵانی لە مەککەدا ئەدا ..

ڕۆژێکیان دوای جەنگی بەدر لەگەڵ صەفوانی کوڕی ئومەییە پێکەوە دانیشتبوون و باسی لێ قەومانی بەدریان ئەکرد .. عومەیر وتی : بەخوا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە قەرزارم و نیمە بیدەمەوە و ، خاوەنی ماڵ و مندالم و ئەترسم دوای خۆم بفەوتێن ، سوار ئەبووم بۆ لای موحەممەد و ئەم کوشت . کوڕەکەم لەلای ئەو دیلە .. صەفوان ئەمەی بە هەل زانیی و پێی وت : قەرزەکەت لەسەر من ، من بۆت ئەدەمەوە و ، ماڵ و منداڵەکەشت لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی خۆما چاودێرییان ئەکەم و چەندم لێ بێت درێغییان لێ ناکەم . عومەیر وتی : ئەمە ئاشکرا مەکە . وتی : وا ئەکەم .

پاشان عومەیر فەرمانی دا شمشێرەکەیان بۆ تیژ کردەوە و، ژەهراوییان کرد . دوای ئەوە کەوتە ڕێ هەتا گەیشتە مەدینە . لە کاتێکدا کە عومەری کوڕی خەططاب و چەند موسڵمانێك باسی ڕۆژی بەدریان ئەکرد ، کە چۆن خوای گەورە بە سەرکەوتنی بەدر ڕێزی لێ گرتن ، سەیری کرد ئەبینێ وا عومەیری کوڕی وەهب لە دەرگای مزگەوتدا وشترەکەی چۆك پێ دا داوە و ، شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێناوە . عومەر فەرمووی : ئەوە عومەیری کوڕی وەهبی دوژمنی خوایە ، بۆ ئەنجامدانی خراپەیەك هاتووە . هەر ئەویش بوو ڕۆژی بەدر هانە هانەی داین . پاشان چووە ژوورەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەی پێ گەیاند ،

ئەویش فەرمووی : (( أدخله عليَّ )) . فـەرمووی : بیکـەرە ژوورەوە لام . عومـەر رووی لە عومەیر نا و ، دەستی دایە حەماڵەی شمشێرەکەی کە لە ملیدا بوو و بای دا و ، بەو ئەنصارانەش کە لەوێ بوون فەرمووی : بیبەنە ژوورەوە لای پێغەمبەری خوا . کە چاوی پێ کەوت وا عومەر دەستی داوەتە حەماڵەی شمشێرەکەی ملـی ، فەرمووی : (( أرسله يا عمر ، أُدنُ يا عمير )) . فەرمووی : عومەر ! بەری بدە و ، تۆش عومەیر وەرە پێشەوە . کە نزیك بوویەوە پێی فەرموو : (( فما جـاء بـك يـا عمير؟ )) . فەرمووی : عومەیر ! بۆچیی هاتووی ؟ وتـی : بـە دوای ئـەو دیلـەدا هاتووم کە وا لە دەستتاندا .. چاك بن لەگەڵیا . فەرمووی : (( فما بال السيف في عنقك ؟ )) . فەرمووی : ئەی ئەو شمشێرە چیيە لە ملتـا ؟ وتـی : خـوا بیبـڕێ چ شمشێرێك بوو ، جا ئایا هیچی لێ هات ؟

فەرمووی : (( أصدقني ما الذي جئت له ؟ )) . فـەرمووی : راسـتم پـێ بڵـێ ، بۆچیی هاتوویت ؟ وتی : تەنها بۆ ئەوە هـاتووم . فـەرمووی : (( بـل قعـدتَ أنـتَ وصفوان بن أمية في الحِجر فذكرتما أصحاب القليب من قريش ، ثم قلتَ : لولا ديـنٌ عليَّ و عيالٌ عندي لخرجتُ حتى أقتل محمداً ، فتحمَّل لك صفوان بـن أميـة بـدَينك وعيالك على أن تقتلني ، والله حائل بينك وبين ذلـك )) . فەرمووی : بەڵکو تـۆ و صەفوانی کوڕی ئومەییە لە حیجردا دانیشـتن و باسـی کوژراوەکـانی قوڕەیشـتان ئەکرد ، پاشان تۆ وتت : ئەگەر قەرزم لەسەر نەبوایە و ، مـاڵ و منـداڵم بەسـەرا نەکەوتایە ، ئەچووم موحەممەدم ئەکوشت . ئیتر صەفوانی کوڕی ئومەییە چووە ژێر قەرزەکەت و چاودێریی ماڵ و مناڵەکەت ، بەو مەرجەی تۆ بێیت و من بکـوژی . خوایش ماوەت نادا ئەوە بکەیت .

عومەیر وتی : شاهێدیی ئەدەم کە تـۆ پێغەمبـەری خوایـت !! جـاران ، ئـەی پێغەمبەری خوا ! کە تۆ دەنگ و باسی ئاسمان و، ئەو وەحی‌یەی کە ئەهاتە سەرت بۆمانت باس ئەکرد ، ئێمە بە درۆمان ئەخستیتەوە و ، ئەم باسەش جگە لە خۆم و صەفوان کەس ئامادەی نەبووە و ، بەخوا چاك ئەزانم تەنها خـوا لەمـەی ئاگـادار کردوویت . جا سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەتی دام بۆ سـەر ئیسـلام و ، بـەم شێوازەش پاڵی پێوە نام . پاشان شایەتمانی حـەقی هێنـا . پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووی : (( فقهوا أخاكم في دينه و علموه القرآن ، وأطلقوا أسيره )) . فەرمووی :

براکەتان لە دینەکەی شارەزا بکەن و ، قورئانی فێر بکەن و ، دیلەکەشی بۆ بەر بدەن . ئەوانیش فەرمانەکەیان بۆ جێبەجێ کرد ..

پاشان عومەیر وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! من هەوڵم ئەدا و کۆششم ئەکرد هەتا نووری خوا بکوژێنمەوە و ، بە توندییش ئازارم بەوانە ئەگەیاند کە شوێن دینی خوا کەوتبوون . جا من پێم خۆشە ماوەم بدەی بگەڕێمەوە مەککە و ، بانگیان بۆلای خوا و پێغەمبەرەکەی و بۆ سەر ئیسلام بکەم ، بەڵکو خوا هیدایەتیان بدات ، ئەگەر نا چۆن لەوەو پێش ئازاری هاوەڵەکانی تۆم ئەدا لەسەر دینەکەیان ، وەهاش ئازاری ئەوان بدەم ..

پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی دا و گەڕایەوە مەککە . لەولاوە صەفوانیش هەر کە عومەیر بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ ، کەوتە دڵ دانەوەی خۆی و خەڵکەکە و ئەی وت : مژدە بێت لێتان لە ماوەی چەند رۆژێکدا رووداوێك ئەبینن کە رووداوی بەدرتان لە بیر ئەباتەوە . صەفوان خۆیشی ئەچوو بۆ سەر ڕێگای ڕێبواران و هەواڵی عومەیری لێیان ئەپرسیی تا بزانێ نەخشەکەیان سەری گرتووە یان نا ، تا ئەوەبوو لە دوا جاردا کاروانێك هات و هەواڵی موسڵمانبوونی عومەیریان پێ دا .. صەفوان وشك بوو .. لە داخانا سوێندی خوارد کە هەتا ماوە قسەی لەگەڵ نەکات و ، هەرگیز هیچ کەڵکێکیشی نەگرێت .

عومەیر هاتەوە مەککە و لەوێ دەستی بە بانگکردنی خەڵکەکەی بۆ سەر ئیسلام کرد و ، هەرکەسیش پێچەوانەی بجووڵایەتەوە زۆر بە توندیی سزای ئەدا .. ئەوەبوو لەسەر دەستی ئەودا خەڵکێکی زۆر ئیمانیان هێنا .

٥ ـ رەبیعەی کوڕی دەڕڕاجی کوڕی عەنبەس .

٦ ـ عەمری کوڕی ئوبەی کوڕی خەلەف .

٧ ـ ئەبورەهمی کوڕی عەبدوڵلا ، کە هاوپەیمانیان بوو .

٨ ـ پیاوێکی تری هاوپەیمانیان .

٩ ـ نسطاس ، بەندەی ئومەییەی کوڕی خەلەف .

١٠ ـ بەندەیەکی تری ئومەییە .

١١ ـ ئەبورافیع ، غولامێکی ئومەییە .

( ی ) لە نەوەی عامیری کوڕی لوئەی پێنج پیاو ، کە ئەمانەن :

١ ـ سوهەیلی کوڕی عەمر ، کە مالیکی کوڕی دوخشوم دیلی کرد . سوهەیل یەکێ بووە لە پیاوە ناودارە دیارەکانی قوڕەیش ، چ لە سەردەمی نەفامیی و ، چ لە سەردەمی ئیسلامدا .. لە بری قوڕەیش ڕێکەوتننامەی حودەیبیەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ مۆر کرد . ڕۆژی فەتحی مەککە موسڵمان بوو و ، هاوەڵێکی پایەداری بە خزمەتی لێ دەرچوو . ئەوەبوو لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا وەڵامی پێغەمبەری خوای ﷺ ئەدایەوە ، کاتێك کە پرسیاری لە قوڕەیش ئەکرد و ئەی فەرموو (( ماذا تقولون ؟ )) سوهەیلیش ئەی وت : چاك ئەڵێین و چاکیش زەن ئەبەین . تۆ برایەکی بەڕێز و کوڕی برایەکی بەڕێزمانی و ، هەموو دەسەلاتێکیشت هەیە . ئەویش فەرمووی : (( أقول کما قال أخي یوسف : لا تثریب علیکم الیوم )) .

کە لە جەنگی بەدردا بە دیل گیرا ، میکرەزی کوڕی حەفص فیدیەکەی بۆ هێنا و ، عومەری کوڕی خەططابیش داوای لە پێغەمبەری خوا کرد تا مۆڵەتی بدات دانی پێشەوەی سوهەیل دەر بکێشێ ، با نەتوانێ لە هیچ شوێنێکدا دژی ئەو وتار بدات . بەلاّم پێغەمبەری ڕەحمەت وەلاّمی دایەوە : (( لا أمثِّلُ به ، فیمثل الله بي ، وإن کنتُ نبیّاً ، وعسی أن یقوم مقاماً لا تذمه )) . فەرمووی : تەمثیلی پێ ناکەم ، نەوەکو خوایش تەمثیل بە من بکاتەوە ، ئەگەرچیی پێغەمبەریش بم . بەشکوم لە شوێنێکدا بوەستێ بۆ وتاردان تۆ پێت ناخۆش نەبێ .

ئەم هەواڵدانەی پێغەمبەر بە ڕاست دەرچوو .. کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد ، هەندێ لە دانیشتوانی مەککەش ، وەك ئەعراب و مونافیقەکان ، ویستیان لە ئیسلام هەڵ بگەڕێنەوە ، ئا لەو کاتە ناسکەدا سوهەیل مەردانە هەستایە سەرپێ و دەستی بە وتاردان کرد و خەڵکەکەی دڵ خۆش کرد و ، دڵیانی لەسەر دین دامەزراند .

سوهەیل کەوتە گەل سوپای موسڵمانان و بەرەو شام بۆ غەزا کەوتە ڕێ و ، لەوێ بەردەوام بوو تا ئەوەبوو بە تاعوونی عەمواس کۆچی دوایی کرد ، خوا لێی ڕازیی بێ .

٢ ـ عەبدی کوڕی زەمعەی کوڕی قەیس .

٣ ـ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەنشەئی کوڕی وەقدان .

٤ ـ حەبیبی کوڕی جابیر .

٥ ـ سائیبی کوڕی مالیك .
( ك ) لە نەوەی حاریثی کوڕی فیهر چوار پیاو ، کە ئەمانەن :
١ ـ طوفەیلی کوڕی ئەبوقەنیع .
٢ ـ عوتبەی کوڕی عەمری کوڕی جەحدەم .
٣ ـ شافیع ، پیاوێکی یەمەنیی هاوپەیمانیان بووە .
٤ ـ شەفیع ، پیاوێکی تری یەمەنیی هاوپەیمانیان بووە .
ئەوانی تریان ناویان نەدراوە .

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە موطەللیبی کوڕی ئەبووەداعە بە پەلە خۆی گەیاندە مەدینە و چوار هەزار دیرهەمی دا لە فیدیەی باوکی‌دا .. بەڵام دەسەڵاتی دیلەکان جیاواز بوو ، بۆیە لە چوار صەد دیرهەمەوە هەتا چوار هەزار دیرهەم لە فیدیەدا دراوە . هی واش هەبوو چل ئۆقیە ئاڵتوونی لە بری ئەدا بە فیدیە ، وەك عەبباس خوا لێی رازیی بێ . هی واش هەبوو هیچ سامانێکی نەبوو ، بەڵام خوێندن و نووسینی ئەزانی ، بۆیە دە منداڵی مەدینەی درایە دەست تا فێری خوێندن و نووسینیان بکات .

ئیمام ئەحمەد بە سەنەدی خۆی لە ئیبن عەبباس‌ەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە: هەندێ لە دیلەکانی رۆژی بەدر هیچیان نەبوو بیدەن لە فیدیەدا ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا تا نووسین فێری منداڵەکانی ئەنصار بکەن .

هەر کەسیش پارەی نەبوایە و خوێندەوارییشی نەبوایە ، ئەوا بەبێ بەرامبەر ئازاد ئەکرا .

لەم کاتە ناسکەدا کە دیلەکان ئەو فیدیەیان هاتە سەرشان ، لەسەر شانی زۆربەیان گران ئەبوو چونکە هەژار و دەست کورت بوون ، بۆیە خوای گەورە قورئانی پیرۆزی نارد تا دڵ خۆشیی بێ بۆیان کە ئەگەر ئیمان بهێنن ، خوای گەورە لە دنیاش و قیامەتییش‌دا چاك‌تر لەو فیدیەیان بۆ ئەبژێرێتەوە . ئەوەتا قورئان ئەفەرموێ :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ ( الأنفال: ٧٠ ) ئەمەش بۆ ئەوەی تا ئیمان بهێنن .. بژاردنی دنیا و لێ‌خۆش‌بوونی قیامەت . عەبباسی

مامەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوا لەویش رازی بێت ئەم بەڵێنەی خوای گەورەی دەست گیر بوو . ئەوەبوو عەبباس ئەی‌وت : خوای گەورە ( ئەو فیدیەیەی ) بۆ گۆڕیم بە بیست بەندە ـ لە ریوایەتێکی تردا چل ـ کە هەر هەموویان بە سامانی من خەریکی بازرگانیی بوون و ، زەمزەمیشی پێشکەش کردم ـ مەبەستی لە ئاودانی حاجیانە ـ کە پێم باش نیە لە بریی ئەو هەموو سامانی دانیشتوانی مەککەم پێ بدرێ . دوای ئەوەش کە ئەوەندە خێر و چاکەی دەست گیر بوو بوو کە رازیی بوو بوو ، ئەی وت : دوای ئەمەش هیوادارم ئەو لێ‌خۆش‌بوونەمان دەست گیر ببێ کە خوای گەورە ـ جل‌جلالە ـ بەڵێنی پێمان داوە .

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی‌دا راوێژی کرد ، کە ئەوەبوو ئەبوبەکر حەزی لە فیدیە وەرگرتن و ئازادکردنی قورەیشی‌یە دیلەکان بوو ، بەڵام عومەر حەزی لەوە بوو لە ملی هەموویان بدرێ .. سەرەنجام پێغەمبەری خوا ﷺ راکەی ئەبوبەکری وەرگرت .

دوای ئەنجام دانی ئەم کارە خوای گەورە لۆمە و گلەیی ناردە خوارەوە کە نەئەبوو پێغەمبەر ﷺ دیل بگرێت و بە فیدیە بەریان بدات ، بەڵکو ئەبوا یەك بە یەکی ئەو دیلانەیان بکوشتایە تا پشتی کافران بە جارێ بشکایە ، چونکە ئەو فیدیە وەرگرتنە خۆشویستنی دنیایە و ، خوای گەورەش قیامەتی ئەوێ . خۆ ئەگەر بەڵێنی خوای گەورە نەبوایە لەسەر ئەو کارە موسڵمانەکان تووشی سزایەکی گەورە ئەبوون .. ئەوەتا قورئان ئەفەرموێ : ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾(الأنفال : ٦٧ ـ ٦٨).

کە ئەم دوو ئایەتە هاتنە خوارەوە ، بۆ سبەینێ عومەر هات ، ئەبینێ وا پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ ئەگریێن .. عومەر فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ! هەواڵم بدەرێ بۆچ خۆت و ئەبوبەکری هاوەڵت ئەگرین ؟ خۆ ئەگەر منیش گریانم هات ئەوا ئەگریم و ، گەر گریانیشم نەهات ، ئەوا بە بۆنەی گریانەکەی ئێوەوە خۆم ئەهێنمە گریان . پێغەمبەری خوا فەرمووی : (( للذي عرض عليَّ أصحابك من أخذهم الفداء ، وقد عرض عليّ عذابكم أدنى من هذه الشجرة )) . فەرمووی : بۆ ئەوە ئەگریم کە هاوەڵەکانت ئەو رایەیان خستە بەردەمم کە فیدیە لە دیلەکان وەربگرن .. خوای گەورەش سزادانی ئێوەی لەم

درەختە نزیکتر پیشان دام . بە درەختێکی نزیکی فەرموو . هەواڵیشی دایە کە ئایەتەکان دابەزیوون . ئەمەش بەڵگەیە کە نەك ئەبوبەکر بەڵکو زۆربەی هاوەڵان رایان لەسەر فیدیە وەرگرتن بووە .

کە هاوەڵان ئەم دوو ئایەتەیان دین ، دەستیان لە کەڵك وەرگرتن لە پارەی فیدیەکە گرتەوە و ، زۆر شەرمەزاری ئەو گلەییە خواییە بوون ، تا خوای گەورە دڵخۆشیی دانەوە و قورئانی پیرۆزی ناردەوە و ، فەرمانی پێ دان کە ئەو غەنیمەتە بە حەڵاڵیی و پاکیی بخۆن ، کە ئەفەرموێ :

﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾( الأنفال : ٦٩ )

هەندێ لە خۆرهەڵات ناسان و ئەوانەش کە ئەیانەوێ مەسیحییەت بڵاو بکەنەوە رەخنە لە هەڵوێستی موسڵمانان ئەگرن ، دەربارەی دیلەکانی بەدر .. رەخنە ئەگرن لەوەی کە موسڵمانەکان دوو دیلیان کوشتووە و ، فیدیەشیان لەوانی تر وەرگرتووە.

ئەوانە زۆر گێل و نەفامن .. هەر ئەڵێی مێژووی دوور و درێژی مەسیحیەتیان سەرنج نەداوە ، کە بە دەستی ئەوان چەند ملیۆن مرۆڤ بەدبەخت کراوە بە درێژایی مێژوو ، تەنها بۆ سەپاندنی حوکم و دەسەڵاتی پڕ لە زوڵم و ستەمیان .

پێش هەموو شتێك موسڵمانەکان بە تەمای جەنگ نەبوون لەگەڵ سوپایەکی وەها گەورە و پڕتفاقدا .. خۆ موسڵمانەکان هەموو جەنگاوەرانیان نەهاتبوون بۆ بەدر ، ئەوەندە هەبوو خوای گەورە ویستی وەها بوو ، موسڵمانەکان بە تفاقێکی کەمەوە بچنە مەیدانی ئەو سوپا دڕندەیەی قوڕەیش و سەریان بخات بەسەریانا تا بزانن کە ئەو سەرکەوتنە پێشکەشی‌یەکی خوایی بوو و هیچی تر .. تا بزانن وا خوای گەورە بەڵێنی خۆی بردە سەر و ، با ئەوانیش بە جوانیی بەندایەتیی خۆیان ئەنجام بدەن ..

لەلایەکی ترەوە ئەوان رەخنەی ئەوە لە موسڵمانان ئەگرن کە بۆچ فیدیەیان لێ سەندن ، ئەبوا هەر بە هەوانتە ئازادیان بکردنایە و ، ئەو غەنیمەتانەی مەیدانی جەنگیان بەس بوو . کەچیی خوای پەروەردگار ـ وەك باسمان کرد ـ رەخنەی ئەوەیان لێ ئەگرێ کە بۆچ فیدیەیان لێ وەرگرتن ، بەڵکو ئەبوا هەموویان بکوشتنایە هەتا پشتی قوڕەیشی خوانەناس بشکێ . خۆ ئەگەر خاتری ئەهلی بەدری نەگرتایە ئەوا ئەبوا سزای خوایی‌یان بچەشتایە .

که موسڵمانەکان لە حەفتا دیل دوو دیلیان کوشتووە ، دیارە ـ وەك باسمان کرد ـ ئەو دوانە یەکجار خراپ بوون و مافی خۆیان بوو ، بگرە زۆربەی قورەیشی‌یەکان تاوان‌بار بوون ، بەوەی کە سیانزە ساڵی رەبەق خەریکی سزا و ئازاردانی پێغەمبەر و موسڵمانە بێ‌دەستەکان بوون ، بێ‌ئەوەی تاوانێکیان ئەنجام دابێ .. تەنها ئەوەندە هەیە شوێن رێبازی خوا کەوتبوون و ، دەستیان لە رەوشتە نزمەکانی نەفامیی هەڵ گرتبوو .. هێشتا دوای کۆچ کردن و بەجێ‌هێشتنی نیشتمان و کەس و کار و بەرژەوەندییش ، قورەیش کۆڵی نەئەدا و ، ئەیویست نەهێڵێ موسڵمانەکان لە مەدینەش بحەسێنەوە .. ئەو نەفامە رەخنەگرانە مێژووی پڕ لە ستەم و ئاژاوەی خۆیان لەیاد ئەکەن ، کە بە ناوی صەلیبەوە چ جەنگ و دەست درێژی‌یەکی خوێناویی بەرامبەر بە موسڵمانان ئەنجام دراوە ..

ئەوەبوو چەندین ساڵ جەنگ و ئاژاوەیان لە شامدا نایەوە و ، ئەیانویست فەلەستین داگیر بکەن و ، بە یەکجاریی ئیسلام و موسڵمانان لەناو بەرن ، کەچیی سۆزی خوای گەورە جووڵا و ، پاڵەوانی لێ‌هاتووی کوردیی ، صەلاحەددینی ئەییووبیی ، بۆ ئەم کارە رەخساند ، تا خاکی موسڵمانان پاك بکاتەوە و ئەو چڵکنە پیسانە بخاتە ناو دەریاوە و ، لە کۆڵ موسڵمانانیان بکاتەوە .

یان لە بیری خۆیانی ئەبەنەوە کە لە ئەندەلووس‌دا کاتێك مەسیحیەکان دەسەڵاتیان پەیدا کرد بەسەر موسڵمانەکان‌دا چۆن بە سەربڕین و سووتاندن تاقی موسڵمانیان لەو وڵاتەدا بڕی‌یەوە ، بە مەرجێ موسڵمانەکان لەسەر ئەو خاکە بۆ ماوەی هەشت صەد ساڵ شارستانیەتێکی یەکجار مەزنیان بەرپا کرد و ، بوونە مایەی بووژانەوە و پێشکەوتنی هەر هەموو ئەوروپا .. بەڵام ئەوروپا چونکە زانستەکەیان وەرگرت و دینی ئیسلام و رەوشتە بەرزەکانی ئیسلامیان لەگەڵیا وەرنەگرت ، زانستەکەیان بووە بەڵایەکی گەورە بۆ خۆشیان و ، بۆ تێکڕای مرۆڤایەتییش ، کە ئەوە چەند صەدەیەکە سەرزەویی بە دەست ستەمیانەوە ئەتلێتەوە و ، ئەو زانستە بەکەڵکەیان کردە نەگبەتیی بۆ مرۆڤ .

هەر نەك بەرامبەر بە موسڵمانان ، بەڵکو گاورەکان بەرامبەر یەکتریی زۆر ستەم‌کار بوون .. بۆ نموونە ئەو قەسابخانەیەی کە مەسیحیەکان بە ناوی مەسیحی‌یەتەوە بۆ برا هاودینەکانی خۆیانیان دروست کرد ، کە پێی ئەڵێن

قەسابخانەی ( سان بارتلمي ) ، بە خاڵێکی ناشیرینی مێژووی مەسیحیەت ئەژمێررێت ، بە هیچ شتێك پینە ناکرێ .

ئەم قەسابخانەیە بە شەودا ئەنجام درا .. ئەوەبوو کاثولیك دەستیان بە سەربڕینی پرۆتستانیەکان کرد لە پاریس و لە فەرەنسا ، بەلام بەوپەڕی نامەردیەوە . ( حياة محمد هيكل ، ص ٢٦٨ ) .

ئیتر با ئەو هەموو کوشتن و سەربڕینە هەزار بە هەزارانەی شۆرشی فەرەنسا و ، شۆرشە جیاجیاکانی تری گەلانی ئەوروپا و ، ئەو هەموو کوشتوبڕەی کە دەوڵەتە داگیرکارەکانی ئەوروپا لە وڵاتە جۆراو جۆرە داگیرکراوەکانی جیهان دا ، بە ناوی کوژاندنەوەی ئاژاوەوە ، لە چەرخی تازەدا ، ئەنجامی ئەدەن ، لەولاوە بووەستن .

دوو جەنگی جیهانیی بەرپا کران ، لەبەر خاتری دەسەلاتی زاڵمان و ، لە پێناوی ئەوەدا چەندین ملیۆن مرۆڤ کوژرا و ، چەندین خێزان و ماڵ و منداڵ زەبوون و بەدبەخت کران .. رەخنەگرە چڵکاوخۆرەکانیش مێشێك میوانیان نیە . لەبەر چاویان‌دا بە هەزارەها دیلی جەنگە ناهەموارەکان ئەکوژرێن و جووڵە ناکەن، کەچیی بۆ کوشتنی دوو ئەسیری هەزار ساڵ لەمەور بەر ، کە شیاوی ئەوەن پێیان بوترێ : تاوانباری جەنگ ، دەنگ بەرز ئەکەنەوە ، بە مەرجێ زۆربەی دیلەکان کە دوایی موسڵمان ئەبوون ، بە بۆنەی ئەو موعامەلە چاکەوە بوو ، کە هاوەڵان ، بە هۆی ئامۆژگاریی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەنجامیان دا .

بەڵێ ، موسڵمانەکان لە هەموو غەزاکانیان‌دا نموونەی مرۆڤی بەرەحم و دادپەروەر و خاوەن بەزەیی بوون .. خەڵکێکی زۆر شاهێدیی ئەوە ئەدەن ، کە یەکێ لەوانە مێژوونووسی مەزن ( گۆستاف لۆبۆن ) ە کە ئەڵێ : ( مێژوو وڵات گیرێکی تری بە خۆیەوە نەدیوە کە لە عەرەب ( واتە موسڵمانەکان ) دادپەروەرتر و بەبەزەییتر بێت ) . ( الوحي المحمدي ، ص ١٢٩ )

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە ناوی هاوەڵانی بەدر بخەینە بەردەست ئازیزانمان، تا بزانن بە ئیخلاص و هیممەتی بەرز ئەو پیاوە کەم و کەم تفاقانە ئیسلامیان هەڵگرت و پێشکەشی سەرزەوی‌یان کرد ..

لە پێشەوە ئاماژەمان کردووە کە بە پێی سەرژمێریی مامۆستا ( باشمیل ) بەشداربووانی جەنگی بەدر سێ‌صەد و حەڤدە کەس بوون ، کە هەشتا و شەشیان

موهاجیریی و ، صەد و حەفتایان خەزرەجیی و شەصت و یەکیشیان ئەوسیی بوون، ئەمەش ناوەکانیانن :

**یەکەم : بەدرییە موهاجیرەکان :**

أ ) لە نەوەی هاشمی کوڕی عەبدمەناف هەشت پیاو :

١ ـ سەرداری هەموو پێغەمبەران ، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموطەللیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدمەناف .

٢ ـ حەمزەی کوڕی عبدولموطەللیب .

٣ ـ عەلیی کوڕی ئەبوطالیبی کوڕی عەبدولموطەللیب .

٤ ـ زەیدی کوڕی حاریثەی خزمەت گوزاری پێغەمبەر ﷺ .

٥ ـ ئەنەسەی حەبەشیی ، خزمەت گوزاری پێغەمبەر ﷺ .

٦ ـ ئەبوکەبشەی فارسیی ، خزمەت گوزاری پێغەمبەر ﷺ .

٧ ـ کەنازی کوڕی حوصەین ، کە پێی ئەوترا ئەبو مەرثەد ، هاوپەیمانیان بوو .

٨ ـ مەرثەدی کوڕی ئەبومەرثەد ، کە ئەویش هاوپەیمانیان بوو .

( ب ) لە نەوەی موطەللیبی کوڕی عەبدمەناف ، چوار پیاو:

١ ـ عوبەیدەی کوڕی حاریثی کوڕی موطەللیب ـ شەهیدی بەدر .

٢ ـ طوفەیلی کوڕی حاریثی کوڕی موطەللیب .

٣ ـ حوصەینی کوڕی حاریثی کوڕی موطەللیب .

٤ ـ میسطەح ، کە ناوی عەوفی کوڕی ئەثاثەی کوڕی عەببادی کوڕی موطەللیب بووە .

( ج ) لە نەوەی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف شانزە پیاو :

١ ـ عوثمانی کوڕی عەففان ، کە لەلای روقیەی خێزانی مایەوە بۆ سەروکاریی چارەسەرکردنی و ، وەك بەدرییەکان بەشی بۆ دانرا .

٢ ـ ئەبوحوذەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی رەبیعەی کوڕی عەبدشەمس .

٣ ـ سالم ، مەولای ئەبوحوذەیفەی کوڕی عوتبە .[٣٤٠]

---

[٣٤٠] سالم کوڕی مەعقەل ، یەکێکە لە هاوەڵە پایەدارەکان کە زوو موسڵمان بووە . سەرەتا بەندەی ئافرەتێکی ئەنصاریی بوو و ، ئازادی کرد . دوای ئەوە بووە مەولای هاوەڵی بە ناوبانگ ئەبوحوذەیفە و ، کردییە کوڕی خۆی و فاطیمەی کچی وەلیدی کوڕی عوتبەی برازای لێ مارە کرد . دواییش ئایەتی بەتاڵ کردنەوەی یاسای بەکوڕکردن هات و ، ئەبوا هەموو کەسێك بە ناوی باوکیەوە بانگ بکرایە . سالم خاوەنی پایەیەکی مەزن بوو لە ئیسلامدا ، کە ئەوەبوو لە مزگەوتی قوباءدا پێش نوێژیی بۆ موهاجیرەکان ئەکرد کە ئەبوبەکر و عومەریشیان لە ناودا بوون . سالم

٤ ـ عەبدوڵلای کوڕی جەحش کە هاوپەیمانیان بوو .

٥ ـ عوکاشەی کوڕی مەحصەن ، ئەویش هاوپەیمانیان بوو .

٦ ـ شوجاعی کوڕی وەهبی کوڕی رەبیعە ( هاوپەیمان ) .

٧ ـ عوقبەی برای ( هاوپەیمان ) .

٨ ـ یەزیدی کوڕی رەقیش ( هاوپەیمان ) .

٩ ـ ئەبوسینان ، مەحصەنی کوڕی حەرثان ( هاوپەیمان ) .

١٠ ـ سینانی کوڕی ئەبوسینان ( هاوپەیمان ) .

١١ ـ میحرەزی کوڕی نەضلەی کوڕی عەبدوڵلا ( هاوپەیمان ) .

١٢ ـ رەبیعەی کوڕی ئەکثەم ( هاوپەیمان ) .

١٣ ـ ثەقیفی کوڕی عەمر ( هاوپەیمان ) .

١٤ ـ مالیکی کوڕی عەمر ( هاوپەیمان ) .

١٥ ـ مەدلەجی کوڕی عەمر ( هاوپەیمان ) .

١٦ ـ ئەبومەخشیی ( هاوپەیمان ) .

( د ) لە نەوەی نەوفەلی کوڕی عەبدمەناف ، دوو پیاو :

١ ـ عوتبەی کوڕی غەزوان ( هاوپەیمان ) .

٢ ـ خەببابی مەولای عوتبەی کوڕی غەزوان ( هاوپەیمان ) .

( ه ) لە نەوەی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا ، سێ پیاو :

١ ـ زوبەیری کوڕی عەووامی کوڕی خوەیلیدی کوڕی ئەسەد .

٢ ـ حاطبی کوڕی ئەبوبەلتەعەی یەمانیی ( هاوپەیمان ) .

٣ ـ سەعدی کەلبیی ، مەولای حاطب ( هاوپەیمان ) .

( و ) لە نەوەی عەبدوددارى کوڕی قوصەی دوو پیاو :

---

لەگەڵ عومەردا کۆچی کرد بۆ مەدینە و ، هەمیشە عومەر ستایشی ئەکرد . کاتێکیش کە عومەر زامدار کرا ، بیری لەو کەسانە ئەکردەوە کە شایانی ئەوەن بکرێن بە خەلیفە . لەو کاتەدا سالم یشی بە بیردا هات کەچیی هاتەوە یادی کە سالم کۆچی دوایی کردووە ، بۆیە فەرمووی : ئەگەر سالم زیندوو بوایە کاری خەلافەتم نەئەکردە شوورا ، واتە سالمم راستەوخۆ ئەکردە خەلیفەی موسڵمانان . ئەمەش پایەداریی سالم دەرئەخات لە دڵی عومەردا . سالم یەکێك بوو لەو هاوەڵە ناودارانەی کە قورئانیان لە بەربوو . پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی ئەدا تا موسڵمانەکان قورئان لە چوار کەس وەربگرن کە ئەی فەرموو : (( خذوا القرآن من أربعة : من أبن أم عبد ، ومن أبيّ بن كعب ، ومن سالم مولى أبي حذيفة ، ومن معاذ بن جبل )) . سالم بەشداریی بەدری کرد و لە جەنگی یەمامەدا خۆی و ئەبوحوذەیفەی مەولای بە شەهیدیی سەریان نایەوە ، خوا لێیان رازیی بێ .

١ ـ موصعەبى كوڕى عومەيرى كوڕى هاشمى كوڕى عەبدمەنافى كوڕى عەبدوددار .

٢ ـ سوەيطى كوڕى سەعدى كوڕى حەريمەلە .

( ز ) لە نەوەى زوهرەى كوڕى كيلاب هەشت پياو :

١ ـ عەبدوررەحمانى كوڕى عەوف .

٢ ـ سەعدى كوڕى ئەبووەققاص .

٣ ـ عومەيرى كوڕى ئەبووەققاص ـ شەهيدى بەدر .

٤ ـ ميقدادى كوڕى عەمرى كوڕى ثعلبە ، كە هاوپەيمانيان بوو .

٥ ـ عەبدوڵلاى كوڕى مەسعوودى كوڕى حاريثى هەذەليى ، كە هاوپەيمانيان بوو .

٦ ـ مەسعوودى كوڕى رەبيعەى كوڕى عەمرى كوڕى سەعد ، كە هاوپەيمانيان بوو .

٧ ـ ذوششيمالەين كوڕى عەمر ، كە هاوپەيمانيان بوو ـ شەهيدى بەدر .

٨ ـ خەبباى كوڕى ئەرەت ، كە هاوپەيمانيان بوو .

( ح ) لە نەوەى تەيمى كوڕى موڕڕە پێنج پياو :

١ ـ ئەبوبەكرى صدديق .

٢ ـ بيلالى كوڕى رەباح كە مەولاى ئەبوبەكر بوو .

٣ ـ عاميرى كوڕى فوهەيرە ، ئەويش مەولاى ئەبوبەكر بوو .

٤ ـ صوهەيبى كوڕى سينان ، كە مەولاى عەبدوڵلاى كوڕى جەدعان بوو .

٥ ـ طەلحەى كوڕى عوبەيدوڵلا ، كە لە كاتى جەنگەكەدا لە شام بوو و پێغەمبەرى خوا ﷺ وەك بەدريى بەشى بۆ ديارىى كرد .

( ط ) لە نەوەى مەخزووم پێنج پياو :

١ ـ ئەبوسەلەمەى كوڕى عەبدولئەسەد كە ناوى عەبدوڵلا بوو .

٢ ـ شەمماسى كوڕى عوثمانى كوڕى شەريد .

٣ ـ ئەرقەمى كوڕى ئەبوئەرقەم ، كە ناوى ئەبوئەرقەم عەبدمەنافى كوڕى ئەسەد بووە .

٤ ـ عەممارى كوڕى ياسر .

٥ ـ موعتەبى كوڕى عەوفى كوڕى عامير ، كە هاوپەيمانيان بوو .

( ي ) لە نەوەی عەدیی کوڕی کەعب ( هۆزەکەی خەلیفە عومەر ) چواردە پیاو :

١ ـ عومەری کوڕی خەططابی کوڕی نوفەیلی کوڕی عەبدولعوززا .

٢ ـ میهجەعی عەککیی کە مەولای عومەر بووە ـ شەهیدی بەدر .

٣ ـ عەمری کوڕی سوراقە .

٤ ـ عەبدوڵڵای کوڕی سوراقەی برای .

٥ ـ واقیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبد مەناف ، کە هاوپەیمانیان بوو .

٦ ـ خەولیی کوڕی ئەبوخەولیی ، کە هاوپەیمانیان بوو .

٧ ـ مالیکی کوڕی ئەبوخەولیی ، کە هاوپەیمانیان بوو .

٨ ـ عامیری کوڕی رەبیعە ، کە هاوپەیمانی بنەماڵەی خەططاب بوو .

٩ ـ عامیری کوڕی بوکەیری کوڕی عەبدیالەیل کە هاوپەیمانیان بوو .

١٠ ـ عاقیل ی کوڕی بوکەیر ـ شەهیدی بەدر .

١١ ـ خالیدی کوڕی بوکەیر .

١٢ ـ ئیاسی کوڕی بوکەیر .

١٣ ـ زەیدی کوڕی خەططاب کە برای عومەر بووە و ، تەمەنی لە عومەر زیاتر بووە و پێش ئەویش موسڵمان بووە . بەشداریی هەموو ڕووداوەکانی تریشی کردووە و لە جەنگی یەمامەی پاشگەزبووەکان‌دا بە شەهیدیی سەری نایەوە و ، ئاڵای موسڵمانەکانیش بەو بوو . کە شەهید بوو عومەر خەفەتی زۆری بۆ خوارد و، فەرمووشی : بۆ هەردوو کارە چاکەکە پێشم کەوت : پێش من موسڵمان بوو و، پێش منیش شەهید بوو .

١٤ ـ سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل کە مێردی فاطیمەی خوشکی عومەر بوو و ، یەکێکە لەو دە کەسەی کە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە ، لە کاتی جەنگی بەدردا لە شام بوو ، جا کە گەڕایەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە یەکێ لە سەربازانی بەدری ژمارد و بەشی بۆ تەرخان کرد و ، وتی : ئەی پاداشتم ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : (( وأجرك أربعة عشر رجلا )) . فەرمووی : ئەوەندەی چواردە پیاو پاداشتت هەیە .

( ك ) لە نەوەی جومەحی کوڕی عەمری کوڕی هەصیص پێنج پیاو :

١ ـ عوثمانی کوڕی مەظعوون .

٢ ـ سائیبی کوڕی عوثمانی کوڕی مەظعوون .

٣ ـ قودامەی کوڕی مەظعوون .

٤ ـ عەبدوڵڵای کوڕی مەظعوون .

٥ ـ موعەممەری کوڕی حاریثی کوڕی موعەممەر .

( ل ) لە نەوەی سەهمی کوڕی عەمری کوڕی هەصیص یەك پیاو کە ئیبن ئیسحاق ناوی نەداوە .

( م ) لە نەوەی عامیری کوڕی لوئەی حەوت پیاو :

١ ـ ئەبوسەبرەی کوڕی ئەبورەهمی کوڕی عەبدولعوززا .

٢ ـ عەبدوڵڵای کوڕی مەخرەمەی کوڕی عەبدولعوززا .

٣ ـ عەبدوڵڵای کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر .

٤ ـ عومەیری کوڕی عەوف . کە مەولای سوهەیلی کوڕی عەمر بووە .

٥ ـ سەعدی کوڕی خەولە ، کە هاوپەیمانیان بووە .

٦ ـ وەهبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرح .

٧ ـ حاطبی کوڕی عەمر .

( ن ) لە نەوەی حاریثی کوڕی فیهر شەش پیاو .

١ ـ عامیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەڕڕاح ( ئەبوعوبەیدە ) .

٢ ـ عەمری کوڕی حاریثی کوڕی زوهەیر .

٣ ـ سوهەیلی کوڕی وەهبی کوڕی رەبیعە .

٤ ـ صەفوانی کوڕی وەهبی کوڕی رەبیعە ـ شەهیدی بەدر .

٥ ـ عەمری کوڕی ئەبوسەرحی کوڕی رەبیعە .

٦ ـ عیاضی کوڕی زوهەیر .

**دووهەم : بەدرییە ئەنصارەکان :**

**( ١ ) بەدرییە ئەوسییەکان :**

( أ ) لە نەوەی عەبدولئەشهەل ، پانزە پیاو :

١ ـ سەعدی کوڕی موعاذ .

٢ ـ حاریثی کوڕی ئەوسی کوڕی موعاذ .

٣ ـ حاریثی کوڕی ئەنەسی کوڕی رافع .

٤ ـ سەعدی کوڕی زەیدی کوڕی مالیك .

٥ ـ سەلەمەی کوڕی سەللامەی کوڕی وەقش .

٦ ـ عەببادی کوڕی بیشری کوڕی وەقش .
٧ ـ سەلەمەی کوڕی ثابیتی کوڕی وەقش .
٨ ـ رافیعی کوڕی یەزیدی کوڕی کورز .
٩ ـ حاریثی کوڕی خەزنەی کوڕی عەدیی .
١٠ ـ موحەممەدی کوڕی مەسلەمە .
١١ ـ سەلەمەی کوڕی ئەسلەمی کوڕی حەریش ، کە هاوپەیمانیان بووە .
١٢ ـ ئەبولهەیثەمی کوڕی تەییهان .
١٣ ـ عوبەیدی کوڕی تەییهان .
١٤ ـ عەمری کوڕی موعاذی کوڕی نوعمان .
١٥ ـ عەبدوڵلای کوڕی سەهل .
( ب ) لە نەوەی ظەفەر دوو پیاو :
١ ـ قەتادەی کوڕی نوعمانی کوڕی زەید .
٢ ـ عوبەیدی کوڕی ئەوسی کوڕی مالیك .
( ج ) لە نەوەی عەبدی کوڕی رەززاح سێ پیاو :
١ ـ نەصری کوڕی حاریثی کوڕی عەبد .
٢ ـ موعتەبی کوڕی عەبد .
٣ ـ عەبدوڵلای کوڕی طاریقی بەلەویی کە هاوپەیمانیان بووە .
( د ) لە نەوەی حاریثەی کوڕی حاریث سێ پیاو :
١ ـ مەسعوودی کوڕی سەعدی کوڕی عامیر .
٢ ـ ئەبوعەبسی کوڕی جەبر ..
٣ ـ هانیی کوڕی نەیاری بەلەویی ، کە هاوپەیمانیان بووە .
( هـ ) لە نەوەی عەمری کوڕی عەوف شەش پیاو :
١ ـ عاصمی کوڕی ثابیتی کوڕی قەیس .
٢ ـ قەیس ئەبونەفلەحی کوڕی عیصمە .
٣ ـ موعەتتیبی کوڕی قوشەیر .
٤ ـ ئەبومەلیلی کوڕی ئەزعەر .
٥ ـ عەمری کوڕی مەعبەدی کوڕی ئەزعەر .
٦ ـ سەهلی کوڕی حونەیف .

( و ) لە نەوەی ئومەییەی كوڕی زەید نۆ پیاو :

١ ـ مویەششیری كوڕی عەبدولمونذیری كوڕی زەنبەر ـ شەهیدی بەدر .

٢ ـ ریفاعەی كوڕی عەبدولمونذیری كوڕی زەنبەر .

٣ ـ سەعدی كوڕی عوبەیدی كوڕی نوعمان .

٤ ـ عوەییمی كوڕی ساعیدە .

٥ ـ رافیعی كوڕی عەنجەدە .

٦ ـ عوبەیدی كوڕی ئەبوعوبەید .

٧ ـ ثەعلەبەی كوڕی حاطەب .

٨ ـ حاریثی كوڕی حاطەب .

٩ ـ ئەبولوبابە ، كە لەگەڵ حاریثی كوڕی حاطەب ، بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕانەوە بۆ مەدینە ، بەشیان لە دەستكەوتەكانی بەدر درا و ، بە بەدرییش لە قەڵەم دران .

( ز ) لە نەوەی عوبەیدی كوڕی زەید حەوت پیاو :

١ ـ ئونەیسی كوڕی قەتادەی كوڕی رەبیعە .

٢ ـ مەعنی كوڕی عەدیی كوڕی جەددی بەلەویی ، هاوپەیمانیان بوو .

٣ ـ عەبدوڵلای كوڕی سەلەمەی عیجلانیی ، هاوپەیمانیان بوو .

٤ ـ زەیدی كوڕی ئەسلەمی كوڕی ثەعلەبەی عیجلانیی ، هاوپەیمانیان بوو .

٥ ـ ریبعیی كوڕی رافیعی كوڕی زەیدی عیجلانیی ، هاوپەیمانیان بوو .

٦ ـ عاصیمی كوڕی عەدیی كوڕی جەددی عیجلانیی ، هاوپەیمانیان بوو . ئەم هاوەڵە بەرەو بەدر كەوتە رێ بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە و ، بەشە دەستكەوتی وەك بەدری یەكان بۆ دانا .

٧ ـ ثابیتی كوڕی ئەقوەمی كوڕی ثەعلەبەی عیجلانیی ، هاوپەیمانیان بوو .

( ح ) لە نەوەی ثەعلەبەی كوڕی عەمری كوڕی عەوف حەوت پیاو :

١ ـ عەبدوڵلای كوڕی جوبەیری كوڕی نوعمان .

٢ ـ عاصیمی كوڕی قەیسی كوڕی ثابیت .

٣ ـ ئەبوضەییاحی كوڕی ثابیتی كوڕی نوعمان .

٤ ـ ئەبوحەننە یان ئەبوحەببەی كوڕی ثابیتی كوڕی نوعمان .

٥ ـ سالیمی كوڕی عومەیری كوڕی ثابیت .

٦ ـ حاریثی کوڕی نوعمانی کوڕی ثومەییە .
٧ ـ خەوواتی کوڕی جویەیری کوڕی نوعمان .
(ط) لە نەوەی جەحجی کوڕی کولفەی کوڕی عەوف دوو پیاو :
١ ـ مونذیری کوڕی موحەممەدی کوڕی عوقبە .
٢ ـ ئەبوعەقیلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ثەعلەبە ، هاوپەیمانیان بوو .
(ي) لە نەوەی غەنمی کوڕی سەلەم پێنج پیاو :
١ ـ سەعدی کوڕی خەیثەمە ـ شەهیدی بەدر .
٢ ـ مونذیری کوڕی قودامەی کوڕی عەرفەجە .
٣ ـ مالیکی کوڕی قودامەی کوڕی عەرفەجە .
٤ ـ حاریثی کوڕی عەرفەجە .
٥ ـ تەمیم ، بەندەی ئازادکراویان بوو .
(ك) لە نەوەی موعاویەی کوڕی مالیکی کوڕی عەوف سێ پیاو :
١ ـ جەبری کوڕی عەتیکی کوڕی حاریث .
٢ ـ مالیکی کوڕی نومەیلە ، هاوپەیمانیان بوو .
٣ ـ نوعمانی کوڕی عەصر ، هاوپەیمانیان بوو .
**( ٢ ) بەدرىیە خەزرەجییەکان :**
(أ) لە نەوەی ( امريء القيس ) ی کوڕی مالیك چوار پیاو :
١ ـ خاریجەی کوڕی زەید .
٢ ـ سەعدی کوڕی رەبیع .
٣ ـ عەبدوڵلای کوڕی رەواحە .
٤ ـ خەللادی کوڕی سووەیدی کوڕی ثەعلەبە .
(ب) لە نەوەی زەیدی کوڕی مالیك دوو پیاو :
١ ـ بەشیری کوڕی سەعدی کوڕی ثەعلەبە .
٢ ـ سەماکی کوڕی سەعدی کوڕی ثەعلەبە .
(ج) لە نەوەی عەدیی کوڕی کەعبی کوڕی خەزرەج سێ پیاو :
١ ـ سوبەیعی کوڕی قەیسی کوڕی عەیشە .
٢ ـ عەببادی کوڕی قەیسی کوڕی عەیشە .
٣ ـ عەبدوڵلای کوڕی عەبەس .

(د) لە نەوەی ئەحمەری کوڕی حاریثەی کوڕی ثەعلەبە یەك پیاو :

١ ـ یەزیدی کوڕی حاریثی کوڕی قەیس ـ شەهیدی بەدر .

(هـ) لە نەوەی جەشمی کوڕی حاریثی کوڕی خەزرەج چوار پیاو :

١ ـ خوبەیبی کوڕی ئەسافی کوڕی عوتبە .

٢ ـ عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی ثەعلەبە .

٣ ـ حەریثی کوڕی زەیدی کوڕی ثەعلەبە .

٤ ـ سوفیانی کوڕی بیشر .

(و) لە نەوەی جەدارەی کوڕی عەوفی کوڕی حاریث چوار پیاو :

١ ـ تەمیمی کوڕی یەماری کوڕی قەیس .

٢ ـ عەبدوڵڵای کوڕی عومەیر .

٣ ـ زەیدی کوڕی موزەنیی کوڕی قەیس .

٤ ـ عەبدوڵڵای کوڕی عەرفەطەی کوڕی عەدیی .

(ز) لە نەوەی ئەبجەر یەك پیاو :

١ ـ عەبدوڵڵای کوڕی رەبیعی کوڕی قەیس .

(ح) لە نەوەی عەوفی کوڕی خەزرەج ، پاشان لە نەوەی عوبەید ، دوو پیاو :

١ ـ عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول .[٣٤١]

٢ ـ ئەوسی کوڕی خەولیی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حاریث .

(ط) لە نەوەی جوزئی کوڕی عەدیی کوڕی مالیك شەش پیاو :

١ ـ زەیدی کوڕی وەدیعەی کوڕی عەمری غەطەفانیی کە هاوپەیمانیان بوو .

٢ ـ عامیری کوڕی سەلەمەی کوڕی عامیری یەمەنیی کە هاوپەیمانیان بوو .

٣ ـ ئەبوحومەیضە ، مەعبەدی کوڕی عەبباد .

٤ ـ عامیری کوڕی بوکەیر کە هاوپەیمانیان بووە .

٥ ـ عوقبەی کوڕی وەهبی کوڕی کیلدەی غەطەفانیی کە هاوپەیمانیان بوو .

---

[٣٤١] عەبدوڵڵای باوکی ، واتە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرۆکی مونافیقان بوو ، بەڵام خۆی یەکێ بوو لە گەنجە چاکەکانی ئیسلام و ، هاوەڵێکی پایەدار بوو و ، ئامادەی هەموو رووداوەکان بوو . کاتێك کە نیفاقی باوکی دەرکەوت ، داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا باوکی بکوژێت ، کەچیی مۆڵەتی پێ نەدا ، بەڵکو فەرمانی پێ دا کە بە چاکە لەگەڵیا هەڵس و کەوت بکات . لە جەنگی یەمامەی پاشگەزبووەکاندا و ، لە ساڵی دوانزەهەمی کۆچییدا بە شەهیدیی سەری نایەوە . شایانی باسە عەبدوڵڵا یەکێ بووە لەوانەی کە نووسەری پێغەمبەر بوون .

٦ ـ ریفاعەی کوڕی عەمری کوڕی زەید کە هاوپەیمانیان بوو .
(ي) لە نەوەی سالیمی کوڕی عەوف پیاوێك :
١ ـ نەوفەلی کوڕی عەبدوڵلاّی کوڕی نەضلە .
(ك) لە نەوەی ئەصرەمی کوڕی فیهری کوڕی ثەعلەبە دوو پیاو :
١ ـ عویادەی کوڕی صامیت .
٢ ـ ئەوسی کوڕی صامیت .
(ل) لە نەوەی دەعدی کوڕی فیهر پیاوێك :
١ ـ نوعمانی کوڕی مالیکی کوڕی ثەعلەبە .
(م) لە نەوەی لەوذانی کوڕی سالیم دە پیاو :
١ ـ ثابیتی کوڕی هەزال .
٢ ـ مالیکی کوڕی دەخشەمی کوڕی مورضیخە .
٣ ـ رەبیعی کوڕی ئیاسی کوڕی عەمری کوڕی غونم .
٤ ـ وەرەقەی کوڕی ئیاس .
٥ ـ عەمری کوڕی ئیاسی یەمەنیی کە هاوپەیمانیان بوو .
٦ ـ مەجدەری کوڕی زیادی بەلەویی کە هاوپەیمانیان بوو .
٧ ـ عویادەی کوڕی خەشخاشی کوڕی عەمر .
٨ ـ نەححابی کوڕی ثەعلەبە .
٩ ـ عەبدوڵلاّی کوڕی ثەعلەبە .
١٠ ـ عوتبەی کوڕی رەبیعەی کوڕی خالیدی کوڕی موعاویە . کە هاوپەیمانیان بوو .
(ن) لە نەوەی ساعیدەی کوڕی کەعبی کوڕی خەزرەج دوو پیاو :
١ ـ ئەبودوجانە ، سیماکی کوڕی ئەوس .
٢ ـ مونذیری کوڕی عەمری کوڕی خونەیس .
(س) لە نەوەی بەدیی کوڕی عامیری کوڕی عەوف دوو پیاو :
١ ـ ئەبوئوسەیدی کوڕی رەبیعەی کوڕی بەدیی .
٢ ـ مالیکی کوڕی مەسعوودی کوڕی بەدیی .
(ع) لە نەوەی طەریفی کوڕی خەزرەج شەش پیاو :
١ ـ عەبدڕەببەی کوڕی حەققی کوڕی ئەوس .

٢ ـ کەعبی کوڕی جەماز کە هاوپەیمانیان بوو .
٣ ـ ضیمرەی کوڕی عەمر کە هاوپەیمانیان بوو .
٤ ـ زیادی کوڕی عەمر کە هاوپەیمانیان بوو .
٥ ـ بەسبەسی کوڕی عەمری جوهەنیی کە هاوپەیمانیان بوو .
٦ ـ عەبدوڵلای کوڕی عامیری بەلەویی کە هاوپەیمانیان بوو.
(ف) لە نەوەی جەشمی کوڕی خەزرەج دوانزە پیاو :
١ ـ خەڕڕاشی کوڕی صوممەی کوڕی عەمر.
٢ ـ حەببابی کوڕی مونذیر .
٣ ـ عومەیری کوڕی حومام ـ شەهیدی بەدر .
٤ ـ تەمیم ، مەولای خەڕڕاش .
٥ ـ عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی حەرام .
٦ ـ موعاذی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح .
٧ ـ خەللادی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح .
٨ ـ عوقبەی کوڕی عامیری کوڕی نابیی .
٩ ـ حەبیبی کوڕی ئەسوەد ، مەولایان بوو .
١٠ ـ ثابیتی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی زەید .
١١ ـ موعەووەذی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح .
١٢ ـ عومەیری کوڕی حاریثی کوڕی ثەعلەبە .
(ص) لە نەوەی عوبەیدی کوڕی عەدیی کوڕی غەنمی کوڕی کەعب نۆ پیاو:
١ ـ بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعروور .
٢ ـ طوفەیلی کوڕی مالیکی کوڕی خەنساء .
٣ ـ سینانی کوڕی صەیفیی کوڕی خەنساء .
٤ ـ عەبدوڵلای کوڕی جەددی کوڕی قەیسی کوڕی صەخری کوڕی خەنساء .
٥ ـ عوتبەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی صەخری کوڕی خەنساء .
٦ ـ جەبباری کوڕی صەخری کوڕی ئومەییەی کوڕی خەنساء .
٧ ـ خاریجەی کوڕی حومەییری ئەشجەعیی کە هاوپەیمانیان بوو .
٨ ـ عەبدوڵلای کوڕی حومەییر ، کە هاوپەیمانیان بوو .
٩ ـ طوفەیلی کوڕی نوعمانی کوڕی خەنساء .

(ق) لە نەوەی خوناسی کوڕی سینانی کوڕی عوبەید حەوت پیاو :
١ ـ یەزیدی کوڕی مونذیری کوڕی سەرحی کوڕی خوناس .
٢ ـ مەعقەلی کوڕی مونذیری کوڕی خوناس .
٣ ـ عەبدوڵلاّی کوڕی نوعمانی کوڕی بەلدەمە .
٤ ـ ضەححاکی کوڕی حاریثەی کوڕی زەید .
٥ ـ سوادی کوڕی زورەیقی کوڕی ثەعلەبە .
٦ ـ مەعبەدی کوڕی قەیسی کوڕی صەخری کوڕی حەرام .
٧ ـ عەبدوڵلاّی کوڕی قەیسی کوڕی صەخری کوڕی حەرام .
(ر) لە نەوەی نوعمانی کوڕی عوبەید چوار پیاو:
١ ـ عەبدوڵلاّی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی نوعمان .
٢ ـ جابیری کوڕی عەبدوڵلاّی کوڕی ریئابی کوڕی نوعمان .
٣ ـ خولەیدەی کوڕی قەیسی کوڕی نوعمان .
٤ ـ نوعمانی کوڕی سینان ، کە مەولایان بووە .
(ش) لە نەوەی سوادی کوڕی غەنمی کوڕی کەعبی کوڕی سەلیمە چوار پیاو :
١ ـ یەزیدی کوڕی حەدیدە .
٢ ـ سەلیمی کوڕی عەمری کوڕی حەدیدە .
٣ ـ قوطبەی کوڕی عەمری کوڕی حەدیدە .
٤ ـ عەنتەرە ، کە مەولای سەلیمی کوڕی عەمر بوو.
(ت) لە نەوەی عەدیی کوڕی نابیی کوڕی عەمری کوڕی سوادی کوڕی غەنم شەش پیاو :
١ ـ عەبسی کوڕی عامیری کوڕی عەدیی .
٢ ـ ثەعلەبەی کوڕی غەنەمەی کوڕی عەدیی .
٣ ـ سەهلی کوڕی قەیسی کوڕی ئەبوکەعب .
٤ ـ ئەبولیوسر ، کەعبی کوڕی عەمری کوڕی عەبباد .
٥ ـ عەمری کوڕی طەلقی کوڕی زەیدی کوڕی ئومەییە .
٦ ـ موعاذی کوڕی جەبەلی کوڕی عەمری کوڕی ئەوس .
(ث) لە نەوەی زورەیقی کوڕی عامیری کوڕی زورەیق حەوت پیاو :
١ ـ قەیسی کوڕی موحەصصەنی کوڕی خالید .

٢ ـ ئەبوخالید ، حاریثی کوڕی قەیسی کوڕی خالید .
٣ ـ جوبەیری کوڕی ئیاسی کوڕی خالید .
٤ ـ ئەبوعوبادە ، سەعد ی کوڕی عوثمانی کوڕی خەلدە .
٥ ـ ذەکوانی کوڕی عەبدقەیسی کوڕی خەلدە .
٦ ـ عوقبەی کوڕی عوثمانی کوڕی خەلدە .
٧ ـ مەسعوودی کوڕی خەلدەی کوڕی عامیر .
(خ ) لەنەوەی خالیدی کوڕی عامیری کوڕی زورەیق پیاوێك :
١ ـ عەببادی کوڕی قەیسی کوڕی عامیری کوڕی خالید .
(ذ ) لە نەوەی خەلدەی کوڕی عامیری کوڕی زورەیق پێنج پیاو:
١ ـ ئەسعەدی کوڕی یەزیدی کوڕی فاکیهە .
٢ ـ فاکیهەی کوڕی بیشری کوڕی فاکیهە .
٣ ـ موعاذی کوڕی ماعیصی کوڕی قەیس .
٤ ـ عائیذی کوڕی ماعیصی کوڕی قەیس .
٥ ـ مەسعوودی کوڕی سەعدی کوڕی قەیس .
(ض) لە نەوەی عیجلانی کوڕی عەمری کوڕی عامیری کوڕی زورەیق شەش پیاو:
١ ـ ریفاعەی کوڕی رافیعی کوڕی عیجلان .
٢ ـ خەللادی کوڕی رافیعی کوڕی مالیك .
٣ ـ عوبەیدی کوڕی مالیکی کوڕی عەمر.
٤ ـ عوبەیدی کوڕی زەیدی کوڕی عامر.
٥ ـ مەلیلی کوڕی وەبرەی کوڕی خالید .
٦ ـ عیصمەی کوڕی حوصەینی کوڕی وەبرە.
(ظ) لە نەوەی بەیاضەی کوڕی عامیری کوڕی زورەیق شەش پیاو:
١ ـ زیادی کوڕی لەبیدی کوڕی عامیر .
٢ ـ فەروەی کوڕی عەمری کوڕی وەذفە .
٣ ـ خالیدی کوڕی قەیسی کوڕی مالیك .
٤ ـ رەجیلەی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی خالید .
٥ ـ عەطیەی کوڕی نوەیرەی کوڕی عامیر .

٦ ـ خەلیفەی کوڕی عەدیی کوڕی عەمر .

( غ ) لە نەوەی حەبیبی کوڕی عەبد حاریثة دوو پیاو :

١ ـ رافیعی کوڕی موعەللای کوڕی لەوذان ـ شەهیدی بەدر .

٢ ـ هیلالی کوڕی موعەللای کوڕی لەوذان .

(غ) لە نەوەی نەججار ، کە تەیموڵلای کوڕی ثەعلەبەی کوڕی عەمری کوڕی خەزرەج بووە ، پەنجا و سێ پیاو :

١ ـ خالیدی کوڕی زەیدی کوڕی کولەیب ، ( ئەبوئەییووبی ئەنصاریی ) .

٢ ـ ثابیتی کوڕی خالیدی کوڕی نوعمان .

٣ ـ عومارەی کوڕی حەزمی کوڕی زەید .

٤ ـ سوراقەی کوڕی کەعبی کوڕی عەبدولعوززا.

٥ ـ حاریثەی کوڕی نوعمانی کوڕی زەید .

٦ ـ سەلیمی کوڕی قەیسی کوڕی فەهد .

٧ ـ سوهەیلی کوڕی رافیعی کوڕی ئەبوعەمر .

٨ ـ عەدیی کوڕی زەغبائی جوهەینیی ، کە هاوپەیمانیان بووە .

٩ ـ مەسعوودی کوڕی ئەوسی کوڕی زەید .

١٠ ـ ئەبوخوزەیمەی کوڕی ئەوسی کوڕی زەید .

١١ ـ رافیعی کوڕی حاریثی کوڕی سواد

١٢ ـ عەوفی کوڕی حاریثی کوڕی ریفاعە ـ شەهیدی بەدر .

١٣ ـ موعەووەذی کوڕی حاریثی کوڕی ریفاعە ـ شەهیدی بەدر .

١٤ ـ موعاذی کوڕی حاریثی کوڕی ریفاعە ، کە هەرسێکیان برابوون و دایکیان ناوی عەفراء بوو .

١٥ ـ نوعمان یان نوعەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ریفاعە .

١٦ ـ عامیری کوڕی موخەللەدی کوڕی حاریث

١٧ ـ عەبدوڵلای کوڕی قەیسی کوڕی خالید .

١٨ ـ عوصەیمەی ئەشجەعیی ، کە هاوپەیمانیان بووە .

١٩ ـ وەدیعەی کوڕی عەمری جوهەینیی ، کە هاوپەیمانیان بووە .

٢٠ ـ ثابیتی کوڕی عەمری کوڕی زەید .

٢١ ـ ثەعلەبەی کوڕی عەمری کوڕی میحصەن .

٢٢ ـ سەهلی کوڕی عەتیکی کوڕی عەمر .

٢٣ ـ حاریثی کوڕی صوممەی کوڕی عەمر . ئیبن ئیسحاق وتوویە کە لە رەوحاء شوێنێکی شکاوە و پێغەمبەریش ﷺ بەشی بۆ دیاریی کردووە و ، بووە بە یەکێ لە بەدرییەکان .

٢٤ ـ ئوبەی کوڕی کەعبی کوڕی قەیس .

٢٥ ـ ئەنەسی کوڕی موعاذی کوڕی ئەنەس .

٢٦ ـ ئەوسی کوڕی ثابیتی کوڕی مونذیر .

٢٧ ـ ئوبەی کوڕی ثابیت برای حەسسانی کوڕی ثابیتی شاعیر .

٢٨ ـ زەیدی کوڕی سەهل ، ( ئەبوطەلحەی ئەنصاریی ) .

٢٩ ـ حاریثەی کوڕی سوراقەی کوڕی حاریث ـ شەهیدی بەدر .

٣٠ ـ عەمری کوڕی ثەعلەبەی کوڕی وەهب .

٣١ ـ سولەیطی کوڕی قەیسی کوڕی عەمری کوڕی عەتیك .

٣٢ ـ ئەبوزەید ، قەیسی کوڕی سەکەن .

٣٣ ـ ئەبوخاریجە ، عەمری کوڕی قەیسی کوڕی مالیك .

٣٤ ـ ثابیتی کوڕی خەنسائی کوڕی عەمر .

٣٥ ـ عامیری کوڕی ئومەییەی کوڕی زەید .

٣٦ ـ میحرەزی کوڕی عامیری کوڕی مالیك .

٣٧ ـ سوادی کوڕی غوزەییەی بەلەویی ، کە هاوپەیمانیان بوو.

٣٨ ـ حاریثی کوڕی ظالیمی کوڕی عەبس ( أبوالأعور ) .

٣٩ ـ سولەیمی کوڕی میلحانی کوڕی خالید .

٤٠ ـ حەرامی کوڕی میلحانی کوڕی خالید .

٤١ ـ قەیسی کوڕی ئەبو صەعصەعە .

٤٢ ـ عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی عەمری کوڕی عەوف .

٤٣ ـ عوصەیمەی ئەسەدیی ، کە هاوپەیمانیان بووە .

٤٤ ـ عومەیری کوڕی عامیری کوڕی مالیك .

٤٥ ـ سوراقەی کوڕی عەمری کوڕی عەطیە .

٤٦ ـ قەیسی کوڕی موخەللەدی کوڕی ثەعلەبە .

٤٧ ـ نوعمانی کوڕی عەبدعەمری کوڕی مەسعوود .

٤٨ ـ ضەححاكی كوڕی عەبدعەمری كوڕی مەسعوود .
٤٩ ـ سەلیمی كوڕی حاریثی كوڕی ثەعلەبە .
٥٠ ـ جابیری كوڕی سوهەیلی كوڕی عەبدولئەشهەل .
٥١ ـ سەعد ی كوڕی سوهەیلی كوڕی عەبدولئەشهەل .
٥٢ ـ كەعبی كوڕی زەیدی كوڕی قەیس .
٥٣ ـ بوجەیری كوڕی ئەبوبوجەیری غەطەفانیی ، كە هاوپەیمانیان بوو .

**تایبەتمەندی یەكانی ئەهلی بەدر :**

لە بەر گرنگیی غەزای بەدر ، ئەوانەی كە بەشداری یان تێ دا كرد ، بوونە خاوەنی پایە و پلەیەكی بەرز ، چونكە لە راستیی دا بەدر خالّی وەرچەرخان بوو تا بانگی ئیسلامیی و هێزی موسلّمانان بەرێتە ئاستێكەوە كە ئیتر جارێكی تر هێزی كوفر دەستی بەسەریان دا نەڕوات . بەم بۆنەوە ئەهلی بەدر بوونە خاوەنی پایە و پلەیەكی وەها بەرز لە دنیا و قیامەت دا كە هیچ كەسی تریان نەگاتێ . ئەمەش هەندێك لەو تایبەتمەندی یانەن :

**١ ـ گەیشتن بە بەهەشت :**

بوخاریی لە صەحیحەكەی دا ، لە حەمیدەوە ، ریوایەتی كردووە كە وتوویە : گوێم لە ئەنەسی كوڕی مالیك بوو خوا لێی رازیی بێ كە ئەیوت : لە رۆژی بەدردا حاریثە ،[٣٤٢] كە منداڵ بوو ، پێكرا ، واتە شەهید بوو . دایكی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەزانی كە حاریثە چەند خۆشەویست بوو بەلامەوە ، جا ئەگەر لە بەهەشت دا بێ ئەوا ئارام ئەگرم و ئەجر و پاداشت لە خوا داوا ئەكەم . خۆ ئەگەر ئەوەش نەبوو ئەبینیی چیی ئەكەم . فەرمووی : (( ویحك ، أو هبلت ـ أی ثكلت ـ أَوَ جنة واحدة هي ؟ إنها جنان كثيرة ، وإنه في جنة الفردوس )) . وفي رواية : (( إن إبنكَ أصاب الفردوس الأعلى )) .

فەرمووی : ماڵت ئاوابێ ، یان رۆڵەڕۆ بكەیت ، یانێ یەك بەهەشت بێت ؟ بەهەشتی زۆرن و ، كوڕەكەی تۆش گەیشتۆتە فیردەوسی ئەعلا .

حافیظ ئیبن كەثیر ئەڵێت : ئەمە وریاكردنەوەیەكی گەورەیە بۆ فەزڵ و پایەداریی ئەهلی بەدر ، چونكە ئەم كوڕە لە مەیدانی جەنگ دا نەبووە ، بەڵكو لە

---

[٣٤٢] حاریثە كوڕی سوراقە بووە لە نەوەی عەدیی نەوەی نەججاری ئەنصاریی . سوراقەی باوكی بۆتە هاوەڵ و لە رۆژی حونەین دا شەهید بووە . دایكیشی روبەیعی كچی نەضری مامەی ئەنەسی كوڕی مالیك بووە .

دوورەوە سەیری جەنگی کردووە و ، تیری وێڵ پێکاویە ، ئەویش لە کاتێکدا کە لە حەوزەکە ئاوی خواردۆتەوە . لەگەڵ ئەوەشدا بەم هەڵوێستەی فیردەوسی دەست کەوتووە ، کە ژوورووی بەهەشتەکانە و ، رووبارەکانی بەهەشت لەوێ هەڵئەقوڵن و ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی بەسەر ئومەتەکەیدا داوە کە ئەگەر لە خوا بۆ بەهەشت پاڕانەوە ، با داوای فیردەوس بکەن . جا ئەگەر کەسێکی وا ئەمە حاڵی بێ ، ئەی ئەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێ کە بەرامبەر بە دوژمن وەستابێ و ، دوژمنیش لە ژمارە و لە تفاقدا سێقات بێ ؟!

٢ ـ **چاوپۆشیی لە ناپاکیی ئەهلی بەدر :**

ئەهلی بەدر چیی ئەکەن با بیکەن ، چونکە خاوەنی نازن و خاوەنی خزمەتێکی وەها گەورەن ، کە بە هیچ گوناهێك ناشۆررێتەوە .

بوخاریی و موسلیم لە هەردوو صەحیحەکەیاندا چیرۆکی حاطبی کوڕی ئەبوبەلتەعە و نامەناردنی ، بۆ دانیشتوانی مەککەیان ، لە ساڵی فەتحدا ، ریوایەت کردووە ، کە تیایا هەواڵی ئەوەیان ئەداتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ نیازی گرتنی مەککەی هەیە و ، عومەریش لە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئیزن ئەکات تا لە ملی حاطب بدات ، چونکە ناپاکیی بەرامبەر بە خوا و پێغەمبەرەکەی کردووە . پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (( أليس من أهل بدر ؟ لعل الله اطلع إلى أهل بدر فقال : اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم )) . پێیفەرموو : ئەی حاطب ئەهلی بەدر نیە ؟ لەوانەیە خوای گەورە بە ئەهلی بەدری فەرموبێت : چیی ئەکەن بیکەن ، من لێتان خۆش بووم . ئەوەبوو هەردوو چاوی عومەر پڕلە فرمێسك بوون و فەرمووی : خوا و پێغەمبەرەکەی چاك ئەزانن .

٣ ـ **زۆر لە خوا ترسانی بەدرییەکان :**

بەدرییەکان لەگەڵ کردەوە و عیبادەتی زۆریاندا ، لە خوای گەورە یەکجار زۆر ئەترسان .

ئەوەتا ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ لە دەمیەوە بۆنی جگەری برژاو ئەهات ، بە بۆنەی ئەوەوە کە یەکجار زۆر لە خوای گەورە ئەترسا ..

هەروەها عومەریش خوا لێی رازیی بێ لەگەڵ ئەو هەموو دنیانەویستیی و عەدالەتەیدا ، لە ترساندا ئەیفەرموو : خۆزگە لە دایك نەبوومایە .

ئیمام عەلییش خوا لێی رازیی بێ کە شەو هەڵ ئەستا بۆ شەونوێژیی لە میحرابەکەیدا بە وێنەی دایکی جگەرسووتاو شیوەنی ئەکرد و ، بە وێنەی کەسێکی گەزراو ، لە ترسی خوادا ، پێچی ئەدایە خۆی .

٤ ـ بەدرییەکان چاك ترین بەشی موسڵمانانن :

موسلیم لە صەحیحەکەیدا و ، بە سەنەدی خۆی ، لە جابیرەوە ریوایەتی کردووە کە : بەندەیەکی حاطەب دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و شکاتی حاطەب ئەکات و ئەڵێت : حاطەب ئەچێتە ناو ئاگرەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( كذبت لا يدخلها ، إنه شهد بدراً والحديبيــة )) . فەرمووی : درۆت کرت ، ناچێتە ناو ئاگرەوە ، چونکە ئامادەی جەنگی بەدر و رێکەوتن‌نامەی حودەیبیە بووە .

بوخارییش لە صەحیحەکەیدا ریوایەتی کردووە کە : جیبریل دێتە خوارەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەفەرموێ : ئەهلی بەدر لە ناوتاندا چۆن لە قەڵەم ئەدەن ؟ فەرمووی : (( من أفضل المسلمين )) فەرمووی : لە چاكترینی موسڵمانانن ، یان وشەیەك لەو جۆرە . جیبریل فەرمووی : هەروەها ئەو مەلائیکەتانەیش کە ئامادەی بەدر بوون . ( البداية والنهاية : ٣ / ٣٢٨ ) .

جا خەلیفە راشیدەکان قەدری ئەهلی بەدریان لەبەر چاو بوو و، ئەیان‌زانیی کە ئەمانە چینێکی خاوەن رێزی تایبەتن لەناو موسڵمانانا ، لەبەر ئەوە خەلیفە عومەر پێنج هەزار دیرهەم مووچەی بۆ هەریەکە لەو بەدرییانە بڕیی بوویەوە و ، ئەشیفەرموو : فەزڵی ئەوان بەسەر موسڵمانانی دواتردا ئەدەم .

هەروەها زانایانیش پایە و پلەی ئەهلی بەدریان لەبەر چاو بوو ، بۆیە هەندێکیان ئەوانیان بە چینی یەکەمی موسڵمانان هەژمارە کردووە .

٥ ـ نەسپاردنی کاروبار بە ئەهلی بەدر :

ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ زۆر چاك لە پایەداریی ئەهلی بەدر ئاگادار بوو ، بۆیە نەیئەویست ئەوان لە هەڵسووڕاندنی کاروباردا بەشدار بن ، تا دینی پاکیان بە تێکەڵیی دنیا لەکەدار نەبێ .

ئەبونوعەیم لە ( حُلية ) دا و ئیبن عەساکیر لە ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی ئەنصارییەوە تەخریجیان کردووە کە بە ئەبوبەکری صددیقیان خوا لێی رازیی بێ وت : ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ! ئایا کاروبار بە دەستی ئەهلی بەدر

ناسپێری ؟ فەرمووی : من پایە و پلەی ئەوانم لەبەر چاوە ، بەڵام پێم خۆش نیە ئەوان بە تێکەڵیی دنیا چەپەڵ بکەم .

ئیبن سەعدیش (٣ / ٦٠) لە عیمرانی کوڕی عەبدوڵلاوە تەخریجی کردووە کە وتوویە : ثوبەی کوڕی کەعب بە عومەری کوڕی خەططابی وت : ئەوە چیتە کاروبار بە دەستی من ناسپێری ؟ ئەویش فەرمووی : پێم خۆش نیە دینەکەت چەپەڵ بکەم .

**٦ ـ دەست هەڵ گرتن لە هەواو ئارەزووی دەروون :**

هاوەڵان بە گشتیی و ئەهلی بەدر بە تایبەتیی بە شێوەیەکی بێوێنە گوێڕایەڵی فەرمان بوون و ، لەو پێناوەش‌دا ئامادە بوون دەست لە هەموو ویست و ئارەزوویەکی دڵ و دەروونیان هەڵ بگرن ، بەو هیوایەی گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و پێغەمبەر بن ، تا لە ئەنجام‌دا بە سەری بەرزەوە بگەڕێنەوە بارەگای خوا .. بۆیە ئەهلی بەدر بە نییەت و عەزمێکی تەواوەوە چوونە ئەو جەنگەوە تا ببێتە مایەی سەربەرزیی بۆ دینی خوا و ، لەم پێناوەش‌دا هەموو بەرژەوەندی‌یەکیان خستە ئەو لاوە ، بە رادەیەك کە خزم و کەس‌وکاریان بە لاوە هیچ بوو لە چاو دین و ئیمان‌دا ..

بۆ نموونە ، وەك لە پێشەوە باس کرا ، ئەبوعوبەیدە باوکی خۆی کوشت و ، عومەر خاڵۆی خۆی ( ئامۆزای دایکی ) کوشت و ئەبوبەکریش لە خوای ئەویست تووشی عەبدورڕەحمانی کوڕی ببێت هەتا درێغیی لە کوشتنی لە پێناوی خوادا نەکات ..

بەیهەقییش (٩ ـ ٢٧) لە مالیکی کوڕی عومەیرەوە خوا لێی رازیی بێ ، کە سەردەمی نەفامییشی دیی بوو ، تەخریجی کردووە کە وتوویە : پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی : چوومە جەنگی دوژمنەوە و ، تووشی باوکیشم بووم و ، وتەیەکی ناشیرینم دەربارەی تۆ لە دەمی بیست و ، ئارامم نەگرت ، تا ئەوەبوو رمێکم لێ دا ـ یان ئەوەبوو کوشتم ـ پێغەمبەر ﷺ بێ‌دەنگ بوو . پاشان پیاوێکی تر هات و وتی : تووشی باوکم بووم و وازم لێ هێنا و ، پێم خۆش بوو یەکێکی تر دەستی لێ بووەشێنێ . بۆ ئەویش هەر بێ‌دەنگ بوو .

هەتا گەنجی وایان تیا بوو ئامادە بوو خۆی بە دەستی خۆی باوکی لەسەر نیفاق بکوژێ ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی بدات :

بەززار لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیدا ، کە لە سێبەری بینایەکی بەرزدا دانیشتبوو ، تێپەڕی کرد . جا عەبدوڵڵا وتی : کوڕی ئەبوکەبشە تۆزی بۆ کردین . عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەو خوایەی کە ڕێزی لێ ناوی ئەگەر بتەوێ سەری دێنم بۆت . فەرمووی : (( لا ، ولكن بِرَّ أباكَ وأحسن صُحبَتَهُ ! )) . فەرمووی : نەخێر .. دڵی باوکت رازیی بکە و بە چاکیی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکە .

طەبەرانییش لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵاوە گێڕاویەتیەوە کە داوای ئیزن لە پێغەمبەر ﷺ ئەکات تا باوکی بکوژێت ، ئەویش ئەفەرموێ : (( لا تقتل أباك )). فەرمووی : باوکت نەکوژیت .

هاوەڵان بە هیچ شێوەیەك خۆیان لە بیر نەمابوو ، بەڵکو هەموو حەزێکیان بریتیی بوو لە گوێڕایەڵیی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ .

ئیبن عەساکیر لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبولەیلاوە تەخریجی کردووە کە ڕۆژێکیان عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە خوا لێی رازیی بێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کە وتاری ئەدا و ، گوێی لێ بوو کە ئەیفەرموو : (( إجلسوا ! )) . ئەویش لە شوێنی خۆیدا ، لە دەرەوەی مزگەوتدا دانیشت هەتا پێغەمبەر ﷺ لە وتارەکەی بوویەوە . ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ و ، ئەویش پێی فەرموو : (( زادكَ اللهُ حِرصاً على طواعيةِ اللهِ وَ طواعيةِ رسولِه )) . فەرمووی : لەسەر گوێ ڕایەڵیی خوا و گوێ ڕایەڵیی پێغەمبەرەکەی ، خوای گەورە زیاتر سوورت بکات .

هەروەها ئیبن شەیبە لە عەطائەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : پێغەمبەر ﷺ وتاری ئەدا و بە خەڵکەکەی فەرموو : (( إجلسوا )) عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودیش خوا لێی رازیی بێ ، کە لە دەرگاکەدا بوو گوێی لێ بوو خێرا دانیشت ، پێی فەرموو : (( يا عبدالله أدخل )) فەرمووی : عەبدوڵڵا وەرە ژوورەوە . لە ڕیوایەتەکەی جابیردا خوا لێی رازیی بێ وەها هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ چاوی پێ ئەکەوێ و ئەفەرموێ : (( تعال يا عبدالله بن مسعودٍ ! )) .

هەروەها ئەبونوعەیم لە کینانییەوە تەخریجی کردووە ، کە نێرراوی خەلیفە عومەر بووە بۆ لای هیرەقل و ، ناویشی جەثثامەی کوڕی موساحیقی کوڕی ڕەبیعی کوڕی قەیسی کینانیی بووە ، کە وتوویە : دانیشتم و نەمزانیی چ شتێك

لە ژێرمایە . تومەز کورسی‌یەکی لە ئاڵتوون دروست کراو لە ژێرمایە ! کاتێك کە پێم زانیی لەسەری دابەزییم و ئەویش دەستی بە پێکەنین کرد و لێمی پرسیی : لەسەر ئەو کورسی‌یەی کە ئێمە رێزی تۆمان پێی ئەگرت بۆچ دابەزیت ؟ وتم : گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دوورە پەرێزیی لە جۆری ئەمە ئەکرد .

نموونەیەکی تری گوێڕایەڵیی موحەممەدی کوڕی ئەسلەم ە . موحەممەدی کوڕی ئەسلەم لە نەوەی حاریثی کوڕی خەزرەج بووە ، خوا لێی رازیی بێ و ، پیاوێکی یەکجار پیریش بووە ، خۆی باسی خۆی گێڕاوەتەوە . باسی ئەوەی کردووە کە دائەبەزی‌یە مەدینە و لە بازاڕدا پێویستیی خۆی جێ بەجێ ئەکرد و ، پاشان ئەگەڕایەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی ( کە لە دەوروبەری مەدینەدا بوون ) . کە عەباکەی دائەنا ئەهاتەوە یادی کە لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژی ( سوننەتی ) بەجێ نەهێناوە و ئەی‌وت : بەخوا ! دوو رەکعەت نوێژم لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا دا ﷺ بەجێ نەهێنا و ، ئەویش پێمانی فەرمووە : (( مَن هَبَطَ منكم هذه القرية فلا يَرجعَنَّ إلى أهله حتى يركعَ في هذا المسجد ركعتين )) . ئەی‌فەرموو : هەرکەسێکتان هاتە ئەم شارەوە با بەر لەوەی بگەڕێتەوە ناو کەس و کاری لەم مزگەوتەدا دوو رەکعەت نوێژ بەجێ بهێنێ . ئیتر عەباکەی هەڵ ئەگرت و ئەگەڕایەوە بۆ شار هەتا لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دوو رەکعەت نوێژی بە جێ ئەهێنا !

نموونەیەکیش لە گوێڕایەڵیی ئافرەتان ئەخەینە بەر چاو ئازیزانمان :

سەعیدی کوڕی مەنصور و ئیبن نەججار لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجیان کردووە کە وتوویە : کچێکی ئەنصارم خوازبێنیی کرد و ، بۆ پێغەمبەریشم ﷺ باس کرد . ئەویش پێمی فەرموو : (( رأيتَها ؟ )) . فەرمووی : بینیوتە ؟ وتم : نەخێر . فەرمووی : (( فانظر إليها فإنه أحرى أن يُؤدَمَ بينكما )) . فەرمووی : سەیری بکە ، چونکە ئەوە ئەبێتە مایەی هۆگرییتان . منیش چووم بۆ لای و ، ئەوەم بە باوك و دایکی باس کرد و ، ئەوانیش هەریەکەیان سەیری ئەوی تری کرد . منیش هەستام و لە ماڵەکە هاتمە دەرەوە .. کچەکە وتی : ئەو پیاوەم بۆ بانگ بکەنەوە ! ئەوەبوو لە پشتی پەردەکەیەوە وەستا و وتی : ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دابی بە سەیرکردنم ئەوا سەیرم بکە ، ئەگینا

ماوەت نادەم سەیرم بکەی . ئیتر سەیرم کرد و مارەم کرد . هەرگیز هیچ ئافرەتێکی ترم مارە نەکردووە کە بە لامەوە لەو خۆشەویست تر و بەرێزتر بێت ...

هەر لەبەر ئەم پایە بەرزی‌یە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەی‌ئەهێشت هیچ کەسێك ئازاری ئەهلی بەدر بدات :

طبەرانیی لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبوئەوفاوە خوا لێی رازیی بێ تەخریجی کردووە کە وتوویە : عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف شکاتی خالیدی کوڕی وەلیدی خوا لێی رازیی بێ بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ کرد و ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : (( یا خالِدُ ! لا تؤذ رجُلاً من أهلِ بدرٍ ، فلو أنفقتَ مثلَ أُحُد ذَهَباً لَم تُدرِكْ عَمَلَهُ )) . فەرمووی : خالید ! ئازاری پیاوێك مەدە کە ئەهلی بەدرە . خۆ ئەگەر ئەوەندەی کێوی ئوحود ئاڵتوون ببەخشیت ناگەی بە کردەوەی ئەودا . خالیدیش وەڵامی دایەوە : ئەوان قسە بە من ئەڵێن و منیش وەڵامیان ئەدەمەوە . فەرمووی : (( لا تؤذوا خالداً فإنَّهُ سيفٌ من سيوف الله صَبَّهُ اللهُ على الكفار )) . فەرمووی : ئازاری خالید مەدەن ، چونکە ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا و ، خوا بەسەر کافران دا زاڵی کردووە .

**ئەنجامەکانی غەزای بەدر :**

غەزای بەدر مایەی خێر و بەرەکەت بوو بۆ موسڵمانان و ، ئەمەش هەندێ لە ئەنجامەکانی :

١ ـ موسڵمانەکان بوونە خاوەنی هێز و ورەیەکی یەکجار زۆر و ، خەڵکی مەدینە و دەوروبەریان سەنگی تایبەتی‌یان بۆیان دائەنا و ، هەر کەسێ لەوەوبەر نیازی داگیرکردنی مەدینەی بکردایە ، دوای بەدر لەو نیازەی پاشگەز بوویەوە و وازی هێنا..

٢ ـ ئێش و ئازار و خەم و خەفەتێکی زۆرزۆری بە دڵی بت پەرستەکانی مەککە گەیاند ، بە بۆنەی کوژران و بە دیل گیران و زامداربوونی پیاوانیان و ، لە دەست‌دانی ماڵ و سامانیان . هەتا ئەبولەهەب دوای بەدر زۆری پێ‌نەچوو تووشی دەردێکی پیس هات و پێی مرد . ئەبوسوفیانیش کوڕێکی کوژرا و کوڕێکیشی بە دیل گیرا .. یەك بە یەکی ماڵەکانی مەککە شیوەنی تێدا بوو . ئەبوسوفیانیش سوێندی ئەخوارد کە هەتا تۆڵەی بەدر نەکاتەوە ئاوی لەش گرانیی دەرکردن

لەسەری نەکەویٚ ، تا ئەوەبوو هێرشێکی کردە سەر مەدینە وەك لە باسی غـــەزای ( سەویق ـ قاوت ) دا بە درێژە باس ئەکرێت ..

٣ ـ ئەم سەرکەوتنەی بەدر جوولەکـە و مونـافیق و موشـریکەکانی مەدینـەی داچڵەکاند و کەوتنە بیری ئەوەی کە : ئەو پیاوەی کە کۆچی کرد و لە ناو کـەس و کاری خۆیدا هەڵات و ، خۆی گەیاندە ئەم شارە ، رۆژ بە رۆژ هێز و دەسەڵاتی لـە زیادبووندایە و ، خەریکە ببێتە سەرداری هەموو ناوچەکە . جوولەکـەش زۆر داخ لە دڵی سەرکەوتنی بەدر بوون و ، وەهایان بە گـوێی موسـڵماناندا ئـەدا کـە بـا شانازیی نەکەن ، چونکە ئەوان لەگەڵ کۆمەڵێکدا جەنگیان کردووە ئەوانە پیـاوی جەنگ نەبوون ، خۆ ئەگەر لەگەڵ جوولەکەدا بجەنگن چاك ئەزانن چۆن پیاوێکن .. ئیتر لەو رۆژەوە جوولەکە دەستیان دایە شەڕفرۆشتن بـە موسـڵمانان و ، ئـەمانیش دانیان بە خۆیاندا ئەگرت هەتا لە وزەیاندا نەما و ناچار بوون ناوچەکەیان لێ پاك بکەنەوە ، وەك لە دواوە دێت ، إن شاء الله .

**پەندەکانی بەدر :**

غەزای بەدر پەند و ئامۆژگاریی‌یەکی زۆری تیٚدا بەدیی ئەکریٚ ، کـە ئەمانـەی خوارەوە هەندێکیانن :

**١ ـ کاریگەریی هێزە مەعنەویی و رۆحیی‌یەکان :**

ئیمانهێنان بە خوا و ، پشتبەستن بە هێز و دەسەڵاتی ئەو و ، هەسـت کـردن کە سەرکەوتن و مان و مردن بە دەستی ئەوە و ، ئیمانهێنانیش بـە پێغەمبـەری ئازیز ﷺ ، کە هیچی بە هەوا و ئارەزووی خۆی نەفەرمووە و ، خـۆشویستنیشـی ئیمانە و ، خۆ بە قوربان کردنی فەرزە و ، هەر ئەو سـەلامەت بـیٚ ئـیتر هـەموو لیٚقەومانێك ئاسانە و ، ئیمانهێنانیش بە رۆژی قیامـەت ، ئـەم ئیمانـە مایـەی سەرکەوتنی موسڵمانان بوو لە بەدر و لە غەیری بەدریشدا .. هەر ئەم ئیمانە بوو کە یەك بە یەکی جەنگاوەرانی ئیسلامی ئەکردە شێری بێشـە ، بـە رادەیـەك کـە ئەگەر کەس وکار و خۆیشیان بکوژن لە پێناویا کارێکی زۆر ئاسایی بوو ..

**٢ ـ سەرکەوتن لەلایەن خوای گەورەوەیە :**

پێویستە ئیمانداران لە دڵیانا ئەوە جێی ببێتـەوە کـە سـەرکەوتن بـە دەسـتی خوایە و ، مەگەر تەنها خوا خۆی بزانیٚ سەربازەکانی خوا چەند زۆرن :

﴿ وَمَا يَعلَمُ جُنُودُ رَبِّكَ إِلاَّ هُوَ ﴾ . ئیتر موسڵمانان کارکردنیان لەسەرە .. پێویستە بە پێی توانا هەوڵی خۆیان بدەن و ، لەوەولا کار بە خوا بسپێرن و ، چاوەڕوانیی کۆمەکیی ئەو بن ، تا دینەکەی سەر بخات .

جا هاوەڵان زۆر بە چاکیی ئەمەیان ئەزانی : بە هەموو شێوەیەك هەوڵی دەست خستنی هێز و توانایان ئەدا و ، پاشان کاریان ئەدایە دەست خوا و ، بە نزا و پاڕانەوە و پشت بە خوا بەستنەوە ئەچوونە مەیدان . بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هانای ئەبردە بەر دەرگانەی خوای گەورە و زۆر ئەپاڕایەوە تا خوای گەورە چاوی رەحم و سۆزیان لێ کلا نەکات . لەگەڵ ئەوەش‌دا کە موسڵمانەکان ئەوە لە دڵیانا جێگیر بوو بوو کە تەقوا و شەرمی خوا سەرکەوتنی خوا نزیك ئەخەنەوە و ، گوناه و تاوانیش سۆز و بەزەیی خوا دوور ئەخەنەوە ..

٣ ـ راوێژ کردن :

پێغەمبەری ئازیز ﷺ راوێژی بەلاوە زۆر گرنگ بوو ، بۆیە هەمیشە راوێژی بە هاوەڵانی ئەکرد ، وەك لە پێشەوە بە درێژە باس کرا ..

٤ ـ دەروونپاکیی و رەوشتبەرزیی پێغەمبەری خوا ﷺ :

کە سەرنجی رەفتارە بەرزەکانی ئەدەین ، بۆمان دەرئەکەوێ کە هەڵبژێرراوی تاقانەی هەموو مرۆڤە بە درێژایی تەمەنی مرۆڤ . چونکە خاوەنی سۆز و بەزەیی و چاوپۆشی‌یەکی بێ‌وێنە بوو . فەرمانی دا کوژراوانی قورەیش لەو دەرودەشتەدا بەجێ نەهێڵرێن بەڵکو لاشەکانیان بشارێنەوە و ، فەرمانیشی دا لەگەڵ دیلەکان‌دا بە چاکە بجووڵێنەوە .

٥ ـ وریایی و بلیمەتیی پێغەمبەر ﷺ :

پێغەمبەری خوا ﷺ خاوەنی دڵێکی پڕ لە ئیمان بوو ، کە لە نوور و رۆشنایی و بەرەکەتی خوایی پڕ بووبوو ، هەروەها خاوەنی عەقڵێکی وەها گەورە بوو کە بە درێژایی تەمەنی لە بیرکردنەوە و وردبوونەوەدا بوو و ، سەرنجی گەردوونی ئەدا ، سەرەڕای چاودێریی خوای گەورە بۆی ، تا ئەوەبوو بووە خاوەنی عەقڵێك کە لە هەموو عەقڵەکان سەنگین‌تر بێت .

ئەوەبوو کە بۆی دەرکەوت قورەیش ئامادەی جەنگە و کۆڵ نادات ، راوێژی بە هاوەڵانی کرد ، تا بزانێ پلەی ئامادە باشی‌یان بۆ ئەو هەڵوێستە پڕ مەترسی‌یە چەندە ، تا ئەوەبوو ئەوانیش ، خوا لێ‌یان رازیی بێ ، بە موهاجیر و ئەنصارەوە

ئامادەیی خۆیان بە جوان ترین شێوە دەربڕیی ، تا دڵی موبارەکی لەوە بێخەم بێ، کە هاوەڵانی وەك بەنی ئیسرائیلی‌یەکان ترسنۆك نابن و خۆیان لە مەیدانی جەنگ نادزنەوە .

هەروەها کە هەردوو سوپا بەرامبەر بە یەك وەستان و ویستیان زۆران بازیی بکەن سێ قورەیشیی خزمی زۆر نزیکی خۆی ، دوانیان لە نەوەی هاشم و یەکێکیشیان لە نەوەی موطەللیب ، هەڵ بژاردن و ناردنیە مەیدانی ئەو سێ قورەیشی‌یەی کە داوای زۆران‌بازی‌یان ئەکرد .. تا هەموو کەس بزانێ کە خزمە تەواو نزیکەکانی لە پێشی پێشەوەی جەنگ‌دا ئەبن و چ هەڵوێستێك پڕ مەترسیی بێت ئەوانی بۆ ئەنێرێت .

هەر کە دیلەکانیش قۆڵ بەست ئەکرێن هەریەکە لە جووتە وەزیرەکەی ، ئەبوبەکر و عومەر خوا لێ‌یان رازیی بێ ، رایەکی جیاواز دەربارەی دیلەکان دەرئەبڕن و پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان ئەو دوو رایەدا سەرسام ئەبێت . ئەبوبەکر حەزی لە چاوپۆشیی و نەرم و نیانی‌یە و ، عومەریش حەزی لە کوشتنیانە . دوایی کە هاتە دەرەوە ، چونکە سۆز و بەزەیی یەکجار زۆر بوو ، راکەی ئەبوبەکری وەرگرت . تا ئەوەبوو ستایشی هەردووکیانی کرد و هەریەکە لەو جووتە وەزیرەی خۆی شوبهاند بە دوو پێغەمبەری مەزن سەلامیان لێ بێ . ئەبوبەکری شوبهاند بە دوو پێغەمبەری خاوەن سۆز و شەفەقەت : ئیبراهیم و عیسا سەلامیان لێ بێ و ، عومەریشی شوبهاند بە دوانی تر کە یەکجار لە کۆمەڵەکەیان تووڕە بوون ، ئەویش دوای تەواوبوونی صەبر و ئارامیان ، کە ئەوانیش نووح و مووسا بوون سەلامیان لێ بێ . سەرەنجام رای ئەبوبەکری وەرگرت و ، عومەریش ئەوەندەی بەسە کە بە دوو پێغەمبەری ( أولوالعزم ) ی شوبهاندووە .

٦ ـ دادپەروەریی لە وەرگرتنی فیدیە لە دیلەکان :

ئەوانەی بە دیل گیران دوور و نزیکی‌یان لەگەڵ‌دا بە کار نەهات .. نەیان کرد خزمەکان ببەخشن و لە دوورینەکان فیدیە وەربگرن ، بەڵکو فیدیەی زیاتری لەسەر عەبباسی مامەی دانا و ، نەی‌هێشت خاڵوانی عەبباس ، لە نەوەی نەججار لە مافی خۆیان دابەزن . بۆ گێڕانەوەی ملوانکەکەی خەدیجە ، کە بە زەینەبی بەخشیی بوو و ، ئەویش بۆ فیدیەی ئەبولعاصی مێردی ناردبووی ، پرسی بە موسڵمانەکان کرد تا ئەوان رای لەسەر بدەن ، چونکە خەدیجە یەکەم کەس بوو

ئیمانی هێنا و ، یەکەم کەسیش بوو بە سەر و ماڵ خزمەتی ئیسلام بکات . هەندێکیش هەبوون کە شایستەی ئەوەبوون فیدیەکەیان لەسەر لا ببرێ ، هەر چەند خزم و کەسیش نەبوون ، هەروا بەبێ بەرامبەر ئازاد کران !

**٧ ـ ئیجتیهاد کردنی پێغەمبەر ﷺ :**

هەر شتێك لە بارەیەوە وەحی نەهاتبوو ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی هەیە ئیجتیهادی تێدا بکات . جا ئەگەر لە کارێکدا ئیجتهادی کرد و وەحی نەهاتە خوارەوە بۆ راستکردنەوەی ئەوە دیارە ئەو کارە راستە و ، خوای گەورە پێی رازییە ، چونکە خوای گەورە تەنها راستی ئەوێ و ، رێ نادا پێغەمبەرەکەی لە راستیی لا بدات ، بۆیە ئەگەر کارێکی ئەنجام دا و رازیی نەبوو ، ئەوا وەحی دێت و ئەو هەڵەیە راست ئەکاتەوە ، وەك دەربارەی دیلەکان وەحی هات .

**٨ ـ روودانی هەندێ موعجیزە :**

لە غەزای بەدردا چەند موعجیزەیەك روویان دا وەك شکانی شمشێرەکەی عوکاشە ، کە ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لقە دارخورمایەکی دایە و بوو بە شمشێر و کوشتاری پێ کرد . هەروەها شکانی شمشێرەکەی سەلەمەی کوڕی حەریش ، کە ئەوەبوو لقە دارخورمایەکی بەویش دا و بووە شمشێر و کوشتاری پێ کرد .

هەروەها هەواڵ دانی پێغەمبەر ﷺ بە عەبباسی مامەی کە پارەی هەیە وەك لە پێشەوە باس کرا .

شایانی باسە کە ئیمام عەلیی خاتوو فاطیمەی مارە کرد خوا لێیان رازیی بێ، ئەمەش دوای بەدر بە ماوەیەکی کەم . هەروەها لەم ساڵەدا سەرەڕای شەهیدەکان، موسڵمانی دێرین و هاوشیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، عوثمانی کوڕی مەظعوون خوا لێی رازیی بێ کۆچی دوایی کرد ..

کاتێ کە کۆچی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بردە ژوورەوە لای و ماچی کرد و ئەوەندە بۆی گریا هەتا فرمێسك بەسەر روومەتیا هاتنە خوارەوە. پاشان لەگەڵ هاوەڵانی جەنازەکەیان رەوانەی قەبرستان کرد . کە ناشتیان فەرمانی بە پیاوێکدا دا تا بەردێکی بۆ بهێنێ ، کەچیی لەبەرگەورەیی بەردەکە کابرا نەی توانی بیهێنێ . خۆی تەشریفی هەستا و هێنای و لەلای سەری عوثمانەوە دای نا و فەرمووی : (( أُعلم به قبر أخي ، وأدفن إليه من مات من أهلي )) . فەرمووی : تا

بەم بەردە قەبری براکەم بزانم و ، هەر کەسێکیشم مرد لە تەنیشتیا ئەی‌نێژم . بەم بۆنەوە کێلی قەبر ڕێی پێ دراوە .

کاتێك کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد ، فەرمووی : (( إِلْحَقْ بسلفنا الصالح عثمان بن مظعون )) . فەرمووی : بچۆرە پاڵ پیاوچاکی پێشینەمان ، عوثمانی کوڕی مەظعوون ، خوا لێی ڕازیی بێ .

**هۆ رواڵەتی یەکانی سەرکەوتن لە بەدردا :**

وەك لە پێشەوە بۆمان دەرکەوت هێزی موسڵمانان لە چاو هێزی قوڕەیش‌دا کەم بوو و ، ئەو جەنگە لە نێوان دوو سوپای هاوسەنگ‌دا رووی نەدا .

سوپای هەزار نەفەریی قوڕەیش قۆڵیان بۆ جەنگ هەڵ ماڵیی بوو ، بەڵام سوپا سێ‌صەد نەفەری‌یەکەی هاوەڵان کە لە مەدینە دەرچوون بە تەمای جەنگ نەبوون ، کەچیی قوڕەیش تێك شکا و موسڵمانەکانیش سەرکەوتن ، کە ئەمەش هەندێ لە هۆیەکانە ، ئەوەش دیارە دوای هۆی پشت‌گیریی و کۆمەکیی خوای گەورە :

**یەکەم : پشت ساردبوونەوەی سوپای مەککە :**

بەڵێ ، سوپای مەککە سوپایەکی بەدەسەڵات بوو و ، بە حیلەی ئەسپ و دەنگی تەپڵ و گرمەی پاڵەوانان ئەو بیابانەی هێنابووە لەرزە و ، بە شەوق و حەماسەتێکەوە لە مەککە دەرچوو و ، بە نیازی بەرگریی لەو کاروانەوە کەوتە رێ ، کە ئەگەر موحەممەد و هاوەڵانی دەستی بەسەردا بگرن ئابرووی قوڕەیش ئەچێت ، بەڵام کە سوپا بیستی وا کاروانەکە رزگاری بووە و ،کە دیتیشی وا هەندێ لە گەورە پیاوانی سوپا نارەزایی لە هەڵگیرسانی جەنگی بێ‌مەبەست دەرئەبڕن و ، هەندێکیش بە خۆیان و هاوپەیمانانیانەوە بەرەو مەککە گەڕانەوە ، پشتی لە جەنگ‌کردن سارد بوویەوە . ئەمەش لە زانستی جەنگ‌دا گەورەترین هۆیە بۆ تێك شکانی سوپا .

**دووهەم : دەست درێژیی :**

لە هەموو کات و شوێنێك‌دا جەنگ و ئاژاوە شتێکی ناشیرین و قیزەون بووە بەلای خەڵکەوە و ، ژیر و دڵسۆزان هەمیشە خۆیان لە جەنگ لاداوە ، چونکە بە لایانەوە یەقین بووە کە هەر کەسێ ئاگری جەنگی هەڵگیرساندبێ خۆی تیاچووە . لە بەدریش‌دا یەکەم ئاوات‌خوازی جەنگ ئەبوجەهل بوو ، ئەوەبوو بە سووکیی سەری نایەوە .

لە سەرەتاوە دانیشتوانی مەککە بۆ رزگارکردنی هەزار وشتر و بارەکەیان کەوتنە رێ و ، لە دڵی هەموویاندا ئەوە چەسپا بوو کە مافی خۆیانە جەنگ بکەن ، چونکە بەرگریی لە غیرەت و کەرامەت و ماڵ و سامانیان ئەکەن و ، ئەمەش مافی خۆیانە . بەڵام کە سوپا گەیشتە رابوغ ، ئەو شوێنەی کە (١٢٥) کیلۆمەتر لە بەدرەوە دوورە ، هەواڵی دەربازبوونی کاروانەکەی پێ گەیشت . ئیتر پیاوە ژیرەکان هەستیان کرد کە جەنگ کارێکی پێویست نیە و ، وا چاکە بگەڕێنەوە ، بەڵام ئەبوجەهل بەوپەڕی لە خۆبایی بوونەوە کۆڵی نەدا ، هەتا بەسەر شۆڕیی سەری نایەوە .

**سێهەم : بیر وباوەڕ :**

بیروباوەڕ گرنگترین هۆیە بۆ سەرکەوتن ، بۆیە موسڵمانان ، کە وابەستەی بیروباوەڕی خوایی بوون ، سەرەڕای کەمیی و کەم تفاقیيان ، سەرکەوتنیان بەدەست هێنا ، چونکە هەر سەربازێك بۆ خۆی سەربەخۆ چاوەڕوانی یەکێ لە دوو شتە چاکەکە بوو : یان سەرکەوتن ، یان شەهید بوون و گەیشتن بە بەهەشت . دیارە هەر سوپایەك لە سەربازی ئاوەها پێك بێ ، هیچ هێزێك چاری ناکات . بەڵام سوپای قوڕەیش داماو و سەرگەردان بوون و خۆیشیان نەیان ئەزانی خەریکی چین ؟

**چوارەم : شێوازی تازەی جەنگ کردن :**

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جەنگی بەدر شێوازێکی نوێی بەکار هێنا کە تا ئەو رۆژە عەرەبەکان بەو شێوازە پەیبیان پێ نەبردبوو و ، کە موسڵمانەکان چوونە مەیدانی قوڕەیشەوە ، کارێکی ناوازە بوو بەلایانەوە. ئەمەش کورتەیەتی :

أ ـ **سەرکردایەتیی** : لە مێژووی مرۆڤدا سەرکردەیەکی تر بە وێنەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵ نەکەوتووە کە ئەوەندە نەخشە رەنگین بێ و ، سەربازەکانیشی ئەوەندەیان خۆش بوێ و ، بەو شێوە ناوازەش گوێڕایەڵی هەموو فەرمانێکی بن ، بۆیە سوپای هاوەڵان بە گەورەترین و پاکترین سوپای مێژووی مرۆڤ ئەژمێررێ و ، گەورەترین و پیرۆزترین خزمەتیشی بە تێکڕای مرۆڤ پێشکەش کردووە .

پێغەمبەری خوا ﷺ تەواو دامەزراو بوو و ، رێزی تەواویشی لە هاوەڵانی ئەگرت و ، بنکەیەکیشی بۆ سەرکردایەتیی دروست کرد ، تا بە جوانیی چاوی لە مەیدانی جەنگ بێت و ، ورەی موسڵمانەکانیش بەرز بێت و ، لە پیاوە

پاڵەوانەکانی مەدینەش پاسەوانی بۆ دانا ، کە سەعدی کوڕی موعاذی سەرداری ئەوس بوو .

بەڵام سوپای مەککە فەرماندەیەکی وەهای نەبوو تا گوێڕایەڵیی بۆ بکەن ، بۆیە کوێرانە شوێن ئەبوجەهل ئەکەون و ، هەر ئەو جارە فەرماندەیان ئەبێت و خێرا موسڵمانان بە دۆزەخی ئەگەیەنن .

ب ـ ڕێکخستنی سوپا : پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاکەی زۆر بە جوانیی ڕێک خست ، بە شێوەی ڕێکخستنی نوێی جەنگی بیابان . ئەوەبوو پێشەکیی و پاشکۆی بۆ سوپاکەی دانا و بەشی زۆریشی لە ناوەڕاست دا بوو . لە لایەکی ترەوە بە شێوازی (ریز) فەرمانی جەنگی بۆ موسڵمانەکان دا ..[٣٤٣]

[٣٤٣] غزة بدر الكبرى لمحمد أحمد باشميل : ١٨٨ ـ ٢٧٣ ، السيرة النبوة لأبـي شهبة : ٢ / ١٢٣ ـ ١٨١ ، الرحيق المختوم : ٢٠٧ ـ ٢٣٤ ، السيرة النبوة للندوي : ٢١٤ ، ٢١٦ ، شرح حياة الصحابة : ٢ / ٦٠ ـ ٦٤ ، ٨٠ ، ٤٦٢ ـ ٤٦٩ ، ٥٣٢ ، ٥٤٦ ، ٥٦٦ ـ ٥٦٧ .

## بەشی بیست وچوارەم
# ڕووداوەکانی نێوان بەدر و ئوحود

بەڵێ ، وەك لەپێشەوە خستمانە پێش چاوی ئازیزان ، جەنگی بەدری گەورە یەکەم بەیەك گەیشتنی چەکدارانەی نێوان موسڵمانان و موشریکان بوو .. بەم جەنگە یەکجار سەری موسڵمانەکان بەرز بوویەوە ، کە دانیشتوانی سەرتاسەری دوورگەی عەرەبیی شاهێدی‌یان بۆ دا .. جا ئەوانەی کە ئەم سەرکەوتنەیان پێ ناخۆش بوو چەند دەستەیەك بوون :

**یەکەم :** بتپەرستەکانی قوڕەیش کە جەنگەکە ئابڕووی ئەوانی برد و ، لە ناو عەرەبدا سووك و رسوا بوون ..

**دووهەم :** جوولەکەکانی دوورگە ، بە تایبەت جوولەکەکانی مەدینە ، کە هەستیان ئەکرد تا موسڵمانەکان زیاتر بەهێز بن ، ئەوان پایە و پلەی دینی‌یان نامێنێ و ، ئابووریشیان کز و لاواز ئەبێت ..

ئەوەتا قورئانی پیرۆزیش ئاماژە بۆ ئەو دوو دەستە داخ لە دڵە ئەکات کە دوژمنی سەرسەختی موسڵمانان ئەو دوانەن کە ئەفەرموێ :

﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ ﴾ ( المائدة : ٨٢ ).

**سێهەم :** دەستەی موناfیقان بە سەرکردایەتیی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول ، کە ئەمانیش هیچیان لەو دوو دەستەی پێشەوە کەمتر نەبوو ، بەڵام لە بەر ناچاریی بەسەرزارەکیی موسڵمان بووبوون .

**چوارەم :** ئەو عەرەبە بتپەرستانەی کە لە دەوروبەری مەدینەدا ئەژیان و ، بە هیچ شێوەیەك بیریان لە ئیسلام و کوفر نەئەکردەوە .. ئەوانە دز و جەردە و تالانچیی بوون . بەڵام ئەوانیش سەرکەوتنی هێزی موسڵمانانیان زۆر پێ ناخۆش بوو ، چونکە هەستیان ئەکرد کە ئەگەر لە مەدینەدا دەوڵەتێکی بەهێز پێ بگا ، ماوەی دزیی و جەردەیی ئەوان نادات ، بۆیە ئەوانیش رقیان لە موسڵمانەکان بوو .

بەم شێوەیە دوژمن و مەترسی‌یەکی زۆر دەورەی موسڵمانانیان دابوو و ، هەر یەکەیان هەوڵی ئەدا زیان بە موسڵمانەکان بگەیەنێت . مونافیقان لە ناوەوە وەك خۆرە دژایەتی‌یان ئەکرد و ، جوولەکەش بە ئاشکرا پەیمانیان ئەشکاند و ، قورەیشیش خەریکی ئەوەبوون خۆیان بۆ تۆڵەسەندن لە موسڵمانەکان ئامادە بکەن ، تا ئەوەبوو سەرەنجام جەنگی ئوحود رووی دا ، وەك لە دواوە ، إن شاء الله ، باس ئەکرێت .

ئەمەش هەندێ لەو رووداوە گرنگانەی کە هاتنە بەردەم موسڵمانان و ناچاریان کردن کە بەرگریی لە خۆیان بکەن :

**یەکەم : غەزای نەوەی سولەیم لە کودر :**

موسڵمانەکان لەگەڵ زۆربەی ئەو هۆزانەدا کە ئەکەوتنە خۆرئاوای مەدینە تا سەر دەریای سوور پەیمانی دۆستایەتی‌یان بەست بوو ، بۆیە خەریك بوو رێی بازرگانیی مەککە بە تەواویی دابخرێت . قورەیشیش پشتیان بە بازرگانیی بەستبوو و ، بێ ئەو نەئەژیان ، بۆیە کەوتنە تەگبیری ئەوە کە رێیەکی تر ، لە بیابان‌دا ، لە نێوان مەککە و نەجددا بدۆزنەوە ، تا لەوێوە بەرەو عێراق و شام برۆن و ، بازرگانی‌یەکەیان دوور بێ لە مەترسیی .

جا نەوەی سولەیم و غەطەفان گرنگ‌ترین و بەهێزترینی ئەو هۆزانە بوون لەو ناوچانەدا و ، هاوپەیمانی قورەیشیش بوون ، بۆیە پاسەوانیی بازرگانیی قورەیشیان ئەکرد .

قورەیشیش بە زمانی لووس ئەو دوو هۆزەیان لە خشتە بردبوو و ، بۆ دژایەتیی حکومەتی مەدینە هەڵیان ئەنان .

پێغەمبەری خواش ﷺ خاوەنی سیاسەتێکی حەکیم بوو کە نەی‌ئەهێشت هۆزەکان هێرش بکەنە سەری ، بەڵکو هەواڵی نیازی هێرشی هەر هۆزێکی بەرگوێ بکەوتایە ، خێرا ئەم دەستی پێش ئەخست و هێرشی ئەکردە سەری .. ئەو هۆزەش کە هەواڵی هێرشی سوپای هاوەڵانی ئەبیست ، ورەیان ئەڕووخا و ناوچەکەیان چۆڵ ئەکرد ..

ئەوەبوو نەوەی سولەیم و غەطەفان دەستیان دایە کۆکردنەوەی سوپا بۆ هێرش کردنە سەر مەدینە . ئەمە یەکەم هەواڵێك بوو کە دوای بەدر گەیشتە موسڵمانەکان . هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی زانیی ، لەگەڵ دووصەد

سواردا هێرشی کردە سەر ئەو هۆزە جەم بووانە و ، گەیشتنە ماوا و مەنزڵیان کە ناوچەیەك بوو پێیان ئەوت کودر ، ئەبینن وا هەموویان هەڵاتوون و ، ناوچەکەیان بەجێ هێشتووە و ، لە دۆڵەکەش‌دا پێنج‌صەد وشتریان بەجێ هێشتبوو ، کە سوپای مەدینە دەستی بەسەردا گرتن و دوای ئەوەی کە پێنج‌یەکیان لێ جیا کرایەوە دابەش کران بەسەر هاوەڵان‌دا ، کە هەر یەکەیان دوو وشتری بەر ئەکەوت.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ناوچەیەدا سێ ڕۆژ مایەوە ، ئەوسا گەڕایەوە بۆ مەدینە . ئەم غەزایە لە مانگی شەووالی ساڵی دووهەمی کۆچیی‌دا ، حەوت ڕۆژ دوای گەڕانەوەی سوپای ئیسلام لە بەدر ، ڕووی داوە .

لە ماوەی ئەم هەڵمەتەدا کاروباری مەدینە درابووە دەست سیباعی کوڕی عەرفەطە و ، وتراویشە : عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتووم .[٣٤٤]

**دووهەم : غەزای نەوەی قەینوقاع :**

لەمەوبەر باسمان کرد کە کاتێ پێغەمبەری خواﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد ، هەوڵی دا ژیانی ئاشتیی و تەبایی لەگەڵ جوولەکەدا بەسەر بەرێ ، بێ ئەوەی دەست‌درێژیی بکرێتە سەر جوولەکە . با ئەوان شوێن دینی خۆیان بکەون و ، موسڵمانانیش شوێنی دینی خۆیان بکەون . بۆ ئەمە پەیمانێکیان مۆر کرد کە :

یەکەم : هەر دوژمنێك هاتە سەر مەدینە هەردوولا پێکەوە بەرگریی لە شار بکەن.

دووهەم : هیچ لایەکیان ناپاکیی نەکەن و دەست‌درێژیی نەکەنە سەر یەکتر .

سێهەم : هەردوولا سەربەست بن و بە دڵی خۆیان دینی خۆیان جێ بەجێ بکەن .

جا پێغەمبەر و موسڵمانەکان هەوڵیان ئەدا بە پاکیی پارێزگاریی لە پەیمانەکە بکەن ، بەڵام دوای سەرکەوتنی بەدر ، جوولەکە ئاگریان تێ بەربوو و ، لە جاران زیاتر داخ لە دڵی ئیسلام و موسڵمانەکان بوون . چونکە لەوە ئەترسان کە هێزی ئیسلام پەرە بسێنێ و دەسەڵات لەوان بسەنرێ . بۆیە کەوتنە پەیمان شکاندن و ، ئەو هەمووە چاکەیان لەبەرچاو نەبوو و ، کەوتنە دژایەتیی موسڵمانان و ، هەموو جۆرە فێڵ و ناپاکی‌یەکیان بەکار هێنا .

سەرەتا هەوڵیان دا برایەتیی نێوان ئەوس و خەزرەج ـ کە دوای موسڵمان بوونیان ئاشت بوونەوە و بوونە برای یەکتر ـ تێك بدەن .

---

[٣٤٤] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ١٨٣ ، الرحيق المختوم : ٢٣٨ .

ئەوەبوو یەکێ لە جوولەکە پیرە بە ساڵاچووەکان کە یەکجار کافر و بێئیمان بوو و ، زۆریش دژی موسڵمانەکان ئەدوا ، دای بەلای چەند پیاوێکی ئەوس و خەزرەج دا کە لە کۆڕێكدا پێکەوە دانیشتبوون و قسەیان ئەکرد . کە دیتی چۆن بە موسڵمانبوون بەینیان خۆش بووە ، دوای ئەوەی کە لە سەردەمی نەفامیی‌دا ناکۆکیی و دوژمنایەتیی لە نێوانیان‌دا هەبوو ، زۆری پێ ناخۆش بوو و وتی : پیاو ماقوولانی نەوەی قیلە ـ واتە ئەوس و خەزرەج ـ لەم وڵاتەدا یەکیان گرتووە . دە بەخوا ئەگەر ئەوان یەك بگرن ئێمە ژیانمان نابێت . بۆ ئەمە فەرمانی بە گەنجێکی جوولەکەدا دا ، کە لەگەڵیا بوو ، تا بچێتە لایان و باسی رووداوەکانی جەنگی بوعاثیان [٣٤٥] بۆ بکات و ، ئەو شیعرانە بخوێنێتەوە کە هەریەکەیان وتبوونی . کوڕە گەنجەکە کە باسەکەی دەرخست و ئەوانیش دەستیان کرد بە بەرگریی و شانازیی ، سەرەنجام یەکێکیان تووڕە بوو و دەری بڕیی کە ئامادەیە بۆ جەنگ .. هەردوو لا رقیان جوی و داوای چەکیان کرد تا خۆیان بگەیەننە گردە بەرداوی‌یەکەی نزیك مەدینە .

ئەم دەنگ و باسە گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش لەگەڵ کۆمەڵێك موهاجیریی‌دا خۆیان گەیاندە لایان و فەرمووی : (( یا معشر المسلمین ! أبدعوى الجاهلية وأنا بين أظهركم بعد إذ أكرمكم الله بالإسلام ، وقطع به عنكم أمر الجاهلية ، وألف بينكم ترجعون إلى ما كنتم عليه كفاراً ؟! الله الله )) . فەرمووی : ئەی کۆمەڵی موسڵمانان ! ئایا لە کاتێك‌دا کە من وام لە نێوانتان‌دا بانگی نەفامیی بەرز ئەکەنەوە و ، دوای ئەوەی کە خوای گەورە بە ناردنی ئیسلام رێزی لێ گرتن و ، لە رێبازی نەفامیی لای دان و ، دڵ و دەروونتانی بە یەکەوە بەست ، ئەگەڕێنەوە سەر کافرێتیی ؟! لەبەر خاتری خوا ، لەبەر خاتری خوا ..

بەمە تووڕەیی خەڵکەکە نیشتەوە و ، بۆیان دەرکەوت کە ئەمە کاری شەیتان و، نەخشەی دوژمنەکانیان بوو . ئیتر چەکیان دانا و ، دەستیان بە گریان کرد و ، دەستیان لە ملی یەك کرد و ، پاشان بەوپەڕی گوێڕایەڵی‌یەوە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هەستان و گەڕانەوە دوا ..

ئەوەبوو دەربارەی ئەم رووداوە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە :

---

[٣٤٥] جەنگی بوعاث : دواجەنگی نێوان ئەوس و خەزرەج بوو ، کە لەو جەنگەدا ئەوس سەرکەوتن . پاشان خوای گەورە ئیسلامی بۆ ناردن و لە سایەی‌دا بوونە برا ..

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ ۚ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٠٠ ـ ١٠٣ ) .

**موسڵمانەکان تووشیان بە تووشی دراوسێیەکی یەکجار خراپەوە بوو .. جوولەکە خراپترین قەومێك بوون کە ئازاری موسڵمانەکان بدەن ، بە تایبەت کە ئەیانزانیی پەیمانی ئاشتیی و برایی لە نێوانیاندا هەیە . جوولەکە بە بێشەرمانە هەموو کارێکی شیاو و نەشیاویان ئەدایە پاڵ پێغەمبەران سەلامیان لێ بێ .**

**ئیبن ئیسحاق بە سەنەدی خۆی لە ئیبن عەباسەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەتی کردووە کە وتوویە : ئەبوبەکر خوا لێی رازیی بێ ئەچێتە یانەی ( میدراس ) ، کە ئەو کەنیسەیەیە جوولەکە دەرسی تێدا ئەخوێنن و ، ئەبینێ خەڵکێکی زۆر لە جوولەکە لەوێ لە دەوری پیاوێکیان ، کە یەکێکە لە زانا ناودارەکانیان و ناوی فینحاصی کوڕی عازورایە ، کۆ بوونەتەوە . ئەبوبەکر پێی فەرموو : ماڵت کاول بێ ، فینحاص ! لە خوا بترسە و موسڵمان ببە . بەخوا چاك ئەزانیی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە و ، لەلایەن خواوە حەقی بۆ هێناون و ، بە چاوی خۆتان ئەیبینن کە لە تەورات و ئینجیلدا نووسراوە . فینحاص لە وەڵامدا وتی : بەخوا ئەبوبەکر ! ئێمە هیچ پێویستییەکمان بە خوا نیە ، ئەو موحتاجی ئێمەیە و ، ئێمە موحتاجی ئەو نین !! چونکە ئەگەر خوا دەوڵەمەند بوایە ، ئەوا داوای قەرزی لێمان نەئەکرد ، وەك پێغەمبەرەکەتان رای ئەگەیەنێ . ریبا لە ئێوە قەدەغە ئەکات ، کەچیی خۆی پێمان ئەدات . جا ئەگەر دەوڵەمەند بوایە ئەوا ریبای پێمان نەئەدا .**[٣٤٦]

[٣٤٦] مەبەستی فینحاص لەو ئایەتە پیرۆزەیە کە خوای گەورە تیایا فەرمان بەسەر موسڵمانە دەوڵەمەندەکان دا ئەدا تا چاویان لە هەژاران بێت و ، هەر دەوڵەمەندێکیش دەستگرۆیی هەژارانی کردبێ ، ئەوا بە خوای داوە و خوای گەورە بە چەند جارە پاداشتی ئەداتەوە ، کە ئەفەرموێ :

﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَـٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ۚ ﴾ .

ئەبوبەکری صددیق لەم وتەیە تووڕە بوو و بە توندیی زللەیەکی لە دەم و چاوی فینحاص دا ، هەر چەندە ئەبوبەکر خاوەنی خۆگرییی و ویقارێکی یەکجار زۆر بووە . پاشان فەرمووی : بەو خوایەی کە گیانمی بە دەستە ، ئەگەر لەبەر ئەو پەیمانە نەبوایە لە نێوانی ئێمە و تۆدا ئەمدا لە ملت ، هەی دوژمنی خوا . فینحاص بۆ شکاتکردن خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش بە ئەبوبەکری فەرموو : (( ما حملك على ما صنعت ؟ )) فەرمووی : چیی پاڵی پێوە نای تا ئەوە ئەنجام بدەی ؟ ئەویش هەواڵی وتەکەی فینحاص و ، ئەو بێشەرمی‌یەی لە بەردەم خوادا دایە ، فینحاصیش ئینکاریی کرد ، بەڵام ئەوەبوو قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و ئەوەشی چەسپاند کە ئەو جوولەکە ئەو هەڵەیەی وتووە و ، ئەمەش تاوانێکی تریانە کە ئەیخەنە پاڵ تاوانی کوشتنی پێغەمبەران بە ناڕەوا ، کە ئەیفەرموو :

﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ ( آل عمران : ١٨١ ــ ١٨٢ ) .

جوولەکە کۆمەڵێکی خوار و خێچ بوون بۆیە کار و وتەیەکی نەشیاویان لە دەم دەرئەچوو . ئەوەبوو ئەیانوت : خوا پەیمانی لێمان وەرگرتووە کە ئیمان بە هیچ پێغەمبەرێك نەهێنین هەتا قوربانی‌یەك پێشکەش بکا و لە ئاسمانەوە ئاگر بێتە خوارەوە و بی‌سووتێنێ . جا ئەوانیش ئیمان بە پێغەمبەری خوا ناهێنن هەتا ئەو کارەی لێ نەیەت . بۆ ئەمەشیان قورئان هاتە خوارەوە و ، دەمکوتی کردن کە پێغەمبەرانی تریان بۆ هاتوون و ئەو کارەشیان ئەنجام داوە کەچیی کوشتوونیان کە ئەفەرموێ :

﴿ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ ۗ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٨٣ ) .

شایانی باسە کە سێ تیرەی جوولەکە لە مەدینەدا لەگەڵ موسڵمانان دا ئەژیان ، کە بریتی بوون لە جوولەکەی نەوەی قەینوقاع و ، نەوەی نەضیر و ، نەوەی

قورەیظە . هەروەها كۆمەڵێكی گەورەشیان لە خەیبەر و دەوروبەریدا ئەژیان . ئەمانە هەمیشە خەریكی فڕوفێڵ و ئاژاوە بوون .

ئێستا نۆبەی ئەوە هاتووە باسی دوورخستنەوەی نەوەی قەینوقاع بكەین :

ئەوەبوو پێغەمبەر و موسڵمانان پیتێك لەو پەیماننامەیەیان نەشكاند و بە جوانیی پاراستیان ، بەو هیوایەوە كە لە مەدینە و دەوروبەریدا ئاشتیی و تەبایی بەرقەرار بێ و ، موسڵمانەكان ماوەیان هەبێ بچن بە گژی دوژمنە بت پەرستەكانیاندا ، بە تایبەت قوڕەیش ، كە بێگومان خۆیان ئامادەی جەنگێكی سەروماڵیی گەورە ئەكەن ، تا پینەی ئابڕووچوونی بەدریان بكەنەوە .

بەڵام جوولەكە ، هەر چەند بە رواڵەت خۆیان بە ئاشتییخواز لە قەڵەم ئەدا ، لە ژێرەوە خەریكی ئاژاوە و پاشقول‌دانی موسڵمانان بوون و ، بە هیچ شێوەیەك خۆیان بە پابەندی پەیمانەكەیان نەئەزانی . بگرە هەندێكیان بە ئاشكرا بانگەوازی ئەوەی ئەكرد كە بچن بە گژی موسڵمانەكاندا و ، هۆزە عەرەبە بت پەرستەكانیشیان لە دژیان هەڵ ئەنا .

موسڵمانەكانیش دانیان بە خۆیاندا ئەگرت و ، حەزیشیان لەوەبوو ئەوانیش رێی ئاشتیی و برایەتیی بگرنە بەر .

نەوەی قەینوقاعیش ، كە لەناو مەدینەدا و ، لە گەڕەكێكدا بە ناوی خۆیانەوە، ئەژیان ، یەكەم دەستەی جوولەكە بوون كە ئاژاوەیان بەرپا كرد . ئەمانە بە زەڕەنگەریی و ئاسنگەریی و دروست‌كەری قاپ و قاچاخەوە خەریك بوون ، بۆیە دەوڵەمەند بوون و خاوەنی چەك و كەل وپەلی جەنگ بوون و ، قەڵاكانیان بۆ جەنگ دەستیان ئەدا .. ئەمانە نزیكەی حەوت سەد پیاوی جەنگاوەریان هەبوون و ، لە ناو جوولەكەی مەدینەدا لە هەموویان ئازاتربوون . بۆیە هەر موسڵمانیك بچوایەتە بازاڕەكەیانەوە گاڵتە و سووكایەتی‌یان پێ ئەكرد ، هەتا رێ‌یان بە ئافرەتانیش ئەگرت ..

كە هەڵە و تاوانیان لە سنوور دەرچوو ، پێغەمبەری خواﷺ كۆی كردنەوە و ، ئامۆژگاریی كردن ، تا بەڵكو بێنەوە سەر رەوشت و خووی جوان و ، مافی دراوسێیەتیی بپارێزن و ، لە زەرەر و زیانی لە سنووردەرچوون و دەست درێژیی ئاگاداری كردن ، كەچیی ئەوان هەتا ئەهات لە سنوور دەرئەچوون .

ئەبوداود و غەیری ئەویش لە ئیبن عەبباس ەوە خوا لێی رازیی بێ ریوایەتیان کردووە کە وتوویە : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی بەدردا قورەیشی تێك شکاند و ، گەڕایەوە مەدینە ، جوولەکەکانی لە بازاڕی نەوەی قەینوقاع دا کۆکردنەوە و پێی فەرموون : (( یا معشر یهود ! أسلموا قبل أن یصیبکم مثل ما أصاب قریشاً )) . فەرمووی : ئەی کۆمەڵی جوولەکە ! بەر لەوەی ئەوەی تووشی قورەیش بوو تووشی ئێوەش ببێ موسڵمان بن . وتیان : ئەی موحەممەد ! بەوەی چەند کەسێکی قورەیشت کوشتووە ، کە هیچ لێ نەهاتوو و ، جەنگیان نەزانیوە ، لە خۆت بایی مەبە . ئەگەر لەگەڵ ئێمەدا بجەنگییت ئەوسا ئەزانیت پیاو ئێمەین و ، تووشت بە تووشی پیاوی وەك ئێمەوە نەبووە .

بۆ ئەمە خوای گەورە قورئانی پیرۆزی نارد تا ئاگاداری دڵ و نییەتیان بن کە ئەفەرمویٚ :

﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ ( آل عمران : ١٢ ) .

نەوەی قەینوقاع ئامۆژگاری یان نەبیست ، بگرە بە ئاشکرا هەڕەشەی بەرپاکردنی جەنگیان لە موسڵمانەکان کرد . موسڵمانەکانیش دانیان بە خۆیاندا ئەگرت و چاوەڕان بوون بزانن بارودۆخ چۆن ئەگەڕێ ..

سەرەنجام کارێکی یەکجار ناشیرینیان لە دەست دەرچوو :

ئیبن هیشام لە ئەبوعەون ەوە ریوایەتی کردووە کە ئافرەتێکی موسڵمان ملوانکەیەکی خۆی هێنا و لە بازاڕی نەوەی قەینوقاع دا فرۆشتی و ، لەلای زەڕەنگەرێك دانیشت . چەند جوولەکەیەك هاتن بە دەوریا و هەوڵیان دا دەم و چاوی دەربخات ، ئەویش دەری نەخست . ئەوەبوو زەڕەنگەرەکە دەستی برد و چمکی کراسی ئافرەتەکەی بەست بە پشتیەوە ، بێ ئەوەی ئافرەتەکە ئاگادار بێ . کاتێك کە هەستایەوە لاشەی دەرکەوت و ، جوولەکەکان دەستیان بە پێکەنین کرد پێی و ، ئافرەتەکەش هاواری کرد . خێرا پیاوێکی موسڵمان هەڵمەتی دایە سەر زەڕەنگەرەکە و کوشتی ، کە جوولەکە بوو . کۆمەڵێك پیاوی جوولەکەش هەڵمەتیان دایە موسڵمانەکە و کوشتیان . کەس وکاری موسڵمانەکە داوایان لە موسڵمانەکان کرد کە هێرش بکەنە سەر جوولەکەکان . بەمە جەنگ لە نێوان موسڵمانەکان و نەوەی قەینوقاع دا بەرپا بوو .

ئەم کردارە ناشیرینەیان پێغەمبەری خوای ﷺ ناچار کرد تا بڕیاری جەنگ لە دژیان بدات ، بەڵام پێش هەموو شتێك بە پێی فەرمانی قورئان :

﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ﴾ ( الأنفال : ١٥ ) کە فەرمان بەسەر پێغەمبەردا ﷺ ئەدا تا پەیمانی ناپاکان بداتە دواوە ، نەوەی قەینوقاعی ئاگادار کردن کە پەیمانیان لە نێواندا نەما .. ئەوەبوو ئەبولوبابەی کوڕی عەبدولمونذیری کردە ئەمیری مەدینە و ، ئاڵای سوپای موسڵمانانیشی دایە دەست حەمزە و ، بە سەرکردایەتی خۆی سوپای ئیسلام هێرشی کردە سەر نەوەی قەینوقاع . ئەوانیش کە ئەمەیان دیی خێرا چوونە ناو قەلاکانیانەوە و ، خۆیان مەحکەم کرد . موسڵمانەکانیش هەڵمەتیان دایە سەریان و ، ئابلووقەیان دان . ئەمەش لە ڕۆژی شەممەی پانزەهەمی شەووالی ساڵی دووهەمی‌کۆچیی‌دا بوو و تا یەکەم ڕۆژی مانگی ذولقەعیدەی خایاند واتە پانزە ڕۆژ ئابلووقەیان دان . لەم ماوەیەدا خوای گەورە ترس و لەرزی بردە دڵیانەوە ، تا سەرشۆڕ و خەجاڵەتیان بکات . ئیتر خۆیان دا بە دەستەوە بە جۆرێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ویستی خۆی چیی لە سەروماڵ و ژن و منداڵیان ئەکات بابی‌کات . خۆیان بە دەستەوە دا و هەر هەموو جەنگاوەرانیان قۆڵ بەست کران و ، پێغەمبەریش ﷺ ڕاوێژی بە گەورە هاوەڵان کرد کە چی‌یان لێ بکەن ، ئەوانیش ڕایان وەهابوو کە هەموو بکوژرێن ..

ئەم حوکمە شتێکی زۆر ئاسایی بوو ، چونکە ماوەی چەند هەفتەیەك لەوەو پێش قورئان هاتە خوارەوە و لۆمەی پێغەمبەر و ئەبوبەکری کرد کە بۆچ دیلەکانی بەدریان نەکوشت ؟

جوولەکەی نەوەی قەینوقاع دوو هاوپەیمانیان هەبوون : عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی مونافیق و ، عوبادەی کوڕی صامیت . ئەوەبوو عوبادە پشتی لە جوولەکەی بێ‌بەڵێن کرد و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! خوا و پێغەمبەرەکەی ئەکەمە کۆمەك و پشتیوانم و ، لە هاوپەیمانیی و پشتیوانیی ئەو کافرانە خۆم دائەماڵم .

بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بووە پشتیوانی جوولەکەی ناپاك و وتی : ئەی موحەممەد ! لەگەڵ هاوپەیمانەکانم دا چاك بجوڵێرەوە . پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی لێ هەڵ کرد و ، عەبدوڵڵا چەند جارێکی تر داواکەی دووبارە کردەوە و پێغەمبەریش ڕووی وەرگێڕا ، تا وتی : من لە ڕۆژگار ئەترسم . سەرەنجام تکاکەی وەرگرت بەو

مەرجەی مەدینە بەجێ بهێڵن بە خۆیان و ژن و منداڵیانەوە بڕۆن و ماڵ و سامانیان بۆ موسڵمانان بێ .

ئەوەبوو کاری چۆڵ کردن درایە دەست عوبادەی کوڕی صامیت و ، ئەویش سێ ڕۆژ مۆڵەتی دان و ، دوای سێ ڕۆژ ڕوویان لە ناوچەی ئەذرعات نا لە سەر سنووری شام و لەوێ زۆر نەمانەوە خوا لە ناوی بردن .

بەمە موسڵمانەکان لەو سێ دڕکەی جوولەکەی مەدینە لە دڕکێکیان ڕزگاریان بوو .

دەربارەی عوبادەی کوڕی صامیت و عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە کە فەرمانی بەسەر موسڵماناندا ئەدا هەتا جوولەکە و گاور نەکەنە دۆستی خۆیان و پشتیان پێ نەبەستن و هەرکەس وا بکات ئەوە ستەمکارە و ، خوای گەورە هیدایەتی ئەوانە نادات ، کە ئەفەرموێ :

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَـٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ ۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ۚ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَـٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴾

( المائدة : ٥١ ـ ٥٦ ) .[٣٤٧]

**سێهەم : غەزای قاوت :**

هەر کە موسڵمانەکان جەنگی بەدریان بردەوە ، هەر دوژمنێك بۆ خۆی هەوڵی ئەدا زیان بە پێغەمبەر و موسڵمانان بگەیەنێ لەلایەکەوە صەفوانی کوڕی

---

[٣٤٧] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ٣٨٩ ـ ٣٩٦ ، الرحيق المختوم : ٢٤٠ ـ ٢٤٤ ، غزوة أحد لمحمد أحمد باشميل : ٣٣ ـ ٤٣ .

ئومەییە [٣٤٨] و لەلایەکەوە جوولەکە و مونافیقان خەریکی پیلان گێڕان و دژایەتیی بوون ، ئەبوسوفیانیش پێی خۆش بوو ئەویش دەستێك لە موسڵمانان بوەشێنێ و ، کەمێك شوورەیی تێك شکانی قورەیش بشواتەوە و ، بە کارێکی ئاسان و کەم زیان پایەی قەومەکەی بەرز بکاتەوە و ، بیسەلمێنێ کە قورەیش هێزی بالآدەستی دوورگەی عەرەبە .

بۆ ئەمە ئەبوسوفیان بە خۆی و دووصەد سوارچاکەوە مەککەیان بەجێ هێشت تا نەهێڵێ سوێنەکەی بکەوێت ، کە ئەوەبوو سوێندی خواردبوو کە بۆ لەش گرانیی ئاو بەر سەری نەکەوێت هەتا هێرش نەکاتە سەر موحەممەد و دەستێکیان لێ نەوەشێنێ .

هاتن هەتا گەیشتنە نزیك چیایەك بە ناوی ( نیب ) و لە شیوەکەیدا خستیان و قۆناغێك لە مەدینەوە دوور بوو .. ئەبوسوفیان نەیوێرا راستەوخۆ روو بکاتە مەدینە و راستەوخۆ بچێت بە گژی موسڵمانەکاندا ، بۆیە کارێکی جەردە ئاسای ئەنجام دا .. ئەوەبوو لە تاریکییدا و بە نهێنیی خۆی گەیاندە دەوروبەری مەدینە و ، چووە لای حویەیی کوڕی ئەخطەب و، داوای لێ کرد دەرگای بۆ بکاتەوە ، کەچیی حویەیی نەیوێرا دەرگای بۆ بکاتەوە . دوای ئەو چوو بۆ لای سەللامی کوڕی میشکەم ـ سەرداری نەوەی نەضیر ـ و داوای لێ کرد بچێتە ژوورەوە لای . سەللام ماوەی دا و میوان داریی لێ کرد و عەرەقی دەرخوارد دا . ئەو شەوە ئەبوسوفیان لەوێ مایەوە و ، بۆ سبەینێ گەڕایەوە لای هاوەڵانی . دەستەیەك لە پیاوەکانی نارد تا هێرش بکەنە سەر ناوچەی ( العریض ) لە مەدینە و ، دەستیان دایە بڕینی دارخورما و ، ئاگریشیان بەردایە چەند دارخورمایەك و ، چاویان بە پیاوێکی ئەنصاریی و هاوپەیمانێکی کەوت کە لە کێڵگەیەکی خۆیاندا بوون و کوشتنیان و بە پەلە رایان کردەوە دوا ..

کە ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ ، بە پەلە هەڵمەتی دا تا ئەبوسوفیان و هاوەڵەکانی راو بنێ و تۆڵەیان لێ بسەنێ . بەڵام ئەوەبوو بە پەلە گەڕابوونەوە دوا و هەڵاتبوون و ، بۆ بارسووکیی قاوتێکی زۆریان فڕێ دابوو .

---

[٣٤٨] تەگبیری صەفوانی کوڕی ئومەییە و عومەیری کوڕی وەهب بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشەوە باس کراوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام راوی نان تا گەیشتە ( قرقرة الكدر ) و ، لەوێ گەڕایەوە دوا و ، موسڵمانەکان قاوتێکی زۆریان کۆ کردەوە و ، بەو بۆنەوە غەزاکەیان ناو نا : غەزای قاوت .

ئەم رووداوە لە مانگی ذولحەججەی ساڵی دووهەمدا ، واتە دوو مانگ دوای جەنگی بەدر رووی داوە و ، لەو کاتەش‌دا کاروباری مەدینە بە ئەبولوبابەی کوڕی عەبدولمونذیر سپێررابوو .[349]

**چوارەم : غەزای ( ذو أمر ) :**

ئەم غەزایە گەورەترین هەڵمەتی سەربازیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش جەنگی ئوحود خۆی فەرماندەی بووبێ ، ئەمەش لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی سێ‌هەمی کۆچیی‌دا رووی داوە .

هۆی ئەم هەڵمەتە ئەوەبوو هەواڵدەرانی مەدینە هەواڵێکیان گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە بریتیی بوو لەوەی نەوەی ثەعلەبە و موحاریب ـ کە دوو بنەماڵەی غەطەفان بوون ـ خەڵکێکی زۆریان کۆ کردۆتەوە و ، نیازیان وەهایە هێرش بکەنە سەر دەوڵەتی مەدینە .. بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ چوارصەد و پەنجا هاوەڵی‌دا ، کە هەندێکیان سوار و هەندێکیان پیادە بوون ، لە مەدینە دەرچوون و ، کاروباری مەدینەشی بە عوثمانی کوڕی عەففان سپارد .

لە رێگادا موسڵمانەکان پیاوێکیان گرت کە لە نەوەی ثەعلەبە بوو و بردیانە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، ئەویش بانگی کرد بۆ سەر ئیسلام و کابرا موسڵمان بوو و ، درایە دەست بیلال و بووە چاوساغی سوپای موسڵمانان بەرەو ناوچەی دوژمن .

کە هەواڵی سوپای موسڵمانان گەیشتە دانیشتوانی ئەو ناوچانە هەموویان لە ترسانا بەرەو لووتکەی چیاکان هەڵاتن .. سوپای ئیسلام ئەو ناوچانەی گرت و گەیشتە سەر ئاوی ( ذوأمر ) ، کە شوێنی کۆبوونەوەی دوژمنان بوو و ، سەرانسەری مانگی صەفەری ساڵی سێ‌هەمی کۆچیی لەوێ مایەوە ، تا عەرەبەکانی ئەو بیابانە هەست بکەن کە موسڵمانەکان خاوەنی هێز و دەسەڵاتن و هەموو کەس توانای نیە بچێتە بەردەمیان و ، ترس و سامی موسڵمانەکان بچێتە دڵیانەوە . پاشان گەڕانەوە مەدینە .

---

[349] غزوة أحد لمحمد أحمد باشميل : ٥٠ ، والرحيق المختوم : ٢٤٤ ـ ٢٤٥ .

کاتێك کە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە لە ترسی موسڵمانەکان هەڵاتن ، فەرماندەی هۆزی نەوەی ثەعلەبە و موحاریب، کە ( دعثور ) یان ( غورث المحاربي ) بوو هەوڵی دا پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت ، ئەمەش لە کاتێك‌دا کە سوپای موسڵمانەکان سەر ئاوی ( ذو أمر ) یان کردبووە سەربازگە .

ئەوەبوو ڕۆژێکیان باران لەسەر ئەو ناوچەیە باریی و ، بەو بۆنەوە جل و بەرگی پێغەمبەری خواش تەڕ بوون ، کە تەنها دوو کراس بوون و هەر ئەوانەشی پێ بوون ، بۆیە بەسەر درەختێکەوە هەڵی خستن تا وشك ببنەوە و ، پاشان پاڵ کەوت . هەروەها هاوەڵانیش هەر هەموویان بە هەڵ خستنی جل و بەرگیانەوە پەشۆکان . ئا لەم کاتەدا ( دعثور ) ی فەرماندەی ئەو هۆزانە هەلی بەدەست هێنا و خۆی گەیاندە سەربازگەی موسڵمانەکان و ، بە بۆنەی پەشۆکانیانەوە تەماعی ئەوەی کەوتە سەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت . لە ڕاستییدا دعثور پیاوێکی ئازای بە جەرگ بوو و ، قەومەکەشی بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا هەڵیان نا و ، بەڵێنی پێ دان و وتی : خوا بم کوژێ ئەگەر موحەممەد نەکوژم .

کابرا بە ئاسانیی چووە ناو سەربازگەی موسڵمانان و ، بێ‌ئەوەی کەس هەستی پێ بکا گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ . بە شمشێرەوە گەیشتە سەر سەری و ، ویستی بی‌کوژێ و ، پێغەمبەریش ﷺ هیچ چەکێکی بەلاوە نەبوو . وتی :

ئەی موحەممەد ! ئێستە کێ لە دەستم دەربازت ئەکات ؟!

فەرمووی : (( الله )) .

کابرا سامی وشەی (( الله )) ی لێ نیشت و لەرزی لێ هات و ، شمشێرەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە و ، کەوت بە پشتا . پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێرەکەی هەڵ گرت و ، بەرزی کردەوە و ، بە کابرای فەرموو : (( مَن يمنعُك مني ؟ )) فەرمووی : کێ لە دەستم دەربازت ئەکات ؟ وتی : هیچ کەس . پێغەمبەری خوا ﷺ چاوپۆشیی لە کابرا کرد و ، ئەویش بە دڵ و بە گیان موسڵمان بوو و ، پێغەمبەریش ﷺ شمشێرەکەی بۆ گێڕایەوە .. کابرا بە موسڵمانیی گەڕایەوە ناو قەومەکەی و هەواڵی ئەو ڕۆیشتنەی پێ دان و ، ئەوانیشی بۆ سەر ئیسلام بانگ کرد .. هەواڵی ئەوەشی دانێ کە هۆی بە پشتا کەوتنی و بەربوونەوەی شمشێرەکەی لە دەستی ئەوە بووە کە پیاوێکی بالابەرز داویەتی بە سنگی‌دا و ، کە زانیویشیەتی ئەوە مەلائیکەتە موسڵمان بووە .

ئیبن کەثیر لە ( البداية و النهاية ) دا باسی ئەوەی کردووە کە ئەوەی دەعثووری خستووە بە پشتا و شمشێرەکەی لە دەست بەرداوەتەوە ، جیبریل بووە سەلامی لێ بێ کە داویەتی لەسەر سنگی ..

دوای جەنگی بەدر ئەمە دووهەم هەوڵ بوو بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ .

ئەوەبوو دەربارەی ئەم غەزایە قورئان هاتە خوارەوە و ، ئامۆژگاریی موسڵمانانی ئەکرد تا نیعمەتی خوایان لەبەر چاو بێ کە گەیشتە فریایان و لە دەست دوژمنان سەرفرازی کردن کە ئەیفەرموو :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾(المائدة : ١١ ) .[٣٥٠]

**پێنجەم : کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف :**

کەعبی کوڕی ئەشرەف یەکێ بوو لەو جوولەکانەیکە یەکجار داخ لە دڵی موسڵمانان بوو و ، ئازارێکی زۆری پێغەمبەری خوای ﷺ ئەدا و ، حەزی لەوە بوو خەڵك لە دژی هەڵ بنێ ..

ئەشرەفی باوکی کەعب لە هۆزی طەی ، لە نەوەی نەبهان بووە .. لە سەردەمی نەفامییدا خوێنێك هاتۆتە گەردنی و ، هاتۆتە مەدینە و بۆتە هاوپەیمانی هۆزی نەوەی نەضیری جوولەکە و ، سەرەنجام بۆتە سەردار و عەقیلەی کچی ئەبولحوقەیقی جوولەکەی مارە کردووە و ، کەعبی لێی بووە ، کە پیاوێکی کەڵەگەتی دەوڵەمەندی لە جوانییدا بەناوبانگی لێ هەڵ کەوتووە و ، یەکێ بووە لە شاعیرە بەناو بانگەکانیان و ، قەڵاکەشی کەوتۆتە باکووری خۆرهەڵاتی مەدینەوە .

کاتێك کە قوڕەیش لە بەدردا شکا و موسڵمانەکان سەرکەوتن ، کەعبی کوڕی ئەشرەف زۆر داخی لێ هات ، بۆیە وتی : گوایە ئەمە راستە ؟ ئەوانە ماقووڵی عەرەب و پادشای خەڵکن . بە خوا ئەگەر موحەممەد ئەوانەی تێك شکاند بێ ناوسکی زەویی لە پشتی زەویی چاکترە .

کە هەواڵەکە بە لایەوە راست دەرچوو ، دەستی دایە قسە وتن بە پێغەمبەری خوا و موسڵمانەکان و ، ستایش کردنی قوڕەیش و هەڵنانیان . بەمەش دڵی ئاوی نەخواردەوە ، بەڵکو سواری ولاغەکەی بوو و بەرەو مەککە کەوتە رێ و ، لەوێ لە

---

[٣٥٠] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ١٨٤ ، غزوة أحد لمحمد أحمد باشميل : ٥١ ـ ٥٥ ، الرحيق المختوم : ٢٤٥ . بەڵام خاوەنی ( الرحيق ) پێی وایە کە ئەم هەوڵەی دەعثور لەم غەزایەدا نەبووە .

ماڵی موطەللیبی کوڕی ئەبووەداعەی سەهمیی بووە میوان و ، دەستی دایە شیعر هەڵبەستن و شیوەنکردنی کوژراوانی قوڕەیش ، تا کەسوکاریان لە دژی موسڵمانان هەڵ بنێ و ، دڵیان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەق بکات ..

کاتێك کە لە مەککە بوو ئەبوسوفیان و بت پەرستەکانی تریش لێیان پرسیی : ئایا دینەکەی ئێمەت بەلاوە خۆشەویستە یان دینەکەی موحەممەد و هاوەڵانی ؟ و کام لەم دوو دەستەیەش لەسەر ڕێبازی حەقن ؟

کەعب وەڵامی دانەوە : ڕێبازی ئێوە زیاتر ڕێبازی هیدایەتە و چاك تریشە . دەربارەی ئەم وەڵامە کە کەعب خۆیشی ئەیزانیی وا نیە ، قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و باسی خوار و خێچیی ئەو کەسەی ئەکرد کە خۆی بە ئەهلی کیتاب لە قەڵەم ئەدا کەچیی پشتی کافرانیش ئەگرێت :

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّـٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَـٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴾ ( النساء : ٥١ ) .

کە کەعب گەڕایەوە مەدینە دەستی دایە باسی ئافرەتانی موسڵمان و ، هێرشیشی ئەکردە سەر پێغەمبەر و هاوەڵانی .

ئەم دژایەتیی و سووکایەتییە گەیشتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پێی ناڕەحەت بوو ، بۆیە فەرمووی: (( مَن لِكعبِ بن الأشرف؟ فإنه آذى الله ورسوله )) . فەرمووی : کێ کەعبم بۆ لەناو ئەبات ؟ بە ڕاستیی ئازاری خوا و پێغەمبەری دا .. ئەوەبوو موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەوسیی[٣٥١] وتی : من ، ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا پێت خۆشە بیکوژم ؟ فەرمووی : (( نعم )) . کوڕی مەسلەمە وتی : دەی ماوەم بدە قسەت پێ بڵێم . فەرمووی : بەڵێ .

لەگەڵ کوڕی مەسلەمەدا چەند خزمێکی ئەوسیی ئامادەیی خۆیان دەربڕیی کە یەکێکیان ئەبونائیلەی برای شیریی کەعبی کوڕی ئەشرەف بوو و ، عەببادی کوڕی

---

[٣٥١] موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەوسیی ئەنصاریی یەکێکە لە هاوەڵە پایەدارەکان و ، یەکێکیشە لە فەرماندە بەناوبانگەکان .. بەشداریی جەنگی ئوحودی کردووە و ، ڕۆژی ئوحودیش یەکێك بووە لەو هاوەڵانەی کە بە دامەزراویی لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ماوەتەوە . جگە لە جەنگی تەبوك بەشداریی هەموو غەزاکانی کردووە . خەلیفە عومەر بۆ چاودێریی و سەرنج دانی کاری والییەکان بە کاری ئەهێنا . لە سەردەمی ئیمام عەلییدا پشت گیریی هیچ لایەنێکی نەکرد ، بەڵکو کەناری گرت . لە مەدینەدا و لە ساڵی ( ٤٣ ) ی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە ، خوا لێی ڕازیی بێ .

بیشری کوڕی وەقش و ، حاریثی کوڕی ئەوس و ، ئەبوعەبسی کوڕی حەبر بوون و کوڕی مەسلەمەش سەرۆکی هەڵمەتەکە بوو .

ئەو دەستە پاڵەوانە لە نێوان خۆیاندا کۆبوونەوەیەکیان ئەنجام دا تا نەخشەیەکی رێك و پێك بۆ کوشتنی ئەو خوانەناسە بکێشن . دوای ئەوە کوڕی مەسلەمە هاتە لای کەعب و ، کوڕی مەسلەمە دەستی کرد بە قسەوتن بە پێغەمبەر هەتا کەعب متمانەی پێ کرد .. ئەوەبوو وتی : ئەم پیاوە ـ واتە پێغەمبەر ـ داوای خێر و صەدەقەی لێمان کرد ، کەچیی نانی هەموومانی بڕیی .

کەعب وتی : بە خوا لێی بێزار ئەبن .

موحەممەدی کوڕی مەسلەمە وتی : تازە ئێمە شوێنی کەوتووین ، بۆیە پێمان خۆش نیە وازی لێ بهێنین ، هەتا بزانین سەری لە کوێوە دەرئەچێ ؟ جا ئێمە ئەمانەوێ ویسقێك یان دوو ویسق خورمامان بە قەرز بدەیتێ .

کەعب وتی : باشە بارمتەم لە لا دابنێن .

کوڕی مەسلەمە وتی : چ شتێکت ئەوێت ؟

وتی : ژنەکانتان بە بارمتە لە لام دابنێن .

وتی : چۆن ئەبێ ژنەکانمان بە بارمتە لات دابنێین و ، تۆش جوانترین پیاوی عەرەبی ؟

وتی : دەی کوڕەکانتان لە لام بە بارمتە دابنێن .

وتی : چۆن ئەبێ کوڕەکانمان بکەیتە بارمتە لە لات ، هەر کە یەکێکیان جنێویان پێ دا پێی بڵێن : تۆ ئەوەیت کە بۆ ویسقێك یان دوو ویسق کراویتە بارمتە ؟ ئەمە بۆ ئێمە شوورەیی یە . بەڵام ئێمە چەکەکانمان ئەکەینە بارمتە .

ئەویش بەڵێنی پێ دا کە شەو شمشێرەکەی بۆ بهێنێ .

هەروەها ئەبونائیلەش بۆ خۆی هاتە لای و ماوەیەك پێکەوە شیعریان وت ، پاشان وتی : کوڕی ئەشرەف ! ماڵت ئاوا بێ ، بۆ پێویستی یەك هاتوومەتە لات و ئەمەوێ لای تۆ بیدرکێنم بەڵام تۆ ئاشکرای مەکە .

کەعب وتی : وا ئەکەم .

وتی : هاتنی ئەم پیاوە بۆ ناومان بووە بەڵا بۆمان : عەرەب بوونە دوژمنمان و، هەموو بە جارێ هاتن بە گژماندا و ، هەموو رێیەکیان لێمان داخست ، هەتا

ماڵ و منداڵمان تیا چوون و ، نارەحەت بووین و دەستکورتیی تەنگی بە خۆمان و ماڵ ومنداڵمان هەڵ چنی ..

ئەبونائیلە ئەوەشی بردە دڵیەوە کە چەند هاوەڵێکی تری هەن و ، ویستوویەتی ئەوانیش لەگەڵ خۆیدا بهێنێ و ، خورمایان پێ بفرۆشێ .

ئەوەبوو لە شەوی چواردەی مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی سێهەمی کۆچییدا ئەم کۆمەڵە فیداکارە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ کۆبوونەوە و ، لەو شەوە مانگە شەوەدا هەتا قەبرستانی بەقیع رەوانەی کردن و ، پاشان ئامۆژگاریی کردن کە بە ناوی خواوە بکەونە رێ و لە خواش پاڕایەوە تا کۆمەکیان بکات کە فەرمووی : (( إنطلقوا على إسم الله . أللهم أعنهم )) . ئیتر ئەو گەڕایەوە ماڵەوە و ، هەروا خەریکی نوێژکردن و نزا و پاڕانەوە بوو لە خوا .

ئەو دەستە فیداکارەی ئەوس ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە قەڵاکەی کەعبی کوڕی ئەشرەف . هەر لە دوورەوە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە و ئەبونائیلە بانگیان لە کەعب کرد. ئەویش هەستایەوە تا دابەزێتە لایان ، ژنەکەی پێی وت : لەم ساتەدا بۆ کوێ ئەچیتە دەرەوە ؟ من دەنگێك ئەبیستم ئەڵێی خوێنی لێ دائەچۆڕێ .

کەعب وتی : ئەوە موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی برام و ئەبونائیلەی برای شیرییمە .[٣٥٢] پیاوی بەڕێز ئەگەر بە شەودا بانگ بکرێ بۆ لێدانیش هەر ئەڕوات . بەر لەوەی بێتە دەرەوە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە وتی : کە هات قژی سەری ئەگرم و بۆنی ئەکەم ، جا کە منتان دیی دەستم لێی گیر بوو بە شمشێر دای بگرنەوە . ئەوەبوو کەعب هاتە دەرەوە و شمشێرەکەشی بە دەستیەوە بوو و ، بۆنی میسکیش لەسەری بەرز ئەبوویەوە .

کوڕی مەسلەمە وتی : تا ئێستە عەتری وەها بۆن خۆشم بۆن نەکردووە . ماوەم ئەدەی سەرت بۆن بکەم ؟ وتی : بەڵێ . ئەوەبوو بۆنی کرد - هەروەها ئەبونائیلەش وەهای کردووە - .[٣٥٣] کە دەستی لە قژی گیر بوو ، داوای لە

---

[٣٥٢] ئەبونائیلە : ناوی سیلکانی کوڕی سەلامەی کوڕی وەقش بووە . وتراویشە : ناوی سەعد بووە و سیلکان نازناوی بووە و ، لەگەڵ کەعبدا برای شیریی یەکتر بوون و ، لە سەردەمی نەفامییدا پێکەوە خۆشیان هاتووە . واقیدییش باسی ئەوەی کردووە کە موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش هاوشیری کەعب بووە .

[٣٥٣] لەلای ئیبن هیشام وەها هاتووە کە ئەبونائیلە قسەی بە پێغەمبەر ﷺ وتووە و ، هەر ئەویش دەستی داوەتە قژی کوڕی ئەشرەف هەتا کوشتوویانە . لەوە ئەچێ کوڕی مەسلەمەش و ئەبونائیلەش هەردووکیان قسەیان وتبێ و دەستیشیان دابێتە قژی کەعب .

هاوەڵانی کرد تا بە شمشێر دای بگرنەوە . لە هەموو لایەکەوە شمشێریان ئاراستەی کەعب کرد و ، لە دواجاردا کوڕی مەسلەمە خۆی دەستی یەکجاریی لێ وەشاند و کوشتی .

کە لێیان دا بە دەنگی بەرز هاوارێکی وەهای کرد دەوروبەری خۆی راچڵەکاند و لەسەر هەموو قەڵاکانەوە ئاگریان کردەوە .

بە نووکی شمشێری هاوەڵان حاریثی کوڕی ئەوس زامدار بووبوو و ، خوێنیشی لێ رۆیشت بوو . جا کە دەستە موسڵمانەکە گەیشتنە ( حرة العريض ) سەرنجیان دا وا حاریث لەگەڵیان نیە و بەجێ ماوە ، بەڵام چونکە شەو بووە هەستیان پێی نەکردووە . ماوەی سەعاتێك وەستان هەتا ئەویش هات . خێرا هەڵیان گرت و هێنایانەوە . کە گەیشتنە ( بقيع ) ( الله أكبر ) یان کرد و ، پێغەمبەری خواش ﷺ گوێی لە تەکبیرەکەیان بوو و، زانیی ئەوانن و کەعبیان کوشتووە ، بۆیە ئەویش تەکبیری فەرموو . کە گەیشتنەوە لای دوعای خێری بۆ کردن و فەرمووی : (( أفلحت الوجوه )) . وتیان : دەم و چاوی خۆت ئەی پێغەمبەری خوا !

ئەوەبوو سەری مل‌هوڕی خوانەناسیان خستە بەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ و، ئەویش سوپاسی خوای کرد لەسەر کوژرانی و ، تفی موبارەکی خۆیشی لە زامەکەی حاریث دا و چاك بوویەوە و ، دوای ئەوە هیچ ئازارێکی نەبوو .

کە جوولەکە هەواڵی کوژرانی کەعبیان بیست ترس و لەرز دای‌گرتنەوە و ، بۆیان دەرکەوت کە هەر کەسێ بە ئامۆژگاریی دەست لە خراپە هەڵ نەگرێ ، پێغەمبەری خوا بە هێزی بازووی موسڵمانان دەستی لێ ئەوەشێنێ و خەڵکیشی پێ ژێر ئەکات .[٣٥٤]

**شەشەم : غەزای بوحران یان قەردە :**

ئەم غەزایە بریتیی بوو لە دەوری‌یەیەکی جەنگاوەری گەورە کە لە سێ‌صەد جەنگاوەر پێك هاتبوو و ، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی فەرماندەی هەڵمەتەکە بوو و، لە مانگی رەبیعی دووهەمی ساڵی سێ‌هەم‌دا بەرەو ناوچەی بوحران ، لە حیجاز رووە و ( فەرع ) ، رووی داوە . هەردوو مانگی رەبیعی دووهەم و جومادی یەکەم لەوێ مایەوە . پاشان سوپای ئیسلام گەڕایەوە مەدینە و ، تووشی جەنگ نەبوو .

---

[٣٥٤] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ٣٩٧ ـ ٣٩٨ ، الرحيق المختوم : ٢٤٥ ـ ٢٤٩ .

شایانی باسە کە سەرچاوە مێژووییەکان لە هۆی ئەم هەڵمەتە جیاوازییان هەیە .[٣٥٥]

**حەوتەم : سریەی زەیدی کوڕی حاریثە :**

ئەم هەڵمەتە دوامین و سەرکەوتووترین دەوریەی جەنگاوەر بوو کە موسڵمانەکان پێش ئوحود ، لە مانگی جومادی دووهەمی ساڵی سێهەم دا ، ئەنجامیان دا ..

لەوەو پێش قورەیش بە تەما بوو غەطەفان و نەوەی سولەیم پارێزگاریی کاروانە بازرگانییەکانی بۆ بکەن ، بەڵام کە سوپای ئیسلام هەڵمەتی بردە سەر ناوچەی ئەو هۆزانە ، ئیتر قورەیش تێ گەیشت کە ئەو هۆزانە چاری سوپای بە هەڵمەتی ئیسلام ناکەن ، کە ڕۆژ بە ڕۆژیش لە پەرەسەندنایە . بۆ ئەمە قورەیش کەوتە بیرکردنەوە بۆ دۆزینەوە ڕێیەکی گونجاو بۆ هات و چۆی کاروانە بازرگانییەکانیان ، ئەمەش دوای ئەوەی کە حەوت مانگ بەسەر جەنگی بەدردا تێپەڕی بوو و ، وەرزی هاوینیش هاتبووە بەرەوە .

قورەیش بۆ فەرماندەیەتیی ئەو ساڵەی کاروانەکانی بەرەو شام صەفوانی کوڕی ئومەییەی هەڵ بژارد بوو ، چونکە یەکێ لە پاڵەوانان و بازرگانە دیارەکانی قورەیش بوو . دەربارەی ئەم ئەرکەی و روون کردنەوەی هەڵوێست صەفوان بە قورەیشی ڕاگەیاند کە موحەممەد و هاوەڵانی تەنگیان پێ هەڵ چنیون و زیانیان لە بازرگانیی مەککە داوە و ، دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەی نێوان مەدینە و ڕۆخی دەریای سوور دا ئەڕوا و ، دانیشتوانی ئەو ناوچەشیان کردۆتە خۆ و ، زۆربەشیان موسڵمان بوون و ، قورەیش هیچی بۆ نەماوەتەوە . خۆ ئەگەر لەماڵەوە بەتاڵ دائەنیشن ، ئەوا سەرمایەکەیان ئەخۆن و هیچیان لە دەست دا نامێنێت و ، ژیان و گوزەرانی دانیشتوانی مەککە لەسەر بازرگانیی هاوینە بەرەو شام و ، لەسەر بازرگانیی زستانە بەرەو حەبەشەیە .

پیاوماقووڵانی قورەیش کەوتنە وت و وێژ و ، تاوتوێکردنی باسەکە . ئەوەبوو ئەسوەدی کوڕی عەبدولموطەللیب بە صەفوانی وت : واز لە ڕێی کەناری دەریا بهێنە و ، ڕێی عێراق بگرە بەر . دیارە ئەم ڕێگایە زۆر دوور و درێژە و بیابانی نەجد بەرەو شام ئەبڕێ و ، لە خۆرهەڵاتی مەدینەوە ، بەڵام زۆر لە دوورەوە ، تێ

---

[٣٥٥] الرحيق : ٢٤٩ ، غزوة أحد لباشميل : ٥٥ .

ئەپەڕێ . قوڕەیش لەم ڕێیە زۆر بێئاگا بوو ، بۆیە ئەسوەد بە صەفوانی ڕاگەیاند کە فوراتی کوڕی حەییان ، کە پیاوێکی نەوەی بەکری کوڕی وائیل بوو ، بۆ چاو ساغی ڕێ بە کرێ بگرێ .

صەفوان ئەبوسوفیان و چەند پیاوێکی تریشی لەگەڵدا بوون تا لە پارێزگاریی کاروانەکەدا یارمەتیی بدەن و ، بە بێدەنگ ڕێگا بگرنە بەر ، بەڵکو موسڵمانەکان بەم ڕێیە نەزانن و ، ڕێیان پێ نەگرن .

یەکەم کاروانی مەککە لەو ڕێ تازەوە کەوتە ڕێ .. بەڵام بە ویستی خوا ئەم گەشتە نهێنی‌یە بۆ موسڵمانەکان ئاشکرا بوو ..

ئەوەبوو لە کاتی بەڕێکردنی ئەم کاروانەدا نوعەیمی کوڕی مەسعوود ـ کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو ـ لە مەککەدا بوو و ئاگاداری تەگبیر و نەخشەکێشانی قوڕەیش بوو . دوای ئەوە هاتە سەردانی مەدینە و ، یەکێ لە موسڵمانان هەواڵەکەی بەرگوێ کەوت و گەیاندیە پێغەمبەری خوا ﷺ ..

ئەوەبوو سولەیطی کوڕی نوعمان ، کە موسڵمان بووبوو ، ئامادەی کۆڕی عەرەق خواردنەوە بوو ، ئەمەش پێش حەرام‌بوونی عەرەق و ، نوعەیمی کوڕی مەسعوودیش لەوێ ئامادە بوو .. کە نوعەیم سەرخۆش بوو ، بە درێژە باسی کاروانە بازرگانی‌یەکەی کرد کە بە سەرکردایەتیی صەفوانی کوڕی ئومەییە کەوتۆتە ڕێ و ، باسی ڕێی تازەی کرد ..

سولەیط کە ئەمەی بیست خێرا هەستا و هەواڵەکەی گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ .

خێرا پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی خنجیلانەی لە هاوەڵانی پێك هێنا کە صەد جەنگاوەر ئەبوون و زەیدی کوڕی حاریثەشی کردە ئەمیریان و ، بە پەلە خۆیان گەیاندە سەر ڕێی کاروانەکە و ، نەیان‌هێشت دەنگ و باسی ئەم هەڵمەتە بگاتە لای صەفوان و ، لە کاتێك‌دا کە لەسەر ئاوێکی وڵاتی نەجد کە پێی ئەوترا ( قەردە ) کاروانەکە بۆ حەسانەوە خستبوویان ، سوپای موسڵمانەکان لە ناخلۆف دا دایان بە سەریاندا و ، دەستیان بەسەر کاروانەکەدا هەرهەمووی گرت و ، صەفوان و پاسەوانەکانی کاروانەکە ئەوەندەیان پێ کرا خۆیان هەڵێن و ، بەبێ دەست کردنەوە کاروانەکە بە دەستەوە بدەن . دەست کەوتی ئەم کاروانە بە یەکەم دەست کەوتی جەنگ ئەژمێررا کە تا ئەو کاتە موسڵمانەکان دەستیان کەوتبوو .

موسلمانەکان چاوساغی کاروانەکەیان بە دیل گرت کە فوراتی کوڕی حەییان بوو لەگەڵ دوو پاسەوانی تردا و ، دەست کەوتێکی زۆریان لە قاپ و قاچاخ و زیوی باری کاروانەکە ، هێنایەوە کە ئەوەندە زۆر بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج یەکی لێ جیا کردەوە کە بیست و پێنج هەزار دیرهەم بوو و ، ئەوی تریشی بەسەر موسلمانەکانی ئەم سریەیەدا دابەش کرد و ، فوراتیش لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ موسلمان بوو .

ئەم دەست وەشاندنەی موسلمانەکان بەلایەك و لێقەومانێکی تر بوو کە دوای بەدر تووشی قورەیش بوو ، بۆیە خەم و خەفەت هەموویانی داگرت و ، بە هیچ شێوەیەك ئارامیان لا نەمابوو ، بۆیە بڕیاریان هاتە سەر ئەوە کە ئەبێ تۆڵە لە موسلمانەکان بکەنەوە و جەنگێکی ناهەموار بەرپا بکەن .. هەرواش بوو جەنگی ئوحودیان هەڵ گیرساند .[٣٥٦]

---

[٣٥٦] غزوة أحد لباشميل : ٥٥ ـ ٦٠ ، والرحيق : ٢٤٩ ـ ٢٥١ .

# بەشی بیست و پێنجەم
# غـەزای ئـوحـود

**یەکەم : هۆی بەرپابوونی ئەم جەنگە :**

ئەم جەنگە گـەورە و ناهـەمواره لـە رۆژی شـەممەی پـانزەهـەم رۆژی مـانگی شەووالی سالّی سیّهەمی کۆچییدا لـە نیّـوان موسـلّمانەکان و بـتپەرسـتەکانی مەککەدا رووی دا ..

ئـەم جەنگـە دووهـەم جـەنگی خوێنـاویی بـوو کـە موسـلّمانەکان دژی بـت پەرستەکانی مەککە ئەنجامی بدەن ..

ئەم جەنگە بە پێی خۆئامادەکردن و زۆریی سەرباز لە جەنگی بەدر بە گـەورەتر لە قەڵەم ئەدرێت ..

هۆی بەرپابوونی ئەم جەنگە سەختە ئەوەبوو کە کاتێك قورەیش لە بـەدردا دۆڕا و ، موسڵمانەکان دەستێکی چاکیان لە فەرمانـدە و پاڵـەوان و ، پیاوماقووڵانیـان وەشاند و ، ئابرووی قورەیشیان لەناو دوورگەی عەرەبییدا برد ، قورەیش بڕیاریـان دا کە تۆڵە لە موسڵمانەکان بکەنەوە ، بەوەی کە هێرش بکەنە سـەر مەدینـە و ، وەك چۆن موسڵمانەکان ئەبوجەهلی سـەرۆکیان کوشـت و حـەفتا لـە پاڵـەوانانیان کوشتن و حەفتاشیان لیّ بەدیل گرتن ، وەها ئەوانیش پێغەمبەری خوا ﷺ بکـوژن و ئەوەندەش لەوان بکـوژن و بـە دیـل بگـرن . هـەتا ئـەوەبوو قـورەیش گریـان و شیوەنیان لە کەس وکاری کوژراوان قەدەغـە کـرد و ، داواشـیان کـرد زوو بـە زوو نەچن بە دەم دیلەکانەوە و لە فیدیەدانیش پەلە نەکەن ، تا موسڵمانەکان هەسـت نەکەن ئەمان چەندە خەم بار و لێقەوماون .

ئەوەبوو سەردارانی مەککە سـەریان لـە یـەکتریی ئـەدا و ئـەو خەجاڵـەتیی و سەرشۆڕییەیان بـیری یـەکتر ئەخسـتەوە ، کـە مەگـەر بـە دەسـت وەشـاندن لـە موسڵمانەکان جارێکی تر سەریان بەرز ببێتەوە . بەڵام عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل و ، صەفوانی کوڕی ئومەییە و ، ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و ، عەبدوڵڵای کـوڕی ئەبوڕەبیعە لە هەموو کەس زیاتر دڵیان بۆ ئەو جەنگە چاوەڕوان کـراوە ئـەگرا و ،

بەوپەڕی چالاکی‌یەوە خەڵکیان بۆ جەم ئەکرد و هانیان ئەدان . ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ئەمان لە هەموو کەس زیاتر کۆستیان کەوتبوو .

لە کاتێك‌دا کە قورەیش سەرگەرمی ئەمە بوون ، موسڵمانەکانیش دەستەپاچە دانەنیشتبوون ، بەڵکو خەریکی چالاکیی خۆیان و ، خۆ رێك خستن بوون ، تا لە مەدینەدا دەسەڵاتیان بە هێزتر بێ و ، بناغەی بانگەوازەکەیان بە هێزتر بکەن .

یەکەم کارێك کە قورەیش ئەنجامی دا ئەوەبوو بڕیاریان دا ئەو کاروانەی کە پێش بەدر رزگاری بوو و ، بووە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی بەدر ، بکەنە مەسرەفی جەنگ ، بۆیە بە خاوەن پارە و سامانەکانیان وت : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! موحەممەد پشتی ئێوەی شکاند و ، پیاوە چاکەکانتانی کوشت . جا ئێوە بەم پارەیە یارمەتییمان بدەن لەگەڵیا بجەنگێین ، بەڵکو تۆڵەی لێ بکەینەوە .. ئەوانیش هەموو بە گوێ‌یان کردن و ، کاروانەکەیان ـ کە هەزار وشتر و پەنجا هەزار دینار ، واتە پەنجا هەزار مسقاڵ زێڕ ، بوو ـ بۆ ئەو کارە تەرخان کرد ..

دەربارەی ئەم هەڵوێستە چەوتەی قورەیش قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و ، ورەی موسڵمانەکانی بەرز کردەوە کە ئەو خوانەناسانە کە ماڵ و سامانەکەیان بۆ دژایەتیی دینی خوا خەرج ئەکەن ، ئەوانە تەنها هەناسە هەڵ کێشانی پەشیمانی‌یان بۆ ئەمێنێتەوە و لە ئەنجامیش‌دا ئەدۆڕێن کە ئەفەرموێ :

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ ﴾ ( الأنفال : ٣٦ ) .

قورەیش هەر بەوەوە نەوەستا کە دانیشتوانی مەککە هەڵ بنێن بۆ جەنگ ، بەڵکو کەوتنە رازیی‌کردنی هاوپەیمانەکانیان لە ئەحابیش و ، هۆزەکانی دەوروبەری مەککە لە کینانە و دانیشتوانی توهامە و ، هەموو جۆرە شێوازێکیان بۆ رازیی‌کردنی خەڵك بەکار هێنا . ئەوەبوو صەفوانی کوڕی ئومەییە خۆی گەیاندە لای ئەبوعیززەی شاعیر ، کە لە بەدردا بە دیل گیرابوو و ، لە بەر هەژاریی و دەست‌کورتیی و منداڵی وردی پێغەمبەری خوا ﷺ بەزەیی پیایا هاتەوە و ، بەبێ فیدیە بەرەڵای کرد و ، بەڵێنی لێ وەرگرت کە لە دژی چەك هەڵ نەگرێ .. صەفوان کەوتە هەڵ نانی ئەبوعیززە و بەڵێن پێ‌دانی کە ئەگەر لەم جەنگەدا بە سەلامەتیی گەڕایەوە ئەوا ئەوەندە پارەی بداتێ تا دەوڵەمەند ببێ و ، گەر نەش

گەڕایەوە چاوی لە کچەکانی بێ و ، وەك کچەکانی خۆی سەرپەرشتی‌یان بکات ، بەو مەرجەی هۆزەکانی دەوروبەری مەککە هەڵ بنێ و ، بۆ جەنگی موسڵمانەکان کۆیان بکاتەوە .. لە سەرەتاوە کابرا حەزی نەئەکرد بەشداریی بکات و ، ئەی وت کە موحەممەد بەبێ فیدیە ئازادی کردووم و حەز ناکەم دژایەتیی بکەم . بەڵام صەفوان کۆڵی نەدا هەتا ئەو بەدبەختەی رازیی کرد . ئیتر ئەبوعیززە دەستی دایە هەڵ نانی نەوەی کینانە و دانیشتوانی توهامە لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، بە شیعر خوێندن دڵیانی ئەهێنایە جۆش .

هەروەها شاعیرێکی تریشیان بۆ ئەم مەبەستە بەکار هێنا کە ئەویش موسافیعی کوڕی عەبدمەنافی جومەحیی بوو . هەروەها ئەبوعامیری راهیب یش ، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا ئەبوعامیری فاسق ، بە هەمان شێوە هۆزەکانی لە دژی موسڵمانان هەڵ ئەنا..

هۆیەکی تریش بۆ زیاتر دڵ گەرم‌بوونی قورەیش بۆ هێرش‌کردنە سەر موسڵمانەکان ، ئەو زیانە گەورەبوو کە موسڵمانەکان لە قورەیشیان خست ، ئەویش بە دەست گرتنیان بەسەر کاروانە قورەیشی‌یەکەدا ، کە ئەوەبوو لە مانگی جومادی دووهەمی ساڵی سێ‌هەم‌دا بە سەرکردایەتی زەیدی کوڕی حاریثە رێیان پێ گرت ، کە بە راستیی پشتی ئابووریی مەککەی شکاند و ، مەککەی تووشی خەفەتێکی زۆر کرد ..[٣٥٧]

**دووهەم : فەرماندە و ژمارەی سوپای قورەیش :**

دانیشتوانی مەککە هەروا خەریکی خەڵك کۆکردنەوە بوون بۆ جەنگی موسڵمانان ، تا ئەوەبوو ژمارەی سەربازەکانیان گەیشتە سێ هەزار جەنگاوەر ، کە دوو هەزار و نۆصەدیان لە قورەیش و هاوپەیمان و هاوکۆمەك و ئەحابیشەکان و،[٣٥٨] صەد کەسیشیان لە هۆزەکانی کینانە بوون .

---

[٣٥٧] غزوة أحد لباشميل : ٦١ ـ ٦٥ ، الرحيق : ٢٥٢ ـ ٢٥٣ ، السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ١٨٦ .

[٣٥٨] ئەحابیش : بە چەند هۆزێك ئەوترێت کە قورەیشیی نەبوون ، وەك نەوەی موصطەلەق و نەوەی هەون، کە بوونە هاوپەیمانی قورەیش .. بە هۆی ئەوەشەوە ناونران ئەحابیش ، ئەوەبوو لە نزیك چیایەك‌دا کە ناوی ( حبشيى ) بوو ، لە باشووری مەککە ، لەگەڵ قورەیش‌دا کۆبوونەوە و ، پەیمانیان دا کە هەتا شەو تاریکایی و رۆژ رووناکیی بهێنێ و، هەتا چیای ( حبشيى ) لە شوێنی خۆی‌دا بێ ، یەك دەست و یەك دڵ لەگەڵ قورەیش‌دا بن دژی هەر کەسێك کە دژی قورەیش بووەستێ ..

ئەم سوپا گەورەیە ، کە دوورگە هێشتا سوپای وەهای بە خۆیەوە نەدیبوو ، سێ هەزار وشتری لەگەڵدا بوو بۆ سواریی و ، بار هەڵگرتن و ، دووصەد ئەسپیش بۆ سوارچاکان ، هەرچەندە لە ( فتح الباري ) دا صەد ئەسپ باس کراوە . بۆ پارێزگاریی جەنگاوەرانیش شەش‌صەد یان حەوت‌صەد قەڵغانیان پێ بوو ..

قورەیش ، بۆ فەرماندەی گشتیی ئەم هەڵمەتە گەورەیە ، ئەبوسوفیانی کوڕی حەربی هەڵبژارد و ، بۆ فەرماندەی سوارچاکانیش خالیدی کوڕی وەلیدی[٣٥٩] هەڵ بژارد و ، عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهلیش یارمەتی‌دەری بێت .. هەڵگرتنی ئاڵای سوپاش وەك لەوەو پێش بە نەوەکانی عەبدودداری کوڕی قوصەی سپێررا .

سەرەتا ئاڵا بە دەست طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحەی عەبدەری‌یەوە بوو ، کە ئەم پیاوە یەکەم پیاوی کوژراو بوو لە هەڵگرانی ئاڵای قورەیش ، کە ئەوەبوو لە سەرەتای جەنگ‌دا موسڵمانەکان تاقیان لێ برینەوە ، بە شێوەیەك کە ئاڵای قورەیش کەوتە زەویی و ، تێك شکان ..[٣٦٠]

**سێهەم : بەشداریی ئافرەتانی قورەیش :**

دوای تەگبیری جەنگ هاتنە سەرباسی بەشداریی ئافرەتان . لە هەموو کەس زیاتر هیندی کچی عوتبە سوور بوو لەسەر بەشداریی ئافرەتان لەم جەنگەدا .. ئەوەبوو قیژاندی بەسەر ئەوانەدا کە نەیان‌ئەویست بەشداریی بکەن و ، لەسەر رای

---

[٣٥٩] خالیدی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرەی مەخزوومیی قورەیشی‌یە ، کە بە شمشێری خوا ناسراوە و ، فەرماندەی سەرکەوتووی ناودار و هاوەڵی فیداکار و رزگارکەری مرۆڤەکانە . لە سەردەمی نەفامیی‌دا یەکێك بووە لە ناودارانی قورەیش .. پاڵەوانی جەنگ و سوارچاکی بێ‌وێنە بووە .. لە هەموو جەنگەکان‌دا هەتا عومرەی حودەیبیە لەگەڵ موسڵمانەکان‌دا جەنگاوە ، تا ئەوەبوو خوا هیدایەتی دا و ، پێش فەتحی مەککە و ، لە ساڵی حەوتەمی کۆچیی‌دا ، پێش جەنگی موئتەش ، لەگەڵ عەمری کوڕی عاص‌دا ، پشتی سەربازگەی قورەیشیان شکاند و ، هاتن موسڵمان بوون .. پێغەمبەری خوا ﷺ بە موسڵمان‌بوونی زۆر گەشایەوە ، ئەوەبوو کردیە فەرماندەی سوارچاکان و، دوای کەمێك جەنگی موئتە رووی دا و ، بە حەکیمانە سوپا خنجیلانەکەی ئیسلامی لە ژێر چنگی سوپا بێ‌شومارەکەی رۆم رزگار کرد و بە سەری بەرزەوە گەڕایەوە مەدینە . لە جەنگی پاشگەزبووەکان‌دا ئەبوبەکر ناردی بۆ ناوچەی نەجد و دوای کوشتنی موسەیلەمەی درۆزن ، دانیشتوان گەڕانەوە سەر ئیسلام . لە ساڵی دوانزەهەمی کۆچیی‌ش‌دا رووی لە عێراق نا و بەشێکی زۆری عێراقی رزگار کرد . پاشان بە فەرمانی خەلیفە ئەبوبەکر بەرەو شام کەوتە رێ و ، لەوێ بووە فەرماندەی سوپای موسڵمانان و ، دوای وەفاتی ئەبوبەکر ، عومەر خالیدی لە فەرماندەیەتیی خست و ئەبوعوبەیدەی لە جێی دانا . خالید دەستی سارد نەبۆوە ، بەڵکو مەردانە کۆششی ئەکرد هەتا ئەوەبوو لە ساڵی ( ١٤ ) ی کۆچیی‌دا خوا سەرکەوتنی بە موسڵمانەکان بەخشیی . دەربارەی خالید ئەبوبەکر فەرموویە : ئافرەتان ناتوانن پیاوێکی تری وەك خالید ببینن . بوخاریی و موسلیم ( ١٨ ) فەرموودەیان لە خالیدەوە ریوایەت کردووە . سەرەنجام لە ساڵی ( ٢١ ) ی کۆچیی‌دا لە سوریا و لە شاری حیمص کۆچی دوایی کرد .

[٣٦٠] الرحيق : ٢٥٣ ، غزوة أحد لباشميل : ٦٥ ـ ٦٧ .

خۆی پێی داگرت ، تا ئەوەبوو پانزە ئافرەتی ناوداری قورەیش لەم جەنگەدا ، بۆ هەڵنانی پیاوان و هەڵ نەهاتنیان لە جەنگ ، بەشداری‌یان کرد ، کە ئەمانە هەندێکیانن :

١ ـ هیندی [٣٦١] کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی هاوسەری ئەبوسوفیان .

٢ ـ ئوم حەکیمی [٣٦٢] کچی حاریثی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی هاوسەری عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل .

٣ ـ فاطیمەی [٣٦٣] کچی وەلیدی کوڕی موغیرەی هاوسەری حاریثی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرە .

٤ ـ بەرزەی کچی مەسعوودی کوڕی عەمری ثەقەفیی [٣٦٤] هاوسەری صەفوانی کوڕی ئومەییە .

٥ ـ ڕەیطەی کچی مونەببیهی کوڕی حەجاجی سەهمیی [٣٦٥] هاوسەری عەمری کوڕی عاص .

٦ ـ سەلافەی کچی سەعدی کوڕی شەهیدی ئەنصاریی ئەوسیی ، [٣٦٦] هاوسەری طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحە .

٧ ـ خوناسی کچی مالیکی کوڕی میضرەب ، کە ئافرەتێکی نەوەی مالیك بوو لەگەڵ ئەبوعەزیزی کوڕی عومەیری کوڕیدا . ئەم ئافرەتە دایکی موصعەبی کوڕی عومەیری هەڵ گری ئاڵای موسڵمانەکان بوو .

---

[٣٦١] ژیانی ئەبوسوفیان و هیندی هاوسەری لە ژیان‌نامەی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان‌دا خوا لێیان ڕازیی بێ بە درێژە باس کراوە .

[٣٦٢] شتێك لە هەڵوێستی ژیرانە و مەردانەی ئەم ئافرەتە بەڕێزەش لەگەڵ ژیان‌نامەی عیکریمەی هاوسەری‌دا نووسراوە .

[٣٦٣] فاطیمەی کچی وەلید خوشکی خالیدە و ، ڕۆژی فەتحی مەککە موسڵمان بووە و بەیعەتی بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە . هاوەڵێکی بەڕێزی ژیر و بەسەلیقە بووە ، بە جۆرێ کە لە هەندێ کاروباردا خالیدی برای پرسی پێ کردووە . تەنها یەك فەرموودەی ڕیوایەت کردووە .

[٣٦٤] بەرزەی کچی مەسعود لە ڕۆژی فەتح‌دا لەگەڵ صەفوانی مێردی‌دا موسڵمان بوون .

[٣٦٥] ڕەیطەی کچی مونەببیه دایکی هاوەڵی خواناس و دنیانەویست عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص بووە ، دوای مێردەکەی موسڵمان بووە ، لە ڕۆژی فەتح‌دا و بەیعەتیشی بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە . شایانی باسە کە عەمری هاوسەری لەگەڵ خالیددا لە ساڵی حەوتەم‌دا بوو خۆیان گەیاندە مەدینە و موسڵمان بوون .

[٣٦٦] سەلافە دایکی عوثمانی کوڕی طەلحەیە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا بانگی کرد و کلیلەکانی کەعبەی دایە دەست . لە جەنگی ئوحوددا طەلحەی مێردی سەلافە ، کە فەرماندەی هەڵ گرانی ئاڵای قورەیش بوو کوژرا و ، لە ڕۆژی فەتح‌دا کلیلی کەعبە بە لای ئەم ئافرەتە بەڕێزەوە بوو و ، لە ساڵی فەتح‌دا موسڵمان بووە و بە پلەی هاوەڵیی گەیشتووە .

٨ ـ عومەرەی کچی عەلقەمە ، کە یەکێ لە ئافرەتانی نەوەی حاریشی کوڕی عەبدمەنات بوو لە هۆزی کینانە .[٣٦٧]

**چوارەم : سوپای مەککە نەکەوێتە ڕێ :**

بەر لەوەی سوپای مەککە بکەوێتە ڕێ و ، هێشتا لە مەککەدا بوو ، جوبەیری کوڕی موطعیم[٣٦٨] بانگی کردە غولامێکی حەبەشیی خۆی کە ناوی وەحشییی[٣٦٩] بوو و ، بە وێنەی حەبەشی‌یەکان حەربەکەی خۆی ئەهاویشت و کەم هەڵەی ئەکرد. بانگی کرد و داوای لێ کرد کە لەگەڵ سوپادا بکەوێتە ڕێ و ، لە کاتی جەنگ‌دا نیشانەی حەمزەی کوڕی عەبدولموطەللیب بگرێت و بە حەربەکە بی‌کوژێ ، ئەوەبوو پێی وت : ئەگەر تۆ توانیت لە بری طوعەیمەی کوڕی عەدیی مامەم دا ( کە ڕۆژی بەدر حەمزە کوشتبووی ) حەمزەی مامەی موحەممەد بکوژیتەوە ، ئەوا ئازاد بە . هەروەها هیندیش بۆ کوشتنی حەمزە وەحشیی هەڵ ئەنا لەسەر ئەوەی کە خۆشەویستانی ئەویشی لە بەدردا کوشتبوو .

دوای ئەوەی کە هەموو پێویستیی و کەرەسەیەکی جەنگ ئامادە کرا ، سوپا گەورەکەی قورەیش ، بە دڵێکی پڕ لە قین و قارەوە بۆ کوشتن و بڕین و تۆڵەسەندن، بەرەو مەدینەی پایتەختی موسڵمانان کەوتە ڕێ ..

سوپای مەککە ئەمجارە وەك سوپاکەی بەدریان نەبوو .. یەکجار ڕێك و پێکیی پێوە دیار بوو .. فەرماندەکان هیچ جیاوازیی و دووبەرەکی‌یەك لە نێوانیاندا ڕووی نەدا هەتا کۆتایی بە جەنگ هات و گەڕانەوە دوا ..

---

[٣٦٧] غزوة أحد لمحمد أحمد باشميل : ٦٧ ـ ٦٩ .

[٣٦٨] جوبەیری کوڕی موطعیمی کوڕی عەدیی کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدمەنافی قورەیشیی لە سەردەمی نەفامییدا یەکێ بووە لە سەردارانی قورەیش . بە چاکیی موسڵمان بووە و ، هاوەڵێکی چاکی پایەداری لێ دەرچووە و ، بۆتە یەکێ لە کەڵە زانا و سەردارانی قورەیش و ، لە ناسینی ڕەچەڵەکیش‌دا دەستێکی باڵای هەبووە . بوخاریی و موسلیم ( ٦٠ ) فەرموودەیان لێ‌یەوە ڕیوایەت کردووە . ساڵی ( ٥٩ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە ، خوا لێی ڕازیی بێ .

[٣٦٩] وەحشیی کوڕی حەرب ، ئەبودەسمە ، لە بەندەکانی نەوەی نەوفەل بووە و ، لە سەردەمی نەفامییدا یەکێ بووە لە بەندە پاڵەوانە ئازادکراوەکان .. لە ئوحوددا حەمزەی شەهید کردووە و ، لەگەڵ نوێنەری طائیف دا هاتۆتە مەدینە و موسڵمان بووە و ، بۆتە هاوەڵ . بەشداریی جەنگی پاشگەزبووەکانی کردووە و ، یەکێ بووە لەو دوو کەسەی کە موسەیلەمەی درۆزنیان کوشتووە . دوایی ئەی وت : بەم حەربەیەم چاکترین کەسم کوشتووە ( واتە حەمزە ) و ، خراپ‌ترین کەسیشم کوشتووە ( واتە موسەیلەمەی درۆزن ) . لە شاری حیمص و لە ساڵی ( ٢٥ ) کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە .

سوپای قوڕەیش ڕێی بڕیی هەتا گەیشتە ناوچەی ئەبواء ، کە لەو شوێنەدا ئامینەی دایکی پێغەمبەری خوا ﷺ نێژراوە . کە گەیشتن هەندێ لە هەرچیی و پەرچی‌یان ویستیان قەبرەکەی بکەننەوە ، بەڵام سەرۆکەکانیان بەوە ڕازیی نەبوون تا ئەوە نەبێتە باوێکی ناشیرین لەناو عەرەبدا و وتیان : شتی وەها باس نەکەن ، ئەگەر ئێمە شتی وەها بکەین ئەوا نەوەی بەکر و نەوەی خوزاعەش قەبری مردووەکانی ئێمە ئەکەننەوە .

هەروەها قوڕەیش هاتن تا ئەوەبوو لە لاپاڵێکی کێوی ئوحود دا ، کە پێنج میل لە مەدینەوە دوور بوو ، خستیان .[370]

**پێنجەم : هەواڵی قوڕەیش ئەگاتە مەدینە :**

وەك لە جەنگی بەدردا باسمان کرد ، ئەوەبوو عەبباسی مامەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای فیدیەدانی لە دیلیی ئازاد کرا و گەڕایەوە مەککە . جا هەر چەندە موسڵمان‌بوونی خۆی ئاشکرا نەکردبوو ، بەڵام دڵسۆزی موحەممەدی برازای بوو و ، ئەترسا تووشی زیان ببێ ، بۆیە بە وردیی چاودێریی هەڵس و کەوت و جم و جووڵی سوپای قوڕەیشی ئەکرد ..

ئەمجارەش کە قوڕەیش لەشکری پێکەوە ناوە و ، وا بەرەو مەدینە ئەکشێ ، عەبباس ئاگاداری هەموو شتێ بوو ، بۆیە وای بە چاك زانیی بە نامەیەك بە دوور و درێژیی موحەممەدی برازای لە سوپای مەککە ئاگادار بکات ..

ئەوەبوو پیاوێکی متمانەپێکراوی لە هۆزی غیفار بۆ ئەم کارە گرنگە هەڵ بژارد و ، فەرمانی پیا دا کە بە پەلە خۆی بگەیەنێتە مەدینە . کابرا لە ماوەی سێ ڕۆژدا ئەو ڕێ دوورەی بڕیی ، کە پێنج سەد کیلۆمەتر ئەبوو و ، بە شێوەی ئاسایی لە دە ڕۆژ کەمتردا نەئەبڕڕا . گەیشتە مەدینە و نامەکەی لە مزگەوتی قوبادا دایە دەستی موبارەکی پێغەمبەری خوا ﷺ ..

جا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندەواریی نەبوو نامەکەی دایە دەست ئوبەی کوڕی کەعب[371] تا بۆی بخوێنێتەوە . دوای ئەوەی کە لە ناوەڕۆکی

---

[370] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ١٨٧ . غزوة أحد لمحمد أحمد باشميل : ٧١ ، الرحيق المختوم : ٢٥٤ .

[371] ئوبەی کوڕی کەعبی کوڕی قەیس کوڕی عوبەیدی ئەنصاریی نەجاریی ، سەرداری قورئان خوێنانە و ، هاوەڵێکی پایەدارە و ، ئامادەی پەیمانی عەقەبەی دووهەم بووە و ، بەشداریی بەدر و هەموو ڕووداوەکانی تری لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ کردووە . عومەری کوڕی خەططاب ناوی سەرداری موسڵمانانی لێ نابوو . یەکەم کەس بوو کە نامەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیی و ، یەکێکیش بوو لەو شەش کەسەی کە لە مەدینەدا

نامەکە گەیشت ، فەرمانی بە ئوبەی دا هیچیٚ لە نامەکە لای کەس نەدرکیٚنیٚ . پاشان هەواڵی بە چەند هاوەڵیٚکی دا و فەرمانی دا ئەوانیش لای کەس باسی نەکەن . یەکیٚ لەو هاوەڵانەی کە بە تایبەتیی لەو هەواڵە ئاگادار کرا سەعدی کوڕی رەبیع بوو و ، کە ئەوەی بیست وتی : بەخوا هیوادارم خیٚری پیٚوە بیٚ . پیٚغەمبەر ﷺ فەرمانی دا کە لەلای هیچ کەس باسەکە نەدرکیٚنیٚ . کە پیٚغەمبەری خوا ﷺ لەلای سەعد تەشریفی بردە دەرەوە ، ژنەکەی پرسیی : ئەوە پیٚغەمبەری خوا چیی پیٚ فەرمووی ؟

وتی : ئافرەت چیت داوە لەوە ؟ وتی : بە گویٚوە بووم چیی پیٚت فەرموو . ئەو باسەی بۆ میٚردەکەی گیٚڕایەوە کە پیٚغەمبەری خوا ﷺ بە نهیٚنیی پیٚی فەرموو . سەعد ئیسترجاعی کرد و دەستی ژنەکەی گرت و بە پەلە خۆی گەیاندە خزمەتی پیٚغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەی دایە و وتی : ئەی پیٚغەمبەری خوا ! ترسام ئەم هەواڵە بڵاوە بکات و ، تۆش وا بزانی کە من بڵاوم کردۆتەوە ، لە کاتیٚکدا کە فەرمانت داوە نەیدرکیٚنم . فەرمووی : وازی لیٚ بهیٚنە .

جا بۆ ساغ کردنەوەی ئەم هەواڵە ، پیٚغەمبەری خوا ﷺ دوو برای بە ناوی ئەنەس و موئنیس کوڕانی فوضالە ناردن تا هەواڵی قوڕەیشی بۆ وەربگرن . کە رۆیشتن ئەبینن سوپایەکی گەورەی قوڕەیش چەند میلیٚك لە مەدینەوە دوورە و ، شیوی عەقیق ی گرتۆتە بەر و بە لای راستدا گەیشتۆتە شیوی ( القناة ) و ، لە باکووری مەدینەدا و ، لە شویٚنیٚکی نزیکی چیای ( عینین ) ، کە لەمەو دوا ناونرا چیای ( الرماة ) ، هەڵی داوە و ، لەوەدا نەماوە بە شیٚوەی هەواڵیٚکی نهیٚنیی بمیٚنیٚتەوە . هەروەها بە دوای ئەو دوانەدا حوبابی کوڕی مونذیریش رەوانە کرا و هەمان هەواڵی هیٚنایەوە .[٣٧٢]

**شەشەم : خۆ ئامادەکردنی مەدینە :**

سوپای قوڕەیش لە رۆژی جومعەی چواردەهەم رۆژی مانگی شەووالی ساڵی سیٚهەمی کۆچییدا لە نزیك کیٚوی ئوحوددا جیٚگیر بوو .[٣٧٣]

---

فەتوایان ئەدا . خەلیفە عومەر دەربارەی کاری گرنگ پرسیاری لیٚ ئەکرد و داوای چارەسەریی گیروگرفتی لیٚ ئەکرد . صەد و پەنجا و حەوت فەرموودەی لە پیٚغەمبەری خواوە ﷺ ریوایەت کردووە و ، لە ساڵی ( ٣٠ ) کۆچییدا و لە سەردەمی خەلیفە عوثماندا کۆچی دوایی کردووە .

[٣٧٢] غزوة أحد : ٧١ ـ ٧٥ ، الرحيق : ٢٤٥ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ١٨٧ .

[٣٧٣] لە الرحيق المختوم دا : ٢٥٥ وا هاتووە کە لە شەشەم رۆژی شەووالدا بووە .

لەگەڵ ئەم ڕووداوەدا موسڵمانان کەوتنە خۆ و ، هەرچیی پیاویان هەبوو داوایان لێ کرا ئامادە بن و ، بە هیچ شێوەیەك بێ‌چەك نەبن . هەتا لە کاتی نوێژیش‌دا ئامادەیی هەموو ڕووداوێك بن ، بە تایبەتیی بەشی زۆری هاوەڵان لە مزگەوتی پێغەمبەر ئەمانەوە ، بۆ پارێزگاریی لە پێغەمبەری خوا ﷺ . هەتا لە هەموو دەرگا و کەلەبەرێکی شاریش‌دا پاسەوانیان دانا .

بەڵێ ، ئەنصار زۆر بە ئیخلاصەوە پاسەوانیی پێغەمبەری خوایان ﷺ ئەکرد ، بە تایبەت سەردارەکانیان وەك سەعدی کوڕی موعاذ و ، ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و، سەعدی کوڕی عوبادە . شەو بە چەکەوە لەبەردەرگاکەی‌دا ئەمانەوە .

هەواڵ زانانی سوپای مەدینە هەواڵ لە دوای هەواڵ و ، ڕووداو لە دوای ڕووداو هەموو شتێکیان ئەگەیاندە سەرکردایەتیی مەدینە . جا کە هەواڵی گەیشتنی سوپای مەککە ساغ بوویەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەوەیەکی گەورەی لەگەڵ سەردارانی موسڵمانان‌دا کرد ، تا بە ڕاگۆڕینەوە بگەنە ئەنجامێکی باش تا بزانن چ هەڵوێستێك بگرنە بەر ، بۆ پەرچ‌دانەوەی ئەم هێرشەی قوڕەیش کە بە هەموو توانایەکیانەوە هاتوون بۆ قەڵاچۆکردنی موسڵمانان و ، ڕووخاندنی دەوڵەتە ساواکەیان .

ئەو کۆبوونەوەیە لە ڕۆژی جومعەدا بوو و ، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوولی سەرۆکی مونافیقانیش لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە بوو . ئەوەبوو لە شەوی ئەو جومعەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ خەوێکی بینیی و ، لەو کۆڕە گرنگەدا بۆ هاوەڵانی گێڕایەوە و فەرمووی : (( إني قد رأيت والله خيراً ، رأيت بقراً تُذبح ، ورأيت في ذباب سيفي ثلماً ، ورأيت أني أدخلتُ يدي في درع حصينة ، فأوَّلتُها المدينة )) . فەرمووی : خەوێکم دیوە خوا بە خێری بگێڕێ . چەند گایەکم دیتن کە سەر ئەبڕان و ، دیتم نووکی شمشێرەکەشم کەل بوو ، هەروەها دیتم کە دەستم بەناو قەڵغانێکی مەحکەم دا کرد ، کە بە مەدینەم لێك دایەوە .

ئەمەش دەربارەی لێك دانەوەی پاشماوەی خەوەکەی هاتووە کە فەرموویە : (( فأما البقر فأناس من أصحابي يقتلون ، وأما الثلم فهو رجل من أهل بيتي يقتل )) . فەرمووی : گاکان ئەوە ئەگەیەنن کە چەند هاوەڵێکم ئەکوژرێن و ، کەل بوونەکەش ئەوە ئەگەیەنێ کە پیاوێکی ئەهل و بەیتم ئەکوژرێ .

دەربارەی شوێنی موسڵمانان وت و وێژێکی زۆر کرا .. ئایا لە ناو شاردا بمێننەوە ، یان بچنە دەرەوە و لەگەڵ دوژمن دا بجەنگێن . رای پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوەدا بوو کە موسڵمانان لە ناو شاردا بمێننەوە ، تا قورەیش ناچار بکەن هێرش بکاتە سەر مەدینە و ، ئەوسا موسڵمانان دەستیان لێ بوەشێنن . پیاوە بەتەمەنە ئەنصار و موهاجیرەکانیش هەمان رایان هەبوو ، هەتا عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیش هەمان بۆچوونی هەبوو . ئەوەبوو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! لە ناو شاردا بمێنەرەوە و بەرەو روویان دەرمەچۆ . بەخوا هەرچیی بەرەو رووی دوژمن دەرچووبین دەستی لێ وەشاندووین و ، هەرچیی هاتبێتیشە سەرمان دەستمان لێ وەشاندووە ، ئەی ئەگەر تۆشمان لە ناودا بی؟ ئەگەر ئەوان لەوێ ئەمێننەوە خراپیان بەسەر دێ و ، گەر بێنە ناو شاریشەوە ، پیاوان بەرەو روویان ئەجەنگن و، ژنان و منالانیش بەسەر بانەکانەوە بەردیان تێ ئەگرن و ، گەر ئەش گەڕێنەوە بە سەری شۆڕەوە ئەگەڕێنەوە .

عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی وەك سەرۆکێکی خەزرەج ئامادەی ئەو کۆبوونەوە بوو ، بەڵام لەوە ئەچێ ئەم رایەی بۆ ئەوە هەڵ نەبژاردووە کە ئەمە راستە و بۆ موسڵمانان چاکە ، بەڵکو بۆ ئەوە پێی خۆش بوو تا بەڵکو کەس پێی نەزانێ و هەوڵ بدات خۆی لە جەنگ بدزێتەوە . کەچیی خوای گەورە ئەویش و هاوەڵەکانی بە موسڵمانان ناساند و ، ئەو پەردەی کوفر و نیفاقەی کە دابوویان بەسەر خۆیان دا لادا و لە ناسكترین کاتدا دەری خستن کە چۆن مارێکن و لە ژێر پووشدا خۆیان مەلاس داوە .

بەڵام بەشێکی زۆری هاوەڵان ، بە تایبەت ئەو گەنجە دڵ گەرمانەی کە ئامادەی جەنگی بەدر نەبوو بوون ، یان ئامادەی بوو بوون و ، لەزەتی سەرکەوتنیان چەشتبوو ، ئەوانە وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە ئاواتمان بۆ ئەم رۆژە خواستووە ، بمانبەرە دەرەوە بەرەو رووی دوژمنەکانمان ، با وا هەست نەکەن کە لەبەر دەمیاندا بە ترسنۆك یان لاواز دەرچووین . یەکێ لەو خوێن گەرمانە حەمزەی کوڕی عەبدولموطەللیب بوو ، خوا لێی رازیی بێ ، کە بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت :

بەو خوایەی کە قورئانی بۆ ناردوویت هەتا بە شمشێرەکەم لە دەرەوەی مەدینە دا کوشتاریان نەکەم هیچ خۆراکێك تام ناکەم !!

دوای وت و وێژ و راوێژێکی زۆر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرکەوت کە زۆربەی هاوەڵان لەگەڵ دەرچوون‌دان و مانەوەی مەدینە بە چاك نازانن . لەبەرئەوە ئەویش چووە سەر رای ئەوان و بڕیاری دا کە ئەچنە دەرەوەی شار و لەوێ لەگەڵ دوژمن دا بەرامبەر ئەبنەوە ، هەرچەندە حەزیشی بە دەرچوون نەبوو .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جومعەی بۆ موسڵمانەکان کرد و ، لە وتارەکەی‌دا ئامۆژگاریی موسڵمانانی کرد و ، قیامەتی بیر خستنەوە و ، غیرەت و دامەزراویی هێنایەوە یادیان . دوای نوێژ چووە ژوورەوە و ، دوو قەڵغانی لەبەر کرد و ، هاتە دەرەوە بۆ ناو هاوەڵان . کە دڵگەرم و خوێن‌گەرمەکان پێغەمبەری خوایان ﷺ بەو حاڵەوە بینیی پەشیمان بوونەوە و ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە ناچاری دەرچوونمان کردی و ، مافی ئەوەشمان نەبوو . جا ئەگەر ویستت لەسەرە لەناو شاردا بمێنەرەوە . ئەویش فەرمووی : (( ما ينبغي لنبي إذا ليس لأمته أن يضعها حتى يحكم الله بينه وبين عدوه )) . فەرمووی : ناگونجێ پێغەمبەرێك جل و بەرگی جەنگ بپۆشێ و دای‌بنێتەوە ، هەتا خوای گەورە بڕیارێك بۆ ئەو و دوژمنەکەی دەر نەکات ..

موسڵمانان لە دەوروبەری مەدینەوە کۆ بوونەوە و هاتنە مزگەوتی پێغەمبەری خوا و ، نوێژی عەصریشیان بەجێ هێنا .. هەزار جەنگاوەر لە مەدینەدا کۆ بوونەوە .. جارچیی پێغەمبەری خوا ﷺ جاڕی لە شار دەرچوونی سوپای ئیسلامی دا .. وتمان سوپا لە هەزار جەنگاوەر پێك هاتبوو کە تەنها صەد قەڵغان و پەنجا ئەسپیان لەگەڵ دا بوون . بەڵام ئیبن حەجەر دەری بڕیوە کە ئەسپیان پێ نەبووە و ، واقیدییش باسی ئەوەی کردووە کە تەنها پێغەمبەری خوا ئەسپێك و ئەبوبوردەش ئەسپێکی پێ بووە .

پێش‌نوێژیی مەدینە بۆ ئەوانەی کە لە شاردا ئەمێننەوە بە ئیبن ئوم مەکتووم سپێررا و ، پێغەمبەری خواش ﷺ سوپاکەی کرد بە سێ کەتیبەوە :

١ ـ کەتیبەی موهاجیرەکان ، کە ئاڵاکەی بە موصعەبی کوڕی عومەیری عەبدەریی سپارد .

٢ ـ کەتیبەی ئەوس ، کە ئاڵاکەی بە ئوسەیدی کوڕی حوضەیر سپارد .

٣ ـ کەتیبەی خەزرەج ، کە ئاڵاکەی بە حوبابی کوڕی مونذیر سپارد .

سوپا بەرەو باکوور کەوتە ڕێ و لە شار دەرچوو و، هەردوو سەعدیش ( سەعدی کوڕی موعاذی سەرداری ئەوس و ، سەعدی کوڕی عوبادەی سەرداری خەزرەج ) خۆیان بە زرێ داپۆشیی بوو و وەك پاسەوان پێشی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبوون.

کە سوپا لە ( ثنية الوداع ) تێپەڕی کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بە کەتیبەیەکی چەکداری ڕێك و پێك کەوت کە لە سوپاکەی خۆی جیا بوو و بە تەنیا ئەڕۆیشت . کە پرسیاری کرد ئەوانە کێن ؟ هەواڵیان دایە کە ئەوانە جوولەکە هاوپەیمانەکانی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەین . فەرمووی : (( هل أسلموا ؟ )) فەرمووی: موسڵمان بوون ؟ وتیان : نەخێر . فەرمووی : (( لا حاجة لنا فيهم ، إنا لا نستعين بكافر على مشرك )) تێی گەیاندن کە موسڵمانان پێویستی‌یان بە کۆمەکیی ئەوان نیە و ، لە دژی موشریکان کۆمەکیی لە کافران وەرناگرن ..

ئەمە کارێکی یەکجار چاك بوو ، چونکە ئەوانە کۆمەڵێك بوون لەگەڵ ناپاکیی و نیفاق ڕاهاتبوون و ، جێی متمانە نەبوون .

کە سوپای ئیسلام گەیشتە شوێنێك بە ناوی (( الشيخان )) پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای ڕیز کرد و ، هەرچیی منداڵ بوو و بەرگەی جەنگی نەئەگرت گێڕایەوە دوا ، کە لەوانە : عەبدوڵلای کوڕی عومەر و ، ئوسامەی کوڕی زەید و ، ئوسەیدی کوڕی ظوهەیر و ، زەیدی کوڕی ثابیت و ، زەیدی کوڕی ئەرقەم و ، عەڕڕابەی کوڕی ئەوس و ، عەمری کوڕی حەزم و ، ئەبوسەعیدی خودریی و ، زەیدی کوڕی حاریثەی ئەنصاریی و ، سەعدی کوڕی حەببە و ، بەڕائی کوڕی عازیب ، هەرچەندە کە بوخاریی فەرموودەی لە بەرائەوە ریوایەت کردووە ، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەراء بەشداریی ئەو جەنگەی کردووە .

لە ناو منداڵاندا تەنها دوو منداڵ ماوەیان درا بەشداریی جەنگی ئوحود بکەن کە ڕافیعی کوڕی خودەیج و سەمورەی کوڕی جوندوب بوون . لەبەر ئەوەی کە ڕافیع لە تیروەشاندندا زۆر کارامە بوو و ، پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی دا . سەمورەش وتی : من لە ڕافیع بەهێزترم و ئەشیدەم بە زەویی‌دا . کە ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا لەبەردەمی‌دا زۆران بگرن . کە زۆرانیان گرت ، سەمورە ڕافیعی بە زەویی‌دا دا و ، ماوەی ئەویش درا ..

هەر لەو شوێنەدا ئێوارە بەسەر سوپای ئیسلام‌دا هات و ، نوێژی مەغریب و عیشایان لەوێ بەجێ هێنا و ، پەنجا پیاو بۆ پاسەوانیی سەربازگەی ئیسلام هەڵ

بژێرران و ، پاڵەوانی لە ناوبردنی کەعبی کوڕی ئەشرەف ، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ، بە فەرماندەی ئەو پەنجا پیاوە دانرا و ، ذەکوانی کوڕی عەبدقەیسیش بە تایبەتیی کرایە پاسەوانی پێغەمبەری خوا ﷺ .

بەیانی زوو ، بەر لە فەجر سەربازانی ئیسلام هەستان و بەو تاریکەیە کەوتنە ڕێ ، هەتا گەیشتنە ( شوط ) و لەوێ نوێژی فەجریان بە جێ هێنا ، کە یەکجار لە سوپای دوژمن نزیك کەوتبوونەوە ، بە ڕادەیەك کە یەکتری‌یان ئەبینیی .

ئا لەو شوێنەدا و لە بەردەم سوپای مەککەدا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵ گەڕایەوە و ، سێ‌صەد جەنگاوەریشی هەڵ خەڵەتاند و ، ئەوانیشی گێڕایەوە دوا و ، ئەی‌وت : بە گوێی ئەوانی کرد و لە قسەکەی من یاخیی بوو ( واتە لە شاردا نەمایەوە ) ، خەڵکینە ! لەم شوێنەدا بۆچ خۆمان بە کوشت بدەین ؟ ئیتر بەمە هەرچیی ئیمان دانەمەزراو بوو لەگەڵ خۆی‌دا گێڕایەوە دوا .

بێ‌گومان هۆی جیابوونەوەی ئەو موناфیقە لەو کاتە ناسکەدا ئەوە نەبوو کە دەری ئەبڕیی کە گوایە بە گوێی ئەو نەکراوە . خۆ ئەگەر وا بوایە ئەوا هەر لە مەدینە دەرنەئەچوو و ، نەئەکەوتە گەل سوپای ئیسلام . بەڵکو مەبەستی ئەوە بوو لەو کاتە ناسکەدا و لە بەردەم دوژمنی ئامادەباش و خاوەن سوپای بەهێزدا ، ئاژاوە و دووبەرکیی بخاتە ناو سوپای ئیسلامەوە ، تا خەڵکێکی زیاتر لە ئیسلام بکشێتەوە و ، ئەوانەش لە خزمەتی پێغەمبەری خوا دا ﷺ ئەمێننەوە ورەیان بڕووخێ و ، لە هەمان کات‌دا کە دوژمن ئەمە ببینێ زیاتر لەسەر هێرش‌هێنان سوور ببێ و ، ورەو مەعنەویاتی بەرز ببێتەوە . بەمە لە ناوبردنی پێغەمبەر و موسڵمانە دڵسۆزەکان یەکجار ئاسان ئەبێ و ، ئەو کاتە ئەو مونافیقەش کە بە تەمای پادشایەتیی مەدینە بوو ، بە ئاواتی خۆی ئەگات .

خەریك بوو ئاواتی ئەو مونافیقە دڵ پیسە بێتە دیی .

ئەوەبوو دوو تیرەی ئەنصار ، نەوەی حاریثەی ئەوسیی و ، نەوەی سەلیمەی خەزرەجیی ، ویستیان کۆڵ بدەن و واز بهێنن ، دوای ئەوەی کە ژڵەژان و ویستیان بگەڕێنەوە دوا .. بەڵام خوای گەورە کۆمەکیی کردن و ، دامەزرانەوە . قورئان لەو بارەوە ئەفەرموێ :

﴿ إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ .
( آل عمران : ١٢٢ ) .

که سەرۆکی نیفاق بە خۆی و سیٚصەد کەسەوە گەڕانەوە دوا ، عەبدوڵلاّی کوڕی عەمری کوڕی حەرام ، باوکی جابیر ، کەوتە دوایان و هـاواری لیٚ کـردن کـە لـەم کاتە ناسکەدا ، کە دوژمـن هاتۆتـە سـەریان ، بـا دەسـت بـەرداری پیٚغەمبـەر و موسڵمانان نەبن . ئەوانیش وەڵامیان ئەدانەوە : ئەگەر بزانین جەنگ ئەکەن وازتان لیٚ ناهیٚنین ، بەڵکو وای ئەبینین کە جەنگ نابیٚت . باوکی جابیر زۆری وت و نەیان بیست ، لە دواجاردا وتی : هەی دوژمنانی خـوا ! خـوا دوورتـان بخاتـەوە . خـوا ناهیٚڵیٚ پیٚغەمبەرەکەی پیٚویستیی بـە ئیٚـوە هـەبیٚ . دەربـارەی ئـەو مونافیقانـە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە :

﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ ۚ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ قَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَٰكُمْ ۗ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَٰنِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٦٦ ـ ١٦٧ ) .

دوای ئەوەی مونافیقان ڕۆیشتن و عـەبدوڵلاّی کوڕی عـەمری کـوڕی حـەرامیش بانگی لیٚ کردن تا بگەڕیٚنەوە ، موسڵمانەکان کەوتنە باسی ئەوە کە دەرهـەق بـەم مونافیقە ترسنۆکانە چیی بکەن ؟

دەستەیەك لە فەرماندەکانی سوپای ئیسلام رایان وەها بوو بـەر لـەوەی لەگـەڵ بت پەرستەکانی مەککەدا بجەنگیٚن ، دەست لەو مونافیقانـە بووەشـیٚنن و پاکیـان بکەنەوە ، چونکە نامەردانە لە هەڵویٚستی ناسكدا پشتی ئیسلام و موسـڵمانانیان بەردا .

بەڵام دەستەیەکی تریان ، لە سەرووی هەمووشیانەوە پیٚغەمبەری خوا ﷺ ، وای بۆ نەئەچوون ، بەڵکو وایان بە چاك ئەزانی وازیان لیٚ بهیٚنریٚ و ، ئیٚستە دەسـتیان لیٚ نەدریٚ .

ئەم رای دووهەمە رایەکی پڕ لە حیکمـەت بـوو . چـونکە بـە گژاچـوونی ئـەو یاخییبوانە ، لەو ساتە ناسـکەدا ، ئەوپـەڕی مەترسـیی تیٚدایـە و ، سـەلامەتیی سوپای ئیسلام شتیٚکی مسۆگەر نابیٚت . چونکە بە کوشتاری ئەوانە موسڵمانەکان

ئەکەونە نێوان دوو ئاگرەوە .. سوپای موونافیقان و ، سوپای قورەیش .. ئەو کاتەش سوپای مەککە زۆر بە ئاسانیی ئەتوانێ گەمارۆوی سوپای مەدینە بدات و پشتی بشکێنێ .

دوای هەڵ گەڕانەوە و ، کشانەوەی مونافیقان ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پاشماوەی سوپاکەیەوە ـ کە حەوت صەد جەنگاوەر بوون ـ بەرەو دوژمن کەوتە رێ. ئەو شوێنەی کە پێویست بوو موسڵمانان بیکەنە بنکە لە هەندێ شوێندا سەربازگەی قورەیش ماوەی ئەوەی نەهێشتبوو تا موسڵمانەکان تێپەڕ بن ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( من رجل يخرج بنا على القوم من كثب ( أي من قريب ) من طريق لا يمر بنا عليهم ؟ )) . داوای پیاوێکی کرد تا بەلای قورەیشدا تێپەڕ بکەن و بچنە بن پاڵی چیای ئوحود ، بەڵام لە کەنارەوە بڕۆن و نەنیشنە مل سوپای قورەیش .

ئەبوخەیثەمە وتی : من ، ئەی پێغەمبەری خوا !

ئەبوخەیثەمە رێیەکی کورتی هەڵ بژارد و سوپای بت پەرستەکانی خستە لای خۆرئاواوە و ، بە ئەسپایی تێ پەڕین . لەو کاتەدا سوپای موسڵمانان بەلای باخچەی مورەببەعی کوڕی قەیضییدا ـ کە مونافیقێکی نابینا بوو ـ تێ پەڕیی . کە هەستی بە تێپەڕبوونی سوپا کرد ، دەستی بە خۆڵ وەشاندن کرد بە رووی موسڵمانەکاندا و ، ئەیوت : ئەگەر پێغەمبەری خوایت رێت نادەم بێیتە باخچەکەمەوە . خەڵکەکە هەڵمەتیان بۆ دا تا بیکوژن ، کەچیی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیهێشت کە فەرمووی : (( لا تقتلوه فهذا أعمى القلب أعمى البصر )) . فەرمووی : مەیکوژن ، ئەمە چاویش و دڵیشی کوێرن .

هەروا بەردەوام رۆیشتن هەتا گەیشتنە بنی چیای ئوحود و ، لەوێ سوپای ئیسلام روو بە مەدینە وەستا و ، پشتی کردە بەرزاییەکانی کێوی ئوحود . واتە سوپای کوفر کەوتە نێوان سوپای موسڵمانان و مەدینەوە .[٣٧٤]

**حەوتەم : خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ :**

پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و حەوت صەد موسڵمانی جەنگاوەرەوە پشتیان لە کێوی ئوحود کرد ، پاشان ئامۆژگاریی کردن و فەرمووی : (( لا يقاتلنَّ أحد حتى

[٣٧٤] الرحيق : ٢٥٥ ـ ٢٥٩ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ١٨٨ ـ ١٩٠ ، غزوة أحد لمحمد أحمد باشميل : ٧٦ ـ ٨٨ .

آمره بالقتال )) . فەرمووی : هیچ کەس دەست بە جەنگ نەکات هەتا خۆم فەرمانی بەسەردا نەدەم . بۆ بەرەبەیانی رۆژی شەممەی حەوتەم رۆژی مانگی شەووال [٣٧٥] هاوەڵانی ریز کردن و ، هەر کۆمەڵەی لە شوێنی خۆی وەستاند و ، لە ناویاندا پەنجا هاوەڵی هەڵ بژارد کە لە تیر وەشاندندا لێهاتوو بوون و ، عەبدوڵلای کوڕی جوبەیری ئەوسیی بەدرییشی ـ کە دەستە جلێکی سپیی لەبەردا بوو ـ کردە ئەمیریان و ، فەرمانی بەسەریاندا دا کە لەسەر ئەو کێوەی کە ئەکەوێتە لای خواروی شیوی قەنات ـ کە لەمەو دوا ناوی کێوی تیرهاوێژان ( الرماة ) ی لێ نرا و ئەکەوتە باشووری خۆرهەڵاتی سەربازگەکەوە ، دابمەزرێن ، کە نزیکەی دووصەد و پەنجا مەتر لە بنکەی سەرکردایەتی‌یەوە دوور بوون .

مەبەست لەم کارەشی بۆ هاوەڵەکان روون کردەوە . ئەوەبوو بە ئەمیرەکەیانی فەرموو : (( إنضح الخيل عنا بالنبل ، لا يأتون من خلفنا ، إن كانت لنا أو علينا فاثبت مكانك ، لايؤتينَّ من قبلك )) . بە عەبدوڵلای فەرموو : تۆ بە تیر ئەسپ سوارانمان لێ دوور بخەرەوە ، تا لە دواوە نەیەنە سەرمان . ئەگەر ئێمە ژێر کەوین و سەرکەوین تۆ لە شوێنی خۆتدا دامەزراو بە ، تا لەلایەن تۆوە نەیەنە سەرمان .

پاشان بە تیرهاوێژەکانی فەرموو : (( احموا ظهورنا ، فإن رأيتمونا نقتل فلا تنصرونا ، وإن رأيتمونا قد غنمنا فلا تشركونا )) . فەرمووی : لە دوامانەوە بەرگرییمان لێ بکەن . ئەگەر دیتان وا ئێمە ئەکوژرێین ، مەیەن بە دەمانەوە و ، گەر دیتان وا ئێمە غەنیمەتمان دەست کەوتووە ، بەشدارییمان مەکەن .

لە ریوایەتەکەی بوخارییدا وەها هاتووە : (( إن رأيتمونا تخطفنا الطير فلا تبرحوا مكانكم هذا حتى أرسل إليكم ، وإن رأيتمونا هزمنا القوم ووطئناهم فلا تبرحوا حتى أرسل إليكم )) . فەرمووی : ئەگەر چاوتان لێمان بوو باڵندە ئەمان فڕێنن ، هەتا نەنێرم بە دواتاندا شوێنی خۆتان چۆڵ مەکەن . ئەگەر دیشتان دوژمنمان شکاند و نیشتینە ملیان ، هەتا نەنێرم بە دواتاندا هەر شوێنی خۆتان چۆڵ مەکەن .

---

[٣٧٥] لە (( الرحيق المختوم )) دا وەها هاتووە ، بەڵام لە (( السيرة النبوية )) ی ئەبوشوهبەدا پانزەی مانگی شەووال هاتووە .

جیاکردنەوەی ئەم پەنجا هاوەڵە لێهاتووە تیرهاوێژە بۆ ئەوەبوو کە تاقە کەلەبەرێك مەترسیی لێ ئەکرا قورەیش لێیەوە هێرش بکات ، بەوانە بگیرێت ، نەوەکو لە گەرمەی جەنگدا لە دواوە هەڵمەتیان ببرێتە سەر .

دەربارەی ئەمە قورئانی پیرۆز ئەفەرموێ :

﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَـٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ ( آل عمران : ١٢١ ) .

پاشماوەی سوپا ، کرا بە چەند بەشێکەوە .. مونذیری کوڕی عەمر کرایە ئەمیری دەستە راست و ، دەستەچەپیش درایە دەست زوبەیری کوڕی عەووام و ، میقدادی کوڕی ئەسوەدیش یارمەتیی بدات .. کاری سەر شانی زوبەیر ئەوەبوو لە بەردەم هێرشی ئەسپ سوارانی خالیدی کوڕی وەلیددا خۆی بگرێ و ، کۆمەڵێك موسڵمانی ئازا و بەجەرگیش لە پیاوە ناودارەکان ، کە هەر یەکەیان بە هەزاران پیاو مەزەندە ئەکران . خرانە ریزەکانی پێشەوەی سوپاوە ..

پێغەمبەری خوا ﷺ نەخشەیەکی یەکجار جوانی بۆ موسڵمانەکان کێشا ، کە ئەمەش لێهاتن و وریایی و زیرەکیی ئەو ئەسەلمێنێ کە هەتا شارەزایانی جەنگ زیاتر لەم نەخشەیەی ورد ببنەوە ئەوسا کاری پڕ حیکمەتی پێغەمبەری نازداریان بۆ دەرئەکەوێ .

هەرچەندە قورەیش پێشتر هاتنە مەیدانی جەنگ ، بەڵام نەیانزانیی شوێنی چاك هەڵ ببژێرن .

پێغەمبەری خوا ﷺ پشت و لای راستی سوپاکەی پاڵ دا بە کێوی ئوحودەوە و ، بۆ پاراستنی لای چەپیشی ئەوەبوو (٥٠ ) هاوەڵە تیرهاوێژەکەی ناردە سەر چیای ( عەینەین ) کە لەوەو دوا ناونرا ( جبل الرماة ) ، تا ئەو کەلەبەرە بگرن و قورەیش لەوێوە دزە نەکەن . حیسابی ئەوەشی کرد کە ئەگەر موسڵمانەکان بشکێن ، با هەڵ نەیەن تا دوژمن دوایان نەکەوێ و بە دیلیان نەگرێ ، بۆیە شوێنێکی بەرزی بۆ سەربازگەکەی هەڵ بژارد ، کە ئەگەر دوژمن هەڵ بکوتێتە سەریان ئەوا تووشی زەرەر و زیانێکی زۆری بکەن و ، نەهێڵن بە ئاوات بگات . لە هەمان کاتدا کە ئەم ئەو شوێنە چاکەی بۆ خۆی هەڵ بژارد ، دوژمنی ناچار کرد شوێنێکی نزم بکاتە سەربازگەی خۆی کە ئەگەر سەرکەوتنیش بە دەست بێنن ، بێ ئەنجام بن و ، گەر ژێریش بکەون نەتوانن لە دەستی موسڵمانەکان خۆیان دەرباز

بکەن . لەلایەکی ترەوە پێغەمبەری ئازیز ﷺ سەرنجی دا موسڵمانەکان لە چاو قورەیش‌دا ژمارەیان یەکجار کەمە . جا بۆ چارەسەریی ئەمەش کۆمەڵێك هاوەڵی ئازا و پاڵەوانی هەڵ بژاردن تا مەردانە و بەبێ ترس هەڵمەت بەرنە سەر دوژمن و، سەرکوتی بکەن ..

کە سوپا ریز کرا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریی هاوەڵانی کرد ، تا دان بە خۆیان‌دا بگرن .. جا ئەم ئامۆژگاریی‌کردنەی بە چەندین شێواز بوو .. یەکێ لەو شێوازانەی ئەمەبوو : شمشێرێکی بە دەستەوە گرت و فەرمووی : (( من يأخذ هذا السيف بحقه ؟ )) . فەرمووی : کێ ئەم شمشێرە هەڵ ئەگرێ و مافی خۆی پێ ئەدات ؟ خەڵکەکە بێ‌دەنگ کشانە دواوە . پاشان ئەم فەرمایشتەی چەند جارێك دووبارە کردەوە و ، چەند پیاوێکیش وەك عەلیی کوڕی ئەبوطالیب و ، زوبەیری کوڕی عەووام و ، عومەری کوڕی خەططاب ، هەستانەوە و داوایان کرد ، کەچیی نەی‌دا بە هیچ کامیان ، تا ئەوەبوو ئەبودوجانە سیماکی کوڕی خەرشە هەستا و وتی : مافی کامەیە ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟! فەرمووی : (( أن تضرب به العدو حتى ينحني )) . فەرمووی : بەردەوام بەم شمشێرە لە دوژمن بدەی هەتا بچەمێتەوە . وتی : من هەڵی ئەگرم و مافی خۆیشی پێ ئەدەم ، ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەویش دای بە دەستیەوە

ئەبودوجانە پیاوێکی ئازا و پاڵەوان بوو ، بۆیە لە کاتی جەنگ‌دا خۆی هەڵ ئەکێشا و ، سەرپێچێکی سووری هەبوو کە لەسەری ئەبەست خەڵك ئەیانزانیی ئەبودوجانە جەنگی سەروماڵیی ئەکات . کە شمشێرەکەی لە دەستی ئازیز وەرگرت ، بەو سەرپێچەی سەری بەست و لە نێوان هەردوو سوپاکەدا بە خۆ هەڵ کێشانەوە هاتوچۆی بوو .. ئا لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إنها لمشية يبغضها الله إلا في مثل هذا الموطن )) . فەرمووی : ئەمە بەرێوەچوونێکە خوا رقی لێیەتی جگە لەم جۆرە شوێنەدا .[٣٧٦]

**هەشتەم : نزیك بوونەوەی جەنگ :**

لەو بەرەوە قورەیشیش سوپاکەی خۆی رێك و پێك کرد .. ئەمجارە ـ بە پێچەوانەی لەوەو پێشەوە ـ قورەیش سوپایان بە یاسای ریز ئامادەی جەنگ

---

٣٧٦ الرحيق المختوم : ٢٥٩ ـ ٢٦١ ، السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ١٩٠ ـ ١٩١ ، غزوة أحد : ٨٩ ـ ١٠٣ .

کـرد .. ئەوەبوو لەوەو پێش بە یاسای ( الکر والفر ) جەنگیان ئەکرد ، هـەتا لـە بەدریش‌دا . بەڵام یاسای ریز لە موسڵمانەکانەوە فێر بوون .

قوڕەیش لەناو جەرگەی شیوی ( القنـــاة ) دا خـۆی ئامـادەی جـەنگ ئـەکرد و سەرکردایەتیی گشتیی سوپاشی بە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب سپێررا بوو کە لەناو جەرگەی سوپادا بوو . خالیدی کـوڕی وەلیـد بـۆ فەرمانـدەی دەسـتە راسـت و ، عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهلیش بۆ فەرماندەی دەسـتە چـەپ و ، صـەفوانی کـوڕی ئومەییەش بۆ فەرماندەی پیادە و ، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوڕەبیعەش بۆ فەرماندەی تیرهاوێژان دانرا بوون .

ئاڵای سوپاش بە دەست کۆمـەڵێك لە نەوەی عەبدوددارەوە بـوو ، کـە لـە دوای قوصەی ئاڵا کرابووە ئەرکی سەرشانی ئەوان و ، کـەس بـۆی نـەبوو لـەو بـوارەدا ناکۆکی‌یان لەگەڵدا بکـات و ، فەرمانـدەشیان طـەلحـەی کـوڕی ئـەبوطـەلحـەی عەبدەریی بوو و ، لە پێشی پێشەوەی ریزەکان‌دا وەستا بوون .

بەڵام لەو رۆژەدا ئەبوسـوفیانی فەرمانـدەی گشـتیی ، تێـك شـکانەکەی رۆژی بەدری خستە ئەستۆی ئەوان ، کاتێك کە هەڵ گری ئاڵاکەیان نەضری کوڕی حاریـث بە دیلیی کەوتە دەست موسڵمانەکان . جا بۆ ئەوەی غیرەتیان بجووڵێنێ پێی وتن : ئەی نەوەی عـەبدوددار ! لـە رۆژی بـەدردا ئاڵاکـەمان بـە ئێـوە سـپێررا بـوو و ، ئەوەشمان تووش بوو کە دیتان . بە راستیی خەڵك بە هۆی کەوتنی ئاڵاوە دوژمنـی بە سەری‌دا زاڵ ئەبێ . ئەگەر ئاڵا نەما ئەوانیش تێك ئەشکێن . جا یا ئاڵاکـەمان بە جوانیی بۆ راگیر بکەن ، یان وازی لێ بهێنن بۆمان تا بە جـوانیی بۆتـان راگـیر بکەم .

ئەبوسوفیان بەم کارەی سەرکەوتنی بە دەست هێنا ، چونکە نەوەی عـەبدوداری خستنە غیرەتەوە ، هەتا هەڕەشەیان لە ئەبوسوفیان کرد و وتیان : ئێمە ئاڵاکەمان بدەینە دەست تۆ ؟ ئەگەر سبەینێ بەرامبەر یەك وەستان ئەزانیی چیی ئەکـەین . ئەوەبوو کە جەنگ گەرم بوو مەردانە بە دامەزراویی مانەوە هـەتا هـەموویان لـە پێناوی پاراستنی ئاڵاکەدا سەریان نایەوە .

هەرچەندە قوڕەیش خەڵکێکی زۆری کۆ کردبوویـەوە و ، هێشـتا سـوپای وەهـا گەورەیان بە خۆیانەوە نەدیی بوو و ، چەك و تفاقیشیان باش بـوو و ، ئـەیانزانیی موسڵمانان کـەم و کـەم تفـاقن ، لەگـەڵ ئـەوەش‌دا زۆر ئەترسـان وەك رۆژەکـەی

بەدریان لێ بێتەوە . بۆیە هەوڵی ئەوەیان ئەدا ریزی موسـڵمانەکان تێـك بـدەن و پەرتەوازەیان بکەن ، ئەویش بە دروست کردنی ناکۆکیی لە نێوانیـان‌دا بـۆ ئەمـە ئەبوسوفیان ناردی بۆ لای ئەنصار و پێی وتن : واز لە ئێمە و ئامۆزاکەمان بهێنن ـ واتە پێغەمبەری خوا ﷺ ـ ئێمـەش لـە ئـێوە ئـەگـەڕێیـن ، چـونکە ئێمـە پێویستی‌یەکمان بە کوشتاری ئێوە نیە ..

ئەم کارە چەپەڵە هەوڵێکی هیچ و پووچ بوو . کەی ئەنصار وەها ئیمانیـان بـە قورئان هێناوە ؟ کەی بەو ئاسانی‌یە دەست لە ئازیزی نـەبێزراویان هـەڵ ئـەگرن ؟ ئەوەبوو زۆر بە توندیی وەڵامیان بۆ ئەبوسـوفیان نـاردەوە و تـێ‌یـان گەیانـد کـە پاڵەوانەکانی ئەوس و خەزرەج تا دوا دڵۆپی خوێنیان جەنگی سـەرومالّیی ئەکـەن و، بە دڵ و بە گیان پارێزگاریی لە دینەکەیان ئەکەن ..

بەرە بەرە هەردوو سوپا لە یەك نزیك ئەبوونەوە .. کاتی هەڵ گیرسـانی جـەنگ ئەهاتـە بـەرەوە .. ئـەمجارە قـورەیش هـەوڵێکی تریـان دا بـۆ تێـك‌دانـی ریـزی موسڵمانەکان .

ئەوەبوو پیاوێکی نۆکەری ناپاك ، کـە پێـی ئـەوترا : ئـەبوعامیری فاسـق و ، ناویشی عەبدعەمری کوڕی صەیفیی[٣٧٧] بوو و ، جـاران نازنـاوی راهیـب بـوو و ، پێغەمبەری خواﷺ ناوی نا فاسق ، لە نەفامیی‌دا سەرۆکی ئەوس بوو . کە ئیسلام هات ئەم پیاوە کەوتە دژایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، مەدینەی بـەجێ هێشـت و، رۆیشت بۆ لای قورەیش ، تا لە دژی موسڵمانان هەڵیان بنێ و ، بێنـە سـەریان و، بەڵێنی بە قورەیش دا کە ئەگەر قەومەکەی بیبینن گوێڕایەڵی فەرمانی ئەبن و ئەکەونە شوێنی . یەکەم کەس ئەم پیاوە فاسقە بـەرەو رووی موسـڵمانەکان خـۆی

---

[٣٧٧] لە سەردەمی نەفامیی‌دا ئەم ئەبوعامیرە سەرداری ئەوس بووە و ، لە ناویان‌دا ماقووڵ بووە . بەڵام کە ئیسلام هات خۆی بە دوژمنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قەڵەم دا و لە داخانا مەدینەی بەجێ هێشت و ، لەگەڵ پەنجا ناپاکی هۆزی ئەوس‌دا ، خۆی گەیاندە مەککە ، تا لەوێ قورەیش بۆ جەنگی موسڵمانان هەڵ بنێن و ، ئەمانە لە رۆژی ئوحوددا لە ژێر سەرکردایەتیی ئەبوعامیردا بەشداریی جەنگیان کرد . شایانی باسە کە ئەو ناپاکە کوڕێکی گەنجی هەبوو ناوی ( حنظلة ) بوو ، کە نموونەیەکی بەرز بوو لە هێزی ئیمان و تەقوا و دڵسۆزیی بۆ دینەکەی و ، لە رادە بەدەریش خوا و پێغەمبەری ﷺ خۆش ئەویستن . خوای گەورە وەهای هێنایە پێش شەوی جەنگی ئوحود یەکەم شەوی زاوایەتیی حەنظەلە بوو و ، کە بەیانی زوو دەنگی جاڕی جیهادی بیست ، وازی لە هاوسەرەکەی هێنا و ، شمشێرەکەی هەڵ گرت و ، بە پەلە خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ و ، بە وێنەی پاڵەوانی بێ‌هاوتا لە خزمەتیا جەنگی کرد هەتا شەهید بوو . جا لەبەر ئەوەی کە ماوەی نەبوو خۆی بشوات و بە لەشی گرانەوە چوو بۆ جەنگ ، کە شەهید بوو ، مەلائیکە شۆردیان ، بۆیە ناونرا بە ( غسيل الملائكة ) . لە دواوە إن شاء الله بە درێژە باسی ئەکەین .

دەرخست و بانگی قەومەکەی کرد و ، خۆی ناساند پێیان و ، وتی : ئەی کۆمەڵی ئەوس ! من ئەبوعامیرم . ئەوانیش وەڵامیان دایەوە کە خوا هیچ چاوێکت پێ رۆشن نەکاتەوە ، ئەی فاسق ! وتی : دیارە قەومەکەم دوای خۆم تووشی خراپە بوون . کە جەنگیش گەرم بوو بەوپەڕی بێویژدانی‌یەوە لەگەڵ موسڵمانەکاندا ئەجەنگا و بەردیشی تێ ئەگرتن .

لە پێشەوە باسمان کرد کە کۆمەڵێك ئافرەتی ناوداری قورەیش کەوتنە گەل سوپا تا ئەوانیش بەش بەحاڵی خۆیان ورەی جەنگاوەران بەرز بکەنەوە و ، نەهێڵن را بکەن . ئەوەبوو ئەو ئافرەتانە ، کە هیندی کچی عوتبە ، هاوسەری ئەبوسوفیان سەرکردەیان بوو ، بەناو ریزەکاندا هاتوچۆیان ئەکرد و ، دەفیان لێ ئەدا و ، غیرەتی پیاوەکانیان ئەجوولاند و ، بۆ جەنگ و کوشتار هەڵیان ئەنان و ، ورەی پاڵەوانەکانیان بەرز ئەکردەوە . جارێ هەڵگرانی ئاڵایان هەڵ ئەنا و ئەیان وت :

ويـهاً بنـي عبـدالـدار ويـهاً حـمـاةَ الأدبـار

ضـربـاً بـكـل بـتّـار

جارێکیش خزمەکانیان هەڵ ئەنا کە ئەگەر کوشتار بکەن باوەشی خۆشەویستی‌یان بۆ ئەکەنەوە و فەرشیان بۆ را ئەخەن ، بەڵام ئەگەر پشت لە جەنگ هەڵ بکەن ئەوا ئەمانیش پشت لەوان هەڵ ئەکەن و ، بە پیاویان نازانن کە ئەیان وت :

إن تـقـبـلوا نـعانـقْ ونـفـرش النـمـارقْ

أو تـدبـروا نـفـارقْ فـراقَ غـيـرِ وامـقْ

ئەم هەڵنانە زیاتر رووی کردە ئاڵا بە دەستەکان ، بۆیە ئەوانیش بڕیاریان دا دامەزراو بن هەتا ئەوەبوو موسڵمانەکان تاقیان لێیان بڕیی .[٣٧٨]

**نۆهەم : سەرەتای جەنگ :**

هەردوو سوپا لەیەك نزیك کەوتنەوە .. سەعاتی سفر هاتە بەرەوە .. قورەیش بە سێ هەزار جەنگاوەری پڕ تفاقەوە هاتۆتە سەر مەدینە و ، دڵی هەر جەنگاوەرێکی ئەم سوپایە پڕە لە رق و قین و ، بۆ ئەو رۆژە ئەگەڕێ کە تۆڵە لە موسڵمانەکان بکاتەوە . بە مەرجێ موسڵمانەکان حەوت‌صەد جەنگاوەر بوون و ، ئاواتی بەرودوایان شەهیدیی و رەزامەندیی خوای گەورە بوو ، بەو هیوایەوە بە

---

[٣٧٨] السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ١٩١ ـ ١٩٢ ، الرحيق المختوم : ٢٦١ ـ ٢٦٢ ، غزوة أحد : ١٠٣ ـ ١١٠ .

دینی پاك و بیٚ‌گەرد خزمەتیٚکی گرۆی مرۆڤ بکەن ، بەلاّم چەکی بە هیٚز و کاریگەریان ئیمانە پتەو و دامەزراوەکەیان بوو ..

ئەوەی عەبدودداریش هەر هەموویان بە خۆیان و ئالاّکەی دەستیانەوە هاتنە پیٚشی پیٚشەوەی ریزەکانەوە ، تا مەردانە بەرگریی لیٚ بکەن و ، ئامادە بوون لەو پیٚناوەدا خویٚنیان ببەخشن ..

یەکەم کەسیٚك کە بووە سووتەمەنیی جەنگ هەلّگری ئالاّی بت پەرستەکان ، طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحەی عەبدەریی بوو .. یەکیٚ بوو لە پالّەوانە ئازاکانی قورەیش . بە سواریی وشتریٚك هاتە مەیدان و داوای زۆرانبازیی لە موسلّمانەکان کرد .. ئەوەندە ناوبانگی ئازایەتیی دەرچوو بوو ، کەس نەی‌ویٚرا بیٚتە مەیدانی .. خیٚرا زوبەیری کوڕی عەووام هاتە مەیدانی و ، هیچ ماوەی طەلحەی نەدا ، بە ویٚنەی شیٚر هەلّمەتی دا و خۆی هەلّ دایە سەر وشترەکەی و ، پاشان کە لەسەر وشترەکە وەستایەوە ، طەلحەی خستە خوارەوە و ، دای بە زەویی‌دا و ، بە شمشیٚرەکەی سەری بڕیی ..

ئەمە یەکەم هەلّمەتی سوپای مەککە بوو .. هەردوو سوپا بە چاوی ئەنجامی زۆرانبازی‌یەکەوە بوون .. پیٚغەمبەری خواش ﷺ چاوی لیٚ بوو ، خیٚرا (( الله أكبر )) ی فەرموو و ، موسلّمانەکانیش بۆیان سەندەوە و ، ستایشیٚکی چاکی زوبەیری کرد و دەربارەشی فەرمووی : (( إنّ لكل نبيٍّ حواريّاً ، وحواريِّي الزبيرُ )) . فەرمووی : هەموو پیٚغەمبەریٚك قوتابیی و پەیامبەری بوون و ، قوتابیی و پەیامبەری منیش زوبەیرە .

دوای ئەوەی جەنگ هەلّ گیرسا .. بەلاّم دەست پیٚ‌کەری جەنگی ئوحود بت پەرستەکانی مەککە بوون .. ئەوەبوو هیٚزیٚکی پیادەیان بە سەرکردایەتیی ئەبوعامیری فاسق و ناپاك ، بە کۆمەکیی کۆمەلّە سواریٚك بە سەرکردایەتیی عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل دەستیان بە هیٚرش کرد بۆ سەر بالّی چەپی سوپای موسلّمانەکان ، بەو هیوایەی ئەو بالّە تیٚك بشکیٚنن و ، لەویٚوە هەلّمەت بەرن و ، خۆیان بگەیەننە شیوەکە تا لە دواوە دەست لە موسلّمانەکان بوەشیٚنن و ، ریزەکانیان پەرتەوازە بکەن ..

بەلاّم لەبەر ئەوەی کە پیٚغەمبەری خوا ﷺ شویٚنی یەکجار چاکی بۆ سوپاکەی هەلّ بژاردبوو ، بەوەی کە تیر وەشیٚنی لیٚ هاتووی لەسەر ( جبل الرماة ) دانا بوو ،

ئەوا هەموو هەوڵێکی قورەیش بۆ گەیشتن بەو ناوچەیە کارێکی نەگونجاو بوو .. لە هەمان کات‌دا جەنگاوەرە پیادەکانی سوپای ئیسلام ، بە فەرماندەیەتیی زوبەیر و میقداد ، ئەوانیش بەرەنگاری هێرش کاران بوون و پەرچی هەڵمەتەکانیان دانەوە . واش دەرئەکەوێ کە چەند پیاوێکی لێ‌هاتوو لە چەند شوێنێکی شیاوی کێوی ئوحوددا دامەزرا بن و ، بە بەرد تێ‌گرتن و ، بە تاشەبەرد تلێر کردنەوە بۆ سەر هێرش‌کارانی مەککە ، ئەوانیان گێڕابێتە دواوە و ، شپرزەیان کردبن .

سوارچاکانی مەککە سێ جار ئەم هێرشە دووبارە ئەکەنەوە .. بەڵام لە هەموویان‌دا تێك ئەشکێن ، ئەمەش بە هۆی وریایی (٥٠ ) تیرهاوێژەکەی سەر چیای ( الرماة ) .

لەولاوە کە فەرماندەی ئاڵا هەڵ‌گرانی قورەیش بە دەستی زوبەیر کوژرا ، نەوەکانی عەبدوددار یەك لە دوای یەك هەڵمەتیان ئەدا و ئاڵاکەیان بەرز ئەکردەوە .. موسڵمانەکانیش زۆر وریا بوون ، بۆیە سەنگی تەواویان خستبووە سەر ئاڵا هەڵ‌گران .. دوای کوژرانی طەلحە ، ئەبوشەیبە عوثمانی کوڕی ئەبوطەلحەی برای هەڵمەتی دا و ئاڵای بەرز کردەوە و بەرەو پێشەوە بۆ کوشتار کەوتە رێ و ، هەر خەریك بوو شیعریشی ئەوت . لەو کاتەدا حەمزەی کوڕی عەبدولموطەللیبی بۆ گەیشت و شمشێرێکی دا لەسەر شانی دەست و قۆڵی پەڕاند و تا سەر ناوکی هەڵی تلیشاند و ، یەکێ لە سی‌یەکانی دەرکەوت .

پاشان ئەبوسەعدی کوڕی ئەبوطەلحە ئاڵاکەی بەرز کردەوە و ، خێرا سەعدی کوڕی ئەبووەققاص تیرێکی تێ گرت و دای لە قورگی و زمانی دەرهێنا و یەکسەر مرد و ، ئاڵاکە لە دەستی کەوتە زەویی .. وتەیەکی تر دەری خستووە کە ئەبوسەعد داوای زۆران‌بازیی کردووە و ، عەلیی کوڕی ئەبوطالیب لێی هاتۆتە پێش و، یەکی شمشێرێکیان بۆ یەکتر داهێناوەتەوە . سەرەنجام عەلیی شمشێرێکی لێ ئەدا و ئەی‌کوژێ .

پاشان موسافیعی کوڕی طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحە هەڵمەتی دا و ئاڵاکەی هەڵ گرت . لەولاوە عاصیمی کوڕی ثابیتی کوڕی ئەبولئەفلەح تیرێکی بۆ هاویشت و کوشتی .. خێرا کیلابی کوڕی طەلحە کە برای موسافیع بوو ئاڵاکەی بەرز کردەوە ، کەچیی پڵنگ ئاسا زوبەیری کوڕی عەووام هەڵمەتی دایە و ، دەستی دایە جەنگ لەگەڵیا هەتا کوشتی .. دوای ئەویش جولاسی کوڕی طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحە

ئالآکەی بەرز کردەوە و لەولاوە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلآ رمێکی تێ گرت و بە یەکجاریی گیانی لە دەست دا . ئەشڵێن : عاصیم ی کوڕی ثابیتی کوڕی ئەبولئەفلەح تیری تێ گرتووە و کوشتوویەتی .

ئەم شەش ئالآ هەڵگرە کوژراوە لە یەك خێزان بوون ، کە هەموویان نەوەی ئەبوطەلحە عەبدوڵلآی کوڕی عوثمانی کوڕی عەبدوددار بوون . هەر هەموویان خۆیان کردە قوربانی ئالآکەیان . پاشان دوای ئەوان ، ئەرطەئەی کوڕی شورەحبیل، لە نەوەی عەبدوددار ، ئالآکەی هەڵ گرت و ، عەلیی کوڕی ئەبوطالیب ماوەی نەدا یەکسەر کوشتی .. ئەشڵێن : حەمزە کوشتوویەتی . خێرا شورەیحی کوڕی قاریظ هەڵمەتی دایە ئالآکە و هەڵی گرت ، ئەوەبوو قوزمان ، [379] کە هاوپەیمانی نەوەی ظوفر بوو ، کوشتی . پاشان ئەبوزەید عەمری کوڕی عەبدمەنافی عەبدەریی ئالآکەی هەڵ گرت و ، دیسان قوزمان کوشتی . شورەحبیلی کوڕی هاشمی عەبدەریی هەڵی گرت و ، قوزمان ئەویشی کوشت .

بەم شێوەیە موسڵمانەکان هەر دە کەسی نەوەی عەبدوddاری هەڵ گری ئالآی قورەیشیان کوشتن و تاقیان لێ بڕینەوە و ، کەسێکیان لێ نەما ئالآ هەڵ بگرێ ، ناچار بەندەیەکی حەبەشیی ئەوان بە ناوی صەواب هەڵمەتی دا و ئالآکەی هەڵ گرت و ، ئەویش ئازایەتیی و پاڵەوانێتی‌یەکی یەکجار زۆری نواند ، زیاتر لە ئازایەتیی ئاغاکانی . ئەم بەندەیە هەر خەریکی جەنگ و کوشتار و پاراستنی ئالآکە بوو هەتا هەردوو دەستیان پەڕاند ، ناچار چۆکی دایە سەر زەویی تا بە سنگی و ملی ئالآکە راگیر بکات و نەکەوێت و ، ئەشیوت : خوایە ! ئەرکی سەرشانم بەجێ هێنا ؟ تا ئەوەبوو ئەویش کوژرا .

دوای کوژرانی صەوابی بەندە ئالآکە کەوتە زەویی و کەس نەمابوو لەو رۆژە سەختەدا هەڵی بگرێ .. هەروا کەوتبووە زەویی !! [380]

---

[379] قوزمان : موسڵمان نەبوو بوو ، بگرە یەکێ بوو لە مونافیقانی مەدینە و ، بۆ بەرگریی لە ئیسلامیش کوشتاری نەئەکرد ، هەروەك لە کاتی سەرەمەرگی‌دا دەری بڕیی . کاتێك کە هاوەڵان باسی ئازایەتیی قوزمانیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ، دەری بڕیی کە دۆزەخی‌یە . ئەوەبوو قوزمان دوای زامداربوونی لە تاو ئێشی زامەکانی رۆژی ئوحودی ، خۆی کوشتەوە . ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی ئازیز ﷺ .

[380] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ١٩٢ ، الرحيق : ٢٦٣ ـ ٢٦٤ ، غزوة أحد : ١١١ ـ ١١٩ .

**دەهەم : گەرم بوونی جەنگ :**

هەروەك موسڵمانەكان شێرانە هەڵمەتیان دایە سەر ئاڵاْ هەڵگران ، لە هەموو لایەكەوە بە هەمان شێوە هەڵمەتیان ئەدا .. جەنگێكی سەروماڵیی دەست پێ كرا بوو .. كافران بۆ تۆڵەی بەدر هاتبوون و ، موسڵمانانیش بۆ رازیی‌كردنی پەروەردگار هەڵمەتیان ئەدا ..

هەردوو سوپا دەستە و یەخە تێكەڵ بوون .. پاڵەوانەكانی ئیسلام بە راست و بە چەپ‌دا دەستیان ئەوەشاند و ، لاشەی بێ‌سەریان لە مەیدان‌دا ئەخست .. دروشمی ئەو رۆژەی موسڵمانان : (( أَمِتْ ، أَمِتْ )) بوو و دووبارەیان ئەكردەوە .

ئەوە بوو ئەبودوجانە سەرپێچە سوورەكەی لە سەری خۆی بەستبوو و ، شمشێرەكەی پێغەمبەری خوای ﷺ بە دەستەوە گرتبوو و ، ئەی‌ویست ئەو مافەی پێ بدات كە بەڵێنی دابوو ، دەستی بە كوشتار كرد هەتا چووە ناو خەڵكەكەوە .. بە هەر كافرێك بگەیشتایە ئەی‌كوشت . بە راستیی ریزەكانی قورەیشی شپرزە و پەرتەوازە ئەكردن ..

زوبەیر ئەڵێت : كاتێك كە داوای شمشێرەكەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد و نەی‌دامێ و ، دایە دەست ئەبودوجانە ، شتێك بە دڵم‌دا هات و ، لە دڵی خۆم‌دا وتم : من كوڕی صەفیەی [٣٨١] پووری ئەوم و ، قورەیشییم و ، هەستامەوە و ، پێش ئەو داوام لێی كرد ، كەچیی دای بەو و ، وازی لە من هێنا . بەخوا ، سەیری ئەكەم بزانم چیی ئەكات ؟!

دیارە ئیمانی زوبەیر بە راستیی هەر كارێكی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوپەڕی بەهێزیی و دامەزراویی‌دایە .. بەڵام ئەوەندە هەیە پێی خۆش بووە بزانێ حیكمەتی ئەم كارەی چی‌یە ؟!

---

[٣٨١] صەفیە كچی عەبدولموطەللیبی كوڕی هاشمی قورەیشی‌یە . پووری پێغەمبەری خوا بووە و ، خوشكی دایك و باوكیی حەمزە و زوبەیر بووە . دایكی ناوی هالەی كچی وەهبە ، واتە خوشكی ئامینەی دایكی پێغەمبەری خوا ﷺ. یەكەم جار شووی بە حاریثی كوڕی حەربی كوڕی ئومەییە كردووە ، واتە برای ئەبوسوفیان . دوای مردنی ئەم مێردەی شوو بە عەووامی كوڕی خوەیلید ئەكات كە برای خاتوو خەدیجە بووە . یەكێكە لەو ئافرەتانەی كە زوو بە زوو ئیمانی هێناوە و، لەگەڵ زوبەیریش‌دا كۆچی بۆ مەدینە كردووە . ئافرەتێكی زۆر ئازا بووە ، لە دواوە هەڵمەتی شێرانەی باس ئەكرێت . هەتا لە جەنگی ئوحوددا ، كاتێك كە موسڵمانەكان شپرزە ئەبن ، صەفیە رمێكی بە دەستەوە ئەبێت و روو بە كافرەكان هەڵمەت ئەدات .. صەفیە بە شەهیدبوونی حەمزەی برای یەكجار خەمبار ئەبێت و ، بە چەند دێڕە شیعرێكی جوان و ناسك شیوەنێكی گەرمی بۆ ئەكات . لەساڵی ( ٢٠ ) ی كۆچیی‌دا كۆچی دوایی كردووە ، خوا لێی رازیی بێ .

ئەڵێت : شوێنی ئەبودوجانە کەوتم .. سەرپێچێکی سووری خۆی دەرهێنا و ، بەستی لەسەری خۆی . ئەنصاریش وتیان : ئەبودوجانە سەرپێچی مردنی دەرهێنا. ئەبودوجانەش شیعری حەماسەت و گەرم بوونی بۆ خۆی ئەوت و ، تووشی هەر بت پەرستێك بوایە ئەیکوشت .. لەناو بت پەرستەکانیش دا پیاوێك هەبوو کە هەر زامدارێکی ئێمەی بدیایە هێرشی ئەکردە سەری و ئەیکوشت .. لەگەڵ ئەبودوجانەدا لێك نزیك کەوتنەوە . لە خوا پاڕامەوە بگەنە لای یەك .. ئەوەبوو گەیشتن بە یەك و ، هەر یەکە شمشێرێکی بۆ ئەوی تر داهێنایەوە . کە بت پەرستەکە شمشێرێکی بۆ ئەبودوجانە داهێنایەوە ، ئەبودوجانە قەڵغانەکەی دایە بەری و شمشێرەکە کاری لە قەڵغانەکە کرد .. ئەبودوجانە کە لەوی دا کوشتی ..

ئەبودوجانە خۆی بە ناو ریزەکان‌دا کرد ، هەتا گەیشتە لای فەرماندەی ئافرەتە قورەیشی یەکان ، هیندی هاوسەری ئەبوسوفیان .. نەیزانی ئەوە ..

ئەبودوجانە ئەبینێ وا مرۆڤێك خەریکە بە توندیی چنگ لە خەڵك ئەگرێت . ئەویش لە بەردەمی‌دا ئەوەستێت . کاتێك کە شمشێری بۆ بەرز ئەکاتەوە ، بە شێوەی ژنان وەلوەلە ئەکات و ئەزانێ کە ئافرەتە ، جا لەبەر رێزی شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لێ دێنێ و لێی نادات ..

دوای بینینی ئەم هەڵوێستانەی ئەبودوجانە ، زوبەیر ئەڵێت : وتم : خوا و پێغەمبەرەکەی چاکتر ئەزانن .

یەکێك لە کافرەکانی مەککە بە ناوی سیباعی کوڕی عەبدولعوززا لە ریزی بت پەرستەکانەوە دەرپەڕیی و ، ئەیوت : ئایا کەسێ هەیە زۆران بازیی بکات ؟ ئەوەبوو حەمزەی بۆ دەرپەڕیی و پێی وت : ئەی سیباع ! ئەی کوڕی ئوم ئەنمار ! ئایا دژایەتیی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەکەی ؟! هەڵمەتێکی دایە سەری و لە ناوی برد ..

ئەو رۆژە حەمزە دەوری کاریگەری هەبوو لە مل پەڕاندنی پاڵەوانەکانی سوپای قورەیش‌دا .. خۆی گەیاند بووە ناوجەرگەی سوپای مەککە ، سەرەڕای ئەوەی کە دەستی چاکی لە هەڵگرانی ئاڵاکە وەشاند .. کاتێکیش کە شەهید بوو وەك پاڵەوانانی جەنگ لە مەیدان‌دا شەهید نەکرا ، چونکە هیچ کەس نەیئەوێرا بێتە مەیدانی ، بەڵکو بە شێوەیەکی نامەردانە دەستی لێ وەشێنرا ..

وەحشیی کوڕی حەرب باسی چۆنیەتیی شەهید کردنی حەمزەمان بۆ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت :

غولامی جوبەیری کوڕی موطعیم بووم ، کە طوعەیمەی کوڕی عەدیی مامەی رۆژی بەدر کوژرابوو . کە قورەیش بەرەو ئوحود کەوتنە رێ ، جوبەیر پێی وتم : ئەگەر لە بری خوێنی مامەم حەمزەی مامەی موحەممەد بکوژیت ئەوا ئازاد بە .

ئەڵێت : منیش لەگەڵ خەڵکەکە کەوتمە رێ . جا من پیاوێکی حەبەشیی بووم و بە وێنەی حەبەشی یەکان حەربەم ئەهاویشت و ، بە دەگمەن نەم پێکایە . کە هەردوو سوپا دایان لە یەك من بۆ حەمزە چاوە و چاوم ئەکرد .. تا ئەوەبوو لە ناوەڕاستی خەڵکەکەدا دۆزیمەوە .. ئەبینم بە وێنەی وشتری بۆر ، خەڵکەکە تێك ئەشکێنێ و کەس بەرگەی ناگرێ . دە بەخوا من خۆم بۆ ئەو ئامادە ئەکرد و ، خۆم ئەدایە پەنای درەختێك یان بەردێك ، تا بەشکوم لێم نزیك ببێتەوە ، ئەبینم سیباعی کوڕی عەبدولعوززا کەوتە پێشم و بەرەو رووی رۆیشت . هەر کە حەمزە چاوی پێ کەوت پێی وت : وەرە بۆ لای خۆم ئەی کوڕی ...... ـ چونکە دایکی خەتەنەکەر بوو ـ . ئەڵێت : یەك شمشێری لێ دا و سەری لە لاشەی جیا کردەوە .

وەحشیی ئەڵێت : منیش حەربەکەمم ئەشۆکاندەوە ، تا کە بە دڵم بوو تێم گرت و ، ژێر ناوکی پێکا و ، لە نێوان هەردوو قاچیەوە دەرچوو . ویستی بەرەو رووم بێت ، کەچیی زۆری بۆ هات و کەوت ، منیش بە حەربەکەوە وازم لێ هێنا تا گیانی دەرچوو . پاشان هاتمە سەری و ، حەربەکەی خۆمم هەڵ گرت و ، گەڕامەوە بۆ سەربازگە و ، لەوێ دانیشتم و ، جگە لە حەمزە کارم بە کەسەوە نەبوو . ئەویشم لەبەر ئەوە کوشت ، هەتا ئازاد ببم . کاتێك گەڕامەوە مەککە ئازاد کرام.

لە مەککە مامەوە هەتا کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی کرد ، رام کرد بۆ طائیف و لەوێ مامەوە . کاتێك کە نوێنەرانی طائیف بۆ موسڵمان بوون چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، سەرم لێ شێوا و نەم ئەزانی چیی بکەم . ئایا خۆم بگەیەنمە شام ، یان یەمەن ، یان وڵاتی تر ؟ دە بەخوا من لەو خەم و خەفەتەمدا بووم ، پیاوێك پێمی وت : ماڵت کاول بێت ، بەخوا هەر کەس بچێتە سەر دینەکەی و شاهێدیی حەق بدات ، ئەو نایکوژێت .

وەحشیی ئەڵێت : کاتێك کە پیاوەکـە ئـەوەی پـیّ وتم ، کەوتمـە ڕێ و ، هاتمـە خزمەتی پێغەمبەری خوا لە مەدینـە . پێمـی نـەزانی هـەتا گەیشـتمە سـەری و وەستام و شایەتمانی حەقم هێنا . کە دیتمی پێمی فەرموو :

(( أوحشي أنت ؟ ))

وتم : بەڵێ ، ئەی پێغەمبەری خوا .

فەرمووی : (( أقعد فحدثني كيف قتلت حمزة ؟ )) .

فەرمووی : دانیشە و بۆم بگێڕەوە چۆن حەمزەت کوشت ؟

ئەڵێت : منیش بۆم گێڕایەوە . کە لە باسەکەم بوومەوە فـەرمووی : (( ويحـك غيّب عني وجهك )) . فەرمووی : تیاچیت ، دەم و چاوت نەبینم . ئیتر هەمیشە لە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆم لا ئەدا ، بۆ ئەوەی نەم بینێ ، هەتا کۆچی دوایی کرد ..

وەحشیی لە جەنگی پاشگەزبووەکان‌دا موسەیلەمەی درۆزن ئەکوژێت .

بوخاریی ریوایەتی کردووە کـە وەحشـیی وتوویـە : کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کۆچیی دوایی کرد و ، موسەیلەمەی درۆزن پەیدا بـوو ، وتم : ئەچـم بـۆ جـەنگی موسەیلەمە بەڵکو بی‌کوژم و بە کوشتنی ئەو کوشتنی حەمزە بکوژێنمەوە ..

ئەڵێت : لەگەڵ موسـڵمانان‌دا کەوتمـە ڕێ .. ئـەوەی کـە ڕووی دا ڕووی دا و ، ئەبینم پیاوێکی قژ دژراو بەوێنەی وشتری بـۆر لـە درزی دیوارێـك‌دا وەسـتاوە .. وەحشیی ئەڵێت : مـنیش حەربەکـەی خـۆمم تـێ گـرت و دای لـەنێوان هـەردوو مەمکی و لە نێو هەردوو شانیەوە دەرچوو . خێرا پیاوێکی ئەنصارییش هەڵمـەتی دایە سەری و بە شمشێر دای‌گرتەوە ..

لە دوایی تەمەنی‌دا وەحشیی ئەی‌وت :

ئەگەر من موسـەیلەمەی درۆزنم کوشـتبێ ، ئـەوا دوای پێغەمبـەری خـوا ﷺ چاك ترین کەس و ( واتە حەمزە ) خراپ ترین کەسم ( واتە موسەیلەمەی درۆزن ) کوشتوون .

کافرەکان بە دەسـت حـەمزەوە گیریـان خواردبـوو .. پیاویـان نـەبوو ، بـوێرێ ڕاستەوخۆ بچێتە مەیدانی ، لەبەر ئەوە ناچار بوون بە نەخشەیەکی ترسنۆکانە لـە ناوی بەرن .

وەحشیی ئەمێنێ هەتا لە دژی ڕۆمەکانیش لە جەنگی یەرمووك‌دا ئەجەنگێت.

هەرچەندە بە شەهیدبوونی حەمزەی شێری خوا و شێری پێغەمبەرەکەی موسڵمانەکان زیانێکی زۆر گەورەیان لێ کەوت ، لەگەڵ ئەوەش‌دا بە چاکیی دەستیان بەسەر مەیدانی جەنگ‌دا ئەڕۆی .. ئەوەبوو پیاوە بەغیرەتە پاڵەوانەکانی ئیسلام ، بە وێنەی ئەبوبەکر و عومەر و عەلیی و زوبەیر و موصعەب و طەلحە و عەبدوڵڵای کوڕی جەحش و سەعدی کوڕی موعاذ و سەعدی کوڕی عوبادە و سەعدی کوڕی رەبیع و ئەنەسی کوڕی نەضر و هاووێنەیان جەنگێکی سەروماڵیی کۆڵنەدەرانەیان کرد ، بە رادەیەك کە دەستی بت پەرستەکانیان سارد کردەوە و ، ورەیان رووخاندن .

یەکێ لە پاڵەوانەکان - بۆ نموونە - حەنظەلەی کوڕی ئەبوعامیری فاسق بوو .. حەنظەلە بە پێچەوانەی باوکی بوو .. گەنجێکی خواناس و سەرڕاست بوو .. لە پێشەوە باسی ناپاکیی باوکی کرا کە چۆن مەدینەی بە جێ هێشت و پاڵی بە کافرانی قورەیشەوە دا و دژی موسڵمانەکان چەکی هەڵ گرت ، بەڵام حەنظەلەی کوڕی ئەوپەڕی مەردایەتیی و وەفاداریی نواند .

حەنظەلە لە هەڵوێستی نامرۆڤانەی باوکی شەرمەزار ئەبوو ، بۆیە داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا مۆڵەتی بدات باوکی بکوژێت . بەڵام پێغەمبەری رەحمەت ﷺ رێگەی نەدا و قەدەغەی کرد .

لە شەوی جەنگی ئوحوددا حەنظەلە یەکەم شەوی زاوایەتیی بوو .. هەر ئەو شەوە جەمیلەی کچی ئوبەی کوڕی سەلوولی گواستبووەوە ، کە خوشکی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرۆکی نیفاق بوو .

حەنظەلە پیاوانە بەشداریی جەنگی ئوحودی کرد .. حەنظەلە ئەو پیاوەیە کە ناونراوە ( غسيل الملائكة ) ، چونکە کە شەهید کرا لەشی گران بوو و بە فەرمانی خوا مەلائیکە شۆردیان . کە بەیانیی زوو جاڕ درا بۆ جیهاد بووکی بەجێ هێشت و دەستی دایە کەرەسەی جەنگ و ، بێ‌ئەوەی ماوەی هەبێ خۆی بشوا ، بە پەلە خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ .

کە جەنگ دەستی پێ کرد حەنظەلەش خۆی کرد بە ناو ریزەکان‌دا و گەیشتە ناوجەرگەی مەیدانی جەنگ و ، گەیشتە لای ئەبوسوفیانی فەرماندەی گشتیی سوپای مەککە و ، هەڵمەتێکی دایە و ، چوارپەلی ئەسپەکەی قرتاند و ، ئەبوسوفیان لە سەری کەوتە خوارەوە .. کە ئەبوسوفیان کەوتە زەویی ، حەنظەلە

هەڵمەتی دا و پەڕییە سەرسەری و ، ویستی سەری ببڕێ .. بەڵام بە فەرمانی خوا ڕۆژی ئەبوسوفیان تەواو نەبوو بوو و ، ئەبوا نەمرێ هەتا ئیمان بهێنێ و پلەی هاوەڵێتیی دەست بکەوێ ، ئەوەبوو یەکێ لە پیاوە دڵسۆزەکانی دەوروبەری ئەبوسوفیان کە ناوی شەددادی کوڕی ئەسوەد بوو و بە نازناوی ( إبن شعوب ) ناسرابوو ، بە پەلە هەڵمەتی دا تا ئەبوسوفیان ڕزگار بکات .. بە شمشێر حەنظەلەی داگرتەوە و شەهیدی کرد .

دوای شەهیدبوونی حەنظەلەی پاڵەوان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إن صاحبكم لتغسله الملائكة فاسألوا أهله ما شأنه ؟ )) .

فەرمووی : مەلائیکە حەنظەلە ئەشۆن ، لە هاوسەرەکەی پرسیار بکەن بزانن هۆی ئەمە چی‌یە ؟

کە پرسیار لە هاوسەرەکەی کرا ، وتی : کاتێك کە دەنگی جارچیی جیهادی بیست بە لەشی گرانەوە کەوتە ڕێ ..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لذلك غسلته الملائكة )) . فەرمووی : لەبەر ئەوە مەلائیکەت شۆردوویانە .

دوای ئەوەی کە حەنظەلە لە مەیدانی جەنگ‌دا لەگەڵ شەهیدەکانی تردا لە خوێنی خۆی‌دا گەوزابوو و ، ڕۆحەکەی بۆ ئاسمان بەرزبووبوویەوە ، ئەبوعامیری باوکی لەگەڵ چەند فەرماندەیەکی قوڕەیش‌دا دایان بەلای لاشەی کوڕە پاڵەوانەکەی‌دا .. ئەوەندی بۆ هات نارەزایی لە هەڵوێستی کوڕەکەی دەربڕێ و ، لەقەیەکیش لەسەر سنگی بدات .

لە ( فتح الباري : ٧ / ٣٤٦ ) دا ئەوە هاتووە کە ئەو پەنجا تیرهاوێژەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر چیای تیرهاوێژان دای‌نان ، دەورێکی کاریگەریان هەبوو بۆ پشت‌گیریی سوپای ئیسلام ، تا بتوانێ بە ویستی خۆی دەست لە سوپای مەککە بوەشێنێ ..

ئەوەبوو ئەسپ سوارانی مەککە بە سەرکردایەتیی خالیدی کوڕی وەلید و ، پشت‌گیریی ئەبوعامیری فاسق و جەنگاوەرانی دەوروبەری ، سێ جار هێرشیان کردە سەر باڵی چەپی سوپای ئیسلام ، بەو نیازەی تێکی بشکێنن ، تا دوا لە موسڵمانان بگرن و ، ئاژاوە و سەرگەردانی‌یان تێ بخەن و ، سەرەنجام بەرەو تێك

شکانیان بەرن ، کەچیی تیرهاوێژەکان ئازایانە هەر سێ هێرشەکەی خالیدیان پەرچ دایەوە و ، نەیانهێشت بەو مەبەستەیان بگەن .

کە ئەم سێ هەڵمەتە سەریان نەگرت و لووتی قورەیش شکا و .. پیاوانی هەڵگرانی ئاڵا یەك لە دوای یەك بە دەستی موسڵمانان کوژران و ، ئاڵا کەوتە زەویی و .. پاڵەوانەکانی ئیسلامیش مەردانە دەستیان لە سوپای بت پەرستان ئەوەشاند، بەرە بەرە ورەی قورەیش رووخا .. دەست و پەلیان شمشێری نەئەگرت .. ریزەکانیان بە راست و بە چەپدا پەرتەوازە بوون و ، بەوپەڕی شپرزەییەوە سێ هەزار جەنگاوەری داخ لە دڵ بە دەست سوپایەکی بچکۆلەوە گیریان خوارد بوو ، هەروەك سوپای ئیسلام حەوتصەد کەس نەبن ، بەڵکو سیی هەزار بن .

بەرەبەرە قورەیش گەیشتنە ئەو یەقینە کە لە رۆژی بەدر خراپتریان بەسەر دێ .. گەیشتنە ئەو یەقینە کە هەرگیز ئەوان چاری سوپای بچکۆلەی مەدینە ناکەن .. کورتەکەی موسڵمانان سەرکەوتنێکی یەکجار بێوێنەیان مسۆگەر کردبوو ، کە بەبیری هیچ کەسدا نەئەهات .

هێرشی موسڵمانەکان هێرشێکی کاریگەر بوو ، بۆیە قورەیش هەموو هەوڵێکی خۆی دا تا ئەو هێرشە بووەستێنێ .. هەستی بە دەستەپاچەیی ئەکرد .. هیممەت و غیرەتی ئەو سوپا گەورەیە سفر بوو ، بە رادەیەك لە ناو سێ هەزار جەنگاوەردا ، تاقە پیاوێك نەیئەوێرا دەست بداتە ئاڵای ژێر پێ کەوتوو و ، بەرزی بکاتەوە .. کەسێك نەبوو هەڵی بگرێ تا قورەیش لە دەوری کۆ ببێتەوە .. ئەو سوپا بێشومارە هەر هەمووی ورەی نەما بوو .. ئەوەندەیان بۆ هات پاشەکشێ بکەن و مەیدان چۆڵ بکەن و هەڵ بێن .. ئیتر لە یادیان چوو کە ئەمان بۆ تۆڵەسەندن هاتوون و ، ئەیانەوێ ئابڕووی قورەیش بسێننەوە .

ئیبن ئیسحاق وتوویە : پاشان خوای گەورە سەرکەوتنی خۆی بۆ موسڵمانان نارد و ، بەڵێنەکەی خۆی بۆ بەسەر بردن . ئەوەبوو بە شمشێر دایان گرتنەوە ، هەتا لە سەربازخانەکەیان هەڵیان بڕین و ، تێك شکانیان گومانی لێ نەئەکرا . عەبدرڵڵای کوڕی زوبەیر لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : بە خوا چاوم لە قاچی هیندی کچی عوتبە و دەستە خوشکانی بوو کە هەڵیان ماڵی بوون و هەڵ ئەهاتن . لە ریوایەتەکەی بەرائی کوڕی عازیبیشدا ، کە بوخاریی لە صەحیحەکەیدا

گێڕاویەتەوە ، هاتووە : کە پێیان گەیشتین هەڵاتن ، هەتا چاوم لە ئافرەتان بوو کە پەتیان توند ئەکردەوە تا قاچیان هەڵ ماڵن و ، پاوانەکانیشیان دەرکەوتبوون .

موسڵمانەکان سوپای قورەیشیان راونا ..

بە شمشێر دایان گرتنەوە ..

دەستکەوتەکانیان کۆ ئەکردنەوە ..

مەیدان کەوتە دەست موسڵمانەکان .. پیاوانی قورەیش هەڵ ئەهاتن و ، ئافرەتەکانیشیان کە لەوەو پێش بە خۆشی‌یەوە دەفیان لێ ئەدا ، کەوتنە وەلوەلە و دەفیان فڕێ دا و قاچیان دەرخست و روویان لە کێوەکان نا .[٣٨٢]

**یانزەهەم : هەڵەی تیرهاوێژەکان :**

قورەیش هەر هەمووی هەڵ دێت .. مەیدان چۆڵ بووە .. کوژراوەکان لەو ناوەدا کەوتوون و ، قورەیش نەی‌توانیی کۆیان بکاتەوە .. دەمێکیشە ئاڵای قورەیش کەوتووە و، چاوەڕوانی پیاوێک ئەکات بەرزی بکاتەوە .. نەوەی عەبدوددار مەردانە بەرگری‌یان لە ئاڵاکەیان کرد و ، هەر هەموو لەو پێناوەدا سەریان نایەوە .. دوای ئەوان پیاوێك دەست ناکەوێ بەرزی بکاتەوە ، چونکە هەر کەس دەستی بداتێ ، یەکسەر بە شمشێری موسڵمانان قۆڵی ئەقرتێت ..

ئا لەم کاتەدا کە خەریك بوو سوپا خنجیلانەکەی ئیسلام بۆ جاری دووهەم ، دوای بەدر ، سەرکەوتنێکی تر بەسەر قورەیش‌دا تۆمار بکات ، کە هیچی لە سەرکەوتنەکەی بەدر کەمتر نەبێت .. ئا لەم کاتەدا هەڵەیەکی یەکجار گەورە لە دەستی ئەو کۆمەڵە دەرچوو کە بەوپەڕی لێ‌هاتنەوە پشتی سوپای موسڵمانانیان ئەگرت و ، هۆی سەرەکیی بە دەست‌هێنانی سەرکەوتن بوون ، کە ئەوانیش دەستەی تیرهاوێژان بوون .. تا بە چاکیی کاریان ئەکرد سەرکەوتن بەشی سوپای ئیسلام بوو ، بەڵام کە کەوتنە هەڵەوە موسڵمانان تووشی زیانێکی گەورە بوون .. هەتا خەریك بوو ببنە هۆی کوژرانی پێغەمبەری خوا ﷺ .. ئەم هەڵەیە بووە خاڵێکی ناشیرین لە ناو چاوی تیرهاوێژان‌دا و ، سام و هەیبەتی موسڵمانانیشی نەهێشت ..

---

[٣٨٢] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ١٩٣ ـ ١٩٥ ، ٢١٣ ـ ٢١٤ ، الرحيق : ٢٦٤ ـ ٢٦٨ ، غزوة أحد : ١١٩ ـ ١٤٣ ، ١٦٥ ـ ١٧٠ .

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە توندیی فەرمانی بەسەردا دان تا بە هیچ شێوەیەك گردەکە چۆڵ نەکەن ، هەتا ئەگەر باڵندە موسڵمانان بفڕێنن ئەوان نەیەن بە دەمیانەوە ، چونکە لەوە ئەترسا کە ئەسپ سوارانی قورەیش هەل بە دەست بێنن و لە دواوە هێرش بکەنە سەر موسڵمانان .
جا لەبەر ئەوەی کە ئەگەر تیرهاوێژان وریا و ئاگادار بن ئەتوانن ئەو هەڵمەتە پووچەڵ بکەنەوە ، فەرمانی دا تا هەمیشە چاودێریی ئەسپ سواران بن و ، هەر کە لێیان نزیك کەوتنەوە ، بە تیر دایان بگرنەوە ..

هەرواش بوو ، هەر لە یەکەم ساتی جەنگەوە خالید بیری بەلای ئەو کارەوە بوو و ، وەك لە پێشەوە باس کرا ، سێ جار هەڵمەتی دا و تیرهاوێژانی سەر کێوەکە لووتیان شکاند و گێڕایانەوە .

هێشتا بەو شکانەش کۆڵی نەدا .. هەر چاوەڕوان بوو کەی ئەو کێوە چۆڵ بکرێ و ، دەرفەتی دەست بکەوێ لە دواوە هەڵمەت بۆ موسڵمانان بەرێ ؟

موسڵمانان بێخەمی ئەوە بوون کە لە دواوە هەڵمەتیان بۆ نادرێت ، چونکە پاڵەوانەکانی سەر کێوەکە مەردانە دەست لە هەر کەسێك ئەوەشێنن کە نیازی خراپی هەبێ ، بۆیە هەڵمەتیان ئەدا و شمشێریان خستبووە گەردنی سەربازە شپرزە هەڵاتووەکانی مەککە .

بەڵام تیرهاوێژەکان بوونە هۆی لێقەومانێکی یەکجار گەورە ، بەوەی کە فەرمانی پێغەمبەری خوایان ﷺ شکاند .. بوونە هۆی لە دەستدانی بەروبوومەکانی ئەو سەرکەوتنە مەزنەی کە سوپای ئیسلام بە دەستی هێنا ، سەرەڕای شەهیدبوونی شەصت موسڵمان و ، زامداربوونی پێغەمبەریش لە چەند جێگەیەکەوە کە خەریك بوو پێیان بمرێت ..

بەڵێ ، تیرهاوێژەکان کە دیتیان وا موسڵمانەکان دەستیان داوەتە راونانی قورەیش و کۆکردنەوەی دەستکەوتەکانی جەنگ و ، کە دیتیان وا دەمێکە ئاڵای قورەیش لەو ناوەدا کەوتووە و کەس نیە هەڵی بگرێ و بەرزی بکاتەوە ، بوون بە دوو دەستەوە و ، کەوتنە وت و وێژی ئەوەی کە ئایا گردەکە چۆڵ بکەن یان نا ..
زۆربەیان رایان وەها بوو کە ئەوەتا قورەیش تێك شکاوە و هەڵ دێت و ، ئەمانیش مافی خۆیانە دابەزنە مەیدانی جەنگ و بەشی خۆیان لەو دەستکەوتانە کۆ بکەنەوە کە لە مەیدانی جەنگدا کەوتوون .. هەندێکیشیان ، کە ژمارەیان کەم

بوو ، لەگەڵ ئەمیری تیرهاوێژان‌دا رایـان وەهـا بـوو کـە پێویسـتە لـە فـەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هیچ شێوەیەك دەرنەچن و ، بۆیان نیە کێوەکە چۆڵ بکـەن مەگەر بە فەرمانی تایبەتیی خۆی . کـە دەنگـی وت و وێـژیان بـەرز بوویـەوە ، عەبدوڵلای کوڕی جوبەیری فەرماندەیان وتارێکی بۆ دان و ، لەوە ئاگـاداری کـردن کە بۆیان نیە شوێنی خۆیان چۆڵ بکەن و ، فەرمانە توندەکانی پێغەمبـەری خـوای ﷺ هێنانەوە یادیان کە نابێ شوێنەکانیان چۆڵ بکەن .

عەبدوڵلا دەری بڕیی کە ئەو لەسەر مانەوە لەسەر کێوەکە سوورە و ، مۆڵـەتی کەسیش نادات دابەزێ .. ئەگەر فەرمانی کشانەوەی بۆ نەیەت تـا مـردن شـوێنی خۆی چۆڵ ناکات .

بەڵام زۆربەیان ـ وەك خوا بیەوێ کارێك بێتـە دیـی ـ لـە فـەرمانی فەرمانـدە دەرچوون و ، شوێنی خۆیان بەجێ هێشت و ، روویان لە مەیدانی جەنگ نا ..

بەڵێ ، چل پیاویان دابەزین و ، فەرماندە و نۆ پیاویش لە گەڵیا مانەوە .

خالید هەستی کرد وا نزیکە ئاواتەکەی بێتە دیی .. چاوی لێ بـوو وا گردەکـە موسڵمانی تیرهاوێژی کەمی لەسەر ماوە و ، وا چاکە هێرش بکاتە سەر کێوەکە . بـە پەلـە سـووڕێکی خـوارد و کەوتـە ئـەودیوی سـوپای موسـڵمانان و دوای لـە تیرهاوێژەکان گرت ..

بەڵێ ، فەرمانی دا ئەسپ‌سـواران بـە پەلـە دوا لـە سـوپای ئیسـلام بگـرن . ئەوانیش بە پەلە ( کە خالیـد و عیکریمـە فەرمانـدەیان بـوون ) خۆیـان گەیانـدە گردەکە .. پێش هەموو شتێك پێویستە ئەو کێوە پـاك بکەنـەوە .. هەڵمـەتێکی بێ‌وێنەیان دا و ، بەبێ رەحمانە دووصەد ئەسپ سواری پڕ چەك و بە زرێ داپۆشراو هەوڵی قەلاچۆکردنی تیرهاوێژانیان دا ..

تیرهاوێـژان بـە خۆیـان و فەرماندەیانـەوە کـە دە کەسـێك ئـەبوون ئەوپـەڕی دامەزراوی‌یان نواند و ، پاڵەوانانە ئەهاتن بە گـژی ئەسـپ سـوارانی خالیـدا .. بەڵام دە تیرهاوێژ هەر چۆن بن بەرگەی دووصەد ئەسپ سوار ناگرن ، لەبـەر ئـەوە زۆری پێ نەچوو هەر هەموویان بە شـەهیدیی و ، بـە سـەری بـەرزەوە ، سـەریان نایەوە ، خوا لە هەموویان رازیی بێ .

دوای ئەوە خالید هەڵمەتێکی دایە بەشی دواوەی سوپای ئیسـلام و ، بـە یـەك نرکەی خۆی و سوارچاکەکانی بت‌پەرستە تێك‌شـکاوە هـەڵاتووەکانی مەککـە تـێ

گەیشتن کە خالید دەستی خۆی وەشاندووە و ، سەرکەوتوانە پشتی لە سوپای مەدینە گرتووە .. تێك شکاوەکان ورەیان پەیدا کردەوە و ، هاتنەوە بە رووی موسڵمانەکان‌دا و ، خێرا ئافرەتێك بە ناوی عومەرەی حاریثی‌یەوە دەستی دایە ئاڵا فڕێ دراوە ، کەوتووەکەی مەککە و ، بەرزی کردەوە ، تا سەر لە نوێ تێك شکاوەکان لە دەوری کۆ ببنەوە .. قوڕەیشی‌یەکان بانگیان کردە یەکتر و ، ئازایەتی‌یان خستە بەری یەکتر و ، بەرە بەرە گەڕانەوە مەیدان و دەستیان بە جەنگ کردەوە ..

بەم شێوەیە هەڵوێستەکە گۆڕا و ، موسڵمانەکان تووشی زیانێکی گەورە بوون .. چونکە کەوتنە نێوان دوو ئاگرەوە .. تێك شکاوەکان لە پێشەوە و خالید لە دواوە گەمارووی موسڵمانانیان دا و ، موسڵمانەکان کەوتنە بیری خۆ رزگار کردن و لەو ئابلۆوقەیە و ، سەرکەوتنیان لە بیرچوویەوە ..

تەنها بەم هەڵمەتە ناخلۆفی‌یەی خالید ، کە هەڵەی تیرهاوێژەکان بۆی ئاسان کرد ، ئەو نەخشە جوانە حەکیمانەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە بۆ موسڵمانانی دارێژرا بوو ، تێك چوو و ، موسڵمانەکان چوونە بارودۆخێکی ترەوە و ، بە شێوەیەکی پەرتەوازە و بێ‌نەخشە ئەجەنگان و ، لە هەموو نەخشە و ئامۆژگاری‌یەکی سەرکردایەتیی پچڕان و ، هەر کەسە بۆ خۆی هەوڵی ئەدا خۆی دەرباز بکا و ، دەستی کافرانی نەگاتێ ..

تەنها هەڵەیەك بوو ، بەڵام هەموو مەیدانی لە موسڵمانان تێك دا ..

دوای ئەو هەڵەیە موسڵمانەکان رێك و پێکیی ریزەکانیان نەما و ، هەموو بە جارێ تووشی شڵەژان و سەرلێ‌شێوان بوون و ، تێکەڵ و پێکەڵ بوون و ، چیی دەست‌کەوتیان کۆ کردبووەوە ، ناچار بوون فڕێی بدەن . ئەوەندەش شپرزە بووبوون کوشتاری یەکتریان ئەکرد .. زۆربەیان نەیان ئەزانیی روو لە کوێ بنێن .. نەیان ئەزانیی چیی بکەن !! بە تایبەت دوای ئەوەی کە یەکێ لە بت پەرستان بە دەنگی بەرز قیڕاندی و شۆکەی خستە مەیدانی جەنگەوە و وتی : موحەممەد کوژراوە .

شڵەژان و شپرزەیی بووە بەشی موسڵمانەکان .. لەبەر نەمانی ورە و سەرلێ‌شێوان ، هەندێ لە موسڵمانان بە دەستی خۆیان کوژران .. رۆژێکی یەکجار سەخت بوو .. ئەوەی بە بیری موسڵمانان‌دا نەهاتبوو ئەمە بوو ..

لە راستیی‌دا ئەبوایە بەم هەڵەیە و بەم هەڵوێستە هەڵ گەڕاوەیە ، ئەو سوپا زۆر و زەبەندەی مەککە ، بە زووترین کات سوپای موسڵمانانی لە ناو ببردایە و ، مەدینەش بگیرایە و ، شوێنەواری ئیسلام نەمایە . بەڵام شێرەکانی ئیسلام بەو ئاسانی یەش کۆڵ نادەن .. ئەگەرچیی زیانیشان لێ بکەوێ ، ئەوان هەر خاوەنی ئیمانی دامەزراون .. ئەوەشیان کە شەهید ئەبوو ، بە شانازی‌یەوە ئەو شەهیدی‌یەی وەرئەگرت .. هەر چەندە هەڵوێستەکە سەخت بوو و ، لە پێغەمبەری سەرکردە ﷺ دابڕا بوون ، کە هۆشیان بە خۆیان‌دا هاتەوە ، دەستیان دایە جەنگێکی سەروماڵیی وەها کە بتوانن خۆیان لەو ئابلووقەیە دەرباز بکەن و ، خۆیان بگەیەننەوە خزمەتی سەرکردەی گشتیی سوپای ئیسلام ، بە تایبەت دوای ئەوەی کە بۆیان دەرکەوت نەکوژراوە و سەلامەتە و ، لە بنکەی سەرکردایەتی یەوە بانگی لێ کردن ..

بە زەحمەت و ماندووبوون و قوربانی‌یەکی زۆر و ، لە نێوان صەدەها رم و شیر و تیردا ، بە هەر حاڵێك بوو گەیشتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا قورەیش لە هێرش بخەن و ، نەوێرێ بیر لە داگیرکردنی مەدینە بکاتەوە .. هەتا نەهێڵن قورەیش ببێتە خاوەنی مەیدانی جەنگ ، وەك موسڵمانەکان لە بەدردا مانەوە و دەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرت و ، کوژراوەکانی قورەیشیان خستنە ناو بیرەکەی بەدر و ، شەهیدەکانیشیان بەوپەڕی شکۆوە ناشتن .

هەر چۆنێ بوو دوای ئەوەی بت پەرستەکان ورەیان پەیدا کردەوە و لە موسڵمانەکان هەڵ گەڕانەوە ، سوپای موسڵمانان بوون بە سێ دەستەوە :

دەستەی یەکەم : پێغەمبەری خوا ﷺ و هەندێ لە پیاوانی سەرکردایەتیی گشتیی کە لە خزمەتی‌دا مابوونەوە و ، بەشداریی تێك‌شکاندن و راونانی قورەیشی یەکانیان نەکردبوو ، وەك ئەبوبەکری صددیق و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلاّ و هەندێکی تر لە موهاجیر و ئەنصار . ئەم دەستەیە یەکجار کەم بوون و ژمارەشیان لە چواردە پیاو تێپەڕی نەئەکرد ..

دەستەی دووهەم : ئەمانە لە راونانی دوژمن‌دا بەشداری‌یان کرد ، بەڵام زۆر بە دوای دوژمن‌دا نەڕۆیشتن ، بەڵکو لە نزیك بنکەی سەرکردایەتیی پێغەمبەردا مانەوە . کاتێك کە بارودۆخی مەیدانی جەنگ گۆڕرا و ، موسڵمانەکان کەوتنە نێوان ئاگری بت‌پەرستەکان و خالیدەوە ، دوژمن نەی‌توانیی ئەم دەستەیە گەمارۆ

بدات . وەهاش دەرئەکەوێ کە ئەنەسی کوڕی نەضر و، عومەری کوڕی خەططاب و، سەعدی کوڕی ئەبووەققاص لەگەڵ ئەم دەستەیەدا بووبن ..

ئەم دەستەیەش زۆر کەم بوون ، بەڵام هەر پیاوێکیان لە جێی صەدان پیاو بوو .. کە بارودۆخەکە وەهای لێ هات ، ئەمان راستەوخۆ خۆیان گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ و ، قەڵغانێکیان بۆ پاراستنی ئەو پێك هێنا ، نەوەکو دوژمن هەڵمەتی بۆ بدات ..

دەستەی سێهەم : ئەمە بەشە گەورەی سوپاکە بوو و ، زۆربەی زۆری سوپای ئیسلامی لێ پێك هاتبوو .. ئەمانە بوون کە دوژمنیان تێك شکاند و راویان نا و، قوڕەیشیان لە سەربازگەکەیان دەرپەڕاند و ، دەستیان بەسەر بنکەی سەرکردایەتییدا گرت و ، سەربازگەکە چیی کەل و پەل و تفاقی تێدا بوو هەموویان دەست خۆیان خست .

ئەم سوپایە بوو کە خالید پشتی لێ گرت و قوڕەیشیش بە یەکجاریی گەمارۆوی دا .. ئەم دەستەیەش دوای گەمارۆودرانی بوو بە دوو دەستەوە :

یەکەم : کە بەشێکی کەم بوو ، توانیی خۆی دەرباز بکات و بەرەو مەدینە هەڵات ، چونکە نەیتوانیی بەرەو بنکەی سەرکردایەتیی هەنگاو هەڵ گرێ ، لەبەر ئەوەی کە وای ئەزانیی موسڵمانەکان تێك شکاون و ، پێغەمبەری خواش ﷺ کوژراوە ..

ئەم دەستە بچکۆلەیە کە بە تێك شکاویی روویان لە مەدینە نا ، کاتێك گەیشتنە قەراغی شار ، ئەو ئافرەتانەی کە لە قەڵاکاندا بوون و ، ئەوانەش کە هاتبوونە سەر گردۆڵکەکان و ، چاودێریی جەنگیان ئەکرد ، بەو دەستە هەڵاتوانەدا هەڵ شاخین .. هەتا ئافرەتەکان خۆڵیان ئەکرد بە دەم و چاوی مێردەکانیاندا ، کە بۆچ جەنگیان بەجێ هێشتووە ، خۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نەکوژراوە .. ئەمانە بە پەلە بەرەو مەیدانی جەنگ گەڕانەوە ، بەڵام دوای جەنگ بە پێغەمبەری خوا گەیشتنەوە .. ئەڵێن : هەندێ لەو هەڵاتوانە سێ رۆژ دوای جەنگ گەڕاونەتەوە .

ئەمانە قورئانی پیرۆز دەربارەیان هاتە خوارەوە و چاوپۆشیی لێ کردن :

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴾ ( آل عمران : ١٥٥ ) .

**دووهەم :** بەشی هەرە زۆری سوپاکە بوو گەمارۆ درا بوو ، ئا لەو کاتەدا تووشی شلەژاویی بوون و ، ورەی هەندێکیان بە جارێ رووخا ، بە تایبەت کە دەنگ و باسی کوژرانی پێغەمبەریان بیست . ئەوەندە پەشۆکا بوون باوکی حوذەیفەی کوڕی یەمانیان [٣٨٣] کوشت ، هەرچەندە حوذەیفە هاواری لێ کردن ئەوە باوکمە ، لە دەستیان دەرچوو و کوشتیان . دوای کوشتنی حوذەیفە وتی : خوای گەورە لێتان خۆش ببێ .

موسڵمانەکان لەم بارودۆخە ناڕەحەتەدا بوون و ، لە مەیداندا گیریان خواردبوو، هەر ئەوەندەیان زانیی دەنگ و باسێکی پڕ مەترسیی بڵاو بوویەوە کە کافرەکان پێغەمبەری خوایان کوشتووە .

هۆی بڵاوبوونەوەی ئەم پاگاندەیەش ئەوەبوو کە یەکێ لە ئەسپ سوارانی قورەیش ، کە ناوی ئیبن قەمیئە بوو تووشی موصعەبی کوڕی عومەیری عەبدەریی [٣٨٤] بوو ، کە هەڵگری ئاڵای موسڵمانەکان بوو و کوشتی . روخساری موصعەب لە روخساری پێغەمبەری خوا ﷺ ئەچوو ، بە تایبەت کاتێ کەرەسەی جەنگی پۆشیایە ، بۆیە بت پەرستەکە موصعەبی بە پێغەمبەر زانیی و ، هاواری کرد موحەممەدم کوشت . ئیتر هەواڵەکە دەما و دەم بڵاو بوویەوە .

---

[٣٨٣] حوذەیفەی کوڕی حوسەیلی کوڕی جابیری یەمانیی عەبسییە .. یەکێکە لە گەورە هاوەڵان .. خۆی و باوکی موسڵمان بوون . ویستیان بەشداریی جەنگی بەدر بکەن ، بۆیە بە جووتە لە مەدینەوە ئەکەونە رێ بە دوای سوپای ئیسلامدا ، کەچیی تووشی سوپای مەککە ئەبن و ئەیانگرن و ئەڵێن : ئێوە ئەتانەوێ بچنە کۆمەکیی موحەممەد . ئەڵێن : نەخێر ئەوەمان ناوێ .. ئەوسا پەیمانی خوایان لێ وەرئەگرن تا بەشداریی جەنگ نەکەن و بگەڕێنەوە مەدینە . دوای ئەوە دێنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و باسەکەی بۆ ئەگێڕنەوە ، ئەویش فەرمانیان بەسەردا ئەدا کە بگەڕێنەوە مەدینە و جەنگ نەکەن . حوذەیفە بەشداریی جەنگی ئوحود و خەندەق و جەنگەکانی تری کردووە .. دواییش والییەکی ئازا و وڵات رزگارکەری لێ دەرچووە . زیاتر لە خاکی فارسدا خەریکی فتووحات بووە .. هێرشی کردۆتە سەر نەهاوەند و ، دینەوەر و ، ماهی سەندانی فەتح کردووە و ، هێرشی کردۆتە سەر هەمەدان و رەی ( ناوچەی تاران ) و بە زۆر فەتحی کردوون . خەلیفە عومەر ئەیکاتە والیی مەدائین ، بەڵام دەست پاکترین والیی بووە و هەمیشە جێی متمانەی خەلیفە عومەر بووە .. حوذەیفە خۆشەویست و متمانەپێکراوی پێغەمبەری خواش بووە ، بۆیە تەنها ئەو ناوی مونافیقەکانی مەدینەی زانیوە . ئەوەبوو کە یەکێك لە مەدینەدا ئەمرد ، خەلیفە عومەر سەرنجی ئەدا و پرسیاری هاتنی حوذەیفەی ئەکرد .. جا ئەگەر حوذەیفە بۆ نوێژی ئەو مردووە ئامادە بوایە خەلیفەش نوێژی لەسەر ئەکرد ، ئەگینا نەیئەکرد . حوذەیفە ( ٢٢٥ ) فەرموودەی گێڕاوەتەوە . لە ساڵی ( ٣٦ ) ی کۆچییدا لە مەدائین کۆچی دوایی کردووە .

[٣٨٤] لە پێشەوە دیمان کە هەڵگری ئاڵای قورەیش نەوەی عەبدوددار بوون و، یەك بە یەك لە پێناوی پاراستنی ئاڵاکەیاندا خۆیان بە کوشت دا . موصعەبیش لە نەوەی عەبدوددار بووە و پێغەمبەری خوا ﷺ بە شیاوی زانیوە ئاڵای بداتە دەست .

بەم هەواڵە درۆینە ئەوەندەی تر موسڵمانەکان شپرزە بوون و سەریان لێ شێوا ، بە تایبەت ئەوانەی کە کەوتبوونە ناوەڕاست و گەمارۆ درابوون ..

هەندێکیان سەرسام مابوون و نەیان ئەزانیی چیی بکەن و ، هەندێکی تریشیان لە جەنگ کۆڵیان ئەدا و شمشێرەکانیان دانا و ، هەندێکی تریش بیریان لەوە ئەکردەوە پەیوەندیی بە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی بکەن لە مەدینە ، تا خۆ بە دەستەوەدانیان بە قوڕەیش و ئەبوسوفیانی فەرماندەی گشتیی بگەیەنێ و ، ئەمانیان بۆ وەربگرێ ، چونکە وایان ئەزانیی پێغەمبەری خوا ﷺ کوژراوە و ، دینی ئیسلامیش ئیتر تەواو ئەبێ ..

یەکێ لەوانە وتی : خۆزگە نێرراوێکمان بناردایە بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی تا لای ئەبوسوفیان ئەمانمان بۆ وەربگرێ . خزمینە ! موحەممەد کوژراوە ، جا بگەڕێنەوە ناو خزمەکانتان بەر لەوەی ئەوان بێنە سەرتان و بتانکوژن .

کە ئەمان وەها سەرسام و سەرگەردان بوون و ، نەیان ئەزانیی بڕیارێکی ڕێك و پێك بدەن ، ئەنەسی کوڕی نەضری خەزرەجیی دای بە لایانا .. دیتی وا موسڵمانەکان چەکیان فڕێ داوە و ، شپرزە بوون و دەستە ئەژنۆ دانیشتوون . کە پرسیاری هۆی ئەم دەست ساردبوونەوەی لێ کردن ، وتیان : پێغەمبەری خوا کوژراوە .

وتی : خزمینە ! ئەگەر موحەممەد کوژرا بێ ، خۆ پەروەردگاری موحەممەد نەکوژراوە . دەی ئێوە دوای پێغەمبەری خوا ژیانتان بۆ چی یە ؟ دە هەستن لە پێناوی ئەو دینەدا کە ئەو جەنگی بۆ کرد و لە پێناویشیدا مرد ، ئێوەش بجەنگن و لە پێناویشیدا بمرن .

پاش ئەم ئامۆژگاری یە ، ئەنەس ڕووی لە بت پەرستەکان کرد و ، بە خۆی و شمشێرەکەیەوە ، وەك هەوری بەهار هەڵمەتی بۆ ئەدان و ئەیوت :

خوایە ! لەو کارەی کە ئەمانە هێناویانە ( واتە بت پەرستەکان ) خۆم بەریی ئەکەم و ، لەم قسەیەش شەرمەندەم کە ئەمانە ئەی کەن ( واتە ئەو موسڵمانانەی کە چەکیان دانا بوو و بیریان لە خۆ بە دەستەوەدان ئەکردەوە ) .

دوای ئەوە تووشی سەعدی کوڕی موعاذ بوو و پێی وت : ئەی سەعد ! بۆنی بەهەشت لەلای ئوحودەوە ئەبیستم . بە پەلە خۆی هاویشتە ناو کوورەی جەنگەوە و دەستی بە کوشتارێکی بێ وێنە کرد ، هەتا ئەوەبوو شەهید کرا و ، دوایی

سەیریان کرد هەشتا و ئەوەندە زامی دەمی شمشێر و لێدانی رم و نووکی تیری پێوە بوو .. ئەوەبوو تەنها خوشکەکەی توانیی بە هۆی پەنجەیەوە بیناسێتەوە . ئەوەبوو دەربارەی ئەم قارەمانە دڵسۆزانە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە کە ئەیفەرموو :

﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴾ ( الأحزاب : ٢٣ ) .

بەڵێ ، دینە بێگەردەکەی خوای گەورە پیاو پەروەردە ئەکات .. مەرد و قارەمان پێ ئەگەیەنێ ، تا سەروماڵیان بکەنە قوربانیی ئیمان ..

هەروەها هاوەڵێکی تری مەزن ، کە هاوپەیمانی ئەنصار بوو ، بە ناوی ثابیتی کوڕی دەحداحی بەلەویی ، کە دیتی ، بە بۆنەی پاگاندەی کوژرانی پێغەمبەرەوە ، هەندێ جەنگاوەری موسڵمان ورەیان رووخاوە و ، نازانن چیی بکەن ، هاواری کردە ئەنصارەکانی خزمی و ، داوای لێ ئەکردن کە غیرەت بنوێنن و ، دان بە خۆیاندا بگرن . کە ئەیوت :

ئەی کۆمەڵی ئەنصار ! ئەگەر موحەممەد کوژرا بێت ، ئەوا خوا زیندووە و نامرێت . لەسەر دینەکەتان کوشتار بکەن ، بە راستیی خوا کۆمەکییتان ئەکات و سەرتان ئەخات ..

ئەوەبوو چەند پیاوێکی ئەنصاریی هەستان و هاتن بە دەمیەوە .. ئەویش بە خۆی و ئەو چەند ئەنصاری‌یەوە هێرشی کردە سەر کەتیبەیەکی ئەسپ سوارانی قوڕەیش کە خالیدی کوڕی وەلید و ، عەمری کوڕی عاص و ، عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل و ، ضیراری کوڕی خەططابیان تێدا بوون .. خێرا خالید بە رمەکەی هەڵمەتی دایە ثابیت و ، ئەویش و ئەو پیاوانەش کە لەگەڵیا بوون شەهیدی کردن، خوا لێیان رازیی بێ .

بە راستیی رۆژی نەبەرد بوو .. رۆژی غیرەت بوو .. رۆژی قوربانیی کردن بوو لە پێناوی عەقیدەی خواناسیی‌دا .. جەنگی سەروماڵیی ئەویست .. پیاوی مەرد و قارەمانی ئەویست ..

موسڵمانەکان یەکتری‌یان هەڵ ئەنا و غیرەتیان ئەخستە بەر یەکتر .. وازیان لەو بیرە پووچەڵە هێنا کە بریتیی بوو لە خۆ بە دەستەوەدان .. مردنیان هەڵ بژارد نەك

سەرشۆڕیی دنیا و قیامەت .. ئەوەبوو هەستانەوە و دەستیان دایە چەکەکانیان .. پاڵەوانانە دەستیان بە بەرگریی کرد .. سوپای دوژمنیش ئەوەندە زۆر بوو شەپۆلی ئەدا .. ورەی موسڵمانەکان بەرز بوویەوە .. بە تایبەت دوای ئەوەی هەواڵی سەلامەتیی ئازیزیان بۆ ساغ بوویەوە .. ئەوەبوو کەوتنە هەڵمەتدان و ، بە شمشێرەکانیانەوە خۆیان کرد بە ناو ریزەکانی دوژمندا کە چواردەوری موسڵمانەکانیان گرت بوو .. ئەوەبوو گوێیان لە ئازیز بوو بە دەنگی بەرز ، بۆ بەرزکردنەوەی ورەی هاوەڵەکانی و ، تا لە دەوری کۆ ببنەوە ، ئەیفەرموو : (( أنا رسول الله )) . لە بنکەی سەرکردایەتی یەوە ، کە تیایا بە دامەزراویی مابوویەوە ، بانگی لێ ئەکردن ..

ئەوەی ژیریی و سەلیقە بوو پێغەمبەر و ئەرکانی جەنگی بە کاریان ئەهێنا .. یەکێ لەو کارە جوانانەیان ئەوەبوو کە کاتێ سوپای موسڵمانەکان شمشێریان خستە گەردنی کافرەکان و لە سەربازگەکەیان دەریان پەڕاندن ، ئەمان دوایان نەکەوتن و، بە دامەزراویی لە بنکەی سەرکردایەتییدا مانەوە . ئەمە ئەوپەڕی حیکمەتی تێدا بوو ..

بەڵێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ ـ کە فەرماندەیەکی بێوێنەی وەها بوو خوا راستییەکان بخاتە دڵیەوە ـ نەخشەیەکی وەهای کێشا ، کە لەوانەیە و ئەگونجێ جەنگ لە باری سەرکەوتنەوە بگۆڕێ بۆ باری شکستیی .. بۆیە وای بە چاك زانیی خۆی و هاوەڵانی پاڵ بە کێوی ئوحودەوە بدەن ، تا ئەگەر ناچار بوون کەڵك لە سەختیی کێوەکە وەربگرن و ، پیایا سەرکەون .

کاتێك کە موسڵمانەکان سوپای قورەیشی تێك شکاویان راو ئەنا ، پێغەمبەری خواﷺ سەعدی کوڕی ئەبووەققاص و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلای ، لەگەڵ هەندێ لە ئەرکانی جەنگی لەلای خۆی هێشتەوە و ، ئەوان لە شوێنی خۆیاندا نەجووڵان .. هەموویان بە وردیی سەرنجی مەیدانی جەنگیان ئەدا و چاویشیان لە کێوی تیرهاوێژەکان بوو . هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی لێ بوو وا لە هەڵمەتی چوارەمدا خالیدی کوڕی وەلید هەلی بە دەست هێنا و ، دوای ئەوەی کە تیرهاوێژەکان بەشی زۆریان کێوەکەیان بەجێ هێشت ، سەرکەوتە سەر کێوەکە و ، پاشماوەی جەنگاوەرە موسڵمانەکانی سەر کێوەکەشی شەهید کردن .. هەرکە چاوی

لەمە بوو ، بۆی دەرکەوت کە سوپای ئیسلام لە هەڵویستێکی پڕ مەترسییدایە .. هەستی کرد کە لەم کاتە ناسکەدا دوو هەڵوێست ئەتوانیٚ بگرێتە بەر :

یەکەم : یان ئەوەتا بیر لە سەلامەتیی و بیّوەیی خۆی بکاتەوە ، بەوەی کە خۆی بگەیەنێتە شوێنێکی ئەمین و ، واز لە هاوەڵانی بهێنیٚ هەرچیی دێتە ڕێیان.

دووهەم : خۆی بخاتە مەترسییەوە و ، خۆی لە هاوەڵان ئاشکرا بکات ، واتە هەوڵ بدات ئەوان لە مەترسیی ڕزگار بکات ، بەوەی کە بنکەکەی خۆی دیاریی بکات تا هاوەڵان لە دەوری کۆ ببنەوە و ، لە تیاچوون ڕزگار بن .

هەرچەندە خۆی ئەکەوتە مەترسییەوە ، بۆ بەرژەوەندیی هاوەڵان هەڵوێستی دووهەمی هەڵ بژارد ، ئەوەبوو بە دەنگی بەرز هاواری لیٚ کردن : (( هَلُمَّ إليَّ ، أنا رسول الله )) .

قورئانی پیرۆزیش ئەم هەڵوێستەی ئازیزی ﷺ بە کارێکی چاك و پاڵەوانانە لە قەڵەم دا ، چونکە بووە مایەی دەربازکردنی سوپاکەی لە شڵەژان و سەرگەردانیی ، کە ئەفەرمویٚ :

﴿ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ ﴾ .

( آل عمران : ١٥٣ ) .

ئەو بانگەوازەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرانسەری مەیدانی جەنگدا دەنگی دایەوە .. بووە فێنکایی بۆ دڵی موسڵمانەکان تا ورەیان بەرز بێتەوە و ، هەر بە بیستنی دەنگی موبارەکی دڵیان حەسایەوە و لە ئاسوودەیی پڕ بوو و ، ڕوویان لە شوێنی دەنگەکە نا .. بەمە زۆرێك لە گەمارووداوان درزیان بە ڕیزەکانی قوڕەیش دا و ، خۆیان دەرباز کرد ، ئەگەرچیی زیانی گیانیی زۆریان لیٚ کەوت .

بەرەبەرە لە دەوری ئازیز کۆ بوونەوە .. حاڵیان باش بوو و ، دەستیان دایەوە ڕێكخستنی ڕیزەکانیان ، بە سەرکردایەتیی پێغەمبەرەکەیان .. بەمە بەرەیەکی یەکجار بەهێزیان سەر لە نویٚ دروست کردەوە ، بۆیە شێواز و ئەنجامی جەنگ گۆڕا .. موسڵمانەکان هۆشیان بە خۆیانا هاتەوە و ، لەو شڵەژان و سەرگەردانییەی پێشەوە ڕزگار بوون .

بەڵیٚ ، بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە هۆی کۆبوونەوەی موسڵمانە شڵەژاوەکان و ، ڕزگاربوونیان لە تێكشکان و پەرتەوازەیی و ، ڕۆحی مەعنەوییان بەرز بوویەوە ، بەڵام لە هەمان کاتدا بتپەرستەکانیشی لەوە ئاگادار کرد کە

پێغەمبەری خوا ﷺ نەکوژراوە و ، شوێنەکەشی لە لایان ئاشکرا بوو .. کەواتە ئازیز ئەبێتە ئامانجی هێرشی بتپەرستان و ، ئەکەوێتە مەترسی‌یەوە .

بە راستیی باروودۆخێکی زۆر ناهەموار بوو .. ئەوپەڕی مەترسیی رووی کردبووە پێغەمبەری ئازیز ﷺ ، چونکە ئەوانەی نزیك بوون لێ‌یەوە ، بە ئاسانیی ئەیان دۆزی‌یەوە و ، هەوڵیان ئەدا دەستی لێ بوەشێنن ..

هەرواش بوو ، بەر لەوەی بەشی زۆری سوپاکەی خۆی بگەیەنێتە لای ، کافرەکان هێرشی سەخت و ناهەمواریان کردە سەری ، بەو نیازەوە کە خۆی و هاوەڵە کەمەکانی دەوروبەری لە ناو بەرن ..

کەواتە بەم بانگەوازەی ئازیز مەیدانی جەنگ گوازرایەوە بۆ دەوروبەری پێغەمبەری خوا ﷺ .

ئەم هەڵوێستە تازەیە لای هاوەڵان شارراوە نەبوو .. هەستیان کرد کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ لەوپەڕی مەترسی‌دایە و ، لەوانەیە بت پەرستەکان بە کەم ترین ماوە ئابلوقەی خۆی و هاوەڵە کەمەکانی دەوری بدەن و ، بە ئاسانیی لە ناویان بەرن ، بۆیە تەکانیان دا تا بە پەلە خۆیان بگەیەننە سەرکردایەتیی و شوورایەکی مەحکەم و سەخت بە دەوری ئازیزیان‌دا دروست بکەن ، تا پەرچی هێرشی بت پەرستان بدەنەوە ..

مەبەست و ئامانجی سەرەکیی هاوەڵان هاتە سەر پارێزگاریی لە پێغەمبەری خوا ، کە لە هەموو کاتێك زیاتر ژیانی لە مەترسیی‌دا بوو .. هەرواش بوو .. هەر کە شوێنی ئازیز لە ناحەزانی ئاشکرا بوو ، خێرا کۆمەڵێك لە ئەسپ سواران و پیاوی پیادەی قوڕەیش هێرشیان کردە سەری و ، بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵیان ئەدا لە ناوی بەرن ، تا هاوەڵانی تری فریای نەکەوتوون ..

ئازیزمان ، بە شێوەی گەورەترین و ئازاترین پیاوێك کە لە سەرزەویی‌دا ژیا بێ و ، بە شێوەی گەورەترین قارەمانی مرۆڤایەتیی لە بەردەم ئەو هەمووە هێرشانەدا دامەزراو بوو .. هێرش کەرانیش هەڵمەتیان هەڵمەت نەبوو .. شەپۆلی دەریای ورووژاو بوو .. هێرشێکی بێ‌وێنەیان ئەکردە سەر سەرکردایەتیی موسڵمانان .. ئازیزیش لەگەڵ چەند هاوەڵە کەمەکەی دەوروبەری‌دا وەك کێوی سەرکەش دامەزراو بوون ، هەتا بەرەبەرە هاوەڵان فریای کەوتن .

لەم هەڵمەت و دامەزراوی‌یەدا پێغەمبەری خوا لە چەندین لاوە زامدار بوو .. ئەو کڵاوە ئاسنینەی کە لە سەری کردبوو ، لە ئەنجامی لێدانی بێ‌ڕەحمانەی بت پەرستان ، ورد و خاش بوو .. هەروەها لە چەند شوێنێکیشەوە دەم و چاوی پیرۆزی زامدار بوو ..

ئەو ئیبن قەمیئەیەی کە موصعەبی شەهید کرد و وای زانی پێغەمبەری خوایە و ، بڵاوی کردەوە کە پێغەمبەری کوشتووە ، کە زانیی نەکوژراوە هێرشی هێنا و ئەی‌وت : موحەممەد لە کوێیە ؟ سەرفراز نەبم ئەگەر بهێڵم ئەو سەرفراز بێ .

ئەو خوانەناسە خۆی گەیاندە لای ئازیز و ، بێ‌ڕەحمانە بە شمشێر دای‌گرتەوە ، بەڵام چۆن داگرتنەوەیەك ، کەچیی بە سۆز و پارێزگاریی خوا ، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو زرێی لەبەر کردبوو و ، لێدانی ئەو خوانەناسە زرێکانی نەبڕیی ، بەڵام ملی پیرۆزی پێکا و نزیکەی مانگێك ئازاری هەبوو .. ئەو خوانەناسە هەر کۆڵی نەئەدا .. بە خۆی و هاوەڵانیەوە لە هێرش نەئەکەوتن ، بۆیە ئازیز دەم و چاویشی بە دەستی ئیبن قەمیئە زامدار بوو ..

ئەوەبوو دوو ئەڵقەی کڵاوەکەی سەری چەقی بوونە هەردوو کوڵمی موبارەکی و خوێنیان لێ ئەڕۆی ، ئەمەش هەر بە لێدانی ئیبن قەمیئە کە سوارچاکێکی لێهاتووی قوڕەیش بوو .

هەروەها دەم و چاوی موبارەکی زامێکی گەورەی تێ بوو ، کە هەتا کۆچی دوایی کرد شوێنەواری هەر مابوو ، ئەویش بە بۆنەی لێدانێکەوە ، لە کاتی گەرم بوونی جەنگدا ، لەلایەن عەبدوڵڵای کوڕی شیهابی زوهەریی ، باپیری ئیمامی پایەدار موحەممەدی کوڕی شیهابی زوهەریی .

هەروەها دانی تەختی خوارەوەی لای چەپی شکا و ، لێویشی قڵیشا بە هۆی بەردێکی گەورەوە کە عوتبەی کوڕی ئەبووەققاصی برای سەعدی کوڕی ئەبووەققاص ، تێی گرت .

ئا لەم کاتە ناسکەدا و بەم هەموو زامانەوە کەوتە ناو چاڵێکی قووڵەوە و هەردوو ئەژنۆشی زامدار بوون و ، لە تاو ئێش و ئازاردا بێ‌هۆش کەوت .. خێرا هاوەڵە دڵسۆز و فیداکارەکانی هەڵمەتیان دا و ، فریای کەوتن ، لە لایەکەوە بەرگری‌یان لێ ئەکرد و ، کافرانیان لێ دوور ئەخستەوە و ، لەلایەکیشەوە هەوڵیان

ئەدا لەو ناڕەحەتی‌یە دەری بهێنن . ئیمام عەلیی دەستی گرت و ، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلاش لە چاڵەکە بەرزی کردەوە و ، هێنایە دەرەوە و ، بە پێوە وەستا .

لەم کاتەدا کە خوێن لە زامەکانی ئازیز سەری کردبوو ، خوێنەکەی بە دەم و چاویەوە ئەسڕیی و ئەی‌فەرموو : (( كيف يفلح قوم خضبوا وجه نبيهم ، وهو يدعوهم إلى ربهم ؟ إشتد غضب الله على قوم أدموا وجه رسول الله )) .

ئەی‌فەرموو : کۆمەڵێك دەم و چاوی پێغەمبەرەکەیان ، کە بۆلای خوا بانگیان ئەکات ، خوێنایی کردبێ چۆن سەرئەکەون ؟ غەزەبی خوا بە توندیی ئەبارێتە سەر کۆمەڵێك کە دەم و چاوی پێغەمبەری خوایان خوێناویی کردووە .

بە بۆنەی ئەم فەرمایشتەوە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و پێغەمبەری خوای ﷺ تێ‌گەیاند ، کە ئەم کارە بە دەستی خوایە و ، پێغەمبەرە نازدارەکەشی هیچی بە دەست نیە ، خوا بە ویستی خۆیەتی لەسەر ئەو زوڵم و ستەمەیان سزایان بدات، یان چاوپۆشی‌یان لێ بکات ، کە ئەی‌فەرموو :

﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٢٨ )

ئەو هەموو ناڕەحەتی‌یە هاتە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ ، هێشتا کافران وازیان لێ نەئەهێنا و ، بەردەوام هێرشیان بۆ ئەکرد و ، هاوەڵانیش هەوڵیان ئەدا بە پەلە خۆیان بگەیەننە لای و ، خۆیان بکەنە قەڵغانی . بەمە لە دەوروبەری‌دا جەنگێکی ناهەموار بەرپا بوو .[٣٨٥]

**دوانزەهەم : بە هێز بوونەوەی موسڵمانان :**

بەڵێ ، بت پەرستەکان هێرشیان ئەکردە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ و بە هیچ شێوەیەك کۆڵیان نەئەدا و دەست بەرداریشی نەئەبوون .. ئەیان‌ویست بی‌کوژن و لە دەستی رزگاریان بێ .. بەمە بەڵایەکی ناهەموار بەسەر ئەو هاوەڵانەدا ئەباریی کە بەرگری‌یان لە ئازیز ئەکرد .. ئەوانیش خوا لێیان رازیی بێ ، گیانیان خستبووە سەر لەپی دەستیان و بەرگری‌یان لە پێشەواکەیان ئەکرد .. لە هەموو قوژبنێکەوە جەنگ وەستێنرا و ، هێرشی گەورەی قوڕەیش رووی لە ئوحود نا ..

جا هەرچەندە هێزی دوژمن لە رادەبەدەر بوو و ، بە ورەیەکی بەرزەوە هەڵمەتیان ئەدا و ، بەوپەڕی داخ لەدڵی‌یەوە دەستیان ئەوەشاند ، لەگەڵ ئەوەش‌دا

---

[٣٨٥] غزوة أحد : ١٣٤ _ ١٥٣، الرحيق المختوم : ٢٦٨ _ ٢٧٠، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢/ ١٩٥_١٩٧.

موسڵمانەکان بەوپەڕی جوامێریی و ئازایەتی‌یەوە ، بە وێنەی کێوی دامەزراو ، لە رووی هێرشی قورەیش‌دا وەستان و ، شوورایەکیان بە دەوری پێغەمبەری خۆشەویستیان‌دا کێشا ، بۆ ئەوەی هیچ بت‌پەرستێك دەستی نەگاتە ئازیز و ، چیی تر زامدار نەبێ ..

ئەو شوورایشە هەر خوێن و گۆشت بوو .. مرۆڤ بوون .. هێرشی خوانەناسانیش لە وزەدا نەبوو .. بۆیە پاسەوانان یەك لە دوای یەك شەهید ئەبوون ... بەڵام زۆر شادمان بوون .. هەر کە بە شەهیدبوونی یەکێکیان کەلەبەرێك دروست ئەبوو ، خێرا پاڵەوانێکی تر ئەو بۆشایی‌یەی پڕ ئەکردەوە .. لە راستیی‌دا ئەوانەی لە بەرگریی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەکوژران زیاتر لە ئەنصار بوون .

حەممادی کوڕی سەلەمە ریوایەتی کردووە کە بت پەرستەکان زۆر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دێنن و ناڕەحەتی ئەکەن ، ئەویش حەوت ئەنصار و قورەیشی‌یەکی بە دەوردا ئەبن . ئەفەرموێ : (( من يردهم وهو رفيقي في الجنة ؟ )) ئەفەرموێ : کێ ئەو کافرانە ئەداتە دواوە لێم و هاوڕێی بەهەشتم بێت ؟ یەکێ لە ئەنصارەکان هات و کوشتاری کرد هەتا شەهید کرا . کە دیسان ناڕەحەتیان کردەوە فەرمووی : (( من يردهم عنا وهو رفيقي في الجنة ؟ )) .

حەمماد دەری ئەبڕێ کە هەر حەوت ئەنصاری‌یەکە لە بەرگریی‌کردنی ئازیزدا شەهید ئەبن ..

بۆ پەرچ‌دانەوەی هێرشی بت‌پەرستان و بەرگریی لە ئازیز تیرهاوێژەکان کاریگەریی تەواویان هەبوو .. پێش هەموویان پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی تیرهاوێژێکی چاك بوو . کاتێك کە بت‌پەرستان بە کۆمەڵ رژابوون بە سەریان‌دا ، ئەوەندە تیری وەشاند بۆیان کەوانەکەی پچڕا و پارچە پارچە بوو .

ئەبوطەلحەی ئەنصاریی و[٣٨٦] سەعدی کوڕی ئەبووەققاصیش خوا لێیان رازیی بێ، لە تیرهاوێژە ئازا و گورج و گۆڵەکان بوون ، کە لەو سات و وەختە

[٣٨٦] ئەبوطەلحە ناوی زەیدی کوڕی سەهلی کوڕی ئەسوەدی کوڕی حەرامی ئەنصاریی خەزرەجی‌یە . ئامادەی پەیمانی عەقەبەی دووهەم بووە و ، لە هاوەڵە ناودار و پاڵەوانەکان بووە . پێغەمبەری خوا ﷺ شاهێدیی بۆ داوە کە دەنگی ئەبوطەلحە لە ناو سوپادا لە صەد پیاو چاکترە ، کە فەرموویە : (( لصوت أبي طلحة في الجيش خير من مائة رجل )) . هەتا ( إبن عبدالبر ) باسی ئەوەی کردووە کە ئەبوطەلحە لە رۆژی حونەین‌دا خۆی بە تەنیا بیست پیاوی کوشتووە و چەك و تفاقەکەشیانی هێناوە . ئەبوطەلحە بەشداریی جەنگی بەدری کردووە . کە جەنگ گەرم ببوایە لەبەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ چۆکی دائەدا و تیری ناو تیردانەکەی هەڵ ئەڕێژان و ، بەوپەڕی لێ‌هاتن و گورج و

ناهەموارەدا ، جەنگی سەروماڵی‌یان ئەکرد و ، تیری تیژیان ئەگرتە دوژمـن و بە چاکییش ئەیان‌پێکان و ، لووتیان ئەشکاندن ..

ئیمام ئەحمەد لە ئەنەسەوە ریوایەتی کردووە کە ئەبوطەلحەی ئەنصاریی ، لە رۆژی ئوحـوددا و ، لـەو کاتـەدا کـە بـت‌پەرستەکان هێرشـیان هێنـابووە سـەر پێغەمبەری خـوا ﷺ ، لەبـەر دەسـتی‌دا تـیری ئەوەشـاند و ، پێغەمبـەریش لـە پشتیەوە بوو ، ئەبوطەلحەش تیرهاوێژێکی چاك بوو .. هەرچـیی تـیری ئەهاویشـت پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بەرز ئەکردەوە تا ببینێ تیرەکە بەر کـوێ ئەکـەوێ .. خێرا ئەبوطـەلحەش سنگی خۆی بەرز ئەکردەوە ، تا لاشەی ئەو دیار نـەبێ و تـیری دوژمنـی بەرنەکـەوێ و ، ئەشـی وت : بـاوك و دایکـم بـە قوربانـت بـن ، ئـەی پێغەمبەری خوا ، تیرت بەرنەکەوێ ، گەردنم قەڵغانی گەردنت بێت .

لەو هەڵوێستە پڕمەترسی‌یەدا ئەبوطەلحـە لـە بـەردەم پێغەمبـەری خـوادا ﷺ بەوپەڕی ئیخلاص و ئامادەباشی‌یەوە ئەی‌وت : ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! مـن لێ هاتووم ، هەر پێویستی‌یەکت هەیە بم‌نێرە بە دوای‌دا و ، چیت پێ خۆشە فـەرمانم بەسەردا بدە .

ئەو رۆژە ئەبوطەلحە مەردانە بە تیرهاویشتن بەرگریی لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کرد ، هەتا ئەوەبوو لەو رۆژەدا سێ تیروکەوان لە دەستی‌دا شکان .

ئیمام بوخاریی وتوویـە : لـە رۆژی ئوحـوددا خەڵکەکـە تێـك شـکان و دەوری پێغەمبەر چۆڵ بوو ، ئەبوطـەلحە لەبەر دەستی‌دا بـە قـەڵغانێکی پارێزگـاریی لـەو ئەکرد . ئەبوطەلحە تیرهاوێژێکی بەتوانا بوو ، لەو رۆژەدا دوو یان سێ تیروکـەوانی شکاند . کە پیاوێکیش تێپـەڕی بکردایـە و تیردانـی پـێ بوایـە ، ئەی‌فـەرموو : تیرەکان بۆ ئەبوطەلحە هەڵ برێژە .

سەعدی کوڕی ئەبووەققاصیش یەکێ بوو لە تیرهاوێژە ئازا و بەناوبانگـەکان .. ئەویش لـە کاتی تێك‌شکانەکەدا لە خزمەتی پێغەمبەری خـوادا بـە دامـەزراویی مایەوە .. ئەمیش دەورێکی کاریگەری هەبوو ، لە پاراستنی پێغەمبـەری خـوا و گێڕانەوەی هێرشی دوژمنان ، کە بە تیری نووك تیژ دای‌ئەگرتنەوە ..

---

گۆڵی‌یەوە پەرچی هێرشی دوژمنانی ئەدایەوە . لە ئوحودیش‌دا مەردانە بەرگریی لە ئازیزی کرد . ئـەبوطـەلحـە لـە ساڵی ( ٥١ ) ی کۆچیی‌دا ، وتراویشە لە سیی و چواردا کۆچی دوایی کردووە .

لەو کاتە ناسکەدا ، کە کۆمەڵێ خوانەناسان یەك لە دوای یەك هێرشیان ئەکردە سەر ئازیز ، سەعد پاڵەوانانە خۆی ئەگرت و ، لەبەردەمیا بەرگریی لێ ئەکرد ، هەتا ئەڵێن لەو ڕۆژەدا هەزار تیری وەشاندووە .. ئەوەندە دەوری گرنگی هەبوو لە پەرچ‌دانەوەی هێرشی کافران‌دا ، دڵی ئازیزی خۆش کرد ، بە رادەیەك کە دایك و باوکی بکاتە قوربانی سەعد ، بە مەرجێ نەی‌کردوونەتە قوربانی هیچ کەسێکی تر.

مێژوونووسان گێڕاویانەتەوە کە هەرچی سەعد تیری ئەگرتە ئەو بت‌پەرستانەی کە هێرشیان ئەکرد تا دەست لە پێغەمبەری خوا بوەشێنن ، پێی ئەفەرموو : (( إرم ، فداك أبي وأمي )) . ئەی‌فەرموو : تێ‌یان بگرە باوك و دایکم بە قوربانت بن .

سەعیدی کوڕی موسەییەبیش وتوویە : گوێم لە سەعدی کوڕی ئەبووەققاص بوو کە ئەی‌وت : لە ڕۆژی ئوحوددا پێغەمبەری خوا ﷺ تیردانەکەی بۆ هەڵ ڕێژام و فەرمووی : (( إرم ، فداك أبي وأمي )) .

لە صەحیحی بوخارییش‌دا ، لە عەلی‌یەوە ـ کرم الله وجهه ـ هاتووە کە فەرموویە : نەم بیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ دایك و باوکی پێکەوە بە قوربانی هیچ کەس کردبێ ، جگە لە سەعدی کوڕی مالیك ( مەبەستی سەعدی کوڕی ئەبووەققاصە ) . گوێم لێی بوو ( لە ڕۆژی ئوحوددا ) ئەی فەرموو : (( یا سعد ! إرم ، فداك أبي وأمي )) .

یەکێکی تر لەو پاڵەوانە تیرهاوێژانەی ، کە لەو کاتەدا گیانی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبووە مەترسی‌یەوە ، دژی هێرشی بت پەرستان بە وێنەی کێو دامەزرا بوون و ، ئەچوون بە گژیان‌دا ، سەهلی کوڕی حونەیف .[387] لەو ڕۆژەدا بەیعەتی مردنی بە پێغەمبەر ﷺ دابوو . بۆیە کە زۆربەی سوپای ئیسلام شڵەژاو سەری لێ شێوا ، ئەو لەگەڵ دڵسۆزە پاڵفتەکان‌دا ، لە خزمەت پێغەمبەردا بە دامەزراویی

---

[387] سەهلی کوڕی حونەیفی کوڕی وەهبی ئەنصاریی ئەوسیی ، یەکێکە لەوانەی کە زوو بە زوو موسڵمان بوو . لە خزمەتی پێغەمبەردا بەشداریی جەنگی بەدر و هەروەها ڕووداوەکانی تریشی ، کردووە . پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئیمام عەلیی‌دا کردنیە برا . لە ڕۆژی ئوحوددا پاڵەوانانە بەرگریی لە ئازیز کرد . ئیمام عەلیی کردیە والیی بەصرە و ، لەگەڵ ئیمام‌دا بەشداریی صیففینی کردووە دژی موعاویە . بوخاریی و موسلیم چل فەرموودەیان لە سەهلەوە گێڕاوەتەوە . لە ساڵی سیی و هەشتی کۆچیی و ، لە سەردەمی خەلافەتی ئیمام و ، لە شاری کووفەدا کۆچی دوایی کردووە و عەلیی ئەمیری ئیمان‌داران نوێژی لەسەر کردووە ، خوا لێیان ڕازیی بێ .

مایەوە و ، لە پێناوی پاراستنی ئازیزدا ، گیانی خستبووە سەر لەپی دەستی .. بۆیە پێی ئەفەرموو : (( نبلوا سهلاً )) . ئەی فەرموو : تیر بۆ سەهل ئامادە بکەن .

ئیبن کەثیریش دەری بڕیوە کە سەهل یەکێ بووە لەو چەند هاوەڵە کەمەی کە لە کاتی تێکشکان‌دا لە خزمەتی ئازیزدا دامەزراو بووە . ئیبن جەریر نەقڵی کردووە کە ئیبن قەمیئەی حاریثیی بەردێك ئەگرێتە پێغەمبەری خوا ﷺ و لووت و دانی تەختی ئەشکێنێ و دەم و چاویشی زامدار ئەکات و لە توانای ئەخات . ئیتر هاوەڵان پەرتەوازە ئەبن و ، ئەویش خەڵکەکە بانگ ئەکا و ئەفەرموێ : (( إلـيّ عباد الله ، إلّي عباد الله )) . ئەوەبوو سیی پیاوی لە دەور کۆبوونەوە و لەبەر دەستی ئامادە بوون و ، جگە لە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلاّ و سەهلی کوڕی حونەیف کەس خۆی بۆ نەگیرا . دیارە مەبەستی لەو کاتەیە کە هێشتا پاڵەوانەکانی تر کۆ نەبووبوونەوە .

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێرێکی تایبەتیی دایە دەست ئەبودوجانە و ، ئەویش کە جەنگ دەستی پێ کرد ، مەردانە هەڵمەتی ئەدا و ، خۆی بە ناو ریزەکانی دوژمن‌دا ئەکرد . کاتێکیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەورەی درابوو و ، دوژمنان هەڵمەتیان ئەدا بی‌کوژن ، ئەبودوجانەی ئەنصاریی مەردانە پارێزگاریی لێ ئەکرد .

ئەبودوجانە خۆی کردبووە قەڵغانی پێغەمبەر .. خۆی چەماندبۆوە بەسەری‌دا هەتا تیری کافران ئەو نەپێکن و خۆی بپێکن . هەرواش بوو چیی تیر ئەگیرایە پێغەمبەری خوا ، هەر هەموویان بەر پشتی ئەبودوجانە ئەکەوتن ، لەگەڵ ئەوەش دا هیچ باکی نەبوو . هەتا هەندێ لە مێژوونووسان پشتی ئەبودوجانەیان بە پشتی ژیژوو ئەشوبهاند ، بە بۆنەی ئەو هەموو تیرەوە ، کە لە کاتی پاراستنی پێغەمبەری خوادا ﷺ ، چەقی بوون بە پشتی‌دا ..

یەکێکی تر لەو پاڵەوانانەی کە لەو ساتە ناهەموارەدا لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بە دامەزراویی مانەوە حاطبی کوڕی ئەبوبەلتەعە[٣٨٨] بوو .

---

[٣٨٨] حاطەب کوڕی ئەبوبەلتەعەی کوڕی عەمری لەخمیی پاشان قەحطانیی یەمانیی بووە و ، هاوپەیمانی نەوەی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا بووە . زوو بە زوو موسڵمان بووە و کۆچی بۆ مەدینە کردووە . یەکێ بووە لە سوار چاکە بەناوبانگەکانی قورەیش .. بەشداریی جەنگی بەدر و ئوحود و خەندەقی کردووە و ، دۆستی زوبەیر بووە . ئەم بوو ، پێش فەتحی مەککە ، نامەی بە نهێنیی نارد بۆ دانیشتوانی مەککە تا ئاگاداریان بکات وا موسڵمانەکان

لەو کاتەدا کە سوپای ئیسلام شپرزە بووبوو ئەو بە شمشێرەکەی بەرگریی لە پێغەمبەری خوا ئەکرد .. هەر حاطەب بوو کە تۆڵەی پێغەمبەری خوای ﷺ لە عوتبەی کوڕی ئەبووەققاص سەند ، لەسەر ئەوەی کە دەم و چاوی پێغەمبەری خوێناویی کرد ، وەك لە پێشەوە باس کراوە ، ئەوەبوو لەو کاتە ناسکەدا کە پێغەمبەر زامدار کرابوو ، عوتبەی کوشت .

ئیبن کەثیر لە حاطەب خۆیەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : کاتێك کە دیتم عوتبە ( ی کوڕی ئەبووەققاص ) چیی بە پێغەمبەری خوا کرد ، پێم وت : عوتبە بەرەو کوێ ڕۆیشت ؟ ئەویش بەرەو ئەو شوێنە ئاماژەی کرد .

حاطەب ئەڵێ : بە دوایدا ڕۆیشتم هەتا دەستم کەوت .. بە شمشێر لێم دا و سەریم پەڕاند ، پاشان دابەزیم و ئەسپەکەی و شمشێرەکەیم هەڵ گرتن و هێنامەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ، ئەویش پێمی فەرموو : (( رضي الله عنك ، رضي الله عنك )) .

عوتبە برای سەعد بوو ، کە زۆر حەزی لەوە بوو عوتبە بکوژێ ، کەچیی دەستی نەکەوت .

ئەگێڕنەوە کە سەعد خوا لێی ڕازیی بێ وتوویە : هەرگیز ئەوەندەی کە حەزم لە کوشتنی عوتبەی کوڕی ئەبووەققاص بووە ، حەزم لە کوشتنی کەس نەبووە .

طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلای تەیمییش لەبەر دەستی پێغەمبەری خوا دا ﷺ ئەوەندەی سوپایەکی تەواو جەنگاوە .. ئەتوانین بڵێین کە چاکترین و ڕاستترین جەنگ جەنگی طەلحە بووە ..

بەیهەقیی لە ئەبوزوبەیر و، ئەویش لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە کە وتوویە : ڕۆژی ئوحود خەڵکەکە لە دەوری پێغەمبەردا ﷺ پەرتەوازە بوون و ، تەنها یانزە پیاوی ئەنصار و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا لەلای مانەوە و ، ئەویش بە کێوەکەدا سەرئەکەوت ، فەرمووی : (( ألا أحد لهؤلاء ؟ )) . فەرمووی : ئەوە کەس نیە بچێ بە گژی ئەوانەدا .. مەبەستی لەو کافرانە بوو کە بەرەو کێوەکە هێرشیان ئەکرد .

طەلحە ئەڵێ : من ئەی پێغەمبەری خوا !

---

نیازی فەتحی مەککەیان هەیە . دوای ئەوەی کە پێی زانرا ، عوزری بۆ پێغەمبەر هێنایەوە و ، ئەویش لێی وەرگرت و ، شاهێدییشی بۆ دا کە ناچێتە دۆزەخ بە بۆنەی ئەوەوە کە جەنگی بەدری دیوە ..

ئەفەرموێ : (( كما كنت ، يا طلحة ! )) . ئەفەرموێ : لە جێی خۆت بە طەلحە ! پیاوێك لە ئەنصارەكان وتی : من ئەی پێغەمبەری خوا ! دەستی بە كوشتار كرد و پێغەمبەری خوا و ئەوانەی لەگەڵی بوون سەركەوتنە سەر و ، پاشان ئەنصاریيەكە شەهید بوو . كافرەكان لە پێغەمبەری خوا نزیـك كەوتنـەوە .. فـەرمووی : (( ألا رجل لهؤلاء ؟ )) طەلحە قسەكەی خۆی كـردەوە و ، پێغەمبـەری خـواش وەك خـۆی فەرمایشـتی كـردەوە و ، پیاوێـك لـە ئەنصـارەكانیش وتـی : دەی مـن ئـەی پێغەمبەری خوا ! ئەو دەستی بە كوشتار كرد و ، ئەو و هاوەڵانیشی سەرئەكەوتنە سەر ، پاشان شەهید كرا .. كافران فریای پێغەمبەری خوا ﷺ كەوتن و ، ئـەویش وەك یەكەم جاری ئەفەرموو و ، طەلحەش ئەی وت : من ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! بەڵام ئەوی ئەهێشتەوە و ، پیاوێك لە ئەنصار داوای ئیزنی ئەكرد و ئەویش ئیزنـی ئەدا و ، ئەویش وەك ئەوانەی پێش خۆی كوشتاری ئەكرد هەتا هەموویان شـەهید بوون و ، جگە لە طەلحە كەس لە دەوری پێغەمبـەردا نـەما و بت پەرسـتەكانیش گەیشتنە سەریان . ئەو كاتە پێغەمبەری خوا ﷺ فـەرمووی : (( مـن هـؤلاء ؟ )) طەلحە وتی : من .

طەلحە ئەوەندەی هەر هەموو ئەوانەی پێش خۆی كوشتاری كرد ، تا ئەوەبوو لـە بەرگریی پێغەمبەری خوادا لە حەفتا شوێنەوە زامدار بوو ..

ئەبوداودی طـەیالیسیی لە عائیشەی دایكی ئیمان‌دارانەوە ریوایەتی كردووە كە وتوویە : هەرچیی باسی رۆژی ئوحود لەلای ئەبوبەكردا بكرایـە ، ئـەی فـەرموو : ئەو رۆژە هەمووی بۆ طەلحە بوو ، پاشان دەستی بە بـاس ئـەكرد و ئەی‌فـەرموو : رۆژی ئوحود مـن یەكـەم كـەس بـووم گەڕامـەوە ئـەبینم وا پیاوێـك ، لەبـەردەم پێغەمبەری خوادا ، لە پێناوی خوادا ئەجەنگێ ، منیش وتم : طەلحە بـە ، ئـەوەی لە دەستم چوو ، لە دەستم چوو .. پیاوێكیش لە نێوان من و بت پەرستەكان‌دا بوو نەم‌ئەناسی ، منیش لە پێغەمبەری خـواوە لـەو نزیـك‌تـر بـووم ، ئـەو بـە پەلـە هەنگاوی ئەنا كە من نەم ئەتوانی ، ئەبینم ئەبوعوبەیدەی جەڕڕاحە .[389] ئـەوەبوو

---

[389] ئەبوعوبەیدە ، فەرماندە و وڵاتان رزگاركەری بەناوبانگی ئیسلامە ، كە ناوی عامیری كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی جەڕڕاحی كوڕی هیلالی فیهریی قوڕەیشی‌یە . یەكێكە لەو دە كەسەی كە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە . هاوەڵێكی پایەدار و ناودار بووە و ، نازناوی (( أمين الأمة )) ی وەرگرتووە . لە شاری مەككە لـە دایـك بـووە و ، زوو بـە زوو موسڵمان بووە و ، لە هەموو جەنگەكان‌دا لە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ بەشداریی كـردووە ، كاتێـك كـە نوێنەرانی وڵاتی یەمەن هاتنە مەدینە تا موسڵمان‌بوونی دانیشتوانی یەمەن رابگەیەنن ، بـە پێغەمبـەری خوایـان

گەیشتینە لای پێغەمبەری خوا ، ئەبینین دانی تەختی شکاوە و ، دەم و چاوی زامدار بووە و ، دوو ئەڵقەی کڵاوە ئاسنەکەی سەری چەقیونەتە کوڵمی . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( علیکما صاحبکما )) فەرمووی : فریای براکەتان بکەون . مەبەستی لە طەلحە بوو کە بە هۆی زامی زۆرەوە خوێنی سەری کردبوو . هاتین بەلای طەلحەوە کە کەوتبووە چاڵێکەوە ، ئەبینین حەفتا و ئەوەندە زامی رم و شیر و تیری پێوەیە و ، پەنجەیەکیشی بڕاوە . ئێمەش دەرمانمان کرد .

تیرمیذییش ریوایەتی کردووە کە لەو رۆژەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویە : (( من ینظر إلی شهید یمشي علی وجه الأرض ، فلینظر إلی طلحة بن عبیدالله )) . فەرمووی : هەر کەس پێی خۆشە سەیری شەهیدێك بکا کە لەسەر زەوییدا بەڕێوە بچێ ، با سەیری طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا بکات ..

هەروەها لەو ساتە ناهەموارەدا عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف بۆ پاراستنی پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگێکی سەختی ئەکرد ،کە لە ئەنجامدا لە بیست شوێنەوە زیاتر زامدار بووبوو .. دەمی زامدار بوو و ، قاچێکیشی شەل بوو ، کەچیی کە پێغەمبەری خوای هەڵ گرت تا بیخاتە سەر تاشە بەردەکە - کە بە درێژە لە دواوە باسی دێ - ئەو شەلی‌یەی نەما و چاك بوویەوە ..

ئەبوعوبەیدەش یەکێ بوو لەو پاڵەوانە دامەزراوانەی کە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ ئەجەنگا و ، هەر ئەویش بوو کە دوو ئەڵقەی کڵاوە ئاسنەکەی بە دانی دەرهێنانەوە ، کە چەقیبوونە کوڵمی پێغەمبەری خوا ﷺ . جا لەبەر ئەوەی کە ئەڵقەکان زۆر چەقی بوون ، دوو ددانی پێشەوەی ئەبوعوبەیدە شکان .

لە پێشەوە باسی ئازایەتیی و پاڵەوانێتیی حەنظەلەمان کرد کە چۆن شەوی جەنگی ئوحود یەکەم شەوی زاوایەتیی ئەو بوو و ، کە بانگەوازی جیهادی بیست ،

---

ﷺ وت کە یەکێکیان لەگەڵدا بنێرێ تا لە سوننەت و لە ئیسلام شارەزایان بکات ، ئەویش دەستی ئەبوعوبەیدەی گرت و ، فەرمووی : (( هذا أمین هذه الأمة )) . فەرمووی : ئەمە ئەمین و دەست پاکی ئەم ئوممەتەیە. ئەبوعوبەیدە یەکێ بووە لەو چوار فەرماندەیەی کە ئەبوبەکر بۆ فەتحی شامی ناردن و ، پاشان عومەر کردیە فەرماندەی گشتیی سوپای موسڵمانەکان ، ئەمەش دوای لادانی خالیدی کوڕی وەلید لەسەر ئەو کارە و ، وڵاتی شامی رزگار کرد و ، سوپای ئیسلام لە ژێر فەرماندەیەتیی ئەودا لە خۆرهەڵاتەوە گەیشتە فوڕات و لە باکووریشەوە ئاسیای بچووك . بەشداریی جەنگی بەدری کرد و ، لەو جەنگەدا باوکی خۆی ، کە بت پەرست بوو ، کوشت . ئەبوعوبەیدە بە بلیمەتیی و نەرم و نیانیی و حیکمەت و خۆبەکەم زانین ناسراوە . ئیبن عەساکیر دەری بڕیوە کە لە قورەیشدا دوو کەسی بلیمەت ( داهیة ) بوون : ئەبوبەکر و ئەبوعوبەیدە . لە بوخاریی و موسلیمدا چواردە فەرموودەی گێڕاوەتەوە . لە ساڵی هەژدەی کۆچییدا ، بە نەخۆشیی تاعوون ، لە شامدا ، کۆچی دوایی کردووە ، خوا لێی رازیی بێ .

بەبی ئەوەی خۆی بشوا ، چەکی هەڵ گرت و ، خۆی گەیاندە مەیدانی شەهیدان و، سەرەنجام مەلائیکە دوای شەهیدبوونی شۆردیان .

یەکێکی تر لەوانەی کە لە کاتی سەختدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوا دا ﷺ مایەوە ، قەتادەی کوڕی نوعمان بوو .[٣٩٠] لەگەڵ هاوەڵە کەمەکانی دەوروبەری پێغەمبەری خوا دا ﷺ بەرگرییەکی چاکی لە ئازیزی ئەکرد ، هەتا ئەوەبوو چاوێکی بە تیرێکی بتپەرستان پێکرا ، بە رادەیەك کە لە چاڵی چاویدا دەرپەڕیی و بەسەر کوڵمیدا شۆڕ بوویەوە .

ئیبن ئیسحاق ئەڵێت : عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادە بۆمی باس کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە تیری بە کەوانەکەی خۆی تەقاند هەتا لایەکی شکا .. قەتادەی کوڕی نوعمان هەڵی گرت و بە لایەوە بوو .. ئەو رۆژە چاوی قەتادە پێکرا ، بە رادەیەك کە هاتە دەرەوە و کەوتە سەر کوڵمی . پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی موبارەکی هەڵی گرت و خستیەوە شوێنی خۆی و فەرمووی : (( أللهم أكسه جمالاً )) . فەرمووی : خوایە ! جوانیی بەسەردا ببارێنە . لەوەودوا جوانترین و تیژترین چاوی بوو .کاتێکیش کە عاصیمی کوڕەزای چووە خزمەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز رەحمەتی خوای لێ بێ کە والیی مەدینە بوو و لێی پرسیی : تۆ کێیت ؟ ئەویش بە شیعر وەڵامی دایەوە :

أنا إبن الذي سالت على الخد عينه — فُردَّت بكف المصطفى أحسن الردِّ

فعادت كما كانت لأول أمرها — فيا حُسنها عيناً ، ويا حُسن ماخد

وتی : من کوڕی ئەو کەسەم کە چاوی بەسەر کوڵمیدا هاتە خوارەوە و بە دەستی موبارەکی پێغەمبەری خواﷺ بە جوانترین شێوە خرایەوە جێی خۆی و ، وەك جاران چاکتر و جوانتر چاك بوویەوە .

عومەریش بە شیعرێکی جوان وەڵامی دایەوە و ، خەڵاتێکی چاکیشی کرد .[٣٩١]

---

[٣٩٠] قەتادەی کوڕی نوعمانی کوڕی زەیدی کوڕی عامیری کوڕی سەوادی کوڕی ظەفەری ئەوسی‌یە و ، برای دایکیی ئەبوسەعیدی خودرییە . بەشداریی جەنگی بەدری کردووە . هاوەڵێکی پایەدار بووە و ، تیرهاوێژێکی بەناوبانگ بووە . لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی هەموو جەنگەکانی کردووە . لە فەتحی مەککەدا هەڵگری ئاڵای نەوەی ظەفەر بووە و ، لە ساڵی بیست و سێی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە .

[٣٩١] الرحيق المختوم :٢٧١ ـ ٢٧٥، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢/ ١٩٨ـ ٢٠٢، غزوة أحد: ١٥٤ـ ١٦٥، ١٨٠ .

**سیانزەهەم : دەوری ئافرەت لە جەنگی ئوحوددا :**

جەنگی ئوحود یەکەم جەنگێك بوو کە ئافرەتی موسڵمان تیایا بەشداریی جەنگی کرد و چوو بە گژی بتپەرستاندا .

لەم جەنگەدا تەنها یەك ئافرەت بەشداریی جەنگی کردووە و ، بە شمشێر و تیروکەوان کوشتاری کافرانی کردووە ، تا ئەوەبوو لە کاتی بەرگریی‌کردنی‌دا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەندین لاوە زامدار کرا .. هەر چەندە ئەم ئافرەتە بەڕێزە سەرەتا بە ناوی جەنگەوە لە ماڵ دەرنەچوو و ، وەکو پیاوان کەرەسەی جەنگی نەپۆشیی بوو ، بەڵکو بە مەبەستی ئەوە دەرچوو بزانێ بارودۆخی مەیدانی جەنگ چۆنە و ، بزانێ چ خزمەتێکی پێ ئەکرێ ، بە تایبەت بۆ ئاودانی جەنگاوەران و، دەرمان‌کردنی زامداران . ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی ترەوە ئەم ئافرەتە لە تەمەنی گەنجیی‌دا بەشداریی جەنگی نەکردووە و ، لەگەڵ مێردەکەی و هەر دوو کوڕەکەی‌دا بووە .

ئەم ئافرەتە بەڕێزە ، ئوم عومارە نوسەیبەی مازنی‌یە ،[٣٩٢] کە لە کاتی تێك شکانی موسڵمانەکان‌دا ، ناچار ئەبێ دەست بداتە شمشێر و ، پاڵەوانانە کافران لە پێغەمبەری خوا ﷺ دوور بخاتەوە .

سەرەتا ئەم ئافرەتە بەڕێزە کوندەیەك ئاوی گرتە کۆڵ و ، لەگەڵ مێردەکەی و هەر دوو کوڕەکەی‌دا بەرەو جەنگ کەوتە رێ .

ئوم سەعدی کچی سەعدی کوڕی رەبیع ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : چوومە خزمەتی ئوم عومارە و وتم : پورەگیان ! دەنگ و باستم بۆ بگێڕەرەوە .

وتی : سەر لە بەیانیی لە ماڵ دەرچووم تا بزانم موسڵمانەکان چیی ئەکەن و ، منیش کوندەیەکی پڕ لە ئاوم پێ بوو .. ئەوەبوو گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە نێوان هاوەڵەکانی‌دا بووە و ، سەرکەوتنیش بە دەست موسڵمانانەوە بوو .

---

[٣٩٢] نوسەیبە کچی کەعبی کوڕی عەمر بوو لە نەوەی نەججار ، لە خزمانی پێغەمبەری خوا ﷺ .. ئافرەتێکی پایەدار و خاوەن هیممەت بوو . یەکێکە لەو ئافرەتانەی کە زوو بە زوو موسڵمان بووە و ، یەکێکیش بووە لەو سێ ئافرەتەی کە ئامادەی پەیمانی عەقەبە بوون و ، ئامادەی پەیمانی ( رضوان ) یش بووە .
ئوم عومارە بەشداریی جەنگی ئوحود و ، حودەیبیە و ، عومرەی قەزا و ، حونەینی کردووە و ، پاشانیش ئامادەی جەنگی یەمامە بووە دژی موسەیلەمەی درۆزن و ، دەستێکی پەڕیی . ئەبوبەکری صددیق لە سەردەمی خەلافەتی خۆی‌دا رێزی لە نوسەیبە ئەگرت و سەردانی ئەکرد .. چەند فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە . لە ساڵی سیانزەی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە ، خوا لێی رازیی بێ .

کە موسڵمانەکان شپرزە بوون ، خۆم گەیاندە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، دەستم بە کوشتار کرد و ، بە شمشێر دوژمنم لێ دوور ئەخستەوە و ، بە کەوانیش لە بری ئەو تیرم ئەهاویشت ، هەتا برینێکی زۆر کرایە لاشەمەوە ..

ئوم سەعد ئەڵێت : ئەبینم زامیکی قووڵ کە بۆشایی هەبوو وا بەسەر شانیەوە. پێم وت : کێ ئەم زامەی کردە لاشەتەوە ؟ وتی : ئیبن قەمیئە ، خوا ملی بشکێنێ ، کاتێك کە خەڵکەکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دوور کەوتنەوە ، ئەهات و ئەیوت : موحەممەدم پیشان دەن ، رزگار نەبم گەر ئەو رزگاری بێ . من و موصعەبی کوڕی عومەیر و چەند پیاوێکی تر کە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بە دامەزراویی مابوونەوە ، رێمان پێ گرت ، لێی دام و ئەم زامەی کردە شانمەوە و ، چەند شمشێرێکم لێ دا ، بەڵام دوژمنی خوا دوو زرێی لە بەردا بوون .. دوای ئەوە بە بۆنەی ئێشی زامەکانیەوە نوسەیبە ماوەیەك بێ‌هۆش کەوت ، کە چاوی کردەوە پرسیی : پێغەمبەری خوا کوا ؟ بت پەرستەکان چی‌یان کرد ؟ وتیان: سەلامەتە ..

ئەم کارەی نوسەیبە کارێکی ناچاریی بوو .. ئەو بۆ جەنگ و کوشتار لە ماڵ دەرنەچوو .. بەڵام کە تیرهاوێژەکان شوێنی خۆیان چۆڵ کرد و ، خۆیشی کەسێکی ئەو تۆ بە دەوری‌یا نەما ، بە شێوەیەك کە مەترسیی ئەوەی لێ ئەکرا کافران بە دیلی بگرن ، ناچار بوو کە دەست بداتە شمشێر بۆ بەرگریی لە پێغەمبەر و ، پاراستنی خۆیشی ..

بەڵێ ، ئوم عومارە خوا لێی رازیی بێ رۆژی ئوحود لە دوانزە جێگەوە زامدار بوو و ، پێغەمبەری خواش ﷺ بۆ ئازایەتیی و چاو نەترسیی ئەو شاهێدیی دا و ستایشی کرد ، چونکە لە کاتی شپرزەیی و سەرگەردانیی‌دا یەکێ بووە لەوانەی کە لە خزمەتی‌دا دامەزراو بوون . ئەوەتا فەرموویە : (( ما التفت يميناً وشمالاً يوم أحد إلا ورأيتها تقاتل دوني )) . فەرموویە : رۆژی ئوحود هەرچیی بە لای راست و بە لای چەپ‌دا ئاوڕم ئەدایەوە ، ئەم بینیی ئەو لە بەرگریی من‌دا کوشتار ئەکات ..

هەروەها ئەگێڕنەوە کە نوسەیبەی مازنیی ڕۆژی ئوحود لەگەڵ زەیدی کوڕی عاصیم [٣٩٣] ی مێردیدا و حەبیب [٣٩٤] و عەبدوڵلای [٣٩٥] کوڕیدا لە ماڵ دەرچوون و، پێغەمبەریش ﷺ پێیانی فەرموو :

(( بارك الله فيكم أهل بيت .. )) فەرمووی : ئەی خێزانەکە ! خوا فەڕ و بەرەکەت بە سەرتاندا بڕژێنێ .

ئوم عومارە وتی : لە خوا بپاڕێرەوە تا لە بەهەشتدا هاوڕێت بین . ئەویش فەرمووی : (( أللهم اجعلهم رفقائي في الجنة )) . فەرمووی : خوایە ! بیانکە بە هاوڕێم لە بەهەشتدا .. کە نوسەیبە ئەمەی بیست وتی : لە دنیادا هەرچیم بەسەر بێت ، باکم نیە ..

بەڵێ ، جگە لە نوسەیبە نەچەسپاوە کە هیچ ئافرەتێکی تر لە ڕۆژی ئوحوددا بەشداریی جەنگی کردبێ . بەلام مێژوونووسان باسی ئەوەیان کردووە کە دوای ئەوەی بتپەرستان لە مەیدانی جەنگ کشانەوە ، هەندێ لە ژنانی موسڵمانان لە شار دەرچوون ، تا فریای زامداران بکەون و دەرمانیان بکەن و ، ئاویان فریا بخەن ، کە لەوانە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ و فاطیمەی کچی بوون ..

بوخاریی لە ئەنەسەوە [٣٩٦] خوا لێی رازیی بێ ریوایەتی کردووە کە وتوویە : چاوم لێ بوو عائیشە و ئوم سولەیم [٣٩٧] خۆیان هەڵ کردبوو و ، کوندەی ئاویان بە

---

[٣٩٣] زەیدی کوڕی عاصیم ی کوڕی غونم ی نەججاریی ئەنصاریی ، ( إبن عبدالبر ) ئەوەی باس کردووە کە زەید یەکێ بووە لەو هاوەڵانەی کە بەشداریی پەیمانی عەقەبە و ، جەنگی بەدری کردووە و ، لە جەنگی ئوحوددا شەهید بووە ، خوا لێی رازیی بێ .

[٣٩٤] حەبیبی کوڕی زەید ، ئەڵێن بەشداریی پەیمانی عەقەبەی کردووە و ، ابن سەعدیش وتوویە : بەشداریی ئوحود و خەندەق و هەموو ڕووداوەکانی تری کردووە . ئەوەبوو حەبیب لە عومانەوە ئەگەڕایەوە بۆ مەدینە ، لە ڕێگا موسەیلەمەی درۆزن گرتی و لێی پرسیی : ئایا شاهێدیی ئەدەی کە من پێغەمبەری خوام ؟ وتی : نابیستم . وتی : ئەی شاهێدیی ئەدەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوا بێت ؟ وتی : بەڵێ . لە رقانا پارچە گۆشتێکی لێ ئەبڕیی . هەروا پرسیاری لێ ئەکرد و ، ئەویش وەلامی ئەدایەوە هەتا پارچە پارچەی کرد و ، بە شەهیدیی کەوتە سەرزەویی. لە ریوایەتەکەی ( عبدالبر ) دا وا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەبیبی بە شێوەی نوێنەر ناردووە بۆ لای موسەیلەمەی درۆزن .

کاتێك کە هەواڵی حەبیب و شەهیدبوونی گەیشتە نوسەیبە پەیمانی بە خوا دا کە ئەبێ تۆڵەی جگەرگۆشەکەی بکاتەوە . ئەویش مۆڵەتی لە خەلیفە ئەبوبەکر وەرگرت تا لەگەڵ سوپای ئیسلامدا بچێت بۆ یەمامە .

[٣٩٥] عەبدوڵلای کوڕی زەید ، حاکم وەهای دەربڕیوە کە بەشداریی بەدری کردبێ . لەگەڵ خالیدیشدا بەشداریی جەنگی یەمامەی کردووە و ، لە کوشتنی موسەیلەمەی درۆزندا هاوکاریی وەحشیی کوڕی حەربی کردووە . کە گەڕایەوە لای دایکی شمشێرەکەی خوێنی لێ ئەچۆڕیی . دایکی پرسیی : کوشتت ؟ وتی : بەڵێ . خێرا نوسەیبە سەجدەی شوکری بۆ خوا برد . عەبدوڵلا پیاوێکی یەکجار ئازا و بە جەرگ بووە و، هەژدە فەرموودەشی گێڕاوەتەوە.

کۆڵ هەڵ ئەگرت و ، دەرخواردی خەڵکەکەیان ئەدا و ، پاشان ئەگەڕانەوە پڕیان ئەکردنەوە و ، دەرخواردی خەڵکەکەیان ئەدا ..

یەکێکی تر لەو ئافرەتانەی کە یارمەتیی جەنگاوەرانیان ئەدا ، ئوم سولەیط بوو . بوخاریی لە صەحیحەکەی‌دا بە سەنەدی خۆی ریوایەتی کردووە کە : عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی رازیی بێ ـ لە سەردەمی خەلافەتی خۆی‌دا ـ چەند سەرپۆشێکی بەسەر ئافرەتانی مەدینەدا دابەش کرد و ، سەرپۆشێکی چاکیان مابۆوە . یەکێ لەوانەی کە لەلای خەلیفە ئامادە بوون وتی : ئەی ئەمیری ئیماندارانی ! ئەمەیان بدە بەو کچەی پێغەمبەری خوا کە لە لاتە . ( واتە ئوم کولثوومی کچی ئیمام عەلیی کە هاوسەری عومەر بووە ) . فەرمووی : ئوم سولەیط پێی شایانترە لەو ، چونکە ئەو رۆژی ئوحود کوندە ئاوی بە کۆڵ ئەهێنا ..

بەڵام فاطیمەی زەهراء خوا لێی رازیی بێ یەکێ بووە لەو ئافرەتانەی دوای گەڕانەوەی بتپەرستان لە شار دەرئەچن و دێن بە هانای سوپای ئیسلامەوە . کاتێك کە تووشی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەستی لە ملی کرد و ، دەستی کرد بە شۆردنی برینەکانی بە ئاو ، بەڵام تا ئەهات خوێنی زیاتریان لێ ئەڕۆیشت . ناچار پارچە حەسیرێکی هێنا و سووتاندی و خستیە سەر زامەکان و پێوەیان نووسا و خوێنەکەیان وەستایەوە .

---

[٣٩٦] ئەنەسی کوڕی مالیك خزمەتگوزاری پێغەمبەری خوا ﷺ بووە و ، یەکێ بووە لەو هاوەڵانەی کە فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە . کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاتە مەدینە ، ئەنەس دە ساڵان بوو و، دایکی دەستی گرت و هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی : ئەم منداڵە با خزمەتت بکات ، ئەویش قبووڵی کرد . ئەنەس لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بۆ جەنگی بەدر کەوتە رێ ، بەڵام بۆ خزمەتکردنی پێغەمبەر ، نەك بەشداریی بکات ، چونکە منداڵێکی بچووك بوو . دوای ئەوە بەشداریی هەشت غەزای لە خزمەتی ئازیزدا کرد و ، ئەویش دوعای بۆ کرد و فەرمووی : (( أللهم أكثر ماله وولده و أدخله الجنة )) . فەرمووی : خوایە بەرەکەت بخەرە ماڵ و منداڵیەوە ، بیشیخەرە بەهەشتەوە . ئەوەبوو ( ١٠٣ ) ساڵ ژیا و ( ٢٢٨٦ ) فەرموودەشی ریوایەت کرد .. دوا هاوەڵ بوو کە لە بەصرەدا ، لە ساڵی ( ٩٣ ) ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کرد .

[٣٩٧] ئوم سولەیم کچی میلحانی کوڕی خالیدی ئەنصارییە و ، دایکی ئەنەسە . یەکێك بووە لەو ئافرەتانەی کە سەرەتا موسڵمان بوون و ، مالیکی کوڕی نەضری مێردیشی بۆ موسڵمان بوونی تووڕە بوو . ئەوەبوو سەفەری شامی کرد و لەوێ مرد . پاشان ئەبوطەلحەی ئەنصاریی خوازبێنیی لێ کرد و ، ئەویش لە مارەیی‌دا داوای موسڵمانبوونی لێ کرد چونکە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو و ، ئەویش موسڵمان بوو . ئوم سولەیم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی جەنگی حونەینی کردووە . پێغەمبەر ﷺ سۆزی زۆری بەرامبەری بەکار ئەهێنا و ئەیفەرموو : (( إني أرحمها ، قتل أخوها وأبوها معي )) . فەرمووی : بەزەییم پیای‌دا دێتەوە .. براکەی و باوکی لەگەڵم دا کوژران .

هەندێ لە مێژوونووسانیش باسیان کردووە کە هەندێ لە ئافرەتانی موسڵمان لە کاتی گەرمەی جەنگدا دەستی یارمەتییان بۆ بریندارەکان درێژ ئەکرد ، وەك ئوم ئەیمەنی [٣٩٨] دایەنی پێغەمبەری خوا ﷺ .

مێژوونووسان باسی ئەوەیان کردووە کە دەستە تێك شکاوەکەی موسڵمانان کاتێ ویستیان بچنە ناو شارەوە و ، هێشتا پێغەمبەری خوایش ﷺ لەناو جەرگەی مەیدانی جەنگدا خەریکی جەنگ بوو ، ئوم ئەیمەنیان تووش بوو . کە ئەو دەستەیەی بە هەڵاتوویی بینیی دەستی دایە خۆڵ پژان بە دەم و چاویاندا و ، بە هەندێکیانی ئەوت : ئەو تەشییە بگرە و شمشێرەکەت بهێنە . ئوم ئەیمەن خۆی گەیاندە مەیدانی جەنگ و هێشتا جەنگیش بەردەوام بوو ، تا فریاگوزاریی پێشکەش بە زامداران بکات ، هەتا ئەوەبوو لە کاتی فریاکەوتندا کەوتە بەر شاڵاوی هێرشی کافران و تیریان تێ ئەگرت .

لە ( الکامل ) دا هاتووە کە کاتێك ئوم ئەیمەن خەریکی ئاودانی زامدارەکان بوو، حیببانی کوڕی عیرقە تیرێکی تێ گرت ، ئەویش کەوت و لاشەی دەرکەوت و، دوژمنی خوا دایە قاقای پێکەنین .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بەلاوە گران بوو ، بۆیە تیرێکی بێپەڕی دایە دەست سەعدی کوڕی ئەبووەققاص و ، فەرمانی بەسەردا دا بیگرێتە ئەو کافرە . کە تێی گرت بەر ملی کەوت و کەوت بە پشتا و ئەویش لاشەی دەرکەوت و پێغەمبەری

---

[٣٩٨] ئوم ئەیمەن کەنیزەك و بەخێوکەری پێغەمبەری خوا بووە ﷺ و ، ناویشی بەرەکەی کچی ئەعلەبەی کوڕی عەمری کوڕی حیصن بووە . ژنە هاوەڵێکی پایەدار بووە . سەرەتا کەنیزەکی دایکی پێغەمبەری خوا بووە و پێغەمبەری خوا ئەیفەرموو : (( أم أيمن أمي بعد أمي )) . ئەی فەرموو : دوای دایکم ئوم ئەیمەنیش دایکمە . چونکە بەخێوکەری بووە . کاتێك کە خەدیجەی مارە کرد ، ئەوی ئازاد کرد . ئوم ئەیمەن شووی بە عوبەیدی کوڕی زەیدی خەزرەجی کردووە و ، ئەیمەنیان بووە کە بۆتە هاوەڵ و ، لە جەنگی خەیبەردا شەهید بووە . هەر کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری ئوم ئەیمەنی بکردایە دەری ئەبڕیی کە ئەمە پاشماوەی کەس و کاریە ، کە ئەیفەرموو : (( هذه بقية أهل بيتي )) . عوثمانی کوڕی قاسم ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : کاتێك کە ئوم ئەیمەن کۆچی کرد لە ( النصر ) ئێوارەی لێ هات ، زۆری تینوو بوو چونکە بەڕۆژوو بوو ، ئاویشی بەلاوە نەبوو . ئەوەبوو لە ئاسمانەوە دۆلکەیەکی بە قوماشی سپی داپۆشراوی بۆ شۆڕ کرایەوە ، ئەویش گرتی و ئاوی لێ خواردەوە هەتا تینوێتیی شکا . دوای ئەوە ئەیوت : ئیتر لەوەو دوا تینووم نەبوو . پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیانیا سەردانی ئوم ئەیمەنی ئەکرد . کاتێك کە کۆچی دوایی کرد ، ئەبوبەکر بە عومەری فەرموو : هەستە با وەك پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی ئەکرد ، ئێمەش سەردانی بکەین . کە چوونە لای دەستی بە گریان کرد . ئەوانیش فەرموویان بۆچیی ئەگریی ؟؟ ئەوەی کە لای خوایە بۆ پێغەمبەری خوا چاکترە . وتی : بۆ ئەوە ئەگرییم کە وەحیی ئاسمان لێمان پچڕا . ئەوانیش دڵیان پڕ بوو و، ئوم ئەیمەن ئەگریا و ئەوانیش ئەگریان .. شەش فەرموودەی گێڕاوەتەوە .. لە سەردەمی خەلیفە عوثماندا کۆچی دوایی کردووە . خوا لێی رازیی بێ ..

خوا ﷺ ئەوەندە پێ‌کەنی دانی تەختی دەرکەوتن ، پاشان فەرمووی : (( استقاد لها سعد أجاب الله دعوته )) . فەرمووی: سەعد تۆڵەی سەند ، خوا دوعای گیرا بکات .

ئافرەتانی موسڵمان لەوپەڕی حەیا و حورمەت‌دا بەشداریی جەنگیان ئەکرد ، ئەویش لەبەر ناچاریی ، چونکە موسڵمانەکان کەم بوون و کافرەکان زۆر بە دەسەڵات بوون .

موسلیم لە صەحیحەکەی‌دا بە سەنەدی خۆی لە ئەنەسەوە ریوایەتی کردووە کە لە رۆژی حونەین‌دا ئوم سولەیم خەنجەرێکی هەڵ گرتبوو و پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی خەنجەرەکەی پرسیاری لێ کرد ، وتی : بۆ ئەوە هەڵم گرتووە کە ئەگەر یەکێ لە موشریکان لێم نزیك بکەوێتەوە ورگی ئەدڕم .

هەروەها موسلیم لە ئەنەسەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بچوایە بۆ غەزا ئوم سولەیم و چەند ئافرەتێکی ئەنصاری ئەبردن لەگەڵ خۆی‌دا ، لەوێ ئاویان ئەهێنا و ، دەرمانی زامدارانیان ئەکرد .

هەروەها ریوایەتی کردووە کە ئوم عەطیەی ئەنصاریی وتوویە : حەوت غەزام لە خزمەتی پێغەمبەری‌خوادا ﷺ کردووە ، کە لەلای کەل‌وپەلەکەیان ئەمامەوە و، خواردنم بۆ دروست ئەکردن و ، دەرمانی زامدارانم ئەکرد و ، چاودێریی نەخۆشانم ئەکرد .[399]

**چواردەهەم : کشانەوەی سوپای ئیسلام :**

دوای تێك‌شکانی موسڵمانەکان و ، دەرکەوتنی شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کافرەکان هێرشی زۆریان ئەکردە سەری بەو نیازەوە دەستیان بی‌گاتێ و لەناوی بەرن .. خۆ موسڵمانەکان وەها شپرزە و پەرتەوازە بوو بوون ، ئاسایی بوو کافرەکان پێغەمبەر و موسڵمانەکان لە ناو بەرن و تاقیان ببڕنەوە ، بەڵام پێغەمبەر و هاوەڵە کەمەکانی دەوری یەکجار پاڵەوانانە ئەجەنگان . ئەو هاوەڵە پاڵەوانانە جەنگی سەروماڵی‌یان ئەکرد تا بەرە بەرە موسڵمانەکان بە بیستنی سەلامەتیی ئازیز ورەیان بەرز بوویەوە و هەوڵیان ئەدا خۆیان بگەیەننە لای و بەرگریی لێ بکەن .

---

[399] غزوة أحد : ١٧١ ـ ١٧٩ ، السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ٢٠٢ـ ٢٠٥ ، الرحيق : ٢٧٧ ، ٢٨٢ .

پێغەمبەری خوا ﷺ سەرنجی بارودۆخی دەوروبەری خۆی داو تێ گەیشت کە پێویستە نەخشەی گونجاو بۆ جەنگەکە بکێشێ .. ئەوەی رووی دا رووی دا .. هەڵەیەك لەلایەن دەستەیەکەوە رووی دا و ، ئەنجامی چاوەڕوان نەکراو هاتە بەردەمیان . بەڵام نابێ دەستەپاچە بن .. پێویستە سەرلەنوێ نەخشە بکێشرێ بۆ سوپای ئیسلام .. ئیستا کاتی ئەوەیە موسڵمانان بکشێنە دواوە و خۆیان بگەیەننە شوێنێکی سەخت تا دەستی دوژمنیان نەگاتێ و ، جارێکی تر دوژمن نەتوانێ ئابلۆوقەیان بدات . لەبەر ئەمە پێغەمبەر و موسڵمانەکان دەستیان دایە کشانەوە بەرەو بەرزایی یەکانی ئوحود ، بە تایبەت دوای ئەوەی کە ئەوەندە هاوەڵی لە دەور کۆبوونەوە کە بتوانن پاسەوانیی ئەو کشانەوە رێك و پێکە بکەن .

ئەوەی کە یارمەتیی موسڵمانەکانی دا تا بە سەلامەتیی ، یان بە زیانێکی یەکجار کەمەوە ، بکشێنەوە بۆ بەرزایی یەکانی ئوحود ، ئەوەبوو کە زۆربەی کافرەکان بڕوایان بەوە کردبوو کە گوایا پێغەمبەری خوا ﷺ کوژراوە . بۆیە ئەو بتپەرستانە ، کە یەکێکیان ئەبوسوفیانی فەرماندەی گشتیی قورەیش بوو ، وازیان لەوە هێنا هێرش بکەنە سەر پێغەمبەر و ، دڵیشیان لەوە بێخەم بوو کە تێك شکانی موسڵمانەکان یەکجاری یە و ، تازە هەڵسانەوەیان بۆ نیە .. بۆیە بەشی زۆریان پاڵی لێ دایەوە و ، وازی لە جەنگ هێنا و ، هەندێکیشیان بە لووت و گوێ بڕینی موسڵمانانەوە خەریك ئەبوون .. دەستیان دایە بڕینی لووت و گوێ و عەورەت و سك هەڵدڕینی شەهیدەکان . پێغەمبەریش ﷺ باوەڕکردنی ئەو بت پەرستانە بە کوژرانی خۆی بە هەل زانی تا بە خۆی و هاوەڵەکانیەوە بگەنە سەر چیاکە .. بۆیە پێی خۆش بوو دوژمن هەروا بزانێ کوژراوە تا شوێنی نەزانن .. بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە کاتێ کەعبی کوڕی مالیك دوای پاگاندەی کوژرانی پێغەمبەر ﷺ ئەوی بینیی ، بە دەنگی بەرز هاواری کرد : ئەی موسڵمانان ! مژدە بێت ئەوە پێغەمبەری خوایە . ئەویش ئاماژەی بۆ کرد کە بێدەنگ بێت تا لەوە زیاتر کافرەکان ئاگاداری شوێنەکەی نەبن . جا هەر چەندە کافرەکان گوێیان لە هاوارەکەی کەعب بوو ، کەچیی زۆربەیان بڕوایان پێ نەکرد و ، وایان زانیی پاگاندەیە بۆ هێورکردنەوەی موسڵمانەکان و بەرزکردنەوەی ورەیان ، بە تایبەت ئەوانەی کە دەستیان سارد بووبوویەوە و چەکیان دانا بوو . شایانی باسە کە ئەم کشانەوە رێك و پێکەی پێغەمبەر و موسڵمانەکان کشانەوەی سوپایەکی تێك

شکاو نەبوو کە هەر را بکات و توانای دەست کردنەوەی نەبێت . بەڵکو ئەم کشانەوەیە لەوپەڕی ڕێك و پێکیی و ئامادەباشیی‌دا موسڵمانەکان ئەنجامیان ئەدا .. چونکە ئەم سوپایە کە ئەکشایەوە ، هەموو سەربازێکی ، لە سەرووی هەموویانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەوپەڕی ورە بەرزیی‌دا بوون و ، ئازایانە ئەجەنگان هەتا خۆیان گەیاندە ئەو شوێنەی کە سەرکردە دیاریی کردبوو ..

بەڵێ ، لە کاتی کشانەوەدا جەنگ زۆر گەرم بوو و ، بت‌پەرستەکان هێرشی توندیان ئەکردە سەر موسڵمانەکان ، بە نیازی ئەوەی کە دەست لە پێغەمبەر ﷺ بوەشێنن .

ئەوەبوو یەکێ لە سوارچاکانی قوڕەیش ، کە ناوی عوثمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موغیرە بوو ، ئەسپەکەی بەرەو پێغەمبەری خوا ﷺ تاو دابوو بە نیازی کوشتنی ئەو و ، ئەشی وت : رزگار نەبم ئەگەر ئەو رزگاری ببێ ..

پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا و خۆی ئامادە کرد بۆ جەنگان لەگەڵی‌دا ، کەچیی بە فەرمانی خوا ئەسپی کابرا لە کاتی تاودانی‌دا سەرسمی دا و بت‌پەرستەکەی هەڵ دایە چاڵێکەوە و ، نەگەیشتە لای پێغەمبەر و ، خێرا یەکێ لە پاسەوانە ئازاکانی کە حاریثی کوڕی صومە بوو ، بە پەلە هەڵمەتی دا و خۆی گەیاندە لای کافرەکە و ، دوای شمشێربازی‌یەکی زۆر حاریث شمشێرێکی دا لە قاچی و تەختی زەویی کرد ، پاشان تەپی کوتایە سەری و کوشتی و چیی کەرەسەی جەنگی پێ بوو لێی وەرگرت و ، خۆی گەیاندەوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ، ئەویش فەرمووی : (( الحمد لله الذي أماته )) . فەرمووی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لە ناوی برد .

دوای ئەوە بت‌پەرستەکان کەوتنە هێرش تا نەهێڵن موسڵمانەکان بگەنە شوێنی خۆیان و ، دەستیان بگاتە پێغەمبەر و بی‌کوژن .

ئەوەبوو یەکێ لە بت‌پەرستان ، کە عوبەیدوڵڵای کوڕی جابیری عامیریی بوو ، هەڵمەتی دایە حاریثی کوڕی صومە و شمشێرێکی دا لەسەر شانی و بە سەختیی زامداری کرد ، بە رادەیەك کە موسڵمانەکان ناچار بىن زامەکەی تیمار بکەن و خۆیشی بە کۆڵ هەڵ بگرن ..

لەولاوە ئەبودوجانەی پاڵەوانی بەناوبانگ هەڵمەتێکی دایە سوارە قوڕەیشی‌یەکە کە حاریثی زامدار کرد ، واتە عوبەیدوڵڵای عامیریی و ، یەك

شمشێری بۆ داهێنایەوە و ملی پەڕاند و موسڵمانانی لە شەڕ و خراپەی رزگار کرد ..

پاشان ئوبەی کوڕی خەلەفی جومەحیی بەدبەخت ،[٤٠٠] بە فیز و دەمارێکی نەفامانەوە ، ئەسپەکەی هێنایە غاردان و بەرەو پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵمەتی ئەدا بەو هیوایەی دەستی لێ بووەشێنێ و ، ئەشی وت : موحەممەد کوانێ ؟ رزگار نەبم ئەگەر ئەو رزگار بێ . پێغەمبەر ﷺ بە دیاریەوە وەستا و بەر لەوەی بێتە پێشەوە حەربەیەکی تێ گرت و کوشتی .. ئوبەی یەکەم مرۆڤێکی بەدبەخت بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی موبارەکی خۆی کوشتی .

ئیبن ئیسحاق ئەڵێت : کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شیوەکەدا پاڵی دا بە کێوەکەوە . ئوبەی کوڕی خەلەف لێی نزیك کەوتەوە و ، ئەیوت : کوانێ موحەممەد ؟ رزگار نەبم ئەگەر ئەو رزگار ببێ .

خەڵکەکە ( ئەوانەی کە پاسەوانی پێغەمبەر بوون ) وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا پیاوێکمان بچێت بە دەمیەوە ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( دعوه )) . فەرمووی : وازی لێ بهێنن . کە نزیك کەوتەوە پێغەمبەر ﷺ حەربەکەی لە حاریثی کوڕی صومە وەرگرت . لێی وەرگرت و گرتیە ئوبەی و دای لە ملی . ئەوەندە توند لێیدا چەند جارێ بەسەر ئەسپەکەیەوە خولایەوە و تلێر بوویەوە . دوایی بەو لێدانەی پێغەمبەری خوا ﷺ مرد ..

ئەم پیاوە بەدبەختە لە مەککەدا دژایەتیی پێغەمبەری خوای ﷺ زۆر ئەکرد و، ئازاری زۆری ئەدا و هەڕەشەی کوشتنیشی لێ ئەکرد ..

هەرچیی تووشی ببوایە لە مەککەدا هەڕەشەی کوشتنی لێ ئەکرد ، پێغەمبەری خوایش ﷺ ئەی فەرموو : (( بل أنا أقتلك إن شاء الله )) . ئەیفەرموو: إن شاء الله من تۆ ئەکوژم .

ئوبەی ئەو هەڕەشەیەی پێش کۆچ کردنی هەر لە یاد بوو ، بۆیە کە لە رۆژی ئوحوددا بە زامداریی گەڕایەوە ناو خزمەکانی ، کە حەربەکە زۆریشی زامدار نەکردبوو ، ئەیوت : بەخوا موحەممەد کوشتوومی . خەڵکەکە وتیان : بەخوا

---

[٤٠٠] ئوبەی برای ئومەییەی کوڕی خەلەف بووە ، کە ئەویش یەکێ بووە لە سەردارانی قورەیش کە رۆژی بەدر بە دەستی موسڵمانەکان کوژرا . هەروەها ئوبەی مامەی صەفوانی کوڕی ئومەییە بووە ، کە دوایی موسڵمان ئەبێت .

زراوت چووه .. بەخوا هیچت نیە . وتی : هەر لە مەککە پێی وتووم : من تۆ ئەکوژم . دە بەخوا ئەگەر تفێکیشم تیٚ بکا ، پێی ئەمکوژیٚ . لە کاتی گەڕانەوەدا بەرەو مەککە ، کە گەیشتنە ( سەریف ) ، بە هۆی زامی حەربەکەی پێغەمبەری خواوە مرد .. لە ریوایەتەکەی ئەبولئەسوەددا لە عومەرەوە هاتووە کە ئویەی وەك گاجووت ئەیقۆڕاند و ئەیوت : بەو خوایەی کە گیانمی بە دەستە ، ئەگەر ئەوەی بە منەوەیە بە دانیشتوانی ذیلمەجازەوە بێت هەر هەموویان ئەمرن ..[401]

**پانزەهەم : موسڵمانەکان پاڵ بە کێوەکەوە ئەدەن :**

موسڵمانەکان بە شێوەیەکی رێك و پێك کشانەوە دوا و شیوەکەیان بەجێ هێشت و ، روویان لە بەرزاییەکانی کێوی ئوحود نا ، ئەمەش دوای چەندین جەنگ و هەڵمەت و دەست وەشاندن لە سوارچاکانی قورەیش ، کە هێرشیان ئەکردە سەر بە هیوای ئەوەی نەهێڵن موسڵمانەکان بکشێنەوە ، تا دەستیان بگاتە پێغەمبەر و بیکوژن . هەروا بەردەوام کشانەوە هەتا گەیشتنە سەربانێکی بەرزی کێوەکە و ، لەویٚ ئەوەیان کردە ناوچەیەکی بەرگریی سەخت کە توانییان هەموو هەوڵێکی سوپای دوژمن پووچەڵ بکەنەوە ، کە بە مەبەستی تێك شکاندن و پەرتەوازەکردنیان هێرشیان ئەکردە سەریان .

دیارە ئەمەش بە بۆنەی ئەو نەخشە جوانەوە بوو کە ئازیز بۆ موسڵمانانی کێشا. ئەوەبوو شوێنێکی چاکی بۆ سەربازگەی موسڵمانان هەڵ بژارد ، کە بریتیی بوو لە دامێنی ئوحود و دواییش کەڵك لە بەرزاییەکانی ئوحود وەرگیرا و ، خۆیان پیٚ مەحکەم کرد و هێرشەکانی قورەیش بیٚکەڵك دەرچوون ..

بەڵام لەوە ئەچیٚ هەندیٚ لە موسڵمانەکان ، کە هەواڵی سەلامەتیی پێغەمبەری خوایان ﷺ نەئەزانی ، پێشی ئەو کەوتبوون و کشابوونەوە بۆ سەربەرزاییەکانی ئوحود . کە بەرە بەرە پێغەمبەر و هاوەڵانی دەوری ئەکشانەوە بۆ بەرزاییەکان ، یەکیٚ لەو موسڵمانە پێش کەوتوانە کە پێغەمبەری بینیی وا لە پێش هاوەڵانەوە سەر کێوەکە ئەکەویٚ ، وایزانیی لەو قورەیشییە موشریکانەن کە دوای ئیمانداران کەوتوون ، بۆیە خەریك بوو ئازیز بکوژیٚ .

تیری خستە کەوانەکەیەوە و نیشانەی گرتە پێغەمبەری خوا ﷺ و خەریك بوو تیرەکە بتەقێنی و بەرەو سنگی شەریفی ئازیزی رەوانە بکا ، خێرا پێغەمبەری خوا

---

[401] غزوة أحد : ١٨٠ ـ ١٨٧ ، الرحيق المختوم : ٢٧٨ ـ ٢٨٠ .

ﷺ پێی زانیی و ، زانیشی یەکێکە لە سەربازانی سوپای ئیسلام ، بۆیە ئاگاداری کرد و فەرمووی : (( أنا رسول الله )) .

موسڵمانەکە تیرەکەی لە کەوانەکەی دەرهێنا و ، خۆشیی و شادمانیی کەوتە سەر رووەمەتی ئەویش و ئەوانەش کە لە گەڵیا بوون ، بە بۆنەی ئەوەوە کە سەلامەتیی ئازیزیان بۆ ساغ بوویەوە و گەیشتە لایان ..

خۆش‌ترین کاتی تەمەنی ئەو موسڵمانە ئەو ساتە بوو کە تیرەکەی لە کەوانەکەی دەرکرد و ، سەرداری مرۆڤایەتیی پێ نەکوشت ..

لە پێشەوە باسی ماندووبوون و کۆششی طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلاّمان کرد ، لە خزمەتی پێغەمبەردا ، کە ئەوەبوو ویستی سەربکەوێتە سەر بەردێکی زلەی کێوەکە ، بەڵام لەبەر پیریی و زامداریی نەی‌توانیی ، طەلحە شانی دایە ژێری هەتا سەرکەوتە سەری .

ئەم کارەی طەلحە فەڕ و بەرەکەتی تیا بوو بۆ خۆی ، چونکە لە کاتی بەرگریی‌دا قاچێکی طەلحە تووشی شەلیی هاتبوو . جا کە پێغەمبەری خوای ﷺ بە شان هەڵ گرت خۆی ناچار کرد رێك بە رێوە بچێ ، تا ئازاری پێغەمبەر نەدات . بەمە قاچە شەلەکەی رێك وەستا و ، لە شەلیی رزگاری بوو ، چونکە قاچی لە کلۆت‌دا دەرچوو بوو و بەو هەڵ گرتنە چووەوە شوێنی خۆی .

بەمە موسڵمانەکان گەیشتنە شوێنی ئەمین و ، هەر موشریکێکیش لێیان نزیك بکەوتایەتەوە موسڵمانەکان بە تیر دایان ئەگرتەوە ، چونکە سوپای جەم بووی قوڕەیش لە ژێر بەرزایی‌یەکانی ئوحوددا کۆبووبوویەوە و موسڵمانەکان بەسەریان‌دا زاڵ بوون ..

لە کاتی کشانەوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی تینوویەتیی بوو ، کە داوای ئاوی کرد ، عەلیی کوڕی ئەبوطالیب چوو بۆ میهراس ، کە هەندێ ئەڵێن ئاوێکە لە ئوحود و ، پڕی قەڵغانەکەی ئاوی بۆ هێنا . کە پێغەمبەر ﷺ ویستی لێی بخواتەوە ، دیتی وا بۆنی لێ دێ . ئیتر لێی نەخواردەوە ، بەڵام خوێنی زامەکانی پێ داشۆرد کە ئەوەبوو لە کاتی تەنیایی‌دا کافران دەستیان لێ وەشاندبوو و زامداریان کردبوو و ، ئاویشی ئەکرد بە سەری‌دا و ئەی‌فەرموو : (( إشتد غضب الله على من دمّى وجه نبيه )) . ئەی‌فەرموو : غەزەبی خوا بەسەر ئەوانەدا ئەبارێ کە دەم و چاوی پێغەمبەری خوایان خوێناویی کردووە .

لە ریوایەتەکەی طەبەرانییدا وەها هاتووە : (( إشتد غضب الله على قوم دمَّوا وجه رسوله )) . دوای سەعاتێك فەرمووی : (( أللهم اغفر لقومي فإنهم لا يعلمون )) ( فتح الباري ) . لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتووە کە فەرموویە : (( رب اغفر لقومي فإنهم لا يعلمون )) . لە ( الشفاء ) ی قاضي عیاضیشدا هاتووە کە فەرموویە : (( اللهم اهد قومي فإنهم لا يعلمون )) .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئاوەی پێ نەخورایەوە کە عەلیی کوڕی ئەبوطالیب هێنای ، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی چوو بۆ شوێنێکی تر و ئاوی سازگاری هێنا و پێغەمبەری خوا ﷺ لێی خواردەوە و دوعای خێریشی بۆ کوڕی مەسلەمە کرد . جا وا دەرئەکەوێ کە کوڕی مەسلەمە زوو چووبێ بۆ ئاو ، بەلاّم کاتێ دەستی کەوتبێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتبێتە سەر ئەو بەرزاییەی کە بۆی کشانەوە .

کە موسلّمانەکان لە بەرزاییەکاندا شوێنی خۆیان گرت ، کافرانی مەککە چەند جارێك هەولّیان دا هێرشیان بکەنە سەر ، بەلاّم ئەوەبوو بە سۆز و رەحمی خوای گەورە ئەو هەولاّنە هەموویان پووچەلّ دەرچوون ، چونکە موسلّمانەکان مەردانە هێرشیان لە دژی قورەیشییەکان کرد و ناچاریان کردن پاشەکشێ بکەن و، هیوای ئەوەش ببڕن و نەتوانن جارێکی تر دەست لە موسلّمانەکان بوەشێنن ..

دوا هەلّمەت کە سوپای مەککە ئەنجامی دا بۆ لێدانی موسلّمانەکان لە بەرزاییەکانی ئوحوددا ، ئەو هەلّمەتە بوو کە کەتیبەیەك لە ئەسپسوارانی مەککە ، بە سەرکردایەتیی فەرماندەی گشتیی ئەبوسوفیان و فەرماندەی ئەسپ سواران خالیدی کوڕی وەلید ، کردیانە سەر سەربازگەی موسلّمانان بە هیوای دەست وەشاندن لە بنکەی سەرەکیی موسلّمانان .

ئەم هەلّمەتە تا رادەیەك لە بنکەی فەرماندەیەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك کەوتەوە ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( اللهم إنه لا ينبغي لهم أن يعلونا )) . خێرا موسلّمانەکان بە فەرماندەیی عومەری کوڕی خەططاب دژە هێرشێکیان کردە سەر ئەسپ سوارانی ئەبوسوفیان و ، کوشتاریان کردن هەتا ئەوەبوو ناچاریان کردن کە بکشێنەوە و دابەزنەوە خوارەوە ناو شیوەکە .

لەم هەلّمەتە پووچەلّەدا قورەیش سێ پیاویان بە کوشت دا ، کە هەرسێکیان بە تیری تیرهاوێژی بەناوبانگی سوپای ئیسلام ، سەعدی کوڕی ئەبووەققاص کوژران .

کاتێك کە موشریکەکان سەرکەوتنە سەر کێوەکـە ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە سەعدی فەرموو : (( أجبنهم )) . فەرمووی : بیان گێڕەرەوە دوا . ئەویش وتی : بە تەنیا خۆم چۆنیان بگێڕمەوە دوا ؟ سێ جار ئەمەی فەرموو . ئـەوەبوو سـەعد لـە تیردانەکەیدا تیرێکی دەرهێنا و تەقاندی لە پیاوێکیان و کوشتی .. هەروا بە تـیر دوانی تریان لێ ئەکوژێ و ناچاری پاشەکشێ ئەبن .

بە تێك شکانی دوا هەڵمەتی ئەبوسوفیان و ئەسپ سوارانی قـوڕەیش ، سـوپای مەککە دەستی لەوە شۆرد کە بتوانێ ئـیتر دەسـت لـە موسـڵمانان بوەشـێنێ و ، فەرماندەکانیشی گەیشتنە ئەو یەقینە کە موسڵمانەکان زۆر لـەوە بـەهێزترن کـە ئەوان دەستیان بـۆ بکەنـەوە . ئـەو چـەند سـاتەش کـە دەسـتیان لێ وەشـاندن ، هەڵەیەکی کاتیی بوو تێی کەوتن و مەردانە خۆیان لە داوی ئابلۆوقە رزگار کرد و، بە کۆبوونەوەیان لە دەوری ئازیز گەڕاونەتەوە دۆخی بەهێزی جارانیان .

لە لایەکی تریشەوە یەك بە یەکی سوپای قـوڕەیش یـەکجار مانـدوو و هـیلاك بوو، چونکە وەك چەند رۆژێك بوو لە مەککەوە دەرچوو بوون ، لە سـەرەتای رۆژی جەنگەکەشەوە لەلایەن سوپای ئیسلامەوە گورزێکی کاریگەریان تێ سرەوێنرا ، بە رادەیەك کە ترس و لەرزێکی یەکجار زۆر چووبووە دڵی سەربازەکانیانەوە ، چونکە لە یەکەم هەڵمەتدا ، موسڵمانەکان ، بە چەند ساتێکی کەم دەسـتەی ئـاڵا هـەڵ گری قورەیشیان لەناو بردن و هەموویان کوشـتن و ئاڵایـان لـە خـۆڵ گەوزانـد و ، پاشان بە هێرشێکی زراوتـەقێن سـوپای مەککـەیان تـەفروتوونا کـرد و ، ئەگـەر هەڵەی تیرهاوێژانی موسڵمانان نەبوایە ، قوڕەیش وەها تێك ئەشکان کـە نـەتوانن خۆیان کۆ بکەنەوە و ، بگەنەوە مەککە ..

بەم دەست شۆرینە ، ورەی سوپای مەککە نەما و ، ئەبوسـوفیانی فەرمانـدەی گشتیی هاتە سەر ئەو بڕیارە کە کۆتایی بـە جـەنگی بێئاکـام بهێنـێ و ، بـەبێ دەنگ ملی رێگا بەرەو مەککە بگرنە بەر و لەو شوێنەدا شەویان بەسەردا نەیەت. بۆ ئەمە فەرمانی بۆ سەربازان دەرکرد تا خۆیان بۆ گەڕانەوە ئامـادە بکـەن . بـەم بڕیارەی ئەبوسوفیان جەنگ لە ناوچەی ئوحوددا کۆتایی پێ هات .. [٤٠٢]

---

[٤٠٢] الرحيق المختوم : ٢٧٣ ـ ٢٨١ ، غزوة أحد : ١٨٧ ـ ١٩٦ .

**شانزەهەم : شێواندنی جەستەی شەهیدەکان :**

کە ئەبوسوفیان بڕیاری کۆتایی‌هێنانی جەنگی بە سوپاکەی ڕاگەیاند ، سەربازەکانی دەستیان دایە خۆ پێچانەوە بۆ گەڕانەوە و ، هەندێکیشیان خۆیان گەیاندە مەیدانی جەنگ و دەستیان دایە گەڕان بە دوای کوژراوەکانیاندا . هەندێکی تریشیان ، بە رق و قین و دڵ پیسیی نەفامی‌یەوە ، دەستیان دایە لووت و گوێ بڕینی شەهیدەکانی ئیسلام و ، شێواندنی جەستەکانیان ، بە هەڵ دڕینی سکیان و دەرهێنانی ناو سکیان ، بگرە بڕینی عەورەتی هەندێك لەو شەهیدانە ..

لەناو هەموو شەهیدەکان‌دا حەمزەی سەرداری شەهیدانی ڕێگای خوا ، خوا لێی ڕازیی بێ ، لە هەموو کەس زیاتر بەر ئەو تۆڵە و شالاوە دڕندانەیە کەوتبوو . چونکە حەمزە لە هەموو موسڵمانێك زیاتر بەلای سەردارە قوڕەیشی‌یەکانەوە تاوان بار بوو ، لەبەر ئەوەی لە ڕۆژی بەدردا ، بە هاوبەشیی لەگەڵ عەلیی برازای‌دا سەردارانی مەککە : عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی برای و وەلیدی کوڕی عوتبە، لە یەکەم زۆرانبازیی‌دا کوشتبوون ، کە هەموویان لە نەوەی ئومەییەی کوڕی عەبدشەمسن .

لەبەر ئەمە هیندی کچی عوتبە ، کە هاوسەری ئەبوسوفیان بوو ، لە هەموو کەس زیاتر رقی لە حەمزە بوو و ، ئەو دەوری کاریگەری هەبوو لە کۆکردنەوەی سوپای مەککە تا هێرش بکاتە سەر مەدینە و ، خۆیشی لەگەڵ ئەبوسوفیانی هاوسەری‌دا ئامادەی جەنگ بووبوو تا لەگەڵ ژنانی تری قوڕەیش‌دا پیاوەکان هەڵ بنێن و دامەزراویان بکەن لە جەنگ هەڵ نەیەن .

هیند زانیی‌بووی کە جوبەیری کوڕی موطعیم بەڵێنی بە وەحشیی بەندەی داوە کە ئەگەر حەمزە بکوژێت ئازادی بکات ، بۆیە هەرچیی بەلای ئەو بەندە حەبەشی‌یەدا گوزەری بکردایە هەڵی ئەنا تا بەڵێنەکەی بۆ جوبەیری ئاغای بەسەر بەرێت و ، خۆیشی بەڵێنی خەڵاتێکی گەورەی پێ ئەدا کە ئەگەر بتوانێ حەمزە بکوژێ .

کە جەنگ کۆتایی هات وەحشیی هاتە لای هیندی کچی عوتبە و پێی وت :
ئەگەر بکوژی باوکت بکوژمەوە چیم ئەدەیتێ ؟
وتی : هەرچیی جل و بەرگ و خشڵێکم پێوەیە .

ئەویش دڵی پڕ لە متمانە کرد کە کوشتوویە . بەو بۆنەوە هیند جل و بەرگ و خشڵەکەی پێ دا و ، بەڵێنیشی دایە کە ئەگەر گەیشتەوە مەککە خەلاتێکی زێڕینی گەورەی بکات .

وەحشیی کەوتە بەری هیند و بردیە سەر لاشەی حەمزەی شەهید .. بەوپەڕی بێویژدانی یەوە سکی حەمزەی هەڵ دڕیی و ، جگەری دەرهێنا و ، بە سەیرکردنی شادمان ئەبوو و ، خوێنیش لە نێوان پەنجەکانیەوە دائەچۆڕا .

هیند نەزری کردبوو کە ئەگەر دەستی بگاتە حەمزە لە جگەری بخوات . بۆیە هەندێ لە جگەری جوی و هەولی دا قووتی بدا کەچیی بۆی قووت نەدرا و تفی یەوە ..

هەندێ لە مێژوونووسان ئەڵێن : هیند ناو سکی حەمزەی دەرهێناوە و هەردوو گوێی و لووتی بڕیوە و تەمانەی کردووە بە بازووبەندی دەستی و ملوانکەی ملی هەتا گەیشتۆتەوە مەککە .

ئەو ژنانەش کە لەگەڵیا بوون بە هەمان شێوە لووت و گوێی شەهیدەکانی تریان بڕیی و ، هیند لە لووت و گوێی بڕاو ملوانکە و پاوانەی دروست کردن و ، پاوانە و ملوانکە و گوارەکانی خۆی بەخشیی بە وەحشیی .

خۆ لە جەنگی بەدردا موسڵمانەکان زۆرێك لە سەردارانی قوڕەیشیان کوشتن و ، لە کۆتایی جەنگیش دا مەیدانی جەنگ لە دەستیان دا بوو و ، بە شێوەیەکی مرۆڤانە جەستەی ئەو کوژراوانەیان شاردەوە و نەیان هێشت ببنە خۆراکی دڕندە و باڵندە . کەچیی ئەوان ماوەیەکی کەم مەیدانیان لە دەست دا بوو ـ لە کاتی کشانەوەی موسڵمانەکان دا بۆ بەرزایی یەکانی ئوحود ـ ئەو نامەردی یەیان لە دەست داکەوت ..

هیند بە تەمای ئەو دەست وەشاندنە نەبوو قوڕەیش ئەو هەمووە لە موسڵمانان شەهید بکەن ، کە ئەوەی دیی بەوپەڕی فەخر و شانازی یەوە سەرکەوتە سەر تاشە بەردێکی نزیکی موسڵمانەکان و ، بە شیعر بە دەنگی بەرز دای بە گوێی موسڵمانەکان دا :

نحن جَزَيناكم بيومِ بدرٍ — والحرب بعدَ الحربِ ذات سعرِ
ماكان من عتبة لي من صبرٍ — ولا أخي وعمه وبكري
شفيتُ نفسي وقضيتُ نذريَ — شفيت وحشيّ غليل صدري

فشكرُ وحشيٍّ عليَّ عــمري    حتى تــرم أعــظمي في قبــري

ئەڵێ : تۆڵەی بەدرمان لێتان سەند ، جەنگی دوای جەنگ كڵپە ئەسێنێ . دوای عوتبەی باوكم و وەلیدی برام و شەیبەی مامەم و حەنظەلەی كوڕم ئارامم نەمابوو . وا ئێستە دڵم ئاوی خواردەوە و نەزرەكەم بەجێ هێنا و وەحشیی ئازاری دڵ و دەروونی نەهێشت . بە درێژایی تەمەنم و هەتا ئێسقانەكانیشم لە قەبرەكەم دا ئەرزن هەر سوپاسی وەحشیی ئەكەم ..

لەو بەرەوە ، لەلایەن موسڵمانانیشەوە هیندی كچی ئەثاثەی كوڕی عەببادی كوڕی موطەللیب ،[٤٠٣] بە شیعر و ، بە هەمان سەروا وەڵامی هیندی كچی عوتبەی دایەوە :

خــزيت في بدرٍ و بــعد بــدرِ    يا بنتَ وقــاعَ عــظيم الكفرِ

صبَّحــكَ الله غــداةَ الفــجرِ    ملهاً شــمين الطــوال الزهــرِ

بــكلِّ قَــطّاع حســام يفري    حــمزة ليثي وعــلي صقــري

إذ رام شيب وأبــوكِ غــدري    فخــضباً مــنه ضواحي النــحرِ

ونــذركِ الســوء فشــر نــذرِ

ئەڵێ : لە بەدریش و دوای بەدریش‌دا هەر سەرشۆڕ بوویت ، ئەی كچی ئەوەی كە كەوتۆتە ناو كوفرێكی گەورەوە . حەمزە شێر و عەلیی بازی منن .........

نەك هەر تەنها ژنان و پیاوان لووت و گوێی شەهیدەكانیان بڕیی بێ ، بەڵكو ئەبوسوفیانی فەرماندەی گشتیی و فەرماندەكانی سوپای مەككەش لە مەیدانی جەنگەكەدا ئەگەڕان ، تا بزانن كێ و كێ لە هەردوو لا كوژراون .

ئەوەبوو دای بە لای لاشەی پیرۆزی سەرداری شەهیدان‌دا ، ئەبوسوفیانیش وەك هاوسەرەكەی سەركەش بوو ، نووكی رمەكەی خستە سەر شەویلكی حەمزە و لێی ئەدا و ئەیوت : هەی دڵ شكێن بچێژە .

شایانی باسە كە لووت و گوێ بڕینی كوژراو لەسەردەمی نەفامیی عەرەبەكانیش‌دا شتێكی قیزەون و ناشیرین بووە ، لەبەر ئەوە كە حولەیسی كوڕی

---

[٤٠٣] هیند كچی ئەثاثەی كوڕی عەببادی كوڕی موطەللیبی كوڕی عەبدمەناف بووە . عەببادی باپیری ئامۆزای عەبدولموطەللیب و ئەثاثەی باوكیشی ئامۆزازای عەبدوڵڵای باوكی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە . شاعیرێكی قوڕەیشیی ناودار بووە لە سەردەمی نەفامیی‌دا .. دوای غەزای بەدر موسڵمان بووە . لە جەنگی بەدردا دەوری بووە .. خوشكی میسطەحی كوڕی ئەثاثەیە كە لە بوختانەكەی حەزرەتی عائیشەدا ناوی هاتووە . هیند لە ساڵی دەی كۆچیی‌دا كۆچی دوایی كردووە .

زەببانی کوڕی عەبدمەنات ی سەرداری ئەحابیش چاوی لەو کارەی ئەبوسوفیان بوو کارەکەی بەلاوە نەشیاو و ناشیرین بوو بە تووڕەیی‌یەوە بانگی کرد :

ئەی نەوەی کینانە ! ئەوە سەرداری قوڕەیشە ( مەبەستی ئەبوسوفیانە ) ئەبینن چیی بە ئامۆزا مردووەکەی ئەکا . ئەبوسوفیانیش تەریق بوویەوە و بە فەرماندەی ئەحابیشی وت : مالّت ئاوا بێ ، هەڵەیەك بوو کردم ، بۆم بشارەوە . حەمزە و ئەبوسوفیان لە عەبدمەنافدا بە یەك ئەگەن ، چونکە عەبدمەناف باپیری نەوەی هاشم و نەوەی ئومەییەیە .[٤٠٤]

**حەڤدەهەم : کۆتایی جەنگ و کشانەوەی سوپای مەککە :**

دوای ئەوەی کافرەکانی مەککە جەستەی شەهیدەکانیان شێواند و ، زانی‌یان لە هەر دوو لا کێ وکێ کوژراون ، ئەبوسوفیانی فەرماندەی گشتیی فەرمانی گەڕانەوەی دا ..

بەر لەوەی ئەبوسوفیان بە سوپاکەیەوە بەرەو مەککە بکەوێتە رێ ، سەرکەوتە سەر کێوێکی نزیکی موسڵمانەکان و لەوێوە دەستی دایە فیز و دەمار بەسەر موسڵمانەکاندا و ، خۆشیی و شادمانیی دەربڕیی کە گوایا سەرکەوتنی بە دەست هێناوە .

کە چووە سەر کێوەکە بە هەموو هێزێکیەوە قیڕاندی و بە خۆی ئەوت : دەستت خۆش . پاشان رووی لە موسڵمانەکان کرد و وتی : ئایا موحەممەد لە ناو ئەو خەڵکەدایە ؟ فەرمووی : (( لا تجيبوه )) . فەرمووی : وەڵامی نەدەنەوە . پرسیی : ئایا کوڕی ئەبوقوحافە لە ناو ئەو خەڵکەدایە ؟ ئایا کوڕی خەططاب لە ناو ئەو خەڵکەدایە ؟ هەموو جارێ پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: وەڵامی نەدەنەوە .

ئەبوسوفیان وتی : ئەوانە کوژراون ، چونکە ئەگەر زیندوو بوونایە وەڵامیان ئەدایەوە . ئیتر عومەر خۆی پێ نەگیرا و فەرمووی : بەخوا درۆت کرد ، ئەی دوژمنی خوا ، ئەوانەی تۆ ناوت هێنان زیندوون و ، ئەوانەش تۆ پێت ناخۆشە ماون . وتی : ئەم رۆژە بە رۆژی بەدر و ، جەنگیش بە نۆرەیە . عومەر فەرمووی: وەك یەك نین ، کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدان و ، کوژراوەکانی ئێوەش لە ئاگردان .

---

[٤٠٤] غزوة أحد : ١٩٦ ـ ٢٠٠ ، السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ٢٠٧ ، الرحيق : ٢٨١ .

ئەبوسوفیان وتی : لە نـاو کوژراوەکانتـان دا هەنـدێك ئـەبینن کـە جەسـتەیان شێواوە ، من نە فەرمانم بەوە داوە و ، نە پێیشم خۆش بووە .

پاشان دەنگی بەرزکردەوە و وتی : أُعلُ هُبَل ، أعل هبل . واتە : با بەرز و بڵنـد بێ هوبەل .. هوبەل دینەکەت سەرخە . پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی : (( أجیبـوه )) . فەرمووی : وەڵامی بدەنەوە . وتیان چیی پێ بڵێین ؟ فەرمووی : (( قولوا : الله أعلى وأجل )) . فەرمووی : بڵێن : خوا بەرزتر و مەزن‌ترە .. ئەبوسـوفیان وتـی : ئێمـە عوززامان هەیە و ، ئێوە عوززاتان نیە . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( أجیبـوه )) . وتیان : چیی بڵێین ؟ فەرمووی : (( قولوا : الله مولانا ولا مولى لكم )) . فـەرمووی : بڵێن : ئێمە زاتی ( الله ) کۆمەك و پشتیوانمانە و ، ئێوە کۆمەك پشتیوانتان نیە .

پاشان ئەبوسـوفیان وتـی : سـاڵێکی تـر لـە بـەدردا بـەڵێنی نێوانمـان بێـت . پێغەمبەری خوا ﷺ بە یەکێ لە هاوەڵانی فـەرموو : (( قل : نعم هو بيننا وبينـك موعد )) . فەرمووی : بڵێ : باشە با بەڵێنی نیوانمان بێت .

لە ریوایەتێکی تردا وا هاتووە کە کاتێ ئەبوسوفیان دەنگـی عومـەری بیسـت داوای لێ کرد یەك ببینن و وتی : عومەر وەرە بۆ لام .

کە پێغەمبەر ﷺ زانیی ئەبوسوفیان پێی خۆشە عومەر ببینـێ ، فـەرمانی دا بڕوا بزانێ چیی ئەوێ .

هەر چەندە لە حاڵەتی جەنگ‌دا بوون عومەر لێی چووە پێشـەوە . ئەبوسـوفیان لێی پرسیی : ئەی عومەر ! سـوێندت بـەخوا ئـەدەم ، ئایـا ئێمـە موحەممـەدمان کوشتووە ؟؟ عومەر فەرمووی : نەخێر . ئێستە گوێی لە وتەکانتە . ئەبوسـوفیان بە عومەری وت : بە لامەوە تۆ راستگۆتر و چاك‌تری لە کوڕی قەمیئە .

ئەوەبوو ئیبن قەمیئە کە موصعەبی شەهید کردبوو وای زانیی بوو پێغەمبـەری خوایە ، چونکە لە یەك ئەچوون ، بە تایبەت بە پۆشاکی جەنگـەوە ، بۆیـە بـڵاوی کردبووەوە کە موحەممەدم کوشتووە .

کە بەڵێن درا بۆ ساڵێکی تر و لە بەدردا بـە یـەك بگـەن ، خێـرا ئەبوسـوفیان لەسەر کێوەکە دابەزیی و بە سوپاکەیەوە هەر ئەو ئێوارەیە بەرەو مەککـە کەوتـە رێ و ، کۆتایی بە تاقیی‌کردنەوەیەکی سەختی بەردەم موسـڵمانەکان هـات ، کـە پاك و پیسی تیا جیا کرانەوە . چونکە کۆمەڵی ئیمان‌دار هەتا بە چـاکیی تـاقیی

نەكرێتەوە ، نابێتە جێ‌متمانەی پەروەردگار و ، نابێتە ئەمینداری دینی خوا .. ئەوەتا قورئان ئەفەرموێ :

﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ﴾ .

( آل عمران : ١٧٩ ) .

كە ئەبوسوفیان و سوپای مەككە كشانەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمیری ئیمان داران عەلیی كوڕی ئەبوطالیبی خوا لێی ڕازیی بێ نارد تا بزانێ سوپای مەككە نیازی چی‌یە و بزانێ بەرەو كوێوە ئەڕوا ؟

ئایا نیازی ئەوەیە ڕوو لە مەدینە بنێ كە تەنها دوو میل لە مەیدانی جەنگەوە دوورە و ، جگە لە موونافیقان و جوولەكە كەسی تێدا نەماوە ؟ ئایا نیازی هەیە هەڵمەت بەرێتە سەر مەدینە ، یان بەرەو مەككە ئەگەڕێتەوە ؟

جا پێغەمبەری خوا ﷺ وەك فەرماندەیەكی شارەزا و لێ‌هاتوو بە ئەركانی سوپاكەی ڕاگەیاند كە ئەگەر بت‌پەرستان سواری ئەسپ بوون و لە سواریی وشتر لایان سەند ئەوا نیازیان وەهایە هێرش بكەنە سەر مەدینە . خۆ ئەگەر لە سواریی ئەسپ لایان سەند و سواری وشترەكانیان بوون ئەوا نیازیان وەهایە ڕاستەوخۆ ڕوو لە مەككە بنێن . پێیشی ڕاگەیاندن كە ئەگەر نیازی مەدینەیان هەبێ ئەوا ئامادیە بچێ بە گژیانا و نەهێڵێ مەدینە بگرن .. بە مەرجێ سوپای ئیسلام كە حەوت صەد كەس بوو حەفتای لێ شەهید كرا بوون و ، صەد و پەنجایشی زامدار بوون .

عەلیی بە خێرایی شوێن قوڕەیش كەوت و زانیی كە بت پەرستەكان لە سواریی ئەسپ لایان سەندووە و سواری وشترەكانیان بوون و ، ڕوویان لە مەككە ناوە .. ئەمە لە ئیبن هیشام‌دا وا هاتووە . بەڵام لە ( الفتح الباري ) دا وەها هاتووە كە سەعدی كوڕی ئەبووەققاص شوێن قوڕەیش كەوتووە بۆ هەواڵ زانین .

لێرەدا پرسیارێك دێتە بەردەمان : بۆچیی ئەبوسوفیان هێرشی نەكردە سەر مەدینە ؟ خۆ لە كاتی كشانەوەی سوپای قوڕەیش‌دا مەدینە هیچ بەرگرییەكی نەبوو ، چونكە سوپای ئیسلام هێشتا لە مەیدانی جەنگ‌دا بوو و ، مەدینە تەنها ژن و منداڵ و كەسانێكی وەهای تێ‌دا بوون كە توانای جەنگیان نەبێت .. ئەبوسوفیان هەلی بۆ هەڵ كەوتبوو تا بە خۆی و سوپاكەیەوە مەدینە بگرێ ، یان هیچ نەبێ هەندێ دەست كەوت و هەندێ دیل دەست بخات ، چونكە ، بەڵێ

کۆمەڵێك هاوەڵ شەهید کران ، بە بۆنەی هەڵەی تیرهاوێژەکانەوە ، بەڵام لە مەیدانی جەنگدا قورەیش نە دیل و نە دەست کەوتی جەنگی نەگرت ، وەك موسڵمانەکان لە بەدردا دەستیان کەوت .

بێگومان ئەبوسوفیان و فەرماندەکانی سوپاکەی بیریان لەم هەڵە کردۆتەوە : شارێکی وەها بێدیفاع لە بەردەستیاندا هەڵمەتی بدەنێ . کەچیی ئەو کارەیان ئەنجام نەدا و یەکسەر بەرەو مەککە کشانەوە . داخۆ نهێنیی ئەمە چیی بێت ؟

لە راستییدا قورەیش ژیریی و سەلیقەیان بەکار هێنا کاتێك وازیان لە مەدینە هێنا و ، ئەبوسوفیانیش یەکجار ژیر و لێزان بوو وا سوپاکەی تووشی کارەسات نەکرد ، بگرە ئەبوسوفیان بەم کارەی سەلماندی کە فەرماندەیەکی لێهاتوو و وریایە و ، بە سەراب ناخەڵەتێ و ، شوێن رووکەش ناکەوێ . ئەبوسوفیان ئەیزانیی سەرکەوتنی قورەیش رواڵەتییە و هەمیشەیی نیە و ، شەهیدکردنی ئەو کۆمەڵە موسڵمانەش بە ئازایەتیی و نەخشەی قورەیش نەبووە و ، لە هەمان کات دا لێنەهاتوویی و بێنەخشەیی سەرکردایەتیی موسڵمانان نانوێنێ ، بەڵکو هەڵەیەك بوو و لە دەست هەندێکیان دەرچوو . بۆیە ئەبوسوفیان بە چاکی نەئەزانی سەرەنجامی سوپاکەی بخاتە مەترسییەوە ، بە تایبەت وا سوپای مەدینە خۆی کۆکردۆتەوە و توانای جەنگی وەك سەرەتای رۆژ هەیە . جا وا چاکە ئەو سەرکەوتنە ، کە بەناو سەرکەوتنە ، بپارێزرێت و ، بیکەن بە پاگاندە کە ئەمڕۆ لە بریی بەدر .

لە سەرەتای رۆژەوە موسڵمانەکان گورزی کاریگەریان لە قورەیش وەشاند ، بەڵام بە هەڵەی تیرهاوێژەکان بتپەرستەکان توانییان :

١ ـ خۆیان لەو تێك شکانە سامناکە دەرباز بکەن .

٢ ـ زیانێکی گیانیی چاوەڕوان نەکراو بە موسڵمانەکان بگەیەنن .

٣ ـ سەرکەوتنە مسۆگەرەکەی موسڵمانان لە ناو بدەن .

٤ ـ سوپای قورەیش خاوەنی سەرکەوتنێکی رواڵەتیی بێت ، ئەگەرچیی بۆ ماوەی شەو و رۆژێکیش بێت . چونکە بۆ سبەینێ لای هەردوو لا سەلما کە قورەیش سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە و ، هەر کەسیش وایزانی بێ سەرکەوتووە هەر ئەو رۆژە قەناعەتی بەو سەرکەوتنە هەبووە . ئەمە لە غەزای ( حمراء الأسد ) دا روون ئەبێتەوە .

ئەبوسوفیان چاك ئەیزانیی کە ئەم چوار خاڵەی سەرەوە بە بۆنەی ئازایەتیی ئەوانەوە نەهاتوونەتە دیی و ، هیچ کاتێکیش ئەو هەلەیان دەست ناکەوێتەوە . ئەوە خەوێك بوو دییان و جارێکی تر نایبیننەوە . بۆیە نەیئەویست سوپاکەی جارێکی تر بخاتەوە بەر پلاری شێرەکانی ئیسلام .

لە راستییدا ئەبوسوفیانیش و هەموو فەرماندە و سەربازێکی سوپاکەشی ترسی هەڵمەتی سەر لە بەیانیی سوپای مەدینەیان لە دڵدا بوو ، چونکە دیوی راستەقینە بریتییە لە سەرکەوتنی مەدینە و ، دیوی سەرکەوتنی مەککە دیوێکی کاتیی و ناخلۆفیی و رێلێکەوتنە ، بۆیە بەو سەرکەوتنە کاتییە دڵیان خۆش نەبوو و ، لە خوایان ئەویست لەگەڵ سوپای مەدینەدا دەست نەدەنەوە یەخەی یەکتریی و ، بەو سەرکەوتنە ساختەیەوە بگەڕێنەوە دواوە و ، بە هۆزەکانی سەرە رێی مەککە و مەدینە بڵێن لە ئوحوددا تۆڵەی بەدرمان کردۆتەوە .

کەواتە ئەبوسوفیان هەڵەی وا ناکا هێرش بکاتە سەر مەدینە و ، سوپای مەدینە بە جەنگی سەروماڵیی بیاندات بە زەوییدا ..

پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەدر و شوێنەکانی تریشدا ، دوای سەرکەوتن ، یان راونانی دوژمن و دەسەڵات لێسەندنی سێ شەو لەو شوێنەدا ئەمایەوە و بە هەموو لایەکی ئەسەلماند کە بەرامبەرە دوژمنەکانی دەسەڵاتێکیان لە دەستدا نەماوە ، ئەوسا ئەگەڕایەوە .

بەڵام سوپای مەککە نەیوێرا شەوێکیش لە دەوروبەری ناوچەی ئوحوددا بمێنێتەوە ، هەر ئەو ئێوارەیە بەرەو مەککە گەڕایەوە ، کە زۆر لە هەڵاتن و خۆدامالێن لە جەنگ ئەچوو .. ئەوەبوو بە یەك رۆژ نزیکەی چل میلی بەو سوپا زۆر و زەبەندەیە بڕیی . وەك بڵێی ئەترسا ئەگەر بە خاویی بڕۆن ، یان ئەو شەوە لە شوێنێکی نزیك مەدینەدا بخەن ، سوپای موسڵمانەکان بکوتێتە سەریان ، بە تایبەت دوای ناشتنی شەهیدەکان و دەرمانکردنی زامدارەکان ، ئەو کاتە لەوانەیە کارێ بە سوپای مەککە بکات کە با بە دەواری شڕی نەکردبێ .

هەروایش بوو .. بۆچوونەکانی ئەبوسوفیان لە جێی خۆیاندا بوون . بەڵێ ئەوان لەو ناوە دوورکەوتنەوە و ، موسڵمانەکان بە شەهید و زامدارەکانەوە پەشۆکا بوون ، بەڵام ئەوەبوو پانزە سەعاتی نەبرد دوای کۆتایی هاتنی جەنگی ئوحود ،

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بۆ سوپای ئیسلام دەرکرد ، بە تایبەت بۆ ئەوانەی جەنگی ئوحودیان کردووە ، بکەونە دوای سوپای مەککە و راوی بنێن .

لە رۆژی جەنگی ئوحوددا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بە دانیشتنانەوە بەجێ هێنا، لەبەر ئەوەی زامەکانی ئازاریان زۆر بوو و ، توانای نەبوو بە پێوە بووەستێ. کە دەستی بە نوێژ کرد ، هەموو سوپای ئیسلام ، بە زامدار و ساغەوە ، بە دانیشتنانەوە ، لە دوایەوە نوێژیان بەجێ هێنا .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ رووی نزا و پاڕانەوە و ستایشی کردە ئەو خوایەی کە هەموو شتێ لە دەستی خۆیدایە ، بەرامبەر بەو هەموو نارەحەتیی و بەڵایەی کە هێنایەرێیان . ئەوەبوو بە هاوەڵانی فەرموو : (( استووا حتى أثني على ربّي عزّ وجلَّ )) . فەرمووی : رێك بووەستن تا ستایشی خوای پەروەردگارم بکەم .

موسڵمانەکان بە چەند ریزێك لە دوایەوە وەستان و ، ئەویش بەم چەند وشە پڕ لە ئیمانە سازگارانە لە خوا پاڕایەوە :

(( اللهم لك الحمدُ كله ، اللهم لا قابض لما بسطت ، ولا باسط لما قبضت ، ولا هادي لمن أضللت ، ولا مضل لمن هديت ، ولا معطي لما منعت ، ولا مانع لما أعطيت ، ولا مقرِّب لما باعدت ، ولا مبعِّد لما قربت .

أللهم أبسط علينا من بركاتك ورحمتك وفضلك ورزقك . أللهم إني عائذ بك من شرِّ ما أعطيتنا وشر ما منعتنا . اللهم حَبِّبْ إلينا الإيمان وزينه في قلوبنا ، وكره إلينا الكفر والفسوق والعصيان ، واجعلنا من الراشدين . اللهم توفنا مسلمين ، وأحينا مسلمين ، وألحقنا بالصالحين غير خزايا ولا مفتونين .

اللهم قاتلِ الكفرة الذين يكذبون رسلك ، ويصدون عن سبيلك ، واجعل عليهم رجزك وعذابك . اللهم قاتلِ الكفرة الذين أوتوا الكتاب ، إلهَ الحق )) . رواه الإمام أحمد .[405]

**هەژدەهەم : گەڕان بە دوای شەهیدەکاندا :**

دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی یەك لایی بوویەوە کە قورەیش نیازی هێرشکردنە سەر مەدینەی نیە و ، بەرەو مەککە کەوتۆتە رێ ، کەوتە هەوڵی ئەوەی کە بزانێ کێ وکێ لە هاوەڵانی شەهید بوون ..

---

[405] غزوة أحد : ٢٠١ ـ ٢١٠ ، الرحيق المختوم : ٢٨٣ ـ ٢٨٤ ، ٢٨٧ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٠٩ ـ ٢١٠ .

لەسەر کێوی ئوحود بە خۆی و هاوڵانەوە دابەزینە خوارەوە مەیدانی جەنگ ، تا بە شێوەیەکی ڕێك وپێك شەهیدەکان بنێژن و، فریای زامدارەکانیش بکەون و دەرمانی زامەکانیان بکەن ..

پێغەمبەری خوا ﷺ بە تایبەت موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی نارد تا هەواڵی سەعدی کوڕی ڕەبیعی[٤٠٦] بۆ بزانێ ، کە یەکێ لە فەرماندە بەناوبانگەکانی ئەنصار بوو . ناردی تا بزانێ زیندووە یان شەهید بووە .

کە کوڕی مەسلەمە لە ناو مەیدانی جەنگدا ئەسووڕایەوە ، چاوی بە سەعدی کوڕی ڕەبیع کەوت کە لە خوێنی خۆی گەوزا بوو و ، بە خوڕ خوێن لە زامەکانی ئەڕۆیشت و ، لە دواساتەکانی ژیانیدا بوو .. چەمی‌یەوە بەسەریدا و هەواڵی دایێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە تایبەت بۆ ئەوەی ناردووە کە هەواڵی ئەو بزانێ و بزانێ چیی بەسەر هاتووە . سەعد بە دەنگێکی یەکجار کپ و نزمەوە ، بە کوڕی مەسلەمەی گەیاند کە تازە ئەم لە دەست دەرچووە و ، بە بۆنەی زامە سەختەکانیەوە جارێکی تر هەڵ ناسێتەوە .

سەعد لەم هەڵوێستە ناسکەی ژیانیدایە .. لای یەقینە کە بەم زوانە ژیانی تەواو ئەبێت ، بیری لە ژن و منداڵ و سامان و باخ و باخات و کەس وکاری نەئەکردەوە .. بەڵکو خەمی پێغەمبەری خوای بوو .. خەمی بوو ئەگەر هەندێکیان شەهید بن ، پێغەمبەری خوا ﷺ وەك جارانی خزمەت نەکرێ ..

---

[٤٠٦] سەعدی کوڕی ڕەبیعی کوڕی عەمری کوڕی ئەبوزوهەیری خەزرەجیی ئەنصاریی بووە .. لەگەڵ پێشینەکانی دانیشتوانی مەدینەدا موسڵمان بووە . ئامادەی پەیمانی عەقەبە بووە کە پێش کۆچ کردن لە نێوان پێغەمبەر و موسڵمانەکانی مەدینەدا بەستراوە . سەعد یەکێ لە سەردارانی مەدینە بووە بۆ بەستنی ئەو پەیمانە . لە دوای کۆچ کردن لەگەڵ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفدا بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوونە برا . سەعد بەشداریی جەنگی بەدری لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ کردووە . یەکێ بووە لە هاوەڵە بەئەمەك و بەوەفاکان . لە ڕۆژی ئوحوددا لە دوانزە شوێنی سەختەوە زامدار کرا . لە ڕیوایەتی تردا وا هاتووە کە بە ڕم و شیر و تیر لە حەفتا شوێنەوە زامدار کراوە . ئەبوبەکریش زۆری خۆش ئەویست ، بە ڕادەیەك کە کاتێك ئوم سەعدی کچی سەعدی کوڕی ڕەبیع ئەچێتە خزمەتی ئەبوبەکر ، لە سەردەمی خەلافەتیدا کراسەکەی خۆی بۆ ڕاخست لەسەری دابنیشێت . کە عومەر چووە ژوورەوە سەری لە کردەوەکەی خەلیفە سوڕ ئەما ، کە ئەبێ ئەم ئافرەتە کێ بێ وا ئەوەندە بەلای خەلیفەوە بەڕێزە ، بۆیە پرسیاری کرد . خەلیفەش وەڵامی دایەوە و فەرمووی : ئەمە کچی پیاوێکە لە منیش و لە تۆش چاکترە . فەرمووی : ئەوە کێیە ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : پیاوێکە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا سەری ناوەتەوە و ، شوێنی خۆی لە بەهەشت دا دیوە و ، منیش و تۆیش هەروا ماوین .

لە کاتی ئاسایی‌دا سەعد داوای لە عەبدوڕڕەحمانی برای دینیی کرد تا یەکێ لە دوو باخەکەی بۆ خۆی هەڵ بژێرێ و ، لە دوو ژنەکەشی کامیانی بوێ بۆی تەڵاق ئەدا ، تا دوای بەسەر چوونی عیددەی مارەی بکات .

لە کاتی ئاسایی‌دا ئەمە دڵ و دەروونی ئەم پاڵەوانەیە .

لە کاتی ناسك و هەڵوێستی سەختیش‌دا بیری بەلای خۆی و کەس وکاریەوە نیە .. بەڵکو خەمی پێغەمبەری بوو ئەوەندە پێغەمبەری خوای ﷺ خۆش ئەویست، خۆش‌ویستنی هەموو شتێکی پشت‌گوێ خستبوو .. هەتا بیری بەلای زامەکانیەوە نەبوو .. هەر خەمی بوو ئەو بێ‌ناز بێ .

ئەوەبوو بەر لەوەی گیانی بداتە شەقەی باڵ و بەرەو بەهەشت بکەوێتە ڕێ ، دوو نامەی جوانی بە کوڕی مەسلەمەدا ڕەوانە کرد .. یەکەمیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و ، دووهەمیشیان بۆ ئەنصارە خزمەکانی .

لە نامەی یەکەم‌دا وتی : سەلامم بگەیەنە بە پێغەمبەری خوا ﷺ و ، پێی بڵێ: سەعدی کوڕی ڕەبیع ئەڵێت : بە چاکترین شێوە کە خوا پاداشتی پێغەمبەرێك لە ئوممەتەکەیەوە بداتەوە ، وەهاش لە ئێمەوە پاداشتی تۆ بە چاکە بداتەوە .

لە نامەی دووهەمیش‌دا وتی : سەلامیشم بە خزمەکانت ( واتە ئەنصار ) بگەیەنە و پێیان بڵێ : سەعدی کوڕی ڕەبیع پێتان ئەڵێ : هەتا ئاو لە چاوتان‌دا بێ ، ئەگەر زیانێك بە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بگات ، ئێوە هیچ بیانوویەکتان نابێ ..

ئەوەندەی پێ ناچێ گیانی دەرئەچێ و ، کوڕی مەسلەمەش دێتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەی ئەداتێ ..

ئەمەی پێشەوە لە ( إبن هشام ) وەرگیراوە ، بەڵام لە ( زاد المعاد ) دا وەها هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ زەیدی کوڕی ثابیت ئەنێرێ بۆ زانینی هەواڵی سەعدی کوڕی ڕەبیع و ، ئەفەرموێ : (( إن رأيته ، فأقرئه مني السلام ، وقل له : يقول لك رسول الله : كيف تجدك ؟ )) . ئەفەرموێ : ئەگەر چاوت پێی کەوت ، لە منەوە سەلامی لێ بکە و ، پێی بڵێ : پێغەمبەری خوا پێت ئەڵێت : هەواڵت چی‌یە ؟ زەید بە ناو کوژراوان‌دا ئەگەڕێ هەتا ئەگاتە لای سەعد و ئەبینێ وا لە دواساتەکانی ژیانی‌دا ، حەفتا زامی شیر و تیری پێوەیە .

ئەڵێت : ئەی سەعد ! پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامت لێ ئەکات و ، پێت ئەفەرموێ : (( أخبرني ، كيف تجدك ؟ )) . ئەفەرموێ : هەواڵم بدەرێ ، چۆنی ؟ وەڵامی دایەوە : سەلام لە پێغەمبەری خواش بێ ﷺ و ، پێیشی بڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا ! بۆنی بەهەشت ئەبیستم . بە خزمە ئەنصارەکانیشم بڵێ : هەتا ئاو لە چاوتان‌دا بێ ، ئەگەر زیانێك بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگات ، ئێوە هیچ بیانوویەکتان بەلای خواوە نابێ . ئیتر گیانی دەرچوو .

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ناو کوژراوەکان‌دا ئەگەڕا ، هەوڵی دا حەمزەی مامیشی بدۆزێتەوە .. دوای گەڕان لە دۆڵی قەنات‌دا دۆزیەوە ، ئەبینێ کافرەکان جەستەیان تێك داوە . سکیان هەڵ دڕیوە و جگەریان دەرهێناوە و لووت و گوێیان بڕیوە . ئەمەش تەنها بۆ دەست هێنان بە دڵیانا .. بە ڕاستیی دیمەنێکی سامناك بوو و ، ئێشی زۆری بە دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیاند .

بەڵێ حەمزە خوا لێی ڕازیی بێ مامەی پێغەمبەری خوا و برای شیرییشی بوو .. پیاوێکی وەها پاڵەوان بوو کە لە جەنگ‌دا لە جێی هەزاران جەنگاوەر دائەنرا .. خاوەنی غیرەت و مەردایەتیی و جوامێریی بوو .. لە کاتی گەرم بوونی جەنگ‌دا کۆمەك و پشتیوانی موحەممەدی برازای بوو .. ئەو ڕۆژەش ئەو شەهید کرا ، ئیسلام زۆر پێویستی بە پاڵەوانێکی وەها دڵسۆز و خەم خۆر هەبوو ، چونکە ئیسلام ئەو کاتە خاوەنی سوپایەکی ساوای کەم تفاق بوو . بۆیە بە شەهیدبوونی حەمزە زیانێکی زۆر گەورە لە موسڵمانان کەوت و ، خەم و خەفەتی زۆریشی بە دڵی ئازیز گەیاند .

کاتێك کە بەو شێوازە چاوی پێ کەوت فەرمووی : (( لن أصاب بمثلك أبداً ، وما وقفت قط موقفاً أغيظ علي من هذا )) . فەرمووی : هەرگیز موسیبەتێکی تری وەك تۆم نایەتە ڕێ و ، تا ئێستەش هەڵوێستێکی تری وەها ، کە زۆرم پێ ناخۆش بێ، نەهاتۆتە ڕێم . پاشان فەرمووی : (( ولئن أظهرني الله على قريش في موطن من المواطن لأمثلنَّ بثلاثين رجلاً منهم مكانك )) . فەرمووی : ئەگەر خوا لە شوێنێك بەسەر قوڕەیش‌دا زاڵی کردم ئەبێ لە بریی تۆ لووت و گوێی سیی پیاویان بېڕم ..

موسڵمانەکانیش کە دیيان وا شەهیدەکانیان لووت و گوێیان بڕاوە و ، خەفەتی یەکجار زۆری پێغەمبەری خوایان ﷺ بۆ حەمزەی مامی بینیی ، وتیان :

ئەگەر رۆژێك لە رۆژان خوای گەورە دەسەلاتی داین بەسەریاندا ئەبێ بە شێوەیەك جەستەیان بشێوێنین تا ئێستە هیچ عەرەبێك وەها نەی‌شێواندبێ .

پێغەمبەری خوا ﷺ بەو هەموو ئارام و لێ بوردەیی‌یەیەوە و ، هاوەلان بەو هەموو دڵ پاکی‌یانەوە ، کارەکەیان بەلاوە سەخت بوو ، شەهیدبوونی هاوەڵانیان لە یاد چوو بوو .. شێواندنی جەستەی مردوو کەی کاری مرۆڤی مەردە ؟ لە داخانا ئەو بڕیارە ناهەموارەیان دا ..

بەڵام ئیسلامی بێ‌گەرد کە دینی خوایە و ، قورئانی پیرۆز کە فەرمایشتی خوایە ئەو هەڵوێستەیان نیە .. دینی خوا عەدالەتی ئەوێ .. چاکەی ئەوێ .. ئارامی ئەوێ .. چاوپۆشیی و لێبووردنی ئەوێ .. بۆیە ئەوەندەی پێ نەچوو وەحی بۆ ئازیز هات و کۆمەڵی ئیمان‌داری ئاگادار کرد کە ئەگەر تۆڵە ئەسێنن نابێ زیادەڕەویی بکەن و دەست‌درێژیی بکەن ، خۆ ئەگەر چاوپۆشییش بکەن ئەوە چاکترە .. وا چاکە ئیمان‌داران ئارام بگرن و خەمبار و دڵتەنگ نەبن کاتێ کە دوژمنان فێڵیان کرد . خوای گەورە وا لەگەڵ ئەوانەدا کە تەقوایان هەیە ، کە ئەفەرموێ :

﴿ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾ ( النحل : ١٢٦ - ١٢٨ ) .

کە ئەم ئایەتە پیرۆزانە هاتنە خوارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لەو رایەی خۆی هێنا و بڕیاری دا چاوپۆشیی لەو کردەوە ناشیرینەی قوڕەیش بکات ، چونکە ساڵەهای ساڵە قوڕەیش هەڵوێستی خوار و خێچی گرتۆتە بەر و ، هەموو خراپەیەکی بەرامبەر بە موسڵمانان ئەنجام داوە و ، مەگەر بە موسڵمان‌بوون ئەندامانی دەست‌بەرداری کاری ناشیرین بن .. بەڵێ چاوپۆشیی لێ کردن و ، بۆ فەرمانی خوا گوێڕایەڵیی کرد و ، کەففارەتی سوێندەکەشی دا و ، شێواندنی جەستەی مردووی قەدەغە کرد ..

ئیبن ئیسحاق بە سەنەدی خۆی لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەر شوێنێك‌دا دانیشتبێ بەرلەوەی لەو

شوێنەدا هەستێ فەرمانی بەسەرماندا ئەدا کە صەدەقە بکەین و ، لە شێواندنی جەستەی مردووش قەدەغەی ئەکردین .

لەو کاتەدا صەفیەی کچی عەبدولموطەللیب ( کە پووری پێغەمبەری خوا و خوشکی حەمزەی شەهید بوو ) هات و بە دوای براکەی‌دا ئەگەڕا و ، بیستبوویشی کە چیی بەسەر هاتووە . پێغەمبەری خواش ﷺ ئەی‌زانیی صەفیەی پووری چەندە حەمزەی خۆش ئەوێ ، لەبەر ئەوە ترسا کە ئەگەر حەمزە بەو حاڵەوە ببینێ بەرگە نەگرێ و تێك بچێ ، بۆیە فەرمانی بە زوبەیری کوڕی عەووامی کوڕی‌دا دا تا بکاتە کارێ دایکی بگەڕێتەوە دوا و ، جەستەی براکەی بەو شێوە شێواوییە نەبینێ .

زوبەیر چووە بەردەمی دایکی و پێی وت : دایە گیان ! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی وەهایە کە بگەڕێیتەوە دوا .

وتی : جا بۆچ ؟ بیستوومە کە جەستەی براکەم شێوێنراوە . ئەوەش لە پێناوی خوادا . ئای کە بەو کارە چەندە ڕەزامەندییمان هەیە . ئەگەر خوای گەورە بیەوێ داوای پاداشت لە خوا ئەکەم و ئارام ئەگرم .

زوبەیر گەڕایەوە خزمەتی پێغەمبەر و هەواڵەکەی صەفیەی دایکی پێ گەیاند ، ئەویش فەرمانی دا وازی لێ بهێنێ . صەفیە بەرەو پێغەمبەری خوا ﷺ هات و ، کە بینیی فەرمووی : (( إني أخاف على عقلها )) . فەرمووی : ئەترسم تێك بچێت . کە گەیشتە لای دەستی خستە سەر سنگی ( لەبەر ئەوەی کە پووری بوو ) و دوعای خێری بۆ کرد ، ئەویش ( إسترجاع ) ی وت و دەستی بە گریان کرد .

زوبەیری کوڕی بەزەیی پیایا ئەهاتەوە ، بۆیە هەوڵی ئەدا چاوی بە حەمزە نەکەوێت ، چونکە تەمەنی زۆر بوو و بە ساڵدا چوو بوو . کەچیی صەفیە کۆڵی نەدا و وتی : ناگەڕێمەوە هەتا سەیری نەکەم . کە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا سەیری بکات ، بەستەزمانە چاوی بە دیمەنێکی یەکجار سامناك کەوت .. ئەبینێ وا برای ئازیز و خۆشەویستی و پاڵەوانی لاوچاك لە خۆڵ گەوزاوە و ، بە دەستی نەفامان جەستەی شێواوە .. فرمێسك بە خوڕ لە چاوی صەفیە هاتنە خوارەوە و ، بە کوڵ گریا و دەوروبەریشی هێنایە گریان ، پاشان بە هێمنیی و دامەزراوییەوە داوای لێخۆش‌بوونی لە خوا بۆ براکەی کرد و گەڕایەوە دوا .. هەڵوێستەکەی ئەوەندە کاریگەر بوو پێغەمبەریشی هێنایە گریان .

ئیبن مەسعوود وتوویە : نەمان‌دیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە گریان بۆ حەمزە زیاتر بگرییێ . ئەوەبوو لای قیبلەوە دای‌نا و ، خۆیشی لەسەر جەنازەکەی وەستا و، دەستی بە گریان کرد و هەنیسکیشی ئەدا .[٤٠٧]

**نۆزدەهەم : کۆکردنەوەی شەهیدەکان و ناشتنیان :**

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا شەهیدەکان کۆبکەنەوە و بیان‌نێژن . بەلاّم لە فەرموودەی صەحیح‌دا وەها هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر هیچ شەهیدێکی جەنگ نوێژی نەکردووە ، نە لە ئوحود و نە لە غەیری ئەویش‌دا . بەڵکو فەرمانی ئەدا کە شەهید بە جل و بەرگی خۆیەوە بنێژرێ ، بەبێ شتن و بەبێ نوێژ .

ئیمام شافیعیی خوا لێی رازیی بێ ریوایەتی لەو بارەوە بە پلەی موتەواتیر پێ گەیشتووە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کوژراوانی ئوحود نەکردووە .

ئەوەش کە ریوایەت کراوە کە گوایا پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەریان کردووە و ، حەفتا تەکبیری بەسەر حەمزەوە فەرمووە ، صەحیح نیە .

لە صەحیحی بوخارییش‌دا ئەوە چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە شەهیدانی ئوحود بە خوێنەکەیانەوە بنێژرێن ، جا نە نوێژی لەسەر کردن و ، نە شۆرایشن . فەرمانیشی داوە کە جل و بەرگەکەیان بکرێتە کەفەنیان . ئیتر ئەوەبوو چیی زرێ و پێست بوو لەبەریان داماڵرا و جل و بەرگەکەیان کرایە کەفەنیان ، تا خوێن و زامەکانیان لە رۆژی قیامەت‌دا شاهێدی‌یان بۆ بدەن .

بەلاّم لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم‌دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ، وەك خواحافیزیی‌کردنێك لە موسڵمانەکان ، بە مردوو و زیندوویانەوە ، دوای جەنگی ئوحود بە چەند ساڵێك نوێژی لەسەر کردوون . پاشان دێتە سەر مینبەر و ئەفەرموێ : (( إني بين أيديكم فَرَط ، وأنا عليكم شهيد ، وإن موعدكم الحوض ، وإني لأنظر إليه من مقامي هذا ، وإني لست أخشى عليكم أن تشركوا ، ولكن أخشى عليكم الدنيا أن تتنافسوها )) . ئەفەرموێ : من پێشتان ئەکەوم و ، لەسەریشتان شاهێدم و ، شوێنی بە یەك گەیشتنیشمان سەر حەوزەکەمە و ، ئێستا لەم

---

[٤٠٧] غزوة أحد : ٢١١ _ ٢١٨ ، الرحيق المختوم : ٢٨٤ _ ٢٨٦ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٠٧ _ ٢٠٨ ، ٢١١ _ ٢١٢ .

شوێنەمەوە چاوم لێ یەتی . من لێتان ناترسم شەریك بۆ خوا بڕیار بدەن ، بەڵكو ئەترسم لە نێوان خۆتاندا بۆ دەستخستنی دنیا بەرابەركێ بكەن ..

راویی ئەڵێ : ئەوە دواجارم بوو تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بكەم . بۆ ئەو فەرموودەی سەرەوە هەندێ لە فەقیهەكان شەرعی یەتیان بە نوێژی سەر جەنازەی شەهیدی جەنگ داوە . بەڵام جومهوور رایان وایە كە ئەوە نوێژ نەبووە ، بەڵكو دوعا و پاڕانەوە بووە . یان ئەوە یەكێكە لە تایبەتمەندی یەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ .

حەمزەش بە قوماشێكی خۆی كەفەن كرا ، كە ئەگەر رایان ئەكێشا هەتا سەری پێ داپۆشن ، قاچی دەرئەكەوتن و ، گەر راشیان ئەكێشا بۆ داپۆشینی قاچی سەری دەرئەكەوت . ناچار رایان كێشا تا سەری داپۆشن و بە گەڵای گووژاڵك قاچیان داپۆشیی .

عەبدوررەحمانی كوڕی عەوف ئەڵێت : موصعەبی كوڕی عومەیر كوژرا ، كە لە من چاكتر بوو و ، بە عەبایەك كەفەنیان بۆ كرد كە ئەگەر ئەدرا بە سەریدا قاچی دەرئەكەوتن ، ئەگەر قاچیشی پێ دائەپۆشران ، سەری دەرئەكەوت . سەرەنجام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان ئەدا سەری بە قوماشەكە داپۆشن و بە رووەكی ئیزخیر هەردوو قاچی داپۆشن .

گەڕان بە دوای جەستەی حەنظەلەدا ، سەیریان كرد لەلایەكەوە لەسەر زەویی دانراوە و ئاوی لێ ئەچۆڕێ . پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی بە هاوەڵانی دا كە مەلائیكەت ئەیشۆن . كە پرسیاریان لە هاوسەرەكەی كرد ، پێی راگەیاندن كە زاوا بووە و خۆی نەشۆردووە و ، رای كردووە بە دەم بانگەوازی جیهادەوە . بۆیە ناونراوە (( غسیل الملائكة )) .

لەلایەكی ترەوە ئەوە كەوتە گوێی پێغەمبەری خوا ﷺ كە هەندێ لە شەهیدەكان براونەتەوە بۆ مەدینە ، ئەویش فەرمانی دا كە بیانهێننەوە بۆ مەیدانی جەنگ و لەوێ بیاننێژن .

ئیمام ئەحمەد لە جابیری كوڕی عەبدوڵڵاوە خوا لێیان رازیی بێ ئەگێڕێتەوە كە وتوویە : باوكم لە ئوحوددا شەهید بوو و ، خوشكەكانیشم منیان بە وشترێكەوە نارد بە دوایدا و وتیان : بڕۆ باوكت بخەرە سەر پشتی ئەم وشترە و ، لە قەبرستانی نەوەی سەلیمەدا بینێژە . ئەڵێ : منیش لەگەڵ چەند كەسێكی یارمەتییدەرمدا

هاتم بە دوایا . ئەم دەنگ و باسە ئەگاتەوە بە پێغەمبەری خوا کە لە ئوحود دانیشتبوو . ئەوەبوو بانگی کردم و فەرمووی : (( والذي نفسي بيده لا يدفن إلا مع إخوانه )) . فەرمووی : بەو خوایەی کە گیانمی بە دەستە ئەبێ لەگەڵ براکانیدا بنێژرێ .

ئەوەبوو لەگەڵ هاوەڵانیدا نێژرا .

هەروەها لە جابیرەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : لە کاتێکدا کە منیش وەك خەڵکەکە سەیرم ئەکرد ، ئەبینم وا پوورم ( خوشکی باوکم ) هات کە باوکم و خاڵمی پێ بوون و ، ئەمدیو و ئەودیو خستبوونیە سەر وشترێك ، هێنانیەوە بۆ مەدینە تا لە قەبرسانەکانماندا بیاننێژێ . ئەبینم پیاوێك گەیشت و جاڕی ئەدا : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانتان بەسەردا ئەدات کە جەستەی شەهیدەکان بگێڕنەوە دوا و ، لە شوێنی شەهیدبوونیاندا بیاننێژن . ئێمەش گێڕانمانەوە دوا و ، لە کوێ شەهید بووبوون لەوێ ناشتنمان .

جا لەبەر ئەوەی شەهیدەکان زۆر بوون و ، موسڵمانەکانیش تەواو ماندوو و هیلاك و زامدار بوون و ، ڕۆژیش زۆری نەمابوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا کە شەهیدەکان دوو دوو ، کێ لەگەڵ کێدا خۆشی هاتووە ، بخرێنە قەبرەوە .

ئەوەبوو حەمزە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی خوشکەزای [٤٠٨] خرانە قەبرێکەوە .

بە تایبەتییش پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش بوو عەمری کوڕی جەمووح و [٤٠٩] عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرامی زاوای کە لە دنیادا زۆر دڵسۆزی یەك بوون ، لە قەبرێك دا بنێژرێن . [٤١٠]

---

[٤٠٨] عەبدوڵڵای کوڕی جەحش ، دایکی ئومەیمەی کچی عەبدولموطەللیب بووە کە ئومەیمە خوشکی حەمزە بووە . ئەوەی کە لە ڕۆژی ئوحوددا عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی کوشت ئەبولحەکەمی کوڕی ئەخنەسی کوڕی شەریق بوو . ئەوەبوو لە جەنگی بەدردا ئەخنەس یەکەم کەس بوو کە دژی ڕای ئەبوجەهل وەستا و بڕیاری دا جەنگ نەکات و ، بە خۆی و بە هۆزی نەوەی زوهەرەوە لە ( رابغ ) گەڕایەوە بەرەو مەککە و یەك پیاوی زوهەریی بەشداریی بەدری نەکرد .. ئەوەبوو ئەو ئەبولحەکەمە هەر لە جەنگی ئوحوددا بە کافریی کوژرا .

[٤٠٩] عەمری کوڕی جەمووحی کوڕی زەیدی کوڕی حەرام یەکێکە لە سەردارانی ئەنصار و ، دوا ئەنصاریشە کە موسڵمان بووبێ . پیاوێکی ناودار بووە و زۆر دەست گوشاد و سەخیی تەبیعەت بووە . لە چۆنیەتیی موسڵمان بوونی ، لە پێشەوە شتێکمان باس کردووە و ، بە ئاواتی شەهیدیی بوو ، تا خوا بە سۆز و میهرەبانیی خۆی خەڵاتی کرد ..

[٤١٠] عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرامی کوڕی ثەعلەبەی ئەنصاریی ، خەزرەجیی ، سەلیمیی باوکی جابیر بووە . زوو بە زوو لەگەڵ ئەهلی مەدینە موسڵمان بووە . بەشداریی پەیمانی عەقەبەی کردووە و ، یەکێکیش بووە

هەروەها موصعەبی کوڕی عومەیر و سەعدی کوڕی ڕەبیع ، لە ڕیوایەتێکی تردا خاریجەی کوڕی زەید و [٤١١] سەعدی کوڕی ڕەبیع و، نوعمانی کوڕی مالیك [٤١٢] و بەندەکەی نەوەی حەسحاس پێکەوە نێژران .

پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئاگاداری ناشتنی شەهیدەکان بوو و ، ئەی فەرموو : (( احفروا وأوسعوا ، واجعلوا الرجلين والثلاثة في القبر الواحد )) . ئەیفەرموو : قەبرەکان با فراوان بن . دوو پیاو و سێ پیاو بخەنە قەبرێکەوە . ئەشیفەرموو : (( انظروا أكثر هؤلاء جمعاً للقرآن فاجعلوه أمام أصحابه في القبر )) . ئەیفەرموو : سەرنج بدەن بزانن ئەوانە کامیان قورئانی زیاتری لەبەرە بیخەنە پێش هاوەڵەکانییەوە .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ شاهێدیی دا کە شەهیدەکان لە ڕۆژی قیامەتدا بەو حاڵەوە زیندوو ئەبنەوە کە پێوەی نێژراون ، بەبێ ئەوەی ئاڵ و گۆڕیان بەسەردا بێت ..

ئیبن ئیسحاق وتوویە : لە ڕۆژی ئوحوددا کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری شەهیدەکانی کرد ، فەرمووی : (( أنا شهيد على هؤلاء ، إنه ما من جريح في الله إلا والله يبعثه يوم القيامة يدمي جرحه .. اللون لون دم والريح ريح مسك )) . ئەفەرموێ : من لەسەر ئەمانە شاهێدم .. هەر کەس لە پێناوی خوادا زامدار بوو

---

لەو دوانزە نەقیبەی کە لە بریی خزمەکانیان پەیمانەکەیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بەستووە . عەبدوڵلا بەشداریی بەدری کردووە . ئەو پیاوە دڵسۆزە بوو کە سەر لە بەیانی ڕۆژی ئوحود ئامۆژگاریی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی سەرۆکی مونافیقان و دەستە مونافیقەکەی کرد تا پشت لە پێغەمبەری خوا نەکەن . کە ڕۆژی ئوحود شەهید بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی فەرمووی : (( ما زالت الملائكة تظلله بأجنحتها )) . فەرمووی : هێشتا مەلائیکە بە باڵەکانیان سێبەری بۆ ئەکەن .

[٤١١] خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ئەبوزوهەیری ئەنصاریی خەزرەجیی ، هاوەڵێکی پایەدارە و ، بەشداریی بەدری کردووە . خەزووری ئەبوبەکری صدیق بووە . خاریجە یەکێ لە پاڵەوانە جەنگاوەرەکان بووە .. لە ڕۆژی ئوحوددا لە هەموو لایەکەوە ڕمیان ئاراستە کرد ، تا ئەوەبوو لە دە و ئەوەندە شوێنەوە زامدار بوو . لەو کاتەدا صەفوانی کوڕی ئومەییە دای بە لایا و خاریجەی ناسیەوە و ، هەڵمەتی دایە سەری و شەهیدی کرد و پاشان ئەیوت : ئێستە دڵم حەسایەوە کە هاوەڵە پایەدارەکانی موحەممەدم کوشتوون .. خاریجەی کوڕی زەید و ، ئەوسی کوڕی ئەرقەم و ، ئەبونەوفەلم کوشتوون ..

[٤١٢] نوعمانی کوڕی مالیکی کوڕی ثەعلەبەی ئەنصاریی خەزرەجیی ، هاوەڵێکی پایەداری بەدرە . ئەم هاوەڵە بوو کە بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت : بەخوا ئەچمە بەهەشتەوە . فەرمووی : (( بِمَ ؟ )) . فەرمووی : بە چیی ئەچیتە بەهەشتەوە ؟ وتی : بەوە ئەچم کە من شاهێدیی ئەدەم کە جگە لە زاتی (( الله )) پەرستراوێکی تر نیە و ، تۆش پێغەمبەری خوایت و ، لە ڕۆژی نەبەردیشدا پشت هەڵ ناکەم . فەرمووی : (( صدقت )) .

بێت ئەوا کە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا زیندووی ئەکاتەوە زامەکەی خوێنی لێ دێ ، ڕەنگی ڕەنگی خوێنە و ، بۆنیشی بۆنی میسکە .

سالاَن تێپەڕین و ئەم بەڵێنەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دیی و بۆ خەڵك سەلما.

ئەبوداود و نەسسائیی و تیرمیذیی لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاَوە خوا لێیان ڕازیی بێ ڕیوایەتیان کردووە کە وتوویە :

لە سەردەمی خەلافەتی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیاندا بووم ، پیاوێك هاتە لام و وتی : ئەی جابیری کوڕی عەبدوڵلاَ ! بەخوا کاربەدەستانی موعاویە دەستکاریی قەبرەکەی باوکتیان کردووە و هەندێکی دەرکەوتووە . منیش هاتم بۆ لای ئەبینم بەو شێوەیە کە ناشتوومە و نەگۆڕراوە .

هەروەها بەیهەقییش لە جابیرەوە ڕیوایەتی کردووە و وتوویە : کە دوای چل ساڵ موعاویە لە نزیك کوژراوانی ئوحودەوە کانیی لێ دا و ئاوەکە هات بەسەریاندا ، کە هەواڵمان زانیی هاتین بە لایانەوە و دەرمان هێنان . ئەوەبوو خاکەنازەکە بەر قاچی حەمزە کەوت خوێنی لێ دەرپەڕیی . لە ڕیوایەتەکەی ئیبن ئیسحاقدا ئەڵێ : دەرمان هێنان ، هەروەك دوێنێ نێژرابن .

هەروەها واقیدییش لە جابیرەوە ڕیوایەتی کردووە : کە قەبرەکانمان هەڵ دانەوە ، ئەبینم باوکم وا لە قەبرەکەیدا هەر وەك بە شێوەی خۆی خەوتبێ و ، ئەبینین وا عەمری کوڕی جەمووحی دراوسێشی وا لە قەبرەکەیدا و ، دەستی لەسەر زامەکەی داناوە ، کە دەستی لابرا خوێنی لێ دەرپەڕی .. ئەڵێن : بە وێنەی بۆنی میسك بۆنی خۆش لە قەبرەکانیانەوە هاتووە ، ئەمەش دوای چل ساڵ لە ناشتنیان ، خوا لە هەموویان ڕازیی بێ .

لە ( الموطأ ) یشدا بەم شێوە هاتووە : ئەوەبوو هەردوو ئەنصاریی عەمری کوڕی جەمووح و عەبدوڵلاَی کوڕی حەرام لافاو قەبرەکەیانی دڕیی بوو ، چونکە قەبرەکەیان لە قەراغی چەمەکەدا بوو و ، هەردووکیشیان لە یەك قەبردا نێژرا بوون و ، ڕۆژی ئوحود شەهید بووبوون . قەبرەکەیان هەڵ درایەوە تا بگوازرێنەوە ، ئەبینن هیچ نەگۆڕاون ، هەروەك دوێنێ نێژرا بن . ئەوەبوو یەکێکیان زامدار بووبوو و دەستی لەسەر زامەکەی دانا بوو و ، هەر بەو شێوەشەوە نێژرا بوو ، کە دەستی لەسەر زامەکەی لادرا و وازی لێ هێنرا

گەڕایەوە شوێنی خۆی . بە مەرجێ ماوەی نێوان جەنگی ئوحود و ئەو قەبر هەڵدانەوەیە چل و شەش ساڵ بوو .

لەبەر ئەوەی کە شەهیدانی ئوحود خاوەنی پایە و پلەیەکی بەرزن و ، لە پێناوی خوادا خۆیان بەخت کردووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لێ ئەدان و سەلامی لێ ئەکردن و ئەیفەرموو : (( سلام عليكم بما صبرتم ، فنعم عقبى الدار )) . ئەبوبەکریش و عومەریش و عوثمانیش خوا لێیان رازیی بێ لە سەردەمی خەلافەتی خۆیاندا سەردانیان ئەکردن و سەلامیان لێ ئەکردن .

واقیدییش ئەوەی گێڕاوەتەوە کە خاتوو فاطیمە و ، سەعد و ، ئەبوسەعیدی خودریی و ، ئەبوهورەیرە و ، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و ، ئوم سەلەمە ، خوا لێیان رازیی بێ ، سەردانی شەهیدانی ئوحودیان ئەکرد ..

پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پایە و پلەی بەرزی ئەو شەهیدانەی کردووە کە لە مەیدانی جەنگی کافراندا سەر ئەنێنەوە .

ئیبن عەبباس خوا لێیان رازیی بێ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ریوایەتی کردووە کە فەرموویە : (( لما أصيب إخوانكم بأحُد جعل الله أرواحهم في أجواف طير خضر ، ترد أنهار الجنة وتأكل من ثمارها ، وتأوي إلى قناديل من ذهب معلقة في ظل العرش ، فلما وجدوا طيب مشربهم و مأكلهم وحسن مقيلهم ، قالوا : يا ليت إخواننا يعلمون ما صنع الله بنا ، لئلا يزهدوا في الجهاد ولا ينكلوا عن الحرب . فقال الله عزوجل : أنا أبلغهم عنكم )) .. فەرموویە : کاتێك کە براکانتان لە ئوحوددا شەهید کران ، خوای گەورە رۆحی هەر یەکەیانی خستە ناو سکی باڵندەی سەوزەوە و ، ئەوانیش ئەهاتنە سەر رووبارەکانی بەهەشت و ئاویان ئەخواردەوە و ، لە بەرووبومی بەهەشتیان ئەخوارد و ، ئێوارانیش ئەگەڕانەوە بۆ ناو چرای لە زێڕ دروست کراو و بە عەرشدا هەڵواسراو . ئەو بەهەشتیانە کاتێ کە خواردن و خواردنەوەی چاك و شوێن و مەنزڵی خۆشی خۆیانیان دیی ، وتیان : خۆزگە براکانمان ئەیانزانیی خوای گەورە چۆن پاداشتی چاکەی ئێمەی داوەتەوە ، تا لە جیهاد و جەنگی کافراندا نوشوستیی و نوکوولیی نەکەن . خوای گەورەش فەرمووی : من لە بریی ئێوە ئەو هەواڵەیان پێ ئەگەیەنم . ئەوەبوو خوای گەورە قورئانی پیرۆزی دەربارەی ئەوە نارده خوارەوە :

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٦٩ ـ ١٧٠ ) .

ئەم مژدەیە بۆ ئەوانەیە کە بە پاکیی و دڵ پڕ لە ئیخلاصەوە لە ڕێی خوادا ئەجەنگن و سەرەنجام شەهید ئەبن . بەڵام هەرکەسێ بە نییەتێکی ترەوە خۆی بە کوشت بدات ئەوە بە شەهید ناژمێرێ . بۆ ئەمە دوو نموونەمان هەیە :

یەکێکیان ( قوزمان ) ە کە عەرەبی مەدینە بوو و ، پاڵەوانێکی کەم وێنە بوو و ، ڕۆژی ئوحود پاڵەوانانە جەنگی کرد و ، بە تاقی تەنیا یانزە کەس لە کافرانی کوشت ، کە پێنجیان هەڵگرانی ئالاَی قوڕەیش بوون لە نەوەی ( عەبدوددار ) .

پێش دەستپێکردنی جەنگ هەرچیی باسی ئەو پیاوە بۆ پێغەمبەر ﷺ بکرایە ئەیفەرموو : (( إنه من أهل النار )) . ئەیفەرموو : دۆزەخی یە .

سەرەنجام قوزمان لەو جەنگەدا چەند زام کرایە لاشەیەوە . ئەوەبوو هەڵیان گرت و بردیانە ماڵەوە و ، موسڵمانان سەریان لێ ئەدا و ئەیان وت : مژدە بێ قوزمان . ئەیوت : مژدەی چییم لێ بێ ؟ من بۆ بەرگریی لە شەرەف و مەردایەتیی خزمەکانم جەنگاوم .

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە قەتادە خوا لێی ڕازیی بێ بە قوزمان ئەڵێ : شەهیدبوونت لێ پیرۆز بێت . وەڵامی دایەوە : بەخوا من ، ئەی باوکی عەمر ! لە پێناوی دیندا نەجەنگاوم . بۆ ئەوە جەنگاوم کە قوڕەیش نەیەت و پێ نەخاتە سەر خاکمان .

کاتێك کە زامەکان زۆریان بۆ هێنا خۆی کوشتەوە . ئەوەبوو لە تیردانەکەیدا تیرێکی دەرهێنا و شادەماری قۆڵی خۆی پێ بڕیی و ، خوێنی لێ ئەڕۆیشت هەتا مرد ..

کە ئەم پیاوە ئازایە بەم شێوەیە سەری نایەوە ، پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : شاهێدیی ئەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت . فەرمووی : چیی بووە ؟ وتی ئەو پیاوەی کە لەوە و پێش ناوت برد کە دۆزەخی یە، لە سەرەمەرگیدا وەهاو وەهای کردووە ...

دەربارەی پیاوێك کە بۆ دەربڕینی ئازایەتیی جەنگ بکا و ، پیاوێکیش بۆ بەرگریی لە خۆی و کەس و کاری جەنگ بکا و ، پیاوێکیش بۆ ریا و خۆدەرخستن جەنگ بکات ، کام لەمانە لە پێناوی خوادایە ؟

فەرمووی: (( مَن يقاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله )) . فەرمووی: هەر کەسێ بۆ بەرزکردنەوەی فەرمایشتی خوا بجەنگێ ، ئەوە لە پێناوی خوادایە .

نموونەی دووهەمیش پیاوێکی عەرەبە کە شوێنکەوتەی دینی جوولەکە بوو ، بە ناوی موخەیریق ، کە ئەیزانیی لەسەر جوولەکەکانی مەدینە پێویستە کۆمەکیی سوپای ئیسلام بکەن دژی سوپای قورەیش ، بە بۆنەی ئەو پەیمانەوە کە لە نێوان موسڵمانەکان و جوولەکەدا مۆر کراوە .

موخەیریق داوای لە جوولەکە کرد کە چەك هەڵ گرن و لەگەڵ موسڵمانەکاندا بچن بە گژی سوپای مەککەدا ، کەچیی جوولەکە ئەوەیان کردە بیانوو کە ئەمڕۆ شەممەیە و ، ئەوان جەنگی تیا ناکەن . خۆی چەکی هەڵ گرت و دەستی بە جەنگ کرد هەتا کوژرا .

کە هەواڵی کوژرانی موخەیریق گەیشتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( مخيريق خير يهود )) .

موخەیریقیش پێش کوژرانی وەسیەتی کرد و وتی : ئەگەر کوژرام چیی ماڵ و سامانم هەیە بۆ موحەممەد چیی لێ ئەکات با بیکات . جا سوهەیلیی ئەوەی باس کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ماڵ و سامانەی موخەیریقی کردە وەقف بۆ موسڵمانان لە مەدینەدا ، کە بریتیی بوو لە حەوت باخ .

هێشتا ئەم پیاوەش بە شەهید لە قەڵەم نەدراوە ، چونکە بە پێی فەرمانی قورئان بۆ خوا نەجەنگاوە ، بەڵکو وەك جوولەکەیەکی خاوەن بەڵێن کوشتاری کردووە .

کەچیی پیاوێکی تر لە نەوەی عەبدولئەشهەل ، کە ئوصەیرم ی پێ ئەوترا ، یەکجار لە ئیسلام بێزار بوو و ، گاڵتەی بە خزمەکانی ئەکرد کە شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبوون و ، هەروا لەسەر شیرك مابۆوە و ، قەناعەتی بە ڕێبازی ئیسلام نەبوو ، هەتا کە ڕۆژی ئوحود هاتە بەرەوە ، هەر ئەو ڕۆژە هیدایەتی خوایی بۆ هات و ، دەستی دایە شمشێرەکەی و ڕمەکەی هەڵ گرت و ، بەبێ ئەوەی هیچ کەس بە کارەکەی بزانێ ، بەرەو مەیدانی جەنگ کەوتە ڕێ . ئەو

ڕۆژە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ جەنگێکی پاڵەوانانەی کرد هەتا زامەکان زۆریان بۆ هێنا و سەری نایەوە و ، بێ ئەوەی نوێژێك یان ڕۆژوویەك بەجێ بهێنێ گەیشتە بەهەشت .

لە کۆتایی جەنگدا خزمەکانی لە نەوەی عەبدولئەشهەل بەناو کوژراو و زامدارەکاندا ئەگەڕان ، چاویان پێی کەوت . وتیان : بە خوا ئەمە ئوصەیرمە ، چۆن گەیشتۆتە ئێرە ؟ خۆ ئەو بڕوای بەم کارە نەبوو . ئەوەبوو پرسیاریان لێ کرد و وتیان : ئەی عەمر ! ( ناوی عەمری کوڕی ثابیتی کوڕی وەقش بوو ) چیی تۆی گەیاندۆتە ئێرە ؟ ئایا بۆ بەرگریی لە خزمەکانت ، یان حەزت لە ئیسلامە ؟ وتی : بەڵکو حەزم لە ئیسلامە ، ئیمانم بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی هێناوە و ، موسڵمان بووم و ، دەستم داوەتە شمشێرەکەم و ، هاتوومەتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، دەستم بە کوشتار کردووە ، هەتا ئەمەم بەسەر هاتووە .

ئیتر ئەوەندەی پێ نەچوو لەبەر دەستیاندا کۆچی دوایی کرد . کە باسیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد فەرمووی : (( إنه لمن أهل الجنة )) . فەرمووی: بەهەشتیە.

ئەبوهورەیرەش دەربارەی ئوصەیرم ئەیوت : باسی پیاوێکم بۆ بکەن کە نوێژێکی بەجێ نەهێناوە و چۆتە بەهەشتەوە .[٤١٣]

**بیستەم : گەڕانەوەی سوپای ئیسلام بۆ مەدینە :**

دوای تەواوبوونی جەنگ و گەڕان بە دوای زامدار و شەهیدەکاندا ، شەهیدەکان بە خاك سپێرران و زامدارەکانیش دەرمان کران . بەڵێ قوڕەیش لەو ناوە نەوەستا ، خێرا کشایەوە دوا و لە خوای ئەویست لە دەست موسڵمانەکان دەرباز بێت . موسڵمانەکان ئەگەرچیی شەهیدی زیاتریان دا ، بەلام لە سەرەتای جەنگ و لە کۆتایی جەنگدا مەیدان بە دەستی موسڵمانەکانەوە بوو .. دوای ئەوە هەمووی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا سوپا بەرەو مەدینە بگەڕێتەوە و ، کۆمەکیی زامدارەکان کرا تا لە پێش سوپاوە بگەنەوە شار . دوای ئەوانیش سوپا کەوتە ڕێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشی پێشەوەدا بوو و ، فەرماندە ناودارەکانی ئەنصار و موهاجیرەکان دەورەیان دابوو .

---

[٤١٣] غزوة أحد : ٢١٨ ـ ٢٣٤ ، الرحيق المختوم : ٢٨٥ ـ ٢٨٧ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢١٥ ـ ٢١٦ .

بە رواڵەت سوپای ئیسلام جەنگی نەبردۆتەوە ، بەڵام کە دانیشتوانی شار هاتن بە پیری پێغەمبەر و سوپا خواناسەکەیەوە ، ئەوپەڕی مژدەی سەرکەوتن بوو .. خەڵکی مەدینە هاتن بە پیریانەوە کە هەموو جووڵە و وتەیەکیان سەرکەوتنی ئیمانی تیا بەدیی ئەکرا .. دیار بوو ئیسلام بە تەواوەتیی دڵ و دەروونی ئەو خەڵکەی پەروەردە کردبوو ، هەرچەند دوو سێ ساڵێك بوو ئیسلام هاتبووە ناویان .. دەرئەکەوت کە چەندە خوا و پێغەمبەریان خۆش ئەوێن ، بە رادەیەك هەر تەنها سەلامەتیی پێغەمبەری خوایان ﷺ ئەویست .

گەورە و بچووکی شار هاتبوونە دەرەوەی شار تا لە سەلامەتیی ئازیز ئاگادار بن و هەواڵی کەس و کاریان بزانن .. بزانن گەڕاونەتەوە یان شەهیدییان خەڵات کراوە !!

یەکێ لەوانەی کە هاتنە پێشوازیی سوپای ئیسلام ئافرەتێکی نەوەی دینار بوو کە لە جەنگی ئوحوددا باوك و برا و مێرد و کوڕی شەهید بووبوون . کاتێك کە شەهیدبوونی ئەو چوار کەسەی درا بە گوێیا زۆر بەلایەوە گرنگ نەبوو ، چونکە بۆ سەلامەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ وەها شڵەژا بوو ، ئەو موسیبەتە گەورەی لە یاد کردبوو ، بۆیە پرسیی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چیی بەسەر هات ؟ وتیان : دایکی فلان ! ئەو باشە و ، سوپاس بۆ خوا بەو جۆرەیە کە تۆ پێت خۆشە . جا بۆ ئەوەی دڵی ئاو بخواتەوە و بێخەم ببێ وتی : پیشانم بدەن با ببینم . کە چاوی پێ کەوت ئاماژەی بۆ موسیبەتەکەی خۆی کرد و وتی : هەر تۆ سەلامەت بی هەموو موسیبەتێك بچووکە .

لە ریوایەتێکی تردا ئەم ئافرەتەی نەوەی دینار دێتە مەیدانی جەنگ و لەوێ جەستەی باوکی و کوڕی و براکەی و مێردەکەی ئەبینێ . هەرچیی ئەیپرسیی : ئەمە کێیە ؟ ئەوترا ئەوە باوکتە .. ئەوە کوڕەکەتە .. ئەوە مێردەکەتە .. ئەوە براکەتە ، کەچیی گوێیی لێ نەبوو ، بەڵکو بەوپەڕی شڵەژاوییەوە ئەی وت : ئەی پێغەمبەری خوا چیی بەسەر هات ؟؟

خەڵکەکەش وەڵامیان ئەدایەوە : وا لە پێشتەوە .. هەتا تەشریفی گەیشت و ، ئەویش دەستی لەلایەکی کراسەکەی گیر کرد و ئەیوت : دایك و باوکم بە قوربانت ئەی پێغەمبەری خوا ، هەر تۆ سەلامەت بی هیچ باکێکم نیە .

هەروەها لە کاتی گەڕانەوەی سوپادا بەرەو مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی کەوت بە حەمنەی کچی جەحش [٤١٤] ( کە پوورزای بوو ) و ( بۆ سەرەخۆشیی لێ کردنی ) پێی فەرموو : (( إحتسبي )) واتە : بۆ ئەم موسیبەتەت داوای ئەجر و پاداشت لە خوا بکە .

پرسیی : کێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ؟؟

فەرمووی : (( خالَك حمزة )) .

وتی : إنا لله وإنا إليه راجعون ، خوا لێی خۆش بێ و، شەهیدییشی لێ پیرۆز بێ.

دیسان فەرمووی : (( إحتسبي )) .

پرسیی : کێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ؟؟

فەرمووی : (( أخاك عبدالله بن جحش )) .

وتی: إنا لله وإنا إليه راجعون ، خوا لێی خۆش بێ و ، شەهیدییشی لێ پیرۆز بێ.

پاشان پێی فەرموو : (( إحتسبي )) .

پرسیی : کێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ؟؟

فەرمووی : (( زوجك مصعب بن عمير )) . فەرمووی : موصعەبی کوڕی عومەیری مێردت .

وتی : ئای خەفەتبار خۆم . دەستی بە هاوار و گریان کرد . کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیتی چۆن بۆ خاڵۆی و براکەی دامەزراو بوو و ، چۆنیش بۆ مێردەکەی هاواری لێ هەستا ، فەرمووی : (( إن زوج المرأة منها لبمكان )) . واتە : ئافرەت بە تیاچوونی مێردی زیاتر ناڕەحەت ئەبێ لە هەموو کەسێکی تری .

دوای دەنگ بەرزکردنەوە لێی پرسیی : (( لِمَ قلت هذا ؟ )) . فەرمووی : بۆچ وەهات وت ؟ وتی : بیرم لە هەتیویی منداڵەکانی کردەوە ، ئەوە کاری تێ کردم .

پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوای گەورە بۆ خۆی و منداڵەکانی پاڕایەوە تا کەسێکی چاك بۆ سەرپەرشتیی‌یان پەیدا بکات . ئەوەبوو حەمنە شووی بە طەلحەی

---

[٤١٤] حەمنەی کچی جەحشی ئەسەدیی ، هاوسەری موصعەبی کوڕی عومەیر بووە ، کە لە ڕۆژی ئوحوددا هەڵگری ئاڵای موسڵمانەکان بوو . کە موصعەب شەهید بوو ، مێردی بە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا کرد . دایکی حەمنە و دایکی زەینەبی هاوسەری پێغەمبەری خوا ئومەیمەی کچی عەبدولموطەللیب بووە . حەمنە یەکێ بووە لەو کۆمەڵە ئافرەتەی کە بەیعەتیان داوە و ، لە کاتی جەنگیش‌دا ئاوی بە دەم جەنگاوەرانەوە ئەدا و دەرمانی زامدارەکانی ئەکرد . دایکی موحەممەدی کوڕی طەلحەیە کە لەبەر خواناسیی و عیبادەت زۆریی ناونراوە (( السجاد )) . حەمنە تەنها یەك فەرموودەی گێڕاوەتەوە ..

کوڕی عوبەیدوڵڵا کرد ، خوا لێی رازیی بێ ، کە لە هاوەڵە دەوڵەمەندە ناودارەکان بوو و ، زۆر بە چاکیی و بە دڵسۆزیی منداڵەکانی موصعەبی سەروکایی ئەکردن و خوای گەورە کوڕێکی خواناسی پێ بەخشین کە ناوی (( محمد )) و نازناویشی (( سەججاد )) بوو ..

بەر لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بگاتە ناو شار ، دایکی سەعدی کوڕی موعاذی سەرداری ئەنصار بەرەو رووی هات ، کە ئەو بەسەر ئەسپەکەیەوە بوو و ، سەعدیش جڵەوی گرتبوو .

سەعد وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! دایکم . فەرمووی : (( مرحباً بها )) . پێغەمبەر ﷺ وەستا هەتا هات . کە نزیك کەوتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شەهیدبوونی عەمری کوڕی موعاذی کوڕی سەرەخۆشیی لێ کرد .[٤١٥]

دایکی سەعد وتی : کە تۆم بە سەلامەتیی بینیی موسیبەتەکەم بەلاوە بچووك بوویەوە .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ کەس و کاری شەهیدانی ئوحود کرد و ، بە دایکی فەرموو : (( یا أم سعد ! أبشري و بشري أهلهم أن قتلاهم ترافقوا في الجنة جميعاً ، وقد شفعوا في أهلهم جميعاً )) . فەرمووی : ئەی دایکی سەعد ! مژدە بێ لێت و مژدەش بە کەس و کاری کوژراوان بدە کە هەموویان پێکەوە وان لە بەهەشتدا و ، تکای لێخۆشبوون لە کەسوکاریشیان لە هەر هەموویان وەرگیراوە ..

وتی : ئێمەش رازیی بووین ئەی پێغەمبەری خوا ! جا دوای ئەمە ئیتر کێ بۆیان ئەگریی ؟؟

پاشان وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! دوعا بۆ ژن و منداڵ و کەسوکاریان بکە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( اللهم أذهب حزن قلوبهم و أجبر مصيبتهم وأحسن الخلف على من خلفوا )) . لە خوای گەورە پاڕایەوە تا خەفەتی دڵیان لابەرێت و ئەو موصیبەتەیان لەسەر سووك بکات و ، کەسانی چاك بۆ سەروکاریی بەجێماوان بنێرێ .

---

[٤١٥] عەمری کوڕی موعاذی کوڕی نوعمانی کوڕی ( امرىء القيس ) ی ئەوسیی ئەنصاریی ، برای سەعدی کوڕی موعاذە . هاوەڵێکی پایەدار بووە ، کە بەشداریی جەنگی بەدری کردووە . لە جەنگی ئوحوددا بە دەستی ضیراری کوڕی خەططاب ( برای عومەر ) ، لە تەمەنی سیی و دووساڵییدا شەهید بووە خوا لێی رازیی بێ .

ئێوارەی ئەو ڕۆژە ، ڕۆژی جەنگی ئوحود ، کە پانزەهەمین ڕۆژی مانگی شەووالی سێهەم ساڵی کۆچیی بوو ، پێغەمبەری خوا گەیشتەوە مەدینە ، کە دەستەی ئەرکانی جەنگ و بەشی هەرە زۆری سوپاکەی دەورەیان دابوو .

دیار بوو زامەکانی پێغەمبەری خوا ئازاری زۆریان ئەدا و ، کە گەیشتەوە مەدینە ئازارەکەیان لە زیادکردن‌دا بوو ، بۆیە کە گەیشتە ماڵەوە ، خێرا هەردوو سەعدی سەرداری ئەوس و خەزرەج ، سەعدی کوڕی موعاذ و سەعدی کوڕی عوبادە ، هەڵیان گرت و لەسەر ولاغەکەی دایان بەزاند و ، چوونە بن باڵی و ئەویش خۆی دا بەسەر شانیان‌دا هەتا تەشریفی بردە ماڵەوە ..

کە لە ماڵەوە دانیشت شمشێرەکەی دایە دەست فاطیمەی کچی و فەرمووی : (( إغسلي عن هذا دمه يا بنية فوالله لقد صدقني في هذا اليوم )) . فەرمووی : ڕۆڵە ! خوێنی ئەو شمشێرە داشۆرە ، بەخوا ئەمڕۆ لەگەڵم‌دا ڕاستی کرد ، واتە چاک ئەهاتە دەست بۆم .

هەروەها عەلیی کوڕی ئەبوطالیب‌یش خوا لێی ڕازیی بێ بە شمشێرەکەیەوە هات ، کە ڕۆژی ئوحود ئەوەندەی وەشاند بوو چەمابوویەوە ، دایە دەست فاطیمەی زەهرای هاوسەری و فەرمووی : خوێنی ئەم شمشێرەش داشۆرە ، بەخوا ئەمڕۆ لەگەڵم‌دا ڕاستی کرد . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لئن كنت صدقت القتال لقد صدق معك سهلُ بن حنيف و أبودجانة )) . فەرمووی : ئەگەر تۆ بە ڕاستیی جەنگت کردبێ ئەوا سەهلی کوڕی حونەیف و ئەبودوجانەش لەگەڵت‌دا بە ڕاستیی جەنگیان کردووە . (( لئن كنت قد أجدت الضرب بسيفك لقد أجاده سهل بن حنيف وأبودجانة وعاصم بن ثابت والحارث بن الصمة )) . فەرموویە : ئەگەر تۆ چاک شمشێرت وەشاندبێ ، ئەوا سەهلی کوڕی حونەیف و ئەبودوجانە و عاصیمی کوڕی ثابیت و حاریثی کوڕی صوممەش شمشێریان چاک وەشاندووە .[٤١٦]

دەربارەی ئەو زیانەی کە لە ڕۆژی ئوحوددا هاتە ڕێی موسڵمانان پێغەمبەری خوا ﷺ بە تاقی‌کردنەوەیەکی خوایی لە قەڵەم دا و بەڵێنیشی بە عەلیی ئامۆزای دا کە ئیتر جارێکی تر موشریکان توانایان نابێ زیانی وەها لە موسڵمانان بدەن و،

[٤١٦] ئیبن هیشام وتوویە : بە شمشێرەکەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوترا ( ذوالفقار ) کە لە بنەڕەت‌دا شمشێری عاص ی کوڕی مونەببیه بوو . کە لە بەدردا بە کافریی کوژرا کەوتە دەست پێغەمبەری خوا ﷺ و ، پاشان کەوتە دەست عەلیی کوڕی ئەبوطالیب .

ئیتر ئیسلام هەر لە زیادکردنایە کە فەرمووی : (( لا يصيب المشركون منا مثلها حتى يفتح الله علينا )) .

هەرواش بوو ، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا کۆچی دوایی کرد لە هیچ هەڵوێستێکدا لەبەر دەم دوژمناندا نوشوستییان نەهێنا و ، لە هیچ ڕووداوێکدا کافران نەیانتوانی شکستیی بە سوپای ئیسلام بگەیەنن ، سوپاس بۆ خوا ..

خوای گەورە ویستی وەها بوو کە دوای سەرکەوتنە مەزنەکەی بەدر بە ساڵێك موسڵمانەکان تووشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت بکات ، ئەویش بە نوشوستهێنانیان لە ئوحوددا بۆ ماوەیەکی کەم . ویستی وەها بوو ئەوەندەی کوژراوانی بەدر لەمانیش شەهید بدرێ ، بەڵام بەرامبەر بە حەفتا دیلەکەی قوڕەیش ئەمان کەسیان لێ بە دیل نەکرا .

جا ئەگەر سەرنجی هەر دوو شاری مەککە و مەدینە بدەین ، مەککە دوای جەنگی بەدر و ، مەدینەش دوای جەنگی ئوحود ، تێ ئەگەین کە دانیشتوانی ئەم دوو شارە ، کە جاران زۆر لەیەك ئەچوون ، ئێستە ، بە بۆنەی کاریگەریی عەقیدەی ئیسلامەوە جیاوازییان زۆرە .

موسڵمانەکان بە ژن و بە پیاوەوە خۆیان فرۆشتووە بە خوا و ، چاویان بڕیوەتە پاداشتی قیامەت .. ڕەزامەندیی خوا ئەوپەڕی ئاواتیانە .. شەهیدبوونی کەس و کار و خۆشەویستان جێی فەخر و شانازییە .. بۆیە نە گلەیی و نە پەشیمانیی و نەناڕەحەتیی بە هیچ ئەندامێکیانەوە نەئەبینرا . بەڵکو بە پێچەوانەوە جوامێریی و خۆنەویستیی و فیداکاریی و خۆشویستن و سەلامەتیی پێغەمبەری خوایان پێوە ئەبینرا .

بەڵام خەڵکی مەدینە تا ئەو ڕۆژە گریان و شیوەنیان لێ قەدەغە نەکرابوو ، بۆیە بە پێی بەزم و باوی پێش ئیسلام ئافرەتان دەستیان دایە شیوەن و لاواندنەوەی شەهیدەکان ، تا ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شەوە گریان بە دەنگی بەرزی لە موسڵمانان قەدەغە کرد و ، بۆ هەتا هەتاییش حەرام کرا .

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ماڵەکانی نەوەی عەبدولئەشهەلدا تێ پەڕی و گوێی لە گریان و شیوەن بوو بۆ کوژراوەکانیان ، ئەوەبوو هەردوو چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ لە فرمێسك پڕ بوون و پاشان فەرمووی: (( لكن حمزة لا بواكي له )) . دڵی لە خۆی داما کە حەمزە ، لەبەرئەوەی

که خەڵکی مەککەن ، کەسی لێرە نیە شیوەنی بۆ بکەن . کە سەعدی کوڕی موعاذ و ئوسەیدی کوڕی حوضەیر گەڕانەوە بۆ ماڵەکانی نەوەی عەبدولئەشهەل فەرمانیان بە ئافرەتەکانیان دا کە خۆیان داپۆشن و بچن بۆ مامەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگرییێن . کە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێیان بوو وا بۆ حەمزە ئەگرییێن ، هاتە دەرەوە لایان کە لە دەرگای مزگەوتدا وەستا بوون و فەرمووی : (( إرجعن يرحمكن الله فقد آسيتن بأنفسكن )) . فەرمانی بەسەریاندا دا کە بگەڕێنەوە و ئەوان کاری سەرشانی خۆیان ئەنجام دا و تێی گەیاندن کە مەبەستی ئەوە نەبووە ئەوان بەو شێوە بۆی بگرین .. ئیتر لەو رۆژەوە شیوەن و لاواندنەوەی مردووان قەدەغە کرا ..

ئەو شەوە کە سوپای ئیسلام لە ئوحود گەڕابوویەوە ، موسڵمانان وریا و ئاگادار بوون و ، هەرچەندە ماندوو و هیلاك و زامدار و جەرگ سووتاو بوون ، بەلاّم بڕیاریان دا چەك دانەنێن و ، هەموو کەلەبەرێکی شار بگرن و پاسەوانی شار بن ، نەوەك ئەبوسوفیان هەل بە دەست بێنێ و ، هێرش بکاتە سەریان .

پاڵەوانە نەبەزەکانی ئەوس و خەزرەج مەفرەزەیەکی بەهێزیان دروست کرد و ، کاری پارێزگاریی لە پێغەمبەری خوایان ﷺ پێ سپارد و ، ئەوانیش خوا لێیان رازیی بێ هەتا بەیانیی بە هەموو چەك و تفاقێکەوە وەستان و پاسەوانی دەرگای ماڵی پێغەمبەر بوون ، نەوەکو دوژمن هەل بە دەست بهێنێ و هەڵمەتی بەرێتە سەر ..

ئەو پاسەوانی‌یە زۆر جێی خۆی بوو ، چونکە ئەو شەوە لە ئەبوسوفیان دوژمن تر و نزیکتریش هەبوون ، کە گومانی ئەوەیان لێ بکرێ نیازی خراپ دەرهەق بە پێغەمبەر و موسڵمانان بکەن ، کە ئەویش موونافیقانی دەوروبەری کوڕی ئوبەی و، هەردوو تیرە جوولەکەکەی مەدینە ـ نەوەی نەضیر و نەوەی قورەیظە ـ بوون .[٤١٧]

**بیست و یەکەم : هەڵمەتی ( حمراء الأسد ) :**[٤١٨]

سوپای ترسنۆکی مەککە ، بە بۆنەی هەڵەی تیرهاوێژەکانەوە ، بووە خاوەنی سەرکەوتنێکی ساختە و ، هەر بەو بۆنەوە سوپای پاڵەوانی ئیسلامیش بووە سوپایەکی تێك شکاو و ورە رووخاو .. ئەمە ناهەقی‌یەك بوو لە ماوەی شەو و

---

[٤١٧] غزوة أحد : ٢٣٥ ـ ٢٤٤ ، الرحيق المختوم : ٢٨٧ ـ ٢٨٨ .

[٤١٨] شوێنێکە کە هەشت میل لە مەدینەوە دوورە . ( الرحيق ، سيرة أبي شهبة ، الرسول القائد ) .

رۆژێك‌دا لە مەیدانی واقیع‌دا جێی خۆی کردبۆوە .. سوپایەکی دۆڕاو و بێ‌بەرنامە سەرکەوتنی بە دەستەوەیە و ، سوپایەکی پەروەردەکراوی خاوەن عەقیدەی قیامەت ویستیش بۆتە جێی توانجی ناحەزە زۆر و زەبەندەکانی .

ئەم ناهەقی‌یە ئەبووە هۆی نەمانی سام و هەیبەتی موسلمانەکان لە دڵ و دەروونی ناحەزەکانیان‌دا ، چ ناحەزانی ناوەوە و چ ناحەزانی دەرەوە ، بە رادەیەك کە هەندێکیان بیر لەوە بکەنەوە هێرش بکەنە سەر مەدینە ، یان لە ناو شاردا ئاژاوە و پشێویی بەرپا بکەن ، هەندێکیشیان دەستیان دابووە قسەکردن و رووخاندنی مەعنەویاتی موسلمانەکان بە ئاشکرا ، وەك جوولەکە و مونافیقەکان ..

ساڵی پار لە جەنگی بەدردا موسلمانەکان سەلماندیان کە بە ئاسانیی چاری هەر هێزێك ئەکەن کە بیەوێ بێت بە گژیان‌دا ، چونکە بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو قورەیشیان دا بە زەویی‌دا و ، لە ناو هۆزەکان‌دا سومعەیان شکاند ، هەتا ئەوەبوو بە چ حاڵێ قورەیش خۆی لە مەیدانی جەنگ دزی‌یەوە و بەرەو مەککە هەڵات . کەچیی سوپای موسلمانەکان سێ شەو و سێ رۆژ لە ناوچەی بەدردا مانەوە ، ئەوسا لەسەر خۆو بەبێ‌ترس بەرەو مەدینە کەوتنە رێ ..

لە جەنگی ئوحودیش‌دا سەرکەوتنی خوا خەریك بوو پێشکەش بە سوپای ئیسلام ئەکرا ، ئەگەر هەڵەی هەندێکیان نەبوایە . ئەوەبوو زیانێکی زۆریان لێ کەوت و بە ناڕەوا و بە ساختە سەرکەوتن بۆ قورەیشی دۆڕاو تۆمار ئەکرا .. بە مەرجێ قورەیش ئەیانزانیی ئەوان بەرگەی پاڵەوانەکانی ئیسلام ناگرن ، بۆیە بە پەلە لە ئوحود کشانەوە و ، شارێکی بێ‌دیفاعی وەك مەدینەش لەبەر دەستیانا بوو نەیان وێرا رووی تێ بکەن .. هەر ئەو شەوە بە پەلە کشانەوە و هەڵاتن . بە مەرجێ مەگەر کەسانێکی یەکجار کەم بیانزانیایە ئەم سەرکەوتنەی قورەیش راستەقینە و هەمیشەیی نیە .

بۆ راست‌کردنەوەی بۆچوونی خەڵك و بۆ تێگەیشتنیان کە قورەیش سەرکەوتوو نیە و ، بۆ سەلماندنی ئەوەش کە موسلمانەکان نەدۆڕاون ، بەڵکو تاکە پاڵەوانی سەرانسەری دوورگەن ، ئەویش بە بۆنەی دینی پاك و ، ئیمانی دامەزراو و ، فەرماندەی رەببانی‌یانەوە ، بۆ ئەمە هەمووی پێویست بە بەڵگە و دەلیلی عەمەلیی هەبوو .. پێویست بوو بسەلمێ کە سوپای مەککە سوپایەکی رووخاوی بێ سەروبنە و ، سوپای ئیسلامیش سوپایەکی بێ‌وێنەیە ، نەك لە دوورگەی

عەرەبیی‌دا و لە چاخێکی تایبەتیی‌دا ، بەڵکو لە سەرانسەری سەرزەویی‌دا و بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتیی . سوپای موسڵمانان تاکە سوپای پاك و خاوێنی سەرزەوی‌یە و ، خوای گەورە خۆی پەروەردەی بۆ ناردووە و ، هەر خۆیشی پشت گیریی لێ ئەکا و ، بە پێی شیاویی و لێ‌هاتنی سەرکەوتنی پێشکەش ئەکات . دەی کەواتە نەك هەر قورەیش کە ناتوانێ جارێکی تر لەبەردەم ئەم سوپا مەزنەدا خۆی بگرێ ، بەڵکو هیچ هێزێکی تریش چاری پێ ناکرێ ..

ئەم سەلماندنە بۆچوونی جوولەکە و مونافیقانیشی راست ئەکردەوە ، کە با وا نەزانن موسڵمانەکان داماو و دەستەپاچەن و هەر کەس بیەوێ ئەتوانێ بیانکاتە پارووی‌ەك و قووتیان بدات .. با چاك بزانن پاڵەوانەکانی ئیسلام خۆیان بە خوا فرۆشتووە و ، بوون بۆ هیچ هێزێك دانانێن و ، هەموو هێزێکیش بە پەرۆشرە ئەزانن .

بۆ ئەمەی کە لە پێشەوە باس کرا پێویست بوو بە پەلە ، تا سوپای قورەیش نەگەیشتۆتەوە مەککە ، کارێکی سەربازیی وەها ئەنجام بدرێت ، کە حەق و راستیی شوێنی خۆیان بگرنەوە و ، سەرکەوتنیش بگەڕێتەوە بۆ خاوەنی شەرعیی خۆی .

بۆ ئەمە فەرماندەی گشتیی سوپای ئیسلام ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەلە بڕیارێکی سەربازیی یەکجار سەخت و پڕمەترسیی بۆ سوپای ئیسلام دەرکرد .. بەڵێ چەند سەعاتێکە لە جەنگ بوونەتەوە و ، شەهیدێکی زۆریان داوە و ، لەوەش زیاتر زامداریان هەیە کە بەشێکی زۆریان زامەکانیان زۆر و سەختن و ، هەر چەندەش شار سەرسامی ئەو لێ‌قەومانە گەورەیەیە ، بڕیارێکی یەکجار سەختی دەرکرد ..

بڕیاری ئەوەی دەرکرد کە پێویستە بە پەلە سوپای زامداری ئیسلام شوێن قورەیش بکەوێت و ، ئەگەر فریای بکەون دەستێکی چاکی لێ بوەشێنن و ، گەر فریای نەکەوتن ، بۆ دوور و نزیکی بسەلمێنن کە موسڵمانەکان قورەیشیان راو ناوە و ، قورەیش بە هیچ شێوەیەك ناوێرێ روو بکاتە دەست وبازووی پاڵەوانەکانی ئیسلام .

دەرکردنی ئەم بڕیارە لە کاتێك‌دا بوو کە هێشتا پانزە سەعات بەسەر کۆتایی هاتنی جەنگ‌دا تێ نەپەڕیی بوو .

هەروەها بڕیارێکی تریشی لەگەڵیا دەرکرد کە تەنها ئەو جەنگاوەرانە بەشداریی هەڵمەتی ڕۆژی یەك شەممە ئەکەن کە دوێنێ ، شەممە ، بەشداریی جەنگی ئوحودیان کردبێ ، تا هەموان بزانن کە سوپای موسڵمانان خاوەنی ورەیەکی یەکجار بەرزە و، یەك بەیەکی جەنگاوەرانی گیانیان خستۆتە سەر لەپی دەستیان و ، کە بەشداریی جەنگیش ئەکەن ، ئاواتیان ئەوەیە کە خوا شەهیدییان خەڵات بکات ..

هەر سوپایەك دانە دانەی جەنگاوەرانی ئاوەها پەروەردە کرابن ، کێ ئەوێرێ بێتە مەیدانی ؟

هەرواش بوو .. کاتێك کە سوپای موسڵمانەکان تەنگیان بە سوپای ساسانیی‌یە ئاگرپەرستەکان هەڵ چنی ، کیسرای پادشایان هانای بردە بەر فەغفووری پادشای چین تا بە لەشکر و سوپا کۆمەکیی بکات و لە موسڵمانەکان ڕزگاری ببێ . پادشای چینیش کە دەنگ‌وباسی فیداکاریی موسڵمانەکانی بیستبوو وەڵامی کیسرای وەها دایەوە کە من سوپا و سەربازێکی ئەوتۆم نین بیان‌نێرمە بەردەم سوپای موسڵمانان کە مەرگیان لا خۆشەویست‌ترە لە ژیان ..

کێ بەرگەی سوپای وەها ئەگرێت ؟!

هەرکەی دیتان کەسانێك بە ناوی ئیسلامەوە چەکیان هەڵ گرتووە و ، بەرگەی کافریش ناگرن ، ئەوە بزانن ئەوانە لە ڕێبازی قورئان و سوننەتی ئازیز بێ‌بەشن ، چونکە هەرگیز نەبووە موسڵمان چاری کافر نەکات .

بە یەقین موسڵمانی دیلی باڵ‌بەستراوی ناو زیندانی کافران ، لە فیرعەونێکی خاوەن تەخت و سوپا و زێڕ و زیو و دەسەڵات ئازاترە .. بەڵێ ئاسیای هاوسەری فیرعەون لە فیرعەون ئازاتر بوو .. شانەکەری قژی کچەکەشی لە فیرعەون ئازاتر بوو .. کەواتە ئیسلام حەقە و حەقیش هەمیشە سەرکەوتووە .

بەڵێ پێغەمبەری ئازیز فەرمانی دا ئەبێ بکەونە دوای قوڕەیش و ڕاوی بنێن ، بەڵام تەنها بەشداربووانی جەنگی ئوحود لەگەڵیا دەرئەچن ..

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ : بۆ بەیانیی ڕۆژی یەك شەممەی شانزەهەمین ڕۆژی شەووالی ساڵی سێ‌هەمی کۆچیی ، جاڕچیی پێغەمبەری خوا ﷺ جاڕی بە ناو خەڵكدا دا کە ئەبێ دوای دوژمن بکەون و ، جاڕیشی دا کە هەر کەس دوێنێ ئامادەی جەنگ نەبووە لەگەڵیانا دەرنەچێ ..

پێغەمبەر و هاوەڵان و کەس‌وکار و ماڵ و منداڵیان هەر هەموویان غیرەتیان لێ ئەباریی .. مردن لە پێناوی عەقیدەدا بە لایانەوە کارێکی یەکجار ئاسایی بوو .. ئای کە ژیانێکی خۆشە کۆمەڵێ خۆی بەخوا بفرۆشێ ..

مەلائیکەتەکانی ئاسمان سەیری کۆمەڵە بچکۆلەکەی ئیمانیان ئەکرد ، کە لە چاو هێز و توانای خوانەناسان‌دا وەك دوورگەیەکی بچکۆلەی ناو دەریای پان و پۆڕ وەها بوو و ، لە خوای گەورە داوای سەرکەوتن و سەرفرازی‌یان بۆ ئەکردن ..

بەڵێ ، جگە لە تاقە پیاوێك ماوەی هیچ کەس نەدرا لەو هەڵمەتەدا بەشداریی بکا ، ئەگەر دوێنێ بەشداریی جەنگی نەکردبێ .. ئەو پیاوەش جابیری کوڕی عەبدوڵلاّ بوو .[419]

جابیر بەڵگەی دواکەوتنی خۆی خستە بەردەم فەرماندەی باڵای سوپای ئیسلام ، پێغەمبەری ئیسلام ﷺ تا ڕێی پێ بدا بەشداریی هەڵمەتی ( حمراء الأسد ) بکات . هۆی دواکەوتنەکەشی ئەوەبوو کە جابیر حەوت خوشکی هەبوون لە ماڵەوە و ، باوکیشی پێی خۆش بوو خۆی بەشداریی جەنگ بکا ، چونکە تەمەنی زۆری پێوە نەماوە ، بەشکو خوا شەهیدیی خەلاّت بکات ، بۆ ئەمە داوای لە جابیر کرد لە ماڵەوە لای خوشکەکانی بمێنێتەوە ، چونکە ئەو گەنجە و تەمەنی ماویەتی و فریای هەموو شتێ ئەکەوێ ..

ئیبن ئیسحاق گێڕاویەتەوە کە جابیری کوڕی عەبدوڵلاّ خوا لێیان ڕازیی بێ دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەڵێ :

**ئەی پێغەمبەری خوا ! باوکم بەلای حەوت خوشکەکەمەوە منی بەجێ هێشت و، وتی : کوڕەکەم ! ناگونجێ منیش و تۆش هەردووکمان ئەم ئافرەتانە بەجێ بهێڵین و پیاوێکیان بەلاوە نەبێ . منیش پێم خۆشە خۆم لە خزمەتی پێغەمبەری**

---

[419] جابیری کوڕی عەبدوڵلاّی کوڕی عەمری کوڕی حەرامی خەزرەجیی ئەنصاریی سەلیمیی ، یەکێکە لە هاوەڵە ناودارەکان . لە پێناوی خوادا بەشداریی نۆزدە غەزای کردووە . جابیر بەشداریی جەنگی بەدری نەکرد . لەوە ئەچێ کە باوکی داوای لێ کردبێ بەشداریی نەکا ، بۆ ئەوەی خۆی بەشداریی بکا و جابیر لای حەوت خوشکەکەی لە ماڵەوە بمێنێتەوە ، وەك لە ئوحوددا داوای لێ کرد . جابیر یەکێکە لەو هاوەڵە پایەدارە زانست زۆرانەی کە فەرموودەی زۆری گێڕابێتەوە . لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەڵقەیەکی هەبوو کە موسڵمانان زانستیان لێ وەرئەگرت و ، دوایین هاوەڵیش بووە کە لە مەدینە کۆچی کردبێ . ( الإصابة / إبن حجر ) لە ٧٤ ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە . ئیبن حەزم وتوویە : ١٥٤٠ فەرموودەی گێڕاوەتەوە .

خوادا بچم بۆ جیهاد نەك تۆ . جا لای خوشکەکانت بمێنەرەوە . ئیتر منیش لایـان مامەوە . جا ئەی پێغەمبەری خوا ماوەم بدە لەگەڵتا بێم . ئەویش ماوەی دا .

ئەوەبوو سەرۆکی مونافیقانیش عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی داوای لـە پێغەمبـەری خوا ﷺ کرد تا ماوەی بدا و لەگەڵیا دەرچێت ، کەچیی ماوەی نەدا .

دوای نوێـژی فـەجری رۆژی یـەك شـەممەی شـانزەهەم رۆژی شـەووال ، سـوپای مەدینە ، بە سەرکردایەتیی پێغەمبەری خـوا ﷺ کەوتـە رێ تـا بیسـەلمێنێ کـە سوپای مەدینە هیچ نکوولیی و نوشووستیی نەهێناوە و ، سوپای مەککەش هـیچ کات سەرکەوتن بە دەست ناهێنێت و ، سەربازەکانیشی ئەو پیاوە نین کە بەرگـەی هەڵمەتی موسڵمانان بگرن .. بۆ ئەمە ئـیبن ئـوم مـەکتووم[٤٢٠] ئەکاتـە ئـەمیری مەدینە .

پێغەمبەری خوا ﷺ چەك و تفاقی جەنگی پۆشیی و ، سواری ئەسـپەکەی بـوو کە پێی ئەوترا ( سکب ) و ، کەوتە پێش سـوپا و ، بـە پەلـە بـەرەو باشـوور بـۆ راونانی ئەبوسوفیان و سوپای مەککە کەوتنە رێ .

ئاڵای ئەم هەڵمەتە درایە دەست عەلیی کوڕی ئەبوطالیب خوا لێی رازیی بـێ ، کە هەر ئەو ئاڵایە بوو دوێنێ موسڵمانەکان لە سایەیدا جەنگان .

کە جوولەکە و مونافیقانی مەدینە ئەم هەڵمەتەی سوپای ئیسلامیان دیی ، کە هەر جەنگاوەرێك بۆ خۆی هەڵمەتی ئەدا و ، چەك و تفاقی هەڵ ئەگرت بۆ راونانی دوژمن ، سەرسام بوون . چونکە بە حیسابی ئەوان موسڵمانەکان تازە جارێکی تر توانای بەرەنگاربوونەوەی قوڕەیشیان نیە .

نەك هەر جەنگاوەرە لەش ساغەکان ئەکەوتنـە رێ ، بـەڵکو ئەوانـەش کـە بـە خەستیی زامدار بوو بوون ، خۆیان پێچابوویەوە تا دوژمن راو بنێن . بەڵێ ، تاقە

---

[٤٢٠] ئیبن ئوم مەکتووم : عەمری کوڕی ئوم مەکتووم ، ئەڵێن ناویشی عەبدوڵلا بووە ، کوڕی قەیسی کوڕی زائیدەی کوڕی ئەصەم بووە . قوڕەیشی‌یە و لە هۆزی نەوەی عـامیری کـوڕی لوئەییـە . دایکیشـی نـاوی عاتیکـەی کچـی عەبدوڵلای مەخزوومی‌یە . عەمر خاڵۆزای خاتوو خەدیجەیە و ، یەکێکە لەوانەی کە لە سەرەتاوە کۆچی بۆ مەدینـە کرد ، کە هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی نەکردبوو . لە زۆربـەی غـەزاکاندا پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەیکردە ئەمیری مەدینە تا ئیمامەت بۆ موسڵمانان بکات . دەربارەی ئیبن مەکتووم سـەرەتای سـوورەتی ( عـبس ) هاتـە خوارەوە کە تیایا خوای گەورە عیتاب بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنێرێ . ئەگێڕنەوە کـە عـەمر بەشداریی جـەنگی ( قادسیة ) ی کردووە و ، لەو جەنگەدا ئەو بە نابینایی هەڵگری ئاڵای موسڵمانەکان بووە و لـەو جەنگـەشدا بـە شەهیدیی سەری ناوەتەوە .

پیاوێکی ئەو زامدارانە لەشار بەجێ نەمان ، هەر چۆنێك بوو هەرهەموویان کەوتنە ڕێ .

بۆ نموونە ، لە نەوەی عەبدولئەشهەل دوو برا هەردووکیان لە جەنگی ئوحوددا زامدار ئەبن و ، زامەکانیشیان قووڵ و سەخت ئەبن .

یەکێکیان ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : من و برایەکم لە خزمەتی پێغەمبەری خوا دا ﷺ بەشداریی جەنگی ئوحودمان کرد و ، هەردووکمان بە زامداریی گەڕاینەوە دوا .[٤٢١] جا کە جارچیی پێغەمبەری خوا ﷺ جاڕی ئەوەی دا کە موسڵمانان بۆ راونانی دوژمن بکەونە ڕێ ، بە براکەمم وت : ئایا غەزایەکی خزمەتی پێغەمبەری خوامان ﷺ لە کیس بچێ ؟ بەخوا وڵاغیشمان نیە سواری ببین و ، هەریەکەشمان بە سەختیی زامدار بووە .. ئەوەبوو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کەوتینە ڕێ و ، زامەکەی من سووك تر بوو ، بۆیە هەرچیی براکەم نارەحەت ببوایە تاوێ هەڵم ئەگرت و ، تاوێکیش خۆی ئەڕۆی ، هەتا گەیشتینە ئەو شوێنەی کە موسڵمانان پێی گەیشتن ..

ئەمەش ناوی هەندێ لەو هاوەڵە ناودارانەیە کە لە هەڵمەتی ( حمراء الأسد ) دا بەشداری‌یان کردووە ، هەرچەندە لە جەنگی ئوحوددا بە سەختیی زامدار بووبوون:

١ـ طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ، زیاتر لە شەصت زامی پێوە بوو .

٢ ـ حاریثی کوڕی صومە ، دە زامی پێوە بوو .

٣ ـ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ، بیست زامی پێوە بوو .

٤ ـ کەعبی کوڕی مالیك ، زیاتر لە دە زامی پێوە بوو .

٥ ـ ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ، نۆ زامی پێوە بوو .

٦ ـ عوقبەی کوڕی عامیر ،[٤٢٢] ئەویش نۆ زامی پێوە بوو .

بە شێوەیەکی گشتیی بەشی زۆری سوپای ئیسلام زامدار بووبوون . هەتا هۆزی نەوەی سەلیمە خۆیان بە تەنیا چل پیاویان زامدار بوون و ، کە پێغەمبەر ﷺ

---

[٤٢١] ئەم دوو برایە ناویان عەبدوڵلا و رافیعی کوڕانی سوهەیلی کوڕی رافیع بوون .

[٤٢٢] عوقبەی کوڕی عامیری کوڕی نابیی سەلیمیی ئەنصاریی ، هاوەڵێکی مەزن بووە . بەشداریی بەستنی پەیمانی عەقەبەی کردووە و ، لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی جەنگی بەدر و ئوحود و خەندەق و جەنگەکانی تریشی کردووە . لە جەنگ‌دا بە بەستنی دەستەسرێکی صەوز لە زرێکەی بەری خۆی دیاریی ئەکرد . لە جەنگی یەمامەدا بە شەهیدیی سەری ناوەتەوە .

چاوی بە زامدارەکانی ئەم هۆزە کەوت ، دوعـای رەحمـەتی خـوای بـۆ کـردن کـە فەرمووی : (( أللهم ارحم بني سلمة )) .

پێغەمبەری خوایش ﷺ بەش بە حاڵی خۆی زامدار بوو ، بەڵام هەر چۆنێ بـوو موسـڵمانان کەوتنـە رێ . ئـەو رۆژە هـەتا ئێـوارە بـە پەلـە رۆیشـتن بـە دوای ئەبوسوفیاندا ، تـا ئـەوەبوو لـە ( حـمراء الأسـد ) ئێوارەیـان لێ هـات و ، چاوساغی سوپای موسڵمانەکان لەم هەڵمەتەدا ثابیتی کوڕی ضەححـاك بـوو .[٤٢٣]

ئەو ئێوارەیە سوپای ئیسلام لە ( حـمراء الأسد ) خستی و شەو لەوێ مایەوە .

ئەبوسوفیان رێگای زۆری بڕیی بوو ..گەیشتبوونە رەوحاء[٤٢٤] و لـەوێ سـوپای مەککە خستبووی کە لە ( حـمراء الأسد ) زۆردوور نەبوو .

لەوە ئەچێ هەندێ لە سەرکردەکانی سوپای مەککە گلەیی‌یان لـە ئەبوسـوفیان کردبێ ، کە بۆچ ئەو ئێوارەیە هێرشی نەکردۆتە سەر مەدینە و ، بە پەلە مەیدانی جەنگی بەجێ هێشتووە بێ ئەوەی بە یەکجاریی سوپای مەدینە تێك بشکێنێ و ، بەبێ کۆڵدان داواشیان لێ کردبێ کە بگەڕێتەوە دوا و هێرش بکاتە سەر مەدینە و موسڵمانەکان لە ناوبەرن .

هەتا هی وایان بووە لۆمەی ئەبوسوفیانی کردووە کە نە موحەممەدیان لـە بریـی ئەبوجەهل کوشتووە و ، نە لە جیاتیی حەفتا دیلەکەی مەککە کەسـیان بـە دیـل گرتـووە .. کەواتـە وا چـاکە بگەڕێنـەوە تـا تاقیـان لێ ببڕنـەوە ، هـەتا خۆیـان کۆنەکردۆتەوە .

ئەم گلەیی‌یانە لەو کۆنگرەیەدا خرانـە پـێش چـاو کـە فەرمانـدەکانی سـوپای مەککە لە رەوحاء بەستیان ، بۆ تاوتوێکردنی ئـەو پێشـنیارەی کـە هەنـدێ لـە فەرماندەکان خستیانە روو کە بریتیی بوو لە گەڕانەوەی سوپای مەککـە بـۆ سـەر مەدینە و لەناوبردنی موسڵمانەکان .

جا هەر چەندە زۆربەی فەرماندەکان ئەم کارەیان بە لاوە باش بـوو ، بگـرە بـە لایانەوە پێویست بوو ، تا دەستێکی تر لە موسڵمانانی مەدینە بوەشێنن و تۆڵـەی

---

[٤٢٣] ثابیتی کوڕی ضەححاکی کوڕی خەلیفەی ئەوسیی ئەنصاریی هاوەڵێکی پایەداری مەزنە کە بەشداریی جەنگی بەدری کردووە و ، یەکێکیش بووە لەو موسڵمانانەی کە لە ژێر درەختەکەدا بەیعەتیان بـە پێغەمبـەر ﷺ دا . لـە جەنگی خەندەقیش‌دا لە پاشکۆی پێغەمبەری خوادا ﷺ سواری وڵاغ ئەبوو . چواردە فەرموودەی لە دەم وەرگـیراوە و ، لە ساڵی ( ٤٥ ) ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە .

[٤٢٤] رەوحاء : شیوێکی فراوانە و سیی میل لە مەدینەوە دوورە .

تەواوی بەدر بسێنن ، بەڵام یەکێ لە سەردارەکانیان ، کە صەفوانی کوڕی ئومەییە بوو ، [٤٢٥] ئەم رایەی بە لاوە پەسەند نەبوو و ، ئامۆژگارییکردن با بۆ خۆیان بکشێنەوە و ، بیر لە گەڕانەوە و جەنگ نەکەنەوە ، چونکە ئەترسێ سوپای مەدینە دەستی خراپ بوەشێنێ و ، سەرکەوتنە رووکەشەکەی ئوحودیان لە کیس بچێ و ، لە جیاتی ریش سمێڵیشیان لە دەست دەرچێ . پێی وتن :

خزمینە ! شتی وا مەکەن ، چونکە من ئەترسم ئەو موسڵمانانەش کە بەشدارییان لە ئوحوددا نەکردبوو لە دژتان کۆ ببنەوە ، لەبەر ئەوە بگەڕێنەوە ، ئێستە سەرکەوتن لە دەستی ئێوەدایە ، بەڵام کە گەڕانەوە ئەترسم سەرکەوتنتان لێ بسەنرێ .

لەوە ئەچێ ئەبوسوفیانی فەرمانددەی گشتیی سەرەتا رای لەگەڵ صەفواندا بووبێ ، بەڵام دوایی رای فەرماندەکانی تری پەسەند کردبێ ، ئەویش لەبەر زۆرییان و لەبەر سووربوونیان .

لەو کاتەدا کە فەرماندەکانی مەککە خەریکی وت و وێژ بوون لە کۆنگرەی رەوحاءدا ، لە ناکاو دەنگوباسێکی سەیر گەیشتە سەربازەکانی قورەیش . هەواڵەکە ئەوەبوو کە سوپای مەدینە بە سەرکردایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ دوایان کەوتووە و ، بە تەمای لێدانی سوپای مەککەیە و ، ئێستاش ( حمراء الأسد ) ی کردۆتە مۆڵگای خۆی .

فەرماندەکانی کۆنگرەکە حەپەسان .. چیی ئەبیستن ؟! ئەمان بە تەمان بگەڕێنەوە سەر مەدینە و ، موسڵمانەکان بکەنە پارووەکی چەور ، کەچیی وا ئێستا موحەممەد ئەوان راو ئەنێ ؟ ئەوەندە بەهێزن لەو بیابانەدا شوێن قورەیش بکەون ؟

بەم هەواڵە ورەی فەرماندە و سەربازی سوپای قورەیش رووخا و ، هەموو بە جارێ هاتنە سەر راکەی صەفوانی کوڕی ئومەییە و ، کەوتنە تەگبیری ئەوە کە چۆن لە رەوحاء بەرەو مەککە بکشێنەوە و ، ئەو سەرکەوتنە رواڵەتییەش کە لە ئوحوددا بە دەستیان هێناوە لە کیسی نەدەن ، چونکە ئەگەر دانیشتوانی دوورگە ببینن چۆن سوپای مەدینە دوایان کەوتووە و ، ئەوانیش بەرەو مەککە هەڵ دێن ،

---

[٤٢٥] صەفوان دوای فەتحی مەککە موسڵمان ئەبێ و ، هاوەڵێکی زۆر چاکی لێ دەرئەچێ .

سەرکەوتنی ئوحودیان لێ ئەسێننەوە ، چونکە هەڵمەتی ( حمراء الأسد ) بەشێکە لە جەنگی ئوحود ، بگرە بەشی کۆتایی ئەو زۆرانبازی‌یەیە .

ئیتر سوپای مەککە نەی‌ئەزانیی سوپای مەدینە سەربازە زامدار و هیلاك و کەس وکار کوژراوەکەی دوێنێن ، بەڵکو وایان ئەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەکیی تازەی لەگەڵدایە ، بۆیە لە هەموو کاتێك زیاتر لە موسڵمانەکان ئەترسان ..

لە راستییش‌دا هەروایە . چ فەرماندەیەك دوای کوژران و زامداربوونی بەشی زۆری سوپاکەی ، دوای دوژمن ئەکەوێ و راوی ئەنێ ، ئەگەر بە تەواویی بە خۆی و سوپاکەی‌دا نەپەرموێ و ، ئەگەر دوژمن یەکجار بە لاواز و داماو نەزانێ ؟ بە تایبەتیی ( محمد المصطفى ) ﷺ کە هەرگیز کاری نابەجێی نەکردووە و ، کۆمەڵێك پیاوی ژیری بە سەلیقەش لە دەوریان و راوێژیان پێ ئەکات !

کەواتە سوپای مەدینە ئەبێ یەکجار بەهێز بێ ، وا دوای کوژرانی حەفتا پیاو و زامداربوونی صەد و پەنجا پیاوی ، دوای پانزە سەعات ، دوای سوپای قورەیشی سێ‌هەزاریی سەرکەوتوو ئەکەوێ ..

ئەبوسوفیانیش بەش بە حاڵی خۆی ترسێکی زۆری موسڵمانان چووبووە دڵیەوە، بە تایبەت دوای ئەوەی کە پیاوێکی هاوپەیمانی موسڵمانەکان ، لە هۆزی خوزاعە، بە ناوی مەعبەدی کوڕی ئەبومەعبەدی خوزاعیی ،[٤٢٦] کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو ، دەنگ‌وباسی موسڵمانەکانی دا بە گوێی ئەبوسوفیان‌دا ..

لە کاتێك‌دا کە سوپای مەدینە لە ( حمراء الأسد ) خستبووی ، مەعبەد گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، مەعبەد ناڕەحەتیی خۆی لەوە دەربڕیی کە موسڵمانەکان لە ئوحوددا تووشی زەرەر و زیان بوون . جا وتی : ئەی موحەممەد ! بەخوا بە لامانەوە زۆر گران بوو ئەو لێدانەت و ، ئاواتەخواز بووین خوا لە دەستیان بە سەلامەت دەرت بکات .

مەعبەد ( حمراء الأسد ) ی بەجێ هێشت و ، خۆی لە خۆیەوە ، وەك مرۆڤێکی ژیر و بە سەلیقە ، بڕیاری دا چاکەیەك لەگەڵ سوپای موسڵمانان‌دا بکات . بۆ

---

[٤٢٦] مەعبەد دوایی موسڵمان ئەبێ و موسڵمانێکی چاکی دامەزراوی لێ دەرئەچێ . ساڵی کۆچ کردنی دەست نەکەوتووە .

ئەمە مەعبەد بڕیاری دا بە ئەنقەست بە لای مۆڵگای سوپای مەککەدا تێپەڕ بکات .

کە گەیشتە ڕەوحاء ئەبوسوفیان خۆی گەیاندە لای و لێی پرسیی :

مەعبەد چ دەنگ و باسێکت لەلایە ؟

وتی : موحەممەد بە خۆی و هاوەڵانیەوە ، بە سوپایەکی ئەوەندە زۆرەوە کە هێشتا شتی وەهام نەدیوە ، دواتان کەوتووە و ، خۆیان ئەخۆنەوە بۆتان . ئەوانەی کە دوێنێ لە ئەوس و خەزرەج دواکەوتبوون لە جەنگ ، ئەمڕۆ لە دەوری جەم بوون و ، پەیمانیان داوە کە نەگەڕێنەوە تا لەگەڵتان بجەنگن و تۆڵەی خۆیان بکەنەوە .. یەکجار تووڕەن بۆ ئەو زیانەی کە لە خزمەکانیان کەوتووە و ، پەشیمانی کارەکەشیانن .. ئەوەندە تووڕە و داخ لە دڵن تا ئێستە شتی وەهام نەدیوە ..

ئەبوسوفیان بە یەکجاریی بێتاقەت بوو و ، بە ترسێکەوە وتی :

کابرا ! ئەوە چیی ئەڵێی ؟!

مەعبەد وتی: بەخوا وا بزانم لێرە بار ناکەیت سەری ئەسپەکانیان دەرئەکەوێ .

ئەبوسوفیان وتی: بەخوا ئێمە بە یەك دەنگیی بڕیارمان داوە بگەڕێینەوە سەریان و ، ئەوانەشیان کە ماون بنبڕیان بکەین ..

مەعبەد ئەڵێ : من ئەڵێم شتی وەها نەکەن .

ئەم پاگاندەیەی مەعبەد کاریگەرییەکی یەکجار زۆری کردە سەر ورەی فەرماندەکانی سوپای مەککە و ، ترس و لەرزێکی زۆریشی خستە ناو دڵی سەربازەکانیەوە . وای تێ گەیاندن کە موحەممەد کۆمەکی یەکی تازەی بۆ هاتووە و، سوپاکەی ئەمڕۆی بریتیی نیە لەو سوپا ماندوو و زامدارەی ئوحود ، ئەگینا چۆن ئەوێرێ خۆی تووشی بەڵای وەها بکات ، بۆیە فەرماندەکانی مەککە بڕیاریان دا بەرەو مەککە بکشێنەوە و ، خۆیان لە قەرەی سوپای مەدینە نەدەن .

بەڵام لەولاوە موسڵمانەکان لێویان ئەکرۆژن بۆ تۆڵەسەندن لە قورەیش و ، قورەیشیش ئەیەوێ خۆی بە سەرکەوتوو بزانێ ، جا چۆن ئەبێ لەبەردەم موسڵمانەکان هەڵ بێن ؟

ئەبوسوفیان گیری خواردبوو .. لە لایەکەوە ناوێرن بچنە مەیدانی سوپای مەدینەوە و ، لە لایەکیشەوە پێیان خۆشە دانیشتوانی دوورگە وا بزانن تۆڵەی بەدریان سەندووە .

جا ئەگەر ئەم بەرەو مەککە بکشێتەوە و ، موحەممەدیش بە دوایەوە بێت ، ئەبێ کێ ئەوەندە گێل بێ مەدالیای سەرکەوتن بکا بە سنگی ئەبوسوفیاندا ؟ ئیتر با ئابڕووچوونی شێواندنی جەستەی شەهیدەکانی ئوحود لەولاوە بوەستێ کە بەلای عەرەبە بتپەرستەکانیشەوە بە کارێکی قیزەون لە قەڵەم ئەدرا ..

بۆ ئەمە ئەبوسوفیان بە شوورەیی ئەزانیی سوپای مەککە بەرامبەر بە سوپای مەدینە نەوەستێ و ، لەگەڵیا نەجەنگێ .

ئەبوسوفیان لە هەموو کەسێ زیاتر سوپای موسڵمانانیش و سوپای مەککەش ئەناسێ .. بەڵام چیی بکا ؟

سەرەتا گلەیی ئەوەی هاتە سەر کە بۆچ هێرشی نەبردە سەر مەدینە لە کاتێک دا کە مەدینە جەنگاوەری تێدا نەبوون و ، موسڵمانەکان بە ناشتنی شەهیدەکانەوە پەشۆکابوون ؟ وا ئێستاش گلەیی ئەوەی دێتە سەر کە بۆچ ئاوڕت لە موحەممەد نەدایەوە کە دوای پانزە سەعات لە کۆتایی هاتنی جەنگی ئوحود دواتان کەوت و داوای جەنگی کرد ؟

جا ئەگەر ئەبوسوفیان نەچێتە مەیدانی موسڵمانەکان و ، لە جەنگێکی تردا نەیاندا بە زەوییدا ، مانای وایە کە مەککە هەر سوپای نەبووە و ، جەنگاوەرانیشی نابێ لە هیچ هەڵوێستێکدا سەر بەرز بکەنەوە ..

ئەبوسوفیان یەکجار گیرخواردە بوو .. جەنگ ئەکات ئەدۆڕێت و ، جەنگیش ناکات سەرکەوتنەکەی ئوحودی لە کیس ئەچێ .. ئەیزانیی سوپای مەدینە چەند داخ لە دڵە بۆ دەستوەشاندن لە سوپای مەککە ئیتر با ئازایەتیی و چاونەترسیی سەربازانی مەدینە لەولاوە بوەستێ کە یەك بە یەکیان خۆی بە خوا فرۆشتووە و ، باکی لە مان و مردن نیە .

سەرەنجام ئەبوسوفیان و فەرماندەکانی تری مەککە گەیشتنە ئەو بڕیارە کە جەنگ نەکەن و بکشێنەوە دوا بەرەو مەککە . بەڵام خۆ نابێ وەها سادە و ساویلکانە .. پێویستە تەپ و تۆزێك بە دەوری باسەکەدا دروست بکەن تا بکرێ بە ژێر لێوەوە .

بۆ ئەمە ئەبوسوفیان بڕیاری دا سوپای مەدینە بەوە چاوبەست بکات کە گوایا سوپای مەککە بە نیازە هێرش بکاتە سەر موسڵمانەکان لە ( حمراء الأسد ) و تاقیان لێ ببڕێتەوە . بەڵکو بەم پاگاندەیە سوپای مەدینە بترسێت و بەرەو مەدینە

بکشێتەوە و ، بی‌کەن بە گاڵە کە موسڵمانەکان هەلاّتن و ، ئەوسا سوپای مەککە بە فیز و دەمارێکەوە بەرەو مەککە بکەوێتە رێ .. ئیتر ئەوانەی کە چاودێریی زۆرانبازیی ئەکەن و چاویان لە سوپای مەدینەیە وا شوێن قورەیش کەوتووە ، بە چاوی خۆیان کشانەوەی سوپای مەدینە ئەبینن ، کە بە هەڕەشەی ئەبوسوفیان کشایەوە دوا و ، نەی‌وێرا جەنگ بکات . ئەوسا گلەیی لەسەر سوپای مەککە نامێنێت و ، بە سەرکەوتووش لە قەڵەم ئەدرێت .

بۆ ئەم مەبەستە ئەبوسوفیان پێی خۆش بوو نامەیەك بۆ پێغەمبەر ﷺ بنووسێت کە تیایا هەڕەشەی ئەوەی لێ بکات کە سوپای مەککە بەیەك دەنگیی ئەیەوێ هێرش بکاتە سەریان لە ( حمراء الأسد ) و رەگ و ریشەیان لە بن‌دا دەر بهێنێ .

لەو کاتەدا کاروانێکی نەوەی ( عبد القيس ) بەرەو مەدینە ئەڕۆیشت ، ئەبوسوفیان نامەکەی دایە دەست ئەوان و ، ئەوانیش گەیاندیانە لای موسڵمانەکان . کە پێغەمبەری خوا ﷺ نامە هەڕەشە ئەنگێزەکەی ئەبوسوفیانی خوێندەوە ، بە هیچ شێوەیەك گوێی نەدایە و ، لە ناوچەی ( حمراء الأسد ) بۆ ماوەی سێ شەو و سێ رۆژ مایەوە و ، لە شەوەکان‌دا موسڵمانەکان ئاگریان ئەکردەوە تا قورەیش شوێنەکەیان بزانن و ، ئەوەش بزانن کە موسڵمانەکان خۆیان بۆ زۆرانبازی ئامادە کردووە و ، ئەگەر مەردن با بێنە مەیدان .

کە ئەبوسوفیان زانیی هەڕەشە و گورەشەکەی هیچی نەبەستەوە ، ناچار بوو کە مل بۆ رەشەبا بچەمێنێتەوە و ، دان بە تێشکاویی خۆی و سوپاکەی‌دا بنێ و ، بە سەری شۆڕەوە بەرەو مەککە ملی رێگا بگرنە بەر و ، موسڵمانەکانیش بە دامەزراویی لە ( حمراء الأسد ) مابوونەوە ..

بەر لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگەڕێتەوە بۆ مەدینە ئەبوعیززەی جومەحیی گرت ، کە یەکێ بوو لەوانەی کە لە جەنگی بەدردا بە دیل گیران و ، لەبەر هەژاریی و دەست‌کورتیی و کچی زۆری بەبێ وەرگرتنی فیدیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادی کرد ، بەو مەرجەی جارێکی تر دژی موسڵمانەکان نەوەستێت . کەچیی ئەم پیاوە پیاوەتی‌یەکەی لەبەرچاو نەبوو و ، پەیمانی شکاند و بە شیعر خەڵکیی لە دژی پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانەکان هەڵ ئەنا و ، بۆ جەنگی ئوحودیش بەشداریی جەنگی کرد . جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ گرتی وتی : ئەی موحەممەد !

چاوپۆشییم لێ بکە و ، پیاوەتییم لەگەڵدا بکە و ، لێم گەڕێ بۆ کچەکانم و ، پەیمانت ئەدەمێ کە جارێکی تر کاری وەها نەکەم . فەرمووی : (( لا أدعك تمسح عارضيك بمكة وتقول : خدعت محمداً مرتين ، لا يدلغ المؤمن من جحر مرتين )) . فەرمووی : لێت ناگەڕێم بگەڕێیتەوە مەککە و دەست بێنی بە لاجانگتدا و بڵێی: موحەممەدم دوو جار خەڵەتاندووە . ئیماندار لە کونێکدا دوو جار ناگەزرێت .. پاشان فەرمانی بەسەر زوبەیردا ، یان عاصیمی کوڕی ثابیتدا دا تا لە ملی بدات .

دوای گەڕانەوەی ئەبوسوفیان لەگەڵ سوپاکەیدا بەرەو مەککە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوپا خواناسەکەیەوە ، بە سەری بەرزەوە گەڕانەوە مەدینە و ، بەم هەڵمەتە سەلماندی کە قوڕەیش سوپای جەنگیان نیە و جارێکی تریش ناتوانن بێنە مەیدانی خواناسان . بەمە سەرکەوتنێکی سیاسیی و سەربازیی بۆ موسڵمانەکان تۆمار کرا و ، سام و هەیبەتی موسڵمانان وەك جارانی لێ هاتەوە و ، بۆ هەموو لایەکی ناحەزیش سەلما کە سەربازانی ئیسلام مل بۆ هیچ هێزێك کەچ ناکەن و ، گەورەترین و دامەزراوترین سوپای دوورگەی عەرەبیی سوپای موسڵمانانە . ئیتر با نە مونافیق و ، نە جوولەکە و ، نە ئەعرابی بیابانیش بە تەما نەبن هەرگیز بوێرن دەست لە موسڵمانان بوەشێنن .

بەمە بۆ هەموو دوورگە دەرکەوت کە سوپای قوڕەیش هیچ کات لە ئوحوددا سەرنەکەوتووە و ، تەنها ئەوەبووە کە هەندێ لە موسڵمانەکان هەڵەیان کردووە و ، بەو بۆنەوە زیانیان لێ کەوتووە .

هەروەها کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە مەدینە حوکمی ئیعدامی بۆ یەکێ لە جاسووسەکانی مەککە دەرکرد ، کە ئەویش موعاویەی کوڕی موغیرەی کوڕی ئەبولعاص بوو ، باپیری عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان لە سەری دایکیەوە .

کاتێك کە بتپەرستەکان لە ئوحود گەڕانەوە ئەو موعاویە هات بۆ لای عوثمانی کوڕی عەففانی ئامۆزای و ، ئەویش چوو داوای ئەمانی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کرد ، ئەویش مۆڵەتی دا بەو مەرجەی کە ئەگەر دوای سێ ڕۆژی تر بیدۆزێتەوە ئەیکوژێت . جا کە سوپای ئیسلام مەدینەی چۆڵ کرد ، ئەو موعاویەیە زیاتر لە سێ ڕۆژ لە مەدینەدا مایەوە و ، بۆ بەرژەوەندیی قوڕەیش خەریکی سیخوڕیی بوو. کە سوپای ئیسلام گەڕایەوە موعاویەی کوڕی موغیرە ڕای کرد . پێغەمبەری خوا

ﷺ زەیدی کوڕی حاریثە و عەمماری کوڕی یاسیری نارد بە دوایدا بیدۆزنەوە و بیکوژن . ئەوانیش فەرمانەکەیان ئەنجام دا ..

کورتەی باس : هەڵمەتی ( حمراء الأسد ) غەزایەکی سەربەخۆ نەبووە ، بەڵکو لاپەڕەیەك بووە لەلاپەڕەکانی غەزای ئوحود ..

لە سەرەتاوە موسڵمانەکان جەنگیان بردەوە و ، سوپای مەککە بە تەواویی شپرزە بوو و جگە لە هەڵاتن هیچی بۆ نەمایەوە .

لە بەشی دووهەمی جەنگەکەدا موسڵمانەکان بە هەڵەی تیرهاوێژەکان زیانێکی گیانیی زۆریان لێ کەوت و ، کافرانی مەککە دەسەلاتیان بەسەر مەیدانی جەنگ دا هەبوو و ، نامەردانە جەستەی شەهیدەکانیان شێواند . بەلام نەیانتوانیی موسڵمانان تێك بشکێنن و راو بنێن . بەڵکو موسڵمانەکان بەوپەڕی غیرەتەوە خۆیان گرت و تاقە کەسێکیان نەبووە دیلی قوڕەیش و ، بەوپەڕی غیرەتەوە خۆیان گەیاندەوە لای فەرماندەی گشتیی مەدینە و ، لە دەوری جەم بوون و ، بوونەوە خاوەنی هێزی خۆیان ، بە شێوەیەك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری ئەوەی دا کە ئەگەر ئەبوسوفیان نیازی ئەوە بکات هەڵمەت بەرێتە سەر مەدینە ، بە جەنگێکی سەرومالیی ئەچن بە گژیاندا ..

سوپای مەککەش بە راستیی خۆی ئەوەندە بە خاوەنی هێز نەئەزانیی کە بتوانێ جەنگێکی تر بۆ خۆی ساز بدات ، بۆیە وازی لە مەدینە هێنا و بە پەلە کشایەوە و ، وەك دەستووری سوپای سەرکەوتووی ئەو زەمانە دوو سێ رۆژ لەو ناوەدا نەمایەوە ، بەڵکو یەکسەر کشایەوە و ، کە موسڵمانەکانیش شوێنی کەوتن ، خێرا بەرەو مەککە کشایەوە و ، جورئەتی ئەوەی نەبوو بچێ بە گژی موسڵمانەکاندا .

شایانی باسە کە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوولی سەرۆکی مونافیقان هەموو جارێ ، پێش جەنگی ئوحود ، رۆژانی جومعە رێزێکی لێ ئەگیرا ، ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر دائەنیشت تا بۆ خەڵکەکە وتار بدات ، ئەو عەبدوڵلایە هەڵ ئەسا و ئەیوت : خەڵکینە ! ئەمە پێغەمبەری خوایە لە ناوتان دا ، خوای گەورە بە هۆی ناردنی ئەوەوە رێزی لێتان گرتووە و پایەداری کردوون . جا ئێوەش کۆمەکیی بکەن و پشتی بگرن و ، گوێڕایەڵ و فەرمان بەرداری بن . پاشان دائەنیشت .

کە رۆژی ئوحود ئەو پەنەی دا و بە سێ‌صەد کەسەوە گەڕایەوە دوا و پشتی پێغەمبەر و موسڵمانانی بەردا و ، خەڵکی لە جەنگ گەڕانەوە ، بۆ رۆژی جومعە هەستا و ویستی وەك جاران قسەکانی بکاتەوە . خێرا موسڵمانان دەستیان دایە چمکی جلەکانی و وتیان : دانیشە ئەی دوژمنی خوا ، دوای ئەوەی کە کردت ، ئیتر تۆ شیاوی ئەوە نیت !!

سەرۆکی نیفاق بە تووڕیی‌یەوە هەستا و مزگەوتی بەجێ‌هێشت و ئەی‌وت : بەخوا ئەڵێی شتێکی خراپم وتووە ، هەستاوم پشت‌گیریی لێ ئەکەم . لە دەرگای مزگەوتدا پیاوێکی ئەنصاریی تووش بوو و وتی : ئەوە چیتە ؟ ئەویش باسەکەی بۆ کرد . ئەنصاری‌یەکە وتی : دەی بگەڕێرەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوای گەورە داوای لێ‌خۆش‌بوونت بۆ ئەکات . وتی : بەخوا نامەوێ داوای لێ‌خۆش‌بوونم بۆ بکات .[٤٢٧]

**بیست و دووهەم : کوژراوانی هەردوو سوپا :**

لە غەزای ئوحوددا لە هەر دوو لا کۆمەڵێك کوژران ، بەلاّم شەهیدانی موسڵمانان زیاتر بوون لە کوژراوانی قورەیش .

**( ا ) شەهیدانی موسڵمانان :**

**( ١ ) شەهیدانی موهاجیرین :**

تەنها چوار کەسیان لێ شەهید کراوە ، چونکە موهاجیرەکان لە چاو ئەنصاردا ژمارەیان کەمتر بووە ، ئەمەش ناوەکانیانە :

١ ـ لە نەوەی هاشمی کوڕی عەبدمەناف ، حەمزەی کوڕی عەبدولموطەللیب ، کە وەحشیی کوڕی حەربی بەندەی ئازادکراوی جوبەیری کوڕی موطعیم شەهیدی کرد .

٢ ـ لە نەوەی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف ، عەبدوڵلاّی کوڕی جەحش ، هاوپەیمانیان بووە ، چونکە خۆی لە نەوەی ئەسەدی کوڕی خوزەیمە بووە . دایکی ئومەیمەی کچی عەبدولموطەللیبە . کافرەکان لووت و گوێیان بڕیی بوو ، بۆیە ناو نرا بوو ( المجدّع في الله ) . زوبەیری کوڕی بەککار ئەوەی باس کردووە کە لە رۆژی ئوحوددا شمشێرەکەی ئەشکێ و پێغەمبەری خوا ﷺ لقە دارخورمایەکی ئەداتە

---

[٤٢٧] غزوة أحد : ٢٤٤ ـ ٢٦٢ ، الرحيق المختوم : ٢٨٩ ـ ٢٩٣ ، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٢٧ ـ ٢٣٠ .

دەست و ، لە دەستیا ئەبێتە شمشێر و جەنگی پێ ئەکات هەتا شەهید ئەبێت . پاشان کە ئەکەوێتە دەست منداڵەکانی لە میراتی یەکێکیاندا بە دووصەد دینار ئەفرۆشرێ ..

٣ ـ لە نەوەی عەبدودداری کوڕی قوصەی ، موصعەبی کوڕی عومەیر ، کە ئیبن قەمیئەی لەیثیی ، لە کاتێکدا کە خۆی کردبووە قەڵغان بۆ پاراستنی پێغەمبەری خوا ﷺ شەهیدی کرد .

٤ ـ لە نەوەی مەخزووم ، شەمماسی کوڕی عوثمانی کوڕی شەرید .[٤٢٨]

( ٢ ) **شەهیدانی ئەنصار :**

شەهیدەکانی ئەنصار ئەگەنە شەصت و پێنج شەهید کە بیست و چواریان لە هۆزی ئەوس و چل و یەکیشیان لە هۆزی خەزرەجن کە ئەمانەن :

**یەکەم : شەهیدەکانی ئەوس :**

( أ ) لە نەوەی عەبدولئەشهەل : چواردە پیاو ، کە ئەمانەن :

١ ـ عەمری کوڕی موعاذی کوڕی نوعمان .

٢ ـ حاریثی کوڕی ئەنەسی کوڕی رافیع .

٣ ـ عومارەی کوڕی زیادی کوڕی سەکەن ، ئەم پاڵەوانە لەبەر دەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ ، لە کاتی کشانەوە بۆ کێوی ئوحود ، شەهید بوو .

٤ ـ سەلەمەی کوڕی ثابیتی کوڕی وەقش ، کە بەشداریی جەنگی بەدریشی کردووە .

٥ ـ عەمری کوڕی ثابیتی کوڕی وەقش ، کە ئوصەیرم‌یان پێ ئەوت و ، رۆژی ئوحود موسڵمانێتیی چووە دڵیەوە و ، بێ‌ئەوەی کەس بە موسڵمان‌بوونی بزانێ خۆی گەیاندە مەیدانی جەنگ تا شەهید بوو . لە پێشەوە بە درێژە باسی کراوە .

٦ ـ ثابیتی کوڕی وەقشی باوکی سەلەمە و عەمر ، کە ئەوەندە پیر بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەشداربوونی جەنگ چاوپۆشیی لێ کرد ، بەڵام کە دیی وا ئاگری جەنگ بڵێسەی سەندووە ، دەستی دایە شمشێرەکەی و خەریکی کوشتار بوو هەتا شەهید کرا .

---

[٤٢٨] شەمماس : یەکێکە لە کۆچکەرە دێرینەکان و ، لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی بەدری کردووە . پیاوێکی دەم و چاو گەشاوە و پێ‌کەوتوو بووە . لە رۆژی ئوحوددا لە چەند لاوە بە سەختیی زامدار بوو و برایەوە مەدینە و دوای رۆژێك کۆچی دوایی کرد و ، لە بەقیع نێژرا .

٧ ـ حوسەیلی کوڕی جابیر ، باوکی حوذەیفەی کوڕی یەمان ، لە پێشەوە باس کراوە .
٨ ـ صەیفیی کوڕی قەیظیی ، کە دایکی صەفیەی کچی تەییهان بووە و ، بە دەستی ضیراری کوڕی خەططاب شەهید بووە .
٩ ـ حوبابی کوڕی قەیظیی ، برای صەیفیی بووە و ، بەشداریی بەدری کردووە.
١٠ ـ عەببادی کوڕی سەهلی کوڕی مەخرەمە ، کە بە دەستی صەفوانی کوڕی ئومەییە شەهید بووە .
١١ ـ حاریثی کوڕی ئەوسی کوڕی موعاذی کوڕی نوعمان ، برازای سەعدی کوڕی موعاذ ، بەشداریی بەدری کردووە و ، لە تەمەنی بیست و هەشت ساڵییدا شەهید بووە .
١٢ ـ ریفاعەی کوڕی وەقش ، برای ثابیتی کوڕی وەقش بووە ، کە خالیدی کوڕی وەلید شەهیدی کردووە .
١٣ ـ ئەیاسی کوڕی ئەوسی کوڕی عەتیك .
١٤ ـ عوبەیدی کوڕی تەییهان ، بەشداریی پەیمانی عەقەبە و جەنگی بەدریشی کردووە .
( ب ) لە نەوەی ظوفر، یەك پیاو کە :
١ ـ یەزیدی کوڕی حاطبی کوڕی ئومەییەیە .
( ج ) لە نەوەی ضەبیعە ، دوو پیاو کە ئەمانەن :
١ ـ ئەبوسوفیانی کوڕی حاریثی کوڕی قەیسی کوڕی زەید ، کە بەشداریی بەدری کردووە و ، کە موسڵمانەکان لە ئوحوددا شکستیان هێنا وتی : خوایە ! من نامەوێ بگەڕێمەوە بۆ ناو کچەکانم ، بەڵکو ئەمەوێ لە پێناوی تۆدا بکوژرێم . ئەوەبوو شەهید بوو و ، پێغەمبەری خوایش ﷺ ستایشی کرد ..
٢ ـ حەنظەلەی کوڕی عامیر ( کە مەلائیکە شۆردیان ) .
( د ) لە نەوەی عوبەید ، یەك پیاو کە :
١ ـ ئەنیسی کوڕی قەتادەیە و ، بەشداریی بەدری کردووە .
( هـ ) لە نەوەی ثەعلەبەی کوڕی عەمری کوڕی عەوف دوو پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ ئەبوحەییەی کوڕی عەمری کوڕی ثابیت ، کە ئەبوحاتەم وتوویە : ناوی عامیری کوڕی عەبدعەمری کوڕی عومەیری کوڕی ثابیتە . لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی بەدری کردووە .

٢ ـ عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر ، کە ئەمیری ( ٥٠ ) تیرهاوێژەکەی ( جبل الرماة ) بووە . ئەو شوێنی خۆی چۆڵ نەکردووە هەتا شەهید کراوە .

( و ) لە نەوەی سەلم یەك پیاو کە :

١ ـ خەیثەمەی کوڕی حاریثی کوڕی مالیکی کوڕی کەعبە ، کە هوبەیرەی کوڕی ئەبووەهبی مەخزوومیی شەهیدی کردووە .

( ز ) لە نەوەی موعاویەی کوڕی مالیکی کوڕی عەوف دوو پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ سوبەیعی کوڕی حاطەب ، کە بەشداریی بەدری کردووە .

٢ ـ مالیکی کوڕی نومەیلەی موزەنیی کە هاوپەیمانیان بووە . بەشداریی بەدری کردووە ( إبن اسحاق ) .

( ح ) لە نەوەی خەطیمە ، یەك پیاو کە :

١ ـ حاریثی کوڕی عەدیی کوڕی خەرشەیە .

**دووهەم : شەهیدەکانی خەزرەج :**

( أ ) لە نەوەی نەججاری کوڕی ثعلبە دوانزە شەهید کە ئەمانەن :

١ ـ عەمری کوڕی قەیسی کوڕی زەیدی کوڕی سەواد ، واقیدیی وەهای باس کردووە کە بەشداریی بەدری کردبێ .

٢ ـ قەیسی کوڕی عەمری کوڕی قەیس ، کە هەندێ ئەڵێن بەشداریی بەدری کردووە و هەندێکیش ئەڵێن نەیکردووە .

٣ ـ ثابیتی کوڕی عەمری کوڕی زەیدی کوڕی عەدیی کوڕی سەوادە .

٤ ـ عامیری کوڕی موخەللەدی کوڕی حەرث ، کە مووسای کوڕی عوقبە بە بەدریی لە قەڵەمی داوە .

٥ ـ ئەبوهوبەیرەی کوڕی حاریثی کوڕی عەلقەمەی کوڕی عەمری کوڕی کەعب، خالیدی کوڕی وەلید شەهیدی کرد ، دوای ئەوەی کە ئەم یەکێ لە کافرەکانی بە وێنەی مەڕ سەربڕیی . ئەم هاوەڵە ئەوەندە ئازا بووە لە جەنگدا وەك شێر هەڵمەتی داوە .

٦ ـ عەمری کوڕی موطەرریفی کوڕی عەلقەمەی کوڕی عەمر .

٧ ـ ئەوسی کوڕی ثابیتی کوڕی مونذیر ، کە برای حەسسانی شاعیر بووە . بەشداریی پەیمانی عەقەبە و جەنگی بەدری کردووە .

٨ ـ ئەنەسی کوڕی نەضری کوڕی ضەمضەمی کوڕی زەیدی کوڕی حەرام . ئەنەس کە دیتی هەندێ موسڵمان سارد بوونەتەوە غیرەتی خستە بەریان و ، بە سەعدی کوڕی موعاذیشی ئەوت : ئەی سەعد ! لەلای ئوحودەوە بۆنی بەهەشت ئەبیستم . چووە پێشەوە هەتا شەهید بوو ..

٩ ـ قەیسی کوڕی موخەللەد ، بەشداریی بەدری کردووە .

١٠ ـ کەیسان ( بەندەیان بووە ) .

١١ ـ سەلیمی کوڕی حاریث ، ئیبن ئیسحاق بە بەدریی لە قەڵەم داوە .

١٢ ـ نوعمانی کوڕی عەبدعەمری کوڕی مەسعوودی کوڕی کەعب ، بەشداریی بەدری کردووە .

( ب ) لە نەوەی حاریث ، سێ پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ئەبوزوهەیر .

٢ ـ سەعدی کوڕی رەبیعی کوڕی عەمری کوڕی ئەبوزوهەیر ، کە هەردووکیان پێکەوە لە قەبرێکدا نێژران .

٣ ـ ئەوسی کوڕی ئەرقەمی کوڕی زەید .

( ج ) لە نەوەی ئەبجەر ، سێ پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ مالیکی کوڕی سینانی کوڕی عوبەید ، کە باوکی ئەبوسەعیدی خودریی بووە و ، ئەو پیاوە بووە کە خوێنی دەم و چاوی زامداری پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵ مژیوە و ، یەکێ بووە لەو پیاوانەی کە لەرۆژی ئوحوددا دامەزراو بوون .

٢ ـ سەعیدی کوڕی سووەیدی کوڕی قەیس ، برای دایکیی سەمورەی کوڕی جوندوب بووە .

٣ ـ عوتبەی کوڕی رەبیعی کوڕی رافیع .

( د ) لە نەوەی ساعیدە ، دوو پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ ثەعلەبەی کوڕی سەعدی کوڕی مالیك ، طەبەرانیی بە بەدریی لە قەڵەم داوە .

٢ ـ ثەقفی کوڕی فەروەی کوڕی بەدیی ، کە پێی وتراوە ئەخرەش .

( هـ ) لەنەوەی طەریف ، دوو پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ عەبدوڵلاّی کوڕی عەمری کوڕی وەهب ، کە لە دەستەی سەعدی کوڕی عوبادەی سەرداری خەزرەج خۆی بووە .

٢ ـ ضەمرە ، لە نەوەی جوهەینە بووە و هاوپەیمانیان بووە و ، بەدرییە .

( و ) لە نەوەی عەوفی کوڕی خەزرەج ، پێنج پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ نەوفەلی کوڕی عەبدوڵلاّ ، بەشداریی بەدری کردووە . ( ابن عبدالبر ) ئەڵێت : ئەمە نەوفەلی کوری ثەعلەبەی کوڕی عەبدوڵلاّ کوڕی نەضلەیە .

٢ ـ عەبباسی کوڕی عوبادەی کوڕی نەضلەی کوڕی مالیکی کوڕی عیجلان . بەشداریی پەیمانی عەقەبەی کردووە . ئەم هاوەڵە بوو کە خزمەکانی وریا کردەوە تا بزانن بەستنی پەیمانی عەقەبە چ کارێکی گەورە و گرانە ئەیخەنە ئەستۆی خۆیان و ، پێویستە پارێزگاریی لێ بکەن ، کە پێی وتن : ئەی کۆمەڵی خەزرەج ! ئایا ئەزانن لەسەر چ مەرجێك موحەممەد لەگەڵ خۆتاندا ئەبەن ؟ ئێوە کە ئەیبەن جەنگی سوور و رەشتان دێتە رێ . جا ئەگەر ئەزانن کە جەنگ ماندووی کردن دەستبەرداری ئەبن ، هەر لە ئێستەوە وازی لێ بهێنن و ، گەر لەسەر ئەوەش ئارام ئەگرن دەی بیبەن . وتیان : لەسەر ئەوە ئەیبەین لەگەڵ خۆماندا . جا ئەم هاوەڵە لە دوای بەستنی پەیمانی عەقەبە لە مەککە ئەمێنێتەوە تا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کۆچ بۆ مەدینە ئەکات ، بەمە عەبباسی کوڕی عوبادە بە ئەنصارییش و بە موهاجیرییش لە قەڵەم ئەدرێ .

٣ ـ نوعمانی کوڕی مالیکی کوڕی ثەعلەبە .

٤ ـ موجەذەری کوڕی زیادی بەلەویی ئەنصاریی خەزرەجیی . ( هاوپەیمانیان بووە ) .

٥ ـ عوبادەی کوڕی حەسحاس ، لە ( إصابە ) دا بە خەشخاش هاتووە . بەشداریی بەدری کردووە . لەگەڵ ئەم دوو هاوەڵەی پێشەوەی ( مجذر و نعمان ) لە قەبرێكدا پێکەوە نێژراون .

( ز ) لە نەوەی حوبلا ، یەك پیاو کە :

١ ـ ریفاعەی کوڕی عەمری کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدوڵلاّیە و ، بەشداریی بەدری کردووە .

( ح ) لە نەوەی سەلیمە ، چوار پیاو کە ئەمانەن :

١ ـ عەبدوڵلاّی کوڕی عەمری کوڕی حەرام ، باوکی جابیر . بەیهەقیی لە جابیرەوە ریوایەتی کردووە کە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ سەیرمی کرد و فەرمووی : (( مالي أراك مهتماً ؟ )) فەرمووی : ئەوە چی‌یە بە خەمبار ئەکەویتە بەرچاوم ؟ وتم : باوکم شەهید بوو و قەرز و خێزانێکی زۆری بەسەرمدا بەجێ هێشتووە . فەرمووی : (( ألا أخبرك ؟ ما كلم الله أحداً إلا من وراء حجاب ، وإنه كلم أباك كفاحاً ـ يعني مواجهة ـ وقال له : يا عبدي سلني أعطك . قال : أسألك أن تردني إلى الدنيا فأقتل فيه ثانية ، فقال الحق تبارك وتعالى : إنه سبق مني القول أهم إليها ـ أي الدنيا ـ لا يرجعون . قال : ربي فأبلغ من ورائي ، فأنزل الله سبحانه :

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾ )) .

فەرمووی : هەواڵت نەدەمێ ؟ خوای گەورە لەگەڵ هەر کەسێکدا فەرمایشتی کردبێ ، لە پشتی پەردەوە بووە ، بەڵام راستەوخۆ لەگەڵ باوکتدا فەرمایشتی کرد و ، فەرمووی : بەندەکەم ! داوام لێ بکە ، تا پێت ببەخشم . ئەویش وتی : داوات لێ ئەکەم کە بمگێڕیتەوە بۆ دنیا ، تا جارێکی تریش لەسەر تۆ شەهید ببم . خوای گەورەش فەرمووی : زووتر بڕیاری ئەوەم داوە کە هیچ کەس ناگەڕێتەوە بۆ دنیا . وتی : دەی ، پەروەردگارم ! زیندوانی دوای خۆم ئاگادار بکە . خوای گەورەش ئەو ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە .

٢ ـ عەمری کوڕی جەمووحی کوڕی زەیدی کوڕی حەرام ، لەگەڵ عەبدوڵلاّی کوڕی عەمردا پێکەوە لە قەبرێکدا نێژراون . ئەم شەهیدەش چوار کوڕی ئازا و بەجەرگی وەك شێری هەبوون و لە هەموو غەزاکاندا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادە ئەبوون و ، عەمری باوکیشیان قاچێکی ناتەواو بوو و ئەشەلی . کە جەنگی ئوحود هاتە بەرەوە کوڕەکان ویستیان خۆیان بچن بۆ غەزا و باوکیان لەبەر شەلیی لە ماڵەوە بێ ، چونکە خوا چاوپۆشیی لەو کردووە . کەچیی عەمر هاتە خزمەتی پێغەمبەر و وتی : کوڕەکانم ئەیانەوێ لە دەرچوون لە خزمەتتدا قەدەغەم بکەن ، دەبەخوا من ئەمەوێ بەم قاچە شەلەمەوە بگەمە بەهەشت . پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری تێ گەیاند کە ئەو عوزری هەیە و جیهادی لەسەر نیە، کە فەرمووی : (( أما أنت فقد عذرك الله فلا جهاد عليك )) . فەرمانی بە کوڕەکانیشی دا کە ئەگەر ئەو خۆی پێی خۆشە قەدەغەی نەکەن ، بەشکوم خوا

شەهیدیی بە خەلاّت بکات کە فەرمووی : (( ما علیکم أن لا تمنعوه لعل الله یرزقــه الشهادة )) . ئەوەبوو دەرچوو و شەهیدیی دەست کەوت .
٣ ـ خەللادی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح ، لە ئوحوددا لەگەڵ باوکیا شەهید بووە و بەشداریی بەدریشی کردووە .
دایکی خـەللاد جەسـتەی خـەللادی کـوڕی و عـەمری مێـردی هـەڵ گـرتن و هێنانیەوە تا لە مەدینەدا بیان‌نێژن ، کەچیی بە بۆنەی فەرمانەکـەی پێغەمبـەری خواوە ﷺ گێڕانیەوە بۆ شوێنی شەهیدبوونیان لە ئوحود .
٤ ـ ئەبوئەیمەن ، کە بەندەی ئازادکراوی عەمری کوڕی جەمووح بوو .
( ط ) لە نەوەی سوادی کوڕی غونم ، سێ پیاو کە ئەمانەن :
١ ـ سەلیمی کوڕی عەمر یان عامیر ، بەشـداریی پـەیمانی عەقەبـە و جـەنگی بەدری کردووە .
٢ـ عەنتەرە ، بەندەی ئازادکراوی سەلیم بووە .
٣ ـ سەهلی کوڕی قەیسی کوڕی کەعب ، بەشداریی بەدری کردووە .
( ی ) لە نەوەی زورەیقی کوڕی عامیر ، دوو پیاو کە ئەمانەن :
١ ـ ذەکوانی کوڕی عەبدقەیس ، یەکێکە لەوانەی کـە زوو بـە زوو موسـڵمان بوون و ، ئامادەی بەستنی پەیمانی عەقەبە بووە . سەرەتا پێش کۆچ کـردن لەگـەڵ ئەسعەدی کوڕی زوراره سەردانی مەککە ئەکەن و ، باسی ئیسلام لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەبیستن و موسڵمان ئەبن . ئەم دوانە یەکەم کەس بـوون کـە ئیسـلامیان بـە مەدینە گەیاند . ڕۆژێك پێش جەنگی ئوحود ، دەربـارەی ذەکـوان ، پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرمووی : (( من أحب أن ینظر إلى رجل یطأ بقدمه غداً خضــراء الجنـــة ، فلینظر إلى هذا )) . فەرمووی : هەرکـەس پێـی خۆشـە سـەیری پیاوێـك بکـا کـە سبەینێ پێ ئەخاتە سەیرانگاکانی بەهەشتەوە ، با سەیری ئەمـە بکـا .. ذەکـوان ئەو هاوەڵە بەڕێزە جێ متمانەیە بوو کە ئـەو شـەوەی سـوپای پێغەمبـەر ﷺ لـە ناوچەی ( شیخین ) مایەوە ، کاتێ کە ئەی ویست بەرەو ئوحود بڕوات ، ئەو شەوە پاسەوانی پێغەمبەری خوا بوو .
٢ ـ عوبەیدی کوڕی موعەللا .
( ك ) لە نەوەی سوادی کوڕی مالیك ، یەك پیاو کە :
١ ـ مالیکی کوڕی ئەیاسە .

( ل ) لە نەوەی عەمری کوڕی مالیك ، یەك پیاو کە :

١ ـ ئەیاسی کوڕی عەدی‌یە .

( م ) لە نەوەی سالمی کوڕی عەوف ، یەك پیاو کە :

١ ـ عەمری کوڕی ئەیاسە .

( ن ) لە نەوەی عیجلان یەك پیاو کە :

١ ـ عەبدوڵڵای کوڕی سەلەمەی بەلەوی‌یە ، بەشداریی جەنگی بەدری کردووە، پاڵەوانێکی بەجەرگ بووە . کە شەهید کرا دایکی ماوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرت تا تەرمەکەی بەرێتەوە بۆ مەدینە ، تا بێ تاقەتیی نەکا بۆی ، ئەویش ماوەی دا .

هەروەها پیاوێکی جوولەکەش بە ناوی موخەیریق ، کە لە پێشەوە باسی هاتووە ، کوژراوە .

چوار پیاوی موهاجیریی و ، بیست و چواری ئەوسیی و ، چل و یەکی خەزرەجیی و جوولەکەیەك ئەمە حەفتا پیاو . بەڵام زامدارانی موسڵمانان لە جەنگی ئوحوددا ، هیچ مێژوونووسێك یەك بە یەك تۆماری نەکردوون و ، وەك شەهیدەکان بە وردیی سەرژمێریی نەکراون . بەڵام بە وردبوونەوە لە هەواڵەکان ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە موسڵمانەکان زامداریان زۆر بوون و ، لە صەد و پەنجا زامدار کەمتر نەبوون .

لە ( السيرة الحلبية ) دا ( ٢ / ٥٠ ) هاتووە کە تەنها لە نەوەی سەلیمەدا چل کەس زامدار بوون ، بە مەرجێ لەم هۆزەدا تەنها چوار پیاو شەهید بوون .

بەڵام لە سوپای موسڵمانان‌دا یەك کەس بە دیل نەگیراوە .

**( ب ) کوژراوانی قورەیش :**

زەرەر و زیانی قورەیش لە جەنگی ئوحوددا لە موسڵمانەکان کەمتر بوو ، بەڵام هەر چۆنێ بێ لە نیوەی ئەوان تێ ئەپەڕین و ، ئەم جەنگە تۆیەی بە قورەیش کرد کە ئیتر بوێرن روو لە دەست و شمشێری موسڵمانان بکەن ، بۆیە کە بۆ جەنگی ئەحزاب هاتنە سەر مەدینە ، ناچار بوون سوپایەکی دە هەزاریی لەو عەرەبە مشە خۆرانەی دوورگە کۆ بکەنەوە بە نیازی تاڵان و بڕۆی مەدینەوە هێرشیان کردە سەر دەوڵەتە نەونەمامەکەی ئیسلام .

ئەمانەش ناوی کوژراوەکانی قورەیشن لە جەنگی ئوحوددا :

( أ ) له نەوەی عەبدوددا‌ری کوڕی قوصەی کوڕی کیلابی کوڕی موڕڕەی کوڕی کەعب یانزە پیاو کوژران کە هەر هەموویان هەڵ گری ئاڵای قورەیش بوون و له سەرەتای جەنگ دا ، وەك هەورە تریشقە موسڵمانەکان هەڵمەتیان دایە سەریان و یەك لە دوای یەك ملیان پەڕاندن و بە کوژرانی ئەمانە پشتی قورەیش شکا و تێك شکانێکی تری لە بەدر سەخت‌تر باوەشی بۆ ئەگرتنەوە ، ئەگەر هەڵەی تیرهاوێژە موسڵمانەکانی سەر ( جبل الرماة ) نەبوایە ، کوژراوەکانیش ئەمانە بوون :

١ ـ طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحە ، کە طەلحەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولعوززای کوڕی عوثمانی کوڕی عەبدوددارە و ، عەبدودداریش برای عەبدمەنافی کوڕی قوصەی باپیرە گەورەی پێغەمبەری خوایە ﷺ هەتا ئێستەش ( آل شيبي ) لە سعوود کە لە نەوەی عەبدوددارن کلیلی کەعبەیان لە دەستدایە .
ئەم طەلحەیە بە دەستی زوبەیری کوڕی عەووام کوژرا .

٢ ـ ئەبوسەعدی کوڕی ئەبوطەلحە ، کە سەعدی کوڕی ئەبووەققاص کوشتی .

٣ ـ عوثمانی کوڕی ئەبوطەلحە ، کە حەمزە کوشتی .

٤ ـ موسافیع ی کوڕی ئەبوطەلحە ، کە بە تیر لە دوورەوە عاصیمی کوڕی ثابیتی کوڕی ئەبوئەفلەح کوشتی .
ئەم چوارەی پێشەوە برابوون .

٥ ـ جولاسی کوڕی طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحە ، ئەمیش بە تیری عاصیمی کوڕی ثابیت کوژرا .

٦ ـ حاریثی کوڕی طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحە ، کە بە دەستی قوزمان کوژرا ..

٧ ـ کیلابی کوڕی طەلحەی کوڕی ئەبوطەلحە ، ئەمیش هەر قوزمان کوشتی .
بەڵام بەلای ( ابن هشام ) ەوە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف کوشتوویە .
ئەم سیانەشیان کوڕی یەکەم کوژراو بوون .

٨ ـ ئەرطئەی کوڕی شورەحبیلی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی عەبدوددار ، کە ئامۆزای موصعەبی کوڕی عومەیر بووە . حەمزە کوشتوویە .

٩ ـ ئەبویەزیدی کوڕی عومەیری کوڕی هاشمی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی عەبدوددار ، کە برای موصعەب بووە ، ئەمیش قوزمان کوشتوویە .

١٠ ـ قاسطی کوڕی شورەیحی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی عەبدوددار ، کە ئامۆزای موصعەب بووە ، ئەمیش قوزمان کوشتوویە .

١١ ـ صەوواب ، بەندەیەكی حەبەشی‌یان بووە ، ئەمیش قوزمان كوشتوویە .
ئەشڵێن : ئیمام عەلیی ، یان سەعدی كوڕی ئەبووەققاص كوشتوویە .
( ب ) لە نەوەی ئەسەدی كوڕی عەبدولعوززای كوڕی قوصەی ، یەك پیاو كە :
١ ـ عەبدوڵڵای كوڕی حەمیری كوڕی زوهەیر بووە ، كە عەلیی كوڕی ئەبوطالیب كوشتوویە .
( ج ) لە نەوەی زوهرەی كوڕی كیلاب ، دوو پیاو كە ئەمانەن :
١ ـ ئەبولحەكەمی كوڕی ئەخنەسی كوڕی شەریقی كوڕی عەمری ثەقەفیی ، كە عەلیی كوڕی ئەبوطالیب كوشتوویە .
٢ ـ سیباعی كوڕی عەبدولعوززای خوزاعیی ، كە حەمزە كوشتوویە .
( د ) لە نەوەی مەخزوومی كوڕی یەقظە ، چوار پیاو كە ئەمانەن :
١ ـ هیشامی كوڕی ئەبوئومەییەی كوڕی موغیرە ، كە ئامۆزای خالید بووە و، ئەمیش قوزمان كوشتوویە .
٢ ـ وەلیدی كوڕی عاصی كوڕی هیشامی كوڕی موغیرە ، كە ئامۆزازای خالید بووە و ، ئەمیش قوزمان كوشتوویە .
٣ ـ ئەبوئومەییەی كوڕی ئەبوحوذەیفەی كوڕی موغیرە ، كە ئامۆزای خالید بووە و ، عەلیی كوڕی ئەبوطالیب كوشتوویە .
٤ ـ خالیدی كوڕی ئەعلەم كە هاوپەیمانی نەوەی مەخزووم بووە و ، ئەمیش قوزمان كوشتوویە .
( هـ ) لە نەوەی جومەح ، دوو پیاو كە ئەمانەن :
١ ـ ئەبوعیززە ، عەمری كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عومەیری كوڕی وەهب ، دوای ئەوەی كە پەیمانی شكاند و بۆ جاری دووەم كەوتە دەست موسڵمانان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا لە ملی بدرێت .
٢ ـ ئوبەی كوڕی خەلەفی كوڕی وەهب ، كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی پیرۆزی خۆی تەنها ئەم پیاوە بەدبەختەی كوشتووە .
( و ) لە نەوەی عامری كوڕی لوئەی ، دوو پیاو كە ئەمانەن :
١ ـ عوبەیدەی كوڕی جابیر ، كە ئەمیش قوزمان كوشتی .
٢ ـ شەیبەی كوڕی مالیكی كوڕی موضەرریب ، ئەمیش قوزمان كوشتی .
هەندێكیش ئەڵێن : عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود كوشتوویە .

ئەمە بیست ودوو کەس کە لای ( إبن هشام ) تۆمار کراون ، بەڵام کوژراوانی قورەیش هەر ئەمانە نین و ، مێژوونووسانی تر کوژراوی تریان هەڵ داون :

١ ـ ( إبن القیم ) لە ( زاد المعاد ) دا ( ج ٢ ص ٢٤٠ ) ئەوەی باس کردووە کە سەعدی کوڕی ئەبووەققاص لە هێرشی قورەیش‌دا بۆ سەر کێوی ئوحود ، سێ بت پەرستی کوشتووە .

٢ ـ ئیبن ئیسحاقیش لەو فەرموودەدا کە زوبەیر ریوایەتی کردووە ، ئەوەی باس کردووە کە ئەبودوجانە پیاوێکی لە بت‌پەرستان کوشتووە .

٣ ـ کەعبی کوڕی مالیکی هاوەڵی بەناوبانگیش ریوایەتی کردووە ، وەك لە ( البدایة والنهایة : ٤ / ١٧ ) دا هاتووە کە ئەبودوجانە پیاوێکی تری لە بت پەرستان کوشتووە ، کە بە شمشێرێك دوو کەرتی کردووە .

٤ ـ هەروەها حاریثی کوڕی صومە ( لە کاتی کشانەوەی موسڵمانان‌دا بۆ سەر کێوەکە ) عوثمانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موغیرەی کوشتووە ، کە ویستوویە هێرش بکاتە سەر پێغەمبەر ﷺ ، وەك لە ( السیرة الحلبیة : ٢ / ٣٠ ) دا هاتووە .

٥ ـ هەروەها ئەبودوجانەش ( لەکاتی کشانەوەدا ) عوبەیدوڵلای جابریی کوشتووە کە هەوڵی دا حاریثی کوڕی بکوژێ ، وەك لە ( السیرة الحلبیة : ٢ / ٣٠ ) دا هاتووە .

٦ ـ هەروەها حاطبی کوڕی ئەبوبەلتەعە عوتبەی کوڕی ئەبووەققاصی کوشت، کاتێ کە هێرشی کردە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ و دانی تەختی شکاند ، ئەمەش لە کاتی شپرزەبوونی موسڵمانان‌دا . وەك لە ( السیرة الحلبیة : ٢ / ٢٧ ) دا هاتووە .

٧ ـ هەروەها لە ( السیرة الحلبیة : ٢ / ٤٥ ) دا هاتووە کە حاریثی کوڕی صومە ، لە کاتی کشانەوە بۆ سەر کێوەکەدا ، چاوی بە لاشەی حەوت کوژراوی قورەیش ئەکەوێت لەبەر دەستی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف‌دا ، ئەمیش لێی ئەپرسێ : ئایا ئەمانە هەموویان تۆ کوشتووتن ؟ عەبدوڕڕەحمان ئەڵێ : ئەم دوانەیان من کوشتوومن ، بەڵام ئەوانەیان کەسێك کوشتنی کە من نەم ئەدیی جا ( ابن برهان الدین ) لە ( السیرة الحلبیة ) دا وەهای بۆ چووە کە ئەو پێنجەی تر بۆ بەرگریی لە عەبدوڕڕەحمان مەلائیکەت کوشتوونی .

ئەمە پانزە کوژراوی تری قورەیش کە ( إبن إسحاق ) لە ناو ئەو بیست و دوو کەسەدا باسی نەکردوون . بەم پێیە ژمارەی کوژراوانی ئوحود سیی و حەوت پیاون ، نەك بیست و دوو .

بەڵام زامدارانی قورەیش ، ئەوانیش ژمارەیان نەزانراوە ..[429]

**بیست و سێهەم : قورئان باسی جەنگەکە ئەکات :**

لە راستییدا قورئانی پیرۆز بە درێژە باسی جەنگی ئوحودی کرد .. دەربارەی ئوحود شەصت ئایەت لە قورئانی پیرۆز هاتنە خوارەوە و ، باسی لایەنە جۆر بە جۆرەکانی و ، ئەو ئالۆ گۆڕ و شپرزەبوونەی موسڵمانەکانی ئەکرد ، تا موسڵمانەکان پەند لەو جەنگە ناهەموارە وەربگرن . ئەتوانین ئەو باسانە لە چەند خاڵێکدا بخەینە بەر دەستی ئازیزانمان :

١ ـ قۆناغی یەکەمی جەنگەکە باس ئەکات کە بریتی‌یە لە خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَـٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ ( آل عمران : ١٢١ )

٢ ـ پاشان قورئان باسی ئەو کۆمەڵە مونافیقە ئەکات کە سێصەد کەس ئەبوون و ، بەسەرکردایەتیی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵ گەڕانەوە و ، لە نیوەی رێدا ، کە بەرەو ئوحود ئەچوون ، گەڕانەوە بۆ مەدینە ، ئەوەتا ئەفەرموێ :

﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ ۚ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ قَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَـٰكُمْ ۗ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَـٰنِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ وَقَعَدُوا۟ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا۟ ۗ قُلْ فَٱدْرَءُوا۟ عَنْ أَنفُسِكُمُ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٦٧ - ١٦٨ ) .

٣ ـ هەروەها قورئان باسی ئەو دابەش‌بوونە پڕمەترسی‌یە ئەکات ، کە بە بۆنەی هەڵگەڕانەوەی مونافیقەکانەوە ، خەریك بوو لە ناو سوپای ئیسلام دا روو بدات ، بەرلەوەی سوپا بگاتە شوێنی خۆی لە ئوحود . ئەفەرموێ :

---

[429] غزوة أحد : ٢٦٣ ـ ٢٨٠ ، السيرة النبوية لأبـي شهبة : ٢ / ٢١١ ـ ٢١٤ ، الرحيق المختوم : ٢٨٩ .

﴿ إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٢٢ ) .

تەفسیرنووسان و مێژوونووسان تەفسیری ئەم ئایەتەیان وەها کردووە ، کە مەبەست بەو دوو تایەفەیە کە وەسوەسەی مونافیقان کاری کردبووە سەر دڵیان و ، نیازیان بوو لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵ بگەڕێنەوە ، بەڵام خوا لەو کارە ناهەموارە ئەوانی دڵسۆز و نییەت پاکی پاراست ، دوو هۆزی ئەنصار بوون کە یەکێکیان نەوەی سەلیمەی خەزرەجیی و ، ئەوی تریشیان نەوەی حاریثەی ئەوسیی بوون ..

ئەم دوو هۆزە بە بۆنەی ئیخلاصیانەوە خوای گەورە لە وەسوەسەی شەیتان پاراستنی و ، مەردانە لە خزمەتی پێغەمبەرەکەیان‌دا هەتا کۆتایی جەنگ بە راستگۆیی مانەوە و ، بەشداری‌یەکی پاڵەوانانەی جەنگیان کرد ، هەتا ئەوەبوو لە نەوەی سەلیمە چوار پیاو شەهید بوون و ، چلیشیان لێ زامدار بوون .

٤ ـ پاشان قورئان ئاماژە بۆ ئەو سەرکەوتنە خێرایەی موسڵمانان ئەکات کە کە لە سەرەتای جەنگ‌دا ، بە بۆنەی گوێڕایەڵیی و فیداکاری‌یانەوە ، خوای گەورە پێشکەشی کردن و ، سوپای مەککەی تێك شکاند و تەفر و توونای کرد ، کە ئەفەرموێ :

﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ ﴾ ( آل عمران : ١٥٢ ) .

٥ ـ پاشان قورئان ئاماژە بۆ نەزانکاریی تیرهاوێژەکانی سەر ( جبل الرماة ) ئەکات ، کە لە ئەمیرەکەیان هەڵ ئەگەڕێنەوە و، بە بۆنەی دنیا خۆش‌ویستنەوە ، گردەکە بەجێ ئەهێڵن و ، سەرەنجام ئەبنە مایەی شکست‌خواردنی موسڵمانان و ، لە دەست دەرچوونی ئەو سەرکەوتنەی کە لە سەرەتای جەنگ‌دا موسڵمانەکان بە دەستیان هێنا ، تا ئەوەبوو کۆمەڵێك پیاوی ئیسلام شەهید ئەبن و قوڕەیشی پەرتەوازە و شلەژاویش خۆی کۆ ئەکاتەوە و بە هێرشەوە دێتە سەر فەرماندایەتیی موسڵمانان و پێغەمبەری خوا ﷺ زامدار ئەبێت و ، کۆمەڵێك پاڵەوانیش شەهید ئەبن .

قورئان تیرهاوێژەکان بە دوو دەستەی جیاواز ناو ئەبات .. هەندێکیان بە دنیا ویست ناو ئەبات کە ئەوانەن لە عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری ئەمیریان هەڵ گەڕانەوە

و ، کۆمەڵێکیشیان بە قیامەت ویست ناو ئەبات کە ئەوانەن لەسەر گردەکە لەگەڵ ئەمیر مانەوە و بەردەوام بەرگرییان ئەکرد هەتا ئەسپ سوارانی خالید هەموویان شەهید کردن .. شایانی باسە ئاماژەی چاوپۆشیی بۆ هەڵەکەرانیش لە ئایەتەکەدا هاتووە ، کە ئەفەرموێ :

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ( آل عمران : ١٥٢ ) .

٦ ـ پاشان قورئانی پیرۆز باسی دامەزراویی پێغەمبەری خوا ئەکات ، لە کاتێکدا کە موسڵمانەکان پەرتەوازە بوو بوون و ، شڵەژا بوون و ، نەیان ئەزانی چیی بکەن ، سەرەڕای ئەو هەموو ترس و لەرزەی کە چووبووە دڵی هەندێکیانەوە :

﴿ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٥٣ ) .

دوای ئەوەی کە موسڵمانەکان سەریان لێ شێوا ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەشی دواوەی سوپادا ، لە بنکەی فەرماندەیی خۆیەوە ، بەوپەڕی دامەزراوییەوە ، داوای لە موسڵمانان ئەکرد کە خۆیان بگەیەننە لای ئەو و ، لەلای کۆببنەوە ، تا ریزەکانیان یەك بخەنەوە و ، بچنەوە دۆخی بەهێزی جارانیان .

٧ ـ هەروەها قورئان باسی پاگاندەی کوژرانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکات ، کە چۆن ئەو پاگاندەیە کارێکی یەکجار سەلبیی کردە سەر وورەی موسڵمانان و ، دەست و پەلی هەندێکی وەها شکاند کە شمشێر فڕێ بدەن و دەستە ئەژنۆ لێی دابنیشین و جەنگ نەکەن . جا قورئان موسڵمانەکان لەوە تێ ئەگەیەنێ کە موحەممەد ﷺ مرۆڤێکە وەك ئەو هەمووانە و ، ئەویش مردنی لە ڕێدایە و بە هەتا هەتایی لە دنیادا نامێنێتەوە ، هەتا ئەگەر لە جەنگیشدا شەهید ببێ ، نابێ شوێنکەوتوانی دینەکەی چەك دانێن و دەست بەرداری دینی حەق بن ، بەڵکو پێویستە چاکتر لە جاران چەك هەڵ گرن و بەرگریی لەو ڕێگا راستە بکەن کە ئەو ئازیزەیان هێناویەتی و لە پێناویدا سەری ناوەتەوە . چونکە ئەگەر مرۆڤەکان لەم

دنیادا فانیی بن ، خۆ دینی خوا هەمیشەیی‌یە و هەتا هەتایە ئەمینێتەوە ، کە ئەفەرموێ :
﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِين مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾
( آل عمران : ١٤٤ ) .

٨ ـ هەروەها قورئان ئاماژە بۆ غیرەت و ئازایەتیی و جوامێریی موسلمانان ئەکات کە چۆن حەزیان لە شەهیدیی بووە لە پێناوی خوادا :
﴿ وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ ٱلْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٤٣ ) .

٩ ـ هەروەها ئاماژە بۆ ئەو دەستەیەی موسلمانان ئەکات کە لە کاتی شپرزەبوونەکەدا ورەیان بەر دا و ، لە جیاتیی ئەوەی کە خۆیان بگەیەننە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بنکەی فەرماندەیی‌دا ، کشانەوە بۆ مەدینە :
﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟ ۖ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾ ( آل عمران : ١٥٥ ) .
ئەوانە شەیتان لە خشتەی بردن ، بەڵام خوای گەورە چاوپۆشیی لێ کردن .

١٠ ـ هەروەها قورئانی پیرۆز موسڵمانەکان ئاگادار ئەکاتەوە کە ئەگەر ئەوان لە ئوحوددا تووشی زەرەر و زیان بووبن ، بە هۆی هەڵەی دەستەیەکیانەوە بووە ، کە تیرهاوێژەکانن ، جا کە پرسیار ئەکەن ئەمە چی‌یە ؟ وەك بڵێی ئێمە بە تەمای سەرکەوتن بووین نەك تێكشکان ، ئەی موحەممەدی خۆشەویستمان ! پێ‌یان بڵێ : ئەم شکستە ئەنجامی کاری هەڵەی خۆتانە . بە مەرجێ ئەوەی لە ئێوە قەوماوە ، کە شەهیدبوونی حەفتا پیاوتانە ، لە جەنگی بەدردا قورەیش دوو ئەوەندە زیانیان لێ کەوت ، کە ئەویش کوژرانی حەفتا پیاو و ، بە دیل گیرانی حەفتا پیاویان بوو.
قورئان ئەفەرموێ :
﴿ أَوَلَمَّآ أَصَـٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَـٰذَا ۖ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ﴾
( آل عمران : ١٦٥ ) .

١١ ـ هەروەها قورئان موسڵمانەکان وریا ئەکاتەوە کە مردن کارێکی ئەوەندە سەخت و ناهەموار نیە ئەوان لێی بترسن ، چونکە هەر کەسە ئەجەلێکی دیاری کراوی هەیە و تا کاتی نەیەت مرۆڤ نامرێت ، کە ئەفەرموێ :

﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا ﴾ ( آل عمران : ١٤٥ ) .

١٢ ـ پاشان قورئانی پیرۆز سەرنجی سوپای موسڵمانان بۆ ئەوە رائەکێشێ کە ئەوان یەکەم سوپایەکی ئیماندار نین لەگەڵ پێغەمبەرەکەیان تووشی بەلا و تاقیی کردنەوە بووبن ، بەڵکو زۆربەی پێغەمبەران ، بە خۆیان و سوپایانەوە تووشی بەلا و موصیبەت بوون ، لەگەڵ ئەوەشدا ورەیان بەرنەداوە و ، بەردەوام لە خزمەتی پێغەمبەرەکەیاندا ، بەرامبەر بە دوژمنی کافریان ، خەریکی جەنگ و کوشتار بوون و ، هەر چەندە لێیان کوژرا بێ و لێیان زامدار بووبێ ، هەتا ئەگەر کوژراوەکەش پێغەمبەرەکەیان بووبێ ، ئەوان شانیان شل نەکردووە و ، بەوپەڕی غیرەتەوە لەسەر دینی خۆیان ماونەتەوە و ، بەرگرییان لێ کردووە و ، بەردەوام لە خوای گەورە داوای دامەزراویی و سەرکەوتنیان کردووە . تا لە ئەنجامدا خوای گەورە پاداشتی دنیایی پێ بەخشین و ، بە جوانترین شێوەش لە قیامەتدا پاداشتی دانەوە . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسْتَكَانُواْ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْءَاخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٤٦ - ١٤٨ ) .

١٣ ـ دوای ئەوە قورئان ئاماژە بۆ شەهیدبوون و زامداربوونی موسڵمانەکان ئەکات و لەسەر دامەزراویی و کۆڵ نەدان هانیان ئەدات ، تا ورە و هێزی مەعنەوییان دانەبەزێ و ، خەم و خەفەتیش نەخۆن ، چونکە یاسای خوا وەهایە کە بردنەوەی جەنگ بە نۆبە بێت و ، مەرج نیە موسڵمانان هەمیشە سەرکەون ، بە تایبەت ئەو کاتانەی کە لە فەرمان دەرئەچن . هەروەها ئەگەر موسڵمانان لێیان نەکوژرێ ، ئەی چۆن پلەی شەهیدیی وەربگرن و ، بە ئاواتی خۆیان بگەن . شایانی باسە کە ئەوانەی لە ئوحوددا شەهید بوون بەشی زۆریان خۆیان ئاواتیان

خواستبوو کە شەهیدی‌یان دەست بکەوێ . هەروەها موسڵمانان پێویستی‌یان بە تاقیی‌کردنەوە هەیە ، تا دەرکەوێ تا چ رادەیەك ئامادەی سەروماڵ بەخشینن .

قورئان ئەفەرموێ :

﴿ وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَمْحَقَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٣٩ - ١٤١ ) .

١٤ ـ پاشان قورئان روونی ئەکاتەوە کە شکستهێنانی ئیمانداران و شەهیدبوون و زامداربوونی هەندێکیان بۆ ئەوەیە کە تاقیی بکرێنەوە ، تا دەر بکەوێ کە کێ خۆی بە خوا فرۆشتووە و ، مونافیقە خۆ هەڵواسەکانیش دەربکەون و ، ئیمان‌داری لاوازیش جیا بکرێنەوە . قورئان ئەفەرموێ :

﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾ ( آل عمران : ١٧٩ ) .

هەروەها ئەفەرموێ :

﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٤٢ ) .

١٥ ـ هەروەها ئاماژە بۆ ئەو دڵئارامیی و هێمنی‌یە ئەکات کە خوا خستیە دڵی ئیمان‌دارانەوە و ، دوای ئەو شپرزەیی و شڵەژانەیان دامەزراویی پێ بەخشین.

ئەفەرموێ :

﴿ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ﴾ ( آل عمران : ١٥٤ ) .

لە کتێبەکانی سیرەت‌دا چەسپاوە کە دوای شکستهێنانەکە هەندێ لە موسڵمانان خەونووچکە ئەی‌بردنەوە . زوبەیری کوڕی عەووام وتوویە : رۆژی ئوحود لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین ﷺ ، کاتێك کە ترس دەورەی دابووین ، یەك بە

یەکمان خەو ئەی‌بردینەوە بە رادەیـەك کـە زنجـی هـەر یەکـەمان نووسـا بـوو بـە سنگیەوە .

لە کەعبی کوڕی عـەمری ئەنصارییشەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : خۆم و چـواردە خزمم لە تەنیشت پێغەمبەری خوادا بووین ﷺ کە تووشی خەونووچکە بـووین بـە هۆی ئەو دڵ بێ‌خەمی‌یەوە کە خوا پێمانی بەخشـیی ، ئـەوەبوو یـەك بـە یـەکمان پرخەی لێ دا ، بە رادەیەك کە قاپەکان ئەیان دا لە یەك و ، چاویشـم لێ بـوو کـە شمشێرەکەی بەڕائی کوڕی مەعروور لە دەستی کەوتە خوارەوە و ، لەبەر خەواڵوویی هەستی پێ نەکرد .

جا ئەم خەواڵوویی‌یە بەڵگەی دڵ ئارامیی و نەبوونی ترسە لە ڕۆشنایی ڕۆژدا ، بێ‌ئەوەی هێشتا جەنگ کۆتایی هاتبێ ..

١٦ ـ قورئان ئاماژە بۆ دەستەیەکی تری سوپای ئوحود ئەکات کە دەستەیەکی ئیمان‌دارن ، بەڵام لاواز و بەرگە نەگرن و ، بۆڵە و گلەیی لە دەمیان دەرئەچێت :

﴿ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ ( آل عمران : ١٥٤ ) .

١٧ ـ هەروەها ئاماژەی بۆ ئەو هەڵوێستەی هەندێ لە ئیمان لاوازەکان کردووە، کـە ئـەوەبوو دوای شکسـتی موسـڵمانەکان و بڵاوبونـەوەی پاگانـدەی کـوژرانی پێغەمـبەری خوا ﷺ ، هەندێ ویستیان پەیوەنـدیی بـە سـەرۆکی مونافیقەکانـەوە بکەن تا لەلای ئەبوسوفیان ئەمانیان بـۆ وەربگـرێ . قورئـانی پـیرۆز ئەوانـەش و تێکڕای موسڵمانانی بۆ ئەوە هەڵ نا با دان بە خۆیاندا بگـرن و ، خۆیـان نەدەنـە دەست ئەو ئاژاوەچیی و سەرگەردانانەی کە خۆشیان نـازانن خـەریکی چین ، کـە ئەفەرموێ :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴾(آل عمران : ١٤٩ـ١٥٠).

١٨ ـ هەروەها قورئان هەڵوێستی نامەردانەی مونافیقان دەرئەخات کە پێی خۆشبوونی خۆیان دەرئەبڕیی و دەستیان بەسەر سنگیانا ئەهێنا ، بە بۆنەی شکستخواردنی موسڵمانانەوە ، بەوەی کە هەندێکیان لێ شەهید بووبوون ، کە ئەیانوت : ئەگەر ئەوانە لەگەڵ خۆمان دا بوونایە نەئەکوژران ، قورئان ئەفەرموێ :

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١٥٦﴾ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿١٥٧﴾ وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٥٦ - ١٥٨ ) .

١٩ ـ مونافیقان پاگاندەیەکی تریان بەناو مەدینەدا بڵاو ئەکردەوە تا دڵی خەڵکیی لە ئیسلام سارد بکەنەوە ، کە ئەیان وت : ئەگەر موحەممەد پێغەمبەر بوایە شکستی نەئەخوارد و زامداریش نەئەبوو ، قورئان ئامۆژگاریی پێغەمبەر و موسڵمانان ئەکات تا خەفەت بۆ ئەو سەرگەردانانە نەخۆن ، چونکە ئەوانە هیچ نین و توانایان نیە زیان بە خوا بگەیەنن . ئەوانە دۆڕاوی دنیا و قیامەتن ، کە ئەفەرموێ :

﴿ وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ ( آل عمران : ١٧٦ ) .

٢٠ ـ پاشان قورئان باسی هەڵوێستی مەردانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکات کە بەرامبەر ئەوانە نواندی کە لە فەرمانی دەرچوون و گوێڕایەڵی یان بۆ نەخشەکانی نەکرد و ، بوونە هۆی شکستی موسڵمانان ، دوای ئەوەی کە خەریک بوو بگەنە لووتکەی سەرکەوتن ، هەروەها بەرامبەر بەوانەی کە دوای شپرزەبوون مەیدانی جەنگیان بەجێ هێشت . ئەمەش کۆمەکیی خوا بوو وا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هەڵوێستە جوانەی گرتە بەر و ، سزای ئەو هەڵەکارانەی نەدا و ، دڵی نەشکاندن و، بە نەرم و نیانیی لەگەڵیان جووڵایەوە و ، سەرەنجام ئەوانیش دڵیان زیاتر لە جاران بۆ خزمەتی ئیسلام گەرم بوو و ، بە دڵ و بە گیان چوونەوە ژێر فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ قورئان ئەفەرموێ :

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٥٩ ) .

**٢١ ـ هەروەها قورئانی پیرۆز باسی ئەو غیرەت و ئازایەتی‌یەی پێغەمبەر و سوپای ئوحود ئەکات کە چۆن دوای چەند سەعاتێك لە کۆتایی هاتنی جەنگی ئوحود ، کەوتنە شوێن سوپای مەککە و راویان نا و ، سەلماندیان کە شێرەکانی مەدینە بۆ هیچ هێزێك مل دانانەوێنن و ، سەرکەوتنیش هەر هی خۆیانە و بەس . قورئان ئەفەرموێ :**

﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴾ ( آل عمران : ١٧٢ ـ ١٧٤ ).

**٢٢ ـ لە دوا خاڵدا ئەبینین قورئان باسی پایە و پلەی شەهیدان ئەکات ، کە نابێ حیسابی مردوویان بۆ بکرێ . قورئان ئەفەرموێ :**

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾

۞ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٦٩ ـ ١٧١ ) ..[٤٣٠]

**بیست و چوارەم : کۆسپەکانی بەردەم سوپای ئوحود :**

**بە راستیی رووداوەکانی جەنگی ئوحود زنجیرە تاقیی‌کردنەوەیەکی یەکجار سەخت بوون ، بۆ هەڵسەنگاندنی ئیمان و ئیخلاصی موسڵمانەکان ، تا بەهێز و لاواز و ، پاك و پیس جیا بکرێنەوە .**

---

[٤٣٠] غزوة أحد : ٢٨٠ ـ ٢٩٢، الرحيق المختوم: ٢٩٣ ـ ٢٩٤، السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٢٠ ـ ٢٢٦.

لە غەزای بەدردا موسڵمانەکان زۆر بە ڕێك و پێکیی چووبوونە ژێر ئاڵای پێغەمبەری خواوە ﷺ و ، بە چاکیی فەرمانەکانیان ئەنجام ئەدان و ، هیچ کەمتەرخەمی‌یەك لە کارەکانیان‌دا دەرنەئەکەوت ، بۆیە ئەنجامی باشی دا و سەرکەوتن پێشکەش بە موسڵمانان کرا .

بەڵام لە غەزای ئوحوددا کۆسپ و تەگەرەی زۆر هاتنە بەردەم سوپای ئیسلام ، ئەمەش پێش ئەوەی کە سوپا مەدینە بەجێ بهێڵێ .

یەکەم جار ناجۆری‌یەك لە بیرکردنەوە و نەخشەکێشان‌دا لە نێوان فەرماندەی گشتیی ، کە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ ، کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی لەگەڵیا هاوڕا بوو و ، کۆمەڵی فەرماندەکانی سوپادا ، کە گەنجە خوێن‌گەرمەکان پشت‌گیری‌یان ئەکرد ، ڕووی دا .

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕای وەها بوو کە موسڵمانەکان لە ناو شاردا بمێننەوە و ، ئەگەر قوڕەیش هێرشی کرد ، لە شەقامەکانی مەدینەدا بچن بە گژیا . بەڵام فەرماندەکان و ، ئەو گەنجە خوێن‌گەرمانەی کە لە پاداشتی بەدر بێ‌بەش بوو بوون ، دڵیان گڕی گرت بوو و ، پێ‌یان خۆش بوو لە شار دەرچن ، تا زووبەزوو بچن بە گژی دوژمن‌دا و ، سەروماڵ بەخت‌کردنی سەربازەکانی ئیسلام بۆ عەقیدەکەیان بسەلمێنن . لە ئەنجام‌دا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕای زۆربەی موسڵمانانی وەرگرت و بڕیاری دا کە لە شار دەرچن .

ئەم ناجۆری‌یە کارێکی ئاسان بوو و ، بە ئاسانیی چارەسەر کرا ، بەڵام لە ڕێگادا کە سوپای ئیسلام ، بە سەرکردایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو ئوحود ئەڕۆی ، ناجۆری‌یەکی تر دروست بوو ، کە ڕەنگ دانەوەی ناجۆریی یەکەم بوو .

کە پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لە ڕای خۆی هێنا و بە گوێی فەرماندەکان و گەنجەکانی کرد ، سەرۆکی نیفاق ئەمەی گرتە دڵ و ، لە نیوەی ڕێ‌دا بە خۆی و سێ‌صەد موونافیقەوە گەڕانەوە دوا و ، لێك دابڕانێکی گەورەی بەرپا کرد و ، مەترسی‌یەکی یەکجار گەورە ڕووی کردە سوپای موسڵمانان ، کە خەریك بوو ببێتە مایەی پەرتەوازەبوونی سەربازەکان و هەڵوەشانەوەی سوپا ، بێ‌ئەوەی گەیشتبێتە لای دوژمن ..

دوای ئەم هەڵگەڕانەوەیەی مونافیقان و گەڕانەوەیان بۆ ناو شار چەندین زەحمەت و مەینەت و تاقیی‌کاریی سەخت هاتنە بەردەم پێغەمبەری فەرماندە و هاوەڵەکانی ..

یەکێ لەو ناڕەحەتی‌یانە بریتی بوو لەوەی کە دوو هۆزی تر خەریك بوو هەڵ بگەڕێنەوە و ، دەست بەرداری جەنگ بن ، ئەگەر سۆزی خوایان فریا نەکەوتایە ..

یەکێ تر لەو ناڕەحەتی‌یانە ئەوەبوو دوای هەڵ گەڕانەوەی مونافیقان هەندێ لە فەرماندەکان داوای ئەوەیان ئەکرد کە ئەو مونافیقانە تەمێ بکرێن و ، لە ناو ببرێن مادام لەو کاتە ناسکەدا پشتی ئیسلامیان بەر دا .. خۆ ئەگەر وەها بکرایە ئەوا سوپای ئیسلام تووشی مەینەتێکی زۆر ئەهات و سەرەنجامێکی یەکجار خراپی ئەبوو . بەڵام خوای گەورە پێغەمبەری ئازیزی ﷺ خستە سەر رێبازی حیکمەت و ژیریی و ئەو کارەی ئەنجام نەدا و وازی لە مونافیقان هێنا .

لەگەڵ ئەمەش‌دا سوپای موسڵمانان مەردانە چووە مەیدانی دوژمنەوە و ، جەنگێکی پیاوانەی کرد و ، هەر چەندە سوپای مەککە زۆر بە تفاق و بەهێز بوو ، ئەو سوپا بچکۆلە لە سەرەتادا دەستێکی چاکی لە سوپای مەککە وەشاند و لە مەیدانی جەنگ‌دا راوی نا ..

بەڵام کارەساتێکی چاوەڕوان نەکراو هاتە بەردەم سوپای مەدینە کە بە زیانێکی گەورە لێی دەرباز بوو ، ئەویش چۆڵ کردنی ( جبل الرماة ) بوو لەلایەن تیرهاوێژەکانەوە ، تا ئەوەبوو حەفتا شەهیدیان دا و ، سەرکەوتنەکەی لاپەڕەی یەکەمی جەنگیان لە دەست دەرچوو و ، سوپا تێك شکاوە هەڵاتووەکەی مەککە هەڵ گەڕایەوە و هاتەوە ناو مەیدانی جەنگ و ، ئابلووقەی موسڵمانانیان دا ..

بەڵام موسڵمانەکان نەخۆیان بە دەستەوە دا و ، نە کەل وپەل و چەکیان کەوتە دەست دوژمن و ، نە مەیدانی جەنگیان چۆڵ کرد بۆ دوژمن ، هەروا جەنگان تا خۆیان لە ئابلووقە رزگار کرد و خۆیان گەیاندەوە لای پێغەمبەری فەرماندە ﷺ و، لاپەڕەی سێ‌هەمی جەنگیان هێنایە پێش و ، قوڕەیشیان لە هێرش‌کردن وەستاند و ، خۆیان وەها کۆکردەوە کە قوڕەیش بەبێ دەنگ و بە پەلە مەیدانی جەنگ چۆڵ بکا و هەر ئەو ئێوارەیە مەدینە بەجێ بهێڵێ و بەرەو مەککە بکەوێتە رێ ، وەك قوڕەیش خۆی بزانێ کە سەرکەوتنی لاپەڕەی دووهەمی جەنگ کارێکی کاتیی بوو و ، ئەوان ناتوانن لەبەردەم سوپای هاوەڵان‌دا دان بە خۆیان‌دا بگرن .

کەواتە وەك موسڵمانان لە بەدردا سەرکەوتن و بوونە خاوەنی مەیدان ، قورەیش لە ئوحوددا وەها سەرنەکەوتن و ، نەیان توانیی لە مەیداندا بمێننەوە و ، نەشیان توانیی موسڵمانان لە مەیدانی جەنگ راو بنێن .

کەواتە ئەوە سەرکەوتنی راستەقینە نەبوو ، چونکە موسڵمانەکان کوژراوەکانیان کۆکردنەوە و هەر ئەو ئێوارەیە ناشتنیان . هەروەها نە دیلیان لێ گیرا و ، نە کەل و پەل و چەکیشیان کرایە دەستکەوت .

ئەگەر قورەیش سەرکەوتنی راستەقینەی بە دەست بهێنایە ئەبوایە هەڵمەتی بدایە لە مەدینەدا هەندێ دیلی بگرتایە و دەستکەوتی دەست خۆی بخستایە . بەڵام نەیوێرا ئەوەش بکات .

لەلایەکی ترەوە قورەیش ئەوەندە بە پەلە مەیدانی جەنگی بەجێ هێشت ، شایانی ئەوەیە ناوی هەڵاتووی لێ بنرێ . چونکە ئەبوسوفیان ئەوەی بە چاك زانیی نەهێڵێ دەستی موسڵمانەکان بگاتە قورەیش ، نەوەکو لە بەدر خراپتریان پێ بکەن ، بەڵگەی ئەمەش هەڵمەتبردنی موسڵمانەکانە بۆ ( حمراء الأسد ) و هەڵاتنی قورەیشە بەرەو مەککە .[431]

**بیست و پێنجەم : رووداوی تری ساڵی سێهەم :**

**( أ ) مارەکردنی ئوم کولثووم لەلایەن عوثمانەوە :**

لەم ساڵەدا سەردارمان عوثمانی کوڕی عەففان خوا لێی رازیی بێ خاتوو ئوم کولثوومی کچی پێغەمبەری خوای ﷺ مارە کرد ، دوای ئەوەی کە روقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ ، کە هاوسەری یەکەمی بوو لە کاتی جەنگی بەدردا کۆچی دوایی کرد .. ئەوەبوو لە مانگی جومادی دووهەمدا گواستیەوە .

کاتێك کە عوثمان خوازبێنیی خاتوو ئوم کولثوومی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێی فەرموو : (( لوکان لي یا عثمان عشرة لزوجتك واحدة بعد الأخرى )) . فەرمووی : عوثمان ! ئەگەر دە کچم هەبن یەك لە دوای یەك مارەیان ئەبڕم لێت .

ئەڵێن : جگە لە عوثمان هیچ کەسێکی تر دوو کچی پێغەمبەرێکی یەك لە دوای یەك مارە نەکردوون لەبەر ئەمە نازناوی : (( ذو النورين )) ی بەسەردا بڕاوە.

---

[431] غزوة أحد : ٢٩٣ _ ٣٠٢ .

**( ب ) مارەکردنی حەفصە لەلایەن پێغەمبەری خواوە :**

هەر لەم ساڵەدا پێغەمبەری خوا ﷺ خاتوو حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەططابی مارە کرد .. خاتوو حەفصە لەوە و پێش هاوسەری خونەییسی کوڕی حوذافەی سەهمیی بووە ، کە هاوەڵێکی بەدریی بووە و ، دوای جەنگی بەدر کۆچی دوایی کردووە .

بوخاریی لە صەحیحەکەیدا ریوایەتی کردووە کە عومەر خوا لێی رازیی بێ داوا لە عوثمان ئەکات ، دوای مردنی روقیەی هاوسەری ، تا حەفصە مارە بکات . ئەویش ئەفەرموێ : پێویستییم بە ژن هێنان نیە . پاشان داوا لە ئەبوبەکر ئەکات تا مارەی بکات ، ئەبوبەکریش بێدەنگ ئەبێت و هیچ وەڵامێکی ناداتەوە ، بە رادەیەك کە عومەر دڵی لە خۆی دائەمێنێ . پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ خوازبێنیی ( حەفصە ) ئەکات و ئەویش لێی مارە ئەکات . دوای خوازبێنییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر بۆ عومەر روون کردەوە کە تەنها ئەوە لە وەڵام دانەوە قەدەغەی کرد کە ئەیزانیی پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی بردووە و ، پێیشی ناخۆش بوو نهێنیی پێغەمبەری خوا بڵاو بکاتەوە ..

بەم خوازبێنییە پێغەمبەری خوا پەیوەندیی خۆی بە وەزیری دووهەمیەوە پتەو تر کرد ، هەروەك پێشتر پەیوەندیی بە یەکەم وەزیریەوە پتەوتر کرد بوو ، ئەویش بە مارەکردنی خاتوو عائیشە .

**( ج ) لەدایك بوونی حەسەن :**

هەر لەم ساڵەدا فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەنی کوڕی بوو و ، بۆ ساڵی ئاییندەش حوسەینی بوو .[٤٣٢]

---

[٤٣٢] السيرة النبوية لأبي شهبة : ٢ / ٢٣٠ ـ ٢٣١ .

# ناوەرۆك

موحەممەدی ئازیزمان ! کاتی خەو و حەسانەوە نەما .. ئەوە نەما تۆ بۆ خۆت بژیت .. ئەوە نەما هەوڵ بدەیت ژیان و گوزەرانی ماڵ و منداڵت خۆش بکەیت .. هەستە مرۆڤایەتیی سەرگەردان بووە .. نرخ و بەهای مرۆڤ دابەزیوە .. مرۆڤەکان خوای خۆیان بە چاکیی ناناسن .. ڕێی ڕاستیان ون کردووە .. زوڵم و ستەم باڵی کێشاوە بەسەر زەوییدا ..

هەستە ، دەست بە کاری خۆت بکە .. تۆ بۆ کارێکی یەکجار مەزن هەڵ بژێرراوی .. ئەو کارە پیرۆزە فەرامۆش مەکە .. هەموو سەرزەویی چاوەڕوانتە .. مرۆڤایەتیی تا ئاخرزەمان بەتەمایە تۆ رزگاری بکەی .. ئەوەتا نەخشە و دەست بە کار بە ..

هەستە ، کاری پیرۆز چاوەڕوانتە .. دڵە شەیداکانی حەق و ڕاستیی چاوئەگێڕن بزانن کێ ئاڵای ڕاستیی بە بەرز ئەکاتەوە ، تا بچنە ژێریەوە و کۆشش بکەن .. خزمەتی حەق بکەن.. چاکە لە سەرزەوییدا بڵاو بکەنەوە ..

بەڵی ، ئازیزمان ! هەستە .. سوپایەکی مەزن لە پیاوچاکانی سەرزەویی ، تا ئاخرزەمان چاوەڕوانن تۆی بەڕێز ئاڵا بەرز کەیتەوە ..

سوپایەکی بەڕێز ئامادەیە تا فەرمان بدەیت و ، ئەویش تەخت و تاجی زوڵم لە بن بهێنێ ..

سوپایەکی مەزن چاوەڕوانە تۆی بەڕێز نەخشەی پاککردنەوەی دڵ و دەروونیان پیشان بدەیت ، تا ئەوانیش یەك لە دوای یەك و ، دەستە لە دوای دەستە ، بە درێژایی مێژوو خەریکی پەروەردەی خۆیان و نەوەکان بن و ، خەریکی تەزکیەی نەفس بن ، تا مرۆڤایەتیی لە ( **اسفل سافلین** ) رزگاری بێ و ، هەوڵ بۆ گەیشتن بە کەماڵات و پایە و پلە بەرزە مەعنەویەکان بدات ..




لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی **سۆز**

سلێمانیی ـ شەقامی صابوونکەران

ژمارە سپاردنی ( ٣٣٤ )ی ساڵی ( ٢٠٠٦ )ی وەزارەتی رۆشنبیریی دراوەتێ.